# تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز

## بەرگی بیست و پێنجەم

سوورەتەکانی

(فصلت) و (الشوری) و (الزخرف)

عەلی باپیر

تەفسیری سوورەتەکانی

# فُصِّلَت و الشُّورَى و الزُّخْرُف

نووسینی : عەلی باپیر
دیزاینی ناوەوە : زەردەشت کاوانی
چاپی یەکەم ١٤٤٣ك - ٢٠٢١ز
٩٠٢ لاپەڕە
١٧* ٢٤ سم
بابەت : ئایینی

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان
ژمارە سپاردنی ( ٧ ) ی ساڵی ٢٠١٢ پێدراوە

تەفسیری سوورەتەکانی

# فُصِّلَتْ و الشُّورَىٰ

# الزُّخْرُفِ

نووسینی: عەلی باپیر

# پێشەکی ئەم تەفسیرە بەگشتیی

**إنَّ الحَمْدَ للَّـهِ نَحْمَـدُهُ وَنَسْـتَعِينُهُ، وَنَسْـتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِـنَا، وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِه اللَّـهُ فَلاَ مُضِـلَّ لَـهُ، وَمَنْ يُضلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَـهُ، وَأَشْـهَدُ أَن لاَ إلَـهَ إلاَّ اللَّـهُ وَحْـدَهُ لاَ شَرِيكَ لَـهُ، وَأَشْـهَدُ أَنَّ مُحَمَّـداً عَبْـدُهُ وَرَسُولُهُ.**

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾ آل عمران.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴿١﴾ ﴾ النساء.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ﴿٧٠﴾ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ ﴾ الأحزاب .

**أمَّا بَعْـدُ: فـإنَّ أَصْـدَقَ الحَديـث كَلامُ اللَّـه، وَخَـيْرَ الْهَـدِي هـدْيُ مُحَمَّـد ﷺ وَشرَّ الأُمُـورِ مُحْدَثاتُهـا، وَكُلَّ مُحْدَثَـةٍ بِدْعَة، وَكُـلَّ بِدْعَةٍ ضَـلاَلَةٌ، وَكُلَّ ضَـلاَلَةٍ فِي النَّـار[١].**

**خوێنـەرە بەڕێـزو خۆشـەویستەکان!**

هیـچ گومـانی تێدانیــە - بـۆ مرۆڤـی بـڕوادار - کـە ئـەو تەمەنـەی لـە خزمـەت دوایین کتێبـی خـوا (قورئـان)دا بەسـەردەبرێ، جـا بـە هــەر شـێوەیەك لـە شـێوەکانی لە خزمەتدابوونـدا بـێ؛ خوێندنـەوە، تێفکریـن و ڕامـان، فێرکـردن، کارپێکـردن ... هتـد، بـە باشـتـرین جێگرتـن جێـگا دەگـرێ و، خاوەنەکـەی لـە دنیـاو دوارۆژدا لێـی بەهرەمەنـدە.

---

(١) ئـەوە پێـی دەگـوترێ: (خطبـة الحاجـة) کـە پێغـەمبــەر ﷺ هــاوەڵانی بەڕێـزی فێــردەکرد، پێــش هـــەر قسـەیەکی گرنگ، بیڵـێن، وەك وتـاری جومعــەو داخــوازییکردن (خِطْبة)و... هتـدو، ئـەم وتــارە، هـەرکام لە: التــرمذي: (١١٠٥)، النســائي: (١١٠٤)، ابن ماجـه: (١٨٩٢) أحمـد: (٣٧٢٠)، الطَّبــراني: (٢٤١٤) هێنــاویانەو (مسلم)یش بەشــێکی هێنـاوە.

منیش - کە وەك باسکردنی چاکەی خوا (**التحدّث بنعمة اللّه**) دەیخەمەڕوو- لەوەتی فامم کردۆتەوە، خوای بەبەزەیی و بەخشەر چاکەی لەگەڵ کردووم و، بە فەرمایشتی بەرزو بێ وێنەی خۆیەوە سەرگەرمی کردوومو، بەر لە تەمەنی بیست ساڵیی یەوە هیدایەتی داوم، کە قورئانی بەرێزو پێز لەبەر بکەم و، سەرقاڵی خوێندنەوەی تەفسیرەکانی قورئان و تێوەرامانی ئایەتە پڕ بەرەکەتەکانی و، لێوردبوونەوەیان بم.

هەر بۆیەش تێکڕای کتێب و نامیلکەو وتارو دەرسەکانم، کەم و زۆر لەبەر ڕۆشنایی قورئان دابوون، کە دیارە هەر ئەمەش شتێکی سروشتییە؛ ئاخر ئایا ئیسلام بێجگە لە قورئان پاشان سوننەتی پێغەمبەر ﷺ، کە ئەویش هەر ڕوونکردنەوەی قورئان و چۆنیەتی جێبەجێکردن و کارپێکردنیەتی، شتێکی دیکەیە؟! بێگومان نەخێر.

ئنجا لەمێژ ساڵیش بوو، کە براو خوشکانێکی دڵسۆزی نزیك و ئاشنام، داوایان لێدەکردم کە دەست بکەم بە دانانی تەفسیرو لێکدانەوەیەکی قورئان، هەتا لە ڕەمەزانی ساڵی (١٤٢٨)دا هاتە دڵمەوە، کە ناوی خوای لێبهێنم و دەست بەو کارە گەورەو گرنگە بکەم، بەڵکو وردە وردە بەپێی بوارو دەرفەت، هەرساڵە هەندێکی لێ ئەنجام بدەم، لەگەڵ سەرقاڵیی زۆرو جۆراو جۆریشدا، هەتا دەرفەتێکی وام بۆ دەڕەخسێ کە بتوانم خێرایی تێدا بکەم و خۆمی بۆ یەکلایی (**متفرّغ**) بکەمەوەو، خوا پشتیوان بێ تەواوی بکەم، ئەگەر تەمەن بەبەریەوە مابێ.

سەرچاوەی دانانی ئەم تەفسیرو لێکدانەوەیەشم، وێڕای سەرنجدانی زۆربەی ئەو تەفسیرانەی کە باون و، دەستم پێیان گەیشتوە، بریتیە لە وردبوونەوەو تێوەرامانی خۆم لە خودی قورئان، چونکە بێگومان قورئان: هەندێکی هەندێکی ڕوون دەکاتەوە: (**القرآن يُفَسِّر بَعضُهُ بَعْضَاً**)، پاشان سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، چونکە پێغەمبەری خواش ڕوونکەرەوە (**مُبَيِّن**)ی قورئانە، وەك خوا ﷻ فەرموویەتی:

﴿...وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾﴾ النحل.

واتـە: هەروەهـا زیکرمـان بـۆ لای تـۆ ناردۆتـە خـوار، تاکـو ئـەوەی بـۆ خـەڵکی نێرراوەتـە خـوار، بۆیـان ڕوون بکەیـەوە، وە بەڵـکو خۆشـیان بیـربکەنەوە.

ئومێدیشـم وایـە - بـە یارمـەتی خـوای بەخشـەر ﷻ - شـایسـتەیی ئـەوەم هـەبێ تەفسـیـرو لێکدانەوەیەکی وا بۆ قورئـان پێشـکەش بە مسـوڵمانانی کوردسـتان بکەم، کـە لـە قورئـان بوەشـێتەوەو، مایـەی بەهـرەو سـوودی خوێنـەران بـێ، بەتایبـەتیش کـە زیاتـر لـە سـی (٣٠) ساڵە لەگـەڵ قورئانی بـەرزو مـەزن و تەفسـیـرەکانی و کتێبەکانی سـوننەتدا خـەریکم و، دەیـان کتێـب و بەرهـەمی جۆراوجـۆرم لـە زۆربـەی بـوارەکانی زانسـتەکانی شـەریعەتدا پێشـکەش کردوون.

شایانی باسیشـە کـە ئەو بیسـت و دوو مانگ زیندانیـی کرانەم لەلایـەن ئەمریکاوە - لـە (٢٠٠٣/٧/١٠ تاکـو: ٢٠٠٥/٤/٢٨) - دەرفەتێـکی گـەورەو گرنـگ بـوو، بـۆ زیاتـر پێدا قووڵـبوونەوەی کتێبـی خـوا (تبـارك و تعالـى) و، بۆ پەیدابوونی تێگەیشـتنی تایبـەت لەبـارەی زۆرێـك لـە ئایەتـەکانی یـەوە، ئـەم ڕاسـتییەش لـە مەوسـووعەی: (**الإسـلام كـما يتجلّى فـي كتـاب اللّـه تعالـى**)دا زۆر چـاك درەوشـاوەتەوە[1]، بـەڵام هـەڵبەتە ناڵـێم و هیچکەسیش بـۆی نیـە بڵـێ: کـە ئـەم تەفسیرەی من تێروتـەواوە، چونکـە وێـڕای سـنووردارbوونی توانـاو بڕسـتم، لـە بەرانبـەر کتێبـی لـە هـەموو ڕووێکـەوە ڕەهـا (مطلـق)و بێسـنوور (لا محـدود)ی خـوادا، نەشـمویسـتوە کـە زۆر بەمـلاولادا بچـم و بچمـە نێو هـەندێك وردەکارییەوە، کە یان من تێیـدا پسپۆڕو

---

(١) ئەو مەوسـووعەیە کە ئێسـتا چـاپ کراوەو، کەوتۆتـە بەردەسـتی خوێنەران و، سـەرجەم هەشـت بەرگ و دەوری سـێ هـەزارو پێنج سـەد (٣٥٠٠) لاپەڕەیەو، هـەوڵـمداوە بەگشـتی تێیدا باسـی سـەرجەم لایەنـەکانی ئیسـلام بکـەم و، تاکـە سـەرچـاوەشم قورئـان بـووە، وێـڕای دەقـەکانی سـوننەت، کـە لـە هـۆش (ذاكـرة)دا بـووون.

شـایانی باسـە ئەو مەوسـووعەیە لە چاپی دووەمی دا، کراوە بە دوازدە (١٢) کتێبـی سـەربەخۆ، بە مەبەستی ئاسـانتـر سـوود لێ بینـرانی .

شــارەزا نیم، یـان خوێنــەر پێویســتی پێـی نیـە، لـە کاتێکـدا دەیــەوێ لـە قورئان تێبگات و، بزانێ خـوا (تبـارك وتعـالـى) ڕاستەوخۆ چـی پـێ فــەرمووە؟!

ئنجـا هــەر لێرەشـەوە بە پێویسـتی دەزانم پڕ بە دڵ سـوپاسی ئەو بـرا گەنجە ڕووح سـووك و گـورج و گـۆڵ و دڵسـۆزە بکـەم (حـەزی نەکـرد نـاوی بهێنـم)، کـە هـەڵسـا بـە نووسـینەوەو هێنـانە سـەر کاغـەزو، پاشـان تایپکـردن و دوایـی پێداچوونـەوەو هەڵەگیـریی، سـەرجـەم ئـەم زنجیـرە دەرسـە، کـە لـە ئەسـڵدا لـە شێوەی وتـار (محـاضرة)دا پێشـکەش کراون، هــەروەها هـەڵسـا بـە (تخریج)ی سـەرجەم دەقەکانی سـوننەت، لـە سـەرچاوە متمانـە پێکراوەکانـەوەو، زەحمـەت و ماندووبوونێـکی زۆری بـە سـەرجەم بەرگـەکانی ئـەم تەفسیـرەوە کێشــاوە، خــوا بـە باشتــرین شــێوە پاداشـتی بداتـەوەو، هــەر صـاڵح و سـاغ و سـەلامەت و سـەربەرزبێ[1]، لـە خـوای بـەرزو بێهـاوتاش داواکارم ئـەو جـۆرە گەنـج و لاوانـە لـە کـوڕان و کچـان، لەنێـو گەلەکەمانـدا، زۆر بـکات .

شـایانی باسیشـە کـە ئێمـە لـەم تەفسیــرەماندا، بـاسی بـەش (جـزء)ەکانی قورئـان و دابەشـکردنەکانی دیکـەی وەك: - (حـزب) - ناکەیـن، چونکـە هــەر ســوورەتێك بۆخــۆی شــتێکی ســەربەخۆیــەو، ســەرجەم ئایەتــەکانی وەك ئاڵقــەکانی زنجیرێـك پێکـەوە پەیوەسـتن و، ئاشکراشـە کـە دابەشـکرانی سـەرجەم قورئـان بـۆ سـی (٣٠) بـەش (جـزء) و شەســت (٦٠) (حـزب)، شتێکە لەلایـەن زانایانـەوە کـراوە، بـۆ ئاسـانکاریی خوێنـدنی قورئــان، دیـارە ئێمـە لـە دابەشـکردنی بەرگـەکانی ئـەم تەفسیـرەشــدا، دیسـان حیســاب بـۆ بەشـەکان (أجـزاء)ی ناکەیـن و، بـە گوێـرەی ســوورەتەکان، بەرگــەکانی دیـاریی دەکەیـن.

---

(١) ئـەو بــرا دڵســۆزە ئێســتاش پـاش تەواوکردنـی زۆربـەی قورئـان، لێبڕاوانـە بەردەوامـە و عەزمیشــی جــەزم کردوە، کە ئەگەر تەمەنمــان بەردەوام بێ، هەتــا کۆتــایی ئەم تەفسیــرە ســەرگەرمی کارەکـەی بێ .

دوا قسەشم ئەوەیە کە:

ئەم تەفسیره - وەك پێشتر گوتمان - لە ئەسڵدا بەشێوەی دەرس و وتار پێشکەش کراوە، بەڵام دواتر خۆم دووجار بە وردیی پێیدا چوومەوەو، بەپێی پێویست دەستکارییم کردوە، دیارە هەموو دەرسێکیش بەناوی خواو ستایشی خوا ﷻ دەستی پێکردوە، بەڵام ئێمە لە سەرەتای دەرسەکانەوە، ئەوانەمان لابردوە، بۆ زۆر دووبارە نەبوونەوەو، ئەو (خطبة الحاجة)یەی لە سەرەتای ئەم پێشەکییەوە هاتوە، لەجیاتی سەرەتای سەرجەم دەرسەکانە.

سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ،

وَسَلَامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ .

دووشەممە ٢٥ رجب ١٤٣٢

٢٠١١/٦/٢٧

هەولێر

# بەرچاو ڕوونییەکی گرنگ
# لەبارەی ئەم تەفسیرەوە

**خوێنەری بەڕێز !**

هەرچەندە لە (پێشەکی گشتیی) ئەم تەفسیرەدا باسمان کردوە کە بۆ نووسینی ئەم تەفسیرە، لە هەموو ئەو تەفسیرە باوانەی دەستم پێیان گەیشتوە، بەهرەمەندبووم، هەروەها لە کۆتایی هەر بەرگێکی ئەم تەفسیرەدا، سەرجەم ئەو تەفسیرانەی کەم و زۆر لێیان سوودمەند بووم، ناوەکانیانمان بە ڕیز نووسیون، بەڵام لێرەش وەك جەختکردنەوەی زیاترو بەرچاوڕوونیی باشتر بۆ ئێوەی بەڕێز دەڵێم :

مادام ناوی تەفسیرەکانمان نووسیوە، نە پێویست دەکات و نەدەشگونجێ، بۆ هەر تێگەیشتن و بیرۆکەیەك، کە زۆربەی تەفسیرەکان لەبارەی ئایەتێکەوە، یان ڕستەو بڕگەیەکی ئایەتێکەوە، دەیهێنن، ئێمە هەموو جارێ ناوی ئەو تەفسیرانە بێنین، بەڵام بێگومان هەر کات بیرۆکەو تێگەیشتنێکی تایبەتی یەکێك لە تەفسیرەکان هەبێ و بکەوێتە بەرچاوم، ئنجا چ پەسندی بکەم، چ ڕەفزی بکەم، هەر کات بە پێویستی بزانم، بە تایبەت ئاماژەی پێدەکەم، ئەگەرنا بە ئاماژەی گشتیی و بە نووسینی ناوی تەفسیرەکان لە کۆتایی هەر بەرگێك دا، ئیکتیفا دەکەم و، زۆریش لە ئەمانەتی زانستیی (الأمانة العلمیة) دەخەفتێم و مەبەستمە ڕەچاوی بکەم، چونکە ئەمینیی و ئەمانەت پارێزیی، ڕەوشتێکی گەورەو بەرزی مسوڵمانەتییە .

شایانی باسیشە جاری وا هەیە بیرۆکەو تێگەیشتنێکی تایبەتیی خۆمم، دەربارەی کۆمەڵە ئایەتێك یان ئایەتێك یان ڕستەو بڕگەیەکی ئایەتێك، بۆ دروست دەبێ، وەك تێگەیشتن و بۆچوونی خۆم دەینووسم، کەچی ڕەنگە لە تەفسیرەکانی

دیکەش - یەکێکیان یان زیاتر - دا هەبێ، ئەویش بەهۆی ئەوەوەیە کە من ئەو تەفسیرەم نەکەوتۆتە بەر دیدە، یان دیتوومەو لەیادم نەماوە.

# پێشەکی ئەم بەرگە

الحمدللـه وحـده والصـلاة والسـلام والـبركات علـى مـن النبـيَّ بعـده، محمـد وآلـه الملتزميـن بهديـه: صحبـاً وأزواجـاً وقرابـة وذريـة والتابعيـن بإحسـانٍ.

خوێنەرە بەڕێز و خۆشەویستەکانم !

سـوپاس و ستایشـی شایسـتە بـۆ خـوای کاربەجێـی میهرەبـان، ئەمـە بەرگی بیسـت و پێنجەمـە لـە تەفسـیری قورئانـی بـەرز و بەپێـزو، لـەم بەرگەدا سـێ سـوڕەت لـە حەوت سـوڕەتە حامیمەکان تەفسـیرکراون:

١- فصلت
٢- الشورى
٣- الزخرف

شـیاوی گوتنیشـە کـە ئـەم بەرگەش لـەسەر هەمـان میتـۆدی بەرگەکانی پێشـوویەتی و، بـە حـەوت قۆنـاغ هەوڵمانـداوە تیشـکێك بخەینـە سـەر چەمـك و واتـای ئایەتەکانـی هـەرکام لـەو سـێ سـورەتە موبارەکـەی قورئانـی مـەزن، ئنجـا وێـڕای تەفسـیرکردنی سـەرجەم ئایەتەکانـی ئـەو سـێ سـوڕەتە لەهـەر کاێکیشـیاندا چەنـد کورتـە باسـێکمان کـردوون، بـەم شـێوەیەی خـوارەوە:

### یەکەم : فصلت

١- پێناسەی قورئان بە نۆ سیفەتی سەرەکیی.
٢- کورتەباسێك لەبارەی درووست بوونی گەردوونەوە.
٣- کورتەباسێك لەبارەی شایەدیی لەسەردانی مرۆڤەوە لە قیامەت دا.
٤- کورتەباسێك لە بارەی هاوەڵێتیی فریشتان بۆ بڕواداران و، شەیتانەکان بۆ بێبڕوایانەوە.
٥- کورتەباسێك لەبارەی خەسڵەتە بنەڕەتییەکانی بانگەوازکارانەوە.

٦- کورتەباسێك لەبارەی دەرکەوتنی بەردەوامی نیشانەکانی خواوە لە ئاسۆیەکان و لە خودی مرۆڤانیشدا.

## دووەم: الشـــــوری

١- کورتەباسێك: چوار سەرنج لەبارەی خوا و پەیوەندیی لەگەڵ دروستکراوەکانی دا.

٢- کورتەباسێك لەبارەی بەپاکگرتنی خواوە، لە وێکچوونی بەدروستکراوەکان.

٣- کورتەباسێك لەبارەی بژیودانی خواو زۆر و کەمکردنیەوە.

٤- کورتەباسێك لەبارەی مانای (قُلْ لا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا إلا الْمَوَدَّةَ فِي الْقُرْبَىٰ) وە.

٥- ڕوونکردنەوەیەك لەسەر: هەبوونی پێڕۆ (دابة) لە ئاسمان دا.

٦- کورتەباسێك لەبارەی ڕاوێژەوە.

٧- کورتەباسێك لەبارەی فەرمایشتکردنی خواوە.

٨- کورتەباسێك لەبارەی فەرمایشتی خوا: (مَا كُنتَ تَدْرِي مَا الْكِتَابُ وَلَا الْإِيمَانُ) .

## سێیەم: الزخـــــرف

١- کورتەباسێك لەبارەی عەرەبیی بوونی قورئانەوە.

٢- کورتەباسێك لەبارەی ناڕەوایی شوێنکەوتنی کوێرانەی پێشینانەوە.

٣- شەش کورتە سەرنج لەبارەی دنیاو دوارۆژەوە.

٤- هەندێك وردەکاریی مانای (وَلَمَّا ضُرِبَ ابْنُ مَرْيَمَ مَثَلا..).

٥- نازو نیعمەتەکانی بەهەشت و سەرنجێك لەسەر قسەیەکی ڕازیی.

هیواداریشـم ئـەم بەرگـەش کاتـی پێویسـتی لەگـەڵ بەسـەرببرێ لەلایـەن خوێنەرانی شـەیدا و عەوودالّـی قـووڵ و راسـت و دروسـت تێگەیشـتنی قورئانـی بـەرز و بەپێـزەوە.

٩ / ربیع الأول / ١٤٤٣ ك

١٥ / ١٠ / ٢٠٢١ ز

## دەستپێک

بەڕێـــزان!

خـوا ﷻ پشـتیوان بـێ ئەمـڕۆ کـە (١٨/ ربیع الثـاني/ سـاڵی ١٤٤١) کۆچییـە، بەرانبەر (١٥/ ١٢/ ٢٠١٩)ی زایینـی، دەسـت دەکەیـن بـە تەفسـیری سـوورەتی (فصلـت)، یـان سـوورەتی (حـم)ی (فصلت).

## پێناسەی سوورەتی (فُصلت) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی:

ئەم سوورەتە چەند ناوێکی بۆ بەکارهاتوون:

١- حمُ السَّجْدة

٢- سورة السَّجْدة

٣- سورة فصلت

٤- سورة المَصابیح

٥- سورة الأَقْوَات

٦- سجدة المؤمن.

هەمـوو ئـەو ناوانـەی بـۆ بەکارهاتـوون، بـەڵام ئـەو نـاوەی زیاتـر پێـی نـاسراوە، بریتیـە لـە: (سُـورَةُ فُصِّلَـت)، لەبـەر ئـەوەی ئـەم وشـەیە یەکـەم وشـەیە لـە سـوورەتەکەدا.

## دووەم: شوێنی دابەزینی:

ئـەم سـوورەتە بـە یەكدەنگیـی هەمـوو زانایـان سـوورەتێكی مەككەییـەو، هیـچ زانایـەك، هیـچ ئایەتێكـی لـێ هەڵنـەواردوە، بڵـێ: ئـەو ئایەتـە، یـان ئـەو چەنـد ئایەتـە مەدینەییـن.

## سێیەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و دابەزیندا:

لـە ڕیزبەندیـی سـوورەتەكانی موصحەفـدا، ئـەم سـوورەتە ژمـارە (٤١)ە، واتـە: لـە پێـش ئـەم سـوورەتەدا كـە لـە سـوورەتی فاتیحـەوە پـێ دادێ، چـل سـوورەتی دیكـە هـەن و، ئەمەیـان (٤١)ەمیـن سـوورەتەو، لـە ڕیزبەندیـی دابەزینـدا ئـەم سـوورەتە ژمـارە (٦١)ە، لـە دوای سـوورەتی (**غافـر**) و ، پێـش سـوورەتی (**الزخـرف**) هاتۆتـە خـوار.

## چوارەم: ژمارەی ئایەتەكانی:

زانایـان لـەو بابەتـەدا یەكدەنـگ نیـن، هەندێكیـان ژمـارەی ئایەتەكانـی سـوورەتی (فصلت)یـان بـە (٥٢) ئایەتـە دانـاوەو، هەندێكیـان بـە (٥٣) ئایـەت، هەندێكـی دیكەیشـیان گوتوویانـە: (٥٤) ئایەتـە، زانایانـی مەككـەو مەدینـە بـە (٥٢)یـان دانـاوە، زانایانـی شـام و بەصـرە بـە (٥٣) یـان دانـاوە، بـەڵام زانایانـی كووفـە بـە (٥٤) ئایەتیان دانـاوەو، زۆربـەی ئـەو موصحەفانـەی كـە لەبـەر دەسـتی ئێمـەدا هـەن، ژمـارە (٥٤) یـان تەبەننیـی كـردوە. پێشـتریش گوتوومانـە: جیاوازیـی لـە ژمـارەی ئایەتەكانـی سـوورەتێكدا دەگەڕێتـەوە بـۆ درێژیـی و كورتیـی ڕسـتەكان، هەندێـك لـە زانایـان ڕسـتەیەكیان كردۆتـە دوو ئایـەت، بـەڵام هەندێكـی دیكەیـان هەمـان ڕسـتەیان كردۆتـە یـەك ئایـەت.

## پێنجەم: نێوەڕۆکی:

ئـەم سـوورەتە هەمـان نێوەڕۆکـی سـوورەتە مەککەییەکانـی هەیـە، بـەڵام پانتاییەکـی زۆری ئـەم سـوورەتە بـۆ باسـی قورئـان تەرخانکـراوەو، لـە پێنـج شـوێناندا باسـی قورئـان کـراوەو، بـە هـەر سێك نـاوی (**کتـاب**) و (**قـرآن**) و (**ذکـر**) هاتـوە، سێ جـار نـاوی (**قـرآن**) هاتـوە، دوو جـار نـاوی (**کتـاب**) هاتـوە، جارێکیـش نـاوی (**ذکـر**) هاتـوە.

لـە دوای باسـی قورئـان، پانتاییەکـی زۆری ئـەم سـوورەتە، بـۆ باسـی ڕۆژی دوایـی تەرخانکـراوە، سـزای خـوا لـە ڕۆژی دوایـی دا و، پاداشـتی خـوا لـە ڕۆژی دوایـی دا، سـزای خـوا بـۆ تاوانبـاران و لادەران، پاداشـتی خـوا بـۆ بـڕواداران و چاکـەکاران.

دوای ئـەوەش پانتاییەکـی بـاش بـۆ خسـتنە ڕووی نیشـانەکانی خـوا (**آیـات اللـه**) تەرخانکـراوە، ئاماژەیەکیـش بـە بەسـەرهاتی هـەردوو گەلـی عـاد و سـەموود کـراوە، هەڵبەتـە هـەر بـە کورتیـی ئاماژەیـان پێکـراوە، لـە سـیاقی باسـکردنی ملهوڕیـی و عینادیـی کافرەکانـی سـەردەمی پێغەمبـەردا ﷺ باسـی عینادیـی و ملهوڕیـی بێبڕوایانـی گەلـی عـاد و سـەموودیش کـراوە، کـە سـەرەنجام چییـان لێهاتـوە؟ کەواتـە: ئێـوەش پەنـد وەربگـرن، بـا بـە مـەرەدی ئـەوان نەچـن!

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی:

ئـەم سـوورەتە موبارەکـە کۆمەڵێـك تایبەتمەندیـی هـەن، ئێمـە لێـرەدا حـەوت تایبەتمەندیـی دەخەینـەڕوو:

١- لەم سوورەتەدا لە ئایەتەکانی: (٩ - ١٢)دا، باسی درێژەی دروستکرانی ئاسمان و زەوی کراوە، لێرەدا چوار ئایەت بۆ ئەو باسە تەرخانکراون، لە هیچ شوێنێکی دیکەی قورئاندا ئاوا باس نەکراوە، کە خوا ﷻ چۆن زەوی بە دوو قۆناغ هێناوەتە دی، دواییش

بە دوو قۆناغ پێکهاتەکانی زەوی و، هەم چیایەکانی تێدا داکوتاون و، هەم بژیوەکانی تێدا داناون، دواتریش بە دوو قۆناغ خوا ﷻ ، ئاسمان (واتە: گەردوون)ی دروستکردوە، پێش ئەوەی بە شێوەی حەوت ئاسمانان بیانهێنێتە دی و، ئاسمانی نیزیك ئێمە بە چرایان برازێنێتەوە (کە مەبەست پێی ئەستێرەکان و کەهکەشانەکانن)، پێش ئەوە ئاسمان لە شێوەی دووکەڵێکدا بووە، یان لە شێوەی گازێکدا بووە.

ئـەو وردەکارییـە بـەو شـێوازە لـە قورئانـدا، تەنهـا لـەم چـوار ئایەتـەی سـووڕەتی (فصلـت)دا بـەم شـێوازە خراوەتـە ڕوو.

٢- لەم سووڕەتەدا ئەو بێبڕوایانەی دووچاری دۆزەخ دەبن، داوا لە خوا ﷻ دەکەن: ئەو دووانەی لە جندو مرۆڤ کە گومڕایان کردوون، پێشانیان بدات، تاکو بیانخەنە ژێر پێیان! ئەم تەعبیرە تەنها لێرەدا لە ئایەتی (٢٩)دا هاتوە.

٣- باسی دابەزینی فریشتان بۆ سەر بڕوادارانی ڕاوەستاوو دامەزراوو ئیلهام بۆ کردنیان، ئەویش تەنیا لەم سووڕەتەدا بەو شێوەیە هاتوە، لە ئایەتەکانی: (٣٠ - ٣٢)دا، ئەم ڕاستییە خراوەتە ڕوو، مەبەستمان بەم شێوەیە، ئەگەرنا لە زۆر شوێنی قورئاندا باسی هاودەمیی و هاوڕازیی فریشتەکان بۆ بڕواداران کراوە.

٤- باسی ئەوە کە بانگەوازکار بۆ لای خوا ﷻ، قسەکەی باشترین قسەیە، ئەویش تەنیا لەم سووڕەتە، لە ئایەتی ژمارە (٣٣)دا، ئەو تەعبیرە هاتوە.

٥- باسی ئەوە کە قورئان لە هیچ لایەکەوە هەڵەو ناهەقیی تێدانیە، ناڕێکیی و لاچوون و لادان ڕووی تێناکات، ئەوەش لە ئایەتەکانی: (٤١ - ٤٢)دا هاتوە.

٦- باسی ئەوە کە ئەگەر قورئان بە عەجەمیی بووایە، واتە: بە غەیری زمانی عەرەبیی بووایە، بێبڕوایەکانی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ ڕەخنەیان لێدەگرت، کە چۆن پێغەمبەر ﷺ عەرەبەو، قورئان غەیری زمانی عەرەبە (ئەعجەمییە)؟ ئەوەش لە ئایەتی ژمارە (٤٤)دا ئاماژەی پێکراوە، کە لە هەموو قورئاندا تەنیا لێرەدا باس کراوە.

٧- باسی ئەوە کە خوا ﷻ بەردەوام نیشانەکانی ڕاستییەتی قورئان، یان نیشانەکانی ڕاستییەتی خوا ﷻ، یان نیشانەکانی ڕاستییەتی پێغەمبەر ﷺ، یان هەرسێکیان بەیەکەوە، لە ئاسۆیەکان و لە خودی خۆشیاندا پێشانی مرۆڤەکان دەدات، واتە: بەردەوام ئەو بەڵگەو نیشانانە دەردەکەون کە زیاتر ڕاستێتیی قورئان نیشان دەدەن، یاخود هەقانییەتی پەروەردگارێتیی خوا ﷻ، یاخود هەقانییەتی پێغەمبەر ﷺ کە قورئانی وەك بەرنامەو پەیام لە خواوە بۆ بەندەکانی خوا ﷻ هێناوە.

## حەوتەم: دابەشکردنی ئایەتەکان بۆ چەند دەرسێك:

ئێمـە ئـەو (٥٤) ئایەتـەی ئـەم سـوورەتە، بـۆ شـەش دەرسـان دابـەش دەکەیـن، بەمجـۆرەی خـوارەوە:

**دەرسـی یەکـەم:** ئایەتەکانـی: (١ - ١٢)، واتـە: دوازدە (١٢) ئایەتی سـەرەتای سـوورەتەکە دەگرێتـە خـۆی، خـوا ﷻ باسـی قورئـان دەکات، پاشـان باسـی پێغەمبـەر ﷺ دەکات، پاشـان باسـی یەکتایـی خـوا ﷻ، دواتریـش باسـی چۆنیەتـی دروسـتکردنی خـوا بـۆ گـەردوون، پێشـێ باسـی زەویـی و پێکهاتەکانـی زەوی، دواتریـش باسـی پێکهاتەکانـی ئاسـمان، دەکات.

**دەرسـی دووەم:** ئایەتەکانـی: (١٣ - ١٨)، واتـە: شـەش (٦) ئایـەت دەگرێتـە خـۆی، باسـی هـەردوو گەلـی عـادو سـەموود دەکات، هەروەهـا چۆنیەتـی فەوتێنرانیـان دەخاتـە ڕوو، کـە گەلـی عـاد پێغەمبەرەکەیـان هـود ؑ بـوو و، گەلـی سـەموود پێغەمبەرەکەیـان ساڵـح ؑ بـووە.

**دەرسـی سـێیەم:** ئایەتەکانـی: (١٩ - ٢٩)، واتـە: یـازدە (١١) ئایـەت دەگرێتـە خـۆی، باسـی سـەرەنجامی شـوومی بێبڕوایـان لـە ڕۆژی دوایـی دا، کـە چـۆن پێسـت و ئەندامەکانیـان شـایەدییان لەسـەر دەدەن و، فریشـتەکان سەرزەنشـت و سـەر کۆنەیـان دەکـەن، هەروەهـا باسـی چەنـد هەڵوێسـتێکی بێبڕوایـان لـە دژایەتیـی قورئـان و دژایەتیـی پێغەمبـەردا ﷺ دواتریـش چۆنیەتـی پەشـێمان بوونەوەیـان لـە

دۆزەخ دا، کە داوا لە خوا ﷻ دەکەن ئەوەی بۆتە هۆی گومڕاکردنیان لە مرۆڤ و لە جند، پێشانیان بدەن تاکو بیانخەنە ژێر پێیان.

**دەرسی چوارەم:** ئایەتەکانی: (٣٠ - ٣٩)، واتە: دە (١٠) ئایەت دەگرێتە خۆی، باسی بەندە چاك و دامەزراوەکانی خوا، کە فریشتەکان دادەبەزنە سەریان و، باسی بانگەوازکردن بۆ لای خوا ﷻ کە چ پلەو پایەیەکی گرنگی هەیە، هەروەها ڕەوشتەکانی بانگەوازکاران، دواتر باسی هەندێك لە نیشانەکانی خوا ﷻ، وەك: شەو، ڕۆژ، مانگ، خۆر، زەوی کاتێك کە باران دادەبارێتە سەری، چۆن زیندوو دەبێتەوەو بەرز دەبێتەوەو، پڕ دەبێت لە ژیان و جموجۆڵ.

**دەرسی پێنجەم:** ئایەتەکانی: (٤٠ - ٤٥)، واتە: شەش (٦) ئایەت دەگرێتە خۆی، خوا جارێکی دیکە باسی قورئان دەکات، هەروەها باسی ئەو خێرو بەرەکەتەی لە قورئاندا هەیە، هەروەها ئەو بەدبەختییەی بێبڕوایەکان کە چۆن لە بەرانبەر قورئاندا کوێرو کەڕن! لە جیاتی ئەوەی پێشوازیی لەو نوور و بەرەکەتەی خوا ﷻ بکەن، پشتی تێدەکەن!.

**دەرسی شەشەم و کۆتایی:** ئایەتەکانی: (٤٦ - ٥٤)، واتە: نۆ (٩) ئایەت دەگرێتە خۆی، باسی سەرەنجامی بێبڕوایان، کە چۆن لە ڕۆژی دوایی دا تووشی پەشێمانیی دەبن و تووشی بەدبەختیی دێن، هاوکات لەگەڵ ئەوەشدا چەند باس و بابەتێکی دیکە تێکەڵی ئەوە کراون.

کۆتا باس: جارێکی دیکە باسی قورئانە، کە خوا ﷻ جارێکی دیکە ڕایدەگەیەنێ لە مەودوا، واتە: تاکو ژیانی دنیا بەردەوام بێ، بەردەوام ئێمە نیشانەکانی خۆمان لە ئاسۆیەکان و، لە خۆشیاندا پێشان دەدەین، تاکو زیاتر بۆیان دەرکەوێ کە قورئان هەقە، یاخود خوا ﷻ هەقە، ئەوەش شتێکی چاوەڕوانکراوە، چونکە قورئان فەرمایشتی دابەزێنراوی زاتێکە، کە ئاگاداری هەموو شتێکەو دەوری هەموو شتێکی داوە.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە دوازدە (١٢) ئایەتـی سـەرەتای ئـەم سـوورەتە پێکـدێ، واتـە: ئایەتەکانـی: (١ - ١٢)، لـەو ئایەتانـەدا باسـی دوو بابەتـی گرنـگ کـراوە:

**یەکەم:** باسی قورئان و، سەرەنجامی خراپی بێبڕوایان بە قورئان، هەروەها سەرەنجامی باشی بڕواداران بە قورئان.

**دووەم:** باسی یەکتایی خوا ﷻو، چۆنیەتی دروستکردنی گەردوون لە لایەن خواوە، کە سەرەتا باسی زەوی دەکات، لەبەر گرنگیی بە نسبەت ئێمەوە، دواتر باسی دروستکردنی ئاسمان و گەردوون بە گشتیی دەکات، کە لە ڕاستییدا زەوی ئێمە بەشێکی بچووکی گەردوونە، بەڵام لەبەر گرنگیی زەوی بۆ ئێمە، خوا ﷻ سەرەتا باسی قۆناغەکانی دروستکردنی زەوی دەکات بە چوار قۆناغ، دوو قۆناغ بۆ دروستکردنی زەوی و، دوو قۆناغیش بۆ تێیدا داکوتانی چیایەکان و، تێدا ئەندازەگیریی کردنی بژیوەکان، هەروەها خوا ﷻ بە دوو قۆناغ باسی دروستکردنی ئاسمان دەکات، کە سەرەنجام هەمووی بە یەکەوە دەبنە شەش قۆناغ.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿حمٓ ﴿١﴾ تَنزِيلٌ مِّنَ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٢﴾ كِتَٰبٌ فُصِّلَتْ ءَايَٰتُهُۥ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا لِّقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿٣﴾ بَشِيرًا وَنَذِيرًا فَأَعْرَضَ أَكْثَرُهُمْ فَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ ﴿٤﴾ وَقَالُوا۟ قُلُوبُنَا فِىٓ أَكِنَّةٍ مِّمَّا تَدْعُونَآ إِلَيْهِ وَفِىٓ ءَاذَانِنَا وَقْرٌ وَمِنۢ بَيْنِنَا وَبَيْنِكَ حِجَابٌ فَٱعْمَلْ إِنَّنَا عَٰمِلُونَ ﴿٥﴾ قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَىَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ فَٱسْتَقِيمُوٓا۟ إِلَيْهِ وَٱسْتَغْفِرُوهُ ۗ وَوَيْلٌ لِّلْمُشْرِكِينَ ﴿٦﴾ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُم

بِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ كَٰفِرُونَ ﴿٧﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمۡ أَجۡرٌ غَيۡرُ مَمۡنُونٖ ﴿٨﴾ ۞قُلۡ أَئِنَّكُمۡ لَتَكۡفُرُونَ بِٱلَّذِي خَلَقَ ٱلۡأَرۡضَ فِي يَوۡمَيۡنِ وَتَجۡعَلُونَ لَهُۥٓ أَندَادٗاۚ ذَٰلِكَ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٩﴾ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَٰسِيَ مِن فَوۡقِهَا وَبَٰرَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَآ أَقۡوَٰتَهَا فِيٓ أَرۡبَعَةِ أَيَّامٖ سَوَآءٗ لِّلسَّآئِلِينَ ﴿١٠﴾ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِيَ دُخَانٞ فَقَالَ لَهَا وَلِلۡأَرۡضِ ٱئۡتِيَا طَوۡعًا أَوۡ كَرۡهٗا قَالَتَآ أَتَيۡنَا طَآئِعِينَ ﴿١١﴾ فَقَضَىٰهُنَّ سَبۡعَ سَمَٰوَاتٖ فِي يَوۡمَيۡنِ وَأَوۡحَىٰ فِي كُلِّ سَمَآءٍ أَمۡرَهَاۚ وَزَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنۡيَا بِمَصَٰبِيحَ وَحِفۡظٗاۚ ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ ﴿١٢﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

(بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، حا میم ﴿١﴾ (دابەزاندنی قورئان) دابەزاندنە لە (خوای) بە بەزەیی بەخشندەوە ﴿٢﴾ کتێبێکە ئایەتەکانی ڕوونکراونەوە، قورئانێکە بە (زمانی) عەرەبیی، بۆ کۆمەڵێك کە بزانن ﴿٣﴾ مـوژدەدەرو ترسێنەرە (بۆ خەڵکی) کەچی زۆربەیان پشتیان هەڵکرد، بۆیە نابیستن ﴿٤﴾ گوتیشیان: لە بەرانبەر ئەوەدا کە ئێمەی بۆ بانگ دەکەی، دڵ ( و عەقڵ) ەکانمان لە کیفان دان (پەردەپۆش کراون)و، قورسایی لە گوێیەکانمادایەو، لە نێوان ئێمەو تۆدا (هەر لە ئێمەوە تاکو دەگاتە تۆ) پەردە و نێوان هەیە، دەجا تۆ کاری خۆت بکەو، ئێمەش ئەنجامدەر (ی کاری خۆمان)ین ﴿٥﴾ (ئەی موحەممەد!) بڵێ: من تەنیا مرۆڤێکی وەك ئێوەم، سروشم بۆ لا دەکرێ کە پەرستراوتان یەك پەرستراوە، دەجا بە ڕێك و ڕاستیی بەرەو لای بچن و، داوای لێبوردنی لێ بکەن و، سزای سەخت بۆ هاوبەش دانەران ﴿٦﴾ ئەوانەی زەکاتێ نادەن و، ئەوانەی بە مەنزڵگای کۆتاییش بێبڕوان ﴿٧﴾ بێگومان ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کردەوە باشەکان دەکەن، پاداشتی نەبڕاوەیان هەیە (لە ڕۆژی دوایی دا) ﴿٨﴾ بڵێ: ئایا

ئێـوە بـەو کەسـە بێبـڕوان کـە زەوی لـە مـاوەی دوو ڕۆژانـدا (بـە دوو قۆناغـان) دروسـتکردووەو هاوتایانـی بـۆ دادەنێـن؟ ئـا ئـەوە (خـوای) پـەروەردگاری جیهانییانـە ﴿٩﴾ (چیا) چەسپاوەکانیشـی لەسـەر داناون و پیـت و پێـزی تێخسـتووەو، بژیوەکانـی تێـدا ئەندازەگیریـی کـردوون، لـە مـاوەی چـوار ڕۆژانـدا (بـە چـوار قۆنـاغ) یەکسـان (پڕ بـە پێسـت لەگـەڵ داخوازیـی) داواکارانـدا ﴿١٠﴾ دوایـی ویسـتی ئاسـمان دروسـت بـکات، کـە لـەو کاتـەدا دووکـەڵ بـوو (خـوا) بـە وی (بـە ئاسـمان)و بـە زەوی فەرموو: چـارو ناچـار وەرن (پەیدابـن)، گوتیـان: فەرمانبەرانـە هاتیـن (پەیدابوویـن) ﴿١١﴾ ئنجا (خـوا) لـە شـێوەی حـەوت ئاسـماندا لـە مـاوەی دوو ڕۆژ(قۆنـاغ)ان دا پەیـدای کـردن (ڕێکیخسـتن) سروشیشـی کـرد بـە ئەنجامدانـی کاروبـاری هـەر ئاسـمانێك و، ئاسـمانی نیزیکتریـش (لـە ئێوە)مـان بـە چرایـان (ئەسـتێرەکان) ڕازانـدەوەو، بـۆ پاراسـتنیش (لـە گـوێ گرتنـی شـەیتانەکان، پریشـك و بڵێسـەکانیان بەکاردێنیـن) ئـەوە ئەندازەگیریـی (خـوای) زاڵـی زانایـە ﴿١٢﴾).

## شیکردنەوەی هەندێ لە وشەکان

(**فُصِّلَتْ**): (**الفَصْلُ: إِبَانَـةُ أَحَـدِ الشَّـيئَينِ مِـنَ الآخَـرِ حَتَّى يَكُـونَ بَيْنَهُمَا فُرْجَـةٌ**)، (**فُصِّلَتْ أي: بُيِّنَت وَوضِّحَـتْ**)، (فَصْـل): بریتیـە لـەوە کـە دوو شـت لـە یـەك جیابکرێنـەوە تـا کەلێنێکیـان دەکەوێتێ.

کەواتـە: لێـرە کـە دەفەرمـوێ: ﴿ فُصِّلَتْ ءَايَـٰتُهُۥ ﴾، واتـە: ئایەتـەکانی قورئـان، ڕوونکراونـەوەو ڕۆشـنکراونەوە، کـە مەبەسـت ئەوەیـە ئایەتـەکان لـە خـودی خۆیاندا، مانـا ڕۆشـنن.

(**أَكِنَّةٍ**): (**الْكِـنُّ: مَـا يُحْفَـظُ فِيـهِ الـشَّيءُ، كَنَنْـتُ الـشَّيءَ كَنّـاً، وَالجَمْـعُ: أَكْنَـان، وَالكِنَـانُ: الْغِطَـاءُ وَالجَمْـعُ: أَكِنَّـة**)، (کِـنّ): هـەر شـوێنێك کـە شـتێکی تێـدا پەنهـان

دەکرێ، دەگوترێ: (**كَنَنْتُ الشَّيءَ كَنًّا**) واتە: ئەو شتەم پەنهانکرد، کۆی (**كِنْ**) یش (**أَكْنَان**)ە، وەك دەفەرموێ: ﴿مِّنَ ٱلْجِبَالِ أَكْنَٰنًا ﴿٨١﴾﴾ **النحل**، واتە: لە چیاکاندا کون و پەناگەمان ڕەخساندوون، بەڵام (**أَكِنَّة**) کۆی (**كِنَان**)ە، (**كِنَان**) بە مانای (**غِطَاء**) واتە: پەردە، یان کیف، یان هەر شتێك، شتێکی تێبکرێ، دێ.

(وَقْرٌ): (**الوَقْرُ: الثِّقَلُ فِي الأُذُنِ**)، قورساییەك کە لە گوێدا بێ، دیارە گوێ ئەگەر شتێکی قورسی تێبکرێ، نابیستێ، بەڵام (**الوِقْرُ: الحِمْلُ**)، (**وِقْر**): بە مانای بار دێ، بارێك کە هەڵدەگیرێ، بەڵام (**وَقْر**) بە مانای قورسایی دێ.

(حِجَابٌ): (**الحَجْبُ والحِجَابُ: المَنْعُ مِنَ الوُصُول**)، وشەی (**حَجْب، حِجَاب**): بریتیە لە ڕێگرتن لە گەیشتنی شتێك، واتە: پەردەو نێوان و سێوان.

(غَيْرُ مَمْنُونٍ): (**مَنّ**) بە مانای (**قَطْع**) دێ و بە مانای قورساییش دێ، ﴿غَيْرُ مَمْنُونٍ﴾ یانی: (**غَيْرُ مَعْدُودٍ**) واتە: نەژمێرراوە، یان (**غَيْرُ مَقْطُوعٍ**) نەبڕاوە، یان (**غَيْرُ مَنْقُوصٍ**) واتە: هیچ کەم و کوڕیی تێدانیە.

(أَندَادًا): (**أَنْدَاد جَمْعُ نِدٌّ، نِدُّ الشَّيءِ: مُشَارِكُهُ فِي جَوهَرِهِ، وَذَلِكَ ضَرْبٌ مِنَ المُمَاثَلَة**)، (**نِدّ**) بە (**أَنْدَاد**) کۆدەکرێتەوە، بریتیە لە هاوبەشی شتێك لە جەوهەرو چییەتیدا، دەگوترێ: (**هَذَا نِدُّ هَذَا**) واتە: ڕێك وەك ئەوە لە جەوهەرو چییەتیدا، کە دیارە بەشداری شتێك لە جەوهەرەکەیدا، جۆرێکە لە وێکچوون و وەك یەك بوون.

(رَوَاسِيَ): (**رَسَا الشَّيءُ يَرْسو رَسًا: أي ثَبَتَ، وَأَرْسَاهُ غَيْرُهُ: ثَبَّتَهُ، وَالرَّوَاسِي: أي الجِبَالُ الثَّابِتَات**)، (**رَسَا الشَّيءُ يَرْسو رَسًّا**) واتە: ئەو شتە چەسپا، دەچەسپێ، چەسپان، بەڵام (**أَرْسَاهُ**)، یانی: چەسپاندی (**ثَبَّتَهُ**)، (**رَوَاسِي**) واتە: چەسپاوەکان، کە بێگومان ئەوە سیفەتی وەسفکراو (موصوف)ێکی قرتێنراوە، یانی: (**الجِبَالُ الرَّوَاسِي**) واتە: چیایە چەسپاوەکان.

(وَبَـٰرَكَ فِيهَا): پیت و پێـزی تێخسـت، (الْبَرَكَـةُ: ثُبُـوتُ الْخَـيْرِ، وَالْمُبَـارَكُ مَـا فِيْـهِ ذَلِـكَ الْخَـيْر)، (بَرَكَـة): بریتیـە لـە چەسـپانی خێـرو چاکـە لـە شـتێکدا، (مُبَـارَك): ئەوەیـە کـە ئـەو خێـرو چاکەیـەی تێدابـێ، واتـە: بەرھەمـدار، بـە پێـز.

(أَقْوَٰتَهَا): (القُـوتُ: مَـا يُمْسِـكُ الرَّمَـق، قَاتَـهُ يَقُوتُـهُ قُوتـاً أَي: أَطْعَمَـهُ قُوتَـهُ، وَأَقَاتَـهُ يُقِيتَـهُ: جَعَـلَ لَـهُ مَـا يُقُوتُـهُ)، (أَقْـوَات) کـۆی (قُـوت)ە، (قُـوت): ھـەر شـتێکە کـە مـرۆڤ پێـی بـژی و پشـتی ڕابگـرێ، دەگوتـرێ: (قَاتَـهُ يَقُوتُـهُ قُوتـاً أَي: أَطْعَمَـهُ قُوتَـهُ) واتـە: بژیوەکـەی پێـدا، بـەڵام (أَقَاتَـهُ يُقِيتُـهُ) واتـە: بژیوەکـەی بـۆ دانـا، شـتێك کـە پێـی دەژی بـۆی تەرخانکـرد.

(ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ): ڕووی کـردە ئاسـمان، ویسـتی ئاسـمان بێنێتـە دی، (إِسْـتَوَى إِذَا عُـدِّيَ بِــ «إِلَى» اقْتَـضَى مَعْنَـى الإِنتِهَـاءِ إِلَيْـهِ) وشـەی (إِسْـتَوَى) ئەگـەر بـەرکار بـە ھـۆی (إِلَى)وە بخـوازێ، ئـەوە مانـای پێگەیشـتن دەگەیەنـێ، بـەڵام ئەگـەر بـە (عَـلَى) بـەرکار بخـوازێ (اسْـتَوى عَـلَى الْعَـرْش) ئـەوە مانـای بەرزبوونـەوە، یاخـود چوونـە سـەر، نیشـتەجێ بـوون لەسـەری دەگەیەنـێ.

(دُخَانٌ): (الدُّخَـانُ: الْعُثَـانُ الْمُسْـتَصْحَبُ لِلْهِيـبِ)، (دُخَـان): ئـەو دووکەڵەیـە کـە لەگـەڵ گـڕو بڵێسـەدایە، بـە کوردیـی ھـەر دەڵێیـن: دووکـەڵ.

(طَوْعًا): (الطَّوْعُ: الإِنْقِيَادُ وَيُضَادُّهُ: الْكُرْهُ)، (طَـوْع) واتـە: ملکەچیـی، ملکەچییەکی خۆشـحاڵانە، پێچەوانەکـەی بریتیـە لـە (كُـرْه) ناخۆشـحاڵیی، پێناخـۆش بوون.

(كَرْهًا): (قِيـلَ: الْكَـرْهُ وَالْكُـرْهُ وَاحِـدٌ، نَحْـو الضَّعْـف وَالضُّعْـف، وَقِيـلَ: الْكَـرْهُ: الْمَشَـقَّةُ الْخَارِجِيَّـةُ، وَالْكُـرْهُ: الْمَشَـقَّةُ الدَّاخِلِيَّـة)، ھەندێـك گوتوویانـە: (كَـرْهُ، كُـرْهُ) واتاکەیـان ھـەر یەکـە وەك (ضَعْـف، ضُعْـف) ھەردووکـی بـە مانـای بێھێزیـن، (كَـرْهُ، وكُرْهُ)یـش یانـی: ناخۆشـیی و پێناخـۆش بـوون، ھەندێکیـش گوتوویانـە: (كَـرْه): بریتیـە لـەو ناڕەحەتییەی تووشـی مـرۆڤ دێ، بـە ھـۆی ھۆکارێکـی دەرەکییـەوە، بـەڵام (كُـرْه): بریتیـە لـەو پێناخـۆش بوونـەی بـە ھـۆی ھۆکارێکـی نێوخۆییـەوە تووشـی مـرۆڤ دێ.

(فَقَضَىٰهُنَّ): تێکیپەڕانـدن، دروسـتیکردن (الْقَضَـاءُ: فَصْـلُ الأَمْـرِ قَـوْلاً ذَلِـكَ كَانَ أَوْ فِعْلاً)، (قَضَـاء): بریتیـە لـە تێکیپەڕاندنـی کارێـك، ئنجا بـە قسـە بـێ (قسـەکە بکـرێ)، یاخـود کارێـك بـێ ئەنجام بـدرێ.

(ٱلدُّنْيَا): (الأَقْـرَبُ، مُؤَنَّـثُ الأَدْنَى مِثْـلُ: الأَقْـصَى وَالْقُصْـوَى)، (دُنْيَـا) یانـی: (أَقْـرَب) نیزیکـتر، کـە مێینـەی مەجازیـی (أَدْنَى)یـە، (الأَدْنى) یانـی: نیزیکـتر، ئنجـا ئەگـەر حاڵەتـی مێینـەی لـێ بگـری دەڵێـی: (الدُّنْيَـا)، (الْحَيـاةُ الدُّنْيَـا) یانـی: ژیانـی نیزیکـتر لـە ئێمـە، (الآخِـرَة)ش بۆیـە وای پـێ دەگوتـرێ، لەبـەر ئـەوەی لـە دوایـی دێـت، وەك (أَقْصَى) واتـە: دوورتـر، (قُصْوَى) هـەر بـە مانـای دوورتـر، بـەڵام (أَقْصَى) بـۆ حاڵەتـی نێرینـەی مەجازییـە، (قُصْوَى) بـۆ حاڵەتـی مێینـەی مەجازییـە.

(بِمَصَٰبِيحَ): (مَصَابِيح جَمْعُ مِصْبَاح، وَهُـوَ الـسِّرَاجُ، وَالْمَقْصـودُ بِالْمَصَابيـح: الْكَوَاكِـبُ وَالنُّجُـوم)، (مِصْبَـاح) بـە (مَصَابِيـح) کۆدەکرێتـەوە واتـە: چـرا، کـە خـوا دەفەرمـوێ: ﴿وَزَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِمَصَٰبِيحَ﴾، واتـە: ئاسـمانی نیزیکـتر لـە ئێوەمـان بـە چرایـان ڕازاندۆتـەوە، مەبەسـت پێـی ئەسـتێرەکانن کـە تیشـك دەدەن.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خـوا ﷻ لـەم سـووڕەتەدا هـەروەك لـە پێناسـەکەیدا باسـمان کـرد، زۆر باسـی قورئـان دەکات، هەروەهـا هەڵوێسـتی بێبڕوایـەکان لـە بەرانبـەر قورئانـداو، چەنـد ڕاسـتییەکی دیکـەشی تێـدا خراونـەڕوو:

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾، بـە نـاوی خـوای بـە بەزەیـی بەخشـندە، یـانی: دەسـتپێکردنم بـە نـاوی خـوای بـە بەزەیـی بەخشـندەیە، یاخـود دەسـتپێدەکەم بـە نـاوی خـوای بـە بەزەیـی بەخشـندە، زۆر جـار ئەمەمـان گوتـوە، بـەڵام لێـرەش دووبـارەی دەکەینـەوە:

مادام خوا ﷻ سەدو چواردە (١١٤) جاران لە قورئانـدا فەرموویەتی: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾، ئـەوە دەهێنێ کـە ماناکەشی دووبـارە بکرێتـەوە، کاتێـك کـە مـرۆڤ دەڵـێ: بـە نـاوی خـوای بـە بەزەیـی بەخشـندە، دەبێ بەلایەنـی کەمـەوە چـوار واتایـان لـە عەقـڵ و دڵـی خۆیـدا ئامـادە بـکات:

١- بە ناوی خوا دەستپێدەکەم، نەك بە ناوی خۆم، یان هەر کەس و هەر شتێکی دیکە.

٢- ئەو کارە بۆ ڕازییکردنی خوا ئەنجام دەدەم.

٣- ئەو کارە بە پێی بەرنامەی خوا ئەنجام دەدەم.

٤- ئەو کارە بە یارمەتیی و هاوکاریی خوا ئەنجام دەدەم، نەك بە شان و شەوکەتی خۆم.

ئنجـا دەفەرمـوێ: ﴿حمٓ ۝١﴾، ئەمانـە دوو پیـتن، (حـا) و (میـم) پێشـتریش باسـمان کـردوە: حـەوت سـوورەت لـە قورئانـدا کـە پێیـان دەگوتـرێ: (حـەوا میـم) یـان خـاوەن حامیمـەکان (**ذوات حـم**)، هەموویـان بـە (**حـم**) دەسـت پـێ دەکـەن، ئەمـەش دووەمیـن سـوورەتەو، یەکـەم سـوورەتیان (**غافـر**) بـوو.

ئێمـە لـە سـەرەتای سـوورەتی (**البقـرة**)دا، باسـمان کـرد، بـەڵام بـە درێژتـر لـە سـەرەتای سـوورەتی (**یونـس**)دا، باسـی ئـەو (٢٩) سـوورەتەمان کـردوە، کـە بـەو پیتـە پچـڕ پچڕانـە دەسـتپێدەکەن، کـە تەنیـا دووانیـان مەدینەییـن و ئـەوانی دیکـە مەککەییـن، ئنجـا هەیانـە بـە پیتێـك دەسـت پـێ دەکات، وەك (**ص، ق، ن**)، هەشـیانە بـە دوو پیتـان دەسـت پـێ دەکات، وەك (**حـم**)، (**طـه**)، (**یـس**)، (**طـس**)، هەشـیانە بـە سێ پیتـان وەك (**آلم**)، (**آلـر**)، (**طسـم**)، هەشـیانە بـە چـوار پیتـان وەك (**المـر**)، (**المـص**)، هەشـیانە بـە پێنـج پیتـان وەك (**کهیعـص**)، لەوێـدا بـە درێژیـی باسـمان کـردوە، لێـرەدا باسـی ناکەینـەوە.

ئەوەنـدە هەیـە خـوا ﷻ ئـەو سـوورەتانەی بـەو پیتانـە دەسـتپێکردوون، کـە هەمـوو جـۆرە پیتەکانیـان تێـدان، زیاتـر مەبەسـت پێـی ئەوەیـە: ئـەی مرۆڤـەکان!

ئەی جند! ئەو قورئانەی لەبەر دەستی ئێوەدا هەیە، هەر لەو پیت و دەنگانە پێکهاتوە، کە ئێوە قسەیان پێدەکەن و، پێیان دەنووسن و، بەکاریان دێنن، واتە: کەرەستەکە لەبەر دەستی ئێوەشدا هەیە، ئنجا ئەگەر نەتانتوانی قورئانێکی وا بێنن، یاخود دە (١٠) سوورەت، یان تەنها سوورەتێك بێنن، کەواتە: دڵنیابن: خوا ﷻ ئەو قورئانەی هەر لەو کەرەستەیە هێناوەتە دی، کە لەبەر دەستی ئێوەشدا هەیەو، بزانن کە بێژەری ئەو فەرمایشتە (قورئان) تەنها خوا ﷻ خۆیەتی، نە موحەممەد ﷺ خاوەنیەتی و، نە هیچ کەسێك فێری کردوە، بەڵکو بێژەری ئەو فەرمایشتە بێ وێنەیە، تەنیا خوایە ﷻ.

هەروەك چۆن خوا ﷻ لە ماددەی بێ ژیان، ئەو هەموو جۆرە زیندەوەر و ژیاندارانە دروست دەکات، ئەو هەموو دروستکراوانەی ژیانیان هەیە، بەڵام ئێوە تەنها دەتوانن لەو ماددەیە کەل و پەلی بێ ژیان دروست بکەن، بە هەمان شێوەش خوا لەو پیت و دەنگانە، ئەو فەرمایشتەی هێناوەتە دی، کە ئێوە ناتوانن نەك وێنەی وەك قورئان، بەڵکو هی دە (١٠) سوورەتی، یاخود هی سوورەتێکی سێ ئایەتییش بێنن، کەواتە: بزانن ئەوە فەرمایشتی خوایە.

﴿ تَنزِيلٌ مِّنَ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾، دابەزێنراوە لەلایەن (خوای) بە بەزەیی بەخشندەوە، لێرەدا (**تَنزِيل**)، دەبێتە گوزارە (**خبر**) بۆ (**الرَّحْمَن الرَّحِيم**)، واتە: دەبێتە: (**هذا تَنزِيلٌ مِنَ الرَّحمانِ الرَّحِيم**)، یان هەمووی بەیەکەوە دەبێتە نیهاد (**مبتدأ**) بۆ دوای خۆی.

﴿ كِتَٰبٌ فُصِّلَتْ ءَايَٰتُهُۥ ﴾، کتێبێکە ئایەتەکانی ڕۆشن کراونەوە، واتە: کە دابەزێنراوە ئایەتەکانی بە ڕۆشنیی دابەزیون، نەك پێشێ ئایەتەکانی نارۆشن بووبن و، دوایی خوا ﷻ ڕوونی کردبنەوە، یانی: خوا ئایەتەکانی بە ڕۆشنیی دابەزاندوون، ﴿ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا ﴾، قورئانێکە بە زمانی عەرەبیی، ئنجا زمانی عەرەبیی ناوونیشانێکە بۆ زمانی گەلی عەرەب کە قسەی پێدەکەن، بەڵام وێڕای

ئـەوەش وشـەی عەڕەبیـی بـە مانـای ڕۆشـنیش دێ، دەگوتـرێ: (أَعْـرَبَ عَـنْ رَأْيـهِ) واتـە: ڕایەکـەی خـۆی دەرخسـت.

وەك لـە فەرمایشـتی پێغەمبـەر ﷺ هاتـوە: {وَالثَّيْـبُ تُعْـرِبُ عَـنْ نَفْسِـهَا}[1]، واتـە: ئافرەتـی بێـوەژن خـۆی قسـەی خـۆی دەکات، لەبـەر ئـەوەی تاڕاددەیـەك شـەرمی شـکاوە، خـۆی دەتوانـێ بڵـێ ڕازییـە، یاخـود ڕازیـی نیـە، بـەو پیـاوە، (تُعْـرِب) واتـە: ڕای خـۆی بـە ڕوونیـی ڕادەگەیەنـێ.

﴿ لِّقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ﴾، ئـەم قوڕئانـە بـۆ کۆمەڵێـك هاتـوە، کـە بزانـن، وەك پێشـینان دەڵێـن: (قـەدری زێـڕ لـە لای زێڕنگـەرە)، کەواتـە: کـێ لـەم قوڕئانـە بەهرەمەنـد دەبـێ؟ کەسـێك کـە زانـا بـێ و زانسـتی لـەلا بـێ، لـە ڕاسـتییدا مـرۆڤ بـە ئەنـدازەی ئـەوەی زانیاریـی لەلایـە، لـە قوڕئـان تـێ دەگات، ئـەو هەمـوو نهێنییانـەی لـە قوڕئاندا هـەن، ئـەو هەمـوو حیکمـەت و سـوودانەی لـە قوڕئانـدا هـەن، ئـەو هەمـوو نـوور و پیـت و بەرەکەتـەی لـە قوڕئانـدا هەیـە، بـۆ کەسـێك زیاتـر زانـراو دەبـێ، زانیاریـی زیاتـری لـەلا بـێ.

﴿ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗا ﴾، مـوژدەدەرەو ترسـێنەرە، یاخـود دڵخۆشـکەرو ورياکەرەوەیـە، بـۆ کـێ؟ بـۆ خەڵـك هاتـوە کـە موژدەیـان پێبـدات، ئەگـەر شـوێنی بکـەون و بـڕوای پـێ بێنـن، مـوژدەی خێـر و خۆشـیی دنیـاو سـەرفرازیی دواڕۆژیـان پێـدەدات، بـە پێچەوانەشـەوە: ئەوانـەی پشـتی تێدەکـەن، دەیانترسـێنێ و ورياـان دەکاتـەوە، کـە هـەم لـە دنیـادا تووشـی ناڕەحەتیـی و پەشـێمانیی دێـن، هـەم لـە ڕۆژی دواییشـدا تووشـی سـزاو ئـازاری خـوا ﷻ دێـن، ﴿ فَأَعۡرَضَ أَكۡثَرُهُمۡ فَهُمۡ لَا يَسۡمَعُونَ ﴾، زۆربەیـان پشـتیان هەڵکـرد، بۆیـە نابیسـتن، بـە زۆریـی وایـە کـە مـرۆڤ پشـتی لـە شـتێك کـرد، نایبیسـتێ، مەبەسـت لێـرەدا بێبڕوایەکانـی ڕۆژگاری پێغەمبـەرە ﷺ

---

(١) {عَـنْ عَـدِيِّ بْـنِ عَمِـيرَةَ الْكِنْـدِيِّ ﷺ، قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللـهِ ﷺ: الثَّيِّـبُ تُعْـرِبُ عَـنْ نَفْسِـهَا، وَالْبِكْـرُ رِضَاهَـا الصَّمْـتُ} أخرجـه ابـن ماجـه: ١٨٧٢، وأحمـد: ١٧٧٥٨، والطـبراني: ٢٦٤.

دەشـگونجێ مەبەسـت پێـی بـەس ئـەوان نەبێ، بەڵکـو کـۆی مرۆڤایەتیـی بێ، کـە لـە ڕاسـتییدا مرۆڤایەتیـی زۆربـەی پشـتی لـێ هەڵـدەکات و نابیسـتێ.

﴿ وَقَالُواْ قُلُوبُنَا فِيٓ أَكِنَّةٖ ﴾، کافرەکانـی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ گوتیان: دڵەکانی ئێمـە لـە کیفانـدان، پێشـتریش باسـمان کـرد، (**أَكِنَّة**) کـۆی (**كنان**)ە، واتـە: (**غطاء**)، پـەردە، یـانی: پـەردە پـۆش کـراون و لـە کیـف و تـوورەکان دان، ﴿ مِّمَّا تَدۡعُونَآ إِلَيۡهِ ﴾، لـە بەرانبـەر ئـەوەدا کـە ئێمـەی بـۆ بانـگ دەکـەی، دڵـمان لـە کیفدایـە، عەقڵـمان داخـراوە و، پـەردە پـۆش کـراوە، ﴿ وَفِيٓ ءَاذَانِنَا وَقۡرٞ ﴾، گوێیەکانیشـمان قورسـایی تێدایـە، ﴿ وَمِنۢ بَيۡنِنَا وَبَيۡنِكَ حِجَابٞ ﴾، لـە نێـوان ئێمـەو تـۆدا، پـەردەو نێـوان هەیە، دیـوار هەیـە، ئنجـا وەك زانایانـی ڕەوانبێژیـی دەڵێـن، لێـرەدا کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَمِنۢ بَيۡنِنَا وَبَيۡنِكَ حِجَابٞ ﴾، ئـەم (**مـن**) بریتیـە لـە (**مـن**)ی دەسـتپێکردن (**إبتدائیة**)، یـانی: هـەر لـە لای ئێمـەوە تاکـو دەگاتـە تـۆ، هەمـووی پـەردەو نێوانـە، واتـە: پـەردەو نێوانێکـی زۆر ئەسـتوور هەیـە، ﴿ فَٱعۡمَلۡ إِنَّنَا عَٰمِلُونَ ﴾، تـۆ کاری خـۆت بکـە، ئێمـەش ئەنجامـدەری ئەوەیـن کـە بـە باشـی دەزانیـن، واتـە: گوێـت بـۆ ناگریـن و، پەیامەکـەت لـێ وەرناگریـن.

خـوا ﷻ بـە پێغەمبـەر ﷺ دەفەرمـوێ: ﴿ قُلۡ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٞ مِّثۡلُكُمۡ ﴾، تـۆ بڵـێ: مـن تەنیـا مرۆڤێکـم وەك ئێـوە، واتـە: لـەو ڕووەوەی کـە مرۆڤـم، منیـش وەك ئێـوەم، ﴿ يُوحَىٰٓ إِلَيَّ ﴾، سروشـم بـۆ لا دەکـرێ و، پەیامـم بـۆ لا دەنێـردرێ، ﴿ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمۡ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞ ﴾، کـە پەرسـتراوی ئێـوە یـەك پەرسـتراوە، واتـە: جیاوازییەکـەم لەگـەڵ ئێـوە هـەر ئەوەیـە، کـە مـن وەحییـم بـۆ دێ و، خـوای پـەروەردگار بـە شـێوەی پەنامەکیـی دەمدوێنـێ و سروشـم بـۆ دەکات، ئەگەرنـا مـن لافـی هیـچ ئیمتیازێـك بەسـەر ئێـوەدا لێنـادەم، بڵێـم مـن فریشـتەم، یـان مـن لـە ئێـوە چاکـترم یـان ... هتـد، بـەڵام مـن ڕەوانەکـراوی خـوام، خـوا ﷻ سروشـم بـۆ دەکات، نێوەڕۆکـی ئـەو سروش و پەیامـەش ئەوەیـە کـە پەرسـتراوی ئێـوە یـەك پەرسـتراوە، ﴿ فَٱسۡتَقِيمُوٓاْ إِلَيۡهِ ﴾، ئنجـا بـەرەو لای وی خۆتـان ڕاسـت بکـەن، ﴿ وَٱسۡتَغۡفِرُوهُ ﴾، هەروەهـا

داوای لێبوردنی لێبکەن، ﴿ وَوَيْلٌ لِّلْمُشْرِكِينَ ﴾، هاواریش، یاخود سزای سەختیش بۆ هاوبەشدانەران.

﴿ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ ﴾، ئەوانەی زەکات نادەن، واتە: لە ماڵی خۆیان نابەخشن بە هەژارو نەداران، ئەوە واتایەکی، واتایەکی دیکەی، واتە: خۆیان پاك و چاك ناکەن، خۆیان تەزکیە ناکەن، ﴿ وَهُم بِٱلْءَاخِرَةِ هُمْ كَٰفِرُونَ ﴾، ئەوانیش بەرانبەر بە ڕۆژی دوایی بێبڕوان.

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی بڕوایان هێناوە، بە هەموو ئەو شتانەی پێویستە بڕوایان پێ بهێنرێ، ﴿ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴾، کردەوە چاکەکانیشیان ئەنجام داون، چ پەیوەندییان بە دڵ و دەروونیانەوە هەبێ و، چ پەیوەندییان بە دەرو زمانیانەوە هەبێ، چ پەیوەندییان بە کردەوەی ئەندامەکانیانەوە هەبێ، کردەوە باشەکانیان ئەنجام داون بە دڵ و زمان و لاشەیان، ﴿ لَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ ﴾، ئەوانە پاداشتێکی نەبڕاوەیان بۆ هەیە، یاخود پاداشتێکی بێ کۆتایی، یاخود پاداشتێکی بێ کەم و کوڕیی.

ئنجا خوا ﷻ لە دوای بابەتی یەکەم، کە پەیوەندیی بە قورئانەوە هەبوو، دێتە سەر بابەتی دووەم کە دروستکردنی گەردوونە، دەفەرموێ:

﴿ قُلْ أَئِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ بِٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْأَرْضَ فِى يَوْمَيْنِ ﴾، (ئەی موحەممەد ﷺ!) بڵێ: ئایا ئێوە بێبڕوا دەبن بەوەی کە زەوی لە ماوەی دوو ڕۆژاندا هێناوەتە دی؟! واتە: بە دوو قۆناغ زەوی دروستکردوە، ﴿ وَتَجْعَلُونَ لَهُۥٓ أَندَادًا ﴾، ئایا هاوتایانی بۆ دادەنێن؟! ﴿ ذَٰلِكَ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، ئا ئەوە پەروەردگاری جیهانییانە، واتە: ئەو شایستەی ئەوە نیە کەسی دیکە، وەك وی تەماشا بکەن و، بیکەن بە هاوتای، خوا زەوی بە دوو قۆناغان هێناوەتە دی.

ئنجا باسی پێکهاتەکانی زەوی دەکات، باسی گرنگترین پێکهاتەکانی دەکات کە چیایەکان و، پیت و پێز تێدا دانران و، بژیو تێدا دانرانیەتی: ﴿ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَٰسِىَ

﴿مِن فَوْقِهَا﴾، هەروەها چیایە چەسپاوەکانی لە سەرووی داناون، ﴿وَبَٰرَكَ فِيهَا﴾، پیت و پێزی خستۆتە نێو زەوی، ﴿وَقَدَّرَ فِيهَآ أَقْوَٰتَهَا﴾، هەروەها بژیوەکانی تێدا ئەندازەگیری کردوون، هەموو ئەمانە لە ماوەی چەند ڕۆژدا؟ ﴿فِىٓ أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ﴾، لە ماوەی چوار ڕۆژاندا، واتە: بە چوار قۆناغ، ﴿سَوَآءً لِّلسَّآئِلِينَ﴾، ئەو پیت و پێزەی تێیدا دایناوە، ئەو بژیوەی تێیدا هێناویەتە دی، ڕێك پڕ بە پێستە لەگەڵ داوای داواکاراندا، واتە: پێویستییەکانی هەموو ئەو خەڵکەی کە بە زمانی حاڵ داوا لە خوا دەکەن، هەموو ئەو پێویستییانەی تێدا داناون.

لێرەدا مەبەست لەوە نیە کە خوا ﷻ بە دوو ڕۆژان زەوی دروست کردبێ و، هەروەها بە چوار ڕۆژانیش پێکهاتەکانی، بەڵکو مەبەست پێی ئەوەیە کە خوا ﷻ بە دوو قۆناغ زەوی هێناوەتە دی، دواتر بە دوو قۆناغ پێکهاتەکانی دروستکردوون، کەواتە: هەمووی بە یەکەوە دەکاتە چوار قۆناغ، دوو کۆ دوو دەکاتە چوار (٢+٢= ٤)، واتە: زەوی پێکهاتەکانی لە ماوەی چوار ڕۆژاندا هاتوونە دی.

زانایان لەوەدا گوتوویانە: وەك تۆ بڵێی: بە دوو سەعاتان لە هەولێرەوە چوومە سلێمانی، دوایی بە چوار سەعاتان چوومە کەلار، واتە: لەگەڵ ئەو دوو سەعاتەش کە لە هەولێرەوە پێی چووی بۆ سلێمانی، نەك بە چوار سەعاتان لە سلێمانیەوە چووبی بۆ کەلار، یانی: کۆی گشتیی دەکات چوار سەعات، لە هەولێرەوە بۆ سلێمانی دوو سەعات، لە سلێمانیشەوە بۆ کەلار دوو سەعات.

کەواتە: لێرەدا خوا ﷻ کە دەفەرموێ: چیایەکانمان تێدا دانان و، پیت و پێزمان تێخست و، بژیوەکانمان تێدا دانان، لە ماوەی چوار ڕۆژاندا، واتە: بەو دوو قۆناغەش کە زەوی تێدا هێناونە دی، بە هەموویانەوە چوار قۆناغ، بۆیەش لێرەدا ئەوە باس دەکەین، چونکە دواتر خوا ﷻ باسی دروستبوونی ئاسمانیش دەکات بە دوو ڕۆژان، کەواتە: ئەگەر لێرەدا ئاوا لێکبدرێتەوە: دروستکردنی زەوی بە دوو ڕۆژ، دواتر دروستکردنی پێکهاتەکانی بە چوار ڕۆژ، دروستکردنی ئاسمانیش

بـە دوو ڕۆژ، کەواتـە: بەپێـی ئـەو لێکدانـەوە بـێ هەمـووی دەکاتـە هەشـت ڕۆژ، کـە ئەمـەش لێکدانەوەیەکـی هەڵەیـە، چونکـە ئەگـەر دیقـەت بدەیـن خـوا ﷻ لـە هەمـوو قورئانـدا لـە باسـی دروسـتکردنی زەوی و ئاسـمانەکاندا، باسـی شـەش ڕۆژ دەکات، نـەك هەشـت ڕۆژ!.

﴿ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِيَ دُخَانٞ ﴾، دوایـی خـوا ﷻ ڕووی کـردە ئاسـمان لـە کاتێکـدا کـە دوو کـەڵ بـوو، واتـە: لـە شـێوەی دووکـەڵ و گازێکـدا بـوو، ڕووی تێکـرد تاکـو دروسـتی بـکات، ﴿ فَقَالَ لَهَا وَلِلۡأَرۡضِ ٱئۡتِيَا طَوۡعًا أَوۡ كَرۡهٗا ﴾، خـوا بـە وانـی فەرمـوو: (واتـە: بـە ئاسـمان و بـە زەوی): وەرن بـە پێخـۆش بـوون و پێناخـۆش بـوون، ﴿ قَالَتَآ أَتَيۡنَا طَآئِعِينَ ﴾، گوتیـان: ئێمـە بـە پێخـۆش بـوون و بـە ملکەچییـەوە هاتیـن، واتـە: دروسـت بوویـن.

﴿ فَقَضَىٰهُنَّ سَبۡعَ سَمَٰوَاتٖ ﴾، ئنجـا خـوا ﷻ حـەوت ئاسـمانی هێنانـە دی، ﴿ فِي يَوۡمَيۡنِ ﴾، لـە دوو ڕۆژانـدا، واتـە: بـە دوو قۆنـاغ، کەواتـە: هەمـوو زەوی بـە چـوار قۆنـاغ و، ئاسـمانیش بـە دوو قۆنـاغ هاتوونـە دی، ﴿ وَأَوۡحَىٰ فِي كُلِّ سَمَآءٍ أَمۡرَهَا ﴾، هەروەهـا لـە هـەر ئاسـمانێکدا فەرمانەکـەی تێـدا دانـا، واتـە: سروشـیکرد لـە هـەر ئاسـمانێکدا کاری ئـەو ئاسـمانە چییـە، ﴿ وَزَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنۡيَا بِمَصَٰبِيحَ ﴾، ئاسـمانی نیزیـك لـە ئێوەشـمان بـە چرایـان ڕازانـدەوە، واتـە: بـە ئەسـتێرەکان، ﴿ وَحِفۡظٗا ﴾، هەروەهـا بـۆ پاراسـتنی ئاسـمانەکان، لـەوەی کـە شـەیتانەکان گـوێ بگـرن، بـۆ قسـەی فریشـتەکان، پریشـك و بڵێسـەی ئەسـتێرەکان بـۆ ئـەوەش بـە کاردێ، هـەروەك لـە شـوێنەکانی دیکـە بـە ڕوونیـی باسـکراوە، ﴿ ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ ﴾، ئـەوەش ئەندازەگیریـی خـوای باڵادەسـتی زانایـە.

هەڵبەتـە لێـرەدا خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: دوایـی ویسـتی ئاسـمان دروسـت بـکات کـە دووکـەڵ بـوو، دوایـی بـە ئاسـمان و زەوی فەرمـوو: وەرن بـە پێخۆشـبوون و پێناخـۆش بوونـەوە، واتـە: خـوا ویسـتی بیانهێنێتـە دی و، ویسـتی خـۆی ئاراسـتە کـردن، ئەوانیش

گوتیان: ئەوە هاتین بە ملکەچیی و پێخۆشبوونەوە، واتە: دروستبووین، لێرەدا ئەمە وێنا کردنە بەوەی کە خوا کاتێك ویستی گەردوون بخوڵقێنێ، بە ئاسانترین شێوە کە ئێمە لە مێشکماندا تێیدەگەین، هاتۆتە دی.

لێرەدا پێشتر باسی دروستبوونی زەوی دەکات، دواتر باسی دروست بوونی ئاسمان دەکات، بە دڵنیاییی زەوی ئێمە شتێکی بچووکە لە نێو گەردوون دا، زەوی یەکێکە لە نۆ خڕۆکەکەی کۆمەڵەی خۆر، خۆر ملیۆنێك و سێسەد هەزار (١,٣٠٠,٠٠٠) جار هێندەی زەوییە، هەروەها هەندێك لە خڕۆکەکانی کۆمەڵەی خۆر، زۆر لە زەوی گەورەترن، خۆریش خۆی یەکێکە لەو یەك تریلیۆن (واتە: یەك هەزار ملیار) ئەستێرەیەی کە لە کەهکەشانی کاکێشاندا هەن، زانایان دەڵێن: یەك تریلیۆن کەهکەشان مەزەندە کراوە لە هەموو گەردوون دا، ئەوەش هەمووی لە سنووری ئاسمانی یەکەمە! کەواتە: زەوی ئێمە زۆر بچووکە، بەڵام لەبەر ئەوەی بە نسبەت ئێمەوە، زەوی زۆر گرنگە، خوا ﷻ دروستکردنی زەوی پێشخستوە، دوایی باسی دروستکردنی گەردوونی کردوە، ئەگەرنا پێشێ گەردوون بە دوو قۆناغ دروستکراوە، دوایی زەوی بە دوو قۆناغ دروستکراوەو، بە دوو قۆناغی دیکە وای لێکراوە، کە بە کەڵکی ژیانی مرۆڤ بێت لەسەری.

## هۆی هاتنەخوارەوەی ئایەتەکان

لـە بـارەی هـۆکاری هاتنـە خـواری ئـەم چەنـد ئایەتـەی سـەرەتای ئـەم سـوورەتەوە، (القرطبـي) لـە (الجامـع لأحـكام القـرآن)دا[1]، دوو بەسـەرهات بـاس دەکات، بـەڵام نـەك بـەو واتایـەی ئایەتـەکان بـەو بۆنەیـە هاتبنـە خـوار، بەڵکو پێغەمبـەر ﷺ لـە ڕووداوێکدا ئـەم چەنـد ئایەتـە دەخوێنێتـەوە، بەسـەر نوێنـەری قورەیشـییەکاندا: عوتبـەی کـوڕی ڕەبیعـە، هـەر بۆیـەش ئێمـە کاتـی خـۆی لـە هـۆی هاتنـە خوارەوەکەیـدا نەمـان هێنان، بـەڵام ئێسـتا بـەر لـەوەی بچینـە سـەر مەسـەلە گرنگـەکان، بـۆ تیشـك خسـتنە سـەر نێوەڕۆکـی ئـەو دوازدە ئایەتـە موبارەکـە، باسـیان دەکەیـن:

١)- (القرطبي) دەڵێ: (وَرُوِيَ أَنَّ الرَّيَّانَ بْنَ حَرْمَلَةَ قَالَ: قَالَ الْمَلأُ مِنْ قُرَيْشٍ وَأَبُو جَهْلٍ: قَدِ الْتَبَسَ عَلَيْنَا أَمْرُ مُحَمَّدٍ، فَلَوِ الْتَمَسْتُمْ رَجُلًا عَالِماً بِالشِّعْرِ وَالْكِهَانَةِ وَالسِّحْرِ فَكَلَّمَهُ ثُمَّ آتَانَا بِبَيَانٍ مِنْ أَمْرِهِ، فقال عتبة ابن رَبِيعَةَ: وَاللَّهِ لَقَدْ سَمِعْتُ الْكِهَانَةَ وَالشِّعْرَ وَالسِّحْرَ، وَعَلِمْتُ مِنْ ذَلِكَ عِلْمًا لَا يَخْفَى عَلَيَّ إِنْ كَانَ كَذَلِكَ. فَقَالُوا: إِيْتِهِ فَحَدِّثْهُ. فَأَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ لَهُ: يَا مُحَمَّدُ! أَنْتَ خَيْرٌ أَمْ قُصَيُّ بْنُ كِلَابٍ؟ أَنْتَ خَيْرٌ أَمْ هَاشِمٌ؟ أَنْتَ خَيْرٌ أَمْ عَبْدُ الْمُطَّلِبِ؟ أَنْتَ خَيْرٌ أَمْ عَبْدُ اللَّه؟ فَبِمَ تَشْتُمُ آلِهَتَنَا، وَتُضَلِّلُ آبَاءَنَا، وَتُسَفِّهُ أَحْلَامَنَا، وَتَذُمُّ دِينَنَا؟ فَإِنْ كُنْتَ إِنَّمَا تُرِيدُ الرِّيَاسَةَ، عَقَدْنَا إِلَيْكَ أَلْوِيَتَنَا فَكُنْتَ رَئِيسَنَا مَا بَقِيتَ، وَإِنْ كُنْتَ تُرِيدُ الْبَاءَةَ، زَوَّجْنَاكَ عَشْرَ نِسَاءٍ مِنْ أَيِّ بَنَاتِ قُرَيْشٍ شِئْتَ، وَإِنْ كُنْتَ تُرِيدُ الْمَالَ، جَمَعْنَا لَكَ مَا تَسْتَغْنِي بِهِ أَنْتَ وَعَقِبُكَ مِنْ بَعْدِكَ، وَإِنْ كَانَ هَذَا الَّذِي يَأْتِيكَ رِئْيَاً مِنَ الْجِنِّ، قَدْ غَلَبَ عَلَيْكَ، بَذَلْنَا لَكَ أَمْوَالَنَا فِي طَلَبِ مَا تَتَدَاوَى بِهِ أَوْ نُغْلَبُ فِيكَ. وَالنَّبِيُّ ﷺ سَاكِتٌ، فَلَمَّا فَرَغَ قَالَ: «قَدْ فَرَغْتَ يَا أَبَا الْوَلِيدِ» قَالَ: نَعَم. (قَالَ: فَاسْمَع مِنِّي)، قَالَ: يَا ابْن أَخِي أَسْمَعُ. قَالَ: «بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ. حم. تَنْزِيلٌ مِنَ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ. كِتابٌ فُصِّلَتْ آياتُهُ قُرْآناً عَرَبِيّاً لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ» إلى قَوْلِ:» فَإِنْ أَعْرَضُوا فَقُلْ

---

(١) ج١٥، ص(٢٧١ - ٢٧٢)،

أَنْذَرْتُكُمْ صاعِقَةً مِثْلَ صاعِقَةِ عادٍ وَثَمُودَ»[1]، فَوَثَبَ عُتْبَةُ وَوَضَعَ يَدَهُ عَلَى فَمِ النَّبِيِّ ﷺ، وَنَاشَدَهُ اللَّهَ وَالرَّحِمَ لَيَسْكُتَنَّ، وَرَجَعَ إِلَى أَهْلِهِ وَلَمْ يَخْرُجْ إِلَى قُرَيْشٍ فَجَاءَهُ أَبُو جَهْلٍ، فَقَالَ: صَبَوْتَ إِلَى مُحَمَّدٍ؟ أَمْ أَعْجَبَكَ طَعَامُهُ؟ فَغَضِبَ عُتْبَةُ وَأَقْسَمَ أَلَّا يُكَلِّمَ مُحَمَّداً أَبَداً، ثُمَّ قَالَ: وَاللَّهِ لَقَدْ تَعْلَمُونَ أَنِّي مِنْ أَكْثَرِ قُرَيْشٍ مَالًا، وَلَكِنِّي لَمَّا قَصَصْتُ عَلَيْهِ الْقِصَّةَ أَجَابَنِي بِشَيْءٍ وَاللَّهِ مَا هُوَ بِشِعْرٍ، وَلَا كِهَانَةٍ، وَلَا سِحْرٍ، ثُمَّ تَلَا عَلَيْهِمْ مَا سَمِعَ مِنْهُ إِلَى قَوْلِهِ: (مِثْلَ صاعِقَةِ عادٍ وَثَمُودَ)[2]، وَأَمْسَكْتُ بِفِيهِ وَنَاشَدْتُهُ بِالرَّحِمِ أَنْ يَكُفَّ، وَقَدْ عَلِمْتُمْ أَنَّ مُحَمَّداً، إِذَا قَالَ شَيْئاً لَمْ يَكْذِبْ، فَوَاللَّهِ لَقَدْ خِفْتُ أَنْ يَنْزِلَ بِكُمُ الْعَذَابُ، يَعْنِي: الصَّاعِقَةَ) (أخرجه الحاكم: ٣٠٠٢، موصولاً، وقال الهيثمي في المجمع الزوائد: ج٦، ص٢٠، رواه أبو يعلى).

واتە: ڕەبیانی کوڕی حەرمەلە دەڵێ: گەورە گەورەکانی قوڕەیش، لە نێویاندا ئەبوو جەهل، ڕۆژێك کۆبوونەوەو، گوتیان: کاری موحەممەد ﷺ لە ئێمە تێکەڵ بووە، ئەگەر پیاوێکی شارەزا بە شیعرو کەهانەو جادوو بدۆزنەوە، قسەی لەگەڵ بکاو، دوایی بێتەوە بۆ لامان و کارەکەی بۆ ئێمە ڕوون بکاتەوە، عوتبەی کوڕی ڕەبیعە گوتی: من گوێم لە قسەی کەهانەو کاهینان بووە، هەروەها شیعریشم زۆر بیستوەو، جادووشم زۆر بیستوە (واتە: لێیان دەزانم)، لەو بارەوە شتێك دەزانم کە هیچ شتێکی کەهانەو جادوو و شیعر، لە من شێردراوە نیە، ئەگەر ئەوەی موحەممەد یەکێك لەو سێیانە بێ، (واتە: کاهین بێ، یان شاعیر بێ، یان جادووگەر بێ).

گوتیان: بچۆ بۆ لای بیدوێنە، ئەویش هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺو گوتی: ئەی موحەممەد! ئایا تۆ باشتری، یان قوصەی کوڕی کیلاب؟ (باپیرە گەورەی قوڕەیش)، ئایا تۆ گەورەتری یاخود هاشیم؟ (باپیرە گەورەی بەنی هاشیم)، ئایا تۆ گەورەتری یان عەبدولموتەللیب؟ (باپیری پێغەمبەر ﷺ)، ئایا تۆ گەورەتری یان عەبدوڵڵا؟ (بابی پێغەمبەر ﷺ، مەبەستی ئەوە بووە ئەوانە لەسەر ئەو ئایینە

---

(١) فصلت: ١٣.

(٢) فصلت: ١٣.

بوون کە ئێمە لەسەری دەڕۆین، کە بریتیە لە بتپەرستیی!)، کەواتە: بۆچی قسە بە پەرستراوەکانمان دەڵێی؟ باب و باپیرانمان بە گومڕا دەزانی؟ عەقڵەکانی ئێمە بە سووك دەزانی؟ هەروەها ئایین و بەرنامەکەمان بە سووك دەزانی و ڕەخنەی لێ دەگری؟ ئەگەر تۆ سەرۆکایەتییت دەوێ، ئێمە ئاڵاکانمانت بۆ دەبەستین، تاکو بمێنی سەرۆکمان بە، ئەگەر ئارەزووی جینسییت هەیە، دە ژنانت بۆ دێنین، لە کچانی قورەیش، هەر کەسێك تۆ بتەوێ، ئەگەر ماڵ و سامانت دەوێ، هێندەت ماڵ و سامان بۆ کۆ دەکەینەوە، کە خۆت و وەچەکەشت پێی دەوڵەمەندو بێ نیاز بن، ئەگەر ئەوانەشت نیە، بەڵکو شەیتانێك لە جندان دێ بۆ لات و، بەسەرتدا زاڵ بووە، ئێمە ماڵ و سامانی خۆمانت بۆ سەرف دەکەین، تاکو چاکت دەکەینەوە، یاخود ئیعلانی دەکەین کە بۆمان چاك نابیەوەو، لە چاککردنەوەی تۆدا تێك دەشکێین!

پێغەمبەریش ﷺ بێ دەنگ بوو، تاکو ئەو قسەکانی دەکردن، کە لە قسەکانی بۆوە، فەرمووی: ئەبوو وەلید تەواو بووی؟ گوتی: بەڵێ، فەرمووی: گوێ بگرە! گوتی: ئەی برازام گوێ دەگرم، پێغەمبەریش ﷺ ئەو دوازدە ئایەتەی سەرەتای سووڕەتی (فصلت)ی هەموو بەسەردا خوێندنەوە، هەتا گەیشتە ئەو ئایەتە: ﴿ فَإِنْ أَعْرَضُوا۟ فَقُلْ أَنذَرْتُكُمْ صَـٰعِقَةً مِّثْلَ صَـٰعِقَةِ عَادٍ وَثَمُودَ ﴿١٣﴾ ﴾، واتە: ئەگەر هەر پشتیان هەڵکرد، بڵێ: دەتانترسێنم لە هاڕژن و چریکەیەك کە ئاگری لەگەڵدابێ، وەك ئەوەی گەلی عادو سەموودی پێ فەوتان.

کە گەیشتە ئەوێ، عوتبە یەکسەر هەڵبەزیەوەو دەستی لەسەر زاری پێغەمبەر ﷺ داناو، خوا و خزمایەتیی بە گژدا کردن، کە بێدەنگ بێ، (گوتی: لەبەر خاتری خواو لەبەر خاتری خزمایەتیی بێ دەنگبە، پێغەمبەریش ﷺ ئەوەی دیکەی نەخوێندو داوایەکەی گرتەوە)، عوتبەی کوڕی ڕەبیعەش گەڕایەوە بۆ ماڵی خۆی و، نەچۆوە بۆ لای سەرانی قورەیش، ئەبوو جەهل هات بۆ لای و، گوتی: ئایا هەڵگەڕاویەوە بۆ لای موحەممەد؟ یاخود بە خواردنەکەی سەرسام بووی؟ عوتبە

تووڕە بوو، سوێندی خوارد، کە هەرگیز قسە لەگەڵ موحەممەددا نەکاتەوە، دوایی گوتی: بە خوا دەزانن کە من لە هەموو قورەیش دەوڵەمەندترم، بەڵام ئەو قسەیەی کە بڕیار بوو بۆی بکەم، دوای ئەوەی بۆم کرد، وەڵامی دامەوە بە شتێك کە نە شیعرو نە کەهانەو، نە جادوو بوو، دوایی ئەوەی کە لە پێغەمبەری ﷺ بیستبوو، {دیارە هەر یەکسەر لەبەری کردوە، ئەو کاتە ئەوان لەبەر ئەوەی زیاتر پشتیان بە لەبەرکردن بەستوە، دەرخ و لەبەرکردنیان زۆر بەهێز بووە}، هەمووی بۆ خوێندەوە، تاکو دەگاتە ئەو شوێنە: ﴿ فَإِنْ أَعْرَضُوا فَقُلْ أَنذَرْتُكُمْ صَاعِقَةً مِّثْلَ صَاعِقَةِ عَادٍ وَثَمُودَ ﴿١٣﴾ ﴾، عوتبە گوتی: (موحەممەد ﷺ) ئەوەی خوێندەوە، منیش زارم گرت و، داوام لێکرد بە خزمایەتیی کە بێدەنگ بێ و چیدیکە نەخوێنێتەوە، چونکە خۆتان دەزانن کە موحەممەد، ئەگەر شتێك بڵێ، درۆ ناکات! بە خوا ترسام ئەو سزایە کە هەڕەشەتان پێ لێ دەکات، یەکسەر دابەزێتە سەرتان، {بۆیە گوتم: با ئەو قسەیەی دیکەی تەواو نەکات}.

٢)- (وَقَدْ رَوَى هَذَا الْخَبَرَ أَبُو بَكْرٍ الْأَنْبَارِيُّ فِي كِتَابِ الرَّدِّ لَهُ عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ كَعْبٍ الْقُرَظِيِّ، وَأَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَرَأَ: «حم. فُصِّلَتْ» حَتَّى انْتَهَى إِلَى السَّجْدَةِ فَسَجَدَ وَعُتْبَةُ مُصْغٍ يَسْتَمِعُ، قَدِ اعْتَمَدَ عَلَى يَدَيْهِ مِنْ وَرَاءِ ظَهْرِهِ. فَلَمَّا قَطَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْقِرَاءَةَ قَالَ لَهُ: «يَا أَبَا الْوَلِيدِ قَدْ سَمِعْتَ الَّذِي قَرَأْتُ عَلَيْكَ فَأَنْتَ وَذَاكَ»، فَانْصَرَفَ عُتْبَةُ إِلَى قُرَيْشٍ فِي نَادِيهَا فَقَالُوا: وَاللَّهِ لَقَدْ جَاءَكُمْ أَبُو الْوَلِيدِ بِغَيْرِ الْوَجْهِ الَّذِي مَضَى بِهِ مِنْ عِنْدِكُمْ. ثُمَّ قَالُوا: مَا وَرَاءَكَ أَبَا الْوَلِيدِ؟ قَالَ: وَاللَّهِ لَقَدْ سَمِعْتُ كَلَامَاً مِنْ مُحَمَّدٍ، مَا سَمِعْتُ مِثْلَهُ قَطُّ، وَاللَّهِ مَا هُوَ بِالشِّعْرِ، وَلَا بِالْكِهَانَةِ، فَأَطِيعُونِي فِي هَذِهِ وَأَنْزِلُوهَا بِي، خَلُّوا مُحَمَّدَاً وَشَأْنَهُ وَاعْتَزِلُوهُ، فَوَاللَّهِ لَيَكُونَنَّ لِمَا سَمِعْتُ مِنْ كَلَامِهِ نَبَأٌ، فَإِنْ أَصَابَتْهُ الْعَرَبُ كُفِيتُمُوهُ بِأَيْدِي غَيْرِكُمْ، وَإِنْ كَانَ مَلِكَاً أَوْ نَبِيَّاً كُنْتُمْ أَسْعَدَ النَّاسِ بِهِ، لِأَنَّ مُلْكَهُ مُلْكُكُمْ وَشَرَفَهُ شَرَفُكُمْ. فَقَالُوا: هَيْهَاتَ سَحَرَكَ مُحَمَّدٌ يَا أَبَا الْوَلِيدِ! وَقَالَ: هَذَا رَأْيِي لَكُمْ فَاصْنَعُوا مَا شِئْتُمْ). (الجامع لأحكام القرآن: ج١٥، ص٢٧١ و ٢٧٢).

واتە: ئەم هەواڵە ئەبوو بەکری ئەنباریی لە کتێبی: (**الرَّدُّ عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ كَعْبٍ الْقُرَظِيِّ**)دا بەم شێوەیە هێناویەتی، کە پێغەمبەر ﷺ حا میمی (**فصلت**)ی بەسەردا

خوێندۆتـەوە، تاکـو گەیشـتۆتە شـوێنی سـەجدە، ئیـدی پێغەمبەر ﷺ سـەجدەی بـردوە، عوتبـەش هـەر گوێـی گرتـوە (گوێـی هەڵخسـتوە)و دەسـتەکانی لـە پشـتیەوە داداون، کاتێـك پێغەمبـەر ﷺ خوێندنەوەکـەی تـەواو کـردوە، فەرموویەتـی: ئـەی ئەبـوو وەلیـد! ئـەوەی بـۆم خوێندیـەوە بیسـتت؟ ئیـدی خـۆت سەرپشـك بـە (ئـەوە وەڵامەکەیەتـی،) عوتبـەش دەچێتـەوە بـۆ لای قورەیـش، کـە لـە کـۆڕو مەجلیسـی خۆیانـدا دانیشـتوون، قورەیشـییەکان دەڵێـن: بـە خـوا ئەبـوو وەلیـد (واتـە: عوتبـەی کـوڕی ڕەبیعـە) بـە ڕووێکـەوە هاتۆتـەوە بـۆ لاتـان، جگـە لـەو ڕووەی کـە پێـی چـوو بـووە لای موحەممـەد ﷺ (واتـە: ڕووی و دەم و چـاوی گـۆڕاوە)، دوایـی گوتیـان: ئەبـوو وەلیـد چیـت پێیـە؟ (چ هەواڵێکـت پێیـە؟) ئەویـش گوتـی: بـە خـوا قسـەیەکم لـە موحەممـەد بیسـت، کـە هەرگیـز شـتی وام نەبیسـتوە! بـە خـوا ئـەوە نەشیعرەو، نـە کەهانەیـە، جـا بـە قسـەی مـن بکـەن و، ئـەوە بخەنـە سـەر ئەسـتۆی مـن، لـە موحەممـەدو لـە کارەکـەی بگەڕێـن و، لێـی کەنـار بگـرن، بـە خـوا ئـەو قسـەیەی من لێـم بیسـت، هەواڵێکـی مەزنـی دەبێ، ئنجـا ئەگـەر عەرەبـەکان زەبریـان لێـداو لـە نێویـان بـرد، ئـەوە ئێـوە بـە دەسـتی غەیری خۆتـان ئـەو کابرایەتـان لـە کـۆڵ بۆتـەوە، بـەڵام ئەگەر بـوو بە حوکمـڕان، یـان پێغەمبەر بـێ، ئـەوە ئێـوە بەختەوەرتریـن کـەس دەبـن بـە موحەممـەد، چونکـە حوکمڕانییەکـەی حوکمڕانیـی ئێـوە دەبـێ و، بەرزییەکـەی بـەرزی ئێـوە دەبـێ، ئەوانیـش گوتیـان: ئـەوە زۆر دوورە! ئـەی ئەبـوو وەلیـد! موحەممـەد جـادووی لێکـردووی، ئەویـش گوتـی: ئـەوە بۆچوونـی منـە، خۆتـان چیتـان پـێ چاکـە ئـەوە بکـەن.

دەڵێـم: بـە تەئکیـد ئەگـەر بـە قسـەیان کردبایـە، زۆر قازانجیـان دەکـرد، بـەڵام ئەو زلەزلانـەی قورەیـش تەمـاع و بەرژەوەندیـی ناشـەرعیی، کـە بەسـەریەکەوەیان نابـوو، ڕێـی لێگرتـن لـەوەی بـە قسـەی عوتبـەی کـوڕی ڕەبیعـە بکـەن، کـە لـە هەمووشـیان زاناتـر و عاقڵتر و شـارەزاتر بـووە.

ئـەم دوو گێڕدراوەیـە تیشـکی زیاترمـان بـۆ دەخەنـە سـەر واتـای ئـەم ئایەتانـە، هـەر بۆیـە لێـرەدا هێنامانـن.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**پێناسەی قورئان بەوە کە لەلایەن خوای بە بەزەیی بەخشندەوە دەبەزیوەو، ئایەتەکانی ڕوونن و خوێنراوەیەکی بە زمانی عەرەبییە، بۆ کەسانێك کە زانان و، مـوژدەدەرو ترسێنەرە، پاشان خستنەڕووی هەڵوێستی نەرێنییانەی بێبڕوایان لە بەرانبەریدا، کە نە دڵییان تێی دەگات، نە گوێیان دەبیستێ، نەچاویشیان دەیبینێ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿حمٓ ﴿١﴾ تَنزِيلٌ مِّنَ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٢﴾ كِتَٰبٌ فُصِّلَتۡ ءَايَٰتُهُۥ قُرۡءَانًا عَرَبِيًّا لِّقَوۡمٍ يَعۡلَمُونَ ﴿٣﴾ بَشِيرًا وَنَذِيرًا فَأَعۡرَضَ أَكۡثَرُهُمۡ فَهُمۡ لَا يَسۡمَعُونَ ﴿٤﴾ وَقَالُواْ قُلُوبُنَا فِيٓ أَكِنَّةٍ مِّمَّا تَدۡعُونَآ إِلَيۡهِ وَفِيٓ ءَاذَانِنَا وَقۡرٌ وَمِنۢ بَيۡنِنَا وَبَيۡنِكَ حِجَابٌ فَٱعۡمَلۡ إِنَّنَا عَٰمِلُونَ ﴿٥﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە سێزدە بڕگەدا:

١)- ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾، بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە.

٢)- ﴿حمٓ﴾، ئەوە دوو پیتە (ح، م)، پێشتر قسەمان لەبارەوە کردووە، کە ئەو جۆرە پیتانە بە پیتە پچڕپچڕەکان (**الحروف المقطّعة**) ناسراون و لە پێش (٢٩) سووڕەتەوە هاتوون.

٣)- ﴿تَنزِيلٌ مِّنَ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾، دابەزێنراوە لە لایەن خوای بە بەزەیی بەخشندەوە، وشەی: (**تَنْزِيلٌ**)، واتە: (**مُنَزَّلٌ**) دابەزێنراوە، وشەی: (**تَنْزِيل**)، چاوگە، بەڵام بە مانای ناوی بەرکار (**إسم مفعول**)ە، یانی: (**مُنَزَّلٌ**) واتە: دابەزێنراوە.

ئنجا بـە پێـی ڕێزمانـی عەرەبیـی: (تَنْزِيـلٌ)، دەبـێ بـە نیهـاد (مبتـدأ) و، ﴿ مِّنَ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾، لـە شـوێنی (رفع)دایـەو، دەبـێ بـە گـوزارە (خَـبَر).

دەشـگونجێ بگوتـرێ: (تَنْزِيـلٌ)، گوزارەیـەو نیهادەکـەی قرتێـنراوە، کـە بریتیـە لـە (هَـذَا)، بـەم شـێوەیە: (هَـذَا تَنْزِيـلٌ مِـنَ الرَّحْمَـنِ الرَّحِيـم).

ئنجا خـوا ﷻ کـە بـە قورئـان دەفەرمـوێ: (تَنْزِيـلٌ)، واتـە: لەسـەرێوە لەلایـەن خـواوە، کـە خـوا ﷻ لـە سـەرووی دروسـتکراوەکانی خۆیەتـی، بـەو شـێوەیە کـە بـۆ خـوا شایسـتەیە، لەوێـوە ئـەو قورئانـە دابەزێـنراوە، کەواتـە: بزانـن سـەرچاوەکەی سـەرێیەو، لەلایـەن خـوای خـاوەن بەزەیـی و بەخشـندەوەیە.

٤)- ﴿ كِتَٰبٌ فُصِّلَتْ ءَايَٰتُهُۥ ﴾، کتێبێکە ئایەتەکانی ڕوونکراونەوە، (الكتَاب: إسْمٌ لمَجْمُوعِ حُرُوفٍ دَالَّةٍ عَلَى أَلْفَاظٍ مُفِيدَة)، (كَتَبَ) واتە: (جَمَعَ)، هەروەك (قَرَأَ)ش بە مانای (جَمَعَ)یە، ئنجا (کتاب) یانی: ئەو پیتانەی نووسراون و، کۆکراونەوەو دەلالەت دەکەن لەسەر هەندێك بێژەی سوودبەخش، ماناگەیەن، قورئانیش دیسان بریتیە لەو پیت و دەنگانەی کۆکراونەتەوە، بەڵام بێژراون و مانایەك بە دەستەوە دەدەن.

(فُصِّلَتْ)، یـانی: (أَي بُيِّنَـت وَ وُضِّحَـت)، ڕوونکراونـەوە، پێشـتریش لـە لێکدانـەوەی وشـەکاندا باسـمان کـرد، کـە: (فَصْل) واتـە: لێك جیاکردنـەوەی دوو شـتان، بە شـێوەیەك کەلێنیـان بکەوێتـێ، دوو شـت ئەگـەر پێکـەوە ئاوێتـە بـن، بـۆت لێـك ناکرێنـەوە، بـەڵام کـە لێکـت جیاکردنـەوەو کەلێنیـان کەوتـێ، دەڵێـی: ئەمـە ئەویانـەو، ئـەوەش ئەویانـە، بۆیـە قسـەش ئەگـەر بگوتـرێ: قسـەیەکی ڕوونـە، جیایـە لـەوەی کەسـێك قسـەکانی تێکـەڵ پێکـەڵ بـکات و، کۆتایـی ڕسـتەو سـەرەتای ڕسـتە دیـار نەبـێ، ئنجـا ئایـا ڕسـتەی پرسـیارکردنە؟ یـان ڕسـتەی هەواڵدانـە؟ ئەگـەر بـە پێـی نەغمـەو ئاوازەکـەی دیـار نەبێ، زۆر جیایـە لـەوەی کـە بـە ڕوونیـی قسـە بکـرێ، یاخـود کتێبێـك بـە ڕوونیـی سـەرەتاو کۆتایـی ڕسـتەکانی و، شـێوەی دارشـتنی بڕگەکانـی ڕوون بـێ.

٥)- ﴿ قُرۡءَانًا عَرَبِيّٗا ﴾، {ئەو دابەزێنراوە، وێڕای ئەوەی کتێبەو نووسراوەتەوە}، خوێنراوەیەکی عەرەبییشە، (قرآن) واتە: خوێنراوە، چاوگەو دەشگونجێ ناو بێ، واتە: خوێنراوەیەکە بە زمانی عەرەبیی.

(قُرْآناً) کە مەنصووب کراوە لێرەدا:

أ- یان ئەوەتا حاڵە، ئەو خوێنراوەیە کە کتێبێکە ئایەتەکانی دابەزێنراون و ڕوونکراونەوە، لە حاڵێکدا کە دەشخوێنرێتەوە بە زمانی عەرەبیی.

ب- یاخود: ﴿ قُرۡءَانًا عَرَبِيّٗا ﴾، لەسەر حاڵەتی مەدح (**منصوب**)ە، لە زمانی عەرەبییدا شتێك کە مەدح و ستایش بکرێ، حاڵەتی (**نصب**) وەردەگرێ.

وشەی: (**عَرَبِيًّا**)یش وێڕای ئەوەی زمانێکی گەلێکی دیارییکراو دەگرێتەوە، کە گەلی عەرەبە، بەڵام لە زمانی عەرەبییدا و لە بەرکارهێنانی قورئان و سوننەتیش دا، بە واتای قسەی ڕۆشنیش دێ، دەگوترێ: (**أَعْـرَبَ عَـنْ رَأْيـهِ**)، واتە: ڕای خۆی دەرخست، پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: {**وَالثَّيِّـبُ تُعْـرِبُ عَـنْ نَفْسِـهَا**}[1]، واتە: ئافرەتی بێوەژن خۆی قسەی خۆی بە ڕوونیی دەکات، لەبەر ئەوەی هەندێك شەرمی شکاوە، خۆی دەتوانێ بڵێ ڕازییە، یاخود ڕازیی نیە، بەو پیاوە، (**تُعْرِب**) واتە: ڕای خۆی بە ڕوونیی ڕادەگەیەنێ.

٦)- ﴿ لِّقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ﴾، ئەم دابەزێنراوە کە لەلایەن خوای خاوەن بەزەیی بەخشندەوە هاتوە، کتێبێکە ئایەتەکانی ڕوون کراونەوە، هەروەها قورئانێکی ڕۆشنە بە زمانی عەرەبییە، بۆ کۆمەڵێك بزانن.

لێرەدا بۆ (**يَعلَمُون**) دەزانن، توێژەرەوان دوو واتایان داناون:

أ- زمانی عەرەبیی بزانن.

---

(١) {عَـنْ عَـدِيِّ بْـنِ عَمِـيرَةَ الْكِنْـدِيِّ ﷺ، قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللـهِ ﷺ: الثَّيِّـبُ تُعْـرِبُ عَـنْ نَفْسِـهَا، وَالْبِكْـرُ رِضَاهَـا صَمْتُهَـا} أخرجـه ابـن ماجـه: ١٨٧٢، وأحمـد: ١٧٧٥٨، والطـبراني: ٢٦٤.

ب- یاخود کتێبە ئاسمانییەکان بزانن، ئەو کاتە دەزانن کە ئەمەش کتێبێکی ئاسمانییە، کە دەفەرموێ: (**يَعْلَمُونَ**) بەرکاری (**يَعْلَمُونَ**)، قرتێنراوە، چونکە زانراوە: (**يَعْلَمُونَ اللِسَانَ العَرَبِي**)، یان: (**يَعْلَمُونَ الكُتُبَ السَّمَاوِيَّة**).

بەڵام من پێم وایە ئەگەر بگوترێ: (**يَعْلَمُونَ**)، واتە: زانیارییان هەیە، یانی: لێرەدا ﴿ يَعۡلَمُونَ ﴾، وەك تێپەڕکار (**مُتَعَدِّي**) مامەڵەی لەگەڵ نەکراوە تاکو بەرکار بخوازێ، بەڵکو وەك کرداری لازیم بەکارهاتووە وەك (**هُوَ يَعْلَمُ**) ئەو دەزانێ، لێرەش (**لقوم يعلمون**) واتە: کەسانێك کە خاوەن زانیاریی بن دەزانن.

وەك پێشینان گوتوویانە: «قەدری زێڕ لە لای زێڕنگەرە»، کەسێك زانا نەبێ، قەدری قورئان نازانێ، بەڵکو کەسێك تاکو پتر زانا بێ و، توانای دەرککردن و تێگەیشتنی شتی هەبێ و، قووڵ و ورد بێ، زیاتر لە قورئان بەهرەمەند دەبێ و دەزانێ کە قورئان چییە؟ بەڵام بابای نەزان و نەشارەزای کەودەن، بە دڵنیایی قەدری قورئان نازانێ و، لێی تێناگات، بۆیە دەڵێ: هیچ نییە! هەروەك چۆن کەسێك کوێر بێ، خۆر بە نێوەڕاستی ئاسمانەوە نابینێ! مەگەر هەست بە گەرمییەکەی بکات، ئەگەرنا، نایبینێ، بە هەمان شێوەش کەسێك نەزان بێ، قەدری قورئان نازانێ، بە هۆی نەزانییەکەیەوە.

٧)- ﴿ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗا ﴾، قورئان هەم موژدەدەرەو، هەم ترسێنەر و وریا کەرەوەیە.

﴿ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗا ﴾، یان أ- حاڵی دووەمە بۆ: (**كِتَاب**)، واتە: ئەو کتێبە ئایەتەکانی ڕوون کراونەوە، لە حاڵێکدا کە خوێنراوەیەکی عەرەبییە، لە هەمان کاتیشدا، موژدەدەر و ترسێنەریشە.

ب- دەشگونجێ: ﴿ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗا ﴾، سیفەت بێ بۆ: ﴿ قُرۡءَانًا عَرَبِيّٗا ﴾، واتە: قورئانێکی عەرەبییە، کە موژدەدەر و ترسێنەرە.

کە دەفەرموێ: ﴿ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗا ﴾، لێرەدا بە پیتی (و) گێردراوەتەوە، بۆ ئاگادارکردنەوەی ئەوە کە موژدەدەرە بۆ کۆمەڵێك و ترسێنەریشە بۆ کۆمەڵێکی

دیکـە، واتـە: ئەوانـەی کـە لێـی بەهەرەمەنـد دەبـن، موژدەیـان پـێ دەدات بـە سـەربەرزیی و سـەرفرازیی دنیـاو دوارۆژ، ئەوانـەش کـە پشـتی تێدەکەن، دەیانترسـێنێ و وریایـان دەکاتـەوە، بـە مەینەتیـی و سـزاو پەشـێمانیی لـە دنیـاو دوارۆژدا.

٨)- ﴿ فَأَعْرَضَ أَكْثَرُهُمْ ﴾، زۆربەیان پشتیان هەڵکرد، (عُرْض) بە مانای لامل دێ، (أَعْرَضَ) واتە: لاملی تێکرد، کەسێك بیەوێ گوێ لە شتێك نەگرێ، لاملی تێدەکات، یاخود کە بیەوێ پشتی تێبکات، پێشێ لاملی تێدەکات، دوایی وەردەسوورِێ.

لێـرەدا: ﴿ فَأَعْرَضَ أَكْثَرُهُمْ ﴾، واتـە: زۆربەیان پشـتیان هەڵکرد لـە زانیارییەکانی قورئـان، لە مـوژدە و ترسـاندنەکانی قورئان.

٩)- ﴿ فَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ ﴾، بۆیە نابیستن! بە تەئکید کەسێك پشت لە شتێك بکات و، لاملی تێبکات و لێی دوور بکەوێتەوە، دەنگەکەی نابیستێ، ئەوانەش لە ئەنجامی پشتهەڵکردنیان لە قورئان، دەنگ و سەدای زوڵاڵی قورئان نەبیستن، بۆیە لێی تێناگەن.

زۆر کەسـی مولحیـدو بـێ دیـن هەیـە، دەڵـێ: کـوا قورئـان چـی تێدایـە؟! کاتـی خـۆی لـە سـەرەتای کارو بانگـەوازی ئیسـلامییمدا، لـە زۆر کـۆڕ و مەجلیسـدا هـی وا هەبـووە، گوتوویەتـی: کـوا فـڵان سـوورەتە، چ سـوودێکی هەیـە؟! کـە ئێسـتا کەمـتر وایـە، خەڵـك بـەو شـێوە ئاشـکرایە، ئـەو جـۆرە ڕەخنانـە لـە کـۆڕو مەجلیسـان دا بگـرێ[1]، هەرچەنـدە پێـم خۆشـە خەڵـك چـی لـە دڵیدایـە، بـە ڕوونیـی و بـە ئاشـکرایی بیڵـێ، نـەك ڕوو دەربایسـی و ڕووپامایـی بـکات، دواتـر لـە پاشـملە شـتی دیکـە بڵـێ؟! بێگومانیـش هـەر سـوورەتێك و هـەر کۆمەڵـە ئایەتێـك دەگونجـێ دەیان حیکمـەت و پەنـدی لێوەربگـری، بـەڵام وەك گوتـراوە: {بابـای نەخـۆش ئـاوی شـیرینی بـەزار تاڵـە}، بابـای نەخـۆش کـە میزاجـی تێکچووبـێ، ئـاوی سـازگاریش بخواتـەوە بـەزاری تاڵـە، بەڵکـو ئەگـەر شـتی شـیرینیش بخـوات هـەر بـەزاری تاڵـە، مـرۆڤ کـە میزاجـی ڕووح و عەقڵـی تێکچـوو، شـتەکان وەك خـۆی نابینـێ!

---

(١) ناشـڵێم ئێسـتاش ئـەوە نیـە، بـەڵام ڕەنگـە هـەل و مـەرج و واقیعـی کۆمەڵایەتیـی و سیاسـیی بەنـدە بـە جۆرێـك بـێ، ئـەو قسـانە نەبیسـتم

ئنجا خوا ﷻ هەڵوێستی بێبڕوایەکانمان بۆ بەرجەستە دەکات، کە لە وەڵامدا چییان گوتوە:

١٠)- ﴿ وَقَالُواْ قُلُوبُنَا فِيٓ أَكِنَّةٖ مِّمَّا تَدۡعُونَآ إِلَيۡهِ ﴾، گوتیان: دڵمان لە کیفاندایە، بەرانبەر ئەوەی تۆ ئێمەی بۆ بانگ دەکەی، وشەی: (**أَكِنَّة**) كۆی (**كِنانَ**)ە، (**الكِنانُ: مِثْلُ الغِطَاءِ وَزْناً وَمَعْنَى**)، (**كنان**) یانی: (**غِطَاء**) واتە: پۆشەر، یانی: دڵەکانی ئێمە پەردەپۆش کراون و لە نێو کیف و توورەکان دان.

کە دەفەرموێ: ﴿ مِّمَّا تَدۡعُونَآ إِلَيۡهِ ﴾، واتە: (**عَمَّا تَدْعُونَا إِلَيْه**)، لە بەرانبەر ئەوەدا کە تۆ ئێمەی بۆ بانگ دەکەی، ئێمە دڵمان لە کیف و توورەکەدایە، واتە: ئەو شتەی تۆ ئێمەی بۆ بانگ دەکەی، ناچێتە نێو دڵمانەوە، چونکە دڵمان پەردەپۆش کراوە.

١١)- ﴿ وَفِيٓ ءَاذَانِنَا وَقۡرٞ ﴾، {جگە لەوەی عەقڵ و دڵمان داپۆشراوە، لەوەی ئێمەی بۆ بانگ دەکەی}، هەروەها لە گوێیەکانیشماندا قورسایی هەیە.

وشەی (**وَقْر**)، بە مانای (**صَمَم**) دێ، واتە: کەڕیی، هەروەها بە مانای (**ثِقَل**)یش دێ، واتە: قورسایی، ئنجا بێگومان کەسێك قورسایی لە گوێی کرابێ، گوێبیستی ئەو قسانە نابێ کە بۆی دەکرێن.

١٢)- ﴿ وَمِنۢ بَيۡنِنَا وَبَيۡنِكَ حِجَابٞ ﴾، لە نێوان ئێمەو تۆدا پەردەو نێوان هەیە، دەڵێ: (**الحِجَابُ: الساتر لِلمَرْئِيّ مِنْ حَائِطٍ أَو ثَوْب**)، (**حِجاب**): بریتیە لە پەردەو نێوانێك ڕێ بگرێ لەوەی تۆ ئەو شتە بینراوە ببینی، ئنجا پەردەیەك بێ، دیوارێك بێ، هەر شتێك بێ.

لێرەدا جێی سەرنجە کە دەڵێ: ﴿ وَمِنۢ بَيۡنِنَا وَبَيۡنِكَ حِجَابٞ ﴾، بە هۆی ئەو (**مِنْ**)ەوە ماناکە بەم شێوەیەی لێ دێ، دەڵێ: (**الحِجابُ ابْتَدَأَ مِنَّا وابْتَدَأَ مِنْكَ، فَالمَسَافَةُ المُتَوَسِّطَةَ بَيْنَ جِهَتِنَا وَجِهَتِكَ، مُسْتَوْعَبَةٌ بِالحِجَابِ لا فَرَاغَ فِيهَا**)، کە دەفەرموێ: ﴿ وَمِنۢ بَيۡنِنَا وَبَيۡنِكَ حِجَابٞ ﴾، واتە: لە لای ئێمەوە دەست پێدەکات،

تاکو لای تۆ، هەمووی پەردەو نێوانە، واتە: ئەو پەردەو نێوانە لە تۆوە دەست پێدەکات، هەروەها لە ئێمەشەوە دەست پێدەکات، ئەوەی نێوەڕاستیشمان هەمووی پەردە و نێوانەو، هیچ بۆشایی تێدانییە، بۆ وێنە: تۆ کەسێك لە بەرانبەرتە، لە لای تۆوە دیوارێك دەست پێبکات، تا دەگاتە لای وی، مانای وایە ئەو دیوارە زۆر ئەستوورە، ئەوانیش دەڵێن: پەردەو نێوانێکی زۆر ئەستوورمان لە بەینداییە، بۆیە هیچ نابیستین.

ئەمە **(الشوكاني)** لە **(فتح القدير)**دا[1] هێناویەتی، ئەویش لە **(الزمخشري)** وەری گرتووە، کە لە **(كشاف)**دا هێناویەتی، زەمەخشەریی زۆرجار لە تەفسیرەکەیدا ئەو نوکتە ڕەوانبێژییانە دێنێ، بە هەمان شێوە **(البيضاوي وفخرالدين الرازي)**ش، بەڵام زۆرێك لە شیکەرەوانی قورئان، لە **(الكشّاف)**ەوە زیاتر ئەو سەرنجە ڕەوانبێژییانە دێنن.

١٣)- ﴿ فَٱعۡمَلۡ إِنَّنَا عَٰمِلُونَ ﴾، دەجا تۆ کار بکە، ئێمەش کاری خۆمان دەکەین، واتە: تۆ لەسەر کاری خۆت بەردەوام بە، ئێمە گوێت پێ نادەین، ئێمەش لەسەر کاری خۆمان بەردەوام دەبین.

دیارە بەرکاری **(فَاعْمَل)**، هەروەها: **(عَامِلُونَ)**، هەردووکیان قرتێنراون، بۆچی؟ بۆ ئەوەی زەین بە لای هەموو شتێکدا بچێ، واتە: تۆ کار بکەو، هەرچی پێت چاکە، ئەنجامی بدە، ئێمەش ئەنجامدەری هەرکارێك دەبین کە پێمان چاکە.

لێرەدا جیاوازیی هەیە لە وشەی کردەوەی پێغەمبەر ﷺ و هی خۆیان، هی پێغەمبەریان ﷺ بە کردار کارهێناوە **(فَاعْمَل)**، واتە: کار بکە، بەڵام هی خۆیان بە ناوی بکەر **(إسم فاعل)** هێناوە **(عَامِلُونَ)**، ئەمەش یانی: هەر بەردەوام دەبین لەسەر کردەوەی ڕابردوومان.

---

(١) ج٤، ص ٦٧٨.

شـایانی باسـە: کـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿لِّقَوۡمٍ يَعۡلَمُونَ﴾، وەك پێشـتر ئاماژەمـان پێـدا:

١- هەندێك گوتوویانە، واتە: شارەزایی بە زمانی عەرەبیان هەبێ.

٢- هەندێکی دیکە گوتوویانە: ئاگایان لە کتێبە ئاسمانییەکانی دیکە هەبێ، چونکە ئەوەی شارەزای کتێبە ئاسمانییەکان بێ، کاتێك سەیری قورئان دەکات، دەزانێ ئەویش وەك ئەوانەو، کتێبێکی ئاسمانییەو، قسەی بەشەر نیە.

٣- منیش وام لێکدایەوە کە مەبەستی پێ ئەوەیە، هەر کەسێك زانیاریی هەبێ بە ڕەهایی، واتە: زانابێ و شارەزابێ، ئنجا ئەوەی گرنگە ئاماژەی پێ بکەین لێرەدا ئەوەیە: ئەو سێ واتایە تێك ناگیرێن، واتە: کەسێك شارەزای زمانی عەرەبیی بێ و، کەسێك ئاگای لە کتێبە ئاسمانییەکان بێ و، کەسێك زانیاریی هەبێ بە گشتیی و، ئامادەییشی هەبێ زانیاریی وەرگرێ، کەواتە: قورئان بۆ ئەو جۆرە کەسانە بە سوودە.

## پێناسەی قورئان بە نۆ سیفەتی سەرەکیی

لێرەدا خوا ﷻ لەم چەند ئایەتەدا، پێناسەی قورئانی بە نۆ (٩) سیفەتی سەرەکیی کردوە، کە ئەم سیفەتانەن:

١- ﴿ تَنزِيلٌ ﴾، کەواتە: ئەم قورئانە دابەزێنراوە، نە هەڵبەستراوەو نەگوتراوەو نەنووسراوە و نەفێرکراوە، بەڵکو لەسەرێوە، لە لایەن خوایەك کە لەسەرووی دروستکراوەکانیەتی، بەو شێوەیە کە بۆ خوا شایستەیە، لەوێوە دابەزێنراوە.

٢- ﴿ مِّنَ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾، دابەزێنراوە لەلایەن خوایەکی ئەوپەڕی بە بەزەیی و بەخشندەو میهرەبانەوە، یاخود بە بەزەییە بە گشتیی بۆ مرۆڤ و، جندو، فریشتەو هەموو دروستکراوەکان، بەخشندەشە بە تایبەت بۆ بڕواداران لە ڕۆژی دوایی دا، یاخود واتە: خوا ﷻ خاوەنی سیفەتی بەخشندەیی و بەزەییە، بە بەردەوامیی بەزەیی بەکاردێنێ، بەزەییەکەی تازە دەبێتەوە، هەروەها خاوەنی بەزەییشە، واتە: بەزەییەکەی چەسپاوە، چونکە صیغەی (**فَعلان**) و (**فَعيل**)، (ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ) بەو دوو مانایە دێن.

٣- ﴿ كِتَٰبٌ ﴾، قورئان نووسراوە، لە شوێنێکی دیکە باسمان کردوە، حیکمەتی خوای پەروەردگار وایخواستوە، ئەم قورئانە بە دوو شێوە بگات بە ئێمە: هەم بە شێوەی نووسراو، هەم بە شێوەی گوتراو، ئێمە بە تەواتور قورئانمان پێگەیشتوە، هەزاران کەس قورئانیان لەبەر کردوە، دواتر بە هەزارانی دیکەیان گوتوە، ئەوانیش بە هەزارانی دیکەو ... هتد، کە ئێستا ملیۆنان کەس هەموو قورئانیان لەبەرە، وێڕای گوتران و لەبەر کران لە عەقڵ و سینەکان دا، کاتی خۆی لە سەردەمی پێغەمبەریش دا ﷺ نووسراوەتەوە لەلایەن چەند نووسەرێکەوە، لەسەر چەرم و پەڕۆو بەردو ئەو شتانەی لەسەریان نووسیون، چەند نووسەرێك هەبوون، ئیشیان ئەوە بووە کە قورئان بنووسنەوە، کاتێك سوورەتێك، یان چەند ئایەتێك دابەزیوەتە سەر پێغەمبەر، ئەوان ڕاستەوخۆ نووسیویانەتەوە[1].

---

(١) نووسەرەوانی وەحیی دەوری (٤٣) کەس بوون و (٢٨) یان هەمیشەیی و پسپۆڕ بوون، بڕوانە:

بۆیە قورئان پێی دەگوترێ: ﴿كِتَٰبٌ﴾، چونکە نووسراوە، پێشی دەگوترێ: ﴿قُرۡءَانًا﴾، چونکە گوتراو و بێژراوە.

٤- ﴿فُصِّلَتۡ ءَايَٰتُهُۥ﴾، ئایەتەکانی ڕوونکراونەوە، واتە: ڕوونن، نەك پێشێ ڕوون نەبووبن، دواتر ڕوونکرابنەوە، واتە: ئایەتەکانی کە دابەزێنراون، ڕوونن، بەڵام خوا ﷻ لێرەدا ئەم تەعبیرەی بە کردار (**فعل**) هێناوە، ئەگەرنا لە شوێنی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿ءَايَٰتٍ مُّفَصَّلَٰتٍ ١٣٣﴾ **الأعراف**، بەڵام بۆ موعجیزەکان، واتە: ئایەتە ڕۆشنەکان، بەڵام لێرەدا دەفەرموێ: (فُصِّلَتۡ ءَايَٰتُهُۥ) و لە شوێنی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿كِتَٰبٌ أُحۡكِمَتۡ ءَايَٰتُهُۥ ١﴾، **هود**، واتە: دەیخاتە حاڵەتی کردەییەوەو بە شێوەی کردەیی هێناویەتی، ئایەتەکانی ڕۆشن کراونەوەو، ئایەتەکانی مەحکەم و قایم و توندو تۆڵ کراون.

٥- ﴿قُرۡءَانًا﴾، خوێنراوەیە، لە شوێنی دیکەدا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا قَرَأۡنَٰهُ فَٱتَّبِعۡ قُرۡءَانَهُۥ ١٨﴾ **القيامة**، قورئان لەوێدا دەگونجێ چاوگ بێ، واتە: (قِرَاءَة) خوێندنەوە، دەشگونجێ ناو بێ، واتە: خوێنراوە، قورئان هەم خوێندنەوەیە، هەم خوێندراوەیە.

٦- ﴿عَرَبِيًّا﴾، قورئانێکی عەرەبییە، واتە: بە زمانی عەرەبییە، وشەی عەرەبیی وێڕای زمانی عەرەبیی بە واتای ڕۆشنیش دێ، بۆیەش نەتەوەی عەرەب زمانی خۆیان ناوناوە عەرەبیی، لەبەر ئەوەی زمانی خۆیان پێ ڕۆشن بووەو، باش لە یەك تێگەیشتوون، بەڵام زمانی گەلانی دیکەیان پێ ناڕۆشن بووە، بۆیە ناویان لێ ناوە: عەجەمیی یان ئەعجەمیی، عەجەمیش زمانی خۆیان پێ ڕۆشنەو، زمانی عەرەبییان پێ ناڕۆشنە، کەواتە: ئەمە شتێکی ڕێژەیی و گوێرەییە، بۆ وێنە: بابایەکی کورد زمانی خۆی پێ ڕۆشنە، بەڵام زمانی بەرانبەری خۆی پێ ناڕۆشنە، هەروەها بەرانبەرەکەشی بەهەمان شێوە.

٧- ﴿لِّقَوۡمٍ يَعۡلَمُونَ﴾، بۆ کۆمەڵێك کە بزانن:

أ- زمانی عەرەبیی بزانن.

---

(حقائق وشبهات حول القرآن الكريم) د. محمد عمارة، ص: ٣٠ - ٤٣، الطبعة الثانية: ١٤٣٣ هـ - ٢٠١٢م.

ب- شارەزای کتێبە ئاسمانییەکان بن.

ج- ئامادەبن بزانن و فێر بن.

د- یاخود (يَعْلَمُونَ)، ئەگەر کردارێکی لازیم بێ، وەك: (عَلِمَ، يَعْلَمُ) واتە: زانی، دەزانێ، نەك تەنها فڵان شتە دەزانێ، بەڵکو ئەوانەی زانیارییان هەیە بەڕەهایی.

٨- ﴿ بَشِيرًا ﴾، قورئان دڵخۆشکەرو موژدەدەرە، بۆ کەسانێك کە شوێنی دەکەون، شوێن پەروەردگار دەکەون، شوێن پێغەمبەرەکەی ﷺ دەکەون، قورئان هەم لە دنیادا دڵخۆشیان دەکات، لەسەر ئاستی تاك، ئاسوودەیی و سەربەرزیی و ئارامیی و بەرچاوڕوونیان دەبێ، لەسەر ئاستی کۆمەڵگاش توندو تۆڵیی و، تەبایی و، دادگەرییان دەبێ، بۆ ڕۆژی دواییش موژدەیان پێدەدات، کە خوا ﷻ لێیان ڕازی دەبێ و دەیانخاتە بەهەشتەکانیەوە.

٩- ﴿ وَنَذِيرًا ﴾، ترسێنەرو وریا کەرەوە، ئەمەش سیفەتی نۆیەم و کۆتاییە، کە لێرەدا قورئانیان پێ وەسفکراوە، (الإِنْذَارُ: إِعْلاَمٌ مَعَ تَخْوِيفٍ)، (إِنْذَار): بریتیە لە ئاگادارکردنەوە لەگەڵ ترساندن دا، واتە: هۆشداریی پێدان و وریا کردنەوەو ترساندن، بە دڵنیایی قورئان ترسێنەرو ورياکەرەوەو هۆشداریی دەرە بۆ کەسانێك کە پشتی تێدەکەن، دەیانترسێنێ کە ئێوە لە دنیاشدا تووشی باجدان دەبن، لەبەر ئەوەی پشتتان لە قورئان کردوە، لە ڕۆژی دواییشدا تووشی جەزرەبەو سزای خوا ﷻ دێن.

لێرەدا جێی خۆیەتی باسی ئەوەش بکەین، دوای ئەوەی خوا ﷻ لێرەدا باسی ئەو نۆ سیفەتەی قورئان دەکات، ئنجا دێتە سەر باسی هەڵوێستی نەرێنییانەی بێبڕوایان، واتە: قورئانێك کە خاوەنی ئەو نۆ سیفەتانەیە، دەبوو زۆر پێشوازیی لێ بکرێ و شوکرانەی لەسەر بکرێ، دەبوو باوەشی گەرمی بۆ بکرێتەوە، هەڵبەتە خاوەنی عەقڵ و ویژدانەکان بەو شێوەیەن، ئەوانەی خوا ﷻ چاکەی بۆیان بوێ، شایستەی چاکەو خێرو بەرەکەتی قورئان بن.

لێرەدا خوا ﷻ دێتە سەر باسی هەڵوێستی نەرێنییانەی بێبڕوایان لە شەش هەڵوێستاندا:

١- ﴿ فَأَعْرَضَ أَكْثَرُهُمْ ﴾، زۆربەیان پشتیان هەڵکرد، لە قورئاندا بە زۆریی: (**أَكْثَرُهُم**)، یان: (**كَثِيرٌ**)، بەکاردەهێنرێ، بۆچی؟ چونکە هەموویان پشتیان تێنەکردوە، ئەوانەی پێغەمبەر ﷺ پەیامی ئیسلام و قورئانی بە گوێ دا داون، هەندێکیان شوێنی پێغەمبەر ﷺ کەوتوون، بۆیە لە قورئاندا زۆر بە دەگمەن شێوەی ڕەهاییت بەرچاو دەکەوێ، خوا ﷻ باسی هەر قەومێك بکات، دەفەرموێ: زۆرینەیان، نەك هەموویان، ﴿ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ عَنْ ءَايَٰتِنَا لَغَٰفِلُونَ ﴿٩٢﴾ ﴾، زۆرێك لە خەڵکی لە ئایەتەکانمان لە بێئاگایانن، خوا ﷻ دەفەرموێ: زۆرێك، نافەرموێ: هەموو، چونکە بێگومان خەڵکانێك هەن، کە بێئاگانین لە ئایەتەکانی خوا، لێرەشدا هەموویان پشتیان تێ نەکردوە، لاملیان لە قورئان نەکردوە، بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَأَعْرَضَ أَكْثَرُهُمْ ﴾.

٢- ﴿ فَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ ﴾، ئەوانە نابیستن، نابیستن بە واتای ئەوەیە کە وەریناگرن و قبووڵی ناکەن، بەڵام لێرەدا حاڵەتی ئەوانی چواندوە، بە حاڵەتی کەسێك کە بانگی بکەی و نەبیستێ.

٣- ﴿ وَقَالُوا۟ قُلُوبُنَا فِىٓ أَكِنَّةٍ مِّمَّا تَدْعُونَآ إِلَيْهِ ﴾، گوتیان دڵمان لە نێو بەرگ و پۆشەرو کیفاندایە، بەرانبەر بەوەی تۆ ئێمەی بۆ بانگ دەکەی، بۆیە ئەو قسەیەی تۆ دەیکەی ناچێتە نێو عەقڵ و دڵمانەوە.

٤- ﴿ وَفِىٓ ءَاذَانِنَا وَقْرٌ ﴾، گوێیەکانیشمان قورساییان تێدایە، ئنجا گوێیەك قورسایی تێدابێ، بێگومان نابیستێ.

٥- ﴿ وَمِنۢ بَيْنِنَا وَبَيْنِكَ حِجَابٌ ﴾، لە نێوان ئێمەو تۆدا، پەردەو نێوان هەیە، واتە: لە ئێمەوە تاکو دەگاتە تۆ، پەردەو نێوان هەیە، بۆیە نابینین.

٦- ﴿ فَٱعْمَلْ إِنَّنَا عَٰمِلُونَ ﴾، تۆ (ئەی موحەممەد ﷺ) کاری خۆت بکەو، ئێمەش ئەنجامدەری کاری خۆمانین، واتە: ئێمە چۆنمان کردوە، هەروا دەکەین، تۆش لەسەر کاری خۆت بەردەوام بەو، ئێمەش گوێت پێنادەین! ئەوەش ئەوپەڕی ملهوڕیی و یاخیی بوونی ئەوان دەردەخات.

**مەسەلەی دووەم:**

**فەرمانکردنـی خـوا ﷻ بـە پێغەمبەرەکـەی موحەممـەد ﷺ کـە ڕاییگەیەنـێ، ئەویـش تەنیـا مرۆڤێکـی وەك خۆیانـە، بـەڵام سروشـی بـۆ کـراوە، کـە تەنیـا یـەك پەرستراوی هەقیـان هەیـە، ئنجـا بـا بـە ڕاستیی ڕووی تێبکـەن و، داوای لێبوردنـی لێبکـەن، هەروەهـا ئاماژەیەکیـش بـە خەسـڵەتە بنەڕەتییەکانـی هەریـەك لـە هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەران و، بـڕواداران:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَىَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ فَٱسْتَقِيمُوٓا۟ إِلَيْهِ وَٱسْتَغْفِرُوهُ ۗ وَوَيْلٌ لِّلْمُشْرِكِينَ ﴿٦﴾ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُم بِٱلْـَٔاخِرَةِ هُمْ كَٰفِرُونَ ﴿٧﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ ﴿٨﴾ ﴾.

شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دە برگەدا:

١)- ﴿ قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ ﴾، بڵێ: من تەنیا مرۆڤێکم وەك ئێوە، ئەم ڕستەیەو دوو ڕستەی دواتری ئەم ئایەتە، لە ئایەتی (١١٠)ی سووڕەتی (**الكهف**)یشدا هاتوە، بە هەمان شێوە: ﴿ قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَىَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ ... ﴾.

لێـرەدا کـە دەفەرمـوێ: ﴿ قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ ﴾، وشـەی (**إنَّمـا**): ئامـرازی کورتهەڵهێنـان و چەسـپاندنە، واتـە: (**إنَّمَـا: أَنَـا مَقْصُـورٌ فـي الْبَشَرِيَّـةِ دُونَ التَّـصَرُّفِ فِي قُلُوبِ النَّـاس**)، واتـە: مـن کورتهەڵهێـنراوم لـە مـرۆڤ بووندا، نـەك بتوانم دەسـتکاریی دڵـی خەڵـك بکـەم، دڵـی ئێـوە وەربگێـڕم بـۆ ئیـمان، مـن مرۆڤێکـم وەك ئێـوە، لـەو ڕووەوە کـە بتوانـم ئێـوە بێنمـە سـەر ڕێـگای هیدایـەت، ناتوانـم!.

دەتوانـم ڕێنماییتـان بکـەم، دەتوانـم هیدایەتتـان بـدەم بـە واتـای ڕێنمایـی و واتـا گشـتییەکەی هیدایـەت، بـەڵام ناتوانـم هیدایەتتـان بـدەم بـە واتـا تایبەتییەکـەی

هیدایـەت، بـەو مانایـەی بتانخەمـە سـەر ڕاسـتە ڕێ، ئەگـەر ئینسـان وریـا نەبـێ لـە جیاکردنـەوەی واتـای گشـتیی هیدایـەت و، واتـای تایبەتیـی هیدایـەت، وەك هەندێـك لـە توێژەرەوانـی قورئـان تووشـی ئـەو هەڵەیـە بـوون، ئـەو کەسـەش ئەگـەر لێکیـان جیانەکاتـەوە، بێگومـان تووشـی هەڵـە دەبـێ.

بـا سـەرنج بدەیـن! خـوا ﷻ لـە سـوورەتی (**القصـص**) دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ ﴿٥٦﴾ ﴾، واتـە: تـۆ ناتوانـی هیدایەتـی ئەوانـە بـدەی کـە خۆشـت دەوێـن، لـە هەمـان کاتـدا لـە سـوورەتی (**الشـورى**) دەفەرمـوێ: ﴿ وَإِنَّكَ لَتَهْدِيٓ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسْتَقِيمٖ ﴿٥٢﴾ ﴾، واتـە: بـە دڵنیایـی تـۆ هیدایەتـی خەڵـك دەدەی بـۆ سـەر ڕێـگای ڕاسـت، ئنجـا کـە دەفەرمـوێ: تـۆ هیدایەتیـان دەدەی، بـە مانـای ڕێنماییـە، واتـە: تـۆ ڕێنماییـان دەکـەی، بـەڵام کـە دەفەرمـوێ: ناتوانـی هیدایەتیـان بـدەی، واتـە: ڕێـی ڕاسـتییان پـێ بگـری و، بیانخەیـە سـەر ڕاسـتە شـەقام.

کەواتـە: هیدایەتێـك هەیـە، بـە مانـای ڕێنمایـی، هیدایەتێکیـش هەیـە بـە مانـای خسـتنە سـەر ڕێـگا، ئنجـا خسـتنە سـەر ڕێـگا، تەنهـا بـە خـوا ﷻ دەکـرێ، تەنهـا خـوا دەتوانـێ خەڵـك بخاتـە سـەر ڕاسـتە شـەقام، لێـرەش خـوا ﷻ بـە پێغەمبـەر ﷺ دەفەرمـوێ: ﴿ قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٞ مِّثْلُكُمْ ﴾، بڵـێ: مـن تەنیـا مرۆڤێکـم وەك ئێـوە، واتـە: ئەگـەر چاوەڕێـی ئەوەبـن، بـە تۆبزیـی ئیمانتـان بخەمـە نێـو دڵ، بێگومـان ناتوانـم و ئـەوە کاری مـن نیـە، چونکـە مـن مرۆڤێکـی وەك خۆتانـم.

٢)- ﴿ يُوحَىٰٓ إِلَيَّ ﴾، سروشم بۆ لا دەکرێ، واتە: قسەی پەنهانم بۆلا دەنێردرێ، ئەوەی پێشێ بەرپەرچدانەوەی ئەوەبوو، ئەوان بە پێغەمبەریان دەگوت، تۆ مرۆڤێکی وەك ئێمەی، خوا ﷻ بە پێغەمبەری ﷺ دەفەرموێ: بڵێ: بەڵێ منیش مرۆڤێکی وەك ئێوەم، ئەوە ڕاستە، من لەو قسەیەدا پشتگیرییتان دەکەم و بەرپەرچتان نادەمەوە، بەڵام ئەمە بەو واتایە نا، کە من لە هەموو شتێکدا مرۆڤێکی وەك ئێوەم، من لە مرۆڤ بووندا وەك ئێوەم، لەو شتانەدا کە بە مرۆڤ ناکرێن و، تەنها بە خوا ﷻ دەکرێن، لەو شتەدا ڕاستە وەك ئێوەم.

بەڵام جیاوازییەكم هەیە لەگەڵ ئێوە، ئەویش ئەوەیە: ﴿يُوحَىٰٓ إِلَيَّ﴾، سروشم بۆ لا دەكرێ، ئەمەش بەرپەرچدانەوەی ئەوەیە كە دەیانگوت: تۆ مرۆڤێكی وەك ئێمەی، واتە: مرۆڤ شایستەی ئەوە نیە، خوا ﷻ وەحیی بۆ بنێرێ، نەخێر! پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: من مرۆڤێكی وەك ئێوەم لە مرۆڤایەتییدا، بەڵام لە هەمان كاتدا مرۆڤێكم شایستەم سروشم بۆ بكرێ، لە نێو مرۆڤەكاندا كەسانێك هەبوون شایستەی ئەوە بوون خوا بەشێوەی تایبەت و پەنهان فەرمایشتیان بۆ بنێرێ و، بیاندوێنێ، كە پێی دەگوترێ: وەحیی.

شایانی باسە: ئێمە لە **(الكتاب السادس)** لە مەوسووعەی: **(الإسلام كما يتجلى في كتاب الله)**دا، لە ژێر ناوونیشانی: **(بحثٌ حَوْل الوَحِي)**، باسێكی تێرو تەسەلمان لە بارەی وەحییەوە كردوە، لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا، هەروەها لە سوورەتی **(يونس)**یشدا ئەو باسەمان بە تێرو تەسەلیی دووبارە خستۆتەوە بەرباس و پوختەكەیمان بە كوردیی هێناوە.

وەحیی لە بنچینەدا بە مانای قسەی پەنهان و، ئیلهام و خورپە دێ و، بە مانای غەریزەو ئاماژە دێ و، بە مانای فەرمانكردنی خوا دێ، هەروەها بە مانای ئەو وەحییە زانراوەش دێ، كە خوا ﷻ بە هۆی فریشتەكانەوە پەیامی تایبەت بۆ پێغەمبەران **(عليهم الصلاة والسلام)** دەنێرێ.

٣)- ﴿أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ﴾، كە پەرستراوی ئێوە تەنیا یەك پەرستراوە، لێرەدا خوای پەروەردگار جەوهەرو كاكڵی ئەو سروشەی بۆ لای موحەممەدی ﷺ كردوە، لەوەدا دەخاتەڕوو، كە بریتیە لە خوا بە یەكگرتن و، تەنیا خواپەرستن، ئەگەرنا ئەوەی خوا بۆ پێغەمبەری خاتەمی سروشكردوە، جگە لە خوا بە یەكگرتن و تەنیا خواپەرستن، زۆر شتی دیكەشی تێدایە، بەڵام ئەوە جەوهەرو كاكڵەكەیەتی و، ئەو هەناوو هەوێنەیە كە شتەكانی دیكە هەموویان لەخزمەت ئەو كاكڵ و جەوهەرەدان.

ئنجا هەروەك چۆن وشەی: **(إِنَّمَا)** ئامرازی كورت هەڵهێنان و چەسپاندنە، بە هەمان شێوەش وشەی **(أَنَّمَا)**ش هەمان مانا دەگەیەنێ، وشەی **(أَنَّمَا)**ش

هـەر دەسـتە خوشـکی (إِنَّما)یـە، بـەڵام (إِنَّمـا) لـە سـەرەتای ڕسـتەدا دێ و (أَنَّمـا) لـە نێوەڕاسـتی ڕسـتەدا دێ، (أَنَّمـا)و (إِنَّمـا)ش هەردووکیـان پێکهاتـوون لـە: (إِنَّ) کـە بـۆ تەئکیـد کردنـەوەو جەختکردنەوەیـە، لەگـەڵ (مـا) کـە (مـا الكافـة)ی پـێ دەڵێـن، ئەویـش زیـاد کـراوە، ئەمـەش بۆچـی؟ بـۆ ئـەوەی مانـای (مـا) و (إلاَّ) بگەیەنـێ، واتـە: (مَـا هُنَـاكَ إِلـهٌ إِلاَّ إِلـهٌ وَاحِـد)، واتـە: وشـەی (أَنَّمـا) هـەم مانـای (مـا) بـۆ لابـردن (نفـي) و، هـەم مانـای (إلاَّ) بـۆ هـەڵاواردن (إسـتثناء) دەگرێتـەوە، واتـە: هیـچ پەرسـتراوێك نیـە جگـە لـە یـەك پەرسـتراوی تـاك.

٤)- ﴿ فَٱسۡتَقِيمُوٓاْ إِلَيۡهِ ﴾، ئنجا ئێوە خۆتان بەرەو ئەو پەیام و وەحییە ڕاست بکەن، لێرەدا دەگونجێ مەبەست لە: ﴿ فَٱسۡتَقِيمُوٓاْ إِلَيۡهِ ﴾، بریتی بێ لە (فَاسْتَقِيمُوا لَهُ)، خۆتانی بۆ ڕاست بکەن، چونکە دەگوترێ: (ذَهَبْتُ إِلَيْهِ وَذَهَبْتُ لَهُ)، واتە: لە زمانی عەرەبیدا جاری وا هەیە (ل) لە شوێنی (إلى)دا دادەنیشێ و، جاری واش هەیە (إلى) لە شوێنی (ل)دا دادەنیشێ.

یاخـود ﴿ فَٱسۡتَقِيمُوٓاْ إِلَيۡهِ ﴾، وشـەی (إسـتقيموا) بۆیـە بـە (إلى) بـەرکاری خواسـتوە، چونکـە مانـای (تَوَجَّهُـوا) یـان (أَنِيبُـوا)ی خراوەتـە نێـو، واتـە: ڕووی تێبکەن، یاخـود بـۆ لای بگەڕێنـەوە، کەواتـە: (إستَقِيمُوا)، هـەم مانـای خـۆی دەگەیەنـێ، کـە بریتیـە لـە ڕێـك وەسـتان، لـە هەمـان کاتیشـدا بـە مانـای بـە ڕێکیـی ڕووی تێبکـەن، یـان بـە ڕێکیـی بـۆ لای بگەڕێنـەوە، دێ.

٥)- ﴿ وَٱسۡتَغۡفِرُوهُ ﴾، داوای لێبوردنیشی لێبکەن.

٦)- ﴿ وَوَيۡلٞ لِّلۡمُشۡرِكِينَ ﴾، سزای سەختیش بۆ هاوبەش بۆ خوا دانەران.

کەواتـە: مانایەکـەی بـەم شـێوەیەی لـێ دێتـەوە: ئێـوە بەندایەتیـی خۆتـان بـۆ لای خـوا سـاغ بکەنـەوەو، هاوبەشـی بـۆ دامەنێـن، واتـە: جگـە لـەوی مەکەنـە هاوبەشـی و، لـەوەش کـە ڕابـردووەو هاوبەشـتان بـۆ دانـاوە، داوای لێبـوردن و چاوپۆشـیی لـێ بکـەن.

٧)- ﴿ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ ﴾، لێرەدا خوا ﷻ وەسفێکی دیکەی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان دەکات: ئەوانەی کە زەکات نادەن، لێرەدا زەکات بە دڵنیایی مەبەستی پێ صەدەقەو ماڵ بەخشینە، بە بەڵگەی ئەوەی کە (**يُؤْتُونَ**)ی لەگەڵ هاتوە، (**يُؤْتُونَ أَي: يَدْفَعُونَ أَو يُعْطُونَ**)، دەیدەن یان دەبەخشن، کەواتە: ﴿ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْتُونَ ﴾، واتە: (**لا يَدْفَعُونَ الزَّكاةَ، أَو لا يُعْطُونَ الزَّكاةَ**)، واتە: زەکات نادەن، یان نایبەخشن.

وەك گوتمان بەهۆی هەبوونی کرداری (**يُؤْتُونَ**)، لێرەدا (**الزَّكاة**) بە مانای ماڵ بەخشین دێ، ئەگەرنا دەشگونجا (**الزَّكاةَ**) بە مانای خۆ پاككردنەوەش هاتبایە.

### لێرەدا پرسیارێك دێتە ئاراوە:

ئەم سوورەتە مەككەییە، لە مەككەش زەکات فەرز نەكرابوو لەسەر مسوڵمانان، ئەدی چۆن لێرەدا خوا ﷻ باسی زەکات دەکات و، سەرزەنشتی کافران دەکات لەسەر ئەوەی زەکات نادەن؟!

### وەڵامەکەی ئەوەیە:

چ نوێژو، چ زەکات و، چ ڕۆژوو، ... هتد، ئەمانە لە قۆناغی مەككەشدا هەبوون، بەڵام وەك ئەسڵەکەیان هەبوون، نەوەك دوا قۆناغیان، بۆ وێنە: نوێژ هەر بووە، بەڵام دوایی پێنج نوێژەکان فەرز کراون، هەروەها نوێژی هەینیی و جەژنەکان و نوێژەکانی دیکە، هەروەها ڕۆژووگرتن هەر بووە، بەڵام دوایی لە ساڵی دووەمی کۆچییدا گرتنی ڕۆژووی ڕەمەزان فەرز کرا، هەروەها زەکاتیش هەر بووە، بەڵام دوایی لە ساڵی هەشت یان نۆی کۆچیی لە سوورەتی (**التوبة**)دا فەرز کراوەو، دیاریکراوە بدرێ بە کێ و چۆن بێ و، چۆن نەبێ؟ بەڵام لە مەككە ئەصڵی ئەو کارانە هەر بووە، ماڵ بەخشین هەر بووەو، مسوڵمانانی بۆ هاندراون، کەسێکیش ماڵی خۆی نەبەخشییێ، بە کەسانی ئاتاج و نەدار، سەر زەنشتکراوە، هەروەك سەرزەنشتی کەسانێکیش کراوە کە نوێژ ناکەن، بۆ وێنە: لە سوورەتی (**القيامة**)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَلَا صَدَّقَ وَلَا صَلَّىٰ ﴿٣١﴾ وَلَٰكِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ ﴿٣٢﴾ ﴾،

سەرزەنشتیان دەکات لەبەر ئەوەی نوێژیان نەکردوە، هەروەها لە سوورەتی (**المدثر**)دا دەفەرمویێ: ﴿ قَالُواْ لَمْ نَكُ مِنَ ٱلْمُصَلِّينَ ﴿٤٣﴾ وَلَمْ نَكُ نُطْعِمُ ٱلْمِسْكِينَ ﴿٤٤﴾ وَكُنَّا نَخُوضُ مَعَ ٱلْخَآئِضِينَ ﴿٤٥﴾ وَكُنَّا نُكَذِّبُ بِيَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿٤٦﴾ ﴾، سوورەتی (**المدثر**)یش لەو سوورەتانەیە کە هەر لە سەرەتای قۆناغی مەککەدا هاتوونە خوار، مانای وایە لە قۆناغی مەککەشدا نوێژ کردن هەر بووە، بەڵام نەك ئەو پێنج نوێژە کاتەکانیان بەو شێوازە دیارییکرابێ، کە دواتر دیارییکراون.

٨)- ﴿ وَهُم بِٱلْآخِرَةِ هُمْ كَٰفِرُونَ ﴾، هەروەها ئەوان بە مەنزڵگای کۆتایی بێبڕوان، لێرەدا ﴿ وَهُم بِٱلْآخِرَةِ ﴾، (**الأخرة**) سیفەتی وەسفکراوێکی قرتێراو (**مَحْذُوف**)ە، واتە: (**وَهُمْ بِالحَيَاةِ الآخِرَةِ، أَو بِالدَّارِ الآخِرَة**)، ئەوان بە ژیانی دواتر، یان بە مەنزڵگای دواتر.

﴿ هُمْ كَٰفِرُونَ ﴾، لێرەدا: (**هُمْ**)، ڕاناوی لێك جیا کردنەوە (**ضَمِيْر الفَصل**)ە، بۆ جەختکردنەوەو تۆخکردنەوەی مانایەکەیەتی.

دواتر خوا ﷻ دێتە سەر باسی بڕواداران:

٩)- ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی بڕوایان هێناوەو، کردەوە باشەکانیان ئەنجامداون، وەك زۆر جاری دیکە گوتوومانە: (**آمَنُوا**)، هەمیشە بەرکارەکەی قرتێنراوە، واتە: (**آمَنُوا بِاللهِ وَمَلَئِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَاليَومِ الآخِرِ وَبِالْقَدَرِ خَيرِهِ وَشَرِّهِ**)، واتە: بڕوایان هێناوە بە هەموو ئەو شتانەی کە پێویستە بڕوایان پێ بهێنرێ.

(**عَمِلُوا**)، یانی: ئەنجامیان داوە، (**الصَّالِحَات**) دیسان سیفەتی وەسفکراوێکی قرتێنراوە، یانی: (**عَمِلُوا الخِصالَ الصَّالِحَات، أَو عَمِلُوا الأَعمَال الصَّالِحَات**)، خەسڵەتە باشەکان، یان کردەوە باشەکانیان ئەنجام داون، ئەوانەی وان:

١٠)- ﴿ لَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ ﴾، پاداشتێکی نەبڕاوەیان هەیە، لە حاڵەتی ئاسایی دا دەبووایە فەرمووبای: (**أَجرٌ غَيْرُ مَمْنونٍ لَهُم**)، بەڵام بۆیە (**الجارّ والمجرور**) پێشخراوە، لەبەر گرنگیی پێدان، وەك (**إِيَّاكَ نعبد**).

وشـەی (أَجْر)یـش: بریتیـە لـە قەرەبوویەكـی بـە كەڵـك، پاداشـتێكە خاوەنەكـەی لێـی بەهرەمەنـد بـێ.

وشەی (مَمنُونٍ): زانایان بە دوو واتایان لێكیان داوەتەوە:

أ- هەندێكیان گوتوویانە: (ممنون مَفْعُولٌ مِنَ المَنّ، وَهُوَ ذِكْرُ النِّعْمَةِ لِلْمُنْعَمِ عَلَيْهِ بِهَا أَي: غَيْرِ مَمْنُونٍ بِهِ عَلَيْهِ)، واتە: (مَمنُون) بەركارە لە (مَنّ)، ئەویش بریتیە لە باسكردنی چاكە بۆ كەسێك كە چاكەكەی لەگەڵدا كراوە، واتە: منەتیان لەسەر ناكرێ، ئەم واتایە (محمد الطاهر بن عاشور) هێناویەتی، بەڵام پێم بەهێز نیە، بەڵكو ئەو واتایەی زۆرینەی توێژەرەوانم پێ بەهێزترە كە لە خاڵی دووەم دا دەیهێنین.

ب- (﴿لَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ ۝٨﴾، أَي غَيْر مَقْطُوع)، چونكە (مَنَّهُ أَي قَطَعَهُ)، یاخود (غَيْرُ مَنْقُوص) پاداشتێكی نەبڕاوەیان هەیە، یاخود پاداشتێكیان هەیە كە ناتەواویی تێدانیە، بەڵكو تێرو تەواوەو، بەردەوامەو نەبڕاوەیە.

## مەسەلەی سێیەم:

**فەرمانکردنی خوا ﷻ بە نکووڵییکردنی پێغەمبەر ﷺ لە بێبڕوایان، کە بەرانبەر بەو زاتە بێبڕوابن، کە زەمین و پێکهاتەکانی لە ماوەی چوار ڕۆژاندا (واتە: بە چوار قۆناغ)و، ئاسمانیشی بە دوو قۆناغ دروست کردوەو کەرەستەکەیشی دوو کەڵ بووە، پاشان ئاسمانی نیزیکتر لە ئێمەی خەڵکی سەر زەوی، بە ئەستێران ڕازاندۆتەوە، هەم بۆ جوانیی، هەم بۆ پاراستنی لە شەیتانەکان، بە هۆی تیر بارانکرانیان بە پریشك و بڵێسەکانیان، تاکو گوێ لە قسەی فریشتەکان نەگرن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿قُلْ أَئِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ بِالَّذِي خَلَقَ الْأَرْضَ فِي يَوْمَيْنِ وَتَجْعَلُونَ لَهُ أَندَادًا ذَٰلِكَ رَبُّ الْعَالَمِينَ ﴿٩﴾ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ مِن فَوْقِهَا وَبَارَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَا أَقْوَاتَهَا فِي أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ سَوَاءً لِّلسَّائِلِينَ ﴿١٠﴾ ثُمَّ اسْتَوَىٰ إِلَى السَّمَاءِ وَهِيَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ائْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَا أَتَيْنَا طَائِعِينَ ﴿١١﴾ فَقَضَاهُنَّ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ فِي يَوْمَيْنِ وَأَوْحَىٰ فِي كُلِّ سَمَاءٍ أَمْرَهَا وَزَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِمَصَابِيحَ وَحِفْظًا ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ ﴿١٢﴾﴾

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە بیست بڕگەدا:

١)- ﴿قُلْ أَئِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ بِالَّذِي خَلَقَ الْأَرْضَ﴾، (ئەی موحەممەد ﷺ!) بڵێ: ئایا ئێوە بێبڕوان بەو کەسەی زەوی دروستکردوە، هەمزە (أ)ی ﴿أَئِنَّكُمْ﴾، بۆ پرسیار کردنی سەرزەنشتکردنە (**الإسْتِفْهَام التَوْبِيْخي**).

پسپۆڕان گوتوویانە: (**وَفِي الإفْتِتَاحِ بِالإسْتِفْهَامِ وَحَرْفَي التَّأكِيدِ، دِلالَةٌ عَلى أَنَّ أَمْراً مُهِمّاً سَيُلْقَى إِلَيهِم**)، کە دەفەرموێ: ﴿قُلْ أَئِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ﴾، لێرەدا لە سەرەتادا کە هەم بە پرسیارێکی سەرزەنشتکەرانەو، بە (إِنَّ)و بە (لَـ) جەختی لێکراوەتەوە، ئەوە دەگەیەنێ کە قسەو باسێکی گرنگیان پێ ڕادەگەیەنێ.

٢)- ﴿ فِي يَوْمَيْنِ ﴾، له دوو ڕۆژان دا، واته: له دوو قۆناغاندا، دواتر باسی دەکەین، وشەی (يَوم) به مانای ماوەیەك له کات دێ، بۆیه: تەعبیری (يَوْمَيْنِ) یانی: {له ماوەی دوو ئەندازه له کات دا}، واته: به دوو قۆناغ، زەوی هێنراوەته دی.

که دەفەرموێ: ﴿ فِي يَوْمَيْنِ ﴾:

١- هەندێك له زانایان گوتوویانه، واته: دوو ڕۆژی وەك ڕۆژی خۆمان، ئنجا هەندێکیان ڕۆژەکانیشیان دیارییکردوون، بۆ وێنه: ڕۆژی شەممەو یەك شەممە، یاخود ڕۆژی دووشەممەو سێ شەممە! که به ڕاستیی ئەوه زۆر سەرکێڵ و ساده تێگەیشتنه له قورئان!.

٢- هەندێکیشیان گوتوویانه: مەرج نیه ڕۆژانی وەك: دووشەممەو سێ شەممه بن، چونکه تاکو زەوی نەبووبێ و، زەوی به دەوری خۆیداو له بەرانبەر خۆردا نەخولابێتەوە، ڕۆژو هەفتەو مانگ و ساڵ دروست نەبوون، بەڵام ئەو دوو ماوەیه له کات، به قەدەر دوو ڕۆژی ئێستای ئێمه بوون، که بریتیه له چل و هەشت (٤٨) سەعات.

مانای دووەمیان تۆزێك عەقڵ دەیگرێ، بەڵام له ڕاستییدا ئەویش هەم لەگەڵ واقیعی دروست بوونی گەردوون و، هەم لەگەڵ چەمك و واتای ئایەتەکاندا ناگونجێ، وەك دوایی له کورته باسێکدا دەیخەینه ڕوو، کەواته: ﴿ فِي يَوْمَيْنِ ﴾، واته: له دوو قۆناغ و ماوەی کاتییدا، بەڵام ئایا ئەو دوو قۆناغه چەند بوون؟ نازانین.

٣)- ﴿ وَتَجْعَلُونَ لَهُۥٓ أَندَادًا ﴾، ئایا هاوتایانی بۆ دادەنێن؟! (أَنْدَاد) کۆی (نِدّ)ە، (**وَهُوَ المِثْلُ وَالكُفْءُ**)، واته: وێنەو هاوتا.

٤)- ﴿ ذَٰلِكَ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، ئا ئەوه {ئەو زاتەی زەوی به دوو قۆناغان دروستکردوه}، پەروەردگاری جیهانییانه، بۆیه به ناوی ئاماژەی دوور هێناویەتی، چونکه ئاماژەیه بەوەی مەقامی ئەو زاته زۆر بەرزه، یاخود لەبەر ئەوەی له عەقڵی ئەوانەوه زۆر دووره، که تەنیا ئەو بپەرستن و هاوبەشی بۆ دادەنەنێن.

٥)- ﴿وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ مِن فَوْقِهَا﴾، لەسەرروویەوەش چەسپاوەكانی داناون، واتە: چیا چەسپاوەكانی تێدا داناون، چونكە: ﴿رَوَاسِيَ﴾: (**صفةٌ مَوْصُوفٍ مَحْذُوف**)، واتە: (**وَجَعَلَ فِيهَا الجِبالَ الرَّوَاسِي**)، چیا چەسپاوەكانی تێدا داناون، (**الرَّوَاسِي صِفَةُ الجِبَالِ مِثْلُ**: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ الْجَوَارِ﴾، (**أي: السُّفُنُ الجَوَارِي**)، وشەی ﴿رَوَاسِيَ﴾، سیفەتی چیایەكانە، بەڵام چونكە دەزانرێ مەبەست لە چەسپاوەكان شاخەكانە، بۆیە خوا ﷻ بە پێویستی نەزانیوە، وشەی (**جِبال**) بهێنێ، هەروەك لە سوورەتی (**الشورى**)دا خوا ﷻ دەفەرمویێ: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ الْجَوَارِ فِي الْبَحْرِ كَالْأَعْلَامِ ﴿٣٢﴾﴾، واتە: لە نیشانەكانی خوا ڕۆیشتووەكانن بە دەریادا، وەك چیای بەرز، ڕۆیشتووەكان، واتە: (**السُّفُنُ الجَوَارِي**)، كەشتییە ڕۆیشتووەكان.

بۆچی لێرەدا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ مِن فَوْقِهَا﴾، چیایە چەسپاوەكانی لە سەرروویەوە داناون؟ لە حاڵێك دا كە چیایەكان هەر لەسەر ڕووی زەوین؟ لێرەدا خوا ﷻ ئاماژە بە زەوی دەكات، بۆ ئامادەكردنی وێنەو دیمەنی سەرنجڕاكێشی چیایەكان لەبەرچاومان.

هەڵبەتە ئێمە لە شوێنی دیكەدا باسی چیایەكانمان كردوە، وەك سوورەتی (**الرعد**)و شوێنی دیكەش[١]، كە چیایەكان وەك پەیكەری ئێسك وان بۆ زەوی و توێكڵی زەوییان زۆر مەحكەم كردوە، هەروەها لە شوێنی دیكەدا باسی سوودەكانی چیایەكانمان كردوە، كە هەم سەرچاوەی كۆكردنەوەی ئاون، هەم سەرچاوەی كۆكردنەوەی كانیی و ڕووبارو جۆگاو جۆبارەكانن، هەروەها سەرچاوەی داهاتی گەلێك لە میوەو دارو درەختن، هەروەها زۆرجار تەوژمی بایەكان دەگێڕنەوەو، كاریگەریی زۆریان هەیە بۆ پاراستنی زەوی كە لە كاتی ئاگر پرژێنەكان و بوومەلەرزەكاندا، لێك هەڵنەوەشێ و، وەك چۆن پەیكەری ئێسكیی جەستەی مرۆڤ دەگرێ، چیایەكانیش ئاوا هەموویان بە یەكەوە ئاڵقە بەندن، بە یەكەوە توێكڵی زەوییان مەحكەم كردوە.

---

(١) بۆ وێنە: تەفسیری سوورەتی (النبأ)، ئایەتی: (والجبال أو تاداً).

بەرزترین لووتکەی چیا لەسەر ڕووی زەوی، لووتکەی (ئیڤریست - Everest)ە، لە زنجیرە چیای هیمالایە، کە (٨٨٤٩) مەتر بەرزە لە ئاستی ڕووی دەریاوە، واتە: نیزیکەی نۆ کیلۆمەتر لە ئاستی ڕووی دەریاوە بەرزە، زانایانی جیۆلۆجیی دەڵێن: هەر چیایەك چەندەی بە دەرەوەیە، دە (١٠) تاکو پازدە (١٥) هێندەی بە ناخی زەویدا چۆتە خوارێ، بەو پێیەش بێ، چیای هیمالایە کە لووتکە بەرزەکەی دەوری (٩) کیلۆمەترە، نۆ جارانی دە بکە (٩ x ١٠ = ٩٠)، بەلای کەمەوە (١٠٠) کیلۆمەتر لەو چیایە لە ناخیی زەویدایە، هەر بۆیەش خوا ﷻ ناوی لە چیایەکان ناوە (أَوتاد)، کە کۆی (وَتَد)ە، واتە: گوڵمیخ و سینگ، ئەو گوڵمیخ و سینگەی چادرو تاوڵی پێ ڕادەگیرێ، یاخود وڵاخێکی پێ دەبەسترێتەوە، کە عادەت وایە بەشی زۆری دادەکوترێ لە زەویداو، بەشێکی کەمی بە دەرەوە دەمێنێتەوە، خوای بەرزیش چیاکانی بە گوڵمیخ وەسف کردوون، وەك چۆن گوڵمیخ کەناری چادرو ڕەشماڵی پێ ڕادەگیرێ، بە هەمان شێوە ئەو چیایانەش زەوییان پێ ڕاگیر کراوە، دوای ئەوەی زانستی زەویناسیی (جیۆلۆجیا) بەرەو پێشچوو، ئنجا زانییان کە هەر چیایەك چەندەی بە دەرەوەیە، دە تاکو پازدە هێندەی بە ناخیی زەویدا چۆتە خوارێ، ئەوەش خۆی ئیعجازێکی عیلمییە.

٦)- ﴿ وَبَٰرَكَ فِيهَا ﴾، هەروەها خوا ﷻ پیزی تێخست، پیزی خستە زەوی، یانی: (**جَعَلَ فِيهَا البَرَكَة**)، وشەی (**بَرَكَة**): بریتیە لە خێرێکی بەردەوام و چەسپاو، هەروەها (**بُرْكَة**) واتە: گۆماو، بۆیە پێی دەگوترێ: (**بُرْكَة**)، چونکە ئاوەکەی تێدا داوەستاوەو ماوەتەوە، کەواتە: (**بَرَكَة**)، واتە: خێرێکی بەردەوام.

﴿ وَبَٰرَكَ فِيهَا ﴾، خوا ﷻ پیت و پیزی تێخستوە لە زەوی، ئەو هەموو نەوتەی خستۆتە نێو زەوی، ئەو هەموو خەڵووزی بەردەی خستۆتە نێوی، ئەو هەموو غازەی تێخستۆتە، هەر خوا خۆی دەزانێ چی دیکەشی تێدایەو، ئێستا مرۆڤایەتیی پەی پێنەبردوە، دواتر بە بەرەو پێش چوونی زانست، دەزانین خوا ﷻ چی دیکەی لە ناخی زەویدا بۆ هەڵگرتووین؟!.

٧)- ﴿ وَقَدَّرَ فِيهَآ أَقۡوَٰتَهَا ﴾، هەروەها (خوا) بژیوەکانی لە زەویدا ئەندازەگیریی کردن، (**قَدَّرَ أَيْ: جَعَلَ قَدْراً أَي مِقْدَاراً، وَالمِقْدَارُ: النِّصَابُ المَحْدُودُ بِالنَّوْعِ وَالكَمِّيَّة**)، (**قَدَّرَ**) واتە: ئەندازەی بۆ دانا، کە بریتیە لەو ئەندازە دیارییکراوە بە چەندێتیی، یاخود بە چۆنیەتیی.

﴿ وَقَدَّرَ فِيهَآ أَقۡوَٰتَهَا ﴾، (**أَي: تَقْدِيرُ كُلِّ نَوعٍ مِنَ القُوتِ بِمَا يَصلُحُ لَهُ مِنَ الأَوقَاتِ**)، واتە: ئەندازەگیریی کردنی هەر کام لە بژیوەکان، بەپێی ئەوەی بۆی دەگونجێ لەگەڵ کاتەکەدا، زۆر لە دانەوێڵەکان لە کەشی پایزو زستاندا دەچێنرێن، بەڵام دواتر لە کەشی بەهارو هاویندا هەڵدەگیرێنەوە، هەروەها هەندێك لە میوەکان لە کەشی هاویندا پێدەگەن، هەندێکیان لە کەشی پایزو زستاندا پێدەگەن، هەندێکی دیکەیان لە بەهاردا پێدەگەن، ئنجا ئەگەر هەرچی میوەیە لە یەك کەشدا پێ گەیشتبایە، بە کەڵك نەدەهات.

دیسان لە ڕووی پێگەیشتنیانەوە جیاوازیی هەیە: دانەوێڵە یەکجار بەرەکەی دەردەکات و، یەکجار دەدوورێتەوە، وەك نیسك و گەنم و جۆو نۆك و هەرزن و ماش و برنج، بەڵام تەرەکارو میوەو سەوزەکان، چین چین بەرهەم دەردەکەن، جارێك دەچنرێ، دوای ماوەیەك دیسانەوە بەرهەم دەردەکات و دەچنرێتەوە، هەیانە حەوت جارو بگرە زیاتریش بەر دەردەکات، بۆ ئەوەی هەموو پێکەوە نەبێ و خەسار ببێ (سبحان الله) لە کاری خوا!

پسپۆڕان گوتوویانە: (**جَمْعُ الأَقْوَاتِ مُضَافاً إِلَى ضَمِيرِ الأَرضِ، يُفِيدُ العُمُومَ**)، یانی: وشەی (**أقوات**) کە کۆی (**قوت**)ەو پاڵدراوەتە لای ڕاناوی زەوی، (**أَقْوَاتَهَا**) ئەمە مانای گشتاندن دەگەیەنێ، واتە: تێکڕای بژیوەکانی زەوی تێدا دانان، بۆ تێکڕای ئەوانەی پێویستییان بە بژیو هەیە، واتە: نەك تەنها مرۆڤ، بەڵکو درندەو باڵندەو ئاژەڵ و خشۆکەکان و زیندەوەرەکان بە تێکڕایی، هەروەها لە نێویشیاندا مرۆڤ و جند، چونکە ئەوانیش هەر بەوە دەژین کە لەسەر زەوی هەیە.

٨)- ﴿ فِيٓ أَرۡبَعَةِ أَيَّامٖ ﴾، لە چوار ڕۆژاندا، واتە: بە چوار قۆناغ، کە دەفەرموێ: ﴿ فِيٓ أَرۡبَعَةِ أَيَّامٖ ﴾، (**فَذَلِكَةٌ لِمَجمُوعِ مدَّةِ خَلْقِ الأَرضِ: جُرْمِها وَما عَلَيهَا مِنَ رَواسِي، وَمَا فِيهَا**

**مِنَ البَرَكاتِ وَالأَقْوات)** كە دەفەرمویٚ: لە ماوەی چوار ڕۆژاندا، واتە: بە چوار قۆناغ، ئەمە کۆکەرەوەی کۆی دروستبوونی زەوییە، خودی زەوی و پێکهاتەکانی زەوی، کە تێدا چەسپێنرانی چیایەکان و، پیت و پێز تێخستنی و، تێدا دانانی بژیوەکانە، هەر کامێکیان لە کاتی خۆیداو بە ئەندازەی خۆی.

کەواتــە: خــودی زەوی بــە دوو قۆنــاغ دروســتبووەو، پێکهاتەکانیشــی بــە دوو قۆناغــی دیکــە تێیــدا هێنراونــە دی، یــانی: کــۆی دروســتبوونی و زەوی و پێکهاتەکانــی، لــە چــوار قۆناغانــدا بــووە، ئنجــا بــۆ ئــەوەی لێــمان تێکنەچــێ: دواتــر خــوا ڕوو دەکاتــە ئاســمان کــە دووکــەڵ بــوو و ئەویشــی لــە دوو ڕۆژانــدا دروســتکرد، کەواتــە: چــوار ڕۆژەکــەی دروســتبوونی زەویــی و پێکهاتەکانــی لەگــەڵ دوو ڕۆژەکــەی دروســتبوونی ئاســماندا کــە خایاندوویانــە، هەمــووی دەکاتــە شــەش ڕۆژ (شــەش قۆنــاغ)، کــە خــوا ﷻ لــە چەنــدان شــوێنی قورئانــدا باســی شــەش قۆنــاغ دەکات بــۆ دروســتبوونی زەوی و ئاســـمان، بــەڵام کەســێك ورد نەبێتــەوەو نەزانــێ، وای دادەنــێ کــە زەوی بــە دوو ڕۆژان دروســت بــووەو، دوایــی پێکهاتەکانــی بــە چــوار ڕۆژان و، ئاســمانیش بــە دوو ڕۆژان، کەواتــە: دەکاتــە هەشــت ڕۆژ! بــەڵام وەك گوتــم: لــە ئەنجامــی هەڵــە حیســاب کردنەکــەدا ئــەو کەســە بــە هەڵــەدا چــووە، ئەگەرنــا ئایەتەکــە وا نافەرمــوێ.

٩)- ﴿ سَوَآءً لِّلسَّآئِلِينَ ﴾، وشەی: (**سَوَاءً**)، خوێنراویشەتەوە: (**سَوَاءٍ**)، واتە: بە چوار قۆناغی یەکسان، ئەو قۆناغانە، وەك یەك بوون، هەروەها خوێنراویشەتەوە: (**سَوَاءٌ**) بە هەر سێ جۆرە خوێندنەوەکە هاتوە.

کــە دەفەرمــوێ: ﴿ سَوَآءً لِّلسَّآئِلِينَ ﴾، لێــرەدا: (**للسَّــائِلِينَ**)، دەگونجــێ بــە واتــای پرسیارکەران بــێ، واتــە: ئــەو چــوار قۆناغــە بــە ئەنــدازەی یــەك بــوون، بۆیــە خــوا ﷻ ئــەوەی ڕوونکردۆتــەوە، بــۆ کەســانێك کــە بپرســن: ئایــا ئەندازەکەیــان چەنــد بــووە؟ ئەنــدازەی ئــەو چــوار قۆناغــەی زەوی و پێکهاتەکانــی پــێ دروســتکران، بــە قــەدەر یــەك بــوون و یەکســان بــوون، دەشــگونجێ: (**للسَّــائِلِينَ**)، بــە مانــای داواکــەران بــێ،

واتـە: ﴿ وَقَدَّرَ فِيهَآ أَقْوَٰتَهَا فِىٓ أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ ﴾، بژیوەکانـی تێـدا ئەندازەگیریـی کـردن لـە چـوار قۆناغانـدا، ﴿ سَوَآءً لِّلسَّآئِلِينَ ﴾، پـڕ بـە پێسـتی داواکاران، ڕێـك و تـەواو لەگـەڵ ئـەوەی کـە داواکاران بـە زمانـی حـاڵ داوایـان کـردوە، هەرچـی ئـەوان پێویسـتییان پێبـووە، بـە تەواویـی خـوا ﷻ لەسـەر زەوی دا دایناوەو، بژیوەکانـی تێـدا ئەندازەگیریـی کـردوون.

١٠)- ﴿ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ ﴾، دوایی خوا ڕووی کردە ئاسمان، وشەی: (**اسْتَوَى**)، ئەگەر بە (**عَلَى**) بەرکار بخوازێ، واتە: چووە سەری و نیشتەجێ بوو و بەرز بۆوە، بەڵام ئەگەر: (**اسْتَوَى**)، بە (**إِلى**) بەرکار بخوازێ، (**يَعْنِي: قَصَدَ نَحوَهَا قَصْداً سَوِيّاً**)، بە ڕێکیی ڕووی تێکردو ویستی، کەواتە: ﴿ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ ﴾، (**أَي عَمَدَ إِلى السَّماء، وَقَصَدَ السَّماءَ قَصْداً سَوِيّاً**)، ڕێك ڕووی لە ئاسمان کردو ویستی بیهێنێتە دی.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ ﴾، لەوبـارەوە هەندێـك لـە زانایـان دەڵێـن: (**إِستَوى إِلى مَكَانِ كَذا، أَي تَوَجَّهَ إِلَيهِ تَوَجُّهاً لا يَلْتَفِتُ إِلى سَواهُ**)، واتـە: ڕووی کـردە فـڵان شـوێن، بـە شـێوەیەك کـە ئـاوڕی لـە هیـچ شـوێنی دیکـە نەدایـەوە.

لێـرەدا وشـەی: (**ثُمَّ**)، بـۆ ڕیزبەندیـی کاتیـی نیـە، بەڵکـو بـۆ ڕیزبەندیـی باسـکردن و پلـەو پایـەو پێگەیـە، واتـە: دوای ئـەوەی باسـی دروسـتکرانی زەوی کـرا، ئنجـا...، چونکـە زەوی شـتێکی بچووکـەو، بەشـێکە لـە ئاسـمان و هەمـوو گـەردوون، کەواتـە: لێـرەدا مەبەسـت پـێ ڕیزبەندیـی دروسـتکردن نیـە، چونکـە وەك دوایـی باسـی دەکەیـن، زەوی بەشـێکی بچووکـی گەردوونـە.

١١)- ﴿ وَهِىَ دُخَانٌ ﴾، لەو کاتەدا ئاسمان دوو کەڵ بوو، (**دُخَان**): ئەوەیە کە لە بڵێسەی ئاگر بەرز دەبێتەوە، واتە: ماددەی ئاسمان (گەردوون) شێوەی گازێك بوو کە خوای باڵادەست دووکەڵی بۆ بەکارهێناوە.

١٢)- ﴿ فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ٱئْتِيَا ﴾، خوا ﷻ بە ئاسمان و بە زەویشی گوت: بێن، وەرن، (**أَي: تَكَوَّنا، إِستَجِيبَا لِلخَلقِ**)، دروست بێن، وەڵامبدەنەوە بۆ دروستکران.

وشـەی: ﴿ فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ٱئْتِيَا ﴾، ئیبنـو عەبباس (خـوا لـە خـۆی و بابـی ڕازی بـێ) خوێندوویەتـەوە: (آتِيَا)، یـانی: بـدەن.

١٣)- ﴿ طَوْعًا أَوْ كَرْهًا ﴾، چار و ناچار، بە پێخۆش بوون و پێ ناخۆش بوونەوە، **(طَوعاً وَكَرهاً: مَصدَرَانِ فِي مَوضِعِ الحَالِ، أَي طَائِعَتَينِ أَو مُكرَهَتَين)**، **(طَوعاً)** و **(كَرهاً)** چاوگن و لە شوێنی حاڵدا دانیشتوون، واتە: ملکەچانە و پێخۆشحاڵە، یاخود پێناخۆشحاڵانە، یاخود چارو ناچار.

هەڵبەتـە لێـرەدا کـە دەفەرمـوێ: ﴿ فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ٱئْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا ﴾، بـە ویـش و بـە زەویـشی فەرمـوو: وەرن، دروسـت بـن چـارو ناچـار، بـە پێخـۆش بـوون و پێناخـۆش بوونـەوە، ئەمـە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوە کـە زەویـش هـەر لـە نێـو ئاسـماندا دروسـتبووە، کەواتـە: ئـەوە کـە پێشـێ خـوا ﷻ باسـی دروسـتبوونی زەوی دەکات بـە دوو قۆنـاغ و، دوایـی دروسـتبوونی پێکهاتەکانـی بـە دوو قۆنـاغ و کـۆی زەوی و پێکهاتەکانـی بـە چـوار قۆنـاغ، لەبـەر ئەوەیـە کـە زەوی بـە نسـبەت ئێمـەی مرۆڤـەوە، گرنگیـی و بایەخیـی زیاتـرە، نشـینگەی ئێمەیـەو، هەمـوو ژیانمـان لەسـەریەتی، بۆیـە پێشـێ باسـی دروسـتکردنی زەوی کـردوە، ئەگەرنـا لـە ڕاسـتییدا دروسـتبوونی زەویـش هـەر لـە نێـو دروسـتبوونی ئاسـماندایەو، ئـەو دوو قۆناغـەی ئاسـمانیان پـێ دروسـتبووە، هـاو کات زەویشـیان پـێ دروسـتبووە، کەواتـە: زەوی و ئاسـمانەکان لـە یـەك کاتـداو، بەیەکـەوە دروسـتبوون، چونکـە دوایـی کـە دەفەرمـوێ: ﴿ فَقَضَىٰهُنَّ سَبْعَ سَمَوَاتٍ ﴾، خـوا تێکیپەڕانـدن لـە شـێوەی حـەوت ئاسـماناندا، لێرەدا بۆیـە باسـی زەوی نەکردۆتـەوە، چونکـە زەویـش هـەر لـە نێـو ئاسـمانەکاندایە، بۆیـە کـە حـەوت ئاسـمانەکان دروسـت بـوون بـە دوو قۆنـاغ، مانـای وایـە هـاو کات لەگـەڵ ئەوانـدا، زەویـش دروسـت بـووە.

بـەڵام وەك دوایـی باسـی دەکەیـن، زەوی سـەربەخۆ دروسـت نەبـووە، بەڵکـو بەشـێك بـووە لـە خـۆر، دوایـی لـە خـۆر جیابۆتـەوە، کـە بـە مەزەنـدەی زانایانـی

فیزیـای ئێسـتا، خـۆر ئەسـتێرەیەکە لـە نێـوان یـەك تریلیـۆن (١,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) ئەستێرەدا، کـە وەك خـۆرن، یاخـود گەورەتـرن، یاخـود بچووکترن، ئنجا خـۆری ئێمـە یەکێکـە لـەو ئەستێرانە، زەوی ئێمـەش لـە خـۆر جیابۆتـەوەو خـۆر یەکێکـە لـە یـەك تریلیـۆن ئەستێرەی دیکـەی نـاو یـەك کەهکەشـان، کـە بـە مەزەنـدەی زانایـان دەڵێن: دوو سـەد ملیـار کەهکشـان دۆزراونـەوە لـە گەردوونـداو، هەندێکیـش دەڵێـن: یـەك تریلیۆن! هەڵبەتـە هەمـوو ئەوانـەش مەزەنـدەو نیزیـك خسـتنەوەن، نـەك بـە ڕێکیی و کـت و مـت و وردیـی بـێ، گرنـگ ئەوەیـە ژمـارەی کەهکەشـانەکان لـە گەردوونـدا زۆر زۆرە، هـەر کام لـەم کەهکەشـانانەش وەك ئـەو کەهکەشـانەی ئێمـە کەمتر یـان زیاتـر ئەسـتێرەی تێـدان.

١٤)- ﴿ قَالَتَآ أَتَيۡنَا طَآئِعِينَ ﴾، گوتیان: ملکەچییمان بەخشیی، یاخود ئەوەی پێمان گوتراوە جێبەجێی بکەین، ئەوە جێبەجێمان کرد، ئەوە فەرمانبەرییمان بەخشیی.

کەواتـە: (آئْتِيَـا)، ئەمـە لـە (**مُؤَاتـاة**)ە، واتـە: بـە گـوێ کـردن و بـە قسـە کـردن، ئەوانیـش گوتوویانـە: (**أتينـا**)، هاتیـن، یـان: بەخشـیمان و دامـان.

١٥)- ﴿ فَقَضَىٰهُنَّ سَبۡعَ سَمَٰوَاتٍ ﴾، ئنجا خوا تێکیپەڕاندن لە شێوەی حەوت ئاسماناندا، (**أي: خَلَقَهُنَّ، أو أَحْكَمَهُنَّ، أو فَرَغَ مِنْهُنَّ**)، واتە: هێنانیە دی، یاخود قایم و توندو تۆڵی کردن، یاخود لێیان بۆوە.

کـە دەفەرمـوێ: (**فَقَضَاهُـنَّ**)، ڕاناوەکـەی دەچێتـەوە سـەر ئاسـمان، کـە ئاسـمان مـێ (**مُؤَنَّـث**)ە و یەکـە، بـەڵام بۆیـە بـە کـۆ (**جمـع**) هاتـوە، لەسـەر مانـای ئـەوە کـە دوایـی دەبـێ بـە حـەوت ئاسـمان، یاخـود لـەو ڕووەوە کـە: ﴿ ٱلسَّمَآءِ ﴾، نـاڕوون (مبهـم)ە، بـەڵام دوایـی بـە: ﴿ سَبۡعَ سَمَٰوَاتٍ ﴾، ڕوون دەکرێتـەوە.

ئنجـا ﴿ سَبۡعَ سَمَٰوَاتٍ ﴾، (منصـوب)ە، چونکـە تەفسـیرە بـۆ: (**فَقَضَاهُـنَّ**)، یاخـود جێگـرەوە (**بَدَل**)یـە بـۆ ڕانـاوی (**هُـنَّ**)، یاخـود بـەرکاری دووەمـە بـۆ: (**فَقَضَاهُـنَّ**)، کـە (**هُـنَّ**) دەبێتـە بـەرکاری یەکـەم و، ﴿ سَبۡعَ سَمَٰوَاتٍ ﴾، دەبێتـە بـەرکاری دووەم،

لەبەر ئەوەی (قَضَا)، مانای (صَيَّرَ)ی خراوەتە نێو، (أي صَيَّرَهُنَّ)، وایلێکردن، یاخود: ﴿سَبْعَ سَمَٰوَاتٍ﴾، دەبێتە حاڵ، واتە: دروستی کردن و تێکیپەڕاندن، لە حاڵێکدا کە حەوت ئاسمان بوون، یاخود: ﴿سَبْعَ سَمَٰوَاتٍ﴾، تەمییزە، هەموو ئەو حاڵەتانەش لە ڕووی ڕێزمانی عەرەبییەوە دروستن.

١٦)- ﴿فِي يَوْمَيْنِ﴾، لە دوو قۆناغدا، حەوت ئاسمانەکەی هێنانی دی، واتە: لە دوو ماوەی کاتییدا.

١٧)- ﴿وَأَوْحَىٰ فِي كُلِّ سَمَآءٍ أَمْرَهَا﴾، لە هەر ئاسمانێکیشدا فەرمانەکەی پێسپارد، سروش و پەیامەکەی تێدادانا، (أَي: أَمَرَ فِي كُلِّ سَمَاءٍ بِتَرْتِيبِ أَمْرِهَا وَشُؤُونِهَا)، واتە: فەرمانی کرد لە هەر ئاسمانێکدا کە کاروبارەکانی ڕێك بخرێن.

هەندێکیشیان گوتوویانە: (**الوَحِيُ فِي السَّمَاءِ: تَقْدِيرُ نَظْمِهَا وَتَقْدِيرُ جَاذِبِيَّتِهَا وَسَيْرُ نُجُومِهَا وَكَوَاكِبِهَا، وَخَلْقُ المَلَائِكَةِ فِيهَا، وَمَا يَقُومُونَ بِهِ مِن أُمُور، أَمرُهَا: شَأْنُهَا وَهُوَ يَصْدُقُ بِكُلِّ مَا هُوَ مِنْ مُلَابَسَاتِهَا وَأَحْوَالِهَا، وَانتَصَبَ (أَمْرَهَا) عَلَى نَزْعِ الخَافِضِ أَي بِأَمْرِهَا، أَو عَلَى تَضْمِينِ أَوْحَى مَعْنَى قَدَّرَ وَأَوْدَعَ**).

کە دەفەرموێ: ﴿وَأَوْحَىٰ فِي كُلِّ سَمَآءٍ أَمْرَهَا﴾، دەڵێ: مەبەست لە وەحیی لە هەر ئاسمانێکدا، ئەندازەگیریی کردن و ڕێك و پێککردنی سیستمەکەیەتی و، ئەندازەگیریی کردنی هێزی ڕاکێشانیەتی و، ڕێکخستنی جووڵەی ئەستێرەو خڕۆکەکانیەتی، هەروەها ئەو فریشتانەی تێیدا دانراون لە هەر ئاسمانێك داو، ئەو کاروبارانەی پێیان هەڵدەستن، هەروەها کە دەفەرموێ: (**أَمْرَهَا**)، واتە: کاروبارەکەی، ئەویش هەموو ئەو شتانە دەگرێتەوە، کە پەیوەندییان بەو ئاسمانەوەیە، کە ئاماژەمان بە هەندێکیان دا، هەروەها: (**أَمْرَهَا**)، مەنصووبەو حاڵەتی نەصبی وەرگرتوە، لەبەر ئەوەی (**وَأَوْحَى**)، مانای (**قَدَّرَ**) یاخود (**أَوْدَعَ**)ی خراوەتە نێو، یانی: تێیدا ئەندازەگیریی کرد، یاخود کاروباری هەر ئاسمانێکی خستە نێو ئەو ئاسمانەوەو ڕێکیخست.

١٨)- ﴿ وَزَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِمَصَٰبِيحَ ﴾، ئاسمانی نیزیکتریشمان بە چرایان جوانکردوە، ڕازاندۆتەوە.

١٩)- ﴿ وَحِفْظًا ﴾ هەروەها بۆ پاراستنیش، یانی: پاراستنی ئاسمانەکان لە گوێ تێداگرتنی شەیتانەکان، بە پارچەو پریشکی ئەستێرەو خڕۆکەکان.

٢٠)- ﴿ ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ ﴾، ئەوەش ئەندازەگیریی کردنی (خوای) زاڵی زانایە، یانی: دروستکرانی حەوت ئاسمانەکان و زەوی و پێکهاتەکانی و ڕازاندنەوەی ئاسمان و پاراستنی بە هۆی ئەستێرانەوە، تێکڕای بە نەخشەو بەرنامەو ئەندازەگیریی خوای باڵا دەستی زانایە.

## كورتە باسێک لە بارەی دروستبوونی گەردوونەوە

ئـەو چـوار ئایەتـەی لـە دەرسـی پێشـوودا قسـەمان لـە بـارەوە کـردن، کـە دەفەرمـوێ: ﴿قُلْ أَئِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ بِالَّذِي خَلَقَ الْأَرْضَ فِي يَوْمَيْنِ وَتَجْعَلُونَ لَهُ أَندَادًا ذَٰلِكَ رَبُّ الْعَالَمِينَ ﴿٩﴾ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ مِن فَوْقِهَا وَبَارَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَا أَقْوَاتَهَا فِي أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ سَوَاءً لِّلسَّائِلِينَ ﴿١٠﴾ ثُمَّ اسْتَوَىٰ إِلَى السَّمَاءِ وَهِيَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ائْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَا أَتَيْنَا طَائِعِينَ ﴿١١﴾ فَقَضَاهُنَّ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ فِي يَوْمَيْنِ وَأَوْحَىٰ فِي كُلِّ سَمَاءٍ أَمْرَهَا وَزَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِمَصَابِيحَ وَحِفْظًا ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ ﴿١٢﴾﴾، ئـەم چـوار ئایەتـە موبارەکـە کـە پێشـتر شـیمان کردنـەوە، قسـە لـە بـارەی دروسـتبوونی زەویـی و ئاسـمانەوە دەکـەن، بۆیـە بـە باشـم زانـی کـە کورتـە باسـێك لـە بـارەی دروسـتبوونی گەردوونـەوە بکەیـن.

گـەردوون (**الكَوْن**) یـان بوونـەوەر، مەبەسـتمان پێـی هەمـوو ئـەو شـتانەیە کـە خـوا دروسـتی کـردوون، کـە تاکـو ڕاددەیـەك بـۆ ئێمـە زانـراون، کـە زاراوی (ئاسـمان و زەوی)، یـان (ئاسـمانەکان و زەوی)، یـان (حـەوت ئاسـمانەکان و زەوی)، بەکاردەهێنرێ بـۆ تەعبیرکـردن لـە کـۆی دروسـتکراوەکانی خـوا ﷻ جگـە لـە عـەڕش و درەختـی کۆتایـی (**سِـدْرَةُ المُنْتَهـى**)و، هـەر دروسـتکراوێکی دیکـەی خـوا ﷻ کـە لـە سـنووری بوونـەوەردا نیـەو، لـە دەرەوەی چوارچێـوەی بوونـەوەرە.

ئەو کورتە باسەش لە نۆ بڕگەدا شی دەکەینەوە:

**١)**- تەعبیری ئاسمانەکان و زەوی: (**السَّماواتِ والأَرْضُ**)، یاخود ئاسمان و زەوی: (**السَّماءِ والأَرْضُ**)، یان حەوت ئاسمانەکان و زەوی: (**والسَّماواتِ السَّبْع والأَرْض**)، ئەم تەعبیرە مەبەست پێی گەردوونە بە سەرو خواریەوە.

ئنجا لەو چوار ئایەتەی سوورەتی (فُصِّلَتْ)دا، خوا ﷻ سەرەتا باسی چۆنیەتی دروستکردنی زەوی دەکات، هەم وەك پەیدابوونی زەوی، هەم وەك پێکهاتەکانی زەوی و چیایەکان و، ئەو پیت و پێزەی خوا خستوویەتە نێو زەوی و، ئەو بژیوانەی لە زەویدا داینـاون، دوایی خوا ﷻ باسی دروستکردنی ئاسمان دەکات، کە دەفەرموێ: پێش ئەوەی خوا لە شێوەی ئاسمان، یان حەوت ئاسمانانـدا بیهێنێتە دی، دوو کەڵ بوو، بەڵام بۆ زەوی خوا ﷻ باسی ماددەکەی ناکات کە لە چیی بوو، بەس بۆ ئاسمان باس دەکات کە دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِىَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ٱئْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا ﴾، واتە: دوایی (خوا ﷻ) بەرەو ئاسمان چوو (ویستی دروستی بکات)، کە لە شێوەی دووکەڵ دا بوو، {واتە: (گاز) بوو}، بە ویش و زەویشی گوت وەرن پەیدا بن، چارو ناچار، بە پێخۆشبوون و پێناخۆش بوونەوە، ﴿ قَالَتَآ أَتَيْنَا طَآئِعِينَ ﴾، هەردووکیان (ئاسمان و زەوی)، گوتیان: ملکەچانە دروستبووین، یاخود: هاتین بەپێی فەرمانی تۆ.

جێی سەرنج ئەوەیە کە خوا ﷻ ڕاناوی کۆی نێرینەی بۆ ئاسمان و زەوی بەکارهێناوە، ﴿ قَالَتَآ أَتَيْنَا طَآئِعِينَ ﴾، واتە: ئێمە ملکەچانە هاتین، وەك خاوەن ئیرادەو شعوورو عەقڵێك قسە دەکەن، بۆیەش خوا ﷻ ئەو ڕاناوەی بۆ بەکارهێناون، چونکە مامەڵەیان لەگەڵ فەرمانی خوادا، مامەڵەیەك بووە وەك هی خاوەن عەقڵ و شعوورێك بووە کە فەرمانبەرو ملکەچە بۆ خوا، دوایی خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَقَضَىٰهُنَّ سَبْعَ سَمَٰوَاتٍ ﴾، واتە: خوا ﷻ تێکیپەڕاندن، هێنانیە دی حەوت ئاسمان، واتە: ئەو دووکەڵەی کە کەرەسەی خاوی لێ دروستکرانی ئاسمان بوو، خوا لە شێوەی حەوت ئاسمانانـدا، هێنایە دی، ﴿ فِى يَوْمَيْنِ ﴾، واتە: لە دوو ڕۆژاندا، یانی: بە دوو قۆناغ، دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَأَوْحَىٰ فِى كُلِّ سَمَآءٍ أَمْرَهَا ﴾، واتە: لە هەر ئاسمانێکدا فەرمانەکەی دانا، سروشی خۆی لەوێدا دانا، واتە: ئەوەی کە دەبێ لە هەر ئاسمانێکدا ئەنجام بدرێ، خوا ﷻ لەوێی دانا، یانی: ئەو سیستم (**نظام**)ەی پێی بەڕێوەدەچێ، ﴿ وَزَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ

﴿ ٱلدُّنۡيَا بِمَصَٰبِيحَ ﴾، واتـە: ئاسـمانی نیزیکیشـمان، {واتـە: نیزیـك لـە ئێوەمـان ئـەی خەڵکـی زەوی!} بـە چرایـان ڕازانـدەوە، ئـەم تەعبیـرە وەك جـاری دیکـەش باسـمان کـردوە، ئـەوە دەگەیەنـێ کـە هەرچـی ئەسـتێرەیەو، هەرچـی کەهکەشـانەو، هەرچـی گەلـە کەهکەشـانە، هەمـووی دەکەوێتـە سـنووری ئاسـمانی یەکەمـەوە، چونکـە خـوا دەفەرمـوێ: ئاسـمانی نیزیکـتر لـە ئێوەمـان، ڕازانـدەوە، چونکـە وشـەی (**دُنيا**) (**مؤنث**) ی (**أدْنى**)یـە، واتـە: نیزیکـتر، (**دُنيا**)ش هـەر واتـە: نیزیکـتر، بـەڵام بـە بـاری مێینـەدا.

کەواتـە: هەرچـی خڕۆکـەو ئەسـتێرەو کەهکەشـانە کـە وەك چرایـان دەبینرێـن، هەموویـان لـە سـنووری ئاسـمانی یەکەمـدان، چونکـە خـوا دەفەرمـوێ: ئاسـمانی نیزیکترمـان، واتـە: نیزیکـتر لـە زەویـمان بـە چرایـان ڕازانـدەوە، مانـای وایـە لـە سـەرووی ئـەو کەهکەشـان و، ئەسـتێرانەوە کـە لـە سـنووری ئاسـمانی یەکەمـدان، ئەویـش هـەر خـوا دەزانـێ سـنوورەکەی لـە کـوێ کۆتایـی دێ! لـە سـەرووی ئـەوەوە شـەش ئاسـمانی دیکـە هـەن، ئنجـا لـە سـەرووی ئەویشـەوە عـەرش هەیـەو، (**سِدْرَة المُنْتَهى**) هەیـە، وەك خـوا ﷻ لـە سـوورەتی (النَّجـم)دا باسـی کـردوە.

لێـرەدا خـوا ﷻ کـە پێشـتر باسـی زەوی دەکات، لەبـەر ئەوەیـە کـە زەوی بـە نسـبەت ئێمـەوە، زیاتـر جێـی بایـەخ و گرنگییـەو نشـینگەی ئێمەیـە، ئەگەرنـا لـە ڕاسـتییدا زەوی هـەر دەکەوێتـەوە نێـو ئاسـمان، واتـە: نێـو گـەردوون، بەڵکـو شـتێکی زۆر بچووکـە لـە نێـو گەردوونـدا، بـە بەڵگـەی ئـەوەش کـە خـوا ﷻ دوایـی لـە دروسـتکردنی ئاسـماندا، دەفەرمـوێ: ﴿ فَقَالَ لَهَا وَلِلۡأَرۡضِ ٱئۡتِيَا طَوۡعًا أَوۡ كَرۡهًا ﴾، واتـە: بـە ئاسـمان و بـە زەویشـی فەرمـوو، چـارو ناچـار وەرن، پەیدابـن، کەواتـە: زەوی هـەر لـە نێـو ئاسـماندا دروسـت بـووە، بـەڵام نـەك بـە شـێوەی زەوی، بەڵکـو وەك بیـردۆزە فیزیایـی و گەردوونییەکانـی ئێسـتا دەڵێـن: زەوی ئێمـە پارچەیـەك بـووە لـە خـۆر جیابۆتـەوە، هەروەهـا هەشـت خڕۆکەکـەی دیکـەش و بـە هەموویـان کۆمەڵەی خـۆر پێکدێنـن، چونکـە هەموویـان لـە خـۆر جیابوونـەوە، کەواتـە: زەویـش هـەر لەنێـو ئاسـمانەکاندا بـووە، بـەڵام دوایـی جیابۆتـەوە، ئنجـا جیابوونـەوەی زەوی لـە

خـۆر، دوو قۆناغـی ویسـتوون و، پێکهاتەکانـی زەویـش کـە بریتیـن لـە چیایـەکان و ئـەو پیـت و پێـزەی کـە تێیخـراوەو، بژیـوەکان کـە تێیـدا دانـراون، واتـە: دروسـتبوونی ئـەو توێکڵـەی زەوی، ئەویـش دوو قۆناغـی خایانـدوون، کەواتـە: سـەرجەم زەوی چ وەك پەیدابـوون و، چ وەك تێـدا دانرانـی پێکهاتەکانـی، بـە چـوار قۆنـاغ تـەواو بـووە، ئاسـمانیش هەمـووی، واتـە: گـەردوون هەمـووی و لـە نێویشـیدا زەوی کـە بەشـێك بـووە لـە خـۆر، ئەویـش هەمـووی بـە دوو قۆنـاغ، کەواتـە: دەبێتـە شـەش قۆنـاغ، ئەمـە وەك پێناسـەیەکی ئاسـمانەکان و زەوی و، یەکانگیربوونـی ئـەو زاراوەیـە لەگـەڵ زاراوەی گەردوونـدا کـە ئێسـتا بەکاردەهێـنرێ.

**٢)**- ئێستا پەیدابوونی گەردوون بۆتە شتێکی مشت و مڕ هەڵنەگر، لە ڕۆژگاری ئێستاماندا، ئەوە کە گەردوون سەرەتایەکی هەیەو پەیدابووە، بۆتە شتێکی مشت و مڕ هەڵنەگر، ئەگەر پێشتر کەسانێکی مولحید توانیبیان قسەیەکی وا بکەن کە ئەم دنیایە، ئەم گەردوونە بێ سەرەتایەو، هەر بووە، بۆیە پێویستیی بە پەیداکەرو بەدیهێنەرو ڕێکخەرێك ناکات، کە ئەگەر گریمان هەر هەبووش بووبێ، کە واش نیە، دیسان هەر پێویستیی بە ڕێکخەرێك و بە پەیداکەرێك دەکات، بەڵام بە هەر حاڵ ئێستا بیرۆکەی بێ سەرەتاو ئەزەلیی بوونی گەردوون، دروست نەبوونی گەردوون لە کاتێکی دیارییکراودا، بۆتە شتێکی ئەفسانەیی، ئێستا بڕوادارو بێبڕوا لەسەر ئەوە یەکدەنگن و ڕێککەوتوون کە گەردوون لە نەبوونەوە هاتوە، ئەوەش باسێکی دوورو درێژ هەڵدەگرێ، کە ئێمە لە مەوسووعەی: (ئیمان و ئیلحاد)، واتە: (دەروشاوەیی ئیمان و پووچەڵیی ئیلحاد لەبەر ڕۆشنایی زگماك و عەقڵ و زانست و وەحیی دا)، کە سوپاس بۆ خوا چاپی یەکەمی تەواو بووە، چاپی دووەمیش کراوەتەوە، لەوێدا خستوومانەتە ڕوو و، لەو بارەوە، دوازدە بەڵگەی زانستیی و عەقڵییمان هێناون[١].

**٣)**- گەردوون لە چییەوە هاتوە؟

نوێترین بیـردۆزەو بـۆ چوونـی فیزیایـی لـەو بـارەوە کـە گـەردوون لـە چییـەوە هاتـوە؟ بریتیـە لـە بیردۆزەیـەك کە بـە (بیـگ بانـگ)(big bang)، یاخـود (تەقینەوەی

---

(١) لاپەڕە: ٧١٣ - ٧٤١، چاپی یەکەم/ ٢٠١٩ز.

مـەزن)، (**الإنْفجـارُ العَظيـم**) نـاسراوە، کـە بەپێـی ئـەو بیردۆزەیـە دەڵـێ: سـێزدە ملیـارو حەوتسـەد ملیـۆن (١٣,٧٠٠,٠٠٠,٠٠٠) سـاڵ، یاخـود هەشتسـەد ملیـۆن سـاڵ، هەندێکیـش دەڵێـن: پـازدە ملیـار سـاڵ لەمەوبـەر ئـەم گەردوونـە بوونـی نەبـووە، واتـە: ئـەم ئاسـمان و زەوییـە کـە ئیمـە دەیبینیـن بوونـی نەبـووەو، لـە ئەنجامـی تەقینـەوەی تەنێکـی زۆر بچـووك، کـە پێـی دەگوتـرێ: تـاك (**مُفْـرَدَة**)، ئنجـا هەندێکیان هێلکـەی گـەردوون (**بَيْضَـةُ الكَـوْن**)، هەندێکیـان تـۆوی گـەردوون (**بَـذرَةُ الكَـوْن**)، بـە ئینگلیزیـی (singularity - سـینگولاریتی) پـێ دەڵێـن، لـە ئەنجامـی تەقینـەوەی ئـەو (singularity)یـەدا، واتـە: ئـەو تاکـە گەردوونییـەدا، ئـەم گەردوونـەی ئێسـتا دەیبینیـن بەسـەرو خواریـەوە، بـە ئاسـمانەکان و زەوییـەوە هاتۆتـە دی.

ئنجـا (singularity)یـش لـە ڕووی قەبـارەو گەرمیـی و کاتـەوە، دەبـێ بەپێـی نەگـۆڕی بلانـك (**ثابِـتُ بلانـك**) تەماشـا بکـرێ، کـە نەگـۆڕی بلانـك دەڵـێ: لـەوە بچووکـترو، لـەوە گەرمـترو، لـەوە خێراتـر لـە ڕووی کاتـەوە نیـە:

١- (singularity) بەپێی پێوەری (کاڵڤن) دە توان سی و دوو پلەی (کاڵڤن) گەرم بووە، واتە ژمارە دە، سی و دوو سفری بۆ دابنرێ، ئەوەندە پلەی (کاڵڤن) گەرم بووە ($١٠^{٣٢}$).

٢- لە ڕووی کاتەوە، دە توان چل و سێ سالیبی چرکەیەکی پێچووە، واتە ژمارە دە چل و سێ سفری هەبێ ($١٠^{-٤٣}$)، ئنجا یەك بەشی ئەو ژمارەیە ئەو کاتە بووە کە (singularity) تێدا تەقیوەتەوە، واتە: چرکەیەك دابەش بکەی بۆ ژمارەیەك کە ژمارە دە چل و سێ سفری هەبێ، یەك بەشی ئەوە، ئەو کاتە بووە کە پێی چووە بۆ تەقینەوەی ئەو تاکە گەردوونییە.

٣- لە ڕووی قەبارەوە، هێندە بچووك بووە، دە توان سی و پێنج سالیبی مەترێك بووە، واتە: ژمارە دە سی و پێنج سفری هەبێ ($١٠^{-٣٥}$)، یەك لەسەر ئەو ژمارەیە ئەوە قەبارەی ئەو تاکە گەردوونییە بووە، واتە: ئەوپەڕیی گەرم و، ئەوپەڕیی بچووك، لە کاتێکی ئەوپەڕیی کەمدا، کە ئەسڵەن هیچ کامیان مرۆڤ ناتوانێ بە خەیاڵی خۆشییاندا بهێنێ.

٤)- ئایا ئەمە چی دەگەیەنێ؟

ئەمــەش ئــەوە دەگەیەنــێ کــە گــەردوون لــە نەبوونــەوە هاتــوە، چونکــە لــە ڕاسـتییدا ئـەو ئەندازەیـەی لـە ڕووی کاتـەوە پێـی چـووە، یەکجـار یەکجـار کەمـەو، قەبارەکــەی یەکجــار یەکجــار بچووکــە، زۆر زۆر لــە ئەلیکترۆنیــش بچووکــترە، کــە ئەلیکـترۆن هێنـدە گچکەیـە: ئەگـەر گەردیلەیـەك هێنـدەی قەبـارەی زەوی گـەورە بکـرێ، ئـەو کاتـە ئەلیکترۆنەکـە بـە ئەنـدازەی تۆپێکـی پـێ دیـارە، بـەڵام ئـەو (sin-gularity)یــە لــە ئەلیکترۆنیــش زۆر بچووکــترە.

لـە ڕووی گەرمییشـەوە لـەوە گەرمـتر، لـە خەیاڵـدا جێـی نابێتـەوە، بۆیـە ئەگـەر بگوتـرێ: ئـەم گەردوونـە لـە نەبوونـەوە هاتـوە، شـتێکی زۆر زانسـتییە، چونکـە ئـەو قەبـارە بچووکـە، بـەو هەمـوو گەرمییـە، لـەو هەمـوو کاتـە چڕکراوەیـەدا، لـە ڕاسـتییدا تەعبیرێکـی دیکەیـە لـە نەبـوون (عـدم).

٥)- قورئان چۆن باسی دروستبوونی گەردوون دەکات؟

ئــەو بیــردۆزە تازەیــەی کــە باســمان کــرد، لەگــەڵ ئاماژەکانــی قورئانــدا زۆر تێکدەکاتـەوە، هەڵبەتـە ئێمـە هەرگیـز قورئـان لەگـەڵ هیـچ بیردۆزەیەکـدا بـەراورد ناکەیـن، چونکـە ئـەوەی خـوا دەیفەرمـوێ، ڕاسـتیی ڕەهایە، بۆیـە هەمیشـە بنچینە لە لای ئێمـە فەرمایشـتی خوایـە، بـەڵام ئەگـەر زانسـتیش بگاتـە دەرککردنـی حەقیقەتێك کـە ئـەو حەقیقەتـە قورئـان ئامـاژەی پێکردبـێ، دەگونجـێ ئـەو ئایەتـە مەبەسـت پێـی ئـەو حەقیقەتەیـە بـێ، کـە زانسـت ئێسـتا بـۆی کەشـف بـووە:

لــە ســووڕەتی (الأَنْبِيــاء)دا، خــوا ﷻ دەفەرمــوێ: ﴿ أَوَلَمْ يَرَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَٰهُمَا ۖ وَجَعَلْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ كُلَّ شَىْءٍ حَىٍّ ۖ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾، واتـە: ئایـا ئەوانـەی بێبـڕوان نازانـن کـە ئاسـمانەکان و زەوی پێکـەوە چەسـپاو بـوون، ئنجـا لەیەکـمان جیاکردنـەوە؟، ﴿ كَانَتَا رَتْقًا ﴾، (أي: مُلْتَصِقَتَين)، وەك لـە سـووڕەتی (الأَنْبِياء)دا، بـە درێژیـی باسـمان کـردوە، واتـە: پێکـەوە جۆشـدراو (لـکاو) بـوون، ﴿ فَفَتَقْنَٰهُمَا ﴾، واتـە: لێکـمان جیاکردنـەوە.

وشـەی (فَتـق)، واتـە: لێـك جیابوونـەوەی دوو شـتان کـە لێـك نەپچڕێـن، زەویـش لەگـەڵ ئاسـمان لێـك دانەبـڕاون، چونکـە زەوی بـە دەوری خـۆردا دەخولێتـەوەو، کاتـی خـۆی هـەر لـە خـۆر جیابۆتـەوە و، لەگـەڵ هەشـت خڕۆکەکـەی دیکـەدا بـە هەموویـان کۆمەڵـەی خـۆر پێکدێنـن، خۆریـش بـە دەوری داڵـی ڕاوەسـتاودا دەخولێتـەوە، ئەویـش هـەر ئەسـتێرەیەکە لـە یـەك تریلیـۆن ئەسـتێرەی نێـو کەهکەشـانی کاکێشـان، کەهکەشـانی کاکێشـانیش دیسـان لەگـەڵ کەهکەشـانەکانی دیکـە پێکەوەیـە، کەواتـە: زەوی کـە لـە ئاسـمان جیابۆتـەوە لێـی دانەبـڕاوەو، لێـی دوور نەکەوتۆتـەوە، ﴿ فَفَتَقۡنَٰهُمَا ﴾، واتـە: لێکـمان جیاکردنـەوە بـۆ ئـەوەی لێـك بپچڕێـن و لێـك دابڕێـن، ﴿وَجَعَلۡنَا مِنَ ٱلۡمَآءِ كُلَّ شَيۡءٍ حَيٍّۚ ﴿٣٠﴾﴾، هەمـوو زیندەوەرێکیشـمان لـە ئـاو دروسـتکردوە، ﴿أَفَلَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٣٠﴾﴾، واتـە: ئایـا بـڕوا ناهێنـن؟! واتـە: ئایـا بـڕوا ناهێنـن بـە خـوای بـەرز کـە لـە یـەك ئایەتـدا ئامـاژە دەکات بـە سـەرەتای درووسـتبوونی گـەردوون و ژیـان، کـە زانسـت هەرچەنـدە لێـی بکۆڵێتـەوەو بـڕوات، هـەر دەگات بـەوەی خـوا فەرموویەتـی؟! بۆیـە زانایانـی ئیسـلام گوتوویانـە: کۆتایـی زانسـت سـەرەتای وەحییـە، وەحیـی چـی فەرمـوو بـێ، زانسـت دوای ئـەوەی لێـی دەکۆڵێتـەوەو دەڕواو دەپشـکنێ، دێتـەوە سـەر ئـەوەی وەحیـی فەرموویەتـی، ئەگـەر ڕاسـتیی زانسـتیی بـێ، ئەمـما بیردۆزەیەکـی خەیاڵاویـی وەك بیـردۆزەی (داروین)، یـان هـەر بیردۆزەیەکـی دیکـە ئەگـەر لەگـەڵ ڕاسـتییەکانی وەحییـدا نەگونجا، ئـەو بیردۆزەیـە نەبۆتـە حەقیقەتێکـی زانسـتیی و هـەر خەیاڵێکەو کەسـێك کردوویەتـی.

لـە سـوورەتی (فُصِّلَـتْ)دا، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِيَ دُخَانٞ ﴾، واتـە: دوایـی خـوا ﷻ ویسـتی ئاسـمان دروسـت بـکات، لـەو کاتـەدا دووکەڵ بـوو، ئەمە لەگـەڵ ئـەوەی کـە زانسـتی تـازەو بیـردۆزەی (بیـگ بانـگ - Big Bang) دەیڵـێ، کـە هـەر لـە زیمنـی بیـردۆزەی (بیـگ بانـگ)دا زانایـان دەڵێـن: دوای تەقینـەوەی (singu-larity) جۆرێـك لـە مـاددە دروسـت بـووە کـە لـە شـێوەی دووکەڵـدا بـووەو، بـەردەوام

هەر لێککشاوەو، وەك دوایی باسی دەکەین، دوای ملیۆنان ساڵ، ئنجا کەهکەشان و ئەستێرەکان دروست بوون، یانی: دوای ئەوەی ئەندازەیەك سارد بۆتەوە، ئنجا ڕێگە دراوە کە گەردیلەکان دروست بن و، ئەلیکترۆن و نیوترۆن و پرۆتۆنەکان گەردیلە پێك بێنن، دوایی ئەوانیش کەهکەشانەکان پێکبێنن، لە نێو کەهکەشانەکاندا ئەستێرەکان و خڕۆکەکان دروست بن، ئنجا زانایانیش هەر زاراوەی دووکەڵیان بەکارهێناوە، یاخود پێی دەڵێن: شۆربای گەردوونیی (**الحِساءُ الكَوْنِي**)، ماددەیەکی شل بووە، ماددەیەکی شیکراوە (**مُخَلخَل**) بووە، کە پێشتر یەکجار چڕ بووە، ئەمەش زۆر بە زەحمەت لە عەقڵ و خەیاڵدا جێی دەبێتەوە، ئەم گەردوونە فراوانە بەو هەموو تریلیۆنان ئەستێرەو خڕۆکەو، بەو هەموو ملیاران کەهکەشانانەوە، هەمووی لە تاکێکی گەردوونیی کە زۆر زۆر زۆر لەوە بچووکترە کە بەچاو ببینرێ، پەیدابووبن، لە ڕاستییدا ئەوە لە خەیاڵەوە نیزیکترە تاکو لە عەقڵ، بەڵام ئەگەر زانست شتێکی وای سەلماند، دیارە لە هەقێ ئاو ڕادەوەستێ!.

ئنجا کە خوا دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِىَ دُخَانٌ ﴾، کەواتە: ئەو گەردوونەی ئێمە بەر لەوەی بە شێوەی حەوت ئاسمانەکان دروست بێ، لە شێوەی گازێکی پرژو بڵاودا بووە، وەك دووکەڵ.

لە سوورەتی (**الأَنْبِياء**) لە ئایەتی (١٠٤)دا لەوێشدا ئاماژەیەك هەیە، خوا دەفەرموێ: ﴿ يَوْمَ نَطْوِى ٱلسَّمَآءَ كَطَىِّ ٱلسِّجِلِّ لِلْكُتُبِ ۚ كَمَا بَدَأْنَآ أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُۥ ۚ وَعْدًا عَلَيْنَآ ۚ إِنَّا كُنَّا فَٰعِلِينَ ﴿١٠٤﴾ ﴾، واتە: ئەو ڕۆژەی کە ئاسمان وەك پێچرانەوەی تۆمار دەیپێچینەوە، ﴿ ٱلسِّجِلِّ ﴾، ئەو فایلەیە کە خەڵك شتی لەسەر دەنووسێ، بەو شێوەیە دەیپێچینەوە، وەك چۆن یەکەمجار دروستمان کردوە، بەو شێوەیە دەیگێڕینەوە.

کەواتە: گەردوون، بەر لەوەی ئاوا بڵاوبێتەوە، پێچراوە بووە، ئەمەش دیسان ئاماژەیە بۆ ئەوە کە لە تەنێکی بچووکەوە هاتوە، هەمووی لەوێدا جێی

کراوەتەوە، بەڵام دوایی خوای کاربەجێ بڵاوی کردۆتەوە، ئنجا دەفەرموێ ئێمە ئەو ڕۆژە کە ڕۆژی دواییە، ئاسمان واتە: گەردوون دەپێچینەوەو، دەیخەینەوە نێو یەك، وەك چۆن تۆمارێکی نووسین دەخرێتە نێو یەك، پێشێ بڵاوکراوەتەوە، دوایی دەپێچرێتەوە، دوایی دەفەرموێ: ﴿كَمَا بَدَأْنَآ أَوَّلَ خَلْقٍ﴾، واتە: وەك چۆن یەکەمجار دروستمان کردوە، ئاوا دەیگێڕینەوە بۆ حاڵەتی سەرەتا، ﴿وَعْدًا عَلَيْنَآ﴾، واتە: ئەوەش بەڵێنێکە ئێمە داومانە، ﴿إِنَّا كُنَّا فَٰعِلِينَ﴾، واتە: بە دڵنیایی ئێمە ئەنجامدەری ئەوەین.

هەروەها لە سووڕەتی (**هود**) لە ئایەتی حەوتەم دا خوای باڵادەست ئاماژەیەك دەكات كە ئەم گەردوونە كەرەستەكەی ماددەیەكی وەك یەك بووە، دەفەرموێ: ﴿وَكَانَ عَرْشُهُۥ عَلَى ٱلْمَآءِ﴾، واتە: بارەگای خوا، عەرشی خوا لەسەر ئاو بوو، ئاو كە ڕەمزە كیمیاییەكەی ($H_2O$)یە، واتە: گەردیلەیەكی هایدرۆجین لەگەڵ دوو گەردیلەی ئۆكسجیندا یەك دەگرن، مۆلكۆڵێك، (گەردێك)ی ئاو پێكدێنن، زانایان دەڵێن: ئێستاش لەگەڵدابێ (٧٥٪)ی ماددەی گەردوون، هایدرۆجینەو، (٢٥٪)یشی هیلیۆم و توخمەكانی دیكەیە، كەواتە: دەگونجێ ئەمە ئاماژە بێ بەوە كە خوا بەرلەوەی ئەم گەردوونە بخوڵقێنێ، ئەو ماددەییەی كە موڵكی خواو، حوكمڕانی خوای پێك دەهێنا، كە تەعبیری لێدەكات بە ئاو، خوڵقاندوویەتی، لەبەر ئەوەی كە زۆربەی ماددەی گەردوون ئێستاش لەگەڵدابێ گازی هایدرۆجین پێكی دێنێ! لە سووڕەتی (**النازعات**) لە ئایەتەكانی: (٢٧ - ٣٣) دا، خوا ﷻ ئاوا باسی گەردوون بەسەرو خواریەوە، واتە: بە ئاسمان و زەویەوە دەكات، دەفەرموێ: ﴿ءَأَنتُمْ أَشَدُّ خَلْقًا أَمِ ٱلسَّمَآءُ﴾، ئایا دروستكرانی ئێوە بەزەحمەتترە، یاخود هی ئاسمان، واتە: گەردوون؟! ﴿بَنَىٰهَا ﴿٢٧﴾﴾، خوا ئاسمانی بیناكردوە (دروستكردوە)، ﴿رَفَعَ سَمْكَهَا﴾، واتە: بەرزییەكەی زۆر بەرز كردەوە، (سَمْكٌ) واتە: ئەستوورییەكەی، ﴿فَسَوَّىٰهَا ﴿٢٨﴾﴾، ڕێكیخست، ﴿وَأَغْطَشَ لَيْلَهَا وَأَخْرَجَ ضُحَىٰهَا﴾، شەوەكەی زۆر تاریك كردو، ڕووناكییەكەشی دەرهێنا، ﴿وَٱلْأَرْضَ بَعْدَ ذَٰلِكَ دَحَىٰهَآ

(٣٠) ﴾، زەویشی دوای ئەوە پان ڕاخست، واتە: دوای ئەوەی خوای بەرز ئاسمانی بەرز کردەوەو، دروستیکردو، ڕێکیبخست و، تاریکییەکەی تێدا زۆر تاریك و خەست کردو، ڕووناکییەکەی لێ دەرهێنا، ئنجا دوای ئەوە زەویشی پان ڕاخست، ﴿ أَخْرَجَ مِنْهَا مَآءَهَا وَمَرْعَىٰهَا (٣١) ﴾، ئاوەکەیشی لێ دەرهێنا (لە زەوی) و، لە وەڕگاکانیشی لێ دەرهێنان، ﴿ وَٱلْجِبَالَ أَرْسَىٰهَا (٣٢) ﴾، چیایەکانیشی تێدا چەسپاندن، ﴿ مَتَٰعًا لَّكُمْ وَلِأَنْعَٰمِكُمْ (٣٣) ﴾، هەم بۆ ڕابواردن و گوزەرانی خۆتان و، بۆ ئاژەڵەکانیشتان، کەواتە: ئەم ئایەتە زۆر بە ڕوونیی دەق لەسەر ئەوە دەکات کە زەوی لە دوای ئاسمان دروست بووە، ﴿ وَٱلْأَرْضَ بَعْدَ ذَٰلِكَ دَحَىٰهَآ (٣٠) ﴾، واتە: لە دوای ئەوە خوا زەوی پان ڕاخست، دوایی زیاتر تیشك دەخەینە سەر ئەو بابەتە.

٦)- بە ماوەی چەند گەردوون دروست بووە؟

گەردووناسانی هاوچەرخ دەڵێن: گەردوون بە چەند قۆناغێك دروست بووە، کە من لە مەوسووعەی (ئیمان و ئیلحاد)[1]، بە وەرگرتن لە زانایانی فیزیکزان بە تایبەتی (زَغْلُول النجّار)، کە باسی گەردوون دەکات، قسەکانی ئەوم کورت کردوونەوە، کە ئەم گەردوونە بە چەند قۆناغێك دروست بووە، ئەویش دوای هەزار تریلیۆن (١,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) چرکە، کە دەکاتە سی و دوو ملیۆن ساڵ، کەهکەشانەکان دروست بوون، واتە: لە دوای تەقینەوەی (Singularity)، سی و دوو ملیۆن ساڵی پێچووە کە دەکاتە هەزار تریلۆن چرکە، ئنجا گونجاوە کە کەهکەشانەکان دروست بن.

هەڵبەتە لە سەرچاوەی ناوبراودا ئەو بە زیاتری هێناون، بەڵام من کردوومن بە هەشت قۆناغ و لەوێدا خستوومنە ڕوو.

خوای بەرزیش لە قورئاندا دەفەرموێ: بە شەش قۆناغ دروست بوون، واتە: کۆی دروستکراوەکانی گەردوون، خوا ﷻ لە سوورەتی (السَّجْدة) ئایەتی چوار

---

(١) لاپەڕە: ٧٣٠ - ٧٣٣، چاپی یەکەم/ ٢٠١٩ز.

(٤)دا، دەفەرمـوێ: ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ﴾، واتـە: خـوا ئـەو کەسـەیە کـە ئاسـمانەکان و زەوی، ئـەوەی دەکەوێتـە نێوانیانـەوە بـە شـەش ڕۆژان، واتـە: بـە شـەش قۆناغـان دروسـتکردوون، دوایـی خـوا چـووە سـەر عـەڕش، ئنجـا لـە حـەوت شـوێنی قورئانـدا، ئـەو ڕاسـتییە دووبـارە بۆتـەوە کـە خـوا ئاسـمانەکان و زەوی، واتـە: گەردوونـی بـە شـەش قۆنـاغ دروسـتکردوون.

**لە سوورەتی (فُصِّلَتْ)دا، ئەو شەش قۆناغە بەو شێوەیە دانراون:**

**قۆناغـی یەکـەم و دووەم:** ئاسـمان، واتـە: گـەردوون هەمـووی، لـە نێویشـیدا زەوی بـە دوو قۆنـاغ دروسـت بـووە، کـە دەگونجـێ ئەمـە ئامـاژە بـێ بـە قۆناغـی (رَتْـقْ)و، (فَتْـقْ)، واتـە: پێکـەوە لکاویـی و لێـك جیابوونـەوە، زەوییـش هـەر لـە نێـو گەردوونـدا بـووە، یـانی: ماددەکـەی لـە نێـو گەردووندا بـووە، ئەمـە قۆناغـی یەکـەم و دووەمـە کـە خـوای پەروەردگاریـش دەفەرمـوێ: ﴿ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِىَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ٱئْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَآ أَتَيْنَا طَآئِعِينَ ﴿١١﴾ فَقَضَىٰهُنَّ سَبْعَ سَمَٰوَاتٍ فِى يَوْمَيْنِ ﴾، یـانی: حـەوت ئاسـمانەکان، واتـە: گـەردوون بـە دوو قۆنـاغ دروسـت بـوون، لـە نێویشـیاندا زەوی، کـە زەوی بـۆ خـۆی پارچەیـەك بـووە لـە خـۆر، خۆریـش یەکێـك لـە ئەسـتێرەکانی کەهکەشـانی کاکێشـانەو، کەهکەشـانی کاکێشـانیش هـەر بەشـێك بـووە لـە گـەردوون، دوایـی زەوی بـە چـوار قۆنـاغ دروسـت بـووە، واتـە: زەوی خـۆی بـە دوو قۆنـاغ دروسـت بـووە، پاشـان بـە دوو قۆناغیـش پێکهاتەکانـی دروسـت بـوون، قۆناغـی یەکـەم و دووەمـی دروسـتکرانی زەوی و، جیابوونـەوەی لـە خـۆر، واتـە: قۆناغـی پەیدابـوون (مَرْحَلَـةُ الإيجـاد)، ئەویـش دیسـان هـەر حاڵەتـی (رَتْـقْ)و، (فَتْـقْ)ی بـووە، پێشـێ لـە نێـو خـۆردا بـووە، دوایـی جیابۆتـەوە.

**قۆناغـی سـێیەم و چوارەمـی** دروسـتبوونی زەوییـش بریتیـە لـە دروسـتکرانی پێکهاتەکانـی زەوی، یانـی: (مَرْحَلَـةُ الإعْـداد)، قۆناغـی ئامادەکـردن.

کەواتـە: دوو قۆنـاغ بـۆ دروسـتکرانی ئاسـمان، واتـە: گـەردوون و، دوو قۆنـاغ بـۆ دروسـتکرانی زەوی و، دوو قۆنـاغ بـۆ دروسـتکرانی پێکهاتەکانـی زەوی، هەمـووی دەکاتـە شـەش قۆنـاغ، (٢ + ٢ + ٢= ٦).

ئنجا ئـەو شـەش ڕۆژەی کـە خـوا لـە چەنـد شـوێنێك لـە قورئانـدا باسـی کـردوون، بێگومـان مەبەسـت پێیـان ئـەو شـەش قۆناغەیـە، چونکـە مەبەسـت لـە (يَوْمَيْن)و، (أَرْبَعَة أَيَّام)و، (سِتَّة أَيَّام)، بێگومـان چەنـد ماوەیەکـی کاتییـن، نـەك شـەو و ڕۆژی ئاسـایی (٢٤) سـەعاتیی، بۆچـی؟ لەبـەر سـێ بەڵگـە:

**یەکەم:** ئەو جۆرە ڕۆژە کە ڕۆژی (٢٤) سەعاتییە، دوایی پەیدابووە، دوای ئەوەی کە زەوی پەیدابووەو، بە دەوری خۆیدا خولاوەتەوە لە بەرانبەر خۆردا، ئنجا شەو و ڕۆژ پەیدابوون، هەر (٢٤) سەعات جارێك زەوی خولێك بە دەوری خۆیدا دەخوا، لە بەرانبەر خۆردا، ئەو دیوەی دەکەوێتە لای خۆر دەبێتە ڕۆژو، دیوەکەی دیکەش کە پشتی لە خۆرە دەبێتە شەو، کەواتە: هەتا زەوی دروست نەبووە، شەوو ڕۆژ هەر نەبوون، شەوو ڕۆژی (٢٤) سەعاتیی هەر بوونیان نەبووە.

**دووەم:** خوا وشەی (يَوم) ڕۆژی، بە مانای جۆراو جۆری بەکارهێناوە لە قورئاندا، بۆ وێنە:

أ)- لە سوورەتی (المَعارِج)دا، خوا فەرموویەتی: ﴿ تَعۡرُجُ ٱلۡمَلَـٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ إِلَيۡهِ فِي يَوۡمٖ كَانَ مِقۡدَارُهُۥ خَمۡسِينَ أَلۡفَ سَنَةٖ ﴿٤﴾ ﴾، واتە: فریشتەکان و ڕووح، (واتە: جیبریل) بۆ لای وی (خوا) بەرز دەبنەوە لە ڕۆژێکدا، (واتە: لە ماوەیەکدا) کە ئەندازەکەی پەنجا هەزار ساڵە، کەواتە: خوا ﷻ ڕۆژ (يَوم)ی بەکارهێناوە بە ماوەیەکی پەنجا هەزار ساڵیی.

ب)- لە سوورەتی (الحَجّ)دا دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّ يَوۡمًا عِندَ رَبِّكَ كَأَلۡفِ سَنَةٖ مِّمَّا تَعُدُّونَ ﴿٤٧﴾ ﴾، واتە: ڕۆژێك لە لای پەروەردگارت بە ئەندازەی هەزار ساڵە، کە ئێوە دەیژمێرن، واتە: ڕۆژی هەزار ساڵییش هەیە.

**ج)**- لە سوورەتی (**آلِ عِمْران**)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿وَتِلْكَ ٱلْأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ ٱلنَّاسِ﴾، واتە: ئەو رۆژانە لە نێو خەڵكدا دەستاو دەستیان پێ دەكەین، واتە: رۆژانی سەركەوتن و بردنەوەو، رۆژانی تێكشكان و دۆڕان، كە بە تەئكید نە سەركەوتنەكە، نە دۆڕانەكە، مەرج نیە لە یەك رۆژی دیارییكراودا بێ، لەوانەیە چەند مانگێكی پێ چووبن، تاكو لایەك لایەكی تێكشكاندوە، یان دەوڵەتێك بەسەر دەوڵەتێكدا زاڵ بووە.

**د)**- لە سوورەتی (**إبراهیم**)دا خوا دەفەرموێ: ﴿وَذَكِّرْهُم بِأَيَّىٰمِ ٱللَّهِ﴾، واتە: رۆژەكانی خوایان بیربێنەوە، واتە: ئەو كاتانەی كە خوا چاكەی تێدا لەگەڵ مرۆڤەكاندا كردوون، یاخود سەری خستوون، یاخود دەربازی كردوون، یان نیعمەتی پێداون.

**هـ)**- لە سوورەتی (**غافِر**)دا دەفەرموێ: ﴿إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيْكُم مِّثْلَ يَوْمِ ٱلْأَحْزَابِ ﴿٣٠﴾﴾، واتە: من مەترسییم لێتان هەیە، وەك رۆژی حیزبەكان، رۆژی ئەو كۆمەڵانەی كە خوا فەوتاندنی.

**و)**- لە سوورەتی (**الفُرقان**)دا دەفەرموێ: ﴿وَكَانَ يَوْمًا عَلَى ٱلْكَـٰفِرِينَ عَسِيرًا ﴿٢٦﴾﴾، واتە: ئەو رۆژە، (واتە: رۆژی دوایی) لەسەر كافرەكان زۆر قورس و زەحمەتە.

**سێیەم:** لە زمانی عەرەبییدا وشەی (**یَوم**) بە مانای ماوەیەك لە كات (**مَدَّة زَمَنِيَّة**) دێ، ئەوە فەرهەنگەكانی زمان: (**یَوم**)، واتە: ماوەیەك لە كات، بەڵام مانا عورفیی باوەكەی بۆ ئێمە، واتە: رۆژێكی (٢٤) سەعاتیی، جاری واش هەیە (**یَوم**) مەبەست پێی (**نَهار**)ە، واتە: ئەو كاتە كە رۆژ بە دەرەوەیە، (**لَیْل**)یش لە بەرانبەر (**نَهار**)دا دادەنێن، جاری واش هەیە (**یَوم**) بە كۆی (**لَیْل**) و (**نَهار**) دەگوترێ، واتە: (٢٤) سەعات، واتە: دیسان لە زاراوەی ئێمەدا جاری وایە رۆژ بۆ (١٢) سەعاتەكە بەكاردێ، ئەو كاتەی كە خۆر بە دەرەوەیەو دنیا رووناكە، جاری واش هەیە بە مانای (٢٤) سەعاتەكە، واتە: كۆی شەوو رۆژ بەكاردێ، لە زمانی عەرەبییدا (**یَوم**) واتە: ماوەیەك لە كات، چ كورت بێ چ درێژ.

**٧)**- پاش و پێش پێكرانی باسی دروستكرانی ئاسمان و زەوی، بە پێی سیاق و مەقامە: هەندێك لە زانایان ئەوەیان لێ بۆتە ئیشكال و، هەندێك لە ئەوانەی لە پشت پەردەی

ڕەشەوە تەماشای قورئان دەکەن و، بە بیری کورتی خۆیان تەماشای قورئان دەکەن، ئەوەیان کردوە بە جۆرێك لە ڕەخنە گرتن لە قورئان، کە لە شوێنێك خوا دەفەرموێ: زەوی پێش ئاسمان دروست بووەو، لە شوێنێ دەفەرموێ: ئاسمان پێش زەوی، بەڵام بێگومان بەپێی سیاق و مەقام ئەو پاش و پێشە کراوە، بۆ وێنە: لە سوورەتی (**فُصِّلَت**)دا، کە دەفەرموێ: ﴿قُلْ أَئِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ بِالَّذِي خَلَقَ الْأَرْضَ فِي يَوْمَيْنِ وَتَجْعَلُونَ لَهُ أَندَادًا ذَٰلِكَ رَبُّ الْعَالَمِينَ ﴿٩﴾ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ مِن فَوْقِهَا وَبَارَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَا أَقْوَاتَهَا فِي أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ سَوَاءً لِّلسَّائِلِينَ ﴿١٠﴾﴾، وەك پێشتریش گوتمان، ئەمە مەبەست پێی کۆی دروستبوونی زەوی و، ئامادەکرانی زەوییە، کە دەفەرموێ: ﴿فِي أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ﴾، ئەو چوار ڕۆژە تەنیا بۆ دروستکرانی چیایەکان و پیت و پێز تێخستنی زەوی و، ئەندازەگیرکردنی بژیوەکان نیە تێیدا، بەڵکو یانی: هەم دروستکرانی زەوی، هەم ئامادەکرانی بە چوار قۆناغ بووە.

وەك یەکێك دەڵێ: لە هەولێرەوە بە دوو سەعات چوومە سلێمانی، دوایی بە چوار سەعات چوومە کەلار، مانای وانیە لە سلێمانییەوە بە چوار سەعاتان چووە بۆ کەلار، یانی: بە کۆی چوار سەعاتان لە هەولێرەوە چووە بۆ کەلار، لە هەولێرەوە بە دوو سەعات بۆ سلێمانی و، لەوێشەوە بە چوار سەعات بۆ کەلار، هەمووی دەکاتە چوار.

دوایی دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ اسْتَوَىٰ إِلَى السَّمَاءِ وَهِيَ دُخَانٌ﴾، دوایی ڕوویکردە ئاسمان کە لەو حاڵەدا دووکەڵ بوو، هەموو زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن دەڵێن: لێرەدا (**ثُمَّ: لِلتَّرتيب الرُّتبي**)، (**ثم**) بۆ ڕیزبەندیی پلە پلەییە، (**لِأَنَّ خَلْقَ السَّماءِ أَعْظَمُ وأَهَمُّ مِن خَلْقِ الأَرض**)، لەبەر ئەوەی دروستکردنی ئاسمان گەورەترەو گرنگترە لە دروستکردنی زەوی و، زەوی بۆ خۆی بەشێکی بچووکە لە نێو ئاسماندا.

لە سوورەتی (**البقرة**)شدا دەفەرموێ: ﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا ثُمَّ اسْتَوَىٰ إِلَى السَّمَاءِ فَسَوَّاهُنَّ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ ۚ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴿٢٩﴾﴾،

دیسان خوا سەرەتا باسی دروستکردنی زەوی دەکات، لەبەر ئەوەی بە نسبەت ئێمەوە گرنگترە، دوایی کە دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ﴾، دیسان وەك ئایەتەکەی سوورەتی (فُصِّلَت)، (ثُمَّ) بۆ ڕیزبەندیی پلەو پایەیە، نەك بۆ ڕیزبەندیی کاتیی، بەڵام لە سوورەتی (النَّازِعَات)دا زۆر بە ڕوونیی دیارە کە دروستکرانی زەوی دوای دروستکرانی ئاسمانە، دەفەرموێ: ﴿ءَأَنتُمْ أَشَدُّ خَلْقًا أَمِ ٱلسَّمَآءُ بَنَىٰهَا ﴿٢٧﴾ رَفَعَ سَمْكَهَا فَسَوَّىٰهَا ﴿٢٨﴾ وَأَغْطَشَ لَيْلَهَا وَأَخْرَجَ ضُحَىٰهَا ﴿٢٩﴾ وَٱلْأَرْضَ بَعْدَ ذَٰلِكَ دَحَىٰهَآ ﴿٣٠﴾﴾، ئەمە زۆر ڕوونە، ﴿بَعْدَ ذَٰلِكَ﴾، ئەمە دەقە لەو بابەتەداو، هیچ ئەگەرێك هەڵناگرێ، جگە لە ڕیزبەندیی کاتیی، جیاواز لە وشەی (ثُمَّ)، کە جاری وایە بۆ ڕیزبەندیی کاتییەو، جاری وایە بۆ ڕیزبەندیی پلە پلەییە، بەڵام: ﴿وَٱلْأَرْضَ بَعْدَ ذَٰلِكَ دَحَىٰهَآ ﴿٣٠﴾﴾، دوای ئەوەش زەوی پان ڕاخست، دروستکردنی زەوی بەتەئکید لە دوای ئاسمانەوە بووە، ئەم ئایەتە لەو بارەوە دەقە و هیچ ئەگەری دیکە هەڵناگرێ.

٨)- هەرچی زانست دەیڵێ لە بارەی گەردوونەوە، هەمووی هەر ئەگەرە چونکە خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿مَّآ أَشْهَدتُّهُمْ خَلْقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلَا خَلْقَ أَنفُسِهِمْ وَمَا كُنتُ مُتَّخِذَ ٱلْمُضِلِّينَ عَضُدًا ﴿٥١﴾﴾، واتە: من ئامادەم نەکردوون لە کاتی دروستکرانی ئاسمانەکان و زەویدا، هەروەها دروستکرانی خۆشیاندا، یاخود ئاگادارم نەکردوون و نەمکردوونە شایەد، کەواتە: هەرچی دەگوترێ لەو بارەوە، هەمووی بیردۆزەیەو، بۆچوونە، دەگونجی بیپێکێ و، دەشگونجێ نەیپێکێ، بەڵام ڕاستیی ڕەهاو تێرو تەواو، تەنیا ئەوەیە کە خوا ﷻ دەیفەرموێ.

٩)- ئەو دەقانەی سوننەت کە لەو بارەوە هاتوون، هەموویان لە ئیسرائیلیاتەوە هاتوون، کە من وەك بەرچاو ڕوونیی خوێنەرانی بەرێز، ئاماژەیەك بە هەندێکیان دەکەم، یەکێك لەوانە ئەوەیە:

أ- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّ الله ابْتَدَأَ الخَلْقَ يَوْمَ السَّبْتِ}[1]، گوایە ئەبوو هورەیرە ﷺ، لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتەوە، فەرموویەتی: خوا دروستکراوەکانی لە ڕۆژی شەممەدا دەست پێکردن! بەڵام بێگومان شەممەو یەك شەممەو دوو شەممە تاکو پێنج شەممەو هەینی، کاتێك دروست بوون کە زەوی دروست بووەو، بە دەوری خۆیدا خولاوەتەوەو، بە دەوری خۆردا خولاوەتەوە، بۆیە ئەوە هیچ پشتی پێ نابەسترێ.

هەرچەنـدە ئـەوە لـە (صحیح مسـلم)دا هاتـوە، بـەڵام بوخاریـی و عەلـی کـوڕی مەدینیـی کـە دوو فەرموودەناسـی زۆر مەشـهوورن، ئەم دەقەیان لە ڕووی سـەنەدەوە بـە بێهێـز دانـاوەو گوتوویانـە: ئـەوە قسـەی کەعبـی ئەحبـارە، کـە یەکێـك بـووە لـە زانایانـی جوولەکـەو مسـوڵمان بـووەو بـۆ ئەبـوو هورەیـرەی باسـکردوە، بـەڵام هەندێـك لـە ڕاوییـەکان وایانزانیـوە، ئەبـوو هورەیـرە پاڵـی داوەتـە لای پێغەمبـەر ﷺ، بۆیـە موسـلیمیش لـەوەدا نەیپێـکاوەو بـە فەرمـوودەی دانـاوە، کـە لـە ڕاسـتییدا فەرمـوودە نیـە.

ئنجـا جوولەکـەکان دەڵێـن: خـوا دروسـتکراوەکانی لـە ڕۆژی یـەك شـەممەدا دەسـت پێکـردوون، لـە ڕۆژی شـەممەدا خـوا پشـووی دا! لـە (پەیمانـی کـۆن)دا هاتـوە ئیسـراحەتی کـرد، خـوای بەرزیـش لـە سـوورەتی (ق)دا دەفەرمـوێ: ﴿وَمَا مَسَّنَا مِن لُّغُوبٍ ﴿٣٨﴾﴾، واتـە: ئێمـە بـە دروسـتکرانی گەردوونـەوە، مانـدوو نەبوویـن، هەروەهـا هەمـوو ئـەو دەقانـەی کـە لـەو بـارەوە هاتـوون، هەموویـان،

---

(١) أخرجـه مسـلم في صحيحـه (٤٤٢٧)، بهـذا اللفـظ: {عَـنْ أَبِي هُرَيْـرَةَ ﷺ، قَـالَ: أَخَـذَ رَسُـولُ اللَّـهِ ﷺ بِيَـدِي، فَقَـالَ: «خَلَـقَ اللَّـهُ عَـزَّ وَجَـلَّ التُّرْبَـةَ يَـوْمَ السَّـبْتِ، وَخَلَـقَ فِيهَـا الْجِبَـالَ يَـوْمَ الأَحَـدِ، وَخَلَـقَ الشَّـجَرَ يَـوْمَ الإِثْنَـيْنِ، وَخَلَـقَ الْمَكْـرُوهَ يَـوْمَ الثُّلاَثَـاءِ، وَخَلَـقَ النُّـورَ يَـوْمَ الأَرْبِعَـاءِ، وَبَـثَّ فِيهَـا الـدَّوَابَّ يَـوْمَ الْخَمِيـسِ، وَخَلَـقَ آدَمَ عَلَيْـهِ السَّـلاَمُ بَعْـدَ الْعَـصْرِ مِـنْ يَـوْمِ الْجُمُعَـةِ فِي آخِـرِ الْخَلْـقِ، وَفِي آخِـرِ سَـاعَةٍ مِـنْ سَـاعَاتِ الْجُمُعَـةِ فِيـمَا بَـيْنَ الْعَـصْرِ إِلَى اللَّيْـلِ»}، وقـد ضعّفـه البخـاري وابـن المدينـي بأنـه مـن كلام كَعـب الأحبـار حـدّث بـه أبـا هريـرة ﷺ وإنمـا اشـتبه عـلى بعـض الـرواةِ سـنده، فظنـه مرفوعـاً.

یـان هەڵبەسـتراون، یـان سـەنەدەکەیان زۆر بێهێـزەو هـی پشـت پـێ بەسـتران نیـن، ئـەوە کـە ڕۆژەکانـی هەفتـە دیاریـی کـراون، کـە گوایـە: لـە ڕۆژی شـەممەدا خـوا فـلان شـتی دروسـتکردوە، گڵـی دروسـتکردوەو لـە ڕۆژی یـەك شـەممەدا، باڵنـدەی دروسـتکردوەو، لـە ڕۆژی سـێ شـەممەدا دارو درەختـی دروسـتکردوەو....هتد.

**ب**- کە **(الطبري)** بە ژمارە: (٢٠٤٢٩) دەقێکی لەو بارەوە هێناوە، کە ڕۆژەکانی هەفتەی دیارییکردوون بۆ دروستکردنی شتەکان، پێشەوا حاکیمیش بە صەحیحی داناوە[١]، بەڵام لە ڕاستییدا ئەوە بە هەڵبەستراو یان بە بێهێز دانراوە.

**ج**- هەروەها ئەم دەقەش: {**إِنَّ الله فَرَغَ مِنْ خَلْقِهِ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ**} (**أخرجه أبو الشيخ في العَظَمَة، برقم: ٨٩٥**)، واتە: خوا لە دروستکردنی دروستکراوەکانی بۆوە لە ماوەی شەش ڕۆژان دا، کە ئەمەش جێی پشت پێ بەستن نیە.

بـەڵام لـە فەرمـوودەی ڕاسـت (صحیـح)دا هاتـوە کـە خـوا ئادەمـی ﷺ لـە ڕۆژی جومعـەدا خوڵقانـدوە، ئەمـە لـە صەحیحـی بوخاریـی و موسـلیمدا هاتـوەو، خـوا ﷻ کاتێـك ئادەمـی خوڵقانـدوە، کـە زەوی هەبـووەو، ڕۆژەکانـی هەفتـە هەبـوون و ئەوەیـان هیـچ ئیشـکالێکی تێدانیـە.

بـەڵام ئەوانـی دیکـە لـە ڕووی سـەنەدەوە، پشـتیان پـێ نابەسـترێ، لـە ڕووی واقیعیـی و زانسـتیی گەردووناسیشـەوە بـە کەڵـك نایـەن و، هەرگیزیـش فەرمایشـتی پێغەمبـەری خـوا لەگـەڵ عەقـڵ و زانسـت و واقیـع دا تێـك ناگیـرێ.

**سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.**

---

(١) المستدرك على الصحيحين، ج٢، ص٥٤٣.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـە لـە شـەش (٦) ئایەت پێك هاتـوە، ئایەتەکانـی: (١٣ - ١٨)، لەو شـەش ئایەتـەدا، خـوای بـەرزی مـەزن ئاماژەیەکـی کـورت بـە بەسـەرهاتی هـەردوو گەلـی عـاد، کـە پێغەمبەرەکەیـان هـوود ﷺ بـووەو، گەلـی ثەمـوود، کـە پێغەمبەرەکەیـان صاڵیـح ﷺ بـووە دەکات، بـە بۆنـەی پشـتگوێ خسـتن و، پشـت هەڵکـردن و یاخیـی بوونـی بێبڕوایانـی ڕۆژگاری پێغەمبـەری خـواوە ﷺ خـوا ﷻ باسـی ئـەو دوو گەلـە سـەرکەش و یاخییـەو، ئـەو سـەرەنجامە شـووم و دژوارەیـان دەکات، کـە بەسـەریان هاتـوە، واتـە: ئەگـەر ئەوانیـش لەسـەر ئـەو حاڵەیـان بـەردەوام بـن، سـزایەکی لـەو شـێوەیەی کـە ئـەو دوو گەلـە سـەرکەش و یاخییـە پێـی فەوتێـنراون، چاوەڕێیانـە، کـە بریتـی بـووە لـە (صَاعِقَة)، واتـە: دەنـگ و هاڕژنێکـی گـەورەو بێـڕەزا، کـە ئاگـرو بڵێسـەی لـێ پەیدابـێ و، ببێتـە هـۆی وێرانکـردن و خاپوورکـردن.

﴿ فَإِنْ أَعْرَضُوا۟ فَقُلْ أَنذَرْتُكُمْ صَـٰعِقَةً مِّثْلَ صَـٰعِقَةِ عَادٍ وَثَمُودَ ﴿١٣﴾ إِذْ جَآءَتْهُمُ ٱلرُّسُلُ مِنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّا ٱللَّهَ ۖ قَالُوا۟ لَوْ شَآءَ رَبُّنَا لَأَنزَلَ مَلَـٰٓئِكَةً فَإِنَّا بِمَآ أُرْسِلْتُم بِهِۦ كَـٰفِرُونَ ﴿١٤﴾ فَأَمَّا عَادٌ فَٱسْتَكْبَرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَقَالُوا۟ مَنْ أَشَدُّ مِنَّا قُوَّةً ۖ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِى خَلَقَهُمْ هُوَ أَشَدُّ مِنْهُمْ قُوَّةً ۖ وَكَانُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا يَجْحَدُونَ ﴿١٥﴾ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا صَرْصَرًا فِىٓ أَيَّامٍ نَّحِسَاتٍ لِّنُذِيقَهُمْ عَذَابَ ٱلْخِزْىِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَعَذَابُ ٱلْـَٔاخِرَةِ أَخْزَىٰ ۖ وَهُمْ لَا يُنصَرُونَ ﴿١٦﴾ وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيْنَـٰهُمْ فَٱسْتَحَبُّوا۟ ٱلْعَمَىٰ عَلَى ٱلْهُدَىٰ فَأَخَذَتْهُمْ صَـٰعِقَةُ ٱلْعَذَابِ ٱلْهُونِ بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿١٧﴾ وَنَجَّيْنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَكَانُوا۟ يَتَّقُونَ ﴿١٨﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{(ئەی موحەممەد!) ئەگەر خەڵکەکەت پشتیان هەڵکرد لە بڕواهێنان، پێیان بڵێ: دەتانترسێنم و هۆشدارییتان پێ دەدەم لە هاڕژنێکی بڵێسەی ئاگردار، وەك هاڕژنی پێ فەوتێنرانی هەردوو گەلی عادو ثەموود ﴿١٣﴾ کاتێك پێغەمبەران لە پێش دەستیانەوەو، لە دوایانەوە هاتنە لایان، {هەموو شێوازێکیان لەگەڵ بەکارهێنان و، زۆر سوور بوون لەسەر ڕێی ڕاستگرتنیان}و، پێیان ڕاگەیاندن کە جگە لە خوا مەپەرستن، ئەوانیش گوتیان: ئەگەر پەروەردگارمان ویستبای پێغەمبەرمان بۆ بنێرێ، فریشتەی دادەبەزاندن، بۆیە ئێمە بەوەی پێی ڕەوانکراون، بێبڕواین، (پێمان وانیە خوا ئێوەی ناردبێ) ﴿١٤﴾ ئنجا گەلی عاد بە ناهەق لە زەویدا خۆیان بە زلگرت و گوتیان: کێ لە ئێمە هێزی توندترە؟! ئایا نەیاندیبوو (بە چاوی عەقڵ و دڵ) کە ئەو خوایەی دروستی کردوون، هێزی لەوان توندترە! وێڕای ئەوە نکووڵییشیان لە نیشانەکانمان دەکرد ﴿١٥﴾ ئنجا ئێمەش بایەکی ساردو بەهێزمان لە ڕۆژانێکی نەگبەت و بێ خێردا ناردە سەریان، تاکو ئازاری زەبوونییان لە ژیانی دنیادا پێ بچێژین و، ئازاری ژیانی کۆتاییش زەبوونکەرتریشەو، ئەوان یاریدەش نادرێن، دەربازیش ناکرێن ﴿١٦﴾ بەڵام گەلی ثەموود ڕێنماییمان کردن، کەچی کوێرییان بەسەر ڕێنماییدا هەڵبژارد، بۆیە سەرەنجام بە هۆی ئەوەوە کە دەیانکرد، هاڕژنی ئازاری ڕیسوایی گرتنی ﴿١٧﴾ ئەوانەش کە بڕوایان هێنابوو و پارێزیان دەکرد، قوتارمان کردن ﴿١٨﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(أَعْرَضُواْ): (أَعْـرَضَ: أي أَظْهَـرَ عُرْضَـهُ: أي نَاحِيَتَـهُ، أَعْـرَضَ عَنِّـي: وَلَّى مُبْدِيـاً عُرْضَـهُ)، پشـتیان هەڵکـرد، لاملیـان تێکـرد، چونکـە (أَعْـرَضَ) واتـە: لاملـی یاخـود لاتەنیشـتی دەرخسـت، (أَعْـرَضَ عَنِّـي) پشـتی تێکردم و لاتەنیشـتی خـۆی کردە من، ئینسـان ئەگەر ڕووبـەڕووی کەسـێك بـێ، کاتێـك دەیـەوێ پشـتی تێبـکات، پێشـێ وەردەسـووڕێ و لاتەنیشـتی دەیکەوێتـێ، دوایـی پشـتی تێـدەکات.

(صَٰعِقَةً): (الصَّاعِقَـةُ وَالصَّاقِعَـةُ يَتَقَارَبَـانِ وَهُـمَا: الهَـدَّةُ الكَبِـيرَةُ، وَالصَّاعِقَـةُ: الصَّـوْتُ الشَّـدِيدُ فِـي الجَـوِّ، ثُـمَّ يَكُـونُ مِنْهَـا نَـارٌ فَقَـط، أو عَـذَابٌ أو مَـوْت)، (صَاعِقَـة) لەگـەڵ (صَاقِعَـة): واتایـان لێـك نیزیکـە کـە بریتیـە لـە: دەنگێکـی گەورە، بـە کوردیـی دەڵێین: هـاڕژن، چریکـە، هـاڕە، (صَاعِقَـة): دەنگێکـی بەهێـزە لـە ئاسـمان دێ، دوایـی یـان ئاگـری لەگەڵدایـە بـە تەنـێ، یاخـود ئازاریـش، یاخـود مردنیشـی پێوەیـە.

دەڵێم: هەبوونی ئاگرو ئازارو مردن شوێنەوارەکانی ئەو هاڕژنەن کە (صَاعِقَة)یە.

(صَرْصَرًا): (رِيْحَـاً صَرْصَراً: أَي شَـدِيدَةً) واتـە: بایەکـی بەهێـز، (صَرْصَر): بـە مانـای بایەکـی زۆر سـاردو، زۆر تونـدو بەهێـز.

(نَّحِسَاتٍ): کـۆی (نَحْـس)ە، کـە بـە (نَحْسَـات)یش خوێنراوەتـەوە، (نَحِسَـات: أي مَشـؤُمَات) واتـە: ڕۆژانێکـی بێخێـر، هەڵبەتـە ڕۆژەکان هـەر وەك خۆیانن، بـەڵام کردەوەی مرۆڤەکانـە کـە کاتەکانـی خێـردار دەکات، یاخـود بێخێـر دەکات، بـۆ گەلـی عـاد ئـەو ڕۆژانـەی کـە تێیـدا فەوتێـنراون، ڕۆژانێکـی نەگبـەت و بێخێر بـوون، بە نسـبەت ئەوانەوە.

(ٱلْخِزْيِ): (خَـزِيَ الرَّجُـلُ: لَحِقَـهُ انْكِسَـارٌ)، دەگوتـرێ: (خَـزِيَ الرَّجُـلُ) واتـە: بەخـۆدا شـکایەوە، یـان شـەرم گرتـی، شـەرمەزار بـوو.

(فَٱسْتَحَبُّوا): هەڵیانبـژارد، (تَعْدِيَتُـهُ بـ«عَلَى» يُفِيـدُ الإِيْثَـارَ، وَحَقِيقَةُ الإِسْـتِحْبَابِ تَحَرِّي الإِنْسَـانِ فِي الـشَّيْءِ أَنْ يُحِبَّـهُ)، وشـەی (اسْـتَحَبُّوا): کـە بـە (عَلَى) بـەرکاری خواسـتوە، مانـای هەڵبـژاردن دەگەیەنـێ، وشـەی (إِسْتِحْبَاب): لـە ئەصڵـدا بریتیـە لـەوەی مـرۆڤ لـە شـتێك بخەفتـێ خۆشـیبوێ، (اسْـتَحَبُّوا) بـە (س و ت) مانایەکـەی بەهێزکـراوە، ئەگەرنـا یانـی: (أَحَبُّوا)، ئنجـا کـە بـە (عَلَى) بـەرکاری خواسـتوە: ﴿فَٱسْتَحَبُّوا ٱلْعَمَىٰ عَلَى ٱلْهُدَىٰ﴾، کوێرییـان بەسـەر ڕێنماییـدا هەڵبـژارد، ئەمـە مانـای هەڵبـژاردن دەگەیەنـێ.

(ٱلْعَمَىٰ): (إِفْتِقَـادُ البَـصَرِ وَالبَصِـيرَةِ) (عَمَـى): بریتیـە نەبوونـی چـاو و نەبوونـی عەقـڵ و دڵ.

(ٱلْهُونِ): (الهَـوَانُ: التَّذَلُّلُ فِي نَفْسِـهِ، لِمَا لا يُلْحِقُ بِـهِ غَضَاضَـةً، فَيُمْدَحُ، أو مِنْ جِهَـةِ مُتَسَلِّطٍ مُسْتَخِفٍّ بِـهِ، فَيُذَمُّ)، (هَـوَان): ئەگـەر مـرۆڤ لـە خـودی خۆیـدا خـۆی بـە کـەم بگـرێ، خـۆی نـەرم و نیـان بـێ، ئـەوە بـە نوقسـانیی بـۆی لـە قەڵـەم نـادرێ، بۆیـە لەسـەری سـتایش دەکـرێ، دەگوتـرێ: فڵانکـەس پیاوێکـی هێدیـی و مەنـدە، بـەڵام ئەگـەر بـە هـۆی کەسـێکەوە بـێ کـە بەسـەریدا زاڵ بـووەو بـە کەمـی تەماشـا دەکات، لـەو حاڵەتـەدا ئـەو نەرمیـی و زەبوونییـە بـە نوقسـانیی لـە قەڵـەم دەدرێ و، لەسـەری زەم دەکـرێ.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

سەرەتا پێویستە ئەوە بڵێین: کە لەم شەش (٦) ئایەتەدا، خوا ﷻ ئاماژەیەك دەکات بە هەر کام لە گەلی عادو گەلی ثەموود، ئێمەش لە سوورەتی (هود) دا بەسەرهاتی هوود ﷺو گەلەکەی (عاد)مان بە درێژیی باسکردووەو، لە سوورەتی (الحِجْر)یش دا، بەسەرهاتی صالیح ﷺو گەلەکەی ثەموودمان بە درێژیی باسکردوە، بۆیە لێرەدا هەر بە خێرایی بەسەر تەفسیرکردنی ئایەتەکاندا دەڕۆین، ئەوەندەی پێویست بێ بۆ ڕوونکردنەوەی چەمکی ئایەتەکان، هەڵوەستە دەکەین، ئەگەرنا بەسەرهاتی ئەو دوو پێغەمبەرە پایە بەرزە هوودو صالیح و، گەلە یاخیی و سەرکەشەکانیان: گەلی عادو گەلی ثەموود، لەو دوو شوێنە کە ئامـاژەم پێدان بە درێژیی خستوماننە ڕوو.

لێرەدا خوا ﷻ هەر بە بۆنەی سەرکەشیی و یاخیی بوون و لە خوا عاسێ بوونی کافرانی ڕۆژگاری پێغەمبەرەوە، ڕوو لە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەکات و دەفەرموێ: ﴿ فَإِنْ أَعْرَضُواْ ﴾، ئنجا ئەگەر هەر پشتیان هەڵکرد، واتە: بەردەوام بوون لەسەر پشتهەڵکردن و بە دەنگەوە نەهاتن، ﴿ فَقُلْ أَنذَرْتُكُمْ صَٰعِقَةً مِّثْلَ صَٰعِقَةِ عَادٍ وَثَمُودَ ﴾، پێیان بڵێ: دەتانترسێنم و هۆشدارییتان پێ دەدەم لە (صَاعِقَة)یەك وێنەی (صَاعِقَـة)ی گەلی عادو ثەموود، واتە: ئەو (صَاعِقَة)یەی کە گەلی عادو ثەموودی پێ فەوتێنراون، وەك پێشتریش گوتمان (صَاعِقَـة) زیاتر بە هاڕژنێك، دەنگێکی گەورە دەگوترێ، کە جاری وایە ئاگرێکی بە بڵێسەی لەگەڵدایە، وەك لە سوورەتی (الرَّعـد)دا خوا دەفەموێ: ﴿ وَيُرْسِلُ ٱلصَّوَٰعِقَ فَيُصِيبُ بِهَا مَن يَشَآءُ ﴾، واتە: خوا (صَاعِقَـة)ەکان دەنێرێ، هەر کەسێکی بیەوێ، ئەو (صَاعِقَة)انە لێی دەدەن، کە مەبەست پێی برووسکەیە، ئەو برووسکەی لە ئەنجامی ساردو گەرمیی نێوان هەورو زەوی پەیدادەبێ، (صَاعِقَـة) لە ئەسڵدا

ئەوەیە، بەڵام دوایی خوازراوەتەوە بۆ هەر ڕووداوێك، یان هەر ئازارێکی زۆر توندو سامناك، کە ببێتە هۆی پێ فەوتێنرانی کەسێك، یان کۆمەڵێك، بۆیەش ئەوە دەڵێین: چونکە گەلی ثەموود دیارە بە (صَاعِقَة) فەوتاون، واتە: بە هاڕژنێکی گەورە کە بڵێسەی ئاگر بووەو، بۆتە هۆی زەوی لەرزە لە ژێریاندا، بەڵام گەلی عاد بە بایەکی بەهێزو ساردو توند فەوتێنراون، بەڵام (صَاعِقَة) وەك دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا زیاتر باسی دەکەین، وێڕای ئەوەی کە بە بڵێسەی ئاگر دەگوترێ، بە هەمان شێوە بە هەر سزایەکی دیکەی، یان هەر ئازارێکی دیکەی کە کەسێك، یان کۆمەڵێکی پێ دەفەوتێن، بەوەش دەگوترێ.

﴿ إِذْ جَآءَتْهُمُ ٱلرُّسُلُ مِنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ ﴾، کاتێك کە پێغەمبەران هاتن بۆ لایان لە پێش دەستیانەوەو لە دوایانەوە، واتە پێغەمبەرانێك (عَلَيْهِم الصَّلاةُ وَالسَّلام) لەپێش واندا هاتبوون، ئەو پێغەمبەرانەی بۆ باب و باپیرانیان هاتوون و، ئەو پێغەمبەرانەشی کە لەدوایانەوە هاتن، واتە لە ڕۆژگاری خۆیاندا، ئەوە واتایەکی، یاخود مەبەست ئەوەیە کە پێغەمبەرانیان (عَلَيْهِم الصَّلاةُ وَالسَّلام) لە هەموو لایانرا بۆیان دەهاتن تاکو قەناعەتیان پێ بێنن، ﴿ مِنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ ﴾، یانی: هەموو شێوازێکیان لەگەڵ بەکاردەهێنان، وەك چۆن کەسێك کە قسە لەگەڵ کەسێکدا دەکات، بۆ ئەوەی ئیقناعی بکات، جارێك لەولاڕا قسەی لەگەڵ دەکات و، جارێك لە لایەکی دیکەوەو، جارێك لە پێشەوە بۆ ئەوەی ئیقناعی بکات، لێرەدا مەبەست ئەوەیە کە هەموو شێوازێکیان لەگەڵ ئەو گەلانەیاندا بەکارهێناون، کە ئیقناعیان بکەن و بیانهێننە سەر ڕێی ڕاست، ﴿ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّا ٱللَّهَ ﴾، پێیان دەگوتن: کە جگە لە خوا مەپەرستن.

ئەو دوو گەلە، واتە: گەلی عادو گەلی ثەموود، وەڵامی پێغەمبەرەکانیان هوودو صالیح ﷺیان دایەوە: ﴿ قَالُوا۟ لَوْ شَآءَ رَبُّنَا لَأَنزَلَ مَلَٰٓئِكَةً ﴾، گوتیان: ئەگەر پەروەردگارمان ویستبای فریشتەی دادەبەزاندن، یانی چی؟ یانی: ئەگەر پەروەردگارمان ویستبای پێغەمبەرمان بۆ لا بنێرێ، فریشتەی دادەبەزاندن،

مـادام فریشـتەی دانەبەزانـدوون، کەواتـە: ئێـوە پێغەمبـەر نیـن، ﴿ فَإِنَّا بِمَآ أُرْسِلْتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴾، واتـە: بۆیـە ئێمـە ئـەوەی ئێـوە پێـی ڕەوانکـراون، پێـی بێبڕوایـن، مەبەسـتیان ئـەوە نەبـووە کـە بڵێـن: ئێـوە پێغەمبـەرن و ئێمـەش بڕواتـان پـێ ناکەین، بەڵکـو مەبەسـتیان ئـەوە بـووە بڵێـن: ئـەوە کـە ئێـوە لافـی ئـەوە لـێ دەدەن، پێـی ڕەوان کـراون، ئێمـە پێـی بێبڕوایـن و، پێـمان وانیـە ئێـوە خـوا ناردبنـی، ئەگـەر خـوا ویسـتبای پێغەمبـەر بنێـرێ، فریشـتەی دەنـاردن.

دوای ئـەوەی خـوا ﷻ لـەم دوو ئایەتە موباڕەکـەدا، بە کورتیی باسـی هەردووکیانی کـرد، ئنجا دێتـە سـەر باسـی یـەك یەکیان، پێشـێ باسـی گەلـی عـاد دەکات، لـە ڕووی مێژوویـی و کاتیشـەوە، گەلـی عـاد لـە پێـش گەلـی ثەموودەوە بـووەو، لـەو شـوێنەی کـە ئاماژەمـان پێـدا لـە سـوورەتی هـوددا، ئێمـە بـە درێژیـی باسـی گەلـی عـادو هەڵکەوتـە جوگرافییەکەیـان و، ئـەو کاتـە کـە تێیـدا ژیـاون و، تایبەتمەندییەکانیـان و، شـوێنەوارەکانیان و، ئـەو سـزایەی کـە پێـی فەوتێـنراون، ئەوانەمـان بـە درێژیـی بـاس کـردوون، دەفەرمـوێ: ﴿ فَأَمَّا عَادٌ فَٱسْتَكْبَرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ ﴾، ئنجا هەرچـی گەلـی عـاد بوو لـە زەویـدا، واتە: لەسـەر زەمینـی خۆیانـدا، (**الأرض**) (أل)کەی بـۆ ناسـاندنە، بـەڵام بـۆ (**عهـد**)ە، واتـە: لەسـەر زەمینەکـەی خۆیانـدا خۆیـان بەزلگرت، ﴿ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ ﴾، بـە ناهـەق، ئنجـا خۆبەزلگرتـن هـەر بـە ناهەقـەو خۆبەزلگرتنـی هـەق نیـە، بـەڵام ئەمـە بـۆ زیاتـر قێـزەون دەرخسـتنی خۆبەزلگرییەکەیانـە، ئەگەرنا هـەر کەسـێك خـۆی بەزلبگـرێ بـە هـەر هۆیەکـەوە بـێ، خۆبەزلگرییەکـەی هـەر بـە ناهەقـە، ئەگـەر بەهـۆی زانیارییـەوە لـە خـۆی بایـی بـێ، یـان بـە هـۆی دەسـەڵات و سـامانەوە، یـان بەهـۆی قەڕەباڵغیـی دەوریـەوە، یـان بـە هـەر هۆیەکـەوە، مـرۆڤ لـە خـۆی بایـی بـێ و، لـە کەوڵـی خـۆی دەربچـێ، هـەر خراپـە، بـەڵام ئـەوەی ئێـرە بـۆ زیاتـر ناشـیرین دەرخسـتنی خـۆ بەزلگرییەکەیانـە.

﴿ وَقَالُوا۟ مَنْ أَشَدُّ مِنَّا قُوَّةً ﴾، گەلـی عـاد گوتیـان: کـێ لـە ئێمـە هێـزی زیاتـرەو توندتـرە؟! ﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِى خَلَقَهُمْ هُوَ أَشَدُّ مِنْهُمْ قُوَّةً ﴾، ئایـا نەیانبینیـوە

ئـەو خوایـەی هێناونیـە دی، لـەوان هێـزی زیاتـرەو توندتـرە؟! یـانی: بـەلای کەمـەوە ئـەو خوایـەی کـە ئەوانـی دروسـتکردوە، لـەوان بەهێزتـرە، کەواتـە: نەدەبـوو ئـاوا لـە کەوڵـی خۆیـان دەربچـن و، بڵێـن: کـێ لـە ئێمـە بەهێزتـرە؟

هەڵبەتـە لـە کتێبـە مێژووییەکانـدا بـاس دەکـرێ، کـە گەلـی عـاد لـە ڕووی کەلەش و جەسـتەوە زۆر زل بـوون، دەڵێـن: لـە ڕووی عەقڵیشـەوە زۆر هۆشـیار بـوون و، لـە ڕووی ئاوەدانییـەوە شـوێنەوارەکانیان دیـارن، بۆیـە زۆر بـە خۆیـان نازیـوەو، ئـەو ئیمکانیـەت و توانایـەی خـوا پێـی داون، لـە جیاتـی ئـەوەی بـەکاری بێنـن بـۆ چاکـەو، بـە چاکـەی خـوای بزانـن و بـۆ خێـر بـە کاری بێنـن، پێـی لـە خۆبایـی بـوون و، بـۆ خراپـەش بەکاریـان هێنـاوە، وەك لـەو شـوێنانەدا کـە خـوای پـەروەردگار باسـی گەلـی عـاد دەکات، بـاسی دەکات کـە ڕێگرییـان کـردوەو، خراپەکارییـان کـردوەو، سـتەمیان کـردوە لـە خەڵکـی دیکـە، ﴿ وَكَانُواْ بِـَٔايَـٰتِنَا يَجۡحَدُونَ ﴾، هەروەهـا بـە ئایەتەکانـی ئێمـەش بێبـڕوا بـوون و نکووڵییـان لـە ئایەتەکانـی ئێمـە دەکـرد، (**آيات**) یـش دەگونجـێ مەبەسـت پێیـان فەرمایشـتی خـوا بـێ، کـە لـە دوو توێـی ئـەو ڕسـتانەدا، کـە لـە پەیـام و کتێبەکانیـدا دایبەزاندوون و، بەرجەسـتە بووە، دەشـگونجێ (**آيَاتِ**) مەبەسـت پێـی هەمـوو ئـەو شـتانەبن، کـە دەبـێ خوایـان پـێ بناسرێ، واتـە: دیـاردەو دیمەنەکانـی دەوروبـەرو گـەردوون، یاخـود (**آيَات**) مەبەسـت پێـی ئـەو موعجیزانـەن کـە پێغەمبـەران (**عَلَيْهِـم الصَّـلاةُ وَالسَّـلام**) هێناویانـن، کـە پێغەمبـەران هـەر خـودی خۆیـان موعجیـزە بـوون، بۆیـەش وا دەڵێـم، چونکـە ئەگـەر خـوای بـەرز بـۆ گەلـی ثەمـوود باسـی ئـەو حوشـترە (**ناقة**) ناوازەیـە دەکات، کـە لـە بەردێـك یـان لـە چیایـەك هاتۆتـەدەر، بـەڵام بـۆ گەلـی هـوود، کـە عـادن، باسـی مەعجیزەیەکـی دیاریکـراو نـاکات، کـە هـوود ﷺ بـۆی بردبـن و پێشـانیدابن، بـەڵام پێغەمبـەران هــەر بـۆ خۆیـان موعجیـزە بـوون، بەپێـی فەرمایشـتەکەی پێغەمبەریـش ﷺ کـە زۆرجـار هێناومانـەو لـە صەحیحی بوخاریـی و موسـلیم دا، هاتـوە، هیـچ پێغەمبەرێك نەبـووە، بەڵگەیەکـی وای پـێ نەبـێ کـە خەڵـك لەسـەری ئیمانـی پـێ بێنـن و،

قەناعەتیان بێ کە ڕاست دەکات و، پێغەمبەری خوایە، ئنجا بە پێی ئەوە هەم هوودیش، هەم هەموو پێغەمبەرانیش بەڵگەو موعجیزەیەکیان بووە، با خوای موتەعالیش لە قورئاندا باسی نەکردبێ، هەرچەندە پێغەمبەران بۆ خۆشیان هەر موعجیزە بوون، هەر کەسێ تێیان ڕامابایە، دەیزانی ئەوانە کەسانێکی ڕاستگۆن، چونکە پێغەمبەران پێش پێغەمبەرایەتییش خاوەنی پاکترین مەعدەن و چاکترین عەقڵ و، ڕەوشت بەرزترین کەس بوون و، هیچ لەکەو پەڵەیەکیان بەسەرەوە نەبووەو، خەڵك هەرگیز درۆو پەیمان شکێنیی لێ نەبیستوون و، شتی نارێکی لێ نەبینیون، لەبەر ئەوە هەر کە گوتوویانە: ئێمە نوێنەری خواین، دەبووایە بڕواو متمانەیان پێ بکەن، بەڵام وێڕای ئەوە، هیچ پێغەمبەرێکیش نەبووە موعجیزەیەکی پێ نەبێ، کە خەڵکەکە قەناعەتیان پێی بێ، ئەوە پێغەمبەری خوایە، ئەگەر لە هەقێ بگەڕێن.

﴿يَجۡحَدُونَ﴾، واتە: نکووڵییان لە نیشانەکانی ئێمە دەکرد، نکووڵییکردن ئەوەیە ئینسان شتێك بزانێ هەقەو دانی پێدانەهێنێ.

ئنجا خوا ﷻ باسی چۆنیەتی سزادانی گەلی عاد دەکات، دەفەرمووێ: ﴿فَأَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ رِيحٗا صَرۡصَرٗا فِيٓ أَيَّامٖ نَّحِسَاتٖ﴾، بایەکی بە هێزی زۆر ساردمان لە ڕۆژانێکی بێ خێردا ناردە سەریان، کە لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە، ئەو بایەی گەلی عادی پێ فەوتێنراوە، پێی گوتراوە: (دەبوور)، واتە: ئەو بایەی لە پشتی کەعبەوە دێ، عەرەب بەپێی شوێنەکانی خۆیان ناویان لە شتەکان ناوە، کە لەپشتی کەعبەوە بێ، مانای وایە لە ڕۆژئاواوە هاتووە، هەروەها (صَرۡصَرۡ) بە مانای توندو بەهێزیش دێ، ﴿فِيٓ أَيَّامٖ نَّحِسَاتٖ﴾، واتە: لە ڕۆژانێکی نەگبەتدا، (نَحِسَاتْ) کۆی (نَحِس)ە، هەروەها خوێنراویشەتەوە: (**فـي أَيَّامٍ نَحْسَاتٍ**)، ئەویش کۆی (نَحْس)ە، ئنجا (نَحْس) یان (نَحِس) بە (نَحِسَاتْ) یان بە (نَحْسَاتْ) کۆدەکرێتەوە واتە: ڕۆژانێکی نەگبەت و بێ خێرو پڕ شەئامەت، هەڵبەتە ڕۆژ لە زاتی خۆیدا هەر ڕۆژە، بەڵام بۆ ئەوان ڕۆژانێکی بێ خێرو

نەگبەت و پڕ مەینەتیی بوون، ﴿ لِّنُذِيقَهُمْ عَذَابَ الْخِزْيِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا ﴾، تاکو سزای ڕیسواکەریان لە ژیانی دنیادا پێ بچێژین، وەك ئەو سزایە خواردنێك بێ و، دەرخواردیان بدرێ، ﴿ عَذَابَ الْخِزْيِ ﴾، ئەمە پاڵدانی وەسفکراو (**مَوصُوف**)ە بۆ لای (**صِفَة**)، کە لە ئەصڵدا (**الخِزْيِ العَذَاب**)ە، بەڵام (**عَذَابَ الخِزي**) بۆ زیاتر تۆخکردنەوەی ئازارەکەیە، واتە: ئازاری ڕیسواکەرو زەبوونکەر، ﴿ وَلَعَذَابُ الْآخِرَةِ أَخْزَىٰ ﴾، بە دڵنیایی سزاو ئازاری مەنزڵگای کۆتاییش ڕیسواکەرترو زەبوونکەرترو شەرمەزارکەرتریشە، ﴿ وَهُمْ لَا يُنصَرُونَ ﴾، ئەوانیش سەر ناخرێن، واتە: ئەو سزا ڕیسواکەرەیان بە ملدا دێ، لە ڕۆژی دواییدا، کە لە هی دنیا ڕیسواکەرترەو، سەریش ناخرێن و کەس نیە، فریایان بکەوێ و تکایان بۆ بکات و دەربازیان بکات.

ئنجا دێتە سەر باسی گەلی **ثەمود**، دەفەرموێ: ﴿ وَأَمَّا ثَمُودُ ﴾، بەڵام گەلی **ثەمود**، ﴿ فَهَدَيْنَاهُمْ ﴾، ڕێنماییمان کردن، لێرەدا: (**هَدَيْنَاهُمْ**)، واتە: ڕێی ڕاستمان پێشان دان، ئەگەرنا (**هَدَيْنَاهُمْ**) بە مانای (خستماننە سەر ڕێ) نیە، گەر خوا خستبانیە سەر ڕێگای ڕاست، مانای وایە تووشی سزا نەدەبوون، بەڵام واتە: ڕێمان پێشاندان، چونکە وشەی (**هُدى**) لە قورئاندا جاری وایە بە مانای ڕێ پێشاندان و ڕێنمایی کردنەو، جاری وایە بە مانای خستنە سەر ڕێی ڕاستە، زۆرجاریش ئەوەمان گوتوە کە هەندێك لە ڕوونکەرەوانی قورئان، زۆرجار ئەوانەی وتاران دەدەن و باسی ئیسلام دەکەن، لە ئەنجامی ئەوەدا کە نازانن ئەو وشەیە لە سیاقێکدا واتایەکی هەیەو، لە سیاقێکی دیکەدا، واتایەکی دیکەی هەیە، تووشی تێگەیشتنی هەڵە دەبن لە هەندێك لە ئایەتەکانی قورئان، خوا دەفەرموێ: گەلی **ثەموو**دیشمان ڕێنمایی کرد بوون، ڕێی ڕاستمان پێشاندابوون، ﴿ فَاسْتَحَبُّوا الْعَمَىٰ عَلَى الْهُدَىٰ ﴾، بەڵام کوێرییان بەسەر ڕێنماییدا هەڵبژارد، کوێرییان خۆشتر ویست لە ڕێنمایی، ﴿ فَأَخَذَتْهُمْ صَاعِقَةُ الْعَذَابِ الْهُونِ ﴾، لە ئەنجامدا هاڕژنی ئازارێکی ڕیسواکەرو شەرمەزارکەر گرتنی، (**صَاعِقَة**) پێشتر باسمان کرد، واتە: هاڕژنێك و

دەنگێکی گەورە، کە بڵێسە ئاگری لەگەڵدا بێ، خوا ﷻ لەو شوێنانەدا کە باسی فەوتانی گەلی ثەموود دەکات، کە پێغەمبەرەکەیان (صَالِح) بووە، وشەی (صَاعِقَة) یان بۆ بەکاردێنێ، جاری واش هەیە وشەی بوومەلەرزە (زَلْزَلَة) یان بۆ بەکاردێنێ، جاری واش هەیە وشەی چریکەو هاڕژن (صَيْحَة) یان بۆ بەکاردێنێ، کە وەك لە کاتی توێژینەوەی بەسەرهاتی گەلی ثەمووددا گوتوومانە: ئەوانە هەموویان هەریەکەی بە ئیعتیبارێك تەعبیر لەو سزایە دەکەن کە ئەو گەلەی پێ فەوتێنراوە، ئنجا تەعبیرێکیان باسی دەنگەکەی دەکات و، تەعبیرێکیان باسی بڵێسەکەی دەکات و، تەعبیرێکیان باسی شوێنەواری ئەو سزایە دەکات، کە بۆتە هۆی زەمین لەرزە، یاخود ئاگر پژێن و ... هتد، بەڵام بۆچی خوا بەو جۆرە سزای دان؟ ﴿بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ﴾، بەهۆی ئەوەوە کە وەدەستیان دەهێناو دەیانکرد.

﴿وَنَجَّيْنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَكَانُوا۟ يَتَّقُونَ﴾، ئەوانەش کە بڕوایان هێنابوو و پارێزیان دەکرد، دەربازمان کردن، ئەوانەی بڕوایان هێناوەو پارێزیان کردوە، ئەوانە بوون کە لەگەڵ صالیح ﷺ بوون، کە هەمیشە پێغەمبەران لە کاتی سزادرانی گەل و کۆمەڵگایەکانیان دا، دوورکەوتوونەوە، چونکە خوا فەرمانی پێکردوون خۆتان و ئەوانەی بڕوایان پێتان هێناوە، دووربکەونەوە، ئەوانیش ڕۆیشتوون و شارەکەو شوێنەکەیان بەجێ هێشتووە، دوای ئەوان خوا سزای ناردوە بۆ ئەو گەلە ملهوڕو یاخییە، کە دیارە ئەوان متمانەیان نەبووە بەوەی ئەو پێغەمبەرە ڕاست دەکات، ئەگەرنا ئەوانیش شارەکەیان بەجێ دەهێشت بۆ ئەوەی بەسەریاندا کاول نەبێ.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**فەرمانکردنـی خـوا ﷻ بـە پێغەمبەرەکـەی موحەممـەد ﷺ، کـە لـە کاتـی ڕوو وەرگێـران و پشـت تێکردنـی خەڵکەکـەی دا لـە پەیامـی خـوا، بـە (صاعقة)یەکـی وەك هـی گەلـی عـاددو ثەمـوود، کـە ئـەو دوو گەلـە سـەر کەشـەی پـێ فەوتێـنراون، بیانترسـێنێ، کـە پێغەمبەرانیـان، واتـە: هـوودو صاڵیـح ؈ بـە هەمـوو شـێوەیەك هەوڵیـان لەگەڵیانـدا، کـە تەنیـا خواپەرسـتن، بـەڵام بێبـڕوا بـوون پێیـان، بـە بیانـووی ئـەوەی کـە ئەگـەر خـوا ویسـتبای پێغەمبـەران بنێـرێ، فریشـتەی دادەبەزانـدن:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ فَإِنْ أَعْرَضُوا۟ فَقُلْ أَنذَرْتُكُمْ صَـٰعِقَةً مِّثْلَ صَـٰعِقَةِ عَادٍ وَثَمُودَ ﴿١٣﴾ إِذْ جَآءَتْهُمُ ٱلرُّسُلُ مِنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّا ٱللَّهَ قَالُوا۟ لَوْ شَآءَ رَبُّنَا لَأَنزَلَ مَلَـٰٓئِكَةً فَإِنَّا بِمَآ أُرْسِلْتُم بِهِۦ كَـٰفِرُونَ ﴿١٤﴾ ﴾.

### شیکردنەوی ئەم دوو ئایەتە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿ فَإِنْ أَعْرَضُوا۟ ﴾، واتە: ئنجا ئەگەر خەڵکەکەت، کۆمەڵگایەکەت (ئەی موحەممەد ﷺ!)، پشتیان هەڵکرد، لاملیان تێکردی، (**أي: اسْتَمَرُّوا فـي إعْراضِهِم**)، واتە: بەردەوام بوون لەسەر پشت تێکردن و وەڵام نەدانەوەت، ﴿ فَإِنْ أَعْرَضُوا۟ ﴾، {**(إنْ): في الأَصْلِ يَقَعُ فِي المَوْقِع الَّذِي لاَجَزْم فِيْه بحُصُول الشَّرْط**}، واتە: لە ئەصڵدا (إنْ) بەکاردەهێنرێ بۆ ئەو شوێنەی کە دڵنیایی تێدانیە، مەرجەکە بێتە دی، واتە: عەقڵ و مەنتیق وا دەخوازێ کە ئەوان پشت هەڵنەکەن، یاخود لەسەر پشتهەڵکردن و پشتتێکردنیان بەردەوام نەبن، بەڵام ئەگەر لەسەر پشتتێکردنیان بەردەوام بوون.

٢)- ﴿ فَقُلۡ أَنذَرۡتُكُمۡ صَٰعِقَةً ﴾، پێیان بڵێ: ئێوەم ترساندو هۆشداریم پێدان لە (**صاعقة**) ەیەك.

٣)- ﴿ مِّثۡلَ صَٰعِقَةِ عَادٍ وَثَمُودَ ﴾، وەك (**صاعقة**)ەی گەلی عادو گەلی ثەموود، ﴿ أَنذَرۡتُكُمۡ ﴾، (**الإنْذارُ: التَّخْوِيفُ، وَهُوَ هُنا تَخْوِيفٌ بِتَوَقُّعِ عِقَابٍ، مِثْلِ عِقَابِ الَّذِينَ شابَهُوهم فِي الإعْراضِ، لِأنَّ قُرَيْشاً لَمْ تُصِبْهم صاعِقَةٌ مِثْلُ صاعِقَةِ عادٍ وثَمُودَ**)، (**إنْذار**): بریتیە لە ئاگادارکردنەوە لەگەڵ ترساندندا، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی ترساندنە بەوەی ئەگەری ئەوە هەیە، خوا سزایان بۆ بنێرێ، وەك سزای ئەوانەی وەك ئەوانیان کردوە، چونکە کافرەکانی قورەیش (**صاعقة**)ی وەك هی عادو ثەموودیان تووش نەبوو، کەواتە: مەبەست ئەوەیە ئەگەری هەیە ئێوەش سزا بدرێن، وەك سزای ئەوان، نەك ڕێك کت و مت ئەو (**صَاعِقَة**)یەی ئەوانی پێ فەوتاون، ئەو جۆرە (**صَاعِقَة**)یەش بۆ ئێوە بێ.

(**الصَّاعِقَـة: نـارٌ تَخْـرُجُ مَـعَ الـبَرْقِ تَحْـرِقُ مـا تُصِيبُـهُ**)، (**صَاعِقَـة**): بڵێسـە ئاگرێکـە لـە هـەورە تریشـقە دەردەچـێ، هەرچـی لێـی بـدات، دەیسـووتێنێ، وەك لـە سـوورەتی (**الرَّعـد**)دا دەفەرمـوێ: ﴿ وَيُرۡسِلُ ٱلصَّوَٰعِقَ فَيُصِيبُ بِهَا مَن يَشَآءُ وَهُمۡ يُجَٰدِلُونَ فِي ٱللَّهِ وَهُوَ شَدِيدُ ٱلۡمِحَالِ ﴿١٣﴾ ﴾، واتـە: خـوا صاعیقـەکان دەنێـرێ، (برووسـکەکان دەنێـرێ) هـەر کەسـێکی بیـەوێ لێـی دەدەن...

(**الصَّاعِقَـة: الحَادِثَـةُ المُبِـيرَةُ السَّرِيعَـةُ الإهْـلاكِ**)، (صاعقـة) ڕووداوێکـە بـە خێرایـی ئـەو کەسـە یـان ئـەو کۆمەڵەیـە دەفەوتێنـێ کـە لێـی دەدات، ئـەو مانایەشـی هەیـە.

٤)- ﴿ إِذۡ جَآءَتۡهُمُ ٱلرُّسُلُ مِنۢ بَيۡنِ أَيۡدِيهِمۡ وَمِنۡ خَلۡفِهِمۡ ﴾، کاتێك پێغەمبەرەکانیان لە پێش دەستیانەوە و، لە دوایانەوە بۆیان هاتن، لێرەدا خوا دەفەرموێ: ﴿ إِذۡ جَآءَتۡهُمُ ٱلرُّسُلُ ﴾، واتە: کاتێك پێغەمبەرەکانیان بۆیان هاتن، لە حاڵێکدا گەلی عاد بەس هوودیان بۆ چووەو، گەلی ثەموودیش، بەس صاڵیحیان بۆ چووەو دوو پێغەمبەر بوون؟! لێرەدا (**جَمْعُ الرُّسُلِ هُنَا مِنْ بابِ إطْلاقِ صِيغَةِ الجَمْعِ عَلَى الإثْنَيْنِ، مِثْلَ قَوْلِهِ تَعالى: ﴿ فَقَدۡ صَغَتۡ قُلُوبُكُمَا ﴾التحريم**)، واتە: لێرەدا (**رُسُل**) کە کۆکراوەتەوە ئەمە لەسەر

شێوازی بەکارهێنانی کۆیە بۆ دووان، وەك لە سوورەتی (**التَّحْريم**)دا خوا ﷻ بە دووان لە هاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ خوا لێیان ڕازی بێ، دەفەرموێ: ﴿ إِن تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا ﴾، ﴿ إِن تَتُوبَآ ﴾، پێشێ بە (**مُثَنَّى**) دەیهێنێ، ﴿ فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا ﴾، بە دڵنیایی دڵەکانتان لایانداوە، بە کۆ دەیهێنێ.

کەواتـە: بۆیـە خـوا ﷻ بـە کـۆ (**جمـع**) هێناویـەتی، چونکـە جـاری وایـە (دوو) ڕانـاوی کـۆی بـۆ بـەکاردێ و، وەك کـۆ مامەڵـەی لەگەڵـدا دەکـرێ.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ مِنۢ بَيۡنِ أَيۡدِيهِمۡ وَمِنۡ خَلۡفِهِمۡ ﴾، پێغەمبەرانیـان لـە پێـش دەسـتیانەوەو، لـە دوایانـەوە بۆیـان هاتـن، ئەمـە دوو واتایـان هەڵدەگـرێ:

یەکـەم: ئەمـە خسـتنە ڕووی سـوور بوونـی پێغەمبـەری هـەر کام لـەو دوو گەلەیە، لەسـەر ئـەوە کـە هیدایەتـی خـوا وەربگـرن، واتـە: هەمـوو شـێوازێکیان لەگەڵـدا بەکارهێنـان، وەك کەسـێك بـە کەسـێکی دیکـە دەڵـێ: لـە هەمـوو لایانـەوە بـۆی چـووم، یـان هەمـوو کەلێنـم لێگرتـن، یانـی: هەمـوو شـێوازێکم لەگەڵـدا بەکارهێنـا.

دووەم: یاخـود مەبەسـت پێـی ئەوەیـە: پێغەمبەرانێـك کـە بـۆ بـاب و باپیرانیـان هاتـوون، لـە پێـش دەسـتیانەوە هاتـوون و، پێغەمبەرانێکیـش کـە لـە دوای وان هاتـوون، لـە پشـتیانەوە هاتـوون.

واتـە: ئـەو پێغەمبەرانـەی کـە بـۆ بـاب و باپیرانیـان هاتـوون، خـوای زانـاو شـارەزا دەفەرمـوێ: ﴿ مِنۢ بَيۡنِ أَيۡدِيهِمۡ ﴾، لـە پێشـیانەوەو، ئـەو پێغەمبەرانـەی کـە بـۆ خۆیـان هاتـوون، دەفەرمـوێ: ﴿ وَمِنۡ خَلۡفِهِمۡ ﴾، لـە دوایانـەوە.

هەڵبەتـە ئـەو پێغەمبەرانـەش کـە لـە ڕۆژگاری بـاب و باپیرانیشـیاندا بۆیـان هاتـوون، بەسـەرهات و بـاس و خواسـی ئەوانیشـیان هـەر زانیـوەو بیسـتوە، کەواتـە: وەك بـۆ وانیـش چووبـن وایـە.

لێرەدا پرسیارێك دەکرێ:

ئایا چۆن خوا ﷻ ناوی لە سزای گەلی هوود کە (عاد)ە ناوە (صَاعِقَة)؟ لە حاڵێکدا کە بە بایەکی بەهێزی توند فەوتێنراون؟!

وەڵامەکەی ئەوەیە: کە وەك لە مانای (صَاعِقَة)شدا باسمان کرد، (صَاعِقَة) هەم بە هاڕژن و بڵێسەی ئاگر کە لە ئاسمانەو دێ، دەگوترێ، هەم بە ئازارێکی فەوتێنەری خێراش دەگوترێ، واتە: ئازارێك کە بە خێرایی خەڵکێك بفەوتێنێ، وشەی (صَاعِقَة) بە هەردووکیان دەگوترێ، ئنجا ئایا ئەو پێغەمبەرانە کە چوونە لای گەلەکانیان، چییان پێگوتن؟.

٥)- ﴿أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّا ٱللَّهَ﴾، کە جگە لەخوا نەپەرستن، وشەی: (أَلَّا)، (تَفْسِيرٌ لِجُمْلَةِ جَائَتْهُمُ الرُّسُلُ)، (أَلَّا): (أَنْ لا)یە، یانی: پێغەمبەرەکان کە چوون بۆ لایان، بۆ ئەوە چوون کە پێیان ڕابگەیەنن، جگە لە خوا نەپەرستن و، بەندایەتیی بۆ جگە لە خوا ﷻ مەکەن، بە مانای فراوانی بەندایەتیی، نەك تەنیا لە ڕووی ئەنجامدانی دروشمەکانەوە، بەڵکو لە ڕووی وەرگرتنی بەرنامەکانیشەوە، یانی: لە هەردوو بواری سەرەکیی: پێشکەش کردنی دروشمەکان و، وەرگرتنی بەرنامەکان، (تَقْدِيمُ الشَّعائِرِ) و (أَخْذُ الشَّرائِعِ)دا، تەنیا بەندایەتیی بۆ خوا بکەن، چونکە ئەو کەسە بەڕاستیی بەندەی خوایە، کە لە ژیانی تاکیی و، ڕووحیی و، مەعنەویی خۆیدا، تەنیا دروشمەکان پێشکەشی خوا دەکات، پاڕانەوەو، ئەوپەڕی لێ ترسان و، ئەوپەڕی خۆشویستن و، ئەوپەڕی پشت پێ بەستن و، ئەوپەڕی مل بۆ کەچ کردن و، ڕکووع و سەجدەو، قوربانیی بۆ سەربڕین و، هاوار تێبەستن و هتدی تەنیا بۆ خوایە، بەڵام هاو کات لەگەڵ ئەوەش دا، بەرنامەکانی ڕێکخستنی ژیانی تاکیی و، خێزانیی و، کۆمەڵایەتیی و، سیاسییش تەنیا لە خوا وەردەگرێ، لە ڕاستییدا بە هەردووکیان ئەوجار مرۆڤ دەگاتە ئەوەی بەندایەتییەکی ڕاست و ساغ و گشتگیرو ڕاستەقینەی بۆ خوا بکات، بەڵام کەسێك کە دروشمەکانی خوا پەرستیی تەنیا بۆ خوا ئەنجام دەدات، بەڵام لە بواری حەڵاڵ و حەڕام و، چاکەو خراپەو، ڕاست و چەوت و، ژیانی سیاسیی و کۆمەڵایەتیی و ئابووریی دا، لا بە لای شەریعەتدا ناکاتەوە، ئەوە لە حەقیقەتدا بەڵێ خوای پەرستوە، بەڵام بە شێوەیەکی زۆر جوزئیی و بچووك خوای پەرستوەو، ئەگەر لە شتەکانی دیکەدا

نەگەڕێتەوە بۆ شەریعەتی خوا ﷻو، پێی وابێ ئەو بەرنامانەی دیکە لە جێی خۆیانن و، ڕاست و بەجێن، ئەوە هاوبەشی بۆ خوا داناوەو، لە پانتاییەکی کەمی ژیانیدا بەندایەتیی بۆ خوا کردوەو، لە پانتاییە گەورەکەدا بەندەی خوا نەبووە، بەڵکو کۆیلەی ئەم و ئەو بووە، وەك خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ أَمْ لَهُمْ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ ﴾، واتە: ئایا هاوبەشانێکیان هەن، شتێکیان بۆ داناون لە ئایین، کە خوا مۆڵەتی لەسەر نیە، واتە: کەسێك شتێك بۆ خەڵك دابنێ لە بەرنامەی ژیان، کە مۆڵەتی خوای لەسەر نەبێ، مانای وایە خۆی کردوە بە هاوبەشی خوا.

٦)- ﴿ قَالُواْ لَوْ شَآءَ رَبُّنَا لَأَنزَلَ مَلَٰٓئِكَةً ﴾، هەردوو گەلەکان (بە پێغەمبەرەکانی خۆیان گوتیان: ئەگەر پەروەردگارمان ویستبای فریشتەی دادەبەزاندن، واتە: ئەگەر پەروەردگارمان ویستبای پێغەمبەرمان بۆلا بنێرێ، فریشتەی دادەبەزاندن و دەیناردن، وەك پێغەمبەر، کەواتە: کە فریشتەمان بۆ دانەبەزێنراون، ئێوە کە دەڵێن پێغەمبەرین، ڕاست ناکەن.

بۆیە سەرەنجامەکەی دەڵێن:

٧)- ﴿ فَإِنَّا بِمَآ أُرْسِلْتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴾، بۆیە ئێمە بەوەی ئێوەی پێ ڕەوانکراون، بێبڕواین، واتە: بینا لەسەر ئەوە کە ئێوە پێغەمبەری خوا نین، چونکە فریشتە نین، کەواتە: ئێمە بێبڕواین بە خۆتان و بە پەیامەکەتان، بەو پەیامەی کە ئێوە لاف لێدەدەن لەلایەن خواوە هێناوتانە، بەڵام ڕاست ناکەن، ئەگەر خوا ویستبای فریشتەی دەکردە نوێنەرو ڕەوانەکراوی خۆی و، پەیامی پێدا دەنارد، کە ئێوەش فریشتە نین و مرۆڤن، کەواتە: ڕاست ناکەن، حاشا بۆ پێغەمبەران، کە بێگومان پێغەمبەرانی خوا هەرگیز لەگەڵ دروستکراوەکاندا خیلاف و درۆیان نەبووە، ئنجا چۆن بە ناوی خوای بەرزی بێ هاوتاوە، شتی ناڕاستیان گوتوە؟.

## مەسەلەی دووەم:

**باسی گەلی عاد کە پێغەمبەرەکەیان هوود بوو، بە ناهەق خۆیان بەزلگرتبوو لە زەویداو، بە هێزو توانای خۆیانەوە دەنازیی و، نکوولّییان لە نیشانەکانی خوا دەکرد، سەرەنجام خوا بایەکی زۆر ساردو بەهێزی لە ڕۆژانێکی نەگبەت و بێ خێردا ناردە سەریان و، لە بەینی بردن و، سزای ڕیسواکەرتری دوارِۆژیش سەرباره چاوەڕێیانە:**

خوا دەفەرمـوێ: ﴿ فَأَمَّا عَادٌ فَاسْتَكْبَرُوا فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَقَالُوا مَنْ أَشَدُّ مِنَّا قُوَّةً أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّ اللَّهَ الَّذِي خَلَقَهُمْ هُوَ أَشَدُّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يَجْحَدُونَ ﴿١٥﴾ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا صَرْصَرًا فِي أَيَّامٍ نَّحِسَاتٍ لِّنُذِيقَهُمْ عَذَابَ الْخِزْيِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَلَعَذَابُ الْآخِرَةِ أَخْزَىٰ وَهُمْ لَا يُنصَرُونَ ﴿١٦﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە یازدە بڕگەدا:

١)- ﴿ فَأَمَّا عَادٌ فَاسْتَكْبَرُوا فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ ﴾، ئنجا هەرچی گەلی عاد بوو لە زەویدا بە ناهەق خۆیان بەزلگرت، وشەی (فَأَمَّا) (ف)کە بۆ بەدواداهاتن (**تَعْقِيب**)ە، یان بۆ ڕوونکردنەوە (**تَفْصِيل**)ە، یان بۆ لق لێکردنەوە (**تَفْرِيْع**)ە، بەڵام (**أَمَّا: حَرْفُ شَرْطٍ وتَفْصِيلْ**)، پیتێکە هەم مەنای مەرج دەگەیەنێ، هەم مانای ڕوونکردنەوە دەگەیەنێ، کە پێشێ خوا ﷻ فەرمووی: ﴿ فَإِنْ أَعْرَضُوا فَقُلْ أَنذَرْتُكُمْ صَاعِقَةً مِّثْلَ صَاعِقَةِ عَادٍ وَثَمُودَ ﴿١٣﴾ ﴾، ئنجا دوای ئەوەی بە کورتیی باسی (عادو ثمود)ی کرد، ئنجا دێتە سەر درێژەی بەسەرهاتەکەیان، هەڵبەتە درێژە لە قەدەر ئێرە، ئەگەرنا لێرەش هەر کورتە، ﴿ فَأَمَّا عَادٌ فَاسْتَكْبَرُوا فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ ﴾، بەڵام گەلی عاد ئەوەی ڕێی لێگرتن بە دوای ڕێنمایی خوا بکەون، خۆ بەزلگرییان بوو، بە ناهەق، خۆ بەزلگرییەکەشیان، لە بەرانبەر پەیامی خواو، پێغەمبەری خوا (هود)دا بوو، ﴿ الْأَرْضِ ﴾، کە (أل)ی ناساندنی لەسەرە، واتە: سەر زەمینێك کە دیارەو زانراوە، ناساندنەکە بۆ (**عَهْد**)ە، واتە: سەر زەمینەکەی

خۆیان کە ئەوان تێیدا باڵا دەست و حوکمڕان بوون، ئنجا هەموو خۆ بە زلگرتنێك هەر بە ناهەقە، بەڵام لێرەدا ئەو قەیدەی خراوەتە سەر: ﴿بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ﴾، بۆچی؟ (**زِيَادَةُ تَشْنِيعٍ لاسْتِكْبَارِهِمْ، إِذْ لا مُبَرِّرَ لِلْكِبْرِ أَبَدًا**)، ئەمە بۆ زیاتر ناقۆڵاو دزێو خستنە بەرچاوی خۆ بەزلگرتنەکەیانە، ئەگەرنا هیچ کاتێك خۆ بەزلگرتن پاساوی نیەو هەمیشە هەر خراپەو، خۆ بەزلگرتن هەردەم سیفەتێکی خراپە، بە پێچەوانەی خۆ بە کەمگرتن (**تواضع**)ەوە کە سیفەتێکی جوان و باشە، هەمیشە خۆ بەزلگریی و، لە کەوڵی خۆ دەرچوون و، بوغڕا بوون، بەهۆی هەر شتێکەوە بێ، بەهۆی ماڵ و سامانەوە بێ، یان بەهۆی دەسەڵاتەوە بێ، یان بە هۆی زانیارییەوە بێ، یان بە هۆی زیدە عەقڵ و هۆشەوە بێ، یان بە هۆی جەستەی بەهێزەوە بێ، یان بەهۆی قەڵەباڵغی خزمان و شوێنکەوتووانەوە بێ، بە هۆی هەر شتێکەوە بێ، خۆ بەزلگریی هەر خراپە، بەڵام لێرە بۆ زیاتر ناشیرین پێشاندانی خۆ بە زلگرییەکەیانە، ئەم قەیدی ﴿بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ﴾، (بە ناهەق)ی خراوەتە سەری.

ئنجا ئەمە باسی چۆنیەتی خۆ بەزلگریی و بوغڕاییەکەیانە:

٢)- ﴿وَقَالُواْ مَنۡ أَشَدُّ مِنَّا قُوَّةً﴾، گوتیان: کێ لە ئێمە هێزی توندترە؟ لە کتێبە مێژووییەکاندا، دەڵێ: گەلی عاد زۆر بە کەلەش و زل بوون، بۆیە بە هێزی جەستەی خۆیانەوە نازیوە، هەروەها گوتراوە: لە ڕووی عەقڵ و تێگەیشتنیشەوە زۆر بەهێز بوون، ﴿قُوَّةً﴾، لە: ﴿مَنۡ أَشَدُّ مِنَّا قُوَّةً﴾، (**القُوَّةُ: حَالَةٌ فِي الجِسْمِ يَتَأَتَّى بِهَا أَنْ يَعْمَلَ الأَعْمَالَ الشَّاقَّةَ، وتُطْلَقُ عَلَى لازِمِ ذَٰلِكَ مِنَ القُدْرَةِ وَوَسَائِلِ الأعْمالِ**) (**قُوَّة**): حاڵەتێکە بۆ جەستە کە بە هۆیەوە دەتوانێ کارە قورسەکان بکات، بەڵام وێڕای هێزی جەستە، بەکاریشدەهێنرێ بۆ شتێك کە بۆ هێزی جەستە پێویستە، وەك ئامڕازەکان و، ئەو شتانەی کە مرۆڤ بەکاریان دێنێ، ئێستاش شتێکی باوە دەگوترێ: هێزی سیاسیی و، هێزی عەسکەریی و، هێزی ئابووریی و، هێزی ئەمنیی و، موخابەراتیی.

خوای بەرزو باڵادەست لە وەڵامی ئەو قسەیاندا دەفەرموێ:

٣)- ﴿أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِي خَلَقَهُمۡ هُوَ أَشَدُّ مِنۡهُمۡ قُوَّةٗ﴾، ئایا نەیانبینیبوو کە ئەو خوایەی دروستیکردوون لەوان هێزی توندترە؟! واتە: بە چاوی عەقڵ و دڵ نەیاندیوە،

چونکە لێرەدا بینین مەبەست پێی زانینە، (**الرُّؤيَةُ عِلْمِيَّةٌ**)، یانی: (**أَلَم يَعْلَموا**)، ئایا نەیاندەزانی و دەرکیان پێ نەدەکرد، ئەو خوایەی دروستیکردوون، ئەو لە ئەوان بەهێزترە؟ (**أيْ: هُوَ أَوْسَعُ قُدْرَةً مِن قُدْرَتِهِمْ فَإطْلاقُ القُوَّةِ عَلى قُدْرَةِ اللَّهِ تَعالى بِمَعْنى كَمالِ القُدْرَةِ**) لێرەدا خوا ﷻ وشەی (**قُوَّة**)ی بەکارهێناوە بۆ توانای خۆی، (**قُوَّة**) یانی: هێز، (**قُدْرَة**) یانی: توانا، وشەی (**قُوَّة**) کە خوا لە جیاتی توانا بە کاریهێناوە، کە توانایی یەکێکە لە سیفەتەکانی خوا، ئەمە بۆ ئەوەیە کە بزانرێ، توانای خوا ﷻ هەرچی هێزی لە مێشکدا وێنا دەکرێ، لێی وەدی دێ.

وەك گوتمان: لە بارەی هێزو توانای جەستەی گەلی عادەوە، کتێبە مێژووییەکان شتیان زۆر باس کردووەو، شوێنەوارەکانیشیان دیارن، وەك خوا ﷻ لە تەفسیری سوورەتی (**الشُّعَراء**)دا پێشتر باسمان کردوە، بەڵام بالێرەش هەروا بە خێرایی سەرنجێکی ئایەتەکان بدەینەوە: گەلی عاد زۆر بەهێز بوون، بە بەڵگەی ئەوە کە هوود ﷺ پێیان دەفەرموێ: ﴿ أَتَبْنُونَ بِكُلِّ رِيعٍ ءَايَةً تَعْبَثُونَ ﴿١٢٨﴾ وَتَتَّخِذُونَ مَصَانِعَ لَعَلَّكُمْ تَخْلُدُونَ ﴿١٢٩﴾ وَإِذَا بَطَشْتُم بَطَشْتُمْ جَبَّارِينَ ﴿١٣٠﴾ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٣١﴾ وَاتَّقُوا الَّذِي أَمَدَّكُم بِمَا تَعْلَمُونَ ﴿١٣٢﴾ أَمَدَّكُم بِأَنْعَامٍ وَبَنِينَ ﴿١٣٣﴾ وَجَنَّاتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٣٤﴾ إِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٣٥﴾ ﴾، واتە: ئایا لە هەر بەرزاییەك کۆشکێك وەك نیشانە دروست دەکەن بە گاڵتەجاڕ (واتە: بێ ئەوەی پێویستتان پێی هەبێ)، هەروەها مەصنەعان[1] دروست دەکەن، بۆ ئەوەی بمێننەوە، (واتە: ناوو ناوبانگتان بمێنێتەوە) و، ئەگەر پەلاماری خەڵکتاندا زۆر بە تێکشکێنەرانە پەلاماریان دەدەن، پارێز لە خوا بکەن و فەرمانبەریی من بکەن، پارێزیش لەو کەسە بکەن کە هاوکاریی ئێوەی کردوە بەوە کە دەزانن، هاوکاریی کردوون

---

(١) (مَصَانِع) کۆی (مَصْنَع)ە، یان بە بینا دەگوترێ، یاخود بە عەمباری ئاو دەگوترێ، (مَصْنَع) یانی: کارگە، لە زمانی عەرەبییدا بە هەر پرۆژەیەك دەگوترێ، پەیوەندیی بە ئاووەوە هەبێ، یان پەیوەندیی بە تێدا نیشتەجێ بوونەوە هەبێ، یان پەیوەندیی بە هەر بەرژەوەندییەکی دیکەوە هەبێ.

بـە ئـاژەڵ و، بـە کـوڕان و، بـە بـاغ و باغـات و کانیـی و سـەرچاوان، بێگومـان مـن مەترسـیی ئـازاری ڕۆژێـکی مەزنـم لێتـان هەیـە.

کـە ئێمـە کاتـی خـۆی ئـەو ئایەتانەمـان بـە درێژیـی تەفسـیر کـردوون لـە تەفسـیری سـوورەتی (**الشُّعَراء**)دا، هەروەهـا وەك پێشـتریش گوتمـان، لـە تەفسـیری سـوورەتی (هود)یشـدا، بـە درێژیـی باسـی هـوود ﷺو گەلەکـەی (عاد)مـان کـردوە، بـەڵام ئـەوە کـە گەلـی عـاد لـە ڕووی جەسـتەوە بەهێـز بـوون و، خـاوەن هێزێکـی جەسـتەیی یاسـادڕ بـوون، ئەمـە ئـەوە ناگەیەنـێ کـە هەرچـی لـە بارەیانـەوە بگوتـرێ هـەر ڕاسـتە.

بۆیـە ئـەوەی کـە (**القُرطُبـي**) لـە ئیبنـو عەبباسـەوە هێناویەتـی خـوا لـە خـۆی و بابـی ڕازی بـێ، دەڵـێ: (**أَطْوَلُهُـم مِئَـةَ ذِرَاعٍ، وأَقْصَرُهُـم سِـتُّونَ ذِرَاعَـاً**)، ئـەوەی لـە هەمووانیـان کەڵەگەتـر بـوو، سـەد باسـك بـوو، ئەوەشـیان کـە لـە هەمـووان کورتـتر بـوو، شەسـت باسـك بـوو، واتـە: باڵایـان، بـە دڵنیایـی ئـەوە زێدەڕۆییەکـی زۆرە، چونکـە ئەگـەر وابووایـە، دەبـوو لـە پەیکـەرە ئێسـکانەکانیان شـتی وا بەجێمابایـە کـە دەلالـەت لەسـەر ئـەوە بـکات، هەرچەنـدە لـە هەندێـك سـەرچاوان دا بـاس دەکـرێ، کـە گوایـە کەلەشـی هەنـدێ کەسـیان دۆزیوەتـەوە، هـەر کەللـە سـەرەکەی لـە سـێ چـوار نەفـەران گەورەتـرە، بـەڵام ئـەوە پێویسـتیی بـە بەڵگەیەکـی زانسـتیی و، بەڵگەیەکـی مێژوویـی دڵنیاکـەر دەکات، پشتڕاسـتی بکاتـەوەو بیسـەلمێنێ.

بـەڵام گرنـگ ئەوەیـە کـە گەلـی عـاد لـە ڕووی جەسـتەییەوە بەهێـز بـوون و، شوێنەوارەکانیشـیان نیشـانەی ئـەوەن، بـەڵام نـەك بـەو شـێوەیەش لـە هەمـوو سـنوورێك بچێتـە دەرێ و لەگـەڵ بەشـەردا نەگونجـێ.

٤)- ﴿ وَكَانُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا يَجْحَدُونَ ﴾، ئەوان نکووڵییان لە نیشانەکانی ئێمە دەکرد، پێشتریش گوتوومانە: (**الجُحُودُ: إِنْكَارُ مَا هُوَ مَعْلُومٌ**)، (**جُحُود**): بریتیە لە نکووڵییکردن لە شتێك کە زانراوە، واتە: مرۆڤ شتێك بە عەقڵ و دڵ بە ڕاستی دەزانێ، بەڵام بە زمان

دانی پێداناهێنێ و نکووڵیی لێ دەکات، بە بەڵگەی ئەو ئایەتەی سوورەتی (النَّمل) کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَجَحَدُواْ بِهَا وَٱسْتَيْقَنَتْهَآ أَنفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا ﴾، واتە: نکووڵییان کرد لەو نیشانانەی (کە مووسا ﷺ) هێنابوونی، لە دڵیشیاندا لێیان دڵنیابوون، بەڵام بەهۆی خۆ بەزلگریی و ستەمەوە نکووڵییان لێ کردن و، واتە: دانیان پێدا نەهێنان.

٥)- ﴿ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا صَرْصَرًا ﴾، ئێمەش لە سزای ئەوەدا بایەکی زۆر ساردی زۆر بەهێزمان نارده سەریان، لە بارەی (صَرْصَر)ەوە زانایان زۆر قسەیان کردوە، بەڵام رەنگە راسترینیان ئەوە بێ کە دەڵێ: (**الصَّرْصَرُ: الرِّيحُ الشَّدِيدَةُ الهُبُوبِ شَدِيدَةُ البَرْد، مِنَ الصَّرَّة أَوِ الصُّرَّة أو الصَّرِيرِ، وَتَضْعِيفُ عَيْنِهَا لِلمُبَالَغَة مِثْلُ كَبْكَبَ لِمُبَالَغَة كَبَّ**)، واتە: (صَرْصَر) بایەکی زۆر توند هەڵکردووی زۆر سارد، کە لە (صَرَّة)ەوە هاتوە، {وەك خوا ﷻ لە بارەی خێزانی ئیبراهیمەوە ﷺ دەفەرموێ: ﴿ فَأَقْبَلَتِ ٱمْرَأَتُهُۥ فِى صَرَّةٍ ﴾، (**أَي: فِي صَيْحَةٍ**) کەواتە: (صَرَّة)، یانی: دەنگی بەرز، هاوار کردن}، یاخود لە (**صُرَّة**) ئەو پریسکەیەی شتی تێ دەکرێ و دوایی توند دەپێچرێ، (**أَوِ الصَّرِيرِ**)، دەنگی دەرگا، جیرەی دەرگا (**صَرْصَر**) لە یەکێك لەوانەوە هاتوە، ئنجا کە (**عَيْنُ الفِعل**)ەکەی دووبارە بۆتەوە (**صَرْصَر**)، ئەمە بۆ زێدەرۆییە، وەك (**كَبْكَبَ**) بۆ زێدەرۆییە لە (**كَبَّ**)، (**كَبَّ**)، واتە: لە پەورو کەوت، وەك لە سوورەتی (**الشُّعَراء**)دا دەفەرموێ: ﴿ فَكُبْكِبُواْ فِيهَا هُمْ وَٱلْغَاوُۥنَ ﴿٩٤﴾ ﴾، واتە: خۆیان و بێمرادەکان لە پەورووی کەوتنە نێو ئاگری دۆزەخەوە.

٦)- ﴿ فِىٓ أَيَّامٍ نَّحِسَاتٍ ﴾، لە رۆژانێکی نەگبەتدا، (**نَحِسَات**) خوێنراویشەتەوە: (**نَحْسَات**)، کە (**نَحِسَات**) کۆی (**نَحِس**)ە، (**نَحْسَات**)یش کۆی (**نَحْس**)ە، دەگوترێ: (**نَحِسَ إِذَا أَصَابَهُ النَّحْسُ**)، هەر کات نەگبەتیی و بێ خێریی تووشی کەسێك بوو، دەگوترێ: (**نَحِسَ**)، (**نَحِسَات**)یش، واتە: بێ خێرو بێ پێزو نەگبەت.

ئایا بۆچی خوا ئەو بایەی بۆ ناردن بەو شێوەیە؟.

٧)- ﴿ لِّنُذِيقَهُمْ عَذَابَ ٱلْخِزْىِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ﴾، تاکو ئازاری ریسواکەریان لە ژیانی دنیادا پێ بچێژین، (ل)ی ﴿ لِّنُذِيقَهُمْ ﴾، (**لامُ التَّعليلِ**)ە، لامی هۆکار دۆزییە، واتە: بۆیە وامانکرد تاکو سزای ریسواکەریان پێ بچێژین، لە ژیانی دنیادا.

لێرەدا سزایەکە شوبهێنراوە بە خواردنێکەوە کە بۆ ئەو کەسە ئامادە کراوە، کە دەفەرموێ: ﴿لِّنُذِيقَهُمْ﴾، ئەمە جۆرێکە لە توانج و گاڵتەپێکردن، ئەگەرنا سزا ناچێژرێ وەك خواردن، بەڵام وەك چۆن خواردنێك بۆ کەسێك ساز دەکرێ و، لێی تام دەکات و لێی دەچێژێ، ئەو سزایەش ئاوا بۆ ئەوان ئامادەکراوە.

٨)- ﴿وَلَعَذَابُ ٱلْآخِرَةِ أَخْزَىٰ وَهُمْ لَا يُنصَرُونَ﴾، بە دڵنیایی سزاو ئازاری ژیانی کۆتایی، یاخود مەنزڵگای کۆتایی، ڕیسواکەرتریشە و یارمەتییش نادرێن. ﴿ٱلْآخِرَةِ﴾، وەك زۆرجار گوتوومانە: (صِفَةٌ لِمَوصوفٍ مَحْذوفٍ)، واتە: ئاوەڵناوی وەسفکراوێکی قرتێنراوە، وەك: (وَلَعَذابِ الحَيَاةِ الأخِرَةِ)، واتە: سزای ژیانی دوارۆژ، یاخود: (وَلَعَذَابُ الدَّارِ الأَخِرَةِ)، واتە: سزاو ئازاری مەنزڵگای کۆتایی، کە دوایی دێ، (أَخْزى) ڕیسواکەرترە، ﴿وَهُمْ لَا يُنصَرُونَ﴾، ئەوان یارمەتییش نادرێن و سەریش ناخرێن و، هیچ کەسێکیش نیە دەربازیان بکات.

ئەمەش بۆ خۆپاراستنە لەوە کە بیسەران وا نەزانن: پشك و بەشی ئەوانە لە سزادان، تەنیا سزای فەوتاندیان بووە، بە بایەکی بەهێزو سارد، بۆیە هەواڵی ئەوە کە سزاو ئازاری ڕۆژی دوایی سەختتریشە، یان زیاتر مایەی ڕیسواکردن و شەرمەزارکردنیانە، ئەوەشی بادراوەتەوە سەرێ.

وشەی: (أَخْـزَى)، (إِسمُ تَفْضِيلِ على غَيرِ قِيَاسٍ) ئەصڵی خۆی (أَشَدُّ إِخْزَاءً)، واتە: زیاتر مایەی سەرشۆڕییە، بەڵام لێرەدا بەبێ قیاس وەك حاڵەتێکی هەڵاواردن هاتوە، وشەی: (أَخْزَى)، لە (خَزِيَ)ەوە کراوە، بە ناوی هەڵبژاردن (إِسم تَفْضِيل).

لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە، فەرموویەتی: {نُصِرْتُ بِالصَّبَا، وَأُهْلِكَتْ عَادٌ بِالدَّبُورِ} (أخرجه أحمد: ٢٠١٣، والبخاري: ٩٨٨، ومسلم: ٩٠٠)، واتە: من بە بای صەبا سەرخراوم و، گەلی عادیش بەبای دەبوور فەوتێنراون.

(الدَّبُور: الرِّيْحُ الَّتِي مِنْ جِهَةِ دُبُرِ الكَعْبَةِ، أي: غَرْبَ الشَّمْس)، واتە: ئەو بایەیە کە لەلای پشتی کەعبەوە هەڵدەکات، واتە: لە ڕۆژئاواوە، بە نسبەت خەڵکێك کە لە دەوری کەعبەن، ئەو بایەی لە ڕۆژئاواوە هەڵدەکات، پێی دەگوترێ دەبوور،

ئنجا گەلی عاد بەو بایە فەوتێنراون، پێچەوانەکەی ئەو بایەش لە ڕۆژهەڵاتەوە دێ، پێی دەگوترێ: صەبا، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: من بەوە سەرخراوم، واتە: ئەو بایە هۆکارێك بووە کە پێغەمبەر ﷺ لە جەنگەکاندا سەربکەوێ، کە دەفەرموێ: ﴿ عَذَابَ ٱلْخِزْيِ ﴾، ئەمە پاڵدرانی وەسفکراوە بۆ لای ئاوەڵناو، چونکە دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَلَعَذَابُ ٱلْآخِرَةِ أَخْزَىٰ ﴾، سزاو ئازاری مەنزڵگای کۆتایی، یاخود ژیانی کۆتایی، زیاتر مایەی ڕیسوابوون و شەرمەزاربوونیانە.

زانایان زۆر قسەیان کردوە لەوبارەوە کە خوا دەفەرموێ: ﴿ فِيٓ أَيَّامٍ نَّحِسَاتٍ ﴾، لە ڕۆژانێکی نەگبەت دا، کە خوای پەروەردگار لە سوورەتی (**الحَاقَّة**) دا دەفەرموێ: ﴿ وَأَمَّا عَادٌ فَأُهْلِكُوا۟ بِرِيحٍ صَرْصَرٍ عَاتِيَةٍ ﴿٦﴾ سَخَّرَهَا عَلَيْهِمْ سَبْعَ لَيَالٍ وَثَمَـٰنِيَةَ أَيَّامٍ حُسُومًا فَتَرَى ٱلْقَوْمَ فِيهَا صَرْعَىٰ كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ نَخْلٍ خَاوِيَةٍ ﴿٧﴾ ﴾، واتە: هەرچی گەلی عاد بوو فەوتێنران بە بایەکی زۆر توندی زۆر ساردی لە سنوور دەرچوو، خوا ئەو بایەی بەسەردا دەستەمۆ کردن، (واتە: وایکرد، وەك سەربازێکی خوای پەروەردگار تێیان بەر بێ)، حەوت شەوو هەشت ڕۆژان بەردەوام بوو بێبڕانەوە، دوایی خەڵکەکەت لەوێدا دەبینی کەوتبوون، وەك بنکە دار خورمای کەوتوو، وەك چۆن دارخورما کە قەدەکەی دەشکێ و بنکەکەی دەمێنێتەوە، ئەوانیش بەو شێوەیان لێهاتبوو.

ئنجا زانایان لەو بارەوە زۆر قسەیان کردوە، کە ئایا ڕۆژەکان نەگبەت بوون؟ چونکە ﴿ أَيَّامٍ نَّحِسَاتٍ ﴾، یانی: (**مَشْئومات**)، ڕۆژانێکی بێ خێرو نەگبەت، ئایا بەختەوەریی، کە ئەوە یە ئینسان شتەکەی باش بۆ بێ، یان نەگبەتیی کە ئەوەیە ئینسان شتەکەی باش بۆ نەیەت، ئایا پەیوەندییان بە ڕۆژگارەوە هەیە؟ ئایا کاتێك هەیە بێ خێربێ بۆ مرۆڤ و، کاتێکیش کە خێرداربێ بۆی؟

دەڵێین: نەخێر، کاتەکان هەموویان بۆ مرۆڤەکان وەك یەکن، بەڵام بەهۆی کردەوەی خۆیانەوەیە، کە ئەو کاتە بۆ یەکێکیان بەرەکەتدار دەبێ و، بۆ

یەکێکیان بێ خێرو نەگبەت دەبێ، ئێستا هەر گەلی عاد، ئەو حەوت شەو و هەشت ڕۆژەی خوا ﷻ لە سوورەتی (الحَاقَّـة)دا دەفەرموێ: بەردەوام ئەو بایە لە دژیان هەڵیکرد، ئەو حەوت شەوو هەشت ڕۆژە، بۆ ئەوان زۆر بێ خێرو نەگبەت بوون، لەبەر کردەوەو هەڵوێستەکەی خۆیان، بەڵام هەر ئەو حەوت شەوو هەشت ڕۆژە، بۆ هوود ﷺو، ئەوانەی بڕوایان لەگەڵ هێنابوو، زۆر خێردار بوون، چونکە لەو خەڵکە خراپە ڕزگاریان بووەو، خوا سەلامەتی کردوون و پارێزراو بوون، هەروەها بۆ خەڵکی دیکە هەر ئەو حەوت شەوو هەشت ڕۆژەی، لەو کاتەدا گەلی عادی پێ فەوتاوە، لەبەر سەرکەشیی و یاخیی بوونیان، بۆ شوێنەکانی دیکەی دنیا کە خەڵکەکە هەڵوێستی خراپ نەبووبێ، ڕۆژان و شەوانی خێردار بوون.

کەواتە: ئەوە مرۆڤ و کردەوەکەیەتی کە کاریگەریی دەبێ لەسەر تەمەنەکەی و، کاتەکانی کە بەسەریدا دەڕۆن، ئەگەرنا کاتەکان وەك توورەکەیەك وان، چییان تێ بکەی بەو شێوەیەن، هەر ئەو ڕۆژان و شەوان و ئەو ساڵانەی کە بۆ وێنە ئەبوو حامیدی غەززالییان تێدا ژیاوە، ئەو پەنجاو پێنج ساڵە، خەڵکی دیکەشیان تێدا ژیاوە، کە مولحید بووە، یان خراپەکار بووە، یان بێ دین بووە، یان ڕێگر بووە، ئەبوو حامیدی غەززالیش لەو ساڵانەدا ژیاوە، کە خەریکی تاعەت و چاکە بووە، دوایی شوێنەواری باشی لە دوای خۆی بەجێهێشتوە، ئەویش و پێشەوایان و زانایانی دیکەش ڕەزاو ڕەحمەتی خوا لە هەموویان بێ.

کەواتە: لە ڕاستییدا ئەوە مرۆڤ خۆیەتی و، کردەوەکەیەتی وادەکات کە تەمەنەکەی و، شەو و ڕۆژەکانی و، هەفتەو ساڵەکانی، بەرەکەتداربن، یاخود بێ بەرەکەت و بێ خێرو نەگبەت بن.

**مەسەلەی سێیەم:**

**ئنجا خوا ﷻ باسی گەلی ثەموود دەكات كە چییان كردو، چۆن فەوتاندنی، كە كوێرییان بەسەر ڕێنمایی دا هەڵبژاردووەو، سەرەنجام هاڕژنی ئازاری زەبوونكەر گرتوونی و، خوای میهرەبان بڕوادارانی پارێزكاری دەرباز كردوون:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيْنَاهُمْ فَاسْتَحَبُّوا الْعَمَى عَلَى الْهُدَى فَأَخَذَتْهُمْ صَاعِقَةُ الْعَذَابِ الْهُونِ بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿١٧﴾ وَنَجَّيْنَا الَّذِينَ آمَنُوا وَكَانُوا يَتَّقُونَ ﴿١٨﴾ ﴾.

## شیكردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيْنَاهُمْ ﴾، بەڵام هەرچی گەلی ثەموود بوو، ئێمە ڕێنماییمان كردن، (**أَمَّا: حَرْفُ شَرْطٍ و تَفْصِيلٍ**)، (**أمّا**) پیتێكە هەم مانای مەرج دەگەیەنێ، هەم مانای ڕوونكردنەوە دەگەیەنێ، (**هَدَيْنَاهُم أَي: أَرَيْنَاهُمُ الطَّرِيقَ**)، واتە: ڕێمان پێشاندان، (**هَدَيْنَاهُم هِدايَةَ دِلالَةٍ وإِرْشَاد**)، واتە: هیدایەتماندان بە هیدایەتی ڕێ پێشاندان و ڕێنمایی كردن، وەك خوا ﷻ لە سوورەتی (**الزُّمَر**)دا دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يَهْدِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِن مُّضِلٍّ ﴾، واتە: هەر كەسێك خوا ڕێنمایی بكات و بیخاتە سەر ڕاستە ڕێ، هیچ گومڕاكەرێكی نابێ، ﴿ وَمَن يُضْلِلِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ هَادٍ ﴿٢٣﴾ ﴾، واتە: كەسێكیش كە خوا گومڕای بكات، هیچ ڕێنماییكارێكی نابێ، كەواتە: لێرەدا ﴿ وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيْنَاهُمْ ﴾، واتە: بەڵام ثەموود ڕێمان پێشاندان، بەو واتایە ڕێنماییمان كردن و گوتمان ئەوە ڕێی ڕاستە.

٢)- ﴿ فَاسْتَحَبُّوا الْعَمَى عَلَى الْهُدَى ﴾، بەڵام ئەوان كوێرییان بەسەر ڕێنماییدا هەڵبژارد، وشەی: ﴿ الْعَمَى ﴾، خوازراوەتەوە بۆ گومڕایی، واتە: گومڕاییان بەسەر ڕێنماییدا هەڵبژارد، وشەی: (**واسْتَحَبُّوا العَمى مَعْناها: أَحَبُّوا، وضُمِّنَ اسْتَحَبُّوا مَعْنى: فَضَّلُوا، وهَيَّأَ لِهَذا التَّضْمِينِ اقْتِرانُهُ بِالسِّينِ والتّاءِ لِلْمُبالَغَةِ لِأَنَّ المُبالَغَةَ فِي المَحَبَّةِ تَسْتَلْزِمُ التَّفْضِيلَ عَلى بَقِيَّةِ المَحْبُوباتِ، فَلِذَلِكَ عُدِّيَ اسْتَحَبُّوا بِحَرْفِ عَلى، أَيْ رَجَّحُوا بِاخْتِيارِهِمْ الضَّلَالَةَ عَلَى الهِدَايَةِ**) وشەی (**إِسْتَحَبُّوا**) واتە:

خۆشیانویست، بەڵام لێرەدا (**إِسْتَحَبُّوا**) مانای هەڵبژاردنی خراوەتە نێو، بەوەش ڕێ خۆشکراوە بۆ ئەو خستنە نێوە کە (**أَحَبُّوا**): (سین) و (تاء)ی بۆ زیادکراون، کراوە بە (**إِسْتَحَبُّوا**)، ئەویش بۆ زێدەڕۆییکردن لە زۆر خۆشویستن دا، چونکە زێدەڕۆییکردن خوازیاری هەڵبژاردنی ئەو شتەیە کە زیاترت خۆشدەوێ بەسەر خۆشویستراوەکانی دیکەدا، هەر بۆیە بە پیتی (**عَلَى**) بەرکاری خواستوە، کەواتە: (**إِسْتَحَبُّوا**)، یانی: (**آثَروا**)، یان (**اخْتَاروا**)، واتە: هەڵیانبژارد، پێیان چاکتر بوو، چی؟ کوێریی بەسەر ڕێنماییدا.

وەك جاری دیکەش باسمانکردوە، نابێ لێمان تێکبچێ کە وشەی (**هُدى**) لە قورئاندا جاری وایە بە مانا گشتییەکەی بەکاردەهێنرێ، کە بە مانای ڕێنمایی و ڕێ پێشاندانە، جاری وایە بە مانا تایبەتییەکەی کە بریتیە لە خستنە سەر ڕاستە ڕێ، یان ڕاستە ڕێکردن، من ئەو تەعبیرە بەکاردێنم (ڕاستە ڕێکردن)، بۆ ڕوونکردنەوە دەڵێین: کەسێك لە تۆ دەپرسێ: ئەرێ فڵان شارە یان فڵان دێیە لە کوێیە؟ یان فڵان گەڕەکە لە کوێیە؟ تۆ دوو حاڵەتت لە پێشن:

یەکەمیان: بە شێوەیەکی گشتیی دەڵێی: دەچی بۆ فڵان شوێن، دوایی دەچی بۆ فڵان شوێن، دوایی ئاوا دەڕۆی و، ئاوا دەڕۆی و دەچی بۆ جێی مەبەست، ئەوە پێی دەگوترێ: ڕێنمایی، ئەوە هیدایەتە بە مانا گشتییەکەی، واتە: ڕێنمایی کردن و ڕێپێشاندان.

دووەمیان: کە مانای هیدایەتی تایبەتە، ئەوەیە دەستی بگری و لەگەڵ خۆتی ببەی بۆ ئەو شوێنەی کە مەبەستیەتی، ئەوە (ڕاستە ڕێکردن)، یان (خستنەسەر ڕاستە ڕێ)ی پێ دەڵێن.

خواش ﷻ هەم پێغەمبەرانی ناردوون و، هەم کتێبەکانی دابەزاندوون بۆ ڕێنمایی خەڵك، کەواتە: پێغەمبەران ڕێنماییکار بوون، کتێبەکانی خوا ڕێ پێشاندەر بوون، بەڵام ئەو هیدایەتەی مرۆڤ ڕاستە ڕێ بکات، ئەوە تەنیا بەدەست خوای کاربەجێیە، بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهْدِي

مَن يَشَآءُ ﴾، واتـە: تـۆ هـەر کەسێکت خـۆش بـوێ ناتوانـی ڕاسـتە ڕێـی بکـەی، بـەڵام خـوا هـەر کەسێکی بـوێ ڕاسـتە ڕێـی دەکات، پێغەمبـەر ﷺ ڕێنمایـی دەکات، بـەڵام خـوا ڕاسـتە ڕێ دەکات.

خـوا ﷻ لـە سـوورەتی (محمـد)دا وشـەی هیدایەتـی بـە هـەردوو واتایەکـەی بەکارهێنـاوە، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَالَّذِينَ اهْتَدَوْا زَادَهُمْ هُدًى وَآتَاهُمْ تَقْوَاهُمْ ﴿١٧﴾ ﴾، واتـە: ئەوانـەی ڕێنمایـی خوایـان وەرگرتـوە، خـوا هیدایەتیـان بـۆ زیـاد دەکات، واتـە: زیاتـر پێیـان دەچەسـپێنێ و، ڕاسـتە ڕێیـان دەکات، پێشـێ خـوای پـەروەردگار ڕێنمایـی خـۆی نـاردوە، دەبـێ ڕێنمایـی خـوا وەربگـری، ئنجـا خـوا ﷻ لـە بەرانبـەر ئـەوەدا کـە هیدایەتەکەیـت وەرگرتـوەو قبووڵکـردوە، ڕاسـتە ڕێـت دەکات، بـەڵام لێـرەدا گەلـی ثەمـوود ڕێنماییەکـەی خوایـان هـەر وەرنەگرتـوەو قبووڵیـان نەکـردوە، بەڵکـو کوێرییـان بەسـەر ڕێنماییـدا هەڵبـژاردوە، بۆیـە شایسـتەی سـزادران بـوون، وەك چـۆن کەسـێك ڕێنمایـی خـوا وەربگـرێ، شایسـتەی ئەوەیـە هیدایەتـی تایبەتیـی بـدرێ، لەبـەر ئـەوەی هیدایەتـی گشـتیی خـوای وەرگرتـوە، خـوا هیدایەتـی تایبەتییشـی پـێ دەدات، بـە هەمـان شـێوەش کەسـێك هیدایـەت و ڕێنمایـی گشـتیی خـوا ڕەت بکاتـەوە، شایسـتەی ئـەوە دەبـێ خـوا سـزای بـدات.

٣)- ﴿ فَأَخَذَتْهُمْ صَاعِقَةُ الْعَذَابِ الْهُونِ ﴾، سەرەنجام (صَاعقَة)ی ئازارێکی ڕیسواکەر گرتنی، (صَاعِقَة) پێشتریش گوتمان: ئاگرێکەو بڵێسەیەکە، ئەصڵە مانایەکەی ئەوەیە کە لە جەودا دێ، خوا ﷻ لە سووڕەتی (الرَّعْد) ئایەتی ژمارە (١٣)دا دەفەرموێ: ﴿ وَيُرْسِلُ الصَّوَاعِقَ فَيُصِيبُ بِهَا مَن يَشَآءُ ﴾، واتە: خوا برووسکەکان دەنێرێ، ئنجا هەر کەسێك بیەوێ، لێیان دەدا بەو برووسکەیە، بەڵام دوایی وشەی (صَاعقَة) خوازراوەتەوە بۆ هاڕژنێکی گەورە، چریکەو دەنگێکی بێڕەزا، هەروەها بەکاریش هێنراوە بۆ سزاو ئازارێك کت و پڕ بێ و، بە خێرایی ئەو کەسە، یان ئەو کۆمەڵە، کە تووشیان دەبێ لە بەینیان بەرێ.

(الهَونُ: الهَوَانُ وهُوَ الذُّلُّ)، (هون) زەبوونیی و ملکەچییە، ئنجا ملکەچیی ئەگەر مرۆڤ لە زاتی خۆیدا ملکەچ و نەرم و نیان بێ، ئەوە لەسەری سوپاس و ستایش دەکرێ، بەڵام ئەگەر بەهۆی هێزێکی دەرەکییەوە بێ، بەبێ ویستی خۆی، لەو حاڵەتەدا شتێکی خراپەو سەرزەنشتکراوە.

خوا ﷻ ڕوونی دەکاتەوە دەفەرموێ:

٤)- ﴿ بِمَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ ﴾، {بۆیە (صَاعِقَة)ی سزاو ئازاری ڕیسواکەر گرتنی}، بە هۆی ئەوەوە کە دەیانکرد.

٥)- ﴿ وَنَجَّيْنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ ﴾، ئەوانەی بڕوایان هێنابوو، پارێزیشیان دەکرد، ئەوانەمان دەرباز کرد، ﴿ ءَامَنُواْ ﴾ی بە کرداریی ڕابردوو هێناوە، چونکە ئیمانەکە پێشێ هێنراوە، بەڵام (تَقْوى)ی بە کرداری ڕانەبردوو (فعل المضارع) هێناوە.

﴿ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ ﴾، چونکـە تەقـوا بـەردەوام لـە ئیمانـەوە پەیـدا دەبـێ و، لـە هەمـوو حاڵەتەکانـی مرۆڤـدا پارێزکاریـی (تَقْـوى) تـازە دەبێتـەوەو دێتـەوە پێـش، ئینسـان لـە هەمـوو هەنگاوێکیـدا پێویسـتی بـە پارێزکاریـی هەیـە، دوای ئـەوەی کـە ئیمانـی هێنـاوەو، ئیـمان چەسـپاوە، هەڵبەتـە ئیمانیـش کـەم و زیـاد دەکات بـەڵام ئیمانەکـە هێـنراوە لـە ڕابـردوودا، بـەڵام ئێسـتاو، بـۆ لـە مـەودوا، تەقـوا تـازە دەبێتەوە.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ فَأَخَذَتۡهُمۡ صَٰعِقَةُ ٱلۡعَذَابِ ٱلۡهُونِ ﴾، (العَـذَابُ: الَّـذِي هُـوَ سَـبَبُ الهَـوَانِ، إضافَـةُ الصِّفَـةِ لِلمَوصُـوف)، واتـە: ئـەو ئـازارەی کـە هـۆکاری ڕیسـواییە.

ئەمـە پاڵدانـی سـیفەتە بـۆ لای وەسـفکراو، ئـەوەی پێشـێ پاڵدرانـی وەسـفکراو بـوو بـۆ لای ئاوەڵنـاو، بـەڵام ئەوەیـان پاڵدانـی ئاوەڵنـاوە بـۆ لای وەسـفکراو، واتـە: حاڵەتـی ئاسـایی خۆیەتـی.

هەندێـك لـە تەفسـیرە هاوچەرخـەکان وشـەی: (صَاعِقَة)ەیـان ئـاوا پێناسـە کـردوە: (الصَّاعِقَـةُ: الصَّيْحَـةُ الَّتِـي تَنْشَـأُ فِي كَهْرَبائِيَّـةِ السَّـحَابِ الحَامِـلِ لِلْـماءِ، فَتَنْقَـدِحُ مِنهَا نـارٌ تُهْلِكُ

**ما تُصِيبُهُ**)، واتـە: ئـەو دەنـگ و هاژنەیە لـە هەورێکی بارگاویـی، کارەبـادار پەیدادەبێ کـە ئـاوی هەڵگرتـوە، ئاگرێـکی لـێ دادەگیرسـێ هەرچـی تـووشی بـێ دەیفەوتێنـێ.

هەورەکـە بارگـەی ساردی هەیـەو زەویـش بارگەکـەی گەرمە، لـە ئەنجامـی ئەوەدا بڵێسـەیەکی لـێ پەیدادەبـێ، کـە پێـی دەگوتـرێ: برووسـکە (**بـرق**)، دەنگەکەشـی پێـی دەگوتـرێ: هـەورە تریشـقە (**رَعْـد**).

لێرەدا لـە کۆتایـی باسـی گەلـی عـادو **ثەمـوود**دا - کـە پێشـتر گوتمـان لە سـوورەتی (هـود)دا بـە درێژیـی باسـی بەسـەرهاتی گەلـی عادمـان کـردوەو، لـە سـوورەتی (**الحِجْر**)یشـدا، بـە درێژیـی باسـی بەسـەرهاتی گەلـی ثەموودمـان کـردوە - ئـەم سـێ سـەرنجە دەخەینـە ڕوو:

**١-** خوا ﷻ سەرەتا باسی گەلی عادو **ثەموود**و، خاڵی هاوبەشیانی کردوە، کە دەفەرموێ: ﴿ فَإِنْ أَعْرَضُوا فَقُلْ أَنذَرْتُكُمْ صَاعِقَةً مِّثْلَ صَاعِقَةِ عَادٍ وَثَمُودَ ﴾، باسی خاڵی هاوبەشیان دەکات، هەروەها باسی سزای هاوبەشیشیان دەکات، کە هەردووکیان سزایەکانی ناو ناون: (**صَاعِقَة**)، ئنجا بە نسبەت گەلی **ثەموود**ەوە، دیارە (**صَاعِقَة**) بووە، بەڵام بە نسبەت گەلی عادەوە بایەکی توندو بەهێزو زۆر سارد بووە، بەڵام خاڵی هاوبەشیان ئەوەیە کە سزایەکی کتوپڕو زۆر بەهێزو فەوتێنەر بووە.

**٢-** دوایی خوا ﷻ باسی تایبەتمەندیی هەر کامێکیانی کردوە:

أ- بە نسبەت گەلی عادەوە دەفەرموێ: ﴿ فَاسْتَكْبَرُوا فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ ﴾، بە ناهەق لە زەویدا خۆیان بە زلگرت، هەروەها گوتوویانە: ﴿ مَنْ أَشَدُّ مِنَّا قُوَّةً ﴾، کێ لە ئێمە بەهێزترە، هەروەها سیفەتێکی دیکەیان: ﴿ وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يَجْحَدُونَ ﴾، واتە: نکووڵییان لە ئایەتەکانی ئێمە دەکرد، ئەم سێ سیفەتەی خوای موتەعال لێی گێڕاونەوە لە گەلی عاد.

بـە نسـبەت سزایەکەشـیانەوە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا صَرْصَرًا فِي أَيَّامٍ نَّحِسَاتٍ لِّنُذِيقَهُمْ عَذَابَ الْخِزْيِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَلَعَذَابُ الْآخِرَةِ أَخْزَىٰ وَهُمْ

﴿ لَا يُنصَرُونَ ﴾، بایەكی زۆر بە هێزی زۆر ساردمان لە ڕۆژانێكی نەگبەتدا ناردە سەریان، تاكو سزای ڕیسواكەریان لە ژیانی دنیا پێ بچێژین و، سزای ڕۆژی دواییش ڕیسواكەرتریشەو، كەسیش نابێ پشتیوانیان بكات و، سەریش ناخرێن.

ب- بە نسبەت گەلی ثەموودەوەش، خوا ﷻ ئەوەی باسكردوە: ﴿ وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيْنَٰهُمْ ﴾، ڕێنماییمان كردن، بەڵام ئەوان چییان كرد؟ ﴿ فَٱسْتَحَبُّوا۟ ٱلْعَمَىٰ عَلَى ٱلْهُدَىٰ ﴾، كوێرییان بەسەر ڕێنماییدا هەڵبژارد، بۆ سزایەكەشیان: ﴿ فَأَخَذَتْهُمْ صَٰعِقَةُ ٱلْعَذَابِ ٱلْهُونِ بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴾، (صَاعِقَة)یەك و، بڵێسەیەك، هاڕژنێكی ئازاری ڕیسواكەر گرتنی، بە هۆی ئەوەوە كە دەیانكرد.

٣- ئەوەی كە لە بەسەرهاتی عاددا باسكراوە، لە هی ثەمووددا دووبارە نەكراوەتەوەو، ئەوەی كە لە هی ثەمووددا باسكراوە، لە هی عاددا باس نەكراوە، بۆ وێنە:

أ- لە هی گەلی عاددا: ﴿ أَيَّامٍ نَّحِسَاتٍ ﴾، ڕۆژانێكی نەگبەت و بێ خێر، ئنجا وەك چۆن ئەو ڕۆژانەی كە گەلی عادیان تێدا فەوتاوە، نەگبەت و بێ خێر بوون بۆ ئەوان، ئەو ڕۆژانەی كە گەلی ثەموودیشیان تێدا فەوتاوە، هەر وابوون، بەڵام چونكە لە هی گەلی عاددا باسی كردوەو، بە پێویست نەزانراوە لە هی گەلی ثەمووددا باس بكرێ، لەبەر ئەوەش كە گەلی عاد دیارە حەوت شەو و هەشت ڕۆژ بایەكە لێی داون، بەڵام هی گەلی ثەموود بڵێسەیەك بووەو، هاڕژنێكی گەورە بووە، هێندەی پێ نەچووە فەوتاون.

ب- هەروەها بە نسبەت گەلی عادەوە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَعَذَابُ ٱلْءَاخِرَةِ أَخْزَىٰ ﴾، ئازاری مەنزڵگای كۆتایی ڕیسواكەرتریشە، بەڵام بۆ گەلی ثەموود ئەوەی بەكارنەهێناوە، چونكە كە لەوێ بەكارهاتوە، هی گەلی ثەموودیش هەر وابووە، وەك چۆن لە دنیادا خوا سزای داون، لە دواڕۆژییشدا سزایان دەدا.

ج- هەروەها بۆ گەلی عاد فەرموویەتی: ﴿ وَهُمْ لَا يُنصَرُونَ ﴾، ئەوان سەرناخرێن، پشتیوانیی ناكرێن، بۆ گەلی ثەموودیش بەهەمان شێوە، بەڵام كە لەوێ باسی كردوە، لەوێ دووبارەی نەكردۆتەوە، واتە: بە نسبەت گەلی عادەوە خوای پەروەردگار سێ شتی

باسکردوون، کە دوایی بۆ گەلی ثەموود دووبارەی نەکردوونەوە، بۆ گەلی ثەموودیش بە هەمان شێوە:

أ- ﴿ وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيْنَاهُمْ ﴾، بەڵام ثەموود ڕێمان پێشاندان، وەك چۆن خوا ڕێی پێشانی گەلی ثەموود داوە، ڕێی پێشانی گەلی عادیش داوە، بەڵام کە لەوێ باسی کردوە، لەوێ بە پێویست نەزانراوە، باس بکرێ.

ب- بۆ گەلی ثەموود دەفەرموێ: ﴿ فَاسْتَحَبُّوا الْعَمَى عَلَى الْهُدَى ﴾، کوێرییان بەسەر ڕێنماییدا هەڵبژارد، کە لێرەدا ئەوەی بۆ گەلی ثەموود باسکردوە، بۆ گەلی عاد بە پێویست نەزانراوە، باس بکرێ.

ج- بۆ گەلی ثەموود دەفەرموێ: ﴿ بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴾، بە هۆی ئەوەوە کە وەدەستیان دەهێناو دەیانکرد، دیارە بۆ گەلی عادیش بە هەمان شێوە، بەڵام کە بۆ گەلی ثەموود باسی کردوە، بۆ گەلی عاد باسی نەکردوە.

کەواتــە: ســێ شــت بــۆ گەلــی عــاد باسـکراون، ســێ شــتیش بــۆ گەلــی ثەمــوود، کــە لــە ڕاسـتییدا هــەردوو گەلەکــە، لــەو شــەش خاڵــەدا هاوبەشــن، خــوا ﷻ بــۆ هــەر کامێکیــان ســێ شــتی باسـکردوون، کــە بــۆ ئــەوی دیکــە ســێ شــتی دیکــەی جیــاوازی باســکردوون، تاکــو بزانــرێ، کــە ســەرجەم هــەردوو گەلەکــە لــەو شــەش خاڵــەدا هاوبــەش بــوون.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە (١١) یـازدە ئایـەت پێـك دێ، ئایەتـەكانی: (١٩ - ٢٩)، كـە باسـی سـەرەنجامی شـووم و بـەدی بێبڕوایانـی كـردوە لـە ڕۆژی دواییـدا، كـە بیسـتن و دیـتن و پێسـتیان لەسـەریان دەبنـە شـایەد، پاشـان باسـی چەنـد حاڵـەت و هەڵوێسـتێكی بێبڕوایـان كـراوە وەك:

١- گومانیان بەرانبەر بە خوا، كە زۆرێك لە كردەوەكانیان نازانێ.

٢- ڕێ پێ نەدرانیان كە بە هۆی داوای لێبوردن كردنەوە، گلەیی خوا لەسەر خۆیان لابەرن.

٣- بۆ ڕەخسێنرانی چەند هاوەڵێكی خراپ، كە كردەوە خراپەكانیان بۆ دەڕازێننەوە، ئنجا هاوەڵی خراپی جند بن، یاخود مرۆڤ بن.

٤- بە یەكدی گوتنیان كە قسەی پووچ و غەڵبەغەڵب بكەن لە دژی قورئان، بۆ ئەوەی بەسەریدا زاڵبن.

٥- سزای بێبڕوایان ئاگری دۆزەخەو، لەوێدا ڕیسواو شەرمەزار دەكرێن.

٦- لە دۆزەخدا بێبڕوایەكان داوا لە خوا دەكەن، ئەو دووانەی لە جندو مرۆڤ، گومڕایان كردوون، پێشانیان بدات تاكو بیانخەنە ژێر پێیان و، لە خوارەوە بن.

﴿ وَيَوْمَ يُحْشَرُ أَعْدَآءُ ٱللَّهِ إِلَى ٱلنَّارِ فَهُمْ يُوزَعُونَ ﴿١٩﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا مَا جَآءُوهَا شَهِدَ عَلَيْهِمْ سَمْعُهُمْ وَأَبْصَٰرُهُمْ وَجُلُودُهُم بِمَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿٢٠﴾ وَقَالُواْ لِجُلُودِهِمْ لِمَ شَهِدتُّمْ عَلَيْنَا قَالُوٓاْ أَنطَقَنَا ٱللَّهُ ٱلَّذِىٓ أَنطَقَ كُلَّ شَىْءٍ وَهُوَ خَلَقَكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢١﴾ وَمَا

كُنتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَن يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ وَلَآ أَبْصَٰرُكُمْ وَلَا جُلُودُكُمْ وَلَٰكِن ظَنَنتُمْ
أَنَّ ٱللَّهَ لَا يَعْلَمُ كَثِيرًا مِّمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٢٢﴾ وَذَٰلِكُمْ ظَنُّكُمُ ٱلَّذِى ظَنَنتُم بِرَبِّكُمْ أَرْدَىٰكُمْ
فَأَصْبَحْتُم مِّنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٢٣﴾ فَإِن يَصْبِرُوا۟ فَٱلنَّارُ مَثْوًى لَّهُمْ ۖ وَإِن يَسْتَعْتِبُوا۟ فَمَا
هُم مِّنَ ٱلْمُعْتَبِينَ ﴿٢٤﴾ وَقَيَّضْنَا لَهُمْ قُرَنَآءَ فَزَيَّنُوا۟ لَهُم مَّا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ
وَحَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلْقَوْلُ فِىٓ أُمَمٍ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِم مِّنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ ۖ إِنَّهُمْ كَانُوا۟
خَٰسِرِينَ ﴿٢٥﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَا تَسْمَعُوا۟ لِهَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ وَٱلْغَوْا۟ فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَغْلِبُونَ ﴿٢٦﴾
فَلَنُذِيقَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ عَذَابًا شَدِيدًا وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَسْوَأَ ٱلَّذِى كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٢٧﴾ ذَٰلِكَ
جَزَآءُ أَعْدَآءِ ٱللَّهِ ٱلنَّارُ ۖ لَهُمْ فِيهَا دَارُ ٱلْخُلْدِ ۖ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا يَجْحَدُونَ ﴿٢٨﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ
كَفَرُوا۟ رَبَّنَآ أَرِنَا ٱلَّذَيْنِ أَضَلَّانَا مِنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ نَجْعَلْهُمَا تَحْتَ أَقْدَامِنَا لِيَكُونَا مِنَ
ٱلْأَسْفَلِينَ ﴿٢٩﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{هەروەها (ئەی موحەممەد) لەو ڕۆژەش بیانترسێنە کە دوژمنانی خوا بەرەو لای ئاگر{ی دۆزەخ} کۆ دەکرێنەوەو ڕەپێچەك دەدرێن، هی پێشێیان ڕادەگیرێ، تاکو هی دواییان پێیان دەگات ﴿١٩﴾ هەتا کاتێك هاتنە لای دۆزەخ، بیستنیان و، چاوەکانیان و، پێستەکانیان، شایەدییان لەسەریان دا لە بارەی ئەوەوە کە دەیانکرد ﴿٢٠﴾ ئەوانیش بە پێستەکانیان گوت: بۆچی شایەدییتان لەسەردراین؟ گوتیان: ئەو خوایە هێنانینیە گۆ، کە هەموو شتێك دێنێتە گۆ، (وەقسە دێنێ)، هەر ئەویش یەکەمجار دروستی کردوون و، تەنیا بۆ لای ویش دەگێڕدرێنەوە ﴿٢١﴾ کاتی خۆیشی لە ژیانی دنیادا، ئێوە بۆیە خۆتانتان حەشار نەدەدا، (خۆتان نەدەشاردەوە) کە بیستنتان و، چاوەکانتان و، پێستەکانتان، شایەدییتان لەسەر

بـدەن، بەڵکـو پێتـان وابـوو: خـوا زۆرێـك لـەوەی دەیکـەن نایزانـێ ﴿٢٢﴾ ئنجـا ئـەو گومانەشـتان کـە بـە پەروەردگارتانتـان بـرد، فەوتاندنـی، (سـەری بـە فەتـارەت دان و)، لـە زیانبـاران بـوون ﴿٢٣﴾ ئنجـا لـە ڕۆژی دواییـدا ئەگـەر خۆیـان ڕابگـرن، (یـان خۆیـان ڕانەگـرن)، لـە نێـو ئاگـردا (یەکسـانە)، شـوێنی حەوانەوەیـان هـەر ئاگـرەو، ئەگـەر داواش بکـەن گلەیـی لەسـەر خۆیـان لابـەرن، لـە گلەیـی لەسـەر لابـراوان نابـن، (بواریـان نـادرێ پـۆزش بهێننـەوەو، گلەیـی خـوا لەسـەر خۆیـان لابـەرن) ﴿٢٤﴾ هەروەهـا هاونشـینانێکی خراپـمان بـۆ ڕەخسـاندوون، هەرچـی لـە پێشـیانەوەیە (لـە کاروبـاری خراپـی دنیـا)و، هەرچـی لـە دوایانەوەیـە (لـە پشـت گوێخسـتنی ڕۆژی دوایـی)، بۆیـان ڕازاندنـەوەو، فەرمایشـت و بڕیـاری خوایـان لەسـەر چەسـپا، (کـە دەبـێ سـزا بدرێـن)، لـە نێـو کۆمەڵانێکـدا لـە جنـدو مـرۆڤ، کـە زیانبـارن ﴿٢٥﴾ ئەوانـەش کـە بێبـڕوان گوتیـان: گـوێ بـۆ ئـەم قورئانـە مەگـرن و، غەڵبەغەڵـب و قسـەی پووچـی لـە کاتـی خوێندنـی دا تێـدا بکـەن، بەڵکـو بەسـەریدا زاڵـبن ﴿٢٦﴾ بـە دڵنیایـی ئەوانـەی بێبـڕوان، ئازارێکـی توندیـان پـێ دەچێژیـن و، مسـۆگەر سـزای خراپتریـن کردەوەیـان دەدەینـەوە کـە دەیانکـرد ﴿٢٧﴾ ئـەوە سزای دوژمنانـی خوایـە، ئاگـری دۆزەخـە، کـە لەوێـدا مەنزڵـگای هەمیشـەییان هەیـە، بـە هـۆی ئـەوەوە کـە نکووڵییـان لـە نیشـانەکانمان دەکـرد ﴿٢٨﴾ هەروەهـا ئەوانـەی بێبـڕوان گوتیـان: پەروەردگارمـان! ئـەو دووانەمـان پیشـان بـدە لـە جنـدو مـرۆڤ کـە گومڕایـان کردیـن، دەیانخەینـە ژێـر پێمانـەوە، تاکـو لـە هـەرە نزمـان بـن ﴿٢٩﴾.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(يُوزَعُونَ): (وَزَعْتُهُ عَنْ كَذَا، أَي: كَفَفْتُهُ، يُوزَعُون، أَي: يُحْبَسُ أَوَّلُهُمْ عَلَى آخِرِهِم، أَوْزِعْنِي: أَلْهِمْنِي)، دەگوترێ: (وَزَعْتُهُ عَنْ كَذَا) واتە: نەمهێشت، ڕێم لێگرت، گێڕامەوە، (يُوزَعُون) هی پێشێیان ڕادەگیرێ، تاکو هی دواییان پێدەگات، هەموویان خڕ دەکرێنەوە سەر یەك، وشەی (أَوْزِعْنِي) لە قورئاندا بەکارهاتوە: ﴿رَبِّ أَوْزِعْنِيٓ أَنْ أَشْكُرَ ﴿١٥﴾﴾الأحقاف، (أَي: أَلْهِمْنِي) واتە: مەهێڵە سوپاسگوزاریی بۆ تۆ نەکەم.

(أَرْدَىٰكُمْ): (أَي: أَهْلَكَكُم) فەوتاندنی، (الرَّدَى: الهَلاَك، والتَّرَدِّي: التَّعَرُّضُ لِلْهَلاَك، أَرْدَاكُم: أَهْلَكَكُم)، (رَدَى) بە مانای فەوتانە، (تَرَدِّي) بریتیە لەوەی ئینسان خۆی بخاتە حاڵەتی فەوتانەوە، کەواتە: (أَرْدَاكُم) واتە: فەوتاندنی.

(وَإِن يَسْتَعْتِبُواْ): ئەگەر داوا بکەن گلەیی لەسەر خۆیان لابەرن، (العَتَبُ: كُلُّ مَكَانٍ نَابٍ بِنَازِلِهِ، وَمِنْهُ عَتَبَةُ الدَّارِ، وَالعَتْبُ وَالمَعْتَبَةُ: غِلْظَةٌ يَجِدُهَا الإِنْسَانُ فِي نَفْسِهِ، وَالإِسْتِعْتَابُ أَنْ يُطْلَبَ مِنَ الإِنْسَانِ أَنْ يَذْكُرَ عَتْبَهُ لِيَعْتِبَ)، (عَتَب): هەر شوێنێکە کە زەق بێ بۆ کەسێك کە لێی دادەنیشێ، لە بنیدا بەرز بێ، (عَتَبَةُ البَاب) واتە: شیپانەی دەرگا، چوارچێوەی دەرگا، (العَتْبُ وَالمَعْتَبَة) زبرییەکە مرۆڤ لە نەفسی خۆیدا هەستی پێدەکات، گلەیی، (إِسْتِعْتَاب)یش ئەوەیە کە داوا لە مرۆڤ بکرێ گلەییەکەی خۆی باس بکات، تاکو گلەییەکەی نەمێنێ، کەواتە: (إِنْ يَسْتعتبوا)، (إِنْ يَسْتَقِلُوا العُتْبَى، وَالعُتْبَى مَصْدَرُ الإِعْتَابِ، وَهِيَ رُجُوعُ المَعْتُوبِ عَلَيْهِ إِلَى مَا يُرْضِي الْعَاتِبَ) ئەگەر داوای (عُتْبَى) بکەن، (عُتْبَى)ش ناوی چاوگە بۆ (إِعْتَاب)، (إِعْتَاب)یش: بریتیە لەوەی بابای لۆمەکراو، بگەڕێتەوە بۆ حاڵەتێك کە بابای لۆمەکەر ڕازی بێ لێی، واتە: گلەیی گلەییکەر لەسەر خۆی نەهێڵێ.

(فَمَا هُم مِّنَ ٱلْمُعْتَبِينَ ): واتـە: (إِنَّ اللـهَ لا يُعْتِبُهُـم، أَي: لا يَقْبَـلُ مِنْهُـمُ الإِعْتِـذَارَ وَرَفْـعَ العِتَـابِ عَلَيْهِـم)، خـوا پـۆزش هێنانەوەیـان لـێ قبـووڵ نـاکات، یـانی: گلەیـی و لۆمـەی خۆییـان لەسـەر لانابـات، لـەوێ بواریـان پـێ نـادات، گلەیـی خـوا لەسـەر خۆیـان لابـەرن.

(وَقَيَّضْـنَا ): (هَيَّئْنَـا، أَتَحْنَـا لِيَسْـتَوْلِيَ عَلَيْـهِ اسْـتِيلاءَ الْقَيـضِ عَـلَى الْبَيْـضِ، وَهُـوَ الْقِـشْرُ الأَعْـلَى)، (قَيَّضْنَـا) بـە مانـای ئامادەمـان کـرد (أَعْدَدْنَـا) واتـە: ڕێـمان پێـدا کە بەسـەریدا زاڵ بـێ، وەك چـۆن (قَيـض) بەسـەر (بَيْـض)دا زاڵ دەبـێ، (قَيض)یـش: بریتیـە لـەو توێکڵـەی لـە سـەرەوەی هێلکەیـە، توێکڵەکـە زەردێنـەو سـپێنەکەی هێلکەکـەی گرتۆتـە نێـو خـۆی.

(قُرَنَآءَ ): (جَمْـعُ قَرِيـن، الْقَرِيـنُ هُـوَ الصَّاحِـبُ المُـلازِم)، (قُرنـاء) کـۆی (قريـن)ە، هاوەڵێـك کـە پەیوەسـت بـێ بـە مرۆڤـەوەو، هەمیشـە لەگەڵـی بـێ، بۆیـە بـە کوردیـی بـە (هاونشـین) کەسـێك کە هەمیشـە لەگـەڵ کەسـێکە، لەگەڵـی دادەنیشـێ و پێکەوەن، مانامـان کـردوە.

(وَٱلْغَوْاْ فِيهِ ): واتـە: (لَغـو)ی تێـدا بکـەن، (اللَّغْـو: مِـنَ الـكَلامِ مَـا لاَ يُعْتَـدُّ بِـهِ، وَهُـوَ الَّـذِي يُـورَدُ لاَ عَـنْ رَوِيَّـةٍ وَفِكْـرٍ، فَيَجْـرِي مَجْـرَى اللَّغَـا، وَهُـوَ صَـوْتُ الْعَصَافِيرِ)، (لَغـو): لـە قسـە، ئەوەیـە کـە بایەخـی پـێ نـەدرێ، ئەویـش ئەوەیـە کەسـێك قسـەیەك بـکات لـە ڕووی بیـر لێکردنـەوەو تێوەڕامانـەوە نەبـێ، بۆیـە حوکمـی (لَغَـا)ی دەبـێ، (لَغَـا)ش: بریتیـە لـە دەنگـی پاسـاریی، دەنگـی چۆلـەکان کـە بـۆ ئێمـە سـوودێکی نیـەو، تێناگەیـن، بـەڵام بێگومـان تەیـرو تـواڵ کـە دەجریوێنـن و دەچریکێنـن، کـەو کـە دەقاسـپێنێ، کۆتـر کـە دەگمێنـێ، قـاز کـە دەقیڕێنـێ، مریشـك کـە دەکورکێنـێ، کەڵەبـاب کـە دەقووقێنـێ، عەلەشـیش کـە دەعووعێنـێ، ئەوانـە هەموویـان بـۆ خۆیـان لێـك تێدەگـەن و بـۆ ئـەوان قسـەیەکی بـە کەڵکـە، بـەڵام بـۆ ئێمـەو مانـان کـە لێیـان تێناگەیـن، پـووچ و بـێ سـوودە.

ئنجا بێبڕوایەکان گوتوویانە: کە قوڕئان دەخوێندرێ، ئێوە قسەی پووچی تێدا بکەن، گاڵە گاڵ و قسەی پووچ بکەن، بۆ ئەوەی ئەو ئایەتانەی دەخوێنرێن، نەگەنە گوێی بیسەران و، لێیان تێنەگەن.

(ٱلۡأَسۡفَلِينَ ): (السُّفْلُ ضِدُّ الْعُلو، وَسَفَلَ فَهُوَ سَافِلٌ، وَأَسْفَلْ ضِدُّ أَعْلَى)، (سُفْل): پێچەوانەی (عُلو)ە، (سُفْل) خوارێ، (عُلو) سەرێ، (سَفَلَ فَهُوَ سَافِلٌ) واتە: چووە ژێرەوە ئەو لە ژێرەوەیە، (وَأَسْفَلْ ضِدُّ أَعْلَى)، (أَسْفَل) واتە: زۆر لە خوارێ، (أَعْلَى) واتە: زۆر لە سەرێ، (هَذَا أَسْفَلُ مِنْ هَذَا، وَهَذَا أَعْلَى مِنْ هَذَا) ئەمە لە خوار ئەمەیەو، ئەمە لە سەرووی ئەمەیە، ئەوانە پێچەوانەی یەکدین.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

دوای ئەوەی خوای کاربەجێ لە شەش ئایەتی پێشوودا، سەرنجی خەڵکی ڕاکێشا بۆ بەسەرهاتی هەر کام لە گەلی عادو گەلی ثەموودو، ئەو سەرەنجامە شوومەی کە لەگەڵیدا دەستەو یەخە بوون، بەهۆی ملهوڕییان و، بە هۆی ڕەفزکردنیانەوە بۆ هیدایەتی خوا، ئنجا خوا ﷻ دەگوازێتەوە بۆ باسی ڕۆژی دوایی، چەند دیمەنێك لە ڕۆژی دوایی دەخاتە بەرچاو، تاکو بزانن کە ڕۆژی دواییش چاوەڕێیانە، وێڕای ئەو سزا دنیاییە، کەواتە: ئەگەر سزایەکی دنیایی وەك هی گەلی عادو ثەموودیشیان بەملدا نەهات، با بزانن ئەوەی ڕۆژی دوایی هەر مسۆگەرەو، بە ملیاندا دێ.

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَيَوۡمَ يُحۡشَرُ أَعۡدَآءُ ٱللَّهِ إِلَى ٱلنَّارِ فَهُمۡ يُوزَعُونَ ﴾، ئەو ڕۆژە کە دوژمنانی خوا بەرەو ئاگر کۆ دەکرێنەوە، ﴿ فَهُمۡ يُوزَعُونَ ﴾، واتە: دەگێڕدرێنەوەو ناهێڵرێ لێك بترازێن، هی پێشێیان ڕادەگیرێ، تاکو هی دواییان پێ دەگات، یاخود: ﴿ فَهُمۡ يُوزَعُونَ ﴾، یانی: (يُسَاقون)، لێدەخوڕرێن و پاڵپێوە

دەنرێن، ڕەپێچەك دەدرێن، وەك چۆن كەسێك كۆمەڵە ئاژەڵێك دەبات بۆ سەر ئاو، یان بۆ نێو ئاغەڵ، دەنگیان دەداو، ڕەپێچەكیان دەداو، هەڵیاندەپێچێ، ئەوانیش بەو شێوەیە، ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا مَا جَآءُوهَا ﴾، هەتا كاتێك كە هاتنە لای، ئەو ڕاناوە (ها) بۆ ئاگر دەچێتەوە، كە پێشێ هاتوە، واتە: تاكو كاتێك كە گەیشتنە لای ئاگری دۆزەخ، ﴿ شَهِدَ عَلَيۡهِمۡ سَمۡعُهُمۡ وَأَبۡصَٰرُهُمۡ وَجُلُودُهُم بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴾، بیستنیان و، چاوەكانیان و، پێستەكانیان شایەدییان لەسەردان بەوەی دەیانكرد، واتە: لەسەریان بوونە شایەد، شایەدی كردەوە خراپەكانیان.

﴿ وَقَالُواْ لِجُلُودِهِمۡ لِمَ شَهِدتُّمۡ عَلَيۡنَا ﴾، بە پێستەكانی خۆیانیان گوت: بۆچی شایەدییمان لەسەر دەدەن، ئەوان هەم بیستنیان و، هەم بینینیان، واتە: گوێ و چاوەكانیشیان شایەتییان لەسەر داون، بەڵام لێرەدا تەنیا ڕووی ڕەخنە دەكەنە پێستەكانیان، كە بۆچی شایەدییمان لەسەر دەدەن؟ باسی گوێ و چاوەكانیان نەكراوە، لەبەر ئەوەی پێستەكانیان لەبەرەو ڕوویانەو دەیبینن، واتە: پێستی ئەندامەكان، بەڵام نە گوێیان دەبینن، نە چاویشیان لەبەر چاویانە تاكو ببینن، كە دەڵێن: بۆچی شایەدییمان لەسەر دەدەن؟ ﴿ قَالُوٓاْ أَنطَقَنَا ٱللَّهُ ٱلَّذِيٓ أَنطَقَ كُلَّ شَيۡءٖ ﴾، گوتیان: ئەو خوایە هێنانینیە گۆ، كە هەموو شتێكی هێناوەتە گۆ، ئەو خوایە ئێمەی وەقسە هێناوە، كە هەموو شتێكی وەقسە هێناوە، واتە: هەر شتێك بیەوێ، خوا ﷻ وای لێدەكات بدوێ و قسە بكات، ﴿ وَهُوَ خَلَقَكُمۡ أَوَّلَ مَرَّةٖ ﴾، هەر ئەویش یەكەمجار دروستی كردن، ﴿ وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴾، هەر بۆ لای ویش دەگێردرێنەوە.

ئنجا ئەمەی دێ، دەگونجێ هەر قسەو وەڵامی پێست و، چاوو، گوێیەكانیان بێ، دەشگونجێ ئەمە فەرمایشتی خوای موتەعال بێ، نێواخنی كردوە لەگەڵ وەڵامی ئەو ئەندامانەی جەستەی مرۆڤدا، دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كُنتُمۡ تَسۡتَتِرُونَ أَن يَشۡهَدَ عَلَيۡكُمۡ سَمۡعُكُمۡ وَلَآ أَبۡصَٰرُكُمۡ وَلَا جُلُودُكُمۡ ﴾، ئێوە كاتی خۆی خۆتان پەنهان نە دەكرد، لە ترسی ئەوەی بیستنتان و، چاوەكانتان و، پێستەكانتان شایەدیتان

لەسـەر بـدەن، واتـە: خۆپەنهانکردنتـان لـە تـرسی شـایەدیی لەسـەردرانتان نەبـوو، ﴿ وَلَٰكِن ظَنَنتُمْ أَنَّ اللَّهَ لَا يَعْلَمُ كَثِيرًا مِّمَّا تَعْمَلُونَ ﴾، بـەڵام پێتـان وابـوو خـوا زۆرێـك لـەوەی دەیکـەن، نایزانـێ، واتـە: ئەگـەر شـتێکتان بـە پەنهانیـی دەکـرد، لەبـەر شـایەدیی لەسـەردانی بیسـتن و، چـاوو، پێسـتتان نەبـوو، بەڵکـو پێتـان وابـوو ئەگـەر شـتێك بـە پەنهانیـی بکـەن، خـوا زۆرێـك لـە کردەوەکانتـان نازانـێ، یـانی: ئـەو کردەوانـەی بـە پەنهانیـی دەیانکـەن، کەواتـە: خـۆ پەنهانکردنەکەتـان لەسـەر ئـەو بناغەیـە بـوو، پێتـان وابـوو ئەگـەر خۆتـان پەنهـان بکـەن، خـوا کـردەوە پەنهانەکانتـان پـەی پێنابـات و نازانـێ، یـان ئەگـەر بـە چپـە قسـە بکـەن، قسـەکەتان نابیسـتێ.

﴿ وَذَٰلِكُمْ ظَنُّكُمُ الَّذِي ظَنَنتُم بِرَبِّكُمْ ﴾، ئـا ئـەو گومانەشـتان کـە بـە پەروەردگارتان بـرد، ﴿ أَرْدَاكُمْ ﴾، تێـوەی فەوتانـد، ﴿ فَأَصْبَحْتُم مِّنَ الْخَاسِرِينَ ﴾، سـەرەنجام لـە زیانبـاران بـوون، واتـە: ئـەو گومانەتـان کـە پێتـان وابـوو، خـوا ﷻ زۆرێـك لـە کردەوەکانتـان نازانـێ و، پێتـان وابـوو خوا لێتان ناپرسێتەوەو، سـزاو پاداشـتتان ناداتەوە، ئـەوە بـوو وایلێکـردن بفەوتێـن و، ڕێ لـە بـەردەم خۆتانـدا تەخـت و ئاچـووخ ببینـن، کـە بێبڕوابـن و، هاوبـەش بـۆ خـوا دانەربـن و، تاوانباربـن و، خراپەکاربـن، چونکـە پێتـان وابـوو خـوا زۆرێـك لـە کردەوەکانتـان نابینـێ و، پێشـتان وابـوو، ڕۆژێـك نایەتـە پێـش خـوا ﷻ سـزاتان بـدات لەسـەر خراپەکانتـان.

﴿ فَإِن يَصْبِرُوا فَالنَّارُ مَثْوًى لَّهُمْ ﴾، ئنجـا ئەگـەر خۆیـان ڕابگـرن، ئـەوە ئاگـر جێـگای حەوانەوەیانـە، واتـە: ئاگـری دۆزەخ، لێـرە دەفەرمـوێ: ئەگـەر خۆیانـی تێـدا ڕابگـرن، باسـی بەرانبەرەکـەی نەکـردوە، بـەڵام واتـە: ئەگـەر خۆیـان ڕابگـرن، یـان خۆیان ڕانەگـرن، سـەرەنجام هـەر جێگایـان ئاگـرە، چونکـە لـە قورئانـدا زۆرجـاران خـوا ﷻ لـە دوو شـتان یەکێکیـان بـاس دەکات و، ئـەوی دیکـە بـاس نـاکات، لەبـەر ئـەوەی ئـەو دوو شـتە پێکـەوەن و پێکـەوە پەیوەسـتن، زانایـان زۆرجـاران وێنـە بـەوە دێننـەوە کـە خـوا ﷻ لـە سـوورەتی (النَّحْل)دا دەفەرمـوێ: ﴿ سَرَابِيلَ تَقِيكُمُ الْحَرَّ وَسَرَابِيلَ تَقِيكُم بَأْسَكُمْ ﴾، واتـە: پۆشـاکێك دروسـت دەکـەن کـە لـە گەرمـا دەتانپارێـزێ،

ساردی باس نەکردوە، یانی: (**تَقیکُمُ الحَرَّ والبَرْدَ**)، واتە: لە گەرماو، لە سەرماش دەتانپارێزێ، هەروەها: ﴿ تَقِيكُم بَأْسَكُمْ ﴾، لە کاتی جەنگ دەتانپارێزێ، کەواتە: لە کاتێك دا جەنگیش نەبێ، ئەو پۆشاکە خۆتانی پێ دادەپۆشن.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَإِن يَسْتَعْتِبُواْ فَمَا هُم مِّنَ ٱلْمُعْتَبِينَ ﴾، ئەگەر داوا بکەن، گلەیی لەسەر خۆیان لابەرن، گلەیی لەسەر لابراو نابن، ئەو گلەیی لەسەر خۆ لابردنەش، بەوە کە داوای لێبوردن لە خوا بکەن و، پۆزش بهێننەوە، بەڵام وەڵامی ئەو داوایەیان نادرێتەوە، بۆیە گلەییان لەسەر لاناچێ، ئەو گلەیی و، ڕەخنەیەی خوا لێیانی هەیە، هەر دەمێنێ، بۆچی؟ چونکە ڕۆژی دوایی شوێنی سزاو پاداشتە، شوێنی داوای لێبوردن کردن و، قەرەبوو کردنەوەو، چاککردنەوەی خراپەکان نیە، خوێنراویشەتەوە: (**وَإِنْ يُسْتَعْتَبُوا فَمَا هُمْ مِنَ المُعْتِبِينْ**)، ئەگەر داوایان لێ بکرێ، گلەیی لەسەر خۆ لابەرن، گلەیی لەسەر خۆ لابەر نابن، (**مُعْتِب**)، واتە: کەسێك کە گلەیی لەسەر خۆی لادەبات.

﴿ وَقَيَّضْنَا لَهُمْ قُرَنَآءَ ﴾، هاونشینانێکمان بۆ ڕەخساندن، بۆ ئامادەکردن، (**قُرَنَاء**) کۆی (**قَرِين**)ە، (**قَرِين**) بە هاوەڵ و هاودەم و هاونشینێك دەگوترێ، کە هەمیشە لەگەڵ مرۆڤ دابێ، بۆیە زۆر لە زانایان (**قُرَنَاء**)یان بە هاوەڵانی جندو شەیتان لێکداوەتەوە، هەرچەندە دەشگونجێ هاوەڵانی مرۆڤ بن، هاوەڵی خراپ، بەڵام وەك دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا زیاتر تیشکی دەخەینە سەر، لە چەند شوێنێکی دیکەی قورئاندا، خوا ﷻ باسی (**قَرِين**)ی کردوەو، باسی شەیتانەکانی کردوە کە دەبنە هاودەم و هاوڕازی بێبڕوایەکان، بۆ وێنە:

أ- لە سوورەتی (**الأَعْرَاف**)دا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا جَعَلْنَا ٱلشَّيَٰطِينَ أَوْلِيَآءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٢٧﴾ ﴾، واتە: ئێمە شەیتانەکانمان کردوە بە دۆست و نیزیکی ئەوانەی بڕوا ناهێنن.

ب- هەروەها لە سوورەتی (**الأَنْعام**)دا دەفەرموێ: ﴿ شَيَٰطِينَ ٱلْإِنسِ وَٱلْجِنِّ يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ زُخْرُفَ ٱلْقَوْلِ غُرُورًا ﴾، واتە: شەیتانەکانی مرۆڤ و جند هەندێکیان

قسەی ڕازاوەو فریودەر بۆ یەکدی دەنێرن، کە مەبەست پێی خوتخوتە کردنی شەیتانە جندەکانە بۆ مرۆڤەکان.

ج- هەروەها لە سوورەتی (الأنعام)دا دەفەرمویٚ: ﴿وَإِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوۡلِيَآئِهِمۡ لِيُجَٰدِلُوكُمۡۖ وَإِنۡ أَطَعۡتُمُوهُمۡ إِنَّكُمۡ لَمُشۡرِكُونَ ﴿١٢١﴾﴾، واتە: شەیتانەکان خوتخوتە دەکەن بۆ دۆستەکانیان (لە کافرەکان) تاکو شەڕە قسەتان لەگەڵدا بکەن و، ئەگەر بە قسەیان بکەن، ئێوەش دەبن بە هاوبەش بۆ خوادانەر، واتە: ئەگەر لە بواری حەڵاڵ و حەرامدا بە قسەیان بکەن، لە بازنەی ئیمان دەردەچن.

﴿وَقَيَّضۡنَا لَهُمۡ قُرَنَآءَ﴾، چەند هاونشینێکمان بۆ ئامادەکردن، ﴿فَزَيَّنُواْ لَهُم مَّا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡ﴾، هەرچی لە پێش دەستیانەوەیەو، هەرچی لە دوایانەوەیە بۆیان ڕازاندنەوە، واتە: هەرچی گوناهو تاوان بوو لە هەر چوار دەوریان بۆیان ڕازاندنەوە، ئەوە واتایەکی، یاخود گوناهو تاوانێك کە لە دنیادا دەیکەن، بۆیان ڕازاندنەوە، ﴿وَمَا خَلۡفَهُمۡ﴾، هەروەها هی ڕۆژی دواییشیان بۆ ڕازاندنەوە، بەو واتایە کە گوتیان: نە سزا هەیەو نە پاداشت هەیەو، نە لێپرسینەوە، نە هیچ هەیە، ئەوێشیان بۆ ڕازاندنەوە فریویاندان، ﴿وَحَقَّ عَلَيۡهِمُ ٱلۡقَوۡلُ﴾، فەرمایشتیان لەسەر چەسپا، فەرمایشت واتە: بڕیاری خوا کە دەبێ سزا بدرێن، لەسەر ئەو کوفرو خراپەو تاوانەیان، ئەو فەرمایشتەی خوایان لەسەر چەسپا، ﴿فِيٓ أُمَمٖ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِهِم مِّنَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ﴾، لە نێو کۆمەڵانێکدا کە تێپەڕیبوون، لە پێش واندا لە جندو لە مرۆڤ، ﴿إِنَّهُمۡ كَانُواْ خَٰسِرِينَ﴾، بە دڵنیایی ئەوان زیانبار بوون، لێرەدا توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: (خَاسِر) بۆ بازرگانێکە کە سەوداو مامەڵەیەك دەکات، دوایی لە سەوداو مامەڵەکەیدا زەرەر دەکات، نەك هەر قازانجی نایەتە دەست، دەستمایەکەشی لە دەست دەدات، واتە: حاڵیان چوێنراوە بە حاڵی بازرگانێکەوە، کە نەك هەر قازانجی نەکردوە، بەڵکو دەستمایەو سەرمایەکەشی فەوتاوە.

ئنجا خوا ﷻ دێتە سەر باسی هەڵوێستێکی دیکەیان و دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴾، ئەوانەی بێبڕوان گوتیان، بە کێیان گوت؟ دیارە لە بەینی خۆیاندا گوتیان، یاخود ﴿ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴾، مەبەست پێی سەرانیانە، سەران و حوکمڕان و دەسترۆیشتووەکان، بە دەست و پێوەندو شوێنکەوتە هەڵخەڵەتاوەکانیان گوت: ﴿ لَا تَسْمَعُواْ لِهَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ ﴾، گوێ بۆ ئەم قورئانە مەگرن، ﴿ وَٱلْغَوْاْ فِيهِ ﴾، لەغووی تێدا بکەن، قسەی پووچی تێدا بکەن، ﴿ لَعَلَّكُمْ تَغْلِبُونَ ﴾، بەڵکو بەسەریدا زاڵبن، ئەوانەی کە فەرمانیان کرد بێ بە جگە لە خۆیان، کە گوێ مەگرن بۆ قورئان و، قسەی پووچی تێدا بکەن! دەبێ کەسانێك بووبن ئەمر و نەهییان بەدەست بوو بێ، کەواتە: ئەمە قسەی بەرپرسەکان و دەسترۆیشتووەکانە، کە بە شوێنکەوتوو و بە دەست و پێوەندو، خەڵکە هەڵخەڵەتاوەکەی خۆیانیان گوتوە، وشەی (لَغْو) پێشتریش باسمان کرد، یانی: قسەی پووچ، قسەیەك کە سوودی نەبێ، واتە: قسەی پووچ بکەن لە کاتێکدا کە قورئان دەخوێنرێ، بۆ ئەوەی لە ئەنجامی گوێ بیست بوونی بیسەراندا بۆ قسە پووچەکان، ئاگایان لە گوێ لێگرتنی قورئان نەمێنێ، یاخود غەڵبەغەڵب و دەنگە دەنگ بکەن، بۆ ئەوەی ئەو دەنگە دەنگ و غەڵبە غەڵبە، ببێتە پەردەیەك لە نێوان قورئان و بیستنی ئەو کەسانەدا، کە لەو کۆڕو مەجلیسەدا گوێ دەگرن، ﴿ لَعَلَّكُمْ تَغْلِبُونَ ﴾، بەڵکو زاڵ بن، ئەگەر وابکەن بەسەر قورئاندا زاڵ دەبن، واتە: ناهێڵن قورئان بگاتە گوێی خەڵك، ئەمە چەکی بەهێزی ناحەزانی پێغەمبەران و پەیامەکانی خوای موتەعال بووە، بە درێژایی مێژوو تاکو ئێستاو، لە مەودواش هەروا دەبێ، بەهێزترین چەکیان ئەوە بووە کە نەهێڵن ئەو دەنگە زوڵاڵە، ئەو بانگە هەقە بگاتە گوێی خەڵك، زانیویانە ئەگەر بگاتە گوێی خەڵك، خەڵك هۆشیار دەبێتەوە، چونکە زگماکی ساغی مرۆڤەکان و عەقڵی سەلیمیان ئاشنایە لەگەڵ پەیامی خواو، بەرنامەی خوادا ﷻ کە بە پێغەمبەراندا ناردوویەتی، چونکە ئەو پەیام و بەرنامانەی خوا، وەڵامگۆی هەموو داخوازییە ڕەواو خوارسکەکانی زگماك و سرووشتیانن.

ئنجا لە بەرانبەر ئەوەدا، خوا دەفەرموێ: ﴿ فَلَنُذِيقَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ عَذَابًا شَدِيدًا ﴾، بە دڵنیایی و زۆر بە جەختکردنەوەوە: ئەوانەی بێبڕوا بوون، سزایەکی توندیان پێ دەچێژین، واتە: وەك چۆن خۆراکێك ئامادە دەکرێ و، دەرخواردی کەسێك دەدرێ، ئێمەش ئاوا ئەو سزایەیان پێ دەچێژین، ﴿ وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَسْوَأَ ٱلَّذِى كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴾، بە دڵنیایی سزایان دەدەین، بە پێی خراپترینی ئەوەی دەیانکرد، واتە: سزای خراپترین کردەوەکانیان دەدەینەوە، ئنجا (أَسْوَأَ)، لێرەدا هەرچەندە ناوی هەڵبژاردن (إِسْم تَفْضِيل)ە، بەڵام مەبەست پێی هەڵبژاردن نیە، بەسەر کردەوەکانی دیکەیان دا کە هێندە خراپ نین، چونکە خوا بەپێی هەموو کردەوە خراپەکانیان، سزای خراپەکاران دەدات، بەڵام یانی: سزای خراپترین کردەوەیان دەدەین، ئەو کردەوانەیان کە هەرە خراپن، کەواتە: (أَسْوَأَ) بەرانبەرێکی نیە، خراپتر لەچی؟ یانی: هەموو کردەوەکانیان خراپترن.

﴿ ذَٰلِكَ جَزَآءُ أَعْدَآءِ ٱللَّهِ ٱلنَّارُ ﴾، ئا ئەوە سزای دوژمنانی خوایە ئاگرە، ئاگری دۆزەخە، ﴿ لَهُمْ فِيهَا دَارُ ٱلْخُلْدِ ﴾، لە نێو ئەو ئاگرەدا مەنزڵگای هەمیشەییان هەیە، واتە: شوێنێکیان هەیە کە هەمیشە تێیدا دەمێننەوە، ﴿ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يَجْحَدُونَ ﴾، ئەوەش سزای ئەوەیە بە نیشانەکانی ئێمە بێبڕوا بوون، نکووڵییان لێیان دەکرد.

هەڵبەتە لێرەدا (آیات) وەك زۆرجار گوتوومانە: دەگونجێ مەبەست پێی ڕستەکانی قورئان بێ، دەشگونجێ مەبەست پێی موعجیزەکانی پێغەمبەران بێ، دەشگونجێ مەبەست پێی دیاردەو دیمەنەکانی گەردوون بێ، واتە: نیعمەتەکانی خوای پەروەردگار، کە ئەوانە نکووڵیی بکەن لەوەی ئەو نیعمەتانە خوا ڕەخساندوونی و، نکووڵیی بکەن لە موعجیزەکانی پێغەمبەران، یاخود لەو ڕستانەی فەرمایشتی خوا، هەمووی دەگرێتەوە، بەڵام زیاتر واپێدەچێ (آیات) مەبەست پێی ڕستەکانی فەرمایشتی خوای بەرزی بێ وێنە بێ.

لە کۆتاییی دا دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴾، هەروەها ئەوانەی بێبڕوا بوون گوتیان: ﴿ رَبَّنَآ أَرِنَا ٱلَّذَيْنِ أَضَلَّانَا مِنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ ﴾، {لە دۆزەخدا وایانگوتوە}، پەروەردگارمان! ئەو دووانەمان پیشانبدە کە گومڕایان کردین لە جندو مرۆڤ، ئەو دووانە، مەبەست دوو کەسی دیاریکراو نیە، یانی: ئەو دوو کۆمەڵە لە شەیتانەکانی جندو، لە شەیتانەکانی مرۆڤ، کە گومڕایان کردین، پیشانمان بدە، ﴿ نَجْعَلْهُمَا تَحْتَ أَقْدَامِنَا ﴾، دەیانخەینە ژێر پێیەکانی خۆمانەوە، ﴿ لِيَكُونَا مِنَ ٱلْأَسْفَلِينَ ﴾، تاکو ئەوانە لە خوارێ بن، ئەمەش ئەوپەڕی ڕق هەڵسانی ئەو شوێنکەوتووە هەڵخەڵەتاوانە دەگەیەنێ، بەرانبەر بە سەرکردەو، دەسترۆیشتووەکان لە کوفرو شیرکدا، کە هەڵیانخەڵەتاندوون، دەڵێن: پیشانمان بدە، تاکو بیانخەینە ژێر پێمان، با لانی کەم تۆزێك داخی دڵی خۆمانیان پێ بڕێژین!.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

باسی کۆکردنەوەو ڕەپێچەکردانی بێبڕوایانی دوژمنانی خوا بەرەو ئاگر دۆزەخ و، شایەدیی لەسەردانی بیستن و چاو و پێستیان و، ڕەخنە گرتنیان لێیان لەو بارەوەو، وەڵامدانەوەیان کە خوا هێناونیە گۆو، سەرزەنشت کرانیان لەسەر ئەوە، کە پێیان وابووە: خوا زۆرێك لەوەی دەیکەن، نایزانێ، کە هەر ئەو گومانەش بوو بە هۆی فەوتانیان و، لە قیامەتیشدا جێگایان ئاگرەو، بواری گلەیی خوا لەسەر خۆ لابردنیشیان نیە:

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَيَوْمَ يُحْشَرُ أَعْدَآءُ ٱللَّهِ إِلَى ٱلنَّارِ فَهُمْ يُوزَعُونَ ﴿١٩﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا مَا جَآءُوهَا شَهِدَ عَلَيْهِمْ سَمْعُهُمْ وَأَبْصَٰرُهُمْ وَجُلُودُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٢٠﴾ وَقَالُوا۟ لِجُلُودِهِمْ لِمَ شَهِدتُّمْ عَلَيْنَا ۖ قَالُوٓا۟ أَنطَقَنَا ٱللَّهُ ٱلَّذِىٓ أَنطَقَ كُلَّ شَىْءٍ وَهُوَ خَلَقَكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢١﴾ وَمَا كُنتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَن يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ وَلَآ أَبْصَٰرُكُمْ وَلَا جُلُودُكُمْ وَلَٰكِن ظَنَنتُمْ أَنَّ ٱللَّهَ لَا يَعْلَمُ كَثِيرًا مِّمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٢٢﴾ وَذَٰلِكُمْ ظَنُّكُمُ ٱلَّذِى ظَنَنتُم بِرَبِّكُمْ أَرْدَىٰكُمْ فَأَصْبَحْتُم مِّنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٢٣﴾ فَإِن يَصْبِرُوا۟ فَٱلنَّارُ مَثْوًى لَّهُمْ ۖ وَإِن يَسْتَعْتِبُوا۟ فَمَا هُم مِّنَ ٱلْمُعْتَبِينَ ﴿٢٤﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە لە نۆزدە بڕگەدا:

١)- ﴿ وَيَوْمَ يُحْشَرُ أَعْدَآءُ ٱللَّهِ إِلَى ٱلنَّارِ ﴾، ئەو ڕۆژە کە دوژمنانی خوا بەرەو ئاگر کۆدەکرێنەوە، وشەی (حَشْرٌ) واتە: کۆکردنەوەو خڕکردنەوە سەریەك، خوێنراویشەتەوە: (وَيَومَ نَحْشُرُ)، ئنجا ئەگەر (نَحْشُرُ) بخوێنرێتەوە، دەبێ بگوترێ: (أَعْدَاءَ الله)، ئەو ڕۆژە کە

دوژمنانی خوا کۆ دەکەینەوە، ئایا (أَعْدَاءُ الله) دوژمنانی خوا کێن؟ بە تەئکید ئەوانەن کە پێغەمبەرانی خوایان بە درۆ داناوە، پەیامی خوایان ڕەتکردۆتەوە، سەرپێچییان لە خوا ﷻ کردوە، توێژەرەوان گوتوویانە: مەبەست پێی بێبڕوایانی ڕۆژگاری پێغەمبەرە ﷺ بەڵکو هەندێکیان گوتوویانە: مەبەست بێبڕوایە قوڕەیشییەکانە، (**محمد الطاهر بن عاشور**) ڕای وایە.

بەڵام من پێموایە: هەموو ئەوانەی دوژمنانی خوان، چ لە ڕۆژگاری پێغەمبەردا ﷺ چ پێش ئەو و، چ دوای ئەو، چ لە هۆزی قوڕەیش و، چ لە هۆزەکانی دیکەو، نەتەوەکانی دیکە، هەموویان دەگرێتەوەو، هیچ پاساوێك نیە تایبەتی بکەین بە بێبڕوایانی هۆزی قوڕەیشەوە!، هەرچەندە (**محمد الطاهر بن عاشور**) لەو بارەوە هەندێك پاساوی هێناونەوە، بەڵام پێم وایە ئیقناعکەر نین، بۆ ئەوە کە چەمك و واتای (**أَعْداءُ الله**) لەم سیاقەدا کە تێیدا هاتوە، تایبەت بکەین بە کۆمەڵێکی دیاریکراوو، کۆمەڵگاو، کاتێکی دیاریکراوەوە.

٢)- ﴿ فَهُمْ يُوزَعُونَ ﴾، ئنجا ئەوان دەوەستێنرێن، یانی: (**يُكَفُّون**)، واتە: هی پێشێیان ڕادەگیرێ، تاکو هی دوایی پێیان دەگاتەوە، (**يُحْبَسُ أَوَّلُهُمْ عَلَى آخِرِهِم**)، واتە: هی پیشێیان ڕادەگیرێن، تاکو ئەوانەی دوایی پێیاندەگەنەوە، بۆ ئەوەی هەموویان پێکەوە بڕۆن، یاخود: (**يُوزَعُونَ**)، بە مانای (**يُدْفَعُون**) دێ، پاڵپێوەدەنرێن و ڕەپێچەك دەدرێن، یاخود (**يوزعون**)، یانی: (**يُسَاقُونْ**)، لێ دەخوڕدرێن.

٣)- ﴿ حَتَّىٰ إِذَا مَا جَاءُوهَا ﴾، هەتا کاتێك کە گەیشتنە لای وی، ڕاناوەکە (ها) بۆ ئاگر دەچێتەوە، ﴿ حَتَّىٰ إِذَا مَا جَاءُوهَا ﴾، یانی: (**جَاءُوا نَارَ جَهَنَّم**)، (**حَتَّى**) لە زمانی عەرەبیدا، دەڵێ: (**لِإنْتِهَاءِ الغايَة**)، واتە: بۆ گەیشتنە بە کۆتایی مەبەستێك، (**إذَا: ظَرْفٌ لِمُسْتَقْبَلٍ، مُتَضَمِّنٌ مَعْنَى الشَّرْطِ**)، (**إذَا**): بۆ داهاتوویە، بەڵام لێرەدا مانای مەرجیشی خراوەتە نێو، (**مَا**)ش زیاد کراوە بۆ جەختکردنەوە.

(**إذَا**) کە دەفەرموێ: ﴿ حَتَّىٰ إِذَا مَا جَاءُوهَا ﴾، کە وەك گوتم مانای مەرجی خراوەتە نێو، وەڵامەکەی قرتێنراوە، بۆ سامناك پێشاندان، واتە: کاتێك کە دەگەنە لای ئەو ئاگرە ئەوە دەبینن، یان ئەوە ڕوودەدا، کە هەر خوا دەزانێ چۆنە؟!

٤)- ﴿شَهِدَ عَلَيۡهِمۡ سَمۡعُهُمۡ وَأَبۡصَٰرُهُمۡ وَجُلُودُهُم بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ﴾، كاتێك كە دەگەنە لای، شایەدییان لەسەر دەدات، بیستنیان و چاوەكانیان و پێستەكانیان، لەسەر ئەوەی دەیانكرد، ئەگەر وەڵامی (إِذَا) قرتێنراوبێ بۆ زەبەلاح و سامناك پێشاندان، ئەم ڕستەیە: (شَهِدَ عَلَيۡهِمۡ سَمۡعُهُمۡ ....)، دەبێتە ڕستەیەكی دەست پێكردن، دەشگونجێ ئەمە وەڵامی (إِذَا) بێ، وەڵامی مەرجەكە بێ، واتە: كاتێك كە دەگەنە لای، بیستنیان و، چاوەكانیان و، پێستەكانیان، لەسەریان دەبنە بەڵگەو شایەد، شایەدییان لەسەر دەدەن، هی چی؟ ﴿بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ﴾، بەوەی كردوویانە، یانی: (بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَهُ)، بەوەی كە دەیانكرد، وشەی (عَمَل) لە بەكارهێنانی قورئاندا، هەر جۆرە چالاكییەك دەگرێتەوە كە مرۆڤ پێی هەڵدەستێ، چ پەیوەندیی بە عەقڵییەوە هەبێ، واتە: بیرو خولیایەكانی، چ پەیوەندیی بە دڵ و دەروونیەوە هەبێ، واتە: هەست و نەستەكانی، چ پەیوەندیی بە زمانییەوە هەبێ، واتە: دەربڕین و وشەو ڕستەكانی، چ پەیوەندیی بە ئەندامەكانی دیكەیەوە هەبێ، واتە: ئەو كارو چالاكییانەی دەیانكات، كەواتە: (عَمَل) لە قورئاندا، چوار جۆرە واتای هەن، یاخود چوار جۆرە چالاكیی دەگرێتەوە:

١- بیرو خولیایەكانی عەقڵ.

٢- هەست و نەستەكانی دڵ.

٣- دەربڕینەكانی زمان.

٤- كردەوەی ئەندامەكان.

٥)- ﴿وَقَالُواْ لِجُلُودِهِمۡ لِمَ شَهِدتُّمۡ عَلَيۡنَا﴾، بە پێستەكانی خۆیانیان گوت، بۆچی شایەدیتان لەسەردایین؟! لێرەدا جێی پرسیارە كە ئەوان هەم بیستنیان، هەم بینینیان، هەم پێستیان شایەدییان لەسەرداون، بەڵام لێرە تەنیا گلەیی لە پێستەكانیان دەكەن؟ ئەمە دوو وەڵامی هەن:

**یەكەم:** لەبەر ئەوەی پێست گشتگیرەو، هەستی بیستن و دیتن و، هەموو هەستەكانی دیكەش دەگرێتە نێو خۆی.

**دووەم:** لەبەر ئەوەی ئەوان لەو کاتەدا تەنیا پێستیان دەبینن، تاکو ڕووی تێ بکەن و گلەیی لێ بکەن، ئەگەرنا چاوو گوێیان نابینن، مرۆڤ نە چاوی دەبینێ و، نە گوێشی دەبینێ[1]، بەڵکو بە چاو دەبینێ و، بە گوێ دەبیستێ، بەڵام لە پێش چاوی نین تاکو قسەیان لەگەڵ بکات و بیاندوێنێ!.

ئـەوان کـە بـەو شـێوەیە ڕەخنـە دەگـرن و دەڵێـن: بۆچـی شـایەدییمان لەسـەر دەدەن، ئـەی پێسـتەکان؟.

٦)- ﴿قَالُوٓاْ أَنطَقَنَا ٱللَّهُ ٱلَّذِيٓ أَنطَقَ كُلَّ شَيۡءٖ﴾، گوتیان: ئەو خوایە ئێمەی هێنایە قسە، کە هەموو شتێك دێنێتە قسە، واتە: ئەگەر بیەوێ هەر شتێك قسە بکات، دەیهێنێتە گۆ کە قسە بکات.

٧)- ﴿وَهُوَ خَلَقَكُمۡ أَوَّلَ مَرَّةٖ﴾، هەر ئەویش یەکەمجار دروستی کردوون.

٨)- ﴿وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ﴾، هەر بۆ لای ویش دەگێڕدرێنەوە.

ئایا ئەو قسەکردن و دواندنەی پێست و گوێ و چاو، لە ڕۆژی دواییدا چۆنە؟

هەندێـك لـە توێـژەرەوان ویسـتوویانە بیعەقڵێنـن و، بـە شـێوەیەکی لـێ بکـەن بچێتـە عەقڵـی کەسـانێکەوە کـە نکووڵیـی دەکـەن، یاخـود پێیـان زەحمەتـە دەسـت و چـاو گـوێ قسـە بکـەن!، بـەڵام لـە ڕاسـتییدا ئـەوە قسـەیەکی بـێ پاسـاوە، چونکـە ئـەو هێنانـە گۆیـە، لـە یاسـا دڕەکانـی خوایـە کـە لـە ڕۆژی دواییـدا زۆر یاسـادڕی دیکـەو، زۆر شـتی دیکـە کـە بـۆ ئێسـتامان زانراونیـن و، بـە پێودانگـی ئێمـە شـتی نابـاون و نەزانـراون، لـەوێ پەیـدا دەبـن، وەك لـە سـوورەتی (**الطَّارِق**)دا خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿يَوۡمَ تُبۡلَى ٱلسَّرَآئِرُ ٩﴾، واتـە: ئـەو ڕۆژە کـە نهێنییـەکان ئاشـکرا دەبـن، هەروەهـا لـە سـوورەتی (**الزُّمَـر**)دا دەفەرمـوێ: ﴿وَبَدَا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مَا لَمۡ يَكُونُواْ يَحۡتَسِبُونَ ٤٧﴾، واتـە: لەلایـەن خـواوە شـتێکیان بـۆ دەرکـەوت کـە حیسـابیان بـۆ نەکـرد بـوو و، گومانیـان بـۆی نەدەچـوو.

---

(١) مەگەر لە ئاوێنەدا.

لێرەدا کە پێستەکان ئاوا وەڵام دەدەنەوە، ئەوە پۆزش هێنانەوەیە، لەلایەن پێست و چاو و گوێ و ئەندامەکانەوە، کە ئەو هێنانە گۆیە، بە ویستی خۆیان نەبووەو، بەبێ ویستی خۆیان و بە ناچاریی هێنراونە قسەو، خوا ﷻ ئەو حاڵەتەی بەسەردا هێناون.

کە دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ خَلَقَكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾، خوا یەکەمجار ئێوەی هێنایە دی و، هەر بۆ لای ئەویش دەگێڕدرێنەوە، ئەمە دەگونجێ تەواوکەری قسەی ئەندامەکان بێ، واتە: پێست و چاوو گوێ، دەشگونجێ ڕستەیەك بێ خوای موتەعال نێواخنی ئەو قسانەی ئەوانی کردبێ، نەك لە ڕۆژی دواییدا ئەو قسانە هەموویان بکەن.

٩)- ﴿وَمَا كُنتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَن يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ وَلَآ أَبْصَٰرُكُمْ وَلَا جُلُودُكُمْ﴾، ئێوەش خۆتان پەنهان نەدەکرد لە ترسی ئەوەی بیستنتان و چاوەکانتان و پێستەکانتان شایەدییتان لەسەر بدەن، لەبەر ئەوە خۆتان نەدەشاردەوە کە ئەندامەکانتان شایەدییتان لەسەر بدەن، ئەمەش هەر قسەی خوایەو نێواخن کراوە، یاخود: ئەوە هەر قسەی پێست و چاو و گوێیەکانە، (أي: **مَا كُنتُمْ تُخْفُونَ أعْمَالَكُم أن تَشْهَدُ بِهَا عَلَيْكُم جَوارِحِكُم، بَلْ كُنْتُمْ تَجْهَرُونَ وتَفْخَرُونَ بِهَا**) واتە: ئێوە لە دنیادا خۆتان پەنهان نەدەکرد، لە ترسی ئەوەی بیستن و چاوەکان و پێستەکانتان شایەدییتان لەسەر بدەن، (واتە: کردەوەکانتان لە دنیادا نەدەشاردنەوە)، بەڵکو شانازییتان پێوە دەکردن و، کردەوەکانتان بە ئاشکرا ئەنجام دەدان.

١٠)- ﴿وَلَٰكِن ظَنَنتُمْ أَنَّ ٱللَّهَ لَا يَعْلَمُ كَثِيرًا مِّمَّا تَعْمَلُونَ﴾، بەڵام گومانتان وابوو کە خوا زۆرێك لەوەی دەیکەن، نایزانێ، (**وَلَكِنَّ اسِتِتَارَكم كَانَ مِنْ أجْلِ اعْتِقَادِكُمْ أنَّ الله لَا يَعْلم الأعْمَال المَخْفِيَّة**) واتە: کە خۆتان پەنهان دەکرد، (لەبەر ئەوەی نەبوو کە مەترسیی ئەوەتان بێ، چاو و گوێ و پێستتان لەسەرتان ببنە شایەد)، بەڵکو لەبەر ئەوە بوو پێتان وابوو: خوا کردەوە پەنهانەکان نازانێ.

١١)- ﴿ وَذَٰلِكُمْ ظَنُّكُمُ ٱلَّذِى ظَنَنتُم بِرَبِّكُمْ أَرْدَىٰكُمْ ﴾، ئا ئەو گومانەشتان بوو، کە گومانتان بە پەروەردگارتان برد، فەوتاندنی.

﴿ أَرْدَىٰكُمْ ﴾، یانی: (أَهْلَكَكُمْ)، ئەو گومانە خراپەتان بوو بەرانبەر بە پەروەردگار، کە فەوتاندنی، چونکە (رَدِيَ أَي: هَلَكَ، مِثْلُ رَضِيَ، وَالإرْداءُ الإهْلاك)، (رَدِيَ)، واتە: (هَلَكَ)، فەوتا، وەك (رَضِيَ) واتە: ڕازیبوو، (الإرْداءُ: الإهْلاكُ)، (إرداء) فەوتاندن، ئا ئەو گومانەتان بوو کە فەوتاندنی.

١٢)- ﴿ فَأَصْبَحْتُم مِّنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴾، ئێستا لە زیانباران بوون، واتە: وەك بازرگانێکتان لێ بەسەرهات، کە دەستخەڕۆ و زیانبار دەبێ، نەك هەر قازانج ناکات، بەڵکو دەستمایەکەشی دەفەوتێ.

١٣)- ﴿ فَإِن يَصْبِرُوا۟ فَٱلنَّارُ مَثْوًى لَّهُمْ ﴾، ئنجا ئەگەر خۆڕابگرن لە ئاگردا، شوێنیان هەر ئاگرە، واتە: ئەگەر خۆڕابگرن، یان خۆڕانەگرن، تازە شوێنیان هەر ئاگرە، (أي: حَاصِلُ أَمْرِهِمْ أَنَّهُم قَدْ زُجَّ بِهِمْ فِي النَّارِ، فَإِنْ صَبَرُوا واسْتَسْلَمُوا، فَهُم باقُونَ فِي النَّارِ، وَإِنِ اعْتَذَرُوا لَمْ يَنْفَعْهُمُ العُذْرُ، ولَمْ يُقْبَلْ مِنْهُم تَنَصُّلٌ)، واتە: سەرەنجامی کارەکەیان ئەوەیە کە ئێستا خراونە نێو ئاگرەوە، ئنجا ئەگەر خۆڕابگرن و ملکەچ بن، ئەوە هەر لە نێو ئاگردا دەمێننەوەو، ئەگەر پۆزشیش بهێننەوە، خۆ دزینەوەیان لێ وەرناگیرێ.

١٤)- ﴿ وَإِن يَسْتَعْتِبُوا۟ فَمَا هُم مِّنَ ٱلْمُعْتَبِينَ ﴾، ئەگەر داوا بکەن گلەیی لەسەر خۆشیان لابەرن، (واتە: پۆزش بهێننەوەو، داوای لێبوردن بکەن)، وەڵامی ئەوەیان نادرێتەوەو، لە گلەیی لەسەر لابراوان نابن، شایانی باسە: لێرەدا شایەتییدانی چاو و گوێ و پێستەکان و، ئەندامەکانی دیکەش لەسەر مرۆڤە بێبڕواو تاوانبارەکان لە دۆزەخدا، ئەو شایەدییدانە بۆ حوکمدان نیە، بەڵکو بۆ سەرزەنشت و سەرکۆنەکردنە، ئەگەرنا پێشتر حوکم و بڕیاریان بەسەردا دراوەو، چوونەتە نێو ئاگری دۆزەخ، واتە: لە نێو ئاگری دۆزەخدان و پێشتر بڕیاردراوە، بەڵام ئەو ئەندامەیان کە شایەدییان لەسەر دەدەن، ڕەنگە لە نێو دۆزەخدا خۆیان بە مەغدوور بزانن، یان پرتەو بۆڵە بکەن، کە چۆن وا

بڕیاریان لەسەر درا، خواش ﷻ بۆ بێ دەنگ کردنیان، ئەندامەکانیان دێنێتە گۆ، تاکو بواری پرتەو بۆڵەیان نەمێنێ، چونکە وەك گوتراوە: (الغَرِيقُ يَتَشَبَّثُ بِكُلِّ حَشِيش)، واتە: بابای خنکاو دەست بۆ چڵە پووشیش درێژ دەکات، ئەوانیش لە وێدا بەتەئکید دەکەونە درۆو دەلەسەو پاساو هێنانەوە، بەڵام خوا ﷻ دوای ئەوەی ئەندامەکانی خۆیانیان لەسەر دەکاتە شایەد، دەرفەتی ئەو قسەیان نامێنێ، وەك دوایی لە فەرمایشتێکی پێغەمبەردا ﷺ دەیهێنین.

## کورتە باسێک لە بارەی
## شایەدیی لەسەر درانی مرۆڤەوە لە قیامەت دا

لـە ڕۆژی دوایـی دا ئەوانـەی شـایەتیی دەدەن لەسـەر مـرۆڤ، ئەگـەر تەماشـای قورئـان بکەیـن، بـەلای کەمـەوە حـەوت جـۆرە شـایەد هـەن، شـایەدیی دەدەن لەسـەر مـرۆڤ، کـە ئـەو کـردەوە خراپانـەی ئەنجامـداون:

### یەکەم: خوای بەرزی مەزن:

وەك لـە سـوورەتی (یونـس) لـە ئایەتـی (٦١)دا، خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَا تَكُونُ فِي شَأْنٍ وَمَا تَتْلُواْ مِنْهُ مِن قُرْءَانٍ وَلَا تَعْمَلُونَ مِنْ عَمَلٍ إِلَّا كُنَّا عَلَيْكُمْ شُهُودًا إِذْ تُفِيضُونَ فِيهِ وَمَا يَعْزُبُ عَن رَّبِّكَ مِن مِّثْقَالِ ذَرَّةٍ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا فِي ٱلسَّمَآءِ وَلَآ أَصْغَرَ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْبَرَ إِلَّا فِي كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ﴿٦١﴾ ﴾، واتـە: تـۆ لـە هیـچ حاڵێکـدا نابـی و، هیـچ کات هیـچ قورئانێـك ناخوێنـی و، هیـچ کردەوەیـەك ناکـەی، مەگـەر ئێمـە بەسـەرتانەوە چاودێریـن، کاتێـك دەچنـە نێـو ئـەو کارەوەو، لـە پـەروەردگارت پەنهـان نیـە، بـە ئەنـدازەی گرانایـی گەردێـك نـە لـە ئاسـمان و، نـە لـە زەویـدا، نـە لـەوە گچکەتـرو، نـە لـەوە گەورەتریـش، هەمـووی سـەرژمێرکراوە لـە کتێبێکـی ڕوونـدا، (کـە مەبەسـت پێـی زانیاریـی ڕەهـاو بـێ سـنووری خوایـە).

کەواتـە: یەکـەم لـە شـایەدەکان خوایـە، خـوا ﷻ لـە زۆر شـوێناندا دەفەرمـوێ: ﴿ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا ﴾، واتـە: خـواش بەسـە شـایەد بێـت.

### دووەم: پێغەمبەران (عَلَيهم الصَّلاَةُ وَالسَّلام):

وەك لـە سـوورەتی (النِّسَـاء) لـە ئایەتـی (٤١)دا، خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدًا ﴿٤١﴾ يَوْمَئِذٍ يَوَدُّ

﴿ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَعَصَوُاْ ٱلرَّسُولَ لَوْ تُسَوَّىٰ بِهِمُ ٱلْأَرْضُ وَلَا يَكْتُمُونَ ٱللَّهَ حَدِيثًا ﴿٤٢﴾ ﴾، واتـە: چـۆن دەبـێ کاتێـك کـە بـۆ هـەر کۆمەڵێـك شـایەدێك دێنیـن و، تۆشـمان وەك شـایەد هێنـا بەسـەر ئەمانـەوە، (واتـە: بەسـەر کافرەکانـی ئۆممەتـی خۆتـەوە)! لـەو ڕۆژەدا ئەوانـەی بێبـڕوان، خۆزگـە دەخـوازن کـە لەگـەڵ زەوی تەخـت بـن و، یەکسـان بـن، (واتـە: زینـدوو نەبنـەوە)، هیـچ قسـەیەکیش لـە خـوای پـەروەردگار پەنهـان ناکـەن.

هەروەهـا لـە سـوورەتی (النَّحل)یشـدا، خـوا ﷻ دیسـان باسـی شـایەدییدانی پێغەمبـەران بـە گشـتیی و، پێغەمبـەری خاتـەم لەسـەر ئۆممەتەکـەی بەتایبـەت دەکات و دەفەرمـوێ: ﴿ وَيَوْمَ نَبْعَثُ فِي كُلِّ أُمَّةٍ شَهِيدًا عَلَيْهِم مِّنْ أَنفُسِهِمْ وَجِئْنَا بِكَ شَهِيدًا عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ تِبْيَٰنًا لِّكُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ ﴿٨٩﴾ ﴾، واتـە: ئـەو ڕۆژە کـە لـە هـەر کۆمەڵێـك شـایەتێك دێنیـن، بەسـەریانەوە لـە خۆیـان و، تۆشـمان هێنـا بە شـایەت لەسـەر ئەوانـە، (ئـەو بێبڕوایانەی ئۆممەتـی خـۆت، چ لـە ڕۆژگاری خۆیـداو، چ لـە ڕۆژگاری دوای خـۆی دا)، کتێبیشـمان دابەزاندۆتـە سـەر تـۆ، ڕوونکـەرەوەی هـەر شـتێکە (کـە پێویسـت بـکات، وەحیـی خـوا ڕوونی بکاتـەوە)و، ڕێنمایـی و بەزەیـی و موژدەیـە بـۆ مسـوڵمانان.

## سێیەم: زمان و، دەست و، پێ و، چـاوو، گوێ:

بـە نسـبەت دەسـت و پـێ و، زمانیـان، لـە سـوورەتی (النُّور)دا، خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ يَوْمَ تَشْهَدُ عَلَيْهِمْ أَلْسِنَتُهُمْ وَأَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم بِمَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾، واتـە: ئـەو ڕۆژە کـە زمانەکانیـان و، دەسـتەکانیان و، پێیەکانیـان، دەبنـە شـایەد بەسـەریانەوە، بـەوەی کـە کردوویانـە.

بـە نسـبەت بیسـتن و، دیـتن و، پێستەکانیشـیانەوە، خـوا لـە سـوورەتی (فُصلَت) دا دەفەرمـوێ: ﴿ شَهِدَ عَلَيْهِمْ سَمْعُهُمْ وَأَبْصَٰرُهُمْ وَجُلُودُهُم بِمَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿٢٠﴾ ﴾، واتـە: بیسـتنیان و چاوەکانیان و پێسـتەکانیان شـایەدییان لەسـەردان بـەوەی دەیانکرد.

### چــوارەم: فریشـــتەکان:

خوا لـە سـوورەتی (ق)دا دەفەرمـوێ: ﴿ وَجَاءَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّعَهَا سَائِقٌ وَشَهِيدٌ ﴿٢١﴾ ﴾، واتـە: هـەر کەسـێك دێ، لێخوڕێـك و، چاودێرێکـی بەسـەرەوەیە، واتـە: هـەم کەسـێك کـە وەپێـش خـۆی دەدات، بـەرەو دۆزەخ، هـەم شـایەدێکیش بەسـەریەوە، کـە بـە دڵنیایـی هەردووکیـان فریشـتەن، هەروەهـا لـە سـوورەتی (الإِنْفِطَار)یشـدا لـەو بـارەوە دەفەرمــوێ: ﴿ وَإِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَافِظِينَ ﴿١٠﴾ كِرَامًا كَاتِبِينَ ﴿١١﴾ يَعْلَمُونَ مَا تَفْعَلُونَ ﴿١٢﴾ ﴾، واتــە: بــە دڵنیایــی ئێــوە چەنــد پارێزەرێکتــان بەســەرەوەن، زۆر بەڕێــزن، نووســەرو تۆمارکـەرن، ئـەوەی دەیکـەن دەیزانـن، (بـۆ ئـەوەی دوایـی لەسـەرتان بینـە شـایەد).

### پێنجەم: زەوی:

وەك خـوا ﷻ لـە سـوورەتی (الزَّلْزَلَـة)دا، دەفەرمـوێ: ﴿ يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا ﴿٤﴾ بِأَنَّ رَبَّكَ أَوْحَىٰ لَهَا ﴿٥﴾ ﴾، واتــە: لــەو ڕۆژەدا زەوی دەنــگ و باســەکانی خـۆی بـاس دەکات، (هـەر کەسـێك چـی کـردوە لەسـەر هـەر پارچـە زەوییـەك، زەوی لەسـەری دەبێتـە شـایەدو بەڵگـە)و، ڕاشـیدەگەیەنێ کـە پـەروەردگاری سروشـی بـۆ کـردوە (کـە بـەو جـۆرە هەواڵەکانـی خـۆی بگێڕێتـەوەو، شـایەدیی خـۆی بـدات).

### شەشەم: ڕۆژگارو زەمان:

وەك لـە فەرمایشـتی پێغەمبـەردا ﷺ هاتـوە، ئەگـەر پاڵوێدرانـی فەرمایشـتەکە بـۆ لای پێغەمبـەر ﷺ ڕاسـتبێ، دەفەرمـوێ: {لَيْسَ مِنْ يَوْمٍ يَأْتِي عَلَى ابْنِ آدَمَ، إِلَّا يُنَادِي فِيهِ: يَا ابْنَ آدَمَ! أَنَا خَلْقٌ جَدِيدٌ، وَأَنَا فِيمَا تَعْمَلُ غَدًا عَلَيْكَ شَهِيدٌ، فَاعْمَلْ فِيَّ خَيْرًا أَشْهَدْ لَكَ بِهِ غَدًا، فَإِنِّي لَوْ قَدْ مَضَيْتُ لَمْ تَرَنِي أَبَدًا، وَيَقُولُ اللَّيْلُ مِثْلَ ذَلِكَ} (أخرجه الديلمي: ٥١٦٢، وأبو نعيم فـي الحلية (٣٠٣/٢)، وضعفه محقق تفسير القرطبي).

واتـە: هیـچ ڕۆژێـك بەسـەر ڕۆڵـەی ئـادەم دا نایـەت، مەگـەر بانگـی دەکات، ئـەی ڕۆڵـەی ئـادەم! مـن دروسـتکراوێکی تـازەم، ئـەوەی تـۆ ئێسـتا دەیکـەی، بەیانـی

دەبمە شایەد بەسەرتەوە، ئنجا کردەوەی باشم تێدا بکە، تاکو بەیانی شایەدیی چاکت بۆ بدەم، چونکە من کە بڕۆم تازە جارێکی دیکە هەرگیز نامبینیەوە، هەروەها شەوگاریش بە هەمان شێوە (هەر شەوێك کە دێ، بانگی مرۆڤ دەکات، هەڵبەتە مەبەست پێی زمانی حاڵە).

کەواتە: ئەمە شەش جۆرە شایەد، بەڵام ئێمە گومان: حەوت، کە دەگونجێ پێست بە جیا بێ، ئەندامەکان وەك دەست و پێ و زمان و چاو و گوێ بەجیا بن، ئەو کاتە دەبن بە حەوت جۆرە شایەد.

پرسیارێك دەکرێ: بۆچی لێرەدا خوا ﷻ ئەو ئەندامانەی تایبەت کردوون، بە شایەدییدانەوە، بە تایبەت لێرە لە سوورەتی (**فُصِّلَت**)دا، واتە: بیستن و چاوەکان و پێستەکان؟ وەڵامەکەی ئەوەیە:

**یەکەم:** ئەوانە ئەو بیستنەیان بەکارنەهێناوە بۆ گوێ بیست بوونی فەرمایشتی خوا ﷻ.

**دووەم:** لەبەر ئەوەی نیشانەکانی خوایان بە چاوەکان نەبینیون.

**سێیەم:** بە پێست و ئەندامەکانیشیان پابەند نەبوون بە شەریعەتی خوای پەروەردگارەوە.

**چوارەم:** بە زمانیشیان هەقیان نەگوتوە.

**پێنجەم:** بە دەستەکانیشیان ئەو کردەوانەیان ئەنجام نەداون، کە جێگای ڕەزامەندیی خوان.

**شەشەم:** بە پێیەکانیشیان بۆ ئەو کارو چالاکییانە نەجووڵاون کە مایەی ڕەزامەندیی خوای پەروەردگارن.

لە بارەی ئەوەوە کە دەفەرموێ: ﴿ وَذَٰلِكُمْ ظَنُّكُمُ ٱلَّذِى ظَنَنتُم بِرَبِّكُمْ أَرْدَىٰكُمْ فَأَصْبَحْتُم مِّنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٢٣﴾ ﴾، ئەوە ئەو گومانەتان بوو کە بەرانبەر بە پەروەردگارتان هەتانبوو و، سەرەنجام ئەو گومانەتان فەوتاندنی و، لە زیانباران بوون.

پێغەمبەر ﷺ لە بارەی گومانی چاك بە خوا بردنەوە فەرموویەتی: {لَا يَمُوتَنَّ أَحَدُكُمْ إِلَّا وَهُوَ يُحْسِنُ الظَّنَّ بِاللَّهِ، فَإِنَّ قَوْمًا أَسَاءُوا الظَّنَّ بِرَبِّهِمْ فَأَهْلَكَهُمْ، فَذَلِكَ قَوْلُهُ: ﴿وَذَٰلِكُمْ ظَنُّكُمُ ٱلَّذِى ظَنَنتُم بِرَبِّكُمْ أَرْدَىٰكُمْ فَأَصْبَحْتُم مِّنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ ﴿٢٣﴾﴾}، (أخرجه مسلم: ٢٨٧٧، والطيالسي: ١٧٧٩، وأبو داود: ٣١١٣، وابن ماجه: ٤١٦٧، ابن حبان: ٦٣٦، ٦٣٧)، واتە: با هیچ کام لە ئێوە نەمرێ، مەگەر لە حاڵێك دا کە گومانی چاك بە خوا دەبات، چونکە کۆمەڵێك گومان خراپیان بە خوا بردو ئەویش فەوتاندنی، خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿وَذَٰلِكُمْ ظَنُّكُمُ ٱلَّذِى ظَنَنتُم بِرَبِّكُمْ أَرْدَىٰكُمْ فَأَصْبَحْتُم مِّنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ ﴿٢٣﴾﴾.

ئەو ڕستەیەی دەفەرموێ: ﴿وَإِن يَسْتَعْتِبُوا۟ فَمَا هُم مِّنَ ٱلْمُعْتَبِينَ ﴿٢٤﴾﴾:

زانایان زۆر قسەیان لەسەر کردوە، چونکە ئەم جۆرە دەربڕینە دەربڕینێکی تۆزێ دەگمەنە، هەرچەندە چەند جارێك لە قورئاندا هاتوە، لە تەفسیری سوورەتی (**النَّحل**)یشدا قسەمان لەبارەوە کردوە، هەروەها لە تەفسیری سوورەتی (**لُقْمان**)یشدا هەر قسەمان لەبارەوە کردوە، ﴿وَإِن يَسْتَعْتِبُوا۟﴾، (**إِنْ يَسْأَلُوا العُتْبى وهي رُجُوعُ المَعْتُوبِ عَلَيْهِ إلى ما يُرْضِي العاتِبَ لَمْ يُعْطَوا حَقَّ رَفْعِ عِتَابٍ عليْهِمْ وَاعْتِذَار**)، واتە: ئەگەر داوای (**عُتْبى**) بکەن، کە بریتیە لە گەڕانەوەی بابای سەرزەنشتکراو بۆ حاڵەتێك کە بابای سەرزەنشتکەر لێی ڕازیبێ، داواکارییەکەیان جێبەجێ ناکرێ و، مافی لابردنی لۆمە لەسەر خۆیانیان پێ نادرێ و، مافی پۆزش هێنانەوەو پاساو هێنانەوەیان پێ نادرێ.

﴿وَإِن يَسْتَعْتِبُوا۟﴾، خوێنراویشەتەوە: (**وَإِنْ يُسْتَعْتَبُوا**)، ئەگەر داوایان لێ بکرێ گلەیی لەسەر خۆیان لابەرن، هەروەها ﴿فَمَا هُم مِّنَ ٱلْمُعْتَبِينَ ﴿٢٤﴾﴾، لەوانە نین کە گلەییان لەسەر لابچێ، خوێنراویشەتەوە: (**فَمَا هُمْ مِنَ المُعْتِبِينَ**)، لەو کەسانە نابن کە گلەیی لەسەر خۆیان لابەرن، حەسەنی بەصرایی و، ئەبو عوبەیدو، ئەبولعالیە، وایان خوێندۆتەوە، (**أَي: إِنْ أَقَالَهُمُ اللهُ وَرَدَّهُمْ إِلى الدُّنْيَا لَمْ**

يَعْمَلُوا بِطَاعَتِهِ كَمَا قَالَ تَعَالى: ﴿ وَلَوْ رُدُّوا لَعَادُوا لِمَا نُهُوا عَنْهُ وَإِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴿٢٨﴾ ﴾، واتـە: ئەگـەر خـوا ﷻ داواکەشـیان بگرێتـەوەو، بیانگێڕێتـەوە بـۆ ژیانـی دنیـا، لەوێـش دیسـان فەرمانبەریـی خـوا ناکـەن و، گلەیـی خـوا لەسـەر خۆیـان لانابـەن، وەك خـوای بـەرز فەرموویـەتی: ئەگـەر بشـگێڕرێنەوە جارێـکی دیکـە دەگەڕێنـەوە سـەر ئـەوەی لێـی قەدەغـە کـراون و ئـەوان درۆزنـن.

لـەو بـارەوە ئـەو فەرموودەیـەی پێغەمبـەر ﷺ دێنیـن، کـە چـۆن ئەندامـەکان شـایەدیی لەسـەر مـرۆڤ دەدەن، کـە دەفەرمـوێ: {عَـنْ أَنَـسِ بْـنِ مَالِـكٍ ﷺ، قَـالَ: كُنَّا عِنْدَ رَسُولِ اللهِ ﷺ فَضَحِكَ، فَقَالَ: «هَلْ تَدْرُونَ مِمَّ أَضْحَكُ؟» قَالَ قُلْنَا: اَللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: مِنْ مُخَاطَبَةِ الْعَبْدِ رَبَّهُ، يَقُولُ: يَا رَبِّ أَلَمْ تُجِرْنِي مِنَ الظُّلْمِ؟ قَالَ: يَقُولُ: بَلَى، قَالَ: فَيَقُولُ: فَإِنِّي لَا أُجِيزُ عَلَى نَفْسِي إِلَّا شَاهِدًا مِنِّي، قَالَ: فَيَقُولُ: كَفَى بِنَفْسِكَ الْيَوْمَ عَلَيْكَ شَهِيدًا، وَبِالْكِرَامِ الْكَاتِبِينَ شُهُودًا، قَالَ: فَيُخْتَمُ عَلَى فِيهِ، فَيُقَالُ لِأَرْكَانِهِ: انْطِقِي، قَالَ: فَتَنْطِقُ بِأَعْمَالِهِ، قَالَ: ثُمَّ يُخَلَّى بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْكَلَامِ، قَالَ فَيَقُولُ: بُعْدًا لَكُنَّ وَسُحْقًا، فَعَنْكُنَّ كُنْتُ أُنَاضِلُ} (أخرجه مسلم: ٢٩٦٩).

واتـە: ئەنەسـی کـوڕی مالیـك ﷺ، دەڵـێ: ئێمـە لـە خزمـەت پێغەمبـەری خـوا ﷺ بوویـن، پێکەنیـی، (زەردەخەنەیەکـی هاتـێ)، دوایـی فەرمـووی: دەزانـن بەچـی پێدەکەنـم؟ گوتمـان: خـواو پێغەمبەرەکـەی زاناتـرن، فەرمـووی: بـەوە پێدەکەنـم کـە بەنـدە پـەروەردگاری دەدوێنـێ (لـە ڕۆژی دواییـدا)، دەڵـێ: ئـەی پـەروەردگارم! ئـەدی تـۆ منـت پەنـا نـەدا لـە ستەم، کە ستەمم لـێ نەکـەی، فەرمـووی: خـواش دەفەرموێ: بـا، فەرمـووی: ئەویـش دەڵـێ: مـن ڕێـگا نـادەم هیـچ کـەس بەسـەرمەوە بەڵگـە بـێ مەگـەر لـە خـۆم، فەرمـووی: خـواش دەفەرمـوێ: باشـە، ئەمـڕۆ هـەر خـۆت بەسـەر خۆتـەوە شـایەدبەو، فریشـتە بەڕێـزە تۆمارکـەرەکان بـا بەسـەرتەوە شـایەتبن، ئنجـا مـۆری بەسـەر دڵ وەدەنـرێ، (واتـە: زاری قەپـات دەبـێ و، قسـەی بـۆ ناکـرێ و)، فەرمـان دەکـرێ بـە ئەندامەکانـی قسـە بکـەن، دێنـە گـۆو، شـایەدیی کردەوەکانـی لەسـەر دەدەن، دوای ئـەوەی ئەندامـەکان شـایەدییەکەیان تـەواو دەکـەن، ئنجـا

دووبارە جارێکی دیکە بواری دەدرێ بە زمانی قسە بکات، ئێجا ئەویش ڕوو دەکاتە ئەندامەکانی و، دەڵێ: دووریی بۆ ئێوەو، سزا بۆ ئێوە، من بەرگریم لە ئێوە دەکرد، ئەوانیش وەك لە ئایەتەکەدا هاتووە دەڵێن: ﴿أَنطَقَنَا ٱللَّهُ ٱلَّذِيٓ أَنطَقَ كُلَّ شَيۡءٖ﴾ ئەو خوایە ئێمەی هێناوەتە گۆ، کە هەموو شتێك ئەگەر بیەوێ دەیهێنێتە گۆ.

## مەسەلەی دووەم:

**سازکرانی هاونشینانی خراپ بۆ بێبڕوایان، کە کوفرو خراپەو تاوانیان بۆ بڕازێننەوەو، سەرەنجام بڕیاری دادگەرانەی خوایان لەسەر بچەسپێ، لە میانی کۆمەڵانێکی ڕابردوو لە جندو مرۆڤی زیانباردا، بەوەی کە دەچنە نێو ئاگری دۆزەخەوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَقَيَّضْنَا لَهُمْ قُرَنَاءَ فَزَيَّنُوا لَهُم مَّا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَحَقَّ عَلَيْهِمُ الْقَوْلُ فِي أُمَمٍ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِم مِّنَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ إِنَّهُمْ كَانُوا خَاسِرِينَ ﴿٢٥﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ وَقَيَّضْنَا لَهُمْ قُرَنَاءَ ﴾، چەند هاونشینێکمان بۆیان ئامادە کردن، (**قَيَّضْنَا أي: هَيَّئْنَا لِهؤُلاءِ الكُفَّار**)، بۆ ئەو بێبڕوایانە ئامادەمان کرد، چی بۆ ئامادە کردن؟ ﴿ قُرَنَاءَ ﴾، ﴿ قُرَنَاءَ ﴾، کۆی (**قَرِين**)ە، (**قَرِين**) بریتیە لە (**الصَّاحِبُ المُلازِمُ**) هاوەڵێکە لە مرۆڤ جیانابێتەوەو هەمیشە لەگەڵیدایە، بە کوردیی: هاونشین، ئنجا ئایا ئەو هاونشین و هاودەم و هاوەڵانە چین؟ زۆربەی توێژەرەوان گوتوویانە: شەیتانەکانن، (**القُرَنَاءُ: شَيَاطِين يُلازِمُونَهُمْ**)، شەیتانە هاونشینەکانن کە هەمیشە لەگەڵیاندان.

(**الطبري**) لەو بارەوە لە تەفسیرەکەی خۆیدا، دەڵێ: (**وَبَعَثْنَا لَهُمْ نُظَرَاء مِنَ الشَّيَاطِينِ، فَجَعَلْنَاهُمْ لَهُمْ قُرَنَاء قَرَنَّاهُمْ بِهِمْ، يُزَيِّنُونَ لَهُمْ قَبَائِحَ أَعْمَالِهِمْ**)[1]، واتە: ناردمانە سەریان چەند هاوتاو هاوشێوەیەك لە شەیتانەکان و، ئەوانمان کردە هاونشینیان، لەگەڵیاندا جووتمان کردن کە هەمیشە پێکەوەبن، کردەوە خراپەکانیان بۆ دەڕازێننەوە.

---

(١) جامع البيان: ج٢٤، ص:١١٠.

ئنجا ئـەو هاونشـینە شـەیتانانە، کـە وەك گوتـم زۆربـەی توێـژەرەوان دەڵێـن: لـە جنـدن، بـەڵام دەگونجـێ مرۆڤیـش بـن، وەك لە سـوورەتی (**النَّاس**)دا خـوا دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِى يُوَسۡوِسُ فِى صُدُورِ ٱلنَّاسِ ۝٥ مِنَ ٱلۡجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ ۝٦ ﴾، واتـە: ئـەوەی خوتخوتـە دەخاتـە سـینەی خەڵکـەوە، لـە جنـدو لـە مـرۆڤ.

هەروەهـا لـە شـوێنی دیکـەدا خـوای پـەروەردگار دەفەرمـوێ: ﴿ شَيَـٰطِينَ ٱلۡإِنسِ وَٱلۡجِنِّ ﴾، واتـە: شـەیتانەکانی مـرۆڤ و جنـد.

ئنجا ئایا ئەو هاونشینانە چی دەکەن؟

٢)- ﴿ فَزَيَّنُواْ لَهُم مَّا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡ ﴾، ئەوەی لە پێش دەستیانەوەیەو، ئەوەی لە دوایانەوەیە بۆیان ڕازاندنەوە، ئەوەی لە پێش دەستیانەوەیەو، ئەوەی لە دوایانەوەیە، زانایان زۆر قسەیان لە بارەوە کردووە، بەڵام دوو واتا زیاتر بە دڵەوە دەچەسپێن:

**یەکەم:** ﴿ مَّا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡ ﴾، واتە: هەرچی گوناهو تاوانە، لە پێشیان و لە دوایان، یان لە دەوروبەریان، بۆیان دەڕازێننەوە، بەڵام بۆیە ئەو دوو لایەی باسکردوون، چونکە ڕاست و چەپ و، سەرو خواریش دەگرنە نێو خۆیان، کە من ئەو واتایەم زیاتر بە دڵە، واتە: هەرچی گوناح و تاوانە، بکەوێتە لای پێشێیان یان لای دواییان بۆیان دەڕازێننەوە.

**دووەم:** ﴿ مَّا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ ﴾، واتە: لە کاروباری دنیا (**مِنْ أَمْرِ الدُّنْيَا**)، ﴿ وَمَا خَلۡفَهُمۡ ﴾، واتە: لە کاروباری ڕۆژی دوایی (**مِنْ أَمْرِ الأَخِرَة**)، کاروباری دنیایان بۆ جوان دەکەن و، بۆیان دەڕازێننەوە: چۆن پێتان خۆشە وا بکەن، نە لێپرسینەوە هەیە، نە سزاو پاداشت هەیە، نە حەڵاڵ و حەرام، هیچ واتایەکیان هەیە، چۆن چێژ وەردەگرن و، چۆن لە ڕووی دنیاییەوە قازانج دەکەن و، بەهرەی ماددیی وەردەگرن، وابکەن.

بـە نسـبەت پشـتیانەوەش، واتـە: بـە نسـبەت ئـەو کاتـەوەش کـە دێ، کـە ڕۆژی دواییـە، ئەویشـیان وا بـۆ دەڕازێننـەوە کـە نـە زیندووکرانـەوە هەیـە، نـە سـزاو

پاداشت هەیە، ئەویشیان ئاوا بۆ دەڕازێننەوە، کە ترسی ڕۆژی دواییان نەبێ، کە لە پشتیانەوەیە.

٣)- ﴿وَحَقَّ عَلَيۡهِمُ ٱلۡقَوۡلُ﴾، فەرمایشتیان لەسەر هاتە دی، واتە: بڕیاری خوا ﷻ لەسەریان چەسپا، کە خوا فەرموویەتی: بە پێی سیستم (نظام)ێك کە دایناوە، هەر کەسێك ئاوا بکات و ئاوا بژی، سەرەنجامی بەو شێوەیە دەبێ، ئەو بڕیارەیان لەسەر چەسپا.

٤)- ﴿فِيٓ أُمَمٖ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِهِم مِّنَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ﴾، لە نێو کۆمەڵانێکدا کە تێپەڕیون لە پێش واندا، لە جند و لە مرۆڤ، واتە: هەر خۆیان نین و ئەوانیش چوونە نێو ئەو کۆمەڵ و تاقمە بێبڕوایانەوە لە جندو مرۆڤ، کە لە پێش واندا تێپەڕیون و بڕیاری سزادرانیان بەسەردا چەسپیوە.

٥)- ﴿إِنَّهُمۡ كَانُواْ خَٰسِرِينَ﴾، بە دڵنیایی ئەوان زیانبار بوون، (الطبري) لەو بارەوە دەڵێ: (إِنَّ تِلْكَ الْأُمَمَ الَّذِينَ حَقَّ عَلَيْهِمْ عَذَابُنَا مِنَ الْجِنِّ وَالْإِنْسِ، كَانُوا مَغْبُونِينَ بِبَيْعِهِمْ رِضَا اللَّهِ وَرَحْمَتِهِ بِسَخَطِهِ وَعَذَابِهِ)، واتە: ئەو کۆمەڵانە کە ئازارو سزادانی ئێمەیان لەسەر چەسپیوە، لە جند و لە مرۆڤ، زیانبار بوون، بەوە کە ڕەزامەندیی خواو، بەزەیی خوایان فرۆشت و لە بەرانبەردا تووڕەیی و سزای پەروەردگاریان وەرگرت.

## مەسەلەی سێیەم:

**بێبڕوایان وەك نەخشەو پیلانێکی گڵاو، گوتیان: گوێ بۆ قورئان مەگرن، واتە: بێبڕوایانی قسە ڕۆیشتوو، بە شوێنکەوتووەکانی خۆیانیان گوت: گوێ بۆ قورئان مەگرن و، قسەی پووچ و غەڵبە غەڵب لە کاتی خوێندنی قورئان دا بکەن، بەڵکو بەسەریدا زاڵبن، خواش هەڕەشەی سزاو ئازارێکی سەختی لێکردوون، وەك تۆڵەیەك لە دوژمنانی نکوولیکەر لە خواو نیشانەکانی:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَا تَسْمَعُواْ لِهَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ وَٱلْغَوْاْ فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَغْلِبُونَ ﴿٢٦﴾ فَلَنُذِيقَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ عَذَابًا شَدِيدًا وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَسْوَأَ ٱلَّذِي كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿٢٧﴾ ذَٰلِكَ جَزَآءُ أَعْدَآءِ ٱللَّهِ ٱلنَّارُ لَهُمْ فِيهَا دَارُ ٱلْخُلْدِ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يَجْحَدُونَ ﴿٢٨﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:

١)- ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴾، ئەوانەی بێبڕوابوون، گوتیان: ئەوانەی بێبڕوابوون بە دڵنیایی مەبەست پێی سەرکردەکان و حوکمڕان و قسە ڕۆیشتووەکانە، چونکە ئەوان توانای فەرمان پێکردن و، ڕێ لێگرتنیان هەبووەو، ئەوان بە خەڵکە ڕەش و ڕووت و هەڵخەڵەتاو و گوێ لە مستەکانی خۆیانیان گوتوە: وابکەن و، وامەکەن.

ئایا چییان گوت؟

٢)- ﴿ لَا تَسْمَعُواْ لِهَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ وَٱلْغَوْاْ فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَغْلِبُونَ ﴾، گوێ بۆ ئەم قورئانە مەگرن و، قسەی پووچی تێدا بکەن، بەڵکو بەسەریدا زاڵبن، کەواتە: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴾، ئەوە لە تەفسیرەکاندا نەمبینیوە، بەڵام بە تەئکید بە سیاق و سەلیقە دیارە، کە مەبەست پێی کافرانی ئاسایی نیە کە لە نێو خۆیاندا، وایان گوتبێ، بەڵکو کافرە دەست ڕۆیشتوو و، قسە ڕۆیشتووەکان و، حوکمڕان و باڵادەستەکان بە شوێنکەوتووەکانی خۆیانیان گوت: گوێ بۆ ئەم قورئانە مەگرن، زانیویانە کە ئەگەر گوێی بۆ بگرن و گوێی بۆ

هەڵبخەن، پێی کارتێکراو دەبن، ﴿وَٱلۡغَوۡاْ فِيهِ﴾، قسەی پووچی تێدا بکەن، ﴿لَعَلَّكُمۡ تَغۡلِبُونَ ٢٦﴾، بەڵکو بەسەریدا زاڵبن، ﴿لَا تَسۡمَعُواْ لِهَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ﴾، کە: ﴿تَسۡمَعُواْ﴾، بەرکاری خواستوە بە هۆی لامەوە، دەنا دەیتوانی بفەرموێ: (**لا تَسْمَعُوا هَذَا القُرآنَ**)، گوێ بۆ ئەم قورئانە مەگرن، بەڵام کە دەفەرموێ: ﴿لَا تَسۡمَعُواْ لِهَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ﴾، (**عُدِّي «لا تَسْمَعُوا» بـ «لـ»، لِتَضْمِينِهِ مَعْنَى الإِطْمِئْنَانِ والرُّكُونْ**)، بۆیە: ﴿تَسۡمَعُواْ﴾، بە (لـ) بەرکاری خواستوە، تاکو مانای مەیل بەلادا کردن و پێ ئارام بوون، بخرێتە نێو وشەی: ﴿لَا تَسۡمَعُواْ﴾، یانی: (**لا تَسْمَعُوا لِهَذَا القُرآنِ، ولا تَطْمَئِنُّوا إِلَيْهِ، ولا تَرْكَنُوا إِلَيْهِ**)، گوێ بۆ ئەم قورئانە مەگرن و پێی مەسرەون و بەلایدا مەچن، ﴿وَٱلۡغَوۡاْ فِيهِ﴾، قسەی پووچی تێدا بکەن.

هەڵبەتە کە گوتوویانە: ﴿لَا تَسۡمَعُواْ لِهَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ﴾، ئەمە لەسەر زمانی مسوڵمانان گوتوویانە، ئەگەرنا ئەوان بڕوایان بەوە نەبووە ئەوە ناوی قورئانەو، خوا دایبەزاندوە، واتە: ئەوەی مسوڵمانان پێی دەڵێن قورئان و، پێیان وایە لەلایەن خواوە بەسەر پێغەمبەرەکەی (موحەممەد) ﷺدا خوێنراوەتەوە، گوێ بۆ ئەوە مەگرن، وشەی (**لَغْو**)، وەك پێشتر باسمانکردوە، (**القَولُ الَّذِي لا فَائِدَةَ مِنْهُ**)، ئەو قسەیەی کە سوودی نەبێ، وەك گوتمان لە (**لَغَا**)وە هاتوە، کە دەنگی پاساریی و جریوە جریوی چۆلەکەو باڵندەیەو بۆ ئێمە بێ سوودە، چونکە تێی ناگەین، بەڵام بە تەئکید بۆ خۆیان سوود بەخشەو، لێی حاڵی دەبن، بولبولێك کە دەجریوێنێ، یان کەوێك کە دەقاسپێنێ، یان کۆترێك کە دەگمێنێ، هەروەها مریشك کە کورکە کورك دەکات و، کەڵەباب کە دەقووقێنێ و، باڵندەکانی دیکە، ئەو دەنگ و سەدایەی خۆیان بۆ خۆیان سوود بەخشە.

ئنجا کە گوتوویانە: ﴿وَٱلۡغَوۡاْ فِيهِ﴾، ئەمە دوو واتایان دەگەیەنێ:

**یەکەم:** قسەیەکی تێدا بکەن سوودی نەبێ، واتە: قسەی پووچ و گاڵتەو جەفەنگ بکەن و، دەنگ بەرز بکەنەوە لە کاتێکدا قورئان دەخوێنرێتەوە.

**دووەم:** دەنگە دەنگ و غەڵبەغەڵبێك بکەن، کە دەنگی قورئان خوێنەکە داپۆشێت، ئنجا ئەگەر پێغەمبەرە ﷺ یان یەکێك لە هاوەڵانە، یانی: دەنگ هەڵێنن و، غەڵبە غەڵبێك بکەن، کە دەنگی پێغەمبەر ﷺ یان دەنگی ئەو کەسەی کە قورئان دەخوێنێ، دایپۆشێ و، دەنگەکە ون بێ.

﴿لَعَلَّكُمْ تَغْلِبُونَ ﴿٢٦﴾﴾، بەڵکو زاڵبن، یانی: (**لَعَلَّكُم تَغْلِبُونَ مُحَمَّداً**)، یان (**لَعَلَّكُم تَغْلِبُونَ القُرْآنَ**)، بەڵکو بەسەر موحەممەددا، یان بەسەر قورئاندا زاڵبن، بەوە کە هەر کەس بیەوێ گوێبیستی قورئان بێ، نەتوانێ گوێبیست ببێ، ئنجا کە ئێوە ڕێتان لێگرت گوێبیستی قورئان بێ، مانای وایە بەسەریدا زاڵبوون، چونکە خەڵك هەتا قورئان نەبیستێ، پێی کارتێکراو نابێ.

ئنجا ئەمە وەنەبێ هەر ئەو کاتە وابووبێ، ئێستاش هەروایەو دوژمنان و ناحەزانی ئیسلام، هۆکارێك کە زۆر پشتی پێ دەبەستن و، بە کارتێکەرو کاریگەری دادەنێن بۆ دژایەتیی ئیسلام و مسوڵمانان، ئەوەیە کە شتی پووچ بڵاو دەکەنەوە، ئەو هەموو کەناڵانەی بە پارەی نەوت و غازی دزراوی خەڵك و، بە پارەی بودجەی دزراو و بەتاڵانبراوی ئەم میللەتەو، بە سەروەت و سامانی بە حەرامیی لەسەر یەك کەڵەکە کراوی ئەم خەڵکە هەژارو ڕەش و ڕووتە کار دەکەن، ئەو کەناڵانە چییان لەسەر بڵاو دەکرێتەوە؟! بە دڵنیاییی هەمووی لە چوارچێوەی ئەوەدایە کە خوا دەفەرموێ: (**لَغْو**)، قسەی پووچ، نەك هەر ئەوە، بەڵکو قسەی حەرامیشەو لە (**لَغْو**)ش بەولاوەترە، چونکە (**لَغْو**) ئەوەیە کە سوودی نەبێ، بەڵام زۆرێك لەو قسەو چالاکیی و شتانەی کە لەو کەناڵانەدا بڵاو دەکرێنەوە، نەك هەر سوودی نیە، بەڵکو زۆریش زیانی هەیە، بە تایبەت بۆ چینی گەنج و تازە پێگەیشتوو، کە سەرگەرمیان دەکەن بە قسەو شتی پووچەوە، بەڵکو سەرگەرمیان دەکەن بەوەوە کە وا هەست بکەن یەك تۆپەڵ غەریزەن: تەنیا غەریزەی جینسیین، تەنیا غەریزەی خواردنەوەو خواردنن و، سەرگەرمیان دەکەن بەوەوە کە بەرگ و پۆشاکیان چۆن بێ؟ خواردنیان چۆن

بێ؟ چۆن ئارەزووەکانی خۆیان تێر بکەن، لە هەر ڕێیەکەوە بۆیان هەڵکەوێ، بەبێ ئەوەی گوێ بدەنە حەڵاڵ و حەرام؟ ئەوەش کاتی خۆی پیلان و نەخشەی بێبڕوایان بووە لە دژی قورئان، ئێستاش بە هەمان شێوەو هەموو ئەو هەوڵانە دەچنە ئەو چوارچێوەیەوە، کە خەڵك بەشتی پووچ و بێ ئامانج و بێ سوود سەرگەرم بکرێ، بۆ ئەوەی نەیپەرژێتە سەر ئەوەی حوکمی چ حوکمڕانێکەو، ئەو دنیایە چیی لێ دێ و، کێ حوکمی دەکات و، خێرو بێری ئەو وڵاتە بۆ کوێ دەبردرێ و، ئەو خەڵکە ڕووی پێ لە چی کراوە؟ هەمیشە ئەگەر خەڵك بە ناهەق و بەتاڵەوە سەرقاڵکرا، نایپەرژێتە سەر هەق.

٣)- ﴿ فَلَنُذِيقَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ عَذَابًا شَدِيدًا ﴾، بە دڵنیایی ئێمە ئەوانەی بێبڕوان ئازارێکی سەخت و توندیان پێ دەچێژین، کە دەفەرموێ: ﴿ فَلَنُذِيقَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴾، ئەمە: (**إِظْهَارٌ فِي مَقَامِ الإِضْمَار**)، دەیتوانی بفەرموێ: (**فَلَنُذِيقَنَّهُمْ**)، چونکە پێشتر باسیکردوە کە دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَا تَسْمَعُواْ لِهَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ وَٱلْغَوْاْ فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَغْلِبُونَ ﴿٢٦﴾ ﴾، بەڵام بۆیە دەفەرموێ: ﴿ فَلَنُذِيقَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴾، ئەمە دەرخستنەو ئاشکراکردنە لە شوێنی پەنهانکردن، بۆ ئەوەی بزانرێ کە بێبڕواییەکەیانە، ئەو شێوە ڕەفتارەیان لێ دەپشکوێنێتەوەو، بێبڕواییەکەشیانە وایان لێدەکات شایستەی سزای سەختی خوابن، پێشتریش گوتوومانە: وشەی (**ذَوق**) بە مانای چێشتنی خواردن دێ، واتە: ئینسان لە خواردن بچێژێ، بەڵام لێرەدا ئەمە خوازراوەتەوە بۆ سزا، یانی: ئەو سزاو ئازارە کە خوا بۆ کافرانی ئامادە کردوە، وەك چێشت و خواردنێك بۆی ئامادە کردوون و، کە بە تۆبزیی پێیان بخوات و، پێیان لەو ئازارە بچێژێنێ.

٤)- ﴿ وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَسْوَأَ ٱلَّذِى كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴾، بە دڵنیایی بەپێی خراپترینی ئەوەی دەیانکرد، سزایان دەدەین.

(ل)ی (**لَنَجزِيَنَّهم**) زەمینە خۆشکەرە بۆ سوێند (**مُمَهِّدَةٌ لِلْقَسَم**)، یاخود (لـ)ی سوێندە، یانی: سوێند بە خوا، (ن)ەکەش بۆ جەختکردنەوەیە، واتە: سوێند بە

خـوا زۆر بـە جەختکردنـەوەوە، {(أسـوء) منصـوب عَـلى نَـزْعِ الخافِـضِ أي: عـلى أسْـوَإِ الَّـذِي كانُـوا يَعْمَلُـونَ}، (أسوء) مەنصووبـە بەداڕنینـی ژێردارکـەر، یـانی: سـزایان دەدەین لەسـەر خراپتریـن کردەوەیـان کـە دەیانکـرد، (وأسْـوَأُ: اسْـمُ تَفْضِيـلٍ مَسْـلُوبُ المُفاضَلَـةِ، وإنَّمـا أُرِيـدَ بِـهِ السَّيِّءُ، فَصِيـغَ بِصِيغَـةِ التَّفْضِيـلِ لِلْمُبالَغَـةِ فِي السُّـوءِ)، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ أَسْوَأَ ٱلَّذِى كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾، مەبەسـت ئـەوە نیـە، کـە تەنیـا بـە خراپترینـی کردەوەکەیـان سـزا دەدرێـن، بـەڵام بـە کـردەوە خراپەکانیـان کـە خراپتریـن نیـن، سـزا نادرێـن، ﴿ أَسْوَأَ ﴾، لێـرەدا نـاوی هەڵبژاردنـە، بـەڵام مەبەسـت پێـی هەڵبـژاردن و بـەراورد پێکـردن نیـە، لەگـەڵ بەرانبەرێکـدا، بەڵکـو مەبەسـت پێـی کـردەوەی خراپـە، بـەڵام بۆیـە بـە شـێوەی (إسـم التَّفضيـل) هاتـوە، تاکـو زێدەڕۆیـی بکـرێ لـە خراپیـی کردەوەکەیانـدا.

لـە ڕاسـتییدا هـەر کردەوەیەکـی خـراپ لـە بەرانبـەر خـوای موتەعالـدا، بـە خراپتریـن لـە قەڵـەم دەدرێ، ئەگـەر تەنیـا خراپیـش بـێ، هـەر خراپترینـە.

٥)- ﴿ ذَٰلِكَ جَزَآءُ أَعْدَآءِ ٱللَّهِ ٱلنَّارُ ﴾، ئا ئەوە سزای دوژمنانی خوایە کە ئاگرە.

٦)- ﴿ لَهُمْ فِيهَا دَارُ ٱلْخُلْدِ ﴾، لەوێدا بۆیان هەیە مەنزڵگای تێدامانەوە، واتە: (لَهُم فيها مَنْزِلُ البَقَاءِ الأَبَدِي)، مەنزڵگای مانەوەی هەمیشەیی بۆ ئەوان لەوێدا هەیە.

٧)- ﴿ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا يَجْحَدُونَ ﴾، سزای ئەوە کە نکووڵییان لە ئایەتەکانی ئێمە دەکرد، کەواتە: ئەی بێبڕواینە! ئێستا وەرن بڕوا بە ڕاستێتیی قورئان بێنن و، لێی وردبنەوەو، نکووڵیی لێ مەکەن، ئەگەرنا دوایی ئەوە سزاتانە.

ئەمـەش ئـەوە دەگەیەنـێ کـە ئـەو بێبڕوایانـە زانیویانە قورئـان هەقە، بـەڵام دانیان پێدانەهێنـاوە، چونکـە: ﴿ يَجْحَدُونَ ﴾، واتـە: نکووڵیـی دەکـەن، نکووڵییکـردن ئەوەیـە مـرۆڤ بـە عەقـڵ و دڵ بزانـێ ئـەو شـتە ڕاسـتە، بـەڵام بـە زمـان دانـی پێدانەهێنـێ، وەك خـوای بـەرزی مـەزن لـە سـووڕەتی (النَّمـل)دا لـە بـارەی گەلـی فیرعەونـەوە، کـە مووسـا عليه السلام نیشـانەکانی خـوای پەروەردگاریـان بـۆ دێنێ، دەفەرمـوێ: ﴿ فَلَمَّا جَآءَتْهُمْ

ءَايَٰتُنَا مُبۡصِرَةٗ قَالُواْ هَٰذَا سِحۡرٞ مُّبِينٞ ﴿١٣﴾ وَجَحَدُواْ بِهَا وَٱسۡتَيۡقَنَتۡهَآ أَنفُسُهُمۡ ظُلۡمٗا وَعُلُوّٗاۚ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴿١٤﴾ ﴾، واتـە: کاتێـك کـە نیشـانەکانی ئێمەیـان زۆر ڕۆشـن بـوون، (یـان زۆر پـێ بینـەر بـوون، هـۆکاری ئەوەبـوون مـرۆڤ پێیـان ببینـێ)، بـۆ هاتـن گوتیـان: ئـەوە جادوویێکـی ئاشـکراو ڕوونـەو، نکوولّییـان لێکـردن، لـە دەروونـی خۆشـیاندا لێیـان دڵنیابـوون ڕاسـتن، بـەڵام بـە زمـان نکوولّییـان لـێ کـردن، بـە هـۆی سـتەم و خـۆ سـەپاندنەوە، تاکـو سـتەمکاریی و خۆسـەپاندنیان بـۆ بـەردەوام بـێ، نەچوونـە ژێربـاری ئـەو موعجیزانـەوە کـە مووسـا ﷺ هێنابوونـی و، دانیـان پێـدا نەهێنـان، چونکـە ئەگـەر دانیـان بـە ڕاسـتیی نیشـانەکانیدا هێنابایـە، دەبووایـە ئەگـەر شـوێن پەیامەکەشـی کەوتبـان، ئنجـا ئەگـەر شـوێن پەیامەکـەی کەوتبـان، فیرعـەون و دارو دەسـتەکەی ئـەو بـەزم و بـازاڕەی هەیانبـوو، لێیـان تێکدەچـوو، بۆیـە هـەر لـە سـەرەتاوە نکوولّییـان لـە نیشـانەکانی مووسـا ﷺ کـرد، ﴿ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴿١٤﴾ ﴾، سـەرنج بدە! سـەرەنجامی تێکدەران چـۆن بـوو؟! ئنجـا ئێسـتاش هەروایـەو، ئێسـتاش کەسـانێکی زۆر لـە حوکمڕانـە خـۆ سـەپێنەکان، چ لـە حیزبـە سیکۆلاریسـتەکان، چ لـە ڕژێمـە سیکۆلاریسـتەکان، چ لـە ڕژێمـە میراتیـی و بنەماڵەییـەکان، چ لـە ڕژێمـە خۆسـەپێنەکان بەهـۆی کودەتـای سـەربازیی و، هێـزی سـەربازیی و، هێـزی موخابەراتیـی، چ بـە هـۆی پەیوەندییـە سیاسـییە خـۆ بەدەسـتەوە دەرەکانیـان، لەگـەڵ زلهێزانـی ڕۆژهـەڵات و ڕۆژئـاوادا، ئەوانـە نکوولّیـی دەکـەن لـە ڕاسـتیی ئیسـلام، ئەگەرنـا دەزانن ڕاسـتە، بۆچـی نکوولّیی دەکـەن؟ چونکـە ئەگـەر بێنـە ژێربـاری ئیسـلام و پەیامـی خـواوە، پەیامـی خـوا پێـش هەمـوو شـتێك پێیـان دەڵـێ: هەمووتـان بـران، دەبـێ پێکـەوە تەبابـن، هەروەهـا پێیـان دەڵـێ: ئـەو خێـرو بێـرەی لـەم وڵاتەدایـە، هـی هەمووتانـە، هـی ماڵێـك و دوو مـاڵان و چەنـد ماڵێـك نیـە، هـی عەشـیرەتێك و حیزبێـك نیـە، هـی چەنـد کەسـێك نیـە، هـی هەمووتانـە، دەبـێ تێیـدا بەشـداربن، نابـێ هیـچ کـەس قۆرخکاریـی بـکات لـە نیعمەتەکانـی خـوادا.

هەروەها دینی خوا ڕێیان لێ دەگرێ لە تەزویرو فرت و فێڵ، لە خۆسەپاندن، لە زەبرو زەنگ، لە چاو سوور کردنەوەی ناهەق لە خەڵك، ئنجا ئاینێك ڕێی ئەوانەیان لێ بگرێ، هەر لە سەرەتاوە نکووڵیی لێ دەکەن و، ناچنە ژێرباری.

## مەسەلەی چوارەم و کۆتایی:

**داواکردنی بێبڕوایان لە خوای پەروەردگار کە ئەو دووانەی لە مرۆڤ و جنند گومڕایان کردوون، پیشانیان بدات، تاکو بیانخەنە ژێر پێیان و، بکەونە ژێری ژێرەوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ رَبَّنَآ أَرِنَا ٱلَّذَيۡنِ أَضَلَّانَا مِنَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ نَجۡعَلۡهُمَا تَحۡتَ أَقۡدَامِنَا لِيَكُونَا مِنَ ٱلۡأَسۡفَلِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴾، ئەوانەی بێبڕوان، گوتیان، ئەمە لێرەدا: بە حوکمڕان و شوێنکەوتووەوە، بە سەرکردەو بنکردەوە، ئەوانەی شت بەدەست بوون و، ئەوانەی شوێنکەوتوو و لاساییکەرەوە بوون، هەموویان دەگرێتەوە.

٢)- {ئەوانەی بێبڕوان گوتیان:} ﴿ رَبَّنَآ أَرِنَا ٱلَّذَيۡنِ أَضَلَّانَا ﴾، پەروەردگارمان! ئەو دووانەی گومڕایان کردین، پیشانمان بدە، توێژەرەوانی قورئان زۆربەیان بۆ وێنە: **(الطبري)** و زۆری دیکەش گوتوویانە: ئەو دووانە (ئیبلیس) و (قابیل)ن، ئیبلیس لەبەر ئەوەی یەکەم کەس بوو سەرپێچیی کرد لە ئاسمان، قابیلیش یەکەم کەس بوو لەسەر زەوی سەرپێچیی لە فەرمانی خوا کردو، برایەکەی خۆی کە هابیلە کوشتی، ئەو دووانەمان پیشان بدە کە ڕێی کوفرو تاوان و خراپەیان بۆ خەڵك شکاندو، ڕەنگی سەرپێچیکردن لە فەرمانی خوایان ڕشت.

بەڵام من پێم وایە: ﴿ ٱلَّذَيۡنِ أَضَلَّانَا ﴾، ئەو دووانەی گومڕایان کردین، واتە: ئەو دوو جۆرەی گومڕایان کردین لە جندو مرۆڤ، نەك دوو کەس، کە ئیبلیس و قابیل بن، بەڵکو هەموو ئەوانەی کە لەو دوو جۆرە دروستکراوەن، چ جند، چ مرۆڤ، ئەوانەمان پیشانبدە، چونکە بە تەئکید هەڵخەڵەتێنراوو شوێنکەوتووەکان زۆر زیاترن لە گومڕاکەرەکان، یانی: جاری وا هەیە کەسێك ئۆممەتێك گومڕا

دەكات، كەسێك و دارو دەستەكەی كە كەمینەیەكن، خەڵكێكی زۆر گومڕا دەكەن، كەواتە: گومڕا كراوەكان زۆر زیاترن لە گومڕاكەرەكان، ئەگەر جندن، ئەگەر مرۆڤن، كەواتە: چونكە گومڕاكراوەكان زۆربەن، بە ئاسانیی لەوێ بەڕووەستیان دێن و[1]، دەڵێن: پێشانمان بدە تاكو بیانخەینە ژێر پێمانەوە، هەر كۆمەڵەیەك لە گومڕاكراوەكان، ئەوانەی گومڕایان كردوون لە جندو مرۆڤ، بۆ ئەوەی لەوێ داخی دڵی خۆیانیان پێ بڕێژن.

بەڵگەشم لەو بارەوە كە ئەو دووانە دوو كەسی دیارییكراو نین، بەڵكو دوو جۆرە دروستكراون، ئەوەیە كە خوا لە سوورەتی (**الأَنْعَام**)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا شَيَٰطِينَ ٱلْإِنسِ وَٱلْجِنِّ يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ زُخْرُفَ ٱلْقَوْلِ غُرُورًا ۚ وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ مَا فَعَلُوهُ ۖ فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ ﴿١١٢﴾ ﴾، واتە: هەروا بە شێوەیە بۆ هەر پێغەمبەرێك دوژمنێكمان ڕەخساندوە، لە شەیتانەكانی مرۆڤ و جند، هەروەها لە سوورەتی (**النَّاس**)یشدا خوا دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِى يُوَسْوِسُ فِى صُدُورِ ٱلنَّاسِ ﴿٥﴾ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ ﴿٦﴾ ﴾، واتە: ئەوكەسەی كە خوتخوتەو دنەدانی خراپ دەخاتە سینەی خەڵكەوە، لە جندو لە مرۆڤ.

٣)- ﴿ نَجْعَلْهُمَا تَحْتَ أَقْدَامِنَا ﴾، تاكو بیانخەینە ژێر پێیەكانمانەوە.

٤)- ﴿ لِيَكُونَا مِنَ ٱلْأَسْفَلِينَ ﴾، تاكو ئەو دوو جۆرە خەڵك هەڵخەڵەتێنەرو گومڕاكەرە لە ژێرەوەبن، واتە: لە ژێر ئێمەوەبن و، بیانخەینە ژێر پێمان.

ئەو گومڕاكراوانە كە دەزانن ئەو گومڕاكەرانە، تووشی چ ڕۆژێكی ڕەش و پڕ مەینەتیی و چ بەد بەختییەكیان كردوون، هیچیان بەدەست نامێنێ ئەوە نەبێ كە بڵێن: خوایە! پێشانمان بدە، بزانین كێ و كێ بوون؟ یان لە كوێن؟ تاكو بیانخەینە ژێر پێ، بەڵام پێموانیە ئەو داوایەشیان وەربگیرێ، چونكە كارەكانی

---

(١) بەردەستیان دێن: پێیان دەوێرن

خـوا ﷻ بـۆ سـزادانی کافرانیـش هیچـی فـەوزاو پاشـاگەردانیی نیـە، بەڵکـو هـەر کەسـە بـۆ خـۆی سـزای پـڕ بـە پێسـتی خـۆی دەدرێ، ئـەوە نیـە کـە لەوێـدا ببێتـە گێـژاوو، پاشـا گەردانیـی، بـەڵام گرنـگ ئەوەیـە ئـەوان ئـەو داوایـە دەکـەن و، ئـەو قسـەیە دەکـەن، بـۆ دەرخسـتنی توورەیـی و، بێزاریـی و، زۆر پەسـتیی خۆیـان لـەوان، کـە ئەگـەر بـە خسـتنە ژێـر پێـش بـێ، بـا تـۆزێ تۆڵەیـان لـێ بکەنـەوەو، داخـی دڵـی خۆیانیـان پـێ بڕێـژن.

ئەمـەش بـۆ ئـەوە خـوا ﷻ دەیخاتـە ڕوو، کـە ئـەی ئـەو خەڵکـەی هەڵدەخەڵەتێن و شـوێن ئـەو سـتەمکارانە دەکـەون! ڕۆژێـك دێ داوا لـە خـوا دەکـەن ئـەو سـەرکردانەتان پێشـانتان بـدات، بیانخەنـە ژێـر پـێ، کەواتـە: حەیفـەو عەیبـە ئێسـتا ئێـوە مەکەونـە ژێـر پێیـان، کاتێـك دێ هێندەتـان ڕق لێیـان هەڵدەسـتێ، تووشـی وەزعێکتـان دەکـەن، کـە ئـاوات بخـوازن ئەوانـە بخەنـە ژێـر پێـی خۆتـان، ئنجا ئێسـتا ئێـوە مەکەونـە ژێـر پێـی ئـەوان، تاکـو ئـەو ڕۆژەش ئـەو خۆزگەیـە نەخـوازن!.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرســەمان لــە دە (١٠) ئایــەت پێــك دێ، ئایەتەكانــی: (٣٠ - ٣٩)، لــەم ئایەتانــەدا:

**یەكەم:** باسی بەندە بڕوادارو ڕاوەستاو و دامەزراوەكانی خوا كراوە، كە فریشتەكان لە دنیاو، لە دواڕۆژدا دادەبەزنە سەریان و، موژدەیان پێ دەدەن، ترس و خەم و پەژارەیان لە دڵدا دەڕەوێننەوە.

**دووەم:** هەر لەم دە (١٠) ئایەتەدا، باسی بانگەوازكارانی ڕێی خواو، خەسڵەتە بنەڕەتییەكانیان كراوە.

**سێیەم:** ژمارەیەك لە نیشانەكانی خوا، دیاردەو دیمەنە سەرنجڕاكێش و دڵ بزوێنەكانی دەوروبەرو گەردوون، خراونەڕوو، وەك بەڵگە لەسەر پەروەردگارێتیی و تەنیا پەرستراوێتیی خوا، كە بریتین لە: شەوگارو، ڕۆژگارو، خۆرو، مانگ و، دابەزینی ئاو بۆ سەر زەوی و، زیندووبوونەوەی زەوی و، ڕازاندنەوەی زەوی بە گوڵ و گوڵزارو، ڕووەك و دارو درەخت و، هەموو ئەو شتانەی كە لەسەری دەڕوێن.

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُوا۟ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَٰمُوا۟ تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا۟ وَلَا تَحْزَنُوا۟ وَأَبْشِرُوا۟ بِٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴿٣٠﴾ نَحْنُ أَوْلِيَآؤُكُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِىٓ أَنفُسُكُمْ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ ﴿٣١﴾ نُزُلًا مِّنْ غَفُورٍ رَّحِيمٍ ﴿٣٢﴾ وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا وَقَالَ إِنَّنِى مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٣٣﴾ وَلَا تَسْتَوِى ٱلْحَسَنَةُ وَلَا ٱلسَّيِّئَةُ ۚ ٱدْفَعْ بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ فَإِذَا ٱلَّذِى بَيْنَكَ وَبَيْنَهُۥ عَدَٰوَةٌ كَأَنَّهُۥ وَلِىٌّ حَمِيمٌ ﴿٣٤﴾ وَمَا

يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ﴿٣٥﴾ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ نَزْغٌ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٣٦﴾ وَمِنْ ءَايَٰتِهِ ٱلَّيْلُ وَٱلنَّهَارُ وَٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ لَا تَسْجُدُواْ لِلشَّمْسِ وَلَا لِلْقَمَرِ وَٱسْجُدُواْ لِلَّهِ ٱلَّذِى خَلَقَهُنَّ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴿٣٧﴾ فَإِنِ ٱسْتَكْبَرُواْ فَٱلَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ يُسَبِّحُونَ لَهُۥ بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَهُمْ لَا يَسْـَٔمُونَ ۩ ﴿٣٨﴾ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنَّكَ تَرَى ٱلْأَرْضَ خَٰشِعَةً فَإِذَآ أَنزَلْنَا عَلَيْهَا ٱلْمَآءَ ٱهْتَزَّتْ وَرَبَتْ إِنَّ ٱلَّذِىٓ أَحْيَاهَا لَمُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰٓ إِنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٣٩﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بێگومـان ئەوانـەی گوتیـان: پەروەردگارمـان خوایـە، ئنجـا ڕاوەسـتاوو دامـەزراو بـوون (لەسـەر ڕاسـتە شـەقامی خـوا)، فریشـتەکان دادەبەزنـە سـەریان (خورپەیـان بـۆ دەکـەن)، کـە مەترسـن و خەمبـار مەبـن و، موژدەتـان لـێ بـێ بـەو بەهەشـتەی کـە پێشـتر گفتتـان پـێ دەدرا ﴿٣٠﴾ ئێمـە دۆسـت و پشـتیوانتانین لـە ژیانـی دنیـاو، لـە ژیانـی کۆتاییـداو، لەوێـدا بۆتـان هەیـە هەرچـی دەروونتـان بیخـوازێ و، هەرچـی داوای بکـەن ﴿٣١﴾ ئـەوە بژیوێکـی میوانداریيـە لـە لایـەن خـوای لێبـوردەی میهرەبانـەوە (ئامـادە کـراوە) ﴿٣٢﴾ ئایـا قسـەی کـێ باشـترە لـە هـی کەسـێك کـە خەڵـك بـۆ لای خـوا بانـگ دەکات و، کـردەوەی چـاك دەکات و، دەڵـێ: مـن لـە مسـوڵمانانم؟ ﴿٣٣﴾ چاکـەو خراپـەش یەکسـان نیـن، (لـە شـێوازی بانگـەوازدا)، بـە خەسـڵەت و شـێوازی باشـتر خراپـەی بەرانبەرەکـەت بەرپـەرچ بـدەوە، لـە ئەنجامـی ئـەوەدا ئـەو کەسـەی لـە نێـوان تـۆو ویـدا دوژمنایەتیـی هەیـە، وەك دۆسـتێکی نیزیـك و دڵسـۆزی لـێ دێ ﴿٣٤﴾ ئـەو خەسـڵەتەش تەنیـا بـە کەسـانێك دەدرێ کـە

خۆیـان ڕادەگـرن و، تەنیـا بـە کەسـانێك دەدرێ کـە خـاوەن بەشـێکی مەزنـن، (لـە بـڕواو خواپەرسـتیی و ڕەوشـتی بـەرز) ﴿٣٥﴾ هـەر کاتێکیـش لـە شـەیتانەوە دنـەدان و خوتخوتەیەکـت پـێ گەیشـت، پەنـا بـە خـوا بگـرە، بـە دڵنیایـی ئـەو بیسـەری زانایـە ﴿٣٦﴾ لـە نیشانەکانیشـی (بەڵگـەو نیشـانەکانی پەروەردگارێتیـی و تەنیـا پەرسـتراوێتیی خـوا)، شـەوگارو ڕۆژگارو، خـۆرو مانگـن، ئنجـا ئەگـەر بـە ڕاسـتیی خـوا دەپەرسـتن، کڕنـووش بـۆ خـۆرو بـۆ مانگیـش مەبـەن و، کڕنـووش تەنیـا بـۆ ئـەو خوایـە بـەرن کـە ئەوانـی دروسـتکردوون ﴿٣٧﴾ ئنجـا ئەگـەر خۆیانیـان بـە زلگـرت، بێگومـان ئەوانـەی لـە لای پەروەردگارتـن (لـە فریشـتەکان)، بـە شـەوو ڕۆژ پاکیـی بـۆ دەردەبـڕن، ئـەوان مانـدوو و شـەکەتیش نابـن ﴿٣٨﴾ هەروەهـا لـە نیشـانەکانی وی، ئەوەیـە کـە زەوی بـە ملکەچیـی و پەژمـوردەو وشـك دەبینـی، بـەڵام هـەر کات ئاومـان دابەزانـدە سـەری، جووڵـە جووڵـی کـردو زیـادی کـردو هەڵاوسـا، بـە دڵنیایـی ئـەو کەسـەی ژیاندوویەتەوە، ژێنـەرەوەی مردووانـە، بێگومـان ئـەو لەسـەر هەمـوو شـتێك توانایـە ﴿٣٩﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(ٱسۡتَقَـٰمُواْ ): ڕێـك وەسـتان، (إسْـتِقَامَةُ الإِنْسَـانِ: **لُزومُـهُ المَنْهَـجَ المُسْتَقِيم، الإقَامَـةُ فِي المَـكَانِ: الثَّبَـاتُ وَالرُّسُـوخُ**)، ئیسـتیقامەتی مـرۆڤ: بریتیـە لـەوەی ڕێـی ڕاسـت بگـرێ، (**إقَامَـة**) لـە شـوێنێك، بریتیـە لـەوەی لـەو شـوێنەدا بمێنێتـەوەو چەسـپاو بـێ، کەواتـە (**إسْـتَقَامُوا**) واتـە: لەسـەر ئـەو ڕێیـەی خـوا ﷻ ڕاوەسـتاو بـوون، لەسـەر ئـەو ڕێیـە ڕاسـتەی خـوا چەسـپاو بـوون.

( نُزُلًا): (**النُّـزُلُ: مَـا يُعَـدُّ لِلنَّـازِلِ مِـنَ الـزَّادِ**)، (**نُـزُل**): ئەوەیـە بـۆ بابـای دابەزیـو، میوانێـك کـە لـەلای خانەخـوێ دادەبـەزێ و دێ بـۆ لای، ئامـادە دەکـرێ لـە خـواردن و خـۆراك.

(حَمِيمٌ): (الحَمِيمُ: الْقَرِيبُ الْمُشْفِقُ، فَكَأَنَّهُ يَحْتَدُّ حِمَايَةً لِذَوِيهِ، وَقِيلَ: الْحَامَّةُ وَالعَامَّة)، (حَمِيم): نیزیکێکی بە پەرۆش، یاخود خزمێکی بە پەرۆش، وەك ئەو خزمە، ئەو نیزیکە گەرم بێ و تووڕە ببێ، وەك پاراستنێك بۆ نیزیکەکانی، بۆ خزمەکانی، چونکە (حَمِيم) بە مانای ئاوی کوڵاوو داغیش دێ، یانی: ئەو مرۆڤە ئەگەر زۆر دڵسۆزو بە پەرۆش بێ بۆ کەسێك، گەرم دەبێ وەك پارێزگاریی لێکردنی لەو کەسەی بە نیزیك و بە دۆست و بە خۆشەویستی خۆی دەزانێ، بۆیە لە زمانی عەرەبییدا گوتراوە: (الْحَامَّةُ وَالعَامَّة) واتە: کەسانی تایبەت بە مرۆڤ و، کەسانی گشتیی، (حَامَّة) ئەوانەن کە لەسەر مرۆڤ هەڵدەدەنێ و، تووڕە دەبن و گەرم دادێن، (عامة)ش یانی: خەڵك بە گشتیی.

(وَمَا يُلَقَّىٰهَآ): نایدرێتێ و پێی نا بەخشرێ (وَمَا يُؤْتَاهَا، وَمَا يُعْطَاهَا)، دەگوترێ: (لَقَّيْتُهُ بِكَذَا أَي اسْتَقْبَلْتُهُ بِهِ) واتە: پێشوازییم کرد لەو کەسە بەو شتە، واتە: ئەو شتەم پێدا، (وَمَا يُلَقَّاهَا) یانی: (وَمَا يُعْطَاهَا) پێی نادرێ و پێی نابەخشرێ ئەو سیفەتە.

(إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٍ): مەگەر کەسێك کە خاوەن پشك و بەشێکی مەزن بێ (الحَظُّ: النَّصِيبُ الْمُقَدَّرُ، حَظِظْتُ وَحُظِظْتُ فَأَنَا مَحْظُوظٌ)، (حَظّ): بریتیە لە بەشێکی دیارییکراو، دەگوترێ: (حَظِظْتُ) واتە: ئەو شتەم پێ برا، (حُظِظْتُ) ئەو شتە بە من درا، (فَأَنَا مَحْظُوظٌ) من خاوەن پشك و بەشم.

(يَنزَغَنَّكَ): (النَّزْغُ: دُخُولٌ فِي أَمْرٍ لِإِفْسَادِهِ)، (نَزْغ): بریتیە لە چوونە نێو کارێك بۆ تێکدانی، ئەگەر بە دنەدان و، خوتخوتە دان و، هاندان بەرەو خراپە لێکبدرێتەوە.

(يَسْـَٔمُونَ): ماندوو نابن، (السَّئَامَةُ: الْمَلَالَةُ مِمَّا يَكْثُرُ لُبْثُهُ)، (سَئَامَة): بریتیە لە ماندوو بوون لە شتێك کە زۆر دەمێنێتەوە، واتە: فریشتەکان ماندوو و بێتاقەت و بێزار نابن، بە هۆی ئەوەوە کە هەمیشە سەرگەرمی بە پاکگرتن و ستاییشکردنی خوای بەرزی مەزنن.

(خَٰشِعَةً): زەوی دەبینی بە (خَاشِع)ی، (الخُشُوعُ: الضَّرَاعَة) پاڕانەوەو کڕووزانەوە، (الْأَرْضُ الْخَاشِعَة) زەویەکی بێ ڕووەك، زەویەکی ڕووتەن، لەبەر ئەوەی ئینسان کە هیچی نەبێ دەلاڵێتەوەو دەکڕووزێتەوە، زەویش کە هیچی لەسەر نەبێ وەك بڵێی حاڵەتی کڕووزانەوەو پاڕانەوەو لاڵانەوەی هەیە، کە خوا ئاوێك دابەزێنێتە سەری تاکو دووبارە کشتوکاڵ و ڕووەکی لەسەر سەوز بێ.

(ٱهْتَزَّتْ): (الهَزُّ: التَّحْرِيكُ الشَّدِيد، هَزَزْتُ الرُمْحَ فَاهْتَزَّ)، (هَزّ): بریتیە لە جووڵاندنێکی بەهێز، دەگوترێ: (هَزَزْتُ الرَّمْحَ فَاهْتَزَّ) ڕمەکەم ڕاوەشاند ئەویش ڕاوەشا.

(وَرَبَتْ): زیادی کرد، (رَبَى: أي زَادَ وَعَلَى)، زەوی کە ئاو دادەبەزێتە سەری، چ باران، چ بەفرو تەرزە، ئەو ئاوە تێکەڵ بەو زەویە دەبێ، بێگومان قەبارەی زەوی هەڵدەستێ و هەڵدەئاوسێ، مەبەست پێی ئەو حاڵەتەیە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

لەم دە (١٠) ئایەتەدا، وەك لە پێناسەکەیدا گوتمان: خوا ﷻ سێ بابەتی سەرەکیی باس دەکات:

١- باسی ئەوانەی لەسەر ڕاستە شەقامی خوا بەردەوامن، کە فریشتەکان دەبنە هاودەم و هاوڕازیان، بە پێچەوانەی ئەوانەوە کە بێبڕواو خراپەکار بوون و، خوا شەیتانەکانیان دەکاتە هاونشین و هاوڕاز، شەیتانی جندو مرۆڤ، بەڵام ئەوان فریشتەکان دەبنە هاودەم و هاوڕازو هاونشینیان.

٢- باسی بانگەوازە کە دەبێ بە چ شێوەیەك بانگەواز بکرێ و، خەسڵەتە بنەڕەتەکانی بانگەوازکارانی ڕێی خوا کامانەن؟

٣- باسی هەندێ لە نیشانەکانی خوایە، کە هاوکات نیعمەت و چاکەی خوان بەسەر مرۆڤەوەو، نیشانەی تەنیا بەدیهێنەرایەتیی و، پەروەردگارێتیی و، پەرستراوێتیی خوای بەرزو مەزنیشن.

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَـٰمُواْ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی گوتیان: پەروەردگارمان خوایەو، دواییش ڕاوەستاو و دامەزراو بوون، نە لەخشاو بوون لەسەر ئەو ڕاستە شەقامە، کە بە وشەی: ﴿رَبُّنَا ٱللَّهُ﴾، تەعبیریان لێکرد، چونکە: ﴿رَبُّنَا ٱللَّهُ﴾، پەروەردگارمان خوایە، ئەوە بۆ خۆی ڕێبازو بەرنامەیەکە لە ژیانداو، بووناسییەکە، کە تۆ خۆت بە پەروەردەکراوو، بەخێوکراوو، دروستکراوی خوایەك دەزانی کە خاوەنی هەموو شتێکە، ﴿ثُمَّ ٱسْتَقَـٰمُواْ﴾، دوایی ڕاوەستاوو دامەزراویش بوون لەسەر ئەوە، ﴿تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ﴾، فریشتەکان دادەبەزنە سەریان، چییان پێ دەڵێن؟ ﴿أَلَّا تَخَافُواْ وَلَا تَحْزَنُواْ﴾، (پێیان دەڵێن:) مەترسێن بۆ داهاتوو، پەژارەداریش مەبن بۆ ڕابردوو، یاخود با ترس و خەم و پەژارەتان لە دڵدا نەبێ، ﴿وَأَبْشِرُواْ بِٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ﴾، دڵخۆشبن و موژدەشتان لێ بێ بەو بەهەشتەی پێشتر بەڵێنتان پێدەدرا، واتە: لە دنیادا بەڵێنتان پێدەدرا، یان پێشتر بەڵێنتان پێدراوە.

﴿نَحْنُ أَوْلِيَآؤُكُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ﴾، ئێمە دۆست و پشتیوانی ئێوەین لە ژیانی دنیاداو، لە ژیانی کۆتاییشدا، ﴿وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِىٓ أَنفُسُكُمْ﴾، بۆ ئێوە لەو بەهەشتەدا هەیە، هەر شتێك نەفستان ئارەزووی بکات و بیخوازێ، هەرچی دڵتان ئارەزووی بکات هەیە، ﴿وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ﴾، هەر شتێکیش کە داوا بکەن، لەوێدا بۆتان هەیە، ﴿نُزُلًا مِّنْ غَفُورٍ رَّحِيمٍ﴾، ئەوە نازو نیعمەتێکە ئامادە کراوە لەلایەن خوای لێبووردەی بە بەزەییەوە، وەك چۆن کەسێك، خانەخوێیەك، میوانێکی زۆر عەزیزو خۆشەویست دەعوەت دەکات، چی لە توانایدا هەیە لە پێداویستیی و خواردنی جۆراو جۆر،

بـۆی سـاز دەکات، ئـەو نـازو نیعمەتـەش کـە لـەو بەهەشـتەدا هەیـە، میواندارییـ کردنـی خـوای لێبـوردەی بـە بەزەییـە بـۆ ئێـوە.

ئنجا دێتـە سـەر بابەتـی دووەم، خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا ﴾، قسـەی کـێ چاکـترە لـە هـی کەسـێك کـە خەڵـك بـۆ لای خـوا بانـگ دەکات و، کـردەوەی باشـیش دەکات، واتـە: قسـەکانی مـۆری کردەوەیـان پێوەیـە، قسـەی هەوایـی نیـن، قسـە بـکات و کاری پێنـەکات، ﴿ وَقَالَ إِنَّنِى مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴾، دەشڵێ: مـن لـە مسـوڵمانانم، لەبـەر ئـەوەی خەڵـك بـۆ لای خـوا بانـگ دەکات و، کـردەوەی بـاش دەکات، بوغـڕا نابـێ و لـە خۆبایـی نابـێ و، لـە کەوڵـی خـۆی دەرناچـێ، کـە خـۆی لـە مسـوڵمانان جیابکاتـەوە، بەڵکـو دەڵـێ: مـن لـە مسـوڵمانانم و، مـن لـە ملکەچانـم بـۆ خـوا، ﴿ وَلَا تَسْتَوِى ٱلْحَسَنَةُ وَلَا ٱلسَّيِّئَةُ ﴾، بـە دڵنیایـی چاکەکـردن و خراپەکردنیـش یەکسـان نیـن، واتـە: بەکارهێنانی شـێوازی چـاك، لەگـەڵ شـێوازی خراپـدا، یەکسـان نیـن، بەڵکـو دوو شـوێنەواری زۆر پێچەوانـەی یەکدییـان هەیـە، بۆیـە: ﴿ ٱدْفَعْ بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ﴾، تـۆ بـە کام خەسڵەتی چاکـترە، قسـەو ڕەفتاری خراپـی بەرانبەرەکـەت پاڵپێوەبنـێ، لـە سـوورەتی (**المُؤمِنُـونْ**)دا دەفەرمـوێ: ﴿ ٱدْفَعْ بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ٱلسَّيِّئَةَ ﴾، واتـە: خراپـە بـە کام خەسـڵەت و سـیفەتی چاکـترە، پاڵپێوەبنـێ، بـەڵام لێـرە دەفەرمـوێ: خراپەیـەك کـە لـە بەرانبەرتـدا دەگوتـرێ و دەکـرێ، تـۆ بـە کام ڕەوشـت و کام خەسـڵەت بەرزتـرو چاکـترە، بـەوە ئـەو خراپەیـە پاڵپێوەبنـێ و، وابکـە کاریگەریـی نەمێنـێ، ﴿ فَإِذَا ٱلَّذِى بَيْنَكَ وَبَيْنَهُۥ عَدَٰوَةٌ ﴾، کـە تـۆ واتکـرد، ئنجـا دەبینـی ئـەوەی لـە نێـوان تـۆو ئـەودا دوژمنایەتیـی و ناکۆکیـی و ناتەبایـی هەیـە، ﴿ كَأَنَّهُۥ وَلِىٌّ حَمِيمٌ ﴾، وەك دۆسـتێکی زۆر بـە پـەرۆش و نیزیـك و دڵگەرمـی لـێ دێ بـۆ خـۆت.

﴿ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُوا۟ ﴾، بـەڵام ئـەو سـیفەتەش کـە بـە چاکـە، یـان بـە چاکـتر خراپـە پاڵپێـوە بـنرێ، نـادرێ، مەگـەر بـە کەسـانێك کـە خۆڕاگـرن، ﴿ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ﴾، هەروەهـا نـادرێ مەگـەر بـە خـاوەن پشـك و

بەشێکی مەزن، واتە: خاوەن پشك و بەشێکی مەزن لە ئیمان و خواپەرستییداو، لە چاکەکاریی و تەقواو خۆ پاك و چاککردن دا، دەبێ ئەوانەت هەبێ، ئنجا ئەو ڕەوشت و خەسڵەتە بەرزە لە تۆدا پەیدادەبێ، کە تۆ لە بەرانبەر خراپەدا چاکە بکەی، یان چاکتر بکەی.

ئنجا لەبەر ئەوەی حاڵەتی بانگەوازو وتووێژ لەگەڵ خەڵك و، دیالۆگ و مشتومڕکردن، ئەگەری ئەوەی هەیە بەرانبەرەکەت هەڵبچێ، یان تۆ هەڵبچی و، قسەیەکی توند بکرێ، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ نَزْغٌ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ ﴾، ئەگەر لە شەیتانەوە دنەدانێك، خوتخوتەیەك بە تۆ گەیشت، پەنا بە خوا بگرە، ﴿ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴾، بە دڵنیایی هەر ئەو بیسەری زانایە، قسەکان هەموویان دەبیستێ و، زاناشە بە نێو دڵ و دەروونیشتان.

ئنجا دێتە سەر بابەتی سێیەم، ئەم بابەتانەش هەموویان وەك ئاڵقەکانی زنجیرێك تێکهەڵکێشن، چونکە: ئەوانە دەڵێن: پەروەردگارمان خوایەو ڕاوەستاو دەبن، کەسێك خوا بە پەروەردگارو خاوەنی خۆی بزانێ، بانگەواز دەکات بۆ لای و، ڕێبازی وی، ئایینی خوای پەروەردگارە، هەروەها بە شێوازێکیش ئەو بانگەوازە دەکات کە شایستەی بەرزی ئەو ڕێبازە بێ، ئنجا یەکێك لە شێوازەکانی بانگەواز ئەوەیە، کە مرۆڤ نیشانەو نیعمەتەکانی خوا بخاتە بەرچاوی خەڵك، وەك من کاتی خۆی لە شێعرێك دا گوتوومە:

سروشت ئاوێنەی تەجەللای خوایە ... باش سەرنجی بدە بزانە چی تیایە

لە ڕێی کرەوە کردگار دەناسرێ ... سرووشت کرێکە کردگاری خوایە

یانی: ئێمە لە ڕێی دروستکراوەکانی خواوە، دەتوانین زیاتر خوا ﷻ بناسین، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِ ٱلَّيْلُ وَٱلنَّهَارُ وَٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ ﴾، لە نیشانەکانی پەروەردگارێتیی خوا، شەوگارو ڕۆژگارو خۆرو مانگن، کە خۆر لە ڕۆژگاردا دیارەو، مانگیش لە شەوگاردا، ﴿ لَا تَسْجُدُوا۟ لِلشَّمْسِ وَلَا لِلْقَمَرِ ﴾،

کڕنـووش مەبـەن نـە بـۆ خـۆرو، نـە بـۆ مانگیـش، ﴿وَٱسْجُدُوا۟ لِلَّهِ ٱلَّذِی خَلَقَهُنَّ﴾، کڕنـووش بـۆ ئـەو خوایـە ببـەن، کـە ئەوانـەی هێناوەتـە دی، ﴿إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ﴾، ئەگـەر ئێـوە بەڕاسـتیی خـوا دەپەرسـتن، ﴿فَإِنِ ٱسْتَكْبَرُوا۟﴾، ئنجـا ئەگـەر خۆیـان بەزلگـرت، لـەوە کـە کڕنـووش بـۆ خـوا بـەرن، ﴿فَٱلَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ﴾، ئەوانـەی لـەلای پەروەردگارتـن، کـە مەبەسـت پێـی فریشـتە زۆر لـە خـوا نیزیکەکانـە، چـی دەکـەن؟ ﴿يُسَبِّحُونَ لَهُۥ بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَهُمْ لَا يَسْـَٔمُونَ﴾، بـە شـەوو ڕۆژ پاکیـی بـۆ خـوا دەردەبـڕن و، مانـدووش نابـن، بـێ تاقـەت و وەڕەزیـش نابـن.

هەڵبەتـە لـە کۆتایـی ئـەم ئایەتـەدا سـەجدەی قورئـان خوێنـدن هەیـە، ئێمـەش لە کاتـی قورئـان خوێندنەکـەدا سـەجدەکەمان بـرد[1]، وەك عـادەتی خۆمـان لـە سـەرجەم شـوێنەکانی دیکـەی سـەجدەی قورئانخوێنـدن بـردن دا.

﴿وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنَّكَ تَرَى ٱلْأَرْضَ خَـٰشِعَةً﴾، هەروەهـا لـە نیشـانەکانی خـوا، نیشـانەکانی تەنیـا بەدیهێنەرایەتیـی و، تەنیـا پەروەردگارێتیـی و، تەنیـا خاوەنداریتیـی و، پاشـان تەنیـا پەرسـتراوێتیی خـوا، ئەوەیـە کـە: ﴿أَنَّكَ تَرَى ٱلْأَرْضَ خَـٰشِعَةً﴾، تـۆ زەوی دەبینـی ملکـەچ و زەبـوون، ﴿فَإِذَآ أَنزَلْنَا عَلَيْهَا ٱلْمَآءَ ٱهْتَزَّتْ وَرَبَتْ﴾، ئنجـا کاتێـك ئاومـان دابەزانـدە سـەری، جـووڵاو زیـادی کـردو هەڵاوسـا، واتـە: شـیناوردی لـێ دەڕوێ، جۆرەکانـی ڕووەکـی لـێ دەڕوێـن، لـە دارو درەخـت، لـە میوەجـات، لـە تـەڕەکار، لـە سـەوزە، لـە دانەوێڵـە، لـە گژوگیـا، پێشـێ ئـەو زەوییـە ملکەچـەو، زەبوونـە، وەك چـۆن کەسـێك هیچـی نیـە دەکرووزێتـەوەو، دەلاڵێتـەوە شـتێکی پـێ بـدرێ، ئـەو زەوییـە قاقـڕو دێمـەکارو بـێ ڕووەکـەش، هیـچ سـەوزایی لەسـەر نیـەو، هیـچ ژیانـی لەسـەر نیـە، بـەڵام کاتێـك ئاومـان دابەزانـدە سـەری، لـە شـێوەی بـاران و بەفـرو تـەرزەدا، ﴿ٱهْتَزَّتْ وَرَبَتْ﴾، جـووڵاو، زیـادی کـردو، هەڵاوسـا، ﴿إِنَّ ٱلَّذِىٓ أَحْيَاهَا لَمُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰٓ﴾، بـە دڵنیایـی ئـەو کەسـەی زینـدووی کردۆتـەوە، ژیێنـەرەوەی

---

(١) مەبەستە کاتی گوتنەوەی دەرسەکەیە.

مردووانـە، خـوا ئـەو زەوییـە مـردووە زینـدوو دەکاتـەوە سـاڵانە، لـە کاتـی خۆشـیدا مردووانیــش زینــدوو دەکاتــەوە و، ژیێنــەرەوەی مردووانــە، ﴿إِنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾، بـە دڵنیایـی ئـەو لەسـەر هەمـوو شـتێك بـە توانایـە.

واتـە: ئـەی خەڵکینـە! لـە ڕێـی نیشـانەکانی خـواوە، خـوای پەروەدگارتـان بناسـن و، لـە ڕێـی پێغەمبەرەکەیـەوە ﷺ گـوێ بـۆ فەرمایشـتەکەی بگـرن و، پابەندبـن بـە بەرنامەکەیــەوە، چونکــە کاتێــك دێ، دوای ئــەوەی دەمــرن، وەك چــۆن خــوا ﷻ سـاڵانە زەوی زینــدوو دەکاتــەوە، بەهــۆی دابەزاندنــی ئــاوەوە، کاتێکیــش دێ کــە ئێـوەش زینـدوو دەکرێنـەوەو، کۆدەکرێنـەوەو، لێتـان دەپرسرێتـەوەو، ڕووبـەڕووی سـزاو پاداشـتی خـوا دەبنـەوە.

کەواتـە: خەڵکینـە! کارێـك بکـەن، خۆتـان بـۆ ئـەو ڕۆژە ئامـادە بکـەن، کارێـك بکـەن وەڵامـی هەمـوو پرسیارەکان ئامادە بکـەن، کـە خـوا فەرمـووی: چـۆن ژیـان؟ بڵێـن ئـاوا ژیایـن، کـە خـوا فەرمـووی: کێتـان لـە هەمـوو کـەس زیاتـر خۆشویسـت و، کێتـان لـە هەمـوو کـەس لـە لا بەرزتـرو مەزنترو گەورەتـر بـوو، بـۆ کـێ زیاتـر لـە هەمـوو کـەس ملکەچتر بـوون، پشـتتان بـە کـێ دەبەسـت، ڕووی نیـازو مەبەسـتتان لـە کـێ دەکـرد، بەندایەتییتـان بـۆ کـێ دەکـرد؟ بڵێـن ئـەی خـوای پـەروەردگار! بـۆ تـۆ و، شـوێن پێغەمبـەری تـۆ کەوتیـن.

خـوا ﷻ لـەو کەسـانەمان بگێـڕێ بـە لوتـف و کەرەمـی خـۆی، کـە خـوا لـە دڵ و دەروونیانـدا لـە هەمـوو کـەس بەرزتـرو، شـیرینترو، بەڕێزتـرو، گەورەتـر بـێ و، بـە شـوێن پێـی پێغەمبەرەکەیـداو، بـە گوێگرتـن لـە ئایەتەکانـی، کار دەکـەن لەسـەر ڕۆژ بـە ڕۆژ زیاتـر کامڵتر کـردن و، قوڵکردنـەوەی ئیمانیـان، تاکـو ئـەو ئیمانـە ببێتـە داینەمۆیـەك و، جووڵێنـەرو بزوێنەرێکیـان کـە لـە ژیانـی دنیایانـدا، ڕاسـتە شـەقامی خـوا بگـرن و لێـی لانـەدەن، تاکـو هـەم لـە دنیـادا سـەربەرزو سـەرفراز بـن، هـەم لـە دواڕۆژیشـدا ڕوو سـووری بـەر دەرگای خوابـن.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**دابەزینـی فریشـتەکانی خـوا ﷻ بـۆ سـەر بڕوادارانـی ڕاوەسـتاوو نەلەخشـاوو، ئیلهـام بـۆ کردنیـان، کـە ترسـیان لەسـەر نیـەو، بـا خـەم و پەژارەیـان نەبـێ و، بـە بەهەشـت و پاداشـتی خـوا دڵخۆشـبن، ئەوانیـش (واتـە: فریشـتەکان) لـە ژیانـی دنیاو دواڕۆژدا دۆسـت و پشـتیوانیانن و، ئـەو بەهەشـتەی گفتیشـیان پێـدراوە، هەرچـی ئـارەزووی بکـەن و، بیخـوازن تێیدایـە، وەك کـەل و پـەل و پێداویسـتیی ئامادەکـراو بـۆ میـوان، ئەویـش لـە لایـەن خـوای لێبـوردەی میهرەبانـەوە:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُوا۟ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَـٰمُوا۟ تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا۟ وَلَا تَحْزَنُوا۟ وَأَبْشِرُوا۟ بِٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴿٣٠﴾ نَحْنُ أَوْلِيَآؤُكُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ ۖ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِىٓ أَنفُسُكُمْ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ ﴿٣١﴾ نُزُلًا مِّنْ غَفُورٍ رَّحِيمٍ ﴿٣٢﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:

١)- ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُوا۟ رَبُّنَا ٱللَّهُ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی گوتیان: پەروەردگارمان خوایە.

٢)- ﴿ثُمَّ ٱسْتَقَـٰمُوا۟﴾، دوایی ڕاوەستاو بوون و، دامەزراو بوون، واتە: دامەزراوو ڕاوەستاو بوون لەسەر نێوەڕۆکی ئەوەی گوتیان، ئەوە کە گوتیان: پەروەردگارمان خوایە، وشەی (رَبّ) لە زمانی عەرەبییدا بە مانای پەروەردگارو، خاوەن و، مشوورخۆرو پەرستراو دێ، واتە: پەرستراوو، مشوورخۆرو، خاوەن و، ژیێنەرو مرێنەری ئێمە، خوایە، ڕاوەستاوییش لەسەر نێوەڕۆکی ئەوە، واتە: لە خۆدا بەرجەستەکردنی ئەو ڕاستییانە،

کە ئەو مرۆڤانە جگە لە خوا، کەسی دیکە بە خاوەن و، پەروەردگارو، مشوورخۆرو، گەورەو سەروەری خۆیان نازانن، وشەی (ثُمَّ)ش لێرەدا بۆ ڕیزبەندیی پلەییە، ﴿ثُمَّ ٱسْتَقَـٰمُواْ﴾، واتە: ئەو وشەیە دەڵێن، بەڵام گرنگترو گەورەتر لەوەش ئەوەیە کە ڕاوەستاوو، دامەزراون لەسەر نێوەڕۆکی ئەو قسەیەی کردیان، نەك تەنیا لەسەر گوتنەکەی، چونکە ئەگەر هەزار جار بگوترێ: (رَبِّيَ الله)، یان (رَبُّنَا الله)، بەڵام لە ژیانی کردەییدا ئەوە بەرجەستە نەکرێ، هیچ سوودێك بە خاوەنەکەی ناگەیەنێ و، خوای پەروەردگاریش هیچ نرخ و بەهایەکی بۆ دانانێ.

## پێناسەیەکی (إسْتِقَامَة):

(إسْتِقَامَة) یانی چی؟!

١- یەکێك لە زانایان ئاوا پێناسەی دەکات دەڵێ: (**الإسْتِقامَةُ: هِيَ الثَّباتُ عَلَى شَرَائِط الإيْمَانِ بِجُمْلَتِها، مِنْ غَيْرِ إخْلالٍ بِشَيءٍ مِن أقْسَامِهَا**)، (**إسْتِقَامَة**): بریتیە لە چەسپاویی لەسەر مەرجەکانی ئیمان بە تێکڕایی و، بێ ئەوەی هیچ کام لە بەشەکانی بپەڕێنرێن، واتە: بە کۆی هەل و مەرجەکانی ئیمانەوە پابەندیی بکرێ، ئەوە پێی دەگوترێ: (**إسْتِقَامَة**).

هەڵبەتە وشەی (**إسْتِقَامَ**) لە کرداری (**قَامَ**)ەوە هاتوە، بەڵام (**سين**) و، (**تاء**) ی بۆ زیاد کراوە، (**قَامَ**) واتە: ڕاوەستا، (**إسْتَقَامَ**) واتە: باش ڕاوەستا، چونکە بنچینەیەك هەیە لە زمانی عەرەبییدا دەڵێ: (**زِيَادَةُ المَبْنَى، تَدُلُّ عَلَى زِيَادَةِ المَعْنَى**)، وشەیەك کە پیتەکانی زیاتربن، مانایەکەشی بەهێزترە، (**قَامَ**) واتە: هەڵسا، (**إسْتَقَامَ**) باش ڕاوەستاو هەڵسا، ئنجا ئەو ڕاوەستان و هەڵسانە، مەبەست پێی ڕاوەستانی ماددیی و بەرهەست نیە، بەڵکو مەبەست پێی ڕاوەستاویی و نەلەخشاوییە لەسەر ڕاستە شەقامەکەی خوا.

٢- هەندێکی دیکە لە زاناو شارەزایان لە پێناسەی (**إسْتِقَامَة**)دا گوتوویانە: (**الإسْتِقَامَة: الإقْرارُ بِالرُّبُوبِيَّةِ وَالقِيَامُ بِوَظَائِفِ العُبُودِيَّة**)، واتە: ئیستیقامەت: دانپێداهێنانە بە پەروەردگارێتیی خواداو، هەڵسانە بە ئەنجامدانی ئەرکەکانی بەندایەتیی بۆ خوا.

٣- هەندێکی دیکە (إسْتِقَامَة)یان ئاوا لێکداوەتەوە: (العِلْمُ: اليَقِيْنِي بِرُبُوبِيَّة الله، وَالعَمَلُ بِمُقْتَضى ذَلِكَ العِلْمِ)، (إسْتَقَامَة): بریتیە لە زانیاریی جێی دڵنیایی هەبوون بە پەروەردگارێتیی خواو، کارکردنیش بەپێی داخوازیی ئەو زانیارییە.

شـایانی گوتنیشــە: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَـٰمُواْ﴾، بـە دڵنیایــی ئەوانـەی گوتیـان: پەروەردگارمـان خوایـە، دواییـش ڕاوەسـتاوو دامـەزراو بـوون، ئەمـە هەمـووی دەبێتـە نیهـاد (مُبْتَـدَأ) و، گـوزارە (خَبَر)کـەی دوایـی دێ، کـە دەفەرمـوێ: ﴿تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ﴾، فریشـتەکان دادەبەزنــە سـەریان.

ئێسـتاش بـا سـەرنجی چەنـد قسـەیەکی عاریفێـکی گـەورەی پسـپۆڕ لـە بـواری خـۆ پـاك و چاککـردن (تزکیـة النفـس)دا بدەیـن:

(إبــن عجیبــة)، خاوەنــی: (البَحْـرُ المَدِيـد فِي تَفْسِـيرِ كِتَـابِ اللـهِ المَجِيـد)[1]، چەنـد قسـەیەکی جـوان دێنــێ، لـە بـارەی چەمـك و واتـای (إسْـتَقَامَة)ەوە:

**یەکەم:** (إسْتَقَامُوا عَلَى دَوَامِ الشُّهُودِ وَانفِرَادِ القَلْبِ بالمَعْبُودِ)، واتە: بەردەوام بوون و، ڕاوەستاو بوون لەسەر بەردەوام بینینی خوا بە دڵ و، دڵ یەکلابوونەوە بۆ پەرستراو، کە ئەو دڵە تەنیا خۆشەویستیی و سام و هەیبەت و تەسلیم بوونی خوای پەروەردگاری تێدابێ.

**دووەم:** (إسْتَقَامُوا عَلَى تَصْفِيَة العَقْدِ، ثُمَّ فِي تَوْفِيَةِ العَهْدِ، ثُمَّ فِي دَوَامِ القَصْدِ، ثُمَّ فِي دَوَامِ الوَجْدِ)، واتە: ڕاوەستاو بوون لەسەر ئەوەی ئەو گرێبەستەی لەگەڵ خوادا کردوویانە ساف بکەنەوەو، خڵتەی پێوە نەهێڵن، دوایی ئەو پەیمانەی لەگەڵ خوادا بەستوویانە، پەیمانەکە بە تەواویی جێبەجێ بکەن، دوایی ئەو نیازو مەبەستە کە لە دڵیاندا هەیە (کە بریتیە لە خوا پێ مەبەست بوون)، لەسەر ئەو نیازو مەبەستە سارد نەبنەوەو، بەردەوامبن، دواییش بەردەوام ئەم حاڵەتی دڵ کوڵین و، گەرم و گوڕیەیان بۆ خوای پەروەردگار بەردەوام بێ.

---

(١) ج٦، ص٣٤٤.

**سێیەم:** (**إسْتَقَامُوا بَأقْوَالِهِمْ، ثُمَّ بِأعْمَالِهِمْ، ثُمَ بِصَفَاءِ أحْوَالِهِمْ فِي وَقْتِهِمْ وَفِي مَآلِهِم**)، واتە: ڕاوەستاو بوون بە قسەکانیان، دوایی بە کردەوەکانیان، دوایی بەبێ خڵتەیی و سافیی حاڵەکانیان، هەم لە کاتی ئێستایان داو، هەم لە ئایندەشیاندا.

**چوارەم:** (**دَامُوا عَلَى طَاعَتِهِ، وَاسْتَقَامُوا فِي مَعْرِفَتِهِ، وَهَامُوا فِي مَحَبَّتِهِ، وَقَامُوا بِشَرَائِطِ خِدْمَتِهِ**)، واتە: بەردەوام بوون لەسەر فەرمانبەرییکردنی و، ڕاوەستاو بوون لە ناسینی داو، لە خۆشویستنیدا سەراسیمە بوون، (واتە: ئاگایان لە دەوروبەریان نەماوە)و بە مەرجەکانی خزمەتکردنی و، جێبەجێکردنی فەرمانەکانی هەڵساون.

٣)- ﴿تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ﴾، {بە دڵنیایی ئەوانەی گوتیان: پەروەردگارمان خوایەو، دواییش ڕاوەستاوو، دامەزراو بوون لەسەر ئەوە}، فریشتەکان دادەبەزنە سەریان.

٤)- ﴿أَلَّا تَخَافُواْ وَلَا تَحْزَنُواْ﴾، کە مەترسن و خەمبارو پەژارەدار مەبن.

ئەمە (**مَقُول قَول مَحْذُوف**)، گوتراوی قسەیەکی قرتێنراوە، یانی: (**قَائِلِينَ لَهُم**)، پێیان دەڵێن: ﴿أَلَّا تَخَافُواْ وَلَا تَحْزَنُواْ﴾، مەترسێن و، خەمبارو پەژارەداریش مەبن، واتە: بۆ داهاتوو مەترسێن و، بۆ ڕابردووش پەژارەدار مەبن.

٥)- ﴿وَأَبْشِرُواْ بِٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ﴾، دڵخۆشیش بن، موژدەتان لێ بێ بەو بەهەشتەی موژدەتان پێدەدرا، کە پێشتر لە کتێبی خوادا خوێندووتانەتەوەو، گوێبیستی بوون، موژدەتان لێ بی ئەو بەهەشتەشتان مسۆگەرە.

زانایان باسی ئەوەیان کردوە کە ئایا ئەو دابەزینی فریشتان بۆ سەر بڕواداران، چ وەختێکە؟ هەندێکیان گوتوویانە: لە کاتی گیانەڵاو گیان کێشران و مردن دایە، هەروەها کاتێ جەستە دەخرێتە نێو گۆڕو، لە کاتی زیندووکرانەوەدایە، واتە: لەو سێ حاڵەتەدایە.

هەندێکیش گوتوویانە: مەبەست ئەوە نیە: لە کاتی مردن و، لە کاتی خرانە نێو گۆڕو، لە کاتی زیندوو کرانەوەدا، بەڵکو فریشتەکان لەگەڵ بڕواداراندان

لـە هەمـوو حاڵەتانـدا، وەك ئایەتەکـەش هـەروا دەگەیەنـێ و منیـش ئـەو ڕایـەم پـێ ڕاسـتەو ڕواڵـەتی بێـژەکانی ئایەتەکانیـش هـەر ئـەوە دەگەیەنـێ.

٦)- ﴿ نَحۡنُ أَوۡلِيَآؤُكُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ ﴾، ئێمە دۆست و پشتیوانی ئێوەین لە ژیانی دنیاداو، لە دارۆژیشدا، واتە: خوای پەروەردگار فریشتەکان ئەو مەخلووقە پاك و بێگەردو چاکانەی تەرخانکردوون، کە سەروبەری کاروباری مرۆڤەکان بکەن، هەر کەسە بە پێی خۆی، چونکە کافرەکانیش هەر فریشتەکان گیانیان دەکێشن و، هەر ئەوانیش لە قۆناغی بەرزەخدا سزایان دەدەن، هەروەك چۆن فریشتەکان گیانی بڕواداران دەکێشن و، لە قۆناغی بەرزەخدا نازو نیعمەتیان بۆ دێننە پێش و، قسەی خۆشیان لەگەڵ دەکەن، هی بێبڕوایانیش هەر وایە، بەڵام بە پێچەوانەی حاڵی بڕوادارانەوە.

کەواتـە: فریشـتەکان لەگـەڵ بـڕواداران دان، وەك دۆسـت و پشـتیوان و نیزیـك و مشـوورخۆر، لـە دنیـاو، لـە دوارۆژدا، ئنجـا مانـای وایـە: کاتـی مردنیـش دەگرێتـەوەو، کاتـی گیـان کێشران و، کاتـی خرانە نێو گۆڕیـش دەگرێتـەوەو، کاتـی زیندووکرانەوەش دەگرێتـەوە، بـەڵام جگـە لـەو کاتانـەش هـەر دەگرێتـەوە.

کـە دەڵێـن: ﴿ أَلَّا تَخَافُواْ وَلَا تَحۡزَنُواْ ﴾، (**خَوف**) ئـاوا پێناسـە کـراوە: (**الخَوْفُ: غَـمٌّ فِي النَّفْـسِ يَنْشَـأُ عَـنْ ظَـنِّ حُصُـولِ مَكْـرُوهٍ شَـدِيدٍ**)، تـرس (خـوف) بریتیـە لـە گرێیـەك کـە لـە دڵـدا پەیـدا دەبـێ، بەهـۆی گومـان بـردن بـە پەیدابوونـی خراپەیـەك لـە داهاتـوودا.

(**حُزن**)یـش ئـاوا پێناسـە کـراوە: (**الحُـزْنُ: غَـمٌّ فِي النَّفْـسِ يَنْشَـأُ عَـنْ وُقُـوعِ مَكْـرُوهٍ، بِفَـوَاتِ نَفْـعٍ، أَوْ حُصُـولِ ضُرٍّ**)، پـەژارە (حُـزن): بریتیـە لـە گـرێ و نارەحەتییـەك کـە لـە دڵـدا پەیدادەبـێ، بـە هـۆی چاوەڕێکردنـی هاتنـە دی شـتێکی خـراپ، کـە سـوودێکت لـە دەسـت بچـێ، یاخـود زیانێکـت بەسـەر بـێ.

کەواتـە: فریشـتەکان کـە دەبنـە هـاوڕازو هاونشـینی بـڕواداران، تـرس و دڵەڕاوکەیـان بـە نسـبەت داهاتـووەوە لـە دڵ و دەروون دەردێنـن و، خـەم و پـەژارەو

مەراقیشیان بە نسبەت ڕابردووەوە لە دڵ دەرداوێن، سەرەنجام دڵ و دەروونیان پاك دەكەنەوە لە ترس و لەرزو دڵەڕاوكە، بەنسبەت داهاتووەو، لە غەم و پەژارەش بە نسبەت ڕابردووەوە.

دوایی دەفەرموێ: ﴿ نَحْنُ أَوْلِيَآؤُكُمْ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْأٓخِرَةِ ﴾، ئێمە دۆست و پشتیوانی ئێوەین لە ژیانی دنیاو، لە دوارۆژیشدا، واتە: لە هەردوو مەنزڵگاكاندا ئێمە مشوورخۆرتانین، كاروبارەكانتان بەڕێوەدەبەین.

٧)- ﴿ وَأَبْشِرُواْ بِٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِيٓ أَنفُسُكُمْ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ ﴾، موژدەشتان لێ بێ بەو بەهەشتەی بەڵێنتان پێدەدرا، بۆ ئێوە لەو بەهەشتەدا هەیە، هەر شتێك نەفستان ئارەزووی بكات، هەر شتێك دڵتان بۆی بچێ و، دەروونتان بیخوازێ، هەروەها هەر شتێكیش داوای بكەن.

﴿ تَدَّعُونَ ﴾، (**إِفْتِعَالٌ مِنَ الدُّعَاء**)، (**إِدِّعَاء**) لەسەر وەزنی (**إِفْتِعَال**)ە، لە (**دُعَاء**)وە هاتوە، (**دُعَاء**) یانی: (**طلب**) داواكردن، (**إِدِّعَاء**) كە حاڵەتی (**إِفْتِعَال**) ەكەیەتی، واتە: زۆر داواكردن، یانی: هەر شتێك ئێوە بە ئاواتی دەخوازن بۆتان دێتە دی، كەواتە: فریشتەكان موژدەیان پێدەدەن كە بۆ ئێوە لەو بەهەشتەدا هەیە، هەر شتێك هەستەوەرەكانتان لەززەتی لێ بكەن، چاو لەززەت لە بینینی بكات و، گوێ لەززەت لە بیستنی دەنگی خۆشی بكات، هەروەها هەستەكانی دیكە، هەستی تامكردن (**ذوق**) و، بۆنكردن (**شم**)و، دەست لێدان (**لَمس**)، وێڕای ئەوەش بۆ ئێوە هەیە، هەر شتێك كە بە دڵتاندا بێ و، بە ئاواتی بخوازن، یانی: هەرچێ كە لە دڵتاندا دێ و دەچێ، با لەبەرچاویشتان نەبێ، بەڵام هەر بەدڵتان دابێ، لەوێدا خوای پەروەردگار بۆتان فەراهەم دێنێ و، دەستەبەری دەكات.

٨)- ﴿ نُزُلًا مِّنْ غَفُورٍ رَّحِيمٍ ﴾، ئا ئەو نازو نیعمەتە هەمووی میوانداریيە، لەلایەن خوای لێبوردەی بەبەزەییەوە، چونكە وشەی (**نُزُل**) دەڵێ: (**والنُّزُل: ما يُهَيَّأُ لِلضَّيْفِ مِنَ**

القِرَى، وهو مُشْتَقٌّ مِنَ النُّزُولِ؛ لِأَنَّهُ كَرامَةُ النَّزِيلِ، وهو هُنا مُسْتَعارٌ لِما يُعْطَوْنَهُ مِنَ الرَّغائِبِ سَواءٌ كانَتْ رِزْقاً أَمْ غَيْرَهُ)، واتە: (نُزُل) ئەوەیە کە بۆ میوان ئامادە دەکرێ و، خزمەتی میوانی پێ دەکرێ، ئەم وشەیە لە (نُزُول)، داتاشراوە واتە: دابەزین، چونکە ئەوەی بۆ میوان ئامادە دەکرێ، تاکو خزمەتی میوانەکەی پێ بکرێ، ڕێز لێگرتنە بۆ بابای دابەزیو، واتە: عادەت وابووە ئەو کەسەی میوان بووە سواری وڵاخێك بووە، دوایی دابەزیوە لە لای خانەخوێیەکە، بۆیە پێیان گوتوە: (نَزِیل) دابەزیو، بە میوانیان گوتوە: (نَزِیل)و، بەوەی کە بۆشی ئامادە کراوە، پێیان گوتوە: (نُزُل)، لێرەدا (نُزُل) واتە: ئەو خواردنەی بۆ میوان ئامادە دەکرێ، خوازراوەتەوە بۆ هەر شتێك کە پێیان بدرێ بە بەهەشتییەکان، لەوەی ئارەزووی دەکەن، ئنجا لە خواردن و خۆراك بێ، یان بەرگ و پۆشاك بێ، یاخود ئامرازی سواریی بێ، یاخود هەموو ئەو شتانەی مرۆڤ لەززەتیان لێ دەکات و، پێی خۆشن، واتە: مەرج نیە، تەنیا مەبەست پێی خواردن و خواردنەوە بێ.

## کورتە باسێک لە بارەی

## هاوەڵێتیی فریشتان بۆ بڕواداران و، شەیتانەکان بۆ بێبڕوایان

لـە سـووڕەتی (**الأعراف**)یشـداو، ڕەنگـە لـە شـوێنی دیکەشـدا کـەم و زۆر، باسـی ئـەو بابەتەمـان کـردوە، کـە فریشـتەکان هـاودەم و هـاوڕازو هاونشـین و، دۆسـت و نیزیکـی بڕوادارانـن و، شـەیتانەکانیش هـاودەم و هـاوڕازو هاونشـین و، دۆسـت و نیزیکـی بێبڕوایەکانـن، ئـەم کورتـە باسـەش لـە چـوار بڕگـەدا، دەخەینـە ڕوو:

### ١- هەر دروستکراوێك لە شێوەی خۆی و، بە گوێرەی سرووشتی خۆی، دروستکراوانی دیکە، بۆ لای خۆی پەلکێش دەکات و، بە لاشـیاندا پەلکێش دەکرێ:

بـۆ نموونـە: گـوڵ بولبـول پەلکێـش دەکات، بولبـول بـە لای گوڵـدا پەلکێـش دەکـرێ، هەمیشـە بولبـول و گـوڵ پێکـەوە بـاس دەکرێـن، بولبـول کـە باڵندەیەکـی نـەرم و ناسـکە، زۆر دەنگخۆشـە، مەگـەر چـۆن دەنـا بولبـوول بـۆ سـەر گوڵـەوە نەبـێ نانیشـێ، ئنجـا لەسـەر ئـەو گوڵـە ئـاوازی خـۆش دەخوێنـێ و، دەچریکێنـێ و، دەجریوێنـێ، شـاعیرێکی فـارس دەڵـێ:

> بُلْبُل أزفَيضِ گُل آموخت سُخَنْ ورُنَه نَبود
> إين هـمه قَوْل وغَـزَل تعبيه در منقارش

دەڵـێ: بولبـوول لـە خۆشویسـتنی گوڵـەوە فێـری قسـەکردن بـوو، ئەگەرنـا ئـەو هەمـوو شـیعرو سروودە لـە دەندووکـی ویـدا شـێردراوە نەبـوون، بەڵام خۆشەویسـتیی گـوڵ و جوانیـی گـوڵ بولبوولـی هێنایـە گـۆ، کـە هەمیشـە دەجریوێنـێ و دەچریکێنـێ و، بـە ئـاوازی خـۆش دەخوێنـێ!

هەروەهـا هەنـگ و شـیلەی گـوڵان، هەنـگ کـە مەخلووقێکـی چاکـەو، سرووشـتەکەی پاکـە، دەگـەڕێ لـە کـوێ شـیلەی چـرۆی گوڵێـك هەبـێ، دەیمـژێ و، دوایـی هەنگوینـی لـێ دروسـت دەکات، واتـە: ئـەو دووانـەش پێکـەوە سرووشـتیان لێـك نیزیکـە، بـەڵام بـە پێچەوانـەوە: مێشـە ڕەشـە بەسـەر شـتی پیسـەوە نەبـێ نانیشـێ، ئـەو مێشـە ڕەشـەی کـە مـرۆڤ بێـزارو جـاڕز دەکات، هـەر دەفـڕێ و دێتـەوە، کـە هەندێـك دەڵێـن: (سُمِّيَ الذُّبَابُ ذُبَابَاً لأنَهُ كُلَّمَا ذُبَّ آبَ)، مێـش بۆیـە پێـی گوتـراوە: (ذُبَاب) بـە عەرەبیـی، چونکـە هەتـا دەردەکـرێ هـەر دێتـەوە، (ذُبَّ) یانـی: (طُرِدَ)، دەرکـرا، (آبَ) یانـی: (رَجَعَ)، گەڕایـەوە، مێـش ئەگـەر لـە نێـو گـوڵ و گوڵزارێـك بەرهەڵـدای بکـەی، بەسـەر هیـچ گوڵێکـەوە نانیشـێت، دەگـەڕێ لـە کـوێ خاڵێکـی پیسـی ڕەش هەیـە، بـە ئەوێـوە دەنیشـێ، سرووشـتەکەی وایـە، ئەویـش لـە قـەدەر سرووشـتی خـۆی شـت پەلکێـش دەکات و، بـە لای شـتەوە پەلکێـش دەبـێ.

هەروەهـا قالۆنچـەو ڕیـخ، یـان شـیاکە، قالۆنچـە ڕەشـە، ڕیـخ و شـیاکە دەکاتـە گلۆڵـە، دەیکاتـە تـۆپ و، وەپێـش خـۆی دەدا، بـە تایبەتـی ئەوانـەی لـەلادێ بـوون ئـەو دیمەنـە زۆر شـتێکی بەرچـاوە، ئـەوە بـە نسـبەت ژیاندارانـەوە.

هەروەهـا بـۆ بـێ ژیانانیـش، موگناتیـس مـاددەی ئاسـن پەلکێـش دەکات و، بـە لای مـاددەی ئاسـندا پەلکێـش دەبـێ، بـەڵام موگناتیـس نـە فافـۆن، نـە مـس، نـە زێـڕو، زیـو، نـە تەختـە، ئەوانـە بـەلای خۆیـدا ڕاناکێشـێ و، بەلاشـیاندا کێـش ناکـرێ.

لەو بارەوە پەندیش زۆرن، بۆ وێنە:

پەندێکـی عەرەبیـی هەیـە، دەڵـێ: (الطُّيُـورُ عَـلَى أَشْكَالِهَا تَقَعُ)، واتـە: باڵنـدەکان لەگـەڵ شـێوەی خۆیانـدا دەگونجێـن و، لەگـەڵ شـێوەی خۆیانـدا دەبـن، کۆتـر لەگـەڵ کۆتـر، کـەو لەگـەڵ کـەو، هەرگیـز نەبینـراوە کۆتـر لەگـەڵ کـەو، یـان مراویـی لەگـەڵ سیسـارك، یـان بولبـول لەگـەڵ لەقلـەق، نەخێـر، بەڵکـو بولبـوول لەگـەڵ بولبـوول و، لەقلـەق لەگـەڵ لەقلـەق و، کـەو لەگـەڵ کـەوو، کۆتـر لەگـەڵ کۆتـر.

پەندێکی دیکەی عەرەبیی هەیە، دەڵێ: (**لا تَسأَلْ عَنِ المَرءِ وَسَلْ عَنْ قَرينَهُ، فَكُلُّ قَرِينٍ بِالمُقَارِنِ يَقْتَدِي**)، واتە: لە مرۆڤ مەپرسە کێیە، لە هاوەڵەکانی بپرسە؟ چونکە هەر کەسە چاو لە هاوەڵی خۆی دەکات، یاخود هەر کەسە هاوەڵی لە قەدەر خۆی دەدۆزێتەوە.

هەروەها پەندی کوردییشمان لەو بارەوە هەن، بۆ وێنە:

١- دەڵێن: (دیزە خلۆربۆوە دەرخۆنەی دیتەوە)، دەرخۆنە شتێك بووە لەسەر دیزەیان داناوە، سەری دیزەکەیان پێ گرتوە.

٢- دەڵێن: (کورتە کەژێ لێك دەهەژێ).

٣- دەڵێن: (تەیری گول عاشقی داری ژەقنەمووتە).

کەواتە: ئەوە شتێکی سەلمێنراوە کە دروستکراوەکان، هەر کامێکیان دەگەڕێ بۆ هاوشێوەی خۆی، وەك گوتراوە: (**يُحْشَرُ المَرْءُ عَلَى دِينِ خَلِيلِهِ، فَلْيَنْظُرْ أَحَدُكُمْ مَنْ يُخَالِلُ**)، واتە: مرۆڤ لەسەر ڕێبازی دۆست و خۆشەویستەکەی خۆی کۆدەکرێتەوەو، بەرێ دەکرێ {بەرەو بەهەشت، یان بەرەو دۆزەخ}، ئنجا یەکێك لە ئێوە با جوان سەرنج بدات، لەگەڵ کێدا دۆستایەتیی دەگرێ و، کێی خۆشدەوێ و، بەرەو کێ پەلکێش دەبێ، هەر کەسە لەگەڵ دۆست و ڕەفیق و نیزیکەکانی خۆیدا کۆ دەکرێتەوە، تۆ کەسێکت خۆشبوێ و سەرسام بی بە ڕێبازەکەی و، بە شێوازەکەی و، بەوەی لەسەری دەڕواو، ئەو شێوە ژیانەی پێی دەژیی، تۆش لەگەڵ ئەودا دەبی، ئنجا ئەگەر چاك بێ، یان خراپ.

## ٢- بڕوادارانی پارێزکار لەگەڵ فریشتاندا نیزیك و هاونشینن:

ئـەم ڕاسـتییە لـە زۆر جێـی قورئانـدا خـوای کارزان و میهرەبـان خسـتوویەتە ڕوو، کـە ئینسـانی بـڕوادار، هەتـا ئیمانەکـەی باشـتربێ و، هەتـا زیاتـر ئەهلی ئیـمان و پارێز بـێ، لەگـەڵ فریشـتە پـاك و چاکەکانـی خـوای پـەروەردگاردا نیزیکـترەو، فریشـتەکان زیاتـر لێـی نیزیـك دەبـن و، زیاتـر دەتوانـن بەهـرەی پـێ بگەیەنـن، چونکـە مـرۆڤ هیـچ بەهرەیـەك بـە فریشـتەکان ناگەیەنـێ، بەڵکـو مـرۆڤ بەهـرە وەردەگـرێ لـە فریشـتان، ئنجـا بـە ئەنـدازەی ئیـمان و تەقـوای، مـرۆڤ بەهـرە لـە فریشـتەکان وەردەگـرێ، لـەو بـارەوەش بەڵگـە زۆرن، بـۆ نموونـە:

١- لە سوورەتی (**فُصِّلَتْ**)دا خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَٰمُواْ تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُواْ وَلَا تَحْزَنُواْ وَأَبْشِرُواْ بِٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴿٣٠﴾ نَحْنُ أَوْلِيَآؤُكُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِىٓ أَنفُسُكُمْ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ ﴿٣١﴾ نُزُلًا مِّنْ غَفُورٍ رَّحِيمٍ ﴿٣٢﴾﴾، واتە: بە دڵنیایی ئەوانەی گوتیان: پەروەردگارمان خوایە[1]و، دواییش ڕاوەستاوو، نەلەخشاو بوون، ئەوانە فریشتەکان دادەبەزنە سەریان، پێیان دەڵێن: ﴿أَلَّا تَخَافُواْ﴾، پێشێ ترس و دڵەڕاوکەی داهاتوویان لە دڵدا لادەبەن، ﴿وَلَا تَحْزَنُواْ﴾، ئنجا دڵیان مشت و ماڵ دەکەن و، پاکی دەکەنەوە لە غەم و پەژارەی ڕابردوو، دواییش هەر بەوەندە لێیان ناگەڕێن، ﴿وَأَبْشِرُواْ بِٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴿٣٠﴾﴾، دڵخۆشیشیان دەکەن بەو بەهەشتەی کە پێشتر بەڵێنیان پێدراوە، دواییش بۆیان تەئکید دەکەنەوە، ﴿نَحْنُ أَوْلِيَآؤُكُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ﴾، ئێمە دۆست و نیزیك و پشتیوانتانین لە ژیانی دنیاو، لە دوارۆژیشدا.

---

(١) ئـەوەی گوتوویانـە ئـەو حەقیقەتـە لـە دڵیانـدا هەبـووە، ئەگەرنـا گوتنـی بـە زمـان هیـچ نیـە، بـەڵام دوای ئـەوەی لـە دڵـدا چەسـپاوە، ئنجـا بـە زمانیـان گوتـراوە، ئەگەرنـا گوتراوێـك لـە دڵـدا چەسـپاو نەبـێ، خاوەنەکـەی لێـی بەهرەمەنـد نابێـت.

بۆیـە ئەوانـەی وایـان لێکداوەتـەوە کـە تەنیـا لـە کاتـی سـەرەمەگدا فریشـتەکان دادەبەزنـە سـەر بـڕواداران و، لـە کاتـی خرانـە نێـو گـۆڕو، لـە کاتـی زیندووکرانـەوەدا، لـە ڕاسـتییدا چەمـك و واتـای ئایەتەکەیـان زۆر بەرتەسـك کردۆتـەوە، بەبـێ بەڵگـە، چونکـە خـوای پـەروەردگار لەسـەر زاری فریشـتەکان دەفەرمـوێ: ﴿ نَحْنُ أَوْلِيَآؤُكُمْ ﴾، ئێمـە دۆسـت و پشـتیوانی ئێوەیـن، لـە کـوێ؟ ﴿ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ﴾، کەواتـە: فریشـتەکان هـەر لـە سـەرەتای ژیانـی دنیـاوە تاکـو کۆتایـی دۆسـت و پشـتیوانمانن، ﴿ وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ ﴾، لـە مەنزڵـگای کۆتاییشـدا، لەوێـش فریشـتەکان هـەر لەگـەڵ بڕواداراندان، مشـووریان لـێ دەخـۆن و، سەرپەرشـتییان دەکـەن، لـە دنیـادا سـینەیان گوشـاد دەکـەن و، دڵیـان خـۆش دەکـەن و، شـتی چاکیـان فێـر دەکـەن و، لـە خراپـە دەیانگێڕنـەوەو، خراپەیـان لـەلا قێـزەون دەکـەن و، چاکەیـان لـەلا شـیرین دەکـەن و، تاعەتیـان بـۆ ئاسـان دەکـەن و، لـە بەرانبـەر دوژمنـدا دڵیـان بەهێـز دەکـەن، وەك دوایـی باسـی دەکەیـن.

٢- بەڵگەیەکی دیکە لەو بارەوە کە بڕوادارانی پارێزکار لەگەڵ فریشتاندا نیزیك و هاونشینن، ئەو ئایەتە موبارەکەیە کە خوا لە سوورەتی (**الأنْفَال**)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿إِذْ يُوحِى رَبُّكَ إِلَى ٱلْمَلَـٰٓئِكَةِ أَنِّى مَعَكُمْ فَثَبِّتُوا۟ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ۚ سَأُلْقِى فِى قُلُوبِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلرُّعْبَ فَٱضْرِبُوا۟ فَوْقَ ٱلْأَعْنَاقِ وَٱضْرِبُوا۟ مِنْهُمْ كُلَّ بَنَانٍ ﴿١٢﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ شَآقُّوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ۚ وَمَن يُشَاقِقِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَإِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿١٣﴾﴾، واتە: یاد بکەوە کاتێك پەروەردگارت سروشی دەکرد بۆ فریشتەکان، (واتە: بە شێوەی پەنامەکیی و پەنهان پێی دەفەرموون و، پێی ڕادەگەیاندن)، کە من لەگەڵتانم، ﴿ فَثَبِّتُوا۟ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾، ئێوەش، ئەوانەی بڕوادارن بیانچەسپێنن، دڵیان بچەسپێنن و، پێیان بچەسپێنن و، ورەیان بەرز بکەنەوە، ﴿ سَأُلْقِى فِى قُلُوبِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلرُّعْبَ ﴾، بە دڵنیایی من ترس و بیم دەخەمە دڵی ئەوانەی بێبڕوان، ئەویش هەر لە ڕێی فریشتەکانەوە خوا ترس دەخاتە دڵی بێبڕوایان و، دامەزراویی و نەلەخشاوییش دەخاتە دڵی بڕوادارانەوە.

٣- بەڵگەیەکی دیکە لەو بارەوە، ئەوەیە کە خوا لە سوورەتی (غَافِر)دا، دەفەرمویٚ: ﴿ ٱلَّذِينَ يَحۡمِلُونَ ٱلۡعَرۡشَ وَمَنۡ حَوۡلَهُۥ يُسَبِّحُونَ بِحَمۡدِ رَبِّهِمۡ وَيُؤۡمِنُونَ بِهِۦ وَيَسۡتَغۡفِرُونَ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ رَبَّنَا وَسِعۡتَ كُلَّ شَيۡءٖ رَّحۡمَةٗ وَعِلۡمٗا فَٱغۡفِرۡ لِلَّذِينَ تَابُواْ وَٱتَّبَعُواْ سَبِيلَكَ وَقِهِمۡ عَذَابَ ٱلۡجَحِيمِ ٧ ﴾، واتە: ئەوانەی کە عەرش هەڵدەگرن و، ئەوانەش کە بە دەوری عەرشەوەن، بە ستایشکردنەوە پەروەردگاریان بە پاك دەگرن و، بڕوای پیٚ دیٚنن و، داوای لیٚبوردن دەکەن بۆ ئەوانەی بڕوایان هیٚناوە، دەڵیٚن: پەروەردگارمان! زیانیاریی و بەزەیی تۆ هەموو شتیٚکی گرتۆتەوە، لەوانە ببوورە کە بەرەو لای تۆ گەڕاونەوەو، شویٚن ڕیٚبازەکەت کەوتوون، لە سزای کڵپەی دۆزەخ چەپاڵەیان بدەو بیانپاریٚزە.

کەواتـە: بـەردەوام هەڵگرانـی عەرشـی خـواو، دەورەدەرانـی عەرشـی خـوا، کـە فریشـتەکانن، ویٚـڕای بـە پاکگرتـن و ستایشـکردنیان بـۆ خـواو، بـڕوا هیٚنانیـان بـە خـوا، داوای لیٚبوردنیـش بـۆ بـڕواداران دەکـەن.

٤- هەروەها لە سوورەتی (الشورى)دا خوا دەفەرمویٚ: ﴿ لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۖ وَهُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡعَظِيمُ ٤ تَكَادُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ يَتَفَطَّرۡنَ مِن فَوۡقِهِنَّۚ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يُسَبِّحُونَ بِحَمۡدِ رَبِّهِمۡ وَيَسۡتَغۡفِرُونَ لِمَن فِي ٱلۡأَرۡضِۗ أَلَآ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ٥ ﴾، واتە: حوکمڕانیی ئاسمانەکان و زەوی هی خوایەو، ئەو بەرزی مەزنە، ئاسمانەکان نیزیکە لە لای سەرێیانەوە شەق ببن و، فریشتەکان بە ستایشکردنەوە پەروەردگاریان بە پاك دەگرن و، داوای لیٚبوردنیش بۆ ئەوانە دەکەن کە لەسەر زەویین، (ئەوانەی لەسەر زەوین مرۆڤن و، جندن، بە تایبەت ئەوانەی ئەهلی ئیمانن)، ئاگاداربن! هەر خوا زۆر لیٚبوردەی بە بەزەییە.

هەڵبەتـە دەگونجـیٚ ئایەتـی دیکـەش لـەو بـارەوە بیٚنیـن، هەروەهـا فەرمایشـتی پیٚغەمبەریـش ﷺ بـەڵام ئەوەنـدە بەسـن، بـۆ ئیسـپاتی ئـەوەی کـە فریشـتەکان لەگـەڵ بڕوادارانـدا هـاودەم و هـاوڕازو هاونشـینن.

## ٣- بێبڕوایان لەگەڵ شەیتانەکاندا نیزیك و گونجاون:

شەیتانەکان واتە: ئەو جندە شەیتانانەی کە خراپەکارو بێبڕوان، لەگەڵ مرۆڤە بێبڕوایەکاندا ئەوانیش هاوڕازو هاونشینن:

١- وەك لە سوورەتی (**فُصِّلَت**)دا هاتوە، کە پێشتر باسمان کرد لە ئایەتی ژمارە (٢٥)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَقَيَّضْنَا لَهُمْ قُرَنَاءَ فَزَيَّنُوا لَهُم مَّا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ ﴾، واتە: چەند هاوڕازو هاونشینێکمان بۆ ئامادەکردن کە گوناهو تاوانەکانیان، هی پێش دەستیان و هی دوایان، (یاخود هەموو جۆرە گوناهو تاوانەکانیان، یان ئەوانەی کە پەیوەندییان بە دنیاوە هەیە، یان پەیوەندییان بە ڕۆژی دواییەوە هەیە)، بۆ جوانکردن.

٢- هەروەها لە سوورەتی (**الزخرف**)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يَعْشُ عَن ذِكْرِ الرَّحْمَٰنِ نُقَيِّضْ لَهُ شَيْطَانًا فَهُوَ لَهُ قَرِينٌ ﴿٣٦﴾ وَإِنَّهُمْ لَيَصُدُّونَهُمْ عَنِ السَّبِيلِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ ﴿٣٧﴾ ﴾، واتە: هەر کەسێك لە بەرانبەر یادی خوای خاوەن بەزەییدا، (یان لە بەرانبەر قورئان و کتێبی خوای خاوەن بەزەییدا)، کوێر و نابینا بێ، شەیتانێکی بۆ ئامادە دەکەین دەبێتە هاوڕازو هاونشین و نیزیکی و، دەبێتە جووتی و، لەگەڵی دەبێ، بە دڵنیایی ئەوان، [شەیتانە بێبڕوایەکان] مرۆڤەکان لە ڕێ لادەدەن، کەچی مرۆڤە بێبڕوایەکان وادەزانن ڕێی ڕاستیان گرتوە!

ئاوا شەیتانەکان کڵاویان لەسەر دەنێن و هەڵیان دەخەڵەتێنن.

٣- هەروەها لە سوورەتی (**الأَعْراف**) لە ئایەتی ژمارە (٢٧)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا جَعَلْنَا الشَّيَاطِينَ أَوْلِيَاءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٢٧﴾ ﴾، واتە: ئێمە شەیتانەکانمان کردوون بە دۆست و نیزیکی ئەوانەی بڕوا ناهێنن، ئەمە زۆر ڕوونە کە هەر کەسێك بێبڕوابێ شەیتان لێی نیزیکە، شەیتانەکان دەورو خولیان دەدەن و، لێیان نیزیکن و، زیانیان پێ دەگەیەنن.

٤- هەروەها لە سوورەتی (**الأَنْعَام**) لە ئایەتی ژمارە (١٢١)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّ الشَّيَاطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰ أَوْلِيَائِهِمْ لِيُجَادِلُوكُمْ ۖ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ ﴿١٢١﴾ ﴾،

واتە: بە دڵنیایی شەیتانەکان سروش دەکەن بۆ دۆستەکانی خۆیان، (پەیامی پەنامەکییان بۆ دەنێرن، واتە: بۆ مرۆڤە کافرەکان، ئەی مسوڵمانینە! تاکو ئەو کافرە بێبڕوایانە)، شەڕە قسە لەگەڵ ئێوەدا بکەن، ئەگەر ئێوەش فەرمانبەرییان بۆ بکەن، ئێوەش دەبن بە هاوبەش بۆ خوا دانەر.

ئێمە لە تەفسیری سووڕەتی (**الأَنْعَام**)دا، واتە: لە بەرگی پێنجەمی ئەم تەفسیرە کوردییەمان دا، بە درێژیی لەو بارەوە قسەمان کردوە، کە کافرەکان لەگەڵ بڕواداران دا موناقەشەیان دەکردو، هۆی هاتنە خوارەوەکەیشمان باسکردوە، کە کافرەکان شەڕە قسەیان دەکرد لەگەڵ بڕواداراندا، دەیانگوت ئێوە ئەو ئاژەڵەی بۆ خۆتان دەیکوژن و سەری دەبڕن، گۆشتەکەی دەخۆن، بەڵام ئەوەی خوا دەیکوژێ و مردارە، گۆشتەکەی ناخۆن، ئنجا خوا ﷻ ئەم شەڕە قسەیە پاڵ دەداتە لای شەیتانەکان، کە ئەوان فێریان کردوون، بە خوتخوتەو دندانی شەیتانەکان فێری ئەو قسەیە بوو بوون، کە قسەیەکی بێ جێشە، چونکە لە ڕاستییدا ئەو ئاژەڵەی مرۆڤیش سەری دەبڕێ، هەر بە مۆڵەتی خوا ژیانی تێدا نامێنێ و، ئەوەش کە مردار دەبێتەوە، هەر بە مۆڵەتی خوا ژیانی تێدا نامێنێ، بەڵام ئەوەی سەر دەبڕدرێ، بەشێکی زۆری خوێنەکەی کە لە جەستەی جیا دەبێتەوە، هەرچی شتی زیانبەخشە لە جەستەیدا، وەك کۆلسترۆڵ لەگەڵ خوێنەکەی دەچێتەدەر، بەڵام ئەوەی کە مردار دەبێتەوە، هەر لەنێو جەستەیدا دەمێنێتەوە، کەواتە: لە ڕووی پزیشکییەوەو، لە ڕووی تەندروستییەوە خوای پەروەردگار بە خراپی زانیوە، بۆیە قەدەغەی کردوە، بە تەئکید خوا هیچ شتێکی قەدەغە نەکردوە، مەگەر زیانی بۆ مرۆڤەکان هەیە، هەروەك هیچ شتێکی بۆ حەڵاڵ نەکردوون، مەگەر پاك و چاکە، وەك خوا ﷻ لە سووڕەتی (**الأَعْراف**)دا، دەفەرموێ: ﴿وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡخَبَٰٓئِثَ﴾، خوا شتە پاك و چاکەکانیان بۆ حەڵاڵ دەکات و، شتە پیس و زیانبەخشەکانیان لێ قەدەغە دەکات.

### ٤- وێنەی فریشـتەو، شەیتانان وەك وێنـەی شـەپۆلـە دەنگیی و ڕەنگییەکانن:

فریشـتەکان کـە دروسـتکراوی پـاك و چـاك بێگـەردو فەرمانبەریـی خـوان و، شـەیتانەکان کـە دروسـتکراوە خـراپ و زیانبەخشـەکانن، ئەوانە وەك شـەپۆلە دەنگیی و ڕەنگییـەکان وان، ئێسـتا ئـەو شـوێنەی ئێمـە تێیدایـن، پـڕە لـە شـەپۆلی دەنگیـی و ڕەنگیـی، ڕادیۆیـەك لـە شـوێنێك دابنـێ بەپێـی ئـەوەی تـۆ دەیسـووڕێنی، سـەرجەم ئـەو شـەپۆلە دەنگییانـەی لـەو شـوێنەدا هـەن، ئێمـە دەتوانیـن کـە گوێبیسـتیان بیـن، هەروەهـا چەنـد تەلەفزیـۆن لـە ژووریـك دا دابنێـی، بیخەیـە سـەر چەنـد شـەپۆلی دەنگیـی و ڕەنگیـی، ئـەو شـەپۆلە دەنگیـی و ڕەنگییانـە دێنـن.

کەواتـە: کاریگەریـی فریشـتەو شـەیتانەکانیش هـەر وەك ئـەو شـەپۆلانە وان، ئنجـا وەك چـۆن ئـەو ئامێـرە کـە دادەنـرێ، بەپێـی سرووشـتی ئـەو ئامێـرە، ئـەو شـەپۆلە دەنگیـی و ڕەنگییانـە دەتوانـێ بێنـێ، مرۆڤەکانیـش بەپێـی سرووشـتی خۆیـان، دەتوانـن لـە فریشـتەکان بەهرەمەندبـن، یاخـود لـە شـەیتانەکان زەرەرمەنـد بـن، فەرمایشـتێکی پێغەمبەریـش ﷺ ئـەو ڕاسـتییەمان زۆر جـوان بـۆ بەرجەسـتە دەکات، کـە دەفەرمـوێ: {**إنَّ لِلشَّـيْطانِ لَمَّـةً بِابْـنِ آدَمَ ولِلْمَلَـكِ لَمَّـةً، فَأمَّـا لَمَّـةُ الشَّـيْطانِ، فَإيعـادٌ بِالـشَّرِّ وتَكْذِيـبٌ بِالحَـقِّ، وأمَّـا لَمَّـةُ المَلَـكِ، فَإيعـادٌ بِالخَـيْرِ وتَصْدِيـقٌ بِالحَـقِّ، فَمَـن وجَـدَ ذَلِـكَ فَلْيَعْلَـمْ، أنَّـهُ مِـنَ اللَّـهِ، فَلْيَحْمَـدِ اللَّـهَ، ومَـن وَجَـدَ الأُخْـرَى فَلْيَسْـتَعِذْ بِاللَّـهِ مِـنَ الشَّـيْطانِ**} (**أخرجـه الترمـذي: ٢٩٨٨، وقـال: حسـن غريـب، والنسـائي في الكـبرى: ١١٠٥١، والبيهقـي في شـعب الإيمـان: ٤٥٠٦، وابـن حبـان: ٩٩٧**).

وشـەی: (**لَمَّـة: هَمَّـةٌ وَخَطْـرَةٌ في القَلْـب**)[1]، واتـە: (**لَمَّـة**) بریتیـە لـە دنـەدان و هانـدان لـە دڵ دا.

---

(١) المُعجَمُ الوَسِيط، ج٢، ص٨٤٠.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: بە دڵنیایی شەیتان هاندان و دنەدانی هەیە لە دڵی مرۆڤ دا، فریشتەش هاندان و دنەدانی هەیە لە دڵی مرۆڤدا، ئنجا خوتخوتەو دنەدانی شەیتان، بریتیە لەوە کە مرۆڤ بترسێنێ لە خراپەو، وای لێبکات بڕوا بە هەق نەکات و، بە درۆی دابنێ و، هاندانی فریشتەش ئەوەیە بەڵێنی چاك بە مرۆڤ بدات و، دڵی خۆش بکات بە چاکە، هانیشی بدات بۆ بەڕاست دانانی هەق، ئنجا هەر کەسێك هەستی کرد لە دڵی خۆیدا بە کاریگەریی فریشتە، کە هانی دەدات بۆ چاکەو، بڕوا هێنان بە هەق، با بزانێ ئەوە لە خواوەیەو، ستایشی خوای لەسەر بکات و، هەر کەسێك ئەوی دیکەشی بینی و هەستیکرد کە بەرەو شەڕ دەچێ و، بەرەو خراپەو گوناهو تاوان پەلکێش دەکرێ، با پەنا بە خوا بگرێ، چونکە ئەوە لە شەیتانەوەیە.

کەواتە: ئەو دڵ و دەروونەی مرۆڤ شوێنی زۆرانگرتنی فریشتەو شەیتانە، شەیتان دەیەوێ مرۆڤ بەرەو خراپە پلکێش بکات و، فریشتەش دەیەوێ مرۆڤ بەرەو چاکەی پەلکێش بکات، بەڵام بە دەست مرۆڤە کە ئایا بە لای فریشتەکەدا دەچێ، یان بە لای شەیتانەکەدا دەچێ، ئەگەر بە لای فریشتەکەدا بچێ، هەمیشە بیر لە شتی چاك دەکاتەوەو، بەرەو چاکە هەنگاو دەنێ، ئەگەر لە شەیتانەکەش نیزیك بێ، هەمیشە بیر لە شتی خراپ دەکاتەوەو، بەرەو خراپە هەنگاو دەنێ، خوا پەنامان بدات.

## مەسەلەی دووەم:

**بانگەوازکارانی ڕێی خوا خاوەنی باشترین قسەن، بەڵام دەبێ کرداری باشیان هەبێ و، خۆیان لە ڕیزی مسوڵماناندا بژمێرن، پێویستیشە بە شێوازی هەرە چاك، قسەو ڕەفتاری بەرانبەرەکانیان بەرپەرچ بدەنەوەو، لە کاتی دنەدران لەلایەن شەیتانیشەوە، پەنا بەرنە بەر خوای بیسەری زانا:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا وَقَالَ إِنَّنِى مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٣٣﴾ وَلَا تَسْتَوِى ٱلْحَسَنَةُ وَلَا ٱلسَّيِّئَةُ ٱدْفَعْ بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ فَإِذَا ٱلَّذِى بَيْنَكَ وَبَيْنَهُۥ عَدَٰوَةٌ كَأَنَّهُۥ وَلِىٌّ حَمِيمٌ ﴿٣٤﴾ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُوا۟ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ﴿٣٥﴾ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ نَزْغٌ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٣٦﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە یازدە بڕگەدا:

١)- ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ﴾، قسەی کێ چاکترە لە هی کەسێك بەرەو لای خوا بانگ دەکات؟! واتە: خەڵك بەرەو لای خوا بانگ دەکات، (**الدُّعَاءُ إِلى شَيْءٍ: أَمْرُ غَيْرِكَ بِالإِقْبَالِ عَلَى شَيْءٍ**) (دعاء) ئەوەیە تۆ فەرمان بە غەیری خۆت بکەی ڕوو بکاتە ئەو شتە.

کە دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا﴾، یانی: (**قَوْلُ مَنْ أَحْسَنُ مِنْ قَوْلِ مَنْ دَعَا إِلَى الله**)، واتە: قسەی کێ چاکترە لە قسەی کەسێك کە خەڵك بۆ لای خوا بانگ دەکات، بانگەواز بۆ لای خوا دەکات.

٢)- ﴿وَعَمِلَ صَٰلِحًا﴾، کردەوەی باشیش بکات، تەنیا ئەوەندە نیە قسەی هەبێ، وەستای قسان و کۆڵەواری دەستان بێ، بەڵکو: ﴿وَعَمِلَ صَٰلِحًا﴾، کردەوەی باشیش ئەنجام دەدات، واتە: پابەندە بەوەی دەیڵێ، ئەوەی بە خەڵکی دەیڵێ، پێشێ بۆ خۆی دەیکات.

٣)- ﴿ وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴾، دەشڵێ، بە دڵنیایی من لە مسوڵمانانم، واتە: خۆی جیا ناکاتەوە لە مسوڵمانان، لەبەر ئەوەی بانگەواز بۆ لای خوا دەکات، خۆی پێ لە خەڵك زیاد نیەو، هیچ لافێك بەسەر خەڵکدا لێ نادات و، دەڵێ من یەکێکم لە مسوڵمانان، بەڵام خەڵك بۆ لای ڕاستە شەقامی خواو، بۆ لای خواو، بۆ لای بەندایەتیی کردن بۆ خوا بانگ دەکات.

دوایی خوا ﷻ باسی شێوازی بانگەوازمان بۆ دەکات، دەفەرموێ:

٤)- ﴿ وَلَا تَسْتَوِي ٱلْحَسَنَةُ وَلَا ٱلسَّيِّئَةُ ﴾، بە دڵنیایی چاکەو خراپە یەکسان نین، کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَسْتَوِي ٱلْحَسَنَةُ وَلَا ٱلسَّيِّئَةُ ﴾، وشەی: (حَسَنَةَ)، (**تَعُمُّ جَمِيعَ أَفْرَادِ جِنْسِهَا، وَالمَقْصُودُ حَسَنَةُ الدَّعْوَةِ إِلَى الله**)، وشەی (**الحَسَنَة**): کە (أل)ی ناساندنی لەسەرە، بۆ (**جِنْس**)ە، واتە: تێکڕا (**جِنْس**)ی چاکە بە گشتیی لەگەڵ تێکڕا (**جِنْس**)ی خراپەدا، یەکسان نین و پێکەوە ناچنە تەرازوویەکەوە، بەڵام بەپێی سیاق دەزانین لێرەدا مەبەست لە چاکە، چاکەی خەڵك بانگکردنە بۆ لای خوا، واتە: شێوازی چاکی خەڵك بۆ لای خوا بانگکردن، وەك شێوازی خراپ نیە.

٥)- ﴿ ٱدْفَعْ بِٱلَّتِي هِيَ أَحْسَنُ ﴾، بەوەی باشترە پاڵپێوەبنێ، چی پاڵپێوەبنێ؟ واتە: خەسڵەت و حاڵەت و، کردەوەو هەڵوێستی خراپی بەرانبەرەکەت، بە کام شێوازەو، کام حاڵەتەو، کام خەسڵەتە باشترە، پاڵپێوەبنێ و، بەرپەرچ بدەوە، چونکە (**الَّتِي: صِفَةُ مَوصُوفٍ مَحْذُوف**)، (**الَّتِي**) سیفەتی وەسفکراوێکی قرتێندراوە، یانی: (**إِدْفَعْ سَيِّئَةَ غَيْرِكَ، بِالخَصْلَةِ الَّتِي هِيَ أَحْسَن، أَو بِالطَّرِيقَةِ الَّتِي هِيَ أَحْسَن**)، یانی: خراپەی ئەوی دیکە بە باشترین خەسڵەت، یان باشترین ڕێباز لابەرەو پاڵی پێوە بنێ، وەك خوای پەروەدگار لە سوورەتی (**المُؤمِنُون**)دا، دەفەرموێ: ﴿ ٱدْفَعْ بِٱلَّتِي هِيَ أَحْسَنُ ٱلسَّيِّئَةَ نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَصِفُونَ ﴿٩٦﴾ ﴾، واتە: بە کام سیفەت و، کام خەسڵەتە باشترە، خراپە پاڵپێوەبنێ و، بەرپەرچ بدەوە، ئێمە زاناترین بەوەی ئەوان وەسفی دەکەن و دەیڵێن، یان خوای پەروەردگاری پێ وەسف دەکەن بە ناهەق.

٦)- ﴿ فَإِذَا ٱلَّذِى بَيۡنَكَ وَبَيۡنَهُۥ عَدَٰوَةٞ كَأَنَّهُۥ وَلِيٌّ حَمِيمٞ ﴾، ئەگەر تۆ واتکرد، دەبینی ئەو کەسەی لە نێوان تۆو ئەودا دژایەتیی و ناکۆکیی هەیە، وەك دۆستێکی دڵسۆزو بە پەرۆشە، (**إِذَا: لِلْمُفَاجَئَةِ، وَهِيَ كِنَايَةٌ عَنْ سُرْعَةِ ظُهُورِ أَثَرِ الدَّفْعِ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ**)، (**إِذَا**): لێرەدا بۆ پەیدابوونی شتێکە بە کت و پڕیی و، بە خێرایی، کە لێرەدا کینایەیە لە خێرایی پەیدابوونی شوێنەواری پاڵپێوەنانی خراپە بە چاکە، زۆر بە خێرایی لە نێوان تۆو ئەو کەسەدا کە تۆ بە چاکەی خۆت خراپەی ئەو پاڵپێوەدەنێی، بە شێوازی چاکی خۆت لەگەڵ شێوازی خراپی ئەودا مامەڵە دەکەی و، لە نێوان تۆو ئەودا دژایەتیی هەیە، وەك دۆست و نیزیکێکی خزمی لێ دێ، یاخود زۆر دڵگەرمی لێ دێ، چونکە ﴿ وَلِيٌّ ﴾، بە مانای دۆست و نیزیك دێ، (**الوَلِيُّ: اسْمٌ مُشْتَقٌّ مِنَ الوَلَايَةِ بِفَتْحِ الواوِ، والوَلاء، وهو: الحَلِيفُ والنَّاصِرُ، وهو ضِدُّ العَدُوِّ، والحَمِيمُ: القَرِيبُ والصَّدِيقُ. وهُما خَصْلَتا الوَلايَةِ والقَرَابَةِ**)، واتە: (**وَلِيّ**) ناوێکە داتاشراوە لە (**وَلايَة**)، بە سەر (**فَتْحَة**)ی (**و**)ەکە، {نەك (**وِلايَة**)، (**وِلايَة**) واتە: سەرپەرشتییکردن، بەڵام (**وَلايَة**)، واتە: دۆستایەتیی و، سەرخستن و، نیزیکیی و، خۆشویستن و، نیزیکیی}، ئنجا (**وَلِي**) بە مانای هاوپەیمان و، پشتیوان دێ، هەروەها بە مانای کەسێك دێ کە تۆی خۆشبوێ، (**وَلِي**) دژی (**عَدُوّ**)ە، (**عَدُوّ**) واتە: دوژمن و ناحەز، بەڵام (**وَلِي**) واتە: دۆست و نیزیك، (**الحَمِيم: القَرِيبُ وَالصَّدِيق**)، واتە: (**حَمِيم**) بە مانای دۆست و نیزیك، یان خزم و نیزیك، یان بە مانای برادەرێك دڵسۆزو گیانی بە گیانی دێ.

٧)- ﴿ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ ﴾، ئەم سیفەتە بەرزە نادرێ، مەگەر بەوانەی خۆڕابگرن و خۆیان ڕاگرتبێ، (**أَيِ: المُعَامَلَةُ وَالمُدَافَعَةُ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ**)، ﴿ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ ﴾، ئەم ڕاناوی (ها) دەچێتەوە بۆ خەسڵەت، یان ئەو موعامەلەیە، چونکە چاکەی ڕەها (**مُطْلَق الحَسَنَة**)، بە گشتیی دەدرێ بە زۆر کەس، بەڵام مامەڵەکردن بە شێوەی بەرپەرچدانەوەی خراپە بە چاکە، لە بەرانبەری خراپەدا چاکە کردن، نادرێ بە هیچ کەس جگە لەوانەی خۆڕابگرن، واتە: خۆیان کۆنتڕۆڵ بکەن.

٨)- ﴿ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٖ ﴾، هەروەها ئەوە نادرێ و نابەخشرێ مەگەر بە کەسێك کە خاوەن پشك و بەشێکی زۆر بێ، واتە: خاوەن پشك و بەشێکی مەزن

بێ لە چاكەداو، لە ئیماندا، لە تەقوادا، لە تەزكیەی نەفسدا، (يُلَقَّاهَا)، یانی چی؟ (يُلَقَّاهَا يُجْعَلُ لاقِياً لَهَا، وَهُوَ مُسْتَعَارٌ لِلسَّعْي لِتَحْصِيلِها، لِأَنَّ التَّحْصِيلَ عَلَى الشَّيْءِ بَعْدَ المُعالَجَةِ والتَّخَلُّقِ، يُشْبِهُ السَّعْيَ لِمُلَاقَاةِ أَحَدٍ فَيَلْقَاهُ)، (يُلَقَّاهَا)، واتە: وا دەكرێ كە بیگاتێ، (يُجْعَلُ لاقِياً لَهَا)، وا دەكات كە پێی بگات، خوازراوەتەوە بۆ هەوڵدان بۆ پەیداكردنی، چونكە پەیداكردنی شتێك لە دوای چارەسەرو خۆ ماندووكردنە، ئەوەش شێوەی هەوڵدانە بۆ گەیشتن بۆ دیداری كەسێك، وشەی: ﴿حَظٍّ﴾، كە دەفەرموێ: ﴿وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ﴿٣٥﴾﴾، (الحَظُّ: النَّصِيبُ مِنَ الشَّيءِ مُطْلَقاً، أَو مِنَ الخَيْرِ فَقَط)، (حَظٌّ): بریتیە لە پشك و بەش لە هەر شتێك بە گشتیی، یاخود بە تایبەتی لە خێرو چاكەدا.

٩)- ﴿وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ نَزْغٌ﴾، لە حاڵێكدا كە لە شەیتانەوە دنەدانێك، خوتخوتەیەك بە تۆ دەگات.

١٠)- ﴿فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ﴾، پەنا بە خوا بگرە.

١١)- ﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٣٦﴾﴾، بە دڵنیایی خوا زۆر بیسەری زانایە.

وشەی (نَزغ): (النَّزْغُ النَّخْسُ، وَحَقِيقَتُهُ مَسٌّ شَدِيدٌ لِلجِلْدِ بِطَرَفِ عُودٍ، أَوْ إِصْبَعٍ، فَهُوَ مَصْدَرٌ، وَهُوَ هُنَا مُسْتَعَارٌ لِاتِّصالِ القُوَّةِ الشَّيْطانِيَّةِ بِخَوَاطِرِ الإِنْسَانِ)، (نَزغ): بریتیە لە (نَخْس)، بە عەرەبیی (نَخْس)و، (نَزغ) واتە: تێوەژەنین، یان نقورچكەدان، كە چییەتی (نَزغ)یش بریتیە لەوەی بە شتێك بە توندیی پێستی ئینسان بەسەری دارێك، یاخود بە نینۆكێك بگەزرێ، یان نقورچكەی لێ بدرێ، كە لێرەدا خوازراوەتەوە بۆ پەیوەست بوونی شەیتان بە مێشك و هۆشی مرۆڤەوە، كە شتێكی خراپ بخاتە نێو مێشك و دڵی، كە دەفەرموێ: ﴿وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ﴾، (إمّا) ئەصڵی خۆی (إنْ مَا)یە، بەڵام (إنْ) و (مَا) تێكدا دەغم كراون، (إن)ی (شَرْطِيَّة) لێرەدا بۆیە هێنراوە، چونكە لە ئەصڵدا (إن) كاتێك دەهێنرێ كە مەرج نیە ئەو شتە ڕووبدات و مەرجەكە بێتە دی: {ئەگەر هات و لە شەیتانەوە دنەدانێك گەیشتە تۆ}، ئەمە بۆ بەرزكردنەوەی پلەو پایەی

پێغەمبـەرە ﷺ، لـەوە کـە شـەیتان بتوانـێ هانـی بـدات و، خوتخوتەیەکـی خـراپ بخاتـە نێـو دڵـی، کـە دەفەرمـوێ: (إِمَّا) (ما)یەکـەش زیـاد کـراوە بـۆ جەختکردنـەوەو بەهێزکردنـی پەیوەندیـی نێـوان مـەرج (شَرْط) و وەڵام (جَـواب)ە، نـەك زیـاد کرابـێ بـۆ جەختکردنـەوە لەسـەر ئـەوەی وەڵامەکـەی، یاخـود مەرجەکـە دێتـە دی.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ ﴾، پەنـا بـە خـوا بگـرە (لـە شـەیتانی دوور خـراوە لـە بەزەیـی خـوا)، ئێمـە شـەیتان نابینیـن، بۆیـە بەهێزتریـن چەکـی ئێمـە لـە بەرانبـەر شـەیتاندا، پەنـا بردنـە بـەر خوایـە، بـا لـەو بـارەوە چەنـد دەقێـك بێنیـن:

١- خوا ﷻ لە سوورەتی (الأعراف)دا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْاْ إِذَا مَسَّهُمْ طَٰٓئِفٌ مِّنَ ٱلشَّيْطَٰنِ تَذَكَّرُواْ فَإِذَا هُم مُّبْصِرُونَ ﴿٢٠١﴾ وَإِخْوَٰنُهُمْ يَمُدُّونَهُمْ فِى ٱلْغَىِّ ثُمَّ لَا يُقْصِرُونَ ﴿٢٠٢﴾ ﴾، واتە: بە دڵنیایی ئەوانەی پارێزیان کردوە، ئەگەر لە شەیتانەوە هەستێکیان پێگەیشت، یەکسەر خوایان بیر دێتەوەو، بەرچاو ڕوون دەبن و (پەی بە پیلان و فێڵی شەیتان دەبەن)، بەڵام برایەکانیان شەیتانەکان لە گومڕاییدا ڕستیان بۆ درێژ دەکەن و، کەمتەرخەمییش ناکەن.

واتـە: بێبڕوایـەکان بـە دەسـت شـەیتانەکانەوە وەك تـۆپ و گڵۆڵـە وان، هـەر بەریـان دەدەن و درێژیـان دەکەنـەوە، بـەڵام ئەهلـی تەقـوا، بەڵـێ شـەیتان دەتوانـێ دەسـتێکیان بگەیەنێتـێ و، دنەیەکیـان بـدات، دەوروخولیـان بـدات، بـەڵام یەکسـەر خوایـان بیـر دێتـەوە، ئیمانەکەیـان بێداریـان دەکاتـەوەو، بەرچاویـان ڕوون دەبـێ و، فێڵـی شـەیتان دەبینـن.

٢- پێغەمبەری خواش ﷺ دەفەرموێ: {إِنَّهُ لَيُغَانُ عَلَى قَلْبِي، وَإِنِّي لأَسْتَغْفِرُ اللَّهَ فِي الْيَوْمِ مِائَةَ مَرَّةٍ}، **(أخرجه أحمد: ١٧٨٨١، وعبد بن حميد: ٣٦٤، ومسلم: ٢٧٠٢، وأبو داود: ١٥١٥، وابن حبان: ٩٣١)** واتە: جاری وایە تەم و مژی بێ ئاگایی بەسەر دڵم دا دێ و، ڕۆژی سەد جار داوای لێبوردن لە خوا دەکەم.

نەك لەوە كە گوناهی كردوە، بەو چەمك و واتایەی ئێمە، بەڵكو بەهۆی ئەو جار جار خافڵانە، كە پێغەمبەر ﷺ بەسەر دڵ و دەروونیدا هاتوە.

٣- هەر لەو بارەوە ئەو فەرمایشتەش دێنین: {عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ صُرَدٍ ﵁، قَالَ: اسْتَبَّ رَجُلَانِ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ فَاشْتَدَّ غَضَبُ أَحَدِهِمَا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنِّي لَأَعْلَمُ كَلِمَةً لَوْ قَالَهَا لَذَهَبَ عَنْهُ الْغَضَبُ: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ، فَقَالَ الرَّجُلُ: أَمَجْنُونٌ تَرَانِي؟ فَتَلاَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: ﴿ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ نَزْغٌ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٣٦﴾ ﴾} (أخرجه البخاري: ٦١١٥، ومسلم: ٢٠١٥).

واتە: سولەیمانی كوڕی صورەد ﵁، دەڵێ: دوو پیاو لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بوو بە دەمەقاڵێیان و، قسەیان بە یەكدی گوت، یەكێكیان زۆر تووڕە بوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: من وشەیەك دەزانم ئەگەر بیڵێ، تووڕەییەكەی لادەچێ، ئەگەر بڵێ: (أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطانِ الرَّجِيم)، (واتە: پەنا دەگرم بە شەیتانی دوور خراوە لە بەزەیی خوا)، پیاوەكە گوتی: بە شێتم تێدەگەی؟! (واتە: من شێت نەبووم تاكو ئەو وشەیە بڵێم)، پێغەمبەریش ﷺ ئەو ئایەتەی خوێندەوە كە دەفەرموێ: ﴿ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ نَزْغٌ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٣٦﴾ ﴾.

ئەو كەسە هەر ئەوە كە ئامۆژگارییەكەی پێغەمبەری وەرنەگرتوە، لە ڕاستییدا جۆرێك بووە لە شێتیی و عەقڵ تێكچوون، ئەگەرنا ئەگەر پێغەمبەر ﷺ شتێك بفەرموێ، دەبێ یەكسەر لێی وەربگیرێ، بەڵام ئەو هاوەڵە لەو كاتەدا هێندە تووڕە بووە، وەك گوتراوە: تووڕەیی ڕەشەبایەكە چرای عەقڵ دەكوژێنێتەوە.

## کورتە باسێک لە بارەی
## خەسڵەتە بنەڕەتییەکانی بانگەوازکارانەوە

### ١ و ٢) ئیمانی مەحکەم و دامەزراوو، پارێزکاریی شایستە و تەواو:

خـوا سـبحانە وتعـالی لـە سـوورەتی (**یونـس**) لـە ئایەتـی: (٦٢) و (٦٣)دا بۆمـان باسـی دۆسـتەکانی خـۆی دەکات، بـە تەئکیـد بـرا و خوشـکانی بەڕێـز! کەسـێك دۆسـتی خـوا نەبـێ، هـەوڵ نـادات دۆسـتان بـۆ خـوا پەیـدا بـکات و، کەسـێك لـە خـوا نزیـك نەبـێ، هانـدەر و پاڵنەرێکـی نابـێ، خەڵـك لـە خـوا نزیـك بخاتـەوە، وشـەی (**أولیاء**)یش، کـۆی (**وليّ**)ە، وشـەی (**ولي**) بـە شـەددە لـە ئەسڵدا لـە (**وِلْي**)ەوە هاتـوە، یانـی: (**قُـرْب**) نیزیکیـی[١]، خـوا ئـاوا پێناسـەی دۆسـتەکانی خـۆی دەکات، دەفەرمـوێ:

﴿ أَلَآ إِنَّ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٢﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَكَانُوا۟ يَتَّقُونَ ﴿٦٣﴾ ﴾یونـس.

واتـە: ئاگاداربـن! (خـوا هۆشـدارییمان پێـدەدات) دۆسـتانی خـوا نـە ترسـیان لەسـەرە، نـە پـەژارەش دادەگـرن.

(یانـی: نەترسـیان لەسـەرە بـۆ داهاتـوو، نـە خـەم و پـەژارەش دادەگـرن بـۆ ڕابـردوو) ئەوانـەی ئیمانیـان هێنـاوە (بـە هەمـوو ئـەو شـتانەی پێویسـتە ئیمانیـان پـێ بهێنـرێ، هەروەهـا ئـەوەش سیفەتێکی ڕیشـەداریان بـوو کـە) هەمیشـە پارێزیـان دەکـرد.

---

(١) مفردات ألفاظ القرآن، ص٥٦٦ – ٥٦٨، المكتبة العصرية/ ٢٠١٢م.

ئیمانەکە بە کرداری ڕابردوو دێنێ، چونکە ئیمان تێپەڕیوە، ئیمانیان هێناوە، بەڵام تەقوایەکە بە کرداری ئێستا دێنێ، چونکە تەقوا شتێکی بەردەوامە و، دووبارە دەبێتەوە.

خوشك و برا بەڕێزەکانم!

یەکەمین سیفەتی ئینسانی بانگەوازکار بۆ لای خوا، ئەوەیە کە (ئیمانێکی مەحکەم و دامەزراو)ی هەبێ، ئیمان بە خوای بەرزو مەزن، بە فریشتەکانی خوا، بە کتێبەکانی خوا، بە پێغەمبەرانی خوا، بە ڕۆژی دوایی، بە نەخشە و ئەندازەگیریی خوا سبحانه وتعالی.

ئیمان بناغەیە بۆ هەموو شتەکانی دیکە، بۆیە خوا سبحانه وتعالی سێزدە ساڵی ڕەبەقی تەرخانکردن لە ژیانی موبارەکی پێغەمبەر ﷺ - کە هەموو ژیانەکەی - ژیانی پێغەمبەرایەتیی - بیست و سێ ساڵ بوو -، سێزدە (١٣) ساڵی ڕەبەقی تەرخانکردن بۆ داکوتان و سەقامگیر کردنی ئیمان و عەقیدە، لە دڵی هاوەڵاندا خوا لێیان ڕازی بێ، ئنجا دوایی دە (١٠) ساڵەکەی دیکە، دوای ئەوەی ئیمانیان پەیدابوو، ئنجا ئەحکامیان بۆ هاتنە خوار، بۆ یەك جاریش خوا سبحانه وتعالی لە قورئانی مەککەییدا نەیفەرمووە: **(یا أیها الذین آمنوا)**، بەڵکو یان فەرموویەتی: **(یا أیها الإنسان)** یان (یا بني آدم) یان **(یا أیها الناس)**، بەڵام لە قورئانی مەدینەییدا، خوا سبحانه وتعالی، دەستی کرد بە دواندنی ئەو کۆمەڵەی ئیمانیان لە دڵدا دامەزراوەو، ئیسلامیان فێرکراوەو، شایستەیی ئەوەیان پەیداکردوە، شەریعەتی خوا پیادە بکەن، لە ژیانی تاکیی و، خێزانیی و، کۆمەڵایەتیی و، سیاسیی خۆیاندا.

ئنجا دوایی (پارێزکاریی شایستە و تەواو)، دیارە ئیمان و تەقوا لە قورئاندا، زۆرجار پێکەوە هاتوون، لێرەدا خوای تاك و پاك پێناسەی دۆستان **(أولیاء)**ی خۆی کردوە، هەڵبەتە دوایی بە سیفەتی دیکەش وەسفیان دەکات، بەڵام ئەم

دوو سیفەتە، دوو سیفەتی بنچینەیین، بۆ پێناسەی دۆستانی خوا، بۆیە زانایان گوتوویانە: (مَنْ كَانَ مُؤْمِناً تَقِيّاً، كَانَ لِلهِ وَلِيّاً) واتە: هەر کەسێك بڕوادار و پارێزکار بوو، دۆستی خوایە، بەداخەوە لە نێو کوردەواریی خۆماندا، زۆرجار دۆستانی خوا (أولياء الله) بە شێوەیەك وێناکراون و تەصەوورکراون، پێچەوانەی ئەوە کە قورئان و سوننەت باسیان دەکات، لەوانە: جاری وا هەبووە، کەسێك کە ڕەنگە شێت بووبێ، یان عەقڵی تەواو نەبێ، یان گێل بووبێ، گوتوویانە: ڕەنگە ئەوە دۆستی خوا بێ! نا، دۆستەکانی خوا، هەموویان لە لووتکەی عەقڵدان، هەڵبەتە هەموو بەندەکان، بەندەی خوان، بەڵام دۆستەکانی خوا، عاقڵن، زۆریش عاقڵن، هەروەها ئەهلی عیلمن و، خاوەن بەصیرەتن و، بلیمەتن، بۆیە ناگونجێ ئینسانی شێت، یان کەسێك پاك و خاوێنیی بۆ نەکرێ، ناگونجێ دۆستی خوا بێ، ئەمە وەك ڕاستکردنەوەی چەمکێکی باوی نێو خەڵك، بەڵێ دۆستەکانی خوا عاقڵن و لە عەقڵەوە پێچراون و، لە هەموو شتێکدا تێر و تەواون.

## ٣ و ٤)- خواپەرستییەکی گشتگیر و بەتام، یادی خوا کردنێکی لە ناخەوەو بەردەوام:

بێگومان کەسێك بیەوێ بانگەوازکار بێ و، خەڵك بۆ لای خوا بانگ بکات، دەبێ خۆی خواپەرستییەکی هەبێ، کە تامی لێبکات چێژی لێ وەربگرێ، باتەماشای ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ بکەین، کە دەفەرموێ: {ذَاقَ طَعْمَ الإِيمَانِ: مَنْ رَضِيَ بِاللَّهِ رَبّاً، وَبِالإِسْلاَمِ دِيناً، وَبِمُحَمَّدٍ نَبِيّاً وَرَسُولاً»}[1].

واتە: تامی ئیمانی چێژتوە هەر کەسێك ڕازی بووبێ خوا پەروەردگاری بێ و، ئیسلام بەرنامەی ژیانی بێ و، موحەممەدیش وەك پێغەمبەرو ڕەوانەکراوی خوا قبووڵ بکات.

---

(١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم:١٧٧٨، وَمُسْلِمٌ برقم:٣٤، وَالتِّرمِذِيُّ برقم:٢٦٢٣، عَنِ الْعَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ.

کەواتـە: ئیمانیـش تـام و چێـژی هەیـە، ئنجـا کەسـێك دەتوانـێ بانگـەوازکار بـێ بـۆ لای خـوا، کـە چێـژ لـە ئیمانەکـەی خـۆی وەربگـرێ، تـام لـە خواپەرسـتیی بـکات، هەڵبەتـە هەرکەسـێکیش تـام لـە خواپەرسـتیی بـکات، هەمیشـە خـوای لـە یـاد دەبێ، بۆیـە دوایـی گوتوومـە: (یـادی خـوا کردنێکـی لـە ناخـەوەو بـەردەوام).

یـادی خـوا کردنیـش، دیسـان دەبـێ چەمکەکـەی ڕوون بکەینـەوە، زۆر کـەس وا دەزانـێ یـادی خـوا کـردن، ئەوەیـە: کـە هەمیشـە دەبـێ ئینسـان ئـەو وشـانەی زیکریـان پـێ دەگوتـرێ: (**سُبْحَانَ اللـه، الحَمْدُللـه، لا إِلَـه إلاَّ اللـه، أللـهُ أَكْبُر، أَسْتَغْفِر اللـه**) بـەزاری گـۆ (تلفـظ) بـکات، بـەڵام مـەرج نیـە، یـادی خـوا هـەر بـەو شـێوەیە بـێ، ئەصڵـی یـاد (ذکـر)، پێچەوانـەی لـە بیرچـوون (نسـیان)ە. یـادی خـوا کـردن واتـە: خـوا، لـە یـاد بـوون ئەصڵەکـەی ئەوەیـە، ئنجـا جـاری وا هەیـە: وێـڕای ئـەوەی کـە لـە دڵ و زەینیـدا هەیـە، بـە زمانیـش ئـەو وشـانە دەڵـێ، بـەڵام ئەسـڵی یـادی خـوا، ئەوەیـە کـە لـە عەقـڵ و دڵ و هۆشـدا بـێ، ئەگـەر ئـەوە نەبێـت، جووڵـەی زمـان، هیـچ سـوودێك بـە مـرۆڤ ناگەیەنـێ، خـوای پـەروەردگار لـەو بـارەوە دەفەرمـوێ:

﴿ ٱتْلُ مَآ أُوحِىَ إِلَيْكَ مِنَ ٱلْكِتَـٰبِ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ ۖ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ ۗ وَلَذِكْرُ ٱللَّهِ أَكْبَرُ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَصْنَعُونَ ﴿٤٥﴾ ﴾ العنکبـوت.

واتـە: ئـەوەی لـە کتێبـی پـەروەردگارت بـۆت سروش کـراوە، بیخوێنـە و، نوێـژ بەرپـا بکـە، نوێـژ قەدەغـە(ی خاوەنەکـەی) دەکات لـە هەرچـی کـردار و قسـە و ڕەفتـاری دزێـو و ناقـۆڵا و خـراپ هەیـەو، یـادی خـواش گەورەتـرە، (واتـە: یـادی خـوا گەورەتـرە لـە نوێژیـش و لـە قورئـان خوێندنیـش) و، خـوا دەزانـێ چـی دەکـەن!

ئنجـا لـە ڕاسـتییدا خـوای میهرەبـان کتێـب و فەرمایشـتەکەی خۆیشـی بۆیـە نـاردوە، کـە ئێمـە خوامـان لەبیربـێ، هەروەهـا نوێژیـش بۆیـە فـەرز کـراوە، خوامـان لەبیربـێ، وەك فەرموویەتـی:

﴿ ...وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ ﴿١٤﴾ ﴾ طه.

واتە: نوێژ بەرپا بکە، بۆ یادکردنی من، قورئانیش بۆیە ناوی لێنراوە (زیکر)، چونکە خوات بیردەخاتەوە.

بەڵێ سیفەتی سێیەم و چوارەمی بانگەوازکاران ئەوەیە: کە هەرکامیان خواپەرستییەکی گشتگیر و بەتام و چێژی هەبێ و، یادی خوا کردنێکی لە ناخەوە، لە دڵەوەو، بەردەوامی هەبێ.

## ٥ و ٦)- زانیاریی قووڵ و فراوان بە دین و، بەرچاو ڕوونیی و شارەزایی دەربارەی ژین:

پێشتریش باسمان کردوون، بە بۆنەی دیکەوەو، هەر ئەم ئایەتە موبارەکەشمان بەبەڵگەی هەردووکیان هێنایەوە:

﴿ قُلۡ هَٰذِهِۦ سَبِيلِيٓ أَدۡعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِيۖ وَسُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿١٠٨﴾ ﴾ يوسف.

بەڵێ بەبێ زانیاریی و بەرچاو ڕوونیی و شارەزایی، ئینسان بۆ خۆشی نازانێ بە ڕێگادا بڕوات، چ جای پێش خەڵکی بکەوێ، هەروەها بەبێ شارەزابوونی وەزع و باردۆخ و ڕۆژگار، ئینسان، دۆست و دوژمنی لێ تێکەڵ دەبن و، چاك و خراپی لێ تێکەڵ دەبن و، فێڵی لێ دەکرێ و، هەڵدەخەڵەتێنرێ، کەواتە: کەسانی وا ناتوانن خەڵك لە خوا نزیك بخەنەوە و، خەڵك وا لێبکەن و، وا داربکەن، کە پابەند بن بە پەیام و بەرنامەی خوای پەروەردگارەوە.

## ٧ و ٨)- دڵسـۆزیی و بە تەنگەوەبوون بۆ هـەمووان و، هێمنیی و ئارامیی و نەلەخشان:

بەڵێ کەسێك دەتوانێ خەڵك لە خوا نزیك بخاتەوەو، بۆ لای خوایان بانگ بکات، کە لە ناخەوە بۆ هەموو لایەك دڵسۆزو، بە تەنگەوە بێ، بێ جیاوازیی، ئەمەش زۆرجار جێی تێدا بەهەڵە داچوونە، کەسانێك وا دەزانن دەبێ بەس بۆ مسوڵمانان، دڵسۆز بین! بەڵام ئێمە پێغەمبەران دەبینین (علیهم الصَّلاَة والسلام) بە خەڵکە کافرەکەی خۆیانیان گوتوە:

﴿...وَأَنَا۠ لَكُمۡ نَاصِحٌ أَمِينٌ ﴿٦٨﴾﴾ الأعراف.

واتە: من بۆ ئێوە بەتەنگەوەم، دڵسۆزم، دڵ سووتاوم، بۆیە دەبێ ئەو چەمکەش ڕاست بکرێتەوە، ئنجا لە ڕاستییدا ئەگەر خەڵك نەزانێ بۆی دڵسۆزی: نە متمانەت پێدەکات، نە گوێت بۆ دەگرێ و، نەقسەشت لێوەردەگرێ، ئایا ئێمە ناتوانین دڵسۆزبین بۆ نامسوڵمانان؟ نەك هەر دەبێ بتوانین، بەڵکو ئەوە ئەرکێکەو فەرزە، پێغەمبەران **(علیهم الصَّلاَة والسلام)** وابوون، پێغەمبەری خۆمان (محمد) ﷺ، سەروەری هەموو پێغەمبەران، چەند بە شەفەقەت و بەڕەحم بووە؟ با تەماشا بکەین: لەوبارەوە، دڵسۆزیی خۆی چۆن وێنا دەکات لەگەڵ کەسانێکدا کە دژایەتییشیان کردوە: **{كَانَ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم يَحْكِي نَبِيًّا مِنَ الأَنْبِيَاءِ، ضَرَبَهُ قَوْمُهُ فَأَدْمَوْهُ، وَهُوَ يَمْسَحُ الدَّمَ عَنْ وَجْهِهِ وَيَقُولُ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِقَوْمِي فَإِنَّهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ}**[1].

واتە: پێغەمبەر (محمد) ﷺ باسی پێغەمبەرێکی کرد بۆ هاوەڵانی، کە قەومەکەی بەردبارانیان دەکرد خوێنیان لێهێنا، (سەریان شکاندو بەدەنییان بە خوێندا هێنا)، ئەویش خوێنەکەی دەسڕی و دەیفەرموو: خوایە! لە گەلەکەم خۆشبە، چونکە نازانن، لێیان ببوورە!

---

(١) أَخْرَجَهُ البخاري برقم: ٣٢٩٠. عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ.

مەبەستم ئەوەیە جاری وا کەسێك ملی حەدیسێك دەگرێ، ڕەنگە لە سیاقێکی دیکەدا هاتبێ و حاڵەتێکی تایبەت بێ، کە دروست نیە ئینسان هیچ شەفەقەت و ڕەحم و بە تەنگەوە بوون و بەزەیی هەبێ بەرانبەر بە غەیری مسوڵمان! بەڵام ئەوە بەڕەهایی وانیە، ئەوەتا ئەو پێغەمبەرانە (علیهم الصَّلاَة والسلام)، کە خوا هەم لە (نوح)ەوە دەیگێڕێتەوە: ﴿وَأَنصَحُ لَكُمْ ﴿٦٢﴾﴾ الأعراف، هەم لە (هود)ەوە دەیگێڕێتەوە: ﴿وَأَنَا لَكُمْ نَاصِحٌ أَمِينٌ ﴿٦٨﴾﴾ الأعراف، هەروەها لە صاڵحەوە دەیگێڕێتەوە: ﴿وَنَصَحْتُ لَكُمْ ﴿٧٩﴾﴾ الأعراف، هەروەها لە شوعەیبەوە دەیگێڕێتەوە: ﴿وَنَصَحْتُ لَكُمْ ﴿٩٣﴾﴾ الأعراف، هەموویان باسی خۆیان بە (ناصح)ی گەلەکەیان ناساندوە، (نصح) یانی چی؟ (**النصح: إرادة الخير للمنصوح**)[1]، (نُصح) یان (نصيحة) بریتیە لەوە ئەو کەسە کە نەصیحەتەکەی ئاڕاستە دەکرێ، چی بۆ چاکە ئەوەت بۆی بوێ.

جاری دیکەش باسمان کردوە، زۆرکەس وا دەزانێ نەصیحەت یانی: ئامۆژگاریی، چونکە زۆرجار لە کوردییدا نەصیحەت لە جیاتی ئامۆژگاریی (موعظة) بەکاردێنین، بەڵام لە زمانی عەرەبییدا جیایە و، ئەگەر بڵێین: (نصيحة) یانی: ئامۆژگاریی، مەفهوومی زۆر ئایەت و حەدیسمان لێ تێکدەچن، بۆ وێنە:

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {**«الدِّينُ النَّصِيحَةُ»، قُلْنَا: لِمَنْ؟ قَالَ: «لِلَّهِ وَلِكِتَابِهِ وَلِرَسُولِهِ وَلأَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ وَعَامَّتِهِمْ»**}[2].

واتە: نەصیحەت ئاڕاستەی پێنج لایەنان دەکرێ: بۆ خوا، بۆ کتێبی خوا، بۆ پێغەمبەری خوا، بۆ پێشەوایانی مسوڵمان و بەرپرسانیان و، بۆ خەڵکەکە بە گشتیی.

---

(١) مفردات ألفاظ القرآن: ص٥١٤، المطبعة العصرية، ٢٠١٢ م، {النصح: تحرِّي فعل أو قول فيه صلاح صاحبه}.

(٢) أَخْرَجَهُ أحمد برقم: ١٦٩٨٢، ومسلم برقم: ٥٥، وأبو داود برقم: ٤٩٤٤، عَنْ تَمِيمٍ الدَّارِيِّ.

ئنجا ئەگەر (**نصیحة**) بە مانای (**موعظة**) بێ، چۆن ئامۆژگاریی خوا و کتێبی خوا دەکرێ؟ نا (**نصیحة**) ئەوەیە کە: دڵسۆز بی بۆ خوا و ساغ بی لەگەڵ خوادا، دڵسۆزبی بۆ کتێبی خوا، بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، بۆ بەرپرسان و بۆ خەڵك بە گشتیی، (**نصیحة**)یانی دڵسۆزیی و بەتەنگەوە بوون بۆ هەمووان.

پاشان (هێمنیی و ئارامیی و نەلەخشان)، چونکە لە کاتی شێنەیی و بێگرفتیی و بێکێشەییدا، هەموو کەس ئازایە، بەڵام ئەوە گرنگە: ئایا تۆ لە نارەحەتییدا لە کاتێکدا کە بە شێوەی ناشایست مامەڵەت لەگەڵدا دەکرێ، خۆڕاگر دەبی یان نا؟ بۆیە خوا سبحانه وتعالى لە سوورەتی (البقرة)دا (صبر)مان لە سێ حاڵاندا بۆ دەخاتە ڕوو، دەفەرموێ:

﴿وَٱلصَّٰبِرِينَ فِي ٱلۡبَأۡسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ ٱلۡبَأۡسِۗ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُتَّقُونَ ١٧٧﴾.

واتە: خۆڕاگران لە کاتی هەژاریی و نەداریی و بێ ئیمکانیەتییدا، هەروەها لە کاتی نەخۆشیی و ناخۆشیی و، نارەحەتیی و، لە کاتی جەنگ و ڕووبەڕوو بوونەوەدا.

لەو سێ حاڵەتانەدا دەبێ خۆڕاگر بین، بێگومان بابای خەڵك بانگکەر بۆ لای خوا، ئەگەر بۆیان دڵسۆز نەبێ و، بە تەنگیانەوە نەبێ، کارەکەی پیت و پێزی نابێ و بەرهەمدار نابێ، جاری وایە کەسێك وەك وەزیفە، یان وەك ئەرکێکی دنیایی کارەکەی دەکات، هەندێك کەس هەن، کە لە وەزارەتی ئەوقافەوە ڕادەسپێررێن و، ئیشێکیان پێ دەسپێررێ، وەك پیشەیەك، ئەنجامی دەدەن، بەڵام ئەگەر لە دڵەوە بۆ خەڵکەکە دڵسۆز نەبێت، کاریگەریی نابێ، هەڵبەتە کە بۆشیان دڵسۆز بوو، خۆڕاگریش دەبێ، ئەو سیفەتانە، هەموویان پێکەوە پەیوەستن، ئینسان ئەگەر بۆ خەڵکەکە دڵسۆز بێت، تەحەممولیشیان دەکات، نەزانیی و نەفامییشیان لێ تەحەممول دەکات، لەبەر ڕازی کردنی خوا.

## ٩ و ١٠)- کراوەیی و مامەڵەی بەڕێز و سەنگین، ڕووگەشیی و قسە و گفت و لفتی شیرین:

خـوای پەروەردگار لە سـوورەتی (الفرقـان)دا دەفەرمـوێ: ﴿ وَعِبَادُ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى ٱلْأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلْجَٰهِلُونَ قَالُوا۟ سَلَٰمًا ﴿٦٣﴾ ﴾.

واتـە: بەندەکانـی (خـوای) بەبەزەیـی، بـە هێمنیـی و ئارامیـی ڕێـگادا دەڕۆن، بـە سـەنگینیی و ویقـارەوە و، کاتێـك نەفامانیـش دەیاندوێنـن، قسـەی سـەلامەت دەکـەن، یاخـود دەڵێـن: سـەلامتان لێبـێ.

چونکــە هــەر کــەس چــی پێبــێ، لــەوە دەبەخشــێ، دەڵێــن: جارێــك پێغەمبــەر عیسـا (علیـه السـلام) بـە شـوێنێکدا دەڕوات لەگـەڵ حەوارییەکانـی خـوا لێیـان ڕازی بـێ، خەڵکێکـی نەفـام، جنێـوی پێدەڵێـن، یـان قسـەی ناشایسـت، ئەویـش دەسـت بەرزدەکاتـەوەو، دوعایـان بـۆ دەکات، حەوارییەکانـی پێـی دەڵێـن: ئـەی پێغەمبـەری خوا! ئەوانـە قسـە و ، جنێـوت پێدەڵێـن! دەڵـێ: دەزانـم، بـەڵام هـەر کـەس چـی پـێ بـێ، لەوە دەبەخشـێ، ئـەوان جنێویـان پێیـە، منیـش دوعـای خێـر و قسـەی خێـرم پێیـە.

بەڵـێ (کراوەیـی و مامەڵـەی بەڕێـز و سـەنگین)، خەسـڵەتێکی گرنـگ و بنەڕەتیـی بانگەوازکارانـە، چونکـە: بـە گرژیـی و داخراویـی، ئینسـان ناتوانـێ کارلێـك لەگـەڵ دەوروبـەری خۆیـدا بـکات، دەبـێ کـراوە بـێ، بـەڵام کرانـەوە بەبـێ توانـەوە، کرانەوە، واتــە: تــۆ داخــراو نەبــی، بــە جۆرێــك بــوار نــەدەی لەگــەڵ هیــچ کەســدا کارلێــك بکـەی، لـە بەرانبەریـش دا: هێنـدە کـراوە و بـڵاو نەبـی، هیچـت پێـوە بەنـد نەبـێ و هیچـت پێـوە نەمێنـێ، چونکـە هەندێـك کـەس بـە بیانـووی کرانـەوە، دەتوێنـەوە لـە کۆمەڵـگادا و دەبنـە بەشـێك لـە واقیعێکـی خـراپ!

ئنجـا (ڕووگەشـیی و قسـە و گفـت و لفتـی شـیرین)یش خەسـڵەتێکی دیکـەی خەڵـك بانگکەرانـە بـۆ لای خـوا عـز وجـل.

برا و خوشکە خۆشەویستەکانم!

دڵسۆزانە ئامۆژگارییتان دەکەم، هەمیشە تاکو بۆتان دەکرێ: با لەگەڵ خەڵك دا، قسە و گفت و لفتتان شیرین بێ، ڕووتان خۆش و گەش بێ، بڕواتان بێ، زۆر کەس کە تەماشای ئێمە و مانان دەکات، ئێمە چۆن ببینێ، دینەکەشمان وا دەبینێ، بۆیە خوا سبحانە وتعالی کە پێغەمبەرانی (علیهم الصَّلاَة والسلام) ناردوون، لە هەموو ڕوویێکەوە، لە خەڵکی ڕۆژگاری خۆیان تەواوتر بوون، لە ڕووی جەستەیی و ڕووحیی و عەقڵیی و دەروونیی و ئاکاریی و لە هەموو ڕوویێکەوە، بۆ ئەوەی هەر کەسێك ئەوانی بینی، دیمەنیانی بینی، هەڵسوکەوتیانی بینی، ئەخلاقیانی بینی، سیفەتە بەرزەکانیانی بینی: تێر و تەواویی پەیام و دینەکەیان، لە تێر و تەواویی ئەواندا ببینێ، ئێمە دەبێ وریا بین! ئەم دینە ئەگەر بە ڕووخۆشیی خەڵکی بۆ بانگ نەکرێ، بە گرژیی و مۆن و مرچیی خەڵکی بۆ بانگ ناکرێ، ئەگەر بە قسەی خۆش و گفت و لفتی شیرین، خەڵکی بۆ ڕانەکێشرێ، بە تەئکید بە توانج و پلار و قسەی زبر و ناخۆش، خەڵکی بۆ بانگ ناکرێ، خوای تاك و پاك بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: ﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ ۖ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّوا۟ مِنْ حَوْلِكَ ۖ فَٱعْفُ عَنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِى ٱلْأَمْرِ ۖ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَوَكِّلِينَ ﴿١٥٩﴾ ﴾.

واتە: تۆ بە هۆی بەزەیی خواوە، بۆیان نەرم بووی، ئەگەر قسە ڕەق و دڵ ڕەق بووای، لە دەورت دەپرژان...، کێ لە دەوری کێ دەپرژا؟ ئەو هاوەڵە بەڕێزانە، کە باشترین مرۆڤن لە دوای پێغەمبەران، لە دەوری پێغەمبەر (محمد) ﷺ کە (رحمة للعالمين)ە، دەپرژان، ئەگەر قسە ڕەق و دڵ ڕەق بووایە.

ئنجا لە سوورەتی (الأعراف) لە ئایەتی (١٩٩)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ خُذِ ٱلْعَفْوَ وَأْمُرْ بِٱلْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿١٩٩﴾ ﴾.

ئیمام جەعفەری صادیق ڕەحمەتی خوای لێبێ، گوتوویەتی: ئەم ئایەتە ڕیشە و بنکی هەموو ڕەوشتە بەرزەکانی لە خۆیدا کۆکردوونەوە:

١)- (خُذِ ٱلۡعَفۡوَ) ئەوەی ئاسانە و ئاسان بە دەستەوە دێ، لە خەڵك وەری بگرە، واتە: چاوەڕوانیی زۆرت لە خەڵکی نەبێ، بە زۆریی ئەوانەی هەمیشە پرتە و بۆڵەیانە و گلەیی لە خەڵك دەکەن، لەبەر ئەوەیە، چاوەڕوانیی زۆریان لێیان هەیە، کەواتە: چاوەڕوانیی زۆرت لە خەڵکی نەبێ و، ئەوەی بە سێنایی بەدەستەوە دێ، تەنیا ئەوەیان لێ چاوەڕوان بکە.

٢)- (وَأۡمُرۡ بِٱلۡعُرۡفِ ) واتە: بۆ خۆت چاکە بکە و، فەرمانیشی پێبکە، هەرچی پەسند و چاکە بیکە پیشەی خۆت و، فەرمایشتی پێ بکە.

٣)- (وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡجَٰهِلِينَ ) کەسێکیش کە نەفام بوو، ڕووی لێ وەرگێڕە و پشتی تێبکە و وازی لێ بێنە.

ئیمام شافیعی خوای لێی ڕازی بێ، چەند جوان دەڵێ، لە شیعرێکیدا:

{لَوْ كُلُّ كَلْبٍ عَوَى أَلْقَمْتُهُ حَجَراً ... لأصبَحَ الصَّخر مِثْقَالاً بدينَارٍ}

واتە: ئەگەر هەر سەگێك وەڕی، من بەردێکی پێدادەم

دەبێ مسقاڵی بەرد بە دینارێك پەیداکەم.

جاری وایە کەسانێك قسەی ناخۆشمان پێ دەڵێن، هەندێك برا و خوشکمان زۆر سەغڵەت دەبن و دەڵێن: ماموستا! فڵان شتیان نووسیوە، لە فڵان بڵاوکراوەدا، یان لە فڵان کەناڵ واگوتراوە! منیش زۆرجار گوتوومە: دیارە کەسانێك وامان دەبینن و وامان تەصەووڕ دەکەن! دەڵێن: ئاخر چۆن وەڵامیان نەدەینەوە؟! بەڵام ئایا وەختمان هەیە وەڵامی ئەو شتانە بدەینەوە؟! نا، لە جیاتی وەڵامدانەوە، دوعایەکی خێریان بۆ بکە و بڵێ: خوایە! هیدایەتیان بدە و، بۆ خۆشت خەریکی کاری خۆتبە.

(ئەبراهام لەنکۆڵن)[1] قسەیەکی جوانی هەیە دەڵێ: کاتێ خۆی ئەوانەی ڕەخنەیان لێدەگرتم، یان قسەیان پێدەگوتم، تەمەنەکەم چەندە، چوار هێندەی دیکەشم خستبایە سەر، بەشی ئەوەی نەدەکرد وەڵامیان بدەمەوە، بەڵام هەڵسام کاری خۆم کرد و، سەرکەوتنەکەم، بوو بە وەڵامی هەموو ئەو قسانە کە لە دژم دەکران!

ئێمەش دەبێ ئاوا بکەین و دینەکەشمان هەر وای لێدەوەشێتەوە، جاری وا بووە برایەك هاتوە بۆ لام، قسەیەکی پێگوتراوە، لەلای بۆتە کێویێك گوتوویەتی: حەیام چووە، ئاوایان پێگوتووم! منیش زەردەخەنەیەکم بۆ کردوە، گوتوومە: نەخێر، تۆ لە مابەینی خۆت و خوادا چۆن بی، هەر وای، قسەی خەڵکی نە بەرزت دەکاتەوە و نە نزمت دەکات، هەر خۆتی کە بە چاکە خۆت بەرز دەکەی، یان بە خراپە خۆت نزم دەکەی، بە خوا خەڵك هەمووی مەدحت بکات، بەرز نابیەوە، ئەگەر خوا بەرزت نەکاتەوە و، خەڵك هەمووی زەمت بکات، ئەگەر خوا نەتشکێنێ، ناشکێی، هەروەها خەڵك هەمووی لێت ڕازی بێ، ناتوانن بتبەنە بەهەشتێ و، هەمووشیان لێت تووڕە بن، ناتوانن بتبەنە دۆزەخ، زاڵکەر و زەبوونکەر (مُعِزّ و مُذِلّ) هەر خوایە، بێگومان ئەوەش هەمووی هەر بەرهەمی ئیمان و تەوحیدە، ئینسان ئەگەر بەڕاستیی خوای ناسی و ئیمانی لە دڵدا چەسپی، ئەو کاتە ئەو شتانە زۆر کاری تێناکەن و شلوێی ناکەن.

---

(١) ئەبراهام لەنکۆڵن: ١٨٠٩ - ١٨٦٥ز یەکێکە لە سەرۆك کۆمارەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

## ١١ و ١٢)- ڕاستیی و، دڵ و زمان و کردەوە یەکبوون و، دادگەریی و ئینصاف لەگەڵ دۆست و دوژمن:

بەڕێـــزان!

ئینسان دەبێ ڕاست (صادق) بێ و، دڵی و زمانی و کردەوەی یەك بن و، چیت لە دڵدایە، با هەر ئەوەت بە زماندا بێ و، چی بە زمانیشت داهات، هەوڵبدە پراکتیزەی بکەی و بە کردەوە جێبەجێی بکەی، چونکە خوانەخواستە پێچەوانەی ئەوە: نیفاقە، ئیزدیواجیەتە و، خوای دادگەریش بە گەورەترین گوناهی داناوە:

﴿كَبُرَ مَقْتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُواْ مَا لَا تَفْعَلُونَ ۝٣﴾.

ئینسان دەبێ زۆر لە خۆی وریا بێ، ئەگەر: دڵ و زمانمان و کردەوەمان هەموویان پێکەوە جووت نەبن، زۆر خەتەرە، هەندێ کەس قورئان دەخوێنێ و، قورئان لەعنەتی لێدەکات، کوا قورئان لەعنەت لە کێ دەکات؟! با، بۆ وێنە: کەسێك قورئان دەخوێنێ و زاڵمیشە، لەعنەتەکەی بۆ دێ:

﴿أَلَا لَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ۝١٨﴾ هود.

هەروەها (فسق، کفر، نیفاق)، قورئان هەموویانی زەم کردوون، هی واش هەیە قورئان دەخوێنێتەوە و ئەو سیفەتە خراپانەشی تێدان و، زەم و نەفرین و هەڕەشەکەی بەر دەکەون.

ئنجا خوا دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَكُونُواْ مَعَ ٱلصَّٰدِقِينَ ۝١١٩﴾ التوبة.

واتە: ئەی بڕوادارینە! پارێز لە خوا بکەن و لەگەڵ ڕاستان دا بن.

هەروەها دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ بِٱلْقِسْطِ شُهَدَآءَ لِلَّهِ ۝١٣٥﴾ النساء.

واتــە: ئــەی بڕوادارینــە! زۆر دادگەریــی بەرێوەبــەرن و شــایەدیی بــۆ خــوا (بــە هــەق و ڕاســتیی) بــدەن..

ئنجــا: (دادگەریــی و ئینصــاف لەگــەڵ دۆســت و دوژمن)یشــدا، زۆر گرنگــە، کــە ئــەوەش شــتێکی دیکەیــە، دەبــێ ڕاســت بکرێتــەوە: هەندێــك کــەس وا دەزانــێ ئێمــە دەبــێ تەنیــا لــە نێــو بازنــەی ئیســلامدا دادگــەر و بــە ئینصــاف بیــن و، تەنیــا بــۆ ئــەوان بــە پــەرۆش و دڵســۆز بیــن! بــەڵام نەخێــر ئینســان دەبــێ بــۆ هەمــوو مرۆڤــەکان دڵســۆز بــێ و، لەگــەڵ هەموانیشــدا دادگــەرو بــە ئینصــاف بــێ، چونکــە دادگەریــی و ئینســاف دوو خەســڵەتی پەســندن بەڕەهایــی، نــەك بــە شــێوەیەکی کاتیــی و ڕێژەیــی (مؤقــت ونســبي) هــەر بۆیــەش خــوا بــە دەقــی ئایــەت فەرمانــی پێکردوویــن کــە لەگــەڵ دوژمنانیــش دا دادگــەر بیــن.

وەك خــوا ســبحانە وتعــالى دەفەرمــوێ: ﴿ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعْدِلُوا۟ ۚ ٱعْدِلُوا۟ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ ۖ ﴿٨﴾ ﴾المائــدة.

واتــە: بــا ڕق هەڵســانتان لــە کەســانێك وانــان لێنــەکات کــە نادادگەربــن، دادگەربن! ئــەوە لــە پارێزکارییــەوە نزیکترە.

## ١٣ و ١٤)- خەڵك بانگكردن تەنیا بۆ لای خـوا و، بە شـانازییەوە خـۆ ئەژماركردن لە ڕیزی مسوڵماناندا:

ئـەم دووەش هەردووكیـان لـەم ئایەتـە موبارەكـە وەردەگیرێـن: ﴿ وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا وَقَالَ إِنَّنِى مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٣٣﴾ ﴾فصلت.

واتـە: قسـەی كـێ لـە هـی كەسـێك باشـترە كـە بـۆ لای خـوا بانگـەواز دەكات و، كـردەوەی بـاش دەكات و، دەڵـێ: مـن لـە مسـوڵمانانم!

خوشـك و برایانـی بەڕێـز! زۆرجـار ئینسـان ئەگـەر لـە خـۆی وریـا نەبـێ، شـەیتان فێڵـی لێـدەكات، بـۆ وێنـە: بـە حیسـاب تـۆ خەڵـك بـۆ لای خـوا بانـگ دەكـەی: كەچی تەماشـا دەكـەی خـۆت و خـوات لـێ تێكـەڵ بـوون، دیـن و دنیـات لـێ تێكـەڵ بـوون، كـە ئـەوەش نیشـانەی هـەن، ئینسـان دەبـێ ئـەو شـتانەیان پـێ لـە یـەك جیـا بكاتـەوە، بـۆ نموونـە: ئەگـەر كەسـێك ڕقـی لـە تـۆ بـوو، یـان قسـەیەكی بـە تـۆ گـوت، بـەڵام تـۆ دەتزانـی: ئـەو كەسـە بـۆ خـوا سـوڵحاوە، یـان ئیسـلامی خـۆش دەوێ، ئەگەر تـۆ بەڕاسـتیی خوانـاس بـی، دەبـێ خۆشـت بـوێ و، بڵێـی: هەرچەنـدە تـۆ ڕقـت لـە منـە و، قسەشـم پـێ دەڵێـی، بـەڵام مـادام دڵسـۆزی بـۆ ئیسـلام، هـەر خۆشـم دەوێـی، ئـا ئـەوە ڕاسـتە، بـەڵام ئەگـەر خـۆت لەگـەڵ خـوا لـێ تێكـەڵ بووبـێ و، شـەیتان فێڵی لێكردبـی، ئـەوە لـە جیاتـی خـوا میحوەربـی، دەبیـە خـود میحـوەر، یانـی: لـە جیاتـی تەماشـا بكـەی: داخـۆ ئـەو كەسـە بەینـی لەگـەڵ خـوادا چۆنـە!، تەماشـا دەكـەی: داخـۆ بەینـی لەگـەڵ خـۆت دا چۆنـە؟!

### قوڵە نەزیلەیەك:

جارێـك لـە مزگەوتێـك نوێژمـان دەكـرد، گوێـم لـە مامۆسـتایەكە بـوو، باسـی كەسـێكی دەكـرد، دەمزانـی باسـی كەسـێكە، بـە شـێوەیەك لـە شـێوەكان ناسـیاو و نیزیكییەتـی، دەیگـوت: ئـەو مونافیقـە دێتـە مزگەوتیـش، بـەڵام مامۆسـتای مزگـەوت

ئەزیەت دەدات و... هتد، وتارەکەی هەمووی لەگەڵ کەسێك بوو، منیش هەر لە حوجرەکەدا نوێژم دەکرد، هات بۆ حوجرەکە و گوتم: مامۆستا! هەستم کرد، کەسێك تووڕەی کردووی؟ گوتی: ئەرێ وەڵڵا دراوسێیەکی مونافیقم هەیە، دوایی سەری هەڵێنا، گوتی: ئەها ئەوەتا!

گوتم: هاتوە بۆ جومعەش؟

گوتی: بەڵێ.

گوتم: ئنجا مونافیقیی وی لە چی دایە؟ گوتی: ڕادیۆ بە دەنگی بەرز پێدەکات و، منداڵەکانی لەگەڵ منداڵەکانم ناکۆکن! گوتم: مامۆستا! ئنجا مادام هاتوە بۆ ماڵی خوا و، تۆش بە ئیمام بزانێ، چۆن ئەو وشە و تەعبیرە قورسانەت پێ گوتن؟ پاشان بە لەباریی بچۆ ئامۆژگاریی بکە، نەك لەسەر مینبەر و، کات و سەر و دڵی ئەو هەموو خەڵکەی پێ بگری!

بەڵێ بەڕاستیی دەبێ وریا بین و، خەڵك بۆ لای خوا بانگ بکەین، نەك بۆ لای خۆمان، پاشان: (بە شانازییەوە خۆ ئەژمارکردن لەڕیزی مسوڵماناندا) بێگومان بەڕێزان! شانازییە ئینسان مسوڵمان بێ، شانازییە ئینسان بەندەی خوا بێ و بانگەوازکاری ڕێی خوا بێ: ﴿وَأَنَّهُۥ لَمَّا قَامَ عَبْدُ ٱللَّهِ يَدْعُوهُ كَادُواْ يَكُونُونَ عَلَيْهِ لِبَدًا ١٩﴾ الجن.

واتە: هەروەها کاتێك بەندەی خوا (محمد) هەڵسا لێی پاڕایەوە، نزیك بوو جندەکان لەسەری کەڵەکە بن (هێندە قەڵەباڵغییان لە دەورە کرد).

با پێمان وا نەبێ شتێکی دیکە لەسەرووی مسوڵمانەتییەوە هەیە، خوای پەروەردگار بە پێغەمبەری خاتەم (محمد) ﷺ دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِنَّ صَلَاتِى وَنُسُكِى وَمَحْيَاىَ وَمَمَاتِى لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ١٦٢ لَا شَرِيكَ لَهُۥ ۖ وَبِذَٰلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْمُسْلِمِينَ ١٦٣﴾ الأنعام.

واتــە: بڵــێ: بــە دڵنیایــی نوێــژم و پەرستشــەکان (ی حــەج و عومــرە)م و ژیــان و مردنــم بــۆ خــوای پــەروەردگاری جیهانییانــە. هیــچ هاوبەشــێکی نیــە و، هــەر بــەوەش فەرمانــم پێکــراوە و، مــن یەکەمــی مســوڵمانانم. (یەکــەم کــەس کــە بــۆ خــوا ملکەچــم لــە ڕووی کاتییــەوە: لەســەر ئاســتی ئوممەتــی ئیســلام و، لــە ڕووی پلــەوە: لەســەر ئاســتی مرۆڤایەتیــی).

هەروەهــا خــوای زانــا و توانــا لــە بــارەی ئیبراهیــم (علیــه الســلام)ەوە، دەفەرمــوێ: ﴿ وَمَن يَرْغَبُ عَن مِّلَّةِ إِبْرَٰهِـۧمَ إِلَّا مَن سَفِهَ نَفْسَهُۥ ۚ وَلَقَدِ ٱصْطَفَيْنَـٰهُ فِى ٱلدُّنْيَا ۖ وَإِنَّهُۥ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴿١٣٠﴾ إِذْ قَالَ لَهُۥ رَبُّهُۥٓ أَسْلِمْ ۖ قَالَ أَسْلَمْتُ لِرَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿١٣١﴾ ﴾البقرة.

واتــە: مەگــەر کەســێك خــۆی نەفــام بــکات، ئەگــەر نــا کــێ بەرانبــەر بــە ڕێبــازی ئیبراهیــم ناڕازی ‌وومەنــد دەبــێ! کــە بــە دڵنیایــی لە دنیــادا هەڵمانبــژارد و لــە دوارۆژیش دا لــە بەنــدە زۆر پەســندەکانە. یــاد بکــەوە! کاتێــك پــەروەردگاری پێــی فەرمــوو: ملکــەچ بــە! گوتــی: بــۆ پــەروەردگاری جیهانییــان ملکەچــم.

مەبەســتم ئەوەیــە مســوڵمانەتیی شــانازییە و، پێگــە و پلەیەکــی زۆر بــەرزە، ئنجــا کەســێك لــە نێــو مســوڵمانان دا هەوڵبــدات: خزمەتیــان پێبــکات و کاری خێــر بــکات، ئــەوە شــانازییەکی گەورەتــرە، بــەڵام بــە مەرجێــك خــۆی پــێ لــەوان زیــاد نەبــێ، لەبەرئــەوەی عیلمــی زیاتــرە، یــان لەبــەر ئــەوەی بەرپرســیاریەتییەکی هەیــە، یــان... یان...هتــد، مرۆڤــی مســوڵمان دەبــێ خــۆی پــێ لــە کــەس زیــاد نەبــێ، لــە مســوڵمانان.

## ١٥ و ١٦)- حیکمەت و دانایی لە قسە و ڕەفتاردا و، کارلێکی ئەرێنیی لەگەڵ تێکڕای توێژەکانی خەڵکدا:

پێشتریش باسی حیکمەتم کردوە، کە ڕێبازی گشتی بانگەوازکردنە بۆ لای خوا، خوای کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ ﴿١٢٥﴾ ﴾النحل.

واتە: بە حیکمەت بەرەو ڕێبازی پەروەردگارت بانگەواز بکە.

لێرەدا، دەمەوێ تۆزێك چەمکی حیکمەت ڕوون بکەمەوە:

### ڕوونکردنەوەی چەمکی حیکمەت لە حەوت کورتە خاڵ دا[1]:

بەڕێزان!

خەڵك بانگکردن بۆ لای خوا، بە حیکمەت، زۆر شت دەگرێتەوە، کە ڕەنگە ئەم حەوتە گرنگترینیان بن:

١)- پێویستە ڕەچاوی پلە پلەیی (تدرّج) بکرێ، لەگەڵ بانگکراوان (مدعوين)دا.

٢)- دەبێ ڕەچاوی لە پێشترەکان (أولويات) بکرێ، چ شتێ لە پێش چ شتێکەوەیە، بەپێی پێوەر و تەرازووی شەریعەت.

پێشتر بە وردیی قسەمان لە بارەی ئەو دوو خاڵەوە کرد.

٣)- حاڵیکردن و تێگەیاندنی خەڵك کە بانگەوازکار (داعي) دڵسۆزیانە و بۆیان بە پەرۆشە و، هیچ ئامانجێکی دیکەی نیە واتە: هیچ ئیشی خۆی بەوان نیە، بەڵکو ئیشی خۆیانی پێیانە، خوای بەخشندە ئاوا باسی پێغەمبەری خاتەم (محمد) ﷺ دەکات:

---

(١) ئەم باسەمان لە کتێبی یازدەمی مەوسووعەی: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله) بە ناوونیشانی: (تطبيق المجتمع للشريعة) وەرگرتوە. بڕوانە: [ الطبعة الثانية / ٢٠٢٠م].

﴿ لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢٨﴾ ﴾ التوبة

واتە: پێغەمبەرێکتان لە خۆتان بۆتان هاتوە، هەرشتێك ئێوە نارەحەت بکات، زۆر لەسەر دڵی قورسە و، لەسەر هیدایەتی ئێوە زۆر سوورە و، بەرانبەر بە بڕواداران زۆر میهرەبان و بەبەزەییە.

ئێمەش دەبێ هەوڵبدەین پشك و بەشمان هەبێ لە سیفەتەکانی پێغەمبەردا ﷺ، چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِى رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ﴿٢١﴾ ﴾ الأحزاب.

واتە: لە پێغەمبەری خوادا باشترین سەر مەشق (پێشڕەو و چاوساغ) هەیە. یانی: دەبێ ئێوەش وەك وی بکەن، بۆیە من دەڵێم: هەرکەسێك بە ڕێی پێغەمبەردا ﷺ بچێ، دەبێ هەوڵبدا وەك وی بچێ، ئەگەر کەم و زۆر وەك پێغەمبەر ﷺ نەچێ، مانای وایە بەڕێی ویدا نەچووی!

٤)- جەختکردنەوە لەسەر ئەو ڕاستییە کە ئەو بانگەوازکارە، لافی ئەوە لێنادات هەرچی هەقە لە لای ئەوە، بۆ زانیارییتان! هەموو مرۆڤەکان ڕقیان لە کەسێکە خۆی لەسەرەوەی وان دابنێ و، بڵێ: هەرچی هەقە لە لای منە، کە ڕاستیش نیە، بە خوا، هەرچی هەقە بەس لە لای خوایە: ﴿ وَقُلِ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ ﴿٢٩﴾ ﴾ الكهف.

واتە: بفەرموو: هەق تەنیا لە پەروەردگارتانەوەیە. بەڵام ئەوەی دیکە ڕێژەییە من هەندێکم لە لایە، ئەو هەندێکی لە لایە، ئەوی دیکە هەندێکی لە لایە.

ئنجا مەرجیش نیە کەسێك کە نامسوڵمان بوو، هیچ هەقی لەلا نەبێ، خوای کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لِمَ تَلْبِسُونَ ٱلْحَقَّ بِٱلْبَٰطِلِ ﴿٧١﴾ ﴾ آل عمران.

واتە: ئەی خاوەن کتێبەکان! بۆچی هەق و باطیڵ تێکەڵ دەکەن؟! ئەمە مانای وایە: ئەندازەیەك هەقیان لە لایە، بەڵام گرفت ئەوەیە، هەقێکی کەمیان لە لایە و لەگەڵ بەتاڵێکی زۆرا تێکەڵی دەکەن. ئەم خاڵەشم لە و ئایەتە

موبارەکەی سوورەتی (سبأ)، وەرگرتوە کە خوا دەفەرموێ: ﴿ قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ قُلِ ٱللَّهُ ۖ وَإِنَّآ أَوْ إِيَّاكُمْ لَعَلَىٰ هُدًى أَوْ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٢٤﴾ ﴾.

واتە: بڵێ کێ ڕۆزییتان دەدات لە ئاسمانەکان و زەوییەوە؟ بڵێ: خوا، ئنجا من یان ئێوە لەسەر ڕێنمایین، یاخود لە گومڕاییەکی ئاشکرا داین.

تەماشا بکەن: خوا ئاوا پێغەمبەر (محمد) ﷺ فێر دەکات کە یەکسەر بە کافرەکان نەڵێ: ئێوە لە گومڕایی دان و، من لەسەر هیدایەتم، بێگومان پێغەمبەر ﷺ دەزانێ کە لەسەر هیدایەتە، بەڵام تۆ بتەوێ ئەو خەڵکە بانگ بکەی، بۆ لای پەیامی خوا، دەبێ بەرانبەرەکەت ئەگەرێکی بۆ بهێڵیەوە کە ئەویش حەقێکی لە لایە، بۆ ئەوەی گوێت بۆ بگرێ، چونکە کە تۆ گوتت: تۆ لە گومڕایی دا نغرۆ بووی و، هەقیش هەمووی لە لای منە! مانای وایە: تۆ پەردەکانت هەموو پچڕاندوون، نا، تۆش وەك پێغەمبەرەکەت ﷺ، بڵێ: یان من، یان ئێوە، یەکێکمان لەسەر هیدایەتین و یەکیشمان لە گومڕایی داین.

٥)- خۆپاراستن لە بەکارهێنانی هەر وشە و تەعبیر، یان ڕەفتارێك، یان ئاماژەیەکی ناجۆر و بریندارکەر، ئەمەشم هەر لە سوورەتی (سبأ) وەرگرتوە: ﴿ قُل لَّا تُسْـَٔلُونَ عَمَّآ أَجْرَمْنَا وَلَا نُسْـَٔلُ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٢٥﴾ ﴾.

واتە: بڵێ: ئێوە پرسیارتان لێ ناکرێ دەربارەی تاوانێك کە ئێمە کردوومانە و، ئێمەش دەربارەی کردەوەکانی ئێوە پرسیارمان لێناکرێ، یانی: ئێوە لەبارەی تاوانەکانی ئێمەوە، بەرپرسیارنین و، ئێمەش لەبارەی کردەوەکانی ئێوەوە، بەرپرسیار نین، هی وان بە کردەوە ناو دەبات و، هی خۆی بە تاوان (جريمة) !!

نەك بڵێی: تۆ لە گوناح و تاواندا غەرق بووی و، منیش لە کردەوەی چاکدا گەیشتوومە لووتکە، چونکە ئەویش دەڵێ: تۆ هێندە بڵند و من هێندە نزم، هەر ناتگەمێ! کە بە دڵنیایی ئەوە ڕاستیش نیە، چونکە هەرچۆن بێ بەشەرەکان هەڵەکارن و، کەم و کوڕییان هەر هەیە.

٦)- خۆ دوورگرتن لە هەر جۆرە خۆ بەسەردا هەڵکێشان و خۆ پێباشبوونێك، تەماشا بکەن هەر لە سوورەتی (سبأ)دا خوا فەرموویەتی: ﴿ قُلْ يَجْمَعُ بَيْنَنَا رَبُّنَا ثُمَّ يَفْتَحُ بَيْنَنَا بِالْحَقِّ وَهُوَ الْفَتَّاحُ الْعَلِيمُ ﴿٢٦﴾ ﴾.

واتە: بڵێ: پەروەردگارمان کۆماندەکاتەوە و، دوایی ئەو بە هەق دادوەرییمان لە بەین دەکات و، خوا باشترین گرێ کەرەوەیە و زۆریش زانایە.

سەرنج بدەن! سەرەنجامەکەی لێرە دەرنەخستوە، بڵێ: من لە بەهەشتێم و ئێوەش لە جەهەندەمێن، ئنجا وەرن با پێکەوە دیالۆگ بکەین، دەفەرموێ: پەروەدگارمان کۆماندەکاتەوە و، دوایی ئەو بە شێوەیەکی هەق دادوەرییمان لە بەیندا دەکات و، خوای زانا و شارەزاش باشترین دادوەرە لە قیامەتێ.

هەروەها خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ إِلَيْنَا إِيَابَهُمْ ﴿٢٥﴾ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا حِسَابَهُمْ ﴿٢٦﴾ ﴾الغاشية

واتە: مسۆگەر گەڕانەوەیان تەنیا بۆ لای ئێمەیە و، لێپرسینەوەشیان تەنیا لەسەر ئێمەیە.

٧)- خستە ڕووی ئایین و بەرنامەی خوا، وەك حاڵەتە سروشتیی و ئاسانەکەی خۆی، کە هیچ سەغڵەتکردنێکی تێدانیە، وەك خوای کارزان فەرموویەتی:

أ- ﴿ يُرِيدُ اللَّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ ﴿١٨٥﴾ ﴾البقرة.

واتە: خوا ئاسانیی بۆتان دەوێ و، زەحمەت و قورسیی بۆتان ناوێ.

ب- ﴿ وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ ﴿٧٨﴾ ﴾الحج.

واتە: خوا لە ئایین دا هیچ سەغڵەتییەکی نەخستۆتە سەرتان.

ڕەنگە یەکێك بڵێ: ئەدی بۆچی ئینسان کە بەڕۆژوو دەبێ تینووی دەبێ؟ یان لە جەنگ و جیهادا بریندار دەبێ، دەکوژرێ، ماڵ سەرف دەکات، کۆچ دەکات و....هتد؟!

دەڵێین: ڕاستە، بەڵام هیچی وا نیە کە مرۆڤ بۆی نەکرێ لە هەر شوێنێك هەر ئەرکێکت بۆ جێ بەجێ نەکرا، خوا لەسەرت لادەبات: لەسەفەردا[1] نوێژەکان کورت دەبنەوە، لە سەفەردا ڕۆژووی ڕەمەزان لادەچێ، لە کاتی نەخۆشییدا شێوەی نوێژکردن دەگۆڕێ، زۆرێك لە حوکمەکان لە کاتی نائاساییدا دەگۆڕێن، چونکە خوای میهرەبان دەزانێ تۆ سەغڵەت دەبی، بۆت ئاسان دەکات.

هەروەها [کارلێکی ئەرێنیی (التفاعل الإيجابي) لەگەڵ توێژەکانی خەڵکدا] خەسڵەتێکی دیکەی گەورەو گرنگی بانگەوازکارانە بۆ لای خوا، بابای بانگەوازکار (داعي) دەبێ وەك پێشینان گوتوویانە: ئاردی گەنم بێ، هەموو جۆرە نانێکی لێ دروست بکرێ، ئنجا وەك پێشتریش گوتمان: بانگەوازکار هەمان ئەرکی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم (محمد) ئەنجام دەدات و، ئەویش بۆ تێکڕای خەڵك بە هەموو توێژو پێکهاتەکانیانەوە نێرراوە، وەك خوا عزوجل پێی فەرمووە: ﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا ﴿١٥٨﴾ ﴾ الأعراف.

واتە: بڵێ: ئەی خەڵکینە! من ڕەوانە کراوی خوام بۆ لای تێکڕاتان.

ئاشکراشە قسە کردن بۆ تێکڕای خەڵك و، کار لەسەر کردنیان بۆ نیزیکخستنەوەیان لە خواو پەیام و بەرنامەکەی، کارێکی گەورەو گرنگە و خۆئامادە کردن و ساغیی و پاکیی و دڵسۆزیی و کارامەیی و لێزانییەکی زۆر دەوێ.

---

(١) مەبەست سێ نوێژە چوار ڕکاتییەکانن: نیوەڕۆ و ئێوارە (عصر) و خەوتنان.

## ١٧ و ١٨)- بە دڵی پڕ بەزەیی و خۆشەویستیی ئامۆژگاریی كردن و، لە كاتی ناچارییدا: بەو پەڕی شێوازی بەرز و پەسند شەڕە قسە (جدال) كردن:

براو خوشكە خۆشەویستەكانم!

لە كاتێكدا دەمانەوێ خەڵك بانگ بكەین بۆ لای خوا و، خەڵك لە ئایینی خوا نزیك بخەینەوە، دەبێ دڵی خۆمان پڕ بكەین لە بەزەیی و پەرۆش و خۆشەویستیی، ئێستا دەروونناسەكان و كۆمەڵناسەكان و، ئەوانەی لە گەشەی بەشەریی (التنمية البشرية) دەكۆڵنەوە، دەڵێن: ئەو حاڵەتە دەروونییەی تۆ لە خۆتدا دەیهێنیە دی، یەكسەر كاریگەریی هەیە لەسەر بەرانبەرەكانت، ئەگەر دڵی خۆت پڕبكەی لە خۆشەویستیی و ڕێز و بەزەیی و پەرۆش، ئەو حاڵەتە دەروونییە كاریان تێدەكات و مونعەكیس دەبێتەوە لەسەریان و، بە پێچەوانەش ئەگەر دڵت پڕ بێ لە كینە و بوغز و غەرەز و خۆ پێ زۆربوون، ئەوەش هەر ڕەنگ دەداتەوە و مونعەكیس دەبێ لەسەریان.

جارجار هەندێك وردە بیرەوەریی خۆم باس دەكەم، وەك دەرس لێوەرگرتن:

لێرەش دەڵێم: مەگەر چۆن دەنا لەگەڵ هیچ كەسێكدا، قسە و وتووێژ یان مشت و مڕم نەكردوە، مەگەر دوعام بۆ كردوە و، لە خوا پاڕاومەوە: دڵی نەرم بكات و، هیدایەتی بدات، هەروەها خوا بمپارێزێ لەوەی شەیتان زەفەرم پێبەرێ: قسەیەكی ناڕێك بكەم، كە شایستەی ئیسلام نەبێ، چونكە كێشە هەر ئەوە نیە بە هۆی شێوازی ناڕێكی تۆوە، ئەو كەسە دڵی دەڕەنجێ و لە ئیسلام دوور دەكەوێتەوە، بەڵكو كێشەی گەورە ئەوەیە، بە هۆی تۆوە ئیسلام لەبەر چاوی دەبێزرێ، ئەگەر قسەیەكی ناشیرین بكەی و شێوازێكی ناڕێك بەكاربێنی.

جارێك لەسەر ئەو كەناڵانە، دوو كەس قسەیان دەكرد، مشتومڕیان بوو، بە شێوازی ناشایست و ناڕێك، تەلەفۆنم بۆ یەكێكیان كرد، گوتم: كاكە گیان! بە خوا دیفاع كردن لە دینی خوا وا نابێ، هەر لێیگەڕێی باشترە، چونكە بە هۆی شێواز و تەعبیری ناڕێكی تۆوە، دین ناشیرین دەبێ و، بەو جۆرە قازانجت سەری مایەت دەخوات!

بەڵێ بە دڵی پڕ بەزەیی و خۆشەویستیی ئامۆژگاریی خەڵك كردن كە: (الموعظة الحسنة)ش هەر ئەوە دەگەیەنێ، ئامۆژگاریی چاكت دەبێ بە دڵی پڕ پەرۆش و خۆشەویستییەوە بێ.

ئنجا (لە كاتی ناچارییدا، بەوپەڕی شێوازی بەرز و پەسند شەڕە قسەكردن)، ئەوەش چەمكەكەی لە حەوت وردە خاڵدا ڕوون دەكەمەوە، چۆن موناقەشە بكەین؟ چونكە مەگەر چۆن، دەنا هەموو كەس تووشی موناقەشە و شەڕە قسە هەر دەبێ، هەرچەندە من ئامۆژگارییتان دەكەم، وەك برایەكی دڵسۆزی خۆتان: خۆتان بپارێزن لە شەڕە قسە و دمبەدمبە، بەڵام جاری وایە ئینسان كەسێكی لە ڕاسترا دێ، عینادە و كەللە ڕەقە و نەسەلمێنە، یاخود دەیەوێ لە مەجلیسدا بتشكێنێ، یاخود دینەكەت وا بخاتە بەرچاو كە لە ژێر نیشانەی پرسیار دایە! ئەوە دەبێ دەمكوتی بكەی و، لەو حاڵەتەدا ناچاری.

## حەوت كورتە خاڵ لە بارەی شەڕە قسە كردنەوە بە باشترین شێواز[1]:

١)- كە خوا دەفەرموێ: ﴿وَجَادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ ﴿١٢٥﴾﴾ النحل.

واتە: مرۆڤی مسوڵمان دەبێ باشترین وشە و تەعبیر هەڵبژێرێ، یانی: وشە و تەعبیرێك بەكارنەهێنێ دڵی بەرانبەر برووشێنێ، ئەگەر وشەیەكی ناشایست و ناجۆر بێ، ڕەنگە بەرانبەرەكەی لێی بوەشێتەوە، بەڵام ئەو نابێ لە خۆی و لە ئایینەكەی بوەشێنیەوە.

---

(١) ئەم باسەشم هەر لە سەرچاوەی پێشوو وەرگرتوە، هەمان كتێب.

٢)- پێویستە باش گوێ بۆ قسەی بەرانبەرەکەی بگرێ و، بە ڕێز و حورمەتەوە و، بە گرنگیی پێدانەوە، هەموو مرۆڤێك پێی خۆشە ڕێزی لێ بگری، بەڵام کەسێك قسەت بۆ بکات و خۆت بە شتێکەوە مەشغووڵ بکەی، یەکسەر دڵی دەشێوێ، دوایی هەقیشت پێبێ، لێت وەرناگرێ، بە زۆریی خەڵك خود و بابەت (ذات وموضوع) تێکەڵ دەکەن! بە زۆریی وایە: مرۆڤ ئەگەر ڕێزت لە خۆی نەگرت، هەقەکەشت لێوەرناگرێ.

٣)- قسە پێنەبڕین، ئەگەر قسەکەشی بە دڵ نەبێ، لە هەندێك کاسێت دا، گوێم لە وتووێژێکی کاك (ناصری سوبحانیی) بووە، خوا پلەی بەرز بکات و لێی خۆش بێ، ئەدەبێکی زۆر جوانی پێوە دەبینم، لەگەڵ مامۆستا (مەلا ئەحمەدی دەگا شێخان) وتووێژێك دەکات، کە ماموستا (مەلا ئەحمەد) قسەکانی بێهێزن و قسەی بێجێ دەکات و، بەڵگەکانی بێهێزن، بەڵام کاك (ناصر) نە قسەی پێ دەبڕێ، نە تەعبیرێك بەکاردێنێ دڵی برووشێنێ، زۆر بە حورمەت و ڕێزەوە قسە دەکات!

٤)- دەنگ بە سەردا بەرزنەکردنەوەی، هەرچەندە ئەویش گاڵەگاڵ بکات.

٥)- گاڵتە نەکردن بە قسەکانی، ئەگەر بە جووڵەی لێو و بە ئاماژەی چاویش بێ، چونکە جاری وایە کەسێك لێو لە کەسێك هەڵدەقرچێنێ، یان برۆی لێ بەرز دەکاتەوە.

٦)- دانپێداهێنانی ئەو هەقەی کە لە لایەتی، جاری وایە بەرانبەرەکەت، نامسوڵمانە، بەڵام هەقێکی لەلایە، دەبێ بڵێی: ئەو قسەیەت هەقە، ئەوەت ڕاستە! کە هەم پێی دڵخۆش دەبێ، هەم هەقیشە.

٧)- تێکەڵ نەکردنی کەسایەتیی بابای مشتومڕ و موجادەلەکەر، لەگەڵ بابەتەکەدا، ئەو دیفاع دەکات لە بابەتێکی ناهەق، بەڵام تۆ شەخصەکە لەگەڵ بابەتەکەدا تێکەڵ مەکە، بڵێ: جەنابت زۆر جێی ڕێز و حورمەتی، کە ڕاستیش دەکەی، چونکە: خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِىٓ ءَادَمَ ﴿٧٠﴾ ﴾الإسراء.

واتە: بە دڵنیایی ڕێزمان لە وەچەی ئادەم گرتوە.

مرۆڤـەکان: کافـران و مسـوڵمانان، هەموویـان بەڕێـزن، بڵـێ: تـۆ لـە لای مـن زۆر بەڕێـزی، بـەڵام ئـەو بابەتـە غەڵەتـە، نـەك تێکەڵـی بکـەی، بڵێـی: نـە بـۆ خـۆت بـە کەڵـك دێـی، نـە قسـەت بـە کەڵـك دێ، ئەویـش گوێـت بـۆ ناگـرێ و هیچـت لێـوەر ناگـرێ.

## ١٩ و٢٠)- دووربوون لە خۆ بە گەورە زانیی و، خاکیی بوون و لێبوردەیی و نەرم و نیانیی:

بەڕێــزان! ئــەم دووانــەش دوو خەســڵەتی گــەورە و گرنگیــی کەســانێکن، کــە دەیانــەوێ خەڵــك بــۆ لای خــوا و ئاییــن، بەرنامەکــەی بانــگ بکــەن:

لەبـارەی: (خـۆ بـە گـەورە نەزانیی)یـەوە: سـەرنج بـدەن! پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ، لـە دوو شـوێنی قورئانـدا: لـە سـوورەتی (الکهـف)دا، ئایەتـی (١١٠)، لـە سـوورەتی (فصلـت)دا، ئایەتـی (٦)، خـوا یـەك تەعبیـر بـۆ پێغەمبـەر ﷺ دەنێـرێ کـە بیفەرموێ: ﴿ قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ ﴿١١٠﴾ ﴾الکهـف.

واتە: بڵێ: من بەس مرۆڤێکم وەك ئێوە!

ئێسـتا ڕەنگـە زۆر لـەو بەرپرسـە دنیاییانـە، ئامادەنەبـن شـتێکی وا (بـەڵام بـە دڵ و بـە کـردەوە) بـە خەڵکـی بڵێـن، زۆر گرنگـە مـرۆڤ بـە ڕاسـتیی و لـە دڵـەوە و بـە کـردار بـە خەڵکـی بڵـێ: مـن بـەس مرۆڤێکـم وەك ئێـوە، هیچـم لـە ئێـوە زیـاد نیـە، زۆر گرنگـە کـە خـۆت پـێ لـە خەڵـك زیـاد نەبـێ و، خەڵـك بزانـێ کـە خـۆت پـێ لـەوان زیـاد نیـە، ئنجـا بـا خەڵـك بـە کـردەوە تـۆی پـێ لـە خـۆی زیـاد بـێ، نـەك بـە ئیددیعـا و لاف لێدانـی خـۆت، کـە، بـە تەئکیـد ئـەوەش زیاتـر زەمینـە خـۆش دەکات بـۆ ئـەوەی خەڵـك قسـەت لێوەربگـرێ.

لە بـــارەی:

(خاکیی بوون و لێبوردەیی و نەرم و نیانیی)یشەوە، ئەم ئایەتە بەپێزە بە نموونە دێنینەوە، کە پێشتریش هێنامان: ﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ ۖ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّوا۟ مِنْ حَوْلِكَ ۖ فَٱعْفُ عَنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِى ٱلْأَمْرِ ۖ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَوَكِّلِينَ ﴿١٥٩﴾ ﴾ آل عمران.

واتە: بە هۆی بەزەیی خواوە بۆیان نەرم و نیان بووی و، ئەگەر قسە زبر و دڵڕەق بووای، لە دەورت دەپرژان. لێیان ببوورە و داوای لێبوردنیان (بۆ لە خوا) بکە و لە کاروباردا ڕاوێژیان پێبکە...

## ٢١ و ٢٢)- ئازایەتیی و فیداکاریی و بوێریی و، بێ تەماعیی و قەناعەت و بەرچاو تێریی:

بەڕێـــــــزان!

ئەم خەسڵەتەش: (ئازایەتیی و فیداکاریی و بوێریی) سیفەتێکی دیکەی گەورە و گرنگی بابای بانگەوازکارە بۆ لای خوا و، دەبێ ئازا بێ و، بوێر بێ و، لە شوێنی خۆیدا قسەی خۆی بکات، هەروەها دەبێ فیداکاریش بێ بۆ دینی خوا، بە خوا بە مەرجی سەلامەتیی، دینداریی و مسوڵمانەتیی ناکرێ، هیچ پێغەمبەرێکم (علیهم الصلاة والسلام) نەبینیوە لە دەست و زمانی خەڵکی سەلامەت بووبێ، کاتی خۆی لەو ساڵانەدا کە ئێمە خەباتی چەکدارییمان دەکرد، ئەگەر کەسێکمان لێ بریندار یان شەهید دەبوو، یان تووشی نسکۆ و ناڕەحەتییەك، گیرانێك، دەبووین، کەسانێك تانەیان لێدەداین، دەیانگوت: بێ حیکمەتن، لێی نازانن! بەڵام ئەگەر ئێمە لێی نەزانین و لێمان نەزانیبێ، بێگومان پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) لە لووتکەی لێزانیی کارامەیی و شارەزایی و، بلیمەتییدا بوون، کەچی نەشیان توانیوە سەلامەت بن!

بۆیە دڵنیاتان دەکەمەوە: ئەگەر ئینسان بیەوێ بەڕاستیی مسوڵمان بێ و، بەڕێی خوا و پێغەمبەری خوادا ﷺ بڕوات، موستەحیلە بتوانێ هەموو خەڵکی ڕازییکات، هەرگیز شتی وا نابێ، مەحاڵە کارێك بکەی، کەس لێت تووڕە نەبێ و هەموویان لێت ڕازی بن، مەگەر خۆت بکەی بە گوڵە بەڕۆژە، هەر جارەو ڕووت لە لایەك بێ، ئەگەرنا هەرگیز خەڵکت هەمووی پێ ڕازی ناکرێ، بۆیە کاتێك موعاویەی کوڕی ئەبوو سوفیان، نامەیەك دەنێرێ بۆ دایکمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، وەك لە فەرموودەی (صحیح)دا هاتوە، دەڵێ: ئامۆژگارییم بکە، وەسیەتم بۆ بکە، بەڵام بە کورتیی، ئەویش بۆی دەنووسێ: {سمعت رسولَ الله يقول: **مَنْ الْتَمَسَ رِضَا اللَّهِ بِسَخَطِ النَّاسِ، كَفَاهُ اللَّهُ مُؤْنَةَ النَّاسِ، وَمَنْ الْتَمَسَ رِضَا النَّاسِ بِسَخَطِ اللَّهِ، وَكَلَهُ اللَّهُ إِلَى النَّاسِ**} **أَخْرَجَهُ التِّرمِذِيُّ برقم: ٢٤١٤، وَابْنُ حِبَّان برقم: ٢٧٦، قال الألباني: صحيح.** واتە: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە دەیفەرموو: (هەر کەسێك بیەوێ خوا لە خۆی ڕازی بکات، بە تووڕە کردنی خەڵکی، خوا کێشەی خەڵکی لە کۆڵ دەکاتەوە، بەڵام هەر کەسێك بیەوێت خەڵك ڕازی بکات بە تووڕەکردنی خوا، خوا حەواڵەی خەڵکی دەکات).

هیچ گومانی تێدانیە کە ئینسانی ئیماندار دەبێ ڕەزامەندیی خوا، بکات بە لووتکەی ئاوات و هیوایەکانی خۆی و، هەموو شتێکی دیکەی لە پێناودا بەخت بکات.

ئەوی دیکە: (بێ تەماعیی و قەناعەت و بەرچاو تێریی):

بەڕێـــــزان!

برا و خوشکانێك کە لە مەیدانی بانگەواز کردندان! بێ تەماعیی و قەناعەت هەبوون و، بەرچاو تێریی و، چاو لە دەستی خەڵك نەبوون، ئینسان زۆر بە حورمەت دەکات، ئینسان سەنگین و، بەڕێز دەکات، هەروەها عەکسەکەشی هەر ڕاستە: چاوت لە دەستی هەر کەسێ بێ، جۆرێك لە شەرمەزارییت بەرانبەری دەبێ، بەڵام وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {**مَنْ أَحَبَّ أَنْ يَكُونَ أَقْوَى النَّاسِ، فَلْيَتَوَكَّل**

عَلَى اللهِ، وَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يَكُونَ أَكْرَمَ النَّاسِ، فَلْيَتَّقِ اللهَ عَزَّ وَجَلَّ، وَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يَكُونَ أَغْنَى النَّاس، فَلْيَكُن بِمَا فِي يَدِ اللهِ، أَوْثَق مِمَّا فِي يَدِهِ}[1].

واتە: هەر کەسێك دەیەوێ بەهێزترین کەس بێ، با پشت بە خوا ببەستێ و، هەر کەسێك دەیەوێ بەڕێزترینی خەڵکی بێ، با پارێز لە خوای زاڵی پایەدار بکات و، هەر کەسێك دەیەوێ دەوڵەمەندترین کەس بێ، با ئەوەی لە لای خوایە، متمانەی زیاتر پێ هەبێ، لەوەی لە دەستی خۆی دایە.

خوای پەروەردگاریش دەفەرموێ: ﴿يُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوۡمَةَ لَآئِمٍ ﴿٥٤﴾﴾ المائدة.

واتە: لە ڕێی خوادا تێدەکۆشن و، لە لۆمەی لۆمەکاران ناترسێن.

پێشینانی خۆمان هێندێ پەندی غەڵەتیان هەن، وا مەزانن پەندی پێشینان هەموویان ڕاستن، پەندێك دەڵێ: (لۆمەی عەبدان لە عەزابی قەبر ناخۆشترە!)، بەڵام وا نیە، بە خوا لۆمەی عەبدان هەر هیچ نیە لە چاو عەزابی قەبر، لە بەرزەخ دا، دوای ئەوەی ئینسان ڕووحی لە جەستەی جیادەبێتەوە، بۆیەش وا دەڵێم: چونکە خەڵکی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ئاسیا و زۆر لە وڵاتانی دیکەش، جەستەی مردووەکان هەر دەسووتێنن و، دەبێتە خۆڵەمێش و بڵاوی دەکەنەوە! بۆ ئەوەی لێمان تێك نەچێ، مەرج نیە خەڵك هەمووی بچێتە نێو قەبر، بۆیە دەبێ بڵێین: عەزابی دوای مردن و جیابوونەوەی ڕووح لە جەستە لە جیهانی بەرزەخ دا، ئنجا ئا ئەوە لەگەڵ لۆمەی عەبدان، لە تەرازووێ ناهاویشترێ.

زۆربەی خەڵکی لە ترسی زمانی خەڵك و لەبەر لۆمەی خەڵك، زۆرجار ناتوانێ هەق بڵێ، ناتوانێ پابەند بێ بە هەقەوە، بەڵام خوای زاڵی زانا باسی جیهادکردن لە ڕێی خوادا و، نەترسان لە لۆمەی خەڵکی، پێکەوە هێناون: ﴿يُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوۡمَةَ لَآئِمٍ ﴿٥٤﴾﴾ خوا حەکیمە، دەزانێ چ

---

(١) أَخْرَجَهُ الحَاكِمُ برقم: ٧٧٠٧، وَقَالَ: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ.

دەفەرموێ، چونکە کاتێك دەتوانی جیهاد بکەی و تێبکۆشی لە ڕێی خوادا (کە یەکێك لە جۆرەکانی جیهاد بریتیە لە جەنگ و، جیهاد هەمووی لە جەنگ دا خولاصە نەبۆتەوە)، کاتێك دەتوانی موجاهید بی لە پێناوی خوادا، لە لۆمەی لۆمەکاران نەترسی، دیسان لە بارەی قەناعەت و بەرچاوتێری و چاو لە دەستی خەڵك نەبوونەوە، لە سوورەتی (ص)دا، خوا ئاوا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿ قُلْ مَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُتَكَلِّفِينَ ﴿٨٦﴾ ﴾، واتە: بڵێ: هیچ کرێتان لێ داوا ناکەم، (هیچ پاداشتان لێ داوا ناکەم) و، من هیچ ئەرکتان ناخەمە سەر (یان هیچ لاف لێنادەم).

بەڵێ زۆر گرنگە ئینسان ئەرك نەخاتە سەر خەڵکی و، چاوی لە دەستی خەڵکی نەبێ و، لێیان بێ نیاز بێ، هەر کات مامۆستا و زانا و بانگەوازکار بۆ لای خوا، بێ نیازیی دەربڕێ لەوەی لە دەستی خەڵکدایە، خەڵك زۆر ئاتاجیی دەردەبڕێ، بۆ ئەوەی لە لای مامۆستایە، کە شارەزای دین و پەیامی خوای پەروەردگارە، بەڵام ئەگەر ئەو نیازمەندیی دەربڕێ بۆ ئەوەی لە دەستی ئەواندایە، ئەوانیش لەوانەیە بێنیازیی دەربڕن لە بەرانبەر ئەوەدا کە لە دەستی ئەو دایە، کە ئایین و پەیامی خوای بەرز و مەزنە.

**٢٣ و ٢٤)- بۆ بیروڕای خۆ دەمارگیرنەبوون و، بەردەوام کەم کوڕیی و گوناهی خۆ دیتن و، بە کوڵ لە خوا پـــاڕانەوە و، لە خوتخوتە و دنەدانی شەیتان پەنا بەخوا گرتن:**

بەڕێـــــزان!

تەماشـا بکـەن! پێغەمبەرێکـی پایەبـەرزی وەك (یوسـف) (علیـه السـلام) دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَآ أُبَرِّئُ نَفۡسِيٓۚ إِنَّ ٱلنَّفۡسَ لَأَمَّارَةُۢ بِٱلسُّوٓءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّيٓۚ إِنَّ رَبِّي غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٥٣﴾ ﴾ یوسـف.

ئایـا چ گەنجێـك و چ پیاوێـك هێنـدەی (یوسـف) پـاك و چـاك بـووە، کەچـی دەڵـێ: پاکانـە بـۆ نەفسـی خـۆم ناکـەم، چونکـە نەفـس زۆر فەرمـان دەکات بـە خراپـە، مەگـەر پـەروەردگار بەزەیـی (بەرانبـەر بـە مـرۆڤ) هەبـێ، بێگومـان پـەروەردگار لێبـوردەی میهرەبانـە.

ئنجـا ئەگـەر (یوسـف) پاکانـە بـۆ نەفسـی خـۆی نـەکات، کێـی دیکـە بـۆی هەیـە بڵـێ: مـن لـە سـەرووی ئـارەزووان و گومانـان (شـهوات و شـبهات)نم؟!

بەڵـێ هەمیشـە دەبـێ بابـای بانگـەوازکار بـۆ بیـروڕای خـۆی دەمارگیـر نەبـێ و، کـەم و کوڕییەکانـی خـۆی ببینـێ، گونـاح و ناتەواوییەکانـی خـۆی ببینـێ و، خـۆی پـێ لـە خەڵکـی چاکـتر نەبـێ.

هەروەهـا لـەو لاشـەوە: هەمیشـە لـە خـوا بپاڕێتـەوە و، لـە ترسـی خوتخوتـە و دنەدانـی شـەیتان، پەنـا بەخـوا بگـرێ، وەك خـوا بـە پێغەمبـەر ﷺ دەفەرمـوێ: ﴿ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ نَزۡغٞ فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِۚ إِنَّهُۥ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٠٠﴾ ﴾ الأعـراف.

واتـە: ئەگـەر لـە شـەیتانەوە دنەدانێکـت بـۆ هـات، هاندانێکـت بـۆ هـات، پەنـا بـە خـوا بگـرە، بێگومـان خـوا بیسـەری زانایـە.

شـەیتان جـاری وایـە توانیویەتـی زیـان بـە پێغەمبـەر (محمد)یـش (صلـی اللـه علیـه وسـلم) بگەیەنـێ، بـەڵام نـەك لـەڕووی گەیاندنـی وەحیـی و پەیامـی خـواوە، بەڵكـو لـە ڕووی دیكـەوە، بـە بەڵگـەی ئـەوە كـە خـوای زانـا و شـارەزا لـە سـوورەتی (الأنعـام)دا دەفەرمـوێ: ﴿ وَإِذَا رَأَيْتَ ٱلَّذِينَ يَخُوضُونَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُواْ فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِۦۚ وَإِمَّا يُنسِيَنَّكَ ٱلشَّيْطَٰنُ فَلَا تَقْعُدْ بَعْدَ ٱلذِّكْرَىٰ مَعَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٦٨﴾ ﴾ الأنعـام.

واتـە: ئەگـەر ئەوانـەت دەبینـی كـە دەڕژێنـە نێـو ئایەتەكانـی ئێمـەوە، (قسـەی خراپیـان بەرانبـەر بـە ئایەتەكانـی ئێمـە دەكـرد)، لەگەڵیـان دامەنیشـە، تاكـو باسـی بابەتێكـی دیكـە دەكـەن و، هـەر كات شـەیتان لەبیـری بردیـەوە (خافـڵای و هـەر لـەوێ، لـە مەجلیسـەكە مایـەوە)، دوای ئـەوەی وەبیـرت هاتۆتـەوە، لەگـەڵ كۆمەڵـی سـتەمكاران دا دامەنیشـە.

كەواتـە: دەگونجـێ شـەیتان شـت لـە بیـری پێغەمبەریـش (صلـی اللـه علیـه وسـلم) بەرێتـەوە، بـەڵام جگـە لـە گەیاندنـی وەحیـی، لـەوەدا پێغەمبـەران (علیهـم الصلاة والسـلام) خـوا پاراسـتوونی، بـەڵام لـە شـتی دیكـە، نـا، بـۆ وێنـە: لـە صەحیحـی (بوخاریـی و موسـلیم)دا هاتـوە، كـە لوبەیـدی كـوڕی ئەعصەمـی یەهوودیـی جادووی كـردوە لـە پێغەمبـەر (صلـی اللـه علیـه وسـلم) و كاریگەریـی خراپیشـی لەسـەری هەبـووە، هەتـا خـوای میهرەبـان (المعوذتـین)ی بـە (جبریـل)دا ناردوونـە خـوار، سـوورەتی (الفلـق) و سـوورەتی (النـاس) ئـەو یـازدە ئایەتـە و، بەسـەر پێغەمبەریـدا (صلـی اللـه علیـه وسـلم) خوێنـدوون و، جادووەكـە هەڵوەشـاوەتەوە[١].

---

(١) {عَـنْ عَائِشَـةَ، قَالَـتْ: كَانَ رَسُـولُ اللهِ صلى الله عليه وسلم سُـحِرَ، حَتَّـى كَانَ يَـرَى أَنَّـهُ يَـأْتِي النِّسَـاءَ وَلاَ يَأْتِيهِـنَّ، قَـالَ سُـفْيَانُ (أَحَـدُ رِجَـالِ السَّـنَدِ) وَهـذَا أَشَـدُّ مَـا يَكُـونُ مِـنَ السِّـحْرِ إِذَا كَانَ كَـذَا، فَقَـالَ: يَـا عَائِشَـةُ! أَعَلِمْـتِ أَنَّ اللـهَ قَـدْ أَفْتَـانِي فِيـمَا اسْـتَفْتَيْتُهُ فِيـهِ أَتَـانِي رَجُـلاَنِ فَقَعَـدَ أَحَدُهُـمَا عِنْـدَ رَأْسِي، وَالآخَـرُ عِنْـدَ رِجْلَـيَّ، فَقَـالَ الَّـذِي عِنْـدَ رَأْسِي لِلآخَـرِ: مَـا بَـالُ الرَّجُـلِ قَـالَ: مَطْبُـوبٌ قَـالَ: وَمَـنْ طَبَّـهُ قَـالَ: لَبِيـدُ ابْـنُ أَعْصَـمَ، رَجُـلٌ مِـنْ زُرَيْـقٍ، حَلِيـفٌ لِيَهُـودَ، كَانَ مُنَافِقًـا قَـالَ: وَفِيـمَ قَـالَ: فِي مُشْـطٍ وَمُشَـاطَةٍ قَـالَ: وَأَيْـنَ قَـالَ: فِي جُـفِّ طَلْعَـةٍ ذَكَـرٍ تَحْـتَ رَعُوفَـةٍ، فِي بِئْـرِ ذَرْوَانَ قَالَـتْ: فَـأَتَى النَّبِـيُّ صلى الله عليه وسلم الْبِـئْرَ حَتَّـى اسْـتَخْرَجَهُ فَقَـالَ: هـذِهِ الْبِـئْرُ الَّتِـي أُرِيتُهَـا وَكَأَنَّ مَاءَهَـا

## ٣٥) بەپاڵنەری ڕازیی کردنی خوای پەروەردگار،خستنەڕووی ئیسلام بە زمانی حاڵ و کردار:

ئـەوە کۆتـا سـیفەتە و جـاری دیکـەش قسـەمان لـە بـارەوە کـردوە و، مـن پێـم وایـە: گرنگتریـن خەسـڵەت کـە دەبـێ لـە هـەر مسـوڵمانێکدا هەبـێ، بـە تایبەتـی لـە کەسـێك دا بیـەوێ: ببێتـە هـۆی ڕێنمایـی خەڵـك و دەسـتگرتنی خەڵـك بـەرەو ڕاسـتە شـەقامی خـوا، ئەوەیـە: کـە بـە زمانـی کـردارو زمانـی حـاڵ، ئیسـلامیان لـە ئاوێنـەی کـردارو ڕەفتارەکانیـدا بـۆ دەربخـات.

برایان و خوشکانی بەڕێز!

ئێمـە ئەگـەر هـەر قسـەمان لـە خەڵکـی زیـاد بـێ، کاریگەرییـمان لەسـەریان نابـێ، چونکـە هەمیشـە هـەر کەسـە لـە چ ڕووێکـەوە زیـادەی لـە خەڵکـی پێبـێ، دەتوانـێ لـەو ڕووەوە تەئسـیریان تێبـکات، ئـەوەی عیلـم و فیکریـی لـە خەڵـك زیاتـر بـێ، لـە ڕووی عیلمییـەوە، لـە ڕووی فیکرییـەوە، هەروەهـا ئـەوەی پـارە و سـامانی لـە خەڵـك زیاتـر بـێ، دەتوانـێ بـە مـاڵ و سـامان هاوکارییـان بـکات، هەروەهـا ئەگـەر تەقـوا و ئیخلاصـی لـە خەڵـك زیاتـر بـێ، لـەو ڕووەوە، کاریگەریـی لـە سـەریان دەبـێ، بۆیـە ئەسـاس خۆمانیـن، کـە ئەمـە زۆرجـار وەك پەندێکـم لێکـردوە، دەڵێـم: (پاکسـازیی بـە پـاکان دەکـرێ، چاکسـازیی بـە چـاکان دەکـرێ، ڕاسـتکردنەوە بـە ڕاسـتان دەکـرێ) تاکـو بـۆ خۆمـان هـەوڵ نەدەیـن پـاك و چـاك و ڕاسـت بیـن، چۆن دەتوانیـن گۆڕانکاریـی بەسـەر دەوروبـەری خۆمانـدا بێنیـن؟

ئنجـا کـە دەڵێـم: خسـتنە ڕووی ئیسـلام بـە زمانـی حـاڵ و کـردار، ئـەوە هەمـوو کایەکانـی ژیـان دەگرێتـەوە، بـۆ وێنـە: جـاری وایـە ئینسـان دەچـێ بۆ لای نەخۆشـێك،

---

نُقَاعَـةُ الْحِنَّـاءِ، وَكَأَنَّ نخْلَهَـا رُؤُوسُ الشَّـيَاطِينِ قَـالَ: فَاسْـتُخْرِجَ قَالَـتْ: فَقُلْـتُ أَفَـلاَ تَنَـشَّرْتَ؟ فَقَـالَ: أَمَّـا اللـهِ فَقَـدْ شَـفَانِي، وَأَكْـرَهُ أَنْ أُثِـيرَ عَـلَى أَحَـدٍ مِـنَ النَّـاسِ شَرًّا! أَخْرَجَـهُ البُخَـارِيُّ فِي: ٧٦ كِتَـاب الطـب: ٤٩ بـاب هـل يسـتخرج السـحر؟.

بـە دڵسـۆزیی، دوعـای بـۆ دەكات، دەسـتێكی پێـدا دێنـێ، كـە بێگومـان ئـەو مرۆڤـە زۆر پێـی دڵخـۆش دەبـێ و بـە دڵنیایـی لـە لای خـواش پاداشـتێكی گـەورەی دەبـێ، هەروەهـا چـوون بـۆ تازیـە و، بەشـداریی كـردن لـە خۆشـیی و ناخۆشـیی خەڵـك دا، كەسـێك پێویسـتیی پێیـە هاوكاریـی بـكات و، كێشـەی هەیـە بـۆی چارەسـەر بـكات.

ئنجـا ئـەم زمانـی حـاڵ و كـردارە، زۆر زمانێكـی ڕەوان (فصیـح) و پـاراو و گۆیایـە و، هەمـوو كەسـێك چـاك لێـی تێـدەگات و، بەڕاسـتییش ئەگـەر وانەبیـن، مانـای وایـە هـەر قسـەمان لـە خەڵـك زیاتـرە.

خـوا بـە لوتـف و كەڕەمـی خـۆی یارمەتییـمان بـدات، كـە بـە زمانـی كـردار و حاڵ، پێـش زمانـی وتـار و مەقـاڵ، ئاییـنی خـوای پـەروەردگار بخەینـە بـەر چـاوی خەڵـك و شـیرینی بكەیـن و، كارێـك بكەیـن كـە خەڵـك و دەوروبەرمـان لـە هـەر ئاسـتێكدا هەبـن، بـە هـۆی ئێمـەوە شـیرینایەتییان بـە ئاییـنی خـوای بەخشـەردا بچـێ.

### مەسەلەی سێیەم:

**هەر کام لە شەوگارو ڕۆژگارو، خۆرو مانگ لە نیشانەو بەڵگەکانی خوای پەروەردگارن و، کەسێك خواناس بێ و، بیەوێ بە ڕاستیی خوا بپەرستێ و، تەنیا بەندایەتیی بۆ ئەو بکات، نابێ بێجگە لە خوا کڕنووش بۆ هیچی دیکە ببات، وەك مانگ و خۆرو، ئەستێرەو خڕۆکەکان، هەروەها دابەزێندرانی ئاو بەسەر زەمینی وشك و زەبووونداو، پێژیانەوەیشی لە نیشانەکانی خوایە، وێڕای ئەوەش بەڵگەی زیندووکرانەوەی مردووانیشە لە ڕۆژی دواییدا:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِ ٱلَّيْلُ وَٱلنَّهَارُ وَٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ ۚ لَا تَسْجُدُوا۟ لِلشَّمْسِ وَلَا لِلْقَمَرِ وَٱسْجُدُوا۟ لِلَّهِ ٱلَّذِى خَلَقَهُنَّ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴿٣٧﴾ فَإِنِ ٱسْتَكْبَرُوا۟ فَٱلَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ يُسَبِّحُونَ لَهُۥ بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَهُمْ لَا يَسْـَٔمُونَ ۩ ﴿٣٨﴾ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنَّكَ تَرَى ٱلْأَرْضَ خَـٰشِعَةً فَإِذَآ أَنزَلْنَا عَلَيْهَا ٱلْمَآءَ ٱهْتَزَّتْ وَرَبَتْ ۚ إِنَّ ٱلَّذِىٓ أَحْيَاهَا لَمُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰٓ ۚ إِنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٣٩﴾ ﴾.

### شیکردنەوی ئەم ئایەتانە، لە نۆزدە بڕگەدا:

خوا جارێکی دیکە دێتەوە سەر باسی خستنە ڕووی نیشانەکانی بەدیهێنەرایەتیی و، پەروەردگارێتیی و، خاوەندارێتیی خۆی، کە تەنیا بەدیهێنەربوون و، تەنیا پەروەردگاربوون و، تەنیا خاوەنبوونی خوا ﷻ بۆ گەردوون، بەڵگەی تەنیا پەرستراوبوونیشیەتی، لێرەدا خوا ﷻ چەند نیشانەیەك، چەند دیاردەیەکی گەردوونیی، کە بەڵگەی ئەوەن تەنیا خوا هەمەکارەی گەردوونەو، سەرەنجام ئەو هەمەکارەبوونی خوا بۆ گەردوون، بەڵگەی تەنیا پەرستراوبوونیەتی، دەخاتەڕوو، دەفەرموێ:

١)- ﴿ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِ ٱلَّيْلُ وَٱلنَّهَارُ وَٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ ﴾، هەروەها لە نیشانەکانی خوا، شەوو ڕۆژو خۆرو مانگن، ڕاناوەکە بۆ خوا دەچێتەوە، چونکە پێشێ باسی خوای

بەرزی مەزن کراوە، ﴿ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِ ﴾، لە نیشانەکانی وی، ﴿ ٱلَّيْلُ وَٱلنَّهَارُ ﴾، شەوگارو ڕۆژگار، ﴿ وَٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ ﴾، خۆرو مانگ، یانی: (**مِنْ دَلائِلِ رُبُوبِيَّتِهِ وَوحْدانِيَّتِهِ فِي خَالِقِيَّتِهِ وَرُبُوبِيَّتِه وَمَالِكِيَّتِهِ: اللَّيْلُ والنَّهارُ وَتَعَاقُبُهُمَا والشَّمْسُ والقَمَرُ**)، واتە: لە نیشانەو بەڵگەکانی پەروەردگاریّتیی خواو، تەنیایی خوا لە پەروەردگاریّتیی و، بەدیهێنەرایەتیی و، خاوەنداریّتییدا، بریتین لە شەوگارو ڕۆژگارو، بە دوایی یەکدا هاتنیان و، جێگۆڕکە کردنیان، هەروەها خۆرو مانگ.

ئێمە لە زۆر شوێندا باسی شەوگارو ڕۆژگارمان کردوە، هەروەها باسی خۆرو مانگمان کردوە، بە تایبەت لە تەفسیری سوورەتی (**یونس**)[1]دا بە درێژیی باسی هەر کام لە خۆرو مانگ و زەوییمان کردوەو، شەوگارو ڕۆژگاریش لە ئەنجامی خولانەوەی زەوی بە دەوری خۆیدا لە بەرانبەر خۆردا پەیدادەبن، لەوبارەوە باسێکی تیرو تەسەلمان کردوە، بۆیە لێرە بە خێرایی بەسەریدا ڕەت دەبین.

گرنگ ئەوەیە بزانرێ کە خۆر یەکجار زۆر گەورەترە لە مانگ، هەروەك زۆر گەورەتریشە لە زەوی، زەویش زۆر گەورەترە لە مانگ، خۆر (١،٣٠٠،٠٠٠) جار هێندی زەوییە، زەویش چەند بەرانبەری مانگ گەورەیە، بەڵام خوا ﷻ هەم خۆرو هەم مانگی وا خولقاندوون، کە ئێمە لەسەر زەوی تەماشایان دەکەین، بە ئەندازەی یەکن، وەك دەڵێن: بە ئەندازەی کەللە بێژینگێك، یانی: خوا ﷻ لە مەسافەیەکی وادا داینـاون، کە بۆ ئێمەی خەڵکی زەوی بە ئەندازەی یەك دیاربن، بۆیە خوا ﷻ لە سوورەتی (**الرحمن**)دا دەفەرموێ: ﴿ ٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ بِحُسْبَانٍ ۝٥ ﴾، واتە: ئێمە خۆرو مانگمان بە حیساب و بە ئەندازە داناون، ئنجا هەم دوورییەکەیان لە زەوییەوە، هەم دەرکەوتنی قەبارەکەیان بۆ چاوی ئێمە، هەروەها هەموو کاروبارەکانی دیکەیان، هەمووی ئەندازەگیریی کراوە، زانایان دەڵێن: ئەگەر زەوی دوورتر بووایە لە خۆر، یانی: نێوانی زەوی و خۆر لەوەی ئێستا دوورتر بووایە، یان نیزیکتر بووایە، ژیان لەسەر زەوی نەدەبوو،

---

(١) هەروەها لە تەفسیری سوورەتی (الشمس)یش دا.

ئەگەر دوورتر بووایە سەر زەوی دەبوو بە بەستەڵەك و، ئەگەر نیزیکتر بووایە سەر زەوی دەسووتاو دەبوو بە خۆڵەمێش، هەروەها دووریی نێوان مانگ و زەوی، ئەگەر مانگ نیزیکتر بووایە، ئەو کاتە هەڵکشین و داکشینی دەریایەکان زیاتر دەبوو، ئەگەر دوورتریش بووایە ئەو هەڵکشین و داکشینە کەمتر دەبوو، هەروەها ئەو سیستم و شێوەیەی کە ئێستا ژیان لەسەر زەوی بەخۆیەوە گرتوە، تێك دەچوو، ئنجا زەوی کە لە خولەکێکدا (٣٠) کیلۆمەتر دەبڕێ لە خولانەوەی بە دەوری خۆیدا، بەڵام لە خولانەوەی بە دەوری خۆردا لە چرکەیەکدا (٣٠) کیلۆمەتر دەبڕێ، واتە: سووڕانەوەی بە دەوری خۆردا، شەست هێندەی خولانەوەی بە دەوری خۆیدا خێرایە، کە لە ئەنجامی خولانەوی بە دەوری خۆیدا شەوو ڕۆژ پەیدادەبن، بەڵام لە ئەنجامی خولانەوەی بە دەوری خۆردا، چوار کەشەکانی ساڵ پەیدادەبن، واتە: زستان و هاوین و بەهارو پایز، کە هەر چواریان لە بەرانبەر یەکن، ئەو سووڕانەوانەش ئەگەر کەمتربان یان زیاتربان، هەر بە کەڵك نەدەهات، ئەگەر سووڕانەوەی زەوی بە دەوری خۆیدا خێراتر بووایە، شەوو ڕۆژ لە جیاتی ئەوەی بە هاوکۆیی **(معدّل)** یەکی بۆ (١٢) سەعات دابەش بن، ئەو کاتە خێراتر دەبوون، هەروەها ئەگەر سووڕانەوەکە سستتر بووایە، شەوو ڕۆژ درێژتر دەبوون، لەو حاڵەتەشدا بۆ وێنە: ئەگەر شەو دوو ئەوەندە، یان سێ ئەوەندەی ئێستا بووایە، سەر زەوی دەبوو بە بەستەڵەك لە شەودا، ڕۆژیش ئەگەر دوو ئەوەندە، یان سێ ئەوەندەی ئێستا بووایە، دنیا هەمووی دەسووتا، هەتا شەو دادەهاتەوە، بەڵام خوا ﷻ بەو شێوەیە دایناون، کە لەگەڵ ژیان و بەرژەوەندییەکانی مرۆڤدا گونجاو بن.

بۆیە خوا دەفەرموێ:

٢)- ﴿لَا تَسْجُدُوا لِلشَّمْسِ وَلَا لِلْقَمَرِ﴾، کڕنووش نە بۆ خۆر ببەن و، نە بۆ مانگیش.

٣)- ﴿وَاسْجُدُوا لِلَّهِ الَّذِي خَلَقَهُنَّ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ﴾، کڕنووش بۆ ئەو خوایە بەرن کە دروستییکردوون، ئەگەر بە ڕاستیی ئەو دەپەرستن، لێرەدا: ﴿إِن

كُنتُمۡ إِيَّاهُ تَعۡبُدُونَ ﴾، لە لای مالیك و شافیعیی ڕەحمەتی خوایان لێ بێ، ئێرە شوێنی كڕنووش بردنە، بەڵام لە لای ئەبوو حەنیفە، كۆتایی ئایەتی دواتر شوێنی كڕنووش بردنە، كە لای زۆربەی هەرەزۆری زانایان ئێرە یەكێكە لەو پازدە، یان شازدە شوێنەی كە فەڕزە، هەندێك لە زانایانیش دەڵێن: پەسندەو سوننەتە، كڕنووشیان تێدا ببردرێ، بۆ كەسێك كە ئەو ئایەتانە دەخوێنێ، هەڵبەتە لە كاتی خوێندنی قورئاندا لە نوێژداو، جگە لە نوێژیشدا.

٤)- ﴿ فَإِنِ ٱسۡتَكۡبَرُواْ ﴾، ئنجا ئەگەر خۆیان بەزلگرت، ئەمە چوار واتایان هەڵدەگرێ، بەڵام دوو واتایان سەرەكیین:

أ- خۆیان بەزلگرت لە دانهێنان بەوەدا كە شەوگارو ڕۆژگارو، خۆرو مانگ، بەڵگەن لەسەر یەكتایی خوا ﷻ، لە بەدیهێنەرایەتیی و، پەروەردگارێتیی و، خاوەندارێتیی و، پاشان تەنیا پەرستراوێتییدا، ئەگەر خۆیان بەزلگرت لە دانهێنان بەو ڕاستییەدا.

ب- یاخود خۆیان بەزلگرت لەوەدا كە شوێنی تۆ بكەون.

ج- یاخود ئەگەر خۆ بەزلگربوون لە بەرانبەر ئەوەدا كە پابەندی قورئان بن.

د- یاخود ئەگەر خۆیان بەزلگرت لەوەدا كە كڕنووش بۆ خوا ببەن و، سووربوون لەسەر ئەوەی كڕنووش هەر بۆ مانگ و خۆرو، بت و صەنەمەكان ببەن، ئەو واتایانە هەموویان هەڵدەگرێ، بەڵام دووی یەكەمیان واتە: ئەگەر خۆ بەزلگربوون لە دانهێنان بە بەڵگەبوونی شەوگارو ڕۆژگارو، خۆرو مانگ لەسەر تەنیایی خواو، یەكتایی خوا لە بەدیهێنەرایەتیی و، پەروەردگارێتیی و، خاوەندارێتیی و، تەنیا پەرستراوێتییدا، یاخود خۆ بەزلگربوون لەوەدا كە شوێنی تۆ بكەون، كە ئەو دووانە شوێنكەوتنیان بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ و پابەندیی بە قورئانیشیان تێدایەو، خۆ دوورگرتن لە كڕنووش بۆ غەیری خواشیان تێدایە.

٥)- ﴿ فَٱلَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ يُسَبِّحُونَ لَهُۥ بِٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ وَهُمۡ لَا يَسۡـَٔمُونَ ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی لە لای پەروەردگارتن، بە شەوو ڕۆژ بە پاكی دەگرن و ئەوان ماندووش نابن.

(نیزیکیی) مەبەست پێی نیزیکیی مەعنەوییە، یان دەبێ بڵێین: نیزیکیی لە خوا ﷻ بەو شێوەی بۆ خوا شایستەیە، کە بە تەئکید مەبەست پێی ئەو فریشتانەن کە لە فریشتەکانی دیکە بەرزترن، وەك لە سوورەتی (النساء) لە ئایەتی ژمارە: (١٧٢)دا هاتوە، کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ ٱلْمُقَرَّبُونَ ﴾، واتە: فریشتە زۆر نیزیکخراوەکان، فریشتەکانیش پلە پلەن، هەیانە زیاتر لە خوای بەرزی مەزنەوە نیزیکە، هەشیانە حاڵەتیکی نیزیکیی کەمتری هەیە، وەك خوا ﷻ لە سوورەتی (النساء)دا، دەفەرموێ: ﴿ لَّن يَسْتَنكِفَ ٱلْمَسِيحُ أَن يَكُونَ عَبْدًا لِّلَّهِ وَلَا ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ ٱلْمُقَرَّبُونَ ۚ وَمَن يَسْتَنكِفْ عَنْ عِبَادَتِهِۦ وَيَسْتَكْبِرْ فَسَيَحْشُرُهُمْ إِلَيْهِ جَمِيعًا ﴿١٧٢﴾ ﴾، واتە: مەسیح خۆی بە زل ناگرێ، پێی کەمیی نیە، کە بەندە بێ بۆ خوا، هەروەها فریشتە زۆر نیزیکخراوەکانیش، ئەوانیش خۆیان بە زل ناگرن، خۆیان بە دوور ناگرن، لەوەدا کە پێیان شەرم بێ بەندەبن بۆ خوا ﷻ، هەر کەسێك پێی شەرم بێ، یاخود پێی کەمیی بێ کە بەندایەتیی بۆ خوا بکات و، خۆی بە زلبگرێ، خوا هەموویان بۆ لای خۆی کۆ دەکاتەوە.

ئنجا لە ئایەتی دوایی دا دەفەرموێ: ﴿ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ فَيُوَفِّيهِمْ أُجُورَهُمْ وَيَزِيدُهُم مِّن فَضْلِهِۦ ۖ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱسْتَنكَفُوا۟ وَٱسْتَكْبَرُوا۟ فَيُعَذِّبُهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا وَلَا يَجِدُونَ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿١٧٣﴾ ﴾، واتە: ئنجا ئەوانەیان کە بڕوایان هێناوەو، کردەوە باشەکانیان کردوون، پاداشتی تەواوی کردەوەکانیان دەداتەوەو، لە بەخششی خۆی بۆشیان زیاد دەکات، بەڵام ئەوانەیان کە پێیان شەرم بووەو، پێیان کەمیی بووە بەندایەتیی بۆ خوا بکەن و، خۆیان بەزلگرتوە، ئەوان سزایەکی بە ئێشیان دەدات و، جگە لە خواش هیچ سەرپەرشتیارو یارمەتیدەرو پشتیوانێکیان چنگ ناکەوێ.

کەواتە: تەنانەت ئەو فریشتانەش کە زۆر لە خوا نیزیکن، ئەگەر بێبڕوایەکان خۆیان بە زلگرت، ئەوانەی لە خزمەت پەروەردگارتن و، زۆر لە پەروەردگارت

نیزیکن، بە نیزیکییەك کە بۆ خوا شایستەیە، ئەوانەش: ﴿يُسَبِّحُونَ لَهُۥ بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَهُمْ لَا يَسْـَٔمُونَ ﴾، بە شەوو بە ڕۆژ پاکیی بۆ دەردەبڕن و، ئەوان بێزارو ماندووش نابن.

کە دەفەرموێ: ﴿يُسَبِّحُونَ لَهُۥ﴾، لە شوێنی دیکەش هاتوە: ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ﴾، هەروەها ئەگەر بشفەرموێ: (سَبَّحَهُ)، واتە: بە پاکی گرت، هەر دەبێ، بەڵام لێرەدا ئەمە مانای وایە: زۆر بە شێوەی تایبەت پاکیی بۆ خوا دەردەبڕن، **(التَّسْبِيحُ كُلُّ مَا يَدُلُّ عَلَى تَنْزِيهِ اللهِ تَعَالى عَنْ مَا لا يَلِيقُ بِهِ)**، واتە: **(تَسْبِيح)** بریتیە لە هەر جۆرە بە پاك گرتنێك لە بە پاکگرتنی خوا، لە هەر شتێك بۆ خوا شایستە نەبێ.

﴿وَهُمْ لَا يَسْـَٔمُونَ﴾، ئەوان بێزاریش نابن، دەڵێ: **(السَّآمَةُ: الضَّجَرُ وَالمَلَلُ مِنَ الإِعْيَاءِ)**، واتە: **(سئامَة)** بریتیە لە بێزاریی و، وەڕەزیی لە ئەنجامی زۆر ماندوو بووندا، واتە: بێزار نابن و، وەڕەز نابن و، بێتاقەت نابن، هەرچەندە بە شەوو ڕۆژ سەرگەرمی بە پاکگرتنی خوان.

کە دەفەرموێ: ﴿يُسَبِّحُونَ لَهُۥ بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ﴾، بێگومان بە نسبەت ئێمەوە شەوگارو ڕۆژگار دەزانین چۆنن، کە بە نسبەت ئەستێرەکان و خڕۆکەکانی دیکەوە مەرج نیە هەموویان بەو شێوەیەی زەوی ئێمە بن، لەوێ ڕەنگە هەیانبێ شەوەکەی ملیۆنێك ساڵ بێ و، ڕۆژەکەشی ملیۆنێك ساڵ بێ، یاخود مەرج نیە، هەموو هەڵکەوتەکەیان وەك زەوی بێ، شەوەکەی بەو شێوەیە تاریك بێ و، ڕۆژەکەی بەو شێوەیە ڕووناك بێ، گرنگ ئەوەیە لێرەدا یانی: ئەوەی بە نسبەت ئێمەوەو ئەوەی بۆ ئێمە شەوو ڕۆژە، واتە: بە درێژایی کات، چونکە گۆی زەوی یان شەوە، یان ڕۆژە، واتە: بە درێژایی کات، ئەوانە خەریکی بە پاکگرتنی پەروەردگارن، بێ ئەوەی بێزار ببن، گوتراوە: **(والمَقْصُودُ باللَّيْلِ وَالنَّهَارُ اسْتِيعَابُ الزَّمَنِ كُلِّهِ إذْ لَا زَمَنَ عِنْدَنَا إلاَّ اللَّيْل وَالنَّهَارِ)**، واتە: مەبەست لەوە کە

دەفەرموێ: بە شەوو بە ڕۆژ، واتە: تێکڕای کات، چونکە لە لای ئێمە کات کورت هەڵاتوە لە شەوو ڕۆژدا.

٦)- ﴿ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنَّكَ تَرَى ٱلْأَرْضَ خَـٰشِعَةً ﴾، لە نیشانەکانی وی، (واتە: هی خوا)، ئەوەیە کە تۆ زەوی بە ملکەچ و زەبوون دەبینی، ڕاناوی (أَنَّكَ) بۆ کەسێکی دیاریی نەکراوە، (**أَنَّكَ لِغَيْرِ مُعَيَّنٍ، فَهُوَ صَالِحٌ لِكُلِّ سَامِعٍ**)، هەر بیسەرێك، یان هەر کەسێك کە قورئان دەخوێنێتەوە، هەر کەسێك کە دەگونجێ بدوێنرێ: زەوی دەبینی بە گەردنکەچیی و، زەبوونیی، کە مەبەست لە گەردنکەچیی و زەبوونییەکەی، واتە: وشك و بێ ڕووەکە، (**الخُشُوعُ: التَّذَلُّلُ، وَهُوَ مُسْتَعَارٌ لِحَالِ الأَرْضِ إِذَا كَانَتْ مُقْحِطَةً لا نَبَاتَ عَلَيْهَا، لأَنَّ حَالَهَا فِي تِلْكَ الحالَةِ كَحالِ المُتَذَلِّلِ السَّائِل**)، (**خُشُوع**) یانی: زەبوون، یان گەردنکەچ، کە خوازراوەتەوە بۆ حاڵی زەوی، کە دێمەکارو قاقڕەو، بێ ڕووەکەو هیچ سەوزایی لەسەر نیە، چونکە لەو حاڵەتەدا کە زەوی دەڕووتێتەوەو، هیچ ڕووەکی لەسەر نامێنێ، دەشوبهێتە حاڵی بابایەك کە داوای هاوکاریی دەکات و، سواڵکەرو ئاتاج و هەژارە، واتە: زەویش لەو حاڵەتەدا بە زمانی حاڵ داوا دەکات کە ئاوی دابەزێتە سەر، بۆ ئەوەی جارێکی دیکە ڕووەك و شیناوردی لەسەر بڕوێ.

٧)- ﴿ فَإِذَآ أَنزَلْنَا عَلَيْهَا ٱلْمَآءَ ٱهْتَزَّتْ وَرَبَتْ ﴾، هەر کاتێك ئاومان دابەزاندە سەری، جووڵاو ئاوسا، ئەم (إِذَا)یە (إِذَا)ی (**فُجائِيَّة**)یە، یانی: کتوپڕ کە ئاوی دابەزییە سەر بە خێرایی، دەجووڵێ و دەئاوسێ، (**الإِهْتِزَازُ: مُطَاوَعَةُ هَزَّهُ، أَي: حَرَّكَهُ بَعْدَ سُكُونِهِ فَتَحَرَّكَ**)، واتە: (**إِهْتِزاز**) موتاویعی (**هَزَّ**)یە، (**هَزَّهُ، يَهُزُّهُ، فَاهْتَزَّ**)، واتە: ڕایوەشاندو، ڕایدەوەشێنێ، ڕاوەشێنراو جووڵا، شتێك کە ڕاوەستا بێ و کەسێك ڕایبوەشێنێ، پێی دەگوترێ: (**هَزَّهُ**)، حاڵەتی جووڵانەکەی پێی دەگوترێ: (**إِهْتِزاز**)، (**ورَبَتْ**)، (**أَي: زادَتْ وَنَمَتْ**)، واتە: زیادیکردو گەشەی کرد، کە مەبەست پێی حاڵەتی هەڵاوسانی زەوییە، کاتێك ئاو لە ئاسمانەوە دادەبەزێتە سەری، بە شێوەی باران و بەفرو تەرزە، زەوی دەئاوسێ، قەبارەکەی زیاد دەکات و، تۆو و نێوکی ئەو شیناوردو، دارو درەخت و، دانەوێڵەو .... هتدەی کە لە نێویدان، وردە وردە دەست دەکات بە جووڵەو، چەکەرە دەدات و، هەر کامیان لە ئاست خۆیەوە ئەو زەوییە بەرز دەکاتەوەو دەیدڕێ و، سەری لێ دێنێتەدەر.

٨)- ﴿إِنَّ ٱلَّذِىٓ أَحۡيَاهَا لَمُحۡىِ ٱلۡمَوۡتَىٰٓ﴾، بە دڵنیایی کەسێك کە ژیاندوویەتەوە (ئەو زەوییە)، ژیێنەرەوەی مردووانە.

٩)- ﴿إِنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىۡءٖ قَدِيرٌ﴾، بە دڵنیایی ئەو لەسەر هەموو شتێك توانایە.

لێرەدا خوا ﷻ ژیاندنـەوەی زەویـی و، دووبـارە ڕووەك تێـدا ڕواندنـەوەی زەوی، ئاوێتـە کـردوە لەگـەڵ بەڵگـە هێنانـەوە لەسـەر زینـدوو بوونـەوەی مـردووان، چونکـە خـوا ﷻ باسـی زەوی دەکات لـە نیشـانەکانی تەنیایـی خـوا لـە پەروەردگارێتیـی و، بەدیهێنەرایەتیـی و، خاوەندارێتیـی و، پەرسـتراوێتییدا، ئەوەیـە کـە زەوییەکـی قاقـڕو دێمـەکاری وشـك هەڵاتـوو، کاتێـك کـە خـوا ئـاوی دادەبەزێنێتـە سـەر، ڕادەوەشـێ و دەجووڵـێ و هەڵدەئاوسـێ، هەروەهـا هەمـوو جـۆرە شـیناوردێك کـە دەنـك و تۆوەکانـی تێـدا هـەن، تێیـدا دەڕوێـن، ئنجـا دەفەرمـوێ: ئەوکەسـەی زینـدووی کـردەوە، زیندووکـەرەوەی مردووانیشـە، ژیێنـەرەوەی مردووانیشـە، واتـە: زیندووکرانـەوەی مـردووان و، زیندووکردنـەوەی ئـەو زەوییـە، یـان ئـەو دەنکـە تـۆو و دانەوێڵانـە کـە لـە زەویـدا هـەن، هـەروەك یەکـەو یـەك شـێوەن.

﴿إِنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىۡءٖ قَدِيرٌ﴾، بـە دڵنیایـی خـوا لەسـەر هەمـوو شـتێك بـە توانایـە، دەسـەڵاتی خـوا سـنوورو لەمپەرێکـی لەبـەر نیە.

بێگومـان لێـرەدا لـە کـۆی ئـەو سـێ ئایەتـە موبارەکـەدا، کـە خـوا باسـی شـەوگارو ڕۆژگارو، خـۆرو مانـگ و، زەوی و، پاشـان دابەزێنرانـی ئـاو بـۆ سـەر زەوییەکـی وشـکی قاقـڕی بـێ ڕووەك دا دەکات، پاشـان زیندووبوونـەوەی زەوی ... هتـد.

خـوا ﷻ ئەوانـە هەمـوو وەك بەڵگـە دێنێتـەوە، لەسـەر ئـەوە کـە بێگومـان تەنیـا خـوا ئـەو کارانـە دەکات، کەواتـە: خـوا کـە هەمـەکارەی گەردوونـەو، هەمـەکارەی ئاسـمان و زەوییـە، شایسـتەیە تەنیـا ئەویـش بەندایەتیـی بـۆ بکـرێ و، تەنیـا ئەویـش بپەرسـترێ، کـە زەقتریـن و دیارتریـن شـێوەی پەرسـتن و نیشـانەی پەرسـتن، بریتیـە لـە

کڕنووش بردن، کەواتە: ئەو کڕنووش بردنە، دەبێ تەنیا بۆ خوای بەرزی بێ وێنە بێ.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی یارمەتیی هەموو لایەکمان بدات، کە بە مانای فراوان و ڕاستەقینەی پەرستن، تەنیا خوا بپەرستین، لە ژیانی تایبەتیی و تاکیی خۆماندا، لە ژیانی خێزانییمان و، لە ژیانی کۆمەڵایەتییمان و، لە ژیانی سیاسییماندا، هەروەها لە دەروونی خۆماندا تەنیا خوا بە پەرستراو بزانین، هەروەها لە ڕواڵەتی ژیانماندا، لە هەڵسوکەوتەکانماندا وا بخوێندرێتەوە، کە خوا لە لای ئێمە لە هەموو کەس بەرزترەو مەزنترەو، خۆشەویسترەو، سام لێکراوترەو، مل بۆ کەچکراوترە، هەموو ئەو چەمکانە دەچنەوە نێو چەمك و واتای پەرستن، دەبێ ئەوپەڕی خۆشویستنت و، بە گەورەگرتنت و، بەبەرزگرتنت و، ئەوپەڕی مل بۆ کەچکردنت و، ئەوپەڕی سام و هەیبەت لێکردنت و، ئەوپەڕی پشت پێ بەستنت، تەنیا بۆ خوا ﷻ بێ، ئەو کاتە مانای وایە تەنیا خوات پەرستوە، خوا لەو کەسانەمان بگێڕێ کە بە مانای تەواوی پەرستن، خوا بپەرستین، کە بێگومان ئەوەش دەستەبەر نابێ، بەبێ شوێن پێ هەڵگرتنی پێغەمبەر ﷺ و، پەیڕەویی کردن لە دوا کتێبی خوا، دوا بەرنامەی خوا، کە بە پێغەمبەری کۆتایی خۆی موحەممەددا ناردوویەتی.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە شەش (٦) ئایەت پێك دێ، ئایەتەكانی: (٤٠ - ٤٥)، هەر شەشیان لە بارەی ئایەتەكانی خواوەن، ئەو ڕستانەی كە فەرمایشتی خوا پێك دێنن، هەروەها لە بارەی پێغەمبەرانی خواوەن، بە تایبەت پێغەمبەری خاتەم و، كتێبەكەی (قورئان) و، هەڵوێستی نەیارانیان، لە بەرانبەریان دا، هەروەها ئاماژەیەكیش بە مووسا ﷺ و كتێبەكەی تەورات كراوەو، بەرپەرچدانەوەی هەندێك لەو قسانەی لە بارەی قورئان و، لە بارەی موحەممەدەوە ﷺ گوتراون و دەگوترێن، باسكراوە:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِىٓ ءَايَٰتِنَا لَا يَخْفَوْنَ عَلَيْنَآ ۗ أَفَمَن يُلْقَىٰ فِى ٱلنَّارِ خَيْرٌ أَم مَّن يَأْتِىٓ ءَامِنًا يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ ٱعْمَلُوا۟ مَا شِئْتُمْ ۖ إِنَّهُۥ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٤٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِٱلذِّكْرِ لَمَّا جَآءَهُمْ ۖ وَإِنَّهُۥ لَكِتَٰبٌ عَزِيزٌ ﴿٤١﴾ لَّا يَأْتِيهِ ٱلْبَٰطِلُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِۦ ۖ تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ ﴿٤٢﴾ مَّا يُقَالُ لَكَ إِلَّا مَا قَدْ قِيلَ لِلرُّسُلِ مِن قَبْلِكَ ۚ إِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغْفِرَةٍ وَذُو عِقَابٍ أَلِيمٍ ﴿٤٣﴾ وَلَوْ جَعَلْنَٰهُ قُرْءَانًا أَعْجَمِيًّا لَّقَالُوا۟ لَوْلَا فُصِّلَتْ ءَايَٰتُهُۥٓ ۖ ءَا۬عْجَمِىٌّ وَعَرَبِىٌّ ۗ قُلْ هُوَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ هُدًى وَشِفَآءٌ ۖ وَٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ فِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرٌ وَهُوَ عَلَيْهِمْ عَمًى ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ يُنَادَوْنَ مِن مَّكَانٍۭ بَعِيدٍ ﴿٤٤﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ فَٱخْتُلِفَ فِيهِ ۗ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ لَقُضِىَ بَيْنَهُمْ ۚ وَإِنَّهُمْ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ مُرِيبٍ ﴿٤٥﴾ ﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بـە دڵنیایـی ئەوانـەی لادان لـە ئایەتەکانمانـدا دەکـەن (و بەلارێیانـدا دەبـەن)، لێمان پەنهـان نیـن، ئنجـا ئایـا کەسـێك کـە فـڕێ دەدرێتـە نێـو ئاگـری دۆزەخـەوە، حاڵـی باشـترە، یـان کەسـێك کـە لـە ڕۆژی قیامەتـدا بەبـێ ترسـیی لـە سـزای خـوا دێ؟! چیتـان دەوێ بیکـەن (ئـەی بێبڕواینـە!)، بێگومـان ئـەو (خـوا) بینـەری ئەوەیـە کـە دەیکـەن ﴿٤٠﴾ بێگومـان ئـەو کەسـانەی بـە قورئانـی بیرخـەرەوە بێبڕوابـوون کاتێـك بۆیـان هـات، سـزای سـەخت دەدرێـن، بەڕاسـتیی ئـەو قورئانـە کتێبێکـی زاڵـی باڵادەسـتە ﴿٤١﴾ نـە لـە پێـش دەسـتیەوە، نـە لەدوایـەوە ناهەقیـی و ناڕاسـتیی بـۆ نایـەت، لـە لایـەن خـوای کارزانـی ستایشـکراوەوە دابەزێـنراوە ﴿٤٢﴾ (ئـەی موحەممـەد!) تەنیـا ئـەوەت پـێ دەگوتـرێ، کـە لـە پێـش تـۆدا بـە پێغەمبـەران گوتـراوە، بێگومـان پـەروەردگارت خـاوەن لێبوردنێکـی تایبـەت و، خـاوەن سـزایەکی بـە ئێشـە ﴿٤٣﴾ ئـەم قورئانـە بـە زمانـی عەرەبییـەو، ئەگـەر گێڕاباشـمان بـە قورئانێکی ئەعجەمیـی، (بـە زمانێکـی جگـە لـە عەرەبیـی ، بێبڕوایـەکان) دەیانگـوت: دەبووایـە ئایەتەکانـی ڕوونکرابانـەوە، ئایـا چـۆن قورئانیکـی ئەعجەمییـەو، پێغەمبەرێکـی عەرەبیـی (زمـان)؟! بڵـێ: ئـەم قورئانـە بۆ بـڕواداران ڕێنمایـی و چارەسـەرەو، ئەوانەش کـە بڕواناهێنـن قورسـایی لـە گوێیاندایـەو، ئـەو قورئانـە هـۆکاری کوێرییـە بۆیـان لـە سـۆنگەی بێبڕوابوونیانـەوە، ئەوانـە وەك کەسـانێکن کـە لـە شـوێنێکی دوورەوە بانـگ دەکرێـن (کـە گوێبیسـتی بانگکرانەکـە نابـن) ﴿٤٤﴾ بـە دڵنیایـی کتێبەکـە (تـەوڕات) یشـمان بـە مووسـادا، کەچـی ناکۆکیـی و، ڕاجیایـی تێـدا کـراو، ئەگـەر لەبـەر ئـەوە نەبووایـە وشـەیەك (بڕیارێـك) لـە پەروەردگارتـەوە تێپەڕیـوە (کـە دادوەریـی لـە نێوانـدا کردنیـان بـۆ قیامـەت هەڵبگـرێ)، دادوەرییـان لـە نێوانـدا دەکـراو، بێگومـان ئەوانیـش (بێبڕوایانـی ڕۆژگاری پێغەمبـەری کۆتایـی) لـە بـارەی قورئانـەوە لـە دوو دڵییەکـی خەسـت و خۆڵـدان ﴿٤٥﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(يُلْحِدُونَ): لادەدەن یاخود لادان دەکەن، (**اللَّحْدُ: حُفْرَةٌ مَائِلَةٌ عَنِ الوَسَطِ، لَحَدَ وَأَلْحَدَ فُلانٌ: مَالَ عَنِ الحَقِّ**)، (**لَحْد**): چاڵێکە لە نێوەڕاستی گۆڕدا، بە لایەکیدا لادەدات، بە کوردیی پێی دەڵێین: لاگۆڕ، واتە: دوای ئەوەی گۆڕەکە هەڵدەکەنرێ، بە تەنیشتێکیدا گۆڕیچکەیەك دەدڕدرێ، بۆ ئەوەی دوایی جەنازەکە بخرێتە ئەو تەنیشتەوە، دوایی گۆڕەکە پڕ دەکرێتەوە، جاری واش هەیە نێوەڕاستی گۆڕەکە گۆڕیچکەیەکی دیکەی (گۆڕەکە دەبێ بە گەورەیی هەڵکەنرێ) لێدەدرێ بە زۆریی وایە، بۆ ئەوەی جەنازەکە بخرێتە نێوی، دوایی ئەو بەردانە کە پێی ڕادەهێڵدرێن، دەکەونە سەر ئەولاو لای گۆڕەکە تاکو بە ئاسانیی جەنازەکە داپۆشرێ، دەگوترێ: (**لَحَدَ فُلانٌ وَأَلْحَدَ**) واتە: لە هەق لایدا، (**لَحَدَ يَلْحَدُ، أَلْحَدَ يُلْحِدُ**) واتە: هەم بە سیانیی (**ثلاثي**) هاتوە، هەم بە چواریی (**رباعي**).

(ءَامِنًا): (**أَصْلُ الأَمْنِ: طُمْأَنِينَةُ النَّفْسِ وَزَوَالُ الخَوْفِ**)، (**أَمْن**): لە ئەصڵدا بریتیە لە دەروون ئارام بوون و نەمانی ترس و بیم، کەواتە: (**آمِنْ**) واتە: بێ ترس، دڵنیا.

(عَزِيزٌ): (**الْعِزَّةُ: حَالَةٌ مَانِعَةٌ للإِنْسَانِ مِنْ أَنْ يُغْلَبَ**)، (**عِزَّة**): بریتیە لە حاڵەتێك کە ڕێ بگرێ لەوەی مرۆڤ تێشکاو بێ، دەگوترێ: (**أَرْضٌ عَزَازٌ: أَي صُلْبَةٌ**) زەوییەکی سەخت، ڕەق، (**والعَزِيزُ: الَّذِي يَقْهَرُ وَلا يُقْهَر**)، (**عَزِيز**): ئەوەیە کە زاڵ دەبێ و تێشکاو نابێ.

(أَعْجَمِيًّا): (**الْعُجْمَةُ: خِلَافُ الإِبَانَةِ، وَالإِعْجَامُ: الإِبْهَامُ، وَالْعَجَمُ: خِلَافُ الْعَرَبِ، وَالعَجَمِيُّ مَنْسُوبٌ إِلَيْهِ**)، (**عُجْمَة**) پێچەوانەی (**إِبَانَة**)یە، (**إِبَانَة**) واتە: ڕوونکردنەوە، (**عُجْمَة**) واتە: نامۆیی و ڕوون نەکردنەوەی شتێك، (**إِعْجَام**) یانی: (**إِبْهَام**) واتە:

شتێك كە دیار نەبێ، ڕوون نەبێ، (عَجَم) پێچەوانەی (عَرَب)ە، مرۆڤەكان هەموویان دوو بەشن: یان عەڕەبن، یان عەجەمن، كەواتە: (عَجَم) یانی: غەیری عەڕەب، (عَجَمِيّ) ئەو كەسەی پاڵدەدرێتە لای (عَجَم) واتە: غەیری عەڕەب، دیارە بە نسبەت عەڕەبانەوە مرۆڤەكان، خەڵكەكە دوو بەش بوون، عەڕەب و جگە لە عەڕەب بوون، هەروەك بۆ كوردیش، یان كوردن یان جگە لە كوردن، ئەوە بۆ هەموو نەتەوەكان هەر وایە، بۆ فارسیش خەڵك یان فارسە یان جگە لە فارسە، بۆ ئینگلیزیش یان ئینگلیز، یان جگە لە ئینگلیزە.

(عَمًى): (الْعَمَى: إفْتِقَادُ البَصَرِ وَالبَصِيرَةِ)، (عَمَى): بریتیە لە نەمانی چاو، یاخود دڵ ڕۆشنیی و عەقڵ ڕۆشنیی، واتە: نەدیتنی بەرهەست كە بە چاوەو، نەدیتنی مەعنەویی كە بە عەقڵ و دڵە، دەگوترێ: (عَمِيَ عَلَيْهِ: إشْتَبَهَ حَتَّى صَارَ بِالإضَافَةِ إِلَيْهِ كَالأَعْمَى)، (عَمِيَ عَلَيْهِ) واتە: ئەو شتە لێی نامۆ بوو هەتا بە نسبەت ئەو، وەك كوێری لێهات كە نەتوانێ ببینێ، ﴿ فَعَمِيَتْ عَلَيْهِمُ ٱلْأَنۢبَآءُ يَوْمَئِذٍ ﴿٦٦﴾ ﴾ القصص، واتە: لەو ڕۆژەدا هەواڵەكان لە بەرانبەریاندا كوێر بوون، واتە: نەیانتوانی هەواڵەكان بزانن، وەك بڵێی هەواڵەكان كوێر بن نەگەنە ئەوان.

(مُرِيبٍ): (الرَّيْبُ: الشَّكُّ)، (رَيْب): بە مانای دوودڵییە، (المُرِيبُ: المُوقِعُ فِي الرَّيْبِ)، (مُرِيب) واتە: شتێك كە مرۆڤ بخاتە نێو دوودڵییەوە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خـوا ﷻ هـەر لـە سـیاقی باسـی قورئـان و پێغەمبەرایەتیـی و، لـە سـیاقی خسـتنەڕووی ئایەتەکانیـدا، کـە پێشـێ باسـی ئایەتـە بینراوەکانـی کـرد، لـە کتێبـی گـەردوون دا، ئنجـا باسـی ئایەتـە خوێنراوەکانـی دەکات، لـە کتێبـی قورئـان دا، یاخـود لـە کتێبەکانـی دیکـەی خـوای پـەروەردگاردا، پێشـێ باسـی نیشـانە بەرهەسـتەکانی کـرد، ئنجـا باسـی نیشـانە مەعنەوییـەکان دەکات، پێشـێ باسـی نیشـانەکانی کـرد، کـە لـە ڕووپەڕەکانـی کتێبـی گەردوونـدا دەردەکـەون، ئنجـا باسـی نیشـانەکانی خـۆی دەکات، کـە لـە ڕووپەڕەکانـی کتێبـی فەرمایشـتیدا دەردەکـەون.

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُلۡحِدُونَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا ﴾، بـە دڵنیایـی ئەوانـەی لـە ئایەتەکانـی ئێمـەدا لادان دەکـەن، واتـە: لـە مامەڵـە لەگـەڵ ئایەتەکانـدا لادان دەکـەن و، بەمـلاولادا دەچـن و بـە لاڕێدابـردن دەکـەن، ﴿ لَا يَخۡفَوۡنَ عَلَيۡنَآ ﴾، لێـمان پەنهـان نابـن، بـۆ ئێمـە دیـارن، هـەم لادان و، بەلاڕێـدا بردنەکەیـان، هـەم مشـتومڕو شـەڕە قسـەی بـێ جێیـان، لـە بـارەی ئایەتەکانـی ئێمـەوە دیـارن و، لـە بـەر چاومانـن، هیـچ شـتێکیان لـە ئێمـە پەنهـان نابـێ، ئەمـە بـە تەئکیـد هەڕەشـەیە و، دواییـش خـوا ﷻ هەڕەشـەکە بـاس دەکات، ئەگـەر بـە کەسـێك بڵێـی: تـۆ لـە مـن دیـاری، یـان لێـم پەنهـان نـی، یـان ئـاگام لـێ بـوو چیـت دەکـرد، یـان ئـاگام لێیـە چـی دەکـەی! ئـەوە هەڕەشـەیەکی پێچراوەیـە.

﴿ أَفَمَن يُلۡقَىٰ فِي ٱلنَّارِ خَيۡرٌ ﴾، بـە پرسـیارلێکردنی نکووڵیلێکەرانـە دەفەرمـوێ: ئایـا کەسـێك کـە فـڕێ دەدرێتـە نێـو ئاگـرەوە حاڵـی باشـترە؟! ﴿ أَم مَّن يَأۡتِيٓ ءَامِنٗا يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ ﴾، یاخـود کەسـێك کـە بەبـێ ترسـی لـە ڕۆژی هەڵسـانەوەدا دێ؟! کەواتـە: ئەوانـەی لادان دەکـەن لـە ئایەتەکانـی خـوادا، چارەنووسـیان بریتیـە لـە سـزا، یـان

فڕێدرانـە نێـو ئاگـر، ئنجـا ئایا ئـەوەی فـڕێ دەدرێتـە نێـو ئاگـر، حاڵـی باشـترە، یاخـود کەسـێك کـە بەبـێ تـرس و، بـە دڵنیایـی دێ لـە ڕۆژی هەڵسـانەوەدا؟! ﴿ ٱعۡمَلُواْ مَا شِئۡتُمۡ ﴾، هەرچـی دەتانـەوێ بیکـەن، ﴿ إِنَّهُۥ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٌ ﴾، ئـەو بینـەری ئەوەیـە کـە دەیکـەن، تێتانـەوە ڕامـاوەو دەزانـێ چـی دەکـەن.

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِٱلذِّكۡرِ لَمَّا جَآءَهُمۡ ﴾، بـە دڵنیایـی ئەوانـەی بێبڕوابـوون بـە قورئانـی بیرخـەرەوەو یادخـەرەوە، یادخـەرەوە بـۆ ئـەو ڕاستییانەی کـە لـە زگـماك و، لـە خوارسـك و، ناخـی مرۆڤـدا هـەن، ﴿ لَمَّا جَآءَهُمۡ ﴾، دوای ئـەوەی بۆیـان هـات، کەچـی پێـی بێبڕوابـوون بـەو کتێبـە بیرخەرەوەیـە، ﴿ وَإِنَّهُۥ لَكِتَٰبٌ عَزِيزٌ ﴾، بـە دڵنیایـی ئـەو کتێبێکـی زاڵ و بـاڵا دەسـتە، لێـرەدا وەڵامەکـەی دیـار نیـە، ئەوانـەی بێبڕوابـوون بـە (ذِکْـر) دوای ئـەوەی بۆیـان هـات، لـە حاڵێکـدا کـە کتێبێکـی زاڵ و باڵادەسـتە، کـوا وەڵامەکـەی؟ وەڵامەکـەی بـە سـیاق و سـەلیقە دەزانـرێ، واتـە: ئەوانـە سـزایەکی سـەخت چاوەڕێیانـە.

ئنجـا هـەر لەسـەر وەسـفکردنی قورئـان بـەردەوام دەبـێ، دوای ئـەوەی بـە کتێبێکـی عەزیـز، کتێبێـك کـە بـاڵا دەسـتەو زاڵـە وەسـفی کـرد، دەفەرمـوێ: ﴿ لَّا يَأۡتِيهِ ٱلۡبَٰطِلُ مِنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَلَا مِنۡ خَلۡفِهِۦ ﴾، ناهەقیـی ڕووی تێنـاکات نـە لە پێشـیەوە، نـە لـە دوایـەوە، یاخـود لـە هیـچ لایەکـەوە ناهەقیـی و، هەڵـەو پەڵـە ڕێـی تـێ نابـات و تێیـدا نیـە، ﴿ تَنزِيلٌ مِّنۡ حَكِيمٍ حَمِيدٍ ﴾، دابەزێـنراوە لەلایـەن خوایەکـی کارزانـی ستایشـکراوەوە.

ئنجـا دێتـە سـەر دڵدانـەوەی پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ، دەفەرمـوێ: ﴿ مَّا يُقَالُ لَكَ إِلَّا مَا قَدۡ قِيلَ لِلرُّسُلِ مِن قَبۡلِكَ ﴾، پێـت ناگوتـرێ جگـە لەوەی پێشـتر بـە پێغەمبەران گوتـراوە، کـە پێیـان گوتـوون: جادووگـەرن، شـێتن، بـۆ خۆیـان ئـەو ئیددیعایـە دەکـەن بەبـێ بەڵگـە، هەمـوو ئـەو شـتانەی بـەوان گوتـراون، هـەر ئـەوەش بـە تـۆ دەگوتـرێ، ﴿ إِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغۡفِرَةٍ ﴾، بێگومـان پـەروەردگارت خاوەنـی لێبوردنـە، لێبوردنێکـی

مەزن و تایبەت، بۆ کەسانێك کە شوێن پێغەمبەرانی دەکەون و، پەیامەکانی خوا قبووڵ دەکەن، ﴿ وَذُو عِقَابٍ أَلِيمٍ ﴾، هەروەها خاوەنی تۆڵەو سزایەکی بەئێشیشە، بۆ کەسانێك کە ناهەقیی دەکەن بەرانبەر بە پەیامەکانی خواو، ستەم دەکەن لە پێغەمبەرانی خواو، تۆمەتی خراپیان بۆ دەکەن و، درۆو دەلەسەیان بۆ دەکەن.

﴿ وَلَوْ جَعَلْنَٰهُ قُرْءَانًا أَعْجَمِيًّا لَّقَالُوا۟ لَوْلَا فُصِّلَتْ ءَايَٰتُهُۥٓ ﴾، یەکێك لەو ڕەخنانەی کە کافرەکان لە پێغەمبەریان دەگرت، لە قورئانیان دەگرت، دەیانگوت بۆچی قورئان بە زمانێکی جگە لە عەرەبیی دانەبەزێنراوە؟ یا بە فارسیی بووایە، یان بە ڕۆمیی بووایە، یان بە زمانێکی دیکە بووایە، بە حیساب ئەوانیان پێ خاوەن دەوڵەت و شارستانیەتی و پێشکەوتووتر بووە لە خۆیان، گوتیان: بۆ بە زمانی ئەو گەلە پێشکەوتووانە، یان ئەو کۆمەڵگا پێشکەوتووانە نەبوو؟

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ جَعَلْنَٰهُ قُرْءَانًا أَعْجَمِيًّا ﴾، ئەگەر قورئانمان گێرابایە بە قورئانێك بە زمانی ئەعجەمیی، جگە لە عەرەبیی، ئەعجەمیی یانی: عەجەمیی، ﴿ لَّقَالُوا۟ لَوْلَا فُصِّلَتْ ءَايَٰتُهُۥٓ ﴾، ئەو کاتەش دەیانگوت: بۆچی ئایەتەکانی ڕۆشن نەکراونەوە؟ واتە: بە زمانی خۆمان، ﴿ ءَا۬عْجَمِىٌّ وَعَرَبِىٌّ ﴾، چۆن دەبێ قورئان ئەعجەمیی بێ و، پێغەمبەرەکەش عەرەبیی بێ؟! واتە: چۆن دەبێ قورئانەکە بە زمانێکی جگە لەهی عەرەب بێ، لە حاڵێکدا کە پێغەمبەر عەرەبە؟! واتە: ئەو کاتە ئەو ڕەخنەیان دەگرت و، ڕەخنەی ئەو کاتیان بەجێ دەبوو، بەڵام ڕەخنەی ئێستایان بێ جێیە، کە پێغەمبەرێك لە نێو گەلێکی عەرەبیی زماندابێ، دەبێ هەر بە زمانی ئەو گەل و نەتەوەیەش ئەو فەرمایشت و کەلامەی بۆبێ، خوا ﷻ لە سوورەتی (**إبراهيم**) لە ئایەتی ژمارە: (٤)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوْمِهِۦ لِيُبَيِّنَ لَهُمْ ﴾، واتە: هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردوە مەگەر بە زمانی خەڵکەکەی، تاکو بۆیان ڕوون بکاتەوە، ئنجا ئەگەر وەك ئەوان گوتیان، وامانکردبایە، ئەو کاتە بەڵگەیەکیان بە دەستەوە دەبوو، بەڵام ئێستا

هیچ بەڵگەیەکیان بە دەستەوە نیە، جگە لە بیانووگرتن، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ قُلْ هُوَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ هُدًى وَشِفَآءٌ ﴾، بڵێ: ئەو قورئانە بۆ ئەوانەی بڕوایان هێناوە، ڕێنماییەو چارەسەرە، ﴿ وَٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ فِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرٌ وَهُوَ عَلَيْهِمْ عَمًى ﴾، بەڵام ئەوانەی بڕواناهێنن، قورسایی لە گوێیاندایە لە بەرانبەر قورئاندا، ئەو هەقەی کە لە قورئاندا هەیە نایبیستن، ﴿ عَلَيْهِمْ عَمًى ﴾، ئەو قورئانە بۆ ئەوان وەك کوێر بێ وایە، وەك ڕێیان تێنەبات، کەسێك کوێر بێ، نازانێ بەرەو ئامانج و مەبەستەکەی بڕوا، ئەو قورئانە وەك کوێر بێ بۆ ئەوان وایە، یاخود ئەوان لە بەرانبەر قورئاندا کوێرن، ئەم تەعبیرە لە مەسەلە گرنگەکاندا زیاتر شیی دەکەینەوە.

﴿ أُو۟لَـٰٓئِكَ يُنَادَوْنَ مِن مَّكَانٍۭ بَعِيدٍ ﴾، ئا ئەوانە لە شوێنێکی دوورەوە بانگ دەکرێن، واتە: حاڵیان وەك حاڵی کەسێکە لە شوێنێکی دوورەوە بانگ بکرێ و، تەنیا دەنگ ببیستێ و، لە دەنگەکە حاڵیی نەبێ، نێوەرۆکی ئەو دەنگ و بانگ و قسەکردنە چییە؟!

لە کۆتاییدا خوا ﷻ وەك نموونەیەکی زیندووی بەرجەستە لە مێژوودا، ئاماژە دەکات بە مووسا ﷺو، بە کتێبەکەی کە تەوراتە، دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَـٰبَ ﴾، بە دڵنیاییش کتێبەکەمان بە مووسادا، (أل)ی سەر ﴿ ٱلْكِتَـٰبَ ﴾ بۆ ناساندنە، بەڵام مەبەست پێی (عَهْد)ە، واتە: کتێبەکە، کتێبەکە کە بە مووسا ﷺ دراوەو تەوراتە، ﴿ فَٱخْتُلِفَ فِيهِ ﴾، کەچی ڕاجیایی تێدا کرا، ناکۆکیی تێدا کرا، هەندێکیان بڕوایان پێ هێناو، هەندێکیان بڕوایان پێ نەهێنا، بەنوو ئیسرائیل بڕوایان پێ هێنا، بەڵام قیبتییەکان بڕوایان پێ نەهێنا، یان گەلانی دیکە کە لەگەڵ بەنوو ئیسرائیل دا بوون، بڕوایان پێ نەهێنا، ﴿ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ ﴾، ئەگەر وشەیەك لە پەروەردگارتەوە تێنەپەڕیبایە، واتە: بڕیارێك لە لایەن پەروەردگارتەوە پێشتر نەدرابایە، بڕیارەکەش ئەوەیە کە دادوەریی کردن لە نێوان بەندەکانیدا هەڵدەگرێ بۆ ڕۆژی دوایی، ﴿ لَقُضِىَ

بَيْنَهُمْ ﴾، ئەو دادوەرییەیان لە نێواندا دەکرا، حیسابیان لە دنیادا لە نێواندا دەکرا، بەڵام خوا پێشتر بڕیاری داوەو بەپێی سیستمی خوا، دنیا جێی کردو کۆش و هەوڵدانەو، ڕۆژی دوایی شوێنی حاصەڵات هەڵگرتنەوەو خەرمان کۆ کردنەوەو پاداشت و سزایە، ﴿وَإِنَّهُمْ لَفِي شَكٍّ مِّنْهُ مُرِيبٍ﴾، بەدڵنیایی ئەوان، واتە: کافرەکانی ڕۆژگاری تۆ ئەی موحەممەد! لە بارەی قورئانەوە لە دوو دڵییەکی خەست و خۆڵدان، واتە: بێبڕوایەکانی ڕۆژگاری تۆش، وەك چۆن بێبڕوایەکانی ڕۆژگاری مووسا لە بارەی کتێبەکەی مووساوە کەوتنە ڕاجیایی و، مشتومڕو دووبەرەکیی، بێبڕواکانی ڕۆژگاری تۆش کەوتوونە گومانێکی خەست و خۆڵ، یانی: ئەوە شتێکی چاوەڕوان کراوەو، یاسای خوا لە گەلە پێشووەکاندا هەر وابووەو، گەلە پێشووەکان هەر وابوون لەگەڵ پێغەمبەرانی خوادا، کەواتە: با زۆر لەسەر دڵت قورس نەبێ، تەماشا بکە مووساش ﷺ چەند ئازاردراو، تەماشا بکە چ ڕاجیایی و ناکۆکییەکیان لە بارەی کتێبەکەی مووساوە، کە تەوراتە بەرپا کرد!!.

# مەسەلە گرنگەکان

## مەسەلەی یەکەم:

بەلاڕێدابەرانی ئایەتەکانی خوا، لە خوا پەنهان و شێردراوە نین، بێگومان ئەوانەی فڕێدەدرێنە ئاگرەوە، زۆر جیاوازن لەوانەی لەو ڕۆژەدا بەهۆی ئیمانەوە دڵنیاو بێترسن، بە دڵنیایی بێبڕوایان بە قورئانی بیرخەرەوە، سزابار دەبن، قورئانیش کتێبێکی باڵادەستەو، لە هیچ لایەکەوە هەڵەو پەڵە ڕووی تێ ناکات، چونکە دابەزێنراوی خوای کارزانی ستایشکراوە:

خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُلۡحِدُونَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا لَا يَخۡفَوۡنَ عَلَيۡنَآۗ أَفَمَن يُلۡقَىٰ فِي ٱلنَّارِ خَيۡرٌ أَم مَّن يَأۡتِيٓ ءَامِنٗا يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ ٱعۡمَلُواْ مَا شِئۡتُمۡ إِنَّهُۥ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٤٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِٱلذِّكۡرِ لَمَّا جَآءَهُمۡۖ وَإِنَّهُۥ لَكِتَٰبٌ عَزِيزٞ ﴿٤١﴾ لَّا يَأۡتِيهِ ٱلۡبَٰطِلُ مِنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَلَا مِنۡ خَلۡفِهِۦۖ تَنزِيلٞ مِّنۡ حَكِيمٍ حَمِيدٖ ﴿٤٢﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە یازدە بڕگەدا:

١)- ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُلۡحِدُونَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا لَا يَخۡفَوۡنَ عَلَيۡنَآ ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی لادان دەکەن لە نیشانەکانی ئێمەدا، لە ئێمە پەنهان نین، بە واتایەکی دیکە: ئەوانەی ئایەتەکانی ئێمە، نیشانەکانی ئێمە بە لاڕێدا دەبەن، ئەوانە لە ئێمە شێردراوە نین، وشەی: (يُلْحِدُونَ) لە (إِلْحاد)ەوە هاتوە، (أَلْحَدَ، يُلْحِدُ) (وَالإِلْحَادُ: المَيْلُ عَنِ الإِسْتِقَامَة)، (إِلْحاد): بریتیە لە لادان لە ڕاستیی، لە ڕێی ڕاست، یان لە ڕاست وەستاویی، پێشتر باسمان کرد: لە زمانی کوردییدا (لَحْد) یانی: لاگۆڕ، گۆڕ کە هەڵدەقەنرێ بە شێوەی (لَحْد)، لە تەنیشتی گۆڕەکەوە لایەکی دەدرێ و، جەنازەکەی تێ دەهاویشترێ، گۆڕ بە دوو جۆر هەڵدەقەنرێ:

أ- بە (لَحْدْ) و، ب- بە (شَقّ)، (لَحْد) واتە: لاگۆڕ، (شَقّ) واتە: لە نێوەڕاستی گۆڕەکەدا گۆڕیچەیەك دروست دەکرێ، واتە: گۆڕێکی گچکەترو، جەنازەکەی تێدەهاویشترێ بۆ ئەوەی بەردەکانی پێڕابهێڵدرێن، کەواتە: (يُلْحِدُونَ)، کە بە (يَلْحَدُونَ)ەش دەخوێنرێتەوە، (لَحَدَ، يَلْحَدُ)، (أَلْحَدَ، يُلْحِدُ)، هەردووکیان بە مانای: لایدا، لادەدات، (إلْحاد) لادان، مەبەست لە (آيَاتْ) کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُلۡحِدُونَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا ﴾، هەرچەندە (آيَاتْ) کە کۆی (آيَة)ە، بە مانای نیشانەکان دێ، بەڵام وشەی (آيَاتْ) هەم بەکاردەهێنرێ بۆ ڕستەکانی فەرمایشتی خوا، واتە: ئایەتە خوێنراوەکان (الآيات المقروءة)، هەم بۆ دروستکراوە بیندراوەکانی خوا (آيَاتُ اللهِ الْمَرْئِيَّة)، هەروەها بۆ موعجیزەی پێغەمبەرانیش بەکارهاتوە، بەڵکو هەندێکجار بۆ سزادانەکانی خوا بۆ خەڵکی یاخیی و سەرکەشیش بەکارهاتوە، (آيات) بە هەر کام لەو چوار مانایانە بەکار دێ، بەڵام بەپێی سیاقەکە دەزانین کە مەبەست لە (آيَة) یان (آيَاتْ) لەو سیاقەدا چییە، لێرەدا لەبەر ئەوەی ڕەوتەکە هەمووی باسی قوڕئانە، کەواتە: مەبەست لە (آيَاتْ) فەرمایشتی خوای پەروەردگارو بڕگەکانی فەرمایشتی خوایە.

خوا دەفەرموێ: ئەوانەی لە ئایەتەکانی ئێمەدا لادەدەن، یان لە ئایەتەکانی ئێمەدا لادان دەکەن، یاخود بە لاڕێیاندا دەبەن، ﴿ لَا يَخۡفَوۡنَ عَلَيۡنَآ ﴾، لێمان پەنهان نین، واتە: ئیلحادو لادانەکەیان، یان بە لاڕێدا بردنەکەیان لە ئێمە پەنهان نیە، ئەمە بە دڵنیایی هەڕەشەی لە نێوخۆی وەرگرتوە، واتە: سزایان دەدەین.

٢)- ﴿ أَفَمَن يُلۡقَىٰ فِي ٱلنَّارِ خَيۡرٌ ﴾، ئایا کەسێك کە فڕێ دەدرێتە نێو ئاگرەوە، حاڵی باشترە؟! یانی: (أَفَمَنْ يُلْقى فِي النَّارِ فَهُوَ خَائِفَ أَفْضَل حَالاً).

٣)- ﴿ أَم مَّن يَأۡتِيٓ ءَامِنٗا يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ ﴾، یان کەسێك کە لە ڕۆژی دوایی دا بە دڵنیایی دێ؟ (أَمْ مَنْ يَأْتِي آمِنَاً يَوْمَ القِيَامَة فَيَدْخُلُ الجَنَّة)، ئایا ئەو کەسەی فڕێ دەدرێتە نێو ئاگرەوە حاڵی باشترە، یاخود ئەو کەسەی کە بەبێ ترسی لە ڕۆژی هەڵسانەوەدا دێ و دەچێتە بەهەشتەوە؟ لە هەر کام لەو دوو ڕستەدا، ئەوە باسکراوە، کە لەوی بەرانبەریدا باس نەکراوە، ﴿ أَفَمَن يُلۡقَىٰ فِي ٱلنَّارِ خَيۡرٌ ﴾، لێرەدا باسی ترس نەکراوە، ئایا ئەوەی فڕێ

دەدرێتە ئاگرەوە حاڵی باشترە؟! یان ئەو کەسەی کە بەبێ ترسی دێ، لە ڕۆژی قیامەتدا، لێرەشدا چوونە بەهەشت باس نەکراوە، لەبەر ئەوەی ئەوپەڕی کورتیی و پوختیی لە فەرمایشتی خوادا هەیە، ﴿ أَفَمَن يُلْقَىٰ فِي ٱلنَّارِ خَيْرٌ أَم مَّن يَأْتِيٓ ءَامِنًا يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴾ بە دڵنیایی ئەم پرسیار لێکردنە، پرسیارلێکردنی نکووڵییلێکەرانەیە، واتە: (**مَن يُلْقى فِي النَّارِ لَيْسَ أَفْضَلُ حَالاً مِنَ الَّذِي يكون آمِناً يَوْمَ القِيَامَة**)، گومانی تێدا نیە ئەو کەسەی کە فڕێ دەدرێتە نێو ئاگری دۆزەخەوەو، بە ترس و بیمەوە دێ، وەك ئەو کەسە نیە کە بە دڵنیایی و بە بێ ترسی دێ و، دەخرێتە نێو بەهەشتەوە، بێگومان لێرەدا خوا ﷻ لە کاتێکدا کە باسی لادان لە ئایەتەکانیدا دەکات و، دەشفەرموێ: لە ئێمە شێردراوە نین، دوایی باسی فڕێدرانە نێو ئاگر دەکات، کەواتە: ئەوانەی لادان دەکەن لە ئایەتەکانی خوداو، ئایەتەکانی خوا بەلاڕێدا دەبەن، ئەو سزایە چاوەڕێیانە، هەروەك ئەوانەی لادان لە ئایەتەکانی خوادا ناکەن و، بە ڕێك و ڕاستیی مەمەڵە لەگەڵ ئایەتەکانی خوادا دەکەن، بە هەشت و بێ ترسیی و دڵنیایی چاوەڕێیانە.

٤)- ﴿ ٱعْمَلُوا۟ مَا شِئْتُمْ ﴾، هەرچی دەتانەوێ بیکەن، ئەمە بێگومان هەڕەشە کردنەو، بێ منەتکردنە، واتە: چییتان لە دەست دێ، بیکەن.

٥)- ﴿ إِنَّهُۥ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴾، بە دڵنیایی ئەو بینەری ئەوەیە کە دەیکەن، بینەری کردەوەکانتانە، (**الطبري**) دەڵێ: (**إِنَّ اللَّه أَيُّهَا النَّاس! بِأَعْمَالِكُمْ الَّتِي تَعْمَلُونَهَا ذُو خبْرَةٍ وَعِلْمٍ، لاَ يَخْفَى عَلَيْهِ مِنْهَا، وَلاَ مِنْ غَيْرِهَا شَيءٌ**)، واتە: ئەی خەڵکینە! بە دڵنیایی خوا بە کردەوەکانتان کە ئەنجامیان دەدەن، هەروەها بە جگە لەو کردەوانەش و هەر شتێکی دیکە خاوەنی شارەزاییەو، خاوەنی زانستەو، هیچ شتێکی لێ شێردراوەو پەنهان نیە.

ئنجا لێرەدا خوا ﷻ پێناسەی قورئان دەکات بە پێنج سیفەت، پێشێ دەفەرموێ:

٦)- ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِٱلذِّكْرِ لَمَّا جَآءَهُمْ ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی بێبڕوابوون بە (**ذِكْر**) دوای ئەوەی بۆیان هات، یەکێك لە ناوەکانی قورئان وەك لە کتێبی پێنجەمی

مەوسووعەی: (الإسلامُ كَمَا يَتَجَلَّى فـي كِتَابِ الله)، (الإيمَانُ بِكُتُبِ الله)دا باسم کردوە، کە قورئان چوار ناوی سەرەکیی هەن: (الكِتَب، القُرْآن، الذِّكْر، الفُرْقَان)[1]، بەڵام کۆمەڵێکی زۆر سیفەتی هەن، ئنجا یەکێك لە ناوەکانی قورئان بریتیە لە (ذِكْرْ). ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِٱلذِّكْرِ لَمَّا جَآءَهُمْ ﴾، ئەوانەی بێبڕوابوون بە (ذِكر) دوای ئەوەی بۆیان هات.

وشـەی (ذِکـر): أ- دەگونجـێ بـە مانـای بیرخـەرەوە بـێ، قورئـان بیرخـەرەوەی ڕاسـتییەکانە، کـە خـوا لـە زگـماك و ناخـی مرۆڤـدا دانـاون.

ب- دەگونجێ بە مانای شەڕەف و پایە بەرزیی بێ، قورئان مایەی شەڕەف و پایە بەرزییە.

ج- دەشگونجێ بە مانای پەندو ئامۆژگاریی بێ، قورئان پەندو ئامۆژگارییشە، ئەوە یەکەمین وەسفی قورئان کە بریتیە لە (ذِكْرْ) بیرخەرەوەی ڕاستییەکان، یاخود شەڕەف و ناوبانگ و پایەی بەرز.

٧)- ﴿ وَإِنَّهُۥ لَكِتَٰبٌ عَزِيزٌ ﴾، بە دڵنیایی ئەو (ذِكْر)ە، ئەو قورئانە کە بیرخەرەوەیەو، شەڕەف و ناوبانگە، کتێبێکە، زاڵ و باڵا دەست (عزیز)ە.

ئەمانـەش سـیفەتی دووەم و سـێیەمنی: نـووسراوە، ئـەوە نیـە هـەر گوتـراو یـان خوێـنراو (مَقْـروء) بـێ، بەڵکـو نووسراویشــە.

هەروەهـا قورئـان (عَزِيْـز)ە، کتێبێکـی زاڵـە، (عَزِيْـز) بـە مانـای (غَالِـب) دێ، واتـە: بـاڵا دەسـت و بـە مانـای (عْدِيـمُ النَّظير)یـش دێ، واتـە: بـێ وێنـە، واتـە: شـتێك کـە وێنـەی نەبـێ و، دەگمـەن بـێ، بـە دڵنیایـی قورئـان بـێ وێنەیـە.

سیفەتی چوارەم بریتیە لە:

٨)- ﴿ لَّا يَأْتِيهِ ٱلْبَٰطِلُ ﴾، ناهەقیی ڕووی تێ ناکات، ناهەقیی و پووچیی و هەڵەو پەڵە ڕووی تێناکات.

---

(١) هەروەها (کلام الله)شی بۆ بەکارهێنراوەو، ئەمیش ناوی پێنجەمە.

٩)- ﴿ مِنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَلَا مِنۡ خَلۡفِهِۦ ﴾، نە لە پێش دوو دەستەکانیەوەو، نە لە دواشیەوە، واتە: لە هیچ لایەکەوەو بە هیچ جۆرێك هەڵەو کەم و کوڕیی ڕێی نیە، بێتە نێو قورئانەوەو ڕوو لە قورئان ناکات.

سیفەتی پێنجەمی بریتیە لە:

١٠)- ﴿ تَنزِيلٌ مِّنۡ حَكِيمٍ حَمِيدٍ ﴾، دابەزێنراوە لەلایەن (خوایەکی) کارزان و کاربەجێ و ستایشکراوەوە.

ئنجا قورئان مادام لە زاتێکی (حَكِيم)و، (حَمِيد)ەوە هاتبێ، ئەو سیفەتی (حَكِيم)و، (حَمِيد)یەی خوای موتەعال لە قورئاندا بەرجەستە بووە، مرۆڤیش بە ئەندازەی ئەوە کە لەگەڵ قورئاندا کار لێك دەکات، سیفەتی حیکمەت پەیدا دەکات، هەروەها سیفەتی (حَمِيد)یش پەیدا دەکات و ستایشکراو دەبێ.

کە دەفەرموێ: ﴿ لَّا يَأۡتِيهِ ٱلۡبَٰطِلُ مِنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَلَا مِنۡ خَلۡفِهِۦ ﴾، (**الطبري**) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1] ئاوای پێناسە دەکات: (**لَا يَسْتَطِيعُ ذُو بَاطِلٍ بِكَيْدِهِ تَغْيِيرَهُ بِكَيْدِهِ، وَتَبْدِيلَ شَيْءٍ مِنْ مَعَانِيهِ عَمَّا هُوَ بِهِ، وَذَلِكَ هُوَ الْإِتْيَانُ مِنْ بَيْنِ يَدَيْهِ، وَلَا إِلْحَاقَ مَا لَيْسَ مِنْهُ فِيهِ، وَذَلِكَ إِتْيَانُهُ مِنْ خَلْفِهِ**)، واتە: هیچ خاوەن ئامانجێکی پووچ، خاوەن ناهەقیێك بە پیلانی خۆی ناتوانێ هیچ کام لە واتاکانی قورئان وەك خۆی هەیە، بیگۆڕێ، کە ئەوە بریتیە لە ڕۆیشتن بەرەو قورئان لە پێش دوو دەستەکانیەوە، هەروەها هیچ خاوەن فێڵ و پیلانێکیش ناتوانێ شتێکی بخاتە نێو کە جیابێ لە قورئان، ئەوەش ناهەقیی ڕۆیشتنە بەرەو قورئان لە پشتیەوە، (**الطبري**) ئاوای پێناسە کردووەو ئەو واتایەش هەڵدەگرێ.

بەڵام ئەو مانایە بەهێزترە کە بگوترێ: ﴿ لَّا يَأۡتِيهِ ٱلۡبَٰطِلُ مِنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَلَا مِنۡ خَلۡفِهِۦ ﴾، واتە: بە هیچ جۆرێك و لە هیچ لایەکەوە ناهەقیی و، هەڵەو پەڵە

---

(١) جَامِعُ البَيَان: ج٢٤، ص١٢٤.

ڕوو لە قورئان ناکات و، ڕووی تێ نەکردووە، هیچ جۆرە هەڵەو کەم و کوڕییەکی تێدا نیە، چونکە بە زۆریی وایە ئەگەر شتێك بەرەو کەسێك یان بەرەو شتێك بچێ، یان لەپێشەوە بۆی دێ، یان لە دواوە بۆی دێ، هەڵبەتە دەگونجێ لە لای ڕاست و چەپشیەوە، یان لە سەرو خواریشیەوە بۆی بێ، بەڵام بە زۆریی لە پێشەوەو لە دواوەیە، بۆیە ئەو دوو لایەنە باسکراون، بەڵام مەبەست پێی ئەوەیە کە لە هیچ لایەکەوە ناهەقیی ڕوو لە قورئان ناکات.

کە دەفەرموێ: ﴿تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ﴾، یانی: قورئان دابەزێنراوە لە لایەن خوایەکی خاوەن حیکمەتەوە، کە نەخشەو بەرنامە بۆ بەندەکانی دادەنێ، ئەم قورئانە چی بەرژەوەندیی بەندەکانی تێدا هەیە، لەلایەن خوای خاوەن حیکمەت و کاربەجێ وە، گرتوویەتە خۆی، هەروەها خوا کە قورئانی دابەزاندوە (حَمید) ە، ستایشکراوە لەسەر چاکەکانی، کەواتە: ئەو کارزانیی و ستاییشکراوییەی خوای پەروەردگار لە کتێبەکەشیدا ڕەنگ دەداتەوە، بێگومان هەر بێژەرێك سیفەتەکانی لە بێژراوەکەیدا ڕەنگ دەدەنەوە.

**(فخرالدین الرازي)** لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1]، دەڵێ: **(وَاعلَم أنَّ لِأبِي مُسْلِم الأَصْفَهانِيّ أنْ يَحْتَجَّ بِهَذِهِ الآيَةِ عَلى أنَّهُ لَمْ يُوجَدِ النَّسْخُ فِيهِ، لِأنَّ النَّسْخَ إبْطالٌ، فَلَوْ دَخَلَ النَّسْخُ فِيهِ لَكانَ قَدْ أتاهُ الباطِلُ مِن خَلْفِهِ، وإنَّهُ عَلى خِلافِ هَذِهِ الآيَة)**.

شایانی باسە: ئەبوو موسلیمی ئەصفەهانیی یەکێك بووە لەو زانایانەی گوتوویەتی: (نَسخ) لە قورئاندا نیە، هەڵبەتە زانایانی خەواریجیش هەر وایان گوتوە، زانایانی دیکەش هەبوون و هی هاوچەرخیش ئێستا زۆر هەن وادەڵێن، من بۆ خۆشم هەر ڕام وایە کە بەهیچ جۆرێك ئەوە کە ئایەتێك لە قورئاندا هەبێ بخوێنرێتەوە، بەڵام کاری پێ نەکرێ، لە قورئاندا شتی وا نیە، کە ئێمە ئێستا لە تەفسیر کردنی کۆتایی جوزئی: (٢٤)ی قورئان داین، تاکو ئێستا

---

(١) التَّفْسير الكَبير: ج١٤، ص٢٧.

ئایەتێکمان نەهاتۆتە پێش ناچار بین بڵێین: ئەو ئایەتە نەسخ کراوەتەوە، واتە: دەخوێنرێتەوە، بەڵام کاری پێ ناکرێ! هەڵبەتە بە واتای ڕاستەقینەی (**نَسخ**)، کە بریتیە لە: (**إزالَةُ حُكْمٍ سابِقٍ بِحُكْمٍ لاحِق**)، واتە: حوکمێکی پێشتر بە حوکمێکی دواتر لابچێ، بەڵام ئەوە کە هەندێك لە زانایانی پێشین گوتوویانە، وەك لەو باسەدا کە لە تەفسیری سوورەتی (**البقرة**)دا، گوتوومە[1]، کە هەندێك لە زانایان وشەی (**نَسخ**)یان بەکارهێناوە بۆ تایبەت کردنی واتایەکی گشتیی (**تَخْصيصُ عام**)، یاخود بەندداركردنی حوکمێکی ڕەها (**تَقييدُ مُطْلَق**)، یان ڕوونکردنەوەی حوکمێك کە بە کورتیی باسکراوە (**تَبيينُ مُجْمَل**)، یان بۆ پلە پلەیی (**تَدَرُّج**)، هەندێك لە زانایان بەڵێ وشەی (**نَسخ**)یان بۆ ئەو حاڵەتانە بەکارهێناوە، بەڵام پێناسەی زاراوەی (**نَسخ**) جیایە لەو حاڵەتانە، کە ئەو حاڵەتانە بێگومان لە قورئاندا هەن، خوا ﷻ شتێك لە شوێنێك بە گشتیی دەفەرموێ، دوایی تایبەتی دەکات، یان فەرمایشتێك لە شوێنێك بە ڕەهایی دەفەرموێ، دوایی بەندار (**تَقيد**)ی دەکات، یان شتێکی لە شوێنێك بە کورتیی (**إجمَال**) فەرمووە، دوایی درێژە (**تَفْصيل**) ی دەداتێ، هەروەها هەندێك لە حوکمەکان بە پلە پلە دابەزیون، بۆ وێنە: قەدەغەکردنی مەی (**خَمر**) بە چوار قۆناغدا تێپەڕیوە، هەروەها سوودخۆریی بە چەند قۆناغێکدا تێپەڕیوە، بەڵام ئەوانە جیان لە نەسخ، ئەگەرنا ئەو حاڵەتانە لە قورئاندا هەن.

واتە: ئەبوو موسلیمی ئەصفەهانیی بۆی هەیە بەڵگە بەم ئایەتە بێنێتەوە کە نەسخ (واتە: لابرانی حوکمێك) لە قورئاندا نیە، چونکە نەسخ بریتیە لە لابردن و پووچەڵکردنەوە، ئنجا ئەگەر نەسخ هاتبایە نێو قورئان، مانای وایە پووچەڵکردنەوە لە پشتەوە بۆ قورئان دەهات و، ئەوەش پێچەوانەی ئەو ئایەتە موبارەکەیە.

---

(١) هەروەها لە بابەتی (قورئانی مەزن لە نۆزدە تەوەردا).

## مەسەلەی دووەم:

**دڵدانەوەی خوا ﷻ بۆ پێغەمبەر ﷺ، کە هەرچی پێی دەگوترێ لەلایەن ناحەزانیەوە، بە پێغەمبەرانی پێشتریش گوتراوە، هەروەها بیانوو گرتنیشیان کە بۆچی قورئان بە ئەعجەمیی نیە، قسەیەکی بێ جێیە، چونکە ناگونجێ پێغەمبەر ﷺ عەرەبیی زمان بێ و، قورئانیش عەجەمیی بێ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ مَّا يُقَالُ لَكَ إِلَّا مَا قَدْ قِيلَ لِلرُّسُلِ مِن قَبْلِكَ ۚ إِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغْفِرَةٍ وَذُو عِقَابٍ أَلِيمٍ ﴿٤٣﴾ وَلَوْ جَعَلْنَاهُ قُرْآنًا أَعْجَمِيًّا لَّقَالُوا لَوْلَا فُصِّلَتْ آيَاتُهُ ۖ أَأَعْجَمِيٌّ وَعَرَبِيٌّ ۗ قُلْ هُوَ لِلَّذِينَ آمَنُوا هُدًى وَشِفَاءٌ ۖ وَالَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ فِي آذَانِهِمْ وَقْرٌ وَهُوَ عَلَيْهِمْ عَمًى ۚ أُولَٰئِكَ يُنَادَوْنَ مِن مَّكَانٍ بَعِيدٍ ﴿٤٤﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە لە نۆ بڕگەدا:

١)- ﴿ مَّا يُقَالُ لَكَ إِلَّا مَا قَدْ قِيلَ لِلرُّسُلِ مِن قَبْلِكَ ﴾، هیچت پێ ناگوترێ، مەگەر بە پێغەمبەرانی پێش تۆش گوتراوە، وشەی (ما) لێرەدا دوو حاڵەتی هەن و دەگونجێ بۆ دوو واتایان بەکاربێ:

أ- یان بۆ لابردن (نَفي)یە، ﴿ مَّا يُقَالُ لَكَ ﴾، پێت ناگوترێ، ﴿ إِلَّا مَا قَدْ قِيلَ لِلرُّسُلِ مِن قَبْلِكَ ﴾، مەگەر ئەوەی لە پێش تۆدا بە پێغەمبەران گوتراوە.

ب- دەشگونجی (ما) لێرەدا (إستِفْهَامِيّة) بێ، بۆ پرسیار بێ، ﴿ مَّا يُقَالُ لَكَ إِلَّا مَا قَدْ قِيلَ لِلرُّسُلِ مِن قَبْلِكَ ﴾، یانی: چیت پێ دەگوترێ، جگە لەوەی کە بە پێغەمبەرانی پێش تۆش گوتراوە؟! هەڵبەتە (ما)ی (نافِية)و، (ما)ی (إستِفْهَامِيّة) لە ئاوازی دەنگەکەدا فەرقیان پێدەکرێ، ئەگەر بگوترێ: ﴿ مَّا يُقَالُ لَكَ إِلَّا مَا قَدْ قِيلَ لِلرُّسُلِ مِن قَبْلِكَ ﴾، هیچت پێناگوترێ، مەگەر ئەوەی بە پێغەمبەرانی پێش تۆ گوتراوە، ئەوە (ما)یەکە بۆ لابردنە، بەڵام ئەگەر بگوترێ: ﴿ مَّا يُقَالُ لَكَ ﴾، چیت پێ دەگوترێ، ﴿ إِلَّا مَا قَدْ قِيلَ

لِلرُّسُلِ مِن قَبۡلِكَ ﴾، مەگەر ئەوەی کە بە پێغەمبەرانی پێش تۆ گوتراوە؟ بێگومان لە لایەن بێبڕوایانەوە، بێبڕوایان پێغەمبەرانی پێش موحەممەدیشیان تۆمەتبار کردوە بە شێتیی و، بە جادووگەریی و، بە کەهانەو، ئەو ناوو ناتۆرانەیان لێ هەڵداون.

هەندێکیش وایان لێکداوەتەوە: ﴿ مَّا يُقَالُ لَكَ إِلَّا مَا قَدۡ قِيلَ لِلرُّسُلِ مِن قَبۡلِكَ ﴾، پێت ناگوترێ، مەگەر ئەوەی بە پێغەمبەرانی پێش تۆ گوتراوە، لەلایەن خواوە، واتە: ئەو پەیامەی بۆ تۆ دەنێردرێ، هەر هەمان پەیامە کە بۆ پێغەمبەرانی پێش تۆش نێردراوە، ئنجا بەڵێ لەڕووی ڕێزمانی عەرەبییەوە ئەم واتایەش هەڵدەگرێ، بەڵام بەپێی سیاق هەر مانای یەکەمیان مەبەستە، ئەگەرنا لە ڕووی ڕێزمانی عەرەبییەوە ئەو واتایەش هەڵدەگرێ، ئنجا هەندێ لە توێژەرەوانی قورئان، وەك جاری دیکەش باسم کردوە، هەر مانایەک لە ڕووی ڕێزمانی عەرەبییەوە ڕێی تێچووبێ، هەڵساون قورئانیان پێ تەفسیر کردوە، بەڵام بێگومان جاری وا هەیە ڕستەیەك لە ڕووی ڕێزمانییەوە، واتایەك بەدەستەوە دەدات، بەڵام ئەگەر تەماشای ڕەوتی ئایەتەکان بکەی و، تەماشای نێوەڕۆك و مەبەستیان بکەی، ئەو واتایەی بەدەستییەو دەدات، مەبەست نیە لەوێدا، لێرەدا باس باسی قورئانەو، باسی ناوو ناتۆرەیەکە، دوژمنان و ناحەزانی قورئان و ئیسلام لە قورئانیان هەڵداوە، یان لە پێغەمبەری خوایان ﷺ هەڵداوە.

٢)- ﴿ إِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغۡفِرَةٖ ﴾، بە دڵنیایی پەروەردگاری تۆ خاوەنی لێبوردنە.

٣)- ﴿ وَذُو عِقَابٍ أَلِيمٖ ﴾، هەروەها خاوەنی سزادانێکی بە ئێشیشە.

خاوەنی لێبوردنە بۆ کەسانێك کە شوێنت بکەون و، پەیامی خوا لە تۆ وەربگرن و، تەبەنیی بکەن لە ژیانیاندا، بە پێچەوانەشەوە: خاوەنی سزای بە ئێشە بۆ کەسانێك شوێن تۆ ناکەون و، پەیامی خوا بەسەر تۆدا ڕەت دەکەنەوە.

شارەزایانی زمانی عەرەبیی دەڵێن: بۆچی خوا ﷻ لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ لَذُو مَغۡفِرَةٖ ﴾، هەروەها دەفەرموێ: ﴿ وَذُو عِقَابٍ ﴾؟

ئەمە مانایەکەی بەهێزترە لە وەی بفەرمویٚ: (إِنَّ رَبَّكَ لَغَفُورٌ)، یاخود (يُعَاقِبُهُمْ)، یان (مُعَاقِبٌ)، چونکە کە دەفەرمویٚ: ﴿إِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغْفِرَةٍ﴾، بە دڵنیایی پەروەردگاری تۆ خاوەنی لێبوردنە، واتە: هەرچی لێبوردنە لە لای ویە، هەروەها ﴿وَذُو عِقَابٍ أَلِيمٍ﴾، هەرچی سزای بە ئێشە لە لای ئەوە، ئەمە مانایەکەی بەهێزترە لەوەی بفەرمویٚ: لێبوردەیەو، سزادەرە.

٤)- ﴿وَلَوْ جَعَلْنَٰهُ قُرْءَانًا أَعْجَمِيًّا لَّقَالُوا۟ لَوْلَا فُصِّلَتْ ءَايَٰتُهُۥٓ﴾، ئەگەر گێڕاباشمان بە قورئانێکی ئەعجەمیی، دەیانگوت: دەبووایە ئایەتەکانی ڕۆشن کرابانەوە! (الأَعْجَمُ: هُوَ الَّذِي لَايُفْهَمُ فِي كَلَامِهِ، وَاليَاءُ فِي الأَعْجَمِي للمبالغة، وَالعَجَمُ غَيْرُ العَرَب)، وشەی (أَعْجَمْ) هەر کەسێکە قسەکەی فام نەکریٚ، (ياء)ی ﴿أَعْجَمِيًّا﴾ش بۆ زێدەڕۆیی کردنە لە واتاکەیدا، (عَجَمْ)یش واتە: جگە لە نەتەوەی عەرەب، عەرەب بە جگە لە خۆیانیان گوتوە: (عَجَمْ)، چونکە لە زمانەکەیان حاڵیی نەبوون، هەڵبەتە عەرەبیش وەك گوتم بۆ هەر کام لە نەتەوەکانی دیکە، زمانەکەیان بە (عَجَمِيّ) لە قەڵەم دەدریٚ، بەو واتایەی زمانی ئەوانیش بۆ نەتەوەکانی دیکە فامکراو نیە، بەڵام لەبەر ئەوەی قورئان بە زمانی عەرەبیی هاتوە، لێرەدا عەرەب واتە: ئەو نەتەوە دیارییکراوەی کە قورئان بە زمانیان هاتوەو، (عَجَمْ) واتە: هەموو نەتەوەکانی دیکە، ئنجا عەرەب زمانی نەتەوەکانی دیکەیان ناوناوە: (عَجَمِيّ)، یان (أَعَجَمِيّ)، لەبەر ئەوەی لێیان حاڵیی نەبوون.

خوا دەفەرمویٚ: ئەگەر قورئانمان کردبایە بە زمانی جگە لە عەرەبیی، واتە: بە زمانی (عَجَمِـي)، یان (أَعَجَمِـي)، ﴿لَّقَالُوا۟ لَوْلَا فُصِّلَتْ ءَايَٰتُهُۥٓ﴾، ئەو کاتە دەیانگوت: دەبووایە ئایەتەکانی ڕۆشن بکرێنەوە.

٥)- ﴿ءَا۬عْجَمِىٌّ وَعَرَبِىٌّ﴾، ئایا دەگونجیٚ قورئان (أَعَجَمِي) بێت و، پێغەمبەرەکەش عەرەبیی بیٚ؟! ئەمە بە دوو شێوە دەخوێندرێتەوە: أ- أأعجميٌّ وعربي، ب- آعجمي، یانی: (أَقُرآنٌ أَعَجَمِيٌّ، وَ مُنْزَلٌ عَلَيْهِ عَرَبِيٌ)، ئایا دەگونجیٚ قورئان (أَعَجَمِيّ) بیٚ و، بۆ سەر دابەزێنراوەکەش عەرەب بیٚ؟! یانی: شتێکی سەیرە، ئنجا ئەو کاتە قسەکەیان مەنتیقیی

دەبوو و، ڕەخنەکەیان لەجێی خۆیدا دەبوو، بەڵام ئێستا کە داوا دەکەن دەبووایە قورئان بە(**عَجَمِي**) بێ بۆ پێغەمبەرێکی عەرەبیی، ئێستا ڕەخنەکەیان بێ جێیە، بەڵام ئەگەر گریمان وابووایە کە قورئان بەزمانێکی دیکەی جگە لە عەرەبیی بۆ پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ هاتبایە، کە بە عەرەبیی دەدوێ، ئەو کاتە ڕەخنەکەیان بەجێ دەبوو.

هەڵبەتە کە دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ جَعَلْنَٰهُ قُرْءَانًا أَعْجَمِيًّا﴾، واپێدەچێ ئەوان ڕەخنەیان گرتبێ کە بۆچی قورئان بە زمانێکی دیکەی جگە لە عەرەبیی بۆ پێغەمبەر نەهاتوە؟ یان بۆچی قورئان دانەبەزێنراوەتە سەر کەسێکی دیکە جگە لە موحەممەد ﷺ؟ خواش ﷻ وەڵامی ئەوە دەداتەوە کە دەبووایە پێغەمبەری کۆتایی هەر موحەممەد ﷺ بێ، وەك خوا ﷻ لە سوورەتی (**الأنعام**) لە ئایەتی ژمارە (١٢٤)دا، دەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُۥ﴾، کەواتە: ئەو کەسەی شایستەی ئەوە بووە، خوا ﷻ دوا پەیامی خۆی پێدا بنێرێ، تەنیا موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەبدولموتتەلیب بووە (صەڵات و سەلامی خوای لێ بێ)، دەبووایە قورئان تەنیا بۆ ئەو دابەزیبایە، زمانی ئەویش عەرەبیی بووە، ئنجا ئایا شتێکی زۆر نالۆژیکیی و، پێچەوانەی عەقڵ و حیکمەت نەدەبوو کە بە زمانێکی دیکە قورئانی بۆ بێ و، لە نێو گەلێکیش دا کە عەرەبە، کە ئەگەر خوای پەروەردگار وەك موعجیزەش شارەزای کردبایە لەو زمانەی قورئانی پێ دێ، واتە: جگە لە زمانی عەرەبیی، ئایا ئەو خەڵکە چۆن تێی دەگەیشتن؟! شتێکی نامەنتیقیی دەبوو، ئەو کاتەش ڕەخنەکەیان بەجێ دەبوو، دەیانگوت: بۆچی ئایەتەکانی ڕۆشن نەکراونەوە؟ بۆچی وانین لێیان تێبگەین؟ چۆن دەبێ قورئان ئەعجەمیی بێت و، قورئان بۆ سەر دابەزێنراوەکەش عەرەبیی بێ؟!!.

٦)- ﴿قُلْ هُوَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ هُدًى وَشِفَآءٌ﴾، بڵێ ئەو، (ئەم قورئانە) بۆ کەسانێك کە بڕوایان هێناوە ڕێنمایی و، چارەسەرە، یانی: ڕێنماییە بۆ ڕواڵەتیان و، چارەسەرە بۆ پەنهانیان، یاخود هەم ڕێیان پێشان دەدات و، هەم چارەسەری نەخۆشیی

و گرفت و کێشەکانیان دەکات، هەم نەخۆشییە دەروونییەکانیان، هەم گرفت و کێشە کۆمەڵایەتیی و، ئابووریی و، سیاسییەکانیان چارەسەر دەکات.

٧)- ﴿وَٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ فِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرٌ﴾، بەڵام ئەوانەی بڕوا ناهێنن، قورسایی لە گوێیاندا هەیە، ﴿وَقْرٌ﴾، بە مانای (ثِقَل) دێ، واتە: قورسیی، هەروەها بە مانای (صَمَم)یش دێ، واتە: کەڕیی، کەسێك قورساییەك لە گوێی دابێ، بە دڵنیایی هەرچەندە قسە بۆ بکرێ، نایبیستێ، ئەوانەش وەك کەسێك وان قورساییەك لە گوێیان کرابێ.

٨)- ﴿وَهُوَ عَلَيْهِمْ عَمًى﴾، ئەو (قورئان)یش لەسەر ئەوان کوێرە، ﴿عَمًى﴾، خوێنراویشەتەوە: (عَمٍ)، هەروەها خوێنراویشەتەوە: (عَمِيَ)، بە سێ جۆر خوێنراوەتەوە:

أ- ﴿وَهُوَ عَلَيْهِمْ عَمًى﴾،

ب- (**وَهُوَ عَلَيْهِمْ عَمٍ**)،

ج- (**وَهُوَ عَلَيْهِمْ عَمِيَ**)، بە کرداری ڕابردوو، ئنجا ئەمە چەند واتایەکی هەن:

أ- بە واتای ئەوە دێ کە قورئان ڕێیان تێنابات، (**أَي: لايَهْتَدِي إِلَيْهِمْ**)، وەك چۆن بابایەکی کوێر ناتوانێ بچێ بۆ شوێنێك، قورئانیش ناتوانێ بچێ بۆ لایان.

ب- واتایەکی دیکەی: ﴿وَهُوَ عَلَيْهِمْ عَمًى﴾، یان (**وَهُوَ عَلَيْهِمْ عَمٍ**)، یان (**وَهُوَ عَلَيْهِمْ عَمِيَ**)، یانی: قورئان هۆکاری کوێریی ئەوانە، چۆن؟ یانی: لە ئەنجامی ئەوەدا کە پێی بێبڕوا بوون، حاڵەتی کوێرییان بەسەردا هاتوە، واتە: کوێریی مەعنەویی، بۆیە لێی تێناگەن، وەك لە سوورەتی (**القصص**)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿فَعَمِيَتْ عَلَيْهِمُ ٱلْأَنۢبَآءُ يَوْمَئِذٍ فَهُمْ لَا يَتَسَآءَلُونَ ﴿٦٦﴾﴾، واتە: لەو ڕۆژەدا هەواڵەکان کوێرن، بەنسبەت ئەوانەوە، بۆیە لە یەکدیی ناپرسن، واتە: هەواڵەکان وەك کوێربن ناگەنە ئەوان و، ڕێیان تێ نابەن.

ج- مانایەکی دیکەی: ﴿وَهُوَ عَلَيْهِمْ عَمًى﴾، (**هُوَ ضَمِيرِ الشَّأْنِ أي: لَيْسَ فِي أذَانِهِم وَقْر فَحَسْبُ، بَل الشَّأْنُ أنَّ عَلَيْهِم عَمَىً كَذَلِك**)، واتە: تەنیا حاڵیان وانیە کە گوێیان قورسایی تێدابێ، بەڵکو حاڵیان وایە کە کوێرییشیان لەسەرە، نەك هەر تووشی کەڕیی بوون،

بەڵکو تووشی کوێرییش بوون، بۆیە قورئان نابینن، واتە: لێرەدا (**هُوَ**) ناگەڕێتەوە بۆ قورئان و دەگەڕێتەوە بۆ ڕاناوی حاڵ (**شَأن**)، واتە: نەك هەر گوێیان کەڕیی تێدایە، بەڵکو کوێرییشیان لەسەرەو چاویشیان نابینێ.

٩)- ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ يُنَادَوْنَ مِن مَّكَانِۭ بَعِيدٖ ﴾، ئەوانە لە شوێنێکی دوورەوە بانگ دەکرێن، واتە: ئەوانە وەك کەسێك وان، لە شوێنێکی دوورەوە بانگ بکرێ، بێگومان کەسێك لە شوێنێکی دوورەوە بانگ بکرێ، ئەگەر دەنگێکیش ببیستێ، لێی تێ ناگات، تاکو نیزیك دەکەوێتەوە، ئەوانەش لەبەر ئەوەی ئەو بێبڕواییە وا هەستەوەرەکانی تێك داون، هەستی بیستن و، دیتن و، فامکردن، وەك کەسێك وان کە لە دوورەوە بانگ بکرێ.

کەواتە: ﴿ وَهُوَ عَلَيۡهِمۡ عَمًىۚ ﴾، سێ واتایان هەڵدەگرێ:

**أ**- قورئان بۆ ئەوان وەك کوێرێك وایە کە بەڕێیە نازانێ و، نابینێ، بۆیە ناتوانێ بچێتە نێو عەقڵ و دڵیان.

**ب**- قورئان بۆتە هۆکاری کوێربوونیان، واتە: ئەوان کە بە قورئان بێبڕوا بوون لە ئەنجامی ئەو بێبڕواییەدا کوێر بوون، بۆیە قورئان نابینن، وەك لە سوورەتی (**التوبة**) لە ئایەتی ژمارە (١٢٥)دا دەفەرموێ: ﴿ فَزَادَتۡهُمۡ رِجۡسًا إِلَىٰ رِجۡسِهِمۡ ﴾، واتە: سوورەتێك کە دادەبەزێ هەر پیسیی زیاد دەکات بۆ گەڵ پیسییەکەی پێشێیان، پێشێ بێبڕوا بوون، سوورەتێکی دیکەش کە دێ، بەویش بێبڕوا دەبن، بێبڕواییش پیسییە لە دەروون و، عەقڵی مرۆڤدا، کەواتە: قورئان بەڵێ لە ئەسڵدا هۆی هیدایەت و پاکییە، بەڵام بۆ ئەوان کە کوفریان تێدا زیاد دەکات و، زیاتر پێی کافر دەبن، هەر پیسییان تێدا زیاد دەکات.

**ج**- یاخود: ﴿ وَهُوَ عَلَيۡهِمۡ عَمًىۚ ﴾، (**هُو**) ناگەڕێتەوە بۆ قورئان، بەڵکو ئەوە ڕاناوی حاڵ (**ضَمیر الشَّأن**)ی پێ دەڵێن، واتە: ڕاناوێکە بەکاردێ بۆ حاڵەتەکە، نەك بۆ قورئان، واتە: نەك تەنیا قورسایی لە گوێیاندا هەیە، بەڵکو کوێرییشیان تووش بووە، سەرەنجام ئەوانە وەك کەسێك وان لە شوێنێکی دوورەوە بانگ بکرێ.

لـە بـارەی ئـەوەوە کـە خـوا ﷻ فەرمـووی: ﴿ءَأَعْجَمِيٌّ وَعَرَبِيٌّ﴾، ئەگـەر ئێمـە قورئانمـان کردبایـە بـە (عَجَمِي) دەیانگـوت: ئایـا چـۆن دەبێ قورئـان (أَعَجَمِيٌّ) بـێ، واتـە: بـە زمانـی جگـە لـە عەرەبیـی بـێ و، پێغەمبەرەکـەش عەرەبیـی بێ؟! هەندێك لـە زانایـان گوتوویانـە: واتـە: ئەگـەر هاتبـاو قورئانمـان بـە زمانێکـی دیکـەی جگـە لـە عەرەبـی ناردبایـە، ئـەوان دەیانگـوت: چـۆن دەبـێ قورئـان بـە زمانێـك بـێ کـە ئێمـە لێـی تـێ ناگەیـن، لـە حاڵێکـدا پێغەمبەرەکـە بـە زمانێـك دەدوێ ئێمـە لێـی تێدەگەیـن؟! چونکـە (أَعَجَمِيٌّ) کەسێکە زمانەکـەی فامکـراو نەبـێ، بـەڵام عەرەبیـی کەسـێکە زمانەکـەو، ئاخاوتنەکـەی فامکراوبـێ، یانـی: چـۆن دەبـێ قورئانێـك بـێ کـە فامکـراو نیـە بـۆ ئێمـە، بـۆ سـەر کەسێك کـە زمانەکـەی فامکـراو و زانـراوە بـۆ ئێمـە؟!.

## مەسەلەی سێیەم و کۆتایی:

**ڕاگەیەنرانی ئەو ڕاستییە کە خوا ﷻ تەوراتیشی بە مووسا ﷺ دابوو، بەڵام ڕاجیایی و، ناکۆکیی تێدا پەیدابوو، ئنجا ئەگەر لەبەر بڕیاری پێشتری خوا نەبووایە، دادوەریی لە نێواندا دەکردن و، بێبڕوایانیش لە بارەی قورئانەوە، دوو دڵییەکی خەستیان هەیە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ فَٱخْتُلِفَ فِيهِ ۗ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ لَقُضِىَ بَيْنَهُمْ ۚ وَإِنَّهُمْ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ مُرِيبٍ ﴿٤٥﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ ﴾، بە دڵنیایی کتێبمان بە مووساش دابوو، ﴿ ٱلْكِتَٰبَ ﴾، (أل)ی ناساندنی لەسەرەو بۆ (عَهْد)ە، واتە: کتێبەکەمان بە مووسا دابوو، کە تەوراتە، واتە: تۆ تەنیا پێغەمبەرێك نی کتێبت پێدرا بێ، مووساش ﷺ کە زۆر ناودارەو، بۆ گەلی عەرەبیش ناودار بووە، هەروەها تەوراتیش کە کتێبەکەیەتی ئەویش زۆر ناودار بووە، ئەو کتێبە ناودارەشمان بە مووسا دابوو، کەواتە: تۆش شتێکت پەیدا نەکردوەو، دانەهێناوە پێشینەی نەبووبێ.

٢)- ﴿ فَٱخْتُلِفَ فِيهِ ﴾، ڕاجیایی کرا تێیدا، لە کتێبەکەی مووسادا، کەواتە: کە هاوچەرخانی تۆش، یان گەل و کۆمەڵگایەکەی تۆش ڕاجیایی و، ناکۆکیی دەکەن لە بارەی قورئانەوە، هەندێکیان بڕوای پێ دێنن و، زۆربەیان بڕوای پێ ناهێنن، ئەوەش دیسان پێشینەی هەیە، کتێبەکەی مووساش هەروا ڕاجیایی تێدا کرابوو، هەندێکیان بڕوایان پێ هێناو، زۆربەیان بڕوایان پێ نەهێنا.

٣)- ﴿ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ لَقُضِىَ بَيْنَهُمْ ﴾، ئەگەر لەبەر وشەیەك نەبووایە کە لە پەروەردگارتەوە تێپەڕیوەو، پێشکەوتوە، دادوەرییان لە نێوان دا دەکرا.

واتـە: بڕیارێـك كـە لـە دوو توێـی وشـەیەك دا خـوا داویەتـی، كـە بریتیـە لـەوەی دادوەریـی كـردن لـە نێـوان بەندەكانیـداو، بڕیـار لـە بـارەوە، دانیـان كـە سـزایان بـدات، یاخـود پاداشـتیان بداتـەوە، لـە دنیـادا ئـەو پرۆسـەیە ئەنجـام نـادرێ، بەڵكـو هەڵیدەگـرێ بـۆ قیامـەت، ئەگـەر لەبـەر ئـەوە نەبووایـە، ﴿لَقُضِيَ بَيْنَهُمْ﴾، دادوەرییـان لـە نێوانـدا دەكـرا، یانـی: (لَوْلَا قَرَارٌ سَابِقٌ صَدَر مِنَ الله تَعَالَى لَحَكَمَ بَيْنَ مُصدِّقٍ مِنْهُم وَمُكَذِّبٍ)، واتـە: ئەگـەر لەبـەر ئـەوە نەبووایـە بڕیارێـك لـە خـوای بـەرزەوە تێپەڕیـوە، ئێسـتا لـە نێـوان بەڕاسـت دانـەرو، بـەدرۆ دانەرانـی قورئانـدا، دادوەریـی دەكـرد.

٤)- ﴿وَإِنَّهُمْ لَفِي شَكٍّ مِّنْهُ مُرِيبٍ﴾، بە دڵنیایی ئەوان لە بارەی قورئانەوە لە دوو دڵییەكی بێزاركەردان، (وإنَّ قَوْمَك الكُفَّارَ لَفِي شَكٍ مُزْعِجٍ، فَلَا تَسْتَعِظم هَذَا المَوقف مِنْهم)، واتە: خەڵكە بێبڕوایەكەی گەلەكەی تۆش لە دوو دڵییەكی بێزاركەرو، جاڕزكەردان، بۆیە ئەو هەڵوێستەی ئەوانت لەسەر دڵ قورس نەبێ و، پێت شتێكی مەزن نەبێ، ئەوە بۆ پێغەمبەرانی پێشووش - لە نێویاندا مووسا وەك نموونەیەكی دیارو ئاشكراو زەق - هەمان حاڵەت هاتۆتە پێش.

لـە كۆتایـی ئـەم دەرسـەماندا جارێكـی دیكـە سـەرنجی ئـەو ئایەتـە موبارەكـە دەدەینـەوە كـە دەفەرمـوێ: قورئـان كتێبێكـی زاڵـەو، ناهەقیـی ڕووی تێنـاكات، نـە لـە پێـش دەسـتیەوەو، نـە لـە دوایـەوە، زانایـان چـوار واتایـان بـۆ ئـەم ڕسـتەیە هێنـاون:

**یەكەم:** ئەوەیە كە من هەڵمبژارد، واتە: لە هیچ لایەكەوە هەڵەو كەموكوڕیی ڕوو لە قورئان ناكات.

**دووەم:** نە لە كتێبە پێشووەكاندا شتێك هەیە كە هەڵەیەك بێنێتە سەر قورئان، نە هیچ كتێبێكیش لە دوای قورئان دێ، كە هەڵەیەكی بێنێتە سەرو ڕەخنەیەكی لێ بگرێ.

**سێیەم:** ئەوەی قورئان حوكمی پێكردوە كە هەقە، هەرگیز نابێتە ناهەق و، ئەوەی قورئان بڕیاری داوە كە ناهەقە، هەرگیز نابێتە هەق.

**چوارەم:** قورئان نە لێی کەم دەکرێ، نە لێی زیاد دەکرێ، دەگونجێ کەسێك بێنی موصحەفێك دەستکاریی بکات، بەڵام ئەم قورئانە ئەگەر لێی کەم بکرێ دیارەو، ئەگەر لێشی زیاد بکرێ هەر دیارەو، وەك کتێبەکانی دیکە نیە.

سُبْحَانَكَ اللّٰهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەسـەمان نـۆ (٩) ئایەتـی کۆتایـی سـوورەتی (فصلـت) دەگرێتـە خـۆی، ئایەتەکانـی: (٤٦ - ٥٤)، ئـەوەری سـەرەکیی ئـەو نـۆ (٩) ئایەتـە، باسـی ڕۆژی دواییەو، ئـەو مەینەتییانـەی لـەو ڕۆژەدا چاوەڕێـی مرۆڤـی بێبـڕواو تاوانبـار دەکـەن.

هەروەهـا باسـی بیـرو بۆچوونـی خەیاڵپڵاوانـەی بابـای بێبـڕواو، زوو نائومێـد بـوون و، زوو بوغڕابوونـی لـە دەمـی خۆشـیی و نیعمـەت دایـە.

لـە کۆتاییشـدا: دوای کردنـی پرسـیارێکی هەنـاو هەژێـن لـە کافـرەکان، خـوای پەنهانـزان ڕایدەگەیەنـێ کـە بـەردەوام نیشـانەکانی خـۆی لـە ئاسـۆیەکان و، لـە خـودی مرۆڤەکانیشـدا پێشـانی مرۆڤـەکان دەدات، تاکـو زیاتـر دڵنیابـن لـە ڕاسـتیەتیی قورئـان، هەرچەنـدە کافـرەکان لــە دوو دڵییـدان سـەبارەت بـە دیـداری خـوای دەورەدەری هەمـوو شـتێك، کـە ئـەو هەڵوێسـتەیان هەڵوێسـتێکی زۆر نەفامانەیـە.

﴿ مَّنْ عَمِلَ صَٰلِحًا فَلِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَنْ أَسَآءَ فَعَلَيْهَا ۗ وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿٤٦﴾ ۞ إِلَيْهِ يُرَدُّ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ ۚ وَمَا تَخْرُجُ مِن ثَمَرَٰتٍ مِّنْ أَكْمَامِهَا وَمَا تَحْمِلُ مِنْ أُنثَىٰ وَلَا تَضَعُ إِلَّا بِعِلْمِهِۦ ۚ وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ أَيْنَ شُرَكَآءِى قَالُوٓا۟ ءَاذَنَّٰكَ مَا مِنَّا مِن شَهِيدٍ ﴿٤٧﴾ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَدْعُونَ مِن قَبْلُ ۖ وَظَنُّوا۟ مَا لَهُم مِّن مَّحِيصٍ ﴿٤٨﴾ لَّا يَسْـَٔمُ ٱلْإِنسَٰنُ مِن دُعَآءِ ٱلْخَيْرِ وَإِن مَّسَّهُ ٱلشَّرُّ فَيَـُٔوسٌ قَنُوطٌ ﴿٤٩﴾ وَلَئِنْ أَذَقْنَٰهُ رَحْمَةً مِّنَّا مِنۢ بَعْدِ ضَرَّآءَ مَسَّتْهُ لَيَقُولَنَّ هَٰذَا لِى وَمَآ أَظُنُّ ٱلسَّاعَةَ قَآئِمَةً وَلَئِن رُّجِعْتُ إِلَىٰ رَبِّىٓ إِنَّ لِى عِندَهُۥ لَلْحُسْنَىٰ ۚ فَلَنُنَبِّئَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِمَا عَمِلُوا۟ وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنْ عَذَابٍ غَلِيظٍ ﴿٥٠﴾ وَإِذَآ أَنْعَمْنَا عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ أَعْرَضَ وَنَـَٔا بِجَانِبِهِۦ وَإِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ فَذُو

دُعَآءٍ عَرِيضٍ ﴿٥١﴾ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن كَانَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ثُمَّ كَفَرْتُم بِهِۦ مَنْ أَضَلُّ مِمَّنْ هُوَ فِى شِقَاقٍۭ بَعِيدٍ ﴿٥٢﴾ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ۗ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿٥٣﴾ أَلَآ إِنَّهُمْ فِى مِرْيَةٍ مِّن لِّقَآءِ رَبِّهِمْ ۗ أَلَآ إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَىْءٍ مُّحِيطٌۢ ﴿٥٤﴾ ﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{هەر کەس کردەوەی باش بکات سوودەکەی بۆ خۆیەتی و، هەر کەسیش خراپە بکات زیانەکەی لەسەر خۆیەتی و، پەروەردگاریشت هەرگیز بەرانبەر بە بەندەکان ستەمکار نیە ﴿٤٦﴾ زانیاریی کاتەکە(ی هاتنی ئاخیر زەمان) بەس بۆ لای وی دەگەڕێتەوە (و تەنیا خۆی دەیزانێ)و، هیچ کام لە میوەکان لە کیفەکانیان نایەنە دەرێ و، هیچ مێینەیەك تۆلدار نابێ و، داینانێ، مەگەر بە زانیاریی وی، ئەو ڕۆژەش کە بانگیان دەکات، (هێی هاوبەش دانەرەکان)، کوان هاوبەشەکانم؟ دەڵێن: دانمان پێداهێناو، ئاگادارمان کردیەوە: هیچ کام لە ئێمە شایەد نیە تۆ هاوبەشت هەبن ﴿٤٧﴾ ئەوەی پێشتریش لێی دەپاڕانەوە لێیان ونبوو و دڵنیابوون کە هیچ پەناگەیەکیان نیە، (خۆی تێبگرن لە سزای خوا) ﴿٤٨﴾ مرۆڤ لە پاڕانەوەی باش (داوای چاکە لە خوا کردن) بێزار نابێ و، ئەگەر خراپەو زیانێکیشی تووش بوو، زۆر تەمابڕاو و بێ هیوایە ﴿٤٩﴾ هەر کاتیش بەزەییەکی خۆمانی پێ بچێژین، دوای ناخۆشیی و زیانێك کە تووشیبووە، بە جەختکردنەوەوە دەڵێ: ئەمە هی منە (شایستەی خۆمە)و، گومان نابەم ڕۆژی دوایی بەرپا ببێ و، ئەگەر گریمان بگەڕێمەوە لای پەروەردگاریشم، (قیامەت هەبێ)، بە دڵنیایی پاداشتی هەرەباشم لە لای خوا هەیە، بێگومان هەواڵی ئەوەی کردوویانە بە بێبڕوایان دەدەین و، بە دڵنیایی لە ئازارێکی بێرەزاشیان

پـێ دەچێژیـن ﴿٥٠﴾ هـەر کاتیـش چاکەمـان لەگـەڵ مرۆڤـی بێبـڕوادا کـرد، پشـت هەڵـدەکات و، کەلەکـەی دوور دەگـرێ و، کـە خراپـەو زیانیشـی تووشـبوو، خاوەنـی پاڕانەوەیەکـی بەریـن و زۆرو زەوەنـدە ﴿٥١﴾ بڵـێ: ئایـا دەبینـن (دەزانـن! هەواڵـم پـێ بـدەن) ئەگـەر قورئـان لەلایـەن خـواوە بـێ، ئنجـا ئێـوەش پێـی بێبڕوابـن، ئایـا کـێ لـەو کەسـە گومڕاتـرە کـە لـە دووبەرەکییەکـی دووردایـە؟! ﴿٥٢﴾ لەمـەودا نیشـانەکانی خۆمانیـان لـە ئاسـۆیەکان و، لـە خـودی خۆشـیاندا پێشـان دەدەیـن، تاکـو بۆیـان ڕوونبێتـەوە کـە (ئـەو قورئانـە) چەسـپاوو ڕاسـتە (کـە خـوا دایبەزانـدوە)، ئایـا بـەس نیـە کـە پـەروەردگارت چاودێـرو ئـاگاداری هەمـوو شـتێکە؟! ﴿٥٣﴾ ئەهـا! (ئاگاداربن!) ئـەوان (بێبڕوایـان) لـە دوو دڵییـدان لـە بـارەی دیـداری پەروەردگاریانـەوە، ئەهـا! (بزانـن) بێگومـان ئـەو، (خـوا) دەورەدەری هەمـوو شـتێکە ﴿٥٤﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(أَكْمَامِهَا): (أَكْـمَام: جَمْـعُ كِـمّ وَكُـمّ: مَـا يُغَطِّـي الثَّمَـرَة)، (أَكْـمَامْ) كـۆی (كِـمّ) و (كُـمّ)ە، ئەویـش ئەوەیـە کـە میـوە دادەپۆشـێ واتـە: توێـکڵ یـان کیـف، بـۆ وێنـە: گوێـز کـە بـە توێکڵێکـی سـەوز دەورە دراوە، هەروەهـا هێشـووە خورمـا کـە لـە نێـو کیفێکدایـە، هەمـوو ئـەو شـتانەی دیکـە کـە لـە نێـو کیـف و بەرگێکـدان.

(ءَاذَنَّكَ): (الإِذْنُ فِي الـشَّيءِ: إِعْـلَامٌ بِإجَازَتِـهِ وَالرُّخْصَـةِ فِيـهِ، أَذِنْتُـهُ وَآذَنْتُـهُ: أَعْلَمْتُـهُ)، (الإِذْنُ فِي الـشَّيءِ) ئـاگادار کردنەوەیـە بـە مۆڵەتـدران و، بـە ڕێپێدرانی شـتێك، دەگوترێ: (أَذِنْتُـهُ وَآذَنْتُـهُ) هەردووکیـان یانـی: ئـاگادارم کـردەوەو مۆڵەتمـدا.

(مَحِيصٍ): (أَصْـلُ المَحْـصِ: تَخْلِيـصُ الـشَّيءِ مِـمَّا فِيـهِ مِـنْ عَيْـبٍ كَالْفَحْـصِ، حَـاصَ عَـنِ الحَـقِّ يَحِيـصُ: أَي حَـادَ، وَالمَحِيـصُ: المَخْلَـص) وشـەی (مَحِيـص) لـە ئەصڵـدا بریتیـە لـە دەربازکردنـی شـتێك لـە کـەم و کوڕییـەك کە تێیدایـە، (مَحْـص) و (فَحْـص) مانایەکەیان

لێك نیزیك، (فَحَصَهُ) یانی: پشكنی كە چ خەلەل و كەم و كوڕییەكی تێدایە لایبەرێ، بەڵام (حَاصَ عَنِ الحَقِّ يَحِيصُ: أَيْ حَادَ) واتە: لە هەق لایدا، لاڕێ بوو، (مَحِيص) وەك چۆن بە مانای دەربازكردن دێ، وەك چاوگ بە مانای ناوی شوێن (اسم مكان)یش دێ، یانی: (المَخْلَص) پەناگە، ئەو شوێنەی مرۆڤ خۆی تێبگرێ و خۆی تێدا پەنا بدات.

(لَّا يَسْـَٔمُ): بێزار نابێ، (السَّآمَةُ: المَلَالَةُ مِمَّا يَكْثُرُ لُبْثُهُ) شتێك كە زۆر بمێنێتەوەو مرۆڤ بە هۆیەوە بێزارو وەڕەس و جاڕس ببێ.

(فَيَـُٔوسٌ): (اليَأسُ: إنْتِفَاءُ الطَّمَعِ) (يَأس) ئەوەیە ئینسان ئومێدی بە شتێك نەمێنێ، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ قَدْ يَئِسُوا۟ مِنَ ٱلْـَٔاخِرَةِ كَمَا يَئِسَ ٱلْكُفَّارُ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلْقُبُورِ ﴿١٣﴾ ﴾المتحنة، واتە: ئەوانە لە ڕۆژی دوایی نائومێد بوون، وەك چۆن كافرەكان لە خاوەن گۆڕەكان نائومێد بوون، كە جارێكی دیكە بگەڕێنەوە بۆ ژیان.

(قَنُوطٌ): (القُنُوطُ: اليَأسُ مِنَ الخَيرِ)، (يَأس): بریتیە لەوە كە ئینسان ئومێدی بە شتێك نەمێنێ، بەڵام (قُنُوط): بریتیە لە نائومێد بوون لە چاكە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ قَالَ وَمَن يَقْنَطُ مِن رَّحْمَةِ رَبِّهِۦٓ إِلَّا ٱلضَّآلُّونَ ﴿٥٦﴾ ﴾الحجر، كێ لە بەزەیی پەروەردگاری نائومێد دەبێ جگە لە گومڕایان، كە ئەمە قسەی ئیبراهیمە ﷺ لە وەڵامی فریشتەكاندا، كە موژدەی كوڕێكیان پێدا كە ئیسحاقە، ئەویش گوتی: چۆن كوڕمان دەبێ كە حاڵمان وایە؟ ئەوانیش گوتیان: نائومێد مەبە، ئەویش گوتی: ئنجا كێ نائومێد دەبێ لە بەزەیی خوا، جگە لە سەرگەردان و گومڕایان.

(غَلِيظٍ): بێڕەزا، زبر، ئەستەم، (الغِلْظَةُ: ضِدُّ الرِّقَّةِ، غِلْظَة وَغُلْظَة، وَأَصْلُهُ أَن يُسْتَعْمَلَ فِي الأَجْسَامِ، وَقَدْ يُسْتَعَارُ لِلمَعَانِي كَالكَبِيرِ وَالكَثِيرِ)، (غِلْظَة) پێچەوانەی (رِقَّة)یە، (رِقَّة) یانی: نەرمیی و ناسكیی، بەڵام (غِلْظَة) یانی: زبریی و ئەستووریی، هەم

(غِلْظَـة) بەکاردەهێـنرێ، هـەم (غُلْظَـة)، ئەویـش لـە ئەصڵـدا بـۆ شـتە بەرهەسـتەکان بـە کاردەهێنـدرێ، بـۆ شـتی ماددیـی، بـەڵام جـاری واش هەیـە دەخوازرێتـەوەو بـۆ واتـاو مەبەسـتەکان، واتـە: گـەورە و زۆر.

(وَنَـَا): (نَـَا نَـْيَـاً مِثْـلُ نَعَـا: أَي أَعْـرَضَ وَتَبَاعَـدَ، نَـَا بِجَانِبِـهِ وَنَـاءَ بِجَانِبِـهِ) یانـی: تەنیشـتی خـۆی دوورخسـتەوە، کەلەکـەی خـۆی دوورخسـتەوە، وەك (نَعَـا) واتـە: مردنـی کەسـێکی ڕاگەیانـد، یـان بـە مانـای پشـتتێکردن و خـۆ لـێ دوور گرتـن دێ.

(عَرِيضٍ): (الْعُـرْضُ: خِـلَافُ الطُّـولِ، وَأَصْلُـهُ فِي الأَجْسَـامِ ثُـمَّ اسْـتَعْمَلُوهُ فِي غَيْرِهَـا) (عُـرْض) پێچەوانـەی (طُـول)ە، (عُـرْض) یانـی: پانیـی، بەرینیـی، (طُـول) یانـی: درێژیـی، لـە ئەصڵـدا بـۆ شـتە بەرجەسـتەکان و ماددییـەکان بەکاردەهێـنرێ، بـەڵام دوایـی بـۆ شـتی مەعنەوییـش بەکاردەهێـنرێ و دەخوازرێتـەوە.

(شِقَـاقٍ): (الشِّـقَاقُ: المُخَالَفَـةُ، وَكَوْنُـكَ فِي شِـقٍّ غَـيْرَ شِـقِّ الآخَـر)، (شِـقَاق) یانـی: دوو بەرەکیـی، ئـەوە کـە تـۆ لـە لایـەك بـی و بەرانبەرەکەشـت لـە لایەکـی دیکـە بـێ، یاخـود (الشِّـقَاقُ: مِـنْ شَـقِّ الْعَـصَى بَيْنَـكَ وَبَيْنَـهُ)، (شـقاق) ئەوەیـە گۆچانێـك لـە مابەینـی دوو کەسـاندا هەبـێ و بیشـکێنن، هـەر یەکـی لەتکێکیـان بکەوێتـە دەسـت، یـان بیقەڵێشـن هـەر یەکـەی لایەکیـان بکەوێتـە دەسـت.

(ٱلْآفَاقِ): (جَمْـعُ أُفْـقْ وَأُفُـقْ)، (آفَـاق) کۆیـەو تاکەکـەی بـە (أُفْـقْ) بـە (سـکون) زەنـەو بـە (أُفُـقْ) بـە (ضمّـة) بـۆر دەگوتـرێ، کۆیەکـەی (آفَـاق)ە، (الأَفَـاقُ: النَّوَاحِـي) لایـەکان، ئاسـۆیەکان.

(مِرْيَةٍ): (المِرْيَـةُ: الـتَّرَدُّدُ فِي الأَمْـرِ، وَهُـوَ أَخَـصُّ مِـنَ الشَّـكِّ)، (مِرْيَـة): بریتیـە لـە دڵ لـە دڵ دان لـە کارێکـدا، دوو دڵ بـوون کـە تایبەتـرە لـە (شَـكّ): تایبەتـر بوونەکەشـی ئەوەیـە (شَـكّ): ئەوەیـە شـتەکە هەڵبگـرێ تێیـدا دوو دڵ بـی، بـەڵام (مِرْيَـة): ئەوەیـە لـە شـتێکدا دوو دڵ بـی، هەڵنەگـرێ و شایسـتە نەبـێ، (وَالمُـمَارَاة: المُحَاجَّـةُ فِيـمَا فِيـهِ شَـكٌّ)، (مُـمَاراة) واتـە: شـەڕە قسـە لـە شـتێکدا کـە دوو دڵیـی تێـدا هەبـێ.

## مانای گشتیی ئایەتەكان

لـە كۆتایـی ئـەم سـوورەتە موبارەكـەدا، خـوا ﷻ چەنـد ڕاسـتییەكی زۆر گـەورەو مـەزنی جۆراوجـۆر ڕادەگەیەنـێ، كـە هەر پەیوەسـتن بـە نێوەڕۆكـی سـوورەتەكەو، بەو ئایەتانـەوە كـە ڕابـردن، چونكـە وەك هەمیشـە گوتوومانـە: ئایەتەكانـی قوڕئـان وەك ئاڵقەكانـی زنجیرێـك پێكـەوە پەیوەسـتن، بـەڵام هەندێـك جـار ئەگـەر بـاش سـەرنج نـەدرێ، چۆنیەتیی پەیوەسـت بوونـی ئایەتـەكان بـە یەكدییـەوە نازانـرێ، هەروەهـا لـە پێكـەوە پەیوەسـتكردنی ئایەتـەكان و پێكـەوە پەیوەسـت بوونیانـەوە، زۆر نهێنیـی بـۆ مـرۆڤ دەردەكـەون.

لێـرەدا خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ مَّنۡ عَمِلَ صَٰلِحٗا فَلِنَفۡسِهِۦۖ وَمَنۡ أَسَآءَ فَعَلَيۡهَا ﴾، هـەر كەسـێك چاكـە بـكات سـوودەكەی بـۆ خۆیەتـی و، هـەر كەسـێك خراپـە بـكات، زیانەكـەی بـۆ سـەر خۆیەتـی، خـۆی لێـی زیانبـارە، ﴿وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّٰمٖ لِّلۡعَبِيدِ ﴾، بـە دڵنیایـی پـەروەردگارت سـتەمكار نیـە بـۆ بەنـدەكان.

ئەمـە پەیوەسـت دەبێتـەوە بـە هەمـوو ئایەتەكانـی ڕابـردووەوە كـە باسـی قوڕئـان و، باسـی پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ و، باسـی چۆنیەتیـی پێشـوازییكردن لـە ئایەتەكانـی خـوا، دەكـەن، بـە تایبـەت ئایەتـە خوێنراوەكانـی، هەروەهـا چۆنیەتـی پێشـوازییكردن لـە چاكـەو نیعمەتەكانـی خـوا، كـە لـە دەوروبـەرو بوونـەوەرو لـە ژیانمانـدا دیـارن، هـەر كەسـێك چاكـە بـكات بـەوە كـە بـۆ خـوا سوپاسـگوزار بـێ، بـەوە كە فەرمایشـتی خـوا قـەدر بگـرێ و، پێشـوازیی لـێ بـكات و، بـڕوای پـێ بێنـێ، هەروەهـا بـڕوا بـە پێغەمبـەری خاتـەم بێنـێ، شـوێن پێـی هەڵبگـرێ و، بـڕوا بـە ئاییـن و بەرنامەكـەی خـوا بینـێ، هەروەهـا سوپاسـگوزار بـێ بـۆ چاكەكانـی خـوا، هـەر كەسـێ چاكـە بـكات، خـۆی لێـی بەهرەمەنـدەو، هـەر كەسـێك خراپـە بـكات، خـۆی لێـی زیانبـارە،

﴿وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّٰمٖ لِّلۡعَبِيدِ﴾، پەروەردگاریشــت ســتەمکار نیــە بــۆ بەنــدەکان، وشـەی (**ظَـلاَّم**) ڕێژگـەی زێدەڕۆیـی (**صِيغَـة المُبالَغَـة**)ی (**ظَالِـم**)ە، بـەڵام مانـای ئـەوە نیـە کـە خـوا زۆر سـتەم لـە بەندەکانـی نـاکات، چونکـە کەمێکیـش هـەر سـتەمیان لـێ نـاکات، بەڵکـو لەبـەر ئەوەیـە کـە سیفەتەکانی خـوا هەموویـان لەوپـەڕی دان و، ئەگـەر گریـمان سـتەمکردن یەکێـك بووایـە لـە سیفەتەکانی خـوا، خـوا ﷻ وەك چـۆن (**عَـلاَّمُ الغُيـوب**)ە، (**ظَلاَّم**)یـش دەبـوو، کەواتـە: خـوا کـە زۆر سـتەم نـاکات، مانـای وایـە کەمیـش هـەر سـتەم نـاکات، چونکـە سیفەتەکانی خـوا هەموویـان لـە لووتکـەدان.

﴿إِلَيۡهِ يُرَدُّ عِلۡمُ ٱلسَّاعَةِ﴾، زانیاریـی کاتەکـە (**ساعة**) - ی هاتنـی ئاخیـر زەمـان - بـۆ لای وی دەگێردرێتـەوە، (**السَّاعَة**)، ئـەو کاتەیـە کـە ئـەم ژیانەی تێدا دەپێچرێتەوە، بـە زۆریـی وشـەی: (**السَّـاعَة**)، بـۆ کۆتایـی ژیانـی دنیایـە، واتـە: ئاخیـر زەمـان، بـەڵام جـاری واش هەیـە وشـەی: (**السَّاعَة**)، بـۆ قیامەتیـش بـەکاردێ و، جـاری واش هەیـە: (**السَّـاعَة**)، بـۆ هـەردوو قۆناغەکـەی ئاخیـر زەمـان و قیامـەت (ڕۆژی دوایی) بـەکاردێ، ئـەوەش بەپێـی سـیاق دەزانـرێ، وشـەی: (**السَّـاعَة**)ش، یانـی: کاتێکـی دیارییکـراو: کاتـی دیارییکـراوی کۆتایـی هاتنـی ئـەم ژیانـە، یاخـود کاتـی دیارییکـراوی زینـدوو کرانـەوەی مـردووان، یاخـود کاتـی دیارییکـراوی هـەم کۆتایـی هاتنـی ژیانـی دنیـاو، هـەم دەسـت پێکردنـی ژیانـی ڕۆژی دوایـی، بـە هـەر سـێ واتایەکـە بـەکاردێ، بـەڵام بـە زۆریـی بـۆ ئاخیـر زەمـان بـەکاردێ، (**قیامـة**) هەڵسـانەوەش بـۆ قۆناغـی زیندووکرانـەوەو، سـزاو پاداشـت، بـەکاردێ.

﴿وَمَا تَخۡرُجُ مِن ثَمَرَٰتٖ مِّنۡ أَكۡمَامِهَا﴾، هـەر لـەو ڕووەوە، وەك چـۆن زانیاریـی هاتنـی ئاخیـر زەمـان، یـان هاتنـی قیامـەت و ڕۆژی دوایـی تەنیـا لـە لای ئـەوە، بـە هەمـان شـێوە هیـچ کام لـە میـوەکان لـە کیفەکانیـان نایەنـە دەرێ، ﴿وَمَا تَحۡمِلُ مِنۡ أُنثَىٰ﴾، هەروەهـا هیـچ مێینەیـەك تۆلـدار نابـێ، کـە ئەگـەر بـۆ ئـاژەڵان بـێ، وشـەی (ئـاوس) بـەکاردێ، هەڵبەتـە دەگونجـێ (ئـاوس) بـۆ مرۆڤیـش بەکاربـێ، بـەڵام جـاری وا هەیـە هەندێـك وشـە بـە عـورف، مانایەکـی خـراپ بەدەسـتەوە دەدەن، بـەڵام لـە

ئەسڵی زماندا ئەگەر بگوترێ ئافرەتێك ئاوس بووە، یاخود مانگایەك ئاوس بووە، یان بزنێك، یان مەڕێك، یان حوشترێك، یان ماینێك، زۆر ئاساییە، بەڵام جاری وایە لە بەكارهێنانی دا بە هۆی عورفەوە، وشەیەك مانایەكی خراپ وەردەگرێ، بۆیە لە كوردەوارییدا زیاتر دەڵێن دووگیان، بەڵام پێموایە دەگونجێ وشەی تۆلدار بەگشتیی بەكاربهێنرێ، بۆ نموونە: ئەو ئافرەتە تۆلاو تۆلە، یانی: سكی هەیەو، دوو گیانە، یانی: منداڵی كۆرپەی لە سكدا هەیە، كەواتە: تۆلدار بۆ هەموو مێینەكان بەكاردەهێنرێ، بۆیە من ئەو وشەیەم بەكارهێناوە، هەم بۆ مێینەی مرۆڤ كە ئافرەتە، هەم بۆ مێینەی ئاژەڵەكان، واتە: مێیەی حوشترو، مانگاو، بزن و، مەڕ.

خوا دەفەرموێ: هیچ مێینەیەك تۆلدار نابێ، ﴿وَلَا تَضَعُ﴾، هەروەها تۆلەكەشی دانانێ، ئەوەی نێو سكی دانانێ، كۆرپەكەی، یاخود بێچووەكەی، ﴿إِلَّا بِعِلْمِهِۦ﴾، مەگەر بە زانیاریی خوا، خوا لە هەمووی ئاگادارە، هەم كاتی تۆلداربوونی، هەم كاتی تۆلدانانی، ﴿وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ أَيْنَ شُرَكَآءِى﴾، ئەو ڕۆژەش كە بانگیان دەكات، كوان هاوبەشەكانم؟! واتە: بانگی هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان دەكات، دەفەرموێ: كوان هاوبەشەكانم، ئەوانەی دەتانكردنە هاوبەشی من و، وەك من تەماشاتان دەكردن و مامەڵەتان لەگەڵدا دەكردن؟ ﴿قَالُوٓاْ ءَاذَنَّٰكَ مَا مِنَّا مِن شَهِيدٍ﴾، گوتیان: ئاگادارمان كردوویەوە، پێشتر ڕامانگەیاندوە، هیچ كامێك لە ئێمە شایەدو چاودێرو، بەڵگە نیە كە تۆ هاوبەشت هەبێ.

﴿وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يَدْعُونَ مِن قَبْلُ﴾، ئەوەی پێشتر لێی دەپاڕانەوە لێیان ونبوو، پەنهان بوو، چونكە لە ئەصڵدا وەك هاوبەشی خوا نەبوون، بەڵكو وەك دارێك، یان بەردێك، یان پەیكەرێك، یان مرۆڤێك، یان قەبرێك، یان تاغووتێك، یان ڕژێمێك یان فیرعەونێكی زاڵم هەبوون، بەڵام نەك وەك هاوبەشی خوا، بەڵكو وەك دروستكراوێك لە دروستكراوەكانی خوا، ﴿وَظَنُّواْ مَا لَهُم مِّن مَّحِيصٍ﴾، پێشیان وابوو هیچ پەناگەیەكیان نیە، وشەی (ظَنّ) لە قورئانداو، لە زمانی عەرەبییشدا كە خەڵك وادەزانێ بە زۆریی بە مانای گومان دێ، بەڵام وەك چۆن

بـە مانـای گومـان دێ، بـە مانـای زانیاریـی جێـی دڵنیاییـش دێ، ئەویـش بەپێـی سیاق دەزانـرێ، لەبـەر ئـەوەی زانیارییـش، ئـەو زانیارییـەی مـرۆڤ وەدەسـتی دێنـێ، پلـە پلەیـە، لـە سـەرەتاوە مـرۆڤ جۆرێـك لـە گومانـی دەبـێ، دەبـێ ئـەو شـتە وابـێ، یـان وانەبـێ؟ دوایـی وردە وردە گومانەکـەی بەهێـز دەبـێ، پێشـێ هـەروا خەتەرەیـەك بـە دڵییـدا دێ، دەبـێ وابـێ؟ دوایـی وردە وردە (شَكّ)ی پەیـدا دەبـێ، واتـە: دوو دڵ دەبـێ، لـە نێوەڕاسـتێ دا دەوەسـتێ، لـە نێـوان بـوون و نەبوونـدا، دوایـی دەبێتـە (ظَنّ)، کـە بریتیـە لـە گومانێکـی زاڵ، واتـە: لای بوونـی ئـەو شـتە زاڵ بکـەی، یاخـود لای نەبوونـی زاڵ بکـەی، دوایـی دەبێتـە عیلـم، دواتریـش دەبێتـە یەقیـن، ئنجـا وشـەی (ظَنّ) هـەم بـە سـەرەتای زانینـی شـتەکان دەگوتـرێ و، هـەم بـە نێوەڕاسـتیان و، هـەم بـە کۆتاییەکەیـان، بـەڵام بەپێـی سـیاق دەزانـرێ، کامیـان مەبەسـتە.

لێـرەدا کـە بـاسی ڕۆژی قیامـەت و، زیندووکرانـەوەو هەڵسـانەوەیە، دەزانیـن (ظَنّ) بـە مانـای دڵنیاییـە، چونکـە لـەوێ کـەس گومانـی نامێنـێ، ﴿ وَظَنُّواْ مَا لَهُم مِّن مَّحِيصٍ ﴾، یانـی: دڵنیابـوون و، زانییـان کـە پەناگەیەکیـان نیـەو، هیـچ شـوێنی دەربازبوونیـان نیـە، لـەوێ شـوێنی ئـەوە نیـە، کەسـێك بڵـێ: دەبـێ دەربازبـم؟ کافـر بووبـێ لـە دنیـادا، کەچـی لـە ڕۆژی هەڵسـانەوەو زیندووکرانـەوەدا گومانـی هەبـێ، نەخێـر، بۆیـە دەزانیـن لێـرەدا (ظَنّ) بـە مانـای دڵنیایـی و، زانیارییەکـی چەسـپاوە، هەروەهـا لـە سـووڕەتی (البقرة)شـدا کـە خـوای کارزان باسـی ئـەو کۆمەڵـە کەمـە دەکات، کـە سـەریان دەخـات بەسـەر کەسـانێکی لـە خۆیـان زیاتـردا، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ قَالَ الَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَاقُوا اللَّهِ كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِإِذْنِ اللَّهِ وَاللَّهُ مَعَ الصَّابِرِينَ ﴿٢٤٩﴾ ﴾، واتـە: ئەوانـەی کـە دەیانزانـی بەدیـداری خـوا دەگـەن، گوتیـان: زۆر جـاران کۆمەڵێکـی کـەم بەسـەر کۆمەڵێکـی زۆردا زاڵبـوون بـە مۆڵەتـی خـوا، خـواش لەگـەڵ خۆڕاگراندایـە.

لێـرەدا دەزانیـن کـە: ﴿ يَظُنُّونَ ﴾ بـە مانـای (گومـان دەبـەن) نیـە، چونکـە کەسـێك کـە لەگـەڵ دوژمنـدا ڕووبـەڕوو بۆتـەوە، پێویسـتی بـە یەقینێـك هەیـە کـە

دڵنیابێ خوا سەری دەخات، کەواتە لێرەدا ﴿يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَٰقُواْ ٱللَّهِ﴾، یانی: (يَعْلَمونَ)، یاخود (يَسْتَيقِنون).

هەروەها هەر لە سوورەتی (البقرة)دا خوای بەرزی مەزن لە سیاقێکی دیکەدا باسی (ظَنّ) دەکات کە مەبەست پێی یەقینە، کە دەفەرموێ: ﴿وَٱسْتَعِينُواْ بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِۚ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلَّا عَلَى ٱلْخَٰشِعِينَ ﴿٤٥﴾ ٱلَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَٰقُواْ رَبِّهِمْ وَأَنَّهُمْ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ ﴿٤٦﴾﴾، واتە: یارمەتیی وەربگرن لە خۆڕاگریی و، لە نوێژ، نوێژیش قورسەو گەورەیە، مەگەر لەسەر بۆ خوا ملکەچان، ئەوانەی (ظَنّ)یان وایە کە بە دیداری پەروەردگاریان دەگەن، واتە: یەقینیان وایە، (ظَنّ) لێرەدا بە مانای زانیارییەکی جێی دڵنیاییە، کە بە دیداری پەروەردگاریان دەگەن و، بۆ لای وی دەگەڕێنەوە، چونکە ئەگەر مرۆڤ بەس گومانی هەبێ بچێتەوە خزمەت پەروەردگاری، مانای وایە جارێ هەر ئیمانی نەهێناوە، چ جای شایستەی ئەوەبێ مەدح بکرێ!.

کەواتە: لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿وَظَنُّواْ مَا لَهُم مِّن مَّحِيصٍ﴾، یانی: یەقینیان هەبوو، دڵنیابوون کە شوێنی دەربازبوونیان نیە.

﴿لَّا يَسْـَٔمُ ٱلْإِنسَٰنُ مِن دُعَآءِ ٱلْخَيْرِ﴾، مرۆڤ لە پاڕانەوەی بۆ چاکە بێزار نابێ.

لێرەدا مەبەست لە ئینسان، کە (أل)ی ناساندنی لەسەرە، بەڵام ناساندن (تعريف)ەکە مەبەست پێی جینسی ئینسان نیە، کە هەموو مرۆڤەکان وابن، بەڵکو مەبەست پێی مرۆڤانێکی تایبەتەو، ناساندنەکە بۆ (عَهْد)ە، واتە: ئەو مرۆڤانەی ناسراون و زانراون کە بێبڕوان، بێزار نابن لە داواکردنی شتی چاکە بۆ خۆیان، ئەو مرۆڤە بێبڕوایە بێزار نابێ لە داواکردنی چاکە بۆ خۆی، ﴿وَإِن مَّسَّهُ ٱلشَّرُّ﴾، ئەگەر خراپەو زیانێکیشی تووشبوو، ﴿فَيَـُٔوسٌ قَنُوطٌ﴾، هەم تەمابڕاوە، هەم بێ هیوایە لە خێرو چاکە.

﴿وَلَئِنْ أَذَقْنَٰهُ رَحْمَةً مِّنَّا مِنۢ بَعْدِ ضَرَّآءَ مَسَّتْهُ﴾، ئەگەر لە لایەن خۆمانەوەش بەزەییەکی پێ بچێژین، دوای ئەوەی نەخۆشیی و ناخۆشییەکی تووش بووە،

یانی: هەر کەمێك ناخۆشیی تووش ببێ، دوای ئەوەی بەزەییەکی خۆمان پێ چێژتووە، ئەو بەزەییەش لە چاکەو نیعمەت و خێرو خۆشییەکاندا بەرجەستە دەبێ، ﴿لَيَقُولَنَّ هَٰذَا لِي﴾، زۆر بە جەختکردنەوە دەڵێ: ئەمە هی منە، واتە: من شایستەیمی، بۆیە خوا بە منی داوە، ﴿وَمَآ أَظُنُّ ٱلسَّاعَةَ قَآئِمَةً﴾، پێشم وا نیە قیامەت ڕابێ، (السَّاعَة)، ئەو کاتەی ژیانی دنیای تێدا کۆتایی دێ، بەڵام لێرەدا یانی: قیامەت، ڕۆژی هەڵسانەوەو زیندووکرانەوە، پێم وانیە قیامەت ڕابێ، یان ڕۆژی دوایی بێت، لێرەدا (ظَنّ) بە مانای گومانە، ﴿وَلَئِن رُّجِعْتُ إِلَىٰ رَبِّيٓ﴾، ئەگەر گریمان بشگێڕدرێمەوە بۆ لای پەروەردگارم، ﴿إِنَّ لِي عِندَهُۥ لَلْحُسْنَىٰ﴾، بە دڵنیایی بۆ من لە لای وی پاداشتی هەرە چاك هەیە، (**الحُسنى**)، سیفەتی وەسفکراوێکی قرتێنراوە، یانی: (**لَلْخَصْلَةُ الحُسْنَى**)، سیفەتی هەر باش یاخود (**لَلْمَثُوبَةُ الحُسْنَى**)، پاداشتی هەرە باش، یاخود (**لَلْحَالَةُ الحُسْنَى**)، حاڵەتی هەرە باش، بۆ من هەیە لە لای پەروەردگارم، واتە: زۆر لە خۆی ڕادەبینێ، بێ ئەوەی بناغەیەکی دابنێ، دیواری خەون و خەیاڵی زۆری هەڵچنیوە! بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿فَلَنُنَبِّئَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِمَا عَمِلُوا۟﴾، بە دڵنیایی هەواڵ دەدەین بەوانەی بێبڕوان بەوەی دەیانکرد، هەواڵیان پێدەدەین بە کردەوەکانیان، هەواڵیان پێ دەدەین، واتە: دەڵێین: فڵان شت و، فڵان شتت کرد، ئنجا ئەوەش سزایەکەیەتی، بۆیە دەفەرموێ: ﴿وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنْ عَذَابٍ غَلِيظٍ﴾، لە ئازارێکی ئەستوورو زەبەلاح و بێزەزایان پێ دەچێژین.

ئنجا دێتە سەر حاڵەتێکی دیکەی مرۆڤی بێبڕواو، مرۆڤی دوور لە خوا، دەفەرموێ: ﴿وَإِذَآ أَنْعَمْنَا عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ﴾، دیسان: ﴿ٱلْإِنسَٰنِ﴾، مەبەست پێی مرۆڤێکی تایبەتە، کە مرۆڤی بێبڕواو، دوور لە خوایە، هەر کات چاکەمان لەگەڵ مرۆڤدا کرد، ﴿أَعْرَضَ وَنَـَٔا بِجَانِبِهِۦ﴾، پشت هەڵدەکات و، تەنیشت و کەلەکەی خۆی دوور دەخاتەوە، واتە: لە خوا دوور دەکەوێتەوەو، لە بەندەکانی خواش دوور دەکەوێتەوە، بۆ ئەوەی هاوکارییان نەکات، ﴿وَإِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ﴾، ئەگەر

زیـان و خراپەیەکیشـی تووشـبوو، ﴿ فَذُو دُعَآءٍ عَرِيضٍ ﴾، خـاوەن پاڕانەوەیەکـی پـان و بەرینـە، شـتێك کـە پانابیەکـەی زۆر بـێ، مانـای وایـە درێژاییەکەشـی زۆرە، بۆیـە خـوا ﷻ جاری وا هەیـە باسـی شـتێك دەکات، بـەس بـاسی پانابیەکـەی دەکات، بـۆ وێنـە: لـە سـوورەتی (آل عمـران) لـە ئایەتـی ژمـارە: (١٣٣)دا، باسـی بەهەشـت دەکات، دەفەرمـوێ: ﴿ عَرۡضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ ﴾، پانابیـەکی ئاسـمانەکان و زەوییـە، ئنجـا ئەگـەر پانابیەکـەی بـە قـەدەر ئاسـمانەکان و زەوی بـێ، مانـای وایـە درێژاییەکەشـی زۆرە.

لێـرەدا: ﴿ فَذُو دُعَآءٍ عَرِيضٍ ﴾، پاڕانەوەیەکی پـان و بەرینـی هەیـە، یـانی: زۆرو زەوەند.

ئنجـا خـوا دێتـە سـەر بابەتێکـی دیکـە، بـەڵام هـەر لـە هەمـان سـیاقداو دەفەرمـوێ: ﴿ قُلۡ أَرَءَيۡتُمۡ ﴾، پێیـان بڵـێ: ئایـا دەزانـن؟ ئایـا دەبینـن؟ هەواڵـم پـێ بـدەن ﴿ إِن كَانَ مِنۡ عِندِ ٱللَّهِ ﴾، ئەگـەر لـە لایـەن خـواوە بـوو، ئەمـە بەپێـی ڕەوت دەزانـرێ کـە مەبەسـت پێـی قورئانـە، هەرچەنـدە باسـی قورئـان نەکـراوە، بـەڵام ڕاناوەکـەی کـە تێیـدا شـێردراوەیە بـۆ قورئـان دەچێتـەوە، واتـە: (إِنْ كَانَ القُـرآنُ مـن عنـد اللـه)، ئەگـەر ئـەو قورئانـە لـە لایـەن خـواوە بـوو، ئـەو کتێبـە لەلایـەن خـواوە بـوو، ﴿ ثُمَّ كَفَرۡتُم بِهِۦ ﴾، دواییـش ئێـوە پێـی بێبـڕوا بـوون، ﴿ مَنۡ أَضَلُّ مِمَّنۡ هُوَ فِي شِقَاقِۭ بَعِيدٖ ﴾، کـێ لـەو کەسـە گومڕاتـرە، کـە لـە دووبەرەکییەکـی دووردایـە! لەبـەر ئـەوەی بـڕوا بـە قورئـان، بـە کتێبـی خـوا ناهێنـن، یانـی: ئایـا ئەگـەر قورئـان لـە لایـەن خـواوە بـێ و ئێـوەش پێـی بێبـڕوا بـن، کـێ لـە ئێـوە گومڕاتـرە؟! کـە خۆتـان دوور دەگـرن لـە قورئـان و، دووبەرەکیـی و، بەربەرەکانێـی لەگەڵـدا دەکـەن و، لـە دژایەتیـی کردنەکـەی دا، زۆر دوورکەوتوونـەوە.

لـە کۆتایـی دا خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ سَنُرِيهِمۡ ءَايَٰتِنَا فِي ٱلۡأٓفَاقِ وَفِيٓ أَنفُسِهِمۡ ﴾، لەمـەودوا لـە ئاسـۆیەکان و، لـە خـودی خۆشـیاندا نیشـانەکانی خۆمانیـان

دەخەینە بەرچاو، پێشانیان دەدەین، ﴿ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ ﴾، تاکو بۆیان دەرکەوێ کە ئەو هەقە، (أنه) ئەم ڕاناوە بەپێی سیاق دەزانرێ کە بۆ قورئان دەچێتەوە، بەڵام دەشگونجێ بۆ پێغەمبەری خاتەمیش ﷺ بچێتەوەو دەشگونجێ بۆ خوای بەرزی مەزنیش بچێتەوە، بەڵام بەپێی سیاق لە هەموویان نیزیکتر ئەوەیە کە بۆ قورئان بچێتەوە، چونکە ئایەتەکان هەموویان باسی قورئانن، هەتا ئایەتی پێشتر کە دەفەرموێ: پێیان بڵێ: ئایا دەبینن، ئایا دەزانن، یاخود هەواڵم پێ بدەن؟ ئەگەر لەلایەن خواوە بێ، دوای ئەوەش پێی بێبڕوا بن، واتە: قورئان لە لایەن خواوە بێ، دوای ئەوەش پێی بێبڕوا بن، کێ گومڕاترە لە کەسێك کە لە دووبەرەکییەکی دووردایە؟! ﴿ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ ﴾، ئایا بەس نیە بۆ پەروەردگارت کە چاودێرە بەسەر هەموو شتێکەوە؟! پەروەردگارێك چاودێر بێ بەسەر هەموو شتێکەوە، کەواتە: قورئانێکیش کە ناردوویەتی هەتا ئەو شتانە زیاتر پەییان پێ ببردرێ لە ئاسۆیەکان و، لە خودی مرۆڤەکانیشدا، هەتا زانست زیاتر پەردە لەسەر نهێنییەکانی دروستکراوەکانی خوا هەڵداتەوە، ئەو خوایە کە بەسەر هەموو شتێکەوە چاودێرە، ئەو خوایە کتێبێك بنێرێ هەتا ئەو شتانە زیاتر پەردەیان لەسەر لابچێ و، زانست زیاتر پێیان ئاشنا بێ، کەواتە: زیاتر هەقانیەتیی کتێبی خوا دەردەکەوێ، چونکە بێژەری قورئان خوایە ﷻ، کە بەدیهێنەرو پەروەردگاری هەموو شتەکانەو، دروستکەری هەموو شتەکانە، کەواتە: هەتاکو پەردە زیاتر لەسەر دروستکراوەکانی لابچێ، هەقانیەتیی فەرمایشتەکەی زیاتر دەردەکەوێ، کە ئەمە ئیعجازێکی عیلمیی زۆر بەهێزی تێدایە، چونکە خوای موتەعال بە (س) فەرموویەتی، (س) و (سَوفَ) بۆ داهاتوون، ئەگەر گوتت: (سَأَرَاكَ) واتە: لە مەودوا دەتبینم، (سَوفَ أَرَاكَ) واتە: دوورتر لەمەودوا دەتبینم، لێرە کە دەفەرموێ: ﴿ سَنُرِيهِمْ ﴾، لە مەودوا پێشانیان دەدەین، چییان پێشان دەدەین؟ نیشانەکانی خۆمان، کە بە تەئکید لێرەدا مەبەست لە (آيَات) کە کۆی (آيَة)ە، ئەو دیاردەو دیمەنانەی دەوروبەرو بوونەوەرن، چونکە خوا

دەفەرمـوێ: نیشـانەکانی خۆمانیـان لـە ئاسۆیەکانیشـدا پێشـان دەدەیـن و، لـە خـودی خۆشـیاندا، واتـە: زانیاریـی لـە مـەودوا زیاتـر بـەرەو پێشـەوە دەچـێ، هـەم لـە ڕووی پەیبردنـی زیاتـر بـە نهێنییەکانـی جەسـتەی مـرۆڤ و ڕووح و ناخـی مـرۆڤ، هـەم لـە ڕووی پەیبردنـی زیاتـر بـە گـەردوون و، ئاسـمانەکان و زەوی، لـە ئەنجامـی ئـەوەدا زیاتـر بۆیـان دەردەکـەوێ کـە قورئـان هەقـە، چونکـە تاکـو زانسـت زیاتـر بـەرەو پێشـەوە بچـێ، ئـەو ئاماژانـەی لـە قورئانـدا هـەن، زیاتـر پەردەیـان لەسـەر لادەچـێ، چونکـە خـوا ﷻ لـە قورئانـدا باسـی مـرۆڤ و، دروسـتبوونی مرۆڤـی کـردوە، کـە (**سـلالة مـن طـين**)ەو، (**نُطْفَة**)یـەو، (**عَلَقَة**)یـەو، (**مُضْغَة**)یە...هتـد، کـە لـە سـەرەتای سـوورەتی (**المؤمنـون**)دا باسـێکی خەسـت و خۆڵـمان لـەو بـارەوە کـرد، لـە قـەدەر قەبـارەی ئـەم تەفسـیرە، هەروەهـا لە شـەرح و تەفسـیرکردنی ئایەتەکانـی: (٨ - ١٢)ی ئـەم سـوورەتە موبارەکەشـدا باسـێکمان لـە بـارەی دروسـتبوونی گەردوونـەوە کـرد، کە چـۆن ئایەتـە موبارەکـەکان ئامـاژەی پـێ دەکـەن، زانایانیـش زۆر باسـیان کـردوە لـەو کتێبانـەدا کـە باسـی ئیعجـازی عیلمیـی دەکـەن لـە قورئانـدا، کـە سـەرەتای وەحیـی کۆتایـی زانسـتەو زانسـت لـە کـوێ کۆتایـی دێ، ئـەوێ سـەرەتای وەحییـە، واتـە: داوی ئـەوەی زانسـت لـێ دەکۆڵێتـەوەو شـتەکانی بـۆ دەردەکـەون، وەك حەقیقەتـی زانسـتیی، ئنجـا ئـەوێ دەسـتپێکی وەحییـە، لـە کـوێ زانسـت کۆتایـی هـات، لەوێـوە وەحیـی دەسـت پێـدەکات.

﴿ أَلَآ إِنَّهُمۡ فِي مِرۡيَةٖ مِّن لِّقَآءِ رَبِّهِمۡۗ ﴾، ئاگاداربـن! ئـەوان لـە دوو دڵییـدان لـە بـارەی دیـداری پەروەردگاریانـەوە، ﴿ أَلَآ إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَيۡءٖ مُّحِيطُۢ ﴾، ئەهـا! ئـاگادار بـن! بـە دڵنیایـی ئـەو دەورەدەری هەمـوو شـتێکە، ئنجـا مـادام خـوا دەورەدەری هەمـوو شـتێك بـێ، کەواتـە: کـە دەفەرمـوێ: ئـەی مرۆڤـەکان! ئێـوەم بـۆ تاقیکردنەوە هێناوەتـە دی و لـەم سـەر زەوییـەم دانـاون و، ئەرکـی جێنشـینایەتیی خۆمـم پـێ سـپاردوون و، ئەمانەتـی خۆمـم بـە ئێـوە سـپاردوە هەڵیبگـرن، کـە بـە ئاسـمانەکان و زەوی و چیایـەکان هەڵنەگیـراوە، هەروەهـا لـە باشـترین شـێوەو پێکهاتنـدا ئێـوەم

خولقاندوەو، ڕێزم لێکرتوون، هەروەها ئاوەدانکردنەوەی سەر زەویم پێ سپاردوون، کە ئەمانە هەموویان چەمك و واتای ئایەتەکانی قورئانن، وەك لە جێی دیکەدا بە درێژیی باسمان کردوە، کەواتە: خواو پەروەردگارێکی ئاوا، کە دەوری هەموو شتێکی داوە، هەموو شتێك لە ژێر هەیمەنەو دەسەڵاتی ئەودایە، دەستەوسان نابێ کە دوای ئەوەی ئێوە دەمرن و، دەبنەوە خاك، زیندووتان بکاتەوە بۆ ئەوەی لێتان بپێچێتەوەو، بپرسێتەوە داخۆ ئەو ژیانە دنیاییەتان چۆن گوزەراندو، چۆن مامەڵەتان کرد لەگەڵ سپاردەی خوادا، هەروەها چۆن مامەڵەتان کرد لەگەڵ نیعمەتەکاندا کە خوا بۆی ڕەخساندبوون و، چۆن ئەرکی جێنشینایەتیی خواتان جێبەجێ کردو، ئەو ڕێزو حورمەتەی خوا لێی نابوون، تا چ ڕاددەیەك ئەو ڕێزو حورمەتەتان پاراست، بە هۆی ئیمان و کرداری چاکەوە، یان تاکو چ ڕاددەیەك ئەو حورمەت و ڕێزەتان لەدەستدا بە هۆی بێبڕوایی و تاوان و خراپەو لادانەوە؟! دەبێ لێتان بپێچێتەوە، ئنجا خوایەك دەوری هەموو شتێکی دابێ و، چاودێر بێ بەسەر هەموو شتێکەوەو، هەموو شتێك دروستکراوی خۆی بێ، چۆن زیندوو کرانەوەو، پاشان سزادان و پاداشت دانەوەی ئێوەی لێ عاسێ دەبێ.

هەڵبەتە ئێمە دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا، کورتە باسێکی تایبەت دەکەین لە بارەی دەرکەوتنی بەردەوامی نیشانەکانی خوا ﷻ لە ئاسۆیەکان و، لە خودی مرۆڤانیشدا، بۆیە لێرە بەو ئاماژە کورتە لێی گەڕاین.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

هەر کەس چاکە بکات، خۆی لێی بەهرەمەندەو، لە خراپەشی خۆی زیانبارە، خواش ستەم لە بەندەکانی ناکات و، زانیاریی هاتنی ڕۆژی دواییش بەس لە لای خوایە، بە هەموو شتێك زانایەو، تەنانەت هیچ میوەیەك لە بەرگ و کیفەکەی نایەتە دەرێ و، هیچ مێینەیەك تۆڵدار نابێ و، تۆلەکەی دانانێ، مەگەر خوا دەیزانێ، لە ڕۆژی دواییشدا کە بانگی هاوبەشدانەرەکان دەکات، هاوبەشەکانی لە کوێن کە لەگەڵ خوادا دەیانپەرستن؟ نکووڵیی لە بوونیان دەکەن و، لێیان بزر دەبن، لە قوتاربوونیش لە سزای خوا نائومێد دەبن:

خوا دەفەرموێ: ﴿ مَّنْ عَمِلَ صَٰلِحًا فَلِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَنْ أَسَآءَ فَعَلَيْهَا ۗ وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿٤٦﴾ إِلَيْهِ يُرَدُّ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ ۚ وَمَا تَخْرُجُ مِن ثَمَرَٰتٍ مِّنْ أَكْمَامِهَا وَمَا تَحْمِلُ مِنْ أُنثَىٰ وَلَا تَضَعُ إِلَّا بِعِلْمِهِۦ ۚ وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ أَيْنَ شُرَكَآءِى قَالُوٓا۟ ءَاذَنَّٰكَ مَا مِنَّا مِن شَهِيدٍ ﴿٤٧﴾ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَدْعُونَ مِن قَبْلُ ۖ وَظَنُّوا۟ مَا لَهُم مِّن مَّحِيصٍ ﴿٤٨﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:

خوا ﷻ وەك یاسایەك كە لە چەند شوێنێکی قورئاندا دووبارە بۆتەوە، چ بەو تەعبیرە، چ بە تەعبیری دیکە، ڕایدەگەیەنێ، دەفەرموێ:

١)- ﴿ مَّنْ عَمِلَ صَٰلِحًا فَلِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَنْ أَسَآءَ فَعَلَيْهَا ﴾، هەر کەسێك کردەوەی باش ئەنجام بدات، سوودەکەی بۆ خۆیەتی و، هەر کەسێکیش خراپە بکات، زیانەکەی لەسەر خۆیەتی، هەر کام لە: ﴿ مَّنْ عَمِلَ صَٰلِحًا ﴾و، ﴿ وَمَنْ أَسَآءَ ﴾، مەرجن و،

وەڵامەکەشیان لەگەڵ خۆیاندایە، یانی: (**شَرْطَانِ وَجَوابُهُما**)، ﴿ مَّنْ عَمِلَ صَٰلِحًا ﴾، (مَنْ: **الشَّرطِيَّة**)یە، هەر کەسێك چاکە بکات، وەڵامەکەی بریتیە لە: ﴿ فَلِنَفْسِهِۦ ﴾، سوودەکەی بۆ خۆیەتی، ﴿ وَمَنْ أَسَآءَ ﴾، هەر کەسێك خراپە بکات، ﴿ فَعَلَيْهَا ﴾، زیانەکەی لەسەر خۆیەتی، لێرەدا خوا ﷻ دەیەوێ بە هەموو مرۆڤەکان ڕابگەیەنێ، کە بێ نیازە لە چاکەی چاکەکاران، بۆیە هەر کەسێك چاکە بکات پاداشتەکەی و، بەهرەکەی بۆ خۆی دەگەڕێتەوە، هەروەها خوا ﷻ بێ باکیشە لە خراپەی خراپەکاران، هەر کەسێك خراپە بکات، زیانەکەی بۆ خۆیەتی، کە بریتیە لە سزای خوا لە ڕۆژی دواییداو، دەرهاویشتە خراپەکانی لە ژیانی دنیادا، هەروەها بە نسبەت چاکەشەوە: وەك چۆن پاداشتی لە لای خوا هەیە لە ڕۆژی دواییدا، دەرهاویشتەو بەرهەمی باشیشی هەیە لە ژیانی دنیایدا، ئنجا کردەوەی چاك و، کردەوەی خراپ چەمکەکەیان زۆر فراوانە، چ لە مامەڵە لەگەڵ خوادا ﷻ، ئینسان چاکە بکات، کە بریتیە لە بەندایەتیی بۆ خوا، چ لە مامەڵە لەگەڵ مرۆڤەکاندا، کە بریتیە لە سوود پێگەیاندنیان و، قسەی خێر بۆ کردنیان و، دڵسۆزیی بۆ نواندنیان، هەموو ئەوانە چ لە نێوان مرۆڤ و خوادا بکرێن، چ لە نێوان مرۆڤ و مرۆڤەکاندا، بەڵکو چ لە نێوان مرۆڤ و شتەکاندا، یانی: ئینسان ئەگەر ئامڕازێکی هەبێ بەکاری بێنێ، تاکو لەگەڵیدا چاکەکار بێ، ئەو ئامڕازە تەمەنی زیاتر دەبێ و، بەردەوامتر دەبێ و، باشتر سوودی پێ دەگەیەنێ، بەڵام ئەگەر بە خراپە مامەڵە لەگەڵ ئەو ئامڕازەدا بکات، ئنجا کتێبەکە سەیارەیە، سەعاتە، کۆمپیوتەرە، ....هتد، ئەو شتە تەمەنی کورت دەبێ و، کەمتر سوودی بۆ خاوەنەکەی دەبێ.

٢)- ﴿ وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ﴾، پەروەردگارت ستەمکار نیە بۆ بەندەکان، وشەی (**ظَلَّامٌ**) ڕێژگەی زێدەڕۆیی (**صیغَة المُبَالَغَة**)یە بۆ (**ظَالِم**)، یانی: ستەمکار، بەڵام (**ظَلَّامٌ**) یانی: زۆر ستەمکار، بەڵام کە خوا ﷻ دەفەرموێ: پەروەردگارت زۆر ستەمکار نیە بۆ بەندەکان، ئایا مانای وایە کەمێك ستەمیان لێ دەکات؟

بە دڵنیایی نەخێر، چونکە خوا ﷻ لە سوورەتی (یونس)دا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظْلِمُ ٱلنَّاسَ شَيْـًٔا وَلَٰكِنَّ ٱلنَّاسَ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾، بە دڵنیایی خوا

هیچ ئەندازەیەك ستەم لە خەڵك ناكات، بەڵام خۆیان ستەم لە خۆیان دەكەن، هەروەها لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە، كە لە صەحیحی موسلیمدایە، خوا لە فەرمایشتێكی قودسییدا دەفەرموێ: {**يَا عِبَادِي إِنِّي حَرَّمْتُ الظُّلْمَ عَلَى نَفْسِي وَجَعَلْتُهُ بَيْنَكُمْ مُحَرَّماً فَلاَ تَظَالَمُوا**} (**أخرجه مسلم: ٢٥٧٧، وابن حبان: ٦١٩، والحاكم: ٧٦٠٦، وقال: صحيح على شرط الشيخين**)، واتە: ئەی بەندەكانم! من ستەمم لە خۆم قەدەغە كردوەو، لە نێوان ئێوەشدا قەدەغەم كردوە، ئنجا ستەم لە یەكدی مەكەن.

ئەدی حیكمەتی بەكارهێنانی ئەو تەعبیرە چییە: ﴿وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّامٖ لِّلۡعَبِيدِ ﴾؟

حیكمەتەكەی ئەوەیە كە سیفەتەكانی خوا هەموویان لە لووتكەدان، ئنجا ئەگەر گریمان ستەمكردن یەكێك بووایە لە سیفەتەكانی خوا، ئەو كاتە خوا هەر (**ظَالِم**) نەدەبوو، بەڵكو (**ظَلَّام**) دەبوو، چونكە سیفەتەكانی خوا هەموویان لە لووتكەدان، بەڵام سیفەتەكانی خوا تەنیا سیفەتە باشەكانن، هەرچی تۆزقاڵێك بە لای خراپەدایە، بە دڵنیایی خوای پەروەردگار لێی دوورە، ئێمە كە دەڵێین: (**سُبْحَانَ اللهِ**) یانی: خوا بە دوور دەگرم، بە پاك دەگرم، لە هەرچی هەڵەو پەڵەو، ناتەواوییە، ئەگەر تۆزقاڵێكیش بێ، هەروەها كە دەڵێین: (**الحَمْدُ للهِ**)، واتە: ستایش بۆ خوا، ستایشی خوا دەكەم، واتە: هەرچی سیفەتی چاكەو، مەدح و سەنایە، هەمووی هی خوای پەروەردگارە.

ئنجا خوا ﷻ دێتە سەر بابەتێكی دیكە، دەفەرموێ:

٣)- ﴿إِلَيۡهِ يُرَدُّ عِلۡمُ ٱلسَّاعَةِ﴾، زانیاریی (**السَّاعَة**) بۆ لای وی دەگەڕێتەوە، یانی: (**إِلَيْهِ يُرْجَعُ عِلْمُ السَّاعَة**)، (**السَّاعَة**): بریتیە لە ئەندازەیەك لە كات، كە لە قورئاندا كراوە بە (**عَلَم**) ناوێكی ناسێنەر بۆ ئاخیر زەمان، هەندێك جاریش بۆ قیامەت و، هەندێك جاریش بۆ ڕۆژی دوایی بە هەردوو قۆناغی ئاخیر زەمان و، هەڵسانەوەوە، وشەی (**السَّاعَة**)

مانایەکەی بەپێی سیاقەکان دیاریی دەکرێ، بەڵام وشەی **(السَّاعَة)** لە خودی خۆیدا واتە: ماوەیەك لە كات، چ کەم بێت، چ زۆر بێت، کاتێکی دیارییکراو، کە لە قورئاندا کراوە بە ناوی ناسێنەر (**عَلَم**)، بە زۆریی بۆ ئەو کاتەیە کە ئەم ژیانەی تێدا کۆتا دێ، بە کوردیی دەڵێین: ئاخیر زەمان، دەشگوترێ: ڕۆژی پەسڵان، یانی: کۆتایی هاتنی ژیانی دنیا، جاری واش هەیە **(السَّاعَة)** بۆ قیامەتیش بەکاردەهێنرێ، واتە: هەڵسانەوەو، زیندووکرانەوە، جاری واش هەیە بۆ هەردووکیان بەکاردێ، واتە: بۆ ڕۆژی دوایی بە هەردوو قۆناغی تێکچوونی دنیاو، زیندووکرانەوەی مردووان، لە سووڕەتی (الزمر)دا کە پێشتر تەفسیرمان کرد، خوا ﷻ باسی هەردووکیان پێکەوە دەکات، دەفەرموێ: ﴿وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلْأَرْضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُ ۖ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَىٰ فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنظُرُونَ ﴿٦٨﴾﴾، واتە: فوو بە سووڕدا کرا، هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەبوو مرد، (یان لە هۆش خۆی چوو)، مەگەر ئەوەی خوا بیەوێ نەمرێ، (یان لە هۆش خۆی نەچێ)، دوایی فووێکی دیکەی پێداکرا، (واتە: بۆ جاری دووەم)، یەکسەر کتوپڕ هەموویان هەڵسابوون، چاوەڕێیان دەکرد، (کە مەبەست پێی قیامەتە).

زانیاریـی هاتنـی **(السَّـاعَة)** چ مەبەسـت ئاخیـر زەمـان بـێ، یـان مەبەسـت پێـی قیامـەت بـێ، یـان هەردووکیـان بـێ، تەنیـا بـۆ لای خـوا دەگێڕدرێتـەوە، واتـە: کەسـی دیکـە هیچـی لـێ نازانـێ، وەك لـە فەرمایشـتەکەی پێغەمبـەردا ﷺ کـە بـە (**حَدیـثُ جِبریـل**) نـاسراوە، کاتێـك کـە جیبریـل لـە شـێوەی پیاوێکـی نەنـاسراودا پرسـیار لـە پێغەمبـەر ﷺ دەکات، لـە بـارەی ئیسـلام و، ئیـمان و، ئیحسـانەوە، هەروەهـا دوایـی لـە بـارەی (**سـاعة**)ەوە پرسـیار دەکات: {**قَـالَ فَأَخْـبِرْنِي عَـنِ السَّـاعَةِ. قَـالَ النَّبـيُّ ﷺ: مَـا الْمَسْـئُولُ عَنْهَـا بِأَعْلَـمَ مِـنَ السَّـائِلِ**} (**أخرجـه مسـلم: ٨، وأبـو داود: ٤٦٩٥، والنسائـي: ١١٧٢١، والترمـذي: ٢٦١٠**)، گـوتی: هەواڵـم پێبـدە دەربـارەی دنیـا تێکچـوون، پێغەمبـەر ﷺ دەفەرمـوێ: پرسـیار لێکـراو لـە پرسـیارکەر پێـی زاناتـر نیـە، کـە هـاوەڵان نازانـن ئـەوە کـێ بـوو؟ دوایـی پێغەمبـەر ﷺ هەواڵیـان پـێ دەدات، دەفەرمـوێ: {**فَإِنَّـهُ جِبْرِيلُ أَتَاكُـمْ يُعَلِّمُكُـمْ دِينَكُـمْ**} واتـە: ئـەوە جیبریـل بـوو هاتبـوو ئاینەکەتانـی فێـر دەکـردن.

٤)- ﴿ وَمَا تَخْرُجُ مِن ثَمَرَٰتٍ مِّنْ أَكْمَامِهَا ﴾، هیچ کام لە میوەکان لە کیفەکانی خۆیان نایەنەدەر، (**أَكْمَام**) کۆی (**كِمّ**)، یان (**كُمّ**)ە، (**أي: الأوعِيَة**)، یانی: کیفەکان، کیف و بەرگی میوەکان، کە دەفەرموێ: ﴿ مِن ثَمَرَٰتٍ مِّنْ أَكْمَامِهَا ﴾، (**مِن**)ی یەکەم زیاد کراوە بۆ تەئکید کردن، واتە: هەر لە سەرەتای میوەکانەوە بگرە، تا کۆتاییان کە لە کیف و بەرگەکانی خۆیان دێنە دەرێ، (**مِن**)ی دووەم: ﴿ مِّنْ أَكْمَامِهَا ﴾، (**مِن**)ی دەستپێکردن (**إبْتِدائِيَّة**)ە، کە سەرەتا لە کیفەکەی دێتە دەرێ.

٥)- ﴿ وَمَا تَحْمِلُ مِنْ أُنثَىٰ وَلَا تَضَعُ إِلَّا بِعِلْمِهِۦ ﴾، هەروەها هیچ مێینەیەك تۆلدار نابێ، ئاوس نابێ و، تۆلەکەی دانانێ، مەگەر بە زانیاریی وی.

واتە: خوا ئاگای لە هەر میوەیەك هەیە کە لە کیفەکەی دێتە دەرێ، هەروەها ئاگای لە هەر مێینەیەك هەیە، چ هی مرۆڤان، ئافرەتان، چ هی ئاژەڵان، پەڕەوران، زیدەوەران و، هەمووو ئەوانەی تۆلدار دەبن و، دوایی تۆلەکەیان دادەنێن، سکەکەیان دەدانێن، خوای زانا بە هەموویان ئاگادارە، وشەی: ﴿ وَمَا تَحْمِلُ مِنْ أُنثَىٰ ﴾، ئەم (**مِن**)ەش زیاد کراوە بۆ جەختکردنەوە، واتە: هیچ مێینەیەك نیە هەر لە سەرەتاوە بگرە تاکو کۆتایی.

٦)- ﴿ وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ أَيْنَ شُرَكَآءِى ﴾، ئەو ڕۆژەش کە بانگیان دەکات، کوان هاوبەشەکانم؟ وشەی (**يَومَ**) وەك زۆرجار گوتوومانە پەیوەستە بە شتێکی قرتێنراوەوە، وەك (**اذْكُرْ يَومَ**)، یاد بکەوە ئەو ڕۆژە کە: ﴿ يُنَادِيهِمْ ﴾، بانگیان دەکات، کێ بانگیان دەکات؟ ڕەوتەکە باسی خوای بەرزی مەزنە، واتە: خوا بانگی هاوبەش بۆ خوادانەرەکان.

٧)- ﴿ قَالُوٓاْ ءَاذَنَّٰكَ مَا مِنَّا مِن شَهِيدٍ ﴾، گوتیان: ئاگادارمان کردوویەوە پێشتر هیچ کام لە ئێمە شایەد نیە، یانی: هیچ شایەدێك لە نێو ئێمەدا نیە لەسەر ئەوە کە تۆ هاوبەشت هەبێ.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ أَيۡنَ شُرَكَآءِي ﴾، کـوان هاوبەشـەکانم؟ ئـەم پرسـیارکردنە ڕوونکەرەوەیـە بـۆ وشـەی: ﴿ يُنَادِيهِمۡ ﴾، بانگیـان دەکات، بـۆ چییـان بانـگ دەکات؟ ئەمـە ڕوونـی دەکاتـەوە: ﴿ أَيۡنَ شُرَكَآءِي ﴾، بانگیـان دەکات دەفەرمـوێ: هاوبەشـەکانم لـە کوێـن؟ یاخـود: ﴿ أَيۡنَ شُرَكَآءِي ﴾، گوتـراوی قسـەیەکی قرتێـنراوە (**مقـول قـول محـذوف**)، وەك لـە سـوورەتی (**القصـص**)دا هاتـوە، کـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَيَوۡمَ يُنَادِيهِمۡ فَيَقُولُ أَيۡنَ شُرَكَآءِيَ ٱلَّذِينَ كُنتُمۡ تَزۡعُمُونَ ﴿٦٢﴾ ﴾، واتـە: ئـەو ڕۆژە کـە بانگیـان دەکات، دەفەرمـوێ: کـوان ئـەو هاوبەشانەم ئێـوە پێتـان وابـوو هاوبەشـمن؟

کەواتـە: ﴿ أَيۡنَ شُرَكَآءِي ﴾، یـان هـەر ڕوونکەرەوەیـە بـۆ: ﴿ يُنَادِيهِمۡ ﴾، یاخـود وشـەی (دەفەرمـوێ): (**يَقُولُ**)ی بـۆی (**تَقْديـر**) دەکـرێ کـە قرتێـنراوە، لەبـەر ئـەوەی سـیاق دەیگەیەنـێ، واتـە: ئـەو ڕۆژە کـە بانگیـان دەکات، دەفەرمـوێ: کـوان هاوبەشـەکانم؟ ﴿ قَالُوٓاْ ءَاذَنَّٰكَ مَا مِنَّا مِن شَهِيدٖ ﴾، ﴿ ءَاذَنَّٰكَ ﴾، یانـی: هەواڵـمان پێـداوی و ئاگادارمـان کردوویـەوە، ئەمـە هـی قۆناغێکـی دواتـرە، واتـە: پێشـتر ئـەی پەروەردگارمـان! ئاگادارمـان کردوویـەوە: ﴿ مَا مِنَّا مِن شَهِيدٖ ﴾، ئێمـە هیـچ بینەرێکـمان لـە نێـودا نیـە، یاخـود هیـچ گەواهییدەرێـك و شـایەدێکمان لـە نێـودا نیـە، شـایەدیی بـدات تـۆ هاوەبەشـت هەبـێ.

٨)- ﴿ وَضَلَّ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَدۡعُونَ مِن قَبۡلُ ﴾، ئەوەی پێشتر بانگیان دەکردو، لێی دەپاڕانەوە لێیان ونبوو، (**ضَلَّ أَي: غَابَ، وَضَاعَ**)، ونبوو، زایە بوو، لێیان پەنهان بوو، چونکە بوونێکی ڕاستەقینەی نەبوو، بوونێکی وەهمیی هەبوو لە مێشکی ئەواندا.

٩)- ﴿ وَظَنُّواْ مَا لَهُم مِّن مَّحِيصٖ ﴾، زانییان و، دڵنیابوون کە هیچ پەناگەیەکیان نیە، وەك پێشتریش باسمان کرد، (**ظَنّ**) بەپێی ئەو سیاقانەی تێیاندا دێ، مانایەکەی دیاریی دەکرێ، کە ئایا مەبەست پێی گومانە، یان دڵنیاییە، لە ڕۆژی دواییدا هاوبەش بۆ خوا دانەرو بێبڕوایەکان دڵنیا دەبن و، زانیاریی تەواویان دەبێ کە تازە گرفتار بوون و شوێنی

دەربازبوونیان نیە، کەواتە: لێرەدا (ظَنُّوا) بە مانای (گومان دەبەن) نیە، یانی: دڵنیا بوون کە هیچ پەناگەیەکیان نیە.

(المَحِيصُ: مَصْدَرٌ مِيمِيٌّ، أوِ اسْمُ مَكانٍ مِن: حَاصَ يَحِيصُ: إذا هَرَبَ، أيْ ما لَهم مَقَرٌّ مِنَ النّارِ وَمَلْجَأٌ)، وشەی (مَحِيص): یان چاوگێکی میمییە، یاخود ناوی شوێنە، یانی: هیچ دەربازبوونیان نیە، یاخود شوێنی دەربازبوونیان نیە، کەواتە: (مَحِيص): ئەگەر چاوگ بێ، یانی: دەربازبوون و قوتاربوون، بەڵام ئەگەر ناوی شوێن بێ، واتە: پەناگە، شوێنی لێ دەربازبوون و، شوێنی پەنا پێ گرتنیان نیە، لەو ڕۆژەدا دڵنیا دەبن و بەو شێوەیە دەکەونە گۆڕێ، بێ پشت و پەنا.

## مەسەلەی دووەم:

**مرۆڤ بۆ وەدەست خستنی چاکە زۆر خوازیارەو، داواکارە لە خواو، لە کاتی تووش بوونی زیان و ناڕەحەتییشدا زۆر بێ هیوایەو، لە کاتی پێ چێژرانی بەزەیی خواشدا، پاش خراپەو زیان، خۆهەڵکێش و لەخۆڕادیتوویە، بۆیە شایستەی سزایەکی بێڕەزایە، کە بێگومان لێرەدا مەبەست پێی مرۆڤی بێبڕوایە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿لَّا يَسْـَٔمُ ٱلْإِنسَـٰنُ مِن دُعَآءِ ٱلْخَيْرِ وَإِن مَّسَّهُ ٱلشَّرُّ فَيَـُٔوسٌ قَنُوطٌ ﴿٤٩﴾ وَلَئِنْ أَذَقْنَـٰهُ رَحْمَةً مِّنَّا مِنۢ بَعْدِ ضَرَّآءَ مَسَّتْهُ لَيَقُولَنَّ هَـٰذَا لِى وَمَآ أَظُنُّ ٱلسَّاعَةَ قَآئِمَةً وَلَئِن رُّجِعْتُ إِلَىٰ رَبِّىٓ إِنَّ لِى عِندَهُۥ لَلْحُسْنَىٰ ۚ فَلَنُنَبِّئَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِمَا عَمِلُوا۟ وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنْ عَذَابٍ غَلِيظٍ ﴿٥٠﴾ وَإِذَآ أَنْعَمْنَا عَلَى ٱلْإِنسَـٰنِ أَعْرَضَ وَنَـَٔا بِجَانِبِهِۦ وَإِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ فَذُو دُعَآءٍ عَرِيضٍ ﴿٥١﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە یازدە بڕگەدا:

١)- ﴿لَّا يَسْـَٔمُ ٱلْإِنسَـٰنُ مِن دُعَآءِ ٱلْخَيْرِ﴾، ئینسان لە پاڕانەوەی چاکە بێزار نابێ، یانی: (**لا يَسْئَمُ الإِنْسَانُ مِنْ دُعاءِ اللهِ بِالخَيْرِ**)، مرۆڤ لە لەخوا پاڕانەوە بۆ چاکە بێزار نابێ، ماندوو و شەکەت نابێ، (**السَّئَامَةُ المَلَالَةُ**) بە کوردیی دەبێتەوە بێزاریی و، شەکەت بوون و، وەڕەز بوون، وشەی: (**الإِنْسَان**)، هەرچەندە (أل)ی ناساندنی لەسەرە، بەڵام مەبەست پێی جینسی ئینسان نیە، تێکڕای مرۆڤان، چونکە هەموویان وانین، بەڵکو مەبەست پێی مرۆڤی بێبڕوایە، کەواتە: (أل)ەکە ئەگەر بۆ جینسیش بێ، واتە: جینسی ئینسانی کافر، یاخود ناساندنەکە بۆ (**عَهْد**)ە، واتە: مرۆڤەکە، یانی: مرۆڤی بێبڕوا.

٢)- ﴿وَإِن مَّسَّهُ ٱلشَّرُّ فَيَـُٔوسٌ قَنُوطٌ﴾، ئەگەر زیان و خراپەیەکی تووشبوو، زۆر نائومێدو بێ هیوایە، بۆچی خوا ﷻ هەردووکیانی بەکارهێناون، هەم: (**يَئْس**)، هەم (**قُنُوط**)ی بەکارهێناوە؟ دەڵێین: (**يَأْس**) بریتیە لەوە کە ئینسان بێ هیوا بێ و تەما

براوبێ، بەڵام (**قُنُوط**) ئەوەیە کە لە خێرو چاکە تەما براو بێ، حیکمەتی بەکارهێنانی ئەو دوو وشەیەش ئەوەیە: (**اليَأسُ: فِعْلٌ قَلْبِيٌّ وَالقُنُوطُ إِنْفِعَالٌ بَدَنِيٌّ مِنْ أَثَرِ اليَأسِ**)، (**يَأس**): بریتیە لە کردەوەیەکی دڵیی، بەڵام (**قُنُوط**) دەرکەوتنی ئەو حاڵەتە دەروونییەیە لەسەر دەم و چاو، ئەمە تەعبیرێکی جوانە.

٣)- ﴿ وَلَئِنْ أَذَقْنَاهُ رَحْمَةً مِّنَّا مِنْ بَعْدِ ضَرَّآءَ مَسَّتْهُ ﴾، ئەگەر ئێمە بەزەییەکی لە خۆمانەوە پێ بچێژین، دوای ئازارو زیان و نارەحەتییەك کە تووشیبووە.

٤)- ﴿ لَيَقُولَنَّ هَٰذَا لِي ﴾، زۆر بە دڵنیاییەوە، دەڵێ: ئەوە هی منەو من شایستەمی، ئەو رەحمەت و بەزەیی و خێرو خۆشییە کە هاتۆتە رێم، شایستەی منە.

٥)- ﴿ وَمَآ أَظُنُّ ٱلسَّاعَةَ قَآئِمَةً ﴾، پێشم وانیە کاتەکە (**السَّاعَةَ**)، بێت و، بەرپا ببێت، (**السَّاعَةَ**)، واتە: ئاخیر زەمان، یان رۆژی دوایی، یان قیامەت و هەڵسانەوە.

٦)- ﴿ وَلَئِن رُّجِعْتُ إِلَىٰ رَبِّيٓ ﴾، ئەگەر بگێردرێمەوە بۆ لای پەروەردگاریشم.

٧)- ﴿ إِنَّ لِي عِندَهُۥ لَلْحُسْنَىٰ ﴾، بە دڵنیایی بۆ من لە لای خوا هەرە باشتر، هەیە، واتە: پاداشتی هەرە باشترو، حاڵەتی هەرە باشتر، چونکە (**حُسْنَى: صِفَةُ مَوصوفٍ مَحْذوفٍ**)، (**حُسنى**) سیفەتی وەسفکراوێکی قرتێنراوە، واتە: (**لَلْخَصْلَةُ الحُسْنَى**)، یان (**لَلْحَالَةُ الحُسْنَى**)، یان (**لَلْمَثُوبَةُ الحُسْنَى**)، حاڵەتی باشتر، یان سیفەتی باشتر، یاخود پاداشتی هەرە باشتر بۆ من هەیە لە لای خوا.

٨)- ﴿ فَلَنُنَبِّئَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِمَا عَمِلُواْ ﴾، بە دڵنیایی و بە جەختکردنەوەوە ئەوانەی بێبڕوان، هەواڵیان پێ دەدەین بەوەی کردوویانە.

٩)- ﴿ وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنْ عَذَابٍ غَلِيظٍ ﴾، لە ئازارو سزایەکی ئەستوورو زەبەلاح و بێرەزاشیان پێ دەچێژین، (**الغَلِيظُ: الصَّلْبُ**)، وشەی (**غَلِيظٍ**) یانی: پتەوو رەق، کە دەگونجێ بڵێین: بێرەزا، یان زبر، یان زەبەلاح، هەمووی دەگرێتەوە.

لێرەدا پێویستە چەند سەرنجێکی ڕەوانبێژیی بدەین:

أ- کە دەفەرموێ: ﴿لَّا يَسْـَٔمُ ٱلْإِنسَـٰنُ مِن دُعَآءِ ٱلْخَيْرِ﴾، ﴿لَّا يَسْـَٔمُ﴾، ئەمە تەعبیرکردنە لەوە کە مرۆڤ بەردەوام داوای چاکە دەکات، ﴿مِن دُعَآءِ ٱلْخَيْرِ﴾، مرۆڤی بێبڕوا چی چاکە زیاتر خوازیاری ئەوەیە، بەڵام: ﴿وَإِن مَّسَّهُ ٱلشَّرُّ﴾، (مَسّ) ئەوەیە کە شتێك بگاتە شتێك بە ئاستەم، واتە: ئەگەر تۆزێ ناڕەحەتیی و ئازاری تووش ببێ، ﴿فَيَـُٔوسٌ قَنُوطٌ﴾، نائومێد دەبێ و، نائومێدییەکەش لەسەر دەم و چاوو ڕواڵەتی دەردەکەوێ، ﴿وَلَئِنْ أَذَقْنَـٰهُ رَحْمَةً مِّنَّا مِنۢ بَعْدِ ضَرَّآءَ مَسَّتْهُ﴾، ئەگەر ئێمە بەزەییەکی لەخۆمانەوە پێ بچێژین، لە دوای ئازارو زیانێك کە تووشی بووە، واتە: هەر کە بە ئاستەم ئازارو زیانی تووش بوو، دوای ئەوەی بەزەییمان پێ چێژت - بەزەیی خواش ﷻ بەرجەستە دەبێتەوە لە نازو نیعمەت و خۆشییەکاندا، لەو شتانەدا کە مرۆڤ پێیخۆشن - ئەوە لەو حاڵەتەدا لە جیاتی ئەوەی ئەو نیعمەتە بگێڕێتەوە بۆ لای خوا، دەڵێ: ﴿هَـٰذَا لِى﴾، بۆیە ئەوەم هاتۆتە دەست، چونکە شایستەم، ئنجا بەو نیعمەتەی خوا، کە خوا پێی چێژتوە، هێندە لە خۆی بایی دەبێ، یەکسەر نکوولییش دەکات لە ڕۆژی دوایی، کە ڕۆژی سزاو پاداشتە، بۆیە دەڵێ: ﴿وَمَآ أَظُنُّ ٱلسَّاعَةَ قَآئِمَةً﴾، پێشم وانیە قیامەتیش بەرپا ببێ، کە دەڵێ: ﴿وَلَئِن رُّجِعْتُ إِلَىٰ رَبِّىٓ﴾، (إنِ الشَّرْطِيَّة الَّتِي يَغْلِبُ وُقُوعُهَا فِي شَرْطِ المَشْكُوكِ وُقُوعُهُ)، واتە: (إنِ الشَّرْطِيَّة)، بە زۆریی دەچێتە سەر مەرجێك کە دوو دڵیی هەبێ لەوەدا کە پەیدادەبێ، یان نا؟ ﴿وَلَئِن رُّجِعْتُ إِلَىٰ رَبِّىٓ﴾، ئەگەر گریمان گێڕدرامەوە، واتە: زۆر دوو دڵییشم لەوەدا کە بگێڕدرێمەوە بۆ لای پەروەردگارم، بەڵام ئەگەر گریمان گێڕدرامەوەش، ﴿إِنَّ لِى عِندَهُۥ لَلْحُسْنَىٰ﴾، هەم بە: (إنَّ)ە، کە بۆ جەختکردنەوەو داکۆکییکردنە، ﴿عِندَهُۥ لَلْحُسْنَىٰ﴾، دیسان (ل)یش بۆ دڵنیاکردنەوەیە، زۆر بە دڵنیاییەوە چی چاکترە بۆ من لە لای خوا هەیە.

ب- کە خوا دەفەرموێ: ﴿فَلَنُنَبِّئَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِمَا عَمِلُوا۟﴾، ئەمە: (إظْهَارٌ فِي مَقَامِ الإِضْمَار)، دەرخستنە لە شوێنی پەنهانکردن، خوا ﷻ دەیتوانی بفەرموێ: (فَلَنُنَبِّئَنَّهُمْ)،

بێگومان هەواڵیان پێ دەدەین، بەڵام دەفەرموێ: ﴿ فَلَنُنَبِّئَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِمَا عَمِلُواْ ﴾، هەواڵ دەدەینە ئەوانەی بێبڕوا بوون بەوەی کردوویانە، کە دەفەرموێ: هەواڵیان پێدەدەین، یانی: دەفەرموێ: ئەوە کردەوەکانتانن، کەواتە: شایستەی ئەو سزایەشن، نەك شایستەی ئەو پاداشتە بن کە خەیاڵپلاوتان پێوە دەکرد، ﴿ وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنْ عَذَابٍ غَلِيظٍ ﴾، وشەی (غَلِيظٍ): زیاتر بۆ شتی جەستەیی بەکاردەهێنرێ، شتی ماددیی و بەرهەست، بەڵام لێرەدا خوازراوەتەوە بۆ ئەو سزایەی خوا، دەشگونجێ سزایەکە هەر وشەی (غَلِيظٍ)، بۆ مانا ڕواڵەتییەکەی بۆ بەکاربهێنرێ، واتە: سزایەکی زەبەلاحیی بێڕەزا.

ج- کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِن مَّسَّهُ ٱلشَّرُّ ﴾، وشەی (مَسّ): (أَصَابَهُ إِصَابَةٌ خَفِيفَةٌ)، واتە: بە سووکیی تووشیبوو، چونکە (مَسّ) ئەوەیە بە ئاستەم دەست بگەیەنیە شتێك، ئەگەر بە ئاستەم ئازارێکی تووشبوو، ئەوە هەم لە پێشێش دا هاتوەو، هەم لە دواییشدا هاتوە.

دوایی دەفەرموێ:

١٠)- ﴿ وَإِذَآ أَنْعَمْنَا عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ أَعْرَضَ وَنَـَٔا بِجَانِبِهِۦ ﴾، کاتێك ئێمە چاکە لەگەڵ مرۆڤدا بکەین، پشت هەڵدەکات و تەنیشتی خۆی دوور دەگرێ.

مرۆڤ لێرەدا بە گشتیی هاتوە، بەڵام ئەوەی پێشێ بە دڵنیایی مەبەست پێی مرۆڤی بێبڕوا بوو، چونکە نکووڵییکردن لە ڕۆژی قیامەت و، هەموو شتێك گێڕانەوە بۆ خۆو، نادیدەگرتنی خوا، ئەوە ئینسانی بێبڕوا عادەتی وایە، بەڵام ئەمەیان دەگونجێ هەر مەبەست پێی ئینسانی بێبڕوابێ و دەشگونجێ مرۆڤ بێ بە گشتیی، چونکە لەگەڵ مرۆڤاندا بە گشتیی دەگونجێ، ﴿ وَإِذَآ أَنْعَمْنَا عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ أَعْرَضَ وَنَـَٔا بِجَانِبِهِۦ ﴾، ئەگەر چاکەمان لەگەڵ مرۆڤدا کرد، پشت هەڵ دەکات و، تەنیشتی خۆی دوور دەگرێ.

١١)- ﴿ وَإِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ فَذُو دُعَآءٍ عَرِيضٍ ﴾، ئەگەر ناڕەحەتییەکیشی تووشبوو، دوعایەکی پان و بەرین دەکات، ئەمە لەگەڵ ئینسانی مسوڵمانیشدا دەگونجێ، مسوڵمانێك کە ئیمانەکەی مەحکەم و دامەزراو نەبێ، کە لە کاتی نازو نیعمەتدا بوغڕا دەبێ و، لە کاتی نەهات و ناڕەحەتییانیشدا زۆر وەهەڵپە دەکەوێ و، دەست دەکات بە پاڕانەوەی دوورو درێژ لە خزمەت خوادا، ئەوە دەگونجێ مەبەست پێی ئینسانی مسوڵمانیش بێ، بەڵام بە تەئکید کە خوا ﷻ لێرەدا ئەم حاڵەتە باس دەکات، حاڵەتی سەرزەنشتکردنە، واتە: تۆ کە خوا چاکەیەکت لەگەڵدا دەکات، نابێ پێی بوغڕابی و، خۆت دوور بگری و، فیزو کەشخەی پێوە بکەی، چونکە ﴿ أَعْرَضَ وَنَـَٔا بِجَانِبِهِۦ ﴾، ڕووی وەرگێڕاو تەنیشتی خۆی دوورخستەوە، ئەمە مەبەست پێی بوغڕابوون و، لە خۆبایی بوون و، فیزو کەشخەو دەمار پێکردنە، بە تایبەتی وشەی (**الإِعْرَاضُ: الإِنْصِرَافُ عَنْ شَيْءٍ، وَهُوَ مُسْتَعَارٌ هُنَا لِلْغَفْلَةِ عَنْ شُكْرِ الْمُنْعِمِ، أَوِ التَّعَمُّدِ لِتَرْكِ الشُّكْرِ**)، (**إِعْراض**): بە مانای وازهێنانە لە شتیك، بەڵام لێرە خوازراوەتەوە بۆ بێ ئاگایی لە سوپاسکردنی خاوەن چاکە، کە خوایە، یاخود هەر بە ئانقەست سوپاسگوزاریی نەکردن، دواییش کە دەفەرموێ: ﴿ وَنَـَٔا بِجَانِبِهِۦ ﴾، تەنیشتی خۆی دوورخستەوە، ئەمە تەعبیرێکە بۆ فیزو کەشخە نواندن بەسەر مرۆڤەکاندا، واتە: تەنیشتی خۆی، کەلەکەی خۆی دوورخستەوە، (**وَهُوَ كِنايَةٌ عَنْ إِبْعادِ نَفْسِهِ**)، ئەمە کنارەیە لە خۆ دوور خستنەوە.

بەڵام بە بۆ چوونی من کنارەیە بۆ فیزو کەشخەو دەمارکردن.

﴿ وَإِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ فَذُو دُعَآءٍ عَرِيضٍ ﴾، ئەگەر بە ئاستەم ناڕەحەتییەکی تووش بوو، دوعایەکی پان و بەرین دەکات، کە دەفەرموێ: ﴿ فَذُو دُعَآءٍ ﴾، خاوەنی پاڕانەوەیەکی فراوانە، نەیفەرمووە: (**يَدْعُ دُعَاءً عَرِيضاً**)، پاڕانەوەیەکی فراوان دەکات، بەڵکو دەفەرموێ: ﴿ فَذُو دُعَآءٍ عَرِيضٍ ﴾، واتە: زۆر دەپاڕێتەوەو دوعای دوورو درێژ دەکات لە کاتی ناڕەحەتییاندا، وەك پاڕانەوەو داوا لە خوا کردن لەو حاڵەتەدا، ئەو مرۆڤە بۆتە خاوەنی، چونکە (**ذُو**)، یانی: (**صَاحِب**)، (**عَرِيض**)یش، یانی: بەرین، کە پێچەوانەی درێژییە، ئنجا شتێك کە پان و بەرین بێ، مانای

وایە پانتاییەکەی زۆرە، پاڕانەوەیەك کە خاوەنەکەی لەسەری بەردەوام بێ و، زۆر داوا بکات، لێرەدا چوێنراوە بە شوێنێکی پان و بەرین و فەڕاحەوە، ئنجا شتێك ئەگەر پانابیەکەی زۆر بێ، مانای وایە درێژاییەکەشی هەر زۆرە.

## مەسەلەی سێیەم و کۆتایی:

**فەرمانکردن بە پێغەمبەری خوا ﷺ کە لێیان بپرسێ: ئایا ئەگەر قورئان لەلایەن خواوە هاتبێ و، ئەوانیش پێی بێبڕوابن، چ زیانێکی مەزن دەکەن بەهۆی دووبەرەکیی و دوورییانەوە لە دژی قورئان، پاشان ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە خوای زاناو توانا بەردەوام نیشانەکانی خۆی، کە بەڵگەی ڕاستیی قورئانن، پێشانی خەڵك دەدات لە گەردوون داو، لە خودی خۆشیاندا، بێبڕوایانیش لە دیداری خوادا دوو دڵن، هەرچەندە خوا دەورە دەری هەموو شتێکە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن كَانَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ثُمَّ كَفَرْتُم بِهِۦ مَنْ أَضَلُّ مِمَّنْ هُوَ فِى شِقَاقٍۭ بَعِيدٍ ﴿٥٢﴾ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ۗ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿٥٣﴾ أَلَآ إِنَّهُمْ فِى مِرْيَةٍ مِّن لِّقَآءِ رَبِّهِمْ ۗ أَلَآ إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَىْءٍ مُّحِيطٌۢ ﴿٥٤﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:

١)- ﴿ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن كَانَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ﴾، ئایا دەبینن (بە چاوی عەقڵ و دڵ)؟ ئایا دەزانن؟ ئەگەر لە لایەن خواوە بوو، بێگومان (**كان**) ڕاناوەکەی دەچێتەوە بۆ قورئان، چونکە باس باسی قورئانە، واتە: هەواڵم پێ بدەن، یاخود ئایا دەزانن؟ ئەگەر قورئان لەلایەن خواوە بوو.

٢)- ﴿ ثُمَّ كَفَرْتُم بِهِۦ ﴾، ئنجا ئێوەش پێی بێبڕوا بوون، (**ثم**): (**لِلتَّراخِي الرُّتْبِيِّ؛ لِأَنَّ الكُفْرَ بِمَا هُوَ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ، أَخْطَرُ مِن كَوْنِ القُرْآنِ مِن عِنْدِ اللَّهِ**) واتە: (**ثُمَّ**)، لێرەدا بۆ ڕیزبەندیی پلە پلەییەو، بۆ ڕیزبەندیی بە کاوەخۆو بەدوادا هاتنیشە، چونکە بێبڕوایی بەوەی لەلایەن خواوەیە مەترسیدارترە، یاخود شتێکی گەورەترە لەوە کە قورئان لەلایەن خواوە بێ، قورئان لەلایەن خواوە بێ، شتێکی گەورەیە، بەڵام لەوە گەورەتر ئەوەیە کە مرۆڤ پێی بێبڕوابێ، بۆیە بە: (**ثُمَّ**)، هێناویەتی.

٣)- ﴿مَنْ أَضَلُّ مِمَّنْ هُوَ فِي شِقَاقٍ بَعِيدٍ﴾، کێ گومڕاترە لە کەسێك لە دووبەرەکییەکی دووردایە، (**شِقَاق**) بە مانای (**خِلاف**)دێ، واتە: دووبەرەکیی و ڕاجیایی، هەروەها بە مانای سەرپێچییش دێ، کە دەفەرموێ: ﴿بَعِيدٍ﴾، واتە: لە دووبەرەکیی و دژایەتییەکەدا زۆر دوورکەوتۆتەوەو، زۆر ڕۆیشتوە، کەواتە: ﴿مَنْ أَضَلُّ مِمَّنْ هُوَ فِي شِقَاقٍ بَعِيدٍ ﴿٥٢﴾﴾، یانی: (**مَنْ أَضَلُّ مِنْكُمْ**)، کێ لە ئێوە گومڕاترە؟! کە بە قورئان بێبڕوایە دوای ئەوەی دەزانن لەلایەن خواوەیە، کێ لە ئێوە گومڕاترە؟! کە لە حاڵەتی دووبەرەکیی و دژایەتییەکی دووردان لە دژی قورئان؟ ﴿مَنْ أَضَلُّ﴾، (**مَنِ الأُولى لِلإِسْتِفْهامِ وهو مُسْتَعْمَلٌ فِي مَعْنى النَّفْيِ، أَي: لا أَضَلَّ مِمَّنْ هو فِي شِقاقٍ بَعِيدٍ**)، (**مَنْ**)ی یەکەم بۆ پرسیارکردنەو لە مانای (لابردن)دا بەکارهێنراوە، واتە: هیچکەس گومڕاتر نیە لەو کەسەی لە دووبەرەکییەکی دووردایە، بەڵام (**مَنْ**)ی دووەم ﴿مِمَّنْ﴾ کە (**مِنْ**)ی چۆتە سەرێ، (**مَنْ**)ی (**مَوصُولَة**)یە، یانی: (**مَنْ أَضَلُّ مِنَ الَّذي هُوَ فِي شِقَاقٍ بَعِيد**)، واتە: کێ گومڕاترە لە کەسێك کە لە دووبەرەکییەکی دووردایە.

لێرەدا خوا ﷻ دەیخاتە بەرچاویان کە هیچکەس لە ئێوە گومڕاتر نیە، ئەی بێبڕوایەکان! دوای ئەوەی بەردەوام خوا ﷻ نیشانەکانی خۆی لە ئاسۆیەکان و، لە خودی مرۆڤیشدا پێشان دەدات، لەسەر هەقانیەتیی قورئان، ئنجا هیچکەس لە ئێوە گومڕاتر نیە کە ئێوە بە قورئان بێبڕوابن و، تێیدا لە حاڵەتی دووبەرەکیی و دژایەتییدابن، چونکە ئەوان هەر بە ئەوەندەیان واز نەهێناوە کە پێی بێبڕوابن، بەڵکو دژایەتییشیان کردوە، بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿مَنْ أَضَلُّ مِمَّنْ هُوَ فِي شِقَاقٍ بَعِيدٍ﴾، نەیفەرمووە: (**مَنْ أَضَلُّ مِنْكُمْ**)، چونکە پێشێ فەرموویەتی: پێی بێبڕوابوون، خوای قسە لەجێ ئەم تەعبیرەی بەکارهێناوە، تاکو بزانرێ، وێڕای پێ بێبڕوابوون، دژایەتیی و، دووبەرەکییشیان کردوە بۆ قورئان.

لە کۆتاییدا خوا دەفەرموێ:

٤)- ﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ﴾، لەمەودوا نیشانەکانی خۆمانیان لە ئاسۆیەکان و، لە خودی خۆشیاندا پێشان دەدەین.

٥)- ﴿ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ﴾، تاکو ئەو کاتەی بۆیان دەردەکەوێ، کە ئەو هەقەو چەسپاوە، (أَنَّهُ) ڕاناوەکەی بۆ قورئان دەچێتەوە، دەشگونجێ بۆ خوای بەرزی مەزن بچێتەوە، واتە: کە خوا هەقە، دەشگونجێ بۆ پێغەمبەر ﷺ بچێتەوە، کە پێغەمبەری خوا هەقەو ڕاستەو، ڕەوانەکراوی خوایە، بەڵام لە هەموویان وێچووتر، ئەوەیە کە بۆ قورئان بچێتەوە، چونکە ڕەوتەکە باسی قورئان دەکات.

٦)- ﴿ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ ﴾، ئایا بەس نیە بۆ پەروەردگارت کە بەسەر هەموو شتێکەوە چاودێرە؟! ئەم تەعبیرە دەگونجێ بە چەند شێوەیەك مانا بکرێ:

أ- (أَوَلَمْ تَكْفِكَ شَهَادَةُ رَبِّك)، واتە: ئایا بۆ تۆ بەس نیە کە پەروەردگارت شایەد بێ لەسەر ڕاستیی قورئان؟!

ب- (أَوَلَمْ تَحْصُلِ الكِفَايَةُ بِرَبِّكَ)، واتە: ئایا کیفایەت پەیدا نەبووە بە پەروەردگارت، بە شایەدیی دانی پەروەردگارت؟!

ج- ئایا بۆ ئەوان بەس نیە بۆ سەلماندنی ئەوە کە قورئان هەقەو، تۆ ڕاستی (ئەی موحەممەد!)، کە پەروەردگارت بەسەر هەموو شتێکەوە چاودێرە؟!

٧)- ﴿ أَلَآ إِنَّهُمْ فِى مِرْيَةٍ مِّن لِّقَآءِ رَبِّهِمْ ﴾، ئاگاداربن، ئەها! ئەوان لە دوو دڵییدان لە دیداری پەروەردگاریان، (المِرْيَةُ: الشَّكُّ المُزْعِج)، (مِرْيَةٍ): بە مانای دوو دڵییەکی بێزارکەر دێ.

٨)- ﴿ أَلَآ إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَيْءٍ مُّحِيطٌۢ ﴾، ئەها، ئاگاداربن! ئەو دەورەدەری هەموو شتێکە، واتە: خوا ﷻ بە زانیاریی و بە دەسەڵاتی و، بە هەموو ئەو واتایانەی بۆ خوا شایستەن، دەورەی هەموو شتێکی داوەو، بەسەر هەموو شتێکدا باڵادەستە، چونکە هەموو شتێك بریتیە لە دروستکراوی خۆی.

## کورتە باسێک لە بارەی دەرکەوتنی بەردەوامی نیشانەکانی خواوە ﷻ لە ئاسۆیەکان و لە خودی مرۆڤانیشدا:

خـوا ﷻ کـە ڕایگەیانـدووەو دەفەرمـوێ: ﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ۗ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿٥٣﴾ ﴾.

لـە ڕاسـتییدا ئـەم ئایەتـە موبارەکـە ئیعجازێکـی زانسـتیی زۆر گشـتگیری تێدایـە، واتــە: هەندێـك ئایـەت هـەن، ئیعجازێکـی زانسـتیی بەشـیی (جزئي)یـان تێدایـە، دەربـارەی سـووڕانەوەی زەوی و، دەربـارەی خڕیەتیـی زەوی و، دەربـارەی هاتنـی شـەوو ڕۆژو پێچرانیـان بـە دەوری زەویـدا، هەروەهـا دەربـارەی سـەرەتای دروسـت بوونـی گـەردوون و، کۆتایـی گـەردوون و، دەربـارەی سـەرەتای دروسـتبوونی ژیـان و، زۆر شـتی دیکـە، بـەڵام ئـەم ئایەتـە موبارەکـە ئیعجازێکـی زانسـتیی گشـتگیری تێدایە، چونکـە خـوا زۆر بـە جەختکردنـەوەوە دەفەرمـوێ: بێگومـان لەمـەودا نیشـانەکانی خۆمانیـان پێشـان دەدەیـن لـە ئاسـۆیەکان (لـە گـەردوون)و، لـە خـودی خۆشـیاندا، تاکـو بۆیـان دەرکـەوێ کـە قورئـان هەقـە، واتـە: ئـەو قورئانـە کـە باسـی مـرۆڤ دەکات، واتــە: جەسـتەی مـرۆڤ و، ڕووحـی مـرۆڤ، هەروەهـا باسـی گـەردوون دەکات، تاکـو زانسـت زیاتـر بـەرەو پێشـەوە بچـێ، ئـەو ئاماژانـەی قورئـان کردوونـی بـە گـەردوون و، بـە مـرۆڤ، زیاتـر، ڕاسـتییان دەسـەلمێنێ، ئەوانـەش نیشـانەی خـوان ﷻ لەسـەر ڕاسـتیی قورئـان.

لە چوار کورتە بڕگەدا، ئەم باسە دەخەینە ڕوو:

**١- ئایینی ڕاست و نەگۆڕدراوی خوا ﷻ فەرمایشتی خوایەو، ناگونجێ لەگەڵ وەسفی ڕاست و دروستی دروستکراوەکانیدا تێکبگیرێ:**

وەحیـی خـوا ئەگـەر نەگۆڕدرابـێ و، دەسـتکاریی نەکرابـێ، دیـارە فەرمایشـتی خوایـە، فەرمایشـتی خـواش ناگونجـێ لەگـەڵ زانسـت دا تێکبگیـرێ، زانسـت بریتیە لە چـی؟ زانسـت بریتیـە لـە وەسـفکردنی دروسـتکراوەکانی خـوا، ئنجـا فەرمایشـتی خـوا لەگـەڵ کردەوەکەیـداو، لەگـەڵ دروسـتکراوەکەیدا چـۆن تێکدەگیـرێ؟! ئاییـن ئەگـەر نەگۆڕدرابـێ و، دەسـتکاریی نەکرابـێ، وەحیـی خـواو فەرمایشـتی خوایـە، زانسـتیش باسـی دروسـتکراوی خوایـە، ئایینـی خـواش بەنسـبەت ئێسـتای مرۆڤایەتییـەوە ئاینێـك لێـی دڵنیـا بـی هـی خوایـەو، دەسـتکاریی نەکـراوە، تەنیـا ئیسـلامە کـە لـە قورئانـدا بەرجەسـتەیە، قورئانیـش فەرمایشـتی خوایـە، خـوا ﷻ لـە سـوورەتی **(التوبـة)** لـە ئایەتـی ژمـارە (٦)دا دەفەرمـوێ: ﴿ وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ٱسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَـٰمَ ٱللَّهِ ﴾، واتـە: ئەگـەر یەکێـك لـە هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەران داوای پەنـا پێبردنی لێکـردی، پەنـای بـدە، بـۆ ئـەوەی گوێـی لـە فەرمایشـتی خوابـێ، واتـە: قورئـان فەرمایشـتی خوایـە، بێـژراوی خوایـە.

هەروەهـا لـە سـوورەتی **(الأنعـام)** لـە ئایەتـی ژمـارە (١١٥)دا، دەفەرمـوێ: ﴿ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا ﴾، فەرمایشـتی پـەروەردگارت تـەواوی کـردوە لـە ڕاسـتیی و دادگەرییـدا.

بـە نسـبەت گەردوونیشـەوە، کـە ئەویـش دروسـتکراویی خوایـەو، بەدیهێـنراوی خوایـە، ئایـەت زۆرن لـەو بـارەوە، بـۆ وێنـە: خـوا ﷻ لـە سـوورەتی (لقـمان)دا دەفەرمـوێ: ﴿ خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا ۖ وَأَلْقَىٰ فِى ٱلْأَرْضِ رَوَٰسِىَ أَن تَمِيدَ بِكُمْ وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَآبَّةٍ ۚ وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَنۢبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍ كَرِيمٍ ﴿١٠﴾ هَـٰذَا خَلْقُ ٱللَّهِ فَأَرُونِى مَاذَا خَلَقَ ٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦ ۚ بَلِ ٱلظَّـٰلِمُونَ فِى ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ ﴿١١﴾ ﴾، واتـە: خـوا ئاسـمانەکانی هێناونـە دی، بەبـێ کۆڵەکانێـك کـە

بیانبینن، (یاخود بە چەند کۆڵەکەیەك کە نەبینراون و، نایانبینن، کە مەبەستی هێزی کێشندەیە)، هەروەها چیا قورسەکانی خستوونە نێو زەوی، بۆ ئەوەی لە ژێرتاندا نەجووڵێ و، لە هەموو زیندەوەرێکی تێدا بڵاوکردۆتەوەو، لەسەرێوە ئاومان دابەزاندوە، هەر جۆرە ڕووەکێکی بەرهەمدارمان پێ ڕواندوە، ئەوە دروستکراوی خوایە، پێشانم بدەن، ئەوانی دیکەی جگە لەو (کە دەیانپەرستن)، چییان دروستکردوە؟! (دەنکە لمێك، پەرە مریشکێك، لقە دارێك) ﴿ بَلِ ٱلظَّـٰلِمُونَ فِى ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ ﴾، بەڵکو ستەمکاران لە گومڕاییەکی ئاشکرادان.

کەواتە: دوو کتێبەکەی خوا: کتێبە بیستراوەکەی کە قورئانەو، کتێبە بینراوەکەی کە گەردوونە (**كِتـابُ اللهِ المَسْموع، وَ كِتـابُ اللهِ المَنْظُور**)، ناگونجێ پێکەوە دژ بوەستن، کەواتە: تاکو زانست بەرەو پێشەوە بچێ، ڕاستیی و هەقانیەتیی ئایین و بەرنامەی خوا کە لە قورئاندا بەرجەستەیە، زیاتر دەردەکەوێ، هەڵبەتە ڕێبازی پێغەمبەری خواش ﷺ، ئەویش هەر بەرجەستەکردنی قورئانە لەسەر ئەرزی واقیع و، چۆنیەتیی کارپێکردنی قورئانە.

**٢- ئەوانەی تێکدەگیرێن: ئایینی گۆڕدراوو، زانیاریی تەواو، یاخود ئایینی تەواوو، بە ناو زانیاریی بە زانیاریی دانراون:**

تێکگیران و دژیەکیی (**تناقـض**) کاتێك ڕوو دەدات کە یان ئایینەکە گۆڕدرابێ، بەڵام زانیارییەکە تەواوبێ، یاخود ئایینەکە تەواوبێ، بەڵام ئەوەی بە زانیاریی دانراوە، زانیاریی نەبێت و ناتەواوبێ، هەر بۆیە کاتی خۆی لە سەدەکانی نێوەڕاستدا وەك لە مەوسووعەی: (درەوشاوەیی ئیمان و پووچەڵیی ئیلحاد)دا بە درێژیی سەرگوزشتەی سەرهەڵدانی ئیلحاد لە ئەورووپاو ڕۆژئاوامان دا باس کردوە، کە چۆن دژایەتیی و ناکۆکیی و دووبەرەکیی لەنێوان ڕەوتی زانست و ئایینی کڵێسادا، نەك ئایینی مەسیح، کە لە دوای مەسیح ﷺ دەستکاریی کرا بوو، گۆڕدرا بوو، ئەو دژایەتیی و ناکۆکیی و دووبەرەکییە چۆن پەیدابوو؟ کە ئەوە بەسەرهاتێکی دوورو درێژە، چونکە ئایینەکە گۆڕدرابوو، بەڵام زانیارییەکە بە زۆریی تەواو بوو، ئەویش نەك هەمووی،

بەڵام ئایینەکە گۆڕدرابوو و تێکدرابوو، ئێستا هەندێك جار هەندێك شت بە ناوی زانیارییەوە دەگوترێ، بۆ وێنە: بیردۆزەی داریۆنیزم، یان فرۆیدیزم، یان مارکسیزم، ئەو بیردۆزانە کە لەگەڵ قورئاندا تێك دەگیرێن، لەبەر ئەوەی ئەوانە بە ناو زانیاریی ناتەواون، لەگەڵ ئایینی تێرو تەواودا تێك دەگیرێن، ئەگەرنا هیچ ڕاستییەکی زانستیی نیە، لەگەڵ وەحیی دەستکاریی نەکراو و، نەگۆڕدراودا تێك بگیرێ، یانی: لە ئێستاوە تاکو قیامەت دێ، کەسێك لێی بکۆڵێتەوە ڕاستییەکی زانستیی، کە سەلمێنرابێ ئەوە ڕاستییەکی زانستییە لە قۆناغی بیردۆزەو تیۆریی هەڵبردوە، هەرگیز ڕاستییەکی زانستیی نابینی کە لەگەڵ ئایەتێکی قورئاندا دژ بوەستێ، یان لەگەڵ دەقێکی سوننەتی پێغەمبەردا ﷺ کە بە ڕاستیی سەنەدەکەی ڕاست بێت و پەیوەست بێ بە پێغەمبەرەوە ﷺ چ فەرمایشتی بێ، چ کردەوەی بێ، چ دانپێداهێنانی بێ.

**٣- بە پێی ئایەتی: ﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ﴾، بەردەوام و بەبێ پسانەوە، زانست هەر بەرەو پێش دەچێ و، هەتا زانیارییش بەرەو پێشتر بچێ، ڕاستیی قورئان ئاشکراتر دەبێ:**

کەواتە: ئەمەش موژدەیەکی خۆشە بۆ هەموو ئەوانەی عەوداڵی زانستن و، شەیدای دەرکەوتنی ڕاستییەکانن، شەیدای ئەوەن کە لە نهێنییەکانی خۆیان و دەوروبەریان و، گەردوون زیاتر بەهرەمەندبن، با دڵنیابن، بەپێی ئەم ئایەتە موبارەکە، بەردەوام نهێنییەکانی گەردوون و، نهێنییەکانی خودی مرۆڤیش، زیاتر دەردەکەون، کە دواجاریش دەبن بە نیشانەی ڕاستییەتی قورئان و، نیشانەی ڕاستییەتی خوا ﷻ و، ڕاستییەتی پێغەمبەری خاتەم ﷺ.

چونکە وەك پێشتر گوتمان (س)ی سەر: ﴿ سَنُرِيهِمْ ﴾، لەمەودوا نیشانەکانیانمان پیشان دەدەین، سەردەمی پێغەمبەر ﷺ گوتوویانە: لە مەودوا، چونکە ئایەتەکە دەفەرموێ: لە مەودوا، بۆ ئێستاش کە دەیخوێنینەوە هەر بە مانای لە مەودوا دێ، کەواتە: بەپێی ئەو ئایەتە بەردەوام ڕاستییە زانستییەکان کەشف دەبن و دەردەکەون و، دەبنە بەڵگەش لەسەر ڕاستییەتی قورئان.

**٤- زانایانی پێشووش ئاماژەیان بەو ڕاستییە مەزنە کردوە:**

بـۆ وێنـە: (**فخـر الديـن الـرازي**) لـە تەفسـیرەکەی خۆیـدا[1] لـە تەفسـیری ئەم ڕسـتە قورئانییـەدا کـە دەفەرمـوێ: ﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْآفَاقِ ﴾، چەنـد قسـەیەك دەکات، مـن پوختـەی قسـەکانی دێنـم:

دەڵێ: دوو قسە هەن لە بارەی تەفسیری ئەو ڕستە قورئانییەوە:

**یەکەم:** مەبەست لە نیشانەکانی ئاسۆیەکان بریتین لە نیشانە گەردوونییەکان و، نیشانەی ئەستێرەو خڕۆکەکان و، نیشانەکانی شەوگارو ڕۆژگارو، نیشانەکانی ڕووناکیی و، تاریکییەکان، هەروەها نیشانەکانی جیهانی چوار توخمەکان، (مەبەستیان پێیان: ئاو و گڵ و هەواو ئاگر بووە)، هەروەها کە دەفەرموێ: ﴿ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ ﴾، مەبەست پێی ئەو بەڵگانەن کە وەردەگیرێن لە چۆنیەتیی دروستبوونی کۆرپەلەکان لە تاریکاییەکانی منداڵدانەکانداو، پەیدابوونی ئەندامەکان و، ئەو پێکهاتە سەرسوڕهێنەرانەی کە خوا مرۆڤیان لێ دروست دەکات، وەك خوا ﷻ لە سوورەتی (**الذاريات**)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَفِىٓ أَنفُسِكُمْ ۚ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٢١﴾ ﴾، واتە: لە خودی خۆشتاندا نیشانە زۆرن، بۆچی سەرنج نادەن؟! ئنجا دوایی فەخرەددینی ڕازیی دەڵێ: (**يعني نُريهم من هذه الدلائل مرَّةً بعد أُخرَى إلى أن تزول الشبهات عن قلوبهم، ويحصل فيها الجزم، والقطع بوجود الإله القادر الحكيم العليم المنزَّه عن المثل والضد**)، واتە: خوا مەبەستی ئەوەیە بفەرموێ: نیشانەکانی خۆمانیان لە ڕێی ئەو بەڵگانەوە پێشان دەدەین، جار لە دوای جار، تاکو گومانەکان لە دڵیاندا دەڕەونەوەو، دڵنیایی لە دڵیاندا پەیدا دەبێ، بە بوونی پەرستراوێکی توانای کارزانی زانای پاك، لە وێنەو لە دژ.

دوایـی بـۆ خـۆی پرسـیارێك دەکات، دەڵـێ: (**فَـإنْ قِيـلَ: هَـذَا الوَجْـهُ ضَعِيـفٌ؛ لأَنَّ قَوْلَـهُ تَعـالى:** ﴿ سَنُرِيهِمْ ﴾، **يَقْتَضِي أَنَّـهُ تَعـالى مـا أَطْلَعَهـم عَـلَى تِلْـكَ الآيـاتِ إلى الآنِ، وسَـيُطْلِعُهُم عَلَيْهـا بَعْـدَ ذَلِـكَ، والآيَـاتُ المَوْجُـودَةُ فِـي العَالَـمِ الأَعْـلَى والأَسْـفَلِ، قَـدْ كَانَ**

---

(١) تفسير الكبير: ج٢٧ ص١٢٣.

**اللَّـهُ أَطْلَعَهُـم عَلَيْهَا قَبْلَ ذَلِـكَ، فَثَبَـتَ أَنَّـهُ تَعَـذَّرَ حَمْـلُ هَـذَا اللَّفْـظِ عَـلَى هَـذا الوَجْـهِ)**، واتـە: ئەگـەر بگوتـرێ: ئەمـە ئـەوە دەگەیەنـێ کـە خـوا جـارێ ئـەو خەڵکـەی ئـاگادار نەکردۆتـەوە لـەو نیشـانانەو، لـە مـەودوا ئاگاداریـان دەکاتـەوە، لـە حاڵێکـدا لـە جیهانـی سـەرێ و، جیهانـی خوارێـدا، خـوا ئـەو شـتانەی پێشـانی خەڵـك هـەر داون، کەواتـە: ناگونجـێ ئـەو ئایەتـە بـەو جـۆرە تەفسـیر بکـرێ!

فەخرەددینـی ڕازیـی وەڵامێکـی بـاش دەداتـەوە، لـە قـەدەر خـۆی لـە سـەدەی شەشـەمی کۆچیـی و سـەرەتای سـەدەی حەوتەمـدا، دەڵـێ: **(قُلْنـا: إنَّ القَـوم وَإنْ كَانُـوا قَـد رأوا هَـذِهِ الأَشـيَاء، إلاَّ أن العجائـب التـي أودعهـا اللـه تعـالى في هـذه الأشـياء، مِـمَّا لا نهايـة لهـا، فهـو تعـالى يُطْلِعُهـم عـلى تلـك العجائـب زمانـاً فزمانـاً، ومثالـه كل أحـد رأى بعينـه بنيـة الإنسـان وشـاهدها، إلا أن العجائـب التـي أبدعهـا اللـه في تركيـب هـذا البـدن كثـيرة، وأكـثر النـاس لا يعرفونهـا، والـذي وقـف عـلى شيء منهـا، فكلَّـما ازداد وقوفـاً عـلى تلـك العجائـب والغرائـب، ازداد معرفـة بهـا، فَصَـحَّ بِهَـذا الطَّرِيـقِ قَوْلُـهُ:** ﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ ﴾)، واتـە: بەڵـێ ئـەو شـتانەیان بینیـون، بـەڵام ئـەو شـتە سەرسـوڕهێنەرانەی خـوا لـەو شـتانەدا دایناون، کۆتاییـان نیـە، خـوای بـەرز ئـەو شـتە سەرسـوڕهێنەرانە، کات لـە دوای کات بـۆ خەڵـك دەردەخـات، وێنەکەشـی ئەوەیـە هەمـوو کەسـێك جەسـتەی مرۆڤـی بینیـوە، چەنـد سەرسـوڕهێنەرە! بـەڵام ئـەو شـتە سەرسـوڕهێنەرانەی لـە جەسـتەی مرۆڤـدا هـەن، زۆر زۆرن و، زۆربەی خەڵکـی نایانزانن، (کەواتـە: بـەردەوام دەردەکـەون)، کەسـێکیش کـە شـتێکیان لـە بـارەوە دەزانـێ، هەتـا زیاتریـان لـە بـارەوە بزانـێ، زانیاریـی لـە بارەیانەوە پـتر دەبێ، بـەو جۆرەش فەرمایشـتی خـوا: ﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ ﴾، ڕاسـت دێتـە دی.

دووەم: **(والقَوْلُ الثَّاني: أنَّ المُرَادَ بِآياتِ الآفَاقِ: فَتْحُ البِلاَدِ المُحِيطَةِ بِمَكَّةَ، وبِآيَاتِ أَنْفُسِهِمْ فَتْحُ مَكَّةَ)**، واتە: مەبەست لە ئاسۆیەکان بریتیە لە ئازادکردنی ئەو وڵاتانەی کە دەوری مەککەیانداوە (کە ئیسلام ئازادیان دەکات)، مەبەستیش لە: ﴿ أَنفُسِهِمْ ﴾، ئازادکرانی شاری مەککەیە!

بـەڵام بـە دڵنیایـی ئـەم واتایـەی دووەم - کـە بەداخـەوە زۆربـەی تەفسـیرە پێشـینەکان ئەمەیـان زیاتـر هەڵبـژاردوە - لەگـەڵ ئێوەڕۆکـی ئایەتەکانـدا ناگونجـێ، بـەڵام ئـەوەی فەخرەددینـی ڕازی لـە قسـەی یەکەمـی دا دەریخسـتوە، زۆر جوانـە، کـە لـە ڕۆژگاری ئـەوان دا وەك ئێسـتا زانسـت بـەرەو پێشـەوە نەچـووە، تاکـو ئـەو هەمـوو نهێنییانـە دەرکـەون: گـەردوون چـۆن دروسـت بـووەو، سـووڕانەوەی زەوی و، خڕیەتیـی زەوی و، بەرگـە هـەواو، بەرگە ئاویی و، چیایـەکان و.... هتد، دەرنەکەوتوون، هیـچ گومانـی تێدانیـە کـە مەبەسـتی خـوای بەرزیـش هـەر ئەوەیـە، هەڵبەتـە وێـڕای فەخرەددینـی ڕازیـی[1]، زۆربەیـان ئـەو ڕایەشـیان هێنـاوەو ئاماژەشـیان بـەوە کـردوە کـە دەگونجـێ مەبەسـت پێـی دەرکەوتنـی نیشـانەکانی خـوا بـێ لـە گـەردوون و، لـە مرۆڤـدا، لەئەنجامـی بـەرەو پێـش چوونـی زانسـتدا.

خـوا بـە لوتـف و کەرەمـی خـۆی لـە قورئانـدا زیاتـر سـەر ڕاسـتمان بـکات، و شـارەزامان بـکات و دڵـمان زیاتـر پڕبـکات لـە ئیـمان و هیدایـەت، چونکـە تاکـو لـە خـوا نیزیکـتر بیـن، بـە دڵنیایـی بـە فەرمایشتەکەشـی ئاشـناتر دەبیـن، خـوا یارمەتییـمان بـدات کـە هەرچـی دەیزانیـن بیشـیتوانین، حاڵـی بوونەکـە لـە خۆمانـدا بکەینـە حـاڵ، چونکـە بێگومـان ئامانجـی زانسـت بریتیـە لـە کارپێکـردن و خـۆ پـێ چاککـردن و دەوربـەر پـێ چاککـردن.

لێرەشـدا کۆتایـی بـە تەفسـیرکردنی ئایەتەکانـی سـوورەتی (فصلـت) دێنیـن و دەڵێیـن:

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

---

(١) الطبري في (جامع البيـان): ج٢٥، ص٦، (القرطبـي) في (الجامع لأحـكام القـرآن) ج١٥، ص:٢٩٩، (ابـن عجيبـة) في (البحـر المديـد في تفسـير كتـاب المجيـد) ج٢٥، ص٣٥٥، (الشـوكاني) في (فتـح القدير) ج:٢٤٤، ص٦٢٧.

## دەستپێک

بەڕێـــــزان!

ئەمـڕۆ کـە (٢٩/ **ربیـع الثـاني**/ سـاڵی ١٤٤١) کۆچییـە، بەرانبـەر (٢٠١٩/١٢/٢٦) زایینـی، خـوا پشـتیوان بێـت دەسـتدەکەین بـە تەفسـیرکردنی سـوورەتی (**الشـورى**).

## نێوەڕۆکی سوورەتی (الشورى) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سوورەتە:

ئەم سوورەتە، بە دوو ناوان ناسراوە:

١- (**حـم عسق**)، یان (**عسق**).

٢- (**سُورَةُ الشُّورَى**)، یان (**سُورَة شُورى**)، واتە: بەبێ (أل)، وەك (**البخاري**) لە (**كتاب التفسير**) و (**الترمذي**) لە (**جامع السنن**)دا، هێناویانە، بەڵام دیارە ئەوەی زیاتر باوە، بریتیە لە (**سورة الشورى**) یان (**سورة شورى**).

### دووەم: شوێنی دابەزینی:

ئـەم سـوورەتە موبارەکـە، لـەلای زۆربـەی زانایـان یەکێکـە لـە سـوورەتە مەککەیـەکان، هەرچەنـدە لـە قەتـادەو ئیبنـو عەبباسیشـەوە هاتـوە کـە چـوار ئایەت، ئایەتـەکانی: (٢٣ - ٢٦)، کـە ئەمـە دەقەکەیانـە: ﴿قُل لَّآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا إِلَّا ٱلْمَوَدَّةَ فِى

ٱلْقُرْبَىٰ ۗ وَمَن يَقْتَرِفْ حَسَنَةً نَّزِدْ لَهُۥ فِيهَا حُسْنًا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ شَكُورٌ ﴿٢٣﴾ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا ۖ فَإِن يَشَإِ ٱللَّهُ يَخْتِمْ عَلَىٰ قَلْبِكَ ۗ وَيَمْحُ ٱللَّهُ ٱلْبَٰطِلَ وَيُحِقُّ ٱلْحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٢٤﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى يَقْبَلُ ٱلتَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِۦ وَيَعْفُوا۟ عَنِ ٱلسَّيِّـَٔاتِ وَيَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ ﴿٢٥﴾ وَيَسْتَجِيبُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَيَزِيدُهُم مِّن فَضْلِهِۦ ۚ وَٱلْكَٰفِرُونَ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ ﴿٢٦﴾ ﴾، مەدینەیین، بەڵام وا پێناچێ ئەو رایە ڕاست بێ، دەگونجێ عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، شتی وای هەر لێ نەگێڕدرابێتەوە، هەروەها قەتادەش لێی نەگێڕدرابێتەوە، دەشگونجێ لێشیان گێڕدرابێتەوەو وای تێگەیبن، بەڵام وەك دوایی لە کاتی تەفسیر کردنی ئایەتەکاندا بۆمان دەردەکەوێ، ئایەتەکانی ئەم سوورەتە موبارەکە وەك ئاڵقەکانی زنجیر یەکدی پەیوەست دەکەن و، هیچ نیشانەو بەڵگەیەکیش نیە لەسەر ئەوەی ئەو چوار ئایەتە یاخود هەر ئایەتێکی دیکە، کە هەندێکیان باسی هەندێ ئایەتی دیکەشیان کردوە، لەگەڵ کەش و بارودۆخی قۆناغی مەککەدا نەگونجێ و ناچاربین بڵێین: لە مەدینە هاتۆتە خوار، هەروەها هیچ نەقڵێك و ڕیوایەتێکی ڕاست - لەڕووی سەنەدەوە - لەبەر دەستدا نیە، ناچارمان بکات بڵێین: ئەو ئایەتە لە فلان بۆنەداو، لە فلان کاتەدا لە مەدینە هاتۆتە خوار، دوایی خراوەتە نێو ڕیزی ئەو ئایەتانەی سوورەتی (**الشورى**) کە لە مەککەدا دابەزیوە.

## سێیەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و دابەزینی دا:

لە (**مصحف**)دا ژمارە (٤٢)یە، واتە: لە سوورەتی (**الفاتحة**)وە کە دێین ئەم سوورەتە موبارەکە ژمارەکەی (٤٢)یە، بەڵام لە ڕیزبەندیی دابەزیندا، ژمارە (٦٩)یە، واش پێدەچی لە دەوری ساڵی هەشتەمی پێغەمبەرایەتیی، تاکو ساڵی نۆیەمیشی خایاندبێ، دابەزیبێ، واتە: لەگەڵ کەش و بارودۆخی هەردوو ساڵانی: ٨ و٩ دا زیاتر دەگونجێ و، ئایەتی: ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِرَبِّهِمْ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَمْرُهُمْ

﴿ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣٨﴾ ﴾، لەوبارەوە ئاماژەیە بە هەڵوێستی هەردوو هۆزی ئەوس و خەزرەج، کە هەندێك دەڵێن: لە ساڵی نۆیەمداو هەندێك دەڵێن: لە ساڵی دەیەمی پێغەمبەرایەتییدا، بۆ یەکەمجار دیداریان لەگەڵ پێغەمبەری خاتەمدا ﷺ کردووەو، دواتر پەیمانی یەکەم و دووەمی عەقەبەیان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بەستوون، هەندێکیش دەڵێن: یەکەم دیدار لە ساڵی یازدەیەمی پێغەمبەرایەتیی دابووە، پەیمانی یەکەم و دووەمیش لە ساڵانی دوازدەو سێزدەدا بوون.

## چوارەم: ژمارەی ئایەتەکانی:

ژمارەی ئایەتەکانی سوورەتی (**الشورى**)، لە لای خەڵکی مەدینەو مەککەو شام، هەروەها بەصرەش، بە پەنجا (٥٠) دانراوە، بەڵام لە لای خەڵکی کووفە بە پەنجاو سێ (٥٣) دانراوە، زیاتریش ژمارەی (٥٣) زیاتر تەبەننیی کراوە، پێشتریش گوتوومانە: کە جیاوازیی لە ژماردنی ئایەتەکاندا، دەگەڕێتەوە بۆ کورتیی و درێژیی ڕستەکانی قورئان، زانایەك ڕستەیەکی کردۆتە دوو کوت، بۆیە بۆتە دوو ئایەت، یەکی دیکە هەمووی بە سەریەکەوە کردوە بە یەك ڕستە، بۆیە هەمووی بۆتە یەك ئایەت.

## پێنجەم: نێوەڕۆکی:

ئەم سوورەتە پانتاییەکی زۆری تێدا تەرخانکراوە بۆ باسی وەحیی، شەش جاران وشەی وەحیی بە چەند ڕێژگەیەك لەم سوورەتە موبارەکەدا دووبارە بۆتەوە، لە ئایەتەکانی: (٥٢،٥١،١٣،٧،٣)دا، هەروەها لەم سوورەتەدا سێ شێوازەکانی وەحیی کردنی خوا، هاتوون، تەنیا لەم سوورەتەشدا خوا ﷻ هەرسێك شێوازەکانی سروشکردنی خۆی بۆ پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ**)، خستوونە ڕوو، بەڵام

وێڕای باسی وەحیی کە پانتایەکی زۆری داگرتوە، چەند بابەتێکی دیکەش هاتوون، وەك:

١- خستنەڕووی ژمارەیەك لە سیفەت و کردەوەکانی خوا.

٢- باسی ڕۆژی دوایی، بە هەردوو قۆناغی ئاخیر زەمان و قیامەت و، باسی بەهەشت و دۆزەخ.

٣- باسی پێغەمبەرانی خوا (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) و خاوەنی یەك ئایین و بەرنامە بوونیان لە هێڵە گشتییەکاندا، کە بە تایبەت ناوی نووح و ئیبراهیم و مووساو عیسا (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)و، ناوی پێغەمبەری خۆشمان موحەممەد ﷺ بە شێوەی دواندن هاتوە.

٤- باسی سیفەتە بنەڕەتییەکانی کۆمەڵی مسوڵمان، کە دەوری دە (١٠) سیفەتن.

٥- باسی گەڕانەوە بۆ لای خواو، تەوبە وەرگرتنی خوا لە بەندەکانی.

٦- باسی خستنەڕووی ژمارەیەك لە چاکەو نیعمەتەکانی خوا لە ژیانی مرۆڤدا.

٧- فەرمانکردنی خوا بە پێغەمبەرەکەی ﷺ کە پێنج ئەرکان جێبەجێ بکات و، پێنج ڕاستییانیش ڕابگەیەنێ، لە ئایەتی ژمارە (١٥)دا، هاتوە.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی:

ئێمە لەم سوورەتەدا (١٠) تایبەتمەندییمان دیاریی کردوون، کە دەگونجێ زیاتریشبن، یان دەشگونجێ ئەم (١٠)یە، هەندێکیان بخرێنە نێو هەندێکیان:

١)- یەکەمین تایبەتمەندیی ئەم سوورەتە، ئەوەیە کە دەستپێکی بە پێنج (٥) پیتی پچڕ پچڕە، بەڵام لە (٢) ئایەت دا، (حمٓ ﴿١﴾ عٓسٓقٓ ﴿٢﴾)، چونکە دەستپێکێکی دیکەی پێنج پیتیی هەیە، لە سوورەتی (مریم)دا، بەڵام لەوێ هەر پێنج (٥) پیتەکان بەسەر یەکەوەن و یەك ئایەتن (کٓهیعٓصٓ) بەڵام لێرەدا: (حمٓ)، (عٓسٓقٓ).

٢)- لە ئایەتی (١١)دا، ئەم تەعبیرە لە هەموو قورئاندا تەنیا لێرەدا هاتوە: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۝١١﴾الشورى، واتە: هیچ شتێك وەك خوا نیەو، خوا وەك هیچ شتێك نیە.

٣)- باسی ئەو ڕاستییە کە شەریعەتی موحەممەد ﷺ هەمان شەریعەتی نووح و ئیبراهیم و مووساو عیسایە، دیارە لە هێڵە گشتییەکانیدا، ئەویش لە ئایەتی (١٣) دا هاتوە.

٤)- هاتنی پێنج ئەرکی گەورەو پێنج هەواڵی مەزن لە یەك ئایەتدا، یانی: خوا ﷻ پێنج ئەرکی بە پێغەمبەر ﷺ سپاردوون، پێشیفەرمووە پێنج ڕاستییان ڕابگەیەنێ لە یەك تاکە ئایەتدا، ئایەتی ژمارە (١٥).

٥)- باسی ئەوە کە خوا ﷻ کتێبی بە هەق دابەزاندوەو، تەرازووشی دابەزاندوە، لە ئایەتی ژمارە (١٧)دا، کە تەنیا لەم سوورەتەدا بەم شێوەیە هاتوە.

٦)- باسی ئەوە کە پێغەمبەر ﷺ جگە لە: ﴿ٱلْمَوَدَّةَ فِى ٱلْقُرْبَىٰ﴾، هیچ پاداشتێکی دیکە لە خەڵك ناخوازێ، کاتێك بانگیان دەکات بۆ لای خوا، لە ئایەتی ژمارە (٢٣)دا، کە دەفەرموێ: ﴿قُل لَّآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا إِلَّا ٱلْمَوَدَّةَ فِى ٱلْقُرْبَىٰ ۝٢٣﴾الشورى، واتە: بڵێ: هیچ پاداشتێکتان لێ داوا ناکەم جگە لە ﴿ٱلْمَوَدَّةَ فِى ٱلْقُرْبَىٰ﴾ کە ڕاسترین و گونجاوترین مانای ئەوەیە: تەنیا خۆشەویستییم هەیە کە ئێوە زیاتر لە خوا نیزیك ببنەوە، واتە: تەنیا شتێك کە لێتان داوا بکەم لە بەرانبەر گەیاندنی پەیامی خوادا، ئەوەیە: حەز دەکەم زیاتر لە خوا نیزیك بن، کەواتە: پاداشتەکەش هەر بۆ خۆیان دەگەڕێتەوە.

٧)- باسی ئەوە کە کاروباری مسوڵمانان دەبێ بەڕاوێژ بێ، لە ئایەتی ژمارە (٣٨)دا: ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ۝٣٨﴾الشورى.

٨)- باسی ئەوە کە خوا، بە ویستی خۆی، کچان و کوڕان، یان هەردووکیان بە مرۆڤەکان دەدات و، هەندێکیان نەزۆك دەکات و هیچیان پێنادات، ئەویش لە ئایەتەکانی: (٤٩ و ٥٠)دا هاتوەو، لە هەموو قورئان دا تەنیا لێرەدا ئەوە هاتوە.

٩)- باسی سێ شێوازەکانی ناردنی وەحیی خوا بۆ پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، لە ئایەتی ژمارە (٥١)دا هاتوە: ﴿وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ اللَّهُ إِلَّا وَحْيًا أَوْ مِن وَرَاءِ حِجَابٍ أَوْ يُرْسِلَ رَسُولًا فَيُوحِيَ بِإِذْنِهِ مَا يَشَاءُ ...﴾ .

١٠)- باسی ئەوە کە پێش ناردنی وەحیی، پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ نەیزانیوە نەکتێب چییە، نە ئیمان چییە؟ وەك دەفەرموێ: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا مَا كُنتَ تَدْرِي مَا الْكِتَابُ وَلَا الْإِيمَانُ ﴿٥٢﴾﴾، واتە: ڕووحێکمان لە لایان خۆمانەوە بۆ تۆ ناردوە، کە پێش ئەو نەتدەزانی نە کتێب چییە؟ (واتە: بەرنامەی ژیان)، نە ئیمانیش چییە؟.

کە بە داخەوە، زۆرێك لە توێژەرەوان لە تێگەیشتنی ئەو ڕستە قورئانییەدا نەیانپێکاوە، لەبەر ئەوەی کارتێکراوبوون بە پێناسەی ئیمان، بەو پێیەی لە سەردەمی خۆیاندا باو بووە، کە بریتی بووە لە ناسینی خوا، ئنجا کە خوا دەفەرموێ: تۆ پێش قورئان نەتدەزانی کتێب چییەو ئیمان چییە؟ گوتوویانە: چۆن دەبێ پێغەمبەر ﷺ خوای نەناسیبێ؟! کە لە ڕاستییدا پێغەمبەری خوا (محمد) ﷺ و هەموو پێغەمبەران خوایان هەر ناسیوە، پێش هاتنی وەحییش، بەڵام ئیمان جیایە لە خواناسیی، وەك دوایی باسی دەکەین.

## حەوتەم: دابەشکردنی ئایەتەکان بۆ چەند دەرسێك:

خوا پشتیوان بێ ئێمە کۆی پەنجاو سێ (٥٣) ئایەتەکەی ئەم سووڕەتە موبارەکە، بۆ (٦) دەرسان دابەش دەکەین:

**دەرسی یەکەم:** دوازدە ئایەتی سەرەتا دەگرێتە خۆی، ئایەتەکانی: (١ - ١٢)، کە نێوەڕۆکەکانی بریتیە لە ناساندنی خوا، بە کۆمەڵێکی زۆر لە سیفەت و کردەوەکانی، دەوری بیست و حەوت (٢٧) و، باسی قورئان و باسی پێغەمبەرە ﷺ پێغەمبەری خاتەم و، باسی وەحیی ناردنی خوایە بۆ پێغەمبەری خاتەم و بۆ پێغەمبەرانی پێشووش (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام).

**دەرسی دووەم:** شەش ئایەت دەگرێتە خۆی، ئایەتەکانی: (١٣ - ١٨)، کەتێیان دا باسی ئایینی خوا بە گشتیی کراوەو، باسی هەر پێنج پێغەمبەرە مەزنەکان کراوە: نووح و ئیبراهیم و مووساو عیساو موحەممەد (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) و، باسی ئەرکی پێغەمبەری خاتەم ﷺ کراوە، هەروەها باسی ئەوە کە قورئان بە هەق دابەزێنراوەو، تەرازووشی لە گەڵدا دابەزێنراوە.

**دەرسی سێیەم:** شەش ئایەت دەگرێتە خۆی، ئەویش ئایەتەکانی: (١٩ - ٢٤)، باسی لوتفی خواو، باسی هەوڵدانی مرۆڤ چ بۆ دنیا، چ بۆ ڕۆژی دوایی و، سەرەنجامی مرۆڤەکان لە قیامەتدا، بە هەر دوو باری ئەرێنیی و نەرێنییدا، کراوە.

**دەرسی چوارەم:** یازدە ئایەت دەگرێتە خۆی، ئایەتەکانی: (٢٥ - ٣٥)، باسی ژمارەیەك لە چاکەو نیعمەتەکانی خوا کراوە، کە هاوکات نیشانەو بەڵگەشن لە سەر بەدیهێنەرایەتیی و، پەروەردگارێتیی و، خاوەندارێتیی و، تەنیا پەرستراوێتیی خوا.

**دەرسی پێنجەم:** ئەویش یازدە ئایەت دەگرێتە خۆی، ئایەتەکانی: (٣٦ - ٤٦)، باسی سیفەتە بنەڕەتییەکانی کۆمەڵی بڕوادار کراوە، کە دەوری دە (١٠) سیفەتن، ئەم سوورەتە یەکێکە لە شوێنە دەگمەن و کەمەکان، کە خوا ﷻ ژمارەیەکی زۆر لە سیفەتەکانی بڕوادارانی وەك کۆمەڵ، خستوونەڕوو، لە نێویاندا ئەوە کە کاروباریان بە ڕاوێژ بەڕێوە دەبەن و، ئایەتی ژماری (٣٨) تاکە شوێنێکە کە ئەوەی تێدا هاتبێ: ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ﴿٣٨﴾﴾الشورى، کاروباریان بە ڕاوێژە.

**دەرسی شەشەم:** کە حەوت ئایەتی کۆتایی دەگرێتە خۆی، ئایەتەکانی: (٤٧ - ٥٣) فەرمانکردنی خوا، بە وەڵامدانەوەی مرۆڤان، کە بە دەم بانگی پەیامی خواوە بێن و باسی هەر سێ شێوازەکەی وەحیی و، باسی ئەوە کە خوا ﷻ وەك چۆن وەحیی بۆ پێغەمبەران ناردوە (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، بەهەمان شێوەش

وەحیی بۆ پێغەمبەری خاتەم ناردوە، کە ڕووحێکە لە لایان خۆیەوەو بە هۆی ئەو ڕووحەوە ئنجا لێی ئاشکرابووە، ئیمان چییەو بەرنامە چییەو دەبێ چی بکات و چۆن بەندایەتیی بۆ خوا بکات و، چۆن کۆمەڵگاو دەوروبەرەکەی خۆی چاك بکات؟

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـە لـە دوازدە (١٢) ئایـەتی سـەرەتای سـوورەتی (**الشـورى**) پێکـدێ: (١ - ١٢)، کـە لـەو (١٢) ئایەتـەدا خـوا بـاسی وەحیـی نـاردنی خـۆی بـۆ موحەممـەد ﷺ هەروەهـا بـۆ تێکـڕای پێغەمبـەرانی دیکـەش، (**عَلَيْهِـمُ الصَّـلَاةُ وَالسَّـلَام**) دەکات.

شـایانی باسـە: لــە دوو توێــی ئــەو دوازدە (١٢) ئایەتــەدا، دەوری بیســت و حـەوت (٢٧) لـە سـیفەت و کـردەوە بـێ وێنـەکانی خـوا خراونـە ڕوو، کـە کـەم وایـە لـە پایانتاییـەکی ئەوەنـدەدا، هێنـدە لـە سـیفەت و کـردەوەکانی خـوای تـاك و بـێ وێنـە خرابنـەڕوو لـە قورئانـدا، ئنجـا لەمیـانی ئەوەشـدا زیاتـر لـە بیسـت (٢٠) بابـەتی گـەورەو گرنگـی جـۆراو جـۆر لـە بـواری بووناسـیی و ئیمان و عەقیـدەدا خراونـەڕوو.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿حمٓ ﴿١﴾ عٓسٓقٓ ﴿٢﴾ كَذَٰلِكَ يُوحِيٓ إِلَيۡكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكَ ٱللَّهُ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٣﴾ لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۖ وَهُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡعَظِيمُ ﴿٤﴾ تَكَادُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ يَتَفَطَّرۡنَ مِن فَوۡقِهِنَّۚ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يُسَبِّحُونَ بِحَمۡدِ رَبِّهِمۡ وَيَسۡتَغۡفِرُونَ لِمَن فِي ٱلۡأَرۡضِۗ أَلَآ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥﴾ وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَ ٱللَّهُ حَفِيظٌ عَلَيۡهِمۡ وَمَآ أَنتَ عَلَيۡهِم بِوَكِيلٖ ﴿٦﴾ وَكَذَٰلِكَ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ قُرۡءَانًا عَرَبِيّٗا لِّتُنذِرَ أُمَّ ٱلۡقُرَىٰ وَمَنۡ حَوۡلَهَا وَتُنذِرَ يَوۡمَ ٱلۡجَمۡعِ لَا رَيۡبَ فِيهِۚ فَرِيقٞ فِي ٱلۡجَنَّةِ وَفَرِيقٞ فِي ٱلسَّعِيرِ ﴿٧﴾ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَهُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ وَلَٰكِن يُدۡخِلُ مَن يَشَآءُ فِي رَحۡمَتِهِۦۚ وَٱلظَّٰلِمُونَ مَا لَهُم مِّن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٍ ﴿٨﴾ أَمِ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَۖ فَٱللَّهُ هُوَ ٱلۡوَلِيُّ وَهُوَ يُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰ

وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٩﴾ وَمَا ٱخْتَلَفْتُمْ فِيهِ مِن شَيْءٍ فَحُكْمُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبِّى عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ ﴿١٠﴾ فَاطِرُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ جَعَلَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا وَمِنَ ٱلْأَنْعَٰمِ أَزْوَٰجًا ۖ يَذْرَؤُكُمْ فِيهِ ۚ لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَيْءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١١﴾ لَهُۥ مَقَالِيدُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ ۚ إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴿١٢﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە، حا میم ﴿١﴾ عەین سین قاف ﴿٢﴾ بەو شێوەیە (کە هەر شایستەی خوایە) خوای زاڵی کارزان، سروش بۆ لای تۆو بۆ لای ئەوانەی پێش تۆش (لە پێغەمبەران) دەکات ﴿٣﴾ هەرچی لە ئاسمانەکان و، هەرچی لە زەویی دایە، هی ویەو ئەو بەرزی مەزنە ﴿٤﴾ نیزیکە ئاسمانەکان لە سەرەوەیان ڕا هەڵبقڵیشێن (لە سام و هەیبەتی خوا)و فریشتەکانیش پەروەردگاریان بە پاك دەگرن و، بە ستایشکردنیەوەو داوای لێبوردن (لە خوا) دەکەن بۆ ئەو کەسانەی لە زەویدان، ئەها (ئاگاداربن!) بەڕاستیی هەر خوا لێبوردەی بەبەزەییە ﴿٥﴾ ئەوانەش کە جگە لەوی کە دۆست و سەرپەرشتیارانێکیان گرتوون، خوا بەسەریانەوە پارێزەرو (چاودێرە)و، تۆ کار پێسپێرراوو (پارێزەر) نی بەسەریانەوە، (کە ڕێی لادانیان لێبگری) ﴿٦﴾ هەروەها بەو شێوەیەی (کە شایستەی ئێمەیە) قورئانێکی عەرەبیی (زمان)مان بۆ لات سروشکردوە، تاکو (خەڵکی) دایکی ئاوەدانییەکان (شاری مەککە)و خەڵکی دەوروبەری پێ وریابکەیەوەو بترسێنێ و، (خەڵك) لە ڕۆژی کۆکردنەوە کە دوودڵیی تێدانیە، بترسێنی، (کە لەو ڕۆژەدا) کۆمەڵێك (کە خەڵکی بڕواداری چاکەکارن) لە نێو بەهەشتدا دەبن و، کۆمەڵێك (کە خەڵکی بێبڕوای خراپەکارن) لە نێو کڵپە

(ی دۆزەخ)دا دەبن ﴿٧﴾ ئەگەر خواش ویستبای (زۆریان لێ بکات) دەیکردنە یەك کۆمەڵ (و لەسەر ئیمان، یان لەسەر کوفر کۆی دەکردنەوە) بەڵام (ئازادی کردوون و سەرەنجام) هەر کەسێکی بیەوێ (بە هۆی ئیمان هێنانیەوە) دەیخاتە نێو بەزەیی خۆیەوەو، ستەمکارانیش (کە هیدایەت و پەیامی خوا وەرناگرن) هیچ سەرپەرشتیارو پشتیوانێکیان نیە ﴿٨﴾ یان ئایا (بێبڕوایان) جگە لەو (خوا) سەرپەرشتیارانێکیان گرتوون؟ بەڵکو (لە ڕاستییدا) تەنیا خوا سەرپەرشتیارەو، بەس ئەو مردووان دەژیێنێتەوەو، هەر ئەویش لەسەر هەموو شتێك بە توانایە ﴿٩﴾ هەر شتێکیش تێیدا کەوتنە ڕاجیاییەوە، حوکم و بڕیارەکەی تەنیا بۆ لای خوایە، (بڵێ:) ئا ئەو خوایەتان پەروەردگارمە، پشتم تەنیا بەو بەستوەو، بەس بۆ لای ویش لە ناخەوە دەگەڕێمەوە ﴿١٠﴾ داهێنەری ئاسمانەکان و زەوییە، لە خۆتان هاوسەرانی بۆ ڕەخساندوون و، لە ئاژەڵانیش جووتە (نێرو مێ)یەکانی ڕەخساندوون کە لەوەدا (لەو جووتییە دا) زۆرتان دەکات (خۆتان و ئاژەڵەکانتان، وەچەتان بەردەوام دەبێ) هیچ شتێك وەك وی (خوا) نیەو، ئەو بیسەری بینەرە ﴿١١﴾ کلیلەکانی ئاسمانەکان و زەوی هی وین، بۆ هەر کەس بیەوێ بژیو زۆرو فراوان دەکات و، کەم و تەنگ دەکات، بە دڵنیایی ئەو بە هەموو شتێك زانایە ﴿١٢﴾].

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(يَتَفَطَّرۡنَ ): واتە: هەڵدەقڵیشێن، (الفَطْرُ: الشَّقُّ طُولاً) (فَطْر): بریتیە لە شتێك کە بە باری درێژییدا بشکێ، بە کوردیی هەڵقڵیشانی پێ دەڵێن، دەگوترێ: دارەکە قڵیشا، دیوارەکە قڵیشا، (مِنْ فُطُورٍ أي: اخْتِلاَلٍ وَوَهْنٍ) (فُطُورٍ): بە مانای نارێکیی و بێهێزیی دێ.

(أُمَّ ٱلۡقُرَىٰ ): مەبەست شاری مەککەیە، دایکی ئاوەدانییەکان، هەر وەك بە مەجەڕە گوتراوە: (أُمُّ النُّجُوم) دایکی ئەستێرەکان (کەهکەشان)، هەروەها بە (اللَّوحُ المَحْفُوظ) گوتراوە: (أُمُّ الكِتَاب) دایکی نووسینەکان.

(فَاطِرُ): واتە: داهێنەر، پەیداکەر، (فَطْرُ اللهِ الخَلْقَ: هُوَ إِيْجَادُهُ الشَّيءَ، وَإِبْدَاعُهُ عَلَى هَيْئَةٍ مُتَرَشِّحَةٍ لِفِعْلٍ مِنَ الأَفْعَال)، خوا دروستکراوەکانی (فَطْر) کردوون، (فطْر) بریتیە لە پەیداکرنی شتێك و، داهێنانی بە شێوەیەك کە لێی بوەشێتەوە کارێك ئەنجام بدات، کەواتە: (فَاطِرُ) یانی: (مُبْدِع) داهێنەرو پەیداکەر.

( يَذۡرَؤُكُمۡ فِيهِ ): واتە: لەوێدا زۆرتان دەکات، (الذَّرْءُ: إِظْهَارُ اللهِ تَعَالَى مَا أَبْدَاهُ، يُقَالُ: ذَرَأَ اللهُ الخَلْقَ، أي: أَوْجَدَ أَشْخَاصَهُمْ) (ذَرْءُ): هەم بە مانای دەرخستن دێ، هەم بە مانای زۆر کردن و بڵاو کردنەوەش دێ.

(مَقَالِيدُ): بە مانای (مَفَاتِيح) دێ، واتە: کلیلەکان، (مَقَالِيْد: جَمْعُ إِقْلِيْد مَأْخُوذٌ مِنْ (كِلِيْدِ) الفَارِسِيَّة عَلَى غَيْرِ قِيَاسٍ، أَو جَمْعُ مِقْلَاد، أي: مِفْتَاح)، (مقالید) ئەویش یان کۆی (إِقْلِيد)ە، کە لە (كِلِيْد) ی، فارسییەوە هاتوە، بەڵام بە شێوەیەکی قیاسیی وەرنەگیراوە، یاخود کۆی (مِقْلَاد)ە، ئەگەر کۆی (مِقْلَاد) بێ، بە شێوەیەکی قیاسیی وەرگیراوە، (مِفْتَاح، مَفَاتِيح) (مِقْلَاد، مَقَالِيد) (مِعْرَاج، مَعَارِيج) تا کۆتایی، هەندێکیش (مَقَالِيدُ)یان، بە مانای: (خزائن) لێکداوەتەوە، عەمبارەکان، بەڵام زیاتر وا پێدەچێ مانای (مَفَاتِيح) بێ، واتە: کلیلەکان.

(يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ): (بَسْطُ الشَّــيء: نَشْرُهُ وَتَوْسِيعُهُ) شتێك کـە (بَسْـط) بکـرێ، واتـە: بڵاوبکرێتـەوەو فـراوان بکـرێ، مەبەسـت پێـی زۆر کردنـە.

(يَقۡدِرُ): (قَـدَرْتُ عَلَيْـهِ الشَـيءَ: ضَيَّقْتُـهُ، كَأنَّــمَا جَعَلْتَـهُ بِقَـدْرٍ، بِخِلَافِ مَا وُصِفَ بِغَيْـرِ حِسَـاب)، (قَـدَرَ يَقْـدِرُ) بـە مانـای (ضَيَّقَ يُضَيِّقُ) (قَـدَرْتُ عَلَيْهِ الشَّــيء) واتە: شـتەکەم لـێ تەنـگ کـردەوە، یـانی: کردوومـە بـە ئەندازەیـەکی دیارییکـراو، پێچەوانـەی ئـەوە کـە بەبـێ ژمـاردن پێـی بـدرێ.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

ئـەم دوازده (١٢) ئایەتـە موبارەکـە، وەك پێشـتریش ئامـاژەم پێدا، بیسـت و حەوت (٢٧) لـە سـیفەت و کـردەوە نـاوازەکانی خـوای پەروەردگاریـان تێـدا خراونـەڕوو، کـە ئێمـە لـە میـانی مانـای گشـتیی ئـەو دوازده (١٢) ئایەتـەدا ئاماژەیـان پێدەکەیـن:

سـەرەتا خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾، واتـە: ئـەو کارە دەسـت پێدەکـەم بـە نـاوی خـوای بـە بەزەیـی بەخشـندە، زۆر جـار گوتوومانـە و لێـرەش دووبـارەی دەکەینـەوە: کاتێـك مـرۆڤ ئـەو ڕسـتە موبارەکـە دەڵـێ، دەبـێ چـوار واتـای بنەڕەتیـی بـە عەقـڵ و هۆشـی خۆیـدا بهێنـێ:

١- بە ناوی خوا دەست پێدەکەم، نەك بە ناوی خۆم، یان هەر شتێکی دیکە.

٢- ئەو کارە بۆ ڕازییکردنی خوا ئەنجام دەدەم.

٣- ئەو کارە بە پێی بەرنامەی خوا ئەنجام دەدەم.

٤- ئەو کارە بە یارمەتیی و هاوکاریی خوا ئەنجام دەدەم، نەك بە شان و شەوکەتی خۆم.

سـەرەتا دەڵێیـن: ئـەم سـوورەتە یەکێکـە لـە حـەوت سـوورەتان لـە قوڕئانـدا، کـە پێیـان دەگوتـرێ: (**ذوات حـم**) یـان (**آل حـم**) کـە یەکەمیـان سـوورەتی (**غافـر**) بـوو،

دووەمیان (**فصلت**) بوو، سێیەمیشیان ئەم سوورەتی (**الشورى**)یە، چوارەمیشیان سوورەتی (**الزخرف**) ە، پێنجەمیشیان سوورەتی (**الدخان**)ە، شەشەمیشیان سوورەتی (**الجاثية**)یە، حەوتەمیشیان سوورەتی (**الأحقاف**)ە، ئنجا لە نێو هەر حەوت (٧) سوورەتەکەدا، کە بە (**حم**) دەست پێدەکەن، تەنیا ئەم سوورەتی (**الشورى**)، وێڕای (**حم**) کە ئەو دوو پیتە لە سەرەتاوە هاتوون، سێ پیتی دیکەش هاتوون: (**عسق**)، کە دیارە (**حم**) کراوە بە ئایەتێك و، (**عسق**)یش کراوە بە ئایەتێکی دیکە، لە هەموو قورئانیشدا ئەمە تاکە حاڵەتێکە کە بەم شێوەیە بێ، کە چەند پیتێکی پچڕ پچڕ بکرێن بە دوو ئایەت، لە هەموو قورئان هەمیشە پیتە پچڕ پچڕەکان، هەر بە یەك ئایەت یان بەبەشێك لە ئایەتێك هاتوون، ئەگەر تەنیا یەك پیت بن، وەك: ص و ق و ن، بەڵام ئەوانی دیکە: ئەگەر دووانن، ئەگەر سیانن، ئەگەر چوارن، ئەگەر پێنجن، وەك: سوورەتی (**مريم**)، کە دەفەرمووێ: (**كهيعص**)، کراون بە ئایەتێك[1].

کاتی خۆی ئێمە لە سەرەتای تەفسیری سوورەتی (**يونس**)دا، باسێکی خەست و خۆڵمان لە بارەی ئەو پیتە پچڕ پچڕانەوە کردوە، هەروەها لە سەرەتای سوورەتی (**الشعراء**)یشدا، جارێکی دیکە لەو بارەوە قسەمان کردوەو هەندێك وردە کاریی دیکەمان باس کردوە، بۆیە لێرەدا هەروا بەسەریدا دەڕۆین و ئەوەندە دەڵێین: خوا ﷻ لە ڕێی ئەو پیتە پچڕ پچڕانەوە، کە لە سەرەتای بیست و نۆ (٢٩) لە سوورەتەکانی قورئاندا هاتوون، دەیەوێ ئەو پەیامە بە مرۆڤەکان بگەیەنێ: ئەو قورئانە بەوە بزانن فەرمایشتی منە، کە هەر لەو پیتانە پێك دێ ئێوە قسەیان پێدەکەن و پێیان دەنووسن، ئنجا ئەو کەرەستەیەی لەبەر دەستی ئێوەشدا هەیە، من ئەو قورئانەم لێ پێکهێناوە، بەڵام ئێوە قسەی ئاسایی پێدەکەن و، ناتوانن نەك وێنەی ئەو قورئانە بێنن، بەڵکو وێنەی سوورەتێکیش بێنن، سوورەتێکی سێ ئایەتیی.

---

(١) جگە لە: (طس تلك آيات القرآن وكتاب مبين).

کەواتە: بزانن ئەم فەرمایشتە ئێوە ناتوانن، وەك بەشێكی كەمی بێنن، ئەوە فەرمایشتی خوایە.

خوا دەفەرمووێ: حا میم. عەین سین قاف، ﴿ كَذَٰلِكَ يُوحِىٓ إِلَيْكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكَ ٱللَّهُ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴾، ئاوا بەو شێوەیە - سەرسوڕهێنەرە - سروش بۆ لای تۆ دەكات و، بۆ لای ئەوانەی پێش تۆش دەكات، خوای زاڵی كارزان.

سروشكردن و پەیامی پەنهان ناردنی خوا ﷻ چ بۆ لای پێغەمبەری خاتەم ﷺ، چ بۆ لای پێغەمبەرانی دیكە، شتێكی یەكجار گەورەو گرنگ و تایبەت و سەرسوڕهێنەرە و، خوا بەهۆی ئەوەوە ئەو پێغەمبەرانەی جیا كردوونەوە لە خەڵكی دیكە، وەك خوا لە سوورەتی (النمل)دا، دەفەرمووێ: ﴿ قُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ وَسَلَٰمٌ عَلَىٰ عِبَادِهِ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَىٰٓ ﴿٥٩﴾ ﴾، واتە: بڵێ: ستایش بۆ خواو سەلام لەسەر ئەو بەندانەی هەڵیبژاردوون، هەروەها لە سوورەتی (الحج)دا، دەفەرمووێ: ﴿ ٱللَّهُ يَصْطَفِى مِنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلًا وَمِنَ ٱلنَّاسِ ﴿٧٥﴾ ﴾، واتە: خوا لە فریشتەكانیش نوێنەران هەڵدەبژێرێ و، لە خەڵكیش ڕەوانە كراوانی خۆی هەڵدەبژێرێ، كە پێغەمبەرانن (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ**)، كەواتە: لێرەدا سێ لە سیفەتەكانی خوا، خراونەڕوو:

**یەكەم:** پەیامی پەنهان ناردنی، سروش كردنی (**يوحي**).

**دووەم:** باڵادەستیی خوا (**العزيز**).

**سێیەم:** كاربەجێیی خوا (**الحكيم**).

﴿ لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۖ وَهُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْعَظِيمُ ﴾، ئەوەش سیفەتی چوارەمی خوایە

**چوارەم:** هەرچی لە ئاسمانەكان و هەرچی لە زەویدا هەیە، هی ویە، خوا خاوەن و حوكمڕانی ڕەهاو بێ سنوری هەر شتێكە كە لە ئاسمانەكان و لە زەوی دا هەیە، خوا هەم حوكمڕان و باڵادەستە، هەم خاوەنیشە بۆ هەرچی لە ئاسمانەكان و لە زەویدا هەیە.

پێنجەم و شەشەم: ﴿ وَهُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡعَظِيمُ ﴾، ئەو یەکجار بەرزە، بێ سنوور بەرزەو، یەکجار و بێ سنووریش مەزنە.

حەوتەم: ﴿ تَكَادُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ يَتَفَطَّرۡنَ مِن فَوۡقِهِنَّ ﴾، نیزیکە ئاسمانەکان لە سەریانەوە داقڵیشێن، واتە: داقڵیشان و هەڵقڵیشانەکە لەسەرەوە دەست پێ بکات، بۆچی؟ لەبەر سام هەیبەتی خوا ﷻ چونکە ئەوە هەمووی پەیوەندیی بە خواوە هەیە، هەندێك گوتوویانە: بۆیە ئاسمانەکان خەریکە هەڵقڵیشێن و بشکێن، پارچە پارچە بن، لەبەر قورسیی فریشتەکان کە لەسەریانن، وەك دوایی باسی دەکەین، بەڵام ئەو مانایەی ئێمە کردمان، بەهێزترە.

هەشتەم: ﴿ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يُسَبِّحُونَ بِحَمۡدِ رَبِّهِمۡ ﴾، ئەوەش سیفەتێکی دیکەی خوایە، فریشتەکانیش بەستایشکردنەوە پەروەردگاریان بە پاك دەگرن، ﴿ وَيَسۡتَغۡفِرُونَ لِمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾، داوای لێ بوردنیش دەکەن بۆ هەموو ئەوانەی لە زەوییدان، فریشتەکان هەموو خەڵکەی لە زەوییدان، داوای لێبوردنیان بۆ لە خوا دەکەن.

نۆیەم و دەیەم: ﴿ أَلَآ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴾، ئەها ئاگاداربن! بە دڵنیایی خوا زۆر لێبوردەیە، زۆریش بەبەزەیی و میهرەبانە.

یازدەیەم: ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَ ٱللَّهُ حَفِيظٌ عَلَيۡهِمۡ ﴾، ئەوانەش کە جگە لە خوا دۆستانێك پشتیوانان و سەرپەرشتیارانێك بۆ خۆیان دەگرن، ﴿ ٱللَّهُ حَفِيظٌ عَلَيۡهِمۡ ﴾، خوا بەسەریانەوە پارێزەرە، خوا پارێزەریانە، واتە: پارێزەری کردەوەکانیانە، پارێزەری قسەکانیانە، پارێزەری هەڵسوکەوتەکانیانە، ﴿ وَمَآ أَنتَ عَلَيۡهِم بِوَكِيلٖ ﴾، تۆش بەسەریانەوە کار پێسپێردراوی ئەی موحەممەد ﷺ! واتە: تۆ لێت ناپرسرێتەوە بۆچی کوفریان کردو، بێبڕوابوون، بۆچی تاوانیان کردو لادانیان کرد، دوای ئەوەی پەیامی خوایان پێ دەگەیەنی، بەرپرسیاریەتیی لە ئەستۆی خۆیان دایە.

دوازدەیەم: ﴿ وَكَذَٰلِكَ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ قُرۡءَانًا عَرَبِيّٗا ﴾، هەر بەم شێوەیەی سروشمان کردوە بۆ پێغەمبەرانی پێش تۆ، قورئانێکیشمان بە زمانی عەرەبیی بۆ تۆ ناردوە، ﴿ لِّتُنذِرَ أُمَّ ٱلۡقُرَىٰ وَمَنۡ حَوۡلَهَا ﴾، تاکو دایکی ئاوەدانییەکان بترسێنێ (کە مەککەیە)، واتە:

خەڵکی دایکی ئاوەدانییەکان ﴿ وَمَنْ حَوْلَهَا ﴾، هەروەها ئەو خەڵکەی لە دەوری مەککەیە، کە هەموو گۆی زەوی دەگرێتەوە، ئەوانەی پێ بترسێنی، وریایان بکەیەوە ﴿ وَتُنذِرَ يَوْمَ الْجَمْعِ ﴾، هەروەها بۆ ئەوەی خەڵك ئاگادر بکەیەوەو بترسێنی لە ڕۆژی کۆکردنەوە ﴿ لَا رَيْبَ فِيهِ ﴾، کە هیچ دوو دڵیی تێدانیە، ﴿ فَرِيقٌ فِي الْجَنَّةِ وَفَرِيقٌ فِي السَّعِيرِ ﴾، کە سەرەنجام کۆمەڵێك لە بەهەشتدا سەقامگیر دەبن و، کۆمەڵێکیش لە نێو کڵپەی دۆزەخدان، واتە: وەك سەرەنجامی کۆتایی بەو شێوەیەی لێ دێ، کە ئەوە ڕێگر نیە لەوەی، پێش ئەوەی خەڵك هەمووی لە بەهەشتدا، یاخود لە دۆزەخدا نیشتەجێ بێ، کۆمەڵێك بسووتێنرێن لە بڕواداران و سزا بدرێن، هەروەها کە کۆمەڵێکیش لە سەر ئەعراف دەبن، وەك لە سوورەتی (**الأعراف**)دا هاتوە، ئەوە لەگەڵ ئەوەدا تێکناگیری، چونکە ئێرە باسی دەرەنجامی کۆتایی دەکات.

﴿ وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ لَجَعَلَهُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً ﴾، ئەگەر خواش ویستبای هەمووی دەگێڕان بە یەك کۆمەڵ، واتە: هەمووی لەسەر ئیمان کۆدەکردنەوە، کە خوا حەزی لە ئیمانە، هەروەها خوا دەیتوانی هەموویان لەسەر کوفر کۆبکاتەوە، ﴿ وَلَٰكِن يُدْخِلُ مَن يَشَاءُ فِي رَحْمَتِهِ ﴾، بەڵام هەر کەسێك بیەوێ دەیخاتە نێو بەزەیی خۆیەوە، واتە: بەڵام ئازادی کردوون و، هەر کەسێك کە بیەوێ بە هۆی وەرگرتنی هیدایەتی خواوە، دەیخاتە نێو بەزەیی خۆیەوە، ﴿ وَالظَّالِمُونَ مَا لَهُم مِّن وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴾، ستەمکارانیش هیچ سەرپەرشتیارو هاوکارو یارمەتییدەرێکیان نیە.

﴿ أَمِ اتَّخَذُوا مِن دُونِهِ أَوْلِيَاءَ ﴾، یان ئایا جگە لەو سەرپەرشتیارانێکیان پەیداکردوون، ﴿ فَاللَّهُ هُوَ الْوَلِيُّ ﴾، ئەمەش سیفەتی سێزدەیەم: بە دڵنیایی هەر خوا سەرپەرشتیاری ڕاستەقینەیە ﴿ وَهُوَ يُحْيِي الْمَوْتَىٰ ﴾، ئەمەش سیفەتی چواردەیەم: هەر ئەو مردووان دەژیێنیتەوەو ﴿ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴾، ئەمیش سیفەتی پازدەیەم: ئەو لەسەر هەموو شتێکیش بە توانایە.

﴿ وَمَا ٱخۡتَلَفۡتُمۡ فِيهِ مِن شَيۡءٖ فَحُكۡمُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ ﴾، سیفەتی شازدەیەم: هەر شتێکیش تێیدا دەکەونە ڕاجیاییەوە، بڕیارو حوکمەکەی بۆ لای خوایە، ﴿ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبِّي ﴾، سیفەتی حەڤدەیەم: {تۆ بڵێ:} ئا ئەوەتان پەروەردگارمە، ئا ئەو خوایەتان پەروەردگاری منە، ﴿ عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُ وَإِلَيۡهِ أُنِيبُ ﴾، پشتم هەر بەو دەبەستم و هەر بۆ لای ئەویش دەگەڕێمەوە.

﴿ فَاطِرُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾ سیفەتی هەژدەیەم: داهێنەری ئاسمانەکان و زەوییە ﴿ جَعَلَ لَكُم مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ أَزۡوَٰجٗا ﴾ سیفەتی نۆزدەیەم: لە خۆتان هاوسەرانتانی بۆ هێناونە دی، جووتەکانی بۆ هێناونە دی، ئەی مرۆڤەکان! ﴿ وَمِنَ ٱلۡأَنۡعَٰمِ أَزۡوَٰجٗا ﴾ سیفەتی بیستەم: هەروەها لە ئاژەڵانیش جووتی خوڵقاندوون، واتە: هەم ئێوەی بە جووت (نێرو مێ) و هەم ئاژەڵەکانیشی بە جووت، خوڵقاندوون، ﴿ يَذۡرَؤُكُمۡ فِيهِ ﴾ سیفەتی بیست و یەکەم: لەو جووتییەدا زۆرتان دەکات، وەچەتان بەردەوام دەکات، ﴿ لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞ ﴾، سیفەتی بیست و دووەم: هیچ شتێك وەك وی نیە، زەینتان بەلای ئەوەدا نەچێ، خوا ڕەگەزی هەبێ، ڕەگەزو جووتیەتیی و، نێرو مێیەتیی بۆ ئێوە داناوە، وەك یاسایەك تاکو وەچەتان پێ بەردەوام بێ.

گوتراوە: (**كُلُّ مَا جَرَى ببَالِكَ، فَاللَّهِ بخَلاَفِ ذَلِك**) واتە: هەرچی بە زەینی تۆ دابێ، خوا جیایە لەوە، چونکە هەرچی بەزەینی تۆ دادێ، هەر وێنەی دروستکراوەکانە، بەڵام خوا بەدیهێنەرە، ﴿ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ﴾، بیست و سێ و بیست و چوارەم: خوا بیسەری بینەرە، بەڵام بیستنەکەی و دیتنەکەی، وەك هی ئێمە نیە، وەك چۆن زاتی خوا لە زاتی شتەکان جیایە، هەموو سیفەتەکانی و هەموو حاڵەکانی و هەموو کردەوەکانیشی، جیان لە هی دروستکراوەکان.

کەواتە: چوونە سەر عەرشی خوا، لە سەرەوەی دروستکراوەکان بوونی خوا، دیتنی خوا، بیستنی خوا، فەرمایشت فەرموونی خوا، دەستەڵاتی خوا، بەزەیی

خـوا، هەمـوو سـیفەتەکانی خـوا، دەبـێ بڵێیـن: وەك بـۆ خـوا شایسـتەن، وان، نـەك بـەو چەمـك و واتایانـەی دێنـە زەینـی ئێمـەوە، چونکـە ئـەو چەمـك و واتایانـەی دێنە زەینـی ئێمـەوە، هەموویانمـان لـە دروسـتکراوەکانی دارنیـون، بـەڵام خـوا ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَيْءٌ﴾، ئەمـە بناغـەو بنچینـەی بـە پاکگرتنـی خوایـە ﷻ، لـەوە کـە لـە هیـچ ڕوویەکـەوەو لـە هیـچ شـتێکیدا، وەك دروسـتکراوەکانی بچـێ.

لـە کۆتایـی دا دەفەرمـوێ: ﴿لَهُۥ مَقَالِيدُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ سـیفەتی بیسـت و پێنجـەم: کلیلـەکانی ئاسـمانەکان و زەوی هـەر هـی ئـەون، بەدەسـت ویـن، ﴿يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ﴾ سـیفەتی بیسـت و شەشـەم: بـۆ هـەر کەسـێك کـە بیەوێ بژیـو فـراوان دەکات و، وەتەنـگ دێنـێ، واتـە: لـە هەنـدێ حاڵـدا بـۆی فـراوان دەکات و لـە هەنـدێ حاڵـدا بـۆی وەتەنـگ دێنـێ، یاخـود: بـۆ هـەر کەسـێك بیـەوێ بژیـو فـراوان دەکات و، بـۆ هـەر کەسـێکی دیکـەش بیـەوێ، بژیـو تەنـگ دەکات، کەمـی دەکاتـەوە، ﴿إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ سـیفەتی بیسـت و حەوتـەم: بـە دڵنیایـی ئـەو بـە هەمـوو شـتێك زانایـە، کـە بـە هەمـوو شـتێك زانایـە، واتـە: زۆر کـردن و کـەم کـردنی بژیویـش بـۆ تـاك تـاکی مرۆڤـەکان، لـە حاڵەتـە جیاجیاکانـدا، یاخـود زۆر کـردنی بژیـو بـۆ هەندێکیـان و کەمکرنـەوەی بـۆ هەندێکیـان، بێگومـان هەمـووی لـە ڕووی زانیاریـی بـێ سـنووری خۆیەوەیـەتی، لـە ڕووی حیکمـەت و کارزانیـی بـێ سـنووری خۆیەوەیـەتی، بـە پێـی ئـەو سیسـتمە ناوازەیـەی کـە لـە ژیـانی بەشـەردا دایناوە، ئێمـە دوایـی لـە مەسـەلە گرنگەکانـدا لـە بـارەی فراوانکـردن و تەسـککردن، یاخـود: زۆر کـردن و کەمکـردنی خـوا بـۆ بژیـوی مرۆڤەکانـەوە، باسـێکی تایبـەت دەکەیـن.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**سروشکردنی خوا بۆ پێغەمبەری کۆتایی و سەرجەم پێغەمبەرانی دیکەو، وەسفکرانی خوای بەرزو مەزن بە یازدە سیفەتە بەرزو بێ وێنەکانی:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿حمٓ ﴿١﴾ عٓسٓقٓ ﴿٢﴾ كَذَٰلِكَ يُوحِىٓ إِلَيْكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكَ ٱللَّهُ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٣﴾ لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۖ وَهُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْعَظِيمُ ﴿٤﴾ تَكَادُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ يَتَفَطَّرْنَ مِن فَوْقِهِنَّ ۚ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَيَسْتَغْفِرُونَ لِمَن فِى ٱلْأَرْضِ ۗ أَلَآ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥﴾ وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهُ حَفِيظٌ عَلَيْهِمْ وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِوَكِيلٍ ﴿٦﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە سێزدە بڕگەدا:

١)- خوا عزوجل دوای دەست پێکردن بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، دەفەرموێ: ﴿حمٓ ﴿١﴾ عٓسٓقٓ﴾، ئەمانە پێنج پیتن، دوویان پێکەوە: حا میم (**حـم**)، سێشیان پێکەوە: عەین سین قاف (**عـسـق**)، بەڵام هەموویان پچڕ پچڕ دەخوێنرێنەوە، بە عەرەبیی پێیان دەگوترێ: (**الحُرُوفُ المُقَطَّعَة**) پیتە لێك دابڕێنراوەکان، کە ئێمە لە سەرەتای تەفسیری سوورەتی (**یونس**)دا، باسێکی وردمان لە بارەی ئەو پیتە پچڕ پچڕانەوە کرد، کە لە سەرەتای بیست و نۆ (٢٩) لە سوورەتە موبارەکانی قورئاندا هاتوون، هەروەها لە سەرەتای سوورەتی (**الشعراء**)یشدا، جارێکی دیکە هەندێك شتمان لەو بارەوە باسکرد، شایانی باسە: ئەو پیتانە کە لە سەرەتای بیست و نۆ سوورەتەوە هاتوون، ئەو پیتە پچڕ پچڕانە، هەیانە یەك پیتە، کە لە سەرەتای سێ سوورەتەوە هاتوون: (**ص، ق، ن**)، هەیانە

دوو پیتن، کە دوو پیتەکان زۆرن وەك: (**یس، طه**) و هەموو (**حم**)ەکان، هەیانە سێ پیتن، وەك: (**ألـم**)ەکان، ئەوانیش زۆرن هەروەها (**ألـر**)ەکان و (**طسم**)ەکان، هەیانە چوار پیتن وەك: (**المـر، المـص**) دوو سوورەتیشیان پێنج پیتیین کە سەرەتای سوورەتی (**مریم**) ە: (**كـهـيـعـص**)و، سەرەتای ئەم سوورەتی، (**الشورى**)یە: (**حم، عسق**) ئێمە لە شوێنی ئاماژە پێکراودا باسێکی تێرو تەسەلمان لە بارەوە کردووە، لێرە هەڵیناپرووزێنین و بەو ئاماژە کورتە، واز دێنین و دەڵێین: خوای بەرزی مەزن، لە سەرەتای بیست و نۆ لە سوورەتە موبارەکەکانی قورئان، کە دووانیان مەدینەیین و ئەوانی دیکە مەککەیین، ئەم پیتە پچڕ پچڕانە دێنێ، گرنگترینی ئەو ئامانجانەی دەیانپێکن، ئەوەیە، کە ئەم قورئانە بەرزو مەزنە، هەر لەو پیتانەو لەو دەنگانە پێکهاتوە کە مرۆڤەکانی بەکاریان دەهێنن، بۆ ئاخاوتن و نووسین، ئنجا کە ناتوانن نەك وێنەی قورئان، بەڵکو دە (١٠) سوورەت، بگرە وێنەی سوورەتێکیش بێنن، کەواتە: با دڵنیابن ئەو زاتەی لەو پیت و دەنگانە، ئەو فەرمایشتە بێ وێنەیەی پێکهێناوە، خوای بەرزی مەزنە، ئەگەرنا مرۆڤەکان کەم و زۆر دەتوانن لاسایی یەکدی بکەنەوە.

٢)- ﴿ كَذَٰلِكَ يُوحِيٓ إِلَيۡكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكَ ٱللَّهُ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴾، هەر بەو شێوەیە خوای زاڵی کارزان سروش بۆ لای تۆ دەکات، (پەیامی پەنهانت بۆ دەنێرێ) و بۆ لای ئەوانەی لە پێش تۆش دابوون (لە پێغەمبەران). وەحیی لە زمانی عەرەبییدا (**الكَلَامُ الْخَفِيُّ**) قسەیەکی پەنهان، واتە: وەك ئەو سروشکردن و پەیامی پەنهان ناردنە، کە مەگەر هەر بە خۆی بچوێنرێ، ئەگەرنا وێنەی دیکەی نیە و هیچ شتێکی دیکە نیە، پێی بچوێنرێ، (**كَذَٰلِكَ**) واتە: وەك ئەو شێوە سەر سوڕهێنەرە لە سروشکردن، کە مەگەر هەر بە خۆی بچوێنرێ، سروشت بۆ لا دەکات، هەروەها بۆ لای ئەوانەش کە لە پێش تۆ دابوون، سروشی بۆ کردوون، پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ**)، کێ ئەو سروشەی کردوە؟

﴿ ٱللَّهُ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴾، خـوای باڵادەسـتی کاربەجـێ، خوایـەك ﷻ کـە خـاوەنی ئەوپـەڕی عیـزەت و باڵادەسـتییە، خـاوەنی ئەوپـەڕی زاڵبوونـە، خـاوەنی ئەوپـەڕی کارزانیـی و کاربەجێیشـە، وشـەی (**يُوحِـي**) بـە زۆریـی وا خوێندوویانەتـەوە، بـەڵام

هەندێك لە قورئانخوێنەكانیش خوێندوویانەتەوە: (كَذَلِكَ يُوحَى إِلَيْكَ وَإِلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكَ) ئەو شێوەیە بۆ لای تۆ سروش دەكرێ و بۆ لای ئەوانەی پێش تۆش لەلایەن خوای زاڵی كارزانەوە.

كەواتە: ئەوانە سێ لە سیفەتەكانی خوان:

**یەكەم:** ئەوەیەكە خوا سروش دەكات، بۆ پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) و پەیامی پەنهانیان بۆ دەنێرێ.

**دووەم:** خاوەنی ئەوپەڕی عیززەت و باڵادەستیی بوون.

**سێیەم:** خاوەنی ئەوپەڕی كارزانیی بوون.

٣)- ﴿ لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ ﴾، هەرچی لە ئاسمانەكان و هەرچی لە زەویدا هەیە، هی ئەوە، زانایان وا تەعبیری دەكەن دەڵێن: (لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ مِلْكًا وَمُلْكًا) واتە: چ وەك خاوەندارێتیی، چ وەك حوكمڕانیەتیی هەر خوا ﷻ هەمەكارەی ئاسمانەكان و زەوییە، (مِلْك): شتێكە كە خاوەنێكی هەبێ، (مُلْك)یش، بە مانای حوكمڕانیی و دەستەڵاتدارێتیی دێ.

كەواتە: ئەم گەردوونە بەسەرو خواریەوە، وەك زانایان دەڵێن: (عُلْوِيِّهِ وَسُفْلِيِّهِ) سەرێ و خوارێی، هەمووی هەم خاوەن تێیدا، تەنیا خوایە، هەم حوكمڕان و باڵادەست تێیدا، تەنیا خوایە ﷻ.

ئەمەش سیفەتی چوارەم.

٤)- ﴿ وَهُوَ ٱلْعَلِيُّ ٱلْعَظِيمُ ﴾، هەر ئەویش زۆر بەرزە، زۆریش مەزنە، ئەمەش سیفەتەكانی: پێنج و شەش، دیارە بەرزیی خوا ﷻ بە ڕەهایی و، مەزنیی خوا بە ڕەهایی، مەبەست پێیان وەك هەموو سیفەتەكانی دیكەی خوا، دەبێ بگوترێ: بەرزیی و مەزنییەك كە بۆ خوا شایستەن، خوا بەرزە، ئەوپەڕی بەرزیی هەیەو، ئەوپەڕی مەزنیی هەیە، بەڵام بەرزییەك و مەزنییەك كە بۆ خوا ﷻ شایستەن، نەك مرۆڤ شتێكی بێتە زەینەوە، وەك بەرزیی

دروستکراوەکان، هەندێکیان بەسەر هەندێکیاندا، یاخود مەزنیی دروستکراوەکان، کە بە دڵنیایی مانای هەموو سیفەتەکانی خواو، هەموو کردەوەکانی خواو، هەموو ناوەکانی خوا، جیان لەو ماناو مەبەستانەی کە ئێمە بۆ دروستکراوەکانی بەکاریان دێنین، مانایان هەیە، مانای ڕاستەقینەیان هەیە، بەڵام ئەو ماناو ڕاستەقینەیە بۆ ئێمە نەزانراوە، هەڵبەتە جاری واش هەیە خوا ﷻ وشەیەك بە مانای مەجازییەکەی بەکاردێنی، بەڵام سیفەتەکانی خواو کردەوەکانی خوا، هەموویان مانای ڕاستەقینەیان هەیە، بەڵام بۆ ئێمە زانراو نیە.

کەواتە: سەرچاوەی ئەو سروشە کە بۆ لای تۆ دەکرێ و بۆ پێش تۆش کراوە، خوایەکە ﷻ خاوەنی هەموو ئەو سیفەتە بەرزو ناوازانەیە.

٥)- ﴿ تَكَادُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ يَتَفَطَّرْنَ مِن فَوْقِهِنَّ ﴾، نیزیکە ئاسمانەکان لە باری سەرێیانەوە هەڵقڵیشێن، وشەی (يَتَفَطَّرْنَ) خوێنراویشەتەوە: (يَنْفَطِرْنَ)، (تَكَادُ)ش، خوێنراوەتەوە: (يَكَادُ)، هەم بە (تَكَادُ)، هەم بە (يَكَادُ) خوێنراوەتەوە، ئەگەر (يَكَادُ)بێ، ئاسمانەکان، بە مانای (سَمَاء)ن، یان لەبەر ئەوەی (السموات) (**المُؤَنَّث المَجَازِي**)ین، (يَنْفَطِرْنَ)ش، لەگەڵ (يَتَفَطَّرْنَ) هەردووکیان یەك واتایان هەیە: (**أَيْ: يَتَشَقَّقْنَ**) (**وَيَتَصَدَّعْنَ**) شەق و پەق دەبن، لەت و پەت دەبن، یاخود هەڵدەقڵیشێن، (**الْفَطْرُ: هُوَ الشُّقُ طُولاً**) شتێك بە باری درێژییدا شەق ببێ، هەڵبقڵیشێ.

کە دەفەرمووێ: ﴿ مِن فَوْقِهِنَّ ﴾، ئەم ڕاناوە دەگەڕێتەوە بۆ ئاسمانەکان، واتە: هەڵقڵیشانەکە لە باری سەرێیانەوە دەست پێدەکات، دەشگونجێ ﴿ مِن فَوْقِهِنَّ ﴾، بگەڕێتەوە بۆ زەوییەکان، واتە: لەسەرەوەی زەوییەکانەوە، بەڵام مانای یەکەمیان زیاتر پێدەچێ و، (من) لە: ﴿ مِن فَوْقِهِنَّ ﴾دا زیاد کراوە بۆ تەئکید کردنەوەی لەسەرەوەی هەڵقڵیشانی ئاسمانەکان، واتە: لە سەری سەرێوەو لە کوێ سەرەتای سەرێیە، لەوێوە ئەو هەڵقڵیشانانە خەریکە دەست پێدەکات.

هەڵبەتە زانایان لەوبارەوە: ئایا بۆچی خوا ﷻ باسی ئاسمانەکان دەکات، کە لە سەرێیانەوە خەریکە هەڵبقڵیشێن، بشکێن، پارچەپارچە بن؟ قسەیان کردوە، دوایی ئێمە لە کورتە باسێك، لە چوار سەرنجدا، لەوبارەوە قسە دەکەین.

گرنگ ئەوەیە لێرەدا خوا ﷻ باسی ئەوە دەکات کە نیزیکە ئاسمانەکان لە باری سەرێیانەوە بشکێن، هەڵبقڵیشێن، پارچەپارچە ببن، کە ئەوەش سیفەتێکی دیکەی حەوتەمی خوای پەروەردگارە، چونکە ئەو هەڵقڵیشانەی ئاسمانەکان لە لای سەرێیانەوە، بە تەئکید پەیوەندیی بە خوای پەروەردگارەوە هەیە، واتە: لە سام هەیبەتی خوا، کە ئەوە یەکێکە لە دوو مانایەکانی و، دوایی زیاتر باسی دەکەین، ئنجا ئەو شەق بوون و هەڵقڵیشانی ئاسمان لە سوورەتی (الرحمن)یش دا خوا ئاماژەی پێداوە: ﴿ فَإِذَا ٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ فَكَانَتۡ وَرۡدَةً كَٱلدِّهَانِ ﴿٣٧﴾ ﴾، واتە: کاتێك ئاسمان شەق بوو، وەك گوڵێکی سووری لێ هات، یاخود سوور بۆوە، وەك چۆن ڕۆن داغ دەکرێ، یاخود وەك مسی قاڵکراوەی لێ هات.

٦)- ﴿ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يُسَبِّحُونَ بِحَمۡدِ رَبِّهِمۡ ﴾، فریشتەکانیش بە ستایشکردنەوە پەروەردگاریان بە پاك دەگرن، واتە: هەم بە پاکی دەگرن و بە دووری دەگرن لە هەڵەو پەڵەو کەم و کوڕیی، هەم ستایشی دەکەن بە سیفەتە بەرزو مەزنەکانی.

ئەمەش سیفەتی هەشتەم لەم چەند ئایەتەدا.

٧)- ﴿ وَيَسۡتَغۡفِرُونَ لِمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾، داوای لێبوردنیش دەکەن بۆ هەمموو ئەوانەی کە لە زەویدان، ئنجا ئایا ئەوە تەنیا بڕواداران دەگرێتەوە، یاخود هەمموو دانیشتوانی زەوی دەگرێتەوە، مرۆڤ و جند بە چاك و خراپیانەوە، بە بڕوادارو بێبڕوایانەوە؟ ئەوەش دیسان دوایی قسەی زیاتری لەسەر دەکەین.

٨)- ﴿ أَلَآ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴾، ئەمانەش سیفەتی نۆیەم و دەیەم، کە لەم شەش ئایەتەدا باسکراون: ئاگاداربن! هەر خوا ئەوپەڕی لێبوردەو ئەوپەڕی میهرەبانە، وشەی (ألاَ) واتە: ئاگاداربن، بە کوردیی دەڵێین: (ئەها)، (بزانن)، ﴿ أَلَآ إِنَّ ٱللَّهَ ﴾، بە دڵنیایی خوا، ئنجا بە (هو) ڕاناوی جیاکردنەوە. {ضَمِيرُ الْفَصْل (هُوَ)} واتە: بە سێ ئامڕاز خوا ﷻ زۆر لێبوردەیی و، زۆر بەزەیی نواندن و میهرەبانیی خۆی تەئکید کردۆتەوە: ١- (ألاَ)، ٢- (إنَّ)، ٣- (هُوَ).

٩)- ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَ ٱللَّهُ حَفِيظٌ عَلَيۡهِمۡ ﴾، ئەوانەش کە جگە لەو، یان لە جیاتی وی، یان لە خوار ئەوەوە، دۆستانێکیان سەرپەرشتیارانێکیان بۆ خۆیان پەیداکردوون، خوا پارێزەرە بەسەریانەوە.

ئەوەش سیفەتی یازدەیەمە کە لەم شەش ئایەتەدا باسکراون، واتە: خوا کردەوەکانیان، هاندەریان بۆ کردەوەکان، پەنهان و ئاشکرایان دەپارێزێ، ئاگای لە هەمووی هەیە، ئەمەش هەڕەشەیەکی شێرراوەیە، واتە: سزایان دەدا لە سەر ئەوەی جگە لە خوایان کردوە بە سەرپەرشتیاری خۆیان.

١٠)- ﴿ وَمَآ أَنتَ عَلَيۡهِم بِوَكِيلٖ ﴾، تۆش بەسەر ئەوانەوە چاودێر نی، یاخود کار پێسپێردراونی، کە نەهێڵی لابدەن، نەهێڵی بەملاولادا بچن، لێرەدا (وَكِيل) لەسەر کێشی (فَعِيل)ە، بەڵام بە مانای (مَفْعُول)ە، یانی: (وَمَا أَنْتَ مُوَكَّلٌ عَلَيْهِم) تۆ بەسەر ئەوانەوە نەکراوی بە کارپێسپێردراویان کە نە هێڵی بەملاولادا بچن.

## کورتە باسێک: چوار سەرنج لە بارەی خواو پەیوەندییەوە لەگەڵ دروستکراوەکانی دا

**سەرنجی یەکەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ يَتَفَطَّرْنَ مِن فَوْقِهِنَّ ﴾، یان (يَنْفَطِرْنَ) زانایان لەو بارەوە زۆر مشت و مڕیان کردوە، کە ئایا ئاسمانەکان بۆچی خوا ﷻ بەوە وەسفیان دەکات، کە نیزیکە هەڵبقڵیشێن لەسەرێیانەوە، نیزیکە لەت و پەت بن، لەت و پەت بوونەکەو، هەڵقڵیشانەکەش لەسەرەوە دەست پێدەکات؟ بەڵام ئەوەی زیاتر بە دڵەوە دەنووسێن، دوو واتان:

**یەکەم:** (**يتفطَّرن مِنْ هَيْبَتِهِ وَ خَشْيَتِهِ**) لەبەر سام هەیبەت و، بە مەزن گرتن و ترسان لە خوا ﷻ، ئاسمانەکان خەریکن هەڵبقڵیشێن، بۆیەش هەڵقڵیشانەکە لە سەرەوە دەست پێدەکات، چونکە خوا ﷻ بەو شێوەیە کە بۆ ئەو شایستەیە، لە سەرەوەی دروستکراوەکانی خۆیەتی، دیارە لە سەرەوەی ئاسمانەکانەوە عەرش هەیە، خوای پەروەردگار لەسەرووی عەرشەوەیە، بەڵام بەو شێوەیە کە بۆ خوا شایستەیە، نابێ مانای بەرز بوونەوەو، لەسەر بوون، لە سەرەوە بوون، (**إستواء وعلوّ وارتفاع**) بەو شێوەیە بێ کە ئێمە بۆ شتەکان بۆ دروستکراوەکان بە کاری دێنین، نابێ ئەو چەمك و واتایانە بێنە زەینمانەوە، چونکە خوا: ﴿ لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ﴾، هیچ شتێك وەك خوا نیە، وەك دوایی پێی دەگەین.

ئنجا ئەگەر لێرەدا مەبەست ئەوە بێ: لەبەر سام و هەیبەتی خوا خەریکن ئاسمانەکان هەڵبقڵیشێن، لە سوورەتی (مریم)دا، خوا ﷻ ئەوەی ڕوون کردۆتەوە، دەفەرموێ: ﴿ لَّقَدْ جِئْتُمْ شَيْـًٔا إِدًّا ﴿٨٩﴾ تَكَادُ ٱلسَّمَـٰوَٰتُ يَتَفَطَّرْنَ مِنْهُ وَتَنشَقُّ ٱلْأَرْضُ وَتَخِرُّ ٱلْجِبَالُ هَدًّا ﴿٩٠﴾ أَن دَعَوْا۟ لِلرَّحْمَـٰنِ وَلَدًا ﴿٩١﴾ ﴾، پێشێ باسی ئەوە دەکات، کە ڕۆڵە پاڵدەدەنە لای خوا، (بەشێك لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان)، خوا دەفەرموێ: بەڕاستیی شتێکی زۆر قورس و مەزنتان گوت، شتێکی

زۆر بێڕەزاتـان گـوت، (هەڵەیـەکی زۆر بێڕەزاتـان کـرد)، ئاسـمانەکان خەریکـن بـە هۆی ئـەو قسـەیەوە بقڵیشـێن، زەویـش خەریکـە لـەت بـێ، پارچـە پارچـە بـێ، چیاکانیـش خەریکـن بـە کەوتنێـك، کـە دەنگێـکی گـەورەی لێـوە بـێ، بکـەون، کەوتنەکـە دەنگێکی زەبەلاحـی لێبـێ، وەك چۆن خانوویـك دەڕووخـێ، ﴿ أَن دَعَوْاْ لِلرَّحْمَٰنِ وَلَدًا ﴾، بەهۆی ئـەوەوە کـە ڕۆڵەیـان پاڵدایـە لای خـوای خـاوەن بەزەیـی.

هەڵبەتـە ئێمـە لـە تەفسـیری سـوورەتی (**الإسراء**)دا، کورتـە باسـێکمان لـەو بـارەوە کـردوە، کـە هەرچـی دروسـتکراوی خوایـە، بـە خـوا ئاشـنایەو خـوا دەناسـێ، هـەر بۆیـە کاتێـك هەنـدێ لـە مرۆڤـەکان ڕۆڵـە پاڵدەدەنـە لای خـواو هاوبـەش بـۆ خـوا دادەنێـن، ئاسـمانەکان و زەوی و چیایـەکان و تێکـڕای دروسـتکراوەکان، زۆر نارەحـەت و قەڵسـن، خەریکـن لـە داخـان بپچڕێـن، لێکببنـەوە و بقڵیشـێن، ئەمـە مانـای یەکەم، کـە ئـەم مانایـە زیاتـر دەچێتـە دڵ و عەقڵـەوەو، ئـەو سـێ ئایەتـەی سـوورەتی (**مریـم**) یـش، زیاتـر پشـتگیریی ئـەو ڕایـە دەکـەن، کـە خـوا دەفەرمـوێ: بـە هـۆی ئـەوەوە کە هاوبـەش بـۆ خوادانـەرەکان ڕۆڵـە دەدەن پـاڵ خـوای خـاوەن بەبەزەیـی، ئاسـمانەکان خەریکــن هەڵبقڵیشــێن، زەوی خەریکــە پارچەپارچــە ببــێ، چیایەکانیــش خەریکــن بکـەون، بـە کەوتنێـك کـە دەنگێـکی گـەورەی لێـوە بێـت.

کەواتـە: کـە دەفەرمـوێ: ﴿ تَكَادُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ يَتَفَطَّرْنَ مِن فَوْقِهِنَّ ﴾، واتـە: بـە هـۆی شـیرك و کوفـری مرۆڤەکانـەوە، گـەردوون خەریـك بەسـەر یەکـدا هەڵبقڵیشـێ و تێکبچـێ، هێنـدە نارەحەتـە.

**دووەم:** واتای دووەمی کە توێژەرەوانی قورئان باسیان کردوە: (**مِنْ ثِقَلِ ما عَلَيْهِنَّ مِنَ الْمَلائِكَة**) بە هۆی ئەو قورسییەوە کە لە سەر ئاسمانەکانە، یان لە نێو ئاسمانەکاندا هەیە لە فریشتەکان، چونکە لە تەفسیری سوورەتی (**فاطر**) و سوورەتی (**الصافات**)دا، کورتە باسمان کردوون لە بارەی فریشتەکانەوە کە چەندە زۆرن!!

لێرەش ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ دووبارە دەکەینەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {أَطَّتِ السَّمَاءُ وَحُقَّ لَهَا أَنْ تَئِطَّ، مَا فِيهَا مَوْضِعُ شِبْرٍ، إِلاَّ وَفِيهِ مَلَكٌ قَائِمٌ أَوْ رَاكِعٌ أَوْ سَاجِدٌ} (أخرجه الترمذي: ٢٣١٢، وابن ماجه: ٤١٠٩، والحاكم: ٨٦٣٣، وَحَسَّنَهُ الألبَانِي)، واتە: ئاسمان جیڕەی لێهات، نەقەی لێهات، هەقی خۆشیەتی کە جیڕەو نەقەی لێ بێ، (وەك چۆن بارێکی قورس کە لە وڵاخێك دەنرێ جیڕەی لێ دێ، یان وڵاخەکە نەقەی لێ دێ لە بنیدا)، چونکە شوێنی هیچ بستێك نیە، مەگەر فریشتەیەك تێیدا وەستاوە، یاخود ڕکووعی بردوە، یاخود کڕنووشی بردوە (بۆ خوا ﷻ).

واتە: ئەو ئاسمانە پڕە لە فریشتەکان، وەك چۆن وڵاخێك بارێکی قورسی لێ دەنێن، نەقەو جیڕەی دێ، ئاوا ئاسمانیش نەقەو جیڕەی دێ.

کەواتە: کە دەفەرموێ: ﴿ تَكَادُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ يَتَفَطَّرۡنَ مِن فَوۡقِهِنَّ ﴾، واتە: بە هۆی ئەو بارە قورسەوەی لەسەر پشتیانە، کە بریتین لە فریشتەکان، ئاسمانەکان خەریکن بقڵیشێن، بەڵام مانای یەکەمیان زیاتر بە دڵەوە دەنووسێ.

**سەرنجی دووەم:** لەوبارەوە کە ئایا خوا ﷻ پەیوەندیی لە گەڵ گەردووندا، لەگەڵ ئاسمانەکان و زەویدا، لەگەڵ دروستکراوەکانیدا، چۆنە؟ دیارە خوا بە دیهێنەری هەموو شتێکەو، هەرچی هەیە هەمووی دروستکراوی خوایە، هیچی بوونی نەبووەو خوا بوونی پێداوە، لە نێو دروستکراوەکاندا ئاسمانەکان و زەوی، لە سەرووی ئەوانەوە عەرش و کورسیی، بەڕای هەندێك لە زانایان کە دەڵێن: کورسیی جیسمێکە، دروستکراوی خوایە، بەڵام کورسیی مشت مڕی لەسەرە، بەڵام عەرش ئەوە دیارە خوا لە حەوت شوێنان لە قورئاندا دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ﴾، هەروەها خوا ﷻ، هەم بۆ حاڵەتی ئێستا دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يَحۡمِلُونَ ٱلۡعَرۡشَ وَمَنۡ حَوۡلَهُۥ ﴿٧﴾ ﴾غافر، هەروەها بە نسبەت ڕۆژی دواییشەوە دەفەرموێ: ﴿ وَيَحۡمِلُ عَرۡشَ رَبِّكَ فَوۡقَهُمۡ يَوۡمَئِذٖ ثَمَٰنِيَةٞ ﴿١٧﴾ ﴾الحاقة.

کەواتە: عەرش دروستکراوێکە هەڵگیراوەو، خوای پەروەردگاریش لە سەرووی عەرشەوەیە، بەو شێوەیەی بۆ خوا شایستەیە، چونکە کاتێك نە عەرش هەبووەو، نە ئاسمانەکان و هیچ شتێك نەبووە، خوا ئەوکاتە چۆن بووە، ئێستاش هەر وایە.

لەوبارەوەش بە بۆچوونی من هەم کورتهێنان (**تفریط**)و، هەم زیادەڕۆیی (**إفراط**) هەبووە، لە نێوان دوو کۆمەڵ لە مسوڵماناندا، کە لە مێژوو دابوون و ئێستاش شوێنەواری بیرۆکەکانیان هەیە، ئەوانیش بریتین لە کەسانێك کە زێدە ڕۆییان کردوە لە بە پاکگرتنی خوادا، هەڵبەتە خوا هەتا بەپاك بگیرێ کەمە، بەڵام نابێ بە بیانووی بە پاك گرتنی خواوە، سیفەتەکان لە خوا پەك بخرێن و، سیفەتەکان لە خوا دابڕنرێن و تووشی (**تعطیل**) ببین، ئەوە لایەك، لایەکەی دیکەش زیادە ڕۆییان کردوە لە چەسپاندنی سیفەتەکان دا بۆ خوا، بە شێوەیەك کە سەریان بە وێچواندن و جەستاندن (**تشبیه وتجسیم**) گەیشتوە، ئەوانی دیکەش سەریان بە (**تعطیل وتجرید**) گەیشتوە، کە سیفەتەکان لە خوا پەك بخەن و لێی دابڕنن.

بەڵام هەق و ڕاستیی لە نێوان ئەو دووانە دایە، لەو بارەوە قسەیەکی (**فخر الدین الرازي**) دێنین، کە ئەو یەکێکە لەوانەی زێدەڕۆیی کردوە لە دوورخستنەوەی خوا لە وێچوونی دروستکراوەکانیدا، کە بە تەئکید خوا دوورە لەوەی بە دروستکراوەکانی بچێ، بەڵام نابێ بە بیانووی ئەوە سیفەتەکان لە خوا دابڕنین، (**الرازي**) لە بارەی ئەو ئایەتەوە: ﴿إِن كُلُّ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ إِلَّآ ءَاتِي ٱلرَّحۡمَٰنِ عَبۡدٗا ٩٣﴾مریم، واتە: هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، هەمووی بەبەندایەتیی دێت بۆ لای خوای خاوەن بەبەزەیی، لە بارەی ئەو ئایەتەوەو لە تەفسیری دا نووسیویەتی:

(**وَكَلِمَةُ «مَنْ» لاَ شَكَّ أَنَّهَا وَارِدَةٌ فِي حَقِّ اللَّهِ تَعَالَى، فَدَلَّتْ هَذِهِ الْآيَةُ عَلَى أَنَّ كُلَّ مَنْ فِي السَّمَوات وَالأرض فَهُوَ عَبْد لله، فَلَوْ كَانَ اللهُ مَوْجُوداً فِي السَّمَوات وَالْأَرْضِ وَفِي الْعَرْشِ، لَكَانَ هُوَ مِنْ جُمْلَةِ من فِي السَّمَوات، فَوَجَبَ أَنْ يَكُونَ عَبْدَ اللَّهِ، وَلَمَّا ثَبَتَ**

بِهَذِهِ الْآيَةِ أَنَّ كُلَّ مَنْ كَانَ مَوْجُودًا فِي السَّمَوات وَالْعَرْشِ فَهُوَ عَبْدٌ لِلَّهِ، وَجَبَ فِيمَنْ تَقَدَّسَتْ كِبْرِيَاؤُهُ عَنْ تُهْمَةِ الْعُبُودِيَّةِ، أَنْ يَكُونَ مُنَزَّهًا عَنِ الْكَوْنِ فِي الْمَكَانِ وَالْجِهَةِ وَالْعَرْشِ وَالْكُرْسِيِّ)[1].

لێرەدا (**فخرالدین الرازي**) بەڵگە هێنانەوەیەکی سەرسوڕهێنەر دەکات! خوا دەفەرموێ: {هەر کەس کە لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، هەمووی بەبەندەیی دێ بۆ لای خوای خاوەن بەزەیی} لە تەفسیریدا دەڵێ: وشەی (مَنْ) بە دڵنیایی لە بارەی خوای بەرزەوە هاتوە، ئەم ئایەتەش بەڵگەیە لە سەر ئەوە کە هەر کەسێك لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، ئەوە بەندەی خوایە، بۆیە ئەگەر خوا لە ئاسمانەکان و زەویدا (ئنجا ئەو عەرشیشی بۆ زیاد دەکات) و لە عەرشدا بووایە، ئەویش دەچووە نێو ڕیزی ئەوانەی لە نێو ئاسمانەکان دان، ئەو کاتەش خوا دەبوو بە بەندەی خوا، ئنجا کە بەو ئایەتە چەسپا کە هەکەسێك لە ئاسمانەکان و لە عەرش دایە، بەندەی خوایە، کەواتە: کەسێك کە گەورەیی ئەو زۆر پاکە، نابێ تۆمەتی بەندایەتیی پاڵ بدرێتەلاو، دەبێ بە پاك بگیری لەوەی کە لە شوێنێك دابێ، لە لایەك بێ و، لەسەر عەرش و لەسەر کورسی بێت.

پوختەی قسەکەی (**فخرالدین الرازي**) ئەوەیە کە: ئەوانەی دەڵێن: خوا لەسەر عەرشە، یان لە ئاسمانە {واتە: لە سەرەوەیە} مانای وایە بە پێی ئەو ئایەتە کە خوا دەفەرموێ: هەر کەسێك کە لە ئاسمانەکان و زەویدایە، هەمووی بەندەی خوایە، کەواتە: دەبێ خواش بەندەی خوا بێ!!

بەڵام ئێمە وەڵامی ئەو قسانە، ئاوا دەدەینەوە:

ئەوانەی دەڵێن: خوا لە سەرێیە، مەبەستیان ئەوە نیە لە نێو ئاسماندایەو ئاسمان ببێتە زەرفێك و خوای تێدابێ، بەڵێ: هەندێك وشکە حەنبەلیی و وشکە ظاهیریی، ڕەنگە وایان تەصەووڕ کردبێ، بەڵام ئەو تەصەووڕە هەڵەیەو، خوا

---

(١) التفسیر الکبیر: ج ٢٥، ص ١٢٧.

لە نێو دروستکراوی خۆیدا نیە، ئەوانەی کە دەڵێن: خوا لە سەرێیە، دەڵێن: (أَللهُ مُسْتَوٍ علَى عَرْشِهِ، بَائِنٌ عَنْ خَلْقِهِ كَمَا يَلِيقُ بِهِ) خوا لەسەر عەرشی خۆیەتی و، لە دەرەوەی دروست کراوەکانی خۆیەتی، بەو شێوەیەی بۆی شایستەیە.

بەڵێ بەداخەوە کاتی خۆی هەندێك لە حەنبەلییەکان و ظاهیرییەکان پێیان وابووە، وەك چۆن مرۆڤ لە سەر تەختێك، کورسییەك دادەنیشێ، خواش ئاوا لەسەر عەرش دانیشتوە، چوار مەشقیی، هەروەها پێیان وابووە خوا لە نێو ئاسمان دایە! یانی: ئەگەر (الرازي) بەولادا تێپەڕاندوە، بە بیانووی بە پاکگرتنی خوا، لەوەدا کە وەك دروستکراوەکانی بچێ، ئەوانی دیکەش بە بیانووی ئەوە کە سیفتەکان بۆ خوا دەچەسپێنن، زیادە ڕۆییان کردوەو تێیانپەڕاندوە کە سیفەتەکانی خوایان، وەك هی دروستکراوەکان تەماشا کردوون، ئەگەرنا چوونە سەر عەرشی خوا، بەرزبوونەوەی خوا بۆ سەر عەرش، سەقامگیربوونی خوا لەسەر عەرش، دەبێ بڵێین: وەك بۆ خوا شایستەیە، نەك بەو چەمك و واتایانەی دێنە زەینی ئێمەوە، کە هی دروستکراوەکانن.

لێرەدا چەند قسەیەك دێنمەوە، لە هەندێك لە زانایانەوە، کە لەو بارەوە، چییان گوتوە؟

**١)**- **(القرطبي)** دەڵێ: زانایان گوتوویانە: **(التَّوْحِيدُ: إِثْبَاتُ ذَاتٍ غَيْرِ مُشَبَّهَةٍ بِالذَّوَاتِ، وَلَا مُعَطَّلَةٍ مِنَ الصِّفَاتِ)**[1]، واتە: خوا بەیەکگرتن ئەوەیە ئێمە زاتێك بچەسپێنن کە وەك زاتەکانی دیکە ناچێ و، سیفەتەکانیشی لێ پەکخراونین، سیفەتەکانیشی هەن، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١١﴾﴾الشورى، هیچ شتێك وەك ئەو نیە، ئەمە بۆ بە پاکگرتنی خوا، بۆ چەسپاندنی سیفەتەکانیش: ﴿وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ﴾، ئەو بیسەری بینەریشە، واتە: سیفەتی بیستن و دیتنی هەن، بەڵام بە تەئکید سیفەتەکانیشی وەك زاتەکەینی و، وەك سیفەتەکانی دروستکراوەکان نین.

---

(١) الجامع لأحكام القرآن: ج٧، ص ٣٢٨.

دوایـی (القرطبـي) دەڵـێ: (صَـدْرُ الآيَـةِ فِيـهِ رَدٌّ عَـلَى الْمُشَـبِّهَةِ، وَتَتِمَّتُهَـا رَدٌّ عَـلَى الْمُعَطِّلَـةِ)[١]، سـەرەتای ئایەتەکـە: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ﴾، بەرپەرچـدەرەوەی وێچوێنـەرەکان (و جەستێنەرەکان)ەو، تەواوکارەکەیـشی: ﴿وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ﴾، بەرپەرچـدەرەوەی پەکخەرەکانـە، ئەوانـەی خـوا لـە سـیفەتەکانی پـەك دەخـەن و دادەڕنـن.

٢)- (الحافظ ابن عبدالبر)، وەك (جمال الدين القاسمي) لە تەفسیرەکەی خۆی دا[٢]، لێی وەردەگرێ، دەڵێ: (أَهْلُ السُّنَّةِ مُجْمِعُونَ عَلَى الْإِقْرَارِ بِالصِّفَاتِ الْوَارِدَةِ كُلِّهَا فِي الْقُرْآنِ وَالسُّنَّةِ، وَالْإِيمَانِ بِهَا، وَحَمْلِهَا عَلَى الْحَقِيقَةِ لَا عَلَى الْمَجَازِ، إِلاَّ أَنَّهُمْ لَم يُكَيِّفُوا شَيْئاً مِنْ ذَلِك)، واتە: ئەهلی سوننەت (واتە: ئەوانەی کە بەدوای ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ کەوتوون) یەکدەنگن لەسەر ئەوە: سیفەتەکان کە لە قورئان و سوننەت دا هاتوون بۆ خوا بچەسپێنرێن و، بشگوترێ مانای ڕاستەقینەیان هەیە نەك مانای مەجازیی، بەڵام هیچ کام لە سیفەتەکانی خوا، چۆنیەتییەکەیان دیاریی نەکردوون و نەیانگوتوە بەو شێوەیەن.

کەواتـە: ئـەو چەمـك و واتایانـەی دێنـە مێشـکی ئێمـەوە لـە کاتێکـدا بـۆ وێنـە: کـە وشـەی (وَجْـه) بەکاردێنیـن، یـان وشـەی (یَـدْ) بەکاردێنـن، یـان وشـەی بەرزبوونـەوە (علـوّ) بەکاردێنیـن، ئـەو چەمـك و واتایانـە نابـێ بـۆ خـوای موتەعـال بەکاربێـن.

٣)- (جمال الدين القاسمي) دەڵێ: کەواتە: ئەو کەسەی کە دەڵێ: (الله لَا فِي زَمَانٍ، وَلَا فِي مَكَانٍ، وَلَا يُرَى وَلَا يسْمَعُ، وَلَا يُبْصِرْ، وَلَا يَتَكَلَّمْ، وَلَا يَرْضَى، وَلَا يُرِيدْ، وَلَا وَلَا)[٣]، واتە: خوا لە هیچ شوێنێکدا نیە، لە هیچ کاتێك دانیەو، نابینرێ و نابیستێ و نابینێ، قسە ناکات و ڕازی نابێ و نایەوێ، نا و نا، هەتا هەندێکیان گوتوویانە: خوا ﷻ نە لە نێو گەردووندایە، نە لە دەرەوەی گەردوونە!!

---

(١) الجامع لأحكام القرآن: ج٢٥.

(٢) محاسن التأويل: ج١٤، ص ٢٩٥.

(٣) محاسن التأويل: ج ٨، ص ٣٥٦

لە ڕاستییدا ئەوە تێپەڕاندنێکی زۆرە لە بە پاکگرتنی خواداو بە بیانووی بە پاکگرتنی خواوە، دارنینی سیفەتەکانە لە خوا.

**٤)**- هەر لەو بارەوە لە: (**محاسن التأويل**)ەکەی دا[1] هێناویەتی لە (**الذهبي**)یەوە: (**وَقَالَ الذَّهَبِيُّ رَحِمَهُ الله: مَقَالُ مُتَأَخِّرِي الْمُتَكَلِّمِينَ، أَنَّ اللهَ تَعَالَى لَيْسَ فِي السَّمَاءِ، وَلَا عَلَى الْعَرْشِ، وَلَا عَلَى السَّمَوَاتِ، وَلَا فِي الْأَرْضِ، وَلَا دَاخِلَ الْعَالَمِ وَلَا خَارِجَ الْعَالَمِ، وَلَا هُوَ بَائِنٌ عَنْ خَلْقِهِ، وَلَا مُتَّصِلٌ بِهِمِ. وَقَالُوا: جَمِيعُ هَذِهِ الْأَشْيَاءَ صِفَاتُ الْأَجْسَامِ، وَاللهُ تَعَالَى مُنَزَّهٌ عَنِ الْجِسْمِ، هَذِهِ السُّلُوبُ نعُوتٌ لِلْمَعْدُومِ، بَلْ هُوَ مَوْجُودٌ مُنَزَّهٌ عَنْ خَلْقِهِ، مَوْصُوفٌ بِمَا وَصَفَ بِهِ نَفْسَهُ، وَهُوَ فَوْقَ الْعَرْشِ بِلَا كَيْفٍ**).

زەهەبیی دەڵێ: قسەی زانایانی کەلام، هی دواییینەکانیان، (واتە: ئەوانەی قسەیان لە بارەی عەقیدەو تەوحیدەوە کردوە)، کە گوتوویانە: خوای بەرز نە لە ئاسمانەو نە لە سەر عەرشەو، نە لەسەر ئاسمانەکانەو، نە لە نێو زەوییەو، لە نێو گەردوون دایەو، نە لە دەرەوەی گەردوونە، هەروەها خوا جیا نیە لە دروستکراوەکان و پێشیانەوە پەیوەست نیە، گوتوویانە: چونکە هەموو ئەوانە سیفەتی جیسم و ماددەن، خوای پەروەردگاریش لە جیسم و ماددە پاکە، (زەهەبیی دەڵێ:) تا ئەو لابردنی ئەو سیفەتانە، وەسفە بۆ شتێك كە نەبێ، {لە نێو دروستکراوەکانیدا نیە بەڵێ بەدڵنیایی، بەڵام بڵێی: لە درەوەشیاندا نیەو لەسەر عەرش نیە، ئەوە پێچەوانەی قورئان و زگماك و عەقڵیشە} دوایی (**الذهبي**) دەڵێ: قسەی ڕاست ئەوەیە کە بگوترێ: خوا پاکە لەوەی وەك دروستکراوەکانی بچێ، بەڵام وەسفکراویشە بەوەی خۆی پێوە وەسفکردوەو خوا لەسەر عەرشەو، لە سەرەوەیە، بەڵام بێ ئەوەی ئێمە چۆنیەتییەکەی بزانین {بەو چۆنیەتییە نیە، کە دروستکراوەکان لەسەر شتێك دەبن، یاخود لەسەرێ دەبن، یان لە کات و شوێندا دەبن}.

---

(١) محاسن التأويل: ج ٨، ص ٣٥٦

**سەرنجی سێیەم:** کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَيَسْتَغْفِرُونَ لِمَن فِي ٱلْأَرْضِ ﴾، واتە: فریشتەکان داوای لێبوردن دەکەن بۆ ئەوانەی لە زەوی دان، زانایان گوتوویانە: ئەمە سێ واتای هەن: یەکەم: مەبەست پێی بڕوادارانێکە کە لەسەر زەویین، ئەوە لە ئایەتی (٧)ی سوورەتی (**غافر**)دا دەفەرموێ: ﴿ وَيَسْتَغْفِرُونَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ رَبَّنَا وَسِعْتَ كُلَّ شَىْءٍ رَّحْمَةً وَعِلْمًا فَٱغْفِرْ لِلَّذِينَ تَابُوا۟ وَٱتَّبَعُوا۟ سَبِيلَكَ وَقِهِمْ عَذَابَ ٱلْجَحِيمِ ﴾، واتە: فریشتەکان داوای لێبوردن دەکەن بۆ بڕواداران (دەڵێن:) پەروەردگارمان! بەزەیی و زانیاریی تۆ هەموو شتێکی گرتۆتەوە، لەوانە ببوورە کە گەڕاونەوە بۆ لای تۆ و شوێن ڕێبازەکەت کەوتوون و، لە سزای دۆزەخ چەپاڵەیان بدە.

ئنجا ئەگەر مەبەست لە: ﴿ وَيَسْتَغْفِرُونَ لِمَن فِي ٱلْأَرْضِ ﴾، بڕواداران بێ، ئەوە ئایەتی ژمارە (٧)ی، سوورەتی (**غافر**) پشتڕاستی دەکاتەوە.

**دووەم:** دەشگونجێ مەبەست پێی مرۆڤ و جند هەموویان بێ، هەموو ئەوانەی لەسەر زەویین، بەڵام بەو واتایە نا، کە فریشتەکان داوای لێبوردن لە خوا بۆ کافران بکەن، بەڵکو بەواتایەکی دیکە: (**أي: لَا يُعَاجِلُهُمْ بِالْعِقَابِ**) فریشتەکان داوا دەکەن لە پەروەردگار کە پەلە نەکات لە سزادانی خەڵکی سەر زەوی، وەك لە سوورەتی (فاطر)دا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يُمْسِكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ أَن تَزُولَا ۚ وَلَئِن زَالَتَآ إِنْ أَمْسَكَهُمَا مِنْ أَحَدٍ مِّنۢ بَعْدِهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا ﴿٤١﴾ ﴾، واتە: بە دڵنیایی خوا ئاسمانەکان زەوی دەگرێ کە لابچن و ئەگەر لابچن، جگە لە خوا هیچ کەس نایانگرێ، بە دڵنیایی خوا زۆر هێدیی و مەندەو زۆریش لێبوردەیە.

واتە: لێبوردەیە بۆ خەڵکی نێو ئاسمانەکان و زەوی، بەو واتایە کە لە هەڵەو کەم و کوڕییەکانیان دەگەڕێ، تاکو کاتی خۆی دێ و یەکسەر سزایان نادات، وەك لە کۆتایی سوورەتی (**فاطر**)دا دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِمَا كَسَبُوا۟ مَا تَرَكَ عَلَىٰ ظَهْرِهَا مِن دَآبَّةٍ ﴿٤٥﴾ ﴾، واتە: ئەگەر خوا خەڵکی گرتبایە بە هۆی ئەوەوە کە دەیانکرد، پێڕۆی لەسەر پشتی (زەوی) نەدەهێشت.

**سێیەم:** واتایەکی دیکەی سێیەمیشی هەیە، کە من ئەو واتایەم بەدڵە، ئەویش ئەوەیە: فریشتەکان داوای لێبوردن بۆ هەمووان لە خوا دەکەن، بەڵام داوای لێبوردن بۆ ئیمانداران دەکەن، کە خوا لێیان ببووڕێ و، داوای لێبوردنیش بۆ ئەهلی کوفر دەکەن، کە خوا هیدایەتیانداو، بیانخاتە سەر ڕاستە ڕێ.

**سەرنجی چوارەم:** کە دەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَنتَ عَلَيۡهِم بِوَكِيلٖ ۝٦﴾ الشورى، تۆ بەسەریانەوە وەکیل نی، (**التَّوْكِيلُ: أَنْ تَعْتَمِدَ عَلَى غَيْرِكَ، وَتَجْعَلَهُ نَائِباً عَنْكَ، والوَكِيلُ فَعِيلٌ بِمَعْنَى المَفْعُول. قَالَ تَعَالَى: ﴿وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلٗا ۝٨١﴾ النساء، أي: اكْتَفِ بِهِ، أَنْ يَتَوَلَّى أَمْرَكَ، وَيَتَوَكَّلَ لَكَ، ﴿وَمَآ أَنتَ عَلَيۡهِم بِوَكِيلٖ﴾، أي: بِمُوَكَّلٍ عَلَيْهِمْ وَحَافِظٍ لَهُمْ**)[1]، واتە: (توکیل): بریتیە لەوە کە تۆ پشت بە جگە لە خۆت ببەستی و، بیکەی بە نوێنەر و جێگری خۆت، (وَكِيل) لەسەر کێشی (فَعِيل)ە، بەڵام بە مانای (مَفْعُول)ە، کە دەفەرموێ: ﴿وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلٗا ۝٨١﴾ النساء، واتە: خوات بەسە، کاری تۆی عاید بێ، وەکیلی تۆ بێ، ﴿وَمَآ أَنتَ عَلَيۡهِم بِوَكِيلٖ﴾، واتە: تۆ نەکراویە وەکیل بەسەریانەوەو، تۆ پارێزەریان نیت.

کە ئەمە بێگومان دڵدانەوەی پێغەمبەری خوایە ﷺ، هەروەها دڵدانەوەی شوێنکەوتووانی پێغەمبەری خوایە ﷺ، کە ئەگەر ئەوانە بێبڕوابوون و ڕوویان لە شیرك و کوفر کرد، خوا سزای ئێوە نادات و لێتان ناپرسێتەوە: بۆچی نەتانهێشت؟ چونکە ئێوە وەکیل نین بەسەریانەوە، بەڵام وێڕای ئەوەش، ئاگادارکردنەوەی بێبڕوایانیشە کە: خۆتان بەرپرسیارن لە کردەوەو ڕەفتاری خۆتان و هیچکەس لە جیاتی ئێوە لێی ناپرسرێتەوە، خۆتان بەرپرسیاری کارو کردەوەکانی خۆتانن.

---

(١) مفردات ألفاظ القرآن: ص ٨٨٢.

**مەسەلەی دووەم:**

**خـوا ﷻ وەك سروشـكردنی بـۆ پێغەمبـەرانی پێشـوو (عَلَيْهِـمُ الصَّـلَاةُ وَالسَّـلَامُ)، قورئانێـكی بـە زمـانی عەرەبیـی بـۆ لای تـۆش (ئـەی موحەممـەد! ﷺ) سروشـكردوە، تاكـو خەڵكـی شـاری مەككـەو دەوروبـەری، {تێكـڕای دنیـا} هۆشـیار بكەیـەوە، لـە ڕۆژێـك كـە دوو دڵیـی هەڵناگـرێ و خەڵـك تێیـدا دەبنـە دوو كۆمەڵـی جیـاواز لـە دۆزەخ و، لـە بەهەشـتدا، خـواش نەیویسـتوە خەڵـك ناچار بـكات، ئەگەرنـا دەیكردنە یـەك كۆمـەڵ و لـە سـەر ئیـمان كـۆی دەكردنـەوەو، جگـە لـە خـواش بـە دۆسـت و سەرپەرشـتیار گرتـن شـتێكی بێجێیـە، چونكـە بـەس خـوا سەرپەرشـتیارەو، مـردووان دەژێنێتـەوەو لەسـەر هەمـوو شـتێكیش توانایـە:**

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا لِّتُنذِرَ أُمَّ ٱلْقُرَىٰ وَمَنْ حَوْلَهَا وَتُنذِرَ يَوْمَ ٱلْجَمْعِ لَا رَيْبَ فِيهِ ۚ فَرِيقٌ فِى ٱلْجَنَّةِ وَفَرِيقٌ فِى ٱلسَّعِيرِ ﴿٧﴾ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَهُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَلَٰكِن يُدْخِلُ مَن يَشَآءُ فِى رَحْمَتِهِۦ ۚ وَٱلظَّٰلِمُونَ مَا لَهُم مِّن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿٨﴾ أَمِ ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ ۖ فَٱللَّهُ هُوَ ٱلْوَلِىُّ وَهُوَ يُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٩﴾ ﴾.

## شیكردنەوی ئەم ئایەتانە، لە چواردە بڕگەدا:

١)- ﴿ وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا ﴾، هەر بەو شێوە {سەرسوڕهێنەرە كە هەر دەبێ بە خۆی بچوێنرێ، یاخود: بەو شێوەیە كە خوا ﷻ سروشیكردوەو پەیامی پەنهانی ناردوە بۆ پێغەمبەرانی پێشوو} بۆ لای تۆش قورئانێكمان بە زمانی عەرەبیی سروشكردوە، لێرەدا (**أُطْلِقَ الْقُرْآنُ: وَهُوَ مَصْدَرٌ مِثْلُ غُفْرَانٌ، أُطْلِقَ عَلَى الْمَقْرُوءِ**) واتە: خوێنراوەیەكی عەرەبییمان بۆ لای تۆ ناردوە، كەواتە: هیچ جیاوازیی نیە لە نێوان ئەوەدا كە بۆ لای تۆ سروشكراوەو، ئەوەی بۆ لای پێغەمبەرانی پێش تۆ (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ**)، سروشكراوە، جگە لە جیاوازیی ئەو زمانەی كە فەرمایشتەكانی خوایان پێ سروشكراون و، كتێبەكانی

خوایان پێ دابەزێنراون، بەس زمانەکان جیابوون، ئەگەرنا نێوەڕۆکیان هەمان نێوەڕۆك بووەو، چۆنیەتیی سروشکرانەکەش هەمان چۆنیەتیی بووە.

ئنجا ئایا بۆچی خوا ﷻ قورئانی بەزمانی عەرەبیی بۆ لای موحەممەد ﷺ پێغەمبەری کۆتایی سروشکردوە؟

٢)- ﴿لِّتُنذِرَ أُمَّ ٱلْقُرَىٰ وَمَنْ حَوْلَهَا﴾، تاکو (خەڵکی) دایکی ئاوەدانییەکان (مەککە)و ئەو خەڵکەی لە دەوریی وریا بکەیەوەو بترسێنی. ﴿أُمَّ ٱلْقُرَىٰ﴾ شۆرەت و کونییەی شاری مەککەیە، بۆیەش بە مەککە گوتراوە: ﴿أُمَّ ٱلْقُرَىٰ﴾، چونکە لە هەموو شارە عەرەبییەکان دێرینتر بووە، ئنجا ئەگەر شاری مەککە وەك چەقێك دابنرێ، مانای وایە هەموو شارەکانی دیکەی دنیا، دەکەونە دەوری مەککە، بەڵکو هەندێك لە زانایان، زانایانی جوگرافیناسیی هاوچەرخ دەڵێن: ئەو شوێنە جوگرافییەی شاری مەککەی کەوتۆتێ، وەك نێوەڕاستی گەیاندنی هەموو کیشوەرەکان وایە.

کەواتە: ئامانج لە سروشکرانی قورئانێکی عەرەبیی بۆ پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ بریتیی بووە لە وریاکردنەوەو ترساندنی خەڵکی شاری مەککە.

﴿وَمَنْ حَوْلَهَا﴾ ئەو خەڵکانەش لە دەوری ئەو شارەن، کە ئەمە ئەگەر بازنە تەسکەکە ڕەچاو بکرێ، کە شاری مەککە لە نیوە دورگەی عەرەبیی دایە، هەموو ئەو شارو ئاوەدانییانەی لە نیوە دورگەی عەرەبییدان، لە دەوریی، بەڵام ئەگەر بازنە فراوانەکە ڕەچاو بکرێ، هەموو شارەکان و ئاوەدانییەکانی دنیا، دەکەونە دەوری مەککە.

خوا ﷻ لە چەندان شوێن لە قورئانی مەککەیدا ڕایگەیاندوە کە ئەم قورئانەو، پێغەمبەری خاتەم ﷺ کە ئەو قورئانەی بۆ نێردراوە، هەردووکیان بۆ هەموو مرۆڤایەتیین، بۆ وێنە:

١)- لە سوورەتی (**الفرقان**)دا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ تَبَارَكَ ٱلَّذِى نَزَّلَ ٱلْفُرْقَانَ عَلَىٰ عَبْدِهِۦ لِيَكُونَ لِلْعَٰلَمِينَ نَذِيرًا ﴿١﴾ ﴾، واتە: بەرزو بە پێزە ئەو کەسەی کە فورقانی دابەزاندوە، (لێك جیاکەرەوەی دابەزاندوە) تاکو بۆ هەموو جیهانییان ببێتە ترسێنەرو ورياکەرەوە.

٢- هەروەها لە سوورەتی (**سبأ**)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا ﴿٢٨﴾ ﴾، واتە: تۆمان نەناردوە مەگەر بۆ تێکڕای خەڵکی موژدەدەرو ترسێنەر بی.

٣- هەروەها لە سوورەتی (**الأنبياء**)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿١٠٧﴾ ﴾، واتە: تۆمان نەناردوە مەگەر بەزەیی خوا بی بۆ هەموو جیهانییان.

کە دەفەرموێ: ﴿ لِّتُنذِرَ أُمَّ ٱلْقُرَىٰ ﴾، ﴿ أُمَّ ٱلْقُرَىٰ ﴾، دەبێتە بەرکاری یەکەم بۆ وشەی (**تُنْذِرَ**) بەڵام لە چی بیانترسێنێ و بۆچی وريايان بکاتەوە؟ بەرکاری دووەم (**مَفْعُول بِهِ الثاني**) قرتێنراوە، چونکە سیاقەکە دەلالەتی لەسەر دەکات: (**لِتُنْذِرَ أُمَّ الْقُرَى عَذَابَ اللهِ**) تاکو خەڵکی شاری ﴿ أُمَّ ٱلْقُرَىٰ ﴾، بترسێنی و وريابکەیەوە لە سزای خوا، ﴿ وَمَنْ حَوْلَهَا ﴾، هەروەها ئەو خەڵکەش کە لە دەوری ئەو شارەن، ئەوانەش بترسێنی لە سزای خوا.

٣)- ﴿ وَتُنذِرَ يَوْمَ ٱلْجَمْعِ لَا رَيْبَ فِيهِ ﴾، هەروەها بیانترسێنی لە ڕۆژی کۆبوونەوە، کە دوولیی تێدانیە. لێرەدا: ﴿ يَوْمَ ٱلْجَمْعِ ﴾، دەبێتە بەرکاری دووەم، بە پێچەوانەی ڕستەی یەکەمەوە، ڕستەی یەکەم بەرکاری یەکەمی باسکراو، بەرکاری دووەمی قرتێندراوە، لەبەر ئەوەی سیاق دەیگەیەنێ، تاکو لە ڕۆژی کۆبوونەوە بترسێنی، کێ بترسێنێ؟ بەرکاری یەکەم قرتێنراوە (**أَيْ: تُنْذِرَ أَهَلَ أُمِّ الْقُرَى وَمَنْ حَوْلَهَا يَوْمَ الْجَمْعِ**) واتە: خەڵکی ﴿ أُمَّ ٱلْقُرَىٰ ﴾، و خەڵکەکانی دەوروبەریان بترسێنی و وريابکەیەوە، لە ڕۆژی کۆبوونەوە.

بێگومان ڕۆژی خڕبوونەوەو، کۆبوونەوە ڕۆژی قیامەتە، وشەی: (**الجمع**) لە (﴿ يَوْمَ ٱلْجَمْعِ ﴾)دا: (**الجَمْعُ مَصْدَرٌ أَوْ اسْمٌ لِلْمُجْتَمِعِين**) (**الجمع**) چاوگە، یاخود ناوە بۆ ئەوانەی لەوێدا کۆدەبنەوە، یانی ڕۆژی کۆمەڵ، ئەو خەڵکەی کە لەوێدا کۆمەڵ دەبێتەوە خڕدەبێتەوە، کۆمەڵ بووان، کە مەبەست پێی ڕۆژی دواییە.

﴿لَا رَيْبَ فِيهِ﴾، هیچ دوو دڵیی تێدانیە، کە دەفەرموێ: ﴿لَا رَيْبَ فِيهِ﴾، (أَيْ: دَلَائِلُهُ تَنْفِي الشَّكَّ فِي أَنَّهُ سَيَقَعُ، فَنَزَّلَ رَيْبَ الْمُرْتَابِينَ فِي مَنْزِلَةِ الْعَدَمِ، لِأَنَّ مُوجِبَاتِ الْيَقِينِ بِوُقُوعِهِ بَيِّنَةٌ) واتە: بەڵگەکانی هاتنی ڕۆژی کۆبوونەوەی خەڵك لە ڕۆژی قیامەتدا، لابەری دوو دڵییە، کە ئەو ڕۆژە هەر دەقەومێ، بۆیە دوو دڵیی دوو دڵان و، گومانداران لە بارەی ڕۆژی کۆبوونەوەوە، وەك نەبوو تەماشا کراوە، چونکە ئەو بەڵگانە دڵنیایی پێویست دەکەن، کە ئەو ڕۆژە دەبێ هەر ببێ.

٤)- ﴿فَرِيقٌ فِي الْجَنَّةِ وَفَرِيقٌ فِي السَّعِيرِ﴾، کۆمەڵێك لە بەهەشتدان و کۆمەڵێك لە کڵپە (ی دۆزەخ)دان. وشەی (**فريق**.. **وفريق**) هەردووکیان گوزارە (**خبر**)ی نیهاد (**مبتدأ**) یێکی قرتێنراون، وەك (**هُمْ فَرِيقٌ فِي الْجَنَّة**) ئەو خەڵکە کە کۆدەبنەوە، دەبنە کۆمەڵێك لە بەهەشتدا، هەروەها: (**وَهُمْ فَرِيقٌ فِي السَّعِير**) دەبنە کۆمەڵێکیش لە کڵپەی دۆزەخدا، کە مەبەست دەرەنجامی کۆتاییە، یانی: (**الْمُحَصِّلة النِّهَائِيَّة**)، دەرەنجامی کۆتایی خەڵك دابەش دەبن بۆ ئەم دوو شوێنە، بۆ بەهەشت و بۆ دۆزەخ، بەڵام ئەمە تێکناگیرێ لەگەڵ ئەوەدا کە چەندان فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ هەن و، ئەوە یەکێکە لەو شتانەی کە لە لای زۆربەی هەرە زۆری مسوڵمانان بەشێکە لە عەقیدەیان، کە خاوەنی گوناهە گەورەکان، بایی گوناهە گەورەکانیان ئەگەر پاك نەبووبنەوە، بە سزای قۆناغی بەرزەخ، یان نە کەوتبنە بەر ویستی ڕەهای خوا، یان وەبەر شەفاعەتی پێغەمبەر ﷺ نەکەوتبن، دەبێ بەقەدەر تاوانەکانیان بسووتێنرێن، ئنجا دوای ئەوەی پاك دەکرێنەوەو، سزا دەدرێن، دێنە بەهەشت، چەندان فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ لەو بارەوە هەن، لە کتێبەکانی سوننەت دا هاتوون.

ئنجا کە دەفەرموێ: کۆمەڵێك لە بەهەشت دان و، کۆمەڵێك لە دۆزەخدان، لەگەڵ ئەوەدا کە باسکرا تێکناگیرێ، چونکە لێرەدا باسی دەرەنجامی کۆتایی دەکات، بۆیە ئەوەی کاتی خۆی موعتەزیلەو خەواریج گوتوویانە[1]: ئەوە نیە کە خەڵکێك بچێتە دۆزەخ و، دوایی بچێتە بەهەشت دوای پاکبوونەوە، شتی وانیە،

---

(١) هەروەها هەندێك لە زانایانی هاوچەرخیش.

یەك ڕێیە، یان بۆ بەهەشت یان بۆ دۆزەخە، ئنجا ئایەتێکی ئاوایان بەبەڵگە هێناوەتەوە، لە ڕاستییدا نەیانپێکاوە، چونکە ئەم ئایەتە باسی دەرەنجامی کۆتایی دەکات، ئەگەرنا لە سوورەتی (**الأعراف**)دا، خوا ﷻ باسی ئەوە دەکات کە کۆمەڵێك هەن لە نێوان بەهەشت و دۆزەخاندا، لەسەر دیوار و نێوانێکن کە دەکەوێتە نێوان بەهەشت و دۆزەخەوە و، هەردووك لایان دەبینن: ﴿ وَبَيْنَهُمَا حِجَابٌ وَعَلَى ٱلْأَعْرَافِ رِجَالٌ يَعْرِفُونَ كُلًّا بِسِيمَاهُمْ ﴿٤٦﴾ ﴾!

کەواتە: ئەم ئایەتە باسی ئەوەش ناکات و هاوەڵانی ئەعرافیش ناگرێتەوە! بەڵام ئەم ئایەتە باسی دەرەنجامی کۆتایی دەکات، چونکە دوایی ئەوانەش کە لەسەر (**أَعْرَاف**)ن، واتە: لەسەر ئەو نێوانەن کە دەکەوێتە بەینی بەهەشت و دۆزەخەوە، سەرەنجام بەڕای زۆربەی زانایان، وەك لە تەفسیری سوورەتی (**الأعراف**)دا، باسمان کردوە، ئەوانیش سەرەنجام دەچن بۆ بەهەشت، چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿ لَمْ يَدْخُلُوهَا وَهُمْ يَطْمَعُونَ ﴿٤٦﴾ ﴾، واتە: ئومێدەوار بوون بە بەهەشت، بەڵام جارێ نەچوبوونەتێی.

لە سوورەتی (**النساء**)دا، باسێکمان لەو بارەوە کردوە کە خوا ﷻ باسی ئەوە دەکات: تەوبە لە دوو جۆرە کەسان وەرناگیرێ، کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا ٱلتَّوْبَةُ عَلَى ٱللَّهِ لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٍ ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٍ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١٧﴾ وَلَيْسَتِ ٱلتَّوْبَةُ لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ حَتَّىٰٓ إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ ٱلْمَوْتُ قَالَ إِنِّى تُبْتُ ٱلْـَٰٔنَ وَلَا ٱلَّذِينَ يَمُوتُونَ وَهُمْ كُفَّارٌ ۚ أُوْلَٰٓئِكَ أَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٨﴾ ﴾، واتە: وەرگرتنی تەوبە لەسەر خوا تەنها بۆ کەسانێکە بەنەزانیی خراپە دەکەن، دوایی بە نیزیکیی دەگەڕێنەوە، ئەوانە خوا گەڕانەوەیان لێ وەردەگرێ و خواش زانای کارزانە، بەڵام گەڕانەوە (واتە: تۆبە لێوەرگیران) بۆ کەسانێك نیە کە هەر خراپە دەکەن، هەتا کاتێك یەکیان مردنی دەگاتە سەر، دەڵێ: ئێستا تەوبەم کرد، [کە ئەوە مسوڵمانەو

لەسەر خراپە بەردەوامە، تاکو مردنی لێ وەدەردەکەوێ]، هەروەها تەوبە بۆ کەسانێکیش نیە کە کاتێك دەمرن بە کافریەتیی دەمرن، ئەوانە ئازارێکی بە ئێشمان بۆ داناون.

کەواتە: ئەوانەی پێشێ بە کافریەتیی نامرن، بەڵام بە گوناهباریی دەمرن، بەڵام خوا تەوبەشیان لێ وەرناگرێ، چونکە کاتێك دەگەڕێنەوەو تەوبە دەکەن، کە ئومێدیان بە ژیان نەماوە.

کەواتە: کەسێك کە کافرە تەوبەی لێ وەرناگیرێ و شایستەی سزایە، هەروەها کەسێکیش کە بڕوادارە بەڵام لەسەر تاوان و خراپان بەردەوام دەبێ تاکو دەمرێ، ئەویش تەوبەی لێ وەرناگیرێ و دەبێ هەر ئەهلی سزابێ و، نابێ وەك ئەوی دیکە کە یەك ڕێ دەچێتە بەهەشت، ئەویش یەك ڕێ بچێتە بەهەشت!

کەواتە: بەڵگە هێنانەوە بەم ڕستە قورئانییە بۆ لابردنی سزای قۆناغی بەرزەخ، لە جێی خۆیدا نیە، چونکە ئەمە باسی دەرەنجامی کۆتایی دەکات، چونکە هەندێك لە زانایانی هارچەرخ، کە بە چاکی نازانم ناویان بێنم، خوا پاداشتیان بداتەوە، بۆچوونێکی وایان هەبووە، گوتوویانە: ڕاست نیە کەسانێك تووشی سزابن و دوایی دەربازبن! لەگەڵ ئەوەش دا کە ئەو هەموو فەرمایشتانەی پێغەمبەر ﷺ هەن، کە بێگومان یەك فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ بە سەنەدێکی ڕاست (صحيح) بە ئێمە گەیشتبێ، ئێمە پابەند دەکات، بەو نێوەڕۆکەوە کە دەیگەیەنێ، کە فەرمایشتەکان لەو بارەوە زۆر زۆرن.

٥)- ﴿ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَهُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَلَٰكِن يُدْخِلُ مَن يَشَآءُ فِى رَحْمَتِهِۦ ۚ وَٱلظَّٰلِمُونَ مَا لَهُم مِّن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴾، ئەگەر خواش ویستبای ئەو خەڵکەی هەموو دەکردە یەك کۆمەڵ، بەڵام هەرکەسێك بیەوێ دەیخاتە نێو بەزەیی خۆیەوەو، ستەمکارانیش هیچ دۆست و سەرپەرشتیارێك و هیچ یاریدەدەرێکیان نیە. ئەمە مەبەست پێی دڵدانەوەی پێغەمبەر ﷺ و دڵدانەوەی بڕوادارانە، واتە: خەفەتیان لێ مەخۆن، کە ئەوانە هەر

بڕوا ناهێنن، وەنەبێ ئەوان شتێکیان کردبێ خوایان ﷻ دەستە وستان کردبێ، خوا ئەگەر ویستبای هەمووی دەکردنە یەك کۆمەڵ، هەمووی لەسەر ئیمان کۆدەکردنەوە، یاخود لەسەر کوفر کۆی دەکردنەوە، بەڵام زیاتر وا پێدەچێ مەبەست ئەوە بێ کە لەسەر ئیمان کۆیان بکاتەوە، چونکە خوا ﷻ حەزی لە ئیمانەو ڕقی لە کوفرە، بەڵام نەیویستوە، واتە: خوا نەیویستوە زۆریان لێ بکات لەسەر ئیمان کۆیان بکاتەوە، بەڵکو ویستوویەتی سەرپشکیان بکات و کە سەر پشکی کردوون، هەندێکیان ئیمانیان هەڵبژاردووەو، هەندێکیشیان کوفریان هەڵبژاردوە، یانی: خوا شتێکی دیکەی ویست، ئەویش ئەوە بوو کە سەر پشکیان بکات، تواناداریان بکات بۆ هەڵبژاردنی هەر کام لە ڕێنمایی، یاخود گومڕایی، تاکو سەرەنجام ئەوانەی ڕێنمایی هەڵدەبژێرن، خوا بیانخاتە نێو بەزەیی خۆیەوەو، ستەمکارانێکیش کە گومڕایی هەڵدەبژێرن، هیچ سەرپەرشتیارو یارمەتییدەریان نیە.

﴿ وَلَٰكِن يُدۡخِلُ مَن يَشَآءُ فِي رَحۡمَتِهِۦۚ ﴾، بەڵام خوا هەر کەسێك بیەوێ، دەیخاتە نێو بەزەیی خۆیەوە.

﴿ وَٱلظَّٰلِمُونَ مَا لَهُم مِّن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٍ ﴾، ستەمکارانیش واتە: ئەوانەی ستەم لە خۆیان دەکەن بە هەڵبژاردنی کوفرو، شیرك و، گومڕایی، ئەوانیش هیچ سەرپەرشتیاریان و، هیچ یارمەتییدەریان نیە.

لێرەدا خوا ﷻ لە جیاتی ئەوەی بفەرموێ: **(وَلكِنْ خَيَّرَهُمْ فَمِنْهُمْ مَنِ اخْتَارَ الْإِيمَانَ، لِيُدْخِلَهُ اللهُ فِي رَحْمَتِهِ، وَمِنْهُمْ مَنِ اخْتَارَ الضَّلالَةَ، فَأَصْبَحَ ظَالِمًا لِيُدْخِلَهُ اللهُ فِي النَّار)** کورتی کردۆتەوە، چونکە ئەوەی دیکە، هەمووی عەقڵ و سەلیقە پەی پێ دەبات، یەکسەر دەفەرموێ: ﴿ وَلَٰكِن يُدۡخِلُ مَن يَشَآءُ فِي رَحۡمَتِهِۦۚ وَٱلظَّٰلِمُونَ مَا لَهُم مِّن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٍ ﴾، واتە: بەڵام خوا هەرکەسێکی بیەوێ دەیخاتە نێو بەزەیی خۆیەوە، لەبەر ئەوەی هیدایەت و، ڕێنمایی خوای پێشوازیی لێکردووەو، هەڵبژاردووەو وەرگرتوە، ئەوەی دیکەش کە گومڕایی هەڵدەبژێرێ، مانای وایە

ستەمكارە بە نسبەت خۆیەوە، ستەمی لە خۆی كردوەو، ستەمی لە پەیامی خواش كردوە، بۆیە ئەوەش سەرەنجامی دۆزەخەو، هیچ یارمەتییدەرو هاوكارێكیشیان نیە، یانی: (لكِنِ الظَّالِمُونَ لِأَنْفُسِهِمْ سَيَدْخُلُونَ النَّارَ وَمِنْ ثَمَّ لَا وَلِيٌّ وَلَا نَصِيرَ لهم) بەڵام ستەمكاران لە خۆیان، دەچنە ئاگرەوەو، لەوێش نە سەرپەرشتیاریان هەیەو، نە یارمەتییدەریشیان هەیە، واتە: نەكەسێكیان هەیە سەرپەرشتییان بكات بە گشتیی لە هەموو حاڵانداو، نە كەسێكیان هەیە بە شێوەیەكی بەشیی و لە حاڵەتێكی دیاریكراودا، هاوكارو دەستبارگرو یارمەتییدەریان بێت.

٦)- ﴿ أَمِ ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ ﴾، یان ئایا جگە لەو سەرپەرشتیارانێكیان بۆ خۆیان گرتوون و، پەیدا كردوون؟

٧)- ﴿ فَٱللَّهُ هُوَ ٱلْوَلِىُّ ﴾، بە دڵنیایی بەس خوا سەرپەرشتیارە.

٨)- ﴿ وَهُوَ يُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ ﴾، هەر ئەویش مردووان دەژێنێتەوە.

٩)- ﴿ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴾، تەنیا ئەویش لەسەر هەموو شتێك بە توانایە.

لێرەدا وشەی (أم): (لِلْإِضْرَابِ الإِنْتِقَالِي) بۆ گواستنەوەیە لە مەبەستێك بۆ مەبەستێكی دی، (أَيْ: دَعِ الْإِهْتِمَامَ بِشَأْنِهِمْ وَلْنَعُدْ إِلى فَظَاعَةِ حَالِهِمْ فِي اتِّخَاذِهِمْ أَوْلِيَاء) واتە: واز بێنە لە گرنگیی دان بە حاڵی وان و، با بگەڕێینەوە بۆ حاڵی قێزەونیان، لەوەدا كە دۆستان و سەر پەرشتیارانێكیان لە جیاتی خوا بۆ خۆیان پەیدا كردوون.

﴿ فَٱللَّهُ هُوَ ٱلْوَلِىُّ ﴾، (أَيْ: إِنْ أَرَادُوا وَلِيّاً بِحَقٍّ، فَاللهُ هُوَ الْوَلِيُّ بِحق فَحَسْب) ئەگەر بەڕاستیی سەرپەرشتیاریان دەوێ، بەس خوا سەرپەرشتیاری بە هەقە، بە بەڵگەی ئەوەی: ﴿ وَهُوَ يُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ ﴾، هەر ئەویشە مردووان دەژێنێتەوە ﴿ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴾، هەروەها بەس ئەویش لەسەر هەموو شتێك بە توانایە، واتە: ئەم دوو ڕستەی دوایی: ﴿ وَهُوَ يُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ ﴾ و ﴿ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴾، بەڵگەن،

لەسەر ئەوە کە هەر خوا سەرپەرشتیارەو، شایستەی ئەوەیە بە سەرپەرشتیارو، پەرستراوو، مشوورخۆر بگیرێ، ئەمە وەك ئەو ئایەتەی سوورەتی (النحل) وایە، کە دەفەرموێ: ﴿ أَفَمَن يَخۡلُقُ كَمَن لَّا يَخۡلُقُۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ١٧ ﴾، ئایا زاتێك کە وەدیدێنێ و شت دروست دەکات، وەك کەسێك وایە کە هیچ دروست ناکات؟ بۆچی پەند وەرناگرن.

لێرەشدا خوا دەفەرموێ: ئایا ئەوانە سەرپەرشتیارانێکیان جگە لە خوا، لە جیاتی خوا، بۆ خۆیان پەیداکردوون؟ هەر کەسێك سەرپەرشتیاری دەوێ، بەس خوا سەرپەرشتیارە، بە بەڵگەی ئەوە کە تەنیا ئەو مردووان دەژێنێتەوەو، بەس ئەویش لەسەر هەموو شتێك بە توانایە.

مەسەلەی سێیەم:

**حوکم و بڕیار لە بارەی ڕاجیاییەکانەوە تایبەتە بە خواوە، کە هەر ئەو پەروەردگاری پشت پێ بەستراوی تەوبە بۆ لاکراوەو، داهێنەری گەردوون و دانەری سیستمی جووتیەتییە لە مرۆڤ و ئاژەڵانداو، هیچ شتێك وێنەی وی نیە، کلیلەکانی گەردوونی بە دەستن و، بە ویستی حەکیمانەی خۆی بژیو زۆرو کەم دەکات بۆ مرۆڤەکان، بە هەموو شتێك زانایەو، لەسەر هەموو شتێك توانایە:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَمَا ٱخْتَلَفْتُمْ فِيهِ مِن شَىْءٍ فَحُكْمُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبِّى عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ ﴿١٠﴾ فَاطِرُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ جَعَلَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا وَمِنَ ٱلْأَنْعَٰمِ أَزْوَٰجًا ۖ يَذْرَؤُكُمْ فِيهِ ۚ لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١١﴾ لَهُۥ مَقَالِيدُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ ۚ إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿١٢﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چواردە بڕگەدا:

١)- ﴿ وَمَا ٱخْتَلَفْتُمْ فِيهِ مِن شَىْءٍ فَحُكْمُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ ﴾، هەر شتێك ئێوە تێیدا کەوتنە ڕاجیایی، بڕیار لەبارەیەوە بۆلای خوایە.

﴿ فَحُكْمُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ ﴾، (مَقُولُ قَوْلٍ مَحْذُوفٍ) یانی: (قُلْ فَحُكْمُهُ إِلى اللـه) پێیان بڵێ: بڕیارو حوکم لە بارەیەوە بۆ لای خوایە، تەنیا خوا بۆی هەیە لەو شتانەدا کە تێیان دا دەکەونە ڕاجیاییەوە بڕیار بدات.

٢)- ﴿ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبِّى ﴾، ئا ئەو خوایەتان پەروەردگاری منە، واتە: بەس خوا ئەو پەروەرگارەیە کە بۆی هەیە بەرنامە دابنێ، بۆی هەیە حەڵاڵ و حەرام دیاریی بکات.

٣)- ﴿ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ ﴾، پشتم بەس بەو بەستوەو تەنیا ئەوم کردۆتە، کارپێسپێردراوی خۆم.

٤)- ﴿ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ ﴾، لە ناخ و، دەروونیشەوە بەس بۆ لای وی دەگەڕێمەوە، لە بارەی ئەم ئایەتە موبارەکەوە، زانایان زۆر قسەیان کردوە، زۆربەی هەرە زۆریان گوتوویانە: ئەوە دەگەیەنێ کە مسوڵمانان لەهەر شتێکدا کەوتنە ڕاجیایی، دەبێ حوکمەکەی بۆ لای خوا بگێڕنەوە، چ پەیوندیی بە بووناسییەوە هەبێ، چ بە ئیمان عەقیدەوە هەبێ، چ بە حەڵاڵ و حەرامەوە هەبێ، واتە: چ پەیوەندیی بە بنچینەکانی دینەوە هەبێ، چ بە لق و پۆپەکانی دینەوە، (**أُصُولُ الدِّين وَ فُرُوعُ الدِّين**)، زۆربەی هەرە زۆری زانایانوایانگوتوە، لە نێویان دا: (**الطبري، إبن كثير، القرطبي، فخرالدين الرازي، عبدالرحمن بن ناصر السعدي، الشَّنقيطي**) بۆ وێنە:

**أ**- (**الشنقيطي**) باسێکی دوورو درێژ دەکات، سەرەتایەکەی ئاوا دەست پێدەکات: (**فَعَلَيْكُمْ أَيُّهَا الْمُسْلِمُونَ أَنْ تَتَفَهَّمُوا صِفَاتِ مَنْ يَسْتَحِقُّ أَنْ يُشَرِّعَ وَيُحَلِّلَ وَيُحَرِّمَ**)[1]، واتە: ئەی مسوڵمانینە! پێویستە بزانن کێ دەتوانێ، یاسا دابنێ و، حەڵاڵ و حەرام دیاریی بکات.

**ب**- (**عبدالرحمن بن ناصر السعدي**) لە تەفسیرەکەی خۆیدا، دەڵێ: (**إِتِّفَاقُ الْأُمَّةِ حُجَّةٌ قَاطِعَةٌ، لِأَنَّ اللهَ تَعَالَى لَمْ يَأْمُرْنَا أَنْ نَرُدَّ إِلَيْهِ إِلَا مَا اخْتَلَفْنَا فِيهِ، فَمَا اتَّفَقْنَا عَلَيْهِ، يَكْفِي اتِّفَاقُ الْأُمَّةِ عَلَيْهِ**)[2]، واتە: یەکدەنگیی ئۆممەت بەڵگەیەکی هەڵبڕە، چونکە خوا فەرمانی پێنەکردووین هیچ شتێکی بۆلا بگێڕینەوە، جگە لەوەی تێیدا دەکەوینە ڕاجیایی، کەواتە: ئەوەی لەسەری پێك دێین، ئەوە بەڵگەیە.

واتە: ئەوەی کە کۆدەنگیی زانایانی ئۆممەتی لەسەر دەبێ، پابەندکەرە بۆ هەموو مسوڵمانان.

**ج**- بەڵام (**محمد الطاهر بن عاشور**) لەو بارەوە ڕایەکی دیکەی هەیە، دەڵێ: (**وَلَا عَلَاقَةَ لِهَذِهِ الْآيَةِ بِاخْتِلَافِ عُلَمَاءِ الْأُمَّةِ فِي أُصُولِ الدِّينِ وَفُرُوعِهِ، لِأَنَّ ذَلِكَ الإِخْتِلَافَ حُكْمُهُ مَنُوطٌ**

---

(١) أضواء البيان في إيضاح القرآن بالقرآن: ج ٧، ص ٤٩.

(٢) تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان: ص ٧٥٣.

بِالنَّظَرِ فِي الْأَدِلَّةِ وَالْأَقْيِسَةِ صِحَّةً وَفَسَادًا، إِنَّهُ لَا يُنَاسِبُ سِيَاقَ الْآيَاتِ سَابِقَهَا وَتَالِيَهَا، وَلَا أَغْرَاضَ السُّوَرِ الْمَكِّيَّةِ، وَقَدِ احْتَجَّ بِهَذِهِ الْآيَةِ نُفَاةُ الْقِيَاسِ، وَهُوَ احْتِجَاجٌ لَا يَرْتَضِيهِ نَطَّاسٌ)[١].

واتـە: ئـەم ئایەتـە هیـچ پەیوەندیـی نیـە بـە ڕاجیایـی ئۆممەتـەوە، لـە بـارەی بنچینـەکان و لـق و پۆپـەکانی ئایینـەوە، چونکـە ئـەو ڕاجیاییـە حوکمەکـەی بەسـتراوەتەوە بـە تەماشـاکردنی بەڵگـەکان و قیاسـەکان، کـە ئایـا ڕاسـتن، یاخـود ناتـەواون؟ ئنجـا ئەگـەر ئـەم ئایەتـە بکرێتـە بەڵگـە لەسـەر ئـەوە {کـە دەبـێ ڕاجیایـی زانایـان بگێڕدرێتـەوە بـۆ لای خـوا} لەگـەڵ سـیاقی ئایەتـەکان دا ناگونجـێ و، لەگـەڵ ئامانجـی سـوورەتە مەککەییەکانیشـدا ناگونجـێ، هەندێـك لـە زانایانیـش ئـەم ئایەتەیـان بەبەڵگـە هێناوەتـەوە لەسـەر ئـەوە کـە قیـاس شـتێکی نارەوایـە، بـەڵام هیـچ زانایـەکی ورد بـەو قسـەیە ڕازیـی نیـە.

شـایانی باسـە: (**فخرالدیـن الرازي**)یـش، لـە تەفسـیرەکەیدا[٢]، ئامـاژە بـەوە دەکات کـە ئەوانـەی بڕوایـان بـە قیـاس نیـە، ئـەم ئایەتەیان بەبەڵگـە هێناوەتـەوە، بەس قسـەکەیان دێنـێ، بـێ ئـەوەی بەرپەرچـی بداتـەوە، کـە لە چەند شـوێنێکی دیکـەش هـەروا دەکات، شـوبهەیەك دێنـێ، یاخـود بەڵگەیـەکی ڕای بەرانبـەر دێنـێ، کـە پێـشی ڕازی نیـە بـە حیسـاب، بـەڵام دوایـی بـەر پەرچـی ناداتـەوە! ئنجـا بـە بۆچـوونی من ئـەوە نوقسـانییە، دەبـێ کـە ئیشـکال و شـوبهەکە دێنـێ، بـەر پەرچدانەوەکـەشی بێنـێ.

منیـش پێـم وایـە ڕای زۆربـەی زانایـان زیاتـر پێدەچـێ، ئـەوەش کـە لەگـەڵ مەبەسـتی ئامانجـی سـوورەتە مەککەیەکانـدا ناگونجـێ، ڕاسـت نیـەو لـە سـوورەتە مەککەییەکانـدا، خـوا ﷻ مەسـەلەی حـەڵاڵ و حـەڕام کـە دەبـێ تەنیـا بـە دەسـت خوابـێ، هـەر لـە سـوورەتە مەککەیەکانـدا زۆر باسـکراوە، بـۆ وێنـە: ﴿ أَمْ لَهُمْ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ ﴿٢١﴾ ﴾الشـوری.

---

(١) التحرير والتنوير: ج ٢٥، ص ٤٢.

(٢) ج١٤، ص١٣٢.

کەواتە: ئەوە کە هەر شتێك ڕاجیایی تێدا بوو، چ لە قۆناغی مەککە دابێت، چ لە قۆناغی مەدینەدا، دەبێ بگێڕدرێتەوە بۆ لای خوا ﷻ، چ پەیوەندیی بە بنچینەکانی دینداریییەوە هەبێ، چ پەیوەندیی بە لق و پۆپەکانەوە هەبێ، پێم وایە کە ئایەتەکە زۆر بە ڕوونیی دەیگەیەنێ، بۆیە ڕایەکەی (**محمد الطاهر بن عاشور**)م لێرەدا پێ پەسند نیە.

٥)- ﴿ فَاطِرُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾ (خوا) داهێنەری ئاسمانەکان و زەوییە.

٦)- ﴿ جَعَلَ لَكُم مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ أَزۡوَٰجٗا ﴾، لە خۆتان هاوسەرانی بۆ گێڕاون، جووتی بۆ دروست کردوون، کە ئەمە ئەگەر دوێنراوەکان پیاوبن، واتە: خوا ئافرەتانی بۆ دروست کردوون و، ئەگەر دوێنراوەکان ئافرەت بن، واتە: خوا پیاوانی بۆ دروستکردوون، چونکە هەم پیاوو، هەم ژن، بە جووتی یەکدی دادەنرێن.

٧)- ﴿ وَمِنَ ٱلۡأَنۡعَٰمِ أَزۡوَٰجٗا ﴾، هەروەها لە ئاژەڵانیشدا خوا جووتی دروست کردوون، (أَزْوَاج: جَمْعُ زَوْج، وَهُوَ الْذِي يَنْضَمُّ إِلَى فَرْدٍ فَيَصِيرُ كلاهمَا زَوْجَاً لِلْآخَرْ، أَيْ: الذُّكُور وَالْإِنَاث) (أَزْوَاج): کۆی (زوج)ەو ئەوەیە کە پاڵ دەدرێتە لای تاکێك و، هەردووکیان دەبن بە جووت بۆ یەکدی، کەواتە: لێرەدا ﴿ أَزۡوَٰجٗا ﴾، (أَيْ: ذُكُوراً وَّ إِنَاثاً) واتە: نێرو مێیەکان.

٨)- ﴿ يَذۡرَؤُكُمۡ فِيهِ ﴾، ئێوە لەوێدا زۆر دەکات، ﴿ يَذۡرَؤُكُمۡ ﴾، (أَيْ: يُكْثِركم، يُكَثِّرُكُم) زۆرتان دەکات، یاخود ﴿ يَذۡرَؤُكُمۡ ﴾، (أَيْ: يَخْلُقُكُم) دروستتان دەکات، ﴿ فِيهِ ﴾، واتە: لە: (**جَعَلَ لَكُم**)دا، لەو گێڕانەی بە حاڵەتی جووتییدا، چ بۆ ئێوە، چ بۆ ئاژەڵانتان، لەوەدا خوا زۆرتان دەکات، یاخود لە یاسای جووتییەتییدا، بە هۆی ئەو یاسایەوە خوا زۆرتان دەکات، یاخود دروستتان دەکات، یاخود بڵاوتان دەکاتەوە.

هەڵبەتە دیاردەی جووتییەتیی و جیایی، هەر کام لە نێرو مێ لە یەکدی، چ لە ئینسان، چ لە ئاژەڵ و، چ لە کۆی ژیانداران داو دابەشکردنی توانایەکان و، جۆراو جۆرکردنی توانایەکانی نێرو مێ، ئەمە هەم بە نسبەت مرۆڤیشەوە،

هەم بە نسبەت ئاژەڵ و ژیاندارانی دیکەشەوە، بەدڵنیایی مرۆڤ تاکو سەرنجی لێبدات، حیکمەت و لێزانیی و وردەکاریی خوای پەروەردگاری تێدا دەبینێ، هەرچەندە بەداخەوە زۆرجاران کە خەڵك لە زگماك و خوارسکی خوا لادەدەن، واتە: نەك تەنیا لە شەریعەت لادەدەن، بەڵکو لە زگماکیش لا دەدەن و، ئەم مەسەلەی نێرو مێ، ژن و پیاو، چۆن پێکەوە مامەڵە بکەن؟ دەیکەن بە کێشەو گرفتێکی گەورە: ژنسالاریی، نەخێر پیاو سالاریی! لەحاڵێك دا تەماشا دەکەین لە جیهانی ئاژەڵان، بەڵکو دڕندان و، پەڕەورو ژیاندارانیدا بەگشتیی، ئەو کێشەیە نیە، مێینە کاری خۆی دەکات و نێرینەش کاری خۆی دەکات، بۆ وێنە:

لە نێو شێرەکاندا، ئەوەی ڕاووشکار دەکات، تەنیا مێیە، دێڵە شێرە، بەڵام گۆڵە شێر، نێرەکە، تەنها کاری ئەوەیە پارێزگاریی لەو شوێنە بکات کە تێیدان! ئنجا مەسەلەی ژنسالاریی و پیاو سالاریی هەمووی بە هۆی لادانەوەیە، لە زگماکێ کە خوا مرۆڤی لەسەری خوڵقاندوەو، بەهۆی گوێ نەدانەوەیە بە شەریعەت، ئەگەرنا لە ڕاستییدا نێرو مێ وەك یەك نین، پێکهاتەو توانایەکانیان جیاجیان، لە ڕووی جەستەییەوە، لە ڕووی دەروونییەوە، لە ڕووی ئەوەوە کە جێی بایەخیانە، بەڵام لەو ڕووەوە کە هەردووکیان مرۆڤن، هەردووکیان بەڕێزن و هەردووکیان بەرپرسیارن و، هەردووکیان ئەرکدارن و، هەردووکیان یەکسانن، بەڵام ئەوە کە نێرو مێ لە هەموو شتێك دا وەك یەکبن، نەخێر، ئەوە ئاشکراو دیارە وەك یەك نین، ئنجا خۆگێلکردن لەوەو نکووڵییکردن لەو ڕاستییە، ئەو هەموو گرفت و کێشانە پەیدا دەکات، پاشان نەنێرایەتیی فەزیلەتە، نە مێیایەتییش نوقسانییە، تاکو ئافرەتەکان نکووڵیی بکەن لە مێینە بوونی خۆیان، لە ئافرەت بوونی خۆیان و، لاسایی پیاوەکان بکەنەوە لە نێرایەتیی و لەو سیفەتانەدا کە هی پیاوانن، تاکو بچنە ئاستی ئەوانەوە! چونکە مێینەبوون و ئافرەت بوون نوقسانیی نیە، تاکو ئافرەت نکووڵیی بکات لە مێیەبوون و ئافرەت بوونی خۆی و لاسایی پیاو بکاتەوە، هەر بۆیەش لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە کە نەفرین کراوە

لەو پیاوانەی لاسایی ژنان دەکەنەوەو، لەو ژنانەی لاسایی پیاوان دەکەنەوە: **{لَعَنَ اللهُ الْمُتَشَبِّهِينَ مِنَ الرِّجَالِ بِالنِّسَاءِ، وَالْمُتَشَبِّهَاتِ مِنَ النِّسَاءِ بِالرِّجَالِ} (أخرجه أبو داود: ٤٠٩٧، وابن ماجه: ١٩٠٤، والترمذي: ٢٧٨٤، قال: حسن صحيح)**، واتە: خوا نەفرینی کردوە لەو پیاوانەی چاو لە ژنان دەکەن و، لەو ژنانەی چاو لە پیاوان دەکەن و لاسایان دەکەنەوە، بەڵکو پێویستە هەرکام لە ژن و پیاو، ئەرکی زگماك و خوارسکی خۆیان جێبەجێ بکەن و، هیچ کامیان خۆی پێ لەوی دیکە کەمتر نەبێ، بۆ ئەوەی پاڵنەرێك و هاندەرێکی نەبێ، لاسایی ئەوی دیکە بکاتەوەو خۆی وەك ئەوی دیکە لێبکات کە واشی هەر لێنایەت!

٩)- ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ﴾، واتە: هیچ شتێك وەك خوا نیەو ئەو بیسەری بینەرە. (ك) ی (**كمثله**) یانی: وەك (**مثل**)، کەواتە: لێرەدا مانایەکەی ئاوای لێ دێتەوە: (**لَيْسَ مِثْلُ مِثْلِهِ شَيْء**)، هەڵبەتە ئێمە دوایی کورتە باسێك لە بارەی بە پاکگرتنی خواوە دەکەین، لە وێچوونی دروستکراوەکان، بۆیە بە خێرایی بەسەر تەفسیری ئەم ڕستە بەپێزەدا دەڕۆین، کە دەفەرموێ: ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞ﴾، ئنجا هەندێ لە زانایان گوتوویانە: ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞ﴾، یانی: (**لَيْسَ مِثْلُ مِثْلِهِ شَيْء، فَكَيْفَ بِمِثْلِهِ هُوَ**) وەك وێنەی وێنەی وێنەی خوا نیە، چ جای وێنەی خۆی، واتە: ئەمە بۆ جەختکردنەوەی ئەوەیە، کە هیچ شتێك وەك خوا نیەو گوتوویانە: (**ك**)ەکە، زیاد کراوە بۆ جەختکردنەوە.

کەواتە: ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞ﴾، واتە: (**لَيْسَ مِثْلَهُ شَيْء**) هیچ شتێك وەك خوا نیە ﷻ نە لە زاتی و نە لە سیفەتەکانی و نە لە کردەوەکانی دا.

کەواتە: ڕستەی یەکەمیان: ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞ﴾، ئەمە بۆ بە پاکگرتنی خوایەو ڕستەی دووەمیان: ﴿وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ﴾، ئەمەش بۆ چەسپاندنی سیفەتەکانی خوایە.

﴿ لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ ﴾، لە ڕووی وێچوونی بە دروستکراوەکانەوە، بەڵام لە ڕووی ئەوەوە کە خاوەنی سیفەتەکانە: ﴿ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ﴾، ئەو (خوا) بیسەری بینەرە، هەروەها سیفەتەکانی دیکەشی هەن.

١٠)- ﴿ لَهُۥ مَقَالِيدُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ ﴾، کلیلەکانی ئاسمان زەوی هی وین، (**مَقَالِيد**) کۆی (**إِقْلِيد**)، یاخود کۆی (**مِقْلَاد**)ە، ئەگەر کۆی (**إِقْلِيد**)بێ، هەر لە (**كِلِيد**)ی، فارسییەوە هاتوە، ئەو کاتە، کۆکردنەوەکە بە شێوەی نا قیاسییە، بەڵام ئەگەر کۆی (**مِقْلَاد**)بێ، وەك (**مِفْتَاح، مَفَاتِيح**) (**مِقْلَادْ، مَقَالِيدْ**)، ئەوکاتە بە شێوەیەکی قیاسیی کۆکراوەتەوە، گرنگ ئەوەیە (**مَقَالِيد**)، بە مانای کیلیلەکان دێ، بەڵام هەندێك گوتوویانە: بە مانای خەزێنەکان دێ، واتە: خەزێنەکانی ئاسمانەکان و زەوی هی خوان، یاخود کلیلەکانی ئاسمانەکان و زەوی، واتە: ئەو کلیلانەی کە خەزێنەکانیان پێ دەکرێنەوە، بەدەست خوان.

١١)- ﴿يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقۡدِرُۚ ﴾، بۆ هەر کەسێك بیەوێ بژیو فراوان دەکات و تەنگ دەکاتەوە، واتە: زۆر دەکات و کەم دەکات.

١٢)- ﴿ إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ﴾، واتە: بە دڵنیایی خوا بە هەموو شتێك زانایە.

ئێمە دوایی باسێکی تایبەتیش لە بارەی فراوانکردن و، تەنگکردنەوەی بژیو لە لایەن خوای پەروەردگارەوە بۆ مرۆڤەکان، دەکەین، بۆیە لێرەدا هەروا بە خێرایی بەسەریاندا ڕەتبووین، تەنیا ئەوەندە دەڵێین: لەو بارەوە کە خوا دەفەرموێ: ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ﴾، زانایان دەڵێن: (**وَكُلُّ مَا جَرَى بِبَالِكْ، فَاللهُ بِخِلَافِ ذَلِكَ**) هەرچی بە عەقڵ و خەیاڵ و ئەندێشەی تۆ دادێ، خوا لەوە جیایە، بۆچی؟ چونکە ئەوەی کە مرۆڤ دەتوانێ بە عەقڵ و، ئەندێشەو، خەیاڵی خۆیدا بیهێنێ، وێنەی دروستکراوەکانە، چ وێنە ڕاستەقینەکانیان، چ وێنەی لێکدراو، یاخود دروستکراو، کە خەیاڵ خۆی دروستی دەکات، بۆ وێنە: دەریایەك لە جیوە، چیایەك لە زێڕ، مرۆڤ دەتوانێ بە خەیاڵ دروستی بکات، بەڵام لە دنیای واقیعدا نیە، بەڵام مرۆڤ دەتوانێ بە خەیاڵ

دروستی بکات، دەریا ئەوە هەیە، جیوەش هەیە، جیوەکە بە خەیاڵی خۆی زۆر دەکات، هێندەی دەریایەك، یاخود زێڕ هەیەو چیاش هەیە، بە خەیاڵ مرۆڤ دەتوانێ زێڕەکە زۆر بکات، بە قەدەر چیایەکی لێبکات، با لە دنیای واقیعیشدا نەبێ، ئنجا ئەوشتانەی لە دنیای واقیعدا هەن، عەقڵ وێنەکانیان کۆدەکاتەوە، یان دەنگەکانیان یان بۆنەکانیان، یان تامەکانیان، یان قەبارەکانیان، لە ڕێی پێنج هەستەکانەوە، یاخود ئەوەی کە عەقڵ و، خەیاڵ و ئەندێشە خۆیان دروستیان دەکەن، کە مرۆڤ ئەو توانایەشی هەیە، یانی: وێنەی ڕاستەقینەی شتەکان، کە لە عەقڵدا هەن، چ وێنەی خەیاڵییان کە خەیاڵ دروستیان دەکات و، هەر هی دروستکراوەکانن، خوا لە هەموو ئەوانە جیایە.

## کورتە باسێک لە بارەی

## بە پاکگرتنی خواوە، لە وێچوونی بە دروستکراوەکان

بەڕێـــــزان!

ئەم کورتە باسە لە چوار بڕگەدا دەخەینە ڕوو:

**بڕگەی یەکەم:** ئەو ڕستە قورئانییە کە دەفەرموێ: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١١﴾﴾الشورى، واتە: هیچ شتێك وەك خوا نیەو، ئەو بیسەری بینەرە.

ئەمـە بناغەیـەکی یەکجـار گـەورەو گرنگـە، لـە بەپاکگرتنـی خـوادا ﷻ، کـە وەك دروسـتکراوەکانی بچـێ، هەڵبەتـە ئـەم ڕاسـتییە کـە زۆربـەی هـەرە زۆری زانایـان دەڵێـن: ئەمـە بنچینەیەکـەو بناغەیەکـە بـۆ ئـەوەی بیکەینـە بەڵگە لەسـەر وێنەچوونی خـوا بـە هیـچ کام لـە دروسـتکراوەکانی و، هەرچـی وشـەو تەعبیرێـك بـۆ خـوا ﷻ بەکارهێـنراوە، هەمـووی دەبـێ لەبـەر ڕۆشـنایی ئـەم ڕسـتە موبارەکـەدا: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ﴾، تەماشـای بکەیـن و ئـەم ڕاسـتییە مەزنـە، دەبێتـە بناغەیـەك بـۆ بـە پاکگرتنـی خـواو، بـە دوورگرتنـی لـەوەی بـە دروسـتکراوەکانی بچـێ چ لـە زاتـی دا، چ لـە سـیفەتەکانی دا، چ لـە کردەوەکانـی دا، چ لـە ناوەکانـی دا.

ئـەم ڕاسـتییەش لـە چەنـد شـوێنێکی دیکـەی قورئـان دا ئامـاژەی پێکـراوە، بـەڵام بـە تەعبیـری دی، بـۆ وێنـە:

**أ-** لە سوورەتی (**طه**)دا خوا دەفەرموێ: ﴿يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يُحِيطُونَ بِهِۦ عِلْمًا ﴿١١٠﴾﴾، واتە: خوا ﷻ ئەوەی لە پێش دەستیانە دەیزانێ و، ئەوەی لە دواشیانەوە دەیزانێ، یاخود: داهاتوویان دەزانێ و ڕابردوویان دەزانێ، یان مەبەست ئەوەیە: هەموو شتێك لە بارەی دروستکراوەکانیەوە دەزانێ، ﴿وَلَا يُحِيطُونَ بِهِۦ عِلْمًا﴾، بەڵام زانیاریی ئەوان دەوری خوا نادات، یانی: زانیاریی ئەوان بەس بایی ئەوەندەیە خوا بناسن، بەڵام کە وەك پێویست بزانن چییەت (**ماهیة**)ی خوا چۆنە؟ زانیاریی مرۆڤەکان لەوە کەمترە.

ب- لە سوورەتی (**الأنعام**)یشدا، دەفەرموێ: ﴿ لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَـٰرُ وَهُوَ يُدْرِكُ ٱلْأَبْصَـٰرَ ۖ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١٠٣﴾ ﴾، چاوەکان خوا نابینن، بەڵام خوا چاوەکان دەبینێ و، ئەو زۆر پەنهانکاری شارەزایە.

مەبەست ئەوەیە: لە دنیادا چاوەکان خوا نابینن، بە چاوی سەر خوای پەروەردگار نابینرێ، بەڵام خوا بە چاوی عەقڵ و دڵ دەرك دەکرێ، بەڵام لە ڕۆژی دواییدا لە لایەن ئیماندارانەوە لە بەهەشتدا، دەبینرێ، ئیمانداران خوای پەروەردگار دەبینن، وەك لە تەفسیری سوورەتی (**الأنعام**)دا، کە بەرگی پێنجی ئەم تەفسیرە کوردییەی ئێمەیە، زۆر بە تەفصیل باسێکمان لەو بارەوە کردوە: {بینینی خوای بەرزی مەزن لە دنیاو دواڕۆژدا، لە حاڵەتی خەو و بێدارییدا}.

ج- ئایەتێکی دیکە لەو بارەوە، کە هەر ئەو چەمك و واتایە دەگەیەنێ، ئەوەیە کە لە سوورەتی (**الحدید**)دایە، کە دەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلْأَوَّلُ وَٱلْـَٔاخِرُ وَٱلظَّـٰهِرُ وَٱلْبَاطِنُ ۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٣﴾ ﴾، واتە: خوا یەکەمینەو دوامینەو، ئاشکرایەو پەنهانەو، بە هەموو شتێك زانایە.

یەکەمە واتە: خوا یەکەمە بێ سەرەتا، بەبێ ئەوەی دەستپێکێکی هەبووبێ، هەموو شتەکان دروستکراوی خوان، بەڵام خوا ﷻ بوونەکەی سەرەتایەکی نیە، هەموو شتێك بوونەکەی سەرەتایەکی هەیە، وەك زۆرجار باسمان کردوە، ئێستا نوێترین بیردۆزە، بیردۆزەی (بیگ بانگ) (big bang)ە، کە دەڵێ: «ئەم گەردوونە پێش سێزدە ملیارو حەوسەت ملیۆن، ساڵ بوونی نەبووە»، ئێستا ئەوانەی کە خواناسن و ئەوانەش کە خوانەناسن، هەموویان لەسەر ئەوە یەکدەنگن، هەموویان دەڵێن: ئەم گەردوونە پێش سێزدە ملیارو حەوسەد ملیۆن ساڵ، بوونی نەبووە، بەڵام لە ئەنجامی تەقینەوەیەکی گەورەدا، ئەویش لە تاکی گەردوونیی، یان تۆی گەردوونیی و هێلکەی گەردوونییەوە بووە کە (سینگولاریتی - singularity)ی پێدەڵێن و کە زۆر زۆر گەرم بووەو، یەکجار بچووك و لە

ماوەیەکی زۆر زۆر کەمدا تەقیوەتەوە و، ئەم گەردوونە دروست بووە، هەڵبەتە ئەوان دەڵێن: تەقینەوە! بەڵام لە مەوسووعەی: (ئیمان ئیلحاد)دا باسم کردوە، کە لە ڕاستییدا ئەم گەردوونە زۆر بە سیستم و ڕێك وپێکیی دروستکراوە، بەڵام ئەوان ئەو تەعبیرەیان بە کارهێناوە: (بیگ بانگ) تەقینەوەی گەورە (**الإنفجار الکبیر**)، ئەگەرنا لە ڕاستییدا پرۆسەیەکی ئەوپەڕی سیستماتیك و پەروەردەکاریی بووە.

کەواتە: کە خوا دەفەرمووێ: خوا یەکەمەو دواهەمە، واتە: یەکەمە بێ سەرەتاو، دوایەمینە بێ کۆتایی، ﴿وَٱلظَّٰهِرُ وَٱلْبَاطِنُ﴾، خوا ئاشکرایەو پەنهانیشە، ئاشکرایە بەو واتایە کە ئەگەر بە عەقڵ و دڵ تەماشا خوا بکەی، ئاشکرایە، بەڵام شێرراوەو پەنهانە، ئەگەر بە چاوی سەر بۆی بگەڕێی، خوا نابینی، بە پێنچ هەستەکان خوا دەرك ناکرێ، بەڵام بە چاوی عەقڵ و دڵ خوا ﷻ دەرك دەکرێ و، خوا بە هەموو شتێك زانایە.

ئنجا بە پێی ئەم ئایەتانەو، ڕستەی: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١١﴾﴾ **الشورى**، هەموو ئەو تەعبیرو شانەی بەکاردەهێنرێن و، مانای ئەندامەکان دەگەیەنن، یان مانای هەستەوەرەکان دەگەیەنن، یان مانای جموجۆڵان دەگەیەنن، ئەوانە هیچ کامیان مانا ڕواڵەتەکەیان مەبەست نیە، کاتێك بۆ خوا بەکاردێن، بەڵکو مانایەکی دیکەیان مەبەستە، کە ئێمە نایزانین و، دەڵێین: وەك شایستەی خوایە، بۆ وێنە:

کە خوا ﷻ باسی (**يَدْ**)ی، خۆی دەکات: ﴿يَدُ ٱللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ ﴿١٠﴾﴾ **الفتح**.

یان خوا ﷻ باسی (**وَجْه**)ی، خۆی دەکات: ﴿وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ذُو ٱلْجَلَٰلِ وَٱلْإِكْرَامِ ﴿٢٧﴾﴾ **الرحمن**.

یان خوا ﷻ باسی (**عَيْن**)ی، خۆی دەکات: ﴿وَلِتُصْنَعَ عَلَىٰ عَيْنِىٓ ﴿٣٩﴾﴾ **طه**، یان، دەفەرمووێ: ﴿فَإِنَّكَ بِأَعْيُنِنَا ﴿٤٨﴾﴾ **الطور**، یان خوا ﷻ باسی (**قَبْضَة**)ی، خۆی دەکات: ﴿وَمَا قَدَرُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ وَٱلْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ

﴿وَٱلسَّمَٰوَٰتُ مَطْوِيَّٰتُۢ بِيَمِينِهِۦ ۝٦٧﴾ **الزمر**، واتە: وەك پێویست قەدری خوایان نەگرت، کە خوا زەوی هەمووی لە چنگ دەگرێ و، ئاسمانەکانیش دەپێچێتەوە دەیانخاتە بن دەستی ڕاستی، ئەو تەعبیرانە هەموویان، دەبێ بڵێین: مانا ڕواڵەتەکەیەکان بۆ خوا مەبەست نیە، چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ﴾، واتە: هیچ شتێك لە زاتیدا، وەك خوا نیە، هەروەها لە سیفەتەکانیشداو لە ناوەکانیشیداو لە هەڵسوکەوتەکانیشیدا، وەك خوا نیە ﷻ.

**(محمد الطاهر بن عاشور)** لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1]، قسەیەکی جوان دەکات دەڵێ:

**(وَإِذْ قَدِ اتَّفَقْنَا عَلَى هَذَا الْأَصْلِ، لَمْ يَبْقَ خِلَافٌ فِي تَأْوِيلِ النُّصُوصِ الْمُوهِمَةِ التَّشْبِيهَ، إِلَّا أَنَّ تَأْوِيلَ سَلَفِنَا كَانَ تَأْوِيلًا جُمْلِيًّا، وَتَأْوِيلَ خَلَفِهِمْ كَانَ تَأْوِيلًا تَفْصِيلِيًّا كَتَأْوِيلِهِمُ الْيَدَ بِالْقُدْرَةِ، وَالْعَيْنَ بِالْعِلْمِ، وَبَسْطَ الْيَدَيْنِ بِالْجُودِ، وَالْوَجْهَ بِالذَّاتِ...)**.

واتە: ئەگەر لەسەر ئەو بنەمایە ڕێککەوتین، (کە خوا وەك هیچ شتێك نیە)، کەواتە: هیچ ڕاجیاییەکی وا نامێنێ لە مانا لێکدانەوەی دەقەکان دا کە وێچواندن دەگەیەنن، {چونکە قسەیەکی مەشهوورە دەڵێن: زانایانی پێشین تەئویلیان نەکردوەو، زانایانی پاشین تەئویلیان کردوە، تەئویلیش، ئەوەیە کە وشەیەك مانا ڕواڵەتییەکەی مەبەست نەبێ و، مانایەکی دیکەی هەبێ، وەك ئێستا کە لێرە دانیشتووین ئەگەر یەکێك بڵێ: **(جَاءَ الْأَسَدُ)** شێرەکە هات، کەس بیری بۆ ئەوە ناچێ مەبەست مانای ڕاستەقینەو ڕواڵەتیی بێ کە شێری دڕندەیە، بەڵکو یانی: پیاوێك هات لە ئازایەتیی دا وەك شێرە، یان ئەگەر بڵێین: **(جَاءَ الثَّعْلَبُ)** ڕێویەکە هات، هەموو کەس دەزانێ کە (ڕێوی) مانا ڕواڵەتیی ڕاستەقینەکەی مەبەست نیە، بەڵکو مانا مەجازییەکەی مەبەستە، چونکە وەك چۆن وشەی: (ڕێوی) بۆ دڕندەیەك بەکاردێ، بەهەمان شێوە بۆ مرۆڤی فێڵبازیش بەکاردێ، (أَسَد)یش،

---

(١) التحرير والتنوير: ج ٢٥، ص٤٧.

وەك چۆن بۆ دڕندەیەك بە كاردێ، كە دەزانین شێرە، بەمانا مەجازییەكەشی بەكاردێ، واتە: پیاوێكی ئازا}[1].

دوایی دەڵێ: تەنیا ئەوەندەیە تەئویلكردنی زانایانی پێشینمان، تەئویلێكی كورت بووەو، كەمیان تەئویل كردووەو زۆر نەچوونە نێو قووڵاییی، بەڵام تەئویلكردنی زانایانی پاشین، بە درێژیی و ڕوون بووە، بۆ وێنە:

١- وشەی (يَدْ) كە بە مانای دەستەو، دیارە دەست چۆنە؟ بەڵام ئەوان بۆ خوا بە دەسەڵات مانایان كردوە، {كە دەفەرموێ: ﴿ٱللَّهَ يَدُ ٱللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ ۝١٠﴾ الفتح، واتە: دەسەڵاتی خوا بەسەر دەسەڵاتی ئەوانەوەیە}

٢- وشەی (عَيْن): بۆ ئێمە یانی: چاوو دەزانین یانی: چی؟ بەڵام كە بۆ خوا كە بەكاریان هێناوە، بە زانیاریی لێكیان داوەتەوە.

٣- هەروەها (بَسْطُ الْيَدَيْن) بڵاوكردنەوەی هەردوو دەستەكان، وەك دەفەرموێ: ﴿بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ يُنفِقُ كَيْفَ يَشَآءُ ۝٦٤﴾ المائدة، بەبەخشندەیی لێكیان داوەتەوە {چونكە كەسێك بیەوێ ببەخشێ دەست بڵاو دەكاتەوە، بەڵام ئەگەر نەبەخشێ دەست وێك دێنێتەوە}.

٤- وشەی (وَجْه): بۆ ئێمە یانی: ڕوو، دەم و چاو، بەڵام بۆ خوای پەروەردگار بە خود (ذات)، لێكیان داوەتەوە.

بەڵام زانایانی پێشین هەر گوتوویانە: بە تەئكید نە مەبەست لە (يَدْ) دەست، وەك دەستی ئێمەیە، نە مەبەست لە (عَيْن) چاو، وەك چاوی ئێمەیە، نە مەبەست لە: ﴿بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ﴾، دەست بڵاوكردنەوە، وەك هی ئێمەیە بەڵكو مەبەست پێی مانایەكە بۆ خوا شایستەیە، زانایانی پێشین هەر ئەوەندەیان گوتوە، بەڵام ئەوانەی دوایی، وێڕای ئەوە كە ئەوەیان گوتوە، گوتووشیانە: مەبەست لە (يَدْ) یانی: دەسەڵات و ... هتد.

---

(١) نێوان كەوانەكان زیادەی خۆمە.

**بڕگەی دووەم:** پێویستە لە بواری چەسپاندنی سیفەتەکانی خوا و بەپاکگرتنی دا ئاگاداری تێپەڕاندن بین لە هەردووك لاوە:

یەك: کاتێك کە سیفەتەکان بۆ خوا ﷻ دادەنێین و دەسەلمێنین، کە زانایان پێی دەڵێن: (**إِثْبَاتٌ**) واتە: چەسپاندنی سیفەتەکان بۆ خوا، وریابین ئەوە سەر نەکێشێ بۆ وێچواندن (**تشبيه**)وێچواندنی خوا بە دروستکراوەکان (**تَشْبِيهُ اللهِ بِالْمَخْلُوقَاتِ**).

دوو: کاتێك خواش بە پاك دەگرین، لە وێچواندنی دروستکراوەکان، ئەوەش سەر نەکێشێ بۆ داڕنینی سیفەتەکان لە خوا، بۆیە زانایان بنچینەیەکیان داناوە دەڵێن: (**إِثْبَاتٌ بِلا تَشْبِيهٌ وتَنْزِيهٌ بِلا تَعْطِيل**) چەسپاندنی سیفەتەکان بۆ خوا، بەبێ وێچواندانی خوا بە دروستکراوەکان و، بە پاکگرتنی خوا لە وێچوونی دروستکراوەکان، بەبێ پەکخستنی لە سیفەتەکان، هەروەها هەندێکیان گوتوویانە: (**إِثْبَاتٌ مَعَ تَنْزِيه**) چەسپاندن لەگەڵ بە پاکگرتن دا، سیفەتەکان بۆ خوا بچەسپێنین، هەر سیفەتێك بۆ خۆی بەکاری هێناوە، بەڵام خوا بە پاك بگرین لەوە کە سیفەتەکانی خوا وەك هی ئێمە بن.

**بڕگەی سێیەم:** ئەوە ڕاست نیە کە زانایانی پێشین هیچ تەئویلیان نەکردبێ و، ڕێك ئەو وشانەی کە خوا بەکاری هێناون لەو تەعبیرانەدا، ڕێك مانا ڕواڵەتییەکەیان لێ گرتبێ، وانیە، بەڵکو زانایانی پێشینیش تەئویلیان کردوە، بۆ وێنە:

أ- لە سوورەتی (**الحديد**)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٤﴾﴾، واتە: خوا لەگەڵتانە لە هەر شوێنێك بن و، خوا بینەری ئەوەیە کە دەیکەن.

ئیمام ئەحمەد ڕەحمەتی خوای لێ بێ، کە زۆر سوور بووە لەسەر تەئویل نەکردن و مانا لێکدانەوەی دەقەکان بەبێ بەملاولادا چوون، گوتوویەتی: (**وهو معكم، أيْ: بِعِلْمِهِ وَقُدْرَتِهِ**) واتە: بە زانیاریی خۆی و بە دەسەڵاتی خۆی لەگەڵتانە.

نەك خوا بە زاتی خۆی لەگەڵمان بێ.

(**عبدالرحمن بن ناصر السعدي**)یش لە تەفسیرەکەی خۆیدا، گوتوویەتی: (**وَهَذِهِ الْمَعِيَّة، مَعِيَّةُ الْعِلْمِ وَالْإِطِّلاعْ، وَلِهَذا تَوَعَّدَ، وَوَعَدَ عَلى الْمُجَازَاةِ بِالْأَعْمَالِ بِقَوْلِهِ**: ﴿وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾)[1]، واتە: ئەو لە گەڵ دابوونەی خوا کە دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ﴾، (لەهەر جێیەك بن خوا لەگەڵتانە، ئایا خوا لەگەڵمانە، ئێستا لێرەیە، یان لەهەر شوێنێك بین، خوا لەگەڵمانە؟) دەڵێ: مەبەست ئەوەیە کە لەگەڵتانە بە زانیاریی و بە ئاگاداربوون، هەر بۆیەش دوایی خوا هەڕەشەی کردوەو گفتی داوە بە سزاو پاداشت، لەسەر کردەوەکان، کە دەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾، واتە: ئەو بە کردەوەکانتان ئاگادارە، بینەری کردەوەکانتانە، کردەوەکانتان دەبینێ و دەزانێ، ئنجا کەسێك لەگەڵ کەسێك بێ، ناڵێ: کردەوەکانت و دەبینم و دەزانم، چونکە ئەوە لەگەڵیەتی و تەواو.

ئنجا کە دەفەرموێ: خوا بینەری کردەوەکانتانە، کەواتە: خودی خۆی لەگەڵمان نیە، ئەوە شتێکی بەڵگە نەویستیشە، چونکە خوا ﷻ لەسەر عەرشی خۆیەتی و لە سەرەوەی دروستکراوەکانی خۆیەتی، بەو شێوەیەی بۆ خوا شایستەیە.

**ب**- (**عبدالرحمن بن ناصر السعدي**) لە تەفسیری ئەو ئایەتە موبارەکەدا کە دەفەرموێ: ﴿ءَأَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ أَن يَخۡسِفَ بِكُمُ ٱلۡأَرۡضَ فَإِذَا هِيَ تَمُورُ ١٦﴾**الملك**، واتە: ئایا دڵنیان لەوەی کە لە ئاسمانە، لە سەرێیە، کە زەویتان لەبندا ڕۆبەرێ و لەو حاڵەتەدا زەوی بێت و بچێ و، بخولێتەوەو ئێوەش پێیدا ڕۆبچن، دەڵێ: (﴿ءَأَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ﴾ **وَهُوَ اللهُ تَعَالى، الْعَالِي عَلى خَلْقِهِ**)[2]، کە دەفەرموێ: ﴿ءَأَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ﴾، واتە: ئەو خوایە بەرزەی کە لە سەرووی دروستکراوەکانیەوەیەتی.

---

(١) تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان: ص ٨٣٧.

(٢) تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان: ص ٨٧٧.

کەواتە: کەس ناڵێ: خوا لە نێو ئاسماندایە، چونکە لە سەرەوە بوونی خوا، دەبێ بگوترێ: وەك بۆ خوا شایستەیە، نەك وەك دێتە زەینی ئێمەوە، کە شتێکی دروستکراو لەسەر شتێك دادەنرێ.

**برگەی چوارەم:** کەواتە: داڕنینی سیفەتەکان و پەکخستن (**التَّجْرِيدُ وَالتَّعْطِيل**) کەمتەرخەمییە، کاتێك کە بەو شێوەیە مامەڵە لەگەڵ سیفەتەکانی خوادا بکەین، بەڵام وێچواندن و جەستاندن (**التَّشْبِهُ وَالتَّجْسِيم**)یش زیادەڕۆییە.

موعتەزیلەو جەهمییەکان لە لایەك نکووڵییان کردوە لە سیفەتەکانی خواو، زۆریش زیادەڕۆییان کردوە لە تەئویل داو، کەسی وایان هەبووە گوتوویەتی: خوا هیچ سیفەتێکی نیە، خوا نە لە نێو دروستکراوەکانیەتی و، نە لە دەرەوەی دروستکراوەکانیەتی، نە لەسەرێیەو، نە لە خوارێیە، تەنانەت کەسی وایان هەبووە گوتوویەتی: لەبەر ئەوەی دروستکراوەکان بوونیان هەیە، نابێ بوونیش بۆ خوا بەکاربهێنرێ، کە ئەمە بە ڕاستیی زێدەڕۆییەکی بێ ماناو مەترسییدارە.

لە بەرانبەر ئەوانیشدا هەندێك لە حەنبلییەکان، کە حەشەوییەکان و جەستێنەرەکان (**المُجَسِّمة**)شیان پێدەڵێن، نەك ئیمام ئەحمەد ڕەحمەتی خوای لێ بێ، چونکە ئەو خۆی وانەبووە، بەڵام هەندێك لە شوێنکەوتووانی مەزهەبی حەنبلیی و، هەندێکی خەڵکی دیکەی غەیری مەزهەبی حەنبلییش، ئەوانەش سەریان بە جەستاندن و وێچواندن (**تجسیم وتشبیه**) گەیشتوە، ئەوانیش هەڵساون لە بەرانبەر جەهمییەو موعتەزیلەدا، کە سیفەتەکانیان لە خوا دوورخستوونەوە، ئەوانیش هەڵساون زێدەڕۆییان کردوە لە چەسپاندنی سیفەتەکان بۆ خواداو، هەیانبووە لە زانایانی حەنبلیی مەزهەب لە بەغداد وتاری داوە، لەسەر مینبەر دانیشتوە، چوار مەشقیی، گوتوویەتی: وەك چۆن من ئێستا لەسەر ئەم مینبەرە دانیشتووم، خواش ئاوا لەسەر عەرش دانیشتوە، کە ئەوە جەستاندن و وێچواندنی خوایە بە دروستکراوەکان، چونکە کە خوا دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ﴾،

واتـە: خـوا بـەرز بـۆوە بـۆ سـەر عـەڕش، چـووە سـەر عـەڕش، دەبـێ بڵێـی: وەك بـۆ خـوا شایسـتەیە، ئەگـەر بگوتـرێ: وەك چـۆن مـن، یـان کەسـێك لـە سـەر تەخـت و کورسـییەك دادەنیشـێ، ئـەوە تەشـبیهەو خـواش ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ ١١﴾الشـوری، واتـە: هیـچ شـتێك وەك خوانیـە.

کەواتـە: دەبـێ بگوتـرێ: خـوا لەسـەر عەڕشـە، بـەو شـێوەیەی بـۆ خـوا شایسـتەیە، هەروەهـا خـوا (يَـدْ)ی، هەیـە، (يَـدْ) بـۆ ئێمـە ئەندامـە، بـەڵام بـۆ خـوا سـیفەتە، دیسـان خـوا (عَـيْن)ی، هەیـە، (عـین) بـۆ ئێمـە ئەندامـە، بـەڵام بـۆ خـوا سـیفەتە، ئایـا چۆنـە؟ نازانیـن، بەڵـێ خـوا لـە سـەرەوەی دروسـتکراوەکانی خۆیـەتی، بـەڵام ئـەوە بـۆ خـوا ﷻ سـیفەتێکە کـە وەك هـی دروسـتکراوەکان نیـە، هەروەهـا هەمـوو سـیفەتەکانی دیکـەش، بـۆ وێنـە: کـە لـە هەندێـك فەرمایشـتی پێغەمبـەردا ﷺ هاتـوە دەفەرمـوێ: ئەگـەر سـێیەکی شـەوێ ڕۆیشـت، خـوای پـەروەردگار دێتـە ئاسـمانی نیزیـك لـە ئێمـە[1]، دابەزینـی خـوا بـۆ ئاسـمانی نیزیـك لـە ئێمـە، ئاسـمانی دنیـا، یـانی چـی؟ بێگومـان ئـەوە سـیفەتێکی خوایـەو ئێمـە نازانیـن چۆنـە؟ بـەڵام بـە تەئکیـد مەبەسـت پێـی ئـەوە نیـە کـە خـوا سـەرەوەی دروسـتکراوەکان بـە جـێ بهێڵـێ و بێتـە نێـو دروسـتکراوەکان! چونکـە خـوا لـە نێـو دروسـتکراوەکانیدا جێـی نابێتـەوە، لێـرەدا بـەس ئەوەنـدەی لـە بـارەوە دەڵێیـن، ئەگەرنـا ئـەو باسـە، ئێمـە لـە کتێبـی دووەمـی مەوسـووعەی: (ئیـمان و عەقیـدەی ئیسـلامیی)دا، لەوێـدا بـە تەفصیـڵ بـاسی سـیفەتەکانی خـوای بـەرزی مەزنمـان کـردوە، هەروەهـا لـەو مەوسـووعەی: **(الإسـلام كـما يتجـلّى في كتـاب اللـه)** لـە کتێبـی سـێیەمدا، دیسـان بـە تەفصیـڵ لـە بـارەی نـاوو سـیفەتەکانی خـوای پـەروەردگارەوە دواویـن، لـەو بـارەوە نوختەمـان خسـتۆتە سـەر پیـت.

---

(١)- {عَـنْ أَبِي هُرَيْـرَةَ رضي اللـه عنـه، أَنَّ رَسُـولَ اللـهِ ﷺ، قَـالَ: يَنْـزِلُ رَبُّنَـا كُلَّ لَيْلَـةٍ إِلَى السَّـمَاءِ الدُّنْيَـا، حِينَ يَبْقَـى ثُلُـثُ اللَّيْـلِ الآخِـرِ، يَقـولُ مَـنْ يَدْعُـونِي فَأَسْتَجِيبَ لَهُ، مَـنْ يَسْـأَلُنِي فَأُعْطِيَـهُ، مَنْ يَسْـتَغْفِرُنِي فَأَغْفِـرَ لَـهُ} أخرجـه مالـك: ٤٩٨، والبخـاري: ١٠٩٤، ومسـلم: ٧٥٨.

## كورتە باسێك لە بارەی بژیودانی خواو زۆرو كەمكردنیەوە

خوا پشتیوان بێت لە نۆ (٩) بڕگەدا، ئەم كورتە باسە دەكەین:

**١- واتای وشەی (الرِّزْقُ):** (راغب الأصفهاني) دەڵێ: (الرِّزْقُ: يُقَالُ لِلْعَطَاءِ الْجَارِي تَارَةً، دُنْيَوِيًّا كَانَ أَمْ أُخْرَوِيًّا، وَلِلْنصِيبِ تَارةً، وَلِمَا يَصِلُ إِلَى الْجَوْفِ وَيَتَغَذُّون بِهِ تَارَةً، يُقَالُ: أَعْطَى السُّلْطَانُ رِزْقَ الْجُنْدِ، وَرُزِقْتُ عِلْماً، قَالَ تَعَالَى: ﴿وَأَنفِقُوا۟ مِن مَّا رَزَقْنَٰكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِىَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ ﴿١٠﴾﴾، المنافقون، أَيْ: مِنَ الْمَالِ وَالْجَاهِ وَالْعِلْمِ، وَيُمْكِنُ أَنْ يُحْمَلَ عَلَى الْعُمُومِ، فِيمَا يُؤْكَلَ وَيُلْبَسُ وَيُسْتَعْمَلُ)[1].

واتە: وشەی **(رزق)** جاری وا هەیە بۆ مووچەیەكە كە بەردەوامە، بەكاردەهێنرێ، ئنجا ئەو مووچەو بژیوە، چ دنیایی بێ، چ دواڕۆژیی بێ و، جاری وایە بۆ پشك و بەشێك بەكاردێ و، جاری وایە بۆ ئەوەی دەچێتە نێو هەناوی مرۆڤەوە و پێی دەژی بەكاردێ، {واتە: بۆ خواردن و خواردنەوە} دەگوترێ: حوكمڕان بژیوی سەربازەكانیدا، (واتە: مەعاشی پێدان)، تۆ دەڵێی: **(رُزِقْتُ عِلْماً)** زانیارییم بۆ كرا بە بژیو، (كەواتە: بۆ شتی ماددیش بەكاردێ و، بۆ شتی مەعنەوییش بەكاردێ)، خوا ﷻ لە سوورەتی **(المنافقون)**دا، دەفەرمووێ: ﴿وَأَنفِقُوا۟ مِن مَّا رَزَقْنَٰكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِىَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ ﴿١٠﴾﴾، واتە: لەوەی پێمان داون، ببەخشن، بەر لەوەی یەكێكتان مردنی بگاتێ، لەوەی پێمان داون لە ماڵ و سامان لە پێگە **(جَاه)** {**(جَاه)** یانی: قسە ڕۆیشتن، ئەوە كە مرۆڤ پێگەیەكی كۆمەڵایەتیی هەبێ و قسەی بگیرێتەوە، لەوە ببەخشە، صوڵح بكە، چاكە بكە لە خەڵك} و لەو زانیارییەی پێتدراوە، {كەواتە: وەك چۆن ماڵ و سامان ڕزقە، جاهو پێگەی كۆمەڵایەتییش ڕزقەو زانیارییش ڕزقە} دەشگونجێ وشەی **(رزق)** بەكاربهێنرێ بە گشتیی، بۆ

---

(١) مفردات ألفاظ القرآن: ص ٣٥١.

شتێك كە بخورێ و بۆ شتێك كە بپۆشرێ (بەرگ و پۆشاك) و بۆ هەر شتێك كە بەكاربهێنرێ {یانی: خانووبەرە، سەیارە، كەلوپەلێ كە مرۆڤ بەكاری دێنێ}.

كەواتە: وشەی (رزق) واتە: هەرشتێك كە خوا بۆ مرۆڤەكانی ڕەخساندوە، پێی بژین، ئنجا خواردن و خواردنەوەیە، بەرگ و پۆشاكە، ماڵ و سامانە، كەل و پەلە، ماددییە، یاخود شتی مەعنەوییە.

**٢- بژیو (رزق)، تەنیا لە لایەن خواوەیە:** ئێمە لە كوردییدا جاری وایە (**رزق**) بە ڕۆزیی تەرجەمە دەكەین، جاری واشە بە بژیو، ئەو شتەی كە مرۆڤ پێی دەژیی، كە لە ڕاستییدا مرۆڤ هەر بە خواردن و خواردنەوە ناژی، بەرگ و پۆشاكی پێویستە، خانوو بەرەی پێویستە، كەل و پەلیشی پێویستە، ژیانیش هەر ژیانی ماددیی و جەستەیی نیە، ئینسان ژیانی مەعنەوییشی هەیە، لەبەر ئەوە دەگونجێ بە تەقواش بگوترێ ڕزق و، بە عیلمیش بگوترێ ڕزق و، بە عیبادەتیش بگوترێ، بۆ وێنە: بە حەج دەگوترێ، یەكێك دەڵێ: (**رَزَقَنِي الله حَجًّا**) خوا حەجی پێ بەخشیم، واتە: كردی بە ڕزقم، یان دەڵێ: (**رَزَقَنِي الله صِيَام رَمَضَان**) خوا گرتنی ڕۆژی مانگی ڕەمەزانی كردە بژیوی من، ئنجا ڕزق بە هەموو ئەو چەمكانەی گوتمان، بە هەموو واتاكانیەوە، تەنیا لە لایەن خواوەیە.

خوا لە سوورەتی (**فاطر**)دا، دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡۚ هَلۡ مِنۡ خَٰلِقٍ غَيۡرُ ٱللَّهِ يَرۡزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ فَأَنَّىٰ تُؤۡفَكُونَ ٣ ﴾، واتە: ئەی خەڵكینە! یادی چاكەی خوا بكەنەوە بەسەر تانەوە، ئایا بێجگە لە خوا بەدیهێنەرێكی دیكە هەیە، بژیوتان بدات لە سەرێ و لە خوارێوە، بێجگە لەو هیچ پەرستراو نین، بۆ كوێ لادەدرێن؟! یانی: بەس خوا بژیو دەرتانەو بەس خوا هەموو شتێكی بۆ ڕەخساندوون، كەواتە: هەر ئەویش بپەرستن.

لە سوورەتی (**العنكبوت**)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ فَٱبۡتَغُواْ عِندَ ٱللَّهِ ٱلرِّزۡقَ وَٱعۡبُدُوهُ وَٱشۡكُرُواْ لَهُۥٓۖ إِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ١٧ ﴾، واتە: بژیو هەر لە لای خوا بخوازن، بیپەرستن و سوپاسگوزاریی بۆ بكەن، بۆ لای وی دەگێرنەوە.

کەواتـە: بژیـو تەنهـا بـە دەسـت خـوای بـەرزی مەزنـە، ئـەو شـتانەی مـرۆڤ مـەداری ژیـانی دنیاییـان پـێ سـاز دەکات.

**٣- مرۆڤ پێویستە بۆ دابین کردنی ڕزق و بژیو هەوڵبدات:** بژیو کە تەنیا لەلای خوایە، مانای وانیە مرۆڤ تەنبەڵ تەنبەڵ پاڵبداتەوەو، هیچ کارێك نەکات، بە بیانووی ئەوە کە ڕزق لەسەر خوایە، ڕزق لەسەر خوایە، بەڵام خوا ﷻ بە هۆی هەوڵدانی مرۆڤەکانەوە ئەو ڕزق و بژیوە دەدات، کەسێك زۆر هەوڵبدات، خوا ڕزقی زۆری دەداتێ، کەسێك کەم هەوڵبدات، خوا کەمی دەداتێ، زۆر خۆی ماندوو بکات، بە زۆریی وایە زۆرتری دێتە دەست، کەمتر خۆی ماندوو بکات، کەمتری دێتە دەست، بە زۆریی وایە.

بـەڵام جـاری واش هەیـە ئـەو بنچینەیـە هـەڵاواردنی تێدایـە، کەسـێك زۆریـش هەوڵـدەدات و کەمـی بـە دەسـتەوە دێ و، کـەسی واش هەیـە کـەم هەوڵـدەدات و زۆری بـە دەسـتەوە دێ، ئـەوەش هەڵاواردنـە، لـەو بنچینەیـە، بـەڵام بـە گشـتیی ئەوانـەی زیاتـر خۆیـان مانـدوو دەکـەن، زیاتریـان دێتـە دەسـت، وەك گوتمـان ڕزق بـەس مـاڵ و سـامان نیـە، بـەس خـواردن و خواردنـەوە نیـە، کەسـێك بـۆ عیلـم هەوڵـدەدات و زۆر خـۆی مانـدوو دەکات، زانیاریـی زۆر دەبـێ، کەسـێك لـە ڕووی عەقڵییـەوە، زیاتـر عەقڵـی خـۆی بەکاردێنـێ و بیـر دەکاتـەوە، عەقڵـی بـە هێزتـر دەبـێ، کەسـێك لـە ڕووی جەسـتەییەوە هەوڵـدەدات، جەسـتەی بەهێزتـر دەبـێ، کەسـێك بـۆ مـاڵ و سـامان هەوڵـدەدات، مـاڵ و سـامانی زیاتـر دەبـێ، کـە سـێك بـۆ تاعـەت زیاتـر هەوڵـدەدات، تاعـەتی چاکـتر ئەنجـام دەدات، ئـەوی دیکـە کەمـتر، کەمـتر، بۆیـە مـرۆڤ دەبـێ، هەوڵبـدات، خـوا ﷻ لـە سـوورەتی (الملـك)دا، دەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ ذَلُولًا فَٱمْشُوا۟ فِى مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا۟ مِن رِّزْقِهِۦ ۖ وَإِلَيْهِ ٱلنُّشُورُ ﴿١٥﴾ ﴾، واتـە: خـوا زەوی بـۆ دەسـتەمۆ کـردوون[1]، بـە قـەد پاڵەکانیـدا بـڕۆن و لـە بژیـوی خـوا بخـۆن {بـەڵام لەبیریشـتان نەچـێ} دەچنـەوە خزمـەتی وی.

---

(١) (ذَلُول) بـە وشـترێك دەگوتـرێ کـە بـە ئاسـانیی یـەخ دەبـێ، منداڵێکـی گچکـە بـە وشـتر بڵـێ: یـەخ، یـەخ دەبـێ، بڵـێ هەڵسـە، هەڵدەسـتێ.

دوای ئـەوەی فەرمـووی: ﴿ فَٱمْشُوا۟ فِى مَنَاكِبِهَا ﴾، بەقـە پاڵەکانیـدا بـڕۆن، ئنجـا دەفەرمـوێ: لـە بژیـوی خـوا بخـۆن، یـانی زەوی هەڵکێڵـن، کاربکـەن، کەسـابەت بکـەن، بازرگانیـی بکـەن، کشـتوکاڵ بکـەن، ئاژەڵداریـی بکـەن، بەلاشـان و قـەد پاڵـەکانی زەویـدا بـڕۆن، بـە کەنارەکانـی دا بـڕۆن، ئنجا لـە بژیـوی خـوا بخـۆن، ئەگـەر نـەڕۆی و کار نەکـەی، بژیـوت دەسـت ناکـەوێ!

هەروەهـا لـە سـوورەتی (**الجمعـة**)دا، دەفەرمـوێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا نُودِىَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوْمِ ٱلْجُمُعَةِ فَٱسْعَوْا۟ إِلَىٰ ذِكْرِ ٱللَّهِ وَذَرُوا۟ ٱلْبَيْعَ ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٩﴾ فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ فَٱنتَشِرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَٱبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ وَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿١٠﴾ ﴾، واتـە: ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! ئەگـەر بانگـدرا لـە ڕۆژی جومعـەدا، بـە خێرایـی بـەرەو یـادی خـوا بـڕۆن و واز لـە کڕیـن و فرۆشـتن بێنـن، ئـەوە باشـترە بـۆ ئێـوە ئەگـەر بزانـن. هەرکاتیـش نوێـژ تـەواو بـوو، (نوێـژی جومعـە)، بەزەوییـدا بڵاوببنـەوەو لەبەخشـشی خـوا داوا بکـەن، زۆریـش یـادی خـوا بکـەن {لەمیانـەی کارو کەسابەتیشـدا} بـۆ ئـەوەی سـەرفرازبن.

یـانی: خواتـان لـە بیـر نەچـێ، کـە لـە کڕیـن و فرۆشـتنداو لـە کارو کەسـابەتدا، غـەش و خیانـەت بکـەن، ئەوکاتـە ڕزقەکـە لـە خۆتـان حـەڕام دەکـەن.

کەواتـە: خـوا فەرمـانی کـردوە تەنانـەت لـە ڕۆژی جومعەشـدا کـە ڕۆژی پشـوودانی مسـوڵمانانە، هەتـا بانـگ دەدرێ، بـۆت هەیـە خەریـکی کڕیـن و فرۆشـتن بی، ﴿ إِذَا نُودِىَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوْمِ ٱلْجُمُعَةِ فَٱسْعَوْا۟ إِلَىٰ ذِكْرِ ٱللَّهِ وَذَرُوا۟ ٱلْبَيْعَ ﴾، بـەڵام کـە بانگـی دا لـە کڕیـن و فرۆشـتن گەڕێـن، مـادام بانگیـدا، دوایيـش کـە نوێژ کـرا، دووبارە تێهەڵبچنـەوە لـە کاروکاسـبیی: ﴿ فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ فَٱنتَشِرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَٱبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ ﴾، هـەرکات نوێـژ تـەواو بـوو بەزەویـدا بڵاوببنـەوە جارێـکی دیکـە لـە بەخشـشی خـوا داوا بکـەن، مانـای وایـە خـوای پـەروەردگار زۆر بـە جیددیـی فەرمـانی بـە مسـوڵمانان کـردوە، کـە دەبـێ بـۆ پەیداکـردنی بژیـو هەوڵبـدەن.

پێغەمبەریش ﷺ لە فەرمایشتێکدا دەفەرموێ: {لَوْ تَوَكَّلُونَ عَلَى اللهِ حَقَّ تَوَكُّلِهِ، لَرُزِقْتُمْ كَمَا يُرْزَقُ الطَّيْرُ تَغْدُو خِمَاصًا وَتَرُوحُ بِطَانًا} **(أخرجه الترمذي: ٢٣٤٤، وقال: حسن صحيح، وابن ماجه: ٤١٦٤، وأبو يعلى: ٢٤٧، وابن حبان : ٧٣٠، والحاكم: ٧٨٩٤، وقال: صحيح الإسناد)**، واتە: ئەگەر وەك پێویست پشت بە خوا ببەستن، بژیوتان دەدرێ، وەك چۆن بژیوی باڵندە دەدرێ، باڵندەکان بەیانیان دەردەچن بە سکی برسیەوەو، ئێواران دەگەڕێنەوە، بە سکی پڕەوە.

واتە: خوا بژیویان دەدات، بەڵام دەبێ دەربچن، بجووڵێن، ئێچیر بگرن، ئەگەر باڵندەی بچووك بن، مێش و مەگەز دەخۆن، هەموویان بە سکی خاڵیی دەردەچن بەیانیان، بەڵام ئێواران بەسکی پڕ دەگەڕێنەوە.

کەواتە: دەبێ دەرچوونەکە هەبێ، گەڕان و سووڕانەکە هەبێ، ئنجا تێربوونەکە دەبێ.

**٤- فراوانیی و تەنگیی ڕزق و ڕۆزیی، بۆ تاقیکردنەوەیە، نەك نیشانەی ڕازیی بوون، یان ڕازی نەبوونی خوا:** بە داخەوە زۆر کەس لەوەدا بە هەڵەدا چوون: پێیان وایە ئەگەر خوا بژیوی بۆ کەسێك فراوان کرد، ئەوە زۆری خۆش دەوێ و لێی ڕازییە، بەڵام ئەگەر کەسێکی هەژارو نەدار کرد، دیارە خوا لێی تووڕەیە! بەڵام ئەوە ڕێك پێچەوانەی ئەوەیە کە خوا ﷻ لە قورئاندا فەرموویەتی:

أ- لە سوورەتی **(الفجر)**دا، دەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا ٱلْإِنسَٰنُ إِذَا مَا ٱبْتَلَىٰهُ رَبُّهُۥ فَأَكْرَمَهُۥ وَنَعَّمَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّىٓ أَكْرَمَنِ ﴿١٥﴾ وَأَمَّآ إِذَا مَا ٱبْتَلَىٰهُ فَقَدَرَ عَلَيْهِ رِزْقَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّىٓ أَهَٰنَنِ ﴿١٦﴾ كَلَّا﴾، واتە: مرۆڤ (ی نامسوڵمان، یان مرۆڤێك کە بیرکردنەوەی چەوتە) کاتێك پەروەردگاری تاقیکردەوە، ڕێزی لێگرت و نیعمەتی پێدا، دەڵێ: خوا ڕێزی لە من گرتوە، {واتە: کە خوا لە ڕووی ماددییەوە دەوڵەمەندی کرد، وادەزانێ خوا لە ڕووی مەعنەوییشەوە خۆشیدەوێ و ڕێزی لێدەگرێ} بەڵام ئەگەر تاقیکردەوە (بەبارێکی دیکەدا) بژیوی لێ تەنگکردەوە، دەڵێ: خوا منی بە کەم تەماشا کردوە، خوا منی ڕیسوا کردوە، منی سووك کردوە، خواش دەفەرموێ: ﴿كَلَّا﴾، ئەوە وانیە، واز لەو قسانە بێنە!

ب- لە سوورەتی (**المؤمنون**)دا، دەفەرمویٚ: ﴿ أَيَحْسَبُونَ أَنَّمَا نُمِدُّهُم بِهِۦ مِن مَّالٍ وَبَنِينَ ﴿٥٥﴾ نُسَارِعُ لَهُمْ فِى ٱلْخَيْرَٰتِ ۚ بَل لَّا يَشْعُرُونَ ﴿٥٦﴾ ﴾، واتە: ئایا پێیان وایە ئەوەی کە ئێمە هاوکاریی ئەوانی پێدەکەین لە سامان و لە کوڕان، خێرایی دەکەین لە چاکەی ئەواندا، (واتە: پێیان وایە کە بۆیە وایان بۆ دەکەین، خۆشمان دەوێن)، بەڵکو هەست ناکەن، شعووریان نیە.

ئەگەرنا مرۆڤ! تۆ کاتێك خوا ماڵ و سامانی پێداوی، کوڕان و قەڵەباڵغیی و خزم و قەومی پێداوی، بەڵام ڕووت لە خوا نیە، هەر بزانە کە ماڵەکەت بە غەزەبەو قەڵەباڵغییەکەی دەوریشت بە غەزەبە، چونکە بۆ خراپە بەکاریان دێنی! بەڵام شعووریان نیە.

**٥- زۆر جاران فراوانیی بژێو بۆ کەسێك، یان بۆ کۆمەڵێك مایەی تووڕەیی خوایە:**

أ- خوا لە سوورەتی (**التوبة**)دا، زۆر بەڕوونیی ئەوە دەفەرمویٚ: ﴿ فَلَا تُعْجِبْكَ أَمْوَٰلُهُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُهُمْ ۚ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُم بِهَا فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَتَزْهَقَ أَنفُسُهُمْ وَهُمْ كَٰفِرُونَ ﴿٥٥﴾ ﴾، (ڕوو لە پێغەمبەری خاتەم دەکات و دەفەرمویٚ: سەرسام مەبە بە سامانەکانیان و منداڵەکانیشیان {کە سامان و کوڕو کچیان زۆرە} خوا تەنیا مەبەستی ئەوەیە بەو ماڵ و سامانەو بەو قەڵەباڵغییەی دەوروبەریان لە ژیانی دنیادا سزایان بدات {پێوەی ماندوو دەبن و خڕی دەکەنەوە، بە مشوور لێ خواردنی منداڵەکان ماندوو و ناڕەحەت دەبن} دوایی بمرن و گیانیان دەربچێ، لە حاڵەتێکدا کە بێبڕوان.

کەواتە: خوا ﷻ هەندێ کەس ماڵ و سامانی دەداتێ، قەڵەباڵغی بەدەورەوە پەیدا دەکات، بۆ ئەوەی ببێتە مایەی مەینەتیی و ناڕەحەتیی و، دواییش بە کافریی دەمرێ.

ب- لە سوورەتی (**سبأ**)دا خوای پەروەردگار ڕوونتر ئەو مەبەستە دەخاتەڕوو، دەفەرمویٚ: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا فِى قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَآ إِنَّا بِمَآ أُرْسِلْتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿٣٤﴾ وَقَالُوا۟ نَحْنُ أَكْثَرُ أَمْوَٰلًا وَأَوْلَٰدًا وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴿٣٥﴾ قُلْ إِنَّ رَبِّى يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ

لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٦﴾ وَمَآ أَمْوَٰلُكُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُكُم بِٱلَّتِى تُقَرِّبُكُمْ عِندَنَا زُلْفَىٰٓ إِلَّا مَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَأُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ جَزَآءُ ٱلضِّعْفِ بِمَا عَمِلُوا۟ وَهُمْ فِى ٱلْغُرُفَٰتِ ءَامِنُونَ ﴿٣٧﴾ ﴾، واتە: هیچ وریاکەرەوەو ترسێنەرێکمان، لە هیچ شارو ئاوەدانییەك دا نەناردوە، مەگەر خۆشگوزەرانەکانی گوتوویانە: ئێمە بێبڕواین بەوەی ئێوە پێی ڕەوانکراون، [هەمیشە خۆشگوزەرانەکان دژی پێغەمبەران بوون، خۆشگوزەرانەکان کێ بوون؟ ئەوانە بوون کە دەستەڵاتیان هەبووە، خۆیان سەپاندوە بەسەر خەڵکداو، دەستیشیان بەسەر ماڵ و سامانی وڵات داگرتوە، ئێستاش هەر وایە] . ئەو خۆشگوزەرانانە بە پێغەمبەرانیان گوت: ئێمە لە ئێوە ماڵ و سامانیشمان زیاترەو ڕۆڵەشمان زیاترە {خزم و کەسیشمان زیاترە}و ئێمە لە سزا دراوان نابین، {یانی: خوا ئێمەی خۆشدەوێ ئەگەر خۆشی نەویستباین، ئەو هەموو سامان و کوڕانەی نەدەداینێ!} بڵێ: پەروەردگارم بژیو بۆ هەر کەسێك کە بیەوێ فراوان و تەنگ دەکات، (واتە: لە هەندێك لە حاڵان دا بژیوی بۆ زۆر دەکات و، لە هەندێك حاڵاندا لێی کەم دەکاتەوە، یاخود: بۆ هەندێکیان زۆر دەکات و بۆ هەندێکیان کەم دەکات} بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن {کە ئەوە مانای ڕەزامەندیی خوا نیە، بەڵکو مانای تاقیکردنەوەیە بۆ مرۆڤەکان} ماڵ و سامانتان و ڕۆڵەکانیشتان نابنە هۆکاری ئەوەی لە ئێمەتان وە نیزیك بخەن، مەگەر کەسێك بڕوابێنێ و کردەوەی باش بکات، ئەوانە پاداشتی چەند بەرانبەریان، چەند قاتیان هەیە، بەوەی کە کردوویانە، ئەوانە لە کۆشکە بەرزەکانی بەهەشتدا، بە دڵنیایی بێ ترس و بیم نیشتەجێن.

کەواتە: ئەمە هەر زۆر ڕوونە، وەك پێشینانی خۆشمان دەڵێن: (فڵانکەس ماڵ و سامانی هەیە، بەڵام ماڵەکەی بە غەزەبە)، بۆچی؟ چونکە نوێژی لەسەر دەچوێنێ، ڕۆژووی لەسەر دەچوێنی، خوای تێدا ناناسێ، خراپەی پێ دەکات، مانای وایە ماڵەکەی نیعمەتە بەڵام بۆ خۆی کردوویەتی بە نیقمەت و بەڵا، بەهۆی بێ ئیمانیی و خراپ بەکارهێنانیەوە.

**٦- بژیو زۆرو کەمکردن بە دەستی خوا بوون، لەگەڵ هەوڵداندا، تێکناگیرێن:** یەکێك بۆی هەیە، بڵێ: مادام خوا دەفەرموێ: بۆ هەر کەسێك بیەوێ، بژیوی بۆ فراوان دەکات و، هەر کەسێك بیەوێ بۆی کەم دەکات، کەواتە: مرۆڤ بۆچی هەوڵبدات؟ دەڵێین: ئەو دووانە تێکناگیرێن، چونکە خوا وەك یاسایەکی خۆی دەفەرموێ: ﴿ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَانِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴿٣٩﴾ ﴾ النجم، واتە: بۆ مرۆڤ نیە مەگەر هەوڵ بدات، مرۆڤ دەبێ هەوڵ بدات و بەبێ هەوڵدان هیچی نایەتە دەست، مرۆڤ مسوڵمان بێ، یان نا مسوڵمان بێ، هەروەها لە سوورەتی (**التوبة**)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَقُلِ اعْمَلُوا فَسَيَرَى اللَّهُ عَمَلَكُمْ ﴿١٠٥﴾ ﴾، واتە: بڵێ: کار بکەن، خوا کردەوەکەتان دەبینێ، مانای وایە مرۆڤ دەبێ هەوڵبدات و هەوڵدانەکەی مرۆڤ لەگەڵ ئەوەدا کە بژیو بە دەستی خوایەو، فراوانی دەکات و وەتەنگی دێنێ، یان زۆری دەکات و کەمی دەکات، ئەو دووانە تێکناگیرێن و نابێ هیچکەس ئەوە کە ڕزق و بژیو بە دەست خوایە، بیکاتە پاساوی تەنبەڵیی و کارنەکردن و، خۆماندوو نەکردن، چونکە بەڵێ ڕزق بە دەست خوایە، بەڵام خوا لە ڕێی هۆکارەکان ڕزقەکە دەدات، وەك ژیان و مردن بە دەست خوان، بەڵام کەسێك بۆ خۆی بچێ لە شوێنێکی بەرزەوە خۆی هەڵدێرێ، دەمرێ، یان کەسێك نەخۆش بێت و خۆی چارەسەر نەکات، نەخۆشییەکەی خراپتر دەبێت، بەقەدەری خوایەو، ئەگەر خۆیشی چارەسەر بکات، هەر بە قەدەری خواو، بە ویستی خوا چاك دەبێ، هەروەها مەسەلەی ڕزقیش بە هەمان شێوە، زۆربەی ئەو خەڵکەی تەنبەڵ تەنبەڵ دادەنیشن، دوایی ناچار دەبن دەست لەبەر خەڵکی پان بکەنەوە، ئەوی دیکەش دەچێ کارو کەسابەت دەکات، ئارەقەی نێو چاوانی خۆی دەڕژێنێ و خۆی پێ دەژیەنێ، بۆیە کوردەواریی خۆمان دەڵێ: (گۆشتی بەلەکی خۆت بخۆ، چاکترە لە منەتی قەساب)، یان دەڵێن: (دەستی ماندوو لەسەر سکی تێرە).

**٧- ئیمان و تەقوا مایەی پیت و پێزن لە ژیانی خەڵکداو، ئەگەر خەڵك بڕوادارو پارێزکاربن خوا بژیویان بۆ فراوان دەکات:**

أ- لە سوورەتی (**الأعراف**)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ الْقُرَىٰ آمَنُوا وَاتَّقَوْا لَفَتَحْنَا عَلَيْهِم بَرَكَاتٍ مِّنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ وَلَٰكِن كَذَّبُوا فَأَخَذْنَاهُم بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ

(٩٦) ﴾، واتە: ئەگەر خەڵکی ئاوەدانییەکان ئیمانیان هێنابایەو پارێزیان بکردبایە، {ئەهلی ئیمان و تەقوابان} دەروازەکانی ئاسمان و زەویمان بەسەردا دەکردنەوە، واتە: خێرو خۆشیی و بەرەکەتی ئاسمان و زەویمان بەسەردا دەڕشتن، ﴿ وَلَٰكِن كَذَّبُواْ ﴾ بەڵام بێبڕوابوون، ﴿ فَأَخَذۡنَٰهُم بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴾، بۆیە بەهۆی ئەوەوە کە دەیانکرد، گرتمانن، سزامان دان.

کەواتــە: لــە ئەنجامــی ئیـمان و تەقـوادا، بژیـو بـۆ مـرۆڤ فـراوان دەبـێ، بژیـوی ماددیــی و بژیـوی مەعنەویــی.

ب- لە سوورەتی (**الطلاق**)یشدا، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا (٢) وَيَرۡزُقۡهُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَحۡتَسِبُ ﴾، واتە: هەر کەسێك پارێز لە خوا بکات، خوا دەرووی خێری لێ دەکاتەوەو، بێ ئەوەی خۆی فیکری پێبشکێ و حیسابی بۆ بکات، خوا بژیوی دەدا.

ج- هەروەها لە سوورەتی (**إبراهيم**)دا، دەفەرموێ: ﴿ لَئِن شَكَرۡتُمۡ لَأَزِيدَنَّكُمۡ (٧) ﴾، واتە: ئەگەر سوپاسگوزاریی بکەن بۆتان زیاد دەکەم، هەر نیعمەتێك سوپاسگوزاریی خوای لەسەر بکرێ، خوا ئەو نیعمەتە زیاد دەکات، ئنجا ماڵ و سامانە، عەقڵە، زانستە، هەرچی هەیە، شوکری نیعمەتی خواش ئەوەیە کە ئەو نیعمەتە لە ڕەزامەندیی خوادا بەکاربهێنرێ، کەسێك ماڵ و سامانی هەیە، ماڵ و سامانەکەی دەجوڵێنێ و کاسبیی پێ دەکات، چوار کەسیش سوودی لێوەردەگرن و ماڵ و سامانەکەش زۆر دەبێ، بەڵام ئەگەر دایبنێ لە وێ و وردە وردە لێی سەرف بکات، کۆتایی پێدێت، شوکری نیعمەتی ماڵ ئەوەیە، ئەو ماڵە بە کاربێنی و بیجووڵێنی و، سوودیشی پێ بە خەڵك بگەیەنی و، بەکاری بێنی، نەك دایبنێی بەکاری نەهێنی، هەروەك شوکری نیعمەتی عیلم ئەوەیە، کە ئەو عیلمە لە خۆت دا بەکاربێنی، هەروەها بڵاوی بکەیەوە، ئێستا کەسێك مەسەلەیەك فێر دەبێ، ئەگەر بچێ بۆ دوو کەسی باس بکات، زیاتر لە مێشکیدا دەچەسپێ، بەڵام ئەگەر بەکاری نەهێنێ و بەس لەلای خۆی بێ و بڵاوی نەکاتەوە، ڕەنگە لە بیری بچێتەوە، عەقڵیش بەکاری بێنە، عەقڵت زیاد دەکات، جەستەت بەکاربێنە پتەوو بە هێزو پێز دەبێ.

**٨- گەلێك جاران فراوانكردنی بژیو مایەی یاخیی بوونی خەڵكە:** زۆر جاران خەڵك كە ڕزق و بژیوی بۆ فراوان دەبێ، لە خوا یاخیی دەبێ، ئەگەر تەماشای میللەتی خۆمان بكەین، ئەم هەرێمی كوردستانە، لە سەرەتای ڕاپەرینە جەماوەرییەكەی نەوەدو یەك (١٩٩١ ز) دا، كە خەڵك ئاردی بە كیلۆ دەكڕی و ڕۆنی بە كیلۆ دەكڕی و، زۆربە هەژارو نەدار بوون، زیاتر حیسابی لای خواو قیامەتیان دەكرد، ئێستا كە زۆریان چوونە باڵەخانەو كۆشكی بەرز بەرزەوەو، خۆشگوزەرانیی لە ژیانیاندا پەیدابووە، چەقی گرنگیی و بایەخ پێدانیان بۆتە خۆیان و، خزمەتی جەستەیان و تێركردنی غەریزەو ئارەزووەكانیان، تەماشای ڕێكلامی ڕاگەیاندنەكان دەكەی هەمووی هەر باسی برنج و خواردن و خواردنەوە و پۆشاك و ئەو شتانەیە كە لە خزمەتی جەستەدان، تەماشای ژیان و گوزەرانیان دەكەی، هەمووی هەر پێشبڕكێ لەوەدا دەكات كە خانووەكەی چاكتر بێ، سەیارەكەی چاكتر بێ، پاشان لە ڕووی هاوكاریی یەكدیشەوە، ئەو كاتە خەڵك پێكەوە بە ڕەحمتر بوو، ئێستا كەسی وا هەیە ملیارێكی هەیە، یان چەندان ملیاری هەن، بەڵام بەزەیی بە كەسێكدا نایەتەوە كە لە خانووی بە كرێدایەو كرێی خانووەكەشی بۆ نادرێ! ئەو چەند ملیاردو لێرەی حیزب و خزمیش هەر پارەی ئەو خەڵكە ڕەش و ڕووتەیە دزیویانەو بردوویانە! بەڵێ زۆرجاران فراوانكردنی بژیو، دەبێتە هۆی یاخیی بوونی خەڵك، بەڵام خەڵكێك كە خوا نەناسێ و دنیای خۆشتر بوێ لە دوارۆژ، خەڵكێك خورمای خۆشتر بوێ لە خوا، خەڵكێك كە زیاتر بۆ جەستەو تێركردنی ئارەزوو و غەریزە جەستەییەكان هەوڵبدات، خوا نەبینێ و تەماشای ئاسمان نەكات و سەربەرز نەكاتەوە، وابزانێ ژیان هەر ئەو پێنج و دوو ڕۆژەی دنیایە، ئەو جۆرە كەسانە بە هۆی فراوان بوونی بژیوو ڕزقەوە، لە خوا غافڵ و یاخیی دەبن، ئنجا ئایا بەڵگەمان چییە بۆ ئەوە؟

أ- خوا ﷻ لە سوورەتی **(الشورى)**دا، دەفەرموێ: ﴿ وَلَوۡ بَسَطَ ٱللَّهُ ٱلرِّزۡقَ لِعِبَادِهِۦ لَبَغَوۡاْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَٰكِن يُنَزِّلُ بِقَدَرٖ مَّا يَشَآءُۚ إِنَّهُۥ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرُۢ بَصِيرٞ ﴿٢٧﴾ ﴾، ئەگەر خوا بژیوی فراوان بكردبایە بۆ بەندەكانی، یاخیی دەبوون لە زەویدا، بەڵام بە ئەندازە بۆ هەر كەسێك بیەوێ دادەبەزێنێ، بە دڵنیایی خوا شارەزاو بینەری بەندەكانیەتی، هەر كەسە

هێندەی دەداتێ کە پێی لە خوا یاخیی نەبێ، هی واش هەیە، خوا زۆری دەداتێ، لەبەر ئەوەی خوا دەزانێ ناخێکی پیسی هەیە، دەفەرموێ: با زۆری بدەمێ، تاکو زیاتر لە خوا یاخیی بێ و زیاتر شایستەی سزا بێ، هەم لە دنیادا عەیبداربێ، هەم لە دوا ڕۆژیشدا گوناهبار و سزا باربێ.

ب- هەروەها لە سوورەتی (**الزخرف**)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْلَآ أَن يَكُونَ ٱلنَّاسُ أُمَّةً وَٰحِدَةً لَّجَعَلْنَا لِمَن يَكْفُرُ بِٱلرَّحْمَٰنِ لِبُيُوتِهِمْ سُقُفًا مِّن فِضَّةٍ وَمَعَارِجَ عَلَيْهَا يَظْهَرُونَ ﴿٣٣﴾ وَلِبُيُوتِهِمْ أَبْوَٰبًا وَسُرُرًا عَلَيْهَا يَتَّكِـُٔونَ ﴿٣٤﴾ وَزُخْرُفًا ۚ وَإِن كُلُّ ذَٰلِكَ لَمَّا مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۚ وَٱلْـَٔاخِرَةُ عِندَ رَبِّكَ لِلْمُتَّقِينَ ﴿٣٥﴾ ﴾، واتە: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە خەڵك هەمووی ببنە یەك كۆمەڵ، (و لەسەر کوفر کۆببنەوە) ئەوانەی بێبڕوا دەبن بە خوای خاوەن بەزەیی، وامان دەکرد ماڵەکانیان سەقفەکانیان لە زیو بووایە، هەروەها ئەو پەیژانەی پێیان دا دەچنە سەرێ، دیسان خانووەکانیان دەرگاکانیان زێڕو زیو بووایەو، قەنەفەکانیش کە لەسەریان پاڵدەدەنەوە لە زێڕو زیو چندرابوونایە، هەروەها زێڕێکی زۆریشمان پێدەدان، بەڵام هەموو ئەوە ڕابواردنی ژیانی دنیایە، دوارۆژیش لەلای پەروەردگارت بۆ پارێزکارانە.

ئنجا خستنەڕووی ئەوە هەمووی بۆ ئەوەیە، کە مسوڵمانان کاتێك دەبینن، ئەهلی کوفر - بە تایبەتی ئێستا ئەمریکاو ڕووسیا و چین و زلهێزانی دیکە - سەروەت و سامانێکی زۆریان لەبەر دەست دایە، کە زۆربەی خێرو بێری وڵاتی مسوڵمانانە دزیویانە، کەرەسەی خاوو نەوتەکەیان بە تاڵان دەبەن، چونکە هەر حوکمڕانەکانیش داشی دامەن بە دەست ئەوانەوە، خێرو بێرەکەیان بەتاڵان دەبەن، ئەگەر ئاسن و مسە، زێڕە، زیوە، ئەگەر نەوت و گازە، بەهەرزانیی لێیان دەستێنن، چونکە خۆشیان گوێیان بەدەستی ئەوانەوەیە، ئنجا ئەو غازو نەوت کانزایانە کە بە هەرزانیی لێیان دەکڕن، دوایی لەوەرگیراوەکان (مشتقّات) یان، کەل و پەلی وا دروست دەکەن، بە سەدان بەرانبەر پێیان دەفرۆشنەوە،

هەروەها چەکیشی لێ دروست دەکەن و بەو چەکانەش هەر خۆیانیان پێ بە کوشت دەدەن و پێیان دەفرۆشنەوە!!

ئنجا کاتێ مسوڵمانان واقیعەکە ئاوا دەبینن، کە ئەهلی کوفر هێندە خاوەن ئیمکانیەتن، بۆ ئەوەی زۆر بەسەهوو دانەچن و پێیان وابێ خوا ئەوانی زۆر خۆشدەوێ، بۆیە ئاوای بۆ کردوون!! ئەوەتا خوا دەفەرموێ: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە خەڵك هەمووی ببێتە کۆمەڵێکی کافر، ئاوامان دەکرد بۆ بێبڕوایەکان، مەبەستیش ئەوەیە خوا دنیای پێ هیچ نیە و ژیانی دنیای پێ شتێکی کەم بایەخە، دەیدات بە دوژمنەکانیشی، لە فەرموودەی پێغەمبەردا هاتوە ﷺ دەفەرموێ: خوا جاری وا هەیە بەندەی خۆی لە ماڵ و سامانی دنیا دەپارێزێ، وەك چۆن یەکێك لە ئێوە نەخۆشەکەی لە خواردن دەپارێزێ[1].

کەسێك کە نەخۆش دەبێ پێی دەگوترێ: ئەو شتەی مەخۆ، نەخۆشییەکەت زیاد دەکات، خواش جاری وایە ئاوا بەندەی خۆی دە پارێزێ لە ماڵ وسامانی دنیا، دەزانێ ئەگەر زۆری بداتێ، پێی مەشغووڵ دەبێ، یان پێی لە خۆبایی دەبێ، بۆیەش پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:[2] هەر کەسێك خوا ئەوەندەی بژیو بداتێ بەشی بکات و، پێشی قەناعەت بکات، بەختەوەر و سەرفرازە، مرۆڤ ئەگەر هێندەی بژیو هەبێ، پێی بژیی و چاوی لە دەستی خەڵك نەبێ، بەڵام قەناعەتی پێی هەبێ، سەرفراز و بەختیارە، چونکە ئەگەر قەناعەتی پێ نەبوو، زۆریش بێ هەر کەمە، بەڵام کە قەناعەتی هەبوو کەمیش هەر زۆرە.

---

(١) {عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ رضي الله الله عنه، أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى الله عَلَيه وسَلَّم كَانَ يَقُولُ : إِذَا أَحَبَّ اللَّهُ عَبْدًا حَمَاهُ الدُّنْيَا كَمَا يَحْمِي أَحَدُكُمْ مَرِيضَهُ الْمَاءَ لِيَشْفِيَهُ.} أخرجه أبو يعلى: ٦٨٦٥، قال الهيثمي (٢٨٥/١٠): إسناده حسن.

(٢) {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم، قَالَ: «قَدْ أَفْلَحَ مَنْ أَسْلَمَ: وَرُزِقَ كَفَافاً، وَقَنَّعَهُ اللَّهُ بِمَا آتَاهُ»} أخرجه أحمد: ٦٥٧٢، ومسلم: ١٠٥٤، والترمذي: ٢٣٤٨، وقال: حسن صحيح، وابن ماجه: ٤١٣٨.

گێڕراوەتـەوە: جارێـك كابرایـەك دەچێـت بـۆ لای عومـەری كـوڕی عەبدولعەزیـز (ڕەحمـەتی خـوای لـێ بـێ)، داوای هاوكاریـی لـێ دەكات، دیارە حوكمڕانـەكانی پێـش عومـەری كـوڕی عەبدولعەزیـز هـەروا تەخشـان و پەخشـانیان كـردوە بـە پـارەی دەوڵـەت، كابرایـەك هاتـوە شـیعرێكی پێـدا هەڵگوتـوون، هـەزار درەمیـان داوەتـێ، یەكێـكی دیكـە شـیعرێكی گوتـوە، سـەد دینـاری زێڕیـان داوەتـێ، ئەویـش لـەوان غەڵـەت بـوو، یـان شـاعیرێك بـووە، یـان كابرایـەك بـووە لەوانـەی كـە دێـن ڕوو بـەڕوو مەدحـی حوكمڕانـەكان دەكـەن، {ئێسـتاش دەبینیـن، دەهـۆڵ كـوت و، زوڕنـا ژەن زۆرن، بـۆ ئـەو حوكمڕانانـەی خۆیـان دەسـەپێنن بەسـەر خەڵـك دا، بـۆ چەواشـە كـردنی خەڵـك، دەبـێ زوڕنـا ژەن و دەهـۆڵ كوتـان بـە دەوری خۆیانـەوە پەیـدا بكـەن، ئـەو نووسـەرو شـایەرو ڕاگەیاندنكارانـە، كـە قسـەی ناهـەق دەكـەن} دەچـێ بـۆ لای داوای هاوكاریـی لێـدەكات، ئەویـش دە (١٠) درەمـی زیـوی دەداتـێ، دەڵـێ: فەرمـوو! ئەویـش دەڵـێ: ئـەوە زۆر زۆر كەمـە، هیـچ كەلێنێكـم بـۆ ناگـرێ، مەگـەر هـەر بـۆ بەرەكـەت هەڵیبگـرم، جەنابـت پیاوێـكی موبـارەكی، عومەریـش دەڵـێ: لـە هـی خـۆم هـەر ئەوەنـدەم لـە توانادایـە، هـی بەیـت و ماڵیشـت پـێ ناشـێ، [دەزانـێ هەیـەتی بـەس هاتـوە سـواڵێ بـكات]، كابـراش دەڕوات، عومـەر بانگــی دەكات و دەڵــێ: وەرە وەرە بگەڕێـوە، پێـی دەڵـێ: ئەگـەر پـارەت كـەم بـوو وییسـتت زۆر بـێ، یـادی مـردن بكـە، {بڵـێ: ئنجـا چ بەمەعلوومـە سبەینێ نامـرم و، ئـەو دە درهەمـەش ببێتـە میـرات} هەروەهـا ئەگـەر ماڵیشـت زۆر بـوو، ویسـتت لەبـەر چاوت كـەم بـێ، هـەر یـادی مـردن بكـە! {دەڵێـی: مـادام بەجێـی دێڵـم، هـەر هیـچ نیـە} ئەویـش دەڵـێ: فەرمانـدەی بـڕواداران! ئامۆژگارییەكەتـم زۆر لـە پـارەو سـامانەكە پـێ چاكـتر بـوو، دەڵـێ: دەبـڕۆ كاری پـێ بكـەو خێـری لـێ ببینـی.

**٩- هاندانی خەڵك بۆ بەخشین لە پێناوی خوادا، گەورەترین بەڵگەی كاسبیی كردن و، بژیو دەستەبەر كردنە:** خوا ﷻ لە زۆر شوێنی قورئاندا هانی مسوڵمانان دەدات كە ببەخشن و هاوكاریی خەڵك بكەن، بۆ وێنە:

أ- ﴿مَّثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنۢبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنۢبُلَةٖ مِّاْئَةُ حَبَّةٖۗ وَٱللَّهُ يُضَٰعِفُ لِمَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٦١﴾﴾، واتە: وێنەی ئەوانەی ماڵ و سامانی خۆیان لە ڕێی خوادا دەبەخشن، وەك دەنكە تۆوێكە، حەوت گوڵان دەر بكات، هەر گوڵەی سەد دەنكی تێدابێ، خواش بۆ هەر كەسێكی بیەوێ بۆی چەند بەرانبەریش دەكاتەوە، كەواتە: پاداشتی خێرو چاكە، هەتا یەك بە حەوت سەد (٧٠٠) دەڕوات.

ب- هەروەها هەر لە سوورەتی (**البقرة**)دا، دەفەرموێ: ﴿إِن تُبْدُواْ ٱلصَّدَقَٰتِ فَنِعِمَّا هِيَۖ وَإِن تُخْفُوهَا وَتُؤْتُوهَا ٱلْفُقَرَآءَ فَهُوَ خَيْرٞ لَّكُمْۚ وَيُكَفِّرُ عَنكُم مِّن سَيِّـَٔاتِكُمْۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٞ ﴿٢٧١﴾﴾، واتە: ئەگەر خێرو بەخشینەكانتان ئاشكرا بكەن، شتێكی زۆر زۆر باشە {بۆ ئەوەی خەڵكیش چاوتان لێ بكەن} بەڵام ئەگەر پەنهانی بكەن {و بە پەنهانیی بیدەن بە هەژاران} ئەوە بۆ ئێوە باشترە (خواش) خراپەكانتان لێ دەسڕێتەوەو، خوا بەوەی دەیكەن شارەزایە، واتە: هەندێ جاران وا باشە ماڵ و سامان بەخشینەكانت ئاشكرا بكەی، بۆ ئەوەی خەڵك چاوت لێ بكەن، هەندێ جاریش وا باشە پەنهانی بكەی، تاكو ئەو كەسەی كە هاوكاریی دەكەی دڵی نەشكێ.

كەواتە: هاندانی خوای پەروەردگار بۆ مسوڵمانان كە ببەخشن و هاوكاریی خەڵك بكەن، ئەوە هاندانیانە بۆ كاسبیی كردن و بۆ بژێو پەیداكردن، ئەگەرنا كەسێك نەیبێ، چێ ببەخشێ؟!

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە شەش (٦) ئایەت پێکهاتوە، ئایەتەکانی: (١٣ - ١٨)، تێیاندا خوا باسی ئایینی خۆی دەکات بە گشتیی، کە بۆ هەموو پێغەمبەرانی ناردوە (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، تاکو سەرەنجام لەسەر دەستی پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ تەواو کراوە.

هەروەها باسی هۆکاری سەرەکیی پەرتەوازەیی شوێنکەوتووانی بەرنامە پێشووەکان کراوە، شوێنکەوتووانی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، کە بریتی بووە لە ستەم و سنوورشکێنیی و، حەسوودیی بە یەکدی بردن.

پاشان پێنج ئەرکی گەورەو گرنگ کە بە موحەممەد ﷺ سپێردراون، لەگەڵ ڕاگەیاندنی پێنج ڕاستیی مەزن، خراونەڕوو، هەروەها بێ بەڵگەیی ناحەزانی ئیسلامیش خراوەتەڕوو، دواییش باسی قورئان کراوە.

لە کۆتاییشدا باسی ئاخیر زەمان (ساعة)و، نیزیکییەکەی و گومڕایی و دووریی بێبڕوایان کراوە.

﴿شَرَعَ لَكُم مِّنَ الدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِۦ نُوحًا وَالَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِۦٓ إِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰٓ أَنْ أَقِيمُوا۟ الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا۟ فِيهِ كَبُرَ عَلَى الْمُشْرِكِينَ مَا تَدْعُوهُمْ إِلَيْهِ اللَّهُ يَجْتَبِىٓ إِلَيْهِ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِىٓ إِلَيْهِ مَن يُنِيبُ ﴿١٣﴾ وَمَا تَفَرَّقُوٓا۟ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ الْعِلْمُ بَغْيًۢا بَيْنَهُمْ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى لَّقُضِىَ بَيْنَهُمْ وَإِنَّ الَّذِينَ أُورِثُوا۟ الْكِتَٰبَ مِنۢ بَعْدِهِمْ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ مُرِيبٍ ﴿١٤﴾ فَلِذَٰلِكَ فَادْعُ وَاسْتَقِمْ كَمَآ أُمِرْتَ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ وَقُلْ ءَامَنتُ

بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِن كِتَٰبٍۖ وَأُمِرۡتُ لِأَعۡدِلَ بَيۡنَكُمُۖ ٱللَّهُ رَبُّنَا وَرَبُّكُمۡۖ لَنَآ أَعۡمَٰلُنَا وَلَكُمۡ أَعۡمَٰلُكُمۡۖ لَا حُجَّةَ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكُمُۖ ٱللَّهُ يَجۡمَعُ بَيۡنَنَاۖ وَإِلَيۡهِ ٱلۡمَصِيرُ ﴿١٥﴾ وَٱلَّذِينَ يُحَآجُّونَ فِي ٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ مَا ٱسۡتُجِيبَ لَهُۥ حُجَّتُهُمۡ دَاحِضَةٌ عِندَ رَبِّهِمۡ وَعَلَيۡهِمۡ غَضَبٞ وَلَهُمۡ عَذَابٞ شَدِيدٌ ﴿١٦﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ وَٱلۡمِيزَانَۗ وَمَا يُدۡرِيكَ لَعَلَّ ٱلسَّاعَةَ قَرِيبٞ ﴿١٧﴾ يَسۡتَعۡجِلُ بِهَا ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِهَاۖ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مُشۡفِقُونَ مِنۡهَا وَيَعۡلَمُونَ أَنَّهَا ٱلۡحَقُّۗ أَلَآ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُمَارُونَ فِي ٱلسَّاعَةِ لَفِي ضَلَٰلِۭ بَعِيدٍ ﴿١٨﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{(خـوا) ئـەوەی لـە ئاییـن بـۆی کردوونـە بەرنامە (ئـەی موحەممـەد!) هەمان شـتە (لـە نێوەڕۆکـی دا) کـە نووحـی پـێ ڕاسـپاردبوو و، ئەوەیـە کـە بـۆ لای تۆمـان سروش کـردووەو، ئەوەیـە کـە ئیبراهیـم و مووسـاو عیسـامان پـێ ڕاسـپاردبوون، (پوختەکـەی ئەوەیـە) کـە ئاییـن و بەرنامـە (ی خـوا) بەرپـا بکـەن و، تێیـدا پەرتـەوازە مەبـن، هاوبەشـدانەرەکانیش ئـەوەی ئـەوانی بـۆلا بانـگ دەکـەی (کـە پەرسـتنی خوایـە بـە تەنیـا)، لەسـەر (دڵ)یـان گـەورەو قورسـە، خـواش هـەر کـەس بیـەوێ بـەرەو لای خـۆی هەڵیدەبژێـرێ و، هـەر کـەس (لـە ناخـەوە) بـۆ لای خـوا بگەڕێتـەوە، بـۆ لای خـۆی ڕاسـتە ڕێـی دەکات ﴿١٣﴾ (شـوێنکەوتووە لادەرەکان) پەرتـەوازەش نەبـوون (لـە دەوری ئـەو هەقـەی بـە پێغەمبەرانـدا نێررابـوو)، مەگـەر دوایـی ئـەوەی زانیارییـان بـۆ هـات، بـە هـۆی ئێرەیـی و ستەمەوە (لـە نێـو خۆیانـدا)و، ئەگـەر لەبـەر ئـەوە نەبووایـە کـە وشـە (بڕیار)ێـك، لـە پەروەردگارتـەوە تێپەڕیـوە، تاکـو کاتێـکی ناوبـراو، دادوەرییـان لـە نێوانـدا دەکـراو، بێگومـان ئەوانـەی دوای ئـەوان (دوای پێغەمبـەران)

کتێب (و بەرنامەی خوا)یان کرایە میرات، لە بارەیەوە لە دوو دڵییەکی خەستی بێزارکەردان ﴿١٤﴾ دەجا (ئەی موحەممەد!) بۆ لای ئەوە (کە باسکرا: ڕێی ڕاستی خوا گرتن و پەرتەوازە نەبوون) بانگەواز بکەو، وەك فەرمانت پێکراوە ڕێك وەستاو دامەزراو بەو، بە دوای ئارەزووەکانیان مەکەوەو، بڵێ: بڕوام بە هەر کتێبێك هەیە کە خوا دایبەزاندوەو، فەرمانم پێکراوە لە نێوانتاندا دادگەریم، خوا پەروەردگاری ئێمەو ئێوەشە، کردەوەکانی ئێمە هی خۆمانن و، کردەوەکانی ئێوەش هی خۆتانن، (پاساوی) مشتومڕ لە نێوان ئێمەو ئێوەدا نیە، خوا پێکەوە کۆمان دەکاتەوە (لە قیامەتدا)و، سەرەنجام بەس بۆ لای ویە ﴿١٥﴾ ئەوانەش کە لە بارەی خوا (و کۆتا بەرنامەکەیە)وە، شەڕە قسە دەکەن (لەگەڵ بڕوادارانـدا)، دوای ئەوەی (پەیامی خوا لەلایەن بڕوادارانەوە) وەڵامدراوەتەوە (و بڕوای پێهێنراوە)، بەڵگە (و پاساوە)کەیان لە لای پەروەردگاریان پووچەڵەو، تووڕەیی (خوا)یان لەسەرەو، ئازارێکی سەختیان هەیە (لە ڕۆژی دواییدا) ﴿١٦﴾ خوا ئەو کەسەیە کە کتێبە (کۆتاییە)کەی بە هەق دابەزاندوەو تەرازووش (ی دابەزاندوە)، تۆ چووزانی (چ شتێك وایکردوە بزانی!) کە کاتی دیارییکراو (ی ڕۆژی دوایی) نیزیکە! ﴿١٧﴾ ئەوانەی بڕوایان پێی نیە، پەلەی لێدەکەن و، ئەوانەی بڕواداریشن ترس و بیمیان لێی هەیەو، دەزانن کە چەسپاوە (و هەر دێ)، ئەها (ئاگاداربن!) ئەوانەی لە بارەی کاتی دیارییکراو (ی ڕۆژی دواییە)وە شەڕە قسە دەکەن، لە گومڕاییەکی دوور دان ﴿١٨﴾}

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(شَرَعَ ): (الشَّرْعُ: نَهْجُ الطَّرِيْقِ الوَاضِحِ، يُقَالُ: شَرَعْتُ لَهُ طَرِيقاً، وَالشَّرْعُ: مَصْدَر، ثُمَ جُعِلَ اسْمَاً للطرِيْق النَّهْجِ، فَقِيل لَه: شِرْعٌ، وشَرْعٌ، وشِرْعَةٌ)، (شَرْع): بریتیە لە ڕێیەکی ڕۆشن و ڕوون، دەگوترێ: (شَرَعْتُ لَهُ طَرِيقاً) ڕێیەکەم پێشاندا، (شَرْع)یش چاوگە، دوایی کراوە بە ناو بۆ ڕێیەکی ڕوون، کە هەم دەگوترێ: (شَرْعٌ) و هەم دەگوترێ: (شِرْعٌ) و هەم دەشگوترێ: (شِرْعَةٌ).

(مَا وَصَّىٰ بِهِۦ ): (الوَصِيَّةُ: التقدُّمُ إلى الغَيْرِ بِمَا يَعْمَلُ بِهِ مُقْتَرِناً بِوَعْظ)، وشەی (وَصِيَّة): بریتیە لەوە کە شتێك ئاراستەی کەسێك بکەی کاری پێبکات، بەڵام ئاراستە کردنەکەت لەگەڵ ئامۆژگارییدا بێ، قسەیەکی وا کە دڵی پێی نەرم بێ.

(أَقِيمُواْ ٱلدِّينَ ): واتە: دین بەرپا بکەن، (﴿ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ ﴿٥٥﴾ ﴾المائدة، أي: يُدِيمُونَ فِعْلَهَا، وَيُحَافِظُون عَلَيْهَا)، دەگوترێ: (يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ ) نوێژ بەرپا دەکەن، واتە: نوێژەکە چۆنە، ئاوا دەیهێننە دی، کەواتە: (أَقِيمُواْ ٱلدِّينَ ) واتە: ئایینەکە ڕاست بکەنەوە، بەو شێوە سرووشتییەی خوا دایبەزاندە، بەو شێوەیە جێبەجێی بکەن.

(بَغْيَۢا بَيْنَهُمْ ): (البَغْيُ: طَلَبُ تَجَاوزُ الإقْتِصَادِ فِيْمَا يُتَحَرَّى) (بَغي): بریتیە لە خواستنی بەزاندنی سنووری میانجیی، لەوەدا کە خەفتانی تێدا دەکرێ، کەواتە: وشەی (بَغي) بە مانای زوڵم و دەستدرێژیی و سنوورشکێنیی دێ، بەڵام (الإبْتِغَاءُ: الإجْتِهَادُ في الطَّلَب) وشەی (إبْتِغَاء): بە مانای کۆششکردنە لە داواکردنی شتێکدا.

(لَا حُجَّةَ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ ): (أي: لَا احْتِجَاجَ لِظُهُورِ البَيَانِ): پێویست بە موناقەشە ناکات، لە نێوان ئێمەو ئێوەدا، پێویست بەشەڕە قسە ناکات، لەبەر ڕوونیی ڕوونکردنەوەکە، (الحُجَّةُ: الدَّلَالَةُ المُبَيِّنَةُ للْمَحَجَّة)، (حُجَّة): بریتیە لە بەڵگەیەکی ڕۆشن

کە ڕێیەکە ڕۆشن بکاتەوە، بەڵام دوایی کە دەفەرموێ: ﴿لَا حُجَّةَ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ﴾، یانی: (لاَ جِدَالَ، لاَ نِقَاش) مشت و مڕو شەڕە قسە نیە، چونکە کەسێك کە شەڕە قسە دەکات لەگەڵ ئەوی دیکەدا، دوو کەس هەر کامێکیان بەڵگە دێنێتەوە، کەواتە: بەڵگەمان لە بەیندا، نیە واتە پێویست ناکات بەڵگە بۆ یەکدی بێنینەوە.

(يُحَآجُّونَ): (الـمُحَاجَّة: أنْ يَطْلُبَ كُلُّ أحدٍ أن يَرُدَّ الآخَرَ عَنْ حُجَّتِهِ ومَحَجَّتِهِ)، (مُحاجَّة): ئەوەیە کە دوو کەس، یان چەند کەسێك، هەر کامێکیان بیەوێ ئەوی دیکە لە بەڵگەکەی خۆی لابداو لەڕێیەکەی خۆی لابدا، بەکوردیی پێی دەڵێن: شەڕە قسە، دمبەدمە.

(دَاحِضَةٌ): (أي: بَاطِلَةٌ زَائِلَةٌ، وَأَصْلُهُ مِنْ دحْضِ الرِّجْلِ، وَهُوَ الزَّلَقُ)، (دَاحِضَةٌ) یانی: پووچ، (حُجَّتُهُمْ داحِضَةٌ) واتە: بەڵگەکەیان پووچ و بێ بنەمایە، ڕۆیشتوویە، ئەم وشەی (دَحَضَ): لە ئەصڵدا لە پێ خلیسکانەوە هاتوە، کەسێك لە شوێنێك کە خزە، پێی دەخزێ و دەخلیسکێ، پێی دەگوترێ: (دَحَضَتْ رِجْلُه) واتە: پێی خلیسکا، ئنجا ئەو کەسەی بەڵگەیەك دێنێتەوەو بەڵگەکەی پووچە، وەك ئەوە وایە پێی خلیسکابێ و هەڵدێرابێ.

(وَالْمِيزَانَ): (الوَزْنُ: مَعْرِفَةُ قَدْرِ الشَّيءِ، وَالمِيْزَانُ، الجَمْعُ مَوَازِين، مَا يُوزَنُ بِهِ)، وشەی (وَزْن): بریتیە لە زانینی ئەندازەی شتێك، (مِيْزَان)یش، کە بە (مَوَازِين) کۆدەکرێتەوە، هەر شتێکە شتی پێ هەڵبسەنگێنرێ و پێ بکێشرێ.

(مُشْفِقُونَ مِنْهَا): واتە: پەرۆشیانەو لێی دەترسێن، پەرۆشی خۆیانەو ترسیان بەرانبەری هەیە، دەڵێ: (الشَّفَقُ: اخْتِلَاطُ ضَوْءِ النَّهَارِ بِسَوَادِ اللَّيْلِ عِنْدَ غُرُوبِ الشَّمْسِ)، (شَفَق): بریتیە لە تێکەڵبوونی ڕووناکیی ڕۆژ، لەگەڵ تاریکیی شەو لە کاتی خۆر ئاوابووندا، (الْإِشْفَاقُ: عِنَايَةٌ مُخْتَلِطَةٌ بِخَوْفٍ، لأَنَّ الْمُشْفِقَ يُحِبُّ الْمُشْفَقَ عَلَيْهِ وَيَخَافُ مَا يَلْحَقُهُ)، (إشْفَاق): بریتیە لە گرنگیی پێدانێکی تێکەڵ، لەگەڵ ترس دا، چونکە (مُشْفِق) واتە: کەسێك شەفەقەتی هەبێ بەرانبەر بە کەسێك،

هەم بەتەنگیەوە یەو هەم ترسیشی لێی هەیە تووشی زەرەر ببێ، (**أشْفَقَ مِنْهُ**) واتە: ترسا، لێی ترسا (**أشْفَقَ عَلَيْه**) واتە: بەزەیی پێیدا هات، ئنجا (**أشْفَقْتُ عليه**)، یان (**أشْفَقَ منه**) واتە: گرنگیی پێداو خەمی لێ خوارد.

(يُمَارُونَ ): (**المِرْيَةُ: التَّرَدُّدُ فِي الأَمْرِ، وَهُوَ أَخَصُّ مِنَ الشَّكِّ، وَالمُمَارَاةُ: المُحَاجَّةُ فِيْمَا فِيْهِ مِرْيَة**)، (**مِرْيَة**): بریتیە لە دڵ لە دڵدان لە شتێکدا، کە تایبەتترە لە دوو دڵیی، (**مُمَارَاة**)یش، بریتیە لە شەڕە قسە لە شتێکدا کە جێی دوو دڵییە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خوا ﷻ دوای ئەوەی لە ئایەتەکانی پێشیدا، ژمارەیەکی زۆر لە سیفەتەکانی خۆی و، کردەوەکانی خۆی خستنەڕوو، بۆ خۆناساندنی بە ئێمەو، باسی وەحیی و پەیام ناردنی خۆی کرد بۆ پێغەمبەران بە گشتیی (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام**) و پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ بە تایبەتی، هەروەها دوای ئەوەی باسی بێ وێنەیی خۆی کردو، باسی ئەوەی کرد کە کلیلەکانی ئاسمانەکان و زەوی بەدەست ئەوەوەن، دیسان باسی ئەوەی کرد: هەر کەسێکی بیەوێ، بژیوی بۆ فراوان دەکات، یاخود لێی وەتەنگ دێنێ و بە هەموو شتێك زانایە.

ئنجا هەر لە درێژەی ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە مەزنانەدا، دەفەرموێ: ﴿ شَرَعَ لَكُم مِّنَ ٱلدِّينِ ﴾، واتە: لە ئایینی خۆی بەرنامەیەکی بۆ داناون، کە چییە؟ ﴿ مَا وَصَّىٰ بِهِۦ نُوحًا ﴾، هەمان شتە کە کاتی خۆی نووحی پێ ڕاسپاردوە، ﴿ وَٱلَّذِيٓ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ ﴾، هەروەها ئەوەی بۆ تۆمان سروشکردوە (ئەی موحەممەد! ﷺ) ﴿ وَمَا وَصَّيۡنَا بِهِۦٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰٓ ﴾، دیسان ئەوەی کە هەرکام لە ئیبراهیم و مووساو عیسامان پێ ڕاسپارد بوون.

کەواتــە: ئــەی موحەممــەد ﷺ! هەروەهــا ئــەی بــڕوادارانی شــوێنکەوتووی موحەممــەد! ئــەو بەرنامەیــەی ئێــوەی لەســەرن، لــە هێڵــە گشــتییەکانیدا، هــەر هەمــان ئاییــن و بەرنامەیــە، کــە نــووح و ئیبراهیــم و مووســاو عیســا (**عَلَيْهِـمُ الصَّـلَاةُ وَالسَّـلَامُ**)، لەســەری بــوون.

لێـرەدا خـوا بـاسی ئـەو پێنـج پێغەمبـەرە دەكات و، لـە سـوورەتی (**الأحزاب**)یشـدا، دیسـان بـاسی ئـەو پێنـج پێغەمبـەرە دەكات، دەفەرمـوێ: ﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مِيثَـٰقَهُمْ وَمِنكَ وَمِن نُّوحٍ وَإِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ ﴿٧﴾﴾، واتــە: كاتێـك پەیمانمـان وەرگـرت لـە پێغەمبـەران و لـە تـۆو، لـە نـووح و ئیبراهیـم و مووسـاو لـە عیسـای کـوڕی مەریـەم.

زانایـان هەندێکیـان گوتوویانـە: ئـەو پێنـج پێغەمبەرانـە كـە هـەم لـە سـوورەتی (**الشـوری**)دا، هــەم لــە ســوورەتی (**الأحزاب**)یشــدا، پێکــەوە هاتــوون، واتــە: نــووح و ئیبراهیــم و مووســاو عیســاو موحەممــەد (**عَلَيْهِـمُ الصَّـلَاةُ وَالسَّـلَامُ**)، لــە بــەر ئەوەیــە کــە تایبەتمەندییــەكی جیایــان هەیــە لــەو پێغەمبەرانــەی دیکــە، ئنجـا هەندێکیـان گوتوویانـە، کـە دەفەرمـوێ: ﴿فَٱصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُوْلُواْ ٱلْعَزْمِ مِنَ ٱلرُّسُلِ ﴿٣٥﴾﴾الأحقـاف، واتـە: خـۆت ڕابگـرە وەك چـۆن خـاوەن عەزمـەكان لـە پێغەمبـەران خۆیـان ڕاگـرت، گوتوویانـە: ئـەو پێنجـە پێغەمبـەرە خـاوەن عەزمەكانـن.

بـەڵام وەك لـە چەنـد شـوێنێك لـە كتێبـەكانی خۆمـدا باسـم كـردوە، ئـەو بۆچوونـە ڕاسـت نیـە، کـە تەنیـا ئـەو پێنـج پێغەمبـەرە بـە ئولولعـەزم خاوەن عـەزم ناسرابـن، چونکـە هەمـوو پێغەمبـەران خـاوەنی عـەزم بـوون، (**عـزم**) واتـە: ویسـتی مەحكـەم، پێغەمبـەران (**عَلَيْهِـمُ الصَّـلَاةُ وَالسَّـلَامُ**)، لـە هەمـوو ڕەوشـتە بەرزەكانـدا لـە لووتكـە دابـوون، بەڵـێ لـە نێـوان لووتكەكانیشـدا، بـەرزو بەرزتـر هەیـە، ئەگەرنـا ناگونجـێ بڵێیـی: هـەر ئـەو پێنجـە خـاوەن عـەزم بـوون، ئـەدی پێغەمبـەرەكانی دیکـە خـاوەن عـەزم نەبـوون؟!

کەواتە: ئەو بۆچوونە هەڵەیە بەڵام دەتوانین بڵێین: ئەو پێنج پێغەمبەرە (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ**)، لەوانی دیکە بە عەزمتر بوون، ئەوە دەگونجێ، ئەو پێنجە خاوەن عەزیمەتتر بوون و ئیرادەیان مەحکەمتر بووە.

بەڵام من پێم وایە کە جیاکردنەوەی ئەم پێنج پێغەمبەرە (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ**)، لە دوو شوێنی قورئاندا، لەبەر تایبەتمەندییەکی دیکەیە، ئەویش ئەوەیە کە ئەو پێنج پێغەمبەرانە، ئێستاش شوینکەوتوویان هەن، ئێستاش تەنیا ئۆممەتی ئەو پێنج پێغەمبەرانە هەیە:

١- صابیئەکان کە خۆیان بە شوێن کەوتوی نووح دەزانن، هەروەها هەندێك لە ئایینەکانی ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، خۆیان بە شوێنکەوتووی نووح دەزانن و، باسی تۆفانی نووح لە نێو هەموو ئۆممەتاندا هەیە.

٢- ئیبراهیم ﷵ کە هەرکام لە مسوڵمانان و جوولەکەو نەصرانییەکان، خۆیان بە شوێنکەوتووی وی دەزانن، هەروەها صابیئەش.

٣- مووساش جوولەکەکان خۆیان بە شوێنکەوتووی مووسا دەزانن.

٤- عیساش کە نەصرانییەکان خۆیان بە شوێنکەوتووی دەزانن.

٥- موحەممەدیش ﷺ کە مسوڵمانان خۆیان بە شوێنکەوتووی تایبەتی دەزانن.

کەواتە: ئەو پێنج پێغەمبەرە بۆیە خوا پێکەوەو لە دوو شوێن دا ناوی هێناون، چونکە ئەو پێنج پێغەمبەرە لە هەموو پێغەمبەران ناسراوتر بوون و شوێنکەوتوویان ئێستاش کەم و زۆر هەن.

خوا دەفەرموێ: ئەو بەرنامەیەی کە بۆ ئێوەمان داناوە، هەمان شتە کە نووحمان پێ ڕاسپارد بوو و، ئەوەیە کە بۆ تۆمان سروشکردووەو ئیبراهیم و مووساو عیسامان پێ ڕاسپاردوون، ﴿أَنۡ أَقِيمُواْ ٱلدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُواْ فِيهِ﴾، کە ئایین بەرپا بکەن و تێیدا پەرتەوازە مەبن، واتە: ئایینەکە خوا چۆنی ناردوە، ئاوا جێ

بەجێی بکەن و تێیدا پەرتەوازە مەبن، هەر کۆمەڵە بەشێکی لێ بگرن، و هەر کەسەو بە دۆڵێکدا بڕوات، وەك دەڵێن: (کەس بە ڕبەی کەس نە پێوێ) و (کەس لە مەڕی کەس نەخێوێ) و (هەر کەسە بە یاری خۆی هەڵابڵێ)! بەڵکو هەمووتان هەموو ئایین جێ بەجێ بکەن.

ئەم دەردی بەش بەش بوونە لە دینداریيدا، تایبەت نیە بە ئۆممەتانی پێشووەوە و لە نێو ئۆممەتی پێغەمبەریش ﷺدا هەیە، یەکێك لایەنی تەزکیەکەی دەگرێ، یەکێك لایەنی فیکرییەکەی دەگرێ، یەکێك لایەنی سیاسییەکەی دەگرێ، یەکێك لایەنی جیهادییەکەی دەگرێ، یەکێك لایەنە پەروەردەییەکەی دەگرێ، یەکێك لایەنە عیلمییەکەی دەگرێ، بەڵام دینداریی ڕاست ئەوەیە، تۆ لە یەك کاتدا هەوڵبدەی لایەنە عیلمییەکەشی و فیکرییەکەشی و پەروەردەییەکەشی و ڕووحییەکەشی، ئەخلاقییەکەشی و سیاسییەکەشی و جیهادییەکەشی، هەموویان پێکەوە بگری، چونکە دین هەمووی پێکەوە هاتوەو دەبێ بەش بەش نەکرێ، وەك لە سوورەتی (الروم)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ مِنَ ٱلَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمْ وَكَانُواْ شِيَعًا كُلُّ حِزْبِۭ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ ﴿٣٢﴾ ﴾، واتە: وەك هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان مەبن، ئەوانەی دینەکەیان بەش بەش کردو، تێیدا بوونە تاقم تاقم.

هەرکات هەر کۆمەڵە بەشێکی لە دین گرت، دوایی وا دەزانێ دین بەس ئەوەندەیە، کە بە داخەوە زۆرجار دەردی هاوبەش بۆ خوا دانەران و، دەردی خاوەن کتێبەکان: جوولەکەو نەصرانییەکان، لە نێو مسوڵماناندا، پەیدادەبن و تەشەنە دەکەن، لە کاتێکدا مسوڵمانان باش لە قورئان و سوننەت تێناگەن و، باش پێیانەوە پابەند نابن.

دوایی دەفەرموێ: ﴿ كَبُرَ عَلَى ٱلْمُشْرِكِينَ مَا تَدْعُوهُمْ إِلَيْهِ ﴾، لەسەر هاوبەش بۆ خوادانەرەکان گەورەیە، واتە: لەسەر دڵیان زۆر گەورەو قورسە، ﴿ مَا تَدْعُوهُمْ إِلَيْهِ ﴾، ئەوەی تۆ ئەوانی بۆ بانگ دەکەی، پێغەمبەر ﷺ ئەوانی بۆچی بانگ

دەکرد؟ بۆ خوا بەیەکگرتن و تەنیا خوا پەرستن، ئەوانیش پێیان ناخۆش بوو، چونکە دەیانویست هاوەڵان بۆ خوا پەیدابکەن و هاوبەشانی بۆ دابنێن، ﴿ ٱللَّهُ يَجْتَبِىٓ إِلَيْهِ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِىٓ إِلَيْهِ مَن يُنِيبُ ﴾، خواش بەرەو لای خۆی هەر کەسێك بیەوێ هەڵیدەبژێرێ و، هەر کەسێکیش بیەوێ ڕاستە ڕێی دەکات، بێگومان ئەو کەسەی بەرەو لای خوا دەگەڕێتەوە، ڕاستە ڕێی دەکات.

کەواتە: ئەوانەی خوا هیدایەتیان دەدات و ڕاستەڕێیان دەکات، با زۆر دڵیان بە خۆیان خۆش بێت، کە خوا گوڵبژێری کردوون، هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانیش کە بڕوا ناهێنن، با بزانن: شایستەی ئەوە نەبوون، خوا هەڵیانبژێرێ و بەرەو خۆی دڵیان وەرچەرخێنێ و ڕێنماییان بکات، با شانازیی بە کوفرو شیرکی خۆیانەوە نەکەن، ﴿ وَمَا تَفَرَّقُوٓاْ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْعِلْمُ بَغْيًۢا بَيْنَهُمْ ﴾، ئەوانە پەرتەوازەش نەبوون، واتە: شوێنکەوتووانی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، لە دوای وان پەرتەوازە نەبوون، مەگەر دوای ئەوەی زانیارییان بۆ هات، بە هۆی زوڵم و ستەمیانەوە لە نێو خۆیان دا، بە هۆی ئەوەوە کە هەر کامێکیان چاوی لەوە بووە، خۆی بە خاوەنی دین بزانێ و، خۆی فەرز بکات بەسەر ئەوی دیکەدا بە ناوی دینەوە، لە ئەنجامی ئەوەدا بەش بەش بوون.

﴿ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ ﴾، ئەگەر وشەیەکیش لە پەروەردگارتەوە پێش نەکەوتایە، واتە: خوا بڕیارێکی پێشتری داوە، ﴿ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ﴾، هەتا کاتی دیارییکراو، واتە: خوا بڕیاری داوە تاکو کاتی دیارییکراو، دادوەریی لە نێوان خەڵکدا ناکات، دوایان دەخات تاکو قیامەت و، لە قیامەت دا تەسفیەی حیساب و لێك جیاکردنەوە، دێتە گۆڕێ، لەبەر ئەو بڕیارە نەبووایە: ﴿ لَّقُضِىَ بَيْنَهُمْ ﴾ بەدڵنیایی دادوەرییان لە نێواندا دەکرا، لەسەر ئەوە کە دینی خوایان بەش بەش کردوە، خوا دادوەریی لە نێودا دەکردن و سزای لادەرانی دەدا، بەڵام هەڵیاندەگرێ بۆ ڕۆژی دوایی، چونکە دنیا شوێنی تاقیکردنەوەیەو ڕۆژی دوایی شوێنی حیساب و کیتاب و لێپرسینەوەو سزاو پادشتە.

﴿ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ أُورِثُواْ ٱلْكِتَٰبَ مِنۢ بَعْدِهِمْ ﴾، بـە دڵنیایـی ئەوانـەش کـە دوای ئـەوان کتێبیـان کرایـە میـرات، کتێبیـان پێـدرا، لـە دوای پێغەمبـەرەکان (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّـلَامُ)، کتێبەکەیـان هاتـە دەسـت، ﴿ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ مُرِيبٍ ﴾، لەبارەیـەوە لـە دوو دڵییـەکی خەسـت دان، لەبـارەی کتێبەکەیانـەوە لـە گومانێـکی بێزارکـەر دان، بۆچـی؟ چونکـە هێندەیـان بـەزم و بـازاڕی جیـاواز داهێنـاون و هێندەیـان شـتی خراپ پەیداکـردوە، ئێسـتا کـە کتێبـی خـوا دەبینـن، لەگـەڵ ئـەو واقیعـەدا کـە خۆیـان لـە سـەرینی لـە دینداریـی، زۆر جیایـە، بۆیـە لـە کتێبەکـەی خـوادا کەوتوونـە دوو دڵیـی و گومانـەوە.

سـبحان اللـە! ئـەوە ئێسـتا بەسـەر حاڵـی مسـوڵمانان دا زۆر چەسـپاوە! ئەگـەر تـۆ تەماشـای دینداریـی مسـوڵمانان بکـەی، چ لـە نێـو گـەلی کـورددا، چ لەنێـو گەلەکانـی دیکـەدا، دەبینـی زۆر شـتیان پەیداکـردوە، هیـچ پەیوەندیـی بەدینـەوە نیـە! بـۆ وێنـە: لـە هەنـدێ وڵاتـدا، ئافرەتـان دەبـێ هەموویـان پەچـەدار (**مُنْتَقِبة**)بـن، بـەڵام لەبـەر ئـەوە نیـە زۆر بـە دینـن، چونکـە لـە شـتی دیکـەدا هیـچ گـوێ نادەنـە دیـن، ئێسـتا لـەو دەوڵەتانـەی کەنـدا داو، هەمـوو ئافرەتێـك دەبـێ پێچـەی هەبـێ، زۆر چاکـە، ئنجـا ئایـا ئـەوە لەبـەر بەدینییـە؟ ئەگـەر لەبـەر بەدینییـە، بۆچـی گوێتـان بـە دەسـتی ئەمریکاوەیـە، بۆچـی ئەمریـکا نەوتەکەتـان لـێ دەسـتێنێ، ئـەدی بۆچی ڕێگـە بە خەڵك نـادەن خۆپێشـاندان بکـەن! مـان بگـرن! بۆچـی ڕێ بەخەڵـك نـادەن ڕەخنـە بگـرێ لـە دەسـتەڵاتدار، دەسـتەڵاتدارێك کـە هەمـوو شـتێکی بـۆ خـۆی و بنەماڵەکـەی خـۆی قۆرخ کـردوە! ئایـا ئـەوە لـە کوێـی دینداریـی دایـە، ئـەو حوکمـی میراتیـی و بنەماڵەییـە، ئـەوە لـە کوێـی دینداریـی دایـە، کـوڕە مەلیـك و ئەمیـرو بەرپرسـەکان دەچـن لـە ڕۆژئـاوا چەنـدان ملیـار دۆلار دادەنێـن لـەوێ، ڕۆژئاواییـەکان و ئەمریکاییـەکان سـوودی لێدەبینـن و، ئەگـەر لێشـیان توورەبـوون، لێیـان زەوت دەکـەن، لـەوێ دەچـن کەشـتیی و موڵـك و دوورگـە دەکـڕن، بـە پـارەی ئـەو ڕەش و ڕووتـە، کـە ئەگـەر کەسـێکیان دزیـی کـرد لـە برسـان، دەسـتی دەبـڕن، تاکـو بـۆ ڕیـکلام بڵێـن: ئێمـە شـەریعەت جـێ بەجـێ

دەکەین، ئەها دەستی دزمان بڕی! ئەدی بۆچی دەستی ئەوە کەسە نابڕێ، کە چەندان ملیاری دزیون، دەبێ ئەوە هەر سەری ببڕدرێ، کە دەستی بەسەر موڵك و ماڵی ئەو میللەتە داگرتوە! ئنجا ئەوە لە ڕووی سیاسییەوە، هەروەها لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە، لە ڕووی فیکرییەوە، لە ڕووی ڕەوشتیی و ئاکارییەوە، ئێستا لە نێو مسوڵماناندا زۆر شتی وا پەیدابووە، کە لە مەحەکی قورئان و سوننەتی دەدەی، دەزانی شتی داهێندراو و پەیداکراو و بێ جێیە.

ئنجا ئەوە هەموو وادەکات، کە بەهۆی ئەو شتانەوە کە خەڵك عادەتیان پێوە دەگرێ، شتە داهێنراوەکان، دوایی کە ڕووی گەش و ڕاستەقینەی کتێبی خوایان پێشان بدرێ، بە گومانەوە تەماشای دەکەن و دەڵێن: ئەوەی قورئان دەیڵێ، زۆر جیایە لەوەی ئێمە، هەر وەك چۆن کاتی خۆی هاوبەش بۆ خوا دەنەرەکان، کە پێغەمبەر ﷺ بانگی دەکردن، دەیانگوت: ﴿إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّهْتَدُونَ ﴿٢٢﴾﴾الزخرف، ئێمە باب و باپیرانی خۆمان لەسەر ڕێیەك بینیوە، هەر لەسەر ڕێی ئەوانیش دەڕۆین، ئێستا خەڵكێكی زۆر هەیە ئەگەر پێی بگوترێ: ئەوە پێچەوانەی شەرعە، پێچەوانەی سوننەتەو نابێ وابێ و ئەوە داهێنراوو پەیداکراوە! دەڵێ: ئەدی بۆچی ئەوانەی پێشێ ئەوەیان نەگوتوە؟ نەخێر، وانیە، ئێوە دینێکی تازەتان هێناوە! بەڵام ئیسلام بەس بریتیە لە قورئان و سوننەت و، غەیری قورئان سوننەت هەمووی تێگەیشتنە لە بارەی دینەوە، کە دەگونجێ ئەو کەسە، پێکابێ و، دەشگونجێ نەیپێکابێ، یان دەگونجێ بۆ کاتێك پێکابێ و، بۆ کاتێکی دوای ئەوە، نەیپێکابێ.

دوایی خوا دەفەرموێ: ﴿فَلِذَٰلِكَ فَٱدْعُ﴾، ئنجا بۆ ئەوەی باسکرا، بانگەواز بکە (ئەی موحەممەد ﷺ!) بەڕێزان! ئەمە تاکە ئایەتە لە قورئاندا، کە خوا دە (١٠) ڕستەی تێدا فەرموون، پێنجیان ئەرکن بۆ پێغەمبەر ﷺ و، پێنجیشیان ڕاستیی گەورەو مەزنن، کە پێغەمبەر ﷺ ڕایانبگەیەنێ، جگە لەم ئایەتە تەنیا (آیة الكرسي) لە دە (١٠) ڕستە پێکهاتوە، کە دەربارەی خوایە ﷻ، ئەم ئایەتەش

دەربارەی ئایینی خواو ئەرکی پێغەمبەرەو ﷺ لە دە (١٠) ڕستە پێکهاتوە، پێنجیان ئەرکی پێغەمبەرن ﷺ کە جێ بەجێیان بکات و، پێنجیشیان پێنج ڕاستیی گەورەو مەزنن کە دەبێ ڕایان بگەیەنێ:

**یەکەم:** ﴿ فَلِذَٰلِكَ فَٱدۡعُ ﴾، بۆ ئەوەی باسکرا، خەڵك بانگەواز بکە یانی: {بۆ بەرپاکردنی ئایین، بەو شێوەیەی خوا دایبەزندوە، بۆ ئەوەی تێیدا پەرتەوازە نەبن و، تاکو تەنیا خواش بپەرستن}.

**دووەم:** ﴿ وَٱسۡتَقِمۡ كَمَآ أُمِرۡتَ ﴾، وەك فەرمانت پێکراوە ڕێك وەستاوبە (ئەی موحەممەد ﷺ!) (**إستقامة**) بریتیە لە ڕێك وەستان، بەبێ لادان و ئەملاولا کردن.

**سێیەم:** ﴿ وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَهُمۡ ﴾، بە دوای ئارەزووەکانی ئەوان مەکەوە.

**چوارەم:** ﴿ وَقُلۡ ءَامَنتُ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِن كِتَٰبٍ ﴾، بڵێ: بڕوام هەیە بە هەر کتێبێك کە خوا دایبەزاندوە.

یانی: لەگەڵیان مەچووە نێو شەڕەقسەوەو بڵێ: هەموو ئەو کتێبانەی خوا دایبەزاندوون، بڕوام پێیان هەیە، چونکە جوولەکەو نەصڕانییەکان، دەهاتن بە پێغەمبەریان ﷺ دەگوت: ئایا تەوڕات و ئینجیلیش کتێبی خوا نین؟ قسەیان لەگەڵدا دەکرد، بۆیە فەرموویەتی: بڵێ: بڕوام بە هەر کتێبێکە کە خوا دایبەزاندوە، بەڵام وەك ئەصڵەکەی، نەك وەك واقیعی ئێستای کە پڕ کراوە لە ئەفسانەو، بە پێی هەواو ئارەزووی ئەوانەی کە کتێبەکەیان بەدەستەوە بووە، گۆڕیویانەو شتیان تێخستوە.

**پێنجەم:** ﴿ وَأُمِرۡتُ لِأَعۡدِلَ بَيۡنَكُمُ ﴾، واتە: فەرمانم پێکراوە کە دادگەرییتان لە نێواندا بکەم.

ئەمە کە لە مەککە هاتۆتە خوارێ، ئاماژەیە بەوە کە پێغەمبەر ﷺ کاتێك دێ ئایینەکەی حوکمڕان دەبێ و دەسەڵاتی دەبێ، واتە: بزانن ئەگەر دەسەڵاتم هەبوو دادگەرییتان لە نێواندا دەکەم، ئەمە پێنج ئەرکەکەی پێغەمبەر ﷺ.

ئنجا خوا فەرمانی پێدەکات، پێنج هەواڵیش ڕابگەیەنێ، پێنج ڕاستیی مەزن:

**یەکەم:** ﴿ ٱللَّهُ رَبُّنَا وَرَبُّكُمْ ﴾، خوا پەروەردگاری ئێمەش و ئێوەشە، کەواتە: خوا **سبحانه وتعالى** خاڵی هاوبەشمانە، وەك چۆن ئێوە خوا بە پەروەردگاری خۆتان دەزانن، ئێمەش بە پەروەردگاری خۆمانی دەزانین، ئنجا وەرن با هەموومان تەنیا خوا بپەرستین و هاوبەشی بۆ دانەنێین، من بڕوام بەو کتێبانە هەیە کە خوا دایبەزاندوون، ئێوەش ئەو کتێبەی دیکە، کە کتێبی کۆتایی خوایە، بڕواتان پێی هەبێ، ئەو کاتە مشت و مڕ نامێنێ.

**دووەم:** ﴿ لَنَآ أَعْمَٰلُنَا وَلَكُمْ أَعْمَٰلُكُمْ ﴾، ئێمە کردەوەی خۆمان بۆ خۆمان، ئێوەش کردەوەی خۆتان بۆ خۆتان.

ئایا ئێوە ناڵێن: ئێمە زۆر چاکمان کردوە؟ باشە کردەوەی خۆتان بۆ خۆتان، ئێمەش کردەوەی خۆمان بۆ خۆمان، ئێمە ئەوە بەڕاست دەزانین کە بە پێی قورئان و سوننەت بێ، ئێوەش ئەوە بە ڕاست دەزانن کە بە پێی کتێبی خۆتان بێ، با لەسەر ئەوە مشت و مڕ نەکەین.

**سێیەم:** ﴿ لَا حُجَّةَ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ ﴾، هیچ بەڵگە هێنانەوەو مشت و مڕ نیە لە نێوان ئێمەو ئێوەدا، من بڕوام بە سەرجەم کتێبەکانی خوا هەیە، کە دایبەزاندوون: ئنجا صوحوفی ئیبراهیمە، تەوراتی مووسایە، زەبووری داوودە، ئینجیلی عیسایە، هەر کتێبێکی دیکەی خوا هەیە، ئەگەر بچەسپێ کە کتێبی خوایەو دایبەزاندوە، بڕوام پێیەتی، بەڵام وەك ئەصڵەکەی کە دایبەزاندوە، نەك بەو واقیعەی ئێستای ئەگەر گۆڕدرابێ، ئێوەش بڕوا بە کتێبی خوا بێنن کە دایبەزاندوە، ئەوکاتە مشت و مڕو شەڕە قسە، لە نێوان ئێمەو ئێوەدا نامێنێ.

**چوارەم:** ﴿ ٱللَّهُ يَجْمَعُ بَيْنَنَا ﴾، خوا ئێمەو ئێوە کۆدەکاتەوە، واتە: کاتێك دێ خوا کۆمان دەکاتەوەو دادگاییمان دەکات.

کەواتە: با لە مشت و مڕەکەمان بگەڕێین و هەڵیگرین بۆ ئەوێ.

پێنجەم: ﴿ وَإِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ ﴾، سەرەنجامیش هەمووی بۆ لای خوایە، دەچینەوە خزمەتی.

کەواتە: با هەر کامێکمان خۆی ئامادە بکات، بە چ چاوورووێکەوە دەچێتەوە خزمەت خوا ﷻ و چی لەگەڵ خۆی دەباتەوە بۆ لای؟!

ئنجا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يُحَآجُّونَ فِي ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مَا ٱسْتُجِيبَ لَهُۥ ﴾، واتە: ئەوانەش کە شەڕە قسە دەکەن لەبارەی خواوە، لەبارەی ئایین و بەرنامەی کۆتایی خواوە، دوای ئەوەی وەڵامی دراوەتەوە، واتە: دوای ئەوەی بڕوادارانێك بڕوایان پێهیناوە، بە دوا بەرنامەی خوا، بە دوا کتێبی خوا، بە دوا پێغمبەری خوا ﷺ، کەچی ئەوانە شەڕە قسەو مشت و مڕ دەکەن لەحاڵێك دا ئەو ئیمانداره پاك و چاکانەش هەن، ﴿ حُجَّتُهُمْ دَاحِضَةٌ عِندَ رَبِّهِمْ ﴾، ئا ئەوانە بەڵگەکەیان لەلای خوا پووچە، یانی لە هەر لەبەر ئەوەی خۆیان بەبەڵگەیان زانیوە، ناویان لێناوە بەڵگە، ئەگەرنا لە ڕاستییدا بەڵگە نیە، شتێکی پووچە، ڕۆیشتوەو خلیسکاوە، ﴿ وَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ ﴾، هەروەها تووڕەییان لەسەرە، ﴿ وَلَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ ﴾، سزایەکی سەختیشیان بۆ هەیە، چونکە دوای ئەوەی کۆمەڵێك بڕوایان بە ئیسلام هێناوە، پێغەمبەری خاتەمیش ﷺ هەر کەسێك تەماشای کردبایە، دەیزانی کە ڕاستگۆیە، لە ژیانی دا درۆی نەکردوەو هەرگیز شتێکی خراپی نەکردوە، لە پێش پێغەمبەرایەتیشی دا عەیبەو لەکەیەکی نەهاتۆتە سەر، ئنجا شوێنکەوتوەکانیشی هەموویان لە عەقڵەوە پێچراون، لە حیکمەتەوە پێچراون، لە ئاکارو ڕەوشتی جوانەوە پێچراون، خواپەرستن، پاکن، چاکن، هەر کەسێك تەماشایان بکات، دەزانێ ئەوانە کەسانێکن: ئایین و بەرنامەیەك کە هی ئەو پێغەمبەرەیە ﷺ ئاوا چاك و پاك و جوانی کردوون، شوێنکەوتنی ئەو پێغەمبەرەیە ئاوای چاك و پاك و جوان و ڕێك کردوون، کەواتە: دیارە ئایین بەرنامەیەکی ڕاستە، بۆیە کەسانێك کە لەوبارەوە شەڕە قسە دەکەن و بەرگریی دەکەن، لە ئایینە شێوێنراوەکانیان و، لە کتێب و بەرنامە تێکدراوەکانی خۆیان، ئنجا ئەو قوڕئانەشیان لەبەر دەستە، کە وەك ڕۆژ دەدرەوشێتەوە، ئەوانە لە ڕاستییدا

بەڵگەکەیان پووچاوەیە لەلای پەروەردگاریان و تووڕەیی خوایان لەسەرە، لەبەر ئەوەی بەهۆی بەرژەوەندییە دنیاییەکانیانەوە بە دەم بانگی خواوە ناچن، ئاخر چ قورەیشییەکان کە بڕوایان بە پێغەمبەر نەدەهێنا ﷺ، چ جوولەکەکان لە مەدینە، چ نەصرانییەکان، لەبەر ئەوە بوو، دەترسان بەزم و بازاڕی خۆیانیان لێ تێکبچێ، ئەو خەڵکەیان بە ناوی دینەوە گەوجاندبوو، ئەو ئایینەی بەناوی ئیبراهیمەوە لەسەری بوون، دینی شیرك و بتپەرستیی بوو، هەروەها ئایینی تێکدراوی جوولەکە، یاخود نەصرانیی، بەزم و بازاڕێکیان بۆ خۆیان دروستکردبوو، ئەگەر بڕوایان بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ هێنابایە، دەبوو دەستبەرداری ئەو ئیمتیازە ناشەرعییانە ببن، بۆیە وازیان لە ئایینەکانیان نەدەهێنا، خواش دەفەرموێ: تووڕەییان لەسەرەو، سزای سەختیشیان بۆ هەیە.

لە کۆتایی دا خوا دەفەرموێ: ﴿ اللَّهُ الَّذِي أَنزَلَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ وَالْمِيزَانَ ﴾، خوا کەسێکە کتێبی بە هەق دابەزاندوەو تەرازووش واتە: کە کتێبی دابەزاندوە هەقی لە نێودایە، یاخود: کتێبی دابەزاندوەو هەر ئایەتێکی و، هەر ڕستەیەکی هەق دەپێکێ، یان: بە شێوەیەکی هەق دا دایبەزاندوەو، لە کاتێکی هەق دایبەزاندوەو، بە شێوازێکی هەق و ڕاست، ﴿ وَالْمِيزَانَ ﴾، هەروەها تەرازووشی دابەزاندوە، (میزان) یانی: تەرازوو، ئەو ئامێرەی شتی پێ هەڵدەسەنگێنرێ، بەڵام کوا خوا لە ئاسمانەوە هیچ تەرازوویێکی وەک بۆ ئێمە زانراوە، دانەبەزاندوە! کەواتە: مەبەست پێی عەدلە، یانی دادگەرییشی دابەزاندوە، هەر لە نێو قورئاندا، قورئان بە هەقیش هاتوەو، دادگەرییشی تێدایە، ئەگەر قورئان کاری پێبکرێ، هەق دەچەسپێ و باتیڵ لادەچێ، هەروەها دادگەریی دەچەسپێ و زوڵم و ستەم لادەچێ، ئەگەر قورئان کاری پێکرێ، ستەمی نەتەوەیی نامێنێ، هیچ نەتەوەیەك نەتەوەیەکی دیکە ناچەوسێنێتەوە، ستەمی سیاسیی نامێنێ، هیچ کەسێك هیچ حیزبێك، هیچ لایەنێك خۆی ناسەپێنێ بەسەر خەڵکدا، بەبێ ویستی ئازادانەی خۆیان، هەروەها ستەمی ئابووری نامێنێ، قڕیی و پڕیی

چینایەتیی، نابێ زۆربە قڕبن و لەبەریان ببڕێ و، کەمێك پڕبن و لەسەریانەوە بڕژێ، هەروەها ستەمی کۆمەڵایەتیی نامێنێ، هەندێك لە خۆڕا خۆیان پێ لە خەڵك بەرزتربێ و، وابزانن لە ئاسمانی هاتوونە خوارێ و، خەڵکی دیکەیان پێ کەم بێ!! هەموو جۆرە ستەمەکان لادەچن و دادگەریی ڕەها دەچەسپێ، ﴿ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ ٱلسَّاعَةَ قَرِيبٌ ﴾، تۆ چووزانی دەبینی (ساعة) نیزیکە، (الساعة) واتە: ئەو کاتە دیاریکراوەی دانراوە، بۆ ئەوەی ڕۆژی دوایی تێدا بێ، جا جاری وایە (ساعة) بۆ ئاخیر زەمان بەکاردێ، واتە: کۆتایی هاتنی ئەم ژیانە دنیاییە، جاری واش هەیە بۆ هاتنی قیامەت بەکاردێ، جاری واشە بۆ هەردوو قۆناغی ئاخیر زەمان و قیامەت بەکاردێ، کە لێرەدا هەمووی دەگرێتەوە، کەواتە: باش خۆت بۆ ئامادە بکە.

﴿ يَسْتَعْجِلُ بِهَا ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِهَا ﴾، ئەوانە پەلەی لێ دەکەن، کە بڕوای پێناهێنن، ئەوانەی بێبڕوان، پەلەی لێ دەکەن، دەڵێن: کوا دەبا قیامەت بێ، کوا ئەدی بۆچی نەهات؟! ئەوانە لەبەر ئەوەی بڕوایان پێی نیە، بۆیە پەلەی لێ دەکەن، ئەگەر بڕوایان پێی بووایەو زانیبایان چ ڕۆژێکە، پەلەیان لێ نەدەکرد، ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مُشْفِقُونَ مِنْهَا ﴾، بەڵام ئەوانەی بڕوایان هێناوە، ترس و بیمیان بەرانبەری هەیە، چ مەبەست پێی ئاخیرزەمان، یان قیامەت بێ، چ ڕۆژی دوایی بێ، بە گشتیی، ﴿ وَيَعْلَمُونَ أَنَّهَا ٱلْحَقُّ ﴾، دەشزانن کە چەسپاوە، دێت و هیچ جێی دوو دڵیی تێدانیە، ﴿ أَلَآ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُمَارُونَ فِى ٱلسَّاعَةِ ﴾، ئاگاداربن! ئەوانەی شەڕە قسە دەکەن لە بارەی (ساعة)وە، یاخود: دوو دڵن لە بارەی (ساعة)وە، بە هەرسێ واتای: ئاخیر زەمان، قیامەت، ڕۆژی دوایی بە گشتیی، ئەوانەی دوو دڵن، یاخود شەڕە قسە دەکەن، ﴿ لَفِى ضَلَٰلٍۭ بَعِيدٍ ﴾، لە گومڕاییەکی دووردان.

جاری وایە ئینسان لە ڕێ لادەدات، بەڵام زۆر دوورناکەوێتەوەو، بە ئاسانیی دەتوانێ بێتەوە سەر ڕێ، بەڵام ئەگەر لە ڕێ لابدات و زۆر دووربکەوێتەوە،

دەڵێن: هەیهوو زۆر دوور ڕۆیشتووی، ئنجا خوا ﷻ دەفەرموێ: ئەوانە لە گومراییەکی دووردان.

لێرەدا لە کۆتایی مانای گشتیی ئەم شەش ئایەتە موبارەکەدا، دەڵێین: خوای بەرزی مەزن، ئەگەر سەرنج بدەین لە هەموو دەلاقانەوە بۆ دڵی ئینسان دەچێ و، لە هەموو ڕێیەکانەوە بۆ ئینسان دەچێ، کە ئەو هیدایەتەی خۆی بخاتە نێو دڵ، جاری وایە لە ڕووی بەڵگە هێنانەوەی عەقڵییەوە، جاری وایە لە ڕێی جووڵاندنی دڵ و دەروونەوە، جاری وایە سەرنجیان ڕادەکێشێتەوە بۆ مێژوو، جاری وایە دەیانباتەوە بۆ سەرنجدانی گەردوون، جاری وایە باسی ئاخیر زەمان دەکات، جاری وایە باسی زیندوو کردنەوەو هەڵسێنرانەوەو سزاو پاداشت دەکات، جاری وایە باسی بەهەشت و ئەو نیعمەتانەی تێیدان، دەکات، جاری وایە باسی دۆزەخ و ئەو سزاو جەزرەبەیەی تێیدایە، دەکات، جاری وایە باسی ئەو بەڵاو دەردو موصیبەتانە دەکات، کە بەسەر خەڵك دێن، بە هۆی کردەوە خراپەکانیانەوە، یانی: خوا ﷻ لەم قورئانە مەزنەدا لە هەموو ڕێیانەوەو لە هەموو دەلاقەکانەوە بۆ مرۆڤ دێ، تاکو ئەو هیدایەتەی خوا، ئەو نوورو بەرەکەتەی خوا، بخاتە نێو عەقڵ و نێو دڵی و، پێی هۆشیارو بێدار بێتەوە.

خوا لەو کەسانەمان بگێڕێ بە لوتف و کەرەمی خۆی، کە باش گوێ دەگرن بۆ فەرمایشتی خوا، باش لێی ورد دەبنەوەو تێوەی ڕادەمێنن و لێی تێدەگەن، پاشان باش پێیەوە پابەند دەبن، خوا بە بەزەیی خۆی ئێمە لەو کەسانە بگێڕێ کە زۆرترین بەهرە لە قورئان وەردەگرن، هەم لە دنیادا پێی پاك و چاك دەبن، هەم لە دوارۆژدا پێی سەرفرازو سەر بڵند دەبن.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

بەرنامەی ئۆممەتی ئیسلام، هەمان بەرنامەی نووح و ئیبراهیم و مووساو عیسایە (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، ئێوەڕۆکەکەی بریتیە لە خوا بەیەکگرتن و بەرپاکردنی ئایین لەسەر ئەرزی واقیع و تێدا پەرتەوازە نەبوونی، شوێنکەوتووانی پێغەمبەرانیش پاش زانیاریی و بەرچاوڕوونیی، بە هۆی ستەم و ناکۆکیی نێو خۆیانەوە، لایانداو، سەرەنجام ئەوانەی دوای وان کتێبی خوایان کرایە میرات و پێیاندرا، لە بارەیەوە کەوتنە دوو دڵییەکی خەست و خۆڵەوە، لەبەر ئەوەی شتیان زۆر داهێنا بوو، کتێبی خوایان لەبەرچاو نامۆ بوو بووە وە:

خوا دەفەرمووێ: ﴿شَرَعَ لَكُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِۦ نُوحًا وَٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِۦٓ إِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰٓ ۖ أَنْ أَقِيمُوا۟ ٱلدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا۟ فِيهِ ۚ كَبُرَ عَلَى ٱلْمُشْرِكِينَ مَا تَدْعُوهُمْ إِلَيْهِ ۚ ٱللَّهُ يَجْتَبِىٓ إِلَيْهِ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِىٓ إِلَيْهِ مَن يُنِيبُ ﴿١٣﴾ وَمَا تَفَرَّقُوٓا۟ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْعِلْمُ بَغْيًۢا بَيْنَهُمْ ۚ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى لَّقُضِىَ بَيْنَهُمْ ۚ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ أُورِثُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ مِنۢ بَعْدِهِمْ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ مُرِيبٍ ﴿١٤﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە سێزدە بڕگەدا:

١)- ﴿شَرَعَ لَكُم مِّنَ ٱلدِّينِ﴾، (خوا) لە ئایینی فراوان و گشتیی خۆی بەرنامەیەکی بۆ داناون، (شَرَعَ: جَعَلَ طَرِيْقاً وَاسِعَةً) ڕێیەکی فراوانی دانا، دەگوترێ: (شَرَعَ) بە مانای (أَوْضَحَ وَبَيَّنَ) ڕوونی کردەوەو ئاشکرای کرد، لێرەدا کە دەفەرمووێ: ﴿شَرَعَ لَكُم مِّنَ

ٱلدِّينِ ﴿١٤﴾ ﴾، یانی: (بَيَّنَ لَكُمْ مَسَالِكَ مَا كَلَّفَكُم بِهِ) ئەو کارانەی پێی سپاردوون و ئێوەی پێ ئەرکدار کردوون، خوا بۆی ڕوونکردوونەوە، لێرەدا وشەی (شَرَعَ): خوازراوەتەوە بۆ ڕوونکردنەوە.

(شَرَعَ فِي الأَمْر) دەستی بەکارەکە کرد، ئنجا (شَرَعَ) هاتووەو (شَرَّعَ)ش، هاتووە، کە ئەوە بۆ زێدەڕۆییکردنە، (شَرَعَ) و (شَرَّعَ) هەردووکیان یانی: بەرنامەی دانا، یاخود: بەرنامەکەی ڕوونکردەوە، دوێنراو (مخاطب) لێرەدا ئۆممەتی پێغەمبەرە ﷺ، کە دەفەرموێ: ﴿ شَرَعَ لَكُم ﴾، بۆ ئێوە، ئەو ئێوەیە کێن؟ پێغەمبەرو ﷺ ئۆممەتەکەیەتی، دەفەرموێ: ئەوەی لە ئایین بۆ ئێوەی کردۆتە بەرنامە، ئنجا با بزانین چیی؟!

٢)- ﴿ مَا وَصَّىٰ بِهِۦ نُوحًا ﴾، ئەوەی بۆ ئێوەی کردۆتە بەرنامە: هەمان شتە کە نووحی عليه السلام پێ ڕاسپارد بوو.

٣)- ﴿ وَٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ ﴾، هەروەها ئەوەی بۆ لای تۆمان سروشکردوە.

٤)- ﴿ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِۦٓ إِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰٓ ﴾، دیسان هەمان شتە کە ئیبراهیم و مووساو عیسامان (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، پێ ڕاسپاردبوون، یانی: ئەو بەرنامەیەی ئێوە لە هێڵە گشتییەکانیدا، هەمان بەرنامەو ئایینە کە نووح و ئیبراهیم و مووساو عیسا (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، لەسەری بوون.

هەڵبەتە لێرەدا مەبەست وێچوونی بەرنامەی پێغەمبەری خاتەم ﷺ ئیسلامە، لە هێڵە گشتییەکانیدا، لە بنچینەکانی ئاییندا، لە بواری ئیمان کردەوەی باشدا، یاخود: لە بواری عەقیدەو شەریعەتدا، نەك لە هەموو وردەکارییەکاندا، چونکە لە هەندێك لە وردەکارییەکاندا، بۆ وێنە: ئەوەی خوا ﷻ کاتی خۆی جوولەکەکانی پێ سزاداوەو هەندێ شتی لێ قەدەغە کردوون، یان ئەوەی کە کاتی خۆی ڕەوا بووە لە هەندێ لە بەرنامەکانی خوادا، کە بۆ گەلانی دیکەی ناردوون، کە گونجاو بووە لەگەڵ ئەو ژینگەو هەل و مەرجەدا کە تێیدا بوون، مەرج نیە

ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ پابەند کرابێ بە هەموو ئەو شتانەوە، بۆیە لەوبارەوە ڕاجیایی هەیە لە نێوان زانایاندا، کە ئایا: (**شَرْعُ مَنْ قَبْلَنَا شَرْعٌ لَنَا، أو لَيْسَ شَرعَاً لَنَا**) بەرنامەی ئۆممەتانی پێشوو، پێغەمبەرانی پێشوو، بەرنامەیە بۆ ئێمەش، یاخود بەرنامە نیە بۆ ئێمە؟ کە ڕای ڕاستتر ئەوەیە بەرنامەی پێغەمبەرانی پێشوو (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، بەرنامەیە بۆ ئێمەش، بەڵام بە مەرجێك: یان لە بەرنامەی خۆمان دا بەڵگەی هەبێ، یان لەگەڵ بەرنامەی ئیسلامدا تێکنەگیرێ، لەگەڵ قورئان و سوننەتدا دژ نەوەستێ.

لێرەدا سەرەتا وشەی (وَصَّى): بەکارهاتوە: ﴿مَا وَصَّىٰ بِهِۦ نُوحًا﴾، دوایی دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِيٓ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ﴾ دوایی دیسان فەرموویەتی: ﴿وَمَا وَصَّيۡنَا بِهِۦٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰٓ﴾، (**التَّوْصِيَةُ: الأَمْرُ بِشَيءٍ مَعَ التَّحْرِيْضِ عَلَى إِيْقَاعِهِ وَالعَمَلِ بِه**) (**تَوْصِيَة**): بریتیە لە فەرمانکردن بە شتێك وێڕای هاندان بۆ ئەنجامدانی ئەو شتەو جێبەجێکردنی و کارپێکردنی.

ئنجا ئایا بۆچی خوا ﷻ بۆ شەریعەتی پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ، وشەی (**أَوْحَيْنَا**)ی، بەکارهێناوە، بەڵام هی چوار پێغەمبەرەکانی دیکە: نووح و ئیبراهیم و مووساو عیسا، (**وَصَّى**)ی، بەکارهێناوە، حیکمەتی چییە؟

حیکمەتەکەی وەك زانایان گوتوویانە: (أَوْحَيْنَا) کە بۆ شەریعەتی پێغەمبەری کۆتایی بەکارهاتوە، لەبەر ئەوەیە کە شەریعەتی پێغەمبەری کۆتایی بەردەوامە تاکو قیامەت، پەیامێکی کۆتایی خوایەو هاتوە، بەڵام بۆیە وشەی (وَصَّى) و (وَصَّيْنَا) بۆ شەریعەتی پێغەمبەرانی دیکە بەکارهاتوە، چونکە هی ئەوان بۆ کاتێکی دیاریکراوو بۆ کۆمەڵگایەکی دیاریکراو، بوون، دەڵێ: (**أُسْتُعْمِلَت كَلِمَة وَصَّيْنَا لِلشَّرَائِعِ السَّابِقَة لأَنَّهَا كَانَتْ مُؤَقَّتَةً مُقَدَّراً وُرُودَ شَرِيعَةٍ بَعْدَهَا، فَكَأَنَّ العَمَلُ بِهَا كَالْعَمَلِ الَّذِي يَقُوم بِه المُؤْتَمَنُ حَتَّى يَأْتِيهِ صَاحِبُه**)، واتە: بۆیە وشەی (وَصَّيْنَا) بۆ شەریعەتەکانی دیکە بەکارهاتوە، چونکە بۆ کاتێکی دیاریکراو بوون و ئەوەش

لەبەر چاو گیراوە کە لە دوای هەر کامێکیان شەریعەتێکی دیکە دێ، {لە دوای شەریعەتی ئیبراهیم، هی مووسا هاتوە، لە دوای هی مووسا، هی داوود هاتوە، لە دوای هی داوود هی عیسا هاتوە، لە دوای هی عیسا، هی موحەممەد ﷺ هاتوە} بۆیە کارکردن بە هەر کام لەو شەریعەتانە کە بۆ پێغەمبەرانی پێشوو هاتوون، وەك کارکردنی کەسێك بووە کە سپاردەیەکی پێ دەسپێردرێ، دەبێ ئاگای لەو سپاردەیە بێ و چاودێریی بکات، تاکو خاوەنەکەی دێتەوەو، کە خاوەنەکەی هاتەوە، دەبێ بیدرێتەوە.

بەڵێ ئەو بەرنامانەی کە بۆ پێغەمبەرانەی پێشوو (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) هاتوون، بۆ کۆمەڵگایەکی دیاریکراو بوون، لە کاتێکی دیاریکراوداو لە شوێنێکی دیاریکراودا، واتە: هەم لە ڕووی خەڵکەکەوە دیاریکراو بوون، هەم لە کاتەکەوە، هەم لە ڕووی شوێنە جوگرافییەکەوە، بەڵام هی پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ، لە ڕووی خەڵکەوە، بۆ هەموو مرۆڤایەتییە: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةً لِّلنَّاسِ ﴿٢٨﴾ ﴾سبأ، ﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا ﴿١٥٨﴾ ﴾الأعراف، لە ڕووی کاتەوەش، لەو کاتەوە کە پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ هاتوە، دەرگای وەحیی و پەیامی خوا گاڵە دراوەو داخراوە، هیچ وەحیی دیکە نایەت، تاکو دنیا بە کۆتا دێ، لە ڕووی شوێنی جوگرافییشەوە، بە پانایی زەمین، تەنیا ئایین و بەرنامەی پێغەمبەری خاتەم ﷺ ئەو ئایین و بەرنامەیە، کە خوا بۆ مرڤایەتیی هەڵبژاردوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٨٥﴾ ﴾آل عمران، واتە: هەر کەسێك جگە لە ئیسلام، بە دوایی بەرنامەیەکی دیکە بکەوێ، لێی قبووڵ ناکرێ و لە ڕۆژی دواییدا لە زیانبارانە.

لێی قبووڵ ناکرێ، بەو واتایە نا کە زۆری لێ بکرێ هەر دەبێ مسوڵمان بێ، نا، لە قیامەتدا لێی قبووڵ ناکرێ، بەڵام لە دنیادا خوای پەروەردگار ڕێگای داوە: ﴿ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِىَ دِينِ ﴿٦﴾ ﴾الكافرون، ﴿ لَآ إِكْرَاهَ فِى ٱلدِّينِ ﴿٢٥٦﴾ ﴾البقرة،

هەر کەسێك بە دوای چ بەرنامەیەك دەکەوێ، بکەوێ، بەڵام با بزانێ بۆ قیامەتێ لێی قبووڵ ناکرێ و لەسەری سزا دەدرێ، چونکە تاکە بەرنامەیەك کە شایستەی هەموو مرۆڤایەتیی بێ و، چارەسەری کێشەکانی هەموو مرۆڤایەتیی لە گرەودا هەبێ، تەنیا ئیسلامە، هەروەها تاکە ئایینێك دادگەریی ڕەهای تێدابێ، تەنیا ئیسلامە، بەرنامەکانی دیکە هەموویان: یان چینی بورجوازیی دایدەنێ، بە زیانی چینی پرۆلیتارە، یان پرۆلیتار دایدەنێ و بە زەرەری چینی بورجوازییە، یان عەجەم دایدەنێ بەزەرەری عەرەبە، یان عەرەب دایدەنێ بە زەرەی عەجەمە، یان نێر دایدەنێ بەزەرەری مێ، یان مێ دایدەنێ بەزەرەری نێر، یان ڕۆژهەڵات دایدەنێ بە زەرەری ڕۆژئاوایە، ... هتد، بەڵام بەرنامەی خوا ﷻ نە ئینتیمای ڕەگەزیی هەیە، نە ئینتمای نەتەوەیی هەیە، نە ئینتمانی جوگرافیی هەیە، خوا ﷻ، خوای هەموو لایەکە، هی فەقیرو دەوڵەمەند، هی ڕەش و سپیی، هی عەرەب و عەجەم، هی نێر ومێ، هی هەموو خەڵکەکان و، لایەنگیریی بەلای کەسدا نیە، دادگەریی ڕەها تەنیا لەبەرنامەی خوادایە، ئەمە نوکتەیەکی ڕەوانبێژیی بوو، بۆچی لەوێ (أَوْحَيْنَآ) بەکارهاتوە بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ و، بۆ ئایینی پێغەمبەرانی دیکە (وَصَّيْنَا) بەکارهاتوە؟

نوکتەیەکی دیکەی ڕەوانبێژیی ئەوەیە، کە خوا ﷻ بۆ هی پێغەمبەران وشەی (مـا)ی، بە کارهێناوە، ﴿ شَرَعَ لَكُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِۦ نُوحًا ﴾ ﴿ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِۦٓ ﴾ بەڵام بۆ هی پێغەمبەر موحەممەد دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ ﴾ وشەی: (الَّذِي) بە کارهێناوە، بێگومانیش قورئان ئەوپەڕی وردەکاریی تێدایە، ئنجا ئایا لەبەرچی: پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، چ کە باسی پەیامی نووح دەکات، چ کە دوایی باسی پەیامی هەرکام لە: ئیبراهیم و مووساو عیسا دەکات، وشەی (مَا)ی، بەکارهێناوە، بەڵام بۆ هی پێغەمبەری خاتم ﷺ وشەی (الَّذِي) بە کارهێناوە؟!

وەڵام:

لەبەر ئەوەی وشەی (ما) لە زمانی عەرەبییدا بۆ شتێك بەكاردێ، نەزانراو (مبهم) بێ، بەڵام ئەو كاتەی خوا وەحیی بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ ناردوە، وەحییەكی ئاشكرابووە، بۆیە (الَّذِي) بۆ بەكارهێناوە، ﴿ وَٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ ﴾ چونكە (الَّذِي) ناوی مەوصوولە، بەڵام (ما) دەلالەت لەسەر شتێكی نەزانراو (مبهم) دەكات، ئەو كاتەش چ شەریعەتی نووح ﷺ، چ شەریعەتەكانی ئیبراهیم و مووساو عیسا بۆ موحەممەد ﷺ و بۆ گەلی عەرەب و بۆ مسوڵمانانیش ئێستاش، مەیلەو نامۆن و شتێكی نەزانراون و تەم و مژی زۆریان لەسەرە، بۆیە وشەی (ما)ی، بەكارهێناوە: (أُسْتُعْمِلَتْ كَلِمَةُ مَا لِلشَّرَائِعَ السَّابِقَة، لأَنَّهَا كانت مُبْهَمَةً وَلَمْ تَكُنْ مَعْرُوفَةً إلاَّ إجْمَالًا، فَكَانَتْ نكرات لَا تَتَمَيَّزُ إلاَّ بِصِفَاتِهَا) ئەو بەرنامانەی پێشێ نەزانراو بوون، مەگەر دوایی وەسف بكرێن و باس كرێن، ئەگەرنا نەزانراوە چین و چۆنن؟ بەڵام هی پێغەمبەری خاتەم ﷺ (الَّذِي) بۆ بەكارهێنراوە، چونكە شتێكی زانراو ئاشكرابووە.

شایانی باسە: نووح ﷺ یەكەم پێغەمبەری ڕەوانەكراو بووە، بە بەرنامەوە بۆ مرۆڤایەتیی، لە پێش نووحدا بە تەئكید پێغەمبەرانی دیكە هەبوون، بە مسۆگەریی ئادەم ﷺ پێغەمبەر بووەو، ئیدریس ﷺ پێغەمبەر بووەو، لە هەندێك سەرچاواندا باسی (شیث)یش دەكرێ و ڕەنگە هی دیكەش بووبن، بەڵام ئەوەی بە مسۆگەریی باسیان كراوە، ئادەم و ئیدریسن، كە لە پێش نووحەوە بوون، بەڵام نووح یەكەم ڕەوانكراو (رسول) بووە، بەرنامەی پێدا بنێردرێ، ئادەم بەس (نبي) بووە، چونكە بەرنامە بۆ كێ بێنێ، خۆی و خێزانی بوون؟ هەروەها ئیدریس بەس (نبي) بووە، ﴿ وَٱذْكُرْ فِى ٱلْكِتَـٰبِ إِدْرِيسَ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقًا نَّبِيًّا ۝٥٦ وَرَفَعْنَـٰهُ مَكَانًا عَلِيًّا ۝٥٧ ﴾مريم، (صديق) بووە، زۆر بەڕاستدانەری خوا بووەو، (نبي)یش بووە، (نبي) بە مانای هەواڵ پێدراو، یان: مانای هەواڵدەر، چونكە یان (فعيل)ی، بە مانای (مفعول)ە، واتە: (مُنْبَأ) هەواڵ پێدراو، یان (فعيل)ی، بە مانای (فاعل)ە، واتە: (مُنْبِيء)، هەواڵدەر، بەڵام نووح ﷺ ڕەوانەكراو (رسول) بووە، نەك هەر (نبي)

بووبێ، بەڵکو خاوەن بەرنامەش بووە، بەڵگەشمان لەوبارەوە ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەرە ﷺ کە لە ڕۆژی قیامەتدا، دوای ئەوەی مرۆڤایەتیی کۆدەکرێتەوە، ماوەیەك خەڵك ڕادەگیرێ، خەڵکەکەش دەچن بۆ لای ئادەم دەڵێن: تکامان بۆ بکە خوای پەروەردگار لێپرسینەوە دەست پێبکات، هەموومان سەغڵەت بووین، دەڵێ: من کاتی خۆی سەرپێچییەکم کرد لە فەرمانی خوا، لە درەختە قەدەغە کراوەکەم خوارد، بچن بۆ لای نووح ﷺ، ئادەم پێیان دەڵێ: {وَلَكِنِ ائْتُوا نُوحًا، فَإِنَّهُ أَوَّلُ رَسُولٍ بَعَثَهُ اللَّهُ إِلَى أَهْلِ الأَرْضِ} (أخرجه البخاري: ٤٢٠٦، ومسلم: ١٩٣). واتە: بەڵام بچنەلای نووح یەکەمین ڕەوانەکراو خوا بۆ خەڵکی زەوی ناردوە.

دیارە پێغەمبەرانی پێش نووح (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ)، خەڵکەکەیان هێندە زۆر نەبووە خوا بەرنامەیەکیان بۆ بنێرێ، پێغەمبەرێکی بۆ ناردوون و هەواڵی پێداون، بەڵام بە پێویست نەزانراوە کتێب و بەرنامەیەکی پێ بێ، ڕەنگە عەشیرەتێك بووبن، خەڵکێکی کەم بوون، ئەوەندە بەس بووە پەیامی خوایان پێ ڕابگەیەنێ، جارێ هێندەش دوور نەکەوتوونەوە بکەونە گومانەوە، ئادەم و حەووا نیزیك بوون کە خوای پەروەردگار بە تایبەتی خوڵقاندوونی، ئنجا هەتا گەیشتۆتە سەردەمی نووح، وەك لە (صحيح البخاری)دا هاتوە، ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: لە نێوان ئادەم و نووح دا دە (١٠) سەدە هەبوون، پێشێ خەڵکەکە، ئەو کەسانەیان کە زاناو پێشەوایان بوون و خواپەرست بوون، وێنەیان کێشاون لە پەرستگاکان دا، بۆ ئەوەی بە هۆی ئەوانەوە خواپەرستییان بێتەوە یادو، چاك خوا بپەرستن، دوایی وێنەکانیان کردوون بە پەیکەر، دوایی وای لێهاتوە هەر پەیکەرەکانیان پەرستوون، ئنجا نووح ﷺ کە هاتوە ئەو خەڵکە ماوەیەك بووە داویەتە بتپەرستیی، بۆیە پێویست بووە خوای پەروەردگار بەرنامەیەکیان بۆ بنێرێ.

هەڵبەتە دوایی هەر کام لە ئیبراهیم و مووساو عیساش (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ)، ڕەوانەکراو (رسول) و خاوەن بەرنامە بوون، بەڵام یەکەمین پێغەمبەری

خاوەن بەرنامە، نووح ﷺ بووە، ئێمە لە جێی دیکەدا باسمان کردوە کە جیاوازیی نێوان (رسول) و (نبي) چییە؟ هەموو ڕەسوولێك نەبییە، بەڵام مەرج نیە هەموو نەبییەك ڕەسوول بێ:

(نبي) ئەو کەسەیە خوا هەوڵی تایبەتیی پێ دەدات و وەحیی بۆ دەنێرێ، سروشی بۆ دەکات.

بەڵام (رسول) وێڕای ئەوە، خوا ڕەوانیشی دەکات و بەرنامەیەکی تایبەتیشی پێدەدات، کە بیگەیەنێ بە خەڵکی دی.

هەڵبەتە هەموو (نبي)یەك خوا موکەللەفی کردوە پەیامی خوا بە خەڵك بگەیەنێ، بەڵام مەرج نیە پەیامێکی سەربەخۆی بووبێ، بۆ وێنە: پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیل بەزۆریی خوا بە وشەی (نبي) باسیان دەکات، لەبەر ئەوەی هەموویان شوێنکەوتووی شەریعەتەکەی مووسا بوون، مووسا ڕەسوول بووە، بەڵام پێغەمبەرانی بەنوو ئیسرائیل بەزۆریی (نبي) بوون، چونکە هەر بە پێی تەورات، بە پێی شەریعەتەکەی مووسا بەڕێوەچوون، نەك بەرنامەیەکی تایبەتییان بۆ هاتبێ، داوود و سولەیمان خوا هەر بە (نبي) ناوی هێناون، بەڵام عیسی ﷺ بەڕەسوولیش ناوی هێناوە، چونکە عیسا خوا ئینجیلی پێداوە، بەڵێ، بە پێی تەوراتیش هەر بەڕێوەچووە، بەڵام خوا ئینجیلیشی پێداوە، بەڵام هەندێ لادان و هەڵەو پەڵە کە خراوەتە نێو تەوراتەوە، نێو شەریعەتی مووساوە، عیسا ڕاستی کردۆتەوە بە هۆی ئینجیلەوە.

٥)- ﴿أَنْ أَقِيمُوا۟ الدِّينَ﴾ کە ئایین و بەرنامەکە بەرپابکەن ئەو بەرنامەیەی خوا بۆی داناون لە ئایینی گشتیی خۆی، کە هەمان شتە نووحیی پێ ڕاسپاردبوو کاتی خۆی و ئیبراهیم و مووساو عیساش، ئەو ئایینەی خوا بەرپابکەن، بەرپای بکەن، واتە: لەسەر ئەرزی واقع بەرجەستەی بکەن.

٦)- ﴿وَلَا تَتَفَرَّقُوا۟ فِيهِ﴾، تێیدا پەرتەوازە مەبن، واتە: لەبەرپاکردنی ئاییندا پەرتەوازە مەبن، هەر یەکەی لایەکی بگرێ و، هەریەکەی بەلایەك دا بڕوات، بۆیەش وشەی

(أقيموا) بەکارهاتوە چونکە شتێك کە ڕادەوەستێندرێ، لە تەواوترین حاڵەتیدا دەبێ، بۆیە دەفەرموێ: ﴿أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ﴾، هەروەها بۆ نوێژیش بە زۆریی دەفەرموێ: (أقيْموا الصَّلَاةَ)، (يُقِيمُون الصَّلَاةَ) واتە: نوێژەکە بەو شێوەیە کە هەیە، دەیهێننەدی و ئەنجامی دەدەن.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ﴾، ئـەو ئایینـەی خـوا بـۆی نـاردوون، بـۆی سروشـکردوون ئـا ئـەو ئاییـن و بەرنامەیـە بەرپابکـەن و تێیـدا پەرتـەوازە مەبـن، دەشـگونجێ: ﴿أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ﴾، ڕاناوەکـەی بچێتـەوە بـۆ هەمـوو ئۆممەتـانی پێغەمبـەران، بـا ناویشـیان نەهاتبـێ، بـەڵام بـە سـیاق دەزانـرێ، واتـە: ئـەی هەمـوو ئەوانـەی شـوێنکەوتووانی پێغەمبـەرانی پێشـوون! هەمووتـان ئـەو ئایینـە کـە خـوا بـۆ پێغەمبـەری خاتەمـی ﷺ نـاردوە، شـوێنی بکـەون و بەرپـای بکـەن و جێبەجێـی بکـەن، هەمووتـان پابەندکـراون بـەو دوا پەیـام و بەرنامـەی خـوای پـەروەردگارەوە.

کەواتـە: ﴿أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ﴾، دەگونجـێ بـۆ ئۆممـەتی پێغەمبـەر ﷺ بچێتـەوە، شـوێنکەوتووانی موحەممـەد ﷺ، دەشـگونجێ وێـڕای ئـەوان، بـۆ شـوێنکەوتووانی هەموو پێغەمبەرانیـش بچێتـەوە، ئـەو دوو واتایـەش تێکناگیرێـن، چونکـە لە ڕاسـتییدا پێغەمبەر موحەممـەد ﷺ هەمـوو مرۆڤایەتیـی بـووە بـە ئۆممـەتی وی ﷺ چ شـوێنی بکـەوێ، چ شـوێنی نەکـەوێ، بـەڵام لـە هیـچ کۆمەڵگایـەك دا، لـە هیـچ کۆمەڵـە خەڵکێـك قبـووڵ ناکـرێ بـە دوای پیغەمبەرێـکی دیکـە بکـەوێ، لـە دوای هاتنـی موحەممـەد ﷺ بۆچـی؟ چونکـە ڕێبـازو بەرنامـەی پێغەمبـەرانی پێشـوو، هەموویـان تێکـدراون، پاشـان ئـەوان هەموویـان بـۆ کات و شـوێنیکی دیارییکـراو هاتـوون.

کەواتـە: ئەگـەر لـەو بەرنامانـەدا چارەسـەری گرفـت و کێشـەکانی مرۆڤایەتیـی نەبـێ، ئـەوە نوقصانیـی نیـە بـۆ ئـەو بەرنامەیـە، چونکـە خـوای پـەروەردگار بـۆ ئـەوەی نەنـاردوون، بـۆ دێیـەکی نـاردوون، بـۆ عەشـیرەتێکی نـاردوون، بـۆ شـوێنێکی

ناردوون، بەڵام ئەو بەرنامەیەی بۆ پێغەمبەری خاتەمی ﷺ ناردوە، خوای بەرزی مەزن و زاناو توانا، چارەسەرکردنی گرفت و کێشەکانی هەموو مرڤایەتیی تێدا ڕەچاو کردوە.

٧)- ﴿كَبُرَ عَلَى ٱلْمُشْرِكِينَ مَا تَدْعُوهُمْ إِلَيْهِ﴾، خوا ڕوو دەکاتە پێغەمبەر ﷺو، ئۆممەتەکەی و دەفەرموێ: گەورەو قورسە لەسەر هاوبەش بۆ خوادانەرەکان، ئەوە بانگی بۆ دەکەن، ئەوەی پێغەمبەر ﷺ و مسوڵمانان، هاوبەشدانەران و خەڵکی بۆ بانگ دەکەن، بریتیە لە چی؟ بریتیە لە خوا بەیەکگرتن، (توحيد الله) بۆیەش ئەوان ئەوەیان لەسەر دڵ قورسە، چونکە بە شیرکەوە ڕاهاتوون، بە پەرستنی مرۆڤەکانەوە بە پەرستنی دارو بەردەوە، بە پەرستنی پەیکەرەکانەوە، بە پەرستنی ئەستێرەو خرۆکەکانەوە، بە پەرستنی چەندەها شتەوە ڕاهاتوون، ئێستا لەسەر دڵیان قورسە بڵێی: دەستبەرداری ئەو شتانەبن و تەنیا خوا بپەرستن، (كَبُرَ: أي ثَقُلَ وَصَعُبَ) یانی: قورسەو زەحمەتە لەسەر هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، لەسەر دڵیان، ﴿مَا تَدْعُوهُمْ إِلَيْهِ﴾، ئەوەی تۆ ئەوانی بۆ بانگ دەکەی.

٨)- ﴿ٱللَّهُ يَجْتَبِيٓ إِلَيْهِ مَن يَشَآءُ﴾، بێگومان خوا هەرکەسێکی بوێ بەرەو لای خۆی هەڵیدەبژێرێ.

٩)- ﴿وَيَهْدِيٓ إِلَيْهِ مَن يُنِيبُ﴾، هەروەها هەر کەسێك لە ناخەوە بەرەو لای خوا بگەڕێتەوە، خوا بەرەو لای خۆی ڕاستە ڕێی دەکات.

لێرەدا بۆیە خوا (ما)ی لە: ﴿كَبُرَ عَلَى ٱلْمُشْرِكِينَ مَا تَدْعُوهُمْ إِلَيْهِ﴾ دا بەکارهێناوە، چونکە (مَا) یانی: ئەو شتە نەزانراوەی تۆ ئەوانی بۆ بانگ دەکەی، بۆچی وشەی (مَا) بەکارهاتوە؟ (عُبِّرَ بـ «مَا» اعْتِبَاراً بِنكْرَانِ المُشْرِكين لِهَذِهِ الدَّعوة) بۆیە وشەی (مَا) بەکارهاتوە، کە بۆ شتی نامۆو نەزانراو بەکاردێ، چونکە هاوبەش بۆ خوادانەرەکان ئەوەیان بە نامۆ تەماشایان دەکردو بە شتێکی خراپ و نەزانراویان دەزانی.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ اللَّهُ يَجْتَبِي إِلَيْهِ مَن يَشَاءُ ﴾، (يَجْتَبِـي) یـانی: (يَخْتَـار) خـوا هەڵدەبژێـری بەرەو لای خۆی هەرکەسێکی بیـەوێ، ﴿ وَيَهْدِي إِلَيْهِ مَن يُنِيبُ ﴾، هەرکەسێکیش لـە دەروونـەوە بـۆ لای خـوا بگەڕێتـەوە، خـوا ڕاستەڕێی دەکات بـۆ لای خـۆی، یانـی: ئـەی هاوبـەش بـۆ خوادانـەرەکان! ئـەی خەڵکینـە! هەمـوو کـەس شایسـتەی ئـەوە نیـە خـوا بیخاتـە سـەر ڕاسـتە شـەقامی خـۆی، کاتێـك خـوا هەندێـك لـە ئێـوە هیدایـەت دەدات و دەیخاتـە سـەر ڕاسـتە شـەقامی خـۆی، بزانـن زۆر خـوا پێـداون، ئـەوەش کـە بـێ بـەش دەبـێ لـەو خێـرو بەرەکەتـە، بـا بزانـێ زۆر ماڵوێرانـە.

کەواتـە: شـانازیی بـە کوفـرو شـیرکی خۆتانـەوە مەکـەن، بڵێـن: ئێمـە دەسـتمان لـە شـیرك و کوفـری خۆمـان بەرنـەداوەو هـەر لەسـەری ماوینـەوە، خۆتـان پـێ ئـازا نەبـێ، ئێـوە لـە خێرێـکی زۆر بـێ بـەش بـوو ون، ئەوانـەی خـوا بـەرەو لای خۆییـان هەڵدەبژێـرێ و دڵیـان وەردەچەرخێنـێ بـۆ بەندایەتیـی خـۆی، کـە تەنیـا ئەو بپەرسـتن و تەنیـا شـوێن پێغەمبـەری ئـەو بکـەون: ئەوانـە زۆر خـوا پێـداون، ئەوانـە خـوا هەڵیبـژاردوون و گوڵبژێـری کـردوون، ئەوانـە لـە ناخـەوە بـەرەو لای خـوا گەڕاونـەوە.

١٠)- ﴿ وَمَا تَفَرَّقُوا إِلَّا مِن بَعْدِ مَا جَاءَهُمُ الْعِلْمُ ﴾، پەرتەوازەش نەبوون، مەگەر دوای ئەوەی زانیارییان بۆ هات، مەگەر دوای ئەوەی بەرچاو ڕوونکرانەوەو شارەزا کران، واتە: پەرتەوازەش بوون و هیچ بیانووشیان نەبوو.

١١)- ﴿ بَغْيًا بَيْنَهُمْ ﴾، بەهۆی سنوورشکاندنی نێوخۆیانەوە، پەرتەوازەو دابڕ دابڕ بوون، (البَغي) بە مانای سنووربەزاندن و سنوور شکاندن، واتە: پەرتەوازەبوون و بەشبەشبوونیان لە سۆنگەی ستەم و سنوورشکێنیی نێوخۆیانەوە بوو، کە ئێستاش زۆر جار وایە، بۆ وێنە: ڕێبازەکانی تەزکیەو تەصەووف، ئەوە ناوی ڕێبازێکەو، ئەوەش ناوی ڕێبازێکی دیکەیەو ...هتد، لە نێو خۆیاندا ناکۆکن، کە لە ئەصڵدا ئەو ڕێبازانە هەموویان دەبێ خەڵك بگێڕنەوە بۆ ڕاستە شەقامی قورئان و سوننەت، ئەو پێشەوایانەی ئەو ڕێبازانەیان داناون، ئەگەر شێخ جونەیدی بەغدادیی بووە، ئەگەر ئەبوو حامیدی غەززالیی بووە، ئەگەر عەبدولقادری

گەیلانیی بووە، ئەگەر بەهائەددینی نەقشەبەندیی بووە، سەید ئەحمەدی ڕیفاعیی بووە، سەید ئەحمەدی بەدەویی بووە، هەموو ئەوانە تەنیا شوێنکەوتووی قورئان و سوننەت بوون، بەڵام دوایی بەهۆی ناوەکەیانەوە، ئەوە قادرییە، ئەوە نەقشییە، ئەوە بەدەوییە، ئەوە ڕیفاعییە، ئەوە چییە، لە بەینی خۆیان دا ناکۆکن!

هەروەها ئەو حاڵەتە لە نێو سەلەفیی ناوەکان دا، هەر زۆر زەقە.

هەروەها ئەوە بەسەر لایەنە ئیسلامییەکانیشدا دەچەسپێ، ئەگەر دەمارگیرییان هەبێ بۆ ناوەکەیان، هەر لەبەر ئەوەی ئەوە ناوی وایەو، ئەوە ناوی وایە، ... هتد .

هەروەها بەسەر مەزهەبەکانیشدا دەچەسپێ، کە کاتێ خۆی لە بەغداد دا، حەنبەلییەکان و شافیعیەکانیان، هەروەها حەنبەلییەکانیان و حەنەفییەکان سەدو یەك بەزم و ڕەزم و، کێشەو بێشەیان بووە، یان مالیکییەکان و کێ لە میسردا، کە ئەوە هەمووی دەمارگیرییەو هەمووی سنووربەزاندنە لەگەڵ یەکدی، ئەگەرنا مادام هەموو ڕێبواری یەك ڕێگان، ئەو بەوێدا بۆی دەچێ، ئەو بەوێدا بۆی دەچی، وەك جاری وا هەیە هاوکێشەیەکی ماتماتیکیی و، هاوکێشەیەکی جەبریی بە چەند شێوازێك چارەسەر دەکرێ، یان جاری وایە شارێك چەند ڕێی دەچنەوە تێ، هەر کەسێك هەر ڕێیەك بگرێ ئاساییە، گرنگ ئەوەیە بچێتەوە بۆ وێ، وەك دەڵێن: هەموو ڕێیەکان دەچنەوە بانێ، یان: هەموو ئاو لە کەنداو کۆدەبنەوە.

بۆیە خوا دەفەرموێ: پەرتەوازە نەبوون لە بەینی خۆیاندا، مەگەر دوای ئەوەی زانیارییان بۆ هات، بە هۆی سنووربەزاندنەوە، بە هۆی حەسەدو ستەم و دەستدرێژیی کردنەوە بۆ سەر یەکدی.

١٢)- ﴿وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى لَّقُضِيَ بَيْنَهُمْ﴾، ئەگەر فەرموودەیەك لە پەروەردگارتەوە تێنەپەڕی بووایە، کە تاکو کاتی دیارییکراو هەڵیان بگرێ و، دادوەرییان لە بەیندا نەکات، دادوەرییان لە نێواندا دەکرا، بەڵام خوا پێشتر

بڕیارێکی داوە، کە ئەم دنیایە شوێنی تەصفیەی حیساب نیە، ئەم دنیایە جێی دادوەریی نیە، داخۆ کێ لەسەر هەقەو کێ لەسەر ناهەقە؟ بەڵکو ڕۆژی دوایی، ئەوێ (یوم الفصل)ە، ڕۆژی لێك هەڵاواردن ئەوێیە، ئنجا لەبەر ئەوەی خوا پێشتر ئەو بڕیارەی داوە، ئەگەرنا ئەگەر خوا پێشتر ئەو بڕیارەی نەدابایە، کارەکەیان هێندە خراپە، ئەو ئەهلی دینە کە لەبەر دەستدرێژیی و سنوور شکێنیی لە نێوان خۆیاندا پەرتەوازە بوون، دوای ئەوەی خوا بەرچاوی ڕوون کردوونەوەو، ڕێی پێشانداون، ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە خوا پێشتر بڕیاری داوە، هەر لێرە دادوەرییان لە نێواندا دەکرا.

١٣)- ﴿وَإِنَّ ٱلَّذِينَ أُورِثُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ مِنۢ بَعْدِهِمْ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ مُرِيبٍ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی لە دوای وان، {لە دوای پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)} کتێبیان پێدراوە، کتێبیان کراوەتە میرات، لە بارەیەوە لە دوو دڵییەکی خەستدان، لە دوو دڵییەکی بێزارکەردان، واتە: شوێنکەوتووانی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، کە کتێبەکەیان کەوتۆتە دەست، کە جوولەکەکان تەوراتیان لەبەر دەستەو، نەصرانییەکان ئینجیلیان لەبەر دەستەو، صابیئەکانن کتێبی: **(كنزا ربّا)** و کتێبی: **(مواعظ يحيى بن زكريا)**، یان هەیەو، مەجووسییەکان کتێبی: (ئاڤێستا) یان هەیە، ئەوانەش ئەگەر ئەصڵێکی ئاسمانییان بووبێ، شوێنکەوتووەکانیان لە بارەی کتێبەکانیانەوە کەوتوونە دوو دڵیی و گومانێکی زۆرەوە، کە بە دڵنیایی ئێستا وایە، ئێستا نەصرانییەکان سەدو یەك ڕەخنەیان هەیە لە ئینجیل، جوولەکەکان لەسەر تەورات مشت و مڕیانە، هەروەها صابیئەکان لەسەر **(كنزا ربّا)** و، مەجووسییەکان لەسەر ئاڤێستا، کە من ئەو کتێبانەم هەموویان بە وردیی تەماشا کردوون و، سەدو یەك ئیشکال و کێشەیان تێدایە، چونکە گۆڕدراون و دەستکاریی کراون، ئەگەر پێشتر کتێبی خوایش بووبن، شتی وایان تێدایە کە لە قوتووی هیچ عەتارێکدانیەو، هی عەقڵێك قبووڵی ناکات.

دەفەرموێ: لە بارەی کتێبەکەی خۆیانەوە کەوتوونە دوودڵیی و گومانێکی خەستەوە، منیش بەنسبەت مسوڵمانانەوە دەڵێم: **(أَخْلَافُهُمُ الَّذِيْنَ وَقَعَ الكِتَابُ**

بِيَدِهِم كَالْمِيْرَاثِ عَقْواً صَفْواً، أصْبَحُوا فِي شَكٍّ وَتَرَدُّدٍ فِيْهِ، بِسَبَبِ كَثْرَةِ مُبْتَدَعَاتِهِمْ، فَصَارَتْ حِجَاباً لَهُمْ عَنْ الحَقِّ، وَهَذَا هُوَ حَالُ المُسْلِمِيْنَ الآن).

یانی: ئەوانەی کتێبیان کەوتۆتە بەردەست وەك میراتێك، وەك چۆن کەسێك میراتێکی پێ دەبڕێ پێوەی ماندوو نابێ، ئەوانیش ئەو کتێبەیان کەوتۆتە بەردەست بە ئاسانیی و ساغیی بەڵام تێیدا کەوتوونە دوودڵیی و گومان، چونکە خۆیان هێندەیان شتی داهێنراو پەیدا کردوە، کە ئێستا ئەو شتە داهێنراوانە، بوونە پەردەیەك و کتێبی خوایان لێ شاردوونەوە.

مسوڵمانانیش هەم لە ڕووی قوتابخانەکانی عەقیدەوە (علم الكلام)، هەم لە ڕووی مەزهەبە فیقهییەکانەوە، هەم لە ڕووی قوتابخانەکانی تەزکییەوە، هەم لە ڕووی قوتابخانە سیاسییەکانەوە، لە ئەنجامی ئەوەدا کە شتی زۆر پەیداکراوە، پەیدا دەکرێ و، دادەهێنرێ، کە ئەصڵێکی نییە لە ئیسلام دا، وای لێهاتوە شتە داهێنراو و پەیداکراوەکان، ڕووی گەشی قورئان، ڕووی گەشی وەحییان شاردۆتەوە لە مسوڵمانان.

بۆیە لە ئەصڵی کتێبەکەی خۆیاندا دەکەونە دوودڵیی و گومانەوە، هەڵبەت خوا ﷻ ئەو تەعبیرەی بۆ شوێنکەوتووانی پێغەمبەرانی پێشوو (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، بەکارهێناوە، بەڵام بە بۆچوونی من، حاڵی مسوڵمانانیش دەگرێتەوە.

### مەسەلەی دووەم:

**فەرمانکردنی خوا بە پێغەمبەر ﷺ کە پێنج ئەرکان جێبەجێ بکات و، پێنج ڕاستییانیش ڕابگەیەنێ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿فَلِذَٰلِكَ فَٱدْعُ وَٱسْتَقِمْ كَمَآ أُمِرْتَ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ وَقُلْ ءَامَنتُ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِن كِتَٰبٍ وَأُمِرْتُ لِأَعْدِلَ بَيْنَكُمُ ٱللَّهُ رَبُّنَا وَرَبُّكُمْ لَنَآ أَعْمَٰلُنَا وَلَكُمْ أَعْمَٰلُكُمْ لَا حُجَّةَ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ ٱللَّهُ يَجْمَعُ بَيْنَنَا وَإِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٥﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە دە (١٠) بڕگەدا:

١)- ﴿فَلِذَٰلِكَ فَٱدْعُ﴾، بۆ ئەوەی باسکرا بانگەواز بکە، ئەم ئایەتە موبارەکە جگە لە ئایەتی قەرز (**آية الدَّين**)، لە دوای (**آية الكرسي**) یەکەمین ئایەتە، کە لە دە (١٠) ڕستە پێکهاتوە، پێنجیان پێنج ئەرکن، کە دەبێ پێغەمبەری خاتەم ﷺ جێبەجێیان بکات و، پێنجیشیان پێنج ڕاستیی مەزنن، کە دەبێ بە خەڵکیان ڕابگەیەنێ (**آية الكرسي**)یش، دە (١٠) ڕستەیە، دەربارەی پێناسەی خوا ﷻو، خوا بەیەکگرتن و سیفەتەکانی خوا، کە دەفەرموێ: ﴿فَلِذَٰلِكَ فَٱدْعُ﴾، بۆ ئەوەی باسکرا بانگەواز بکە بریتیە لە چی؟

١- ئایینی خوا بەر پابکرێ.

٢- ڕێ بگیرێ لە پەرتەوازەیی.

٣- ئەوە کە خوا بەیەکگرتن و تەنیا خوا پەرستن، لەسەر دڵی هاوبەش بۆ خوادانەرەکان قورسە.

٤- ئەوە کە خوا ﷻ چاکەی کردوە لەگەڵ بڕواداراندا، کە بەرەو لای خۆی هەڵیبژاردن و ڕێنمایی کردوون.

٥- ئەوە کە بە هۆی سنوورشکاندن و دەستدرێژیی نێو خۆیانەوە، شوێنکەوتووانی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، لە نێو خۆیاندا پەرتەوازە بوون.

٦- ئەوە کە شوێنکەوتووانی پێغەمبەران، دوایی کەوتوونە دوودڵیی و گومانێکی خەستەوە، لە بارەی ئەو کتێبەوە کە پێیاندراوەو وەك میراتێك کەوتۆتە بەردەستیان، لە ئەنجامی ئەوەدا کە شتیان زۆر داهێناوەو پەیداکردوە.

تۆ بانگ بکە بۆ هەموو ئەوە، واتە: چاکەکان جێ بەجێ بکەن و، خۆتان لە خراپەکان بپارێزن.

٢)- ﴿ وَٱسْتَقِمْ كَمَآ أُمِرْتَ ﴾ وەك فەرمانیشت پێکراوە ڕێك وەستاوبە، ئەرکی یەکەمی پێغەمبەر ﷺ ئەوەیە، کە بانگەواز بکات بۆ هەموو ئەوەی کە ڕابرد، پێغەمبەری خاتەم ﷺ تەواوکەری بەرنامەی پێغەمبەرانی پێش خۆیەتی و، ئەو پەیام و بەرنامەیەی خوا بۆ پێغەمبەری خاتەمی ﷺ ناردوە، لە هێڵە گشتییەکانیدا، هەمان پەیام و بەرنامەی پێغەمبەرانی پێشوویە، بەڵام تەواوکەریشیەتی، تۆ بۆ ئەوە خەڵك بانگ بکە، هەروەها بانگیشیان بکە کە لە ئایینددا پەرتەوازە نەبن و لە کتێبەکەی خۆیاندا، لە دوو دڵییدا نەبن، واز بێنن لە شتی داهێنراوو پەیداکراو، بێنەوە سەر ڕاستەڕێی وەحیی و شەریعەت، هەروەها وەك فەرمانت پێکراوە، ڕێك وەستاوبە، ئەوە فەرمانی دووەمە، ئەرکی دووەمی پێغەمبەر ﷺ ئەوە بووە کە ڕێك بوەستێ، وەك فەرمانی پێکراوە، ﴿ كَمَآ أُمِرْتَ ﴾، (الكَاف للمُبَالَغَة، أي مِثل الَّذِي أُمِرْتَ بِهِ) وەك چۆن فەرمانت پێکراوە، ئاوا ڕێك بوەستە، ئەی موحەممەد ﷺ! چونکە تۆ دەبێ ئایین و بەرنامەی ڕاستی خوا، لە خۆتدا بەرجەستە بکەی.

ئێستا ئێمە ئەگەر تەماشای قورئان بکەین، بە شێوەی تیۆریی، ئیسلام دەبینین و، ئەگەر تەماشای پێغەمبەری خاتەم ﷺ بکەین، بە شێوەی پراکتیکیی و جێبەجێ کراویی ئیسلام دەبینین، بۆیەش خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِى رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ﴿٢١﴾ ﴾الأحزاب، واتە: بەڕاستیی لە پێغەمبەری خوادا

باشترین سەر مەشق هەیە، بۆ ئێوە، تەماشای پێغەمبەر ﷺ بکەن، ئیسلامی تێدا دەبینن، بە هەموو ڕەهەندەکانیەوە، ئیسلام چۆنە، پێغەمبەر ﷺ لە ژیانیدا تاکیی و، خێزانیی و، کۆمەڵایەتیی و، سیاسیی خۆیدا، بەرجەستەی کردوە.

٣)- ﴿وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ﴾، بە دوای ئارەزووەکانیان مەکەوە، (أَهْوَاء) کۆی (هَوى) یە (الهَوَى: المَحَبَّة، وغلبت عَلَى محبَّةِ مَا لَا نَفْعَ فِيْهِ) (هوى): بە مانای خۆشویستنە، بەڵام زاڵبووە لە بەکارهێناندا، بەسەر شتێکدا کە خۆشبویسترێ و، سوودی نەبێ، واتە: بە دوای ئارەزوو و بۆ چوونە پووچەکانی ئەوان مەکەوە.

ئەمەش دوو واتای هەن:

**یەکەم:** بە دوای ئارەزووەکانیان مەکەوەو وەك ئەوان مەکە، جاری وابوو، داوایان لێ دەکرد: بتەکانی ئەوان بپەرستێ، یاخود: لەو کارو نەریتەدا خاتریان بگرێ! بە دوای ئارەزوویان مەکەوە.

**دووەم:** کاتێك کە ئەوان بە تایبەتی خاوەن کتێبەکان، تانە دەدەن لە بەرنامەی تۆ، با ئەوە پاڵت پێوە نەنێ تۆش تانە بدەی لە بەرنامەی پێغەمبەرانی پێش خۆت (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، چونکە جاری وایە ئەگەر مرۆڤ لە خۆی وریا نەبێ، کەسێك کە تانە دەدا لە تۆ، تۆش تانەی لێ دەدەیەوە، وەك جاری وا هەبووە شیعە کە بەنەزانیی قسە دەڵێن بەسێ خەلیفە ڕاشیدەکان خوا لێیان ڕازی بێ: ئەبوو بەکرو عومەرو عوسمان، خەڵکی نەزانیش هەبووە لە بەرانبەردا قسەی گوتوە بە عەلی! کە لە ڕاستییدا گەورەیی جەماوەری مسوڵمانان - کە وەك ناوێکی مێژوویی پێیان گوتراوە: **(أهل السنة والجماعة)** کە من پێم وایە ئەوە ناوێکی مێژووییەو هەر بگوترێ: زۆرینەی مسوڵمانان، باشترە - لەوەدابووە، کە جیاوازییان نەکردوە لە نێوان چوار خەلیفەکانداو ڕێزیان لە هەر چواریان گرتوە، هەروەها جیاوازییان نەکردوە لە نێوان هاوەڵانداو ڕێزیان لە هەموویان گرتوە، مەگەر کەسێك هەڵەیەکی بووبێ، هەڵە هەڵەیە، هەروەها جیاوازییان نەکردوە لە نێوان زانایانداو، هەموویان بە زاناو پێشەوای خۆیان داناون.

بـەڵام شـیعە جیاوازیـی دەکـەن لـە نێـوان چـوار خەلیفەکانـدا، تەنیـا یەکێکیـان قبووڵـە، هەروەهـا جیاوازیـی دەکـەن لـە نێـوان هاوەڵانـدا، زۆربەیـان ڕەتدەکەنەوەو، تانەیـان لێـدەدەن، کەمێکیـان نەبـێ، دیسـان جیاوازیـی دەکـەن لە نێـوان زانایانیشـدا، تەنیـا دوازدەیـان بـە ئیمامـی خۆیـان دادەنێنـن و، ئەوانیـش بـە پارێـزراو لـە هەڵـە (معصـوم) دادەنێنـن، ئیمامـی دوازدەیەمیشـیان هـەر بـوونی نیـە، موحەممـەدی کوڕی حەسـەنی عەسـکەریی، چونکـە حەسـەنی عەسـکەریی نـەزۆك بـووە، نـە کوڕ، نـە کچی نەبـووە! بۆیـە ئینسـان دەبـێ وریـا بـێ، کەسـێك ڕەخنەیـەك لـە تـۆ دەگـرێ، تانەیـەك لـە تـۆ دەدات، زوڵمێـك لـە تـۆ دەکات، تـۆ لـە بەرانبـەردا زوڵـم لـەو نەکەیـەوە، بـەس زوڵمەکـەی خـۆی ڕەتبکەیـەوە، نـەك تـۆش زوڵـم لـەو بکـەی، بۆیـە زانایـان ﴿ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ ﴾، یـان: ئـاوا لێـك داوەتـەوە: تـۆ لـە مامەڵـەدا وەك ئـەوان مەکـە، بـا تانـەدانی ئـەوان لـە بانگـەوازی تـۆ، وات لـێ نـەکات تـۆ سـیفەتە بـەرزەکانی پێغەمبـەرانی ئـەوان (عَلَيْهِـمُ الصَّـلَاةُ وَالسَّـلَامُ)، بـاس نەکـەی و، ئـەو ڕێنماییـەی کـە لـە کتێبەکانیانـدا هەیـە نادیـدەی بگـری.

کـە بێگومـان پێغەمبـەر ﷺ وای نەکـردوە، بـەڵام خـوای پـەروەردگار لـە پێـش دا ئـاگاداری کردۆتـەوە.

٤)- ﴿ وَقُلْ ءَامَنتُ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِن كِتَـٰبٍ ﴾، هەروەها بڵێ: بڕوام هێناوە، بە هەر کتێبێك کە خوا دایبەزاندوە، وشەی (مِنْ) پێی دەگوترێ: (من الإبتدائیة) واتە: هەر لە سەرەتاوە، خوا هەر کتێبێکی دابەزاندوە، (کتاب)یش بە (نکرة) هاتوە، یانی: هەر کتێبێك کە خوا دایبەزاندوە بڕوام پێیەتی، ئەمەش بۆ ئەوەیە ڕێی مشت و مڕو شەڕە قسە بگرێ، هەر کۆمەڵێك ڕاست ببنەوە بڵێن: ئێمەش کتێبێکی ئاسمانییمان هەیە، خوا دەفەرموێ: پێیان بڵێ: هەرچی کتێبی خوایەو دایبەزاندوە بڕوام پێیەتی، بەڵام وەك ئەصڵەکەی، ئەدی وەك واقیعی ئێستای؟ دەبێ ئەم قورئانە بکرێتە تەرازوو، هەرچی تێدایەو لەگەڵ قورئاندا دژ دەوەستێ، مانای وایە فەرمایشتی خوا نیە، وەك خوا ﷻ لە سوورەتی (النمل)دا، دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ هَـٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَقُصُّ عَلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ

﴿أَكۡثَرَ ٱلَّذِي هُمۡ فِيهِ يَخۡتَلِفُونَ ٧٦﴾، واتە: ئەم قورئانە بەسەر بەنوو ئیسرائیلدا دەخوێنێتەوە، زۆربەی ئەوەی تێیدا کەوتوونەتە ڕاجیایی، خوای زاناوشارەزا ناوی لەم قورئانە ناوە: (مهیمن) ﴿وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ مُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَمُهَيۡمِنًا عَلَيۡهِ ٤٨﴾المائدة، واتە: کتێبمان بۆ تۆش دابەزاندوە، کتێبەکانی پێش خۆی بە ڕاست دەزانێ و بەسەریشیانەوە چاودێرە.

یانی: لە هەر شتێك دا لادانیان کردبێ، قورئان دەفەرموێ: نەخێر ئەوەیان وانیە.

کە وەك من لەم تەفسیرەی خۆمدا لە زۆر شوێن دا، ئەو شتانەی لادانیان تێدا هەبووە، قسەکانی پەیمانی کۆنم هێناوە، (پەیمانی کۆن)، واتە: تەورات و کتێبەکانی کە لە گەڵیدان، کە سی و نۆ (٣٩) کتێبن و، بە سەرژمێرێك چل و نۆ (٤٩) کتێبن، هەروەها لە (پەیمانی نوێ)ش دا لە هەر شوێنێك لادان بووبێ، ئەوەی بە پێویستم زانیوە بەراوردم کردوون، بە تایبەت لەبەسەرهاتی پێغەمبەراندا (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، کە لە (پەیمانی کۆن)دا، شتی وا بۆ پێغەمبەران گوتراوە، زۆر بێجێیە!

٥)- ﴿وَأُمِرۡتُ لِأَعۡدِلَ بَيۡنَكُمُ﴾، واتە: فەرمانیشم پێکراوە کە لە نێوانتاندا دادگەربم، دادگەریی بچەسپێنم، لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿وَأُمِرۡتُ لِأَعۡدِلَ بَيۡنَكُمُ﴾، دوو واتایان هەڵدەگرێ:

**واتای یەکەم:** ئەی خاوەن کتێبەکان! فەرمانم پێکراوە کە لە هەڵسوکەوتدا، لەگەڵتاندا دادگەربم و بانگتان بکەم بۆ ئەو هەقەی پێمدا نێردراوە، بە هۆی دژایەتیی کردنی ئێوەوە بۆ من، ستەمتان لێنەکەم، شتی بێجێ نەڵێم و کاردانەوەیەکی خراپم نەبێ، دادگەرانە لەگەڵتان دا ڕەفتار بکەم.

**واتای دووەم:** ئاماژەیە بۆ ئەوە کە لە داهاتوودا، خوا پێغەمبەری خاتەم ﷺ باڵادەست و دەسترۆیشتوو دەکات، دەسەڵاتی پێدەدات و قەوارەیەکی سیاسیی

دەبێ، ئەو خاوەن کتێبانەش جوولەکەن، نەصرانیین، هەرچی هەن، هەروەها بێبڕواو هاوبەش بۆ خوادانەرەکانیش، دەکەونە ژێر سایەی ئەو قەوارە سیاسییەی موحەممەد ﷺ دەبێتە دامەزرێنەری، کە ئەمەش ئیعجازێکی هەواڵییە، چونکە ئەو کاتەی ئەم سوورەتە هاتۆتە خوارەوە، مسوڵمانان لە شاری مەککە چەوسێنراوە بوون، لە ژێر هەژموون و ستەمی هاوبەش بۆ خوادانەرەکاندا بوون، ئنجا ئەگەر لەوێ پێغەمبەری خاتەم ﷺ بفەرموێ: ئەگەر دەستەڵاتم کەوتە دەست، کە دەشکەوێتە دەستم، دادگەر دەبم لە نێوانتاندا، ئەوە بەڕاستیی بەس خوا دەتوانێ موژدەیەکی ئاوا بدات، ئەگەرنا پێغەمبەر ﷺ ئەو کاتە بە تەمای سەری خۆی و هاوەڵانی نەبووە (خوا لێیان ڕازی بێ).

ئەمە ئەو پێنج ئەرکەی پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکراوە جێبەجێیان بکات:

بانگەواز بکات بۆ ئەوەی فەرمانی پێکراوە، ڕێك وەستاو بێ لەسەری، بە دوای ئارەزوویان نەکەوێ، بڵێ: بڕوام هێنا بەهەر کتێبێك کە خوا دایبەزاندوە، فەرمانیشم پێکراوە کە دادگەربم لە نێوانتاندا.

ئەو پێنج هەواڵەش کە فەرمانی پێکراوە رایان بگەیەنێ، پێنج ڕاستیین:

٦)- ﴿ ٱللَّهُ رَبُّنَا وَرَبُّكُمْ ﴾، خوا پەروەردگاری ئێمەو ئێوەشە، واتە: ئێمە یەکدەنگین لەسەر ئەوە کە پەروەردگارو خاوەن و بەدیهێنەرمان خوایە، کەواتە: با یەکدەنگیش بین لەسەر پەرستنی و، هەر ئەویش بپەرستین و بەندایەتیی تەنیا بۆ ئەویش بکەین.

٧)- ﴿ لَنَآ أَعْمَٰلُنَا وَلَكُمْ أَعْمَٰلُكُمْ ﴾، کردەوەکانی ئێمە بۆ ئێمەو کردەوەکانی خۆتان بۆ خۆتان، واتە: کەس لە جیاتی کەس سزا نادرێ، کەس لە جیاتی کەس پاداشت نادرێتەوە، واتە: ئێوەش هەوڵبدەن کاری چاك بکەن، ئێمەش هەوڵدەدەین کاری چاك بکەین.

٨)- ﴿ لَا حُجَّةَ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ ﴾، هیچ شەڕە قسەومشت و مرمان لە نێوان دا نیە. (حُجَّةَ) یانی: بەڵگە، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی موناقەشەو شەڕە قسەیە، لەبەر ئەوەی

کەسێك کە شەڕو موناقەشەی دەبێ لەگەڵ کەسێك دا، بەڵگە دێنێتەوە، واتە: ئێمەو ئێوە بواری شەڕە قسە نەماوە لە نێوانماندا، ئەگەر بڕوابێنن ئەوە قورئان و ئیسلام ڕوون و ئاشکرایە، ئەگەر بڕواش ناهێنن و لەسەر ئایین و بەرنامەی خۆتان دەمێننەوە، ئیسلام زۆرتان لێ ناکات.

٩)- ﴿ ٱللَّهُ يَجْمَعُ بَيْنَنَا ﴾، خوا پێکەوە کۆماندەکاتەوە، واتە: ئێرە شوێنی ئەوە نیە ئێمە تەصفیە حیساب پێکەوە بکەین، شوێنی لێکدەرکردن نیە، بەڵکو خوا لە قیامەت دا پێکەوە کۆماندەکاتەوەو، لەوێ خوای پەروەردگار پێمان دەفەرموێ: کێ هەق بووەو کێ ناهەق بووە؟ کێ لەسەر ڕێی ڕاست بووە، کێ لەسەر ڕێی چەوت بووە؟

١٠)- ﴿ وَإِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ ﴾، واتە: سەرەنجام تەنیا بۆ لای خوایە، واتە: سەرەنجامی هەموو لایەك بۆ لای خوایە، چونکە وشەی (الـمَصِیْر)، (أل)ی ناساندنی لەسەرە، کە مەبەست پێی هەمووگیریی (إستغراق)ە، واتە: تێکڕای خەڵکی، بۆ لای خوا ﷻ کۆدەکرێنەوەو هەموویان لەوێ خوا دادوەرییان لە نێواندا دەکات.

کەواتــە: پێویســت نــاکات لێــرە دەمەقاڵــێ و شــەڕە قســە پێکــەوە بکەیــن و دووبەرەکــێ بکەیــن، ئەگــەر بــڕوا دێنــن، ئــەوە ئیســلامەو دیــارە، ئەگــەر بــڕواش ناهێنــن، ئایینــی خــوا زۆر لــەوە بــێ باکــترەو بــێ منەتــترە، زۆر و فشــار لــە خەڵــك بــكات و دینداریــی بەزەخــت و زۆر ناکــرێ! ئەمــە وەك ئــەو ئایەتــەی ســوورەتی (البقــرة) وایــە کــە دەفەرمــوێ: ﴿ لَآ إِكْرَاهَ فِى ٱلدِّينِ ۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشْدُ مِنَ ٱلْغَىِّ ﴿٢٥٦﴾ ﴾، واتــە: تۆبزیــی کــردن نیــە لــە دینــدا، سەرڕاســتیی لــە بێمرادیــی جیابۆتــەوە، لێـك جیابوونــەوەو کــێ بــە دوای ســەر ڕاســتیی (رشــد) دەکــەوێ، ئــەوە لــە ئیســلامدا بەرجەســتەیەو، کێــش دەیــەوێ لەســەر ئاییــن و بەرنامــەی خــۆی و لەســەر ڕێچکــەی خــۆی دەمێنێتــەوە، ئیســلام زۆری لــێ نــاکات.

**مەسەلەی سێیەم:**

**شەڕە قسەکردنی بێبڕوایان لە گەڵ مسوڵمانان، لەبارەی خواوە ﷻ، پاش بە دەنگەوەهاتنی مسوڵمانان بۆ پەیامی خوا، پووچەڵیی بەڵگەو بیانووەکانیان پێشان دەدات، خواش لێیان تووڕەیەو سزای سەختیشیان دەبێ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ يُحَآجُّونَ فِى ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مَا ٱسْتُجِيبَ لَهُۥ حُجَّتُهُمْ دَاحِضَةٌ عِندَ رَبِّهِمْ وَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ وَلَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ ﴿١٦﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿وَٱلَّذِينَ يُحَآجُّونَ فِى ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مَا ٱسْتُجِيبَ لَهُۥ حُجَّتُهُمْ دَاحِضَةٌ عِندَ رَبِّهِمْ﴾، ئەوانەی مشتومڕ دەکەن لەبارەی خواوە، شەڕە قسە دەکەن، دوای ئەوەی وەڵامی (خوا) دراوەتەوە، لەلای پەروەردگاریان بەڵگەکەیان پووچەڵە. یانی: (الَّذِيْنَ يُجَادِلُونَ المُؤْمِنِين حَوْلَ تَوْحِيْدِ الله تَعَالَى) ئەوانەی شەڕە قسە دەکەن لەگەڵ بڕواداراندا، لە بارەی خوا بە یەکگرتنەوە، چونکە لەبارەی تەنیا بەدیهێنەرایەتیی خواو، تەنیا پەروەردگارێتیی خواو، تەنیا خاوەنداریێتیی خواوە، کێشەیان نەبووە، وەك لە چەند شوێنان دا خوای بەرزی مەزن ئەوەی ڕاگەیاندوە:

أ- ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ...﴿٦١﴾﴾العنكبوت، واتە: ئەگەر لێیان بپرسی: کێ ئاسمانەکان و زەوی هێناونەدی و خۆرو مانگی ڕام کردوون؟ بەجەختکردنەوەوە دەڵێن: خوا...

ب- ﴿قُلْ مَن رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ قُلِ ٱللَّهُ ﴿١٦﴾﴾الرعد، واتە: بڵێ: کێ پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوییە؟ بڵێ: خوا، یانی: لەسەر ئەوە کە تەنیا خوا بەدیهێنەرە، تەنیا خوا پەروەردگارە، تەنیا خوا خاوەنە، تەنیا خوا هەمەکارەیە، هاوبەش بۆ خوادانەرکان و بێبڕوایەکان لە ڕۆژگاری پێغەمبەردا ﷺو، هی ئەم ڕۆژگارەش زۆربەیان لەسەر ئەوە

کێشەیان نەبووە، بەڵکو کێشە لەسەر ئەوە بووە: ئایا ئەو تاکە بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەنە، دەبێ تەنیا ئەو بپەرسترێ و بەندایەتیی بۆ بکرێ، بە مانای فراوانی بەندایەتیی، یاخود دەبێ هاوبەشی بۆ دابنرێ؟ لێرەدا مشت و مڕ پەیدابووە.

کەواتە: ﴿ وَٱلَّذِينَ يُحَآجُّونَ فِى ٱللَّهِ ﴾ یانی: ئەوانەی شەڕە قسە دەکەن لە بارەی خواوە، شەڕە قسە دەکەن لەگەڵ بڕوادارانی خوا بەیەکگردا، لە بارەی یەکتایی خواوە، کە دەبێ تەنیا خوا بپەرسترێ.

﴿ مِنۢ بَعْدِ مَا ٱسْتُجِيبَ لَهُۥ ﴾، دوای ئەوەی وەڵامی دراوەتەوە، یانی: دوای ئەوەی بڕواداران وەڵامی بانگەوازی خوایان داوەتەوەو، بە دەم بانگەوازی خواوە هاتوون و بڕیاری بەندایەتیی کردنیان داوە بۆ خوا، بەبێ خڵتەی شیرك، ئەوانەی شەڕە قسە دەکەن لەگەڵ بڕواداران، بێ بەڵگەن و ئەوەی بە بەڵگەی دێننەوە، پووچ و بێ بنەمایە.

﴿ حُجَّتُهُمْ دَاحِضَةٌ عِندَ رَبِّهِمْ ﴾، بەڵگەکەیان پووچاوەیە لە لای پەروەردگاریان، پووچەڵە، (**دَاحِضَة: أي: بَاطِلَةٌ زَائِلَة**)، یانی: پووچەو ڕۆیشتوویە، وشەی (دَاحِضْ) لە (**دَحَضَ**)ەوە، هاتوە، (**دَحْضَ ودَحِض**) یانی: خلیسکا، هەڵزەلی، کەسێك کە لە شوێنێکی لووس پێی دەخلیسکێ و سەرەنگرێ دەبێ، (**دَحْض**)، یانی: خلیسکان، (**دَحِضْ: مَزْلَة زَلِق**) یانی: شوێنێك خەڵکی لێ بخلیسکێ، بەڵام بۆچی خوا ناوی لێناوە: بەڵگە (**حجة**)؟ ﴿ حُجَّتُهُمْ دَاحِضَةٌ ﴾، زانایان گوتوویانە: (**سَمَّاهَا حُجَّةً حَسب اعْتِقَادِهِمْ وَمجَارَاةً لَهُمْ**) بۆیە بە بەڵگەی ناو بردوە چونکە قەناعەتیان وابووە، کە ئەو قسانەی دەیڵێن، بەڵگەن و وەك لەگەڵدا ڕۆیشتن و چاوپۆشیی لێکردن.

٢)- ﴿ وَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ ﴾، تووڕەییشیان لەسەرە، خەشم و تووڕەیی خوایان لەسەر پێویست بووە.

٣)- ﴿ وَلَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ ﴾، ئازارێکی سەختیشیان هەیە، (لە ڕۆژی دواییدا) ئایا ئەمە مەبەست پێی چییە؟ یەکێك لە ڕوونکەرەوانی قورئان تەعبیرێکی جوانی هێناوە، دەڵێ:

(مَفَادُ هَـذِهِ الآيَـة: أنَّ بَعْـدَ إِيمَـانِ النَّـاس بِالْقُـرآن وَاسْـتِفَادَتِهِم مِنْـهُ أفْـرَاداً وَمُجْتَمَعَاً، لَـمْ يَبْـقَ مُـبَرِّرٌ للجِـدَالِ وَالنِّقَـاش حَوْلَـهُ، إذ القُـرْآنُ بَعْـدَ اسْـتِجَابَة أهْـلِ الإسْـلَام، أصْبَـحَ وَاقِعَـاً مِـلأ السَّـمْعِ وَالبَصَــر، فَالْفَـرْدُ المُؤْمِـن أَعْظَـم بُرْهَـانٍ عَـلَى حَقَّانِيَـة دِيْنِـه وَكَذَلِـكَ المُجْتَمَـع المُسْـلِم)، ئەمـە هەندێـکی لـە ڕوونکـەرەوان وەرمگرتـووەو هەندێکیـشی دارِشـتنی خۆمـە.

واتـە: ئێـوەڕۆکی ئـەم ئایەتـە موبارەکـەو مانـاو مەبەسـتەکەی ئەوەیـە: دوای ئـەوەی خەڵـك بڕوایـان بـە قورئـان هێنـاوەو لێـی بەهرەمەنـد بـوون، چ وەك تاکـەکان، چ وەك کۆمەڵـگا، هیـچ بیانـوو و پاسـاوێك نەماوەتـەوە بـۆ شـەڕە قسـەو دەمبەدمـە لـە بـارەی قورئانــەوە، چونکــە قورئــان دوای ئــەوەی ئەهــلی ئیســلام بــە دەنگیــەوە چــوون و، وەڵامیـان داوەتـەوە، بۆتـە واقعێـك کـە گـوێ و چـاوی خەڵك پـڕ دەکات و، تاکی بـڕوادارو کۆمەڵـگای مسـوڵمان، باشـترین بەڵگـەن لەسـەر ڕاسـتیی ئاییـن و بەرنامەکەیـان.

واتـە: تـۆ تەماشـای کۆمەڵـگای مسـوڵمان بکـە! ئەگـەر پێشـتر گومانـت بووبـێ لـە بـارەی قورئـان و ئیسـلامەوە، ئێسـتا کـە تەماشـای مسـوڵمانان دەکـەی، چ کۆمەڵـی مسـوڵمان، چ تـاك تـاکی مسـوڵمانان:

١- کە لە ڕووی زانیارییەوە، قسەیەك ناکەن پشت ئەستوور نەبێ بە زانیاریی.

٢- لە ڕووی فیکریی و عەقڵییەوە، عەقڵ و هۆشێکی تێرو تەواویان هەیە.

٣- لە ڕووی پەرستنەوە، تەنیا ئەو زاتە دەپەرستن، کە بەس خۆی شایستەی پەرستنە، نەك شتێك بپەرستن لە خوار خۆیانەوە بێ.

٤- لە ڕووی خێزانییەوە، تۆکمەو توندو تۆڵ، ڕێزو حورمەت لە بەیندا، لە نێوان ژن و مێرددا، لە نێوانی دایك و باب و ڕۆڵەدا.

٥- لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە، پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانیان وەك خزمایەتیی، دراوسێیەتی، هەموو پەیوەندییەکانی دیکە دەگەیەنن.

٦- لە ڕووی ڕەوشت و ئاکارەوە، لە ڕەوشت و ئاکاری جوانەوە پێچراون، ڕاستگۆ، بە ڕەحم، دادگەر، بە ئینصاف، خۆبەکەمگر، ئنجا هاوکاری خەڵك و لە نێو خۆدا بە ڕەحم و شەفەقەت، لەهەر ڕوویەکەوە تەماشایان بکەی، بە باشترین کەسیان دەبینی.

کەواتە: ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئایین و بەرنامەکەشیان، باشترین ئایین و بەرنامەیە، چونکە گۆزە چی تێدابێ، ئەوەی لێ دەڕژێ، پێشینان گوتوویانە: {بە باخیان گوت: گەڵێك جوانی! گوتی: باخەوانەکەم مەردە} لە ڕاستییدا ئەو کۆمەڵگا مسوڵمانە، ئەو تاك تاکە مسوڵمانانەی کە ئاوا بەو شێوەیە لە نێو کۆمەڵگادا دیارن، بە ڕەوشت و ئەدەب و ئاکاری پەسندیان، بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە ئایین و بەرنامەکەیان تێروتەواو و ڕاستە.

بۆیە خوا دەفەرموێ: ئەوانە بیانووەکانیان پووچن، هەڵبەتە قسەکانیان بیانوون، بەڵام ناوی لێناون بەڵگە (حجة) لەبەر ئەوەی خۆیان بەبەڵگەیان داناون، ئەگەرنا لە ڕاستییدا بەڵگە نەبوون، بەڵکو بیانوو و پاساو بوون.

## مەسەلەی چوارەم:

**خوا کتێبی کۆتایی خۆی بە هەق دابەزاندوە، هەروەها تەرازووش و، ڕۆژی دواییش نیزیکە تەنیا بێبڕوایان پەلەی لێدەکەن، بەڵام بڕواداران ترس و بیمیان لێی هەیە، دەزانن ڕۆژی دوایی هەقە، مشت و مڕکەرانیش لە بارەی ڕۆژی دواییەوە، لە گومڕاییەکی دووردان:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ ٱلْكِتَـٰبَ بِٱلْحَقِّ وَٱلْمِيزَانَ ۗ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ ٱلسَّاعَةَ قَرِيبٌ ﴿١٧﴾ يَسْتَعْجِلُ بِهَا ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِهَا ۖ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مُشْفِقُونَ مِنْهَا وَيَعْلَمُونَ أَنَّهَا ٱلْحَقُّ ۗ أَلَآ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُمَارُونَ فِى ٱلسَّاعَةِ لَفِى ضَلَـٰلٍۭ بَعِيدٍ ﴿١٨﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ ٱلْكِتَـٰبَ بِٱلْحَقِّ ﴾، خوا ئەو کەسەیە کە کتێبی بە هەق دابەزاندوە، واتە:

أ- کە دایبەزاندوە، هەقی لە نێو خۆیدا هەڵگرتوە.

ب- یاخود: بۆ ئەوەی هەقی پێبچەسپێنێ دایبەزاندوە.

ج- یاخود: لە کاتێکی هەق دا و لە شوێنێکی هەقداو بە شێوەیەکی هەق دایبەزاندوە، (**الحَقّ: الشَّيءُ الثَّابِتُ الرَّاسِخ**)، (**حق**): شتێکە چەسپاو بێ و، نەجووڵاو بێ، بە پێچەوانەی (بَاطِل)ەوە، کە شتێکی بۆش و بێ بناغەیە.

وشەی (**حَقّ**)یش بە پێی ئەو سیاقانەی کە تێیاندا دێ، مانایەکەی دەگۆڕێ، وەك لە سەرەتای تەفسیری سوورەتی (**الزمر**)دا باسمان کردوە:

أ- جاری وایە بە مانای ڕاستیی دێ.

**ب-** جاری وایە بە مانای دادگەریی دێ.

**ج-** جاری وایە بەمانای حیکمەت دێ.

**د-** جاری وایە بە مانا زمانەوانییەکەی خۆی دێ، کە بریتیە لە شتێکی چەسپاوو نەگۆڕ.

ئنجا کە خوا دەفەرموێ: خوا ئەو کەسەیە کتێبی بە هەق دابەزاندوە، واتە: ئەو کتێبە هەم هەقی لە نێودایە، هەم بۆ ئەوەیە هەق بچەسپێنێ، هەم لە کات و شوێنی هەقیشداو، هەم بە شێوازی هەقیش دابەزیوە.

۲)- ﴿ وَٱلْمِيزَانَ ﴾، هەروەها خوا تەرازوویەکیشی دابەزاندوە، (**المِيْزَانُ: آلَةُ الوَزْنِ، وَهُنَا مُسْتَعَارٌ للْعَدْلِ**)، (میزان): ئامرازی دادگەرییە، شتێك کە بکێشرێ و بتەوێ بزانی کێشی چەندە؟ دەیخەیە تەرازووەوە، بەڵام لێرەدا خوازراوەتەوە بۆ دادگەریی، ئەگەرنا خوا ئامێری تەرازووی لە ئاسمانەوە دانەبەزاندوە، بەڵام دادگەریی دابەزاندوە، کە دادگەرییەکەش هەر لە نێو قورئاندایە، واتە: ئەو کتێبەی خوا دایبەزاندوە، هەم هەقی لە نێودایەو، هەم دادگەرییشی لە نێودایە.

(الطبري) ڕەحمەتی خوای لێ بێ، لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1] دەڵێ: (**وَأَنْزَلَ الْمِيزَان وَهُوَ الْعَدْل، لِيَقْضِيَ بَيْن النَّاس بِالْإِنْصَافِ، وَيَحْكُم فِيهِمْ بِحُكْمِ اللَّه الَّذِي أَمَرَ بِه فِي كِتَابِه**) واتە: خوا تەرازووی دابەزاندوە کە بریتیە لە دادگەریی، تاکو لە نێوان خەڵکدا بە دادگەریی حوکم بکات، بەپێی حوکمی خوا کە فەرمانی پێکردوە لە کتێبەکەیدا.

یەکی دیکە لە زانایان گوتوویەتی: (المِيْزَان: آلَةُ الوَزْنِ، وَالوَزْنُ: تَقْدِير ثِقَلِ جِسْمٍ) (میزان): بریتیە لە ئامێری کێشان، کێشانیش، {دەگوترێ: ئەو شتەی وەزن کرد} ئەوەیە کە ئەندازەی قورسایی ئەو شتە بزانرێ.

یەکێکیشیان ئاوا پێناسەی (میزان) دەکات:

---

(۱) جامع البيان: ج۲۱، ص۵۲۰.

(وَالمِيْـزَانُ: آلَـةٌ ذَاتُ كَفَتَـيْنِ مُعْتَدِلَتَـيْنِ مُعَلَّقَتَـيْنِ فِي طَـرَفِي قَضِيْـبٍ مُسْـتَوٍ مُعْتَـدِلٍ، لَـهُ عُـرْوَةٌ فِي وَسَـطِهِ، بِحَيْـثُ لَا تَـتَدَلَّى إحْـدَى الكَفَتَـيْنِ عَـلَى الأُخْـرَى إذَا أُمْسِـكَ القَضِيْـبُ مِـنْ عُرْوَتِـهِ)، واتـە: تـەرازوو (میـزان): ئامێرێکـە لـە دوو تـا پێـك هاتـوە، دوو تـای تـەرازوو، هێنـدەی یەکـن، هەڵـواسراون بـە دارێکـەوە (یاخـود بـە ئاسـنێکەوە) بـە یەکسـانیی کـە قوڵفەیـەکی هەیـە لـە نێوەڕاسـتەکەیدا، بـە شـێوەیەك کـە ئەگـەر دووتـای تەرازووەکـە بەربدرێـن، هیچـان بەسـەر هیچیانـدا زاڵنابـن.

یـانی: تـەرازوو ڕادەوەسـتێ، پێشـینانی خۆمـان دەڵێـن: فڵان شـتە تـەرازوو وەسـتاوە، دووتایەکـەی تـەرازوو بـە یەکسـانیی دەوەسـتێ، بـەڵام کاتێـك شـتێك دەخرێتـە یەکێکیانـەوە ئەویـان دادەکـەوێ و، ئـەوی دیکەیـان بـەرز دەبێتـەوە.

٣)- ﴿ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ ٱلسَّاعَةَ قَرِيبٌ ﴾، تۆ چووزانی ڕەنگە (ساعَةَ) نیزیك بێ: (وَأَيُّ شَيْءٍ يُدْرِيكَ وَيُعَلِّمُكَ، لَعَلَّ السَّاعَةَ الَّتِي تَقُومُ فِيهَا الْقِيَامَةُ قَرِيبٌ) چ شتێك تۆی فێر کردووەو شارەزا کردوە، ڕەنگە ئەو کاتەی ڕۆژی قیامەتی تێدا دێ، نیزیك بێ.

وشـەی (السَّـاعَةَ) لێـرەدا دەگونجـێ بـە مانـای کاتی دیارییکـراوی ئاخیـر زەمـان بـێ و، دەشـگونجێ بـە مانـای کاتی دیارییکـراوی هاتنـی قیامـەت و هەسـێنرانەوە بـێ و، دەشـگونجێ بـە مانـای کاتی دیارییکـراوی ڕۆژی دوایـی بـێ بـە هـەردوو قۆناغـی، ئاخیـر زەمـان و زینـدوو کرانـەوەو لێپرسـینەوەوە.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ لَعَلَّ ٱلسَّاعَةَ قَرِيبٌ ﴾، وشـەی (قَرِيـب) بـە نێرینـە (مُذَكَّـر) هاتـوە، هەرچەنـد سـیفەتی (سـاعَةَ)یەو، ئەویـش مێینـە (مؤنث)یـە، بـەڵام مێینـەی مەجازیـی (المؤنـث المجازي)یـەو بـە مانـای کات (وقـت)ە، یـانی: (لَعَـلَّ الوَقْـت المُحَـدَّدَ قَرِيـب)، ڕەنگـە کاتی دانـراو نیزیـك بـێ، (المؤنـث المجازي)یـش، دروسـتە بـە (مذکـر) یـش بـاس بکـرێ، وەك لە سـوورەتی (الأعـراف)دا، خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّ رَحْمَتَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ مِّنَ ٱلْمُحْسِنِينَ ۝٥٦ ﴾، واتـە: بەزەیـی خـوا نیزیکـە لـە چاکەکارانـەوە، لەوێـش بـۆ (رحمـة) نەیفەرمـووە: (قَرِيبـةٌ)، چونکـە (رَحْمَـة) مێینـەی مەجازییـە نـەك ڕاسـتەقینە (حقیقـي).

٤)- ﴿ يَسْتَعْجِلُ بِهَا ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِهَا ﴾، ئەوانە پەلە لە هاتنی کاتەکە **(السّاعَةَ)** دەکەن، کە بڕوایان پێی نیە، دەڵێن: بازوو بێ.

٥)- ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مُشْفِقُونَ مِنْهَا ﴾، بەڵام ئەوانەی بڕوایان هێناوە، ترس و بیمیان لێی هەیە، **(أَشْفَقَ مِنْهَا، أي: خَافَ، وَالإِشْفَاقُ: رَجَاءُ وُقُوعِ مَكْرُوهٍ)**، **(إِشْفَاق)**: بریتیە لەوەی ئومێدەواربی خراپەیەك بێ، یانی: بە تەمابی خراپەیەك بێ و ترست لێی هەبێ.

٦)- ﴿ وَيَعْلَمُونَ أَنَّهَا ٱلْحَقُّ ﴾، {ئەوانەی بڕوادان} دەزانن کە کاتەکە **(السّاعَةَ)** {ئەو کاتەی دیارییکراوە بۆ ئاخر زەمان، یاخود بۆ قیامەت، یان بۆ هەردووکیان} چەسپاوەو دێت.

(الحَـقُّ) کـە (أل)ی، ناسـاندنی لەسـەرە **(تَعْرِيْـف الجِنْـسِ، أي: هِـيَ حَـقٌّ كُلّ الحَـقِّ)** چەسـپاوەو، هەمـوو حەڵـەتی چەسـپاویی تێدایـە.

٧)- ﴿ أَلَآ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُمَارُونَ فِى ٱلسَّاعَةِ لَفِى ضَلَٰلٍۭ بَعِيدٍ ﴾، ئەها (ئاگاداربن!) بە دڵنیایی ئەوانەی مشت و مڕ دەکەن لە بارەی کاتەکە **(ساعَةَ)**وە، لە گومڕاییەکی دووردان، **(الْمُمَارَاةُ: مُفَاعَلَة مِنَ المِرْيَة وَهِيَ الشَّكّ، وَالْمُمَارَاة: المُجَادَلَةُ لإِدْخَال الشَّكّ عَلَى المُجادِل)** **(مُمَارَاة)**: لەسەر کێشی **(مُفَاعلة)**یەو لە **(مِرْيَة)**یەوە هاتوە، **(مِرْيَة)**ش یانی: دوودڵیی، ئنجا **(مُمَارَاة)** واتە: شەڕە قسەکردن بۆ ئەوەی دوودڵیی بخەیە نێو دڵی بەرانبەرەکەتەوەو بیخەیە گومانەوە، دوو دڵی بکەی، لەبارەی ئەو قەناعەتەیەوە کە هەیەتی.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ ٱلسَّاعَةَ قَرِيبٌ ﴾، دەڵـێ: **(مـا: اسْـتِفْهامِيَّةٌ والإِسْـتِفْهامُ مُسْـتَعْمَلٌ فِي التَّنْبِيـهِ والتَّهْيِئَـةِ)** (مَـا) بـۆ پرسـیار کردنـەو ئەویـش لێـرەدا لـە ئاگادارکردنـەوەو ئامادەکـردن دا بەکارهاتـوە. ﴿ وَمَا يُدْرِيكَ ﴾، تـۆ چـووزانی، **(يُدْرِيـكَ: مِـنَ الدِّرَايَـةِ بِمَعْنَـى العِلْـمِ)**، **(يدريـك)** لـە **(دِرَايَة)**یـە، بـە مانـای زانیاریـی، یـانی: چ شـتێك وایکـردوە تـۆ بـزانی کـە هاتنـی کاتەکـە (السَّـاعَةَ)، ئـەو کاتـەی کـە دنیا بـە کۆتـا دێ، یاخـود ئـەو کاتـەی کـە خەڵـکی تێـدا هەڵدەسـتێنرێتەوە، نیزیکـە؟!

مەبەستیش لەو تەعبیرە گەورەو گرنگ پێشاندانی بابەتەکەیە، کە هێندە مەزنە، مەگەر خوای زانا و شارەزا پێت بزانێنی ئەگەرنا نایزانی و دەرکی ناکەی!

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسی سێیەمەش لە شەش (٦) ئایەت پێکدێ، ئایەتەکانی: (١٩ - ٢٤)، لەم شەش ئایەتەدا، خوا باسی چەند بابەتێکی جۆراو جۆری کردوە:

١- لوتف و چاکەکاریی خوا بەرانبەر بە بەندەکانی.

٢- دوارۆژ ویستان و دنیا ویستان، سەرەنجامی جۆراو جۆری هەر کامیان.

٣- ڕەخنە لێ گرتنی ئایین و بەرنامەدانان بەبێ مۆڵەتی خواو، بە شیرك دانانی.

٤- سەرەنجامی دژوارو سامناکی هاوبەشدانەرانی ستەمکارو، شادمانیی و بەختەوەریی بڕوادارانی چاکەکار لە ڕۆژی دواییدا.

٥- ئەوە کە پێغەمبەری خوا موحەممەد ﷺ جگە لە خۆشویستنی لە خوا نیزیك خستنەوەیان، هیچ پاداشتێکی دیکەی لە خەڵك چاوەڕێ نەکردوەو ناکات.

٦- پووچەڵکردنەوەی تۆمەتی هەڵبەسترانی قورئان لە لایەن موحەممەدەوە ﷺ.

﴿ٱللَّهُ لَطِيفُۢ بِعِبَادِهِۦ يَرۡزُقُ مَن يَشَآءُۖ وَهُوَ ٱلۡقَوِيُّ ٱلۡعَزِيزُ ﴿١٩﴾ مَن كَانَ يُرِيدُ حَرۡثَ ٱلۡأٓخِرَةِ نَزِدۡ لَهُۥ فِي حَرۡثِهِۦۖ وَمَن كَانَ يُرِيدُ حَرۡثَ ٱلدُّنۡيَا نُؤۡتِهِۦ مِنۡهَا وَمَا لَهُۥ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِن نَّصِيبٍ ﴿٢٠﴾ أَمۡ لَهُمۡ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمۡ يَأۡذَنۢ بِهِ ٱللَّهُۚ وَلَوۡلَا كَلِمَةُ ٱلۡفَصۡلِ لَقُضِيَ بَيۡنَهُمۡۗ وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٢١﴾ تَرَى ٱلظَّٰلِمِينَ مُشۡفِقِينَ مِمَّا كَسَبُواْ وَهُوَ وَاقِعُۢ بِهِمۡۗ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فِي رَوۡضَاتِ ٱلۡجَنَّاتِۖ لَهُم مَّا يَشَآءُونَ عِندَ رَبِّهِمۡۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَضۡلُ ٱلۡكَبِيرُ ﴿٢٢﴾ ذَٰلِكَ ٱلَّذِي يُبَشِّرُ ٱللَّهُ عِبَادَهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ

وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ ۗ قُل لَّآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا إِلَّا ٱلْمَوَدَّةَ فِى ٱلْقُرْبَىٰ ۗ وَمَن يَقْتَرِفْ حَسَنَةً نَّزِدْ لَهُۥ فِيهَا حُسْنًا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ شَكُورٌ ﴿٢٣﴾ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا ۖ فَإِن يَشَإِ ٱللَّهُ يَخْتِمْ عَلَىٰ قَلْبِكَ ۗ وَيَمْحُ ٱللَّهُ ٱلْبَـٰطِلَ وَيُحِقُّ ٱلْحَقَّ بِكَلِمَـٰتِهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٢٤﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{خوا لوتفی هەیە بۆ بەندەکانی (پەنهانکارو میهرەبانە لەگەڵیان)، بژیو بە هەر کەس دەدا کە بیەوێ و، بەس ئەو بەهێزی زاڵە ﴿١٩﴾ هەر کەس کشتوکاڵ (و بەرهەمی) مەنزڵگای کۆتایی بوێ، لە بەرهەمەکەیدا بۆی زێدە دەکەین و، هەر کەسیش کشتوکاڵ (و بەرهەمی) دنیای بوێ، بەشی دەدەین لێی و، لە مەنزڵگای کۆتایی دا پشك و بەشی نابێ ﴿٢٠﴾ یان ئایا هاوبەشانێکیان هەن بەرنامەیەکیان لە ئایین بۆ داناون، کە خوا ڕێی پێنەداوە؟ ئەگەر لەبەر وشە (بڕیار)ی لێك جیاکردنەوە نەبووایە (کە خوا بۆ ڕۆژی دوایی هەڵیگرتوە)، دادوەرییان لە نێواندا دەکراو، بێگومان ستەمکارانی (هاوبەش دانەر)یش ئازارێکی بە ئێش و ژانیان هەیە (لە ڕۆژی دواییدا) ﴿٢١﴾ (لە ڕۆژی قیامەتدا) ستەمکارانی بێبڕوا دەبینی ترس و بیمیان لە سزای ئەوە هەیە کە وەدەستیان هێناوە (بە دڵنیایی) ئەو سزایە هەر دەشکەوێتە سەریان، ئەوانەش کە بڕوایان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان کردوون، لە نێو مێرگ و گوڵزاری بەهەشتەکان دان، هەرچی بیانەوێ لە لای پەروەردگاریان هەیانە، ئا ئەوەیە چاکەو بەخششی گەورە ﴿٢٢﴾ (ئەو پاداشتە) ئەوەیە کە خوا موژدەی پێ دەداتە ئەو کەسانەی بڕوایان هێناوەو، کردەوە باشەکانیان کردوون، (ئەی موحەممەد!) بڵێ: (ئەم پەیام گەیاندنە) هیچ کرێیەکتان لەسەری لێ ناخوازم، بێجگە لە خۆشویستن و، حەزکردن لە نیزیککەوتنەوەتان (لە خوا)، هەر کەسێکیش چاکەیەك بکات،

چاكیی بۆی تێیدا زێدە دەكەین، بە دڵنیاییەوە خوا لێبوردەی سوپاسگوزارە ﴿٢٣﴾ یان ئایا دەڵێن: (موحەممەد) درۆی بە خواوە هەڵبەستوە! ئەگەر خوا بیەوێ مۆر بەسەر دڵتەوە دەنێ، (هیچ قورئانت لە دڵ و سینەدا ناهێڵێ)، خواش بە وشەكانی ناهەق دەسڕێتەوەو، هەق دەچەسپێنێ، مسۆگەر ئەو بەنهێنیی سینەكان زانایە ﴿٢٤﴾}.

## شیكردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(لَطِيفٌ): (رَفِيْقٌ بِعِبَادِهِ فِي هِدَايَتِهِمْ، يَعْرِفُ الأُمُورَ الدَّقِيْقَةَ، وَيُعَبَّرُ بِالتُّحَفِ المُتَوَصَّلِ بِهَا إِلَى المَودَّةِ بِاللُّطْفِ)، وشەی (**لَطِيف**): بە پێی زانیاریی من لە زمانی كوردییدا ئێمە واتایەكمان نیە پڕ بە پێستی بێ، بۆیە هەر وشەی (**لُطف**)م بەكارهێناوە، (**لَطِيفٌ بِعِبادِهِ**) یانی: لەگەڵیاندا نەرم و نیان و هێدیی و مەندە لە هیدایەتدانیاندا، هەروەها (**لَطِيف**) ئەو كەسەیە كە ئیش و كارە وردو پەنهانەكان دەزانێ، دیسان ئەو دیارییانەی دەبەخشرێن لە نێو خەڵكدا بەیەكدی، بۆ ئەوەی خۆشەویستییان پێ وەدەست بێ، ئەوانیش وشەی (**لُطف**)یان، بۆ بەكاردێ.

فڵانكەس لوتفی لەگەڵدا كردم، واتە: دیارییەكی پێدام، یان لەگەڵم دا هێدیی و نەرم بوو، وەك گوتم: وشەی (**لَطِيف**): ئەگەر بۆ مانای كوردیی بگوترێ: خاوەن لوتف، باشترە، لەوەی وشەیەكی بۆ داتاشین، یاخود ناچاربین دوو سێ ڕستە بەكاربێنین، ئەوجار ماناكەی بە دەستەوە بدات، یاخود لێی نیزیك بێتەوە.

(حَرْثَ): (**الحَرْثُ: إِلْقَاءُ البَذْرِ فِي الأَرْضِ وَتهيئتُهَا للزَّرْعِ، ويُسَمَّى المَحْرُوثُ حَرْثَاً**) (**حَرْث**): لە ئەسڵدا بریتیە لەوە كە تۆو بوەشێنرێ و زەوییەكە ئامادە بكرێ، بۆ ئەوەی دانەوێڵە، یاخود كشتوكاڵ، یاخود نەمام لەو شوێنەدا بچێنرێ و بنێژرێ، (**مَحْرُوث**)یش یانی: كێڵدراو، بەڵام بە (**حَرْثَ**) تەعبیر دەكرێ.

(شَرَعُواْ ): **(الشَّرْعُ: نَهْجُ الطَّرِيْقِ الوَاضِحِ)** (شرع): بریتیە لە ڕێیەکی ڕۆشن، **(وَشَرَعْتُ لَهُ طَرِيْقَاً)** واتە: ڕێیەکەم بۆ دیارییکرد، بۆم ڕوونکردەوە، **(الشَّرْعُ: مَصْدَرٌ، ثُمَّ جُعِلَ اسْمَاً للطَرِيْقِ النَّهْجِ)** **(شَرْع)**: چاوگە لە ئەصڵدا، دوایی کراوە بە ناو بۆ ڕێیەکی ڕۆشن، کەواتە: وشەی **(شَرْع)**: یانی: ڕێیەکی ڕۆشن، لە ئەصڵدا وشەی **(شَرْع)**یان بەکارهێناوە بۆ کەسێك بەڕێیەك دا دەڕوات کە لەو ڕێیەوە بچێ ئاو بێنێ، لە کانیی و سەرچاوە ئاو بێنێ، شەریعەت و بەرنامەی خواش وەك کانیی و سەرچاوەیەکی زوڵاڵ تەماشا کراوە، کە خەڵك ئاوی حەیاتی لێوە دێنێ، ئاوێکی لێوە دێنێ کە هیدایەتی خوایەو مایەی ژیانی ڕووحە.

(كَلِمَةُ ٱلۡفَصۡلِ): وشەی لێك جیاکردنەوە **(كَلِمَة)**: وشە، بەمانای بڕیارە **(فَصْلِ)** یانی: لێك جیاکردنەوە، **(الفَصْلُ: إِبَانَةُ أَحَدِ الشَّيْئَيْنِ مِنَ الآخَرِ: حَتَّى يَكُونَ بَيْنَهُمَا فُرْجَة)**، **(فَصْل)**: بریتیە لەوەی دوو شتان لێك جیابکەیەوەو کەلێنێکیان بکەوێتێ، ئنجا لەبەر ئەوەی شت ئەگەر لێك جیاکرایەوە، ڕوونترە، بۆیە وشەی **(فَصْلِ)** بە مانای ڕوونکردنەوەش هاتوە.

(مُشۡفِقِينَ ): بە ترس و لەرزە، **(الإِشْفَاقُ: عِنَايَةٌ مُخْتَلِطَةٌ بِخَوْفٍ)** **(إشْفَاق)**: بریتیە لە ئاگا لێبوونێکی ئاوێتە لەگەڵ ترسدا.

( وَاقِعُۢ بِهِمۡ ): دەکەوێتە سەریان، **(الوُقُوعُ: ثُبُوتُ الشَّيءِ وَسُقُوطُهُ)** **(وقوع)**: چەسپانی شتێك و کەوتنی شتێکە **(وَاقِعٌ بِهِمْ)**، یانی: ئەو سزایە هەر دەکەوێتە سەریان و بە ملیان دادێ.

(رَوۡضَاتِ ): کۆی **(رَوْضة)**یە، **(الرَّوْضَةُ وَالرَّوْضُ: مُسْتَنْقَعُ المَاءِ، وَالخُضْرَة)**: بریتیە لە شوێنێك کە ئاو و سەوزایی لێ بێ، بە کوردیی پێی دەڵێن: مێرگ و مێرگوزار، یان گوڵ و گوڵزار.

( ٱلۡفَضۡلُ): **(الفَضْلُ: الزِّيَادَةُ عَنِ الإِقْتِصَاد، وَكُلُّ عَطِيَّةٍ لاَ يَلْزَمُ مَنْ يُعْطِي)**، **(فَضْل)**: بە دوو واتایان هاتوە:

**١-** بە مانای زیادە لە میانجیی، کە لە حاڵەتی میانجیی تێپەڕێ.

**٢-** بەمانای هەر بەخششێکیش هاتوە کە ئەو کەسەی دەیبەخشێ، پابەند نەبێ بیبەخشێ، دەگوترێ: لە فەزڵ و لە چاکەی خۆیەوەیەو دەیتوانی نەیداتێ.

(ٱلۡمَوَدَّةَ فِي ٱلۡقُرۡبَىٰ): خۆشویستن لە نزیکییدا، خۆشویستنی نزیکیی (**الـوُدُّ: مَحَبَّةُ الـشَّيءِ، وَتَمَنِّـي كَوْنِـهِ، القُرْبَـةُ وَالقَرَابَـةُ: مَـا يُتَقَـرَّبُ بـهِ إلى اللـه**)، (**وُدّ**) بە مانای خۆشویستنی شتێکە لەگەڵ خۆزگە پێخواستنی، (**قُـرْبَى**) بە مانای (**قُرْبَـة وَقَرَابَـة**) ش، دێت، هەر شتێك كە پێی لە خوا نیزیك دەبیەوە، وەك (**المعجم الوسيط**) لە وشەی (**قربـة**)دا، هێناویەتی، کەواتە: (ٱلۡمَوَدَّةَ فِي ٱلۡقُرۡبَىٰ): یانی: خۆشویستنم بۆ نیزیك خستنەوەتان لە خوای بێ وێنە.

(يَقۡتَرِفۡ): (**أَصْـلُ القَـرْفِ والإقْـتِرَافِ: قَـشْرُ اللِّحَـاءِ عَـنِ الشَّـجَرِ، وَاسَـتُعِيرَ للإكتِسَـابِ**)، وشەی (**قَـرْفُ وَإقْـتِرَاف**) لە ئەصڵدا بە مانای توێکڵ لێکردنەوەی درەختە (توێکڵەکەی لێبکەیەوە) دوایی خوازراوەتەوە بۆ هەر کردەوەیەك كە مرۆڤ وەدەستی بێنێ.

(يَخۡتِمۡ): (**يَخـتِـمْ عَـلَى قَلْبِـكَ**)، واتە: مۆر بەسەر دڵتەوەبنێ، (**يَخْتِـمُ: يَطْبَـعُ، وَهُـوَ تَأْثِـيْرُ الـشَّيءِ كَنَقْـشِ الخَاتَـمِ وَالطَّابِـع**)، کاریگەریی شتێك لەسەر شتێك، شوێنکەی شتێك لەسەر شتێك، وەك: ئەنگوستیلەیەك و مۆرێك كە بەسەر شتێکەوە دەنرێ، شوێنەکەی لێ بەجێدەهێڵێ.

(وَيَمۡحُ): (**الـمَحْو: إزَالَةُ الأَثَرِ**)، (**مَحو**): لابردنی شوێنەواری شتێکە، سڕینەوە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خـوای پـەروەردگار لـەم شەشـە ئایەتـەدا، وەك لـە پێناسـەکەیدا گوتمـان، کۆمەڵـێ بابــەتی جــۆراو جــۆر دەخاتــە ڕوو، کــە هەموویــان لــە ســیاقی وتوێژکردنــن لەگــەڵ بێبڕوایانـداو، بانگکردنیانــە بـۆ تەنیـا خـوا پەرسـتیی و، بـۆ شـوێنکەوتنی دوا پەیامـی خـواو، شـوێن پـێ هەڵگرتنـی دوا ڕەوانەکـراو و پێغەمبـەری خـوا کـە موحەممـەدە ﷺ.

سـەرەتا خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ اللَّهُ لَطِيفٌ بِعِبَادِهِ ﴾ خـوا خـاوەن لوتفـە بەرانبـەر بــە بەنــدەکانی، واتــە: لەگەڵیــان میهرەبانــە، چاکــەکاری پەنهانــکارە، بــێ ئــەوەی خۆیـان هەسـت پێبکـەن، خـوا مشـووریان لـێ دەخـوا، ئـاگای لێیانـە، بژیویـان دەدا، بــە شـێوەیەك کــە خۆیــان فیکـری پێناکــەن، ﴿ يَرْزُقُ مَن يَشَاءُ ﴾ هــەر کەسـێکی بیـەوێ بژیـوی دەدات، ئنجـا کـەم یـان زۆر، بێگومـان خـوا بژیـوی هەمـوو کـەس بگـرە هەمـوو ژیاندارێـك دەدات، چونکە خـوا دەفەرمـوێ:﴿ وَمَا مِن دَابَّةٍ فِي الْأَرْضِ إِلَّا عَلَى اللَّهِ رِزْقُهَا ﴿٦﴾ ﴾هـود، هیـچ پیڕۆیـەك، هیـچ ژیاندارێـك لەسـەر زەوی نیـە مەگـەر بژیـوی لەسـەر خوایـە، خـوا بژیـوی هەموویـان دەدات، بـەڵام هەیـە کەمـی پـێ دەدات و، هەیـە زۆری دەداتـێ، هەروەهـا هـی وایـە لـە کاتێکـدا بـۆی فـراوان دەکات و لـە کاتێکـدا لێـی تەنـگ دەکاتـەوە، تاقییـان دەکاتـەوە بزانـێ کاتێـك بژیویان بـۆ زۆر و فـراوان دەکات هەڵوێسـتیان چۆنـە؟ شـوکرانەبژێرن، یاخـود پێـی بوغـڕاو لەخۆبایـی دەبـن؟ هەروەهـا کاتێـك بژیویـان لـێ تەنـگ دەکات، ئایـا خۆڕاگـرن، یاخـود ناشـوکریی دەکـەن و سـکاڵا دەردەبـڕن؟ ﴿ وَهُوَ الْقَوِيُّ الْعَزِيزُ ﴾ خـوا زۆر بەهێـزەو، زۆریـش زاڵـەو باڵادەسـتە.

﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ الْآخِرَةِ نَزِدْ لَهُ فِي حَرْثِهِ ﴾ هـەر کەسێك (بەرهـەم و) کشــتوکاڵی ڕۆژی دوایــی بــوێ، ئێمــە لــەو (بەرهــەم و) کشــتوکاڵە بــۆی زیــاد دەکەیـن، وشـەی (حَـرْث) بـە مانـای کشـتوکاڵ دێ، لـە ئەسـڵدا (حَـرْث) یـانی: زەوی

کێڵان، بۆ ئەوە مرۆڤ دانەوێڵەی لێ بکات، کشتوکاڵی لێبکات، یاخود نەمامی لێ بنێژێ، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی بەرهەمە، واتە: هەر کەسێك بەرهەمی ڕۆژی دوایی بوێ، ئێمە لەو بەرهەمەیدا بۆی زیاد دەکەین، چونکە بەرهەمەکەی بوێ، مانای وایە هەوڵیشی بۆ دەدا، ﴿ نَزِدْ لَهُۥ فِى حَرْثِهِۦ ﴾ لە بەرهەمەکەیدا بۆی زیاد دەکەین، یەك بە دە (١٠)، وەك دەفەرموێ: ﴿ مَن جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشْرُ أَمْثَالِهَا ﴿١٦٠﴾ ﴾الأنعام، واتە: هەر کەسێك چاکە بێنێ، دە (١٠) بەرانبەری بۆ هەیە، بەڵکو لە سوورەتی (البقرة)دا، خوای بەخشەر یەك بە حەوتسەد (٧٠٠)و زیاتریش باس دەکات: ﴿ مَّثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنۢبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِى كُلِّ سُنۢبُلَةٍ مِّا۟ئَةُ حَبَّةٍ ۗ وَٱللَّهُ يُضَٰعِفُ لِمَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٦١﴾ ﴾، واتە: وێنەی ئەوانەی لە ڕێی خوادا ماڵی خۆیان دەبەخشن، وەك دەنکە گەنمێك وایە، حەوت دەنکە گوڵان دەردەکات، هەر گوڵەی سەد (١٠٠) دەنکی تێدایە، خوا چەند بەرانبەر دەکات، بۆ هەر کەسێك بیەوێ {یەك بە حەوتسەدیش زیاتر} خوا فراوانی زانایە.

خوا هەموو سیفەتەکانی فراوانن، بێ سنوورن و زاناشە، دەزانێ هەر کەسە، چەندەی پاداشت دەداتەوە، بە پێی ئەو نیەتە ساغ و ئەو پاڵنەرو هاندەرە چاکەی وای لێکردوە، ئەو کردەوە باشە بکات، ئنجا ماڵ بەخشینە، یان هەر شتێکی دیکەیە.

﴿ وَمَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ ٱلدُّنْيَا ﴾ هەر کەسێك (بەرهەم و) کشتوکاڵی دنیای بوێ، دەستکەوتی دنیای بوێ، ﴿ نُؤْتِهِۦ مِنْهَا ﴾، لەوەی دەیەوێ، پێی دەدەین، بەشێکی پێدەدەین (ئەوەندەی بمانەوێ)، ﴿ وَمَا لَهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِن نَّصِيبٍ ﴾، بەڵام لە مەنزڵگای کۆتاییدا هیچ پشك و بەشی نیە.

خوا دەفەرموێ: ئەوەی تەنیا مەبەستی دنیابێ، لە دنیادا بەشی دەدەین، بەڵام لە دوارۆژدا بێ بەشە، بەڵام ئەوەی مەبەستی ڕۆژی دوایی بێ، بۆی زیاد

دەکەین، پاداشتەکەی بۆ زیاد دەکەین، باسی دنیای نەکردوە، بڵێ: دنیاشی پێدەدەین، وەك دوایی فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ دێنین لەوبارەوە، لە مەسەلە گرنگەکاندا، ئەوانەی دوارۆژ ویستن، ئەوانەی خواپەرستن و، مەنزڵگای دوای ڕۆژیان کردوە بە ئامانج، شتێك نیە کە خوا لە پەنای ڕۆژی دوایی، لە پەنای بەهەشت دا باسی دنیایان بۆ بکات، بۆیە باسی نەکردوە، ئەگەرنا بە تەئکید کەسێك ڕۆژی دوایی بوێ، خوا لە دنیاشدا بێ بەشی ناکات و، دنیاشی دێتە بەردەست.

ئنجا دێتە سەر بابەتێکی دی، کە ئەم بابەتانە وەك ئاڵقەکانی زنجیر پێکەوە پەیوەستن، چونکە ئەوانەی دنیایان دەوێ، کێن؟ ئەوانەن کە لەسەر ڕێبازی کوفرو شیریك دەڕۆن، ئەدی ئەوانەی ڕۆژی دوایی دەکەنە ئامانج، کێن؟ ئەوانەن کە خواپەرستن و دەزانن خوا ئێرەی داناوە بۆ تاقیکردنەوە، شوێنێکی دیکە هەیە بۆ وەرگرتنەوەی ئەنجامی کردەوەکان، دەفەرموێ: ﴿ أَمْ لَهُمْ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ ﴾، یان ئایا ئەوانە هاوبەشانێکیان هەن، شتێکیان بۆ لە دین دا داناون، کە خوا مۆڵەتی لەسەر نیە، ئایینێکیان بۆ داناون و پێشانداون و بۆ ڕوونکردوونەوە، ﴿ مَا لَمْ يَأْذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ ﴾، شتێکی وا کە خوا مۆڵەتی لەسەر نیە، ﴿ وَلَوْلَا كَلِمَةُ ٱلْفَصْلِ لَقُضِىَ بَيْنَهُمْ ﴾، ئەگەر وشەی هەڵاواردنیش نەبووایە، واتە: بڕیاری هەڵاواردن، کە خوا خستوویەتە ڕۆژی دواییەوە، ﴿ لَقُضِىَ بَيْنَهُمْ ﴾ دادوەرییان لە نێوان دا دەکرا، واتە: چونکە کەسانێکیان داناوە، ئایینیان بۆ دابنێن و حەڵاڵ و حەڕامیان بۆ دابنێن و بەرنامەی ژیانیان بۆ دابنێن، خوا لەسەر ئەوە دادوەریی لەبەیندا دەکردن، بەڵام بڕیاری داوە، لێپرسینەوە سزاو پاداشت هەڵدەگرێ بۆ قۆناغێکی دیکە، کە ڕۆژی دواییە، لەبەر ئەوە، ئەگەرنا خوا پەلەی دەکرد، ئەوەندە ڕقی لێیان هەڵساوە، لەسەر ئەوەی کەسانێك دەکەنە پەرستراوی خۆیان و بەرنامەیان بۆ دادەنێنن، حەڵاڵ و حەڕامیان بۆ دیاریی دەکەن و، شێوەی ژیانیان بۆ دیاریی دەکەن، ﴿ وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾، بە دڵنیایی ستەمکارانیش ئازارێکی بە ئێشیان هەیە، ئەو ستەمکارانەی،

جگـە لـە خـوا دەکەنـە پەرسـتراوی خۆیـان و دەیکەنـە هاوبـەشی خـوا، لـە دانـانی حـەڵاڵ و حەرامـدا، ئەوانـە سـزاو ئازارێـکی بـە ئێشـیان هەیـە.

لـە ڕاسـتییدا دانـانی بەرنامـە بـۆ خەڵـك، کاری خوایـە، هـەر خـوا مـافی هەیـە بفەرمـوێ: خەڵکینـە! ئـاوا بکـەن و ئـاوا مەکـەن، ئـەوە حەڵاڵـەو ئـەوە حەرامـە، ئـەوە چاکـەو ئـەو خراپـە، ئـەوە ڕاسـتەو ئـەوە چەوتـە، بـەڵام کەسـێکی دیکـە ئـەو کارە بـکات و بڵـێ: خەڵکینـە! فـڵان شـتەم قەدەغـە کـرد و، فـڵان شتەشـم ڕێگـە پێـدا، بـۆ وێنـە: زینـا ڕەوایـە، مـادام بـە ئارەزوومەندیـی نێـرو مێیەکەبـێ، لێپرسـینەوەی لەسـەر نیـە، لـە ڕۆژئـاوا وایـە، هەندێـك لـە عەلمانییـەکانی ئێـرەش دەیانـەوێ لێـرەش وای لێبـێ، نێربازیـی ڕەوایـە، ڕیبـاو سـوود ڕەوایـە، شـەڕابخۆریی ڕەوایـە، قومارکـردن ڕەوایـە، بێگومـان هـەر کەسـێك ئـەو شـتانە ڕەوا بـکات، کـە خـوا قەدەغـەی کـردوون، خـۆی لـە خەڵـك کردۆتـە پەرسـتراوو، ئـا ئـەوە هاوبـەش دانانـە بـۆ خـوا.

کەواتـە: دەبـێ خەڵـك بزانـێ، هـەر پەرلەمانێـك، حکوومەتێـك، دەسـتەڵاتێك، دەسـتکاریی حـەڵاڵ و حەرامـەکانی خـوا بـکات، لـە نێـو میللەتێـکی مسـوڵمان دا، مانـای وایـە خـۆی لـەو خەڵکـە مسـوڵمانە کردۆتـە پەرسـتراوو، ئەگـەر ئـەو خەڵکـەش بێدەنـگ بـێ لـە بەرانبەریـداو، پشـتگیریی بـکات و، دەنگـی پێبـداو لەگەڵـی دابـێ، ئـەوە بـۆی بـە هاوبـەش بـۆ خوادانـان لـە قەڵـەم دەدرێ، ئنجـا خـوای دادگـەر لەوبـارەوە فەرموویـەتی:

﴿ أَمْ لَهُمْ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ ﴾ ئایـا هاوبەشـانێکیان هـەن، شـتێکیان بـۆ لـە دیـن دانـاون، کـە خـوا مۆڵـەتی لەسـەر نیـە.

بـۆ وێنـە: خـوا مۆڵـەتی لەسـەر نیـە زینـا ڕەوا بکـرێ، بـا ناویـشی لێبـنرێ: لەشفرۆشـیی، دەڵێـن: ئـەو ئافرەتـە لـەشی خـۆی فرۆشـتوە، یـانی: ئەگـەر نەیفرۆشـێ و پـارە وەرنەگـرێ، قەیـدێ نـاکات!! هەروەهـا ئـەو شـتانەی خـوا پێویسـتی کـردوون، ئـەو بـێ قەدەغەیـان بـکات، ئافـرەت پێویسـتە خـۆی پۆشـتە بـکات، بڵـێ: نەخێـر،

یان بێنێ توانج و پلاری لێبدات، بۆ ئەوەی بەرگ و پۆشاکی شەرعیی دابنێ، یان پیاو بۆی هەیە زیاتر لە هاوسەرێکی هەبێ، بۆ ئەوەی ئافرەتان زیاتر نەمێننەوە، بە قەیرە کچیی و بە بێوەژنیی و دوایی خراپە بڵاوبێتەوە، کەچی ئەو بڵێ: نەخێر نابێ ببێ، ڕێی زینا دەدەن، بەڵام ڕێی هاوسەرگیریی حەڵاڵ نادەن، هەروەها هەموو ئەو شتانەی دیکە کە خوا ﷻ حەڵاڵی کردوون، کەس بۆی نیە قەدەغەیان بکات و، هەموو ئەو شتانەش کە خوا قەغەی کردوون، کەس بۆی نیە ڕەوایان بکات.

ئنجا خوا باسی سەرەنجامی ئەو هاوبەش بۆ خوادانەرە ستەمکارانە دەکات، دەفەرموێ: ﴿ تَرَى ٱلظَّٰلِمِينَ مُشْفِقِينَ مِمَّا كَسَبُوا۟ ﴾، ستەمکاران دەبینی ترس و لەرزیان هەیە لە (سزای) ئەوەی کردوویانەو وەدەستیان هێناوە، ﴿ وَهُوَ وَاقِعٌۢ بِهِمْ ﴾، ئەو (سزای)ە هەر دەشکەوێتە سەریان، ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴾، بەڵام ئەوانەی بڕوایان هێناوەو، کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداون، ﴿ فِى رَوْضَاتِ ٱلْجَنَّاتِ ﴾، لە نێو مێرگ و مێرگوزارو گوڵ و گوڵزارەکانی بەهەشتەکاندان، ﴿ لَهُم مَّا يَشَآءُونَ عِندَ رَبِّهِمْ ﴾، هەرچی بیانەوێ لەلای پەروەردگاریان هەیانە، هەرچی داوای بکەن، هەرچی دڵیان بیخوازێ، بۆیان دەستەبەر کراوە، ﴿ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَضْلُ ٱلْكَبِيرُ ﴾ ئا ئەوەیە بەخششی گەورە.

﴿ ذَٰلِكَ ٱلَّذِى يُبَشِّرُ ٱللَّهُ عِبَادَهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴾، ئەوەش ئەوەیە کە خوا موژدە دەدات بە ئەو بەندانەی بڕوایان هێناوەو کردەوە باشەکانیان ئەنجامداون، موژدەی ئەو ئەو پاداشتە یان پێ دەدات. ﴿ قُل لَّآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا ﴾ پێیان بڵێ: من هیچ کرێ و پاداشتتان لێ داوا ناکەم، ﴿ إِلَّا ٱلْمَوَدَّةَ فِى ٱلْقُرْبَىٰ ﴾، مەگەر حەز کردنم بێ کە لە خوا نزیك ببنەوە، یانی: ئەگەر شتێکتان لێ چاوەڕوان بکەم، هەر ئەوەیە کە حەزدەکەم لە خوا نیزیك ببنەوە، پێم خۆشە لە خوا نیزیك بن و بەندەی خوابن، بۆ ئەوەی کۆیلەی شتەکان و شەیتانەکان و مرۆڤەکان نەبن، ﴿ وَمَن يَقْتَرِفْ حَسَنَةً نَّزِدْ لَهُۥ فِيهَا حُسْنًا ﴾، هەر کەسێك چاکە

بکات، ئێمە چاکیی لە چاکەکەیدا بۆ زیاد دەکەین، پاداشتی چاکتری دەدەینەوە، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ شَكُورٌ﴾ بە دڵنیایی خوا لێبوردەی سوپاسگوزارە.

لە کۆتاییی دا دەفەرمووێ: ﴿أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا﴾ یان ئایا دەڵێن: (موحەممەد) درۆی بە ناوی خواوە هەڵبەستوە؟ ﴿فَإِن يَشَإِ ٱللَّهُ يَخْتِمْ عَلَىٰ قَلْبِكَ﴾ {ئەو قسەیان درۆیە} چونکە ئەگەر خوا بیەوێ مۆر بەسەر دڵتەوە دەنێ، دڵت مۆر دەکات {کە هیچ زانیاریی تێدا نەمێنێ، چ جای درۆ بە ناوی خواوە بڵێی} ﴿وَيَمْحُ ٱللَّهُ ٱلْبَٰطِلَ﴾، خواش باتیڵ و شتی پووچ دەسڕێتەوەو لای دەبات، ئەو قسەیەی ئەوانیش پووچەو، خوا بەو بەڵگەیە لای دەبات، ﴿وَيُحِقُّ ٱلْحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦٓ﴾، (خوا) هەقیش دەچەسپێنێ بە وشەکانی خۆی، ﴿إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾، بە دڵنیایی ئەو بەنهێنیی سینەکان ئاگادارە، ئەو نهێنییانەی کە لە دڵ و سینەکاندا هێندە نیشتەجێن، وەك بووبنە هاوەڵ و خاوەنی ئەو سینانە، خوا بەو نهێنییانە ئاگادارەو، دەزانێ دڵی تۆ چی تێدایە، ئنجا ئەگەر شتێکی خراپت لە دڵدا هەبێ، خوا دڵت مۆر دەکات، و لێت قبووڵ ناکات، وەك لە سوورەتی (الحاقة)دا، دەفەرمووێ: ﴿وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ ٱلْأَقَاوِيلِ ﴿٤٤﴾ لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِٱلْيَمِينِ ﴿٤٥﴾ ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ ٱلْوَتِينَ ﴿٤٦﴾ فَمَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَٰجِزِينَ ﴿٤٧﴾﴾، واتە: ئەگەر هەندێك قسەی بە ناوی ئێمەوە کردبانایە، دەستی ڕاستیمان دەگرت، دوایی لە ڕەگی ملیمان دەداو، هیچ کام لە ئێوەش نەتاندەتوانی بەرگریی لێبکەن!

خوا ئاوا هەڕەشە دەکات، کە پێغەمبەر ﷺ چۆن دەتوانێ بە ناوی خواوە شتێك بفەرمووێ، خوا مۆڵەتی لەسەر نەبێ، نە پێغەمبەری خوا ﷺ لە خۆی دەوەشێنێتەوە، نە خوا ﷻ کەسێك دەکاتە پێغەمبەر ﷺ کە بەو شێوەیە مامەڵە لەگەڵ خوای بەرزی مەزندا بکات.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**خـوا ﷻ خـاوەن لوتـف و مهرەبانـە بـە بەنـدەکانی و، بژیـو دەریانـەو، بەهێـزو زاڵـە، هـەر کەسـێکیش بـۆ دوا ڕۆژ کـردو کـۆش بـکات، خـوا بـۆی زێـدە دەکات، بـەڵام ئـەوەی تەنیـا بـۆ دنیـا هەوڵبـدات، پشـکی خـۆی لـە دنیـادا پێدەبـڕێ، بـەڵام لـە دوارۆژدا بـێ بەشـە:**

خـوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ لَطِيفُۢ بِعِبَادِهِۦ يَرْزُقُ مَن يَشَآءُ ۖ وَهُوَ ٱلْقَوِىُّ ٱلْعَزِيزُ ۝١٩ مَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ ٱلْـَٔاخِرَةِ نَزِدْ لَهُۥ فِى حَرْثِهِۦ ۖ وَمَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ ٱلدُّنْيَا نُؤْتِهِۦ مِنْهَا وَمَا لَهُۥ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ مِن نَّصِيبٍ ۝٢٠ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿ ٱللَّهُ لَطِيفُۢ بِعِبَادِهِۦ ﴾، خوا بەرانبەر بەبەندەکانی بەلوتف (**لَطِيْف**)ە. وشەی (**لَطِيْف**)م، هەر بە: بەلوتف، خاوەن لوتف، مانا کردوە، چونکە وشەی (**لَطِيْف**) یان بە چەند واتایەك لێکداوەتەوە، بۆ وێنە:

**یەك:** (**لَطِيْفٌ بِهِمْ، أي: بَالِغُ الرَّأْفَةِ بِهِمْ**) زۆر بەپەرۆشە بەرانبەریان.

**دوو:** (**بَارٌّ بِهِمْ**) زۆر چاکەکارە لەگەڵیان.

**سێ:** (**رَفِيْقٌ بِهِمْ**) زۆر نەرم و نیانە لە گەڵیان.

**چوار:** (**حَفِيٌّ بِهِمْ**) زۆر گرنگییدەرە پێیان.

کەواتـە: وشـەی (**لَطِیْـف**) هـەر لـە زمـانی عەرەبییشـدا وشـەیەکمان نیـە تەعبیـر بـکات لـە واتایەکـەی، چ جـای لـە زمـانی کوردییـدا، کـە زمـانی عەرەبیـی زۆر لـە زمـانی کوردیـی دەوڵەمەندتـرە.

کەواتـە: (**لَطِیْـف**) واتـە: خـاوەن لوتـف، (**لُطْف**)یـش، دەچێتـەوە نێـو مانـاکانی میهرەبانیـی، بـە بەزەیـی، چاکەکاریـی، پەنهانکاریـی خـوا ﷻ خـاوەنی لوتفـە بەرانبـەر بـە بەنـدەکانی.

٢)- ﴿ يَرۡزُقُ مَن يَشَآءُ ﴾، هەر کەسێك بیەوێ بژیوی دەدا، وشەی (**رِزْق**) پێشتر مانامان کرد، بژیو، هەرشتێکە مرۆڤ پێویستیی پێیەتی بۆ ژیانی دنیای.

کەواتـە: (رزق) تەنیـا خـواردن و خواردنـەوە ناگرێتـەوە، بەڵکـو بـەرگ و پۆشـاك دەگرێتـەوە، مـاڵ و سـامان دەگرێتـەوە، کـەل و پەلـەکانی دیکـە دەگرێتـەوە، جێگـەو ڕێگـە دەگرێتـەوە، ئـەوە لـە ڕووە ماددییەکەیـەوە، لـە ڕووە مەعنەوییەکەشـیەوە دیسـان تاعـەت و، زانیاریـی و، تەقـواو، ڕەوشـتی بـەرزو، ئەنجامـدانی ئەرکـە شـەرعییەکان، هەمـوو ئەوانـە دەگرێتـەوە، یـەك بـە یەکێـك دەڵـێ: (**رَزَقَنِـيَ اللـهُ هَـذَا العَـامِ الحَـجَّ**) خـوا ئەمسـاڵ حەجـی پێـدام، حەجـی کـردە بژیـوم، واتـە: بژیـوی مەعنەویـی، یـان دەگوتـرێ: (**رَزَقَـهُ اللـهُ العِلْـمَ**) خـوا زانیاریـی بـە فلانکـەس دا، یـان دەگوتـرێ: (**رَزَقَـهُ اللـهُ الحِكْمَـة**) خـوا حیکمـەتی پێـدا، یـان: (**رَزَقَـهُ اللـهُ خُلُقَـاً حَسَـنَاً**) خـوا ڕەوشـتێکی جـوانی کردۆتـە بژیـوی، پێیـداوە.

کەواتـە: کـە دەفەرمـوێ: ﴿ يَرۡزُقُ مَن يَشَآءُ ﴾، بژیـو بەهـەر کەسـێك دەدا، بیـەوێ، مەبەسـت ئەوەیـە خـوا بـە ویسـتی ڕەهـای خـۆی، لـە بـواری بژیـو پێـدان دا، مامەڵـە لـە گـەڵ بەندەکانیـدا دەکات، لـە ڕاستییدا بـەس خوایـە بژیـوی هەمـوو کـەس دەدا، بـەڵام هـەر کەسـە بـە ئەنـدازەی خـۆی، وەك لـە سـوورەتی (هـود)دا، خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَا مِن دَآبَّةٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ رِزۡقُهَا ﴿٦﴾ ﴾هـود، واتـە: هیـچ پێڕۆیـەك نیـە لەسـەر زەوی، هیـچ ژیاندارێـك لەسـەر زەوی نیـە، مەگـەر بژیـوی

لەسـەر خوایـە، نـەك هـەر هـی مرۆڤـەكان، بـە هـی ژیاندارانیـش، بەتێكـڕا، بـەڵام هـەر كەسـە و هـەر ژیانـدارە بـە پێـی خـۆی، بـە گوێـرەی سیسـتمێك خـوا بژیـوی دەدا، هـەر زینـدەوەرەو هـەر ژیانـدارە، بـە جۆرێـك، لـەو بـارەوەش پێشـتر كورتـە باسـێكمان كـرد، ئـەوەش بـەو واتایـە نیـە كـە مـادام بژیـو لەسـەر خوایـە، كەواتـە ئینسـان پاڵداتـەوەو هەڵخـزێ، كـردو كـۆش و هەوڵـدان بـە خـەرج نـەدات، بەڵكـو خـوا لـە میـانی هەوڵـدانی مرۆڤەكانـدا، لـە میـانی كارو كاسـبیی و گـەڕان و سـووڕانانیان دا بژیویـان دەدا، ئەگـەر كـەم ئەگـەر زۆر.

٣)- ﴿ وَهُوَ ٱلْقَوِىُّ ٱلْعَزِيزُ ﴾، هەر ئەویش (خوا ﷻ) بەهێزەو زاڵ و باڵادەستە، كەواتە: خوا لوتفەكەی لە شوێنی خۆیدا بەكاردێنێ، هێزو باڵادەستییەكەشی لە جێی خۆیدا بەكاردێنێ، بەدڵنیاییش خوا ﷻ خاوەنی هەموو سیفەتە بەرزو پەسندەكانە، چ ئەوانەی كە ئێمە دەیانزانین، چ ئەوانەی ئێمە نایانزانین، ئەوانەی ئێمە دەیانزانین، ئەوانەن زیاتر پەیوەستن بە ژیانی ئێمەوە، بە گرنگیی پێدانی ئێمەوە هەیە، بەڵام بێگومان سیفەتەكانی خوا، بەس ئەوەندە نین كە ئێمە دەیانزانین، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەریشدا ﷺ هاتوە: {**اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ بِكُلِّ اسْمٍ هُوَ لَكَ سَمَّيْتَ بِهِ نَفْسَكَ، أَوْ أَنْزَلْتَهُ فِي كِتَابِكَ، أَوْ عَلَّمْتَهُ أَحَدًا مِنْ خَلْقِكَ، أَوِ اسْتَأْثَرْتَ بِهِ فِي عِلْمِ الْغَيْبِ عِنْدَكَ**} **(أخرجه ابن حبان: ٩٧٢، قال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح).**

واتـە: ئـەی خوایـە! داوات لێدەكـەم، بـە هـەر ناوێكـت كـە كردووتە ناوی خـۆت، یان لـە كتێبەكەتـدا داتبەزانـدوە، یاخـود فێـری یەكێـك لـە دروسـتكراوەكانی خۆتـت كـردوە، یاخـود لـە لای خـۆت هێشـتووتەوە لـە زانیاریـی پەنهانتـدا (بـەس خۆت دەیـزانی).

بـەڵام بێگومـان خـوا ﷻ هـەر كەسـە بەپێـی ئـەوە كـە شایسـتەی بـێ، بـە سـیفەتەكانی لـە گەڵیـدا مامەڵـە دەكات.

٤)- ﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ ٱلْأَخِرَةِ ﴾، هەر كەسێك بەرهەم و كشتوكاڵی كۆتایی بوێ، (**الحَرْثُ: إِلْقَاءُ البَذْرِ فِي الأَرْضِ**): (**حرث**): بریتیە لە تۆو وەشاندن، لە زەوییدا. (**حَرَثَ**

**الأَرْضَ، يَحْرِثُهَا**) واتە: زەوییەکەی کێڵا، دەیکێڵێ یان تۆوی تێدا وەشاند، دەیوەشێنێ، بەڵام لێرەدا: (**احَترثَ يَحْتَرِثُ أَي: يَكْتَسِبُ، وَأُطْلِقَ الحَرْثُ هُنَا عَلَى ثَمَرَاتِ الأَعْمَالِ وَفَوَائِدِهِ، أَي: مَنْ يُرِيْدُ ثَوَابَ الآخِرَةِ**)، (**يحترث**): (**يَكْتَسِب**)، شت بەدەست دێنێ، لێرەدا وشەی (**حَرْث**) بە کارهێنراوە بۆ بەرهەمی کردەوەکان و، سوودی کردەوەکان، واتە: هەرکەس پاداشتی ڕۆژی دوایی دەوێ.

کەواتە: ﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ ٱلْأَخِرَةِ ﴾، یانی: (**مَنْ كَان يُرِيْدُ ثَوَابَ الدُّنْيَا**) هەر کەسێ پاداشتی ڕۆژی دوایی بوێ، یان هەر کەسێك بەرهەمی ڕۆژی دوایی بوێ.

٥)- ﴿ نَزِدْ لَهُۥ فِى حَرْثِهِۦ ﴾، ئێمە لەو بەرهەم و دەستکەوتەیدا (کە بۆ ڕۆژی دوایی مەبەستیەتی پەیدای بکات) بۆی زیاد دەکەین، چونکە خوا لە سوورەتی (الأنعام) دا، دەفەرموێ: ﴿ مَن جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشْرُ أَمْثَالِهَا ﴿١٦٠﴾ ﴾، واتە: هەر کەسێك چاکەیەك بێنێت، دە (١٠) بەرانبەری، دە هێندەی پاداشت دەدرێتەوە، بەڵکو پێشتر گوتمان لە سوورەتی (البقرة)دا، خوا ﷻ وێنەیەك دێنێتەوە، کە ئەوە دەگەیەنێ، خوا یەك بە حەوتسەدیش پاداشت دەداتەوەو زیاتریش.

٦)- ﴿ وَمَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ ٱلدُّنْيَا نُؤْتِهِۦ مِنْهَا ﴾، هەر کەسێکیش کشت وکاڵ و بەرهەمی دنیای بوێ، لەوە پێی دەدەین، بە ئەندازەی ئەوەی خۆی ماندووکردووەو هۆکارەکانی ڕەچاو کردوون، یانی: هەر کەسێك بە کردەوەکانی و بە هەوڵدانەکەی، بەرهەمی دنیای بوێ، دەستکەوتی دنیای بوێ، کە بریتیە لە گوزەرانی دنیا، ئێمە بەو ئەندازەیەی بۆی دیارییکراوە، پێی دەدەین، وەك لە سوورەتی (**الإسراء**)دا، دەفەرموێ: ﴿ مَّن كَانَ يُرِيدُ ٱلْعَاجِلَةَ عَجَّلْنَا لَهُۥ فِيهَا مَا نَشَآءُ لِمَن نُّرِيدُ ﴿١٨﴾ ﴾، واتە: هەر کەسیش ژیانی پەلەی (دنیای) بوێ، بە پەلە بۆی پێش دەخەین، ئەوەندەی کە بمانەوێ، بۆ هەر کەسێك کە مەبەستمان بێ.

٧)- ﴿ وَمَا لَهُۥ فِى ٱلْأَخِرَةِ مِن نَّصِيبٍ ﴾، لە ڕۆژی دواییدا، هیچ پشك و بەشی نیە.

بۆیەش لە ڕۆژی دواییدا بێ بەش دەبێ، چونکە مەبەستی لە کۆشش و کردەوەکانی، بە دەستهێنانی پاداشتی خواو، بەرهەمی ڕۆژی دوایی نەبووە، یانی: هەر کەسێك بۆ دوارۆژ کار نەکات و، لە کردەوەکانی دا مەبەستی نەبێ پاداشتی ڕۆژی دوایی وەدەست بێنێ، بەش و پشکی لەوێ نابێ، وەك شاعیرێك لەو بارەوە دەڵێ:

یا مُؤثِرَ الدُّنیَا عَلَی دِینِهِ وَمُشْتَرٍ دُنْیَاهُ بالآخِرَة

بِعْتَ الَّذِي یَبْقَی بِمَا یَنْقَضِي تَبّاً لَهَا مِنْ صَفْقَة خَاسِرَة

ئەی ئەو کەسەی دنیای بەسەر دینیدا هەڵبژاردوە، دنیای کڕیوە دوارۆژی پێداوە!

شتێکت فرۆشتوە کە دەمێنێتەوە، بە شتێك کە دەبڕێتەوە، هەر لەبەین بچی، چ سەودایەکی زیانبارە!

با لەوبارەوە سێ فەرمایشتی پێغەمبەریش بێنین ﷺ:

**یەکەمیان:** {عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «بَشِّرْ هَذِهِ الْأُمَّةَ بِالسَّنَاءِ وَالرِّفْعَةِ، وَالنَّصْرِ، وَالتَّمْكِينِ فِي الْأَرْضِ، فَمَنْ عَمِلَ مِنْهُمْ عَمَلَ الْآخِرَةِ لِلدُّنْيَا، لَمْ يَكُنْ لَهُ فِي الْآخِرَةِ نَصِيبٌ»} **(أخرجه أحمد: ٢١٢٥٨، وقال الهيثمي (١٠/٢٢٠): رجاله رجال الصحيح، وأخرجه ابن حبان: ٤٠٥، والحاكم: ٧٨٦٢، وقال: صحيح الإسناد).**

واتە: ئوبەی کوڕی کەعب ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: موژدە بدە بەم ئوممەتە بەرۆشنیی و بەرزیی و یارمەتییدران و پێ چەسپێنران لە زەویدا (دەستەڵات) [بە مەرجێك کردەوەیەك کە بۆ ڕۆژی دوایی دەیکەن، مەبەستیان پێی دنیا نەبێ]، بەڵام هەر کەسێکیان کردەوەیەکی ڕۆژی دوایی بکات، بۆ وەدەستهێنانی دنیا، لە ڕۆژی دواییدا هیچ پشك و بەشی نیە.

**دووەمیان:** {عَنْ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «إِنَّمَا الْأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ، وَإِنَّمَا لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى»} **(أخرجه البخاري: ١، ومسلم: ١٩٠٧، وأبو داود: ٢٢٠١).**

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بێگومان کردەوەکان (کردەوە چاکەکان) بە پێی نیازو مەبەستەکانن، بۆ هەر کەسێکیش بەگوێرەی نیازو مەبەستەکەی پاداشتی هەیە.

**سێیەمیان:** {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ، قَالَ: تَلَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: ﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ ٱلْآخِرَةِ نَزِدْ لَهُۥ فِى حَرْثِهِۦ وَمَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ ٱلدُّنْيَا وَمَا لَهُۥ فِى ٱلْآخِرَةِ مِن نَّصِيبٍ ﴾، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: يَقُولُ اللَّهُ ﷻ: ابْنَ آدَمَ! تَفَرَّغْ لِعِبَادَتِي امْلَأْ صَدْرَكَ غِنًى، وَأَسُدَّ فَقْرَكَ، وَإِلَّا تَفْعَلْ، مَلَأْتُ صَدْرَكَ شُغْلًا، وَلَمْ أَسُدَّ فَقْرَكَ} (أخرجه الترمذي: ٢٦٦٦، والحاكم: ج٢، ص٤٤٣، والبيهقي في الشُّعب: ج٧، ص٢٨٩، وَصَحَّحَهُ الألباني في «الصحيحة»: ٣٥٩).

واتە: ئەبوو هورەیرە ، دەڵێ: ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ ئەم ئایەتە موبارەکەی خوێندەوە: ﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ ٱلْآخِرَةِ نَزِدْ لَهُۥ فِى حَرْثِهِۦ وَمَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ ٱلدُّنْيَا وَمَا لَهُۥ فِى ٱلْآخِرَةِ مِن نَّصِيبٍ ﴾، دوایی فەرمووی: خوا ﷻ دەفەرموێ: ئەی ڕۆڵەی ئادەم! بۆ بەندایەتیی من خۆت یەکلابکەوە، سینەت پڕ دەکەم لە بێ نیازیی و، کەلێنی هەژارییشت بۆ دەگرم، بەڵام ئەگەر وانەکەی، سینەت دەکەم پڕەدەکەم لە سەرقاڵیی و، کەلێنی هەژارییشت بۆ ناگرم.

واتە: ئەگەر ئینسان بەڕاستیی نیەتی لێ بێنێ، بەندایەتیی بۆ خوا بکات و بە پێی تواناش دەست بجووڵێنێ و ڕەچاوی هۆکارەکان بکات، خوا ﷻ مشووری لێ دەخوات و سەرپەرشتیی دەکات، هیچ گومانێك لەوە دانیە، بە ئەندازەی ئەوە کە خۆت بۆ خوا یەکلایی دەکەیەوە، خوا سەرپەرشتییت دەکات، بە ئەندازەی ئەوە کە پشت بە خوا دەبەستی، خوا پشتت دەگرێ، بە ئەندازەی ئەوە کە لە خوا چاوەڕوانیی دەکەی، خوا پێت دەدا، بەڵام چاوەڕوانییەکی شێوەی خۆزگە خواستن، نا، بەڵکو ئومێدەوار بوون.

(رجاء) ئومێد، ئەوەیە کە مرۆڤ ئومێدەوار بێ بە ڕەحمەتی خواو، دەستیش بجووڵێنێ، هۆکارەکانیش دەستەبەر بکات بە پێی توانا، بەڵام (أُمْنِيَّة) خۆزگە، ئەوەیە کە ئینسان هەر خۆزگە بخوازێ، بەڵام هۆکارەکان نەگرێتە بەر.

مەسەلەی دووەم:

هەر کەس بەرنامەی ژیان بۆ خەڵك دابنێ، خۆی کردوە بە هاوبەشی خواو، کەسانێکیش بەوە ڕازیبن، بە ستەمکار دادەنرێن، لە ڕۆژی دواییشدا ترس و لەرزیان دەبێ لە کردەوەکانیان، سزاشیان هەر بە سەردێ، بەڵام بڕوادارانی کردار باش، لە بەهەشتدا لە نێو باخ و گوڵزاردان، پێغەمبەریش ﷺ هیچ چاوەڕوانییەکی لە خەڵك نیە، لە بەرانبەر گەیاندنی پەیامی خوادا پێیان، تاکە کرێیەك، پاداشتێك لێیان بخوازێ، بریتیە لە حەزکردنی بە نیزیکییان لە خوا ﷻ:

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ أَمْ لَهُمْ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنۢ بِهِ ٱللَّهُۚ وَلَوْلَا كَلِمَةُ ٱلْفَصْلِ لَقُضِىَ بَيْنَهُمْۗ وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٢١﴾ تَرَى ٱلظَّٰلِمِينَ مُشْفِقِينَ مِمَّا كَسَبُواْ وَهُوَ وَاقِعٌۢ بِهِمْۗ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فِى رَوْضَاتِ ٱلْجَنَّاتِۖ لَهُم مَّا يَشَآءُونَ عِندَ رَبِّهِمْۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَضْلُ ٱلْكَبِيرُ ﴿٢٢﴾ ذَٰلِكَ ٱلَّذِى يُبَشِّرُ ٱللَّهُ عِبَادَهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِۗ قُل لَّآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا إِلَّا ٱلْمَوَدَّةَ فِى ٱلْقُرْبَىٰۗ وَمَن يَقْتَرِفْ حَسَنَةً نَّزِدْ لَهُۥ فِيهَا حُسْنًاۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ شَكُورٌ ﴿٢٣﴾ ﴾.

شیکردنەوەی ئەم سێ ئایەتە، لە سێزدە بڕگەدا:

١)- ﴿ أَمْ لَهُمْ شُرَكَٰٓؤُاْ ﴾، یان ئایا هاوبەشانێکیان هەن، وشەی (أَمْ): هەندێك دەڵێن: بە مانای: بەڵام (بَلْ)ە، یانی: (بَلْ لَهُ شُرَكَاء) هەندێکیش دەڵێن: بە مانای (بَلْ) و، هەمزەی ئیستفهامیشە، یانی: (بَلْ أَلَهُمْ شُرَكَاء) بەڵکو ئایا هاوبەشیان هەن؟ ئنجا (**الإسْتِفْهَام للتَوْبِيخ وَالإنْكَار**) پرسیارکردنەکە لێرەدا بۆ سەرزەنشتکردن و نکووڵیلێکردنە، یانی: نەدەبوو هاوبەشیان هەبن و هاوبەشان بۆ خوا دابنێن، ئەوانەی لە خەیاڵی هەندێك لە مرۆڤەکاندا دەیانهێننە ڕیزی خواو، وەك خوا مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەن، لە شتێك لە شتەکاندا، تایبەتمەندییەك لە تایبەتمەندییەکانی خوادا، وەك:

١- بەشێك لە وەدیهێنانیان پاڵدەدەنە لا.

٢- بەشێك لە پەروەردگارێتیی و بەشێك لە خاوەندارێتییان، پاڵدەنەلا.

٣- یەكێك لە سیفەتەكانی خواو یەكێك لە ناوەكانی خوایان بۆ بەكاربێنن.

٤- بەشێك لە پەرستراوێتیی كە تایبەتە بە خواوە، بۆیان بەكاربێنن، ئەوانە بە هاوبەش بۆ خوا لە قەڵەمدراون لە خەیاڵی ئەو هاوبەش بۆ خوا دانەرانەدا، ئەگەرنا لە واقیعدا خوا هاوبەشی نین.

خوا دەفەرموێ: ئایا هاوبەشیان هەن:

٢)- ﴿ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ ﴾، لە ئایین شتێكیان بۆ داناون، ڕێیەكیان پێشانداون كە خوا مۆڵەتی پێنەداوە؟ (**شَرَعَ الدِّيْن وَشَرَّعَهُ، أي: سَنَّهُ وَبَيَّنَهُ**)[1] وشەی (**شَرَعَ**) بە سیانیی (**ثُلاثِي**)، و (**شَرَّعَ**) بە چواریی (**رُبَاعِي**) هەردووكیان بە مانای (**سَنَّهُ وَبَيَّنَهُ**) ڕێیەكەی داناو ڕوونی كردەوە (**شَرَّعَ الدِّيْن**) یان (**شَرَعَ شَرَعَ الدِّين**) هەردووكیان یانی: بەرنامەو، ئایینی دانا.

﴿مَا لَمْ يَأْذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ ﴾، یانی: (**مَا لَمْ يَأْذَن بِشَرْعِهِ وَتَشْرِيْعِهِ**) شتێك كە خوا ڕێی نەداوە، پێشان بدرێ و دابنرێ، (**الطبري**) دەڵێ: (**مَا لَمْ يُبِحِ اللَّهُ لَهُمْ ابْتِدَاعَهُ**) ئایا بەرنامەیەكیان داناوە كە خوا بۆی ڕەوا نەكردوون، ڕێی پێنەداون دایبهێنن؟!

٣)- ﴿وَلَوْلَا كَلِمَةُ ٱلْفَصْلِ لَقُضِىَ بَيْنَهُمْ ﴾، ئەگەر وشەی لێك جیاكردنەوە نەبووایە، دادوەریی لە نێوانیاندا دەكرا، وشەی لێك جیاكردنەوە (**كَلِمَةُ الفَصْل**) چییە؟ (**هِيَ مَا قَدَّرَهُ اللَّهُ وَأَرَادَهُ مِنْ إِمْهَالِهِمْ. والفَصْلُ: الفَاصِلُ الَّذِي لا تَرَدُّدَ فِيهِ**) (**كَلِمَة الفَصْلُ**): ئەوەیە كە خوا ویستوویەتی مۆڵەتیان بدات، لە دنیادا سزایان نەدا لەسەر كردەوە خراپەكانیان، وشەی (**فَصل**)یش، بریتیە لە هەڵبڕینی شتێك و بڕیار لە سەردانی كە دڵ لە دڵ دانی تێدا نەبێ.

---

(١) المعجم الوسيط: ص٤٧٩.

(الطبري) دەڵێ: (وَلَوْلَا السَّابِقُ مِنَ اللَّهِ فِي أَنَّهُ لَا يُعَجِّلُ لَهُمُ الْعَذَابَ فِي الدُّنْيَا، وَأَنَّهُ مَضَى مِنْ قِيلِهِ إِنَّهُمْ مُؤَخَّرُونَ بِالْعُقُوبَةِ إِلَى قِيَامِ السَّاعَةِ، لَفَرَغَ مِنَ الْحُكْمِ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ، بِتَعْجِيلِهِ الْعَذَابَ لَهُمْ فِي الدُّنْيَا)[1]، واتە: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە خوا پێشتر بڕیاری داوە، کە لە دنیادا سزایان نادات و پێشتر بڕیاری داوە کە سزادانیان دواخراوە هەتا بەرپابوونی قیامەت، لە دادوەریی کردن لە نێوان ئێوەو ئەوان دا، تەواو دەبوو، کە سزایان بۆ پێشبخات لە دنیادا.

بەڵام بە پێی سسیتمێ کە خوا داینـاوە لە ژیانی بەشەردا، دنیا جێی هەوڵدان و کردو کۆشەو، خوا ﷻ دەرفەتی داوە بە مرۆڤەکان چی دەکەن و چۆن دەکەن؟ هیچ لە مپەرو کۆسپی لە بەردەم دا دانەناون، مەگەر عەقڵی خۆیان و شەرعی خوای پەروەردگار، ئەگەرنا هیچ کۆسپ و لەمپەرێکیان لە بەردەمدا نیە، چاکە دەکەن، یاخود خراپە دەکەن، بەڵام لە قۆناغێکی دیکەی ژیاندا، کە ڕۆژی دواییە، لەوێ لەسەر ئەوە کە لە دنیادا کردوویانە، ئەگەر خراپ بوو بێ، سزاو، ئەگەر چاك بووبێ، پاداشت دەدرێنەوە.

٤)- ﴿وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ﴾، بە دڵنیایی ستەمکارانیش ئازارو سزایەکی بە ئێشیان هەیە، (ظَّالِمِيْن) یانی: ئەو کافرو هاوبەش بۆ خوادانەرانەی ستەمیان لە خۆیان کردوە. ئەمە لێرەدا: (إِظْهَارٌ فِي مَقَامِ الإِضْمَار) دەرخستنە لە جێی پەنهانکردن، خوا دەیتوانی بفەرموێ: (وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيْم) چونکە قسە لەسەر ئەوانەیە کە هاوبەشیان بۆ خوا داناوە، بەڵام بە (ظالم)یش ناوزەندیان دەکات، تاکو دەرکەوێ کە ئەوانەی وێڕای هاوبەشدانان، ستەمکاریشن.

٥)- ﴿تَرَى ٱلظَّٰلِمِينَ مُشۡفِقِينَ مِمَّا كَسَبُواْ﴾، تۆ ستەمکاران دەبینی ترس و بیمیان هەیە لە بەر ئەوەی کردوویانە.

لێرەدا مەبەست پێی ڕۆژی دواییە.

---

(١) جامع البيان، ج٢٠، ص٤٩٣.

٦)- ﴿ وَهُوَ وَاقِعٌ بِهِمْ ﴾، ئەوەش کە لێی دەترسێن، هەر دەکەوێتە سەریان، یانی: **(تَرَى يَا مُحَمَّد! الْكَافِرِينَ بِاللَّهِ يَوْمِ الْقِيَامَة، وَجِلِينَ خَائِفِينَ مِنْ عِقَابِ اللَّهِ عَلَى مَا كَسَبُوا فِي الدُّنْيَا مِنْ أَعْمَالِهِمُ الْخَبِيثَة)**، ئەی موحەممەد ﷺ! {یان: ئەی هەر کەسێك کە قورئان دەخوێنێ!} تۆ بێبڕوایان بە خوا لە ڕۆژی هەڵسانەوەدا دەبینی، دڵ بەترس و لەرزن، زۆر هەست بەترس دەکەن، لە سزای خوا، لە سەر ئەو کردەوە پیس و خراپانەی کردوویانن، ئنجا ئایا ترسەکەیان دەبێتە هۆی ئەوەی دەربازبن؟ نەخێر، ﴿ وَهُوَ وَاقِعٌ بِهِمْ ﴾، ئەو سزایەش هەر دەکەوێتە سەریان. **(وَقَعَ عَلَيْه: سَقَطَ عليه)** کەوتە سەری، ئەو سزایە هەر پێیانەوە دەنووسێ، پێیانەوە دەچەسپێ، **(وَهُمْ ذَائِقُوه لَا مَحَالَة)** ئەوان هەر دەشیچێژن، هیچ دەرەتانیان نیە.

ئـەوە بەنسـبەت هاوبـەش بـۆ خـوا دانەرانـەوە کـە خـوا بـە سـتەمکارانیش نـاوزەدی کـردوون، ئنجـا بابزانیـن بـڕواداران سـەرنجامیان چۆنـە؟

٧)- ﴿ وَالَّذِينَ ءَامَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ فِي رَوْضَاتِ الْجَنَّاتِ ﴾، ئەوانەی بڕوایان هێناوە {بە هەموو ئەو شتانەی پێویستە بڕوایان پێ بهێنرێ}و کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداون، بە عەقڵ و دڵیان، بە زمانیان، بە ئەندامەکانیان.

٨)- ﴿ لَهُم مَّا يَشَآءُونَ عِندَ رَبِّهِمْ ﴾، هەرچی بیانەوێ لە لای پەروەردگاریان هەیانە، هەرچی ئارەزووی بکەن و بیخوازن هەیانە.

ئـەم تەعبیـرە لـە شـوێنی دیکـەش دا زۆر هاتـوە لـە قورئانـدا: ﴿ لَهُم مَّا يَشَآءُونَ عِندَ رَبِّهِمْ ﴾ چونکـە وەك عـەرەب گوتوویانـە: **(كُلُّ الصَّيْدِ فِي جَوْفِ الفَرَى)** هەمـوو نێچیـرەکان لـە نێـو **(فَـرَى)**دان، **(فَـرَى)**: جـۆرە ئاژەڵێکـە زۆر قەڵـەوو گۆشـتنە، پێـم وایـە بـە کوردیـی (چوالـوو) و (کوڕەبەشـە)ی پێدەڵێـن، کـە ئەگـەر بگیـرێ، ڕاوچیـی ئیکتیفـای پـێ دەکات، ئنجـا ئـەو تەعبیـرەش وایـەو، بـەو تەعبیرانـەش هاتـوە:

أ- ﴿ وَلَهُم مَّا يَدَّعُونَ ﴾، هەرچی بیخوازن و بیانەوێ، هەیانە، ئەمە هەموو شتێك دەگرێتە نێو خۆی.

ب- لە سوورەتی (الزخرف)دا، دەفەرموێ: ﴿وَفِيهَا مَا تَشْتَهِيهِ ٱلْأَنفُسُ وَتَلَذُّ ٱلْأَعْيُنُ ﴿٧١﴾﴾، واتە: تێیدایە (لە بەهەشت دا) هەرچی نەفسەکان ئارەزووی بکەن و، هەرچی چاوەکانیش لەززەتی لێ بکەن.

ج- لە سوورەتی (فصلت)یشدا، دەفەرموێ: ﴿وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِيٓ أَنفُسُكُمْ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ ﴿٣١﴾﴾، واتە: هەرچی نەفستان ئارەزووی بکات بۆ ئێوە هەیە لەوێداو، هەرچی بشیخوازن بۆ ئێوە لەوێدا هەیە.

٩)- ﴿ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَضْلُ ٱلْكَبِيرُ﴾، ئا ئەوەیە بەخششی گەورە، وشەی (**فضْل**)، هەم بە مانای بەرزیی و پێگەی بەرز دێ، وەك (**فُلَان ذُو فَضْلٍ**) واتە: خاوەن پێگەی بەرزە، خاوەن شەرەفە، خاوەن بەرزییە، هەروەها بە مانای زێدەیی لە بەخشینیشدا دێ، دەگوترێ: (**هُوَ صَاحِبُ فَضْلٍ عَلَيَّ**) یانی: ئەو زێدەیی بە من داوە.

١٠)- ﴿ذَٰلِكَ ٱلَّذِي يُبَشِّرُ ٱللَّهُ عِبَادَهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾، ئا ئەوەیە خوا موژدەی پێدەدات بە بەندەکانی، کە بڕوایان هێناوەو کردەوە باشەکانیان کردوون، ﴿ذَٰلِكَ ٱلَّذِي﴾ یانی: (**ذَلِكَ الَّذِي يُبَشِّرُ الله بِهِ عِبادَهُ**) وشەی (**بە**) نەهاتوە، لەبەر ئەوەی بە سیاق و سەلیقە دەزانرێ، ئا ئەوەیە کە خوا موژدەی پێ دەدات، بەو بەندانەی ئیمانیان هێناوەو کردەوە باشەکانیان کردوون، وەك پێشتریش گوتمان: بڕوایان هێناوە، واتە: بە هەموو ئەو شتانەی پێویستە بڕوایان پێبهێنرێ، ﴿وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ کردەوە باشەکانیان ئەنجامداون، چ پەیوەندییان بە دڵ و عەقڵیانەوە هەبێ، چ پەیوەندییان بە دەربڕینەکانی زمانەوە بێ، چ پەیوەندییان بە ئەندامەکانەوە هەبێ، لە خودی خۆیاندا، لەگەڵ ماڵ و خێزان دا، لەگەڵ کۆمەڵگا دا، لەگەڵ گەورەو گچکەدا، هەمووی هەمووی دەگرێتەوە.

وشەی (**رَوْضَات**) کۆی (**رَوْضَة**)یە، (**الرَّوْضَةُ: الأَرْضُ ذَاتُ الخَضِرَةِ؛ والبُسْتَانُ الحَسَن؛ يُقَالُ مَجْلِسُهُ كَأَنَّهُ رَوْضَةٌ**) (**رَوْضَة**) بەزەوییەکی سەوزایی دەگوترێ، بە کوردیی مێرگ و مێرگوزار، گوڵ و گوڵزار، دەگوترێ: کۆڕی فلانکەس دەڵێی ڕەوزەیە، وەك باخچەو، گوڵ و گوڵزار.

دوایـی خـوا ﷻ ڕوو لـە پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ دەكات، چونكـە ئـەوان هەنـدێ جـار پێغەمبـەری خاتەمیـان بـەوە تۆمەتبـار دەكـرد، كـە مەبەسـتی حوكمڕانییـە، یـان مەبەسـتی خـۆ بەسـەردا فەرزكردنیـانی هەیـە، یـان مەبەسـتی بـە دەسـتهێنانی سـەروەت و سـامان، یـان گەورەیـی كردنـە بەسـەریاندا.

١١)- ﴿قُل لَّآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ أَجۡرًا إِلَّا ٱلۡمَوَدَّةَ فِي ٱلۡقُرۡبَىٰ﴾، بڵێ: بەدڵنیایی {لەسەر گەیاندنی ئەم پەیامەی خوا} هیچ كرێ و پاداشتێكتان لێ داوا ناكەم، لە بەرانبەریدا، جگە لە خۆشویستنی نیزیكیی، خۆشویستن لە نیزیكییدا، واتە: چاوەڕوانییم تەنیا ئەوەیە: حەز دەكەم و پێم خۆشە، ئێوە لە خوا نیزیك بن، شتێك چاوەڕوان بكەم لە ئێوە لە بەرانبەر گەیاندنی پەیامی خوادا پێتان، هەر ئەوەیە كە لە خواتان نیزیك بخەمەوە، ئەمە ئەو مانایەیە كە لەگەڵ سیاقی ئایەتەكان و، لەگەڵ ئایەتەكانی دیكەشدا گونجاوە، بۆیەش وا دەڵێم: چونكە ئەم ڕستە قورئانییە، زانایانی ڕوونكەرەوانی قورئان، چوار مانایان بۆ داناون!

١٢)- ﴿وَمَن يَقۡتَرِفۡ حَسَنَةً نَّزِدۡ لَهُۥ فِيهَا حُسۡنًا﴾، هەر كەسێك چاكە بكات، چاكیی بۆی تێدا زیاد دەكەین. (یَقْتَرِف) یانی: (یَكْتَسِب) وەدەست بێنێ.

واتە: پاداشتی چاكتری دەدەینەوە لە كردەوە چاكەكەی خۆی.

١٣)- ﴿إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ شَكُورٌ﴾، بە دڵنیایی خوا لێبوردەی سوپاسگوزارە، واتە: بۆ چاكەكاران لە هەڵەو كەم و كوڕییەكانیان دەبووڕێ، بۆ چاكەكانیشیان بە چاكتر پاداشتیان دەداتەوەو، خوای بەرزیش سوپاسگوزارە سەبارەت بە بەندەكانی.

## کورتە باسێک لەبارەی مانای ﴿قُل لَّآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا إِلَّا ٱلْمَوَدَّةَ فِى ٱلْقُرْبَىٰ﴾ ەوە:

بەڕێـــزان!

هەرچەنـدە ئـەم ڕسـتە قورئانییـە، ڕوونکـەرەوانی قورئـان زۆریـان قسـە لەبـارەوە کـردووەو - وەك پێشـتر گوتمـان - سـێ مانایـان بـۆ کـردوون، بـەڵام مانایـەك کـە لـە هەمـووان پـتر بـە عەقـڵ و دڵـەوە دەنووسـێ، لەبـەر چەنـد بەڵگەیـەك کـە ئاماژەیەکیـان پـێ دەکەیـن، ئەوەیـە:

١- ئەی خەڵکینە! من هیچ کرێ و پاداشتێکم لێتان ناوێ جگە لە حەزو خۆشەویشتییم بۆ نیزیکییتان لە خوای بەرزی مەزن. پێم وایە ئەم مانایەیان لە هەموویان ڕێکترەو، لە هەموویان لەگەڵ سیاقی ئایەتەکانیش دا گونجاوترەو، لەگەڵ کەسایەتیی پێغەمبەریش دا ﷺ تەبایەو، لەگەڵ ئایەتەکانی دیکەی قورئانیشدا دێتەوە، کە لە چەند شوێنان خوا ﷻ ئەوەی جەخت کردۆتەوە کە پێغەمبەری خاتەم ﷺ هیچ چاوەڕوانییەکی لە خەڵك نیە، بۆ وێنە:

أ- لە سوورەتی (ص)دا، دەفەرموێ: ﴿قُلْ مَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُتَكَلِّفِينَ ﴿٨٦﴾﴾، واتە: بڵێ من هیچ کرێ و پاداشتێکتان لێ چاوەڕێ ناکەم و من لە باری شان گرانکەرانیش نیم، یاخود من لە کەسانێك نیم شتێك بڵێم وا نەبێ، لە لاف لێدەران نیم، لاف لێ بدەم و دەعوایەك بکەم، وا نەبێ.

ب- لە سوورەتی (الطور)دا، دەفەرموێ: ﴿أَمْ تَسْـَٔلُهُمْ أَجْرًا فَهُم مِّن مَّغْرَمٍ مُّثْقَلُونَ ﴿٤٠﴾﴾.

ج- هەروەها لە سوورەتی (القلم)یشدا، هاتوە لە ئایەتی (٤٦)، دەفەرموێ: ﴿أَمْ تَسْـَٔلُهُمْ أَجْرًا فَهُم مِّن مَّغْرَمٍ مُّثْقَلُونَ﴾، واتە: ئایا تۆ پاداشت و کرێیەکیان لێ داوا دەکەی،

بۆیە باری شانیان قورس بووە، لەبەر ئەو داوایەی دەکەوێتە سەریان، ئەو غەرامەیەی دەیانکەی، ئایا وایە! نەخێر.

ئنجا با تەماشایەکی قسەی توێژەرەوانی قورئان بکەین:

**٢-** لەوبارەوە ئەم دەقە دێنین، کە مانایەکی دیکەی دووامی تێدایە:

**(عَـنِ ابْـن عَبَّـاس رَضِيَ اللـهُ عَنْهُـمَا، فِي قَوْلِـهِ: {لا أَسْـأَلُكُمْ عَلَيْـهِ أَجْـرَاً، إلاَّ الْمَـوَدَّة فِي الْقُـرْبَى} قَـالَ: لَـمْ يَكُـنْ بَطْـنٌ مِـنْ بُطُـون قُرَيْـش إلاَّ وَبَـيْنَ رَسُـول اللّـه ﷺ وَبَيْنهـمْ قَرَابَـة، فَقَـالَ: قُـلْ لَا أَسْـأَلُكُمْ عَلَيْـهِ أَجْـرَاً، أَنْ تَـوَدُّونِي فِي الْقَرَابَـةِ الَّتِـي بَيْنِـي وَبَيْنَكُـمْ) (أخرجـه البخـاري: ٣٤٩٧، والترمـذي: ٣٢٦٢، وأحمـد: ٢٠٢٥، ٢٥٩٤).**

واتـە: عەبدوڵڵای کـوڕی عەببـاس (خـوا لـە خـۆی و بـابی ڕازی بـێ)، لـە بـارەی فەرمایشـتی خـواوە کـە دەفەرمـوێ: ﴿ لَّآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ أَجۡرًا إِلَّا ٱلۡمَوَدَّةَ فِى ٱلۡقُرۡبَىٰ ﴾ دەڵـێ: هیـچ بـەرە بابێـك لـە بەرەبابـەکانی قوڕەیـش نەبـوو، هیـچ تیرەیـەك لـە تیـرەکانی قوڕەیـش نەبـوو، مەگـەر لـە نێـوان پێغەمبـەری خـوا ﷺ و ئەوانـدا نیزیکیـی هەبـووە، (قوڕەیـش لـە نەسـەبی دووریانـدا، هەموویـان دەچنـەوە سـەر عەدنـان و، عەدنـان دەچێتـە سـەر ئیسـماعیل)، بۆیـە پێغەمبـەر ﷺ خـوا پێـی فەرمـوو: بڵـێ: لـە بەرانبـەر گەیانـدنی پەیامـی خـوادا، هیـچ کـرێ و پاداشـتێکتان لـێ داواناکـەم، جگـە لـەوەی لەبـەر ئـەو خزماتییـەی لـە بەینمانـدا هەیـە، منتـان خۆشـبوێ.

واتـە: ڕەچـاوی خزمایەتییـم لەگـەڵ دا بکـەن، کـە ئـەوەش لـە ڕاسـتییدا کـرێ و پاداشـت نیـە، بەڵکـو لەخۆداهێنانـە دی سیفەتێکی بـەرزو پەسـندە، کـە لـە قازانجـی خۆتانـە، لـە سـەردەمی نەفامییشـدا قوڕەیشـییەکان، زۆر بـاسی خزمایەتیـی و، گەیاندنی پەیوەندییـەکانی خزمایەتییـان دەکـرد.

هەڵبەتـە ئـەو واتایـەی عەبدوڵڵای کـوڕی عەببـاس دەیهێنـێ، لەگـەڵ ئـەوەدا کـە ئێمـەش گوتمـان، تێکناگیـرێ، چونکـە ئـەوەش کـرێ و پاداشـت نیـە واتـە: شـتێك نیـە

پێغەمبەر ﷺ لێی بەهرەمەندبێ، ئەگەر ئەوان ڕەچاوی پەیوەندیی خزمایەتیی لەگەڵدا بکەن، بە قازانجی خۆیان تەواو دەبێ، سیفەتێکی باش لە خۆیان دێننە دی، پێغەمبەر ﷺ هیچ سوودێکی ماددیی پێناگات، تاکو بە کرێ و پاداشت بۆی لە قەڵەم بدرێ، هەروەها سوودێکی مەعنەویی بە تایبەت، پێ ناگات.

ئەو مانایەی لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە هێنامان، (**الطبري**) ئەو مانایە زیاتر هەڵدەبژێرێ، وەك لە تەفسیرەکەی خۆی دا[1]، دەڵێ: (**وَأَوْلَى الْأَقْوَالِ فِي ذَلِكَ بِالصَّوَابِ، وَأَشْبَهُهَا بِظَاهِرِ التَّنْزِيلِ: قَوْلُ مَنْ قَالَ: مَعْنَاهُ: قُلْ لَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا يَا مَعْشَرَ قُرَيْشٍ! إِلَّا أَنْ تَوَدُّونِي فِي قَرَابَتِي مِنْكُمْ، وَتَصِلُوا الرَّحِمَ الَّتِي بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ**).

دەڵێ: نیزیکترینی قسەکان لەوبارەوە لە ڕاستییەوەو، وێچوویترینیان بە ڕواڵەتی ئایەتەکان، قسەی کەسێکە کە گوتوویەتی مانایەکەی ئەوەیە: من لە بەرانبەر ئەو پەیامەی خوادا، هیچ پاداشت و کرێیەکتان لێ داوا ناکەم، ئەی کۆمەڵی قورەیش! مەگەر ئەوە کە لەبەر خزمایەتییم لەگەڵتاندا خۆشتان بوێم و، ئەو پەیوەندییە خزمایەتییەی لە نێوان من و ئێوەدا هەیە، بیگەیەنن.

ئنجا هەر (**الطبري**) مانای یەکەمیش هەر دێنێ و دەڵێ: (**قُلْ لَا أَسْأَلُكُمْ أَيُّهَا النَّاس! عَلَى مَا جِئْتُكُمْ بِهِ أَجْرًا، إِلَّا أَنْ تَوَدَّدُوا إِلَى اللَّه، وَتَتَقَرَّبُوا بِالْعَمَلِ الصَّالِح وَالطَّاعَة**)[2]، واتە: بڵێ: ئەی خەڵکینە! لەسەر ئەوەی بۆم هێناون، هیچ کرێ و پاداشتێکتان لێ داواناکەم، مەگەر ئەوە کە خۆتان لە لای خوا خۆشەویست بکەن، بە کردەوەی چاك و بە فەرمانبەریی خۆتان لە خوا نیزیك بخەنەوە، بەس ئەو چاوەڕوانییەم لێتان هەیە، (**الطبري**) ئەو دەقەی هێناوە[3]، بە چەند ڕیوایەتێکی جیاو لە چەند کەسێکی جیاوە.

---

(١) جامع البيان: ج٢٥، ص٧.

(٢) جامع البيان: ج٢٥، ص٢٦.

(٣) بە ژمارەکانی: ٣٠٧٢٢ و ٣٠٧٢٣ و ٣٠٧٢٤ و ٣٠٧٢٥ و ٣٠٧٢٦.

بەڵام وێڕای ئەم دوو مانایە، مانایەکی دیکەشیان هێناوە:

٣- ئەویش ئەوەیە: (**إِلَّا الْمَوَدَّةَ فِي الْقُرْبَىٰ**) یانی: (**إِلاَّ أَنْ تُحِبُّوا قَرَابَتِي**)، واتە: هیچ کرێیەکتان لێ داوا ناکەم، مەگەر ئەوە کە خزمەکانی منتان خۆشبوێن.

ئنجا ئەوانە - بەتایبەتی شیعە - خزمەکانیشیان خولاصە کردوون لە: عەلی و فاتیمەو حەسەن و حوسەین و منداڵەکانی ئەوان دا (خوا لێیان ڕازی بێ)!

کە لە ڕاستییدا ئەم قسەیە، هەم لە گەڵ سیاقی ئایەتەکان دا ناگونجێ، هەم لەگەڵ ئەو ئایەتانەی دیکەدا کە خوای پەروەردگار هەمیشە پێغەمبەری ﷺ بەوە پێناسە کردوە، هیچ چاوەڕوانییەکی لە خەڵك نیە، بەڵام ئەگەر بڵێ: وەرن خزمەکانی منتان خۆشبوێن و چاکەیان لەگەڵدا بکەن، ئەوە جۆرێکە لە کرێ و پاداشت و، لەگەڵ ئەو ئایەتانەی دیکەدا، کە دەفەرموێ: ﴿ قُلْ مَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُتَكَلِّفِينَ ﴿٨٦﴾ ﴾ص، تێکدەگیرێ، بەڵام ئەو مانایەی کە (**الطبري**) هەڵیبژاردوە، کە دەڵێ: ئەوە کە پەیوەندیی خزمایەتییم لەگەڵ بگەیەنن، پێغەمبەر ﷺ مەبەستی پێ ئەوە نەبووە، سوودێکی ماددیی پێ بگەیەنن، بەڵام کە بڵێ: خزمەکانی منتان خۆشبوێن و جیایان بکەنەوە لە خەڵکی دی، بە تەئکید ئەوە جۆرێکە لە پاداشت، چ پاداشتی ماددیی بێ، چ مەعنەویی بێ، کە بە داخەوە تەفسیرکانی شیعەکان بەس ئەو مانایە دێنن، بۆ وێنە:

تەفسیری (المیزان)[1] لەو بارەوە تەفاصیلی زۆری هێناوە، هەروەها تەفسیری (نمونە) کە تەفسیرێکی فارسیی شیعەکانەو لە ژێر چاودێریی (ناصر مکارم شیرازی) و، کۆمەڵێك لە زانایانی شیعەدا نووسراوە[2]، بیست و دوو (٢٢) لاپەڕە لەو بارەوە دواوەو دەمارگیرییەکی زۆر بێ ماناو بێ سوود، لەو تەفسیرەدا لەو بابەتانەدا هەیە، وەك جاری دیکەش هەر ئاماژەم پێداوە، بەڵام هیچ بەڵگەیەك

---

(١) ج١٨، ص٤٢تا ٤٨.

(٢) ج٢٠، ص٤٠٢ - ٤٢٤.

ئـەو قسـانەی ئـەوان پشتڕاسـت ناكاتـەوە، كـە مەبەسـت لـە: (إِلَّا الْمَـوَدَّةَ فِي الْقُـرْبَى) یـانی: (إِلاَّ أَنْ تُحِبُّـوا قَرَابَتِـي) ڕواڵـەتی ئایەتەكـەش ئـەوە هـەر ناگەیەنـێ.

(إبـن كثـیر) لەوبـارەوە لـە تەفسـیرەكەی خۆیـدا[1] ئـەم دەقـەی هێنـاوە: {عَـنِ ابْـنِ عَبَّـاسٍ رَضِيَ اللـهُ عَنْهُـمَا، قَـالَ: لَـمَّا نَزَلَـتْ هَـذِهِ الْآيَـةُ: ﴿قُل لَّآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ أَجۡرًا إِلَّا ٱلۡمَوَدَّةَ فِي ٱلۡقُرۡبَىٰ﴾، قَالُـوا: يَـا رَسُـولَ اللَّـهِ، مَـنْ هَـؤُلَاءِ الَّذِيـنَ أَمَـرَ اللَّـهُ بِمَوَدَّتِهِـمْ؟ قَـالَ: فَاطِمَـةُ وَوَلَدُهَـا، عَلَيْهِـمُ السَّلَامُ} (أخرجـه الطـبراني في المعجـم الكبـير (٤٤٤/١١) وترتيـب الأمـالي للشـجري برقـم: ٧٠٦)، شـیعە ئـەم دەقـە، بـە بەڵگـە دێننـەوە.

واتـە: عەبدوڵـڵای كـوڕی عەببـاس (خـوا لێیـان ڕازی بـێ) گوتوویـەتی: كاتێـك ئـەم ئایەتـە هاتـە خـوار: ﴿قُل لَّآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ أَجۡرًا إِلَّا ٱلۡمَوَدَّةَ فِي ٱلۡقُرۡبَىٰ﴾، گوتوویانـە: ئـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ! ئەوانـە كێـن كـە ئێمـە فەرمانمـان پێكـراوە خۆشـمان بوێـن؟ ئەویـش ﷺ فەرموویـەتی: فاتیمـەو منداڵـەكانی.

بـەڵام (إبـن كثـیر) دەڵـێ: (وَهَـذَا إِسْـنَادٌ ضَعِيـفٌ، فِيـهِ مُبْهَـمٌ لَا يُعْـرَفُ، عَـنْ شَـيْخٍ شِـيعِيٍّ مُتَحَـرِّقٍ، وَهُـوَ حُسَـيْنٌ الْأَشْـقَرُ، وَلَا يُقْبَـلُ خَـبَرُهُ فِي هَـذَا الْمَحَـلِّ. وَذِكْـرُ نُـزُولِ هَـذِهِ الْآيَـةِ فِي الْمَدِينَـةِ بَعِيـدٌ؛ فَإِنَّهَـا مَكِّيَّـةٌ وَلَـمْ يَكُـنْ إِذْ ذَاكَ لِفَاطِمَـةَ أَوْلَادٌ بِالْكُلِّيَّـةِ، فَإِنَّهَـا لَـمْ تَتَـزَوَّجْ بِعَلِـيٍّ إِلَّا بَعْـدَ بَـدْرٍ مِـنَ السَّـنَةِ الثَّانِيـةِ مِـنَ الهِجْـرَةِ).

واتـە: ئەمـە سـەنەدێكی بێهێـزەو، ڕاوییـەكی نەنـاسراو هەیـە، نازانـرێ كێیـە، ئەویش لە شـێخێكی سـووتاوی شـیعییەوە كـە پێـی دەگوتـرێ: (حُسَـيْنٌ الْأَشْـقَر) كـە پیـاوی وەك ئـەو لـەو بـارەوە، ئـەو هەواڵـەی لـێ وەرناگیـرێ، (یـانی: جێـی متمانـە نیـە)، ئنجـا ئـەوە كـە بـاس دەكـرێ: ئـەم ئایەتـە لـە مەدینـە هاتۆتـە خـوار، ئـەوە دوورە، چونكـە ئـەم ئایەتـە مەككەییـەو فاتیمـەش (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، ئـەو كاتـە هیـچ منداڵـی نەبـوون {كـە ئـەم ئایەتـە هاتۆتـە خـوارێ، كـە سـوورەتێكی مەككەییـە} چونكـە فاتیمـە هاوسـەرگیریی لەگـەڵ عـەلی دا نەكـرد، مەگـەر دوای جەنگـی بـەدر، لـە سـاڵی دووەمـی كۆچیـی دا.

---

(١) ج٨، ص٣٠٧.

واتە: بەلای کەمەوە پێنج، شەش ساڵ دوای هاتنە خوارێی ئەم سوورەتە، کە ئەگەر ئەم سوورەتە لە ساڵی هەشت و نۆی پێغەمبەرایەتییش دا هاتبێتە خوارێ، هەتا ساڵی سێزدە، هەر لەوێ بوون، دوایی دوو ساڵیش دوای ئەوە، یانی: بەلای کەم پێنج ساڵی پێچوون، ئەوجار فاتیمەو عەلی (خوا لێیان ڕازی بێ) هاوسەرگیرییان کردوە، دوایی ساڵێك، دوو ساڵیشی پێچوون، تاکو حەسەن و حوسەین هاتوونە دنیا!

کەواتە: ئەوەی کە ئەوان گوتوویانە، هیچ ڕێی تێناچێ، بۆیە وەك گوتمان: ئەو مانایەی بێ گرێ و کۆڵە هەر ئەوەیە: ﴿ قُل لَّآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ أَجۡرًا ﴾، بلێ: هیچ کرێ و پاداشتتان لێ داوا ناکەم، ﴿ إِلَّا ٱلۡمَوَدَّةَ فِي ٱلۡقُرۡبَىٰ ﴾، مەگەر خۆشویستنی من بۆ نیزیکییتان لە خوا، شتێك کە لە ئێوەی چاوەڕێ بکەم هەر ئەوەیە، کە ئێوە زیاتر لە خوا نزیك بن، خۆتانی لێوە نیزیك بخەن، بە هۆی کردەوەی باش و فەرمانبەرییەوە بۆ خوا، خۆتان لە خواوە نیزیك بخەن، بەس ئەو چاوەڕوانییەم لێتان هەیە.

### مەسەلەی سێیەم:

**بێبڕوایەکان دەڵێن: موحەممەد ﷺ قورئانی بە ناوی خواوە هەڵبەستوە، بەڵام ڕاست نیە، چونکە ئەگەر شتێکی وا بکەی (ئەی موحەممەد!) خوا دڵت مۆر دەکاو، خوا ناهەق لادەبات و هەق دەچەسپێنێ بە وشەکانی و، خوا بە نهێنیی سینەکانیش زانایە:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا ۖ فَإِن يَشَإِ ٱللَّهُ يَخْتِمْ عَلَىٰ قَلْبِكَ ۗ وَيَمْحُ ٱللَّهُ ٱلْبَٰطِلَ وَيُحِقُّ ٱلْحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٢٤﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا﴾، یان ئایا دەڵێن: درۆی بە خواوە هەڵبەستوە، یانی: (أَيَقَعُ فِي قُلُوبِهِمْ ويَجْرِي فِي أَلْسِنَتِهِمْ أَنْ يَنْسِبُوا مِثْلَهُ إِلى الإِفْتِراءِ عَلَى اللَّهِ) ئایا ئەوە دەچێتە زەینیانەوەو بەسەر زمانیان دادێ، کە موحەممەد پاڵدەنە لای ئەوە درۆی بە ناوی خواوە هەڵبەستبێ؟! بێگومان ئەمە پرسیار کردنێکی نکووڵییلێکەرانەو سەرزەنشتکەرانەیە، واتە: چۆن شتی وایان بە دڵدا دێ؟ چۆن شتی وایان بە عەقڵدا دێ؟ چۆن شتی وایان بەسەر زماندا دێ؟ کە موحەممەد ﷺ ئەو پیاوە ڕاست و ساغە کە بە حەیاتی درۆی لەگەڵ مرۆڤەکاندا نەکردوە، ئێستا بە ناوی خواوە درۆ هەڵبەستێ، چۆن ڕێگا بە خۆیان دەدەن شتی وا بچێتە عەقڵ و دڵیانەوە؟!

٢)- ﴿فَإِن يَشَإِ ٱللَّهُ يَخْتِمْ عَلَىٰ قَلْبِكَ﴾، ئنجا ئەگەر خوا بیەوێ مۆر بەسەر دڵتەوە دەنێ.

ئەمە دوو واتایان بۆ لێکداونەوە:

أ/ (يَخْتِمْ عَلَىٰ قَلْبِكَ، وَحَيْنَذَاكَ تَفْتَرِي عَلَى الله) ئەگەر خوا بیەوێ، مۆرت بەسەر دڵەوە دەنێ، ئنجا کە مۆری بەسەر دڵەوە نای، درۆ بەناوی خواوە هەڵدەبەستی.

ب/ (يَطْبَعُ عَلَى قَلْبِكَ، فَلَا يَبْقى فِيْهِ شَيْئٌ مِنَ العِلْمِ وَالعَقْل) خوا مۆر بەسەر دڵتەوە دەنێ، هیچ زانیاریی و فام و هۆشی تێدا نامێنێ، بەڵام خوا ﷻ کە تۆی کردوە بە پێغەمبەری خۆی، کەواتە: تۆ باشترین بەندەی خوای و مۆری بەسەر دڵی تۆوە نەناوە، تاکو تۆ بە ناوی خواوە درۆ هەڵبەستی، پاشان تۆ لەو پەڕی عیلم و عەقڵ و هۆش و گۆشدای، کەواتە: بەو واتایەی دیشیان دیسان مۆر بەسەر دڵی تۆوە نەنراوە.

٣)- ﴿وَيَمْحُ ٱللَّهُ ٱلْبَٰطِلَ﴾، خواش پووچ و ناهەق دەسڕێتەوە، لایدەبات، یانی: عادەتی خوا وایەو یاسای خوا وایە، ناهەقێك کە بە ناوی ئەوەوە بگوترێ، لایدەبات.

٤)- ﴿وَيُحِقُّ ٱلْحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦٓ﴾، (خوا) بە وشەکانی هەق دەچەسپێنێ و، ناهەقیش لادەبات، کەواتە: تۆ ئەگەر بە ناوی خواوە درۆت هەڵبەستبایە، خوا لە دڵتدا دەیسڕییەوەو، هەقی دەچەسپاند، ئێستا کە تۆ بەردەوامی لە سەر گەیاندنی پەیامی خوا، کەواتە: ئەوە درۆ هەڵبەستن نیە بە ناوی خواوە، بەڵکو پەیامی خوایە دەیگەیەنی.

٥)- ﴿إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾، بە دڵنیایی ئەو بە نهێنییەکانی سینەکان ئاگادارە، (أي: عَلِيْمٌ بِـمَا فِي صَدْرِكَ، وَصُدُوْرِهِمْ فيُجْرِي الأَمْرَ عَلَى حَسْبِ ذَلِكَ) خوا زانایە بەوە کە لە سینەی تۆو، سینەکانی بەرانبەرەکانیشتدا هەیە، بە پێی ئەوەش خوا ﷻ مامەڵەتان لەگەڵدا دەکات.

وشـەی (ذَاتُ الصُّـدُور) واتـە: (صَاحِبَـةُ الصُّـدُور) خـاوەنی سـینەکان، (الأَسْرَارُ المُتَمَكِّنَـةُ فِي الصُّـدُورِ فَكأَنَّهَـا هِـيَ أَصْحَابُهَـا المَالِكَـةُ لَهَـا) ئـەو نهێنییانـەی کـە لـە سینەکاندا چەسپاون، وەك ئـەو نهێنییانـە بووبـن بـە خـاوەنی سینەکان، یـان هاوەڵـی سـینەکان.

لـە سـوورەتی (الحاقة)شـدا، خـوای پـەروەردگار بـاسی ئـەو بابەتـە دەکات، کـە دەفەرمـوێ: ﴿وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ ٱلْأَقَاوِيلِ ﴿٤٤﴾ لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِٱلْيَمِينِ ﴿٤٥﴾ ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ ٱلْوَتِينَ ﴿٤٦﴾ فَمَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَٰجِزِينَ ﴿٤٧﴾﴾، واتـە: ئەگـەر هەندێـك قسـەی بـە نـاوی ئێمـە کردبانایـە . قۆڵـی ڕاسـتییمان دەگـرت . دوایـی دەمـاری ملیـمان دەبڕیـی

. هیچ کام لە ئێوەش نەتاندەتوانی بەرگریی لێبکەن و ببنە پەردەو نێوانێك لە نێوان ئێمەو سزادانیدا.

کەواتە: ئەوەی موحەممەد ﷺ دەیفەرموێ، پەیامی خوایە پێتان ڕادەگەیەنێ، هەر بۆیەش خوا ئەو پەیامەی خۆی دەچەسپێنێ، وەك ئێستا دەبینین، ئەو پەیامەی خوا بە هەموو دنیادا بڵاو بۆتەوە، بێ ئەوەی نەك وشەیەك، بەڵکو پیتێکیشی کەم و زیاد کرابێ، کەواتە: خوا بۆ خۆی خاوەنی ئەو پەیامەیە، موحەممەد ﷺ تەنیا گەیاندنی لەسەرەو لە خۆیەوە نەیگوتوە، نە بە ناوی خواوە، نە بە ناوی خۆیەوەو، نە هیچ کەسیش فێری کردوە، بەڵکو خوا چۆنی پێ فەرمووە، ئەویش گەیاندوویەتی بە خەڵك.

سُبْحَانَكَ اللّٰهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان یـازدە (١١) ئایـەت دەگرێتـە خـۆی، ئایەتـەکانی: (٢٥ - ٣٥)، کـە تیایـندا چەنـد بابەتێـکی جـۆراو جـۆر خراونـە ڕوو:

١)- تەوبە قبووڵکردنی خوا لە بەندەکانی و لێبوردنی، وەڵامدانەوەی بۆیان و، زیادکردنی لە بەخششی بۆ ئەوانەی کە داوای لێدەکەن و، بەندایەتیی بۆ دەکەن و چاوەڕوانیی لێدەکەن.

٢)- بژیودانی خوا ﷻ بۆ بەندەکانی بە ئەندازە، تاکو یاخیی و بوغزا نەبن و لە کەوڵی خۆیان دەرنەچن.

٣)- ناردنی خوا ﷻ بۆ ئاوی ئاسمان، پاش نائومێد بوونی مرۆڤان لەوەی لە سەرێوە ئاویان بۆ دابەزێنرێ.

٤)- دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی و، ژیاندارانی نێویان و، کۆکردنەوەیان لە ڕۆژی دوایی دا.

٥)- بەڵاو گرفتارییەکان دەرهاویشتەی کردەوەی خراپی دەستی خەڵکن، ئەوانیش دەستەوسانکەری خوا نین لە زەویدا، واتە: ناتوانن لە ژێر ڕکێفی خوا دەربچن و دەرباز نابن، ئەگەر بیەوێ سزایان بدات، یاخود بیەوێ لەم سەر زەوییە لایانبەرێ و، ژیانی دنیایان کۆتایی پێ بێنێ.

٦)- کەشتییەکانیش لە دەریادا لە نیشانەکانی خوان، کە ئەگەر بیەوێ نغرۆیان دەکات و، مرۆڤەکانیش ڕێی قوتاربوونیان نابێ.

﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى يَقْبَلُ ٱلتَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِۦ وَيَعْفُوا۟ عَنِ ٱلسَّيِّـَٔاتِ وَيَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ ﴿٢٥﴾ وَيَسْتَجِيبُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ وَيَزِيدُهُم مِّن فَضْلِهِۦ ۚ وَٱلْكَـٰفِرُونَ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ ﴿٢٦﴾ وَلَوْ بَسَطَ ٱللَّهُ ٱلرِّزْقَ لِعِبَادِهِۦ لَبَغَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَـٰكِن يُنَزِّلُ بِقَدَرٍ مَّا يَشَآءُ ۚ إِنَّهُۥ

بِعِبَادِهِۦ خَبِيرٌۢ بَصِيرٌ ﴿٢٧﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى يُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ مِنۢ بَعْدِ مَا قَنَطُوا۟ وَيَنشُرُ رَحْمَتَهُۥ ۚ وَهُوَ ٱلْوَلِىُّ ٱلْحَمِيدُ ﴿٢٨﴾ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦ خَلْقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَثَّ فِيهِمَا مِن دَآبَّةٍ ۚ وَهُوَ عَلَىٰ جَمْعِهِمْ إِذَا يَشَآءُ قَدِيرٌ ﴿٢٩﴾ وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ وَيَعْفُوا۟ عَن كَثِيرٍ ﴿٣٠﴾ وَمَآ أَنتُم بِمُعْجِزِينَ فِى ٱلْأَرْضِ ۖ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿٣١﴾ وَمِنْ ءَايَٰتِهِ ٱلْجَوَارِ فِى ٱلْبَحْرِ كَٱلْأَعْلَٰمِ ﴿٣٢﴾ إِن يَشَأْ يُسْكِنِ ٱلرِّيحَ فَيَظْلَلْنَ رَوَاكِدَ عَلَىٰ ظَهْرِهِۦٓ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴿٣٣﴾ أَوْ يُوبِقْهُنَّ بِمَا كَسَبُوا۟ وَيَعْفُ عَن كَثِيرٍ ﴿٣٤﴾ وَيَعْلَمَ ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِىٓ ءَايَٰتِنَا مَا لَهُم مِّن مَّحِيصٍ ﴿٣٥﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{هەروەها (خوا) ئەو کەسەیە کە گەڕانەوە (تەوبە) لە بەندەکانی وەردەگرێ و، لە خراپان خۆشدەبێ و، دەشزانێ (مرۆڤەکان) چی دەکەن ﴿٢٥﴾ هەروەها وەڵامی ئەوانەش دەداتەوە، کە بڕوایان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان کردوون و، لە چاکەی خۆیشی بۆیان زیاد دەکات، ئەوانەش کە بێبڕوابوون، ئازارێکی توندیان هەیە (لە ڕۆژی دوایی دا) ﴿٢٦﴾ ئەگەر خوا بژیویشی بۆ بەندەکانی بڵاوکردبایەوە، دەستدرێژییان لە زەویدا دەکرد، بەڵام ئەوەی بیەوێ بە ئەندازە دایدەبەزێنێ، بە دڵنیایی ئەو شارەزاو بینەری بەندەکانیەتی ﴿٢٧﴾ هەروەها (خوا) ئەو کەسەیە دوای ئەوەی (مرۆڤەکان) بێهیوابوون، ئاو (باران و بەفرو تەرزە) دادەبەزێنێ و، بەزەیی خۆی بڵاودەکاتەوەو، هەر ئەوە سەرپەرشتیاری ستایشکراو ﴿٢٨﴾ دیسان لە نیشانەکانی (پەروەردگارێتیی) وی، دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی و، ئەو پێرۆییانەن کە تێیاندا بڵاوی کردوونەوەو، هەرکاتیش بیەوێ لەسەر کۆکردنەوەیان توانایە ﴿٢٩﴾ هەر بەڵایەکیشتان تووش بێ، لە سۆنگەی ئەوەوەیە، کە وەدەستتان هێناوە (لە خراپە)و لە زۆریش خۆشدەبێ

﴿٣٠﴾ ئێوەش دەستەوسانکەر (ی خوا) نین لە زەویداو، جگە لە خواش هیچ سەرپەرشتیار و سەرخەر (و پشتیوان)ێکتان نیە ﴿٣١﴾ هەروەها لە نیشانەکانی (پەروەردگاریێتیی) وی (کەشتییە) بە دەریادا ڕۆیشتووەکانن، وەك چیایەکانن (لە بەرزیی دا) ﴿٣٢﴾ ئەگەر (خوا) بیەوێ بایەکان دەوەستێنێ، ئیدی (کەشتییەکان) لەسەر پشتی (دەریا) بە چەسپاویی و نەجووڵاویی دەمێننەوە، بەڕاستیی لەوەدا نیشانە هەن، بۆ هەر زۆر خۆڕاگرێکی زۆر سوپاسگوزار (بۆ خوا) ﴿٣٣﴾ یان بە هۆی ئەوەوە (کە سەرنشینەکانیان) کردوویانە (لە خراپەو تاوان) کەشتییەکان لە نێو دەبات و، لە زۆر (کردەوەی خراپ)یش خۆشدەبێ ﴿٣٤﴾ لەو کاتەشدا ئەو کەسانەی لە دژی نیشانەکانمان شەڕەقسە دەکەن، دەزانن هیچ پەناگەیەکیان نیە ﴿٣٥﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(لَبَغَوۡاْ فِی ٱلۡأَرۡضِ): واتە: لە زەویدا دەستدرێژیی دەکەن، سنوورشکێنیی دەکەن، (**البَغِيُ: طَلَبُ تَجَاوُزُ الإقْتِصَادِ فِيمَا يُتَحَرَّى، تَجَاوَزَهُ، أَمْ لَمْ يَتَجَاوَزهُ**) (**بغي**): بریتیە لە داواکردنی تێپەڕاندن لە حاڵەتی میانجیی، لە شتێکدا کە خەفتانی تێدا دەکرێ، ئنجا چ ئەو سنوورشکاندنە بووبێ، چ نەبووبێ.

(ٱلۡغَیۡثَ): (**أي: المَطَرُ**)، (**غيث**): بە مانای باران دێ، هەندێکیش گوتوویانە: بارانێکە لە دوای وشکەساڵیی، دەگوترێ: (**اسْتَغَثْتُهُ أي: طَلَبْتُ الغَوْثَ، أو الغَيْثَ مِنْهُ**) (**اسْتَغَثْتُ**): بە مانای داوام لێکرد، داوای هاوکارییم لێکرد، کە لە فریام بێ، یاخود داوای بارانم لێکرد.

(قَنَطُواْ): (**القُنُوطُ: اليَأْسُ مِنَ الخَيْرِ**)، (**قُنوط**): بریتیە لە تەما بڕاوبوون، بێ ئومێدبوون لە خێرو چاکە.

(بَثَّ): (نشر) بڵاوی کردۆتەوە، (أَصْلُ البَثِّ: التَّفْرِيْقُ وَإِثَارَةُ الشَّيءِ، كَبَثِّ الرِّيْحِ التُّرَابَ) وشەی (بَثَّ): لە ڕیشەدا بە مانای لێك جیاکردنەوەو بڵاوکردنەوەیە، هەروەها بریتیە لەوە شتێك بڵاوبکرێتەوە، یانی: لە شوێنی خۆی هەڵبستێنرێ، وەك چۆن با خۆڵ ڕادەماڵێ و، لە شوێنی خۆی لایدەبات.

(دَآبَّةٍ): پێڕۆ، (الدَّبُّ وَالدَّبِيبُ: المَشْيُ الخَفِيْفُ، وَالدَّابَّةُ، يُسْتَعْمَلُ فِي كُلِّ حَيْوَان)، وشەی (دَبُّ ودَبِيب): بە ڕۆیشتنی هێواش دەگوترێ، وشەی (دَابَّة): بەکاردەهێنرێ بۆ هەموو ژیاندارێك، کە ئەگەر بۆ هەموو ژیاندارێك بەکاربهێنرێ، کەواتە: فریشتانیش دەگرێتەوە، ئەوانیش خاوەنی ژیانن.

(مُّصِيبَةٍ): (المُصِيْبَةُ: الرَّمِيَّةُ، ثُمَّ اخْتَصَّت بِالنَّائِبَة) (مُصِيْبَة): بریتیە لە تیرێك کە لە نیشان دەدات، (أَصَابَهُ يُصِيبُهُ، فَهُوَ مُصِيبٌ) یانی: لێیدا لێیدەدا، ئەو لێدەرو پێکەرە، بەڵام دوایی بۆ بەلا بەکارهێنراوە، بەلایەك کە بەسەر مرۆڤ دێت.

(الْجَوَارِ): (الجَرِي: المَرُّ السَّرِيْع) (جَرِي): بە مانای ڕۆیشتنی خێرا دێ، (جَواري) کۆی (جَارية)یە، (الجَارِيَةُ: السَّفِيْنَةُ الَّتِي تَجْرِي فِي البَحْر)، (جَارِيَة): بەو کەشتییە دەگوترێ کە بەدەریادا دەڕوا، هەم بە (جواري) بە (یـ)، هەم بە (جوارِ) بەژێر (كَسْر) خوێنراوەتەوە.

(كَٱلْأَعْلَٰمِ): (العَلَمْ: الأَثَرُ الَّذِي يُعْلَمُ بِهِ الشَّيءُ، كَعَلَمِ الطَّرِيْقِ وَعَلَمِ الجَيْشِ، وَسُمِّي الجَبَلُ عَلَمَاً) (أَعْلَام) کۆی (عَلَم)ە، (عَلَم): ئەو شوێنەوارەیە کە شتێکی پێ دەزانرێ، وەك نیشانەو قووچکەی ڕێ، نیشانە کە دادەنرێ بۆ ئەوەی بزانرێ ڕێیەکە بەکوێ دایە! هەروەها بەیداغی سوپا، بۆ ئەوەی بزانرێ ئەو سوپایە کوێی سەرەو، کوێی ڕاستەو، کوێ چەپە؟ چیاش ناوی لێنراوە (عَلَمْ)، لەبەر ئەوەی ئەویش بەرزەو، بە هۆی چیاکانیشەوە ڕێ و بانەکانیش دەزانرێن.

(رَوَاكِدَ): کۆی (رَاكِدَة)یە، یانی: (ثَابِتة، جَامِدة) (رَكَدَ المَاءُ والرِّيح، أي: سَكَن) ئاوەکە، یان بایەکە وەستا، (رَكَدَ) یانی: بێ دەنگ بوو، وەستا، دیارە ئەوە

وەسفی کەشتییەکانە، ئەو کەشتییانەی لە ئەنجامی ئەوەدا بانامێنێ و ناجووڵێن، لە شوێنی خۆیان دەوەستن.

(**يُوبِقْهُنَّ**): نغرۆیان دەکات، (**وَبَقَ: إذَا تَثَبَّطَ فَهَلَكَ، يَبِقُ وَبْقًا وَمَوْبِقًا، وَأَوْبَقَهُ**) (**وَبَقَ**): شتێك کە تاخیربێ و دوایی لە بەین بچێ، (**يَبِقُ وَبْقًا وَمَوْبِقًا**) یانی: فەوتا، فەوتان، شوێنی لێ فەوتان، (**وَأَوْبَقَهُ**)، واتە: فەوتاندی.

(**مَحِيصٍ**): پەناگە، (**حَاصَ عَنِ الحَقِّ: حَادَ عَنْهُ إلى شِدَّةٍ وَمَكْرُوهٍ، المَحِيْصُ: الـمَلْجَأُ**) (**حَاصَ عَنِ الحَقِّ**) یانی: لە هەق لایدا، بەرەو ناڕەحەتیی و سەختییەك، (**مَحِيص**) یانی: پەناگە، ئەو شوێنەی مرۆڤ لێی دەرباز دەبێ، چونکە (**حَاصَ**) بە مانای (**خَلَصَ**)ش، دێ، ئنجا (**مَحِيص**) یانی: شوێنی قوتار بوون و لێ دەرباز بوون.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

وەك لە پێناسەی ئەم دەرسەدا گوتمان، شەش بابەتی گرنگ و جۆراو جۆر لەم یازدە ئایەتەدا باسکراون، کە هەموویان هەر پەیوەستن بە ئایەتەکانی پێش خۆیان و دوای خۆیانەوەو هەمووی باسی بەندایەتیی کردنە بۆ خوا بە تەنیا، ئنجا لە میانی ئەوەدا خوا باسی نیعمەت و نیشانەکانی دەکات بەسەر بەندەکانیەوە، کە ئەو خوایە، خاوەنی ئەو هەموو فەزڵ و بەخششەیە بەسەرتانەوە، بەس ئەو شایستەی پەرستراوان و بەندایەتیی بۆ کرانە. سەرەتا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى يَقْبَلُ ٱلتَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِۦ ﴾، (و)ەکە، ئەم مەبەستە دەگێڕێتەوەو بادەداتەوە سەر ئەوانەی پێشێ، کە باس باسی خوای بەرزی مەزنە، واتە: خوا ئەو کەسەیە گەڕانەوە لە بەندەکانی وەردەگرێ، کاتێ دەگەڕێنەوە بۆ لای، وەریاندەگرێ و قبووڵیان دەکات، پەشێمان بوونەوەو گەڕانەوەکەیان لێوەردەگرێ، ﴿ وَيَعْفُواْ عَنِ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ﴾، لە خراپەکانیش دەبووری دەیانبەخشێ، چاوپۆشییان

لێدەکات، ﴿ وَيَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ ﴾، دەشزانێ ئێوە (ئەی خەڵکینە!) چی دەکەن! هەروەها خوێنراویشەتەوە: (وَيَعْلَمُ مَا يَفْعَلُون) دەشزانێ ئەوان چی دەکەن، مرۆڤەکان.

﴿ وَيَسْتَجِيبُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَيَزِيدُهُم مِّن فَضْلِهِۦ ﴾، وەڵامی ئەوانەش دەداتەوە کە بڕوایان هێناوەو کردەوە باشەکانیان کردوون و لە بەخششی خۆشی بۆیان زیاد دەکات، لە چاکەی خۆی بۆیان زیاد دەکات، واتە: تەنیا بە ئەندازەی کردەوەکانیان پاداشتیان ناداتەوە، بەڵکو یەك بە دە، تاکو یەك بە حەوتسەدو زیاتریش دەڕوا، وەك پێشتر باسمان کرد.

وشەی (يَسْتَجِيبُ) وەڵام دەداتەوە، (**الذين**)ش:

أ- دەگونجێ لە شوێنی بەرکار (**مفعول به**) بێ، واتە: خوا وەڵامی ئەو کەسانە دەداتەوە، کە ئیمانیان هەیەو، کردەوەی باشیان ئەنجام داوە.

ب- دەشگونجێ (**الذين**) لە شوێنی بکەر (**فاعل**) بێ، یانی: (**ويستجيب الذين**) ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کردەوەی چاکیان کردوون، وەڵام دەدەنەوە، وەڵامی خوا ﷻ، بەڵام مانای یەکەمیان لەگەڵ سیاقەکەدا گونجاوترە، چونکە ڕستەکەی دیکەش: ﴿ وَيَزِيدُهُم مِّن فَضْلِهِۦ ﴾، هەر لە هەمان لە سیاقدایە، خوا وەڵامی ئەوانە دەداتەوە کە بڕویان هێناوە و کردەوە باشەکانیان کردوون و، لە بەخششی خۆیشی بۆیان زیاد دەکات، نەك هەر وەڵامیان دەداتەوە، بەڵکو لە چاکەی خۆی بۆشیان زیاد دەکات، ﴿ وَٱلْكَٰفِرُونَ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ ﴾، ئەوانەش کە بێبڕوان هەق دەپۆشن، سزایەکی سەختیان هەیە، واتە: لە ڕۆژی دواییدا، بەڵکو وەك زۆرجاران باسمان کردوە: کەسانی بێبڕواو هاوبەش بۆ خوادانەر، هەر لە دنیادا، لە سزادان، لە ئازار و مەینەتییدان، چونکە ژیانی دوور لە خوایی، ژیانێکی زۆر قورس و زەحمەتە، ژیانی لە خوا بێ خەبەر بوون، ژیانێکی پڕ مەینەتیی و ئازارە، ئێمە کاتی خۆی لە تەفسیری سوورەتی (**الشعراء**)دا، لەبەر ڕۆشنایی ئەو ئایەتەدا کە دەفەرموێ: ﴿ فَلَا تَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتَكُونَ مِنَ ٱلْمُعَذَّبِينَ ﴿٢١٣﴾ ﴾، لەگەڵ

خوادا لە پەرستراوی دیکە مەپارێوە، ئەگەرنا لە سزا دراوان دەبی، لەوێ کورتە باسێکمان لەو بارەوە کردوە، کە دەفەرموێ: ﴿ فَتَكُونَ مِنَ ٱلْمُعَذَّبِينَ ﴾، بەڵێ، بە پلەی یەکەم سزای ڕۆژی دوایی دەگرێتەوە، چونکە ژیانی دنیا هیچ نیەو زوو دەبڕێتەوە، خۆش بێ، یان ناخۆش بێ، بەڵام بە تەئکید هەر سزای ڕۆژی دوایی ناگرێتەوە، هەر لە دنیاشدا بابای هاوبەش دانەرو دوور لە خواو بێبڕوا، لە ئازارو مەینەتییەکی سەخت و بێزەزادایە.

﴿ وَلَوْ بَسَطَ ٱللَّهُ ٱلرِّزْقَ لِعِبَادِهِۦ لَبَغَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، ئەگەر خوا بژیوی بۆ بەندەکانی فراوان کردبایە، بۆی زۆر کردبان، ﴿ لَبَغَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، لە زەویدا زێدەڕۆییان دەکرد، سنوورشکێنییان دەکرد، دەستدرێژییان دەکرد، ﴿ وَلَٰكِن يُنَزِّلُ بِقَدَرٍ مَّا يَشَآءُ ﴾، بەڵام ئەوەندەی بیەوێ بە ئەندازەیەکی دیارییکراو دایدەبەزێنێ، ﴿ إِنَّهُۥ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرٌۢ بَصِيرٌ ﴾، بە دڵنیایی خوا شارەزاو بینەری بەندەکانیەتی، ئەم ئایەتە موبارەکە کە بێگومان پێویستی بە شیکردنەوەی زیاتر دەکات و، ئێمە لە مەسەلە گرنگەکاندا زیاتر تیشکی دەخەینە سەر، بەڵام لێرەش ئەوەندە دەڵێین: خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ بَسَطَ ٱللَّهُ ٱلرِّزْقَ لِعِبَادِهِۦ ﴾، مەبەست ئەوە نیە کە خوا ئەگەر بژیوی بەندەکانیدابایە، بەڵکو یانی:

أ- ئەگەر بژیوی بۆ زۆر کردبان، بە شێوەیەك کە لە پێویستی خۆیان، زیاد بێ، ئەو کاتە: ﴿ لَبَغَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، سنوورشکێنییان دەکرد لە زەویدا، بە هۆی ئەو بژیو زۆرییەو، ئەو نازو نیعمەتە زۆرانەوە کە لە خۆیان زیادە.

ب- یاخود: ئەگەر خوا بژیوی هەموو بەندەکانی زۆر کردبایەو، جیاوازیی نەخستبایە نێوانیان، ئەو کاتە سنوورشکێنیی و سنووربەزێنیی لە نێوانیاندا دەبوو، چونکە هیچ کامیان پێوستییان بەوی دیکە نەدەبوو، نە ئەوەی ساماندارە، پێویستیی بە ئەوی دیکە دەبوو، نە ئەوەی بێ سامانە، پێویستیی بەسامانادارەکە دەبوو، پارەی لێ وەربگرێ و کارێکی بۆ بکات، ئەویش کەسی نەدەبوو هەندێك کاری بۆ بکات.

ج- یاخود: مەبەست ئەوەیە: ئەگەر خوا ﷻ ئەو بەندانەی دوور لە خوان، بژێوی بۆ زۆر بکردبانایە، زیاد لەوەی کە هەیانە، پێی لە خۆبایی دەبوون، وەك دەفەرموێ: ﴿ كَلَّآ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَيَطْغَىٰٓ ﴿٦﴾ أَن رَّءَاهُ ٱسْتَغْنَىٰٓ ﴿٧﴾ ﴾العلق، کەواتە: مەرج نیە وشەی (لعبادە) بۆ مەدح بێ، بەڵکو مەبەست مانای گشتیی (عباد)ە، ئەوانەی بەندەی خوان، ملکەچن بۆ خوا، بەپێی سیستمی خوا کە دایناوە لە گەردوون دا، بەڕێوە دەچن، نەك ملکەچبن بۆ شەریعەتی خوا کە بە پێغەمبەران دا ناردوویەتی صەڵات و سەلامی خوایان لەسەربێ.

﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى يُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ مِنۢ بَعْدِ مَا قَنَطُوا۟ ﴾، هەروەها خوا ئەو زاتەیە (ئەو کەسەیە) کە ئاو دادەبەزێنێ، ئاوێك کە دەفریای خەڵك دێ و خەڵك داوای کردوە، چاوەڕوانییان کردوە، بۆیان دادەبەزێنێ، ﴿ مِنۢ بَعْدِ مَا قَنَطُوا۟ ﴾، دوای ئەوەی نائومێد بوون، ﴿ وَيَنشُرُ رَحْمَتَهُۥ ﴾، بەزەیی خۆیشی بڵاودەکاتەوە، کە بەزەییەکەی ئاوەکەیە، یاخود شوێنەواری ئاوەکەیە، کە کشتوکاڵ و دەغڵ و دان و، دارو درەخت و میوەو سەوزەو گیاو پاوان و لەوەڕگاو ... هتدە، ئەوانە هەمووی شوێنەواری بەزەیی خوان، وەك لە سوورەتی (**الروم**)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ فَٱنظُرْ إِلَىٰٓ ءَاثَٰرِ رَحْمَتِ ٱللَّهِ كَيْفَ يُحْىِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَآ ﴿٥٠﴾ ﴾، تەماشای شوێنەواری بەزەیی خوا بکە، وشەی (رَحْمَت) یانی: بەزەیی، بەڵام لێرەدا خوازراوەتەوە بۆ باران، یاخود: بۆ ئەو ئاوەی لە ئاسمانەوە دادەبەزێ، وەك لە سوورەتی (**الأعراف**)یشدا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى يُرْسِلُ ٱلرِّيَٰحَ بُشْرًۢا بَيْنَ يَدَىْ رَحْمَتِهِۦ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَقَلَّتْ سَحَابًا ثِقَالًا سُقْنَٰهُ لِبَلَدٍ مَّيِّتٍ فَأَنزَلْنَا بِهِ ٱلْمَآءَ فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ ۚ كَذَٰلِكَ نُخْرِجُ ٱلْمَوْتَىٰ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٥٧﴾ ﴾، لە چەند شوێنان خوا ﷻ باسی ئاو دەکات و بە ڕەحمەت ناوی دێنێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى يُرْسِلُ ٱلرِّيَٰحَ بُشْرًۢا بَيْنَ يَدَىْ رَحْمَتِهِۦ ﴾، خوا ئەو کەسەیە کە بایەکان دەنێرێ، وەك موژدەدان، لە پێش دەستی بەزەییەکەیەوە، ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَقَلَّتْ سَحَابًا ثِقَالًا ﴾، هەتا کاتێك ئەو بایە هەورە قورسەکانی هەڵگرتن، ﴿ سُقْنَٰهُ لِبَلَدٍ مَّيِّتٍ ﴾، ئەو هەورە قورسانەمان لێ خوڕین، پاڵ پێوەنان بۆ سەرزەمینێکی

مردوو، ﴿ فَأَنزَلْنَا بِهِ ٱلْمَآءَ ﴾، ئنجا ئاومان لێ دابەزاند (لە شێوەی باران و بەفرو تەرزەدا) ﴿ فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ ﴾، لە هەر میوەیەك پێمان دەرهێنا، ﴿ كَذَٰلِكَ نُخْرِجُ ٱلْمَوْتَىٰ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴾، هەر ئاواش مردووان زیندوو دەكەینەوە، بۆ ئەوەی پەند وەربگرن.

هەروەها لە سوورەتی (**فاطر**)یشدا، هەر هەمان مەبەست دێنێ، دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ ٱلرِّيَٰحَ فَتُثِيرُ سَحَابًا فَسُقْنَٰهُ إِلَىٰ بَلَدٍ مَّيِّتٍ فَأَحْيَيْنَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا ۚ كَذَٰلِكَ ٱلنُّشُورُ ﴿٩﴾ ﴾، خوا ئەو كەسەیە كە بایەكان دەنێرێ و، هەورەكان هەڵدەگیرسێنێ و دروست دەكات، ئنجا لێی دەخورین بەرەو سەرزەمینێكی مردوو، دوای ئەوەی مردوە، پێی زیندوو دەكەینەوە، دووبارە بڵاوبوونەوەی مرۆڤەكانیش هەر بەو شێوەیە.

لە چەند شوێنان دا، خوا ﷻ ناوی لە ئاو (باران و بەفرو تەرزە) ناوە: رەحمەت، بۆ وێنە: لە سوورتی (الروم)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَٱنظُرْ إِلَىٰٓ ءَاثَٰرِ رَحْمَتِ ٱللَّهِ كَيْفَ يُحْىِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَآ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ ۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٥٠﴾ ﴾، تەماشای شوێنەواری بەزەیی خوا بكەن، چۆن زەوی دوایی ئەوەی مردووە، زیندووی دەكاتەوە، هەر ئەو (پەروەردگار)ە {كە ئاوا باس دەكرێ} ژێنەرەوەی مردووانەو لەسەر هەموو شتێكیش بە توانایە.

پێشتریش باسی ناردنی بایەكان و دروستبوونی هەورەكان و، پاشان ئاو دابارین لەو هەورانە دەكات، دەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى يُرْسِلُ ٱلرِّيَٰحَ فَتُثِيرُ سَحَابًا فَيَبْسُطُهُۥ فِى ٱلسَّمَآءِ كَيْفَ يَشَآءُ وَيَجْعَلُهُۥ كِسَفًا فَتَرَى ٱلْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَٰلِهِۦ ۖ فَإِذَآ أَصَابَ بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦٓ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴿٤٨﴾ وَإِن كَانُوا۟ مِن قَبْلِ أَن يُنَزَّلَ عَلَيْهِم مِّن قَبْلِهِۦ لَمُبْلِسِينَ ﴿٤٩﴾ فَٱنظُرْ إِلَىٰٓ ءَاثَٰرِ رَحْمَتِ ٱللَّهِ ﴿٥٠﴾ ﴾، لێرەش خوای بەرزی مەزن كە دەفەرموێ: ﴿ وَيَنشُرُ رَحْمَتَهُۥ ﴾، بەزەییەكەی خۆی بڵاو دەكاتەوە،

واتـە: ئـەو ئـاوە کـە لـە ئاسـمان دایبەزانـدوە، بـڵاوی دەکاتـەوە: ﴿ وَهُوَ ٱلْوَلِيُّ ٱلْحَمِيدُ ﴾، بـەس ئەویـش سەرپەرشـتیاری ستایشـکراوە.

﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦ خَلْقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، هەروەهـا لـە نیشـانەکانی وی {لـە نیشـانەکانی بەدیهێنەرایەتیـی و، پەروەردگارێتیی و، خاوەنداریێتیی و، مشـوورخۆریەتیی خـوا ﷻ} دروسـتکردنی ئاسـمانەکان و زەوییـە، ﴿وَمَا بَثَّ فِيهِمَا مِن دَآبَّةٍ ﴾، هەروەهـا هەرچـی تێیـدا بڵاوکردوونـەوە لـە پێرۆیـان، (**الدَّابَـةُ: كُلُّ مَـا يَـدُبُّ عَـلَى الأَرْضِ**) (**دَابَـة**): هەرشـتێکە کـە لەسـەر زەوی بـڕوا، هەنـدێ لـە زانایانیـش گوتوویانـە: (**دابـة**) وشـەیەکە هـەر ژیانداریـك دەگرێتـەوە، واتـە: مـرۆڤ و ئـاژەڵان و ژیانـداران بـە گشـتیی، هەروەهـا جنـدو، فریشـتەکانیش، ئەمـە دوایـی پێویسـتییمان پێـی دەبێ، بـەو جـۆرە مانـا لێکدانەوەیـە، چونکـە بـاسی (**دَابَـة**) دەکات و بـاسی بـڵاو کردنـەوەی (**دَابَـةٍ**) دەکات لـە ئاسـمانەکان و زەویـدا، کـە ئایـا تەنیـا مەبەسـت پێـی یەکێکیانـە، کـە زەوییـە و پێـڕۆی تێدان، کـە مـرۆڤ و ئـاژەڵان و دڕنـدان و ژیاندارانـن بەگشـتیی، یاخـود (**دَابَـة**) مەبەسـت پـێ ژیاندارانـە کـە لەسـەر زەوی دەژیـن و، ژیاندارانێکیشـە کـە لـە ئاسـمانن، کـە مەبەسـت پێـی فریشـتەکانن و، جندیـش هـەر لەسـەر زەوییـن، یاخـود مەبەسـت پێـی ژیاندارانـن، چ لـە زەویـدا بـن، چ لـە شـوێنەکانی دیکەدابـن لـە ئاسـماندا، ئنجـا ئـەوە ئاماژەیـەك بـێ، بـۆ ئـەوە کـە ژیـانی وەك هـی ئێمـە لـە لـە چەنـد خڕۆکەیەکـی دیکەشـدا لـە گەردوونـدا هەبـێ؟ دوایـی ئـەوە زیاتـر بـاس دەکەیـن.

﴿ وَهُوَ عَلَىٰ جَمْعِهِمْ إِذَا يَشَآءُ قَدِيرٌ ﴾، خـواش لەسـەر کۆکردنـەوەو خڕکردنەوەیـان هـەر کاتێـك بیـەوێ، توانایـە، واتـە: بەڵـێ بـڵاوی کردوونـەوە بـە ئاسـمانەکان و زەوییدا، بـەڵام هـەر کاتێـك بیـەوێ کۆیـان بکاتـەوە، خڕیـان بکاتـەوە، بـە توانایـە ﷻ.

ئنجـا دێتـە سـەر بابەتێـکی دیکـە، هـەر لـە هەمان سـیاقدا، کە خـوا باسی سیسـتمی خـۆی دەکات، لـە ژیـانی بەشـەردا، دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ ﴾، هـەر بەڵایەکتـان بەسـەر بـێ، کـردەوەی دەسـتی خۆتانـە،

﴿ وَيَعْفُواْ عَن كَثِيرٍ ﴾، لـە زۆریـش چاوپۆشـیی دەکات و دەبـووریّ، بـەڵام هـەر بەڵایەکتـان بەسـەردیّ، هەمـووی دەرهاویشـتەی کـردەوە خراپـەکانی خۆتانـە، وەك لـە سـوورەتی (الـروم)دا، خـوا ﷻ دەفەرمـویّ: ﴿ ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِي ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِي ٱلنَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ ٱلَّذِي عَمِلُواْ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٤١﴾ ﴾، واتە: خراپەو ئاشـووب لـە وشـکانیی و دەریـادا دەرکـەوت بـە هـۆی کـردەی دەسـتی خەڵکـەوە، تاکـو (سـزای) بەشـێك لـەوەی کردوویانـە، پێیـان بچێـژیّ، بەڵکـو بگەڕێنـەوە.

هەروەهـا لـە سـوورەتی (آل عمـران)دا، خـوا ﷻ دەفەرمـویّ: ﴿ أَوَلَمَّآ أَصَٰبَتْكُم مُّصِيبَةٌ قَدْ أَصَبْتُم مِّثْلَيْهَا قُلْتُمْ أَنَّىٰ هَٰذَاۖ قُلْ هُوَ مِنْ عِندِ أَنفُسِكُمْۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٦٥﴾ ﴾، واتـە: ئایـا کـە بەڵایەکتـان بەسـەر هـات ، کـە ئێـوە پێشـتر دووقـاتی ئەوەتـان بەسـەر دوژمنتـان هێنابـوو، گوتتـان: ئـەوە لـە کوێـوە بـوو؟ بڵـێ: لـە خۆتانەوەیـە، بێگومـان خـوا لەسـەر هەمـوو شـتێك توانایـە، واتـە: دەرهاویشـتەی کـردەوە خراپـەکانی خۆتانـە.

هـەروەك دیسـان لـە سـوورەتی (**آل عمـران**)دا، خـوا ﷻ دەفەرمـویّ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَلَّوْاْ مِنكُمْ يَوْمَ ٱلْتَقَى ٱلْجَمْعَانِ إِنَّمَا ٱسْتَزَلَّهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ بِبَعْضِ مَا كَسَبُواْۖ وَلَقَدْ عَفَا ٱللَّهُ عَنْهُمْۗ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ ﴿١٥٥﴾ ﴾، واتـە: بـە دڵنیایـی ئەوانـەی لـە ڕۆژی پێکگەیشـتنی دوو کۆمەڵەکـەدا، پشـتیان لـە دوژمـن کـرد (چ ئەوانـەی شـوێنی خۆیـان بەجێهێشـت، چ ئەوانـەی کاتـێ جەنگەکـە گـەرم بـوو پشـتیان لـە دوژمـن کـرد) ئەوانـە شـەیتان خلیسـکاندنی بـە هـۆی هەندێـك لـە کردەوەکانیانـەوە {کـە پێشـتر کردبوویانـن} خـواش چاوپۆشـیی لێکـردن، بەدڵنیایـی خـوا لێبـوردەی هێدییـە.

بەڵـێ گوناهـو تاوانێـك کـە ئێسـتا دەیکـەی، دوایـی لێـت وەدەردەدا، وەك کەسێك کـە خـۆی ناپارێـزیّ لـە هەنـدیّ جـۆرە خـواردن، بـۆ وێنـە: لـە چەوریـی و شـیرینیی، دوایـی باجەکـەی دەدات، هەروەهـا کەسـێك کـە ئێسـتا کەمتەرخەمییـەك دەکات، دوایـی باجەکـەی دەدات.

کەواتــە: کــە خــوا دەفەرمــوێ: هــەر بەڵایەکتــان بەســەر دێ، کــردەی دەســتی خۆتانــە، واتــە: دەرهاویشــتەی کــردەوە خراپــەکانی خۆتانــە، ﴿ وَيَعْفُواْ عَن كَثِيرٍ ﴾، لــە زۆریــش دەبــووری، واتــە: مەرجیــش نیــە هــەر هەڵەیەکتــان کــرد، خــوا بــە هۆیەوە ســزاتان بــدات و بەڵایەکتــان بەســەر بێنــێ، زۆرجــار چاوپۆشییشــتان لــێ دەکات.

﴿ وَمَآ أَنتُم بِمُعۡجِزِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾، ئێـوەش دەستەوسـانکەر نیـن لە زەویدا، واتە: دەستەوسـانکەری خـوا نیـن، یـانی: ئێـوە ناتوانـن خـوا بـێ توانـاو دەسـتەپاچەو بـێ دەسـتەڵات بکـەن، هـەر کاتێـك بیـەوێ سـزاتان بـدات، سـزاتان دەدات و لـە دەسـتی قوتـارو دەربـاز نابـن، یاخـود: هەرکاتـێ خـوا بیـەوێ بتانمرێنـێ، دەتانمرێنـێ، ﴿ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴾، جگــە لــە خــواش هیــچ سەرپەرشــتییاو هیـچ یارمەتییـدەرو هاوکارییشـتان نابـن.

کەواتـە: لـە خـوا عاسـێ مەبـن و لێـی یاخیـی مەبـن، پشـتی تێمەکـەن، پابەندبـن بــە بەرنامــەو شــەریعەتەکەیەوە، بــۆ ئــەوەی دووچــاری باجــدانی هەڵــەو کــەم و کوڕییــەکانی خۆتــان نەبــن.

﴿ وَمِنۡ ءَايَٰتِهِ ٱلۡجَوَارِ فِي ٱلۡبَحۡرِ كَٱلۡأَعۡلَٰمِ ﴾، هەروەهــا لــە نیشــانەکانی {بەدیهێنەرایەتیـی، پەروەردگارێتیـی و، خاوەندارێتیـی} وی، کەشـتییە ڕۆیشـتووەکانن لــە دەریــادا، وەك چیــا بەرزەکانــن، (جَــوار) بــە دوو شــێوە خوێنراوەتــەوە:

أ- بە ژێر (جَوارِ).

ب- بە (ي)یش (**الجواري**)، لە هەردوو حاڵاندا، (**الجوار**) کۆی (**جارية**)یە، یانی: ڕۆیشتوو، بە ئاودا ڕۆیشتوو کە ئاوەڵناوی وەسفکراوێکی قرتێنراوە، یانی: (**السُّفُن الجَوَار**) یان (**الفُلكُ الجَوَار**) کەشتییە ڕۆیشتووەکان بە دەریادا، ﴿ كَٱلۡأَعۡلَٰمِ ﴾، کۆی (**عَلَم**)ە، (**عَلَم**) بە مانای چیا دێ، هەروەك (**عَلَم**) بە مانای هەر نیشانەیەك دێ، کە شتێکی پێ دەناسرێ، یان پێی بەڕێ دەزانرێ، یاخود خەڵکێکی پێ دەناسرێ.

﴿ إِن يَشَأْ يُسْكِنِ ٱلرِّيحَ ﴾، ئەگەر خوا بیەوێ با دەوەستێنێ، خوێنراویشەتەوە: (**الرِّيَاح**) بایەکان دەوەستێنێ، ئەگەر با نەهات، بۆ کەشتیی چارۆکەدار، کاتی خۆی و ئێستاشی لەگەڵدابێ، ئەگەر بەرەو ئەو ئاراستەیەدا بێ کە فڕۆکەکە بۆی دەچێ، کەشتییەکە بۆی دەچێ، خێراتر دەڕوا بەڵام ئەگەر با پێچەوانەی ئەو ئاراستەیە بێ، کە کەشتیی، یان فڕۆکە بۆی دەچێ، دوا دەکەوێ.

ئێمە لە کۆتایی ساڵی: (٢٠١٠ز)دا، سەفەرێکی[1] کەمبۆیامان کرد، لە (**مَنامة**)ی بەحرەینەوە چووین بۆ (کالالامپوور) پایتەختی (مالیزیا) بە (١٠) سەعات چووین، بەڵام بە (١٢) ساعەت گەڕاینەوە، واتە: دوو سەعات زیاتر، لەبەر ئەوەی با بە پێچەوانەی ئاراستەی فڕۆکەکەمان دەهات.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ فَيَظْلَلْنَ رَوَاكِدَ عَلَىٰ ظَهْرِهِۦٓ ﴾، کەشتییەکان لەسەر پشتی دەریاکە بە چەسپاویی و ڕاوەستاویی و نەجووڵاویی دەمێننەوە، (**رَوَاكِد**) کۆی (**رَاكِدة**)یە، یانی: (**ثابتة**) وەستاو، نەجووڵاو، لەسەرپشتی دەریا، ﴿ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴾، بە دڵنیایی لەوەدا نیشانە هەن، بۆ هەر زۆر خۆڕاگرێکی زۆر سوپاسگوزار، واتە: بۆ هەر بڕواداریێک، چونکە بڕوادار لە بەرانبەر بەڵاکانی خوادا خۆڕاگرە، لە بەرانبەر ناڕەحەتیی و نەهامەتییەکاندا، خۆڕاگرەو بە چۆك دانایەت و، تەسلیم نابێ، بێ هیواو، نائومێد نابێ، لە بەرانبەر چاکەو نیعمەتەکانی خواش دا سوپاسگوزارە، چاکەکانی خوا نادیدە ناگرێ و بە ئەمەگ و بە وەفایە.

کەواتە: نیشانەکانی خوا ﷻ کێ زیاتر دەرکیان دەکاو هەستیان پێ دەکات؟ بەدڵنیایی کەسێك ئیمان و تەقوا لە دڵ و دەروونیدا هەبێ، چونکە کەسێك ئیمان تەقوا لە دڵ و دەروونیدا هەبێ، دەڕازێتەوە بە هەموو سیفەتە بەرزەکان، بە تایبەت هەردوو سیفەتی صەبرو شوکر، کە دوو سیفەتی زۆر کۆکەرەوەن، (صبر):

---

(١) بەبۆنە بەشداریی لە کۆبوونەوەی خولیی پەرلەمانتارە ئاسیاییەکان لە شاری (پنومنە) پایتەختی کەمبودیا.

واتــە: خۆڕاگریــی لــە بەرانبــەر هــەر شــتێك دا کــە ناخۆشــە، (شُــکر)یش، واتــە: سوپاسـگوزاریی و بەکارهێنـانی چاکـەکانی خـوا لـە ڕەزامەندیـی خـوادا.

﴿ أَوۡ يُوبِقۡهُنَّ بِمَا كَسَبُواْ وَيَعۡفُ عَن كَثِيرٖ ﴾، یاخـود {ئەگـەر بایەکـەش نەوەسـتێنێ، بایەکــە زۆر بەهێــز دەکات و} بــە هــۆی ئــەوەوە کــە سەرنشــینەکانی ئــەو کەشــتییانە کردوویانــە، لــە کــردەوەی خــراپ و تــاوان، کەشــتییەکان نغــرۆ دەکات: ﴿ يُوبِقۡهُنَّ ﴾، یـانی: (یهلکهـن)، (یغرقهـن)، کەشـتییەکان لـە بەیـن دەبـات، ﴿ بِمَا كَسَبُواْ ﴾، بـە هـۆی کـردەوەی سەرنشـینەکانی کەشـتییەکانەوە، ﴿ وَيَعۡفُ عَن كَثِيرٖ ﴾، لـە زۆریـش دەبووری، واتــە: مــەرج نیــە بــە هــۆی تــاوان و خراپــەی مرۆڤەکانــەوە، خــوا هەمیشــە ســزایان بــدات لــە دنیــادا، بــەڵام جارجــار ســزایان دەدات: ﴿ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ ﴾، الــروم - ٤١-، بەڵکــو بگەڕێنــەوە، یاخــود بزانــن کــە لایانــداوە لــە سیســتم، بــەڵام هەمــوو جــارێ ســزایان نــادات، چونکــە دنیــا شــوێنی تەصفیــە حیســاب نیــە، جێــی ســزاو پاداشــت نیــە.

﴿ وَيَعۡلَمَ ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا مَا لَهُم مِّن مَّحِيصٖ ﴾، (وَيَعْلَــمَ) هــەم بــە ســەر (فتحة) خوێنراوەتــەوە، واتــە: بۆیــە خــوا ﷻ کەشــتییەکان ئەگــەر بیــەوێ دەفەوتێنــێ و نغرۆیــان دەکات، تاکــو ئەوانــەی لــە دژی ئایەتــەکانی ئێمە شــەڕە قســەو مشــت و مڕ دەکــەن، بزانــن هیــچ ڕێــی دەربازبوونیــان نیــە، هەروەهــا خوێنراویشــەتەوە: (**وَيَعْلَمُ**) ئــەو کاتــەش دەبێتــە ڕســتەیەکی دەســتپێکردوو (**جملـة مستأنفة**) واتــە: ئەوانــەی شــەڕە قســە دەکــەن لــە دژی ئایەتــەکانی ئێمــە، دەزانــن کــە هیــچ ڕێــی دەربازبوونیــان نیــەو، قوتــار نابــن لــە چنگــی ئێمــە.

ئــەوەی لــە کــۆی ئــەو یــازدە (١١) ئایــەت موبارەکــە وەردەگیــرێ، هەر لەســەرەتاوە کــە خــوا ﷻ بــاسی ئــەوە دەکات: گەڕانــەوەی بەنــدەکانی وەردەگــرێ و لــە خراپەکانیان دەبــووری و دەشــزانێ چــی دەکەن؟

دواییــش کــە دەفەرمــوێ: وەڵامــی ئەوانــە دەداتــەوە کــە بڕوایــان هێنــاوەو کــردەوە باشــەکان دەکــەن و لــە بەخشــشی خــۆی بۆیــان زیــاد دەکات، بــەڵام بێبڕوایان ســزایەکی ســەختیان هەیە.

دوایی باسی ئەوە دەکات، کە ئەگەر خوا بژیو فراوان بکات، بۆ مرۆڤەکان، لە ئەندازەی پێویستییان زیاتر بۆیان فراوان بکات، یاخود بۆ هەموویان فراوان بکات، یان بۆ کەسانێکیان کە ئەهلی ئیمان و تەقوانین و بە بژیوی زۆر بوغرا دەبن و لە خۆیان بایی دەبن، ئەگەر بژیویان بۆ زۆر بکات، ئەوانە لە زەویدا سنوورشکێنیی و سنوور بەزێنیی دەکەن، بۆیە خوا بە ئەندازە، ئەوەندەی بیەوێ دەینێرێتە خوار، چونکە بەبەندەکانی ئاشنایە و دەشیانبینێ.

دوایی باسی دابەزاندنی ئاو دەکات، لە ئاسمانەوە، دوای چاوەڕوانیی خەڵك، چونکە (**الغَيْث**): ئاوێکە بەفرو باران و تەرزەیەکە دەبارێت، دوای ئەوەی خەڵك چاوەڕوانیی کردوە، چونکە دەفەرموێ: ﴿ مِنۢ بَعۡدِ مَا قَنَطُواْ وَيَنشُرُ رَحۡمَتَهُۥۚ ﴾، دوای ئەوەی نائومێد بوون و، بەزەیی خۆی بڵاودەکاتەوە.

دوایی باسی ئەوە دەکات کە دروستکرانی ئاسمانەکان و زەوی و، ئەو ژیاندارانەی، یاخود ئەو پێرۆیانەی تێیاندان، دیسان نیشانەی خوان و، خوا دەتوانێ کۆیان بکاتەوە.

دوایی باسی ئەوە دەکات کە هەر بەڵایەکتان بەسەر بێ، بە هۆی کردەی دەستی خۆتانەوەیە، زۆرجاریش دەتانبووریێ.

ئنجا دەفەرموێ: ئێوە دەستەوسانکەری خوا نین لە زەویداو، بێجگە لە خواش هیچ سەرپەرشتیارو یارمەتییدەرێکتان نیە.

پاشان باسی نیشانە بوونی کەشتییەکان دەکات، کە ئەگەر خوا بیەوێ، بایەکان دەوەستێنێ و، کەشتییەکان لەسەر پشتی دەریا ڕادەوەستن، یاخود نغرۆیان دەکات، بەوە کە بایەکە توندتر بکات و، ئەوانە شەڕە قسە دەکەن لە دژی ئایەتەکانی خوا، دەزانن هیچ ڕێی دەربازبوونیان نیە.

هەموو ئەوانە، ئەگەر تەماشایان بکەین دەزانین: خوا ﷻ لە هەموو دەروازانەوە بۆ دڵی مرۆڤ دێت، لە هەموو دەلاقانەوە ئایەتەکانی خوا دەیانەوێ هیدایەت

بخەنە نێو دڵ و عەقڵی مرۆڤەوە، کە ئەگەر بگەڕێنەوە خوا تەوبەتان لێوەردەگرێ و، خوا لە بەخششی خۆی بۆتان زیاد دەکات، خوایە کە بژیوتان دەدات، بەڵام کە جاری وایە زۆری ناکات، بۆ ئەوەیە لە زەوییدا سنوور شکێنیی نەکەن، خوایەك کە ئاوتان بۆ دادەبەزێنێ، هەروەها بەڵاتان کە بەسەردێ، خەتای خۆتانە، کەشتییەکانیش کە دەبینن بەو شێوەیە، نیشانەی گەورەیی و پەروەردگارێتیی خوان ... هتد، ئەمانە هەموویان جووڵێنەرن بۆ ئینسان بەرەو خوا، بەرەو خوا بە یەکگرتن، بەرەو تەنیا خواپەرستن و واز هێنان لە ڕووکردنە جگە لە خوا، واز هێنان لە هاوبەش بۆ خوا دانان، وازهێنان لە گرتنی کوێرەڕێ و ڕێچکەکان کە شەیتانەکان دەیانڕازێننەوە، بەڵام سەرەنجام سەری مرۆڤەکان بە قوڕدا دەکەن، هەم لە دنیادا کارێکیان پێدەکەن، ببنە کۆیلەی کەسێکی وەك خۆیان، یان شتێکی لە خوار خۆیانەوە، لەو مەقامی بەرزیی بەندایەتیی بۆ خوا، کە ئازادیی و ئازایەتیی مرۆڤ و بەرزیی و گەورەیی مرۆڤ لە بەندایەتیی بۆ خوا دایە، کە مرۆڤەکان وەك خۆی تەماشادەکات و، شتەکانی دیکەش لە خوار خۆیەوە دەبینێ و، تەنیا خوا لەسەرووی خۆیەوە دەبینێ.

بۆیە ئەگەر تەماشای ئەم یازدە (١١) ئایەتەو، کۆی ئایەتەکانی ئەم سوورەتەو، کۆی ئایەتەکانی قورئان هەموویان بکەین، دەبینین هانندەری مرۆڤن بۆ بەندایەتیی کردن بۆ خوا، تاکو ئەو مرۆڤە بە هۆی ئەو بەندایەتییەوە بۆ خوا، بەرزبێ و، ئەو پێگە بەرزەی خوا پێی داوە، لێی نەیەتە خوار، ئەو ڕێزو حورمەتەی خوا لێیناوە، لە دەستی نەدات بە هۆی کوفرو شیرکەوە.

خوا بە لوتف کەرەمی خۆی ئێمە لەو کەسانە بگێڕێ، کە بە هۆی بەندایەتییمانەوە بۆ خوا، ئەویش لەمیانی شوێنکەوتنی قورئان و، پەیڕەویی کردن لە پێغەمبەر کۆتایی موحەممەد ﷺ و، بەو شێوەیە مامەڵە کردن لەگەڵ خوادا، کە بۆ خوا شایستەیە، بە هۆی ئەوەوە، هەم لە دنیادا بەختەوەرو سەربەرزبین و، هەم لە دوا ڕۆژدا سەر فرازو شادمان بین.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**خوا ئـەو کەسـەیە گەڕانـەوەو تەوبـە لە بەنـدەکانی وەردەگـرێ و، لـە خراپەکانیان دەبـوورێ و، دەشـزانێ چـی دەکـەن، هەروەهـا خـوا وەڵامـی داواکاریـی بـڕوادارانی چاکـەکار دەداتـەوەو، لـە بەخششـی خـۆی بۆیـان زیـاد دەکات، بێبڕوایانیـش لـە ڕۆژی دوایـی دا، سـزای سـەختیان هەیـە:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى يَقْبَلُ ٱلتَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِۦ وَيَعْفُوا۟ عَنِ ٱلسَّيِّـَٔاتِ وَيَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ ﴿٢٥﴾ وَيَسْتَجِيبُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَيَزِيدُهُم مِّن فَضْلِهِۦ ۚ وَٱلْكَٰفِرُونَ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ ﴿٢٦﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى يَقْبَلُ ٱلتَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِۦ ﴾، ئەو (خوا) ئەو کەسەیە کە گەڕانەوە لە بەندەکانی وەردەگرێ. خوا ﷻ لەو ئایەتانەدا لەسەر ناساندنی خۆی لەمیانی سیفەت و کردەوەکانیداو، لەمیانی چاکەو نیعمەتەکانیدا، بەردەوام دەبێ، هەروەها لەسەر خستنەڕووی هەموو ئەو بەڵگەو هۆکارانەی کە مرۆڤەکان دەبێ تەنیا خوا بە تاکە پەرستراوی خۆیان بزانن، بە مانای وشەی فراوان و گشتگیری پەرستن، ئەو ئایەتانە، هەموویان لەو ڕەوتەدان: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى يَقْبَلُ ٱلتَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِۦ ﴾، خوا ئەو کەسەیە کە گەڕانەوە لە بەندەکانی وەردەگرێ، لێرەدا ئەم ڕستە موبارەکە، چوار زێدەڕۆیی تێدان، لە ڕووی ڕەوانبێژییەوە، بۆ جەختکردنەوە لە سەر ماناو مەبەستەکەی:

**یەکەم:** کە دەفەرموێ: (**وَهُوَ**) بە ڕستەی ناویی (**الجملة الإسمية**) دەست پێدەکات، ئەمە یەکێکە لە جەختکەرەوەکان، چونکە (**هُوَ**) ڕاناوەو بەو ڕاناوە، ئەم ڕستەیە دەست پێدەکات.

**دووەم:** کە دەفەرمویٚ: (**الَّذِي**) کە (**الإِسْم المَوْصُول**)ە، (خوا) ئەو کەسەیە.

**سێیەم:** کە دەفەرمویٚ: (**يَقْبَلُ التَّوْبَة**) (**يَقْبَلُ: فعْلُ المُضَارع**)ە، کرداری ئێستاو دەلالەت لەسەر تازەبوونەوە دەکات، یانی: بەردەوام خوا گەڕانەوەی بەندەکانی بۆ لای خۆی قبووڵ دەکات و لێیان وەردەگریٚ.

**چوارەم:** کە دەفەرمویٚ: (**عَنْ عِبَادِهِ**) نەیفەرمووە: (**مِنْ عِبَادِهِ**) ئنجا (**تَقَبَّلَ التَّوْبَة عَنْهُ**) واتە: لە گوناهەکەی بوردو، گەڕانەوەکەشی لیٚ قبووڵ کرد، هەروەها خوا ﷻ بە سیفەتی (**عِبَادِهِ**) مرۆڤەکانی باسکردوە، کە بەندەی خۆینی.

٢)- ﴿ وَيَعْفُوا۟ عَنِ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ﴾، چاوپۆشیی دەکات لە خراپەکان، (**العَفْو: عَدَمُ مُؤَاخَذَةِ الجَانِي بِجنَايَتِهِ**) (**عَفْو**): بریتیە لەوەی بابای تاوانبار بە تاوانەکەی نەگیریٚ و سزا نەدریٚ.

وشـەی (**السَّيِّئَات**)یش، (**أل**) ناسـاندنی لەسـەرەو ناسـاندنەکەش بـۆ تێکـڕا (**جنس**) ە، تێکـڕای خراپـەکان خـوا ﷻ چاوپۆشـییان لیٚـدەکات.

٣)- ﴿ وَيَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ ﴾، دەشزانیٚ چی دەکەن، ئەی دوێنراوەکان! خوێنراویشەتەوە: (**يَفْعَلُون**) واتە: دەزانیٚ خراپەکاران و تاوانباران، یان مرۆڤەکان بە گشتیی، چی دەکەن؟

ئنجـا کـە دەفەرمـویٚ: دەزانـیٚ چـی دەکـەن؟ واتـە: لەگـەڵ ئەوەشـدا کـە دەزانـیٚ چـی دەکـەن، ئەوجـار ئەگـەر بگەڕێنـەوە، گەڕانەوەکەیـان قبـووڵ دەکات و، لـە تێکـڕای خراپەکانیشـیان چاوپۆشـیی دەکات و دەیانبەخشـیٚ، لەگـەڵ ئەوەشـدا کـە دەزانـیٚ چییتـان کـردوە، یـان دەزانـیٚ چییـان کـردوە، بـە هـەردوو خوێندنەوەکـە.

٤)- ﴿ وَيَسْتَجِيبُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ ﴾، هەروەها وەڵامی ئەوانەی بڕوایان هێناوەو، کردەوە باشەکانیان کردوون، دەداتەوە.

٥)- ﴿ وَيَزِيدُهُم مِّن فَضْلِهِۦ ﴾، لە بەخششی خۆیشی بۆیان زیاد دەکات، واتە: (**يُعْطِيهِمْ أَفْضَلَ مِمَّا عَمِلُوا وَأَكْثَرَ**) باشترو زیاتر لەوەی کە کردوویانە پاداشتیان دەداتەوە، لە سوورەتی (**الأنعام**)دا، خوا دەفەرمویٚ: ﴿ مَن جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشْرُ أَمْثَالِهَا ۖ وَمَن جَآءَ

بِٱلسَّيِّئَةِ فَلَا يُجْزَىٰٓ إِلَّا مِثْلَهَا وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿١٦٠﴾ ﴾، هەر کەسێك چاکەیەك بێنێ، دە (١٠) بەرانبەری ئەوە پاداشتی دەدرێتەوەو، هەر کەسێك خراپەیەك بکات، تەنیا بە ئەندازەی ئەو خراپەیە سزادەدرێ و، ئەوان ستەمیان لێناکرێ، پێشتریش باسمان کرد، کە ئایەتەکەی سوورەتی (**البقرة**) ئاماژە بەوە دەکات، کە چاکەیەك بە حەوتسەدیش پاداشت دەدرێتەوە، بەڵکو زیاتریش.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ وَيَسْتَجِيبُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴾، (**يَسْتَجِيْبُ**) (**س وت**) خراونە سەر (**يُجِيبُ**) یانی: وەڵامدەداتەوە، بەڵام (**يَسْتَجِيْب**) واتە: زۆر وەڵامدەداتەوە، بە جەختکردنەوەوە وەڵامدەداتەوە.

(**الَّذِيْن**)ش دەگونجێ بەرکار (**مفعول به**)بێ، واتە: خوا وەڵامی ئەوانە دەداتەوە کە بڕوایان هێناوەو کردەوەی باشیان کردوە.

دەشگونجێ (**الَّذِيْن**) بکەر (**فاعل**)بێ، واتە: ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کردەوە باشەکان دەکەن، وەڵامدەدەنەوە، بە دەم بانگەوازی خواوە دەچن، کەواتە: (**يَسْتَجِيْب**) دەگونجێ بڵێی: (**الَّذِيْن آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَات يَسْتَجِيْبُون**) یانی: ئەوان وەڵامدەدەنەوە، یاخود: (**أَللهُ يَسْتَجِيْبُ الَّذِيْن آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَات**) خوا وەڵامی ئەوانە دەداتەوە کە بڕوایان هێناوەو کردەوە باشەکانیان کردوون،

٦)- ﴿ وَٱلْكَٰفِرُونَ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ ﴾، ئەوانەش کە بێبڕوان سزایەکی سەختیان هەیە، وشەی (**كَافِرُون**) کۆی (**كَافِر**)ە، لەسەر کێشی (**فَاعِل**)، یانی: کەسێك کە هەقی داپۆشیبێ و هەقی ڕەفز کردبێ، کەواتە: ئەوانەی سزای سەختیان هەیە، ئەوانەن کە هەقیان بۆ دێ و دەیناسن و پێی ئاشنا دەکرێن، بەڵام وەری ناگرن و ڕەتی دەکەنەوە.

## حەوت موژدە لەو دوو ئایەتەدا:

لە ڕاستییدا ئەم دوو ئایەتە موبارەکە، بۆ خۆم هەر جار کە دەیانخوێنم، هیواو ئومێدێکی یەکجار گەورەیان تێدا دەبینم بۆ گوناهباران بە تایبەت و، بۆ

مرۆڤـەکان بـە گشـتیی، ئـەم دوو ئایـەت موبارەکـە زۆر زۆر دڵخۆشـکەرن، چونکـە حـەوت موژدەیـان تێدان، توێـژەرەوان قسـەیان زۆر لەسـەر کـردوون، بـەڵام ئەمبینـوە بـەم شێوەیە ئـەم حـەوت موژدەیـە، دەربهێنن، ئەگـەر هەشـبێ نەکەوتۆتـە بەرچاوم:

**مـوژدەی یەکـەم:** کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى ﴾، خـوا ئـەو کەسـەیە ﷻ، لێرەدا خـوا خـۆی بـە ئێمـە دەناسـێنێ: ئـەو خـوا پـەروەردگارەی ئێـوە، کـە پەیامـی بـە پێغەمبـەری کۆتایـی موحەممـەددا ﷺ بـۆ نـاردوون، هەروەهـا بـە هەمـوو پێغەمبەرانـی دیکـەدا بـۆ گەلانـی دیکـە، بـۆ کۆمەڵگایـەکانی دیکـە، پەیامـەکانی خـۆی نـاردوون، ئـەو کەسـەیە چـاکی بناسـن و زۆر پێـی ئومێدەواربـن.

**مـوژدەی دووەم:** کـە دەفەرمـوێ: ﴿ يَقْبَلُ ٱلتَّوْبَةَ ﴾، گەڕانـەوە وەردەگـرێ، (**التَّوْبَة**) ش، دیـارە (ال)ی، ناسـاندنی لـە سـەرە واتـە: هەمـوو گەڕانـەوەکان وەردەگـرێ، هـەر کەسـێ بگەڕێتـەوە بـۆ لای، چ لـە کوفـرەوە بـۆ ئیـمان بگەڕێتـەوە، چ لـە شـیرکەوە بـۆ خـوا بەیەکگرتـن (**توحیـد اللـه**) بگەڕێتـەوە، چ لـە نیفاقـەوە بـۆ دینداریـی سـاغ و بـێ خڵتـە بگەڕێتـەوە، چ لـە گوناهـو تاوانـەوە بگەڕێتـەوە بـۆ فەرمانبەریـی و گوێڕایەڵیـی، چ لـە کەمتەرخەمییـەوە بگەڕێتـەوە بـۆ گـورج و گۆڵیـی، هەرچۆنێـك مرۆڤـەکان بگەڕێنـەوە بـۆ خزمـەتی خـوا، گەڕانەوەکەیـان لـێ وەردەگـرێ، وەك لـە کتێبـی: (گەڕانـەوە بـۆ لای خـوا) - کـە تاکـو ئێسـتا شـەش جـار چـاپ کـراوە - لەوێـدا بـە تەفصیـڵ بـاسی گەڕانـەوە بـۆ لای خوامـان کـردوە.

**مـوژدەی سـێیەم:** دەفەرمـوێ: ﴿ عَنْ عِبَادِهِۦ ﴾، لـە بەنـدەکانی، مرۆڤـەکان هەرچەنـدە ئەهـلی کوفربـن، ئەهـلی شـیرك بـن، ئەهـلی نیفـاق بـن، ئەهـلی گوناهـو تـاوان بـن، هەرچۆنبن، هـەر بەندەی خۆینـی، ئەمەش دیسـان موژدەو دڵخۆشـکەرێکی دیکەیـە، کـە خـوا مرۆڤـەکان هـەر بـە بەنـدەی خـۆی دەزانـێ، وەك چـۆن بابێـك دایکێـك، ڕۆڵەکـەی خـۆی ئەگـەر لاسـاریش بـێ، ئەگـەر کـوڕە، ئەگـەر کچـە، هـەر بـە هـی خـۆی دەزانـێ، دەڵـێ: تـۆ هـەر ڕۆڵـەو جگـەر گۆشـەی منـی، خـواش ﷻ

مرۆڤەكان هەر بە بەندەی خۆی ناو دێنێ، ئەگەر سەرەڕۆییشیان كردبێ و لاسارییشیان كردبێ.

**مووژدەی چوارەم:** ﴿ وَيَعْفُواْ عَنِ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ﴾، لە هەرچی خراپەو كەم و كوڕییە دەبووورێ، وشەی (**سَيِّئَات**) كۆی (**سَيِّئَة**)یە، (**سَيِّئَة**)ش بۆیە وای پێدەگوترێ، چونكە بۆ خاوەنەكەی خراپە، حاڵی خاوەنەكەی خراپ دەكات، واتە: خوا لە تێكڕای ئەو تاوانانەی، ئەو غەڵەت و پەڵەتانەی بۆ خاوەنەكانیان خراپن، چاوپۆشییان لێ دەكات، ئەگەر خاوەنەكەیان دانیان پێدابنێ و، بگەڕێتەوە بۆ لای خواو لێیان پەشێمان بێ و دەستبەرداریان ببێ.

**مووژدەی پێنجەم:** ﴿ وَيَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ ﴾، یان (**وَيَعْلَمُ مَا يَفْعَلُون**) دەشزانێ چی دەكەن، واتە: لەگەڵ ئەوەشدا كە خوا دەزانێ چی دەكەن، ئەوجاریش خوا ﷻ دەرگای بۆلا گەڕانەوەو بۆلا پەشێمان بوونەوەی خستۆتە سەرپشت، بۆ هەموو مرۆڤەكان.

**مووژدەی شەشەم:** ﴿ وَيَسْتَجِيبُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ ﴾، وەڵامی ئەوانەی بڕوایان هێناوەو كردەوەی باشیان كردوە، دەداتەوە، بە دەنگیانەوە دێ و، لێیان وەردەگرێ، بۆ گوناهباران گەڕانەوەیان لێوەردەگرێ، بەڵام بۆ بڕواداراني كرداری باش، هەمیشە وەڵامگۆیەو بە دەنگەوە هاتوویە، خوای بەخشەری بەخشندە.

**مووژدەی حەوتەم:** ﴿ وَيَزِيدُهُم مِّن فَضْلِهِۦ ﴾، هەروەها لە بەخشش و چاكەی خۆیشی بۆیان زیاد دەكات، واتە: بۆ بڕواداراني كردارباش، هەمیشە خوا ﷻ هەتا داوای لێ بكەن، یاخود تاكو ئەوان شایستەبن، ئەگەر بە زمانی وتاریش داوای لێ نەكەن، بەڵكو بە زمانی حاڵ و كردار، خوا ﷻ بە دەنگیانەوە دێ و وەڵامیان دەداتەوە، لە بەخششی خۆی بۆیان زیاد دەكات، بەخششی خواش بێ سنوورە.

### مەسەلەی دووەم:

**خوا بۆیە بژیو بۆ هەموو بەندەكانی زۆر ناكات، تاكو یاخیی نەبن، بۆیە بە ئەندازە بۆیان دادەبەزێنێ و، هەر ئەویش دوای بێ هیوا بوونیان لە دابەزینی ئاو، بەزەیی خۆی كە لە ئاوی ئاسماندا بەرجەستەیە، بۆیان بڵاودەكاتەوەو، هەر ئەویش سەرپەرشتیاری ستایشكراوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ بَسَطَ ٱللَّهُ ٱلرِّزْقَ لِعِبَادِهِۦ لَبَغَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَٰكِن يُنَزِّلُ بِقَدَرٍ مَّا يَشَآءُ ۚ إِنَّهُۥ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرٌۢ بَصِيرٌ ﴿٢٧﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى يُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ مِنۢ بَعْدِ مَا قَنَطُوا۟ وَيَنشُرُ رَحْمَتَهُۥ ۚ وَهُوَ ٱلْوَلِىُّ ٱلْحَمِيدُ ﴿٢٨﴾ ﴾.

### شیكردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە شەشە بڕگەدا:

١)- ﴿ وَلَوْ بَسَطَ ٱللَّهُ ٱلرِّزْقَ لِعِبَادِهِۦ لَبَغَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، ئەگەر خوا بژیوی بۆ بەندەكانی زۆر كردبایە، بۆی فراوان كردبان، لە زەوییدا یاخیی دەبوون، لێرەدا زانایان زۆریان لەوبارەوە قسە كردوە، كە ئایا مەبەست لەم زۆر كردن و فراوان كردنی بژیو بۆ بەندەكانی، كە دەبێتە هۆی یاخیبوون و سنوورشكێنییان لە زەویدا، چییە؟

أ- هەندێكیان گوتوویانە: ئەگەر خوا هەموو مرۆڤەكانی لە حاڵەتی سامان و بژیو فراوانییدا، دانابایە، ئەوە سسیتمی ژیانیان تێكدەچوو.

ب- هەندێكیان گوتوویانە: هەرچەندە لێرەدا خوا بەندەكانی بە گشتیی فەرموون، بەڵام بەپێی سیاق دەزانین كە مەبەست ئەو بەندانەن، ئەو مرۆڤانەن كە هەڵناگرن و شایستەنین، وەك كوردەواریی خۆمان دەڵێن: (فڵانكەس بە مستە ئاوێك دەكەوێتە مەلە)، یان دەڵێن: (هەر كەسێك چوار عانەی لە گیرفانی خۆیدا بینین، بە هەق لەگەڵ كەسدا ناكات و بوغرا دەبێ).

ج- دەشگونجێ ئاوا مانا بکرێ: ئەگەر خوا بژیو بۆ بەندەکانی زۆر بکات، لەو ئەندازەیەی کە پێویستییانە زیاتر بەسەریاندا بڕێژێ، دەبێتە هۆی سنوورشکێنییان و ستەم و خراپەیان لە زەویدا.

٢)- ﴿ وَلَٰكِن يُنَزِّلُ بِقَدَرٍ مَّا يَشَآءُ ﴾، بەڵام بە ئەندازە دەنێرێتە خوار، ئەوەندەی بیەوێ، (يُنَزِّلُ) بە: (يُنْزِلُ)ش، خوێندراوەتەوە، یانی: بە ئەندازەیەکی دیاریکراو، ئەوەی بیەوێ دایدەبەزێنێ، (بَقَدَرٍ: الْمِقْدَارُ وَالتَّعْيِينُ) ئەندازەو دیارییکردن، کە دەفەرموێ: (مَا يَشَاءُ)، (ما: يَعْنِي الَّذِي يَشَاء إِنْزَالَهُ) ئەوەی کە بیەوێ دایبەزێنێ، بە ئەندازەیەکی دیارییکراو، دایدەبەزێنێ.

٣)- ﴿ إِنَّهُۥ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرٌۢ بَصِيرٌ ﴾، واتە: بەڕاستیی ئەو بەبەندەکانی شارەزایەو بینەریانە، یانی: شارەزایە بە حاڵ و باڵیان، پێش ئەوەی حاڵەت و کردەوەکان لێیان دەربکەون، هەروەها بینەری حاڵ و کردەوەکانیانیشە، دوای ئەوە کردەوەکانیان لێ ئاشکرا دەبن.

لێرەدا سێ دەقی سوننەت دێنین:

**یەکەم:** پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {**أَخْوَفُ مَا أَخَافُ عَلَى أُمَّتِي زَهْرَةُ الدُّنْيا وكَثْرَتُها**} (**أخرجه البخاري: ٦٤٢٧، ومسلم: ١٠٥٢، وغيرهما**).

واتە: ئەوەی کە لە هەموو شتێك زیاتر مەترسییم لێی هەیە لە ئۆممەتەکەم، بریتیە لە جوانیی ژیانی دنیاو، زۆریی (ماڵ و سامانی) دنیا.

واتە: کە زۆر بە سەریاندا بڕژێ و، پێی بوغڕاو یاخیی بن، ئەوەی پێغەمبەریش ﷺ لێی ترساوە، زۆر جوان میصداقەکەی لە سەر ئەرزی واقیع دەبینین، دەوڵەتانی کەنداو تەماشا بکەن، وەختی خۆی وشتر لەوەڕێن بوون، ئێستاش چۆن پێشبڕکە دەکەن لە بەرزکردنەوەی بینایاندا، ئێستا چۆن عیبادو بیلادیان خستۆتە ژێردەستی دوژمنانی خوا، بە فەرمانی جوولەکەو ئەمریکاو ڕۆژئاوا، دەربەست لە خزمەت هەر کەسێك دان، کە لە بەرژەوەندییاندا بێ،

لە بەرژەوەندیی مانەوەیان لەسەر ئەو کورسیی حوکمی میراتیی و بنەماڵەییە، چ لە کەنداو، چ لە میسر، چ لە وڵاتانی دیکەی مسوڵمانانشین دا، بە تایبەت دوای ئەوەی نەوت و گاز دۆزرایەوەو ئەو وڵاتانە دەوڵەمەند بوون، لە جیاتی ئەوەی ئەو دەوڵەمەندیی و سەروەت و سامانە لە ڕەزامەندیی خوادا بەکاربێنن، لە خزمەتی خەڵك و وڵاتیان دا بەکاری بێنن، لە خزمەتکردن و یارمەتییدانی مسوڵمانانی برسیی و ڕەش و ڕووت و چەوسێنراوەی ئەملاولادا بەکاری بێنن، بەکاریان هێنا لە خزمەتکردنی زلهێزان دا و، لە زیاتر چەسپاندن و، زیاتر ڕۆبردنە خواری کورسی حوکم ڕانییان دا، هەروەها زیاتر سەرکوتکردن و دەمکوت کردنی خەڵك و کۆمەڵگاکانی خۆیاندا.

هەروەها لە هەرێمەکەی خۆشمان دا، وێنەی ئەوەی دەوڵەتانی کەنداو بەزەقیی دەبینین.

**دووەم:** پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {**إِذَا أَحَبَّ اللهُ عَبْدًا حَمَاهُ الدُّنْيَا، كَمَا يَظَلُّ أَحَدُكُمْ يَحْمِي سَقِيمَهُ الْمَاءَ**} (**أخرجه الترمذي: ٢٠٣٦، وَصَحَّحَهُ الألباني فِي صَحِيحِ التَّرْغِيبِ وَالتَّرْهِيبِ: ٣١٨٠**).

واتە: ئەگەر خوا بەندەیەکی خۆشویست، لە دنیا دەیپارێزێ، وەك چۆن یەکێك لە ئێوە نەخۆشەکەی لە ئاوێ دەپارێزێ. {کە ئاوی نەداتێ، بۆ ئەوەی زیاتر نەخۆش نەبێ، یان کەسێك کە بریندار دەبێ، ئاوی نادەنێ چونکە لێی تووشی زیان دەبێ}.

**سێیەم:** پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {**إِنَّ اللهَ عَزَّ وَجَلَّ يَحْمِي عَبْدَهُ الْمُؤْمِنَ كَمَا يَحْمِي الرَّاعِي الشَّفِيقُ غَنَمَهُ عَنْ مَرَاتِعِ الْهَلَكَةِ**} (**أخرجه أحمد: ٢٣٦٢٧، والبيهقي في شعب الإيمان: ٩٩٦٧، اللفظ له**).

واتە: بێگومان خوای زاڵی پایەدار بەندەی بڕواداری خۆی دەپارێزێ، وەك چۆن شوانی دڵسۆزو خاوەن پەرۆش، ڕانە مەڕەکەی خۆی دەپارێزێ، لەوە کە لە شوێنی خراپ بلەوەڕێن و، لە ئەنجام دا سەریان بە فەتارەت بچێ، {چ بە هۆی لەوەڕەکەوە کە خراپبێ، چ بە هۆی شوێنەکەوە، کە تووشی هەڵدێران و، لە بەین چوون بێن}.

٤)- ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى يُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ مِنۢ بَعْدِ مَا قَنَطُوا۟ ﴾، خوا ئەو کەسەیە کە ئاو دەنێرێتە خوار، دوای ئەوەی نائومێد بوون، یانی: دوای ئەوەی مرۆڤەکان نائومێد بوون، وشەی **(يُنَزِّلُ)** خوێنراویشەتەوە: **(يُنْزِلُ)**.

**(الْغَيْثُ: الْمَطَرُ الآتِي بَعْدَ الْجَفَافِ، سُمِّيَ غَيْثًا بِالْمَصْدَرِ، لِأَنَّ بِهِ غَيْثَ النَّاسِ الْمُضْطَرِّينَ)** **(غَيْث)**: ئەو بارانەیە کە لە دوای وشکە ساڵیی دێ، دوای بێبارانیی، بۆیە ناوی لێنراوە **(غَيْث)**، چونکە ئەوانەی بێ دەرەتان و ناچارن، هاواریان کردووەو دەفریایان هاتووە.

وشەی **(غَيْث)**: مەرج نیە تەنیا باران بێ، واتە: باران و بەفرو تەرزە، ئەو ئاوەی لە سەرێ دادەبەزێ، گوتراویشە: **(الْغَيْثُ: مَا كَانَ نَافِعاً وَفِي وَقْتِهِ)**، **(غيث)**: ئەوەیە کە بە سوود بێ و، لە کاتی خۆیدا بێ، چونکە جاری واش هەیە باران و بەفرو تەرزە دێ و، مەرج نیە هەر سوودی هەبێ، بەڵکو جاری وایە دەبێتە لافاو لێزماوو، جاری وایە دەبێتە هۆی زیانگەیاند بە کشتوکاڵ، بەڵام ناکرێ لەبەر ئەوەی کەمێك خەڵك کشتوکاڵەکەیان، یاخود خانووەکانیان، کە ئەویش ڕەنگە بە زۆریی بە هۆی کەمتەرخەمیی حوکمەتەکانەوە بێ، زێراب و شوێنی ئاو پێدا ڕۆیشتنیان چاك نەکرد بێ، هەندێك لە گەڕەکەکان زیانیان پێبگات، ناگونجێ لەبەر ئەو زیانە کەمە، ئەو سوودە زۆرانەی کە لە ئاوی ئاسمان دەبینرێن، خوای بەخشەرخەڵکیان لێ بێبەش بکات.

٥)- ﴿ وَيَنشُرُ رَحْمَتَهُۥ ﴾، هەروەها (خوا) بەزەیی خۆی بڵاودەکاتەوە، **(النَّشْرُ: ضِدُّ الطَّيِّ وَاسْتُعِيرَ هُنَا لِلتَّوْسِيعِ وَالإِمْتِدَادِ)**، **(نشر)** پێچەوانەوەو دژی پێچانەوەیە، **(نَشْر)** واتە: بڵاوکردنەوە، **(طَيّ)** واتە: پێچانەوە، لێرەدا **(نشر)** خوازراوەتەوە بۆ فراوانکردن و درێژە پێدان، کە دەفەرموێ: ﴿ وَيَنشُرُ رَحْمَتَهُۥ ﴾، وەك پێشتریش باسمان کرد، لە چەند شوێن لە قورئاندا، خوا ناوی لە باران و ئاوێك کە دادەبەزێ لە ئاسمان، ناوە، ڕەحمەت، بۆ وێنە:

لـە سـوورەتی (الأعـراف)دا، دەفەرمـوێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى يُرْسِلُ ٱلرِّيَـٰحَ بُشْرًۢا بَيْنَ يَدَىْ رَحْمَتِهِۦ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَقَلَّتْ سَحَابًا ثِقَالًا سُقْنَـٰهُ لِبَلَدٍ مَّيِّتٍ فَأَنزَلْنَا بِهِ ٱلْمَآءَ فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ ۚ كَذَٰلِكَ نُخْرِجُ ٱلْمَوْتَىٰ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٥٧﴾ ﴾، واتـە: ئـەو (خـوا) کەسـێکە بایـەکان وەك مـوژدە دەنێـرێ لـە پێـش دەسـتی بەزەییەکـەی خۆیـەوە، (واتـە: بـاران، یـان ئـەو ئـاوەی کـە دادەبەزێـنرێ)، هەتـا کاتێـك کـە ئـەو بایانـە هەورە قورسـەکانیان هەڵگرتـن، ئێمـە لێـی دەخوڕیـن (هەورەکـە) بـەرەو سـەرزەمینێکی مـردوو، ئـاوی لـێ دادەبەزێنیـن و لـە هەمـوو میوەیـەکی پـێ دەردێنیـن، هـەر بـەو شـێوەیەش {لــە کاتــی خۆیــدا} مــردووان دەردێنینــەوە، بــۆ ئــەوەی ئێــوە پەنــد وەربگــرن.

یـانی: وەك چـۆن خـوا بـە هـۆی ئاوێکـەوە کـە دایدەبەزێنـێ، سـەر زەوی زینـدوو دەکاتـەوە، بـە هەمـان شـێوەش، کاتـێ خـۆی فەرمـانی لەسـەرە، لـە ڕۆژی دوایـی دا مردووەکانیـش زینـدوو دەکاتـەوە.

٦)- ﴿ وَهُوَ ٱلْوَلِىُّ ٱلْحَمِيدُ ﴾، هەرئەویش سەرپەرشتیاری ستایشکراوە، سەرپەرشتییکردنەکەی دیارە: سەرپەرشتیی مرۆڤەکان دەکات، تیشکی خۆریان بۆ دەنێرێ لە ڕۆژدا، تیشکی مانگیان بۆ دەنێرێ لە شەوداو، تیشکی ئەستێرەکانیان بۆ دەنێرێ، بۆ ئەوەی دنیا نەبێتە تاریکستان، پاشان ئاویان بۆ دادەبەزێنێ، بە هەر سێ شێوەی بەفرو باران و تەرزە، کە هەر کام لەم سێ شێوەیە حیکمەتی خۆی هەیە، بەفرو تەرزەکە لە شوێنە بەرزەکان دەبارن و لەوێ دەمێننەوە، ئەگەر هەموو ئاوەکە باران بووایە، یەکسەر هەمووی دەهاتە خوار، بەڵام ئەو بەفرو تەرزەیە، لە شوێنە بەرزەکان و چیاکان دەمێنێتەوە، بۆ ئەوەی وردە وردە بەو چیایانەدا بچێتە خوارو، لە عەمبارە ئاوەکاندا دابگیرێ و کۆببێتەوە.

ئنجا ئەگـەر ئـاوی ئاسـمان هەمـووی لێکـڕا بـاران بـاو هاتبایـە خـوار، دنیـا دەبووە لافـاو، ئـەو هەمـوو ڕێـژەی بەفـرە کـە لـە کوێسـتانەکان و لـە شـوێنە بـەرزەکان دەبـارێ، ئـەو ڕێـژە زۆرەی تـەرزە، کـە یەکسـەر ناتوێتـەوە ماوەیـەکی پێدەچـێ،

ئەگەر هەمووی باران بووایە، زۆر لەوڵاتان کاوڵ دەبوون، سەرپەرشتییکردنی خوا بۆ مرۆڤەکان لە زۆر شتدا بەرجەستەیە، ئەو هەموو نازو نیعمەتەی لەسەر زەوی بۆ ڕەخساندوون، ئەو هەموو هۆکارانەی ژیان و گوزەرانی بۆ ڕەخساندوون، ئەم زەوییەی ئێمە بەرگێکی گڵیی هەیە، دوایی بەرگێکی ئاویی هەیە، کە سێ لەسەر چواری پانتایی زەوی دادەپۆشێ، دوایی بەرگێکی هەوایی هەیە، کە بەرزیی هەزار (١٠٠٠) کیلۆمەتر زیاترە، ئنجا پێکهاتەکانی ئەو بەرگە هەواییە، ڕێژەکەیان لەگەڵ ژیانی مرۆڤدا گونجاوە: (٧٨٪)ی نایترۆجینە، (٢١٪)ی ئۆکسجینە، (٠,٣٪)ی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن و هەندێك لە پێکهێنەرەکانی دیکەیە، ئەو ڕێژانەی ئەو توخمانە، ئەگەر کەمتر بایە یان زیاتر بایە، ژیان لەسەر زەوی دروست نەدەبوو.

بۆیە خوا ستایشکراوە، بە موتڵەقیی، هەرچی سیفەتی بەرزو چاکە هی خوایەو، خوا لە هەموو لە کەم و کوڕییەك دوورە.

## مەسەلەی سێیەم:

**هەروەها لە نیشانەکانی خوایە هێنانەدی ئاسمانەکان و زەوی و، ئەوەی لە ژیانداران تێیدا بڵاوکردوونەوە، کە هەر کات ویستی لە سەر کۆکردنەوەیان توانایە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦ خَلْقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَثَّ فِيهِمَا مِن دَآبَّةٍۚ وَهُوَ عَلَىٰ جَمْعِهِمْ إِذَا يَشَآءُ قَدِيرٌ ﴿٢٩﴾ ﴾ .

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦ خَلْقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، هەروەها لە نیشانەکانی، وی دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوییە.

(**الآيَةُ: هِيَ الْعَلَامَةُ وَالدَّلِيلُ عَلَى شَيْءٍ، وَالسِّيَاقُ يَدلُّ عَلَى أَنَّ الْمُرَادَ بِهَا ظَوَاهِرُ الخَلْقِ**). (**آيَة**): بە مانای نیشانەو بەڵگەیە لەسەر شتێك، بەڵام ئەم سیاقەی ئێرە ئەوە دەگەیەنێ، کە مەبەست لە (**آيَاتِ**) لێرەدا دیاردەو دیمەنەکانی دروستکراوەکانی خوان.

ئەگەرنا (**آية**) بە مانای ڕستەی قورئانیش دێ و، بە مانای موعجیزەی پێغەمبەرانیش (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام**) دێ و، بە پێی سیاق دەزانرێ کە کام لە مانایەکانی مەبەستە، جاری واش هەیە لە یەك ڕەوت (**سیاق**)دا زیاتر لە مانایەك هەڵدەگرێ، کە دەفەرموێ: لە نیشانەکانی خوا، واتە: نیشانەکانی بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگارێتیی و، خاوەندارێتیی و باڵادەستیی خوا.

﴿ خَلْقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، دروستکردنی ئاسمانەکان و زەویی، (**السَّمَاوَات**) واتە: دروستکراوە بەرزەکان، یاخود جیهانە بەرزەکان، جیهانە باڵایەکان (**العَوَالِمُ العُلِيَا**)، (**الْأَرْض**)یش، ئەم گۆی زەوییەیە کە ئێمە لەسەری دەژین و جیهانی خوارەوە (**العالم الأسفل**)یە.

٣)- ﴿ وَمَا بَثَّ فِيهِمَا مِن دَآبَّةٍ ﴾، هەروەها ئەوەی بڵاوی کردۆتەوە تێیاندا لە پێڕۆیان، (**البَثُّ: التَّفْرِيقُ وَالتَّوْزِيْعُ، بَثَّتِ الرِّيْحُ التُّرَابَ: فَرَّقَتْهُ**) (**بَثٌّ**): بریتیە لە لێك بڵاوکردنەوەو دابەشکردن، دەگوترێ: (**بَثَّتِ الرِّيْحُ التُّرَابَ**) بایەکە گڵەکەی بڵاوکردوە، پەرش و بڵاوی کردەوە، وشەی (**دَابَّةٍ**) واتە: پێڕۆ، (**كُلُّ مَا يَدُبُّ عَلَى الأَرْضِ**) هەر شتێك کە لەسەر زەوی بڕوات.

بەڵام (**الطبري**) دەڵێ: (**الدَّابَّةُ: النَّاسُ وَالمَلَائِكَة**)[1]، (**دَابَّة**): بریتیە لە خەڵك و فریشتەکان.

هەڵبەتە جینیش هەر دەگرێتەوە، واتە: هەموو ئەوانەی لەسەر زەویین، ئنجا ئەگەر مەبەست بەس سەر زەوی بێ، مرۆڤەکان و جندو فریشتەکانیش، دەگرێتەوە، بەڵام کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا بَثَّ فِيهِمَا مِن دَآبَّةٍ ﴾ هەرچی پێڕۆیە کە تێیدا بڵاوکردوونەوە، کەواتە: (**دَابَّة**): دەبێ لە ئاسمانیش هەبێ.

٤)- ﴿ وَهُوَ عَلَىٰ جَمْعِهِمْ إِذَا يَشَآءُ قَدِيرٌ ﴾، ئەویش لەسەر کۆکردنەوەیان هەر کاتێ بیەوێ، بە توانایە، هەرکاتێ بیەوێ دەتوانێ کۆیان بکاتەوە، خڕیان بکاتەوە، کە مەبەست پێی ڕۆژی دواییەو ڕۆژی کۆکردنەوەو لێپرسینەوەیە.

---

(١) جامع البيان: ج٢٥، ص٣٢.

## ڕوونکردنەوەیەک لەسەر هەبوونی پێڕۆ (دابة) لە ئاسمان دا:

شایانی باسە: ئەم ئایەت موبارەکە کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا بَثَّ فِيهِمَا مِن دَآبَّةٍ﴾، هەرچی پێڕۆیە کە لە ئاسمانەکان و زەویدا بڵاوی کردۆتەوە، تاکە ئایەتێکە لە قورئاندا لەو بارەوە، (**النابلسي**) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1]، دەڵێ: (**هَـذِهِ الآيَـةُ هِـيَ الآيَـةُ الوَحِيْدَة الَّتـي فِيْهَـا إِشَـارَةٌ إلى مَـا سَيُكْتَشَـفُ فـي المُسْـتَقْبَل مِـنْ حَيَـاةٍ حَيْوَانِيَّـة فِي الكَواكِـبِ البَعِيْـدَة وكَائِنَـاتٍ حَيَّـةٍ، فَالْدَّابَـةُ هِـيَ المَخْلُـوق الَّـذِي يَتَحَـرَّكُ وَالمَخْلُوقَـاتُ الَّتِـي تَـدُبُّ عَـلَى وَجِـهِ الأَرْضِ هِـيَ الـدَّواب**).

واتە: ئەم ئایەتە تاکە ئایەتێکە کە ئاماژەی تێدایە، بەوە کە ڕەنگە لە داهاتوودا بدۆزرێتەوە کە ژیانی ژیانداران لە خڕۆکە دوورەکانیشدا هەن، ڕەنگە کائیناتی دیکەی ژیانداری وەك ئەوەی سەر زەوی هەبن، چونکە (**دَابَّـة**) بریتیە لەو دروستکراوەی کە دەجووڵێ، ئەو کائیناتانەی لەسەر زەوی دەجووڵێن، پێیان دەگوترێ: (**دَوَابّ**).

زانایان زۆریان قسە کردوە لەوبارەوەو، تەماشای زۆربەی تەفسیرەکانم کردوە: بۆ وێنە:

١- (**فخرالدين الرَّازي**)[2]، کە زۆر سەری دەخورێ بۆ چارەسەری ئەو ئیشکالانەی بە ڕواڵەت لەسەر هەندێك ئایەتان پەیدادەبن، دەڵێ:

کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَمَا بَثَّ فِيهِمَا مِن دَآبَّةٍ﴾، ئایا ئەمە چۆنە؟ ئەگەر بەس لەسەر زەوی مرۆڤ هەبن و جند هەبن، ئەدی چۆن خوا (**دابة**) پێڕۆی پاڵداوەتە لای ئاسمانەکانیش؟ (**الرازي**) سێ جۆرە وەڵامی داوەتەوە:

**وەڵامی یەکەم:** دەڵێ: (**يُضَـافُ الْفِعْـلُ إِلَى جَمَاعَـةٍ، وَإِنْ كَانَ فَاعِلُهُ وَاحِـدًا مِنْهُمْ، مِثْلُ:** ﴿يَخْرُجُ مِنْهُمَا ٱللُّؤْلُؤُ وَٱلْمَرْجَانُ ﴿٢٢﴾﴾ الرحمن) واتە: جاری وایە کردەوەیەك پاڵدەدرێتە لای کۆمەڵەیەك، هەرچەندە ئەنجام دەرەکەی یەکێك بێ، لەوان، وەك خوا لەبارەی دەرهێنانی گەوهەرو مرواریيەوە لە دەریا لە سوورەتی (**الرحمن**)

---

(١) تفسير النابلسي: ج٨، ص٣١٠.

(٢) ج١٤، ص١٥٢.

دا، دەفەرموێ: ﴿ يَخْرُجُ مِنْهُمَا ٱللُّؤْلُؤُ وَٱلْمَرْجَانُ ﴿٢٢﴾ ﴾، واتە: لە دەریای سوێرو شیرین گەوهەرو مرواریی دەردەهێنرێن، لە حاڵێکدا کە گەوهەرو مروارییەکان تەنیا لە ئاوی سوێردان و، لە ئاوی شیریندا پەروەردە نابن.

**وەڵامی دووەم:** دەڵێ: (**أَنَّ الدَّبِيبَ هُوَ الْحَرَكَةُ، وَالْمَلَائِكَةُ لَهُمْ حَرَكَةٌ**) (دَبِيب): بە مانای جووڵەیەو فریشتەش جووڵەیان هەیە، (هەروەها جندیش جووڵەیان هەیە).

پێشتریش قسەکەی (**الطبري**)مان، هێنا کە گوتی: (**الدَّابَّةُ: النَّاسُ وَالمَلَائِكَة**)، (**دابة**) بریتیە لە خەڵك و فریشتەکان.

**وەڵامی سێیەم:** دەڵێ: (**لاَ يَبْعدُ أَنْ يُقَالَ: إِنَّهُ تَعَالَى خَلَقَ فِي السَّمَوات أَنْوَاعَاً مِنَ الْحَيَوَانَاتِ يَمْشُونَ مَشِيَ الأُنَاسِيِّ عَلَى الْأَرْضِ**) دوورنیە بگوترێ: خوا لە ئاسمانەکاندا چەندان جۆر ژیانداری دروستکردوون، کە وەك مرۆڤان لەسەر زەوی دەڕۆن، ئەوانیش لە شوێنی خۆیان دەڕۆن، ئەوە سێ وەڵامەکەی (**فخر الدين الرازي**).

٢- (**محمد الطاهر بن عاشور**)، دەڵێ: (**وَالْعُلَمَاءُ يَتَرَدَّدُونَ فِي إِثْبَاتِ سُكَّانٍ فِي الْكَوَاكِبِ، وَجَوَّزَ بَعْضُ الْعُلَمَاءِ الْمُتَأَخِّرِينَ أَنْ فِي كَوْكَبِ الْمَرِّيخِ سُكَّانَاً**)[١] واتە: زانایان لەوەدا دڵ لە دڵ دەدەن لە چەسپاندنی دانیشتووان لە خڕۆکەکانی دیکەداو، هەندێك لە زانایانی دوایین بە گونجاویان زانیوە، بە ڕێتێچوویان زانیوە کە لەسەر خڕۆکەی مەرریخ دانیشتووان هەبن.

بێگومان جارێ من بەس قسەی ئەوان دێنم، دواییش قسەی خۆم دەکەم!

٣- یەکێکی دیکە کە لەوبارانەوە قسەی زۆری کردوون، (**طنطاوي الجوهري**)یە، لە تەفسیرەکەی خۆیدا بە ناوی (**الجواهر**)، لە جێیەك دا دەڵێ:

(**أُحْضِرَ روحُ گالِيْلُو وَتَحَدَّثَ حَوْلَ النُّجُومُ وَالكَواكِب، وأَفَادَنَا أَنْ مِنَ السَّيَّارَاتِ مَا هُوَ خَيْر من أَرْضِنَا، كَمَا أَنَّ شَمْسَهُ أَحْسَنُ مِنْ شَمْسِنَا، وَمِنْ الشُّمُوسِ مَا لَا سَيَّارَاتِ لَهَا إِنَّمَا أَحْوَال سُكْنَاهَا خَيْرُ الأَحْوَال**)[٢].

---

(١) التحرير والتنوير: ج٢٥، ص٩٧.

(٢) تفسير الجواهر: ج٢٠، ص١٢.

واتـە: ڕووحـی گالیلۆیـان ئامـادە کـرد، {زانسـتێك هەیـە پێـی دەگوتـرێ: ئامادەکـردنی ڕووحـەکان} (**تحضير الأرواح**)} ئنجـا لـە بارەی ئەسـتێرەکان و خڕۆکەکانەوە قسـەی کردو پێیڕاگەیاندیـن کـە خڕۆکـەی وا هەیـە زۆر باشـترە لـە زەویەکـەی ئێمـەو، خۆرەکەشـی لـە خـۆری ئێمـە باشـترە، خـۆری واش هەیـە هیـچ خڕۆکـەی لەگەڵدانیـن {وەك چـۆن خـۆر کۆمەڵەیـەکی هەیـە نـۆ خڕۆکـەن} بەڵکـو دانیشـتووانی ئـەو خڕۆکانـە لـە باشـترین حاڵەتـدان، {ئەمـە بـە حیسـاب قسـەی گالیلۆیـە کـە ڕووحەکەیـان ئامـادە کـردوە}!

هەروەهـا (**طنطـاوي**) دەڵـێ: خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ يَخْرُجُ مِنْهُمَا ٱللُّؤْلُؤُ وَٱلْمَرْجَانُ ﴿٢٢﴾ ﴾الرحمـن، ڕاسـت نیـە کـە گەوهـەرو مرواریـی تەنیـا لـە ئاوی سـوێردا دروسـت بـبن و، خـواش پاڵیدابنـە لای ئـاوی شـیرین، بەڵکـو لـە ئـاوی شـیرینیش دا گەوهـەرو مـرواری دروسـت دەبـن.

٤- ئەوەی منیش تێی دەگەم ئەوەیە، کە لە ڕاستییدا ئامادە کردنی ڕووحەکان، چ ڕووحی گالیلۆ بێ، یان هەر کەسێکی دیکە بێ، ئەوە بە ئەفسانەی دەزانم و، پێم وایە ڕووحەکان لەبەر دەستی خوای پەروەردگار دان و، هیچ کەس ناتوانێ ڕووحەکان ئامادە بکات و بەس لەبەردەستی خوای پەروەردگاردان، مەگەر خوا ﷻ مۆڵەت بدات بێنە خەوی کەسێك، بۆیە ئەوەی لەو بارەوە دەگوترێ: پێم وایە هەمووی فێڵ و هەڵخەڵەتاندنی جندە شەیتانەکانە لە مرۆڤەکانیان کردوە، ڕەنگە ئامادەکراوەکە هەر قەرینی ئەو کەسە بووبێ، ئەگەر زۆر زانیاریی ورد بدات لە بارەی ئەو کەسەوە، دەبێ هەر قەرینەکەی بێ، وەك هەڵخەڵەتاندنی ئەو خەڵکە کە گومڕایان بکەن، جار جار شەیتانەکان ئەوە دەکەن، ئەوە ئەفسانەیەو لە ڕاستییدا هیچ ڕووێکی عیلمیی نیە، هەرچەندە مشت و مڕو قسەی زۆری لەسەر دەکرێ.

ئایەتەکـەش کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَا بَثَّ فِيهِمَا مِن دَآبَّةٍ ﴾ پێـم وایـە ئـەوەی کـە (**الطـبري**) گوتوویـەتی و ئـەوەی (**الرازي**)یـش لـە ڕای دووەمـی دا گوتوویـەتی: (**أَنَّ الدَّبِيبَ هُوَ الْحَرَكَةُ، وَالْمَلَائِكَةُ لَهُمْ حَرَكَةٌ**) یـانی: (دبیـب) یـانی: جووڵـە و فریشـتەش جووڵەیـان هەیـە، ئنجـا بەمشـێوە لێکدانەوەیـە، هیـچ پێویسـت بـەوە نـاکات، بڵێیـن: جگـە لەسـەر زەوی، شـوێنێکی دیکـەش هەیـەو ژیانێکـی دیکـەی لێیـە، وەك

ژیانی سەر زەوی! چونکە ئەگەر مەبەست لە (**دابة**) هەر دروستکراوێك بێ حەرەکەو جموجوڵی هەبێ، بێگومان فریشتەکانیش جموجوڵیان هەیەو، جندیش جموجوڵیان هەیە، وەك چۆن مرۆڤیش جموجوڵی هەیەو، ئاژەڵان و زیندەوەران و پەرەورانیش جموجوڵیان هەیە.

بەڵام ئەگەر گریمان لە داهاتوودا دەرکەوت، کە لە جگە لە زەوی ئێمەشدا ژیان هەیە، ئەوە ئایەتەکە دەیگرێتەوەو هیچ ناکۆکیی لەگەڵی دا نیە، بەڵام ئەم ئایەتە ئێمە ناچار ناکات بڵێین: لە گەردووندا شوێنێکی دیکەش هەیە، وەك زەوی، ژیانێکی وەك ژیانی ئێمەی لێیە، ئایەتەکە ئێمە ناچار ناکات، وابڵێین، چونکە هەر دەفەرموێ: هەموو ئەو (**دابة**)انەی خوا لە ئاسمانەکان و زەویدا بڵاوی کردوونەوە، (**دابة**)ش هەرشتێکە بجووڵێ و فریشتەکانیش دیارە زۆر زۆرن.

ئەوەی مەرریخیش کە (**محمد الطاهر بن عاشور**) گوتوویەتی: ئێستا دەرکەوتوە! دەڵێین: بە پێچەوانەوە ئێستا سەلمێنراوەکە مەرریخ و هەر نۆ خرۆکەکەش ژیانیان تێدانیە، نەك هەر ژیانیان تێدانیە، بەڵکو هۆکارەکانی بوونی ژیانیشیان تێدانێن، نە بەرگە هەوایان هەیە، نە بەرگە ئاوییان هەیە، ئەگەر بەرگە هەواشیان هەبێ، حاڵەتێکی زۆر سادەی هەیە، بە شێوەیەکی وایە کە هێندە ئۆکسجینی لێ نیە، بۆیە ئەوانەی کە چوونە سەر مانگیش ئۆکسجینیان لەگەڵ خۆیان بردوەو بە پەلەش گەڕاونەوە، بۆ ئەوەی ئەو ئۆکسجینەی پێیانە تەواو نەبێ.

بۆیە تاکو ئێستا زانست ئەوەی بۆی دەرکەوتوە، ئەوەیە کە جگە لەو زەوییەی ئێمەدا، ژیان نیە ژیانێکی وەك هی ئێمە، بەڵام دیارە ژیانی جندو فریشتانیش و ژیانی دروستکراوانێکی دیکەش کە خوا باسی نەکردوون بۆمان، ئەوە شتێکی دیکەیە، بەڵام ژیانی وەك هی ئێمە، تاکو ئێستا ئەوەی زانست پێیگەیشتوە هەر لەم سەر زەوییەی ئێمە، هەیەو، ئەو بارودۆخەی خوا ﷻ هەڵیخستوە، بەجۆرێکە کە ژیانی مرۆڤ تەنیا لەم سەر زەوییەی ئێمە هەبێ.

## مەسەلەی چوارەم:

**هیچ بەڵاو گرفتارییەك بەسەر خەڵك نایەت، مەگەر بە هۆی هەڵەو کردەوەی خراپی خۆیانەوە، زۆرجاریش خوا چاوپۆشیی دەکات، مرۆڤەکانیش دەستەوسانکەری خوا نین، لەسەر زەوی، جگە لەویش هیچ سەرپەرشتیارو پشتیوانێکیان نیە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٖ فَبِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِيكُمۡ وَيَعۡفُواْ عَن كَثِيرٖ ﴿٣٠﴾ وَمَآ أَنتُم بِمُعۡجِزِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِۖ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٖ ﴿٣١﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿ وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٖ فَبِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِيكُمۡ ﴾ {خوا دەفەرموێ} هەر بەڵایەکتان بەسەر دێ، بەهۆی ئەوەوەیە کە دەستەکانی خۆتان ئەنجامیان داوە، ﴿ فَبِمَا كَسَبَتۡ ﴾، خوێندراویشەتەوە: (بِمَا كَسَبَتْ) واتە: بەبێ (ف)ەکە، وشەی (المصِيْبَةُ: إسْمُ للمُصِيبَةِ الَّتِي تُصِيْبُ بِضُرٍّ وَمَكْروهٍ) (مُصِيْبَة) یانی: تووشکەر، ناوە بۆ ئەو بەڵایەی کە کەسێك تووشی زیان و ناڕەحەتیی دەکات، کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٖ فَبِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِيكُمۡ ﴾، واتە: هەر بەڵایەکتان بەسەردێ دەرهاویشتەی کردەوە خراپەکانی خۆتانە، خۆتان پێشەکییەکانی پەیدابوونی ئەو دەرەنجامە دەڕەخسێنن، بەڵایەکان کە بەسەرتان دێن، دەرەنجامن و پێشەکییەکانیان خۆتان دەیانڕەخسێنن، بۆ وێنە: کەسێك تووشی نەخۆشیی شەکرە دێ، تووشی نەخۆشیی فشاری خوێن دێ، تووشی سەرەتان دێ، بە هۆی جگەرە کێشانەوە، بە هۆی خواردنی ناتەندروستەوە، بە هۆی دەرمانی ئێکسپایەرەوە، کە بە داخەوە لەم وڵاتی ئێمەدا، ئەوە زۆر بووە، ئەوە کردەی دەستی خۆتانە، کە تووشی ئەو بەڵایانە دێن، یان کەسێك دەچێت کەمتەرخەمیی دەکات لە خۆپارستنیدا، لە ڕووی تەندروستییەوە، یاخود لە کاتی ناڕەحەتییەکاندا، لە کاتی سەرماو گەرمادا، ئەوە مانای وایە بە هۆی کەمتەرخەمیی خۆیەوەیەتی، تووشی ئەو

بەڵایانە دێ، هەندێ بەڵاش بەسەر مرۆڤ دێن، لە ئەنجامی ئەوەدا کە مرۆڤ گوناهو تاوانی کردوە، خراپەی کردوە، بۆ وێنە: خوا ﷻ لە بارەی جەنگی ئوحودەوە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَلَّوْاْ مِنكُمْ يَوْمَ ٱلْتَقَى ٱلْجَمْعَانِ إِنَّمَا ٱسْتَزَلَّهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ بِبَعْضِ مَا كَسَبُواْ ﴿١٥٥﴾ ﴾آل عمران، واتە: ئەوانەی کە لە ڕۆژی پێکگەیشتنی دوو کۆمەڵەکەدا، پشتیان لە دوژمن کرد، شەیتان خلیسکاندنی، بە هۆی هەندێك لەو گوناهانەوە کە پێشتر کردبوویانن.

٢)- ﴿ وَيَعْفُواْ عَن كَثِيرٍ ﴾، لە زۆریش دەبووری (**كثير صِفَةٌ لِمَحْذُوفٍ، أي: عَنْ خَلْقٍ أو ناسٍ كَثِيْرٍ**)، (**كثير**) سیفەتی وەسفکراوێکی قرتێنراوە، لە خەڵکێکی زۆریش دەبووری، هەموویان سزا نادات، لە ئەنجامی ئەوەدا کە خراپەیان کردوە، (**أي: لَا يُصِيْبُ كَثِيْراً مِنْ عِبَادِهِ الَّذِيْن اسْتَحَقُّوا جَزَاء السُّوء، بِعُقُوبَاتٍ دِنْيَوِيَّة**) زۆرێك لە بەندەکانی کە شایستەن سزابدرێن، بەسزا دنیاییەکان سزایان نادات لە دنیادا.

٣)- ﴿ وَمَآ أَنتُم بِمُعْجِزِينَ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، ئێوەش دەستەوسانکەرنین لە زەویدا، واتە: دەستەوسانکەری خوا نین، (**المُعْجِزُ: الغَالِبُ غَيْرَه مِنْ فُلَاته مِنْ قَبْضَتِه**) (**مُعْجِز**): ئەوەیە کە بەسەر بەرانبەرەکەیدا زاڵ بێ و لە چنگی قوتاربێ و، ئەو دەستەوسان بکات.

٤)- ﴿ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴾، ئێوەش جگە لەخوا هیچ سەرپەرشتیارو هیچ یارمەتییدەرێکیشتان نیە، لە بارەی ئەوەوە کە لە ئەنجامی گوناهو تاواناندا مرۆڤ تووشی بەڵاو گرفتارییان دێ، فەرمایشتێکی پێغەمبەر هەیە ﷺ کە دەفەرموێ:

**{مَا اخْتَلَجَ عِرْقٌ وَلَا عَيْنٌ إِلَّا بِذَنْبٍ، وَمَا يَدْفَعُ اللَّهُ عَنْهُ أَكْثَرُ} (أخرجه الطبراني في «المعجم الصغير»: ١٠٥٣، وعنه أبو نعيم في «أخبار أصبهان» (٢ / ٢٤٧) وَصَحَّحَهُ الألباني في «الصحيحة»: ٢٢١٥).**

واتە: هیچ دەمارێك و هیچ چاوێك تووشی کەم و کوڕیی نەبووە، مەگەر بە هۆی گوناهێکەوە، ئەوەی خواش لایدەبات زیاتریشە.

واتە: مەرج نیە هەر کاتێك مرۆڤ هەڵەو گوناهی کرد، خوا ﷻ سزای بدات، یاخود دەرهاویشتەکەی لە دنیادا ببینێ.

## مەسەلەی پێنجەم و کۆتایی:

**کەشتییەکانیش کە لە دەریادا وێنەی چیاکانن، لە نیشانەکانی خوان، ئەگەر خوا بیەوێ بایەکان ڕادەگرێ و کەشتییەکان لەسەر پشتی دەریا دەوەستن، لەوەدا نیشانەی زۆر هەن بۆ زۆر خۆڕاگرانی زۆر سوپاسگوزار بۆ خوا، هەروەها دەگونجێ خوا کەشتییەکان نغرۆ بکات، بێبڕوایانی مشت و مڕکەریش بزانن، کە شوێنی قوتاربوونیان نیە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِ ٱلْجَوَارِ فِى ٱلْبَحْرِ كَٱلْأَعْلَـٰمِ ﴿٣٢﴾ إِن يَشَأْ يُسْكِنِ ٱلرِّيحَ فَيَظْلَلْنَ رَوَاكِدَ عَلَىٰ ظَهْرِهِۦٓ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴿٣٣﴾ أَوْ يُوبِقْهُنَّ بِمَا كَسَبُوا۟ وَيَعْفُ عَن كَثِيرٍ ﴿٣٤﴾ وَيَعْلَمَ ٱلَّذِينَ يُجَـٰدِلُونَ فِىٓ ءَايَـٰتِنَا مَا لَهُم مِّن مَّحِيصٍ ﴿٣٥﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِ ٱلْجَوَارِ فِى ٱلْبَحْرِ كَٱلْأَعْلَـٰمِ ﴾، کەشتییە ڕۆیشتووە وەك چیایەکانیش لە نیشانەکانی وین، {لە نیشانەکانی خوان، نیشانەکانی پەروەردگارێتیی خواو بەدیهێنەرایەتیی خواو خاوەندارێتیی خوا} ﴿ ٱلْجَوَارِ فِى ٱلْبَحْرِ ﴾، (جَوَارِ) بە دوو جۆر خوێنراوەتەوە:

أ- بە ژێر (**كسر**) (**جَوَارِ**)، ب- بە (يـ)اش، (**الجَوَارِي**)، کۆی (**جَارِيَة**)یە، واتە: ڕۆیشتوو لەسەر ئاو، کە ئەمە ئاوەڵناوی وەسفکراوێکی قرتێنراوە، یانی: (**وَمِنْ آيَاتِهِ السُّفُن الجَوَارِ**) کەشتییە ڕۆیشتووەکانن، ﴿ فِى ٱلْبَحْرِ ﴾، لە دەریادا، (**كَالأَعْلاَم**)، (**أَعْلاَم**) کۆی (**عَلَمْ**)ە، (**عَلَمْ**)، واتە: چیا، لە ئەسڵ دا (**عَلَمْ**)، نیشانەیەکە ڕێی پێ بزانرێ، یاخود نیشانەیە بۆ شتێك، ئنجا لەبەر ئەوەی چیایەکان بەرزن، بە (**أَعْلاَم**) ناودەبرێن، واتە: کەشتییەکان لە دەریادا وەك چیا بەرزەکان وان.

٢)- ﴿ إِن يَشَأْ يُسْكِنِ ٱلرِّيحَ ﴾، ئەگەر خوا بیەوێ با دەوەستێنێ، (**رِيْح**)یش، بە دوو شێوە خوێنراوەتەوە: أ- (**الرِّيْح**). ب- (**الرِّيَاح**)، (**إِنْ يَشَأْ**) ئەگەر خوا بیەوێ (**يُسْكِنِ الرِّيح**)

بایـــەکە دەوەســـتێنێ، (**یُسْکِنِ الرِّیَـــاحَ**) بایەکان ڕادەگرێ، (**إِنْ یَشَـأْ**)یش، دیســـان: **أ-** خوێندراوەتەوە: (**إِنْ یَشَأْ**) بەهەمزە، **ب-** خوێندراویشتەوە: (**إِن یشا**)، بەبێ هەمزە (**أ**).

٣)- ﴿ فَيَظْلَلْنَ رَوَاكِدَ عَلَىٰ ظَهْرِهِۦٓ ﴾، ئەوکاتەش کەشتییەکان لەسەر پشتی دەریا ڕادەوەستن، (**رَوَاكِد**) کۆی (**رَاكِدة**)یە، (**رَاكِدَة**)ش واتە: نیشتوو، لەنگەر گرتوو، وەستاو، (**الرُّكُودُ: الإِسْتِقْرَارُ والثُّبُوت**)، (**رُكود**): بریتیە لە چەسپان و نەجووڵان، ئەگەر بایەکان بوەستن - بە تایبەتی کاتی خۆی کە کەشتییەکان چارۆکەدار بوون - کەشتییەکان لەسەر پشتی دەریا ڕادەوستن، ناجووڵێن.

کـە دەفەرمـوێ: (**ظَهْـرِه**) واتـە: پشـتی دەریـا، (**ظَهْـر**) بـە پشـتی مـرۆڤ و ئاژەڵیـش دەگوتـرێ، بـەڵام بەسـەرەوەی هـەر شـتێکیش دەگوتـرێ، (**وَيُطْلَـقُ عَـلَى أَعْـلَى الـشَّيءِ إِطْلَاقاً شَـائِعَاً**) واتـە: لەسـەر ڕووی دەریـا دەوەسـتن.

٤)- ﴿ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴾، بەڕاستیی لەوەدا، نیشانە زۆر هەن، بۆ هەر زۆر خۆڕاگرێکی زۆر سوپاسگوزار، واتە: بۆ هەر کەسێکی بڕوادار، چونکە بابای بڕوادار، هەم خاوەنی خۆڕاگرییەو هەم خاوەنی سوپاسگوزارییە، هەم لە بەرانبەر بەڵادا خۆی ڕادەگرێ، هەم لە بەرانبەر نیعمەتدا سوپاسگوزار دەبێ، لە ڕاستییدا ئەوانەی لە دیاردەو دیمەنەکانی گەردوون بەهرەمەند دەبن، بڕوادارانن، بە چاوی دڵ تەماشا دەکەن، دەستی خوایان لە پشتدا دەبینن.

(**محمـد الطاهـر بـن عاشـور**) دەڵـێ: (**وَجَعَـلَ ذَلِكَ آيَـةً لِـكُلِّ صَبَّـارٍ شَـكُورٍ لِأَنَّ فِي الْحَالَتَيْنِ خَوْفًـا وَنَجَـاةً، وَالْخَـوْفُ يَدْعُـو إِلَى الصَّـبْرِ، وَالنَّجَـاةُ تَدْعُـو إِلَى الشُّـكْرِ، أي: مُؤْمِـنٍ مُتَخَلِّـقٍ بِخُلُقِ الصَّـبْرِ عَـلَى الـضَّرَّاءِ وَالشُّـكْرِ لِلـسَّرَّاءِ**)[1] واتـە: بۆیـە خـوا ﷻ فەرموویـەتی: لـەوەدا نیشـانە هـەن بـۆ هـەر زۆر خۆڕاگرێـکی زۆر سوپاسـگوزار، چونکـە لـە هـەردوو حاڵەتەکانـدا تـرس هەیـەو قوتـار بوونیـش هەیـە، ترسـەکە خوازیـاری ئەوەیـە مـرۆڤ خۆڕابگـرێ و، دەربازبوونەکـەش خوازیـاری ئەوەیـە مـرۆڤ سوپاسـگوزار بـێ، ئنجـا ئەمـەش سـیفەتی

(١) التحرير والتنوير: ج٢٥ ص١٠٦.

بڕواداڕێکە کە خۆی بە صەبرو شوکر ڕازاندۆتەوە، صەبر لە گرفتارییانداو، شوکر لە بەرانبەر نیعمەت و چاکەکانی خوادا.

٥)- ﴿ أَوْ يُوبِقْهُنَّ بِمَا كَسَبُوا ﴾، یان {خوا ئەگەر بایەکانیش ڕانەگرێ و کەشتییەکان بهێننەوە لەسەر پشتی دەریا} کەشتییەکان نغرۆ بکات، بەهۆی ئەوەوە کە کردوویانە. واتە: بایەکە توند بکات، گەردەلوول بێ و کەشتییەکان نغرۆ بکات، (بِمَا كَسَبُوا) واتە: بە هۆی ئەوەوەکە سەرنشینان و کەشتییەکان سورابووانی کەشتییەکان کردوویانە لە تاوان و خراپە.

٦)- ﴿ وَيَعْفُ عَن كَثِيرٍ ﴾، لە زۆریش دەبووریّ، (وَيَعْفُ) هەم بە بۆر (ضمة) خوێنراوەتەوە، هەم بە واویش (وَيَعْفُو)، یانی: خوا زۆرجاریش دەبووریّ، یان: لە زۆر کەسیش دەبووریّ، شایستەی ئەوەن کە کەشتییەکەیان نغرۆ بکات، بەڵام نغرۆی ناکات.

٧)- ﴿ وَيَعْلَمَ الَّذِينَ يُجَادِلُونَ فِي آيَاتِنَا مَا لَهُم مِّن مَّحِيصٍ ﴾، ئەوانەش کە لە بارەی ئایەتەکانمانەوە شەڕە قسە دەکەن، دەزانن هیچ پەناگەیەکیان نیە. ئەمە بە: (يَعْلَمَ) خوێنراوەتەوەو، بە (يَعْلَمُ)ش، خوێنراوەتەوە، ئەوانەش کە لە دژی ئایەتەکانی ئێمە مشت و مڕ دەکەن، دەزانن شوێنی دەربازبوونیان نیە، (مَحِيْص، أي: مَخْلَص وَمَلْجَأ) پەناگە، شوێنی دەربازبوون، شوێنی پەنا پێبردن، ئەگەر بفەرموێ: (وَيَعْلَمَ الَّذِيْنَ يُجَادِلُوا فِي آيَاتِنا) واتە: خوا ئەوە دەکات تاکو ئەوانەی مشتومڕ لە دژی ئایەتەکانی ئێمە دەکەن، بزانن، کە شوێنی دەربازبوونیان نیە، بەڵام ئەگەر (يَعْلَمُ) بێ، واتە: ئەوانە دەزانن کە لە دژی ئایەتەکانی ئێمە مشتومڕ دەکەن، هیچ شوێنی دەربازبوونیان نیە، کاتێك خوا بیەوێ سزایان بدات و بەڵایان بۆ بنێرێ.

**سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.**

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە یازدە (١١) ئایەت پێکدێ، کە بریتین لە ئایەتەکانی: (٣٦ - ٤٦)، لە هەشت ئایەتی سەرەتایاندا، خوا ﷻ پێناسەی کۆمەڵی مسوڵمانمان بۆ دەکات، لە میانی خستنەڕووی دە (١٠) لە خەسڵەتە بەرزو پەسندەکانیادا، کە بریتین لە:

١)- ئیمان.

٢)- پشت بە خوا بەستن.

٣)- خۆدوورگرتن لە گوناهە گەورەکان و، دزێو و قێزەونەکان.

٤)- لێبوردن لە کاتی توڕەبووندا.

٥)- بە دەم بانگی خواوە چوون.

٦)- نوێژ بەرپاکردن.

٧)- کاروبار بە ڕاوێژ بەڕێوەبردن لە نێو خۆدا.

٨)- بەخشین لە بژیوی خوا پێداودا.

٩)- بەرگریی لە خۆکردن لە کاتی ستەم لێکراندا.

١٠)- چاوپۆشیی و چاکسازیی لە هەڵەکاران، لە کات و شوێنی خۆیدا.

لە سێ ئایەتی دواییشدا، ئایەتەکانی: (٤٤ - ٤٦) خوای دادگەر باسی سەرەنجامی شووم و دژواری ستەمکارانی گومڕا دەکات، کە زۆر بەزەبوونیی و بەترس و لەرزەوە، لەسەر دۆزەخ ڕادەنوێنرێن، هیچ کەسیش نابێتە سەرپەرشتیارو یاریدەدەریان.

﴿ فَمَآ أُوتِيتُم مِّن شَيۡءٖ فَمَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيۡرٞ وَأَبۡقَىٰ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٣٦﴾ وَٱلَّذِينَ يَجۡتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡفَوَٰحِشَ وَإِذَا مَا غَضِبُواْ هُمۡ يَغۡفِرُونَ

﴿٣٧﴾ وَٱلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِرَبِّهِمْ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣٨﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَابَهُمُ ٱلْبَغْىُ هُمْ يَنتَصِرُونَ ﴿٣٩﴾ وَجَزَٰٓؤُا۟ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِّثْلُهَا ۖ فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٠﴾ وَلَمَنِ ٱنتَصَرَ بَعْدَ ظُلْمِهِۦ فَأُو۟لَٰٓئِكَ مَا عَلَيْهِم مِّن سَبِيلٍ ﴿٤١﴾ إِنَّمَا ٱلسَّبِيلُ عَلَى ٱلَّذِينَ يَظْلِمُونَ ٱلنَّاسَ وَيَبْغُونَ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٤٢﴾ وَلَمَن صَبَرَ وَغَفَرَ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ﴿٤٣﴾ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن وَلِىٍّ مِّنۢ بَعْدِهِۦ ۗ وَتَرَى ٱلظَّٰلِمِينَ لَمَّا رَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ يَقُولُونَ هَلْ إِلَىٰ مَرَدٍّ مِّن سَبِيلٍ ﴿٤٤﴾ وَتَرَىٰهُمْ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا خَٰشِعِينَ مِنَ ٱلذُّلِّ يَنظُرُونَ مِن طَرْفٍ خَفِىٍّ ۗ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِنَّ ٱلْخَٰسِرِينَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ وَأَهْلِيهِمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ أَلَآ إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ فِى عَذَابٍ مُّقِيمٍ ﴿٤٥﴾ وَمَا كَانَ لَهُم مِّنْ أَوْلِيَآءَ يَنصُرُونَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ ۗ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن سَبِيلٍ ﴿٤٦﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{(ئەی مرۆڤەکان!) هەر شتێکتان پێدراوە، ڕابواردنێکی کەمی ژیانی دنیایەو، ئەوەی لە لای خوایە (لە ڕۆژی دواییدا) چاکترو بەردەوامترە، بۆ کەسانێك بڕوایان هێنابێ و، پشت بە پەروەردگاریان ببەستن ﴿٣٦﴾ هەروەها ئەوانەی خۆیان لە گوناهە گەورەکان و دزێوو ناقۆڵایەکان دەپارێزن و، هەر کاتیش تووڕەبوون، ئەوان (لەو کەسانەی تووڕەیان کردوون) دەبوورن ﴿٣٧﴾ هەروەها ئەوانەی وەڵامی پەروەردگاریان داوەتەوەو، نوێژیان بەرپاکردوەو، کاروباریان لە نێو خۆیان بەڕاوێژەو، لەوەی کردوومانەتە بژیویان دەبەخشن ﴿٣٨﴾ دیسان ئەوانەی هەر کات دەستدرێژیی و ستەمیان تووش بوو، بەرگریی لە خۆیان دەکەن و،

تۆڵـە دەسـتێننەوە ﴿٣٩﴾ سـزای خراپەیەکیـش، خراپەیـەکی وەك خۆیـەتی و، هـەر کەسیش چاوپۆشیی کردو چاکسازیی کرد، پاداشتی لەسەر خوایە، بە دڵنیایی ئەو ستەمکارانی خۆشناوێن ﴿٤٠﴾ هـەر کەسێکیش دوای ستەملێکرانی تۆڵـە بکاتـەوە، هیـچ ڕێـی گلەییـان لەسـەر نیـە، ﴿٤١﴾ بەڵکـو ڕێ(ی گلەیـی و ڕەخنـە) لەسـەر ئەوانەیە کـە ستەم لـە خەڵك دەکـەن و، بـە ناهـەق سنوورشکێنیی لەسەر زەویدا دەکـەن، ئەوانـە ئازارێـکی بـە ئێـش و ژانیـان هەیـە (لـە ڕۆژی دواییـدا) ﴿٤٢﴾ هـەر کەسێکیش خۆڕاگریـی بـکات و لێببـووریّ، بێگومـان ئـەوە لـە کارە گـەورەو گرنگەکانە (کـە پێویسـتییان بـە ویستێکی قایـم و مەحکـەم هەیـە) ﴿٤٣﴾ هـەر کەسێکیش خـوا گومـڕای بـکات، دوای وی، هیـچ دۆسـت و سەرپەرشـتیاری نیـن و، سـتەمکارانیش دەبینـی کاتێـك ئـازار (ی دۆزەخ) دەبینـن، دەڵێـن: ئایا هیـچ ڕێـی گەڕانـەوە هەیـە؟ ﴿٤٤﴾ هەروەهـا دەیانبینـی بـە زەبوونیـی لەسـەر (ئاگـر) ڕادەنوێنرێـن و، لەبـەر شـەرمەزاریی بـە سیلەی چـاو تەماشـادەکەن و، ئەوانـەی بڕوایـان هێنـاوە دەڵێـن: بـە دڵنیایـی زیانبـاران ئەوانـەن کـە لـە ڕۆژی هەڵسـانەوەدا، خۆیـان و کـەس و کاریـان دەدۆڕێنـن، (لەدەسـت دەدەن) ئەهـا (بزانـن!) ستەمکاران لـە ئازارێـکی بـەردەوام و نەبـڕاوە دان ﴿٤٥﴾ هیـچ دۆسـت و سەرپەرشـتیارانیان نەبـوون لـە بەرانبـەر (سـزای) خـوادا سـەریان بخـەن و، هـەر کەسیش خـوا سـەرگەردانی بـکات، هیـچ ڕێیـەکی نیـە (لێیـەوە قوتـار بـیّ) ﴿٤٦﴾].

## شیكردنەوەی هەندێک لە وشەكان

(وَٱلْفَوَاحِشَ ): (الفُحْشُ والفَحْشَاءُ والفَاحِشَةُ: مَا عَظُمَ قبْحُهُ مِنَ الأَفْعَالِ وَالأَقْوَالِ) مانای هەر سێ وشەی: (فُحْش، فَحْشَاءُ، فَاحِشَة): بریتیە لە هەر كردەوەیەك و، هەر قسەیەك، كە زۆر دزێوو ناشیرین و ناقۆڵاو قێزەون بێ.

(شُورَىٰ): واتە: ڕاوێژ، (الشُّورَى: الأَمْرُ الَّذِي يُتَشَاوَرُ فِيهِ)، (شوری): بریتیە لە كارێك كە ڕاوێژی تێدا بكرێ، (التَّشَاوُرُ والمُشَاوَرَةُ والمَشُورَةُ: اسْتِخْرَاجُ الرَّأْيِ بِمُرَاجَعَةِ البَعْضِ إلى البَعْض) مانای هەر سێ وشەی: (تَشَاوُر، مُشَاوَرَة، مَشُورَة): بریتیە لە دەرهێنانی ڕای ڕاست، بە هۆی ئەوەوە كە هەندێكیان قسە لەگەڵ هەندێك دەكەن و، پێكەوە دیالۆگ و وتووێژ دەكەن.

(يَنتَصِرُونَ): واتە: بەرگریی لەخۆیان دەكەن، (الإنْتِصَارُ والإسْتِنْصَارُ: طَلَبُ النُّصْرَةِ، وَالإنْتِقَامُ، وَالإمْتِنَاعُ مِنَ الظُّلْمِ)، (إنْتِصَارُ وإسْتِنْصَار): هەردووكیان بە سێ واتایان دێن: داواكردنی یارمەتیی، تۆڵەستاندنەوە، ملنەدان بۆ ستەم و زوڵم، (بەرگریی لە خۆكردن).

(سَبِيلٍ): (أي: طَرِيق)، ڕێ، لێرەدا كە دەفەرموێ: (مَا عَلَيْهِم مِّن سَبِيلٍ )، هیچ بیانوویەك نیە، یاخود هیچ ڕێیەك نیە كە ڕەخنەیان لێبگیرێ.

(عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ): ئەو كارانەی كە پێویستییان بە ویستێكی پتەو و مەحكەم دەكات، (العَزْمُ والعَزِيمَةُ: عَقْدُ القَلْبِ عَلَى إمْضَاءِ الأَمْر) (عَزْمُ وعَزِيمَةُ): بریتیە لە دڵ دامەزراندن لەسەر جێبەجێ كردنی كارێك، (عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ): (الأُمُوْر العَازِمَةِ، العَازِمة أَصْحَابها) ئەو كارانەی خاوەنەكانیان، ئەنجامدەرەكانی ئەو كارانە، خاوەن عەزم و بڕیاری پتەون، هەندێكیش گوتوویانە: (عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ) واتە: (الأمُور المعْزُومَة) واتە: ئەو كارانەی عەزمیان لەسەر جەزم كراوە، بە ویستێكی پتەوەوە، ئەنجامدراون.

(مَرَدٍّ ): (المَرَدُّ: الرُّجُوعُ وَالمَرْجِعُ)، (مَردّ): یان چاوگی میمییە، بە مانای (رُجُوع)ە، گەڕانەوە، یاخود ناوی شوێنە (المَرْجِع) شوێنی بۆلا گەڕانەوە.

(يُعْرَضُونَ ): واتە: ڕادەنوێنرێن، عەرز دەکرێن، (عَرَضْتُ الشَّيءَ عَلَى البَيْعِ، وَعَلَى فُلَانٍ وَلِفُلَانٍ) ئەو شتەم بۆ فرۆشتن ڕانواند، یان ئەو شتەم بۆ فلانکەس ڕانواند، کە دەگونجێ بڵێ: (عَرَضْتُ عَلَى فُلَانٍ، أو لِفُلَانٍ) لەسەریم ڕانواند، یاخود بۆیم ڕانواند.

(ٱلذُّلِّ ): (الذُّلُّ: مَا كَانَ عَنْ قَهْرٍ، يُقَالُ: ذَلَّ يَذِلُّ ذُلاًّ) (ذُلّ): بریتیە لە زەبوونییەك، ملکەچییەك بە هۆی ئەوەوە بەرانبەرەکەی دەستەڵاتی بەسەردا ڕاناوە، تووشی مرۆڤ ببێ، دەگوترێ: (ذَلَّ يَذِلُّ، ذُلّا)، بەڵام (الذُّلُّ: مَا كَانَ بَعْدَ تَصَعُّبٍ، وَشَمَاسٍ) (ذِلّ): بریتیە لەوەی وڵاخێك دوای ئەوەی جەنەی گرتوەو یاخیی بووە، دەستەمۆ بێ .

(طَرْفٍ): (طَرَفُ الشَّيءِ: جَانِبُهُ)، تەرەفی شتێك بریتیە لە لایەکی ئەو شتە، (وَطَرْفُ العَيْنِ: جَفْنُهُ) تەرفی چاو، واتە: پێڵووی چاو، (وَالطَّرْفُ: تَحْرِيكُ الجَفْنِ، وَعُبِّرَ بِهِ عَنِ النَّظَرِ) (طَرْف): بریتیە لە جووڵاندنی پێڵووی چاو، کە تەعبیری پێکراوە لە ڕوانین، کەواتە: (طَرْف): بە مانای ڕوانینەو، بە مانای جووڵاندنی پێڵووی چاوە، کە دەفەرموێ: ( مِن طَرْفٍ خَفِيٍّ ) واتە: بە سیلە چاو، یاخود (مُسَارَقَةُ النَّظَر) واتە: تەماشاکردنێکی پەنهان و بە دزیی.

(مُّقِيمٍ ): (أي: مُسْتَمِرٍ وَدَائِمٍ)، بەردەوام، شتێك بەردەوام بێ و درێژەی هەبێ.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

وەك لە پێناسەی ئەم دەرسەدا گوتمان: خوا ﷻ لەم یازدە ئایەتەدا، لە هەشت ئایەتی یەکەمیاندا بە دە (١٠) سیفەتیان باسی کۆمەڵی مسوڵمان، کۆمەڵی بڕوادار دەکات، کاتێکیش ئەو ئایەتە موبارەکانە لە وەسف و پێناسەی کۆمەڵی بڕواداران هاتوونە خوار، کە ئەوان لە مەککە بوون، چونکە وەك پێشتر گوتمان: ئەم سوورەتە موبارەکە ئەگەر لە ساڵی هەشتەمی پێغەمبەرایەتیی دا یان نۆیەمدا دابەزیبێ، واتە: چوار پێنج ساڵ بەر لەوەی مسوڵمانان لەمەککەوە کۆچ بکەن بۆ مەدینەو، ببنە خاوەنی قەوارەی سیاسیی و دەوڵەتی خۆیان.

کەواتە: ئەو دە (١٠) سیفەتەی خوا ﷻ لێرەدا پێناسەی ئەو کۆمەڵە مسوڵمانەیان پێدەکات، یانی: مسوڵمانینە! ئێوە هەر کاتێك ببن بە شێوەی کۆمەڵێك و کۆمەڵگایەك، خەڵکێکی مسوڵمان، پێویستە ڕازاوەبن بەو دە (١٠) سیفەتانە، ڕازاوەبن بە هەموو سیفەتێکی بەرزو جوان، کە ئەم دەیە، دە (١٠) سیفەتی سەرەکیین، لە بەر ئەوەی هەموو بوارەکان، یان زۆربەی هەرە زۆری بوارو لایەنەکانی ژیان و، دینداریی و دنیادارییی دەگرنەوە، هەشت ئایەتی یەکەم بۆ خستنەڕووی ئەو دە سیفەتە تەرخانکراون و، سێ ئایەتی دواییش بۆ خستنە ڕووی سەرەنجامی شووم و دژوارو سەختی بێبڕوایان لە ڕۆژی دواییدا تەرخانکراون.

سەرەتا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَمَآ أُوتِيتُم مِّن شَىۡءٖ فَمَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا ﴾، ئەمە وەك توێژەرەوانی قورئان و شارەزایانی ڕێزمانی عەرەبیی دەڵێن: لق لێکردنەوە (تفريع) یەو شیکردنەوەیە لەسەر ڕستەیەکی پێشوو، واش پێدەچێ ئەم ئایەتە موبارەکە بێ، کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَوۡ بَسَطَ ٱللَّهُ ٱلرِّزۡقَ لِعِبَادِهِۦ لَبَغَوۡاْ فِى ٱلۡأَرۡضِ وَلَٰكِن يُنَزِّلُ بِقَدَرٖ مَّا يَشَآءُۚ إِنَّهُۥ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرُۢ بَصِيرٞ ﴿٢٧﴾ ﴾، دوایی دەفەرموێ: ﴿ فَمَآ أُوتِيتُم مِّن

شَيْءٍ ﴾، هەر شتێك كە پێتان دراوە، یانی: هەرچەندە زۆربێ، هەرچی پێتاندراوە، ﴿ فَمَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا ﴾، بەهەرە وەرگرتنی ژیانی دنیایە، ڕابواردنی کەمی ژیانی دنیایە، (متاع): بریتیە لە هەر شتێك بەهەرەیەكی كەم و كاتیی لێوەربگیرێ، (مَا يُتَمَتَّعُ بِهِ مُؤَقَّتاً) هەر شتێك بە شێوەی كاتیی بەهەرەی لێ وەربگیرێ، پێی دەگوترێ: (متاع)، یانی: هەرچی كەپێتان دراوە با زۆریش بێ، هەر ڕابواردنێكی كەمە، چونكە (مِن) كە دەچێتە سەر (شَيء) واتە: هەر لە سەرەتای هەر شتێكی كەمەوە، تاكو هەر شتێكی زۆر، هەرچی پێتاندراوە لە ژیانی دنیادا، هەمووی ڕابواردنێكی كەمی دنیایە، ﴿ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ ﴾، بەڵام ئەوەی لە لای خوایە، كە بەهەشتە، ﴿ خَيۡرٌ وَأَبۡقَىٰ ﴾، باشترە و بەردەوامتریشە، بەڵام بۆ كێیە؟ ﴿ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ ﴾، بۆ ئەوانەی بڕوایان هێناوەو پشتیشیان بەس بە پەروەردگاریان دەبەستن، یانی: بڕوایان هێناوە بە سەرجەم ئەو شتانەی پێویستە بڕوایان پێ بهێنرێ:

١- بڕوایان بە خوا ﷻ هێناوە، وەك تاكە بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەن و پەرستراوی خۆیان.

٢- بڕوایان بە فریشتەكانی خوا هێناوە.

٣- بڕوایان بە كتێبەكانی خوا هێناوە.

٤- بڕوایان بە پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامَ**) هێناوە.

٥- بڕوایان بە ڕۆژی دوایی هێناوە.

٦- بڕوایان بە نەخشەو ئەندازەگیریی خوا ﷻ هێناوە بۆ هەموو شتێك.

﴿ وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ ﴾، ئەوانەی كە تەنیا پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن، پەروەردگاریان دەكەنە وەكیل و كارپێسپێردراوی خۆیان، پشتیان بە پەروەدگاریان قایمە، كەواتە: بەهەشت لە گرەوی كەسانێكدایە خاوەنی ئەو سیفەتانەن، كە ئێستا باس دەكرێن:

**سیفەتی یەکەم:** (**آمنوا**) کۆمەڵێك کە بە هەشتی خوا شایستەیانەو، خوا بەهەشت دەکاتە شایستەیان، ئەو بەهەشتەی کە زۆر باشترە لە ژیانی دنیاو، لەگەڵی دا بەراورد ناکرێ و بەردەوامتریشەو نابڕێتەوە، لە گرەوی کەسانێکدایەو بۆ کەسانێك تەرخانکراوە، کە: ئیمانیان هێناوە، بڕوایان هێناوە بە هەموو ئەو شتانەی پێویستە بڕوایان پێهێنرێ، بڕوا (**إیمان**)یش وەك پێشتر زۆرجار گوتوومانە: چوار پێکهێنەری هەن:

**أ-** زانینی عەقڵ.

**ب-** پەسندکردن و قبووڵکردنی دڵ.

**ج-** دانپێداهێنانی زمان.

**د-** جێبەجێ کردنی ئەندامەکان، چونکە ئینسان ئەو چوار هێزەی هەن:

**١-** هێزێکی هەیە، شتی پێ دەزانێ، کە عەقڵە.

**٢-** هێزێکی هەیە، شتی پێ دەوێ، یان خۆشدەوێ، یان قبووڵ دەکات، یان ڕەفز دەکات، کە دڵە، ئیرادەیە.

**٣-** هێزێکی هەیە، ئەوەی دەیەوێ پێی دەردەبڕێ، کە زمانیەتی.

**٤-** هێزێکیشی هەیە، ئەوەی بیەوێ، پێی جێبەجێ دەکات، کە ئەندامەکانی و هێزی جەستەیەتی، ئنجا ئیمان پەیوەندیی بە هەر کام لەو چوار هێزەی مرۆڤەوەیە هەیە: هێزی ئیدراکیی، هێزی ئیرادیی، هێزی تەعبیریی، هێزی تەنفیزیی.

بەڵێ ئیمان لە کۆی هەر چوار پێکهاتەکە پێکدێ، ئیمان واتە: تۆ خوا ﷻ و فریشتەکانی خواو کتێبەکانی خواو پێغەمبەرانی خواو ڕۆژی دوایی و، هەر شتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەلایەن خواوە هەواڵی پێداوە، بە عەقڵ دەرکی بکەی و بیزانی، بە دڵ قبووڵی بکەی و پەسندی بکەی، بە زمان دانی پێدابێنی و، بە ئەندامەکانیش بە پێی توانا، بە گوێرەی ئەوە بەڕێوەبچی و ڕەفتاری پێ بکەی.

**سیفەتی دووەم:** ﴿ وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ ﴾ تەنیا پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن، نە پشت بە خۆیان دەبەستن، نە بە خزمیان، نە بە پارەو سامانیان، نە بە فلان دەوڵەت، نە بە فلانکەس، بەڵکو پشتیان تەنیا بە خوا قایمە، بەڵام ئایا پشت بە خوا بەستن، مانای وایە هۆکارەکان ڕەچاو نەکەین؟ نەخێر، وەك زۆر جار گوتوومانە: پشت بە خوا بەستن، لەگەڵ بەستنەوەو دەست بۆ هۆکار بردن دا، ناکۆك نین، چونکە ئەو خوایەی پێت دەفەرمویّ: پشتت پێم ببەستە، هەر ئەویش دەفەرمویّ: دەست بۆ هۆکارەکان بەرە، هۆکارەکان دەستەبەر بکە، خوا ﷻ لە مەدحی (**ذو القرنین**)دا، دەفەرمویّ: ﴿ إِنَّا مَكَّنَّا لَهُۥ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَءَاتَيۡنَٰهُ مِن كُلِّ شَيۡءٖ سَبَبٗا ﴿٨٤﴾ ﴾الكهف، واتە: ئێمە لە زەویدا دەست ڕۆیشتوومان کردبوو و بۆ هەرشتێك هۆکارمان پێدابوو، شوێن هۆکارەکە دەکەوت و بە هۆی هۆکارەکانەوە دەگەیشتە ئامانجەکانی.

ئەو عەرەبە خێڵەکییەی هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ حوشترێکی پێ بوو، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! حوشترێکم پێیە، بیبەستمەوەو پشت بە خوا ببەستم، یان بەرهەڵدای بکەم و پشت بە خوا ببەستم؟ فەرمووی: {**اعْقِلْهَا وَتَوَكَّلْ**} (**أخرجه الترمذي: ٢٥١٧، وإبن حبّان: ٧٣١، وصححه الألباني في «صَحِيح الْجَامِع»: ١٠٦٨**)، واتە: بیبەستەوەو پشت بە خوا ببەستە، چونکە بەستنەوە لەگەڵ پشت بە خوا بەستن دا تێکناگیریّ، بەستنەوە، ئیشی دەستانە، ئیشی جەستەیە، پشت بە خوا بەستنیش، ئیشی دڵ و دەروونە.

**سیفەتی سێیەم:** ﴿ وَٱلَّذِينَ يَجۡتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡفَوَٰحِشَ ﴾، هەروەها ئەوانەی دووریی دەگرن لە گوناهە گەورەکان و، لە گوناهە ناقۆڵاو ناشیرینەکان، ﴿ كَبَٰٓئِرَ ٱلۡإِثۡمِ ﴾ (**كَبائر**) کۆی (**كَبِيرة**)یە، کە پاڵ دراوەتە لای (**إثم**) واتە: گوناهە گەورەکان، (**فواحش**)یش کۆی (**فاحشة**)یە، یانی: ئەو گوناهانەی گەورەن و، دزێوو ناشیرن و ناقۆڵان، خۆیانیان لێ دوور دەگرن، کە دوایی ئێمە لە مەسەلە گرنگەکاندا، پێناسەی گوناهە گەورەکان و، گوناهە دزێو و ناقۆڵایەکان دەکەین،

کورتەکەی ئەوەیە: گوناهی گەورەو ناقۆڵا، هەر گوناهێکە: یان سزای دنیایی لەسەربێ، یاخود هەڕەشەی قیامەتیی لەسەربێ، کە بەو پێیە بێ، هەر کام لە: شیرك و، کوفرو، نیفاق و، خیانەت و، دزیی و، زیناو، کوشتن و، ڕێگریی و، قومارو، مەیخۆریی و، غەیبەت و، درۆکردن و، قسەهێنان و بردن و، بوختانکردن و، جاسووسیی کردن و، هەموو ئەوانە گوناهی گەورەن، چونکە هەموویان، یان سزای دنیاییان لەسەرە، یاخود هەڕەشەی قیامەتیی.

سیفەتی چوارەم: ﴿ وَإِذَا مَا غَضِبُوا۟ هُمْ يَغْفِرُونَ ﴾، (هەروەها ئەوانەی) کاتێك تووڕە بوون، چاوپۆشیی دەکەن، لێدەبوورن، نافەرموێ: تووڕەنابن، چونکە خوا مرۆڤی وا خوڵقاندوە سیفەتی تووڕەبوونی هەبێ، بۆ ئەوەی بەرگریی لە خۆی بکات، بەرگریی لە حورمەتەکانی خۆی بکات، بەرگریی لە پیرۆزییەکانی خۆی بکات، بەرگریی لە بوونی خۆی بکات و لە شتەکانی خۆی بکات و لە دەوروبەری خۆی بکات، واتە: تووڕە نەبوون سیفەتێکی باش نیە، بەڵکو مرۆڤ دەبێ سیفەتی تووڕەیی هەبێ، بەڵام تووڕەیی لە هەقی نەباتە دەرێ، لە سنووری شەریعەتی دەرنەچوێنێ، هەروەها لە شوێنی خۆیدا تووڕەبێ و بە ئەندازەی خۆی تووڕەبێ، هەرکات پێویستیشی کرد، ئەو کەسەی لێی تووڕە بوو، چاوپۆشیی لێ بکات و لێی ببوورێ، بۆیە لێرە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا مَا غَضِبُوا۟ هُمْ يَغْفِرُونَ ﴾، {بەهەشتی خوا بۆ کەسانێك دانراوە} ئەگەر تووڕە بوون، لێدەبوورن و چاوپۆشیی دەکەن، مادام بزانن چاوپۆشییەکە باشە بۆ بابای چاوپۆشیی لێکراو.

سیفەتی پێنجەم: ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِرَبِّهِمْ ﴾، هەروەها ئەوانەی وەڵامی پەروەردگاریان داوەتەوە، بەدەم بانگی پەروەردگاریانەوە چوون، کە ئەمە گشتییە، واتە: بۆ هەر شتێك پەروەردگاریان فەرمانی پێکردبن، دەست لەسەر سینگ بوون و، بە بەڵێ و ئامادەم و لە خزمەتدام، وەڵامی فەرمانەکانی پەروەردگاریان دەدەنەوە، چ بۆ ئەنجامدان بێ، چ بۆ نەکردن بێ، چ بۆ ئەنجامدانی ئەرکەکان بێ، چ بۆ خۆ دوورگرتن لە قەدەغەکان بێ.

سیفەتی شەشەم: ﴿ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾، هەروەها ئەوانەی نوێژیان بەرپاکردوە، نویژ بەرپاکردنیش واتە: نوێژ بەو شێوەیە بکەی کە خوا فەرمانی پێکردوە، چونکە بەرپاکردنی شتێك و ڕاوەستاندنی، باشترین و سرووشتیترین حاڵەتی پێدەدات.

سیفەتی حەوتەم: ﴿ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ﴾، کاروباریان لە نێو خۆیاندا بە ڕاوێژە، واتە: کاروبارێك کە پەیوەندیی بە هەموویانەوە هەبێ، بە ڕاوێژ لە بەینی خۆیاندا ئەنجامی دەدەن، نەك یەکیان خۆی بسەپێنێ بەسەر ئەوی دیکەدا، یاخود هەندێکیان بەبێ گەڕانەوە بۆ ئەوانی دیکە، شتێك بکەن بەناوی هەمووانەوە، مادام کارەکە پەیوەندیی بە هەموویانەوە هەبێ، دەبێ لەبەینی خۆیان دا ڕاوێژی تێدا بکەن.

سیفەتی هەشتەم: ﴿ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴾، لەوەش کە پێمان داون و کردوومانەتە بژیویان، دەبەخشن، ئنجا سەروەت و سامانە، شارەزایی و زانستە، تێگەیشتن و عەقڵە، چاکەو تاعەتە ..هتد، دەبەخشن، واتە: وا دەکەن خەڵکی دیکەش بەهرەمەندبێ و سوودمەند بێ لە هەموو ئەو شتانەی ژیانیان پێیانەوە بەندە، شتی ماددیی و مەعنەویی، کە پێمان داون و بەهرەمەندمان کردوون، هەوڵدەدەن ئەوشتانە بەهرەیان پێ بەخەڵکی دیکە بگەیەنن.

سیفەتی نۆیەم: ﴿ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَابَهُمُ ٱلْبَغْىُ هُمْ يَنتَصِرُونَ ﴾، {هەروەها بەهەشتی خوا کە لە دنیا باشترەو بەردەوامتریشە، لە ڕابواردنی خۆشییەکانی دنیا، بۆ کەسانێك دانراوە} کە هەرکاتێك دەستدرێژییان تووش بوو، تۆڵە دەکەنەوەو دەستەوکەر دەکەن، ﴿ هُمْ يَنتَصِرُونَ ﴾ ئەوان تۆڵە دەکەنەوەو هەقی خۆیان دەستێننەوەو مل نادەن بۆ ستەم و سەر نەوی ناکەن، چونکە: ﴿ يَنتَصِرُونَ ﴾ واتە: مل نەدان بۆ ستەم (**الإمْتِنَاعُ عَنِ الظُّلْم**)، هەروەها بە مانای تۆڵە کردنەوە (**الإنْتِقَام**)یش دێ، دیسان یانی: داواکردنی یارمەتیی، تاکو ئەو دەستدرێژییە لە خۆیان دووربخەنەوە، ﴿ وَجَزَٰٓؤُاْ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِّثْلُهَا ﴾، سزای خراپەیەك، خراپەیەکی وەك خۆیەتی، کە دیارە هەر لەبەر ئەوەی لە ناودا لەگەڵی یەکە، پێی دەگوترێ

خراپە، ئەگەرنا لە ڕاستییدا کەسێك کە خراپە پاڵ پێوەدەنێ و بەرپەرچ دەداتەوە، پاڵ پێوەنانەکەی ئەو بە خراپە دانانرێ.

سیفەتی دەیەم و کۆتایی: ﴿ فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ ﴾، هەر کەسێك چاوپۆشیی بکات و، چاکسازیی بکات، پاداشتی لەسەر خوایە، واتە: لە بەرانبەر هەر خراپەیەکدا، بۆت هەیە خراپەیەك بکەی، بەڵام ئەگەر چاوپۆشیی بکەی و چاکسازیی بکەی، ئەوە باشترەو پاداشتی لەسەر خوایە، ﴿ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، بە دڵنیایی خوا ستەمکارانی خۆشناوێن.

﴿ وَلَمَنِ ٱنتَصَرَ بَعْدَ ظُلْمِهِۦ ﴾، کەسێك دوای ئەوەی ستەمی لێکراوە، تۆڵە بکاتەوەو هەقی خۆی بکاتەوە، یانی: (وَلَمَنِ انْتَصَرَ بَعْدَ مَظْلُومِيَّتِهِ) کەسێك دوای ستەملێکراویی خۆی، تۆڵە بستێنێتەوە، بەرگریی لە خۆی بکات، ﴿ فَأُو۟لَٰٓئِكَ مَا عَلَيْهِم مِّن سَبِيلٍ ﴾، ئەوانە ڕێی ڕەخنەو گلەییان نایەتە سەر.

﴿ إِنَّمَا ٱلسَّبِيلُ عَلَى ٱلَّذِينَ يَظْلِمُونَ ٱلنَّاسَ وَيَبْغُونَ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ ﴾، ڕێی گلەیی و ڕەخنە تەنیا لەسەر ئەوانەیە کە ستەم لە خەڵك دەکەن و، بە ناهەق دەستدرێژیی دەکەن لەزەویدا، ئنجا بێگومان دەستدرێژیی هەر بە ناهەقە، بەڵام ئەوە بۆ زیاتر قێزەون پیشاندانی دەستدرێژیی و سنوور شکێنییەکەیانە، ﴿ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾، ئا ئەوانە ئازارێکی بە ئێشیان هەیە.

﴿ وَلَمَن صَبَرَ وَغَفَرَ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ﴾، بە دڵنیایی کەسێك خۆڕاگربێ و لێبوردن بکات، ئەوە لەو کارانەیە کە پێویستیی بە ویستێکی پتەو دەکات، کارەکەی لەو کارانەیە کە ئەنجامدەرەکەیان، خاوەن ئیرادەو عەزمێکی قایم و مەحکەمە، یاخود: کارەکەی لەو کارانەیە کە خوا ﷻ جەختی لەسەر کردۆتەوەو فەرمانی پێکردوە.

بەڵام با لێمان تێکنەچێ: خوا دەفەرموێ: ﴿ فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ ﴾ ئنجا هەرکەس لێبووری و چاکسازیی بکات، کەواتە: دەبێ چاوپۆشیی کردنەکە،

ببێتە هۆی چاكسازیی، ئەگەرنا چاوپۆشییەك لە كەسێك كە دەستدرێژیی كردوەو خراپەی كردوە، ببێتە هۆی ئەوەی زیاتر شوولی لێ هەڵكێشێ، زیاتر سووربێ لەسەر خراپەكاریی، بۆ وێنە: ستەمێكی كردوە، بیكاتە دوو، بیكاتە سێ، بیكاتە چوار، لەبەر ئەوەی خەڵك چاوپۆشیی لێدەكات، ئەوە ئەو چاوپۆشییە ئیصلاحی بە دوادا نەهات، بۆیە بە پەسند دانانرێ، وەك دوایی لە مەسەلە گرنگەكاندا زیاتر لەوبارەوە قسە دەكەین، كە چاوپۆشیی كردن لە خراپەی خراپەكارێك، كاتێك باشە كە ببێتە هۆی بە خۆ داچوونەوەی و، دەستهەڵگرتن لەو خراپەی و تەریق بوونەوەی، بەڵام ئەگەر ببێتە زیاتر بێ شەرم بوونی و شوول لێهەڵكێشانی، ئەو چاوپۆشیی و لێبوردنە لەگەڵ ئەودا، شتێكی خراپە، بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿ فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ ﴾، هەر كەسێك چاوپۆشیی بكات و چاكسازیی بكات، یانی: لێبوردنەكە ببێتە هۆی چاكیی، ئەگەر ببێتە هۆی خراپیی و دەرهاویشتەی خراپی هەبێ، ئەو لێبوردنە لە شوێنی خۆیدا نیە.

ئنجا ئەمە ئەو هەشت ئایەتە، دەربارەی ئەو دە (١٠) سیفەتە بنەڕەتیی و بنیچینەییانەی كۆمەڵی مسوڵمان لەهەر شوێنێك و لە هەر كاتێكدابن، دەبێ ئەو سیفەتانەیان هەبن، كە وەك ئاماژەمان پێدا، زۆربەی هەرە زۆری بوارو ڕەهەندەكانی دینداریی و دنیاداریی دەگرنەوە.

ئنجا خوا ﷻ دێتە سەر باسی سەرەنجامی ئەوانەی خوا گومڕایان دەكات، هەڵبەتە خوا كەس گومڕا ناكات، بەو واتایە بڕیاری بۆ بدات دەبێ گومڕابێ و، بەدەست خۆی نەبێ، بەڵكو مرۆڤ بەپێی سیستمی خوا گومڕایی بە مل دادێ، هیدایەتی خوای بۆ دێ، هیدایەتەكە ڕەفز دەكات، بە پێی سیستمی خواش هەركەسێ هیدایەت و ڕێنمایی خوا ڕەفز بكات، گومڕا دەبێ، هەروەك بە پێی سیستمی خوا، هەر كەسێك ژەهر بخوات، دەمرێ و، بە پێی سیستمی خوا، هەر كەس خراپە بكات، پێی ناشیرین دەبێ، پێی گوناهبار دەبێ، سیستمی خوا وایە، كە دەفەرموێ: خوا گومڕای بكات، واتە: بە پێی یاسای خوا، بە پێی سیستمێك

کە خوا دایناوە، ئەوەی بەسەر دێ، نەك خوای کارزان ئەوەی بەسەربێنێ، خوا گومڕای بکات! چونکە خوا ﷻ لە ئەسڵدا هەموو پێغەمبەرانی (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) ناردون و، هەموو کتێب و بەرنامەکانی خۆی دابەزاندوون، بۆ ڕێنمایی کردنی خەڵك و، بۆ ئەوەی خەڵك ڕاستە ڕێ بێ، کەواتە: خوا پێی خۆشە ڕێی ڕاست بگرن، پێی خۆشە خەڵك چاك بن و چاکەکاربن، وەك دەفەرموێ: ﴿ مَّنْ عَمِلَ صَٰلِحًا فَلِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَنْ أَسَآءَ فَعَلَيْهَا ۗ وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿٤٦﴾ ﴾فصلت، واتە: هەر کەسێك چاکە بکات خۆی لێی بەهرەمەندەو، هەرکەسێك خراپە بکات، خۆی لێی زیانبارەو، پەروەردگارت ستەمکارنیە بۆ بەندەکانی.

بەڵێ خوا ﷻ ڕقی لە کوفرە، بەڵام ئیمانی خۆشدەوێ، ڕقی لە سپڵەییەو سوپاسگوزاریی خۆشدەوێ، ﴿ وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلْكُفْرَ ۖ وَإِن تَشْكُرُوا۟ يَرْضَهُ لَكُمْ ﴿٧﴾ ﴾الزمر، واتە: خوا ڕازی نیە بەندەکانی سپڵەو ناسوپاس بن، یاخود بێ بڕوابن، بەڵام ئەگەر سوپاسگوزارو بڕواداربن، پێی خۆشەو پێی پەسندو چاکە.

هەر بۆیەش خوا ئەو هەموو پێغەمبەرانەی (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ**) ناردوون و، هێندە هۆشداریی پێداوین: ئاگاتان لێبێ! شەیتان فریوتان نەدات، ﴿ وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ ﴾ هەروەها هەڕەشەی لێ کردووین، ئەگەر بەقسەی شەیتان بکەن، دوایی سزاتان دەدەم! مانای واتە: خوا ڕقی لە زوڵمە، ڕقی لە کوفرە، ڕقی لە شیرکە، ڕقی لە خراپەیەو، پێی خۆشە خەڵك ئیمان بێنێ و سوپاسگوزاربێ و چاکەکاربێ.

کەواتە: هەموو ئەو ئایەتانەی باسی ئەوە دەکەن، خوا خەڵك گومڕا دەکات، واتە: بەپێی یاسای خوا گومڕادەبن، چونکە هەر چۆن بێ گومڕابوونەکە هەر بەپێی ویستی خوای پەروەردگارە، بەپێی سیستمێکە خوای دادگەر داینـاوە، بەڵام ئەوە مرۆڤەکانن خۆیان ڕێی گومڕایی دەگرن، وەك لە سووڕەتی (**فصلت**) دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيْنَٰهُمْ فَٱسْتَحَبُّوا۟ ٱلْعَمَىٰ عَلَى ٱلْهُدَىٰ ﴿١٧﴾ ﴾، واتە: گەلی سەموود ڕێنماییمان کردن، ڕێمان پێشاندان، بەڵام ئەوان کوێرییان

بەسـەر ڕێنماییـدا هەڵبـژارد، هەروەهـا لـە سـوورەتی (إبراهیـم)دا، خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٧﴾ ﴾، واتـە: خـوا سـتەمكاران گومـڕا دەكات، ئـەدی خـوا كـێ هیدایـەت دەدا، كـێ ڕاسـتەڕێ دەكات؟ ﴿ وَيَهْدِيٓ إِلَيْهِ مَن يُنِيبُ ﴿١٣﴾ ﴾الشـورى، خـوا ئەوانـەی كـە بـۆلای دەگەڕێنـەوە، ڕاسـتەڕێیان دەكات، ﴿ وَيَهْدِيٓ إِلَيْهِ مَنْ أَنَابَ ﴿٢٧﴾ ﴾الرعـد، واتـە: ئەوكەسـەی لـە ناخـەوە بـۆلای خـوا گەڕاوەتـەوە، خـوا ڕاسـتەڕێی دەكات.

ئنجا دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن وَلِيٍّ مِّنۢ بَعْدِهِۦ ﴾، هەركەسێك خـوا گومـڕای بـكات، لـە دوای وی، هیـچ سەرپەرشـتیاری نیـن، دوای خـوا كێ سەرپەرشـتیی دەكات؟ هـەر خـوا ﷻ سەرپەرشـتیی بەنـدەكانی دەكات و، ئـاگای لێیانـەو، خـۆشی دەوێـن و مشـووریان دەخـواو، ڕێنماییـان دەكات، ئنجـا ئەگـەر مـرۆڤ هیدایـەتی خـوای ڕەفـز كـردو گومڕایـی بەملـدا هـات، لـە دوای خـوا، كـێ سەرپەرشـتیی بـكات و بەتەنگیـەوە بـێ و مشـووری لـێ بخـوات؟

﴿ وَتَرَى ٱلظَّٰلِمِينَ لَمَّا رَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ﴾، سـتەمكارانیش دەبینـی كاتێـك ئـازار دەبینـن، سـتەمكاران، (**ظـالم**) كـە بـە (**ظالمـون وظالمـين**) كۆدەكرێتـەوە، كـە نـاوی بكـەر (اسـم فاعـل)ە، واتـە: خۆیـان سـتەمیان كـردوە، سـتەمەكەش بریتیـە لـەوەی هیدایـەتی خوایـان ڕەفزكـردوەو گومڕاییـان هەڵبـژاردوە، تـا ئـەو سـتەمكارانە دەبینـی، كاتێك سـزاو ئـازار دەبینـن لـە ڕۆژی دوایـی دا، ﴿ يَقُولُونَ هَلْ إِلَىٰ مَرَدٍّ مِّن سَبِيلٍ ﴾، دەڵێـن: ئایـا هیـچ ڕێـی گەڕانـەوە نیـە، یاخـود: ئایـا هیـچ شـوێنێك نیـە پەنـای پـێ بەریـن؟ چونكـە (**مَـرَدّ**) دەگونجـێ چاوگـی (**میمـي**) بـێ، بـە مانـای گەڕانـەوە (**رَدّ**)، (**الرجـوع**)، دەشـگونجێ بەمانـای پەناگـە (**ملجأ**) و (**محیص**)بـێ، ئایـا هیـچ شـوێنێكی پەناگـە هەیـە خۆمـانی تـێ بگریـن؟ كەواتـە: لـەوێ كـە بـە ئـاوات دەخـوازن بگەڕێنـەوە بـۆ دنیـا، ئێسـتا كـە لـە دنیـادان، كارێـك بكـەن، كـە چوونـە قیامـەت خۆزگـە نەخـوازن بێنـەوە دنیـا، بـۆ كاری چـاك، ئێسـتا ئـەو كارە چاكانـەی ئەو كاتـە خۆزگەیـان پێدەخوازی، ئێسـتا ئەنجامیـان بـدە، ئێسـتا لەبـەر دەسـتەو لـە دەسـت نەچـووە.

﴿ وَتَرَىٰهُمْ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا خَٰشِعِينَ ﴾، تۆ ئەوان دەبینی {هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، گومڕابووەکان} زەبوونانە ڕادەنوێنرێن لەسەری، (ها)ی سەر (عَلَيْهَا) بۆ ئاگری دۆزەخ دەچێتەوەو ئەوە بەڕەوت (**سیاق**) دیارە، چونکە پێشێ هەر باسی ئازاری کردوەو (**عذاب**)یش، نێرینەی مەجازیی (**مذكر مجازي**)یە، بەڵام نافەرموێ: (**وتراهم يعرضون عليه**) واتە: لەسەر ئەوە ئازارو سزایە، بەڵکو دەفەرموێ: (عَلَيْهَا) کە ئەو ڕاناوە بۆ دۆزەخ دەچێتەوە، چونکە ئەو ئازارەش ئازاری دۆزەخە، یان بۆ ئاگر دەچێتەوەو سزای ئاگرە، چۆن لەسەری ڕادەنوێنرێن؟ ﴿ خَٰشِعِينَ ﴾، حاڵە، یانی: لە حاڵێکدا زۆر زەبوون و ملکەچن، ﴿ مِنَ ٱلذُّلِّ يَنظُرُونَ مِن طَرْفٍ خَفِيٍّ ﴾، بە هۆی زەبوونییانەوە، بەهۆی بێ دەستەڵاتیانەوە، بە سیلەی چاو تەماشادەکەن، بە ئاستەم پێڵووی چاویان دەجووڵێنن، (مِن طَرْفٍ خَفِيٍّ) (طَرْفٍ) بە مانای پێڵووی چاو، دێ و، بە مانای ڕوانینی چاویش دێ، (خَفِيٍّ) پەنهان، واتە: بە سیلەی چاو تەماشا دەکەن، مرۆڤ ئەگەر تینێکی بۆ بێ، مەترسییەك ڕووبەڕووی بێ، چاوی تێوە زەق ناکات، بەڵکو بە ئاستەم تیلە چاوێکی دەداتێ و بە سیلەی چاو تەماشای دەکات، ناوێرێ پڕی چاوی تەماشای بکات، یەك بە یەکێك دەڵێ: بە پڕی چاوی تەماشای کرد، بەڵام وەختێك کە ترسەکە زۆر گەورەبێ، بە ئاستەم چاوی لێ دەکات، بۆ ئەوەی وێنەی تەواوی ئەو دیمەنە سامناکە، نەیەتە پێش چاوی.

﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ ﴾، ئەوانەی بڕوایان هێناوە گوتیان، واتە: لە ڕۆژی دواییدا، ﴿ إِنَّ ٱلْخَٰسِرِينَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ وَأَهْلِيهِمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴾، بە دڵنیایی زیانباران، یانی: زیانبارانێ کە تەواوی زیانباریی لەواندا هاتۆتەدی، (ٱلْخَٰسِرِينَ ) (أل)ەکەی، کە بۆ ناساندنە، دەگونجێ بڵێین: بۆ ناساندنی (عهد)ە، واتە: زیانبارەکانی ڕاستەقینە، یاخود بۆ تێکڕا (جنس)ە، واتە: تێکڕای زیانباران، ﴿ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ وَأَهْلِيهِمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴾، ئەوانەن کە خۆیان و کەس وکاریان لە ڕۆژی قیامەتدا، لەدەست داوەو دۆڕاندوە، ﴿ أَلَآ إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ فِى عَذَابٍ مُّقِيمٍ ﴾، ئاگاداربن! ستەمکاران لە ئازارێکی بەردەوامدان، لە ئازارێکی نەبڕاوەدان، کە کۆتایی نایەت.

لە کۆتاییدا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كَانَ لَهُم مِّنْ أَوْلِيَآءَ يَنصُرُونَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ ﴾، جگە لە خوا هیچ سەرپەرشتیاریان نەبوون سەریان بخەن، خواشیان لە خۆیان تووڕە کردبوو، سەرپەرشتیاریی خوایان لە دەست دابوو، جگە لە خواش سەرپەرشتیاری دیکەیان نەبوو، تاکو سەریان بخەن و پشتیان بگرن، ﴿ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن سَبِيلٍ ﴾، کەسێکیش خوا گومڕای بکات، هیچ ڕێی دەربازبوونی نیە، واتە: کەسێك بەپێی سیستم (**نظام**)ێك کە خوا لە ژیانی بەشەرداایناوە، گومڕایی بەملدا هاتبێ و تووشی گومڕایی بووبێ، هیچ ڕێی دەربازبوونی نیە، کەواتە: ڕێی دەرباز بوون بەس ئەوەیە، هیدایەتی خوا هەڵبژێرێ، بۆ ئەوەی تووشی گومڕایی نەبێ، هەر کەسێك بە دوای هودای خوا نەکەوێ، لە چاڵی هەوا دەکەوێ و گومڕا دەبێ، ئەگەر مرۆڤ بیەوێ گومڕایی بەسەر نەیەت، دەبێ ڕێنمایی خوا ﷻ هەڵبژێرێ و، لە باوەشی بگرێ، هەر کات مرۆڤ ڕێنمایی خوای قبووڵ کردو هەڵیبژارد، خوا ﷻ لە پاداشتی ئەوەداو لە بەرانبەر ئەوەداو لە چاکەی ئەوەدا، مشووری لێ دەخوات و سەرپەرشتیاریی دەکات، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱهْتَدَوْا۟ زَادَهُمْ هُدًى وَءَاتَىٰهُمْ تَقْوَىٰهُمْ ﴿١٧﴾ ﴾محمد، واتە: ئەوانەی ڕێنمایی خوایان وەرگرتوە، خوا زیاتر ڕاستە ڕێیان دەکات، زیاتر ڕێنماییان دەکات و، پارێزکارییشیان {پاریزکارییەك کە شایستەی ئەوانە} پێیان دەبەخشێ.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی ئێمە لەو کەسانە بگێڕێ، کە تەواوی هیدایەتی خوا بە دڵ و گیان قبووڵ دەکەن و، سەرەنجام شایستەی ئەوە دەبن، کە خوا ﷻ سەرپەرشتیارییان بکات و مشووریان لێ بخوات، یارمەتییدەریان بێت و هاوکاریان بێت، بە دڵنیایی بە ئەندازەی ئەوە کە ئێمە بەرەو خوا دەچین و بۆ خوا صوڵحاو دەبین، شایستەی ئەوە دەبین کە خوا ﷻ ئاگای لێمان بێ و، سەرپەرشتیارمان بێ، مشوورخۆرمان بێ و، دڵمان دامەزراوتر بکات، لەسەر پابەندیی بە شەریعەتەکەیەوە.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

کەم و کورتیی نازو نیعمەتی ژیانی دنیاو، چاکتر بوون و بەردەوامیی پاداشتی خوا، کە بەرجەستەیە لە بەهەشتدا، بۆ بڕوادارانێکی پشت بە خوا قایمی، خۆ دوورگرتوو لە گوناهو خراپە زل و دزێوەکان و، لێبوردە لە کاتی تووڕەیی دا، کە وەڵامگۆی پەروەردگاریانن و، بەرپاکەری نوێژن و، کاروباریان لە نێوخۆیاندا بە ڕاوێژ بەڕێوەدەبەن و، بەخشەرو هاوکارن، لە بەرانبەر ستەم و دەستدرێژییشدا بێ دەنگ نابن و، لە شوێنی خۆیشیدا، کە مایەی خێرو چاکسازیی بێ، لێبوردەیی دەنوێنن، لە بەرانبەر کەسانێك دا کە خراپەیان لەگەڵدا دەکەن:

خوا دەفەرمووێ: ﴿ فَمَآ أُوتِيتُم مِّن شَيْءٍ فَمَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٣٦﴾ وَٱلَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلْإِثْمِ وَٱلْفَوَٰحِشَ وَإِذَا مَا غَضِبُوا۟ هُمْ يَغْفِرُونَ ﴿٣٧﴾ وَٱلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِرَبِّهِمْ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣٨﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَابَهُمُ ٱلْبَغْيُ هُمْ يَنتَصِرُونَ ﴿٣٩﴾ وَجَزَٰٓؤُا۟ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِّثْلُهَا ۖ فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٠﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پازدە بڕگەدا:

١)- ﴿ فَمَآ أُوتِيتُم مِّن شَيْءٍ فَمَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ﴾، هەر شتێك کە پێتاندراوە، ڕابواردنێکی کەمی ژیانی دنیایە، ئەو (ف)ە، کە کەوتۆتە سەر (فَمَا) یانی: ئەمە لقێکە، یان لق دەرکردنێکە لەو ئایەتەی پێشێ، کە خوا ﷻ فەرمووی: ﴿ وَلَوْ بَسَطَ ٱللَّهُ ٱلرِّزْقَ لِعِبَادِهِۦ لَبَغَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَٰكِن يُنَزِّلُ بِقَدَرٍ مَّا يَشَآءُ ۚ إِنَّهُۥ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرٌۢ بَصِيرٌ ﴿٢٧﴾ ﴾الشورى.

ئنجا لێرەدا خوا دەفەرموێ: هەرچی پێتاندراوە: ﴿فَمَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا﴾، ئەوە هەمووی بەهرە وەرگرتنێك و ڕابواردنێكی كاتیی ژیانی دنیایە، چونكە (مَتاع): هەر شتێكە كە بۆ ماوەیەكی كاتیی و كەم، بەهرەی لێ وەربگیرێ.

لێرەدا خوا ﷻ هەموو نازو نیعمەتەكانی ژیانی دنیا، هەموو خۆشییەكانی دنیا، بە گوزەرانێكی كەم، بە بەهرە وەرگرتن و ڕابواردنێكی كەم، كە لە ژیانی دنیادا هەن، وێنا دەكات، چونكە (مِنْ) كە خراوەتە سەر (شَيء): ﴿فَمَآ أُوتِيتُم مِّن شَيۡءٖ﴾ یانی: هەرشتێك لە سەرەتاوە تاكۆتایی شتەكان، (شَيء)یش وشەیەكی گشتییەو مانای گشتیی هەیە، دوایی دەردەكەوێ داخۆ مەبەستی پێی چییە؟ وەك خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿قُلۡ أَيُّ شَيۡءٍ أَكۡبَرُ شَهَٰدَةٗۖ قُلِ ٱللَّهُ ١٩﴾الأنعام، كەواتە: (شَيء) هەر شتێكە بوونی هەبێ، ئنجا بوونەكەی هەرجۆرە بوونێك بێ، لێرەدا كە (مِنْ) خراوەتە سەر (شَيء) یانی: هەر شتێك لە هەرە بچووكەوە، لەو سەرەتایەوە كە دەست پێدەكات، تاكو هەر شتێكی دیكە، كە لە چاوی ئێوەدا گەورەیە، هەر هەمووی، ڕابواردن و بەهرە وەرگرتنێكی كەمی ژیانی دنیایە.

٢)- ﴿وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيۡرٞ وَأَبۡقَىٰ﴾، بەڵام ئەوەی لە لای خوایە باشترەو، بەردەوامتریشە، واتە: لە خودی خۆیدا باشترە، لە ڕووی كاتیشەوە بەردەوامترە، لە خودی خۆیدا باشترە، باشتر بوونێك كە لەگەڵ هی دنیادا ناچێتەوە نێو تەرازوویەكەوە، بەردەوامتربوونەكەشی بە شێوەیەكە، كە وێنا ناكرێ، چونكە نەبڕاوەیە، چاكتربوونی نیعمەتەكانی بەهەشتیش، وەك یەكێك لە زانایان دەڵێ: بۆ حاڵیی بوون، دەتوانین بەراورد بكەین لە نێوان گەوهەرێكدا، كە گەوهەری وا هەیە نرخەكەی یەكجار زۆرە، گەوهەرێك لەگەڵ لەتكە سواڵەتێك، یان لەتكە گۆزەیەك دا بەراورد بكرێ، گەوهەرەكە لە خودی خۆیدا بە نرخترە، كەس لەتكە سواڵەتی ناوێ و شتێكی بێ بەهایە، یانی: پارچەو گۆزەو دیزەو شەربەو كووپە شكاوێك، هیچ سوودێكی نیە، ئنجا گەوهەرەكە دەشمێنێتەوە، بەڵام لەتكە سواڵەتەكە ناشمێنێتەوە، دەبێتەوە بە خۆڵ و گڵ، بە تێپەڕبوونی كات، چونكە هەر لە گڵ دروست بووە.

٣)- ﴿ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا ﴾، بۆ ئەوانەی بڕوایان هێناوە، لێرەدا خوا ﷻ ئەوانەی کە ئەوەی لە خزمەت خوادایە، لە گرەوی ئەواندا دەبێ و دەبێتە خەڵات و پاداشتیان لە لایەن خواوە، کە بەهەشتە، ئەو جۆرە کەسانە بە دە (١٠) خەسڵەت پێناسە دەکات، کە سیفەتی یەکەمیان: بریتیە لە ئیمان: ﴿ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا ﴾، ئەوانەی بڕوایان هێناوە، ئیمانیش چوار پێکهێنەری سەرەکیی هەن:

١- تێگەیشتنی عەقڵ.

٢- قەناعەت پێکردن و، خۆشویستن و پەسند کردنی بە دڵ.

٣- دانپێداهێنانی بە زمان.

٤- جێبەجێ کردن بە ئەندامەکان، چونکە ئینسان ئینسان چوار هێزی هەن: هێزێکی دەرککەر، هێزێکی ویستەرو نەویستەر، هێزێکی دەربڕەر، هێزێکی جێبەجێکەر.

ئنجا (ئیمان): پەیوەندیی بە هەر چواریانەوە هەیە، ئنجا ئیمان بۆ خۆی شەش پایەی هەن:

١- بڕوا بە خوا،

٢- بە فریشتەکانی خوا،

٣- بە کتێبەکانی خوا.

٤- بە پێغەمبەرانی خوا (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ).

٥- بە ڕۆژی دوایی، بە هەردوو قۆناغی ئاخیر زەمان و هەڵسانەوەو زیندوو بوونەوە،

٦- ئیمان بە نەخشەدانان و ئەندازەگیریی و، جێبەجێ کردنی خوا.

٤)- ﴿ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴾، هەروەها تەنیا پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن، واتە: تەنیا پەروەردگار بە کارسپێردراوی خۆیان دادەنێن، لە دڵ و دەروونەوە تەنیا بە خواوە پەیوەستن، ئەگەرنا دەستیان بە هۆکارەکانەوەیە، بەڵام دڵیان بە خواوە پەیوەستە.

ئەمیش سیفەتی دووەمیانە.

٥)- ﴿ وَالَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَائِرَ الْإِثْمِ وَالْفَوَاحِشَ ﴾، ئەوانەی خۆیان دووردەگرن لە گوناهە گەورەکان و لە گوناهە دزێوو ناشیرین و ناقۆڵایەکان، ئەمیش سیفەتی سێیەمیانە. ﴿ كَبَائِرَ الْإِثْمِ ﴾، خوێنراویشەتەوە: (كَبِيرَ الإِثْمِ) گوناهی گەورە، (فَوَاحِش) کۆی (فَاحِشة) یە، (وَهِيَ الفِعْلَة المَوْصُوفَة بِالشَّنَاعة)، (فَاحِشَة): بریتیە لەو کردەوەیەی وەسفکراوە بە دزێویی ناقۆڵایی، بە قێزەونیی، زانایان زۆریان قسەکردوە لە بارەی گوناهە گەورەکانەوە، لە چەند فەرمایشتێکی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە، کە گوناهە گەورەکانی بە حەوت داناون:

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «اجْتَنِبُوا السَّبْعَ المُوبِقَاتِ» قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَمَا هُنَّ؟ قَالَ: «الشِّرْكُ بِاللَّهِ، وَالسِّحْرُ، وَقَتْلُ النَّفْسِ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالحَقِّ، وَأَكْلُ الرِّبَا، وَأَكْلُ مَالِ اليَتِيمِ، وَالتَّوَلِّي يَوْمَ الزَّحْفِ، وَقَذْفُ المُحْصَنَاتِ المُؤْمِنَاتِ الغَافِلاَتِ»} (أخرجه البخاري: ٦٨٥٧، ومسلم: ٨٩).

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: لە حەوت فەوتێنەرەکان دووربکەونەوە، گوتیان: ئەوان چی و چین ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: هاوبەشدانان بۆ خوا و، جادووکردن و، کوشتنی ئەو نەفسەی خوا قەدغەی کردوە مەگەر بەهەقی خۆی و، خواردنی سوودو، خواردنی ماڵی هەتیوو، پشت کردنە دوژمن لە ڕۆژی هێرش و پەلاماریان داو، بۆختانکردنی داوێنپیسیی بە ئافرەتانی پاکی بڕواداری بێ ئاگا.

لە هەندێ فەرمایشتان دا پێنج باسکراون، لە هەندێکی دیکەدا ژمارەیەکی زیاتر باسکراون، بەڵام بە تەئکید مەبەستی فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ ئەوە نەبووە بۆمان سنووردار بکات، کە گوناهە گەورەکان تەنیا ئەو حەوتەن، یان تەنیا ئەو پێنجەن، یان تەنیا ئەو دەیەن، بەڵکو مەبەستی ئەوە بووە، کە ئەوانە لە گوناهە گەورەکانن، یان لە گوناهە گەورە سەرەکییەکانن.

بۆیە زانایان لەو بارەوە زۆر قسەو باسیان کردوە، بەڵام وا پێدەچێ باشترین پێناسەی گوناهی گەورە ئەوەبێ کە بگوترێ: (**الكَبِيْرَة: هِيَ مَا عَلَيْهِ عُقُوبَةٌ دُنْيَوِيَّة، أو وَعِيْدٌ أُخْرَوِي**)، واتە: گوناهی گەورە ئەوەیە ، سزایەکی دنیایی لەسەر بێ، یان هەڕەشەیەکی دواڕۆژیی.

(**أبو جعفر النَحَاس**)، لە کتێبەکەی خۆی دا[1]، دوو شوێنەواران دێنێ دەربارەی پێناسەی گوناهە گەورەکان:

**یەکەمیان:** (**عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّهُ قَالَ: الْكَبَائِرُ كُلُّ ما خَتَمَهُ اللَّهُ جَلَّ وَعَزَّ بِنَارٍ، أَوْ غَضَبٍ، أَوْ لَعْنَةٍ، أَوْ عَذَابٍ**)، واتە: عەبدوڵلای کوڕی عەبباس، (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ)، گوتوویەتی: گوناهە گەورەکان، بریتین لە هەر گوناهێك کە لە کۆتایەکەییدا خوای شکۆداری باڵادەست، ئەو گوناهە گەورەیەی بە باسی ئاگری دۆزەخ، یان تووڕەیی، یان نەفرین، یاخود ئازارو سزا، کۆتایی پێهێنابێ.

**دووەمیان:** (**عَنِ الضَّحَّاكِ، قَالَ: الْكَبَائِرُ: كُلُّ مُوجِبَةٍ، أَوْجَبَ اللَّهُ لِأَهْلِهَا النَّارَ، وَكُلُّ عَمَلٍ يُقَامُ بِهِ الْحَدُّ فَهُوَ مِنَ الْكَبَائِرِ**)، زەححاك گوتوویەتی: هەر پێویستکەرێك کە خوای بەرز بۆ ئەنجامدەری ئەو گوناهە باسی سزاو ئازاری کردبێ، ئەوە گوناهی گەورەیە، هەر گوناهێك سزای بۆ دانرابێ، ئەوە گوناهی گەورەیە.

هەڵبەتە کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَجۡتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡفَوَٰحِشَ ﴾، ئەوانەی خۆیان دوور دەگرن لە گوناهە گەورەکان و، لە گوناهە ناقۆڵاو قێزەونەکان، خۆ دوورگرتن جیایە لە نەکردن، چونکە جاری وا هەیە ئینسان کارێك ناکات، بەڵام لێی نزیك دەکەوێتەوە، بەڵام خوا ﷻ ئەو کۆمەڵە مسوڵمانە، ئەو کۆمەڵە بڕوادارە، بەوە پێناسە دەکات کە ئەسڵەن هەر توخنی ئەو گوناهانە ناکەون و، دوورەپەرێزییان لێدەکەن.

---

(١) إعراب القرآن: ص:٨٠٣.

٦)- ﴿ وَإِذَا مَا غَضِبُواْ هُمْ يَغْفِرُونَ ﴾، لە کاتێکدا تووڕەبوون، ئەوان لێبوردەن و چاوپۆشیی دەکەن،

ئەمیش سیفەتی چوارەمیانە.

کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا مَا غَضِبُواْ ﴾، (إذا) مانای مەرج دەگەیەنێ، کەواتە: ﴿ وَإِذَا مَا غَضِبُواْ ﴾، یانی: هەر کات تووڕەبوون، لێبوردن لەوانەوە دەبێ، واتە: لێبوردن دووبارە دەبێتەوە، لەگەڵ دووبارە بوونەوەی تووڕەبوونیاندا.

(إذَا: **مُضَمَّنَةٌ مَعْنَى الشَّرْطِ، وَدَالَّةٌ عَلَى تحَقُّق الشَّرْطِ، لأَنَّ الغَضَبَ حَالَةٌ نفْسِيَّة لا تَكَادُ تَخْلُو مِنْهَا نَفْسٌ**)، (إذا): مانای مەرجی خراوەتە نێو و، ئەوەش دەگەیەنێ کە مەرجەکە دێتە دی، چونکە تووڕەبوون، حاڵەتێکی دەروونییە، مەگەر چۆن، دەنا هیچ کەس لێی خاڵیی نیە، کەم و زۆر، مرۆڤەکان هەر تووڕە دەبن، هەڵبەتە تووڕە نەبوون، سیفەتێکی پەسند نیە، کە مرۆڤ هەرچی پێی بگوترێ و هەرچی لێی بکرێ، هەر تووڕە نەبێ، بۆیە خوا ﷻ ئەو بەندە هەڵبژاردانەی خۆی بە تورەبوون وەسف دەکات، ﴿ وَإِذَا مَا غَضِبُواْ ﴾، کاتێك کە تووڕە بوون، نافەرموێ تووڕەنابن، تووڕەدەبن، بەڵام لە دوای تووڕەبوون، لێبوردن و چاوپۆشیی بەکاردێنن.

ئەمانە چوار سیفەتیان، دوایی بەرزو مەزن چوار سیفەتی دیکەیان بەسەر یەکەوە باس دەکات:

٧)- ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱسْتَجَابُواْ لِرَبِّهِمْ ﴾ ﴿ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾ ﴿ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ﴾ ﴿ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴾، واتە: ئەوانەی بەدەم بانگی پەروەردگاریانەوە دەچن، وەڵامی پەروەردگاریان داوەتەوەو، نوێژیان بەرپاکردوەو، کاروباریان لە نێوان خۆیان دا بە ڕاوێژەو، لەوەی پێمان داون و کردوومانەتە بژیویان، دەبەخشن، ئنجا خواردن و خۆراك بێ، بەرگ و پۆشاك بێ، کەلوپەل بێ، شتی ماددیی بێ، یان مەعنەویی بێ، لەوەی ئێمە ئەوانمان لێ بەهرەوەر کردوە، ئەوانیش بەهرەی پێ بە غەیری خۆیان دەگەیەنن.

وشەی (**اسْتَجَابُوا**): لە ئەصڵدا (**أَجَابُوا**)یە، بەڵام (**اسْتَجَاب**)، (**س وت**)ی، لێ زیاد کراوە، (**أَجاب**): (**اسْتَجَاب**) ئەوەش مانایەکەی بەهێزتر دەکات، وەك بنچینەیەکی زمانی عەرەبیی هەیە دەڵێ: (**زِيَادَةُ المبْنَى تَدُلُّ عَلَى زِيَادَة المَعْنَى**) وشەیەك، پیتەکانی زیاتربن، مانایەکەی بەهێزترە، هەروەها کە (ل)ی بەکار هێناوە: ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِرَبِّهِمْ ﴾ کەواتە: ئەمە وەڵامدانەوەیەکی تایبەتە، ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِرَبِّهِمْ ﴾ لامەکە بۆ بەهێزکردنی مانایەکەیەتی.

٨)- ﴿ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾ هەروەها نوێژیان بەر پاکردوە، (**إِقَامَةُ الشَّيءِ: جَعْلُهُ قَائِماً مُسْتَوِياً**) (**إقامة**) ئەوەیە شتێك ڕاست بکەیەوەو، ڕێك و پێکی بکەی، واتە: بەو شێوەیەی خوا فەرمانی کردوە، نوێژەکانیان بەرپا دەکەن.

٩)- ﴿ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ﴾، کاروباریشیان لە نێو خۆیان دا بەڕاوێژە. (**الأَمْرُ: اسْمٌ مِنْ أَسْمَاءِ الْأَجْنَاسِ الْعَامَّةِ مِثْلُ: شَيْءٍ وَحَادِثٍ. وَإِضَافَةُ اسْمِ الْجِنْسِ قَدْ تُفِيدُ الْعُمُومَ بِمَعُونَةِ الْمَقَامِ، أَيْ جَمِيعُ أُمُورِهِمْ مُتَشَاوَرٌ فِيهَا بَيْنَهُمْ**)، (**وَأَمْرُهُمْ**): وشەی (أمر): ناوێکە لە ناوە گشتییەکان، وەك (**شَيْءٍ، وَحَادِثٍ**) ئەوانە ناوی گشتیین، پاڵدانی ناوی جینس، بۆ لای ڕاناوی کۆ (هم) (**أَمْرُهُمْ**) ئەوە دەگەیەنێ کە هەموو کاروبارەکانیان، ڕاوێژ تێدا کراون لە نێوان خۆیاندا.

کە دەفەرموێ: (**بَيْنَهُم**) یانی: ڕاوێژەکە لەنێو خۆیاندایەو بۆ هەر کارێکی نێو خۆیان، پێکەوە ڕاوێژ دەکەن، هیچ کامیان بە شێوەی خۆسەپاندن و، گوێنەدان بەوانی دیکە، ئەو کارە بۆ خۆی قۆرخ ناکات و بەڕێوەی نابات.

١٠)- ﴿ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴾، لەوەش کە کردوومانەتە بژیویان و پێمان داون، دەبەخشن، وشەی (رِزق) کە پێشتریش باسمان کرد، لە کورتە باسێکدا: (**الرِّزْقُ: العَطَاء مِن كُلّ نَوْع**)، (رزق) بریتیە لە بەخشش لەهەر جۆرێك، زۆربەی خەڵکی وادەزانن، (رزق) تەنیا خواردن و خۆراکە، بەڵام لە بەکارهێنانی قورئانداو لە بەکارهێنانی زمانیشدا، (رزق) هەر شتێکە کە بە مرۆڤ دەبەخشرێ، ئنجا چ خواردن و خۆراك بێ، چ بەرگ و پۆشاك،

چ کەل و پەل، چ شتی ماددیی، چ شتی مەعنەویی، یەکێك دەڵێ: (**رَزَقَنِي الله حَجَّ بَيْتِهِ الحَرَام**) خوا حەجی ماڵی خۆی کردە بژیوی من، پێی بەخشیم.

١١)- ﴿ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَابَهُمُ ٱلْبَغْىُ هُمْ يَنتَصِرُونَ ﴾ {ئەو بەهەشتەی لەلای خوایە، کە چاکترە لە ڕابواردنی ژیانی دنیاو، بەردەوامتریشە، لە گرەوی کەسانێکدایەو بۆ کەسانێکە کە} هەرکات دەستدرێژییان تووش بوو، ئەوان وەدەنگ دێن، بەرهەڵستیی دەکەن و تۆڵە دەکەنەوە.

وشـەی (**بَغْـي**): بریتیـە لـە سنوورشـکاندنی هـەق، یـان هـەق پێشـێلکردن و دەسـتدرێژیی کردنـە سـەر هـەق.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ أَصَابَهُمُ ﴾، واتـە: ئـەو دەسـتدرێژییە خراوەتـە سـەر ئـەوان و ئاراستەی ئـەوان کـراوە، لایـەن بەرانبەرەکەیان ستەمی لێکـردوون، ﴿ هُمْ يَنتَصِرُونَ ﴾، ئـەوان تۆڵـە دەکەنـەوە، (**إنْتصَـار**) سـێ واتایـان بـۆ لێکدانـەوە: (**الإنْتصَـار: الدَّفَـاع وَالإنْتِقَـام وَطَلَـبُ العَـوْن**)

١- بەرگریی لە خۆکردن.

٢- تۆڵەکردنەوە.

٣- داواکردنی یارمەتیی، هەروەها هەندێکیش بە (الإمْتِنَاع مِنَ الظُّلْم) مانایان کردوە، واتە: خۆنەدانە بەرباری زوڵم، یاخود بەرهەڵستیی کردنی ستەم.

ئەمیش سیفەتی نۆیەمیانە.

١٢)- ﴿ وَجَزَٰٓؤُاْ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِّثْلُهَا ۖ فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ ﴾، سزای خراپەیەك خراپەیەکی وەك خۆیەتی، بەڵام کەسێك چاوپۆشیی و چاکسازیی بکات، ئەوە پاداشتی لەسەر خوایە، کەواتە: سیفەتی دەیەمیان ئەوەیە کە لە بەرانبەری خراپەدا، خراپە دەکەن، بەڵام هەر کەسێك چاوپۆشیی بکات، چاکسازیی بکات، پاداشتی لەسەر خوایە.

﴿ فَمَنۡ عَفَا وَأَصۡلَحَ ﴾ یانی: چاوپۆشیی و لێبوردنێك كە ببێتە هۆی چاكسازیی و چاكبێ بۆ ئەو كەسەی كە چاوپۆشیی لێ دەكەی، پەسندە، بەڵام ئەگەر بۆی خراپ بێ، ئەوە بە تەئكید ئەو چاوپۆشییە شتێكی پەسند نیە.

وشەی (سَيِّئَةٌ) كە دەفەرموێ: ﴿ وَجَزَٰٓؤُاْ سَيِّئَةٖ سَيِّئَةٞ مِّثۡلُهَا ﴾، دیارە كەسێك كە خراپە دەكات بەرانبەر بە كەسێك، بۆ وێنە: جنێوێكی پێدەڵێ، یاخود ماڵێكی لێ زەوت دەكات، یان زوڵلەیەكی لێدەدات، بێگومان كردەوەكەی خراپە، مادام لە خۆڕاو بە بەلاش و بەبێ پاساوو بەڵگە بێ، بەڵام ئەوەی كە بەرپەرچی خراپەكە دەداتەوە، بەرپەرچدانەوەی خراپە بە خراپە، لە قەڵەم نادرێ، ئەدی بۆچی خوا دەفەرموی: ﴿ وَجَزَٰٓؤُاْ سَيِّئَةٖ سَيِّئَةٞ مِّثۡلُهَا ﴾ سزای خراپەیەك خراپەیەكی وەك خۆیەتی؟ (**فِعْلَةٌ سَيِّئَةٌ، أَيْ فِعْلَةٌ تَسُوءُ مَنْ عُومِلَ بِهَا**)، یانی: كردەوەیەك كە بۆ ئەو كەسەی مامەڵەی پێ لەگەڵدا دەكرێ، خراپە، یانی: بۆ ئەو خراپە، ئەگەرنا لە خودی خۆیدا خراپ نیە، ئەمە وەك ئەو ئایەتەی سوورەتی (**البقرة**)یە، كە دەفەرموێ: ﴿ فَمَنِ ٱعۡتَدَىٰ عَلَيۡكُمۡ فَٱعۡتَدُواْ عَلَيۡهِ بِمِثۡلِ مَا ٱعۡتَدَىٰ عَلَيۡكُمۡۚ ﴿١٩٤﴾ ﴾، هەر كەسێك دەستدرێژیی لێ كردن، وەك دەستدرێژیی كردنەكەی وی، دەستدرێژیی بكەنەوە سەری.

هەڵبەتە ئەوەی لە بەرانبەر دەستدرێژییدا، بەرپەرچی دەستدرێژیی دەداتەوە، كردەوەكەی ئەو بە دەستدرێژیی لە قەڵەم نادرێ، بەڵام بە نسبەت بابای دەستدرێژكارەوەو بۆ وی سنووری بەلادا دەشكێنرێ و، باری بەلادا دەخرێ و بۆ وی خراپە.

كە دەفەرموێ: ﴿ وَجَزَٰٓؤُاْ سَيِّئَةٖ سَيِّئَةٞ مِّثۡلُهَا ﴾، (**مِثْلُها: إِنَّمَا تَكُونُ بِمِقْدَارِهَا فِي مُتَعَارَفِ النَّاسِ**) واتە: لە باوی خەڵكداو ئەوەی خەڵك بە پەسندی دەزانێ، بە ئەندازەی خۆی بێت.

زانایان لەو بارەوە زۆر قسەیان کردوە، کە بەرپەرچدانەوە بێ مەرج و بە ڕەهایی نیە، بۆ وێنە: کەسێك درۆت لەگەڵ دەکات، تۆش درۆی لەگەڵ بکەی، کەسێك پەیمانت لەگەڵ دەشکێنێ، تۆش پەیمانی لەگەڵ بشکێنی، یان کەسێك دزییت لێ دەکات، تۆش دزیی لێ بکەی، چونکە ئەو جۆرە گوناهانە لە خودی خۆیاندا قەدەغەن، بە بەرانبەرو بەبێ بەرانبەر، بەڵکو مەبەست ئەو شتانەیە لە خودی خۆیاندا قەدەغە نەبن، بۆ وێنە: کەسێك زللەیەکت لێ دەدا، تۆش بۆت هەیە زللەیەکی لێ بدەیەوە، قسەیەکەت پێدەڵێ، قسەکەی پێ بڵێیەوە، بەڵام ئەگەر قسەکەی ئەو، بۆ وێنە: بوختانی داوێن پیسیی بێ، تۆ بۆت نیە بوختانی داوێنپیسیی پێ بکەیەوە، چونکە ئەوە لە خودی خۆیدا قەدەغەیە، بە بەرانبەرو بێ بەرانبەر، کەواتە: ئەوە وردەکاریی دەوێ.

زانایان دەڵێن: کەسێك دزییت لێ دەکات، تۆ نابێ دزیی لێ بکەیەوە، بەڵکو دەبێ هەقی خۆتی لێ وەربگریەوە، یان کەسێك ماڵی داگیر کردووی، ناچی ماڵی داگیر بکەیەوە، تۆش هەقی خۆتی لێ وەردەگریەوە، مەرج نیە خودی ئەو شتە، بەڵام بە ئەندازەی ئەو شتە.

﴿ فَأَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ ﴾، پاداشتی لەسەر خوایە، پاداشتی لێبوردن و چاوپۆشییەکەی کە مایەی چاکسازییە.

١٣)- ﴿ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، بە دڵنیایی خوا ستەمکارانی خۆشناوێن، واتە: هەر کەسێك خراپە لەگەڵ خەڵك دا بکات و زیانیان پێ بگەیەنێ، ئەوە ستەمکارە، خواش ﷻ ستەمکارانی خۆش ناوێن.

**(القرطبي)** لە تەفسیرەکەی دا[١]، لە **(إبن العربي)** دەخوازێتەوە، دەڵێ:

**(قَالَ ابْنُ الْعَرَبِيِّ: ذَكَرَ اللَّهُ الإِنْتِصَارَ فِي الْبَغْيِ فِي مَعْرِضِ الْمَدْحِ، وَذَكَرَ الْعَفْوَ عَنِ الْجُرْمِ فِي مَوْضِعٍ آخَرَ فِي مَعْرِضِ الْمَدْحِ ، فَاحْتَمَلَ أَنْ يَكُونَ أَحَدُهُمَا: رَافِعًا لِلْآخَرِ،**

---

(١) الجامع لأحكام القرآن: ج١٦، ص٣٣.

وَاحْتَمَلَ أَنْ يَكُونَ ذَلِكَ رَاجِعًا إِلَى حَالَتَيْنِ، إِحْدَاهُمَا أَنْ يَكُونَ الْبَاغِي مُعْلِنًا بِالْفُجُورِ، وَقِحًا فِي الْجُمْهُورِ، مُؤْذِيًا لِلصَّغِيرِ وَالْكَبِيرِ، فَيَكُونُ الإِنْتِقَامُ مِنْهُ أَفْضَلَ، وَفِي مِثْلِهِ قَالَ إِبْرَاهِيمُ النَّخَعِيُّ: كَانُوا يَكْرَهُونَ أَنْ يُذِلُّوا أَنْفُسَهُمْ فَتَجْتَرِئُ عَلَيْهِمُ الْفُسَّاقُ. الثَّانِيَةُ: أَنْ تَكُونَ الْفَلْتَةُ، أَوْ يَقَعُ ذَلِكَ مِمَّنْ يَعْتَرِفُ بِالزَّلَّةِ وَيَسْأَلُ الْمَغْفِرَةَ، فَالْعَفْوُ هَا هنا أَفْضَلُ، وَفِي مِثْلِهِ نَزَلَتْ: ﴿وَأَن تَعْفُوٓاْ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ ﴿٢٣٧﴾﴾ البقرة).

واتە: خوا ﷻ لێرەدا، لەم ئایەتە موبارەکەدا باسی تۆڵساندنەوەی لە سیاقی ستایش کردندا باسکردوە، لە شوێنی دیکەش دا لێبوردنی لە تاوان، دیسان لە سیاقی ستایشکردندا باسکردوە، جا ئەمە دوو ئەگەری هەیە:

أ- دەگونجێ یەکێکیان لابەر بێ بۆ ئەوی دیکە،

ب-بدەشگونجێ ئەوە بگەڕێتەوە بۆ دوو حاڵەتی جیا، {کە بە تەئکید وایەو هیچیان لابەرنین بۆ ئەوی دیکە، بەڵام لێبوردن لەجێی خۆی، تۆڵەسەندنەوەش لە جێی خۆی، کوردەواریی خۆمان دەڵێ: «گەنگرو ماست بەوەختی خۆی»، یان (لِكُلِّ مَقَامٍ مَقَال) بۆ هەر شوێنێك قسەیەکی تایبەت هەیە، ئنجا ئەو دوو حاڵەتەکان ڕوون دەکاتەوە}:

**حاڵەتی یەکەمیان:** ئەوەیە بابای دەستدرێژکار گوناهو تاوانەکەی خۆی ئاشکرا بکاو، بەبێ ئابڕوویی لەنێو خەڵکدا کارەکەی بکات و، ئازار گەیەنەر بێ بۆ گچکەو گەورە، ئەوە تۆڵەسەندنەوە لە بابای وا باشترە، لەو بارەوەشەیە کە ئیبراهیمی نەخەعیی گوتوویەتی: پێشین پێیان ناخۆشبوو خۆیان زەبوون بکەن و، لاڕێیەکان بەسەریاندا زاڵبن و ستەمیان لێ بکەن.

**حاڵەتی دووەم:** ئەوەیە ئەو کەسەی ستەمەکەی کردوەو دەستدرێژییەکەی کردوە، لە دەستی چووبێ، یان کەسێك بێ، دان بێنێ بە هەڵەکەی خۆیدا، بە خلیسکانەکەی خۆیداو، داوای لێبوردن بکات، لەو حاڵەتدا لێبوردن باشترە، لەو بارەشەوەیە کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَأَن تَعْفُوٓاْ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ﴾ ئەگەر لێبوردن و چاوپۆشیی بکەن {باشترەو} لە پارێزکارییەوە نزیکترە.

با ئەم دوو دەقەش لەوبارەوە بێنین:

**١-** پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {مَا يَحِلُّ لِمُؤْمِنٍ أَنْ يُذِلَّ نَفْسَهُ»، قَالُوا: وَكَيْفَ يُذِلُّ نَفْسَهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «يَتَحَمَّلُ مِنَ الْبَلَاءِ مَا لَا يُطِيقُ} **(أخرجه الترمذي: ١١١، ١١٢، وابن ماجه: ٤٠١٦، وَصَحَّحَهُ الألباني).**

واتە: مسوڵمان بۆی ڕەوا نیە خۆی زەبوون بکات، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! چۆن خۆی زەبوون دەکات؟ فەرمووی: خۆی دەداتە بەر بەڵایەك کە لە توانایدا نەبێت.

ئەمە ئەوەش دەگرێتەوە کە، تۆ نابێ بڵێی: قەیناکات با لەبەر خوا لێم بدەن! نا، دوایی ئەو لێدانە دەبینی سەردەکێشێ بۆ کوشتنیشت، بڕوادار نەوەندەی بۆی بکرێ نابێ خۆی زەبوون بکات، بە تایبەت بۆ کەسانێك کە بە هۆی چاوپۆشیی کردن و بێ دەنگییەوەت، زیاتر لە ئاستت دا شووڵی لێ هەڵبکێشن و، زیاتر سامەرەستوو و مکوڕ بن لەسەر ستەم و خراپەکەیان.

**٢-** {قَالَ أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ رضي الله عنه: بَلَغَنَا أَنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يَأْمُرُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مُنَادِيًا فَيُنَادِي: مَنْ كَانَ لَهُ عِنْدَ اللَّهِ شَيْءٌ فَلْيَقُمْ، فَيَقُومُ أَهْلُ الْعَفْوِ، فَيُكَافِئُهُمُ اللَّهُ عَلَى مَا كَانَ مِنْ عَفْوِهِمْ}[1] .

واتە: ئەبوو بەکری صیددیق رضي الله عنه گوتوویەتی: پێمان گەیشتوە کە لە ڕۆژ قیامەتدا خوا (عز وجل) فەرماندەکات بانگ کەرێك بانگ بکات: کێ شتێکی لەلای خوا هەیە، بەهەڵسێ! ئنجا خاوەنانی لێبوردن هەڵدەستن و، خواش پاداشتی لێبوردنەکەیان دەداتەوە.

---

(١)- فضائل الصحابة، للإمام أحمد بن حنبل، رقم: ٧٠١ .

## کورتە باسێک لە بارەی ڕاوێژەوە:[1]

### بڕگەی یەکەم[2]: ڕاوێـژ: بریتیە لە بناغــەی بەڕێـوەبردنی تێکــڕای کاروبارەکانی کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامیی:

ئێمـە ئـەم بڕگـەی یەکەمـە لـە حـەوت خاڵـدا دێنیـن، کـە چـۆن ڕاوێـژ بناغـەی بەڕێوەبـردنی تێکڕای کاروبـارەکانی کۆمەڵـگاو دەوڵـەتی ئیسـلامییە؟ دەقـە عەرەبییەکـە یەکسـەر دەیکـەم بـە کوردیـی.

**١)- ڕیشـەدار بـوونی ڕاوێـژ و ڕەسـەن بـوونی لـە پێکهێنـانی کۆمـەڵ و کۆمەڵـگاو دەوڵـەتی ئیسـلامییدا:**

ئەمـە زۆر بەڕوونیـی دەفامرێتـەوە، لـە فەرمایشـتی خـوا: ﴿ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ﴿٣٨﴾ ﴾الشـوری، واتـە: کاروبارییـان لـە نێـو خۆیانـدا بـە ڕاوێـژە، ئـەم ڕسـتە موبارەکـە لـە سـیاقی ئـەو ئایەتانـەدا هاتۆتـە خـوار، کـە پێناسـەی کۆمەڵـی مسـوڵمان دەکـەن.

کەواتـە: ئـەو سـیفەتی کاروبـار لـە نێـو خـۆدا بەڕاوێـژ بەڕێوەبردنـە، کـە خـوا لـە دوای ئیـمان و پشـت بـە خـوا بەسـتن و، لـە دوای دوورە پەرێزیـی کـردن لـە گوناهـە گـەورەو ناقـۆڵاو دزێـوەکان، دوای لێبـوردنی پـاش تووڕەبـوون و، دوای وەڵامدانـەوەی پـەروەردگارو، دوای بەرپاکـردنی نوێـژ، یەکسـەر باسـی کاروبـار بەڕاوێـژ بەڕێوەبـردن

---

(١) ئێمـە لـە: (الكتـاب الحـادي عـشر) (تطبيـق المجتمـع للشريعـة في جميـع الجوانـب الحيـاة)ەوە، کـە کتێبـی یازدەیەمـە لـە مەوسـووعەی: (الإسـلام كـما يتجلـى في كتـاب اللـه)، کورتـەو خوڵاصـەی مەتڵەبـی چـوارەم و پێنجـەم لـە بـارەی شـووڕاوە دێنیـن و، لـە دوو بڕگـەدا ئـەم کورتـە باسـە لەبـەر ڕۆشـنایی ئـەو کتێبـەدا، پوختـەی ئـەوەی لـەو کتێبـەدا باسـمان کـردوە، دەخەینـە ڕوو.

(٢) (المَطْلَبُ الرَّابِع: الشُّورَى هِيَ أَسَاسُ إِدَارَة، جَمِيعُ شُؤُون الْمُجْتَمع وَالدَّوْلَة الإِسْلَامِيين).

دەکات، کەواتـە: ئەویـش یەکێکـە لـە خەسـڵەتە بنەڕەتییـەکانی تـاك و، کۆمـەڵ و، کۆمەڵگاو دەوڵـەتی ئیسـلامیی.

## ٢)- پێگەی ڕاوێژ لە ئیسلامدا:

پێگـەی ڕاوێـژ ئەوەیـە، کـە هاوتاسـتە لەگـەڵ نوێـژو زەکاتـدا، بەڵگەشـمان لەوبـارەوە ئەوەیـە کـە خـوا ﷻ کاروبـار بـە ڕاوێـژ بەڕێوەبـردنی، خسـتۆتە نێـوان بەرپاکـردنی نوێـژو، بەخشـینەوە، ئنجـا ئـەو بەخشـینە چ لـە مـاڵ و سـامان بـێ، کـە زەکات زەقترینیـەتی، چ لـە هەرشـتێکی دیکـە بـێ، وەك پێشـتر باسـمان کـرد.

کەواتـە: مـادام خـوا خسـتوویەتە نێـوان نوێـژ بەرپاکـردن و بەخشـین و، هاوکاریـی کردنـەوە، یـانی: کاروبـار بەڕاوێـژ بەڕێوەبردنیـش، هاوتـاو هاوتاسـتی ئەوانە.

## ٣)- چەمك و واتای ڕاوێژ:

ڕاوێـژ بریتیـە لـە هەڵگێـڕو وەرگێڕکـردنی بیروڕایـەکان و، تێوەڕامانیـان بە مەبەسـتی گەیشـتن بـە ڕای ڕاسـت، یاخـود ڕاسـترین، چونکـە زانایـانی زمـان، گوتوویانـە: وشـەی (شـوری): لـە ڕیشـەدا لـە (شَـارَ النَّحْـلُ العَسَـلَ، يَشـورُهُ إِذَا جَنَـاهُ مِـنَ الأزهَـار، أو مِـنْ شِرْتُ الدَّابَـةَ أَشُـورهَا إِذَا أَرْكَضْتَهـا، وَأجْرَيْتَهَـا لِتَجْرَّبَهَـا وَتَتَعَـرَّف عَـلَى مِشْـيَتِهَا وَطَبِيعَتِهَـا)،[١] (شـوری) لـە یەکێـك لـەو دووانـەوە هاتـوە:

أ- یان لەوە هاتوە: هەنگەکە هەنگوینی کۆکردەوە، شیلەی گوڵانی کۆکردەوەو کردیە هەنگوین.

ب- یاخود لەوە هاتوە: وڵاخەکە غاردانم پێکردو، ڕۆیاندنم تاکو تاقی بکەمەوە، داخۆ ڕۆیشتن و سرووشتی چۆنە.

کەواتـە: ڕاوێژکارانیـش لـە نێـوان خۆیانـدا، بیروڕایـەکان لـە تەتەڵـەو بێژینـگ دەدەن و دەیانپشـکنن و لێیـان وردەبنـەوە، تاکـو سـەرەنجام بگەنـە ئـەوەی کام ڕایـە ڕاسـتە؟ یاخـود: کام ڕایـە ڕاسـترو چاکـترە؟!

---

(١) المعجم الوسيط ص٥٩٩، المجلد ص٤٠٧.

**٤)- ڕاوێـژ گشتگیرە، بـۆ هـەر کارێـك کـە پێگەیـەکی هەبـێ و گرنگییـەکی هەبـێ، پێویسـتیی بـە قسـە لەسـەرکردن هەبـێ:**

بەڵگەشـمان ئەوەیـە کـە خـوا دەفەرمـوێ: ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ﴿٣٨﴾﴾ الشـوری، کـە پێشـتر گوتمـان (أمـر): بریتیـە لـە حـاڵ و کار، هـەر شـتێك کـە بهێنـێ، قسـەی لەبـارەوە بکـرێ و ڕاوێـژی لەبـارەوە بکـرێ، واتـە: هەرچـی کاروبـاری بڕوادارانـە دەبـێ، بـە ڕاوێژبـێ، هەڵبەتـە ئـەو کاروبارانـەی پەکیـان لەسـەر ئـەوە کەوتـوە، لێیـان وردبیـەوەو، تێیانـەوە ڕامێنـی و ڕاوێژیـان لەبـارەوە بکـەی.

**٥)- بینـا لەسـەر ئـەوەی باسـکرا پێویسـتبوونی ڕاوێـژ لەسـەر بـڕواداران، زۆر ڕوون و ئاشـکرایە:**

چونکـە خـوا ﷻ لـە دوایـی بەرپاکـردنی نوێـژ، یەکسـەر باسـی کاروبـار بـە ڕاوێـژ بەڕێوەبـردن دەکات، کەواتـە: وەك چـۆن نوێـژو مـاڵ بەخشـین لەسـەر مسـوڵمانان فـەرزن، بەهەمـان شـێوە کاروبـار بـە ڕاوێـژ بردنیشـیان لەسـەر فـەرزە.

**٦)- پابەندیـی بـە ئەنجامێکـەوە کـە لـە ڕاوێـژ پەیدادەبـێ پێویسـتە، ئەگەرنـا ڕاوێژکـردن دەبێتـە خافڵانـدنی خەڵـك و، شـتێکی بێجـێ:**

کارێـك کـە ڕاوێـژی لەبـارەوە دەکـرێ، پێویسـتە دەرەنجامەکـەی، ئەنجامەکـەی پابەندیـی پێـوە بکـرێ، واتـە: ڕاوێـژ پابەندکـەرە (**الشـورى مُلْزِمـة**)، تەنیـا فێرکـەر و، ئاگادارکـەرەوە نیـە (لَيْسَـتْ مُعْلِمـة) لـە نێـوان زانایانـدا لـەو بـارەوە زۆر قسـە کـراوە، چونکـە وەختێـك لـە کارێـك دەکۆڵدرێتـەوەو، ڕاوێـژی تێـدا دەکـرێ، دەریـش دەکـەوێ کام ڕایـە ڕاسـترەو بەڵگەدارتـرە، ئەگـەر تەبەننیـی نەکـرێ، مانـای وایـە بـەس خـۆ خافڵانـدن و، خافڵانـدنی خەڵـك بـووە، بـە تایبـەت لـە لایـەن کەسێکەوە کـە ڕاوێژەکـە دەکات، بەتایبـەت لەلایـەن کەسێکەوە کـە حومکڕانـە و ڕاوێژ بە خەڵـك دەکات، ئەگەر حوکمـڕان دوایـی پابەنـد نەبـێ، بـەڕای زۆرینـەوە، یـان بـەو ڕایـەوە کـە دەرکەوتـوە ڕاسـترەو بەڵگەدارتـرە، مانـای وایـە هـەر خافڵانـدوونی!

### ٧)- لە نێوان ڕاوێژی ئیسلامیی و دیموکڕاسییدا، دوو جیاوازیی گەورە هەن:

**یەك:** ئەوەیە کە ڕاوێژ لە ئیسلامدا گشتگیرە، بۆ هەموو ڕەهەندو لایەنەکانی ژیان و، تەنیا لە بواری سیاسییدا کورت هەڵنەهاتوە، کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ﴾، کاروباریان بەڕاوێژە، ئەمە لێرەدا خوا ﷻ کارێك جیا لە کارێکی تایبەت نەکردوە بە ڕاوێژەوە، بەڵکو بە گشتیی و، بە ڕەهایی فەرموویەتی، کەواتە: هەموو کارێکی مسوڵمانان کە بهێنێ و بایەخیی هەبێ، پێویستە ڕاوێژی تێدا بکرێ، هەر بۆیە خوا ﷻ لە قورئاندا، لە مەسەلەی مامەڵەی باب و دایکان لە قەزیەی شیر پێدانی کۆرپەکەیاندا، باسی ڕاوێژی کردوە، لە سوورەتی (**البقرة**) ئایەتی (**٢٣٣**)دا دەفەرموێ: ﴿ فَإِنْ أَرَادَا فِصَالًا عَن تَرَاضٍ مِّنْهُمَا وَتَشَاوُرٍ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا ﴾، هەروەها ڕاوێژکردنی مێرد، کە ژنەکەی تەڵاقداوە، بەڵام ژنەکەی دووگیانە، چۆن منداڵەکەیان شیر پێ بدەن، لە دوای تەڵاقدان؟ لەوێش باسی ڕاوێژی کردوەو دەفەرموێ: ﴿ وَإِن كُنَّ أُولَٰتِ حَمْلٍ فَأَنفِقُوا عَلَيْهِنَّ حَتَّىٰ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ فَإِنْ أَرْضَعْنَ لَكُمْ فَـَٔاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ وَأْتَمِرُوا بَيْنَكُم بِمَعْرُوفٍ ﴿٦﴾ ﴾الطلاق، (**وَأْتَمِرُوا**) واتە: (**تَشَاوروا**)، ڕاوێژ بکەن هەروەها پێشەوای مسوڵمانان و حوکمڕانیان، دیسان پێویستە ڕاوێژ بە بڕواداران بکات، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَشَاوِرْهُمْ فِي الْأَمْرِ ﴿١٥٩﴾ ﴾آل عمران.

**دوو:** ڕاوێژ لە ئیسلامدا پابەندە بە شەریعەتەوە، بە حوکمە هەڵبڕەڕەکانیەوە، چونکە وەك بنچینەیەك گوتراوە: (**لا اجتهاد في معرض النص**)، لە کاتی هەبوونی دەق دا کۆششکردن نیە. بەڵام دیارە دیموکڕاسیی، بەربەڕەڵایەو، پابەندنیە بە هیچ شتێکەوە، هەر بۆیەش لە سایەی ئەو کۆمەڵگایەدا، کە بە حیساب میکانیزمی دیموکڕاسیی، بۆ حوکمڕانیی بەکاردێنن، بەبێ پابەندیی بەشەریعەتەوە، دەگەنە بڕیاری زۆر سەقەت، کە لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە، لە ڕووی دینییەوە، لە ڕووی ئەخلاقییەوە، لەڕووی خێزانییەوە، یان لە ڕووی ستەمکردن لە گەلان و نەتەوەکانی دیکەوە، لە سنوور دەرچوونێکی گەورەی تێدایە، بەڵام لە ئیسلامدا ڕاوێژی مسوڵمانان پابەندە بە شەریعەتەوەو، نابێ لەو چوارچێوەیە دەرچێ، ئەگەر مسوڵمانانی هەموو دنیا نەك هی پەرلەمانێك، نەك هی

ئەنجوومەنی نوێنەرانێك، كۆببنەوە ناتوانن بڵێن: سوود (ربا) حەڵاڵە، یان زینا حەڵاڵە، یان هاوڕەگەز بازی ڕەوایە، یان دزیی حەڵاڵە، یان داگیر كردن، یاخود بەكارهێنانی مادە شەرخۆشكەرەكان ڕەوایە، چونكە ئەمانە هەموویان لە دەقەكانی قورئان و سونەتدا هەڵبڕاون، زانایان وەك بنچینەیەك گوتوویانە: (**حَرَامُ مُحَمَّدٍ حَرَامٌ إِلَى يَوْمِ القِيَامَة، وَحَلاَلُهُ حَلاَلٌ إِلَى يَوْمِ القِيَامَة**) ئەوەی كە موحەممەد ﷺ بە قەدەغەی داناوە، هەر قەدەغەیە تاكو قیامەت، ئەوەش كە ئەو بە ڕەوای داناوە، ڕەوایە تاكو قیامەت، هیچ كەس بۆی نیە نە حەڕامەكان، ڕەوا بكات، نە ڕەوایەكانیش قەدەغە بكات.

### بڕگەی دووەم[1]: سەرپەرشتیاری كردنی كاربەدەستان، ڕەوایەتیی نیە، مەگەر لەسەر بناغەی ڕاوێژ، ئەو بەرپرسیاریەتییەیان پێسپێردرابێ:

### لەوبارەش چوار بەڵگان دەخینە ڕوو:

**یەكەم:** ئەم بنەمایەش هەر لە بنەمای یەكەمەوە وەردەگیرێ و هەڵدەهێنجرێ، بنەمای یەكەم: بریتی بوو لە: ڕاوێژ بناغەی بەڕێوەبردنی تێكڕای كاروبارەكانی كۆمەڵ و كۆمەڵگاو، دەوڵەتی ئیسلامییە، چونكە مادام خوا ﷻ ڕاوێژی كردوە بە ئەو بناغەیەی كە تێكڕای كاروباری مسوڵمانانی لەسەر بنیات دەنرێ و فەرموویەتی: ﴿ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ﴾، بێگومانیش كاری دیارییكردنی كاربەدەستان، لە هەموو كارەكانی مسوڵمانان گرنگترو مەزنترە، بۆیە پێویستە ڕاوێژی تێدا بكەن، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ﴾، كاروباریان لە نێوان خۆیاندا بەڕاوێژە، كاری ئەرك پێ سپاردنی كاربەدەستانیش، لە هەموو كارەكان مەزنترو، بایەخدارترە.

كەواتە: لە هەموو كارەكان زیاتر دەبێ ئەوەی تێدا ڕەچاو بكرێ، كە دەبێ ئەو كارە بناغەكەی ڕاوێژ كردن بێ، بۆیە مسوڵمانان هیچ بوارو دەرفەتیان

---

(١) (المَطْلَبُ الخَامِس: إسناد ولاية وَلاة الأمُور لا شرعيّة لها، إلّا إذَا أسندت إليْهِم عَلى أسَاسِ الشورى).

نیە، هەر کاتێك ویستیان کارێك لە کارەکانی بەڕێوەبردنی کۆمەڵگا بە کەسێك بسپێرن و بەرپرسێك بۆ ئەو کارە بدۆزنەوە، دەبێ ڕاوێژی تێدا بکەن، چونکە ئەو کەسەی کاروبارێکی مسوڵمانان بەڕێوە دەبات، لە ڕاستییدا وەك جێگرایەتیی پێغەمبەر ﷺ ئەو کارە دەکات، دیسان وەك کارپێ سپێردراویەتیی مسوڵمانان، یانی: (نِيَابَةٌ عَنِ الرَّسُول، وَوَكَالَةٌ عَنِ المُجْتَمع) خوا ﷻ لە هەموو قورئاندا، دواندنەکانی هەموویان ئاڕاستەی ئیماندارن کردوون: (يَا أَيُّهَا الَّذِيْن آمنَوُا) کەواتە: لە ئەسڵدا کۆمەڵگای بڕوادار، کۆمەڵگای مسوڵمان، خاوەنی شەرعیی دەستەڵاتە، ئەو کەسەی هەڵیدەبژێرن بۆ ئەوەی کاروباریان بۆ بەڕێوەبەرێ و مشووریان بخوات، چ لە ڕووی یاسادانانەوە، چ لە ڕووی جێبەجێ کردنەوە، چ لە ڕووی دادوەرییەوە، چ لە هەر ڕووێکی دیکەوە، ئەوە وەکیلیانەو، ئەوان خۆیان ئەو کارەیان پێسپاردوە.

پێشەوا زەهەبیی هێناویەتی: (**دَخَلَ أَبُو مُسْلِمٍ عَلَى مُعَاوِيَةَ، فَقَامَ بَيْنَ السِّمَاطَيْنِ فَقَالَ: السَّلامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا الأَجِيرُ، فَقَالُوا: مَهْ، قَالَ: دَعَوُه فَهُوَ أَعْرَفُ بِمَا يَقُولُ، وَعَلَيْكَ السَّلامُ يَا أَبَا مُسْلِمٍ**)[1].

واتە: ئەبوو موسلیمی خەوەلانی چوو بۆ لای موعاویەی کوڕی ئەبوو سوفیان (کە حوکمڕان بوو)، پێیگوت: سڵاوت لێ بێت ئەی کرێکار، (یان ئەی ئەو کەسەی بە کرێمان گرتووی)، خەڵکەکەی کۆڕو مەجلیس گوتیان: بێ دەنگبە، (یانی: ئەو قسەیە چییە دەیکەی؟!)، موعاویە گوتی: لێیگەڕێن، ئەو بۆ خۆی چاکتر دەزانی چی دەڵێ، (**وعليكم السلام**) ئەی ئەبوو موسلیم!

**دووەم:** بەڵگەیەکی دیکە لەو بارەوە کە سەرپەرشتیاری مسوڵمانان ڕەوایەتیی نیە، ئەگەر پاڵنەدرێتە لای ڕاوێژو، لە ویستی ئازادی مسوڵمانانەوەو، لە قەناعەت و ڕەزامەندییانەوە هەڵنەقولابێ، فەرموودەی خوای بەرزە، کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَـٰنَـٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا وَإِذَا حَكَمۡتُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحۡكُمُواْ بِٱلۡعَدۡلِۚ إِنَّ ٱللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِۦٓۗ

---

(١ سير أعلام النبلاء للذهبي: ج٣، ص١٣.

إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ سَمِيعَۢا بَصِيرٗا ﴿٥٨﴾ ﴾النساء، واتە: بێگومان خوا فەرمانتان پێدەکات، (ئەی کۆمەڵگای مسوڵمان) کە سپاردەکان بە خەڵکی شایستەی خۆیان بسپێرن و، هەر کاتێك دادوەرییتان کرد لە نێوان خەڵکدا، (ئەی حوکمڕانەکان)، بە دادگەرانە دادوەریی بکەن، ئەوەی خوا ئامۆژگارییتانی پێدەکات، باشترین شتە، بێگومان خوا بیسەری بینەرە.

لێرەدا خوا ﷻ لەم ئایەتە موبارەکەدا {وەك لە: مەوسووعەی: {ئیسلام و دەوڵەتداریی}دا کە چوار کتێبەو لە کتێبی دووەمیاندا بە درێژیی لەبارەی ئەم ئایەتەوە دواوین} خوا ﷻ فەرمان دەکات بە کۆمەڵگا، کۆمەڵگای مسوڵمان و لەسەریان پێویست دەکات، کە سپاردەکان تەسلیمی خەڵکی شایستەی خۆیان بکەن و، لە دادوەریی کردنیشدا دادگەربن، دواییش بۆیان ڕووندەکاتەوە کە ئەوەی خوا ئامۆژگارییان پێدەکات، باشترین ئامۆژگارییەو خوا قسەکانیشیان دەبیستێ، کردەوەکانیشیان دەبینێ.

سپاردەکان (**أَمَانَات**) کە لێرەدا خوا فەرمانی بە بڕواداران کردوە، بیانگەیەننە دەستی خەڵکی شایستەی خۆیان، گشتگیرە بۆ هەموو جۆرەکانی سپاردەکان، چ سپاردەی مادديی بن، چ سپاردەی مەعنەویی بن، بەڵام ئەوەی لە سیاق دەردەکەوێ، لەبەر ئەوەش کە خوا (**أَدَاء الأَمَانَات**) لەگەڵ (**حُكْم بِالعَدْل**)دا، پێکەوە هێناون، ئەوەیە کە مەبەست لە سپاردەکان (**أَمَانَات**) لێرەدا کاروبار بەڕێوەبردنی کۆمەڵگایە، کە لە ڕاستییدا مەزنترین سپاردەو ئەمانەتیشە، پێغەمبەری خواش ﷺ وشەی ئەمانەتی وا تەفسیر کردوە، وەك لەم فەرمایشتەدا دیارە:

{**عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا ضُيِّعَتِ الْأَمَانَةُ فَانْتَظِرِ السَّاعَةَ»، قَالَ: كَيْفَ إِضَاعَتُهَا؟ قَالَ: «إِذَا وُسِّدَ الْأَمْرُ إِلَى غَيْرِ أَهْلِهِ فَانْتَظِرِ السَّاعَةَ**} (**أخرجه البخاري**: ٥٩). ئەوە لە درێژەی فەرمایشتێکدا هاتوە، کە پیاوێك لە پێغەمبەر دەپرسێ ﷺ: {**مَتَى السَّاعَة**} ئاخیر زەمان کەی دێ؟ یاخود قیامەت کەیە؟

واتە: ئەبوو هوڕەیڕە ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر کاتێك سپاردە زایە کرا، چاوەڕێی ئاخیر زەمان، (یان چاوەڕێی قیامەت) بکە، ئەویش

گوتی: زایەکردنی سپاردە چۆنە؟ فەرمووی: هەرکات کاروبار بە کەسی ناشایست سپێردرا، چاوەڕێی قیامەت، (یان چاوەڕێی ئاخیر زەمان) بکە.

هەڵبەتە ئەو هاوەڵە (خوا لێی ڕازی بێ)، لە (القِيَامَةُ الكُبْرَى، أو السَّاعَة الكُبْرى)ی، پرسیار کردوە، واتە: ئاخیر زەمان، یاخود زیندوو کرانەوەو هەڵسێنرانەوە، بەڵام پێغەمبەری خاتەم ﷺ بۆی باسی کۆتایی هاتن و ئاخیر زەمانی هەر کارێك کردوە، کە بە کەسێکی ناشایست دەسپێردرێ، کە ئەو کارە سەری بەفەتارە دەچێت و کۆتایی پێ دێ و، ئاخیر زەمانی ئەو کارە دێ.

کەواتە: کاتێك سپاردەی حوکمڕانیی زایە نەبووە، کە بە خەڵکی شایستە سپێردراوە، کەسانێك کە شایستەبن، بۆ ئیدارەدان و بەڕێوبردنی کاروباری کۆمەڵگای مسوڵمان.

دوو ڕوونکردنەوەی گرنگ:

١)- وشەی: ﴿وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ ۝٥٩﴾النساء، وشەیەکە، ناگونجێ بڵێین: مەبەست پێی کەسێکە، ئەو کەسەی کە کاروباری کۆمەڵگا بەڕێوە دەبات، ئەگەر ناوی لێبنرێ: خەلیفە، ئیمام، ئەمیر، سەرۆك، سوڵتان، بۆچی؟ چونکە (أولي) بە مانای خاوەنان (أصحاب)ە، دەڵێ: (أولي: جَمْعٌ لَا وَاحِدَ لَهُ مِنْ لَفْظِهِ، وَاحِدَه ذو، وَأولَات للإنَاث، وَاحِدَتها ذَات)[1] واتە: (أولي): وشەیەکە بە مانای خاوەنان دێ، کە لە بێژەی خۆی تاکی نیە، بەڵکو تاکەکەی بریتیە لە (ذو) خاوەن، بۆ یەك کەس، بۆ مێینان، دەگوترێ: (أولات) تاکی (أولات)یش، بریتیە لە (ذات).

کەواتە: هەر لە ئەسڵدا ئەوانەی خاوەنی دەسەڵات دەبن، لە کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامییدا، دەبێ کۆبن، (أوُلِي الأمْرِ) کە دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡ ۝٥٩﴾النساء، ئێمە لە ئیسلامدا (ولي الأمر)مان نیە، (أوُلِي الأمْرِ)مان هەیە، کەواتە: ئەوە لادانێکی زەق و خراپە، کە بە ناوی ئیسلامەوە کەسێك ناوی لێبنرێ: (وَلِيُّ الأمر)، ئێمە (أُولِي الأمْرِ)مان هەیە،

---

(١) مختار الصحاح: ص٤٣.

دەسـتەڵات و حوکمڕانیـی لـە ئیسـلامدا بـە سـتافە، بـە کۆیـە، تاکێـك نیـە، بەڵـێ: کەسـێك دەبـێ نـاوی سـەرۆك بـێ، نـاوی ئەمیـر بـێ، نـاوی هەرچـی بـێ، بـەڵام بـە تەنیـا حوکمڕانیـی نـاکات، بەڵکـو ڕاوێـژ دەکات لەگـەڵ ئەوانـەی لەگەڵـی دان، یـانی: هـاوکارەکانی.

لـە هەمـوو قورئانـدا وشـەی (**ولي الأمـر**) نەهاتـوە، بـەڵام (**أُولِي الأمْـرِ**) هاتـوە، دوو جـاران هاتوە لـە سـوورەتی (**النسـاء**)دا.

ئنجـا ئـەو خاوەنانـەی فەرمانـە، ئـەو کاربەدەسـتانە، چ لە کـۆڕی ڕاوێـژ (پەرلەمان) دا خۆیـان ببینـەوە، یاخـود لـە: کـۆڕی کردنـەوەو گرێـدان (**أَهـلُ الحَـلِّ والعَقْـدِ**) کـە لـەم ڕۆژگارەدا بـە دەسـتەڵاتی یاسـادانان نـاوزەد دەکـرێ، چ لـە حوکمەتـدا، یـان لـە دەسـتەڵاتی جێبەجـێ کردنـدا، چ لـە دەسـتەڵاتی دادوەرییـدا، هـەر سـێك دەسـتەڵاتەکان، (**أُولي الأمـر**) ئەوانـەی ئـەو سـێ دەسـتەڵاتانە بەڕێوەدەبـەن، ئـەو وشـەیان بـۆ بەکاردەهێـنرێ.

**٢)**- چۆنیەتیی و شێوازی ڕاوێژ کردن لە نێو کۆمەڵگادا، بۆ دیارییکردنی ئەوانەی کاریان پێدەسپێردرێ، لە هەر سێ دەسەڵاتی یاسادانان و جێبەجێ کردن و دادوەرییدا، شەریعەت شێوازێکی دیارییکراوی بۆ دانەناوە، بەڵکو بەجێیهێشتوە، لە بازنەی ڕەوادا، لە بازنەی دەستکراوەیی دا، تاکو کۆمەڵگا لە هەر قۆناغێك لە قۆناغەکانی گەشەکردنی ژیانی بەشەردا، بە پێی پێویست میکانیزمی بۆ دابنێ، کەواتە: مسوڵمانان ئازادن و دەستکراوەن، لە هەڵبژاردنی ئەو شێوازو میکانیزمانەی کە پێیان باشترە لە ڕووی ئیداریی و هونەرییەوە، بۆ ئەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە: ﴿ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ﴾، لە ژیانی خۆیاندا بەرجەستە بکەن، مسوڵمانان هیچ قەیدو بەندێکیان لەسەر نیە، جگە لەوە کە نابێ پێچەوانەی دەقێکی شەریعەت بێ و، دەبێ هێنانەدی بەرژەوەندیی مسوڵمانانی لێبکەوێتەوە، چونکە کاروبارە هەڵسوکەوتییەکان، ئەسڵ تێیاندا هێنانەدی بەرژەوەندیی و چەسپاندنی دادگەرییە، ئەگەرنا هیچ قەیدو مەرجێکی دیکەیان لەسەر نیە، بە پێچەوانەی خواپەرستییەکانەوە، کە ئەسڵ تێیاندا پابەندییە بە دەقەکانەوە،

بەبێ سەرنجدانی حیکمەتەکەیان، چونکە مامەڵە لەگەڵ خوادا ﷻ لەسەرووی عەقڵی بەشەرەوەیە، بەڵام مامەڵەی کۆمەڵگا لە نێو خۆیدا، لە مەودای عەقڵی بەشەر دایە، بۆیە دەبێ حیکمەت و سوودەکە لەبەرچاو بگیرێ.

٣)- دیارییکردنی نوێنەرانی کۆمەڵگا، یاخود ئەندامانی ڕاوێژ، یان ئەندامانی پەرلەمان، بە زاراوەی ئەمڕۆ، گرنگترین ئەو بابەتانەیە، کە دەبێ کۆمەڵگای مسوڵمان قسەی خۆی تێدا بکات و ڕاوێژی تێدا بکات، ئنجا چۆنیەتیی هەڵبژاردن و دیارییکردنی نوێنەرانی کۆمەڵگا، ئەمیش دیسان شەریعەت بە بۆشی بەجێیهێشتوە، تەنیا یەك چوارچێوەی فراوانی بۆ داناوە، کە دەبێ بە ڕاوێژی مسوڵمانان لە بەینی خۆیاندا بێ و، هیچ کەس بە لاف لێدانی تاکیی بڵێ: من شایستەترم، یان بنەماڵەیی، یان عەشیرەتیی، یان حیزبیی، یان ڕەگەزیی، بۆی نیە خۆی بەسەر کۆمەڵگادا بسەپێنێ، بەڵکو دەبێ بە ڕاوێژ بێ، بە پرس و ڕای کۆمەڵگابێ.

٤)- زۆرێك لە زانایان لەبارەی ڕەوابوون و ڕەوانەبوونی حوکمڕانیی ئەوانەی خۆیان بەسەر کاروباری مسوڵماناندا سەپاندوە، لە دوای چوار خەلیفە ڕاشیدەکان، هەر لە موعاویەی کوڕی ئەبوو سوفیانەوە، هەتا دوایی، لەو بارەوە زۆر قسەیان کردوە، کە بەبێ ڕاوێژ بە مسوڵمانان خۆیان بەسەر کورسیی حوکمڕانییدا سەپاندوە، کە ئەوەی موعاویە هەتا ڕاددەیەك شوبهەیەکی بە دەستەوە هەبوو، کە حەسەنی کوڕی عەلی (خوا لێیان ڕازی بێ)، تەنازولی بۆ کرد، بەڵام لە دوای ئەوەوە یەزیدی کوڕی و، ئەوانی دیکە، جگە لە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز، ڕەحمەتی خوای لێبێ و، هەندێکی دیکەیان کە کارەکەیان تەسلیمی مسوڵمانان کردۆتەوە، بەڵام مسوڵمانان هەڵیانبژاردوون، ئەوانی دیکە هەموویان بە میراتیی بوون.

زانایان لەوبارەوە زۆر قسەیان کردوە، بەڵام ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ کە دەفەرموێ: {**أَوَّلُ مَنْ يُغَيِّرُ سُنَّتِي رَجُلٌ مِنْ بَنِي أُمَيَّةَ**} (**أخرجه ابن أبي عاصم في الأوائل: ج٧، ص٢، ورواهُ ابنُ كثير في البدَاية والنِّهَاية: ج٨، ص٢٣٤، وكذلك رواه السيوطي في الجامع الصغير: ٢٨٤١، وأورده الألباني في السلسلة الصحيحة رقم: ١٧٤٩**)، واتە: یەکەم کەس کە ڕێبازی من دەگۆڕێ، پیاوێکە لەبەنی ئومەییە.

ئەلبانیی ڕەحمەتی خوای لێ بێ، دەڵێ: ڕەنگە مەبەست لە فەرمایشتەکە گۆڕینی سیستمی هەڵبژاردنی خەلیفە بێ و، کردنی بە میراتیی بێ، [کە لەسەر دەستی موعاویە ئەوە ڕوویدا، خوا لێی ببوورێ].

لەو بارەوە زانایان زۆر قسەیان کردوە، بەڵام پێم وایە ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ، ئەو بابەتە یەکلایی دەکاتەوە، هەروەها دەشگونجێ ئەو ئایەتە موبارەکەی سوورەتی (البقرة) لەوبارەوە بە بەڵگەبهێنرێتەوە، کە دەفەرموێ: ﴿قَالَ لَا يَنَالُ عَهْدِي الظَّالِمِينَ ﴿١٢٤﴾﴾، واتە: پەیمانی من ستەمکاران ناگرێتەوە، کە لە وەڵامی ئیبراهیم دایە (عَلَيْهِ الصَّلاةُ وَالسَّلَامُ)، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿وَإِذِ ابْتَلَىٰ إِبْرَاهِيمَ رَبُّهُ بِكَلِمَاتٍ فَأَتَمَّهُنَّ قَالَ إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا قَالَ وَمِن ذُرِّيَّتِي قَالَ لَا يَنَالُ عَهْدِي الظَّالِمِينَ ﴿١٢٤﴾﴾البقرة، واتە: یادبکەوە! کاتێك پەروەردگاری ئیبراهیم، ئیبراهیمی تاقیکردەوە بە چەند وشەیەك {واتە: بە چەند ئەرکێك} ئەویش هەمووی تەواو کردن، دوایی (خوا) فەرمووی: من دەتکەمە پێشەوا بۆ خەڵك، گوتی: ئەدی لە وەچەکەم؟ (خوا) فەرمووی: ستەمکاران پەیمانی من نایانگرێتەوە، واتە: ستەمکاران ڕەوایەتییان نیە، بۆ پێشەوایەتیی و حوکمرانیی.

کەواتە: هەر کارپێ سپاردنێك لە سەربناغەی خۆسەپاندن و، ستەم لە خەڵك کردن بنیات نرابێ، لە ڕاستییدا ڕەوایەتیی نیەو، بە ناشەرعیی لە قەڵەم دەدرێ.

**سێیەم:** بەڵگەیەکی دیکە لەوبارەوە، ئەوەیە کە خوا ﷻ لەسەر کاربەدەستانی فەرز کردوە حوکم بە دادگەریی بکەن، وەك خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ أَن تَحْكُمُوا بِالْعَدْلِ ﴿٥٨﴾﴾النساء، ئەمەش بەڵگەیەکی دیکەیە، چونکە بابای ستەمکار، کە خۆی بەسەر خەڵکدا سەپاندوە و بۆخۆی دادگەرنیە، چۆن دەتوانێ لە حوکمڕانییدا دادگەرانە ڕەفتار بکات؟ وەك گوتراوە: (كَيْفَ يَستَقِيمُ الظل وَالعودُ أعوجُ) سێبەر چۆن ڕاست دەبێ، ئەگەر دارەکە خوار بێ؟!

**چوارەم:** هەڵبەتە دەگونجێ زۆر بەڵگەی دیکەش بهێنرێتەوە، بۆ وێنە: خوا لە سووڕەتی (هود) ئایەتی (١٨)دا، دەفەرمویٚ: ﴿أَلَا لَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الظَّالِمِينَ ١٨﴾، واتە: ئاگاداربن! نەفرینی خوا لە ستەمکاران.

ئنجا چۆن بابای نەفرین لێکراو، دەبێتە سەرپەرشتیاری مسوڵمانان، مسوڵمانانێك کە خوا بەزەیی پێدادێن، کەسێك کە خوا لە بەزەیی و ڕەحمەتی خۆی دووری خستۆتەوەو نەفرینی لێکردوە، چۆن بکرێتە سەرپەرشتیارو، سەرۆکیان؟ دەگونجێ زۆر بەڵگەی دیکەش لەو بارەوە بهێنرێنەوە.

## مەسەلەی دووەم:

**هەقی خۆکردنەوەو تۆڵەستاندنەوە، دوای ستەملێکران، گلەیی لەسەر نیە، بەڵکو گلەیی و سەرزەنشت لەسەر ستەم کارو دەستدرێژکارانەو، ئەوانە ئازاری بە ژانیشیان هەیە لە قیامەتدا، کەسێکیش خۆڕاگریی و لێبوردنی هەبێ، ئەو خەسڵەتە لەو کارانەیە کە بەبێ ئیرادەی پتەوو قایم نایەتەدی:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَمَنِ ٱنتَصَرَ بَعْدَ ظُلْمِهِۦ فَأُو۟لَٰٓئِكَ مَا عَلَيْهِم مِّن سَبِيلٍ ﴿٤١﴾ إِنَّمَا ٱلسَّبِيلُ عَلَى ٱلَّذِينَ يَظْلِمُونَ ٱلنَّاسَ وَيَبْغُونَ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٤٢﴾ وَلَمَن صَبَرَ وَغَفَرَ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ﴿٤٣﴾ ﴾

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ وَلَمَنِ ٱنتَصَرَ بَعْدَ ظُلْمِهِۦ فَأُو۟لَٰٓئِكَ مَا عَلَيْهِم مِّن سَبِيلٍ ﴾، بە دڵنیایی هەر کەسێك دوای ئەوەی ستەمی لێکراوە، تۆڵەی خۆی بستێنێتەوەو ملنەدات بۆ ستەم، ئەوانە ڕێی گلەییان لەسەر نیە، کەس ناتوانێ گلەییان لێ بکات و سەرزەنشتیان بکات.

کە دەفەرموێ: (**وَلَمَن**) ئەم (ل)ە، (**موطئة للقسم**)، ڕێخۆشکەرە بۆ سوێند، ﴿ وَلَمَنِ ٱنتَصَرَ بَعْدَ ظُلْمِهِۦ ﴾ واتە: بە دڵنیایی کەسێك تۆڵە بستێنێتەوە لە دوای ئەوەی ستەمی لێکراوە، (**إِنْتَصر**) پێشتر گوتمان: أ- یان بە مانای بەرهەڵستیی ستەمکاری کرد، ب- یان بە مانای تۆڵەی ستاند، ج- یاخود مانای داوای یارمەتیی کرد تاکو زوڵمی لێ نەکرێ.

(**بَعْدَ ظُلْمِه: إضَافَةُ المَصْدَرِ إلى مَفْعُولِهِ، أي: بَعْدَ كَوْنِهِ مَظْلُومَاً**)، (**بَعْدَ ظُلْمِهِ**) ئەمە پاڵدانی چاوگە بۆ لای بەرکار، (**بَعْدَ ظُلْمِهِ**) (**ظلم**): چاوگەو ڕاناوەکە (ه) بەرکارەکەیەتی، کە ئەمە پاڵدانی چاوگە بۆ لای بەرکار، واتە: دوای ئەوەی ستەمی لێکراوە، تۆڵە بستێنێتەوە، گلەیی لەسەر نیە، چونکە (**مَنْ: شَرْطِيّة**) یانی: هەر کەسێك بە مەرجێك ستەمی لێکرابێ تۆڵە بستێنێتەوە، گلەیی لەسەر نیە.

﴿ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَا عَلَيۡهِم مِّن سَبِيلٍ ﴾، ئا ئەوانە هیچ ڕێیان لەسەر نیە، یانی: (**مُوجِب المُؤَاخَذَةِ**) هیچ ڕێیەکی پێویستکەر بۆ سزادان و گلەیی لێکرانیان لەسەر نیە، (فَأُوْلَٰٓئِكَ)، دەبێتە وەڵامی مەرجەکە، هەر کەسێك بە مەرجێك ستەمی لێکرابێ و تۆڵەبستێنێتەوە، یاخود بەرپەرچی ستەمەکە بداتەوە، وەڵامەکەی ئەوەیە: ئەوانە هیچ ڕێی گلەیی کردنیان لەسەر نیە.

٢)- ﴿ إِنَّمَا ٱلسَّبِيلُ عَلَى ٱلَّذِينَ يَظۡلِمُونَ ٱلنَّاسَ ﴾، ڕێی گلەیی کردن تەنیا لەسەر ئەوانەیە، کە ستەم لە خەڵك دەکەن، هەر ئەوانە گلەییان دێتە سەرو، ڕێی ڕەخنەگرتنیان بۆ لادەچێ، وشەی ( إِنَّمَا): زۆرجار باسمان کردوە، ئامرازی کورتهەڵێنان و چەسپاندنە، (**أَدَاةُ الحَصْرِ وَالإِثْبَات**) یانی: ڕێی گلەیی تەنیا لەسەر ئەو کەسانەیە کە ستەم لە خەڵك دەکەن.

٣)- ﴿ وَيَبۡغُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ ﴾، هەروەها بە ناهەق دەستدرێژیی دەکەن لە زەویداو، سنووربەزێنیی دەکەن، وشەی (**بَغِي**): بریتیە لە سنووربەزاندن ڕووەو ئەو شتانەی خوا لەسەر زەویدا دایناون، وەك مافێکی گشتیی و سوود بەخش بۆ هەموو لایەك، کە خوا بۆ تێکڕای خەڵکی خوڵقاندوونی، ئەو بێنێ دەستدرێژیی بکاتە سەر ئەو هەق و مافانە، یاخود ئەو نیعمەتانەو بۆ خۆی قۆرخیان بکات و دەستیان بەسەر دابگرێ، ئائەوە (**بَغي**)ە.

کە دەفەرموێ: ﴿ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ ﴾ دەستدرێژیی کردن هەر بە ناهەقە، بەڵام ئەمە: (**لِكَشْفِ فَظَاعَةِ البَغِي**) ئەمە بۆ دەرخستنی ناقۆڵایی و، ناشیرینیی ئەو دەستدرێژییەیە، ئەگەرنا دەستدرێژیی و سنوور شکێنیی هەر خراپە.

ئنجا کەسانێك وابن:

٤)- ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴾، ئەوانە ئازارێکی بە ئێشیان بۆ هەیە، ئازارێکی بە ژان کە بە دڵنیایی مەبەست پێی سزای ڕۆژی دواییە.

٥)- ﴿ وَلَمَن صَبَرَ وَغَفَرَ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمِنۡ عَزۡمِ ٱلۡأُمُورِ ﴾، بە دڵنیایی هەرکەس خۆی ڕابگرێ و لێببوورێ، ئەوە لە کارە گرنگ و جەخت لەسەر کراوەکانە. ئەم (ل)ی (**وَلَمَن**) لامی

دەستپێکردنە (**لام الإبتداء**)، یانی: مسۆگەر کەسێك خۆڕاگریی بکات و لێبوردن بکات، ئەو خۆڕاگریی و لێبوردنە، ﴿ لَمِنْ عَزْمِ الْأُمُورِ ﴾، واتە: لەوکارانەیە کە پێویستیی بە عەزیمەت دەکات، یاخود لەو کارانەیە کە بەکەسانێکی خاوەن ئیرادەو عەزمی پتەو ئەنجام دەدرێن، یاخود لەو کارانەیە کە خوا ﷻ زۆر جەختی لەسەر کردوونەوە.

لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَمَن صَبَرَ وَغَفَرَ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمِنْ عَزْمِ الْأُمُورِ ﴾ چوار جەختکەرەوە هاتوون:

١- (ل): ﴿ وَلَمَن صَبَرَ وَغَفَرَ ﴾.

٢- (إن): (إِنَّ ذَٰلِكَ).

٣- (ل)ی دەستپێکردن (**لام الإبْتِدَاء**): ﴿ وَلَمَن صَبَرَ وَغَفَرَ ﴾.

٤- وەسفکردن بە چاوگ: ﴿ لَمِنْ عَزْمِ الْأُمُورِ ﴾ ئەو کارانەی عەزمیان لەسەر کراوەو، ئیرادەیەکی پتەویشیان لە پشتەوەیە.

وشەی (**عَزْم**) یانی: (**عَقْدُ النِّيَّةِ عَلَى العَمَلِ وَالثَّبَاتِ عَلَى ذَلِك**) (**عزْم**)، بریتیە لە گرێدانی نیازو مەبەست لەسەر کارێك و، چەسپاویی لەسەر ئەو کارە، وشەی (**عَزْم**) کە پاڵدراوەتە لای (**الأمور**)، (**مِنْ إضَافَةِ الصِّفَةِ إلى المَوْصُوف**) لێرەدا سیفەت پاڵدراوەتە لای وەسفکراو، (**أي: الأُمُورِ المَعْزُومة، أو الأمُور العَازِمَة أصْحَابُها**)، واتە: لەو کارانەیە کە عەزمیان لە سەر کراوە، یان: کە خاوەنەکانیان، خاوەن دڵی پتەون لەسەر ئەنجامدانی کاران، یاخود: (**مِنْ عَزَائِمِ اللهِ الَّتِي أمَرَ اللهُ بِهَا**) لەو کارە گرنگانەن کە خوا مەبەستی بوون، مرۆڤەکان بیانهێننەدی.

بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو ئایەتە موبارەکەی دەفەرموێ: ﴿ وَلَمَنِ انتَصَرَ بَعْدَ ظُلْمِهِۦ فَأُولَٰٓئِكَ مَا عَلَيْهِم مِّن سَبِيلٍ ﴾، واتە: هەر کەسێك لە دوای ئەوەی ستەمی لێکراوە، تۆڵە بستێنێتەوە، ئەوانە هیچ ڕێی گلەییان لەسەر نیە، ئەم دەقە لەوبارەوە، دێنین:

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {الْمُسْتَبَّانِ مَا قَالَا فَعَلَى الْبَادِئِ، مَا لَمْ يَعْتَدِ الْمَظْلُومُ} (أخرجه مسلم: ٢٥٨٧، والبخاري في الأدب المفرد: ٤٤٢٣، وأبو داود: ١٨٩، والترمذي: ٥٨١) واتە: ئەو دوو کەسەی قسە بە یەکدی دەڵێن، (جنێو بە یەکدی دەڵێن)، ئەو کەسەی دەستپێشخەر بووە، گوناهەکە لە ئەستۆی ئەوە، تاکو بابای ستەملێکراو سنوور شکێنیی دەکات و تێدەپەڕێنێ. {ئەو کاتە ئەویش گوناهبار دەبێ} وەك بنچینەیەکی شەرعیی هاتوە: (البَادِئُ بالشَّرِّ أظلَم) دەستپێشخەر بۆ خراپە ستەمکارترە، واتە: گوناهەکە لە ئەستۆی ئەوە، ئەوی دیکە کە وەڵام دەداتەوەو بەرگریی لە خۆی دەکات، گوناهبار نابێ، چونکە خوا ﷻ ڕێگای پێداوە بەرگریی لە خۆی بکات: ﴿وَالَّذِينَ إِذَا أَصَابَهُمُ الْبَغْيُ هُمْ يَنتَصِرُونَ﴾، ﴿فَمَنِ اعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ ﴿١٩٤﴾﴾البقرة، ئەویان ڕێی پێدراوە، بۆیە گوناهبار نیەو ئەرکێکی شەرعیی ئەنجام دەدات، بەڵام هی یەکەم کە دەستپێشخەر دەبێ بۆ دەستدرێژیی، کارێك دەکات، کە خوا قەدەغەی کردوە، بۆیە گوناهبارە.

## مەسەلەی سێیەم:

هەر کەسێك خوا گومڕای بكات، هیچ سەرپەرشتیاری نابن و، لە كاتی دیتنی سزای خواشدا، داوای گەڕانەوە دەكەن بۆ دنیاو، كاتێكیش لەسەر ئاگر رادەنوێنرێن بە ملكەچیی و زەبوونیی بەسیلەی چاوان، تەماشا دەكەن و، بڕوادارانیش دەڵێن: ئەوانەی خۆیان و كەس و كاریان دۆڕاندوە، زیانبارن و، هیچ كەسیش نەبوو لە سزای خوا دەربازیان بكات، ئەوەی خواش سەرگەردانی بكات، هیچ ڕێی نین:

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن وَلِيٍّ مِّنۢ بَعْدِهِۦ ۗ وَتَرَى ٱلظَّـٰلِمِينَ لَمَّا رَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ يَقُولُونَ هَلْ إِلَىٰ مَرَدٍّ مِّن سَبِيلٍ ﴿٤٤﴾ وَتَرَىٰهُمْ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا خَـٰشِعِينَ مِنَ ٱلذُّلِّ يَنظُرُونَ مِن طَرْفٍ خَفِيٍّ ۗ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِنَّ ٱلْخَـٰسِرِينَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ وَأَهْلِيهِمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۗ أَلَآ إِنَّ ٱلظَّـٰلِمِينَ فِى عَذَابٍ مُّقِيمٍ ﴿٤٥﴾ وَمَا كَانَ لَهُم مِّنْ أَوْلِيَآءَ يَنصُرُونَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ ۗ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن سَبِيلٍ ﴿٤٦﴾ ﴾.

### شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دە (١٠) بڕگەدا:

١)- ﴿ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن وَلِيٍّ مِّنۢ بَعْدِهِۦ ﴾، هەر كەسێك خوا گومڕای بكات، هیچ سەرپەرشتیاری نین، لە دوای وی.

(مِنْ)ی ﴿ فَمَا لَهُۥ مِن وَلِيٍّ ﴾، (مِنْ: زَائِدَةٌ للتَوْكِيد)، ئەم (مِنْ)ە، زیادكراوە بۆ جەختكردنەوە، واتە: هەر لەسەرەتای سەرپەرشتیارییەوە تاكو كۆتایی، هیچ كەسێك نیە، لە دوای خوا سەرپەرشتیاری بێ، مادام خوا گومڕای كردبێ.

كە دەفەرموێ: ﴿ مِّنۢ بَعْدِهِۦ ﴾، یانی: (مِنْ دُونِه، مِنْ غَيْرِه) جگە لە خوا هیچ سەرپەرشتیاری دیكەی نین، كە خوا گومڕای كردبێ، كێ دەتوانێ سەرپەرشتیاری بێ و بیخاتەوە سەر ڕێ؟!

٢)- ﴿ وَتَرَى ٱلظَّـٰلِمِينَ لَمَّا رَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ﴾، ستەمکارانیش دەبینی، کاتێك کە ئازار دەبینن، سزا دەبینن، واتە: دۆزەخ دەبینن، وشەی (**العَذَاب**)، (أل)ەکە بۆ ناساندنە، بەڵام بۆ (**عهد**)ە، واتە: سزاو ئازارەکە دەبینن، کە مەبەست پێی دۆزەخە، چی دەکەن؟

٣)- ﴿ يَقُولُونَ هَلْ إِلَىٰ مَرَدٍّ مِّن سَبِيلٍ ﴾، دەڵێن: ئایا هیچ ڕێیەك نیە بۆ گەڕانەوە، (**هَلْ: إنْكَارِيٌّ فِي مَعْنَى النَّفِي، و«مِنْ» زَائِدَةٌ للتَّأكِيْد**) ﴿ هَلْ إِلَىٰ مَرَدٍّ مِّن سَبِيلٍ ﴾ یانی: ئایا هیچ ڕێ نین بۆ گەڕانەوە بۆ دنیا؟ (**هل**) بۆ پرسیارکردنی نکووڵییلێکردنەو مەبەست پێی لابردنە، (**مِنْ**)یش کە چۆتە سەر (**سبیل**) زیاد کراوە بۆ تەئکید کردنەوە، واتە: هیچ جۆرە ڕێیەك نیە، کە بگەڕێننەوە.

وشـەی (**مَـرَدّ**) وەك پێشـتریش باسـمان کـرد، هـەم بـە مانـای گەڕانـەوە (**رجُـوع**) دێ و چاوگـی (میمیی)یـە، واتـە: گەڕانـەوە، هـەم بـە مانـای شـوێنی بـۆلا گەڕانـەوە، یـانی (**مَرْجِـع**) واتـە: هیـچ شـوێنێك نیـە بـۆ لای بگەڕێننـەوە؟

٤)- ﴿ وَتَرَىٰهُمْ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا خَـٰشِعِينَ مِنَ ٱلذُّلِّ ﴾، تۆ ئەو تاوانبارە بێبڕوایانە دەبینی، ملکەچانە بەهۆی زەبوونییەوە ڕادەنوێنرێن لەسەری، ڕاناوی (ها)ی (**عَلَيْهَا**) بۆ ئاگری دۆزەخ دەچێتەوە، لەسەر ئاگری دۆزەخ ڕادەنوێنرێن، ﴿ خَـٰشِعِينَ مِنَ ٱلذُّلِّ ﴾ زۆر ملکەچانەو زەبوونانە، لەبەر ئەو بێ دەستەڵاتیی و داماوییەی بەسەریان هاتوە، زۆر ملکەچن، یاخود بەوشەی (**خَاشِعِيْن**) ڕستەکە کۆتایی دێ و، (**من الذلّ**) پەیوەستە بەڕستەی دواییەوە:

٥)- ﴿ مِنَ ٱلذُّلِّ يَنظُرُونَ مِن طَرْفٍ خَفِىٍّ ﴾، لەبەر زەبوونیی و بێ دەستەڵاتیی، بە سیلەی چاو تەماشا دەکەن، (**الطَّرْفُ: تَحْرِيكُ جَفْنِ العَيْنِ**)، (**طَرْف**) جووڵاندنی پێڵووی چاوە. (**طَرَفَ**): لەسەر کێشی (**ضَرَبَ**)، واتە: (**حَرّكَ جَفنه**) پێڵووی چاوی جووڵاند، واتە: پڕ بە چاو تەماشای ئەو سزاو ئازارە ناکەن، بەڵکو بە سیلەی چاوو لە ژێر چاوەوە، تەماشای دەکەن، لە ئەنجامی ئەو زەبوون و زەلیلییەدا کە بە ملیاندا هاتوە.

٦)- ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾، ئەوانەی بڕوایان هێناوە گوتیان، ئەمە وەك جۆرێك لە خۆشحاڵیی دەربڕینە، بەوە كە ئەو تاوانبارو ستەمكارو خراپەكارانە، تووشی ڕۆژی خۆیان بوون، دوو چاری سزای خۆیان بوون، ئەوانەی بڕوایان هێناوە گوتیان:

٧)- ﴿ إِنَّ ٱلْخَٰسِرِينَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمْ وَأَهْلِيهِمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴾، بە دڵنیایی زیانباران، هەر ئەوانەن كە خۆیان و كەس و كاریان لە ڕۆژی قیامەتدا دۆڕاندووەو لە دەستداوە، واتە: زیانباری ڕاستەقینە ئەوانەن، كە هەم خۆیان لە دەستداوەو هەم كەس و كاریشیان.

كەواتە: وشەی (الخاسِرِیْن) كە (أل)ی ناساندنی لەسەرە، بۆ (جنس)ە، یانی: گەورەترین زیانبارو، ئەو كەسەی مانای تەواوی زیانباریی تێدا هاتۆتە دی، ئەو جۆرە كەسانەن.

٨)- ﴿ أَلَآ إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ فِى عَذَابٍ مُّقِيمٍ ﴾، (ألآ: للتَنْبيه وَالإعْلَام) ئاگاداربن! ئەها! ستەمكاران لە ئازارو سزایەكی بەردەوامدان، (الْمُقِيمُ: الَّذِي لاَ يَرْتَحِلُ) بەردەوام و نەپساوەو نەبڕاوە.

٩)- ﴿ وَمَا كَانَ لَهُم مِّنْ أَوْلِيَآءَ يَنصُرُونَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ ﴾، هیچ سەرپەرشتیارانێكیشیان نەبوون، جگە لە خوا سەریان بخەن، دیسان (مِنْ) لێرەدا: ( وَمَا كَانَ لَهُم مِّنْ أَوْلِيَآءَ ) زیادكراوە بۆ جەختكردنەوەی ئەوە، كە هیچ جۆرە سەرپەرشتیارێكیان نیە، هەر لە سەرەتاو دەستپێكەوە تاكو كۆتایی.

﴿ يَنصُرُونَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ ﴾، جگە لە خوا، سەریان بخەن، یان لە بەرانبەر سزای خوادا سەریان بخەن، یاخود: هیچ سەرپەرشتیارانێكیان نەبوون، جگە لە خوا، سەریان بخەن و لە فریایان بێن.

١٠)- ﴿ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن سَبِيلٍ ﴾، هەر كەسێكیش خوا گومڕای بكات، هیچ ڕێی نین.

(سَبيل: نَكِرَةٌ فِي سِيَاقِ النَّفْيِ فَيَعُمُّ كُلَّ سَبِيل مُخَلِّص مِنَ الضَّلالِ وَمِنْ آثَارِهِ)
(سَبِيل): کە بە نەزانراو (نكرة) هاتوە، لە سیاقێکدا کە لابردنە، هەموو جۆرە رێیەکانی رێدەربازکەرەکان دەگرێتەوە، لە گومڕایی و لە شوێنەوارەکانی گومڕایی.

لێرەدا مەبەست ئەوە نیە کە خوا گومڕای کردوون، بەڵکو مەبەست ئەوەیە یاساو سیستمی خوا بەسەریاندا چەسپیوە، کە هیدایەتی خوایان بۆ هاتوە، رەفزیان کردوەو گومڕاییان تووش بووە، وەك چۆن کەسێك ژەهر دەخواتەوە دوایی ژاراویی دەبێ، ئەوانەش کە هیدایەتی خوایان رەفز کردوە، یەکسەر تووشی گومڕایی بوون.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی ئێمە لەو کەسانە بگێڕێ، کە هەمیشە هیدایەتی خوا بە رووح و گیان قبووڵ دەکەن و تێیدەگەن و پێوەی پابەند دەبن، بۆ ئەوەی لە دنیادا بەختەوەربن و، لە دوارۆژیشدا سەربەرزو سەرفرازبن.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان حەوت (٧) ئایەتی کۆتایی سوورەتی (**الشورى**) دەگرێتە خۆی، ئایەتەکانی: (٤٧ - ٥٣) لەو حەوت ئایەتە موبارەکەدا، کۆمەڵێك بابەتی گەورەو گرنگی جۆراو جۆر خراونەڕوو، دەتوانین لە حەوت بابەتدا پوختەیان بکەینەوە:

١- فەرمانکردنی خوا بە مرۆڤەکان، کە بە دەم بانگەوازی خواوە بچن، بەر لەوەی قیامەت و ڕۆژی دوایی بێ، کە گێڕانەوەی نیە، هیچ کەسیش هیچ پەناگەیەکی نیە خۆی تێبگرێ لە سزای خوا.

٢- ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە ﷻ پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ تەنیا وەك گەیەنەری پەیامی خوا نێرراوە، نەك وەك پارێزەری مرۆڤەکان، کە نەهێڵێ بەملاولادا بچن و گومڕابن، ئەو تەنیا گەیاندنی پەیامی خوای لەسەرە.

٣-**زۆر** دڵخۆشبوونی مرۆڤی بێبڕوا بە خۆشیی و نیعمەت و، سپڵەیی نواندنی لە کاتی گرفتاریی دا.

٤- دەستکراوەیی خوا ﷻ لە ڕووی پێدانی ڕۆڵەوە بە مرۆڤەکان، کە تەنیا کچانیان پێبدات، یان تەنیا کوڕانیا پێبدات، یان هەردووکانیان پێبدات، هەم کوڕان و هەم کچان، یاخو هیچیان پێنەدات، بە هەر چوار حاڵەتەکە، خوا ﷻ مامەڵە لەگەڵ مرۆڤەکاندا دەکات.

٥- سێ شێوە سەرەکییەکانی سروشکردنی خوا بۆ پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ**)، خوا ﷻ بە سێ شێوەی سەرەکیی وەحیی و پەیامی خۆی بۆ پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ**) ناردوە:

**یەکەم:** لە پشت پەردەوە دواندن، **دووەم:** خستنە نێو دڵ، **سێیەم:** ناردنی نوێنەرێکی فریشتە.

٦- ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە موحەممەد ﷺ پێش سروش بۆ کرانی، نەیزانیوە کتێب چییەو ئیمان چییە؟

٧- قورئان ڕووح و ڕووناکییەکی خوایەو، مایەی ڕاستە ڕێکردن و بە مراد گەیاندنی بەندەکانە، بە هۆی ئاشنا بوونیانەوە، بەڕاستە شەقامی خوا.

﴿ ٱسْتَجِيبُوا۟ لِرَبِّكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِىَ يَوْمٌ لَّا مَرَدَّ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ ۚ مَا لَكُم مِّن مَّلْجَإٍ يَوْمَئِذٍ وَمَا لَكُم مِّن نَّكِيرٍ ﴿٤٧﴾ فَإِنْ أَعْرَضُوا۟ فَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا ۖ إِنْ عَلَيْكَ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ۗ وَإِنَّآ إِذَآ أَذَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِنَّا رَحْمَةً فَرِحَ بِهَا ۖ وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌۢ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ فَإِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ كَفُورٌ ﴿٤٨﴾ لِّلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ ۚ يَهَبُ لِمَن يَشَآءُ إِنَٰثًا وَيَهَبُ لِمَن يَشَآءُ ٱلذُّكُورَ ﴿٤٩﴾ أَوْ يُزَوِّجُهُمْ ذُكْرَانًا وَإِنَٰثًا ۖ وَيَجْعَلُ مَن يَشَآءُ عَقِيمًا ۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٌ قَدِيرٌ ﴿٥٠﴾ ۞ وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ ٱللَّهُ إِلَّا وَحْيًا أَوْ مِن وَرَآئِ حِجَابٍ أَوْ يُرْسِلَ رَسُولًا فَيُوحِىَ بِإِذْنِهِۦ مَا يَشَآءُ ۚ إِنَّهُۥ عَلِىٌّ حَكِيمٌ ﴿٥١﴾ وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا ۚ مَا كُنتَ تَدْرِى مَا ٱلْكِتَٰبُ وَلَا ٱلْإِيمَٰنُ وَلَٰكِن جَعَلْنَٰهُ نُورًا نَّهْدِى بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنْ عِبَادِنَا ۚ وَإِنَّكَ لَتَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٢﴾ صِرَٰطِ ٱللَّهِ ٱلَّذِى لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ أَلَآ إِلَى ٱللَّهِ تَصِيرُ ٱلْأُمُورُ ﴿٥٣﴾ ﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{(ئـەی خەڵکینـە!) وەڵامـی (پەیامـی) پەروەردگارتـان بدەنـەوە، بـەر لـەوەی ڕۆژێـك بـێ (کـە ڕۆژی دواییـە)، لەلایـەن خـواوە بەرپەرچدانـەوەی نیـەو لـەو ڕۆژەدا هیـچ پەناگەیەکتـان نیـەو، هیـچ نکووڵیـی کردنیشـتان نیـە ﴿٤٧﴾ ئنجـا ئەگـەر پشـتیان هەڵکـرد (لـە پەیامـی خـوا، هـەر خۆیـان زیانبـارن) چونکـە ئێمـە تۆمـان بـە پارێـزەر نەناردۆتـە سـەریان، تـۆ تەنیـا گەیانـدن (ی پەیامـی خـوا)ت لەسـەرە، هـەر کاتێکیـش ئێمـە بەزەییەکـمان بـە مـرۆڤ (ی بێبـڕوا) چێـژت، زۆر پێـی دڵخـۆش دەبـێ و، ئەگـەر خراپەیەکیشـیان بەسـەر بـێ، (ناخۆشـییەکیان بەسـەر بـێ)، بـە هـۆی ئـەوەوە کـە دەسـتیان پێشیخسـتوە (ناشـوکریی دەکات)، چونکـە مـرۆڤ (ی بێبـڕوا!) زۆر سـپڵەو پێنەزانـە ﴿٤٨﴾ حوکمڕانیـی و خاوەندارێتیـی زەوی، بـەس هـی خوایـە، هەرچـی بیـەوێ دەیهێنێتـەدی، هـەر کەسـێکی بـوێ، مێینـان (کچان)ی، پێدەبەخشـێ و، هەر کەسـێکیشی بـوێ نێرینـان (کـوڕان)ی، دەداتـێ ﴿٤٩﴾ یـان نێرینـان و مێینانیـان بـۆ جـووت دەکات (کـوڕان و کچانیـان وێکـڕا دەداتـێ)و، هـەر کەسـیشی بـوێ نـەزۆکی دەکات، بێگومـان ئـەو زانـای توانایـە ﴿٥٠﴾ هیـچ مرۆڤێکیـش بـۆی نیـە خـوا بیدوێنـێ: مەگـەر بـە سروشـکردن، یـان (خسـتنە نێـو دڵ) لـە پشـت پـەردەوە (بیدوێنـێ)، یـان نێردراوێـك بنێـرێ، کـە بـە مۆڵـەتی وی هەرچـی بـوێ، سروشی دەکات، بـە دڵنیایـی ئـەو (خـوا) زانای کارزانـە ﴿٥١﴾ هـەر بـەو شـێوەیەش (کـە باسـکرا)، ڕووحێکـمان لـە لایـەن خۆمانـەوە بـۆلا سروشـکردی، (پێشـتر) نەتـدەزانی نـە کتێـب چییـەو نـە ئیـمان (چییـەو چۆنـە)؟ بـەڵام گێڕامـان، (قورئانمـان کـردە) ڕووناکییـەك هـەر کـەس بمانـەوێ، لـە بەندەکانمـان پێـی ڕاسـتەڕێ دەکەیـن و، بـە دڵنیایـی تـۆ (خەڵـك) بـەرەو ڕاسـتە شـەقام بەرچـاو ڕوون دەکـەی ﴿٥٢﴾ ڕێـی ئـەو خوایـەی هەرچـی لـە ئاسـمانەکان و زەوی دایـە، هـی ویـە، ئەهـا (بزانـن!) کاروبـارەکان تەنیـا بـەرەو لای خـوا دەچـن ﴿٥٣﴾}

## شیکردنەوەی وشەکان

(أَسْتَجِيبُواْ): (أَي: أَجِيْبُوا)، واتە: وەڵام بدەنەوە، (الإِسْتِجَابَةُ: التَّحَرِّي للجَوَابِ وَالتَهيُّوء لَهُ) وشەی (إِسْتِجَابَة): واتە خەفتان، مشوورخواردن و، خۆ ئامادەکردن بۆ وەڵامدانەوە، بەڵام دوایی هەر بە مانای خودی وەڵامدانەوەش هاتوە، واتە: بە دەم پەیامی خواوە بچن، بە دەم بانگەوازی خواوە بچن.

(مَرَدَّ): (المَرَدُّ: الرَدُّ، الرَدُّ كَالرَّجْعِ، وَالمَرَدُّ مَصْدَرٌ مِيْمِيٌّ بِمَعْنَى الرَدُّ، وَالرَدُّ: الدَّفْع)، وشەی (رَدّ) واتە: (رَجع) بە مانای گێڕانەوەیە، (مَردّ) یان چاوگێکی (مِيْمِي)یە، بە مانای (ردّ)، واتە: بەرپەرچدانەوە، یاخود ناوی شوێنە (مَرْجع) پەناگەو شوێنی پەنا بۆ بردن، وشەی (رَدّ)یش، بە مانای (رَجع) گێڕانەوەو بەرپەرچدانەوەیە.

(مَلْجَإٍ): (المَكَانُ الَّذِي يَصِيرُ إِلَيْهِ الإِنْسَانُ للتَوَقِّي فِيْهِ، المَلْجَأُ: مَكَانُ اللَّجْإ) (مَلْجَإ): ئەو شوێنەیە کە مرۆڤ بۆی دەچێ، تاکو لەوێدا پارێزراو بێ، خۆی پەنا بدات، خۆی چەپاڵە بدات، (مَلْجَأ) شوێنی (لَجأ)ە، (لجأ)یش، شوێنی پەنا پێبردن و سەرپێ بردنە.

(نَّكِيرٍ): (إِسْمُ مَصْدَرِ أَنْكَرَ) (أَنْكَرَ) واتە: نکوولیلێکرد، (نَكِير) ناوی چاوگەکەیەتی، یانی: (مَا لَكُمْ إِنْكَارٌ، لِمَا جُوزِيتُم بِهِ، وَلاَ يَسَعَكُمْ إِلاَّ الإِعْتِرَاف) واتە: ئەوەی پێی سزا دەدرێن، ناتوانن نکوولیی لێبکەن و، هیچ دەرفەتتان نیە، مەگەر دانانپێداهێنان، بە تاوانی خۆتان دا کە سزایەکی دیاریکراو بۆ ئەو خراپانەی ئێوە دانراوە، ئێوە ناتوانن نکوولیی لە خراپەکانی خۆتان بکەن، کە بە چەندان شێوە لەسەرتان تۆمار کراون.

(كَفُورٌ): (الكَفُورُ: المُبَالِغُ فِي كُفْرَانِ النِّعْمَةِ)، (کفور): کەسێك کە زێدەڕۆیی دەکات لە نادیدەگرتن و سپڵەیی کردن بەرانبەر بە چاکە، (الكُفْرُ فِي الدِّيْنِ أَكْثَرُ،

**وَالكُفْـرَان فِي النِّعْمَـة أكْـثَر**)، وشـەی (**كُفـور**): دەشـگونجێ بـە مانـای بێبڕوایـی بـێ، بـەڵام وشـەی (**كُفـر**) زیاتـر بـۆ بێبڕوایـی بەكاردەهێـنرێ، بـەڵام (**كُفْـرَان**) زیاتـر بـۆ سـپڵەیی بەكاردەهێـنرێ بەرانبـەر بـە چاكـەو نیعمەتـەكان.

(**يَهَبُ** ): (**الهِبَـةُ) أنْ تَجْعَـلَ المِلْـكَ للغَـيْرِ بِغَـيْرِ عِـوَضٍ**)، (**هِبَـة**): ئەوەیـە كـە تـۆ شـتێك بكـەی بـە موڵـكی كەسـێك بەبـێ قەرەبـوو و بەرانبـەر، واتـە: پێـی ببەخشـی، بـە كوردیـی دەڵێـن: بەخشـین، پێـدان.

(**عَقِـيمًا** ): (**أَصْـلُ العُقْـمِ: الْيُبْـس المَانِـعُ مِـنْ قُبُـول الأثَـر**)، (**عُقْـم**): لـە ئەصڵـدا بـە مانـای وشـكیی دێ، وشـكییەك وا بـكات شـوێنكە لەسـەر ئـەو شـوێنە دروسـت نەبـێ، بـۆ وێنـە: بەردێـكی وشـك شـوێنكەی لەسـەر پەیدانابـێ، بـەڵام (**عَقِيْـم**): لـە ئافرەتـان بـەو ئافرەتـە دەگوتـرێ: كـە تـۆوی نێرینـە وەرناگـرێ، یاخـود تێیـدا ناپیتێـنرێ و، نەزۆكـەو منداڵـی نابـێ.

(**يُزَوِّجُهُمْ** ): (**يَجْعَلُهُـمْ زَوْجَـاً، ذَكَـراً وَأُنْثَـى**) واتـە: دەیانكاتـە جـووت، نێـرو مـێ، كەواتـە: (**يُزَوِّجُهُـم**) لـەو سیاقەدا بـە مانـای ئـەوە نیـە هاوسـەرگیرییان بـۆ دەكات، بەڵكـو مەبەسـت ئەوەیـە (**يُقْـرِنُ الذُّكُـورَ وَالإنَـاثَ بَعْضَهُـم مَـعَ بَعْـض**) نێرینـەو مێنیـان پێكـەوە جـووت دەكات، كـوڕان و كچـان پێكـەوە دەدات بـە كەسـێك كـە بیـەوێ، جـاری وا هەیـە پێشـێ چەنـد كوڕێـكی دەداتـێ، دوایـی چەنـد كچێـك، یـان پێشـێ كچانیـان دەداتـێ، دوایـی كـوڕان، جـاری واش هەیـە دووانەیـان دەبـن، جـاری واش هەیـە كوڕێـك و كچێـك بـەو شـێوەیە، گرنـگ ئەوەیـە (**يُزَوِّجُهُـم ذُكْرَانَـاً وَإِنَاثَـاً**) واتـە: مێینـەو نێرینانیـان بـۆ جـووت دەكات، هەردووكیـان پێـدەدات.

(**رُوحًا** ): (**سُـمِّيَ القُـرْآنُ رُوحَـاً لِكَوْنِـهِ سَـبَبَاً للحَيَـاة الأُخْرَوِيَّـة**)، قوڕئـان بۆیـە ناونـراوە ڕووح، لەبـەر ئـەوەی هـۆكارە بـۆ ژیـانی ڕۆژی دوایـی، بەڵكـو لـە ڕاسـتییدا هـۆكارە بـۆ ژیـانی دنیـاش، مرۆڤـی بـڕوادارو شـوێنكەوتووی قوڕئـان هـەر لـە دنیـادا، قوڕئـان بـۆی دەبێتـە ڕووح و گیـان، جیـای دەكاتـەوە لـە مـردووان.

(صِرَٰطٍ): (الـصِّرَاطُ: الطَّرِيْـقُ المُسْـتَقِيْم) (صِرَاط): بـۆ خـۆی یـانی: ڕێـی ڕاسـت، ئنجا ئەگـەر وشـەی (مستقیم)یشـی، بخرێتـە سـەر، یانی: ڕێیـەکی زۆر ڕاسـت، وشـەی (صِرَاط) بـە (س)یـش، هاتـوە (سِراط).

(تَصِيرُ): (صَـارَ إلى كَـذَا: انْتَهَـى إلَيْـهِ، وَصَـارَ يصـير صـيرورةً: عِبَـارَةٌ عَـنِ التَنقُّـلِ مِـنْ حَـالٍ إلى حَـال)، (صَـارَ إلى كَـذَا) واتـە: چـوو بـۆ لای ئـەوە، (صَـارَ): بـوو (يصـير) دەبـێ چاوگەکـەی (صَيرُورة)یـە، (بـوون) (صَـارَ يَصِـيْرُ صَـيْرُورَةً وصَـيْرًا): (صـيرورة) گواستنەوەیە لـە حاڵێکـەوە بـۆ حاڵێکـی دیکـە.

(ٱلْأُمُورُ): (الأُمُـور: جَمْـعُ أَمْـر، وَالأَمْـرُ: الشَّـأْنُ وَمَصْـدَر أَمَرْتُـهُ: إذَا كَلَّفْـتَ أَنْ يَفْعَـل شَـيْئاً، وَهُـوَ لَفْـظٌ عَـام لِلأَفْعَـالِ وَالأَقْـوَال)، (أمُـور) کـۆی (أَمْـر)ە، (أَمْر)یـش، بـە مانـای حاڵەتـە (شَـأن) بـە کوردیـی هـەر پێـی دەگوتـرێ حـاڵ، یـان حاڵەتێـك کـە مـرۆڤ تێیدایـە، هەروەهـا وشـەی (أمْـر) چاوگـە بـۆ (أَمَرْتُـهُ) ئەگـەر کارێکـت بـە کەسـێك سپارد بیـکات، (أُمـور)، کۆیـە، (أَمْر) وشـەیەکی گشـتییە بـۆ کـردەوەو بـۆ قسـان بـە گشـتیی بەکاردەهێـنرێ.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خـوا ﷻ لـەم حـەوت ئایەتـەدا، حـەوت ڕاسـتیی گـەورەو گرنـگ دەخاتـەڕوو، دەیانکاتـە کۆتایـی ئـەم سـوورەتە موبارەکـە، سـەرەتا خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ ٱسْتَجِيبُوا۟ لِرَبِّكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِىَ يَوْمٌ لَّا مَرَدَّ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ ﴾، واتـە: ئـەی خەڵکینـە! وەڵامـی پەروەردگارتـان بدەنـەوە بـەر لـەوەی ڕۆژێـك بـێ لەلایـەن خـواوە گێڕانـەوەی بـۆ نیە. دەگونجـێ بانگکردنەکـە بـۆ خەڵکـی بـێ بـە گشـتیی، دەشـگونجێ مەبەسـت پێـی بێبڕوایـان و هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەران بـێ، چونکـە دوایـی دەفەرمـوێ: ﴿ مَا لَكُم مِّن مَّلْجَإٍ يَوْمَئِذٍ وَمَا لَكُم مِّن نَّكِيرٍ ﴾، ئێـوە لـە سـزای خـوا هیـچ پەناگەیەکتـان نیـە لـەو ڕۆژەداو، ناشـتوانن نکووڵیـی بکـەن لـە خراپەکانتـان، دەشـتوانین بڵێیـن: بانگکـراوان و فەرمـان پێکـراوان بـەوە کـە بگەڕێنـەوە بـۆ لای خـوا، یـان بـەدەم بانگی خـواوەو بچـن، مرۆڤەکانـن بـە گشـتیی، کـە بـە تەئکیـد ئـەو کاتـە مرۆڤـەکان، چ ئەوەی چاکـەکار بـێ، چ ئـەوەی خراپـەکار بـێ، بـڕوادارو بێبـڕوا، هیـچ کامیـان هیـچ پەنایـان نیـە، جگـە لـە پەنـای خـوا، هیـچ کەسـیش ناتوانـێ نکووڵیـی بـکات لـەوەی کردوویـەتی، ﴿ ٱسْتَجِيبُوا۟ لِرَبِّكُم ﴾، بـە دەم بانگـی پەروەردگارتانـەوە بچـن، ﴿ مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِىَ يَوْمٌ لَّا مَرَدَّ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ ﴾، بەرلـەوەی ڕۆژێـك بـێ کـە گێڕانـەوەی بـۆ نیـە، لـە لایـەن خـواوە، واتـە: خـوا نایگێڕێتـەوە، یاخـود: پێـش ئـەوەی ڕۆژێـك بـێ، لـە لایـەن خـواوە، گێڕانـەوەی بـۆ نیـە.

وشـەی (مَـرَدّ) دەگونجـێ بـە مانـای گێڕانـەوە (ردّ) بـێ، (الـردُّ: الرّجـع) بەرپەرچدانـەوە، گێڕانـەوە دەشـگونجێ (مَـرَدّ) نـاوی شـوێن بـێ، شـوێنی بـۆلا گەڕانـەوە، شـوێنی سـەرپێ بـردن و پەنـا بـۆ بـردن، بـەڵام زیاتـر واپێدەچـێ مەبەسـت پێـی بەرپەرچدانـەوە بـێ، چونکە دوایـی دەفەرمـوێ: ﴿ مَا لَكُم مِّن مَّلْجَإٍ يَوْمَئِذٍ ﴾،

لـەو ڕۆژەدا هیـچ پەناگەیەکتـان نیـە، ﴿ مَا لَكُم مِّن مَّلْجَإٍ يَوْمَئِذٍ ﴾، ئـەم (مِـن) ە، زیـاد کـراوە بـۆ تۆخکردنـەوەی بـێ پەنایـی و بـێ پەناگەیـی، واتـە: هیـچ جـۆرە پەناگەیەکتـان نیـە، هـەر لـە سـەرەتای پەناگانـەوە بگـرە تاکـو کۆتاییـان، ﴿ يَوْمَئِذٍ ﴾ واتـە: لـەو ڕۆژەدا، ئـەم تەنوینـە لـە شـوێنی ڕسـتەیەکە، واتـە: لـەو ڕۆژەدا ئـەوە ڕوودەدا، کـە ڕوو دەدات، ﴿ وَمَا لَكُم مِّن نَّكِيرٍ ﴾، ئێـوە لـەو ڕۆژەدا هیـچ نکووڵییکردنتـان نیـە.

دیسـان (مِـنْ)ی، سـەر (نَكِـيْر)، (زَائِـدَة للتأْكِيـد) بـۆ جەختکردنـەوە زیـاد کـراوە، هیـچ جـۆرە نکووڵییکردنێکتـان بـۆ نیـە، چونکـە هەمـوو شـتێکتان لەسـەر تۆمـار کـراوەو، شـایەدتان لەسـەر ڕادەگیرێـن و، هیـچ کـەس ناتوانـێ نکووڵیـی لـە هیـچ کردەوەیـەکی خـۆی بـکات.

﴿ فَإِنْ أَعْرَضُوا ﴾، ئنجـا ئەگـەر پشـتیان هەڵکـرد، یـان لاملیـان تێکـردی، ﴿ فَمَا أَرْسَلْنَاكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا ﴾، ئێمـە تۆمـان بـە پارێـزەر نەناردۆتـە سـەریان، واتـە: تۆمـان نەنـاردوە بیانپارێـزی لـە لادان و خراپـەو، ناچاریـان بکـەی بڕوابێنـن، ﴿ إِنْ عَلَيْكَ إِلَّا الْبَلَاغُ ﴾، (إِنْ) لێـرەدا بـۆ لابـردن (نَفِـي)ە، یـانی (مَـا عَلَيْـكَ) تـۆ هیـچ شـتێکت لەسـەر نیـە جگـە لـە گەیانـدن، تـۆ تەنیـا ئـەوەت لەسـەرە پەیامـی خوایـان پێبگەیـەنی، ﴿ وَإِنَّا إِذَا أَذَقْنَا الْإِنسَانَ مِنَّا رَحْمَةً فَرِحَ بِهَا ﴾، ئێمـە کاتێـك بەزەییـەك لـە لایـەن خۆمانـەوە بـە مـرۆڤ دەچێژیـن، زۆر پێـی شـادمان و دڵخـۆش دەبـێ، بـە پێـی سـیاق دەزانـرێ کـە لێـرەدا مەبەسـت لـە ئینسـان، مرۆڤـی بێبڕوایـە، چونکـە مرۆڤـی بێبڕوایـە کـە بەهـات و خۆشـیی و نیعمـەتی دنیـا، زۆر دڵخـۆش دەبـێ، ﴿ وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ ﴾، بـەڵام ئـەو مرۆڤـە بێبڕوایانە ئەگـەر خراپەیەکیـان بەسـەربێ، بـە هـۆی ئـەوەوە کە دەسـتەکانیان پێشـیان خسـتوە، واتـە: ئەگـەر دەرهاویشـتەی خراپـەو تاوانەکانـی خۆیـان بێتـە ڕێیـان و ملیـان بگـرێ، ﴿ فَإِنَّ الْإِنسَانَ كَفُورٌ ﴾، ئەوکاتـە ئینسـان، زۆر سـپڵەو پـێ نەزانـە، واتـە: ئینسـانی بێبـڕوا، ئـەو (أل)ە، کـە بـۆ ناسـاندنە، دەبـێ بـۆ (عهـد) بـێ، واتـە: مرۆڤەکـە، مرۆڤـە

بێبڕوایەکە، زۆر سپڵەو پێنەزانە، کاتێك بەڵایەکی بەسەردێ، ناشوکریی دەکات و سپڵەیی دەنوێنێ، وەك هەرگیز خۆشیی نەدیبێ.

ئنجا دێتە سەر باسی بابەتێکی دیکە: ﴿ لِّلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، حوکمڕانیی ئاسمانەکان و زەوی هی خوایە، وشەی (مُلْك) بە مانای حوکمڕانیی دێ و، بە مانای خاوەنداریێتیی دێ و، بە مانای باڵادەستیش دێ، بەڵام لێرەدا زیاتر مەبەست پێی باڵادەستیی و حوکمڕانییە، واتە: دەسەڵات و حوکمڕانیی ئاسمانەکان و زەوی هی خوایە، ﴿ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ ﴾، هەرچی بیەوێ دروستی دەکات، خوا هەر شتێکی بوێ، دروستی کردوەو دروستی دەکات، هیچ شتێك لە ویستی خوا ﷻ عاسێ نابێ، ﴿ يَهَبُ لِمَن يَشَآءُ إِنَٰثًا ﴾، {وێنەیەك دێنێتەوە لەو شتانەی دروستیان دەکات} دەفەرموێ: بە هەر کەسێك کە بیەوێ مێینانیان پێدەبەخشێ، (کچان) ﴿ وَيَهَبُ لِمَن يَشَآءُ ٱلذُّكُورَ ﴾، هەر کەسێکیش بیەوێ نێرینانیان پێدەبەخشێ، (کوڕان).

﴿ أَوْ يُزَوِّجُهُمْ ذُكْرَانًا وَإِنَٰثًا ﴾، یاخود بۆیان جووت دەکات، نێرینان و مێینان، واتە: کوڕان و کچانیان وێکڕا دەداتێ، ﴿ وَيَجْعَلُ مَن يَشَآءُ عَقِيمًا ﴾، هەر کەسێکیشی بوێ، نەزۆکی دەکات، نە کوڕی دەداتێ نە کچ، ﴿ إِنَّهُۥ عَلِيمٌ قَدِيرٌ ﴾، بە دڵنیایی خوا زۆر زانایەو زۆریش توانایە، دەزانێ بۆچی ئەو چوار جۆرە مامەڵەیە دەکات و، حیکمەتی چییە لەو چوار جۆرە مامەڵەیە لەگەڵ مرۆڤەکاندا! هەیانە تەنیا کچانی پێدەداو، هەیانە تەنیا کوڕانی پێدەداو، هەیانە کچان و کوڕانی پێدەدات و هەشیانە هیچیانی پێنادا، خوا بە تواناشە، ئەوپەڕی توانای هەیە، وەك چۆن ئەوپەڕی زانیاریی و حیکمەت و لێزانیی هەیە، ئەوپەڕی تواناو دەستەڵاتیشی هەیە.

ئنجا دێتە سەر بابەتێکی دی: ﴿ وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ ٱللَّهُ إِلَّا وَحْيًا ﴾، هیچ مرۆڤێك بۆی نیە خوا بیدوێنێ، مەگەر سروشی بۆ بکات، ﴿ أَوْ مِن وَرَآئِ حِجَابٍ ﴾، یان لە پشت پەردەوە قسەی لەگەڵ بکات و بیدوێنێ، ﴿ أَوْ يُرْسِلَ رَسُولًا ﴾، یاخود نوێنەرێك بنێرێ، ڕەوانەکراوێك بنێرێ، مەبەست پێی

فریشتەکانن، ﴿ فَيُوحِيَ بِإِذۡنِهِۦ مَا يَشَآءُ ﴾، ئەو کاتە بە مۆڵەتی وی هەرچی بیەوێ وەك پەیامێكی پەنهان دەیگەیەنێ، واتە: بەو پێغەمبەرە (عَلَيۡهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، کە خوا ویستوویەتی پەیامی خۆی بۆ بنێرێ، ﴿ إِنَّهُۥ عَلِيٌّ حَكِيمٌ ﴾، بە دڵنیایی خوا زانای کارزانە.

هەڵبەت ئێمە دوایی کورتە باسێك لەبارەی چۆنیەتی فەرمایشتکردنی خواوە، لەگەڵ مرۆڤەکاندا دەکەین، واتە: لەگەڵ پێغەمبەراندا (عَلَيۡهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، بۆیە لێرە هەروا بە کورتیی بەسەریدا دەڕۆین.

ئنجا خوا ﷻ باسی بابەتێکی دیکە دەکات: ﴿ وَكَذَٰلِكَ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ رُوحًا مِّنۡ أَمۡرِنَا ﴾، هەر بەو شێوەیە لەلایەن خۆمانەوە، ڕووحێكمان بۆ تۆ ناردوە، دیارە دوێنراو پێغەمبەری خاتەمە، ئەی موحەممەدا ﷺ لەلایەن خۆمانەوە ڕووحێكمان بۆ تۆ سروشکردوە، کە مەبەست پێی قورئانە، ﴿ مَا كُنتَ تَدۡرِي مَا ٱلۡكِتَٰبُ وَلَا ٱلۡإِيمَٰنُ ﴾، پێشتر نەتدەزانی نە کتێب چییەو نە ئیمانیش چییە؟ (کتاب): دەگونجێ هەر مەبەست پێی کتێب بێ، دەشگونجێ مەبەست پێی بەرنامە بێ، چونکە کتێبەکەش بەرنامەکەی لە نێودایە، واتە: تۆ نەتدەزانی نە بەرنامە چییە، چۆن دەبێ ئەو کۆمەڵگایە پاك و چاك بکرێ و بەڕێوەببرێ، هەروەها نەتدەزانی ئیمانیش چییە؟ ئیمان بە زاراوە شەرعییەکەی، نەك بەو واتایەی کە هەندێك لە زانایان ئیمانیان بە خواناسیی لێکداوەتەوە، لە ئەنجامی زاڵبوونی بیرۆکەی ئیلحادو، کێشەو مشتومڕ هەبوون لەبارەی بەدیهێنەرایەتیی و، پەروەردگارێتیی خواوە، ڕۆژگارێك بەسەر مسوڵماناندا هاتوە کە ئیمانیان لەوەدا کورت هەڵهێناوە، ئایا ئیعتیقادت بەوە کە خوا هەیە ﷻ یان نا؟ پێیان وا بووە هەر کەسێك ئیعتیقادی بەبوونی خوا هەبێ، مانای وایە ئیمانی هەیە! کە لە ڕاستییدا وانیە، ئەگەرنا پێغەمبەر ﷺ بەرلەوەی خواش نیعمەتی پێغەمبەرایەتیی و، وەحییشی پێ ببەخشێ، بە تەئکید پێغەمبەری خاتەم ﷺو، هەموو پێغەمبەران، هەر خواناس بوون، بەڵكو پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: {**مَا مِنْ مَوْلُودٍ إِلاَّ**

يُولَـدُ عَـلَى الْفِطْـرَةِ: فَأَبَـوَاهُ يُهَوِّدَانِـهِ، أَوْ يُنَصِّرَانِـهِ، أَوْ يُمَجِّسَـانِهِ}، (أخرجـه البخـاري: ١٢٩٢، ومسـلم: ٢٦٥٨، وأبـو داود: ٤٧١٤)، واتـە: هەمـوو منداڵێـك لەسـەر خوارِسـك لـە دایـك دەبـێ، (لەسـەر زگـماكی خواناسـیی)، بـەڵام دوایـی بـاب و دایـكی دەیكەنـە جوولەكـە، یـان دەیكەنـە نەصرانیـی، یـان دەیكەنـە مەجووسـیی.

چ جـای پێغەمبــەران (عَلَيْهِـمُ الصَّـلَاةُ وَالسَّـلَامُ)، كـە خـاوەنی پاكتریــن ڕووح و، چاكتریــن مەعــدەن و، تەواوتریــن زگــماك بــوون، كەواتــە: كــە دەفەرمــوێ: پێشــتر نەتـدەزانی نـە كتێـب چییـەو نـە ئیـمان چییـە؟ مەبەسـت ئـەوە نیـە كـە پێغەمبـەر خــوای نەناســیبێ، وەك بەداخــەوە زۆر لــە توێــژەرەوان وای لــێ تێگەیشــتوون، كــە دوایـی لـەو بـارەوە لەمەسـەلە گرنگەكانـدا ڕوونكردنـەوەی زیاتـر دەدەیـن، ﴿وَلَٰكِن جَعَلْنَٰهُ نُورًا﴾، بـەڵام ئێمـە گێڕامـان بـە ڕووناكییـەك، چیـمان گێـڕا بـە ڕووناكییـەك؟ واتـە: ئـەوەی كـە بـۆ تۆمـان كردۆتـە پەیـام، ئـەو پەیامـەو ئـەو قورئانەمـان گێـڕا بـە ڕووناكییـەك، (جَعَلْنَـه) ڕاناوەكـەی بـۆ قورئـان دەچێتـەوە، واتـە: ئێمـە ئـەو كتێبەمـان، ئـەو قورئانەمـان كـردە ڕووناكییـەك ﴿نَّهْدِى بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنْ عِبَادِنَا﴾، هـەر كەسـێك بمانـەوێ لـە بەندەكانمـان پێـی ڕاسـتەڕێ دەكەیـن، لێـرەدا (نهـدي) بـە مانـای ڕێـی پێشـان دەدەیـن، نیـە، چونكـە خـوا ویسـتوویەتی و ڕێـی پێشـانی هەمـوو خەڵـك داوە، (نهـدي) لێـرەدا بەمانـای: ڕاسـتەڕێ دەكەیـن، دەیخەینـە سـەر ڕاسـتەڕێ، ﴿وَإِنَّكَ لَتَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾، بـە دڵنیایـی تـۆش خەڵـك ڕێنمایـی دەكـەی بـەرەو ڕاسـتە شـەقام، لێـرەدا هیدایـەت بـە مانـای ڕێپێشـاندانە، نـەك بـە مانـای خسـتنە سـەر ڕاسـتەڕێ، چونكـە ڕاسـتەڕێ كـردن، تەنیـا بەدەسـت خوایـە، بەڵكـو ئـەركی پێغەمبـەر ﷺ تەنیـا ڕێـی ڕاسـت نیشـاندانە.

كەواتـە: هـەر لـەم ئایەتـە موبارەكـەدا وشـەی هیدایـەت، بـە دوو واتایـان هاتـوە، بـە مانـای ڕاسـتەڕێ كـردن، چونكـە هـەر خـوا دەتوانـێ خەڵـك ڕاسـتەڕێ بـكات و، بـە ئامانـج بگەیەنـێ، بـە مانـا مانـای ڕێ پێشـاندان، كـە ئـەوە ئـەركی پێغەمبـەرە ﷺ ڕێ پێشـانی خەڵـك بـدات.

ئنجا پێناسەی ﴿ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴾، دەكات، دەفەرموێ: ﴿ صِرَٰطِ ٱللَّهِ ٱلَّذِى لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، ڕاستەڕێ، کام ڕاستەڕێ؟ ڕێی ئەو خوایەی کە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە هی ئەوە، ﴿ أَلَآ إِلَى ٱللَّهِ تَصِيرُ ٱلْأُمُورُ ﴾، بزانن! تەنیا کاروبارەکان بەرەو لای خوا دەچن، سەرەنجامی هەموو کاروبارەکان دەگەڕێنەوە بۆ لای خوا.

کەواتە: ئێوەش ئەی مرۆڤەکان! خۆتان ئامادە بکەن، بۆ دیداری خوا ﷻ بزانن چۆن و بە چ شێوەیەك دەچنەوە خزمەتی؟ خوا لەو کەسانەمان بگێڕێ کە بەسەری بەرزو، بەڕووی سوورو، بەدەستی پڕو، توێشووی باشەوە، دەگەڕێنەوە بۆ خزمەت خوای پەروەردگاری جیهانییان.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**فەرمانکردنی خوا بە وەڵامدانەوەی پەیامەکەی و، ترس و بیم هەبوون لە ڕۆژی دوایی، کە خوا بەرپەرچی ناداتەوەو، بیبڕوایانیش هیچ پەنایەکیان نیەو نکووڵییش ناکەن لە خراپەکانیان، پاشان فەرمانکردن بە پێغەمبەر ﷺ کە ئەو پارێزەر نیە بەسەریانەوە، بەس گەیاندنی پەیامی خوای لەسەرە، ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییەش کە مرۆڤی بێبڕوا، بە هات و خۆشیی زۆر دڵخۆش و بوغڕا دەبێ و، بە نەهات و زیان و ناڕەحەتییانیش، زۆر سپڵەو ناشوکر دەبێ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ ٱسْتَجِيبُوا۟ لِرَبِّكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِىَ يَوْمٌ لَّا مَرَدَّ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَكُم مِّن مَّلْجَإٍ يَوْمَئِذٍ وَمَا لَكُم مِّن نَّكِيرٍ ﴿٤٧﴾ فَإِنْ أَعْرَضُوا۟ فَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا ۖ إِنْ عَلَيْكَ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ۗ وَإِنَّآ إِذَآ أَذَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِنَّا رَحْمَةً فَرِحَ بِهَا ۖ وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌۢ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ فَإِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ كَفُورٌ ﴿٤٨﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە نۆ بڕگەدا:

١)- ﴿ ٱسْتَجِيبُوا۟ لِرَبِّكُمْ ﴾، وەڵامی پەروەردگارتان بدەنەوە، (**إِسْتَجَابَة**) لە گەڵ (**إِجَابَة**) یەك واتایان هەیە، (**أَجَابَ**) یانی وەڵامی دایەوە، کەواتە: (**أَجِيبُوا**) وەڵامبدەنەوە، (**إِسْتَجِيبُوا**) یانی: وەڵام بدەنەوە، بەڵام جیاوازییان چییە؟ جیاوازییان ئەوەیە کە (**أَجِيبُوا**) (**س**) و (**ت**)ی، خراونە سەر، بۆ جەختکردنەوەیە، واتە: زۆر بەجیددیی و زۆر بە چاکیی بە دەم بانگەوازی پەروەردگارتانەوە بچن، ئەم (ل)ش کە دەفەرموێ: ﴿ ٱسْتَجِيبُوا۟ لِرَبِّكُمْ ﴾ دیسان بۆ جەختکردنەوەیە، وەك (**حَمَدْتُهُ**)، (**حَمَدتُ لَهُ**)، (**حَمَدْتُهُ**) واتە:

ستایشم کرد، بەڵام (**حَمَدتُ لَهُ**) واتە: ستایشم کرد، بەتایبەتی بۆ وی، لێرەش کە دەفەرمویٚ: ﴿ ٱسْتَجِيبُواْ لِرَبِّكُم ﴾ دەشیتوانی بفەرمویٚ: (**اِسْتَجِيبُوا رَبَّكُم**)، بەڵام ئەمە یانی: وەڵامێك بدەنەوە شایستەی پەروەردگارتان بێ و، بە دەم پەروەردگارتانەوە بچن، بە شێوەیەك کە شایستەی ئەو بێ، بە دڵنیاییش مەبەست لە بە دەم پەیامی پەروەردگارەوە چوون و، وەڵامی پەروەردگاردانەوە، ئەوەیە کە ئەو پەیامەی پێغەمبەرەکەی ﷺ پێیان دەگەیەنێ، بە دڵ و گیان لێی وەربگرن و، ئەوەی تێیدایە، جێبەجێی بکەن.

٢)- ﴿ مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ يَوْمٌ لَّا مَرَدَّ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ ﴾، بەرلەوەی ڕۆژێك بێ کە لەلایەن خواوە گێڕانەوەی بۆ نیە، یان: بەرلەوەی ڕۆژێك بێ لەلایەن خواوە، کە گێڕانەوەو بەرپەرچدانەوەی بۆ نیە. ﴿ لَّا مَرَدَّ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ ﴾ یانی:

أ/ (**لا رَدَّ لَهُ مِنَ الله**) خوا بەرپەرچی ناداتەوە.

ب/ (**لا رَدَّ لليوم الذي يأتِي مِنَ الله**) ئەو ڕۆژەی لەلایەن خواوە، دێ، بەرپەرچدانەوەی بۆ نیە.

وشـەی (**مَـرَدّ: مَصْـدَرُ مِيْمِـيٌّ بِمَعْنـى الـرَدّ**) (**مَـرَدّ**): چاوگێـکی میمییـە بـە مانـای (**رَدّ**)، (**رَدّ**)یـش، هـەم بـە مانـای گێڕانـەوە (**رجـع**) دێ، هـەم بـە مانـای بەرپەرچدانـەوەو لابـردن و پاڵپێوەنـان (**دفـع**) دێ، واتـە: ئـەو ڕۆژە کـە هـات لـە لایـەن خـواوە، بەرپەرچدانــەوەی بــۆ نیــە، چونکــە (لا) بــۆ (**نفــي الجنــس**)ە، یــانی: هیــچ جــۆرە بەرپەرچدانەوەیـەکی بـۆ نیـە، یاخـود: خـوا ئـەو ڕۆژەی کـە هێنـا، خـۆی بەرپەرچـی ناداتـەوە، سیسـتمی خوایـە، ئێسـتا دنیایـەو دوایـی ڕۆژی دواییـە، هـەر کام لـە شـتەکان لـە کاتی خۆیانـدا دێـن.

٣)- ﴿ مَا لَكُم مِّن مَّلْجَإٍ يَوْمَئِذٍ ﴾، لەو ڕۆژەدا هیچ پەناگەیەکتان بۆ نیەو، هیچ نکووڵییکردنیشتان نیە، (**مِنْ**) لە: ﴿ مَا لَكُم مِّن مَّلْجَإٍ ﴾ کە زیادکراوە بۆ تۆخ کردنەوەی ئەوەیە کە هیچ جۆرە پەناگەیەك نیە، واتە: هەر لە سەرەتای پەناگانەوە بگرە تاکو کۆتایی، هەروەها (**مِن**)ی ﴿ مِّن نَّكِيرٍ ﴾، دیسان ئەویش بۆ جەختکردنەوە زیادکراوە (**زائدة للتأكيد**) واتە: هیچ جۆرە نکووڵییکردنێکتان بۆ نیە، نە کەم نەزۆر،

(مَلْجَأ): شوێنی (لجأ)ە، (لجأ)یش، بریتیە لەوەی مرۆڤ بەرەو شوێنێك بچێ، کەواتە: (مَلْجَأ) پەناگە، ئەو شوێنەیە کە مرۆڤ بۆی دەچێ تاکو لەوێدا خۆی بپارێزێ و خۆی پەنا بدات.

٤)- ﴿وَمَا لَكُم مِّن نَّكِيرٍ﴾، هیچ جۆرە نکوولّییکردنێکتان بۆ نیە، بۆ ئەوەی پێی سزا دەدرێن، هیچ بوارتان نیە، مەگەر دان پێداهێنان بەبێ لاملیی، وشەی (إنْكَار) بە مانای بەرپەرچدانەوەش دێ، دەگوترێ: (أَنْكَرْتُ: إِذَا فَعَلْتَ بِهِ فِعْلاً يَرْدَعُهُ)، (أَنْكَرْتُ عَلَيْهِ) واتە: بەرپەرچم دایەوە، شتێکم کرد ئەو بەرپەرچ بدرێتەوەو بگەڕێتەوە، واتە: ئێوە هیچ جۆرە نکوولّییکردنێکتان بۆ نیەو، ناچارن دان پێدا بێنن، یاخود هیچ جۆرە بەرپەرچدانەوەیەکتان بۆ نیە، چونکە (أَنْكَرْتُ عَلَيْهِ) واتە: نەمهێشت بیکات، یان: ڕەخنەم لێگرت، بە مانای ڕەخنەلێگرتن دێ و، بە مانای دەستگرتن و نەهێشتنیش دێ، فەرمان بە چاکەو ڕێگریی لە خراپە، ڕێگرییەکە جاری وایە بە قسەیەو، جاری وایە بە دەستە، وەك لەم فەرمایشتەدا هاتوە: {مَنْ رَأَى مِنْكُمْ مُنْكَرًا فَلْيُغَيِّرْهُ بِيَدِهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِلِسَانِهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِقَلْبِهِ، وَذَلِكَ أَضْعَفُ الْإِيمَانِ}، (أخرجه مسلم: ٤٩، وأبو داود: ١١٤٠، والترمذي: ٢١٧٢، وَالنَّسَائِي: ٥٠٠٨، وابن ماجه: ٤٠١٣) واتە: هەر کامێك لە ئێوە خراپەیەکی بینی با بە دەست نەیهێڵێ، ئەگەر نەیتوانی بە زمانی، ئەگەر نەیتوانی بە دڵێ و، ئەوەش بێهێزترینی بڕوایە.

٥)- ﴿فَإِنْ أَعْرَضُوا فَمَا أَرْسَلْنَاكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا﴾، ئنجا ئەگەر هەر پشتیان هەڵکردو ڕوویان وەرگێڕا، ئێمە تۆمان نەناردوە بەسەریانەوە پارێزەر بی، واتە: تۆ کەمتەرخەم نی لە بەرانبەر ئەواندا، تۆ پەیامی خوات پێگەیاندوون، ئنجا کە ئەوان ڕێی ڕاست ناگرن، بەرپرسیارییەتەکە لە ئەستۆی تۆدا نیە، ئەمە دڵدانەوەی پێغەمبەر ﷺ و هەر کەسێکە کە لە ڕێی پێغەمبەرەوە دەچێ و، پەیامی خوا بە ڕوونیی بە خەڵك دەگەیەنێ.

٦)- ﴿إِنْ عَلَيْكَ إِلَّا الْبَلَاغُ﴾ تۆ جگە لە گەیاندن هیچی دیکەت لەسەر نیە. (إِنْ) لێرەدا بە مانای (مَا)یەو بۆ لابردن (نفي)ە، واتە: تۆ هیچت لەسەر نیە: (مَا عَلَيْكَ) هیچ شتێکت لەسەر نیە، ﴿إِلَّا الْبَلَاغُ﴾ جگە لە گەیاندن، (البَلَاغ: التَّبْلِيغ) پێڕاگەیاندن.

٧)- ﴿ وَإِنَّآ إِذَآ أَذَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ مِنَّا رَحۡمَةٗ فَرِحَ بِهَا ﴾، ئێمە هەر كاتێك بەزەییەكمان لە خۆمانەوە بە مرۆڤ چێژت، زۆر پێی دڵخۆش دەبێ، (إِذَا) لێرەدا: **(تَدُلُّ عَلَى تَحَقُّقِ كَثْرَةِ وُقُوعِ شَرْطِها، بِخِلَافِ «إِنْ» فهي تَدُلّ عَلى نَدْرَةِ وُقُوعِهِ)** وشەی (إذَا) كاتێك دەچێتە سەر شتێك، مانای وایە مەرجەكەی زۆر دێتەدی، ﴿ وَإِنَّآ إِذَآ أَذَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ مِنَّا رَحۡمَةٗ ﴾، ئێمە هەركات بەزەیی خۆمان بە مرۆڤ چێژت، یانی: زۆرجار پێی دەچێژین، بەڵام (إِنْ) بەدەگمەن مەرجەكەی دێتەوی، ﴿ وَإِن تُصِبۡهُمۡ سَيِّئَةُۢ ﴾ ئەگەر خراپەو ناخۆشییەكیان بە سەرهات...

﴿ فَرِحَ بِهَا ﴾، زۆر پێی دڵخۆش دەبێ، **(الفَرَحُ: السُّرُورُ الشَّدِيْدُ، لِذَا لَمْ يَأْتِ فِي القُرْآنِ إِلاَّ مُقْتَرِنَاً بِالذَّمِّ)** وشەی (فَرَح) واتە: دڵخۆشیی زۆر، زۆر شادمان بوون، هەر بۆیە لە قورئاندا بە زۆریی لە حاڵەتی زەمدا هاتوە: ﴿ لَا تَفۡرَحۡۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡفَرِحِينَ ٧٦ ﴾القصص، لە زۆر شوێندا خوا زەمی كافرەكانی كردوە كە بە دنیاو نیعمەت و خۆشییەكانی زۆر دڵخۆش دەبن، تەنیا لە حاڵێكدا، زۆر دڵخۆشبوون باشە، كە پەیوەندیی بە پاداشتی خواوە، یان شتی مەعنەوییەوە هەبێ، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ بِفَضۡلِ ٱللَّهِ وَبِرَحۡمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلۡيَفۡرَحُواْ هُوَ خَيۡرٞ مِّمَّا يَجۡمَعُونَ ٥٨ ﴾یونس، هەروەها دەفەرموێ: ﴿ وَيَوۡمَئِذٖ يَفۡرَحُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٤ بِنَصۡرِ ٱللَّهِۚ ٥ ﴾الروم، ئەو شتانەی كە پەیوەندییان بە خواوە هەیە، بە لایەنی مەعنەوییەوە، پاداشتی ڕۆژی دوایی، شایستەی ئەوەن مرۆڤ زۆر دڵی پێخۆشبن.

لێرەدا كە دەفەرموێ: ئێمە هەركات بەزەییمان لە خۆمانەوە بە مرۆڤ چێژت، لێرەدا مەبەست مرۆڤی بێبڕوایە، كە لە كاتی هات و نیعمەتدا، زۆر دڵخۆش دەبێ و پێی بوغراو لە خۆبایی دەبێ.

٨)- ﴿ وَإِن تُصِبۡهُمۡ سَيِّئَةُۢ بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيهِمۡ ﴾ بەڵام ئەگەر خراپەیەكیان بەهۆی كردەی دەستیانەوە تووش بوو، (إن) ئەوە دەگەیەنێ ئەو شتە كەمتر بێتەدی، بەڵام (إذا) بۆ شتێكە كە زیاتر بێتەدی، بۆیە بۆ پێشخستنی خۆشیی و ڕەحمەت (إذا)ی،

بەکارهێناوە، بەڵام بۆ تووشبوونی ناخۆشیی و بەڵا (إن) بەکارهێناوە: ﴿ وَإِن تُصِبۡهُمۡ سَيِّئَةُۢ ﴾، یانی: ئەگەر جارێك لەجاران خراپەیەکیان بەسەرهات، ﴿ بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيهِمۡ ﴾، ئەویش بەهۆی ئەوەوە کە دەستەکانیان پێشیانخستوە.

٩)- ﴿ فَإِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ كَفُورٞ ﴾، ئەوە مرۆڤ (واتە: مرۆڤی بێبڕوا) زۆر سپڵەیەو پێ نەزانە، لێرەدا بە تەئکید ناتوانین بڵێین: (أل) سەر (الإنْسان) بۆ (جنس)ەو مەبەست پێی هەموو مرۆڤەکانن، چونکە مرۆڤانی بڕوادار کاتێك خوا بەزەییەکی خۆییان پێدەچێژێ و، چاکەیەکیان بۆ دێنێتە پێش، ستایشی خوای لەسەر دەکەن و دڵخۆش دەبن، بە بەزەیی خوا، نەك بە خودی نیعمەتەکە، ئەگەر بەڵاو ناڕەحەتییەکیشیان بەسەر بێ، ئەوان لە جیاتی ئەوەی سپڵەیی بکەن بەرانبەر بە خوا، بە خۆیاندا دەچنەوە، چاو بە خۆدادەگێڕنەوەو دەزانن ئەوە سزای خراپەیەك لە خراپەکانیانەو، دەرهاویشتەی کردەوە خراپەکانی خۆیانە، بۆیە (أل) سەر (الانْسَان) یان دەبێ بڵێین: (أل)ی (عهد)ە، واتە: مرۆڤە بێبڕوایەکان، یاخود ئەگەر بڵێین: بۆ سەرجەم (جنس)ە، واتە: سەرجەم مرۆڤە بێبڕوایەکان، بەو شێوەیەن.

## مەسەلەی دووەم:

**ڕاگەیاندنی حوکمڕانیی و دەسەڵاتداریی ڕەهای خوا بۆ ئاسمانەکان زەوی (گەردوون) کە هەرچی بیەوێ، دەیخوڵقێنێ، کچان یان کوڕان بە تەنیا، یان وێکڕا بە هەر کەس بیەوێ دەبەخشێ و، هەندێك کەسیش نەزۆك دەکات و هیچی پێنادات، خواش خاوەنی ئەوپەڕی زانایی و توانایییە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ لِّلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ ۚ يَهَبُ لِمَن يَشَآءُ إِنَٰثًا وَيَهَبُ لِمَن يَشَآءُ ٱلذُّكُورَ ﴿٤٩﴾ أَوْ يُزَوِّجُهُمْ ذُكْرَانًا وَإِنَٰثًا ۖ وَيَجْعَلُ مَن يَشَآءُ عَقِيمًا ۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٌ قَدِيرٌ ﴿٥٠﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿ لِّلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، (**المُلْكُ: السُّلْطَان وَالحُكْمُ**): (**ملك**) بریتیە لە دەسەڵات و حوکمڕانیی، خاوەنی (**إعراب القرآن**) ئاوا پێناسەی (**مُلْك**) دەکات: (**المُلْكُ بِالضَمّ: الإِسْتِيلَاء عَلَى الشَّيء وَالتَّصَرُّفِ بِهِ حَسْبُ المَشِيْئَة**)[1]، وشەی (**مُلْك**) بە بۆر، بریتیە لە دەسەڵات ڕانواندن بەسەر شتێکداو، دەستتێوەردانی بە پێی ویست و خواست، بەڵام (**مِلْك**) بە ژێری میمەکە، یانی: شت هەبوون، (**مُلْك**)یش یانی: دەسترۆیشتوویی و حوکمڕانیی، ﴿ لِّلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، واتە: حوکمڕانیی و باڵادەستیی لە ئاسمانەکان و زەویدا هی خوایە ﷻ.

٢)- ﴿ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ ﴾، هەرچی بیەوێ دروستی دەکات، یانی: هەرچی بیەوێ دروستی بکات، دروستی دەکات، هیچ شتێك لە بەر ویستی بێ سنووری خوا ﷻ عاسێ نابێ، ئنجا خوا ﷻ نیشانەیەك لە بێسنووریی دەسەڵاتی خۆی، هەروەها دەسترۆیشتوویەتیی خۆی، دەخاتەڕوو، دەفەرموێ:

---

(١) ج٩، ص٥١ و٥٢.

٣)- ﴿يَهَبُ لِمَن يَشَآءُ إِنَٰثًا﴾، هەر کەسێك بیەوێ، مێینانی پێدەبەخشێ.

٤)- ﴿وَيَهَبُ لِمَن يَشَآءُ ٱلذُّكُورَ﴾، هەر کەسێکیش بیەوێ، نێرینانی پێدەبەخشێ.

زانایـان لـەو بـارەوە قسـەیان کـردوە، بۆچـی خـوا ﷻ مێینـە (کچـان)ی پێشخسـتوون؟ دەڵێـن: (قَـدَّمَ الإنَـاث لإثْبَـاتِ طَلَاقَـة القُـدَرةِ الحَكِيْمَـة، أو تَكْرِيْمـاً لَهُـنَّ)، دەگونجـێ لەبـەر دوو هـۆکاران مێینـەی پێشخسـتبێ،

**یەکەم:** بۆ ئیسپات و سەلماندنی ئەوە کە دەستەڵاتی کاربەجێیانەی خوا، هیچ کۆت بەندێکی لەسەر نیە، ئنجا لەبەر ئەوەی عورفی کۆمەڵگاکان بە زۆریی وایە بوونی کوڕیان پێخۆشترە، خوا کچی پێشخستوون، واتە: ئەوەی کە ئێوە پێتان خۆش نیەو، بەهەڵەشدا چوون، ئەوەتان پێ دەدا!!

**دووەم:** ئەوە وەك ڕێزگرتنە لە ئافرەتان، بۆیە ئافرەتانی پێشخستوون، لەبەر ئەوەی لە زۆربەی کۆمەڵگاکاندا وەك پێویست ڕێز لە ئافرەتان ناگیرێ، بە تایبەت ئەوانەی زۆر باسی ئافرەت دەکەن، (فیمینیستەکان) ئەوانە زیاتر سووکایەتیی بە ئافرەت دەکەن، وەك کاڵایەکی بازرگانیی، وەك ئامرازێکی ڕابواردن، تەماشای دەکەن، لە ڕاستییدا پێهەڵداگوتنەکەیان، زیاتر صابوون لە بنی پێدانیانەو کڵاو لەسەر نانیانە، کێت بینی زۆر بە ئافرەتاندا هەڵدەڵێ، دوایی تەماشای بکەو لێی وردبەوە، زۆر بە سووکیی تەماشای ئافرەت دەکات، وەك ئامرازێك کە پێی ڕابوێرێ، تەماشای دەکات، بۆیە پێی خۆشە ڕووتی بکاتەوە، پێی خۆشە ئەو ئافرەتە مێینایەتیی خۆی زیاتر دەربخات، نەك وەك مرۆڤێك بێتە بەرچاو!!

بـەڵام ئیسـلام دەیـەوێ ئافـرەت وەك مـرۆڤ بێتـە بەرچـاو، بۆیـە دەڵـێ: دەبـێ فـڵان پۆشـاکە لەبەربکـەی و، بـەو شـێوەیە هەڵسـوکەوت بکـەی، ئەو سـنوورانەی شـەریعەت دایاندەنـێ بـۆ ئافـرەت، بـۆ ڕێزلێگرتنـی ئافرەتـە، بـۆ دەرکەوتنـی ئافرەتـە وەك مرۆڤێـك، نـەك وەك مێینەیـەك، بـەڵام ئەوانـەی بەئافـرەت هەڵدەڵێـن، بـە تایبـەتی لـە\ ڕۆژگاری ئێسـتاماندا، دەیانـەوێ حەیـاو حیشـمەتی لـێ دابڕنـن و لـە بـەرگ و پۆشـاك دایبڕنـن

و ڕووتی بکەنـەوە، لەبـەر ئـەوەی تەنیـا وەك مێینەیـەك تەماشـای دەکـەن، وەك چـۆن دڕنـدە تەماشـای نێچیـر دەکات، ئەوانیـش ئـاوا تەماشـای ئافـرەت دەکـەن!!

٥)- ﴿ أَوْ يُزَوِّجُهُمْ ذُكْرَانًا وَإِنَاثًا ﴾، یاخود بۆیان جووت دەکات، نێرینان و مێینان، واتە: بە جووتە دەیانداتێ، هەم کوڕان و هەم کچان، (االتَّزْوِيجُ: هَا هُنَا هُوَ الْجَمْعُ بَيْنَ الْبَنِينَ وَالْبَنَات، تَقُولُ الْعَرَبُ: زَوَّجْتُ بين إبلي، إذَا جَمَعَ بَيْنَ الْكِبَارِ وَالصِّغَارِ) (تزْوِيج): لێرەدا کۆکردنەوەی کوڕان و کچانە پێکەوەو جووتکردنیانە، عەڕەب دەڵێن: (زَوَّجْتُ بَيْنَ إبلِي) حوشترەکانم جووت کردن، ئەگەر حوشترە گەورەو بە تەمەنەکان و بێچوو و کەم تەمەنەکانی پێکەوە هێنان.

(التَّزْوِيجُ: قَرْنُ الشَّيْءِ بِشَيْءٍ آخَرَ فَيَصِيرَانِ زَوْجَاً) (تَزْوِيج): بریتیـە لـە جووتکـردنی شـتێك لەگـەڵ شـتێکی دیکـەدا، هەردووکیـان پێیـان دەگوتـرێ: زەوج، بـۆ وێنـە: جووتـە پێـڵاو پێیـان دەگوتـرێ: (جـووت) (زَوجُ النَّعْلَيْن) بـە هـەر کامێکیـان دەگوتـرێ: زەوج، نـەك بـە هەردووکیـان ئنجـا پێیـان بگوتـرێ: زەوج، ژن و مێردیـش بـە هەردووکیـان دەگوتـرێ: زەوج، وەك خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَقُلْنَا يَـٰٓـَٔادَمُ ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ ﴿٣٥﴾ ﴾البقـرة، هـەم ئافـرەت پێـی دەگوتـرێ زەوج، هـەم پیاویـش پێی دەگوتـرێ زەوج.

کەواتـە: ﴿ أَوْ يُزَوِّجُهُمْ ذُكْرَانًا وَإِنَاثًا ﴾، واتـە: بۆیـان جـووت دەکات، نێرینـان و مێینـان پێکـەوە دەیانداتـێ.

٦)- ﴿ وَيَجْعَلُ مَن يَشَآءُ عَقِيمًا ﴾، هەر کەسێکیش بیەوێ نەزۆکی دەکات، (العَقِيْمُ: الَّذِي لاَ يُولَدُ لَهُ، رَجُلاً كَانَ أو امْرَأَةً) (عَقِيْم) واتە: نەزۆك، ئەوەیە کە منداڵی نەبێ، ئنجا چ پیاو بێ چ ئافرەت، بەڵام هەندێکیان دەڵێن: بە تایبەت بۆ ئافرت بەکاردێ، ﴿ قَالَتْ يَـٰوَيْلَتَىٰٓ ءَأَلِدُ وَأَنَا۠ عَجُوزٌ وَهَـٰذَا بَعْلِى شَيْخًا ﴿٧٢﴾ ﴾هود، گوتی: ئەی هاوار بۆ من! ئایا منداڵم دەبێ کە ئافرەتێکم بوومە پیرەژن و، ئەمەش مێردەکەمە پیرە؟! بەڵام وشەی (عَقِيم) کە لێرە خوای بەرز هێناویەتی واتە: نەزۆك و بێ وەچە، بێ وەجاخ، ئەوکاتە هەردووکیان دەگرێتەوە، بەڵام کە بڵێی: نەزۆك هەر ئافرەت دەگرێتەوە، چونکە بەس ئافرەتە تۆلی دەبێ و حەملی دەبێ.

٧)- ﴿إِنَّهُۥ عَلِيمٌ قَدِيرٌ﴾، بە دڵنیایی خوا زانای توانایە.

لێرەدا زانایان قسەیان کردوە لەوبارەوە کە بۆچی خوا ﷻ باسی جۆرێکی دیکە لە مرۆڤانی نەکردوە؟ چونکە مرۆڤ نێری هەیەو مێی هەیە، بەڵام جۆرێکی دیکەشی هەیە پێی دەگوترێ: نێرەمووك (**خُنْثَى**) نە نێرەو نە مێ، نێرەمووك، هەندێك لە زانایان دەڵێن: بۆیە خوا لە قورئاندا باسی نەکردوە، چونکە دەگمەنە، یانی: لە سەدان مرۆڤ و لە هەزاران، یەکێکیان وا دەردەچێ کە بەو شێوەیە بێ و ئەوانیش جۆراو جۆرن.

**(القرطبي)** لە **(إبن العربي)** دەیهێنێ کە گوتوویەتی: **(وَقَدْ أَنْكَرَ قَوْمٌ مِنْ رُءُوسِ الْعَوَامِّ وُجُودَ الْخُنْثَى بِدَلِيلِ عَدَمِ ذِكْرِه)**[1]، واتە: خەڵکێك لە عەوامان، بوونی نێرەمووك (**خُنْثَى**)یان، نکووڵیلێکردوە، لەبەر ئەوەی باس نەکراوە!

بەڵام لە ڕاستییدا ئەو قسەیە هیچ نیەو لە واقیعدا هەیە، کەسانێك هەن وان، ئنجا ڕەنگە هەبێ بە لای ئافرەتایەتییدا بشکێتەوەو، هەیە بە لای پیاوەتییدا بشکێتەوەو، هەیە هەردووك لای وەك یەك و یەکسانن.

لەو بارەشەوە ئەمە دەقە هاتوە، **{عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ جَسْرٍ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ مَعْقِلٍ وَأَشْيَاخَهُمْ يَذْكُرُونَ: أَنَّ عَلِيًّا** ﷺ، **سُئِلَ عَنِ الْمَوْلُودِ: لَا يُدْرَى أَرَجُلٌ أَمْ امْرَأَةٌ؟ فَقَالَ عَلِيٌّ: يُوَرَّثُ مِنْ حَيْثِ يَبُولُ } (أخرجه: البيهقي: ١٢٢٩٤، وابن أبي شيبة: ٣١٣٦٤، والدارمي: ٣٠١٢، وَصَحَّحَهُ الألباني في الإرواء تحت حديث: ١٧١٠)**.

واتە: عەلی ﷺ پرسیاری لێکرالە بارەی منداڵێکەوە، کە هەم ئەندامی نێرینەی هەیە، هەم هی مێینەی هەیە؟ (ئایا چۆن میراتی دەدرێتێ؟) گوتی: لە کوێوە میز دەکات؟ (واتە: لە هەر کامیانی میزی کرد حوکمی ئەوەیان هەیە).

---

(١) التحرير والتنوير: ج١٦، ص٤٢.

نێرەمووك (خُنْثَى) ئەوەیە كە هەردوو ئەندامی نێرینەو مێینەی هەبن، بەڵام خوا ﷻ باسی نەكردوە لەبەر ئەوەی حاڵەتێكی دەگمەنە، بەڵام زانایان لە كتێبە فیقهییەكاندا زۆر قسەیان كردوە، چونكە نێرەمووك (خُنْثَى): چەند حاڵەتێكی هەن، هەیە حاڵەتی مێینەكەی بەهێزترەو، هەیە حاڵەتی نێرینەكەی بەهێزترە، هەشە هەردووكی وەك یەكن و پێی دەگوترێ: (خُنْثَى مُشْكل) لە كتێبە فیقهییەكاندا لەو بارەوە زۆر قسە كراوە.

### مەسەلەی سێیەم:

**خوا ﷻ تەنیا بەسێ شێوازان پەیامی تایبەتیی خۆی بۆ مرۆڤە هەڵبژاردەکان، بۆ پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، دەنێرێ: دواندنی پشت پەردەو، خستنە نێو دڵ و، نێردراویی فریشتە ناردن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ اللَّهُ إِلَّا وَحْيًا أَوْ مِن وَرَآئِ حِجَابٍ أَوْ يُرْسِلَ رَسُولًا فَيُوحِيَ بِإِذْنِهِ مَا يَشَآءُ إِنَّهُ عَلِيٌّ حَكِيمٌ ﴿٥١﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ اللَّهُ إِلَّا وَحْيًا أَوْ مِن وَرَآئِ حِجَابٍ أَوْ يُرْسِلَ رَسُولًا﴾، هیچ مرۆڤێك بۆیە نیە خوا بیدوێنێ، مەگەر بەپەنامەکیی (بیخاتە نێو دڵ). مەبەست لە دواندنی خوا ﷻ و فەرمایشتکردنی، گەیشتنی مەبەستی خوایە بە پێغەمبەر ﷺ، ئنجا ئەو گەیشتنە، چ بە هۆی قسەیەکەوە بێ کە ئەو پێغەمبەرە دەیبیستێ، وەك مووسا ﷺ فەرمایشتی خوای بیست: ﴿وَكَلَّمَ اللَّهُ مُوسَىٰ تَكْلِيمًا ﴿١٦٤﴾﴾النساء، یاخود بە هۆی قسەیەکەوە بێ کە فریشتە لە لایەن خواوە دەیگەیەنن بە پێغەمبەر ﷺ، یاخود زانیارییەك بێ بخرێتە دڵی ئەو پێغەمبەرەوە ﷺ، ئەویش دڵنیایی (یقین)ی بۆ پەیدادەبێ، کە ئەو زانیارییە خوا بۆی ناردوە. تەنیا لەو سێ ڕێیەوەیە، خوا پەیامی خۆی بۆ پێغەمبەران ناردوە:

أ- ﴿إِلَّا وَحْيًا﴾، مەگەر سروشی بۆ بکات، یانی: بیخاتە نێو دڵ.

ب- ﴿أَوْ مِن وَرَآئِ حِجَابٍ﴾، یان لە پشت پەردەوە، واتە: ڕاستەوخۆ خوا بیدوێنێ، بەڵام لە پشت پەردەوەو خوا نابینێ.

ج)- ﴿أَوْ يُرْسِلَ رَسُولًا﴾، یاخود ڕەوانەکراوێك بنێرێ، نێردراوێك بنێرێ، کە فریشتەیە.

٢)- ﴿فَيُوحِيَ بِإِذْنِهِ مَا يَشَآءُ﴾، (فَيُوحِي: يُبَلِّغُ وَيُوصِلُ بإذْنِ الله) ئنجا بە مۆڵەتی خوا پێڕابگەیەنێ و بگەیەنێ.

٣)- ﴿إِنَّهُۥ عَلِيٌّ حَكِيمٞ﴾، بە دڵنیایی خوا زۆر بەرزەو، زۆریش کارزانە، بەرزیی خوا بێسنوورەو، کاربەجێیی خواش ﷻ بێسنوورە.

وەحیی لە ڕووی زمانەوانیەوە: (الوَحي: الإشَارَةُ الخَفِيَّةُ، ويُطْلَقُ عَلَى مَا يَجِدُهُ المَرْءُ فِي نَفْسِهِ دَفْعَةً كَحُصُولِ مَعْنَى الكَلَامِ فِي نَفْسِ السَّامِعِ) (وَحي): بە مانای ئاماژەیەکی پەنهان دێت، هەروەها بۆ ئەوەش بەکاردەهێنرێ کە مرۆڤ زانیارییەك لە دڵی خۆیدا هەست پێدەکات، وەك چۆن کەسێك قسەیەك دەبیستێ، یەکسەر مانایەکەی دێتە نێو دڵیەوە، ئەویش ئاوا مانایەکی دێتە نێو دڵەوە، ئەوە پێی دەگوترێ وەحیی، واتە: پێگەیاندنێکی پەنهان.

شایانی باسە: ئێمە لە مەووسوعەی: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله) لە: (الكتاب الخامس)دا لە ژێر ناونیشانی: (بَحْثٌ حَوْلَ الوَحي)دا، باسێکی دوورودرێژمان لەوبارەوە کردووە، لەتەفسیری سوورەتی (یونس)یشدا، کورتە باسێکمان لە بارەی وەحییەوە هێناوە، کە بریتیە لە گوشراو و خوڵاسەی ئەو باسەی لە مەوسووعەی: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله)دا هاتوە.

ئێستاش بە چاکی دەزانم، کورتە باسێك لە بارەی {فەرمایشتکردنی خواوە ﷻ} بخەینە ڕوو، بەرلەوەی بێینە سەر مەسەلەی چوارەم و کۆتایی، ئەم کورتە باسە دەخەینەڕوو، کە فەرمایشتکرنی خوا و قسە فەرمووونی خوا ﷻ، چۆنە؟

## کورتە باسێک لە بارەی فەرمایشتکردنی خواوە

بەڕێـــزان !

ئەم کورتە باسە لە چوار بڕگەدا دەخەینە ڕوو:

**بڕگـەی یـەك:** فەرمایشـتکردنی خـواو گەیانـدنی پەیامەکـەی بـە پێغەمبـەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلَام**)، سـێ شـێوازی سـەرەکیی هـەن، وەك ئـەو ئایەتـە موبارەکـە دەیگەیەنـێ: ﴿ وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ اللَّهُ إِلَّا وَحْيًا أَوْ مِن وَرَاءِ حِجَابٍ أَوْ يُرْسِلَ رَسُولًا فَيُوحِيَ بِإِذْنِهِ مَا يَشَاءُ إِنَّهُ عَلِيٌّ حَكِيمٌ ﴾، واتـە: هیـچ مرۆڤێـك بـۆی نیـە خـوا بیدوێنـێ، مەگـەر بـە سروشـکردن، یـان لـە پشـت پـەردەوە، یـان نوێنەرێـك دەنێـرێ بـە مۆڵـەتی وی ئـەوەی بیـەوێ سروشی دەکات، بێگومـان ئـەو بـەرزی کارزانە.

**شـێوازی یەکـەم:** کـە دەفەرمـوێ: (**إلاَّ وَحْيَاً**) (**أي: كَلامَـاً وَحْيَـاً، أي: مُوحـى بـهِ**) یـانی: قسـەیەکی وەحیـی، بـە وەحیـی نێـرراو، یەکێـك دەڵـێ: (**لا أُكَلِّمُـهُ إلَّا جَهْـرَاً، أو إخْفَاتـاً**) قسـەی لەگـەڵ ناکـەم مەگـەر بەدەنگـی بـەرز یـان بـە دەنگـی نـزم، دەڵـێ: (**لأَنَّ الجَهْـرَ وَالإخْفَـات صفَتَـانِ للـكَلَام**)، چونکـە هـەر کام لـە دەنـگ هەڵێنـان و دەنـگ کپکـردن، سـیفەتی قسـەکردنن، کەواتـە: کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ اللَّهُ إِلَّا وَحْيًا ﴾، (**أي: إلاَّ كَلاَمَـاً وَحِيَـاً**) مەگـەر دواندنێـکی سروش، یاخـود دواندنێـك کـە سروش بکـرێ.

فەرمایشـتێکی پێغەمبـەر ﷺ لەوبـارەوە هەیـە کـە دەفەرمـوێ: {**إنَّ رَوْحَ الْقُـدُسِ نَفَـثَ فِي رُوعِـيَ أَنَّ نَفْسًـا لَـنْ تَمُـوتَ حَتَّـى تَسْـتَكْمِلَ أَجَلَهَـا وَتَسْـتَوْعِبَ رِزْقَهَـا، فَأَجْمِلُـوا فِي الطَّلَـبِ، وَلَا يَحْمِلَـنَّ أَحَدَكُـمُ اسْتِبْطَاءُ الـرِّزْقِ أَنْ يَطْلُبَـهُ بِمَعْصِيَـةٍ، فَـإِنَّ اللَّـهَ لَا يُنَـالُ مَـا عِنْـدَهُ إِلَّا بِطَاعَتِـهِ**} (**حليـة الأوليـاء وطبقـات الأصفيـاء ج١٠، ص٢٨، عَـنْ أَبِي أُمَامَـةَ** رضي الله عنه، **وَحَسَّـنَهُ الألبَـانِي فـي صحيـح الجامـع: ٢٠٨٥**).

واتـە (روح القُـدُس) خسـتیە نێـو عەقـڵ دڵمـەوە، کـە هیـچ نەفسـێك نامـرێ تاکـو بژیوەکـەی تـەواو نـەکات و کاتی مردنیـشی نەیـەت، بۆیـە پارێز لـە خوا بکـەن و، جوان داوای بژیـو لـە خـوا بکـەن و، بـا یەکێکتـان وەخـرانی ئـەو بژیـوەی داوای دەکات، وای لێنـەکات کـە بـە سـەرپێچیی داوای بـکات (بژیـوی حـەرام)، چونکـە ئـەوەی لـەلای خوایـە (لـە بژیـوی حـەڵاڵ) تەنیا بـە فەرمانبەریـی بـۆ کرانی وەدەدەسـت دەهێـنرێ.

پێغەمبـەر ﷺ دەفەرمـوێ: (رُوحَ القُـدُس) کـە جبریلـە، ئـەوەی خسـتە نێـو دڵـم، واتـە: ئـەوە وەحییـە.

وەحیـی واتـە: قسـەیەکی پەنهـان بچێتـە نێـو دڵ، ئنجـا ئەگـەر بـۆ پێغەمبـەران بـێ، پێـی دەگوتـرێ: وەحیـی، بـەڵام ئەگـەر بـۆ جگەلـە پێغەمبـەران بـێ، پێـی دەگوتـرێ ئیلهـام، خورپـە، خرانـە نێـو دڵ.

ئەوەی باسکرا شێوازی یەکەمی نێررانی وەحیی خوا بوو.

**شـێوازی دووەم:** ﴿ أَوْ مِن وَرَآيِ حِجَابٍ ﴾، شـێوازی دووەمـی گەیانـدنی پەیامـی خـوا، فەرمایشـتکرنی خـوا، بـۆ پێغەمبـەران لـە پشـت پەردەوەیـە: (**يَسْـمَعُهُ سَـامِعُهُ وَلَا يَـرىَ مَصْـدَرَهُ**) ئـەو کەسـەی دەیبیسـتێ، تێـی دەگات، بـەڵام سـەرچاوەکەی نابینـێ، بەڵکـو چۆنیـشی دەبیسـتێ، ئـەوەش هـەر دیارنیـە، ئایـا مووسـا چـۆن فەرمایشـتی خـوای بیسـتوە؟ ئێمـە نازانیـن.

**شـێوازی سـێیەم:** ﴿ أَوْ يُرْسِلَ رَسُولًا فَيُوحِيَ بِإِذْنِهِۦ مَا يَشَآءُ ﴾، یاخـود نوێنەرێـك، ڕەوانەکراوێـك دەنێـرێ، (**يُرْسِـلُ مَلَـكًاً إلى النَّبِـي فَيُبَلِّـغُ إلَيْـهِ كَلَامَـاً يَسْـمَعُهُ النَّبِـي وَيَعِيْـهِ**) خـوا فریشـتەیەك دەنێـرێ بـۆ لای ئـەو پێغەمبـەرە (**علیـه الصـلاة والسـلام**) قسـەیەکی پێڕادەگەینـێ، پێغەمبەرەکـە دەیبیسـتێ و تێـشی دەگا، ﴿ فَيُوحِيَ بِإِذْنِهِۦ مَا يَشَآءُ ﴾، بـە مۆڵـەتی خـوا هەرچـی بیـەوێ پێـی ڕادەگەیەنـێ، ﴿ إِنَّهُۥ عَلِيٌّ حَكِيمٌ ﴾، بـە دڵنیایـی خـوا بـەرزەو کارزانـە.

**برگـەی دوو:** مشـتومری یەکجـار زۆری زانایـان لـە بـارەی فەرمایشـتکردنی خـواوە، وایکـردوە بکرێتـە ناوونیشـانی کـۆی: {ئیـمان و عەقیـدەی ئیسـلامیی} زۆرێـك لـە

کتێبەکان پێیان دەگوترێ: (**علم الكلام**) زانستی کەلام، ئەمە لەبەر ئەوە بووە زۆر مشتومڕ کراوە لەبارەی فەرمایشتی خواوە ﷻ، چ قورئان، چ کتێبەکانی دیکەی خوا، چ فەرمایشتکردنی خوا بە گشتیی، لەو بارەوە زۆر قسە کراوەو مشتومڕی زۆر بووە، ئەو بابەتە زاڵ بووە بەسەر کۆی بابەتەکانی ئیمان و عەقیدەدا، بۆیە ناو لە زانیاریی ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی نراوە، (**علم الكلام**)، کە لەڕاستییدا ناوەکە لە جێی خۆیدا نیە، چونکە کەلام یەکێکە لە بابەتەکانی ئیمان عەقیدە، ئەو ناوانەی دیکە ڕاستن، وەك: (**أصول الدين**)، (**الإيمان**)، (**العقيدة الإسلاميّة**)، (**الفقه الأكبر**)، بەڵام (**علم الكلام**) بکرێتە ناوونیشان بۆ کۆی ئیمان و عەقیدە، ئەوە زێدەڕۆییکردنە لە گەورەکردنی بەش (**جزء**)ێك لەسەر حیسابی هەموو (**كل**)!

هەروەها لە بارەی قورئانەوەو چۆنیەتی پەیوەندییەوە بە خواوە، مشتومڕ زۆر بووە، هەندێك لە حەنبەلییەکان و نەیارەکانیان، تووشی تێپەڕاندن و بەزایەدان بوون، لە حەنبەلییەکان هەبووە گوتوویەتی: نەك هەر بێژە (**لفظ**)ەکانی فەرمایشتی خوا، بگرە مەرەکەب و تیانووسەکەش، ئەوانیش هەر دروستکراونین و ئەوانیش هەر لەمێژینەو بێ سەرەتان، (**فخرالدين الرازي**)، لە تەفسیرەکەی خۆی دا[1] دەڵێ: (**الْحَنَابِلَةُ الَّذِينَ قَالُوا: بِقِدَمِ هَذِهِ الْحُرُوفِ، وَهَؤُلَاءِ أَخَسُّ مِنْ أَنْ يُذْكَرُوا فِي زُمْرَةِ الْعُقَلَاءِ**) ئەو بە گشتیی گوتوویەتی: حەنبەلییەکان {بەڵام بەشێك لە حەنبەلییەکان بوون} ئەوانەی گوتوویانە: ئەو پیتانەی قورئان {کە ئێمە دەیانخوێنین و دەیاننووسین} ئەوانەش هەر بێ سەرەتان، ئەوانە کەمترن لەوەی لە ڕیزی عاقڵاندا بژمێردرێن! {ئەویش جۆرێك لە زێدەڕۆیی کردوە لەو قسەیەیدا}.

بە هەرحاڵ بەشێك لە حەنبەلییەکان وابوون، لە بەرانبەریشیاندا، هەندێك لە نەیارەکانیان لە موعتەزیلەو، جەهمییەکان گوتوویانە: نەك هەر بێژەکان (**ألفاظ**)ی فەرمایشتی خوا، بەڵکو مانایەکانیشیان هەر پەیدابوون (**حادث**)ن!

---

(١ ) مفاتيح الغيب: ج١٤، ص١٦٦.

(**أبو بكر الباقلاني**) کە یەکێکە لە زانایانی بەرجەستەی ئیسلام، هەوڵیداوە خەتی نێوەڕاست بگرێ، کە گوتوویەتی: (**إنَّ كَلامَ اللَّهِ الأزَلِيَّ مَقْرُوءٌ بِألْسِنَتِنا، مَحْفُوظٌ فِي قُلُوبِنَا، مَسْمُوعٌ بِآذانِنا، مَكْتُوبٌ فِي مَصاحِفِنا، غَيْرُ حالٍّ فِي شَيْءٍ مِن ذَلِكَ، كَما أنَّ اللَّهَ مَعْلُومٌ بِقُلُوبِنا مَذْكُورٌ بِألْسِنَتِنا، مَعْبُودٌ فِي مَحارِيبِنا، وهو غَيْرُ حالٍّ فِي شَيْءٍ مِن ذَلِكَ، والقِرَاءَةُ وَالقَارِئُ مَخْلُوقانِ، كَمَا أنَّ العِلْمَ والمَعْرِفَةَ مَخْلُوقانِ، والمَعْلُومُ والمَعْرُوفُ قَدِيمانِ**)، باقلانیی بە بۆچوونی من، قسەیەکی زۆر میانجیی و باشی گوتوە لێرەدا، دەڵێ:

فەرمایشتی لە مێژینەی خوا، کە بە زمانەکانمان دەیخوێنینەوەو، لە دڵەکان و عەقڵەکانمان دا لە بەری دەکەین و، بە گوێیەکانمان دەیبیستین و، لە موصحەفەکانماندا دەینووسین، ئەو فەرمایشتە بێ سەرەتایەی خوا کە سیفەتی خوایە، لە هیچکام لەو شتانەدا نیە، {نە لە نێو موصحەفدایە، ئەو سیفەتەی خوا، نە لەسەر زمانی ئێمەیە، نە لە عەقڵ و دڵی ئێمەدایە، نە بە گوێشمان ئەو سیفەتەی خوا دەبیستین} هەروەك چۆن خوا ﷻ بە عەقڵ و دڵمان زانراوەو بە زمانمان باسکراوەو یادی دەکەین و، لە میحرابەکانماندا پەرستراوە، بەڵام خوا ﷻ لە هیچ کام لەوانەدا نیە {نە لە دڵی ئێمەدایە، بەس زانینەکەی و ناسینەکەی لە دڵی ئێمەدایەو، نە لەسەر زمانی ئێمەیە، بەڵکو باسکردنەکەی لەسەر زمانی ئێمەیە، نە لە میحرابەکەی ئێمەش دایە، بەڵکو بەندایەتییەکەی ئێمە لە میحرابەکاندا بەرجەستە دەبێ} خوێندنەوەکەو خوێنەرەکە هەردووکیان دروستکراون، هەروەك چۆن زانیاریی و ناسینەکە هەردووکیان دروستکراون {زانیاریی ئێمە بە خواو ئاشنایی ئێمە بە خوا، هەردووکیان دروستکراون} بەڵام زانراوەکەو ناسراوەکە، کە خوایە ﷻ ئەوە لە مێژینەیەو بێ سەرەتایە.

(**محمد الطاهر بن عاشور**)یش لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1]، دەڵێ:

---

(١ ) التحرير والتنوير: ج٢٥، ص١٤٨.

(وَقَدِ اصْطَلَحَ الْأَشْعَرِيُّ عَلَى تَسْمِيَةِ ذَلِكَ الْمَدْلُولِ، كَلَامًا نَفْسِيًّا، وَهُوَ إِرَادَةُ الْمَعَانِي الَّتِي دَلَّ عَلَيْهَا الْكَلَامُ اللَّفْظِيُّ، وَقَدِ اسْتَأْنَسَ لِذَلِكَ بِقَوْلِ الْأَخْطَلِ:

إِنَّ الْكَلَامَ لَفِي الْفُؤَادِ وَإِنَّمَا ... جُعِلَ اللِّسَانُ عَلَى الْفُؤَادِ دَلِيلًا).

واتە: ئەبوو حەسەنی ئەشعەریی، ناوی لەو فەرمایشتەی خوا ناوە، کەلامی نەفسیی {سیفەتەکەی خوای ناو ناوە فەرمایشتی زاتی خوا} کە بریتیە لە ویستنی ئەو واتاو مەبەستانەی بێژەکە دەیانگەیەنێ، لەوەشدا قسەی (أخطل)ی، بەبەڵگە هێناوەتەوە، کە شاعیرێکە دەڵێ:

إِنَّ الْكَلَامَ لَفِي الْفُؤَادِ وَإِنَّمَا ... جُعِلَ اللِّسَانُ عَلَى الْفُؤَادِ دَلِيلًا

قسەکردن لە نێو عەقڵ و دڵدایە، بەڵکو زمان تەنیا نیشانەیە، بۆ ئەوەی لە عەقڵ ودڵدایە.

ئێستا هەر کەسێك کە قسەیەك دەکات، مانایەکەی و مەبەستەکەی لە عەقڵ ودڵیدا هەیە، دوایی لەڕێی زمانەوە، لەڕێی وشەکانەوە، یاخود لەڕێی نووسینەوە، دەری دەبڕێ، یان لەڕووی ئاماژەیەکەوە دەردەبڕێ، بەڵام مانایەکەی لە عەقڵ و دڵدایە.

فەرمایشتکردنی خوای پەروەردگاریش وەك سیفەتێك، سیفەتێکی ئەزەلیی، وەك زاتی خوا بێ سەرەتایە، سیفەتەکە دیارە وەك خوای پەروەردگارە، بەڵام دوایی کە خوا ﷻ ئەو فەرمایشتەی خۆی بۆ ئێمە بەرجەستە دەکاتەوە لەو وشەو بێژنەدا، کە دوایی ئێمە دەیاننووسین و دەیانڵێین، بە دڵنیایی مەرەکەبەکەو گوتنەکەی ئێمەو، شتەکە کە تێیدا دەنووسرێ، ئەوانە هەموویان دروستکراون، هیچ گومان لەوەدا نیە.

**برگەی سێ:** ڕای ڕاست و میانجیی لە بارەی ئەوەوە کە خوا ﷻ سیفەتی فەرمایشتکردنی تێدا ئەزەلییە، بەڵام فەرمایشتکردنەکەی لە حاڵ و کاتێکی

دیاریکراودا، پەیدابوویە، سیفەتی فەرمایشتکردن لە خوادا، سیفەتێکی ئەزەلییە، بەڵام خودی فەرمایشتکردنەکە لەو کاتەدا کە فەرمایشتەکەی فەرمووە، شتێکی پەیدابوویە، بۆ وێنە: خوا لە ئەزەلەوە سیفەتی فەرمایشتکردنی هەبووە، بەڵام لەو کاتەدا کە فەرمایشتی لەگەڵ مووسادا کردوە، فەرمایشتکردنەکە شتێکی پەیدابووە، چونکە لە کاتێك دا و لە شوێنێکدایە، **(محمد الطاهر بن عاشور)** لەو بارەوە وردەکارییەکی هێناوە، من دەقەکە هەمووی بە عەرەبیی دێنم، لەبەر ئەمانەتی عیلمیی، چونکە مەسەلەیەکی زۆر هەستیارو وردە، دەڵێ:

(وَتَحْقِيقُ هَذَا الْمَقَامِ بِوَجْهٍ وَاضِحٍ قَرِيبٍ أَنْ نَقُولَ: إِنَّ ثُبُوتَ صِفَةِ الْكَلَامِ لِلَّهِ هُوَ مِثْلُ ثُبُوتِ صِفَةِ الْإِرَادَةِ وَصِفَةِ الْقُدْرَةِ لَهُ تَعَالَى، فِي الْأَزَلِ، وَهُوَ أَشْبَهُ بِاتِّصَافِهِ بِالْإِرَادَةِ، فَكَمَا أَنَّ مَعْنَى ثُبُوتِ صِفَةِ الْإِرَادَةِ لِلَّهِ، أَنَّهُ تَعَالَى مَتَى تَعَلَّقَ عِلْمُهُ بِإِيجَادِ شَيْءٍ لَمْ يَكُنْ مَوْجُودًا، أَوْ بِإِعْدَامِ شَيْءٍ كَانَ مَوْجُودًا، أَنَّهُ لَا يَحُولُ دُونَ تَنْفِيذِ مَا تَعَلَّقَ عِلْمُهُ بِإِيجَادِهِ، أَوْ إِعْدَامِهِ حَائِلٌ، وَلَا يَمْنَعُهُ مِنْهُ مَانِعٌ، وَمَتَى تَعَلَّقَ عِلْمُهُ بِإِبْقَاءِ الْمَعْدُومِ فِي حَالَةِ الْعَدَمِ، أَوِ الْمَوْجُودِ فِي حَالَةِ الْوُجُودِ، لَا يُكْرِهُهُ عَلَى ضِدِّ ذَلِكَ مُكْرِهٌ. فَكَذَلِكَ ثُبُوتُ الْكَلَامِ لِلَّهِ مَعْنَاهُ أَنَّهُ كُلَّمَا تَعَلَّقَ عِلْمُهُ بِأَنَّهُ يَأْمُرَ أَوْ يَنْهَى أَحَدًا، لَمْ يَحُلْ حَائِلٌ دُونَ إِيجَادِ مَا يُبَلِّغُ مُرَادَهُ إِلَى الْمَأْمُورِينَ أَوِ الْمَنْهِيِّينَ، وَكُلَّمَا تَعَلَّقَ عِلْمُهُ بِأَنْ يَتْرُكَ تَوْجِيهَ أَمْرٍ أَوْ نَهْيٍ إِلَى النَّاسِ، لَمْ يُكْرِهْهُ مُكْرِهٌ عَلَى أَنْ يَأْمُرَهُمْ أَوْ يَنْهَاهُمْ.

وَكَمَا أَنَّ لِلْإِرَادَةِ تَعَلُّقًا صَلَاحِيًّا أَزَلِيًّا، وَتَعَلُّقًا تَنْجِيزِيًّا حَادِثًا، حِينَ تَتَوَجَّهُ الْإِرَادَةُ إِلَى إِيجَادِ بِوَاسِطَةِ الْقُدْرَةِ. كَذَلِكَ نَجِدُ لِكَلَامِ اللَّهِ تَعَلُّقًا صَلَاحِيًّا أَزَلِيًّا، وَتَعَلُّقًا تَنْجِيزِيًّا حِينَ اقْتِضَاءِ عِلْمِ اللَّهِ تَوْجِيهَ أَمْرِهِ أَوْ نَهْيِهِ أَوْ نَحْوِهِمَا إِلَى بَعْضِ عِبَادِهِ. فَالْكَلَامُ الَّذِي يَنْطِقُ بِهِ الرَّسُولُ وَيَنْسُبُهُ إِلَى اللَّهِ تَعَالَى هُوَ حَادِثٌ، وَهُوَ أَثَرُ التَّعَلُّقِ التَّنْجِيزِيِّ الْحَادِثِ، وَالْكَلَامُ الَّذِي نَعْتَقِدُ أَنَّ اللَّهَ أَرَادَهُ وَأَرَادَ مِنَ النَّاسِ الْعَمَلَ بِهِ، هُوَ الصِّفَةُ الْأَزَلِيَّةُ الْقَدِيمَةُ وَلَهَا التَّعَلُّقُ الصَّلَاحِيُّ الْقَدِيمُ)[1]،

---

(١) التحرير والتنوير: ج٢٥، ص١٤٩،١٤٨.

دەڵێ: ساغكردنەوە لەم شوێنەداو، بە شێوەیەكی ڕوونی نیزیك ئەوەیە كە بڵێین: چەسپانی سیفەتی فەرمایشتكردن بۆ خوا، وەك چەسپانی سیفەتی ویست و سیفەتی دەستەڵاتە بۆ خوای بەرز لە ئەزەلدا، بەڵكو سیفەتی فەرمایشتكردنی خوا زیاتر دەشوبهێتە سیفەتی ویستی خواوە، ئنجا هەروەك چۆن چەسپاویی سیفەتی ویست بۆ خوای بەرز ئەوەیە: كە خوا هەر كاتێك زانیارییەكەی پەیوەست بوو بە پەیداكردنی شێكەوە كە نەبووبێ، یان بە لەبەین بردنی شتێكەوە كە بووبێ، هیچ شتێك ڕێناگرێ لەوە كە زانیاریی خوا پێوە پەیوەست بووەكە پەیدا بكات، یاخود لە بەینی بەرێ، هیچ ڕێگرێك ڕێی لێناگرێ، هەروەها هەر كاتێك زانیاریی خوا پەیوەست بوو بە هێشتنەوەی نەبوویەك لەحاڵی نەبووندا، یاخود پەیدابوویەك لە حاڵەتی بووندا، ئەوە هیچ ناچاركەرێك لەسەر پێچەوانەی ئەوە ناچاری ناكات، بەهەمان شێوەش:

چەسپانی فەرمایشتكردن بۆ خوا، واتایەكەی ئەوەیە هەر كاتێك زانیاریی خوا پەیوەست بوو بەوەوە كە فەرمان بكات بە كەسێك، یاخود ڕێی لێبگرێ، هیچ پەرچێك نایەتەبەری، كە ڕێ لەوە بگرێ ئەوەی مەبەستیەتی بیگەیەنێ، بۆ فەرمان پێكراوان، یان بۆ قەدەغەكراوان، هەروەها هەر كاتێك زانیاریی خوا پەیوەست بوو بەوەوە فەرمانی خۆی، یاخود قەدەغەی خۆی ئاڕاستەی خەڵك نەكات، هیچ ناچاركەرێك ناچاری ناكات فەرمانیان پێبكات، یاخود ڕێیان لێ بگرێ، هەروەك چۆن ویستی خوا ﷻ پەیوەست بوونێكی ئەزەلیی شایستەی هەیە، پەیوەست بوونێكی پەیداكردنیشی هەیە، كاتێك ویستی خوا بە هۆی دەستەڵاتەكەیەوە ئاڕاستەی شتێك دەبێ، لە ئەزەلدا خوا ویستەكەی هەیە، بەڵام لە كاتێكی دیارییكراودا، بە هۆی دەستەڵاتی خواوە، ئەو شتە پەیدا دەكات، بە هەمان شێوە فەرمایشتی خواش لە ئەزەلدا، شایستەیی ئەوەی هەیە ئەو فەرمایشتە بفەرموێ، ئنجا ئەو پەیوەندییەی هەیەو، پەیوەندییەكی جێبەجێ كردنیشی هەیە، لە كاتێكدا خوا دەیەوێ فەرمانی خۆی، یاخود نەهی خۆی

ئاراستەی کەسێك بکات، یاخود جیا لەوانەش (جگە لە فەرمان و نەهی) هەر شتێکی دیکە خۆی بیەوێ ئاراستەی بەندەکانی بکات.

کەواتە: ئەو قسەیەی کە پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموێ و پاڵی دەداتە لای خوای بەرز، فەرمایشتەکەی خوا، ئەو پەیدابووەیە، کە لەسەر زمانی پێغەمبەر ﷺ پەیدادەبێ، ئەوە شوێنەواری ئەو پەیوەست بوون پەیداکردنە تازەیە کە سیفەتی فەرمایشتی خوایە، بەڵام ئەو فەرمایشتەی دەزانرێ خوا ویستوویەتی، لە خەڵکی ویستوە کاری پێبکەن، ئەوە سیفەتە ئەزەلییە لە مێژینەییەکەی خوایەو، ئەو پەیوەست بوونە گونجاوییەی هەیە، کە لە کاتێکی دیاریکراو و لە شوێنێکی دیاریکراودا بەرجەستە ببێ.

واتە: سیفەتی فەرمایشتکردنی خوا ﷻ، وەك سەرجەم سیفەتەکانی خوایە، کە وەك زاتی خوا، بێ سەرەتان، وەك چۆن خوا لەئەزەل دا زانیاریی هەبووە، توانای هەبووە، ویستی هەبووە، دەستەڵاتی هەبووە، حیکمەتی هەبووە، بەزەیی هەبووە، بە هەمان شێوەش خوای بەرز سیفەتی فەرمایشتکردنی هەبووە، بەڵام کاتێك کە فەرمایشتەکەی کردوەو ئەو فەرمایشتە بەرجەستە بووە، لەو کاتەدا کە فەرمایشتەکەی کردوە، ئەو فەرمایشتکردنە بە پەیدابوو لە قەڵەم دەدرێ، بەڵام سیفەتەکە ئەزەلییەو لەمێژینەیە.

بە تەئکید دواییش کە مرۆڤەکان ئەو فەرمایشتەی خوا دەخوێننەوەو بە عەقڵیان تێیدەگەن و، بە زمانیان دەیڵێن و، لە میحرابەکاندا دەیخوێننەوەو، لە پەرستشدا بەرجەستەی دەکەن، هەموو ئەوانە بەپەیدا بوو لە قەڵەم دەدرێن، بەڵام ئەسڵی فەرمایشتەکەی خواو، زانیارییەکەی خوا، وەك سیفەتەکانی ئەزەلیین، بە دڵنیایی ئەوە مەسەلەیەکی زۆر وردو، ئەوەندەی بە گشتیی خوێنەران لێی تێبگەن، باسم کرد.

**بڕگەی چوار:** ئنجا لێرەدا قسەی خۆم دێنم، وەك گوشراوی ئەوەی گوترا لەو بارەوە:

خوا عزوجل سیفەتەکانی و کارەکانی زۆر لەوە مەزنترن و، بەرزترن کە ئێمەی مرۆڤ هەموو شتێکیان لەبارەوە بزانین و وەك پێویست تێیان بگەین، خوا لە سوورەتی (طه)دا، پێی فەرمووین: ﴿وَلَا يُحِيطُونَ بِهِۦ عِلْمًا ﴿١١٠﴾﴾، واتە: زانیاریی ئەوان دەوری خوا نادات.

کەواتە: هەر کەسێك تەماعی ئەوەی هەبێ، کە لە بارەی فەرمایشتی خواوە، دەستەڵاتی خوا، زانیاریی خوا، بەزەیی خوا، حیکمەتی خوا، هەمووشتێکی لە بارەوە بزانێ، ئەوە دەیەوێ شتێکی بێسنوور لە شتێکی سنوورداردا جێبکاتەوە، ئنجا با وەك وێنەیەك بێنینەوە، تەنیا بۆ لێ حاڵیی بوون:

ئایا ئاوی دەریایەك، ئاوی ئۆقیانووسێك لە بەرداخێکدا جێی دەبێتەوە؟ نەخێر، ئنجا زانیاریی خوا زۆر زۆر فراوانتریشەو بێسنوور فراوانە، هەروەها حیکمەتی خوا، ڕەحمەتی خوا، هەموو سیفەتەکانی خوا بێسنوورن و لە چاو عەقڵی مرۆڤ وەك ئۆقیانووس و پەرداخیش نین، ئۆقیانووسەکە هەر چۆنبێ سنووردارە، بەڵام سیفەتەکانی خوا بێسنوورن، بۆیە خوای پەروەردگاریش ئەوەندە توانایەی داوە بەئێمە، بایی ئەوەندە کە خوا بناسین و لە سیفەتەکانی تێبگەین و لە کردەوەکانی تێبگەین، بەڵام بمانەوێ هەموو شتێك لەبارەی خواوە بزانین، بە تەئکید ئێمە بەو توانایەی خوا پێیداوین لەو ژیانە دنیاییەدا بۆ تاقیکردنەوە، توانامان بایی ئەوەندە نیە، هەموو شتێك لە بارەی خواوە ﷻ بزانین، بەڵکو بایی ئەوەندە دەزانین کە خوا بناسین و، بزانین خاوەنی ئێمە، پەروەردگاری ئێمە، بەدیهێنەری ئێمەیەو، دەبێ هەر ئەو بپەرستین و بەندایەتیی بۆ بکەین، زاتی خوای پەروەردگار بەو شێوەیە کە دەفەرموێ: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَيْءٌ ﴿١١﴾﴾الشورى، هیچ شتێك وەك وێنەی وی نیە، هەروەها سیفەتەکانی بێسنوورن و کردەوەکانی

وەك كردوەی هیچ شتێك و كەسێكی دیكە نین. بە كورتیی: هەرچی پەیوەندیی بە خواوە هەیە، تایبەتە بە خواوە، بایی ئەوەندە خوا عەقڵ و هەستی داوە بە ئێمە، كە ئەو شتانە بزانین، بەڵام مانەوێ ئەوپەڕی شتەكان بزانین، بێگومان تەنیا خوا ﷻ وەك پێویست خۆی دەناسێ، بەڵام ئێمە بایی ئەوەندە كە پێی تاقیبكرێینەوە، توانای پێداوین، بیناسین.

## مەسەلەی چوارەم:

**سروشکردنی خوا بۆ موحەممەد ﷺ بەهەمان شێوەی سروشکردنیەتی بۆ پێغەمبەرانی پێشووی و، پێش سروش بۆ کرانی، بە کتێب و ئیمان ئاشنا نەبووە، بەڵام خوا قورئانی کردۆتە ڕووناکییەك کە موحەممەد ﷺ بەندەکانی خوای بەرەو ڕاستە شەقامی خوا، کە خاوەنی ئاسمانەکان و زەوییە، پێ ڕێنمایی بکات:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا ۚ مَا كُنتَ تَدْرِى مَا ٱلْكِتَٰبُ وَلَا ٱلْإِيمَٰنُ وَلَٰكِن جَعَلْنَٰهُ نُورًا نَّهْدِى بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنْ عِبَادِنَا ۚ وَإِنَّكَ لَتَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٢﴾ صِرَٰطِ ٱللَّهِ ٱلَّذِى لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ أَلَآ إِلَى ٱللَّهِ تَصِيرُ ٱلْأُمُورُ ﴿٥٣﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا﴾، هەروەها بەو شێوەیە ڕووحێکمان لەلایەن خۆمانەوە، لە فەرمانی خۆمان بۆ تۆ سروشکرد، لێرە کە دەفەرموێ: ﴿مِّنْ أَمْرِنَا﴾، (**الأَمْرُ المُضَافُ إلى اللَّهِ بِمَعْنى الشَّأْن العَظِيمِ**) لەشکۆ و پێگەی خۆمانەوە، ڕووحێکمان بۆ تۆ نارد، ﴿وَكَذَٰلِكَ﴾، واتە: بەو شێوە سەرسوڕهێنەرە کە دەبێ هەر بە خۆی بچوێنرێ، یاخود بەو شێوەیە کە لە ئایەتی پێشوودا باسکرا، ئێمە لە لایەن خۆمانەوە ڕووحێکمان بۆ ڕەوانکردی، یاخود بەو شێوەیە کە لەگەڵ پێغەمبەرانی پێشوودا (**عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلاَم**)، مامەڵەمان کردوە، کە سروشمان بۆ کردوون، (**أيْ: كانَ وحْيُنا إلَيْكَ مِثْلَ كَلاَمِنَا الَّذِي كَلَّمْنا بِهِ مِنْ قَبْلَكَ**) سروشکردنەکەی ئێمە بۆ لای تۆ، هەروەك فەرمایشتکردن و سروشکردنمان بووە، بۆ لای پێغەمبەرانی پێش تۆ.

٢)- ﴿مَا كُنتَ تَدْرِى مَا ٱلْكِتَٰبُ وَلَا ٱلْإِيمَٰنُ﴾، پێشتر نەتدەزانی نە کتێب چییەو نە ئیمان چییە؟ (**المَقْصُود نَفِي دِرَايَتُه لِكُلٍّ مِنَ الكِتَاب وَالإِيمَان**) مەبەست ئەوەیە کە

پێغەمبەر ﷺ هیچ کام لە کتێب و ئیمانی نەزانیون، یانی: زانینی پێغەمبەر ﷺ لادەبات، لە بارەی کتێبەوەو لە بارەی ئیمانەوە.

٣)- ﴿ وَلَٰكِن جَعَلْنَٰهُ نُورًا ﴾، بەڵام ئێمە کردمان بە ڕووناکییەك، ڕاناوی سەر (**جَعَلْناه**) بۆ قورئان دەچێتەوە، واتە: ئەم قورئانەمان کە بۆ ناردووی و بۆمان سروشکردووی، کردوومانە بە ڕووناکییەك.

٤)- ﴿ نَّهْدِى بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنْ عِبَادِنَا ﴾، هەرکام لە بەندەکانمان، کە بمانەوێ پێی ڕاستە ڕێ دەکەین، پێی بە مراد دەگەیەنین.

٥)- ﴿ وَإِنَّكَ لَتَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴾، بە دڵنیایی تۆش ڕێنمایی دەکەی بەرەو ڕێی ڕاست، بەرکار (**مَفْعول به**) ڕێنمایی دەکەی (**تَهْدِي**) قرتێندراوە، (**إنَّكَ لَتَهْدِي**) یانی: (**وَإنَّكَ لَتَهْدِي النَّاسَ إلى صِراطٍ مُسْتَقِيْم**) خەڵك بەرەو ڕێی ڕاست ڕێنماییان دەکەی وڕێیان پێشان دەدەی.

ئنجا دوایی پێناسەی ڕێیە ڕاستەکە دەکات و دەفەرموێ:

٦)- ﴿ صِرَٰطِ ٱللَّهِ ٱلَّذِى لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، ڕێی ئەو خوایەی کە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی دایە، هی ویە.

٧)- ﴿ أَلَآ إِلَى ٱللَّهِ تَصِيرُ ٱلْأُمُورُ ﴾ (ئەها) بزانن! کاروبارەکان تەنیا بەرەو لای خوا دەچن. (**ألا: أَدَاةُ التَّنْبِيه**) (**ألا**) ئامرازی وریاکردنەوەیە، یانی ئەها کاروبارەکان بەرەو لای خوا دەچن، هەموو شتێك دەچێتەوە بۆ لای خوا (**صَارَ إلى كَذَا: انْتَقَلَ، وَصَارَ للإنْتِهَاء إلى غَايَة**) (**صَارَ**): بەکاردەهێنرێ بۆ گەیشتن بە ئامانجێك، بە کۆتاییەك.

## کورتە باسێک دەربارەی فەرمایشتی خوا
## ﴿مَا كُنتَ تَدْرِى مَا ٱلْكِتَٰبُ وَلَا ٱلْإِيمَٰنُ﴾

لێرەدا مشتومڕێکی زۆر لە بارەی ئەم تەعبیرەوە هەیە، کە خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿مَا كُنتَ تَدْرِى مَا ٱلْكِتَٰبُ وَلَا ٱلْإِيمَٰنُ﴾، تۆ پێشتر نەتدەزانی نە کتێب چییەو، نە ئیمان چییە؟

لەو بارەوە مشتومڕی زۆر کراوە، کە بە بۆچوونی بەندە، مانای ڕستە قورئانییەکە زۆر ڕوونە، خوا بە پێغەمبەر موحەممەد ﷺ دەفەرمووێ: تۆ پێش ئەوەی وەحییت بۆ بنێرم و بتکەمە پێغەمبەر ﷺ، نەتزانیوە نەکتێبێک چییەو نە ئیمان چییە؟ کتێب ئەگەر مەبەست قورئان بێ، پێش ئەوەی خوا قورئان بۆ پێغەمبەر بنێرێ، پێغەمبەر ﷺ نەیزانیوە قورئان چییە، ئەگەر مەبەست لە کتێب بەرنامە بێ، چونکە (کتاب) لە قورئاندا بە مانای بەرنامەش هاتوە، بێگومان پێغەمبەر ﷺ نەیزانیوە بەرنامە چییە؟ هەروەها نەشیزانیوە ئیمانیش چییە؟ هۆی ئەو مشتومڕەش بە بۆچوونی من، دەگەڕێتەوە بۆ دوو شتان:

**یەکەم:** بە داخەوە هەندێك لەزانایان، کاتێك کە قسە دێتەسەر پێغەمبەری خاتەم ﷺ عاتیفەیان بەسەر عەقڵدا زاڵ دەکەن، بۆ وێنە: لێرەدا دەڵێن: چۆن پێغەمبەر ﷺ نەیزانیوە ئیمان چییە؟ خوا کاتێك بفەرموێ: نەیزانیوە ئیمان چییە! نەیزانیوە، یاخود لە سوورەتی (**الضحى**)دا، کە دەفەرموێ: ﴿وَوَجَدَكَ ضَآلًّا فَهَدَىٰ ۝٧﴾، خوا تۆی بە گومڕا بینی، بەڵام ڕێنمایی کردی، یان خستیتە سەر ڕاستەڕێ، هەندێك لە زانایان پینەو پەڕۆی دنیایان کردوە، دەڵێن: ﴿وَوَجَدَكَ ضَآلًّا فَهَدَىٰ ۝٧﴾، ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ منداڵ بووە، ڕێی لێ ونبووە، دوایی خوا جبریلی ناردوە، هێناویەتەوە بۆ ماڵێ!! بەڵام پێویست بەوە ناکات، چونکە خوا ﷻ دەفەرموێ: تۆ بەڕێیەت نەدەزانی، (**ضالّ**) یانی: کەسێك کە بەڕێیە نازانێ و

ون بووە، ئنجا دەپرسین: ئایا چاکەو ئازایەتییەکەی وەحیی خوا چییە، ئەگەر پێغەمبەری خاتەم ﷺ پێش هاتنی وەحیی و بوونە پێغەمبەریش کتێبی هەر زانیبێ و ئیمانیشی هەر زانیبێ، ئایا دوای بۆ هاتنی وەحیی چی لێ زیاد بووە؟

**دووەم:** ئەوجۆرە زانایانە وەك خۆی لە ماناو چەمکی ئیمان حاڵیی نەبوون و، ئیمانیان هەر بە مانای خواناسیی، **(معرفة الله)** بەکارهێناوە، کەمن کتێبێکم هەیە بە ناوی: (خواناسیی، ئایین، ئیمان) خواناسیی جیایە لە ئیمان، خواناسیی ئەوەیە کە تۆ بزانی خوا ﷻ بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەنی ئەم گەردوون و کەون و کائیناتەیە، ئەوە خواناسییەو، ئەمە خاڵی هاوبەشی بڕواداران و بێبڕوایانە، بێبڕوایان مەبەستم ئەوانە نیە کە مولحیدن، واتە: هەموو ئەو بێبڕوایانەی وەك: جوولەکە، نەصڕانیی، صابیئە، هاوبەش بۆخوا دانەران، بەڵکو ئەوە خاڵی هاوبەشی بەینی بڕواداران و ئیبلیسیشە، ئیبلیسیش خوای ناسیوە، بەڵام ئایا ئیبلیس کە خوای ناسیوە بە بڕوادار لە قەڵەم دراوە؟ بەتەئکید نەخێر، ئنجا ئیشکالەکە لەوەدایە، کە ئەوان پێیان وابووە، ئیمان یانی: خواناسیی، ئنجا گوتوویانە: پێغەمبەر ﷺ ئەدی ئەوە نیە لە ئەشکەوتی (حراء)دا خواپەرستیی کردوە، کەواتە چۆن خوای نەناسیوە؟!

وەڵامەکەی ئەوەیە: کە ئیمان جیایە لە خواناسیی، ئەگەر ئیمان خواناسیی بوایە، پێغەمبەر ﷺ زۆرباش خوای ناسیوە، نەك هەر پێغەمبەر ﷺ بەڵکو پێغەمبەری خاتەم دەفەرموێ: {**مَا مِنْ مَوْلُودٍ إِلاَّ يُولَدُ عَلَى الْفِطْرَةِ: فَأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِهِ، أَوْ يُنَصِّرَانِهِ، أَوْ يُمَجِّسَانِهِ**}، **(أخرجه البخاري: ١٢٩٢، ومسلم: ٢٦٥٨، وأبو داود: ٤٧١٤)**، واتە: هەموو منداڵێك لەسەر خوارِسك لە دایك دەبێ، (لەسەر زگماکی خواناسیی)، بەڵام دوایی باب و دایکی دەیکەنە جوولەکە، یان دەیکەنە نەصڕانیی، یان دەیکەنە مەجووسیی.

چ جای پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ)، کە خاوەنی پاکترین سرووشت و زگماك و خوارِسك و چاکترین مەعدەن بوون، بەڵام ئیمان جیایە لە خواناسیی.

ئنجا با تەماشایەکی تەئویل و مانا لێکدانەوەی هەندێك لە زانایان بکەین، تەماشای زۆر لە تەفسیرەکانم کرد، بۆ وێنە: (القرطبي)[1] حەوت جۆرە تەئویلان دەکات بۆ ئەوە کە دەفەرموێ: ﴿مَا كُنتَ تَدْرِى مَا ٱلْكِتَـٰبُ وَلَا ٱلْإِيمَـٰنُ﴾، کە ئایا مەبەست پێی چییەو، مەبەست لە (ئیمان) کە پێغەمبەر نەیزانیوە چییە؟!

**یەك:** (**شَرَائِعُ الْإِيمَانِ وَمَعَالِمُهُ**) مەبەست: بەرنامەکانی ئیمان و نیشانەکانی ئیمانە.

**دوو:** (**الْإِيمَانُ: تَفَاصِيل الشَّرْعِ**) ئیمان مەبەست پێی وردەکارییەکانی شەریعەتە، کە نەیزانیون.

**سێ:** (**قِرَاءَةُ الْقُرْآنِ وَدَعْوَةُ النَّاسِ إِلى الإِيْمَان**) مەبەست: قورئان خوێندن و بانگکردنی خەڵك بەرەو ئیمانە.

**چوار:** (**الْإِيمَانُ: الْفَرَائِضُ وَالْأَحْكَامُ**) مەبەست لە ئیمان: فەرزەکان و حوکمە شەرعییەکانە، کە نەیزانیون.

**پێنج:** (**الْإِيمَانُ: الصَّلَاةَ**) مەبەست لە ئیمان نوێژە، ئنجا ئەو ئایەتەیان بە بەڵگە هێناوەتەوە: ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَـٰنَكُمْ﴾البقرة.

**شەش:** (**الْإِيمَانُ: أَهْلُ الْإِيمَانِ**) یانی: تۆ ئەهلی ئیمانت نەناسیون، پێش ئەوەی خوا وەحییت بۆ بنێرێ!

**حەوت:** (**فِي الْمَهْدِ وَقَبْلَ الْبُلُوغِ**) تۆ کاتێك لە بێشکەدابووی و، پێش ئەوەی باڵغ بی، نەتزانیوە ئیمان چییە!

تەئویلێکی دیکەشیان هێناوە دەڵێ: (**كُنْتَ مِنْ قَوْمٍ لاَ يَعْلَمُوْنَ الكِتَابَ، وَالإِيْمَان كَيْ تَأخُذُهُمَا مِنْهُم**) تۆ لە نێو خەڵکێك دا بووی کە ئەوان نەیاندەزانی کتێب چییەو ئیمان چییە، تاکو لەوانی وەربگری.

---

(١) ج٢٥، ص٤٧.

بەڵام لە ڕاستییدا پێویست بەو تەئویلانە هیچیان ناکات، مانایەکەی هەر ئەوەیە کە مەبەست لە ئیمان: (**الحَقَائِقُ الَّتِي جَاءَ بِهَا الشَّرْعُ، وَفَهِمَهَا العَقْلُ، وَاعْتَقَدَهَا القَلْبُ، وَأَقَرَّ بِهَا اللِّسَانُ، وَنَفَّذَتْهَا الأَرْكَانُ**).

واتە: ئیمان ئەو ڕاستییانەن کە شەریعەت هێناونی و، مرۆڤ بە عەقڵ تێیان دەگات و، بە دڵ قبووڵیان دەکات و پەسندیان دەکات و، بە زمان دانیان پێدادێنێ و تەعبیریان لێدەکات و، بە ئەندامەکانیشی جێبەجێیان دەکات.

پێغەمبەر ﷺ ئەو ڕاستییانەی کە لەبارەی خواوە، لە بارەی فریشتەکانەوە، لە بارەی کتێبەکانەوە، لە بارەی پێغەمبەرانە، لە بارەی ڕۆژی دوایییەوە، لە بارەی قەزاو قەدەرەوە، هاتوون، کە بەبێ هاتنی شەریعەت، مرۆڤ نایانزانێ، ئەوانە کە دەبێ دوایی بە عەقڵ دەرك بکرێن و بە دڵ قبووڵ بکرێن و بە زمان ئیعتیرافیان پێبکرێ و بە ئەندامەکان جێبەجێ بکرێن، ئا ئەوە بووە پێغەمبەر ﷺ نەیزانیوە، ئەگەرنا پێغەمبەری خوا، خواناس بووەو، پێغەمبەری خوا ﷺ زانیویشیەتی ڕۆژێك دێ مرۆڤ لێی دەپرسرێتەوەو، کەم زۆر دەنگوباسی پێغەمبەرانیشی بیستوە، بەڵام ئەو ڕاستییانە بەو شێوەیە کە دوایی خوا ناردوونی، لەلای پێغەمبەری خاتەم نەبوون ﷺ.

بە نسبەت کتێبیشەوە، دیارە پێغەمبەر ﷺ بەر لەوەی خوا کتێبی بۆ بنێرێ، نەیزانیوە کتێب چییە، چۆن بزانێ؟ هەروەها بەرلەوەی بەرنامەی بۆ بێ، نەیزانیوە بەرنامە چییە؟ لە سوورەتی (الضحى)ش دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَوَجَدَكَ ضَآلًّا فَهَدَىٰ ﴿٧﴾ ﴾، واتە: خوا تۆی سەرگەردان بینی، بەڵام ڕێنمایی کردی، ڕاستەڕێی کردی، ئەگەر پێغەمبەری خوا زانیبای، بۆچی لە تەمەنی چل ساڵییەوە، لە دوای چل و یەك ساڵییەوە دەستی پێدەکرد؟ هەر لە سەرەتاوە دەستی پێدەکرد، بەڵام دیارە نەیزانیوەو بێگومان ئەگەر زانیبای، لەگەڵ کۆمەڵگایەکەی خۆیدا خەریك دەبوو، بەڵام پێغەمبەر ﷺ پێش تەمەنی چل ساڵی، هەرگیز لێی

نەگێرداوەتەوە، سێ کەسی دواندبن و بۆ خواناسیی بانگیان بکات، بۆ ڕەوشتی بەرز، بۆ عیبادەت، یاخود نەهییان لێبکات لە شتی خراپ، لێی نەگێردراوەتەوە، چونکە بەرنامەکەی نەبووە، هەتا خوا سروشی بۆ نەکردوە، نەیزانیوە نە ئیمان چییە، بەو شێوەیەی باسمان کرد، نەکتێب و بەرنامەش چییە، بەو شێوەیەی باسمان کرد، ئنجا لە سوورەتی (یوسف)دا، خوای پەروەردگار لە ئایەتی ژمارە (٣)دا، زۆر بەڕوونیی دەفەرمووێ: ﴿ نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ أَحْسَنَ الْقَصَصِ بِمَآ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ هَٰذَا الْقُرْءَانَ وَإِن كُنتَ مِن قَبْلِهِۦ لَمِنَ الْغَٰفِلِينَ ﴿٣﴾ ﴾، واتە: ئێمە باشترین بەسەرهات، باشترین گێڕانەوە بۆ تۆ دەگێڕینەوە، بە هۆی ئەوەوە کە ئەم قورئانەمان بۆ تۆ سروش کردوە، هەرچەندە پێشتر لەبێ ئاگایان بووبی، کەواتە: پێغەمبەر ﷺ پێشتر لە بێئاگایان بووە، دوایی خوا ئاگاداری کردۆتەوەو، عەقڵ و دڵی ڕۆشن کردۆتەوە، بەو هیدایەتەی خۆی و بەو وەحییەی خۆی.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی هیدایەتمان بدات، زیاتر لە قورئان پێبگەین و زیاتر تێوەی ڕامێنین و لێی وردبینەوە، هیدایەتیشمان بدات هەرچی زانیمان بیتوانین و، حاڵیی بوونەکە لە خۆماندا بکەینە حاڵ.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

بەڕێـــــزان!

ئەمڕۆ کـە (١٤٤١/٥/١٤) کۆچییـە، بەرانبـەر (٩/ ١/ ٢٠٢٠)ی زایینـی، بە پشـتیوانی خـوا، دەسـت دەکەیـن بـە تەفسـیر کردنـی سـوورەتی (**الزخرف**).

## پێناسەی سوورەتی (الزخرف)و بابەتەکانی

### ١)- ناوی ئەم سوورەتە:

ئـەم سـوورەتە لـە موصحەفەکانـدا هـەر بـە (**سـورة الزخـرف**) نـاسراوە، بـەڵام پێشـەوا بوخاریـی ڕەحمـەتی خـوای لـێ بـێ، لـە صەحیحەکـەی خـۆی لـە (**کتـاب التفسـیر**)دا، بـە (**سورة حـم الزخـرف**) نـاوزەدی کـردوە، لەبـەر ئـەوەی ئەمیـش یەکێکە لـە حـەوت سـوورەتەکان، کـە هـەردوو پیتـی (حم)یـان لـە پێشـەوەن، وەك پێشـتر باسـمان کـرد.

### ٢)- شوێنی دابەزینی:

ئـەم سـوورەتە مەککەییـەو، لـە (**قَتـادَة**) و (**عَبْـدُ الرَّحْمَـن بْـن زَيـد بْـن أسـلَم**) ەوە هاتـوە، کـە هەردووکیـان لـە زانایانـی جیلـی دوای هاوەڵانـن، واتـە: جیلـی شـوێنکەوتووان (**التَّابِعـين**)، کـە ئایەتـی: ﴿ وَسۡـَٔلۡ مَنۡ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رُّسُلِنَآ أَجَعَلۡنَا مِن دُونِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ءَالِهَةٗ يُعۡبَدُونَ ﴿٤٥﴾ ﴾الزخـرف، واتـە: لەوانـە بپرسـە کـە لـە پێـش تـۆدا ناردوومانـن، لـە پێغەمبـەران، ئایـا جگـە لـە (خـوای) خـاوەن بەزەیـی، پەرسـتراوانێکی دیکەمـان دانـاون، بپەرسـترێن؟ ئەمـەش پرسـیارکردنی نکووڵیلێکەرانەیـە، واتـە: شـتی وانیـە، ئـەو دوو زانایـە گوتوویانـە: ئـەم ئایەتـە موبارەکـە لـە (**المَسـجِدُ الأقـصَى**) دابەزیـوە، واتـە: ئـەو کاتـەی پێغەمبـەری خاتـەم

موحەممەد ﷺ سەفەری شەوڕۆو بەرزبوونەوە (الإسرَاء وَالمِعرَاج)ی کردوە، ئنجا ئەگەر ئەوە ڕاست بێ، هیچ گرفت نیە، گرنگ ئەوەیە ئەم ئایەتەش، لە نێو سوورەتی (الزخرف) دایە، یەکێکە لە (٨٩) ئایەتەکەی پێش کۆچکردنی پێغەمبەر ﷺو، هاوەڵانی لە شاری مەککەوە بۆ شاری مەدینە دابەزیوە.

کەواتە: با لە دەرەوەی مەککەش هاتبێتە خوار، وەك شوێنی جوگرافیی، بەڵام لە ڕووی کاتەوە، هەر دەچێتە پێناسەی سوورەتە مەککەییەکان و ئایەتە مەککەییەکانەوە.

## ٣)- ڕیزبەندیی لە موصحەف و هاتنە خواردا:

لە ڕیزبەندیی دابەزین (**ترتیبُ النزول**)دا، ژمارە (٦٢)ی هەیە، واتە: شەست و دووەمین سوورەتە دابەزیوە، پێش سوورەتی (**الدُّخَان**)و لە دوای سوورەتی (**فُصِّلَت**)، لە ڕیزبەندیی (**المُصحَف**)یشدا ژمارە (٤٣)یە.

## ٤)- ژمارەی ئایەتەکانی:

لە لای زۆربەی هەرە زۆر لە زانایان، ئەوانەی سەرژمێریی ئایەتەکانی قورئانیان کردوە، هەشتا و نۆ (٨٩) ئایەتە، بەڵام هەندێك لە زانایانی شام بە هەشتاو هەشت (٨٨)یان داناوە، پێشتریش باسمان کردوە، کە جیاوازیی ژمارەی ئایەتەکان، پەیوەندیی هەیە بە کورتیی و درێژیی هەندێك لە ڕستەکانەوە.

## ٥)- نێوەڕۆکی:

ئەمیش هەمان نێوەڕۆکی قورئانی مەککەییە، بە هەر سێ تەوەرە گشتییەکەیەوە، باسی خواناسیی و، بەدیهێنەرایەتیی و، پەروەردگارێتیی و، خاوەندارێتیی و، تەنیا پەرستراوێتیی خوا ﷻو، باسی پێغەمبەرایەتیی و، وەحیی

و، باسی ڕۆژی دوایی و بەهەشت و دۆزەخ. بەڵام ئەم سوورەتە پانتاییەکی زۆری تێدا تەرخانکراوە، بۆ خستنەڕووی شیرك و پووچەڵکردنەوەی، بە هەر سێ جۆرەکەیەوە:

١- شیرکی هاوەڵ و هاوبەش بۆ خوا دانان (باوترین جۆری هاوبەش بۆ خوا دانان بووە).

٢- شیرکی **طاغووت** پەرستیی.

٣- شیرکی ڕۆڵە بۆ خوا دانان.

کە بە زۆرییش وابووە فریشتەکانیان بە ڕۆڵەی خوا داناون و، پێشتریش خەیاڵیان وابووە، کە فریشتەکان مێینەن، بۆیە فریشتەکانیان بە کچانی خوا داناون، هەڵبەتە هەندێك لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، (**شَیاطِین**)یشیان بە کوڕانی خوا داناون، وەك لە سوورەتی (**الأنعَام**)دا بە درێژیی لەو بارەوە دواین.

شایانی باسیشە: ناوی هەر کام لە (**إبراهیم، موسى، عیسى ابن مریم**)، (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام**)، لەم سوورەتەدا هێنراوە، ئاماژەیەك بە بەسەرهاتەکانیان کراوە، لە سیاقی بەرپەرچدانەوەی شیرکدا:

١- ئیبراهیم ﷺ: لە هەر سێ ئایەتەکانی ژمارە: (٢٦، ٢٧، ٢٨).

٢- مووسا ﷺ: لە ئایەتەکانی ژمارە: (٤٦ - ٥٦)، واتە: (١١) ئایەت.

٣- عیسا ﷺ: لە ئایەتەکانی ژمارە: (٥٧ - ٦٥)، واتە: (٩) ئایەت.

واتە: سەرجەم بیست و سێ (٢٣) ئایەت، بۆ ئاماژەیەك بە بەسەرهات و هەڵوێستی ئەم سێ پێغەمبەرە پایە بەرزە تەرخان کراون، لە بواری بەرپەرچدانەوەیان بۆ شیرك دا، ئنجا لە دوای بەرپەرچدانەوەی شیرك، بە هەر سێ جۆرەکەیەوە، پانتاییەکی باشیش بۆ خستنەڕووی نیشانەکانی خوا، کە لە هەمان کاتدا چاکەو نیعمەتەکانیشنی لە ژیانی مرۆڤدا، تەرخان کراوە، هەروەها باسی ڕۆژی دوایی و نیعمەتەکانی بەهەشت و، ئازارو مەینەتییەکانی دۆزەخیش

کراوەو، چەند جارێکیش باسی قورئان کراوە بە ناوەکانی: (**الكِتابُ المُبين**)، (**قرآناً عَرَبيّاً**)، (**جَاءَهُمُ الحَقّ**)، (**هَذا القُرآن**)، (**الّذي أُحِيَ إلَيكَ**)، بەم پێنج تەعبیرە لە چەند شوێنێکدا باسی قورئانیش کراوە.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی:

١- لەم سوورەتەدا لە قەدەر قەبارەی خۆی، پانتاییەکی زۆر بۆ بەرپەرچدانەوەی هەر سێك جۆری شیرك: هاوبەش دانان، ڕۆڵە بۆ لا پاڵدان، **طاغووت** پەرستیی، تەرخانکراوە.

٢- لەم سوورەتەدا لە دوو ئایەتدا، قسەی پووچی کافرەکان، شوێن باب و باپیرانمان دەکەوین، بە هەردوو تەعبیری:

أ- ﴿إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّهْتَدُونَ ﴿٢٢﴾﴾، و

ب- ﴿إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّقْتَدُونَ ﴿٢٣﴾﴾، هاتوە، کە تەنیا لەم سوورەتەدا، بەو شێوەیە بە دوو تەعبیری جیاواز ئەم مەسەلەیە، لە دوو ئایەتی بە دوای یەکدا هاتوە.

٣- تەنیا لەم سوورەتەدا، ئەو ڕاستییە، بەو ڕوونییە خراوەتە ڕوو، کە ئەگەر لەبەر تێکڕا کافر بوونی خەڵك نەبووایە، لەبەر ئەوە نەبووایە، خەڵك وەسەر کوفر بگەڕێ و، وەسەر شیرك بگەڕێ و هەمووی لە خوا هەڵبگەڕێتەوەو، سامان و نیعمەتێکی یەکجار زۆری بەسەر کافراندا دادەڕشت، کە لە ئایەتەکانی: (٣٣، ٣٤، ٣٥)دا، ئەو ڕاستییە خراوەتەڕوو: ﴿وَلَوْلَآ أَن يَكُونَ ٱلنَّاسُ أُمَّةً وَٰحِدَةً لَّجَعَلْنَا لِمَن يَكْفُرُ بِٱلرَّحْمَٰنِ لِبُيُوتِهِمْ سُقُفًا مِّن فِضَّةٍ وَمَعَارِجَ عَلَيْهَا يَظْهَرُونَ ﴿٣٣﴾ وَلِبُيُوتِهِمْ أَبْوَٰبًا وَسُرُرًا عَلَيْهَا يَتَّكِـُٔونَ ﴿٣٤﴾ وَزُخْرُفًا ۚ وَإِن كُلُّ ذَٰلِكَ لَمَّا مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۚ وَٱلْءَاخِرَةُ عِندَ رَبِّكَ لِلْمُتَّقِينَ ﴿٣٥﴾﴾ الزخرف.

٤- تەنیا لەم سوورەتەدا باسی پێکەنینی فیرعەونییەکان بە موعجیزەکانی مووسا ﷺ کراوە: ﴿ فَلَمَّا جَآءَهُم بِـَٔايَٰتِنَآ إِذَا هُم مِّنْهَا يَضْحَكُونَ ﴿٤٧﴾ ﴾ **الزخرف**، واتە: کاتێك نیشانەکانی ئێمەی بۆ هێنان، کتوپڕ پێیان پێکەنین، کە بە زۆریی وایە، بابای کاڵفام و، بابای نەزان بە شت پێدەکەنێ، لە جیاتی ئەوەی تێوەی ڕامێنێ، پێی پێدەکەنێ، ئینسانی عاقڵ لە شت ورد دەبێتەوەو تێی ڕادەمێنێ، شتێك کە نامۆ بێ و سەیر بێ، یەکسەر پێی پێ ناکەنێ، بەڵکو لێی ورد دەبێتەوە.

٥- تەنیا لەم سوورەتەدا فیرعەونییەکان، مووسایان ﷺ بە: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَ ٱلسَّاحِرُ ﴾، دواندوە، لە ئایەتی ژمارە: (٤٩)دا، بەڵێ لە شوێنەکانی دیکەدا باسی ئەوەیان کردوە، کە ئەمە جادووگەرەو، ئەمە جادووی هێناوە، بەڵام ئەوە کە ڕووبەڕوو پێی بڵێن: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَ ٱلسَّاحِرُ ﴾، تەنیا لەم سوورەتەدا لە ئایەتی ژمارە: (٤٩)دا هاتوە.

٦- تەنیا لەم سوورەتەدا، ئەو قسەو بیانووەی فیرعەون لە بارەی مووساوە ﷺ هاتوە: ﴿ فَلَوْلَآ أُلْقِىَ عَلَيْهِ أَسْوِرَةٌ مِّن ذَهَبٍ أَوْ جَآءَ مَعَهُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ مُقْتَرِنِينَ ﴿٥٣﴾ ﴾، واتە: دەبوایە بازنەی زێڕی فڕێدرابانە سەری، یاخود فریشتەکان بە جووت لەگەڵی دابانایەو هاوڕابان لەگەڵی و، پێکەوە هاتبانایە.

٧- تەنیا لەم سوورەتەدا، تەعبیری: ﴿ فَٱسْتَخَفَّ قَوْمَهُۥ فَأَطَاعُوهُ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا فَـٰسِقِينَ ﴿٥٤﴾ ﴾، هاتوە، واتە: فیرعەون خەڵکەکەی خۆی سووك کردو، کێشی کەم کردن، کە بە تەئکید مەبەست ئەوە نیە کێشی دابەزاند بن، مەبەست ئەوەیە کە لە زمانەکاندا هەیە، دەڵێ: فلان کەس پیاوێکی گرانەو، مرۆڤێکی گرانەو، قورسە، واتە: سووکەڵە نیەو، عەقڵ سووك نیەو، پیاوێکی دامەزراوە، مرۆڤێکی دامەزراوە، بەڵام فیرعەون بە چەواشەکردن و، بە هەڕەشەو گوڕەشە کردن، یاخود بە ترساندن و برسیی کردن، وای لێکردن کە ئەو عەقڵ و هۆش و گۆشەیان، وەك پێویست لێی بەهرەمەند نەبن، یاخود: ﴿ فَٱسْتَخَفَّ قَوْمَهُۥ ﴾، واتە: خەڵکەکەی خۆی سووك بینی و، سووکەڵەی بینین لە ڕووی عەقڵ و تێگەیشتنەوە، بۆیەش بەقسەیان نەکرد.

٨- تەنیا لەم سوورەتەدا، هاوبەش دانەرەکان بۆ پاساو هێنانەوەی شیرکەکەیان، وێنەیان بە عیسا ﷺ هێناوەتەوە: ﴿ وَلَمَّا ضُرِبَ ٱبْنُ مَرْيَمَ مَثَلًا إِذَا قَوْمُكَ مِنْهُ يَصِدُّونَ ﴿٥٧﴾ وَقَالُوٓاْ ءَأَٰلِهَتُنَا خَيْرٌ أَمْ هُوَ مَا ضَرَبُوهُ لَكَ إِلَّا جَدَلَۢا بَلْ هُمْ قَوْمٌ خَصِمُونَ ﴿٥٨﴾ ﴾، واتە: کاتێك (عیسای) کوڕی مەریەم بە وێنە هێنرایەوە، خەڵکەکەت بە هۆی ئەوەوە کردیان بە گاڵەو، گوتیان: ئایا پەرستراوەکانی ئێمە باشترن یان عیسا ﷺ؟ تەنیا بۆ شەڕە قسە، ئەو وێنەیان هێنایەوە، ئەوانە کۆمەڵێکی زۆر مشتومڕکەرن، یانی: سەریان بۆ شەڕە قسەو موجادەلە دەخورێ، وێنە هێنانەوەکەش ئەوە بوو، کە خوا ﷻ لە سوورەتی (الأنبیاء)دا، دەفەرموێ: ﴿ إِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنتُمْ لَهَا وَٰرِدُونَ ﴿٩٨﴾ ﴾، واتە: ئێوە خۆتان و ئەوانەی دەیانپەرستن، جگە لە خوا، دەبنە سووتەمەنیی دۆزەخ، ئێوە دەچنە نێوی.

هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانی مەککە، گوتیان: ئنجا ئایا پەرستراوەکانی ئێمە باشترن یان عیسا، واتە: ئەگەر بەپێی ئەو ئایەتە بێ، هەر کەس لەگەڵ پەرستراوەکەی دا بچێتە دۆزەخ، کەواتە: دەبێ نەصرانییەکانیش، عیسا ﷺ لەگەڵیاندا بچێتە دۆزەخ، چونکە نەصرانییەکانیش عیسا ﷺ دەپەرستن، بەڵام خوا ﷻ لێرەدا بەو جۆرە وەڵامدەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿ مَا ضَرَبُوهُ لَكَ إِلَّا جَدَلَۢا ﴾، هەر تەنیا بۆ شەڕە قسە بە وێنەیان هێنایەوە، ئەگەرنا وەك زانایانی وتوویژ (مُنَاظَرة) دەڵێن: (**هَـذَا قِيَاسٌ مَعَ الفَارِق**)، واتە: ئەوە پێوانەیەکە لەگەڵ جیاوازییدا، شتەکان دەبێ چۆنیەك بن، ئنجا پێوانە بکرێنە سەر یەك، یەکێك لەوی دیکە جیابێ، ڕەوا نیە قیاس بکرێنە سەر یەك، وەك دوایی باسی دەکەین.

٩- تەنیا لەم سوورەتەدا، عیسا ﷺ بە نیشانەی کاتەکە (**ساعَة**)، ئاخیر زەمان، یاخود قیامەت، یان هەردوو قۆناغی ئاخیر زەمان و قیامەت، واتە: ڕۆژی دوایی، دانراوە، وەك لە ئایەتی ژمارە: (٦١)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّهُۥ لَعِلْمٌ لِّلسَّاعَةِ فَلَا تَمْتَرُنَّ بِهَا وَٱتَّبِعُونِ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٦١﴾ ﴾، واتە: بە دڵنیایی عیسا ﷺ زانیارییە بۆ کاتەکە (**ساعَة**)، واتە: بە هۆی عیساوە دەزانرێ (**سَاعَة**) دێ، کە لە کۆتایی ڕۆژگاردا عیسا ﷺ دوای ئەوەی لە

ئاسمان دادەبەزێ، ئنجا دەزانرێ دوای دابەزینی عیسا ، تەمەنی دنیا زۆری بە بەر نەماوە، چونکە دوای ئەویش، کە دەججاڵ دەکوژێ، دوایی یەئجووج و مەئجووج دێن، دوای ئەویش نیشانە گەورەکانی دیکە دێن و، ژیانی مرۆڤ لەسەر زەوی دەپێچرێتەوە.

١٠- تەنیا لەم سوورەتەدا، تەعبیری: ﴿ ٱلْأَخِلَّآءُ يَوْمَئِذٍۭ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ إِلَّا ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٦٧﴾ ﴾، هاتوە، واتە: ئەوانەی زۆر یەکدییان خۆشویستوە، گیانی بە گیانی بوون لە دنیادا، لەو ڕۆژەدا، [لە ڕۆژی دواییدا] هەموویان پێکەوە، دەبنە دوژمن و ناحەز، جگە لە پارێزکاران، پارێزکارانێك کە لەبەر خوا یەکدییان خۆشویستوە، لەوێش ئەو خۆشەویستیی و مەحەببەت و، دۆستایەتیی و، بەزەیی و پەرۆشەیان، بۆ یەکدی بەردەوام دەبێ، چونکە لە دنیادا لە دۆستایەتیی یەکدیی بەهرەمەند بوون، شتێك کە لە دنیادا، بەهرەی پێگەیاندوون، لە قیامەتیش لە سەری بەردەوام دەبن، بەڵام ئەوانی دیکە، ئەو خۆشەویستیی و دۆستایەتییەی نێوانیان، لەبەر ئەوەی لەسەر بناغەیەکی پووچ بووە، یاخود لەسەر شتێکی ناهەق بووەو، بۆ ستەمکاریی بووە، بۆ زوڵم لەوانی دیکەو خراپەکاریی بووە، بۆیە لە دوارۆژدا تەماشا دەکەن، بەرهەمی ئەو دۆستایەتیی و نیزیکییە، بۆیان بۆتە ژەقنەبووت و مایەی مەینەتیی و ئازاری دۆزەخ، بۆیە لەوێ لێك دەبنە دوژمن.

١١- تەنیا لەم سوورەتەدا، تەعبیری: ﴿ أَمْ أَبْرَمُوٓا۟ أَمْرًا فَإِنَّا مُبْرِمُونَ ﴿٧٩﴾ ﴾ هاتوە، واتە: یان ئەوان بڕیارێکیان داوە، ئێمە بڕیاردەرین، واتە: یان ئەوان شتێکیان هەڵبڕیوەو، ئێمە هەڵبڕەرین، بۆ هەر کارو فەرمانێك کە بمانەوێ ئەنجامی بدەین.

## حەوتەم: دابەش کردنی ئایەتەکان بۆ چەند دەرسێك:

ئێمە سەرجەم ئەو (٨٩) ئایەتەمان بۆ حەوت دەرسان دابەش کردوون:

**دەرسی یەکەم:** ئایەتەکانی: (١ - ١٤)، واتە: چواردە ئایەتی سەرەتای ئەم سوورەتە دەگرێتە خۆی، کە باسی قورئان و نیشانەکانی خوا ﷻو، نیعمەتەکانی خوا لە ژیانی بەشەردا، دەکەن.

**دەرسی دووەم:** ئایەتەکانی: (١٥ - ٢٥)، واتە: یازدە ئایەت دەگرێتە خۆی، لەو یازدە ئایەتەدا، بەرپەرچدانەوەی شیرکی ڕۆڵە بڕیاردان بۆ خواو، لاساییکردنەوەی کوێرانەی پێشینان، پووچەڵکراونەوە.

**دەرسی سێیەم:** ئایەتەکانی: (٢٦ - ٤٥)، واتە: بیست ئایەت دەگرێتە خۆی، کە باسی ئیبراهیم ﷺ لە سێ ئایەتی سەرەتای داو، هەڵوێستی بەرانبەر بە بابی و بە گەلە بێبڕوایەکەی و، کە چۆن حاشای لێکردوون لە پەرستراوەکانیان و، ئیعلانی تەنیا خواپەرستیی کردوە، پاشان هەڵوێستی کافرەکانی مەککە خراوەتەڕوو، دڵدانەوەی پێغەمبەری خوا ﷺو ڕێنمایی کردنی و، خستنە ڕووی ئەو ڕاستییە کە ژیانی دنیا کەم بایەخە، ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە، خەڵك هەمووی یەك پارچە ببێتە بێبڕوا، ئەوانەی بێبڕوان، نازو نیعمەتی زیاتر لەوەی کە هەیانە، بەسەریدا دەڕشتن.

**دەرسی چوارەم:** ئایەتەکانی: (٤٦ - ٥٦)، واتە: لە یازدە ئایەت پێك دێ، باسی گۆشەیەك لە بەسەرهاتی مووسا ﷺ لەگەڵ فیرعەون، کە چۆن مووسا بە بەڵگە ڕۆشنەکانی خواوەو، بە نیشانەکانەوە چووە بۆ لای فیرعەون و کۆمەڵگایەکەی، بەڵام ئەوان گاڵتەیان پێکردوەو، بە جادووگەر ناوزەدیان کردوە، سەرەنجام فیرعەون بوغڕا بووەو، بە ماڵ و سەروەت و ساماناکەی، خۆی هەڵکێشاوە بەسەر مووسادا ﷺ، بەڵام سەرەنجام ئەو گەلەی کە فیرعەون گەوجاندبوونی و، چەواشەی کردبوون و، نەفام و نەزانی کردبوون، ئنجا چەوساندبوونیەوە، بە هۆی نەزانیی و نەفامییانەوە، خوا ﷻ بە توندترین شێوە سزای داون.

**دەرسی پێنجەم:** ئایەتەکانی: (٥٧ - ٦٥)، نۆ ئایەت دەگرێتە خۆی، باسی وێنە هێنانەوەی کافرەکانی مەککەیە بە عیسا ﷺ، لەسەر ڕاستیی شیرك و، ئەگەر وابێت هەر کەسێك، هەر شتێك بپەرستێ، لەگەڵ پەرستراوەکەی دەچێتە دۆزەخ، کەواتە: نەصرانییەکان کە عیسا ﷺ دەپەرستن، دەبێ عیساش لەگەڵ ئەواندا بچێتە دۆزەخ! خوا ﷻ بەرپەرچی ئەو قسەیانی داونەوەو، کە ئەو قیاسە لە

جێی خۆیدا نیەو، جۆرێکە لە چەواشەکاریی و سەفسەطە.

**دەرسی شەشەم:** ئایەتەکانی: (٦٦ - ٧٣)، واتە: هەشت ئایەت دەگرێتە خۆی، باسی هەندێك لە نازو نیعمەتەکانی بەهەشت بۆ هەندێك لە پارێزکاران کراوەو لە نێو نازو نیعمەتەکاندا باسی ئەوە کراوە: ﴿ وَفِيهَا مَا تَشْتَهِيهِ ٱلْأَنفُسُ وَتَلَذُّ ٱلْأَعْيُنُ ﴿٧١﴾ ﴾الزخرف، بۆ ئەوان لە بەهەشتدا هەیە، هەر شتێك نەفسیان بیخوازێ و، ئارەزووی بکات، هەر شتێك کە چاوو لە دیتنی و تەماشاکردنی چێژ وەربگرێ.

**دەرسی حەوتەم:** ئایەتەکانی: (٧٤ - ٨٩)، کە شازدە ئایەتی کۆتایی دەگرێتە خۆی، باسی سەرەنجامی شوومی تاوانباران لە دۆزەخداو، دووبارە بەرپەرچدانەوەی شیرك بە هەردوو جۆرەکەیەوە، واتە: شیرکی هاوبەش بۆ خوا دانان و، ڕۆڵە پاڵدان بۆ لای خوا، سەرەنجام فەرمانکردنی خوا ﷻ بە پێغەمبەر ﷺ، کە با چاوپۆشییان لێبکات و وازیان لێ بێنێ، خوا ﷻ هەڕەشەیان لێدەکات، کە دەفەرموێ: ﴿ فَٱصْفَحْ عَنْهُمْ وَقُلْ سَلَٰمٌ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿٨٩﴾ ﴾الزخرف، لە مەودوا دەزانن چییان بەسەر دێ، ئەگەر لەسەر ئەوەی لەسەرینی بەردەوام بن.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە چـوارده (١٤) ئایەتـی سـەرەتای ئـەم سـووڕەتە موبارەکـە پێـك دێ، کـە بریتیـن لـە ئایەتەکانـی: (١ - ١٤)، کـە لـە پێنـج ئایەتـی سـەرەتادا، باسـی قوڕئـان و، پێناسـەی قوڕئـان و، پێگـەی قوڕئـان کـراوە.

لە سێ ئایەتی دواتردا، باسی پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ**) دەکرێ.

لـە شـەش ئایەتـی کۆتاییشـدا، باسـی بەدیهێنەرایەتیـی خـواو، ژمارەیـەك لـە نیشـانەو بەڵگەکانـی کـراوە، کـە هـاوکات ئـەو نیشـانەو بەڵگانـە، چاکـەو نیعمەتـی خواشـن، بـۆ مرۆڤـەکان، کـە سـەرجەم ئەگـەر بڵێیـن: شـەش بەڵگـەو نیشـانەن، هـاو کات، شـەش چاکـەو نیعمەتـی خواشـن:

١- هێنانەدی ئاسمانەکان و زەمین.

٢- زەوی کردن بە لانکە، یاخود ڕاخستن و ئامادە کردن، کە بە هۆیەوە بتوانرێ، ژیانێکی ئاسایی لەسەر بگوزەرێنن.

٣- ڕێ و بان تێدا دانانی زەوی، واتە: خوا ﷻ زەوی وا هەڵخستوە، کە مرۆڤەکان بتوانن ڕێ و بانی تێدا دروست بکەن، بۆ وێنە: ئەگەر توێکڵی زەوی وەك ئاسن و پۆڵا بووایە، چۆن دەیانتوانی ڕێی تێدا دروست بکەن و بیکۆڵن؟.

٤- دابەزاندنی ئاوێکی بە ئەندازە، لەسەرێوەو پێ ژیاندنەوەی زەوی، زەوییەکی ڕەق هەڵاتووی مردوو، ئەو ئاوەش کە دادەبەزێنرێ، بە هەر سێ شێوەی باران و بەفرو تەرزە، دادەبارێ.

٥- دروستکردنی سەرجەم جووتەکان، کەوا پێدەچێ مەبەست پێی ڕووەکەکان بێ، هەڵبەتە وشەی (**أزواج**) بە جووتی ئاژەڵ و مرۆڤ و ڕووەك و، بەڵکو ماددەی بێ ژیانیش، بەڵکو

هەموو دروستکراوەکانی گەردوون دەگوترێ، چونکە هەموو دروستکراوەکان جووتن و تەنیا خوا تاکە، بەڵام بەپێی سیاق لێرەدا دەردەکەوێ، کە مەبەست لە جووتەکان، جووتی ڕووەکەکانەو، ئاوی ئاسمان، جووتە ڕووەکەکان و شیناوردەکان، دەڕوێنێ.

٦- ڕەخساندنی کەشتیی و ئاژەڵان بۆ بار و سواریی مرۆڤەکان.

لـە کۆتاییشـدا باسـی یـاد کردنـی چاکـەی خـواو، بـە پاکگرتنـی کـراوە، لـە کاتـی بەهـرە لێوەرگرتنـی ئامرازەکانـی بـارو سـواردا.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ حمٓ ﴿١﴾ وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُبِينِ ﴿٢﴾ إِنَّا جَعَلۡنَٰهُ قُرۡءَٰنًا عَرَبِيّٗا لَّعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ
﴿٣﴾ وَإِنَّهُۥ فِيٓ أُمِّ ٱلۡكِتَٰبِ لَدَيۡنَا لَعَلِيٌّ حَكِيمٌ ﴿٤﴾ أَفَنَضۡرِبُ عَنكُمُ ٱلذِّكۡرَ
صَفۡحًا أَن كُنتُمۡ قَوۡمٗا مُّسۡرِفِينَ ﴿٥﴾ وَكَمۡ أَرۡسَلۡنَا مِن نَّبِيّٖ فِي ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿٦﴾
وَمَا يَأۡتِيهِم مِّن نَّبِيٍّ إِلَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ﴿٧﴾ فَأَهۡلَكۡنَآ أَشَدَّ مِنۡهُم بَطۡشٗا وَمَضَىٰ
مَثَلُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿٨﴾ وَلَئِن سَأَلۡتَهُم مَّنۡ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ لَيَقُولُنَّ خَلَقَهُنَّ
ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٩﴾ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ مَهۡدٗا وَجَعَلَ لَكُمۡ فِيهَا سُبُلٗا
لَّعَلَّكُمۡ تَهۡتَدُونَ ﴿١٠﴾ وَٱلَّذِي نَزَّلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءَۢ بِقَدَرٖ فَأَنشَرۡنَا بِهِۦ بَلۡدَةٗ مَّيۡتٗاۚ
كَذَٰلِكَ تُخۡرَجُونَ ﴿١١﴾ وَٱلَّذِي خَلَقَ ٱلۡأَزۡوَٰجَ كُلَّهَا وَجَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلۡفُلۡكِ وَٱلۡأَنۡعَٰمِ
مَا تَرۡكَبُونَ ﴿١٢﴾ لِتَسۡتَوُۥاْ عَلَىٰ ظُهُورِهِۦ ثُمَّ تَذۡكُرُواْ نِعۡمَةَ رَبِّكُمۡ إِذَا ٱسۡتَوَيۡتُمۡ عَلَيۡهِ وَتَقُولُواْ
سُبۡحَٰنَ ٱلَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَٰذَا وَمَا كُنَّا لَهُۥ مُقۡرِنِينَ ﴿١٣﴾ وَإِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ
﴿١٤﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بـە نـاوی خـوای بـە بەزەیـی بەخشـندە، حـا میـم (١) سـوێند بـە کتێبـی ڕۆشـنکەرەوە (٢) ئێمـە گێڕاومانـە بـە قورئانێکـی عەرەبیـی، بەڵکـو (مانـاو مەبەسـتەکانی) بفامـن (٣) بـە دڵنیاییـش ئـەو (قورئـان)ە، لـە دایکـی (ئەسـڵی) کتێبـدا، لـە لامـان یەکجـار بـەرزو کارزانـە (٤) ئنجا ئایا (ئـەی بێبڕواینـە!) بـە هـۆی ئـەوەوە، کـە ئێـوە کۆمەڵێکـی زێـدەڕۆن، (قورئـانی) بیرخـەرەوە (دانەبەزێنیـن و) لێتان دوور بخەینـەوە؟ (٥) گەلێـك پێغەمبەریشـمان لـە (گـەل و کۆمەڵـگا) پێشـووەکاندا نـاردوون (٦) هیـچ پێغەمبەرێکیشـیان بـۆ نەهاتـوە، مەگـەر گاڵتەیـان پێکـردوە (٧) کەسـانی وامـان لـە نێـو بـردن کـە زۆر لـەوان (بێبڕوایـان)، بـە زەبرتـر بـوون و، حـاڵ و بەسـەرهاتی پێشـووانیش ڕابـرد، (لـە نێـو چـوون و تەنیـا بـاس و خواسـیان مایـەوە) (٨) ئەگـەر لێشـیان بپرسـی: کـێ ئاسـمانەکان و زەوی وەدیهێنـاون؟ بـە جەختکردنـەوە دەڵێـن: (خـوای) زاڵـی زانـا هێناونیـە دی (٩) ئـەو کەسـەی کـە زەوی بـۆ گێـڕاون بـە شـوێنی تێـدا پشـوودان و، ڕێیەکانـی بـۆ ئێـوە تێـدا دانـاون، بەڵکـو بـە ڕێیـە بزانـن (و پێیانـدا بگەنـە ئامانجەکانتـان) (١٠) هەروەهـا ئـەو (بـە دیهێنـەری گـەردوون) ئـەو کەسـەیە، ئاوێکـی بـە ئەنـدازەی لەسـەرێوە دابەزانـدوە، ئیـدی سـەر زەمینێکـی مردوومـان پـێ ژیاندۆتـەوە، (لـە ڕۆژی دواییـدا ئێـوەش) بـەو شـێوەیە دەردەهێنرێنـەوە (١١) هەروەهـا (خـوا) ئـەو کەسـەیە، کـە هەمـوو جووتەکانـی دروسـتکردوون و، لـە کەشـتییان و ئاژەڵانیـش ئـەوەی بـۆ ڕەخسـاندوون کـە (بـۆ بـارو هاتوچـۆ) سـواری بـن (١٢) (خـوا ئـەو هۆکارانـەی بـۆ ڕەخسـاندن) تاکـو لەسـەر پشـتیان سـەقامگیر بـن و، هـەر کاتیـش چوونـە سـەر (پشـت)یان یـادی چاکـەی پەروەردگارتـان بکەنـەوەو، بڵێـن: پاکیـی بـۆ ئـەو کەسـەی ئـەوەی بـۆ ڕام و دەستەمۆ

کردووین و، ئێمە بۆیان ملپێکەچکەر نەبووین ﴿١٣﴾ ئێمەش (دوای مردنمان) هەر بۆ لای پەروەردگارمان دەگەڕێینەوە ﴿١٤﴾].

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(صَفْحًا): (صَفْحُ الشَّيءِ: عَرْضُهُ وَجَانِبُهُ، وَالصَّفْحُ: تَرْكُ التَّثرِيبِ وَهُوَ أَبْلَغُ مِنَ العَفْوِ، وَضَرَبْتُ عَنْهُ صَفْحًا، أي: أَعْرَضْتُ عَنْهُ)، بە پانایی شتێك و لاتەنیشتی شتێك دەگوترێ: (صَفْحَةُ العُنُق)، واتە: لامل، هەروەها وشەی (صَفْح): بریتیە لە وازلێهێنانی سەرکۆنەکردن، کە ئەمە لە (عَفْو) مانایەکەی بەهێزترە، (عَفْو): ئەوەیە چاوپۆشیی لێ بکەی، بەڵام (صَفْح): ئەوەیە وێڕای چاوپۆشیی لۆمەشی نەکەی، چاوپۆشیی کردن، ڕەنگە نەرمە گلەییەکی تێدابێ، بەڵام (صَفْحُ) ئەوەیە هەر لاملی تێ بکەی، وەك ئەوەی ئەو کەسە، خراپەی هەر نەکردبێ، (ضَرَبْتُ عَنْهُ صَفْحًا، أي: أَعْرَضْتُ عَنْهُ)، واتە: ڕووم لێ وەرگێڕا، لێی دوورکەوتمەوە، کە دەفەرموێ: ﴿ أَفَنَضْرِبُ عَنكُمُ ٱلذِّكْرَ صَفْحًا ﴾، ئایا (ذِكْر) کە قورئانە، لە ئێوەی دووربخەینەوە؟ بە هۆی ئەوەوە کە ئێوە زێدەڕۆییکارن، واتە: واناکەین.

(مُّسْرِفِينَ): (السَّرْفُ: تَجَاوزُ الحَدِّ فِي كُلِّ فِعْلٍ يَفْعَلُهُ الإِنْسَانُ، وَإِنْ كَانَ فِي الإِنْفَاقِ أَشْهَر)، وشەی (سَرْف): بریتیە لە سنوور بەزاندن لە هەر کارێکدا مرۆڤ دەیکات، هەرچەندە لە خەرجکردن دا باوترە، بەڵام بۆ شتی دیکەش هەر بەکاردێ.

(بَطْشًا): (البَطْشُ: تَنَاوُلُ الشَّيءِ بِصَوْلَةٍ)، (بَطْش): بریتیە لەوە بە توندیی پەلاماری شتێك بدرێ، بە کوردیی (بَطْش) زەبرو پەلاماردان و هەڵکوتانە سەری پێ دەگوترێ.

(مَثَلُ): (بِمَعْنَى مِثْل، نَحو شَبَه وَشِبْه، نَقْض وَنِقْض، المَثَلُ: الوَصْفُ وَالخَبَرُ، أو المُشَابَهَةُ لِغَيره فِي مَعْنَىً مِنَ المَعَانِي، أوِ الصِّفَةُ وَالوَصْفُ)، وشەی (مَثَل): بە پێی سیاقەکان مانایەکەی دیاریی دەکرێ، زۆر مانای هەن، بە مانای (مِثْل) دێ، واتە: وەك وێنەی ئەو شتە، وەك (شَبَه، شِبْه)، (مَثَل ومِثْل)، (نَقْض وَنِقْض)، واتە: هەڵوەشانەوە، (مَثَل) بە مانای وەسفیش دێت، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَلِلَّهِ ٱلْمَثَلُ ٱلْأَعْلَىٰ ﴿٦٠﴾ ﴾النَّحل، واتە: وەصفی هەرە بەرز تەنیا بۆ خوایە، (مَثَل) بە مانای خەبەریش دێ، ﴿ وَمَضَىٰ مَثَلُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٨﴾ ﴾الزخرف، واتە: هەواڵی پێشووان تێپەڕی، یانی: (سَبَقَ خَبَرُ الأوَّلِيْن)، (مَثَل): بریتیە لەوە، کە شتێك بە شتێك بچێ، لە واتایەك لە واتاکاندا، یان لە سیفەتێك لە سیفەتەکانیدا.

(مَهْدًا): (المَهْدُ: مَا يُهَيَّأُ للصَّبِيِّ، المَهْدُ وَالمِهَادُ: المَكَانُ المُمَهَّدُ المُوَطَّأُ) (مهْد) بۆ ئەو شوێنە بەکاردێ، کە بۆ منداڵ ساز دەکرێ، ئنجا جۆلانەیە، لانکەو بێشکەیە، جێیەکی بۆ ڕادەخرێ کە تێیدا پشوو بدات، بەڵام وشەی (المَهْدُ وَالمِهَاد) بە هەر شوێنێکیش دەگوترێ کە ئامادە و ساز بکرێ و مرۆڤ تێیدا پشوو بدات، یاخود ژیانی تێدا بگوزەرێنێ، ﴿ أَلَمْ نَجْعَلِ ٱلْأَرْضَ مِهَٰدًا ﴿٦﴾ ﴾النبأ، واتە: زەوییمان پان ڕاخستوەو، ئامادەو سازمان کردوە، کە ئێوە ژیانی تێدا بگوزەرێنن، وەك چۆن جۆلانەو بێشکەو لانکە، بۆ منداڵی ساوا ساز دەکرێ، کە تێیدا پشوو بدات.

(فَأَنشَرْنَا): (النَّشْرُ: التَّوزِيعُ)، (نشر): بریتیە لە بڵاوکردنەوە، (نَشَرَ الثَّوبَ وَالصَّحِيفَةَ وَالسَّحَابَ)، واتە: پۆشاکەکەی بڵاوکردەوەو، پەڕەکەی پان ڕاخست، هەورەکەی بڵاوکردەوە، (نَشَرَ المَيِّتَ: أَحْيَاهُ)، ﴿ فَأَنشَرْنَا بِهِۦ بَلْدَةً مَّيْتًا ﴾، واتە: سەر زەمینێکی مردوومان پێ ژیاندەوە.

(بَلْدَةً): (البَلْدَةُ: المَكَانُ المُحِيطُ المَحْدُودُ المُتَأثِّرُ بِاجتِمَاع قُطَّانِهِ، وَإِقَامَتِهِم فِيهِ)، (بَلْدَة): بە شوێنێك دەگوترێ دەورەدرابێ و، سنوورداربێ و کارتێکراو بێ بە دانیشتووەکانی، کە لەسەری کۆبوونەتەوەو، ژیان دەگوزەرێنن.

( لِتَسْتَوُۥاْ عَلَىٰ ظُهُورِهِۦ ): تاکو بچنە سەر پشتیان، (**تَعْتَدِلوا وَتَسْتَقِرُّوا**)، یانی: ڕێك بن و، سەقامگیر بن لەسەر پشتی ئەو ئاژەڵانەی کە بۆ بارو سوار بەکاریان دێنن، یاخود پشتی ئەو کەشتییانە، کە بۆ بارو سوار بەکاریان دێنن، خوا بۆی ڕام و دەستەمۆ کردوون.

(مُقۡرِنِينَ): (**المُقْرِنُ: المُطِيقُ**)، واتە: ملپێکەچکەر، توانا بەسەرداشکاو، (**أَقْرَنَ، أي: أَطَاقَ**)، واتە: توانای بەسەریدا شکا، (**مُقْرِنِيْن**): هەم بە مانای توانا بەسەردا شکاوان دێ، هەم بە مانای (**مُطَوِّعِيْن**)، واتە: ملپێکەچکەران و، بە مانای کۆنترۆڵکەران (**ضَابِطِين**)یش لێکدراوەتەوە، ﴿ وَمَا كُنَّا لَهُۥ مُقۡرِنِينَ ﴿١٣﴾ ﴾ **الزخرف**، واتە: ئێمە کۆنترۆڵکەرنین بۆ ئەو ئاژەڵانە، ئەی خوایە! ئەگەر تۆ نەبووای و، بۆت دەستەمۆ نەکردباین، هەروەها بۆ کەشتییەکان، یاخود (**مُقْرِنِيْن أي: مُماثِلِينَ في القُوَّة**)، ئێمە بە قەدەر ئەو ئاژەڵە، یاخود بە قەدەر ئەو کەشتیی و هۆکاری هاتوچۆیانە، توانامان نەبوو، ئەگەر تۆ بۆت ملکەچ و دەستەمۆ نەکردباین.

(لَمُنقَلِبُونَ): (**الإنقِلاَبُ: الرُّجُوعُ إلى المَكَانِ الَّذِي يُفَارِقُهُ**)، (**إنْقِلاَب**): بریتیە لە گەڕانەوە بۆ شوێنێك، کە لێی جیادەبێتەوە، کەواتە: ﴿ وَإِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ ﴿١٤﴾ ﴾، واتە: ئێمە بۆ لای پەروەردگارمان دەگەڕێینەوە، واتە: ئێرە واز لێ دێنین، ئەم سەر زەوییە، جەستەکەمان تێکەڵ بە خاك دەبێتەوەو، ڕووحەکەشمان دەچێتەوە بۆ ئەو شوێنەی، خوا دیاریی کردوەو، لە ڕۆژی دواییشدا جەستەو ڕووح، دەچینەوە بۆ ئەو شوێنەی، خوا ﷻ بۆی دیاریی کردووین، لە ڕۆژی کۆکردنەوەو لێپرسینەوەو، پاشان سزاو پاداشتدا.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خوا ﷻ لەم سوورەتەدا، وەك لە خستنەڕووی ئێوەڕۆك و پێناسەکەیدا، باسمان کرد، هەر سێ تەوەرە گەورەو گرنگ و سەرەکییەکەی قورئانی مەککەیی:

أ- باسی خوا ﷻو، بەدیهێنەرایەتیی و، پەروەردگاریێتیی و، خاوەنداریێتیی خوا، ئنجا تەنیا پەرستراوێتیی و، ناوو سیفەتەکانی خواو، ئەوە کە دەبێ تەنیا خوا بەندایەتیی بۆ بکرێ و، بپەرسترێ، بە مانای فراوانی پەرستن.

ب- هەروەها باسی قورئان و، کتێبەکانی خواو، باسی وەحیی و، پێغەمبەرایەتیی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، بە گشتیی کراوەو، بە تایبەت پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ.

ج- هەروەها باسی ڕۆژی دوایی، بە هەردوو قۆناغی ئاخیر زەمان و، قیامەت و هەڵسانەوە، پاشان نیشتەجێ بوونی بڕواداران لە بەهەشتدا، کە هەرچی دڵیان بیخوازێ تێیدایەو، گرفتار بوونی بێبڕوایان بە دۆزەخەوە، کە تێیدا تووشی هەموو جۆرە سزاو ئازارو مەینەتییەك دەبن، کە هەر بۆیان وێنا (تصوّر) نەکراوە لە ژیانی دنیایاندا.

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾، بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، زۆرجاران دووبارەمان کردۆتەوەو لێرەش دووبارەی دەکەینەوە، کە دەگوترێ: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾، واتە: ئەم کارە دەست پێدەکەم، یان دەست پێکردنی ئەو کارەم، بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندەیە، لە کاتێك دا مرۆڤ ئەو وشە موبارەکە دەڵێ: دەبێ بەلای کەمەوە چوار واتایان بە عەقڵ و دڵی خۆیدا بێنێ:

١- ئەو کارە بە ناوی خوا دەکەم، نەك بە ناوی خۆم، یان بە ناوی کەسێك، یان ناوی هەر شتێکی دیکە.

٢- ئەم کارە بۆ ڕازییکردنی خوا ئەنجام دەدەم.

٣- ئەم کارە بەپێی شەرع و بەرنامەی خوا ئەنجام دەدەم.

٤- ئەم کارە بەتواناو ئاسانکاریی خوا ئەنجام دەدەم، نەك بەشان و شەوکەت و توانای خۆم.

﴿حمٓ﴾، حا میم، دوو پیتن، وەك لە سەرەتای سوورەتی (**غافِر**)دا باسمان کرد، سوورەتەکانی: (**غافِر، فُصِّلَت، الشوری، الزخرف، الدُّخَان، الجَاثية، والأحقَاف**)، پێیان دەگوترێ: خاوەنانی حا میم (**ذوات حميم**)، یان (**آلُ حميم**)، ئەو حەوت سوورەتە بە (**حم**) دەست پێ دەکەن، بەو دوو پیتە، کە ئێمە لە سەرەتای سوورەتی (**يُونُس**)دا باسێکی دوورو درێژمان، لە بارەی ئەو پیتە پچڕ پچڕانەوە کرد، کە لە سەرەتای (٢٩) لە سوورەتەکانی قورئاندا هاتوون، باشترین مانا کە تاکو ئێستا پێی گەیشتبم، ئەوەیە کە خوا ﷻ لە ڕێی باسکردنی ئەو پیتە پچڕ پچڕانەوە، تێمان دەگەیەنێ، ئەی مرۆڤەکان! ئەو قورئانەی لەبەر دەستتانە فەرمایشتی خوایەو، هەر لەو پیتانەی کە ئێوە قسەیان پێ دەکەن و، پێیان دەنووسن، پێکهاتوە، بەڵام کە ئێوە ناتوانن، نەك وێنەی قورئان، بەڵکو دە سوورەت، بگرە سوورەتێکی بێنن، سوورەتێکی سێ ئایەتی وەك (**العصر**) یان (**الكَوثَر**) یان (**النَّصر**)، کەواتە: بزانن و دڵنیابن، بەس خوا ئەو فەرمایشتەی فەرمووە، هەر لەو پیت و دەنگانەی کە لەبەر دەستی ئێوەشدا هەن، وەك کەرەستەی خاو، بەڵام کە ئێوە ناتوانن وەك ئەو بێنن، بزانن تەنیا خوا ﷻ ئەو فەرمایشتەی فەرمووەو، ئەو فەرمایشتە نە هی موحەممەدە ﷺ نە هی جگە لە ئەوە، وەك زەینتان، ئەی بێبڕوایەکان! خلیسکەتان پێ دەبات و، شەیتان فریوتان دەدات، لەو بارەوە دوو دڵییتان دەخاتە عەقڵ و دڵەوە.

﴿وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُبِينِ﴾، سوێند بە کتێبی ڕۆشنکەرەوە، یان: کتێبی ڕۆشن.

﴿إِنَّا جَعَلۡنَٰهُ قُرۡءَٰنًا عَرَبِيّٗا لَّعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ﴾، ئێمە ئەو کتێبە ڕۆشنکەرەوەیەمان گێڕاوە، بە قورئانێك بە زمانی عەرەبیی بەڵکو بفامن!، یاخود گێڕاومانە بە

قورئانێکی ڕۆشن، وێڕای ئەوەی بە زمانی عەرەبان دەگوترێ: (**اللُّغَة العَرَبيَّة**)، بە هەمان شێوەش، عەرەبیی واتە: زمانێکی ڕۆشن، بۆچی؟ تاکو تێبگەن و بفامن، خوا ﷻ لە قەدەر عەقڵی ئێمە، ئێمەی دواندوە، ئەگەرنا خوا ﷻ لە قەدەر زانیاریی بێ سنووری خۆی ئێمەی دواندبایە، لێی حاڵیی نەدەبووین، بەڵام خوا ﷻ لە قەدەر عەقڵی ئێمە، ئێمەی دواندوەو، ئەو ماناو مەبەستانەی ویستوویەتی بە ئێمە بگەن، بۆی خستووینە قاڵب و تەعبیری واوە، کە لێیان تێبگەین.

﴿ وَإِنَّهُۥ فِىٓ أُمِّ ٱلْكِتَـٰبِ لَدَيْنَا لَعَلِىٌّ حَكِيمٌ ﴾، بە دڵنیایی ئەم کتێبە، ئەم قورئانە، لە ئەسڵی کتێبدا، لە لامان زۆر بەرزەو، زۆریش پڕ حیکمەتە، یاخود زۆریش کارزانە، ئنجا: ﴿ أُمِّ ٱلْكِتَـٰبِ ﴾، وەك لە دواییدا باسی دەکەین، هەندێك دەڵێن مەبەست پێی: (**اللَّوحُ المَحفُوظ**)ە، کە بە (**الكِتابُ المُبِين**)یش هاتوەو بە (**كِتابُ مَكنون**)یش هاتوە، بە (**إمام مبين**)یش، هەندێکیش دەڵێن، مەبەست لە (**اللَّوحُ المَحفُوظ**) و (**الكِتابُ المُبِين**) و (**كِتابٍ مَكنُون**) و (**إمام مبين**) هەموو ئەمانە، مەبەست پێیان زانیاریی خوای بەرزو بێ وێنەیە، گرنگ ئەوەیە خوا ﷻ دەفەرموێ: ئەم قورئانە لە زانیاریی منداو، لە لای ئێمە زۆر بەرزەو، زۆریش کارزان و کاربەجێیە.

﴿ أَفَنَضْرِبُ عَنكُمُ ٱلذِّكْرَ صَفْحًا أَن كُنتُمْ قَوْمًا مُّسْرِفِينَ ﴾، ئەمە پرسیارکردنێکی نکووڵیلێکەرانەیە، خوا ڕوو لە بێبڕواییەکان دەکات: ئایا بەهۆی ئەوەوە ئێوە کۆمەڵێکی زێدەڕۆییکارن، ئێمە ئەم زیکرو ئەم یادخەرەوەیەتان لێ دووربخەینەوەو بۆتان دانەبەزێنین؟ لەبەر ئەوەی ڕەخنەی لێ دەگرن، پێی ڕازی نین، یان تۆمەتی جادوو بوون، یاخود شیعر بوون، پاڵبدەنە لای قورئان، یاخود تۆمەتی کاهین بوون و، جادووگەر بوون و، پاڵبدەنە لای پێغەمبەر ﷺ ئایا وازتان لێ بێنین؟ واتە: وازتان لێناهێنین و، ئەم قورئانە دادەبەزێنین، ئەگەر ئێوە بڕوای پێ نەهێنن، خەڵکێکی دیکە بڕوای پێدەهێنێ، ﴿ فَإِن يَكْفُرْ بِهَا هَـٰٓؤُلَآءِ

فَقَدْ وَكَّلْنَا بِهَا قَوْمًا لَّيْسُوا بِهَا بِكَافِرِينَ (٨٩) ﴾الأنعام، ئەگەر ئەوانە پێی بێبڕوا بن، کەسانێکی دیکەمان پێ ڕاسپاردوون، کە پێی بێبڕوا نابن، بەڵکو بە دڵ و گیان قبووڵی دەکەن.

﴿ وَكَمْ أَرْسَلْنَا مِن نَّبِيٍّ فِي الْأَوَّلِينَ ﴾، ئنجا لە دوای باسی قورئان، دێتە سەر باسی پێغەمبەرایەتیی موحەممەد ﷺ، پێغەمبەرایەتیی موحەممەدیش ﷺ، شتێکی داهێنراو نیەو، شتێك نیە کە پێشینەی نەبووبێ، (كَم) لێرەدا (كَم الخَبَرِية)ی پێ دەگوترێ و بۆ زۆرییە، واتە: (كَثيراً أرسَلنَا مِن نَبِيٍّ فِي الأوَّلِين)، زۆر پێغەمبەرمان لە گەلە پێشووەکاندا ڕەوانە کردن.

﴿ وَمَا يَأْتِيهِم مِّن نَّبِيٍّ إِلَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ ﴾، هیچ پێغەمبەرێکیشیان بۆ نەهات، مەگەر گاڵتەیان پێدەکردن، واتە: ئێستاش گاڵتە بە تۆ دەکەن و، بڕوات پێ ناکەن، تۆمەتت دەدەنە پاڵ، لە دڵی خۆتی مەگرە، عادەتی گەلان و کۆمەڵگاکان لە ڕابردووشدا هەر وابووە.

﴿ فَأَهْلَكْنَا أَشَدَّ مِنْهُم بَطْشًا وَمَضَىٰ مَثَلُ الْأَوَّلِينَ ﴾، ئنجا کەسانێك کە زۆر لەوانە زەبریان توندتر بوو و، بەهێزتر بوون و، بە تواناتر بوون، لە نێومان بردن و هەواڵی ڕابردووانیش تێپەڕی، واتە: بوونە پەندی زەمانەو، تەنیا ناویان لە کتێبەکانی مێژوودا ماوە، وەك گەلی عادو سەموود **لووط** و گەلەکانی دیکە.

﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ ﴾، ئنجا دوای باسی قورئان و، باسی پێغەمبەرایەتیی، دێتە سەر باسی بەدیهێنەرایەتیی و، پەروەردگارێتیی و، خاوەندارێتیی خواو، نازو نیعمەتەکانی خواو، نیشانەکانی خوا، دەفەرموێ: ئەگەر لێیان بپرسی: کێ ئاسمانەکان و زەوی هێناونە دی، لە نەبوونەوە پەیدای کردوون؟، ﴿ لَيَقُولُنَّ خَلَقَهُنَّ الْعَزِيزُ الْعَلِيمُ ﴾، بە جەختکردنەوەوە دەڵێن: خوای زاڵی زانا هێناونیە دی.

﴿ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ مَهْدًا ﴾، بێگومـان ئەمـە فەرمایشـتی خوایـە، ئێواخنـی وەڵامەکـەی ئەوانـی کـردوە:

ئـەو کەسـەی زەوی بـۆ ئامـادە کـردوون، یاخـود زەوی وەك بێشـکە، چـۆن منداڵ تێیـدا دەسرەوێ ئـاوای لێکـردوە، ﴿ وَجَعَلَ لَكُمْ فِيهَا سُبُلًا ﴾، هەروەهـا ڕێـی بـۆ تێـدا گێـڕاون، واتـە: وایکـردوە بتوانـن، ڕێیانـی تێـدا دروسـتبکەن، ﴿ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴾، بەڵکـو ڕێ بگرنـە بـەر، بـەرەو ئامانجەکانـی خۆتـان و، بـە هـۆی ڕێیەکانـەوە بگەنـە ئـەو ئامانجانـەی دەتانـەوێ.

﴿ وَٱلَّذِى نَزَّلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً ﴾، هەروەهـا خـوا ﷻ خاوەنـی ئێـوەو، پـەروەردگارو بەدیهێنـەری گەردوونـەو، ئـەو کەسـەیە کـە لـە سـەرێوە، ئـاوی بـۆ دابەزانـدوون، ﴿ بِقَدَرٍ ﴾، بـە ئەنـدازە، نـە کەمـتر لـە پێویسـتیی خۆتـان، نـە زیاتریـش وەك تۆفانەکـەی نـووح، ﴿ فَأَنشَرْنَا بِهِۦ بَلْدَةً مَّيْتًا ﴾، ئێمـە سـەرزەمینێکی مردوومـان پـێ ژیانـدەوە، ﴿ كَذَٰلِكَ تُخْرَجُونَ ﴾، هـەر بـەو شـێوەیەش، ئێـوە دەردەهێنرێنـەوە.

﴿ وَٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْأَزْوَٰجَ كُلَّهَا ﴾، هەروەهـا خـوا ﷻ بەدیهێنـەرو پـەروەردگارو خاوەنـی ئێـوە: ئـەو کەسـەیە هەمـوو جووتەکانـی دروسـتکردوون، جووتـەکان دەگونجـێ مەبەسـت پێـی تێکـڕای جووتـی دروسـتکراوەکان بـێ، چونکـە هەمـوو دروسـتکراوەکان جووتـن: ئاسـمان و زەویـی، ساردو گـەرم، دنیاو دواڕۆژ، بەهەشـت و دۆزەخ، نێـرو مـێ، هەمـووی جووتە، دەشـگونجێ مەبەسـت پێـی جووتـی ڕووەکەکان بـێ، ﴿ وَجَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلْفُلْكِ وَٱلْأَنْعَٰمِ مَا تَرْكَبُونَ ﴾، هەروەهـا لـە کەشتییەکان و لـە ئاژەڵانیـش، هـۆکاری وای بـۆ ڕەخسـاندوون، کـە سـواریان بـبن و، بـۆ بـارو سـوار بەکاریـان بێنـن.

﴿ لِتَسْتَوُۥا عَلَىٰ ظُهُورِهِۦ ﴾، بـۆ ئـەوەی بچنـە سـەر پشـتیان، پشـتی ئاژەڵـەکان و، پشـتی کەشـتییەکان، پشـتی ئـەو هۆکارانـەی بـۆی ڕەخسـاندوون، ﴿ ثُمَّ تَذْكُرُوا

﴿ نِعۡمَةَ رَبِّكُمۡ إِذَا ٱسۡتَوَيۡتُمۡ عَلَيۡهِ ﴾، دوایی یادی چاکەی پەروەردگارتان بکەنەوە، بەسەر خۆتانەوە، هەر کاتێك چوونە سەر پشتیان و سەقامگیر بوون، ﴿ وَتَقُولُواْ سُبۡحَٰنَ ٱلَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَٰذَا وَمَا كُنَّا لَهُۥ مُقۡرِنِينَ ﴾، هەروەها بڵێن: پاکیی بۆ ئەو کەسەی ئەوەی بۆ ڕام و دەستەمۆ کردووین و، ئێمە توانامان بەسەریدا نەدەشکا، ئێمە نەماندەتوانی کۆنترۆڵیان بکەین، لەبەر ئەوەی زۆر بەهێزن، حوشترێك، گایەك، کەرێك، گامێشێك، فیلێك، لە مرۆڤ عاسێ ببێ، بە سەد کەس پێی ناوێرن، بەڵام خوا وایکردوە، دەستەمۆ بن.

﴿ وَإِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە بۆ لای پەروەردگارمان دەگەڕێینەوە، واتە: بەو سەفەرانەی دەیکەن لە ژیانی دنیاتاندا، سەفەری ژیانی خۆتان بێتەوە یاد، کە ئێوەش سەرەنجام و مەنزڵگای کۆتاییتان بۆ لای خوای پەروەردگارە، کەواتە: خۆتان ئامادە بکەن، بۆ دیداری خوا، لە مەنزڵگای کۆتاییدا.

## مەسەلە گرنگەكان

### مەسەلەی یەكەم:

**پێناسەی قورئان بە كتێبێكی ڕۆشنكەرەوە، بە زمانی عەرەبیی كە بۆ تێگەیاندن نێرراوە، لە ئەسڵی كتێب (زانیاریی خوا)دا، بەرزو كارزانەو، ناگونجێ بە هۆی زێدەڕۆیی و سەرەڕۆیی بێبڕوایانەوە، لە كوفرو شیركدا، خوا ئەو قورئانە بیرخەرەوەیان لێ دووربخاتەوەو، بۆیان دانەبەزێنێ، واتە: خوا ﷻ نابێ بە نەفامیی ئەوان بكات، بەڵكو دەبێ هەر لە قەدەر كەرەم و بەزەیی و بەخشندەیی و، بەرزو بێ وێنەیی خۆی، لەگەڵ بەندەكاندا مامەڵە بكات:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿حمٓ ۝١ وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُبِينِ ۝٢ إِنَّا جَعَلۡنَٰهُ قُرۡءَٰنًا عَرَبِيّٗا لَّعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ ۝٣ وَإِنَّهُۥ فِيٓ أُمِّ ٱلۡكِتَٰبِ لَدَيۡنَا لَعَلِيٌّ حَكِيمٌ ۝٤ أَفَنَضۡرِبُ عَنكُمُ ٱلذِّكۡرَ صَفۡحًا أَن كُنتُمۡ قَوۡمٗا مُّسۡرِفِينَ ۝٥﴾،

### شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿حمٓ﴾، ئەمانە دوو پیتن: پیتی (ح) و پیتی (م)، یانی: ئەم قورئانە هەر لەو پیتانە پێك دێ، كە دەیاننوسن و پێیان دەدوێن، كۆی ئەو پیتانەش كە بەكارهێنراون، لە سەرەتای (٢٩) لە سوورەتەكانی قورئاندا، كۆی هەموویان چواردە (١٤) پیتن، كە هەموو جۆرەكانی پیتەكانیان تێدان، وەك لە سەرەتای تەفسیری (الشُّعَرَاء)دا، لەو بارەوە چەند ڕوونكردنەوەیەكمان داون.

٢)- ﴿وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُبِينِ﴾، سوێند بە كتێبی ڕوونكەرەوە، یان ڕۆشن، (و) لێرەدا، دەگونجێ بۆ بادانەوەو گێڕانەوە بێ، كە ئەگەر وابێ، مانای وایە: ﴿حمٓ﴾، سوێندە، دواییش

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَٱلْكِتَـٰبِ ٱلْمُبِينِ ﴾، واتە: هەروەها کتێبی ڕۆشنکەرەوەیە، دەشگونجێ (و) لێرەدا بۆ سوێند پێ خواردن بێ، واتە: سوێند بە کتێبی ڕۆشنکەرەوە، واتە: (**الكِتَابِ المُبِين**)، دەبێتە سوێند پێخوراو (**مُقْسَمٌ بِهِ**)، ئایا سوێند لەسەر خوراوەکە چییە؟ ﴿ إِنَّا جَعَلْنَـٰهُ قُرْءَ ٰنًا عَرَبِيًّا ﴾، ئێمە گێڕاومانە بە قورئانێکی عەرەبیی، وشەی: (**مُبِيْن**) ئەگەر لە (**أَبَانَ المتعدِّي**)ەوە هاتبێ، بە مانای ڕوونکەرەوە دێ، (**أَبَانَ**) لەو کاتەدا بەرکار (**مفعول به**) دەخوازێ، (**أَبَانَ المُدَرِّسُ الدَّرسَ**)، وانەبێژەکە دەرسەکەی ڕوون کردەوە، دەشگونجێ بڵێین: ﴿ وَٱلْكِتَـٰبِ ٱلْمُبِينِ ﴾، واتە: سوێند بەو کتێبە ڕۆشنە، یانی: فامکراوەو، ئاڵۆز نیە، ئەو کاتەش (**مُبِيْن**)، لە (**أَبَانَ**)ی (**لازم**)ەوە هاتوە، وەك (**أَبَانَ القَمَرُ**)، واتە: مانگەکە دەرکەوت، واتە: ﴿ وَٱلْكِتَـٰبِ ٱلْمُبِينِ ﴾، واتە: کتێبێکی ڕۆشن، لە ڕابردووشدا چەند جارێك لە بارەی وشەی: (**مُبِيْن**)ەوە، قسەمان کردوە، کە بەپێی سیاقەکان، جاری وا هەیە دەگونجێ بە هەردوو مانای (**اللاَزِم والمُتَعَدِّي**) بێ، جاری واش هەیە تەنیا دەگونجێ بە مانای (**لازِم**) بێ، جاری واش هەیە بەس دەگونجێ بە مانای (**مُتَعَدِّي**) بێ.

٣)- ﴿ إِنَّا جَعَلْنَـٰهُ قُرْءَ ٰنًا عَرَبِيًّا ﴾، ئێمە گێڕاومانە بە قورئانێکی عەرەبیی، وشەی: ﴿ جَعَلْنَـٰهُ ﴾، (**أي: قُلنَاهُ، أو أَنْزَلْنَاهُ، أو كَوَّنَّاهُ**)، واتە: بێژتوومانەو، یان دامانبەزاندوە، یان پێکمان هێناوە، ئەم کتێبە ڕۆشنە، یان ڕۆشنکەرەوەیە، لە شێوەی قورئانێکی عەرەبییدا، ئەمە ئەگەر (**جَعَلَ**)، بە مانای گوتن یان دابەزاندن، یان پێکهێنان بێ، واتە: یەك بەرکار (**مَفعُول به**) بخوازێ، بەڵام ئەگەر دوو بەرکاران بخوازێ، ئەو کاتە بە مانای: (**سَمَّيْنَاهُ وَوَصَفْنَاهُ، قُرْآناً عَرَبِيّاً**)، ئێمە ئەو قورئانەمان ناو ناوە، یاخود وەسفان کردوە بە قورئانێکی عەرەبیی.

وشەی (**عَرَبِي**): پێشتریش باسمان کردوە، کە وەك چۆن بە مانای زمانێك دێ، کە هی نەتەوەیەکی دیارییکراوە، کە نەتەوەی عەرەبە، هاوکات بە مانای زمانێکی ڕۆشنیش دێ، (**أَعْرَبَ عَنْ رَأْيِهِ**)، ڕایەکەی خۆی ڕوونکردەوە، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {**الثَّيِّبُ تُعْرِبُ عَنْ نَفْسِهَا بِلِسَانِهَا، وَالْبِكْرُ رِضَاهَا صَمْتُهَا**} (**أخرجه أحمد: ١٧٢٧١، تعليق شعيب الأرنؤوط: صحيح لغيره**)، واتە: (لە کاتی

مارەکراندا)، بێوەژن ڕای خۆی دەردەخات، کچیش دەبێ مۆڵەتی لێوەربگیرێ، بەڵام ئەگەر قسەش نەکات، بێ دەنگییەکەی نیشانەی ڕازیی بوونیەتی.

هەر (**إِعْرَاب**) واتە: ڕوونکردنەوەی ڕستەیەك، کە پێکهاتەکانی ئەو ڕستەیە چۆنن، وەك هەر سێ پێکهاتە سەرەکییەکەی، کامیان ناوەو، کامیان کردارەو، کامیان پیتە؟ چۆنیەتیی پەیوەندییان پێکەوە، (**إعراب**) واتە: ڕوونکردنەوە.

کەواتە: (**عَـرَبِيّ**): ﴿ إِنَّا جَعَلۡنَٰهُ قُرۡءَٰنًا عَرَبِيّٗا ﴾، دەگونجێ مەبەست پێی، قورئانێکی ڕۆشن، مانا ڕۆشن بێ، دەشگونجێ مەبەست پێی قورئانێك بێ بە زمانی نەتەوەی عەرەب، عەرەبییش بۆ نەتەوەی عەرەب زمانێکی ڕۆشن بووە.

٤)- ﴿ لَّعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ ﴾، بەڵکو بفامن، هەندێك لە توێژەرەوان وایان لێکداوەتەوە، کە (**لَعَلَّكُم تَفْهَمُونَ أَيُّهَا العَرَب**)، یانی: بۆیە بە زمانی عەرەبییە تاکو تێبگەن، ئەی گەلی عەرەب! بەڵام ئەگەر (**عَرَبِيّ**) بە مانای ڕۆشن بێ، یانی: قورئانێك خوێنراوەیەکی ڕۆشنە، تاکو تێی بگەن، ئەی مرۆڤەکان! ئنجا ئەگەر هەر بە مانای زمانی عەرەبییش بێ، یانی: بۆ ئەوەی تێی بگەن و، بیفامن، ئەی مرۆڤەکان، بە عەرەب و جگە لە عەرەبەوە، واتە: ئەگەر مەبەست لە (**عَرَبِيّ**) زمانی عەرەبییش بێ، ئێمە مولزەم نین، بڵێین: دوێنراوەکان تەنیا گەلی عەرەبن، چونکە خوا ﷻ بەڵێ بە زمانی عەرەبیی ناردوویەتی و، هەر دەبوو بە زمانێك بێ.

ئنجا خوا لە نێو هەموو زمانەکاندا زمانی عەرەبیی هەڵبژاردوە، لەبەر کۆمەڵێك تایبەتمەندیی کە لە زمانی عەرەبییدا هەن، بەڵام بۆ هەموو مرۆڤایەتییە، ﴿ لَّعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ ﴾، بەڵکو تێبگەن و، بیفامن و، بیری لێبکەنەوە.

٥)- ﴿ وَإِنَّهُۥ فِيٓ أُمِّ ٱلۡكِتَٰبِ لَدَيۡنَا لَعَلِيٌّ حَكِيمٌ ﴾، بە دڵنیایی ئەم کتێبە، ئەم قورئانە، لە دایکی کتێب دا لە لای ئێمە بەرزی کارزانە.

﴿ أُمِّ ٱلۡكِتَٰبِ ﴾، خوێنراویشەتەوە: (**إِمِّ الكِتَاب**)، کە هەر بە مانای ئەسڵی کتێبە، (**أُم**) بە مانای دایك دێ، دایك بۆیە پێی دەگوترێ (**أُم**) چونکە ئەصڵە بۆ هەموو ڕۆڵەکانی و، ئەوان لەو جیا دەبنەوە، کەواتە: هەر شتێکیش ئەصڵ بوو

بێ، بۆ شتەکانی دیکە، پێی دەگوترێ: (أُم)، وەك دەگوترێ: (**أُمُّ القُرَى**)، کە ناوی شاری مەککەیەو، بە سوورەتی (**الفَاتِحة**) دەگوترێ: (**أُمُّ الكِتَاب**)، چونکە ماناو مەبەستەکانی کە لە سوورەتی (**الفَاتِحة**)دا هەن، گشتگیرن، وەك چوارچێوەیەك وان، بۆ هەموو ماناو مەبەستەکانی سوورەتەکانی دیکەی قورئان.

مەبەست لە: ﴿ أُمِّ ٱلْكِتَٰبِ ﴾، لە شوێنی دیکەشدا هاتوە، وەك خوا ﷻ لە سوورەتی (البروج)دا، دەفەرمووێ: ﴿ بَلْ هُوَ قُرْءَانٌ مَّجِيدٌ ﴿٢١﴾ فِى لَوْحٍ مَّحْفُوظٍۭ ﴿٢٢﴾ ﴾، بەڵكو ئەمە قورئانێکی پایەدارە، پایە بەرزە، شكۆ بەرزە، لە تەختێکی پارێزراودا، (**لَوح**) واتە: تەخت، شتێك کە لەسەری بنووسرێ، لە سوورەتی (**الوَاقِعَة**)شدا، دەفەرمووێ: ﴿ إِنَّهُۥ لَقُرْءَانٌ كَرِيمٌ ﴿٧٧﴾ فِى كِتَٰبٍ مَّكْنُونٍ ﴿٧٨﴾ ﴾، ئەمە قورئانێکی بەخشندەیە، یان بەرێزە، لە نووسراوێکی پەنهان و شێردراوەدا، لە سوورەتی (یس) یشدا دەفەرمووێ: (**وَكُلَّ شَيْءٍ أَحْصَيْنَاهُ فِي إِمَامٍ مُبِينٍ**) ئنجا لێرەش دەفەرمووێ: ﴿ أُمِّ ٱلْكِتَٰبِ ﴾، کەواتە: مەبەست لە (**أُمُّ الكِتَاب**) و (**لَوحُ مَحفُوظ**) و (**كِتَابٍ مَكنُون**)، (**إمام مبين**) یەك شتە، یانی: ئەم قورئانە، بەر لەوەی بێتە بەردەستی ئێمە، لە (**أُمُّ الكِتَاب**) و (**لَوحُ مَحفُوظ**) و (**كِتَابٍ مَكنُون**) و (**إمام مبين**) دا هەبووە، قورئانێکی مەجید بووەو، قورئانێکی کەریم بووەو، بەرزو کارزان (**عَلِيٌّ حَكِيم**)یش بووە.

ئنجا ئایا مەبەست لە (**أُمُّ الكِتَاب**) و (**لَوحُ مَحفُوظ**) و (**كِتَابٍ مَكنُون**)، (**إمام مبين**)، دروستکراوێکە لە دروستکراوەکانی خوا، کە هەموو زانیارییەکانی خوای تێدا تۆمار کرابن؟.

دەڵێین: ئەمە رایەکی زانایانە، بەڵام هیچ دەقێکی سوننەتمان نیە، پشتڕاستی ئەوە بکاتەوە، یاخود ناچارمان بکات، کە: (**أُمُّ الكِتَاب**)و، (**لَوحُ مَحفُوظ**)و، (**كِتَابٍ مَكنُون**)، دروستکراوێکی خوا بێ و، هەموو زانیارییەکانی خۆی تێدا تۆمار کردبن.

یاخود مەبەست پێیان زانیاریی خوایە، بەڵام خوا ﷻ لێرەدا بەپێی عەقڵی ئێمە، دەماندوێنێ، کە ئێمە ئەگەر زانیارییەکمان هەبێ، بمانەوێ لێمان

تێکنەچێ، دەینووسین و، تۆماری دەکەین، وەك گوتراوە: (قَيِّدُوا العِلمَ بِالكِتَابَة)، چونکە زانیارییەك ئەگەر لە کتێبێکدا نووسیبمان، یان لەسەر تەختێك یان لەسەر بەردێك هەڵمان کەندبێ، لە بیرمان ناچێ و دەپارێزرێ، بۆیە خوا ﷻ ئەو تەعبیرەی بەکارهێناوە.

بە هەر حاڵ لە لای خوای پەروەردگار ئاسانە، دروستکراوێکی هەبێ، هەموو زانیارییەکانی لە بارەی دروستکراوەکانی خۆی تێدا تۆمار کردبن، دەشگونجێ مەبەست پێی زانیاریی خوا ﷻ بێ، بەڵام خوا ﷻ بەپێ عەقڵی ئێمە، ئێمەی دواندوە، هەر بۆیەش جارێك دەفەرموێ: (أُمُّ الكِتَاب) و جارێ دەفەرموێ: (لَوحٌ مَحفُوظ) و جارێ دەفەرموێ: (كِتَابٍ مَكنُون) و جارێك (إمام مبين).

٦)- ﴿ أَفَنَضۡرِبُ عَنكُمُ ٱلذِّكۡرَ صَفۡحًا أَن كُنتُمۡ قَوۡمٗا مُّسۡرِفِينَ ﴾، (لێرەدا خوا ڕوو لە بێبڕوایەکان دەکات، بێبڕوایەکانی ڕۆژگاریی پێغەمبەر ﷺ، دەشگونجێ هەموو بێبڕوایان بە درێژایی زەمان و، بە پانایی زەمین، هەموویان بگرێتەوە)، ئایا بیرخەرەوەتان لێ دووربخەینەوەو بۆتان دانەبەزێنین، بەهۆی ئەوەوە، کە ئێوە کۆمەڵێکی زێدەڕۆییکارن؟ وشەی (أَن) خوێنراویشەتەوە: (إن)، (إن كُنتُم قَومَاً مُسْرِفِين)، ئایا لە حاڵێکدا ئێوە کۆمەڵێکی زێدەڕۆییکار بوون، ئێمە بیرخەرەوەتان، (قورئانی بیرخەرەوەتان) لێ دووربخەینەوە؟!

ئەم تەعبیرە، کە دەفەرموێ: ﴿ أَفَنَضۡرِبُ عَنكُمُ ٱلذِّكۡرَ صَفۡحًا ﴾، (الزَّمَخْشري) دەڵێ: (الفَاءُ فِي قَوْلِهِ: ﴿ أَفَنَضۡرِبُ عَنكُمُ ٱلذِّكۡرَ صَفۡحًا ﴾، للعَطْفِ، عَلَى مَحْذوفٍ تَقْدِيرُهُ، أَنُهْمِلُكُم ونَضْرِبُ عَنْكُمُ الذِّكرَ صَفْحَاً) واتە: (ف) بۆ بادانەوەیە لەسەر شتێکی قرتێنراو، کە بەو شێوەیە دەگونجێ دابنرێ: ئایا پشتگوێتان بخەین و، بیرخەرەوەتان لێ دووربخەینەوە، بە هۆی ئەوەوە کە ئێوە زێدەڕۆییکارن، یان لە حاڵێکدا کە ئێوە زێدەڕۆییکارن؟ ئەگەر بڵێ: (أَن)، یانی: (لأَجْلِ)، بە هۆی زێدەڕۆیی ئێوەوە، ئێمە بیرخەرەوەتان لێ دووربخەینەوە، بەڵام ئەگەر (إن)، بێ، واتە: لە حاڵێکدا کە ئێوە زێدەڕۆییکارن، ئێمە قورئانتان لێ دووربخەینەوەو، بیرخەرەوەتان لێ دووربخەینەوە؟

(الـضَّرْبُ: القَـرْعُ، وَهُنَـا اسْـتُعِيرَ لِلقَطْـعِ وَالـصَّرْفِ)، (قَـرْع): بـه مانـای لێدانـی شـتێکه، بـەڵام لێـرەدا خوازراوەتـەوە بـۆ بڕینـی شـتێك و لادانـی شـتێك، وشـەی (صَفْح) پێشـتر باسـمان کـرد، بـە مانـای لاتەنیشـت و ڕووپـەڕی شـتێك دێ، لێـرەدا دەڵـێ: (مَصدَرٌ، صَفَـحَ عَـنْ كَـذَا أي: أَعْـرَضَ، مَفعُـولٌ مُطْلَـق، ﴿ أَفَنَضْرِبُ عَنكُمُ ٱلذِّكْرَ صَفْحًا ﴾، يعنـي: أَفَنَصْفَـحُ عَنْكُـمُ الذِّكْـرَ صَفْحَـاً)، یـانی: ئایـا لاملتـان تێبکەیـن و، پشـتگوێتان بخەیـن، بـە پشـتگوێ خسـتن، یاخـود (صَفْحَاً: مَنْصُـوبٌ علـى النِّيَابَـةِ عَـنِ الظَّـرْفِ، أي: فِي مَـكَانِ صَفْـحٍ مِثْـلُ: ضَعْـهُ جَانِبَـاً)، ﴿ أَفَنَضْرِبُ عَنكُمُ ٱلذِّكْرَ صَفْحًا ﴾، ئەمـە (صَفحـاً) مەنصووبـە، حاڵەتـی ئیعرابییەکەشـی ئەوەیـە، کـە نائیبـە بـۆ (ظَرْف)ێـك، وەك گوتـراوە: (ضَعْـهُ جَانِبَـاً)، لـەولا دایبنـێ، (ضَرَبَ عَنْـهُ صَفْحَـاً)، واتـە: پشـتگوێی خسـت و، ئـەو شـتەی لـێ دوورخسـتەوەو پێـی نـەدا.

بێگومـان کـە دەفەرمـوێ: ﴿ أَفَنَضْرِبُ عَنكُمُ ٱلذِّكْرَ صَفْحًا ﴾، هەمـزە (أ) ەکـە بـۆ پرسـیارکردنی نکووڵییلێکەرانەیـە، کـە ئەویـش دوو واتایـان دەگرێتـەوە:

١- (هَلْ نَتْرُكُكُم وَنُهمِلُكُم؟)، ئایا وازتان لێ بێنین و پشتگوێتان بخەین؟

٢- (هَلْ نَترُكُ تَذْكِيرَكُم؟)، ئایا بیرخستنەوەی ئێوە پشتگوێ بخەین، واتە: لێتان بگەڕێین و، بیرتان نەخەینەوەو ئامۆژگارییتان نەکەین؟

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّا جَعَلْنَٰهُ قُرْءَٰنًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴾، ئەمـە دوو واتایـان دەگرێتـە خـۆی:

أ- دەرخستنی پێگەی بەرزی قورئان و، ستایشکردنیەتی، بەوە کە ئەم قورئانە، بە زمانێکی زۆر ڕوون و پاراو و ڕۆشن دابەزێنراوە.

ب- ڕەخنەگرتنە لە بێبڕوایەکان، گەلی عەرەب بە تایبەت، کە یەکەم دوێنراو بوون، دوای ئەوانیش هەر کەسێکی دیکە کە بێبڕوا دەبێ، ئەم قورئانە لەگەڵ ئەوەشدا بە زمانێکی زۆر ڕۆشن نێردراوە، کەچی ئەوان گوێی بۆ ناگرن و پێی کارتێکراو نابن و، وەری ناگرن.

کەواتـە: لـە یـەك کاتـدا، هـەم ستایشـکردنە بـۆ قورئـان، هـەم ڕەخنەگرتنـە لـە ناحەزانـی قورئـان و، لەوانـەی قورئـان ڕەفـز دەکـەن.

# کورتە باسێک
# لە بارەی عەرەبیی بوونی قورئانەوە

لە پێنج بڕگەدا، ئەم کورتە باسە دەخەینەڕوو:

**١)- بە زمانی عەرەبیی بوونی قورئان، لە چەندان ئایەتدا باسکراوە:**

ئـەوە کـە قورئـان بـە زمانـی عەرەبیـی نێـردراوە، واتـە: بـە زمانـی ئـەو نەتەوەیـەی پێیـان دەگوتـرێ: عـەرەب، زمانەکەشـیان پێـی دەگوتـرێ: زمـانی عەرەبیـی (**اللِسـان العَـرَبِي**) یاخـود (**اللُّغَـة العَرَبِيـة**)، ئەمـە لـە زۆر شـوێنی قورئانـدا باسـکراوەو جێـی مشـتومڕ نیـە، کـە قورئـان بـە زمانـی نەتـەوەی عـەرەب هاتـوە.

بۆ وێنـــە:

١- ﴿ إِنَّا جَعَلْنَٰهُ قُرْءَٰنًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٣﴾ ﴾**الزخرف**، ئێمە گێڕاومانە بە قورئانێکی عەرەبیی بەڵکو بفامن.

٢- ﴿ إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ قُرْءَٰنًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٢﴾ ﴾**یوسف**، واتە: ئێمە بە قورئانێکی عەرەبیی دامانبەزاندوە، بۆ ئەوەی تێبگەن.

٣- ﴿ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَٰهُ حُكْمًا عَرَبِيًّا ﴿٣٧﴾ ﴾**الرعد**، واتە: ئێمە گێڕاومانە بە حیکمەتێك، بە زمانی عەرەبیی، بێگومان حوکم لێرەدا بە مانای حیکمەتە.

٤- ﴿ وَإِنَّهُۥ لَتَنزِيلُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٩٢﴾ نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ ﴿١٩٣﴾ عَلَىٰ قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ ﴿١٩٤﴾ بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُّبِينٍ ﴿١٩٥﴾ وَإِنَّهُۥ لَفِى زُبُرِ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٩٦﴾ ﴾**الشُّعَرَاء**، لە سوورەتی (**الشُّعَرَاء**)دا لە هەموو شوێنەکان، خوا ﷻ ڕوونتر، ئەو ڕاستییە بەیان دەکات، کە بریتیە لە عەرەبیی بوونی قورئان:

واتــە: بــە دڵنیایــی ئــەم قورئانــە دابەزێـنراوی پــەروەردگاری جیهانییانــە، (**روح الأمین**) دایبەزانـدوە بۆسـەر دڵـی تـۆ، تاکـو تـۆ لـە وریاکـەرەوان و ترسـێنەرەوان بـی، بـە زمانێکـی عەرەبیـی ڕۆشـن، لـە کتێبـە پێشووەکانیشـدا، ئـەو بـاس و خـواسی هەیـە.

## ٢)- بە عەرەبیی بوونی قورئان، لە یەك کاتدا دوو واتای هەن:

**یەکەم:** قورئان بە زمانی عەرەبییە، کە نەتەوەی عەرەب بە زمانی عەرەبیی قسە دەکەن، پێشتریش گوتمان، گەلی عەرەب زمانی خۆیان پێ ڕۆشن بووە، لەبەر ئەوەی باش لێی تێگەیشتوون و، باش یەکدییان پێ تێگەیاندوە، بەڵام زمانی نەتەوەکانی دیکەیان بە (**أعجَمي**) ناوناوە، لەبەر ئەوە بۆیان ناڕۆشن بوون، هەڵبەتە ئەوە بۆ نەتەوەکانی دیکەش هەر وایە، بابایەکی ئینگلیز، ئیسپانیی، ڕووسیی، یابانیی، کورد، فارس، تورك، هەموو ئەوانە زمانی خۆیان پێ ڕۆشنە، پێی لێك تێکدەگەن و، پێی حاڵیی دەبن، زمانی غەیری خۆیان، ئنجا عەرەبیی بێ یان هەر زمانێکی دیکە، پێیان ناڕۆشنە، ئەمە شتێکی ڕێژەییە، بەڵام گرنگ ئەوەیە، عەرەبیی بوونی قورئان، ئەوە دەگەیەنێ کە بە زمانی عەرەبییە، بە زمانی نەتەوەی عەرەب.

**دووەم:** هاو کات ئەوەش دەگەیەنێ، کە قورئان بە شێوەیەکی ڕۆشنە، کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا جَعَلْنَٰهُ قُرْءَٰنًا عَرَبِيًّا ﴿٣﴾ ﴾**الزخرف**، وەك چۆن ئەوە دەگەیەنێ کە بە زمانی عەرەبییە، ئەوەش دەگەیەنێ، کە بە زمانێکی ڕۆشنە، یاخود ڕۆشنکەرەوەیە، یانی: شێوازی دابەزینی ئەم قورئانە، شێوازێکی ڕۆشنە، بۆ هەر کەسێك کە شارەزای زمانی عەرەبیی بێ، بۆی ڕۆشنە، بەڵام کەسێك کە عەرەبیی نەزانێ، بۆ وی ناڕۆشنە.

## ٣)- ئایا وشەی غەیرە عەرەبیی لە قورئاندا هەن یان نا؟

لەو بارەوە زانایان سێ ڕایان هەن:

**یەکەم:** هیچ وشەیەکی جگە لە عەرەبیی لە قورئاندا نیە، ئەم ڕایە ژمارەیەك لە زانایان تەبەننییان کردوە، لە نێویاندا: (**الشَّافِعي، أَبو عُبَيْدَة، إِبنُ فارس، الطَّبَري، البَاقلاَّني، الرَّازي ... هتد**).

**دووەم:** وشەی جگە لە عەرەبیی لە قوڕئاندا هەن، ئەم ڕایە گێڕدراوەتەوە لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس و عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوودەوە (خوا لێیان ڕازی بێ)، هەروەها لە (**وَهَب بْنِ مُنَبِّه و سَعِيدِ بْنِ جُبَيرٍ و عِكْرِمَة ومُجَاهِد و عَطَاء وضَحَّاك**) کە هەموویان زانایانی شوێنکەوتووانن، هەروەها هەر کام لە (**الزَّمَخْشَري، إبنُ عجيبة، السُّيوطِي...**) هی دیکەش، ڕایان وایە وشەی جگە لە عەرەبیی لە قوڕئاندا هەن.

منیش ڕام وایە، کە ئەوە جێی مشتومڕ هەر نیە، کە وشەی نا عەرەبیی لە قوڕئان دا هەن.

**سێیەم:** وشەی نا عەرەبیی تێدان، بەڵام عەرەب ئەو وشانەیان بە زمانی خۆیان گۆ کردوون و، عەرەباندوویانن، واتە: وەك چۆن هەندێك وشە هەن، عەرەبیی بوون، بەڵام کوردێنراون، بۆ وێنە، (**كِتاب**) کورد کردوویەتی بە کتێب، (**قَلَم**) کورد کردوویەتی بە قەڵەم، هەروەها گەلێ وشەی دیکە هەن، کە کورد کورداندوونی و، فارس فارساندوونیی و، زمانەکانی دیکەش، بە شێوەی خۆیان گۆیان دەکەن، سەرو گوێیان شکاندوون، بە شێوەیەك کە لەگەڵ زمانەکەی واندا بگونجێن، ئەگەر پیتێکیان تێدا هەبێ، کە لە زمانی واندا نەبێ، ئەو پیتانەی لە زمانی خۆیاندا هەن، لە جیاتی ئەوان دایاناون.

هەڵبەتە ئەم ڕایەی سێیەم ئەوەی دووەمیش دەگرێتە خۆی.

(**السُّيوطي**) دوو کتێبی هەن لەو بارەوە:

**أ- المُتَوَكِّل فِيما فِي القرآنِ مِنَ المُعَرَّب).**

**ب- (المُهَذَّب فِيما وَقَع فِي القرآنِ مِنَ المُعَرَّب).**

لەو دوو کتێبەیدا، بە چەند سەنەدێك دەیباتەوە سەر هاوەڵان و، دەیباتەوە سەر شوێنکەوتووان، کە وشەی نا عەرەبیی لە قوڕئاندا هەن، ئەو دەڵێ: وشەی دە (١٠) زمانی جیاواز لە قوڕئان دا هەن: (**الحَبَشِيَّة، وَالفَارِسِيَّة، وَالرُّومِيَّة، وَالهِنديَّة، وَالسّريانيَّة، وَالعِبريَّة، وَالنَّبَطيَّة، وَالقِبْطِيَّة، وَالتُّرْكِيَّة، وَالزَّنجيَّة، وَالبَرْبَريَّة**)، واتە: ئەو

وشـانەی کـە لـە قورئانـدا هـەن، هەندێکیـان دەگەڕێنـەوە بـۆ زمانـی حەبەشـەو، یاخـود بـۆ فارسـی، یاخـود بـۆ ڕۆمیـی، یـان بـۆ هیندیـی، یـان بـۆ سـورەیانیی، یـان بـۆ عیبرانیـی، یـان بـۆ نەبەطیـی، یـان بـۆ قیبطـي، یـان بـۆ زمانـی تورکیـی، یـان زەنجیـی، یـان بەربەریـی.

بەڵکـو ئەگـەر وردتـر سـەرنج بـدرێ، وشـەی کوردییـش هـەن: کـە کوردیـی و فارسـیی ڕیشـەیان یەکـەو ڕەنگـە زمانـی دیکـەش پەیدابـن.

**٤)- هەشت ووشەی نا عەرەبیی بەنموونە:**

**١- سِـجيل. ٢- المِشـكاة. ٣- اليَـم. ٤- الطُـور. ٥- أباريـق. ٦- إستَـبـرَق. ٧- سُـندس. ٨- زَرَابِيّ.**

هەمـوو ئـەو وشـانە، نـا عەرەبییـن، بـۆ وێنـە: (**سِجيل**) ئەوانـەی شـارەزای زمانـی فارسـیین، وەك (**الطَّـبَري**)و (**فَخـرَ الدِّيـن الـرَّازي**)، کـە هـەر فـارس بـوون، دەڵێـن: (**سِـجِّيل**) لـە سـەنگی گڵـەوە هاتـوە، سـەنگی گل، واتـە: بـەردی قـوڕ، بـەڵام پیتـی (گ) لـە عەرەبییـدا نیـە، بۆیـە (**ج**)یـان بەکارهێنـاوە، (سـنج جـل)، دواییـش تێکیانـدا دەغـم کـردوون و بۆتـە (**سِـجيل**).

وشـەی (**زَرَابِي**) کـۆی (**زَربي**)ە، کـە لـە ڕاسـتییدا ژێـر پێیـە، بـەڵام پیتـی (ژ)و پیتـی (پ) لـە عەرەبییـدا نیـن، بۆیـە لـە جیاتـی (ژ)، (ز)یـان بەکارهێنـاوەو، لـە جیاتـی (پ)، (**ب**)یـان بەکارهێنـاوە، کەواتـە: ژێـر پێیەکـە بۆتـە: (**زربي**) بـە (**زَرَابِي**) کۆیـان کردۆتـەوەو عەرەباندوویانـە.

هەروەهـا وشـەکانی دیکـە: (**المِشـكاة، اليَـم، الطُـور، أباريـق، إسـتَبرَق، سُـندُوس**) ئەوانیـش ڕیشـەی عەرەبییـان نیـە، ئنجـا نـەك ئەوەنـدە، بەڵکـو نـاوی پێغەمبـەران (عَلَيْهِـمُ الصَّـلَاةُ وَالسَّـلَامِ)، بەبـێ هـەڵاواردن، جگـە لـە (**هـود وصالِـح**)، کـە وا پێدەچـێ عـەرەب بووبـن، ئەگەرنـا هـەر کام لـە وشـەکانی (**إبراهيـم، إسـمَاعيل، إسـحَاق، يَعقُوب،**

شُعَیب، یُوسُف، موسى، عیسى، نوح، إدریس، آدم، لوط) و گەلێك ناوی دیكەش، لە قورئاندا هەن، هی پێغەمبەران و جگە لە پێغەمبەران، بۆ وێنە: (لُقمان) ئەوانە هیچ پەیوەندییان بە زمانی عەرەبییەوە نیە.

## ٥)- عەرەبیی بوونی قورئان، لەگەڵ هەبوونی وشە ناعەرەبییەكاندا، ناكۆك نیە:

چونكە هیچ زمانێك لە دنیادا نیە، زمانێك بێ، پاك بێ لە وشەی بیانیی، لە وشەی جگەلە خۆی، هیچ زمانێك نیە، لەبەر ئەوەی هیچ نەتەوەیەك نەبووە، زمانێك بۆ خۆی دابنێ و، هیچ پەیوەندیی نەبێ بە زمانەكانی دیكەوە، لە ئەصڵدا مرۆڤایەتیی پێشتر بە یەك زمان قسەی كردوەو، دوایی وردە وردە، لێك دووركەوتوونەوەو، لە هەر شوێنێكی جوگرافیی وردە وردە لەهجە بووەو، دوایی بۆتە زمانێكی سەربەخۆ، ئێستا چوار هەزار زمان لە جیهاندا هەن، بۆیە عەرەبیی بوونی قورئان، بە هەردوو واتایەكەی، كە بە زمانی نەتەوەی عەرەبەو، بە مانای شێوازێكی ڕۆشنە، لەگەڵ هەبوونی وشەی زمانەكانی دیكەدا كە بیانیین، ناكۆك نیە[1].

---

(١) بۆ نووسینی ئەم باسە، تا ڕادەیەك لە تەفسیری (إعراب القرآن)ی (مُحيِ الدِّین دَرویش) بەرگی (٩) لاپەڕە (٦٤ و ٦٥)، سوودم وەرگرتوە.

**مەسەلەی دووەم:**

**خـوا ﷻ زۆر لـە پێغەمبەرانـی لـە گەلـە پێشـووەکاندا نـاردوون و، ئـەو گـەل و کۆمەڵگایانـە، هـەر پێغەمبەرێکیـان بـۆ هاتبـێ گاڵتەیـان پێکـردوون و، خـواش هەرچەنـدە ئـەو گـەل و کۆمەڵگایـە بێبڕوایانـە، لـەو خەڵکـەی ڕۆژگاری پێغەمبـەر ﷺ بـە زەبرتـر بـوون و، بـە تواناتـر بـوون، بـەڵام فەوتاندوونـی و، بوونە بەسـەرهاتی مێژوویـی، مەگـەر لـە گۆشـەو کەنـاری کتێبەکانـی مێـژوودا بۆیـان بگەڕێـی، ئەگەرنـا بوونیـان نەمـاوە:**

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَكَمْ أَرْسَلْنَا مِن نَّبِيٍّ فِي ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٦﴾ وَمَا يَأْتِيهِم مِّن نَّبِيٍّ إِلَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٧﴾ فَأَهْلَكْنَآ أَشَدَّ مِنْهُم بَطْشًا وَمَضَىٰ مَثَلُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٨﴾ ﴾

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چوار بڕگەدا:**

١)- ﴿ وَكَمْ أَرْسَلْنَا مِن نَّبِيٍّ فِي ٱلْأَوَّلِينَ ﴾، زۆر پێغەمبەریشمان لە پێشووەکان دا ناردوون، (كَم) وەك پێشتر گوتمان: (**كَمْ الخَبَرِيَّة بِمَعْنَى الكَثِير، وَهُوَ مَنْصُوبٌ عَلَى المَفعولِيَّةِ لـ «أَرْسَلْنَا»**)، ﴿ وَكَمْ أَرْسَلْنَا مِن نَّبِيٍّ فِي ٱلْأَوَّلِينَ ﴾، واتە: (**كَثِيراً أَرْسَلْنَا مِن نَبِيٍّ فـي الأَوَّلِيـن**)، زۆر لە پێغەمبەرانمان لە گەلە پێشووەکاندا، ڕەوانە کردوون، (**الأَوَّلِين**) کۆی (**الأَوَّل**)ە، واتە: سەرەتا، پێشوو.

٢)- ﴿ وَمَا يَأْتِيهِم مِّن نَّبِيٍّ إِلَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴾، واتە: هیچ پێغەمبەرێکیان بۆ نەهاتوە، ئەو گەلە پێشووانە، مەگەر گاڵتەیان پێکردوە، گاڵتە پێکردن بەوانی دیکە، نیشانەی نەفامیی و کەودەنییە، بە تایبەت خەڵکی دواکەوتوو، خەڵکی کەودەن، گاڵتە بە شتێکی تازە دەکات، شتێکی نامۆ کە نەیدیبێ و، نەیبیستبێ، کە مەرج نیە شتێك نەتدیبێ و نەتبیستبێ، خراپ بێ، هەروەك مەرج نیە، هەر شتێك لەگەڵی ڕاهاتبووی و خووت پێوەی گرتبوو، پێی ئاشنا بووی، شتێکی باش بێ، زۆر شتی هەڵەو پەڵە هەیە، خەڵك لەگەڵی

ڕادێ و خووی پێوە دەگرێ، زۆر شتی نامۆش هەیە، زۆر باشە بەڵام خەڵك جارێ پێی ئاشنا نەبووەو، تێی نەگەیوە، بە زۆریی وایە، گاڵتە کردن نیشانەی نەزانیی و نەفامییە.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَا يَأْتِيهِم مِّن نَّبِيٍّ إِلَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴾، هیـچ پێغەمبەرێکیـان بـۆ نەهاتـوە، مەگـەر گاڵتەیـان پێکـردوە، واتـە: هیـچ پێغەمبەرێکیـان لـە هیـچ حاڵێکـدا لـە حاڵەکانیـان بـۆ نەهاتـوە، مەگـەر گاڵتەپێکردنیـان بـەراورد بـووە، لەگـەڵ هاتنـی ئـەو پێغەمبـەرەدا بۆیـان، واتـە: هەرکـە بۆیـان هاتـوە، ئەوانیش گاڵتەیـان پێکـردوە.

٣)- ﴿ فَأَهْلَكْنَآ أَشَدَّ مِنْهُم بَطْشًا ﴾، کەسانێك و کۆمەڵانێکمان فەوتاندن لەوان بە زەبرتر بوون، ڕاناوی ﴿ مِنْهُم ﴾، دەچێتەوە بۆ بێبڕوایەکانی قوڕەیشی هاوچەرخی پێغەمبەر ﷺ، واتە: کەسانێکمان کە لەوان بە زەبرترو بە تواناتر بوون، فەوتاندوون. (**البَطْشُ: الإِضْرَارُ القَوِيّ، الأَخْذُ بِشِدَّة**)، زیانگەیاندنێکی بەهێزو، توند گرتن.

پێـم وایـە وشـەی (**بَطـش**) لـە کوردییـدا یـانی: زەبـرو پەلامـاردان، واتـە: پەلامـارو زەبریـان توندتـر بـوو، لەگـەڵ ئەوەشـدا نەیانتوانـی لـە سـزای خـوا دەربـاز بـن.

٤)- ﴿ وَمَضَىٰ مَثَلُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴾، بەسەرهاتی پێشووانیش ڕابرد، واتە: تێپەڕین و بوونە بەسەرهات، وشەی (**مَثَل**)، بە مانای شێوەو سیفەت و هەواڵ دێ، واتە: (**مَضَتْ حَالُهُمُ العَجِيبَة**)، حاڵە سەرسوڕهێنەرەکەیان تێپەڕی، (**ومُضِي المَثَلِ كِنايَةٌ عَنِ اسْتِئْصالِهِمْ لأنَّ مُضِيَّ الأحْوالِ يَكُونُ بِمُضِيِّ أَصْحابِها، فَهو فِي مَعْنى قَوْلِهِ تَعالى:** ﴿ فَقُطِعَ دَابِرُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٤٥﴾ ﴾**الأنعام**، کە دەفەرموێ: هەواڵیان یاخود وێنەیان، یان سیفەتیان تێپەڕی، ئەمە کینایەیە بۆ کۆتایی هاتنیان، چونکە کاتێك حاڵێك کۆتایی دێ، کە خاوەن حاڵەکە کۆتایی هاتبێ، ئەمە وەك ئەو ئایەتە موبارەکەیە کە لە سوورەتی (**الأنعام**)دا خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ فَقُطِعَ دَابِرُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٤٥﴾ ﴾، واتە: ئەو کۆمەڵەی ستەمیان کردبوو، دوایان بڕا، [ئنجا ئەگەر دوایان ببڕێ، واتە: پێشیان پێشتر تەواو بووە] و ستایش بۆ خوای پەروەردگاری جیهانییان.

کەواتـە: وشـەی (مَـضَى أي: سَـلَفَ وَتَقَـدَّمَ)، واتـە: تێپـەڕی و ڕابـرد، دەگونجـێ لێـرەدا مەبەسـت ئـەوە بـێ: (حُـكِيَ خَبَرُهُـم سَـابِقاً)، پێشـتر هەواڵەکەیـان گێڕدرایـەوە، یاخـود مەبەسـت ئەوەبـێ کـە تێپەڕیـن و، بوونـە پەنـدی زەمانـە.

لێـرەدا پێویسـتە ئـەوە بڵێیـن: کـە ئەمـە هەمـووی دڵدانـەوە بـووە، بـۆ پێغەمبەری خاتـەم ﷺ، هەروەهـا بـۆ شـوێنکەوتووانی و بـۆ هەمـوو ئەوانەی لە ڕێـی پێغەمبەریی کۆتاییـەوە دەڕۆن و، خەڵکـی ڕۆژگاری خۆیـان، بـێ ڕێزییـان بەرانبـەر دەنوێنـن، ئنجـا بـە شـێوەی گاڵتـە پێکـردن بـێ، بـە شـێوەی تۆمـەت بـۆ هەڵبەسـتن بـێ، بـە شـێوەی لـە پشـت پـەردەی ڕەشـەوە تەماشـاکردن بـێ، واتـە: وامەزانـە کـە تـۆ ئـەی پێغەمبـەر! ﷺ یەکـەم پێغەمبەرێکـی کـە گاڵتـەت پێکرابـێ، لـە لایـەن گەلەکەتـەوە، یـان تۆمەتبـار کرابـی، یـان ئـازار درابـی، بەڵکـو پێغەمبەرانـی پێشـوو (عَلَيْهِـمُ الصَّـلاَةُ وَالسَّـلاَم) هەموویـان وابـوون.

ئـەم ئایەتـە موبارەکـە کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَكَمْ أَرْسَلْنَا مِن نَّبِيٍّ فِي ٱلْأَوَّلِينَ ﴾، واتـە: زۆرمـان پێغەمبـەر ناردوون، لـە گەلـە پێشـووەکاندا، یـانی: پێغەمبـەران زۆر بـوون و هـەر ئەوەنـدە نیـن، کـە خـوا ﷻ نـاوی هێنـاون لـە قورئـان دا، کـە تەنیـا (٢٥) پێغەمبـەر ناویـان هاتـوە، وەك خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَرُسُلًا قَدْ قَصَصْنَٰهُمْ عَلَيْكَ مِن قَبْلُ وَرُسُلًا لَّمْ نَقْصُصْهُمْ عَلَيْكَ ﴿١٦٤﴾ ﴾النسـاء، ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِّن قَبْلِكَ مِنْهُم مَّن قَصَصْنَا عَلَيْكَ وَمِنْهُم مَّن لَّمْ نَقْصُصْ عَلَيْكَ ﴿٧٨﴾ ﴾غافـر، هەیانـە بەسـەرهاتیمان بەسـەرتدا خوێندۆتـەوەو، هەیانـە بەسـەرهاتیمان بەسـەرتدا نەخوێندۆتـەوە، واتـە: هەیانـە ناویـمان هێنـاوەو هەشـیانە ناویـمان نەهێنـاوە.

ئایەتەکـەی دیکـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَا يَأْتِيهِم مِّن نَّبِيٍّ إِلَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴾، هیـچ پێغەمبەرێکیـان بـۆ نەهاتـوە، ئـەو گەلـە پێشـووانە، مەگـەر گاڵتەیـان پێکـردوە، ئەمـەش ئـەوە دەگەیەنـێ، کـە گاڵتەپێکرانـی پێغەمبـەران (عَلَيْهِـمُ الصَّـلاَةُ وَالسَّـلاَم)، هەڵاواردنـی تێـدا نەبـووەو، هیـچ پێغەمبەرێـك نەهاتـوە، گەلەکـەی گاڵتـەی پـێ

نـەكات، ئنجـا لێـرە باسـی گاڵتـە پێكـردن دەكات، لـە شـوێنی دیكـە باسـی بـە درۆ دانـان دەكات، لـە شـوێنی دیكـەدا باسـی تۆمەتبـار كـردن دەكات، بـەوە كـە بـە جادووگـەر، یـان بـە كاهیـن، یـان بـە شـاعیر، یـان بـەوە كـە دەیانـەوێ خۆیـان بەسـەردا فـەرز بكـەن.

كەواتـە: ئـەی پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ! هەروەهـا ئـەی ئەوانەی لە رێـی پێغەمبەری خاتەمـەوە دەڕۆن! كاتێـك ئێـوەش لەگـەڵ خەڵـك و كۆمەڵـگای خۆتانـدا، ڕووبـەڕووی گاڵتەپێكـران و تۆمـەت بـۆ كـران و، ئەزیـەت و ئـازار دران و، بـە درۆ دانـدران دەبنـەوە، وامەزانـن كـە بـەس ئێـوەن، بەڵكـو ئـەوە عادەتـی هەمـوو گـەلان بـووە، كـە دژ بـە پێغەمبـەران بـوون، كـە زانیویانـە پەیامـی پێغەمبـەران بـەزم و بـازاڕی وان تێكـدەدات، عادەتیـان وابـووە كـە گاڵتەیـان پێكـردوون، هەڵبەتـە گاڵتەپێكردنەكـە، بـە زۆریـی لەلایـەن سـەركردەكانەوە و ئەوانـەوە بـووە، كـە بـاڵا دەسـت و حوكمـڕان بـوون، چونكـە خەڵكـی دیكـەی بـێ دەسـەڵات، توانـای نەبـووە گاڵتـە بـە پێغەمبەران بـكات و، بـە درۆیـان دابنـێ، بـەڵام خـوا ﷻ پاڵـی دەداتـە لای هەمـووان، لەبـەر ئـەوەی خەڵكەكـەش شـوێن حوكمـڕان و دەسـەڵاتدارەكانی خۆیـان كەوتـوون، لـەو گاڵتـە پێكـردن و بـە درۆ دانـان و، تۆمـەت بـۆ كردنانـەی پێغەمبەرانـدا، ئنجـا ئەمـە دڵدانەوەیـە بـۆ پێغەمبـەری خاتـەم ﷺو، بـۆ هـەر كەسـێك لـە رێـی پێغەمبـەری خاتەمـەوە دەڕوا، كـە ئـەوە شـتێكی ئاسایی و سروشـتییە، شـتێكی چاوەڕوان كـراوە، تـۆش لـە پێغەمبەرانـی خـوا (عَلَيْهِـمُ الصَّـلَاةُ وَالسَّـلَامِ) زیاتـر نـی، كـە ئـەوان گاڵتەیـان پێكـراوە، بـا بـە تـۆش بكـرێ، بێگومـان ئـەوە دڵدانەوەیەكـی گـەورەو، بەرچـاو ڕوونییەكـی باشیشـی تێدایـە، كـە مـرۆڤ باشـتر بزانـێ لـە مێـژوودا چـی گـوزەراوە؟ لـە واقیعـی ئێستاشـدا كـە ئـەوە دەبینـرێ، لـە جیاتـی دڵ پـێ ناڕەحـەت بوون، ئینسـان دەبـێ دڵـی بـە خـۆی خـۆش بـێ و، بڵـێ: هەمـان شـتی كـە بەسـەر پێغەمبـەران هاتـوە، بەسـەر ئێمـەو مانانیـش دێ، كەواتـە: دیـارە ئێمـەش لەڕێـی پێغەمبەرانـەوە دەڕۆیـن!.

## مەسەلەی سێیەم:

**کافرەکان دان دێنن بە بەدیهێنەرایەتیی و خاوەنداریێتیی خوادا بۆ گەردوون، ئەو کەسەی زەمینی بۆ ڕاخستوون و، بۆی ئامادە کردوون، ڕێی بۆ تێدا داناون و، ئاویشی بە ئەندازە بۆ دابەزاندوون و، زەوی پێ ژیاندۆتەوەو، تێکڕای جووتەکانیشی دروستکردوون، هەروەها کەشتییەکان و ئاژەڵەکانیشی بۆ بارو سوار دروستکردوون، تاکو بەهرەیان لێ وەربگرن و، لە کاتی سواربوونیاندا خوا بە پاك بگرن و، یادی چاکەکانی خوا بەسەرخۆتانەوە بکەنەوە:**

دوای ئەوەی لە ئایەتەکانی پێشوودا، خوا ﷻ باسی هەر کام لە قوڕئان و، پاشان باسی ڕەوانە کرانی پێغەمبەرانی کرد، بە تایبەت پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ کە سەرقافڵەی پێغەمبەران و کۆتاییانە، باسی لاملیی بێبڕوایەکانیشی کرد، هەم لە شوێنکەوتنی پێغەمبەر ﷺ، هەم لە پەیڕەویی کردن لە قوڕئان.

ئنجا خوا ﷻ باسی بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگاریێتیی خۆی دەکات، کە لە لای بێبڕوایەکان شتێکی سەلمێنراوە، هەندێك کەس وادەزانێ، کە خواناسیی لەگەڵ بێبڕوایی دا، دژ ناوەستێ و، مانای وایە هەر کەس خوای ناسی، بێبڕوا نیە!! بەڵام ئەوە حاڵیی نەبوونە، لە چەمك و واتای ئیمان، ئیمان بریتی نیە لەوەی خوا بناسی، یان پێغەمبەر ﷺ بناسی، یان قوڕئان بزانی، یان بزانی کە ڕۆژی دوایی هەیە، بەڵکو ئیمان بریتیە لە دەرککردنی ئەو ڕاستییانەو، ڕاستیی بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگاریێتیی و خاوەنداریێتیی خوا، پاشان کتێب و بەرنامە بوونی قوڕئان و، ڕاستیی ڕەوانەکرانی موحەممەد ﷺو، ڕاستیی هەبوونی ڕۆژی دوایی، دەبێ ئەو ڕاستییانە بە عەقڵ دەرك بکەی، بەڵام بە دڵیش وەریان بگری و، پەسندیان بکەی، هەروەها بە زمانیش دانیان پێدا بێنی، بە کردەوەش بەو پێیە بەڕێوە بچی و ڕەفتار بکەی، کەواتە: ئیمان تەنیا دەرککردنی ئەو ڕاستییانە نیە، تاکو هەر کەسێك ئەوانەی، یان هەندێك لەوانەی دەرککرد، بە بڕوادار لە

قەڵـەم بـدرێ.

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَئِن سَأَلۡتَهُم مَّنۡ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ لَيَقُولُنَّ خَلَقَهُنَّ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٩﴾ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ مَهۡدٗا وَجَعَلَ لَكُمۡ فِيهَا سُبُلٗا لَّعَلَّكُمۡ تَهۡتَدُونَ ﴿١٠﴾ وَٱلَّذِي نَزَّلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءَۢ بِقَدَرٖ فَأَنشَرۡنَا بِهِۦ بَلۡدَةٗ مَّيۡتٗاۚ كَذَٰلِكَ تُخۡرَجُونَ ﴿١١﴾ وَٱلَّذِي خَلَقَ ٱلۡأَزۡوَٰجَ كُلَّهَا وَجَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلۡفُلۡكِ وَٱلۡأَنۡعَٰمِ مَا تَرۡكَبُونَ ﴿١٢﴾ لِتَسۡتَوُۥاْ عَلَىٰ ظُهُورِهِۦ ثُمَّ تَذۡكُرُواْ نِعۡمَةَ رَبِّكُمۡ إِذَا ٱسۡتَوَيۡتُمۡ عَلَيۡهِ وَتَقُولُواْ سُبۡحَٰنَ ٱلَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَٰذَا وَمَا كُنَّا لَهُۥ مُقۡرِنِينَ ﴿١٣﴾ وَإِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ ﴿١٤﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە سێزدە بڕگەدا:

١)- ﴿ وَلَئِن سَأَلۡتَهُم مَّنۡ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ لَيَقُولُنَّ خَلَقَهُنَّ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡعَلِيمُ ﴾، ئەگەر لێیان بپرسی: کێ ئاسمانەکان و زەوی هێناونە دی (و، لە نەبوونەوە پەیدای کردوون)، بە جەختکردنەوە دەڵێن: (خوای) زاڵی زانا هێناونیە دی.

واتـە: خـوای باڵادەسـتی زانـا پەیـدای کردوون، لـە حاڵێکـدا دان بـە پەروەردگارێتیی و، بەدیهێنەرایەتیـی خـوادا دێنـن، کەچـی لـە پەرسـتنیدا هاوبـەش پەیـدا دەکـەن و، هاوبەشـی بـۆ دادەنێـن، یاخـود لـە بنەڕەتـەوە ئـەو هـەر ناپەرسـتن و جگـە لـەو دەپەرسـتن، کـە ئـەوەش دژ یەکیـی (**تَنَاقُض**)ە، لەوانـدا، چونکـە ئـەی مـرۆڤ! مـادام خـوا خـاوەن و بەدیهێنـەرو پـەروەردگاری کـەون و کائیناتـە، بـە خۆشـتەوە، عەقـڵ و مەنتیـق خوازیـاری ئـەوەن، کـە بـەس ئـەو خوایـەش خۆتـی تەسـلیم بکـەی و، بەندایەتیـی بـۆ بکـەی و ئەوپـەڕی ملکەچیـی و، بەندایەتیـی و خۆشویسـتن و، بـە بـەرزو مـەزن گرتـن و، ڕێزلێگرتـن و، پشـت پـێ بەسـتنی بـۆ ئەنجـام بـدەی.

شـایانی باسـە: ئـەو ڕاسـتییە کـە بێبڕوایەکانـی ڕۆژگاری پێغەمبـەر ﷺ، هاوبـەش بـۆ خـوا دانەرەکانـی کۆمەڵـگای پێغەمبـەری خـوا ﷺ، دانیـان بـە بەدیهێنەرایەتیـی

خـوادا هێنـاوە، بـەڵام جگـە لەویـان پەرسـتوە، بـەلای کەمـەوە لـە چـوار شـوێنی قورئانـدا هاتـوە:

١- ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ خَلَقَهُنَّ ٱلْعَزِيزُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٩﴾ ﴾ الزخرف.

٢- ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٦١﴾ ﴾ العَنكَبُوت.

٣- ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ قُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٥﴾ ﴾ لُقمَان.

٤- ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ قُلْ أَفَرَءَيْتُم مَّا تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ إِنْ أَرَادَنِيَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ هَلْ هُنَّ كَٰشِفَٰتُ ضُرِّهِۦٓ أَوْ أَرَادَنِي بِرَحْمَةٍ هَلْ هُنَّ مُمْسِكَٰتُ رَحْمَتِهِۦ ۚ قُلْ حَسْبِيَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ يَتَوَكَّلُ ٱلْمُتَوَكِّلُونَ ﴿٣٨﴾ ﴾ الزمر.

لـە هـەر شـوێنەدا، بـە تەعبیـرو شـێوازێکی جیـاواز لەوانـی دیکـە هاتـوە، بـەڵام لـە نێوەڕۆکیانـدا، هەمـووی هـەر ئەوەیـە کـە دانیـان هێنـاوە، بەدیهێنەرایەتیـی و پەروەردگارێتیـی و خاوەندارێتیـی خـوادا ﷻ، ئەمـەش سـێ ڕاسـتییان دەگرێتـە خـۆی:

**أ**- خوا ناسیی شتێکی زگماك و خوارسکە، لە دەروونی هەر مرۆڤێکدا.

**ب**- هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، کە بە هاوبەش بۆ خوا دانەر ناوزەد کراون، خوا نەناس (**مُلحِد**) نەبوون.

**ج**- هاوبەش بۆ خوا دانان، یاخود پەرستنی جگە لە خوا، چ وێڕای خوا، چ بە تەنیا، بەدڵنیایی شتێکی دژ یەك (**مُتَناقِض**)ە، هەر بۆیەش لە سوورەتی (**العَنكَبُوت**)دا، خوا ﷻ دەفەرمویّ: ﴿ فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٦١﴾ ﴾، یانی: کەواتە بەرەو کوێ لادەدرێن؟ مادام دان

بە بەدیهێنەرایەتیی خوادا دێنن، دەبێ هەر ئەویش بپەرستن، ئیدی بۆچی لادەدرێن و ویستی خۆتان لە دەست داوە؟.

دوایی خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿ خَلَقَهُنَّ ٱلْعَزِيزُ ٱلْعَلِيمُ ﴾، دەگونجێ ئەمە قسەی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان بێ، دەشگونجێ فەرمایشتی خوای موتەعال بێ، کە خۆی بەو دوو وەسفە پێناسە دەکات، ئەوپەڕی عیززەت و باڵادەستیی و زاڵیی و، ئەوپەڕی زانایی، بەڵام ئەوەی دیکە کە دێ و باسی ئەوە دەکات: زەوی بۆ ئامادە کردوون و، ڕێی بۆ تێدا داناون، تاکو بە ڕێیەکاندا بگەنە ئامانجەکان و، ئاوی بە ئەندازە لە سەرێ ڕا بۆ دابەزاندوون و، زەوی مردووی پێ ژیاندۆتەوەو، جووتەکانی هەموو هێناونە دی و، کەشتییەکان و ئاژەڵەکانی بۆ ڕەخساندوون، تاکو بۆ بارو سوار بەکاریان بێنن، بێگومان ئەوە فەرمایشتی خوایە ﷻ، نێواخنی کردوە لەگەڵ قسەکانی ئەواندا، تاکو دژیەکیی ئەوان و، ناکۆك بوونی هەڵوێستەکەی ئەوان، لەگەڵ عەقڵ و لۆژیکدا، زیاتر دەربخات.

٢)- ﴿ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ مَهْدًا ﴾، ئەو کەس (خوا)ەی زەوی بۆ ئێوە گێڕاوە، بە ڕایەخ، خوێنراویشەتەوە: (**مِهاد**)و هەردووکیان بە مانای (**فِراش و بِسَاط**)ن، شتێك کە ڕادەخرێ، ڕایەخ، هەروەها (**مَهد**) بە مانای بێشکەو لانکەو جۆلانە دێ، کە منداڵی گچکە تێیدا دەخەوێنرێ و پشوو دەدات، واتە: خوا ﷻ زەوی بۆ ئێوە، والێکردوە: بێشکەو لانکەی منداڵ، چۆن تێیدا ڕادەژێنرێ و پشوو دەدات، بێ ئەوەی منداڵە بخات، زەویش بۆ ئێوە بەهەمان شێوەیە، زەویش بەلای کەمەوە پێنج جۆرە خولانەوەی هەن:

١- خولانەوەی بە دەوری خۆیدا، کە دەبێتە هۆی پەیدابوونی شەوو ڕۆژ.

٢- خولانەوەی بە دەوری خۆردا لە ماوەی ساڵێکدا، کە دەبێتە هۆی پەیدابوونی چوار کەشەکانی ساڵ.

٣- خولانەوەیەك لەگەڵ خۆرو کۆمەڵەی خۆردا، بەدەوری داڵی ڕاوەستاودا.

٤- پاشان سووڕانەوەیەکی دیکە، بە دەوری چەقی کەهکەشاندا.

٥- دوایی سووڕانەیەکی دیکە لەگەڵ کەهکەشاندا، بەلای کەمەوە زەوی ئەم پێنج سووڕانەوەیەی هەن، کەچی ئێمە هەستیان پێ ناکەین، لە حاڵێکدا خولانەوەی زەوی بە دەوری خۆیدا، بە خێرایی (٣٠)کم لە خولەکێك دایەو، سووڕانەوەی بە دەوری خۆردا بە خێرایی (٣٠)کم لە چرکەیەك دایە، واتە: شەست هێندە خێراتر لەوەی بە دەوری خۆیدا دەخولێتەوە، بە دەوری خۆردا دەخولێتەوە، بۆیەش خوا ﷻ زەوی بۆ چواندووین بە بێشکەو، لانکەو، جۆلانە، لەبەر ئەوەی ئەو جووڵانەوانەی هەن، وەك چۆن بێشکەو لانکە، ڕاژاندن و جووڵانی هەیە، بێ ئەوەی ئەو کۆرپەیەی، یاخود ئەو منداڵەی تێیدایە بیخاتە خوارێ، یاخود: وەك چۆن فەرشێك یان بەڕەیەك ڕادەخەی و خەڵك لەسەری دادەنیشێ، ئاوا خوا ﷻ زەوی بۆ ئێمە ڕاخستوە.

٣)- ﴿ وَجَعَلَ لَكُمْ فِيهَا سُبُلًا لَّعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴾، ڕێیەکانی بۆ ئێوە لەوێدا داناون، بەڵکو بەو ڕێیانەدا ڕێی ڕاست بگرن و بگەنە ئامانج.

(**سُبُل**) کۆی (**سَبيل**)ە، واتە: خوا وایکردوە ئەو توێکڵی زەوییە، ئێمە بتوانین ڕێیانی تێدا دابنێین، بۆ وێنە با بیهێنینە بەرچاوی خۆمان: ئەگەر توێکڵی زەوی، کە ئێمە لەسەرینی، پۆڵا بووایە، ئاسن بووایە، کانزایەك لە کانزاییەکان بووایە، یان بەرد بووایە، بێگومان ئەو کاتە ڕێ تێدا دانانی، مەحاڵ دەبوو، یان زۆر زۆر زەحمەت دەبوو.

﴿ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴾، بەڵکو بەو ڕێیانەدا ڕێی ڕاست بگرن و، بگەنە ئامانج، (**الهِدايَةُ حَقِيقَتُها: الدَّلالَةُ عَلى المَكانِ المَقْصُودِ، وتُطْلَقُ عَلى تَعْرِيفِ الحَقائِقِ المَطْلُوبَةِ**)، چییەتی هیدایەت ڕێ پێشاندانە بەرەو شوێنی مەبەست و، بەکاریش دەهێنرێ بۆ ناساندنی ڕاستییەکان، بەڵام لێرەدا واپێدەچێ، زیاتر مەبەست ئەوە بێ، بەو ڕێیانەدا بگەنە ئامانج، ئەو ڕێیە ڕاستانە بگرن و، لێیانەوە بگەنە ئەو ئامانج و مەبەستانەی دەتانەوێن.

٤)- ﴿ وَٱلَّذِی نَزَّلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءَۢ بِقَدَرٍ ﴾، هەروەها ئەو کەسەی بە ئەندازە ئاوی لەسەرێوە دابەزاندوە، (**الَّذي**) هەم ئەمەیان، هەم ئەوەی پێشێیان و، ئەوەی دواییان کە دێ و سێ جار دووبارە بۆتەوە: (**إسم المَوصُول**)ە، دووبارە کراوەتەوە لەبەر گرنگیی پێدان، پێشێ دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِی جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ مَهۡدࣰا ﴾، دیارە ئەگەر خوا ﷻ (**الَّذي**)یشی بەکارنەهێنابایە، هەر فەرمووبای: (**وَجَعَلَ لَكُمُ الأرضَ مَهداً**)، یاخود فەرمووبای: (**وَنَزَّلَ مِنَ السَّماءِ مَاءً بقدر**)، هەروەها هی دواترییش لە ڕووی ڕێزمانییەوە، هەر دروست بوو، بەڵام سێ جاران ئەو ناوی مەوصوولەی دووبارە کردۆتەوە، لەبەر گرنگیی پێدان.

﴿ وَٱلَّذِی نَزَّلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءَۢ بِقَدَرٍ ﴾، {ئـەو کەسـە ئاسـمانەکان و زەوی هێناونـە دی و، خاوەنـی گەردوونـە، بەسـەرو خواریـەوە}، کـە لەسـەرێوە ئـاوی بـە ئەنـدازە دابەزانـدوە، (**بِقَدَر**) واتـە: (**بِمِقـدار**)، بـە ئەنـدازە، بـەو ئەندازەیـەی بـۆ ژیانـی ئێـوە پێویسـتە، نـەك پەکتـان لەسـەری بکـەوێ، هێنـدە کـەم بـێ، یاخـود هێنـدە زۆر بـێ، ژیـان و گوزەرانتـان تـاڵ بـکات، وەك لـە هەنـدێ شـوێن کـە لـە ئەنـدازە زیاتـر، ئـاو دادەبـەزێ، بـە شـێوەی بـاران و بەفـرو تـەزرە، دەبێتـە هـۆی لێزمـاو و لافـاو، تۆفانەکـەی نووحیـش نـاودارە.

٥)- ﴿ فَأَنشَرۡنَا بِهِۦ بَلۡدَةࣰ مَّیۡتࣰاۚ ﴾، {بەو ئاوە کە لە سەرێوە دامانبەزاندوە}، سەر زەمینێکی مردوومان پێ ژیاندەوە، (**أَنشَرنَا: الإنشَارُ : الإحيَاءُ**)، واتە: زیندووکردنەوەو، ژیاندنەوە، لەبەر ئەوەی مردوو لە شوێنی خۆی چەسپاوە، بەڵام زیندوو دەجووڵێ و بڵاودەبێتەوە، (**أَنشَرنَا**) لە (**نَشْر**)ەوە هاتوە، یانی: بڵاوکردنەوە، چونکە لە ئەنجامی ئەوەدا، کە ژیانداران هەر لە ڕووەکەوە بگرە، هەتا زیندەوەران و پەلەوەرو ئاژەڵان و، ...هتد، لە ئەنجامی ئەوەدا کە ژیانیان تێدایە، جموجۆڵ و گەشەکردن و هات و چۆیان دەبێ، وشەی (**مَيْتاً**) خوێندراویشەتەوە: (**بَلدَةً مَّيْتاً**)، کە لە زۆر شوێنی قورئاندا، هەم بە زەنەش هاتوەو، هەم بە گیرەش هاتوەو، هەر یەك واتاشیان هەیە.

٦)- ﴿ كَذَٰلِكَ تُخْرَجُونَ ﴾، هەر بەو شێوەیەش دەردەهێنرێنەوە، (**أي: مِثْلُ ذَلِكَ الإنتِشَارِ، تُخرَجُونَ مِنَ الأرْضِ بَعْدَ فَنَائِكُم**)، واتە: وەك چۆن ئێستا لە ئەنجامی دابەزێنرانی ئاو لە سەرێوە، سەر زەوی دەژێیتەوە، ئەو سەر زەوییە مردوە، جارێکی دیکە دەکەوێتەوە جموجۆڵ، بە هەمان شێوە ئێوەش هەر بەو شێوەیە دەردەهێنرێنەوە، واتە: زیندوو دەکرێنەوەو، جەستەکانتان لە زەوی دەهێنرێنەوە دەر، وشەی (**تُخرَجُون**) واتە: دەردەهێنرێنەوەو، خوێنراویشەتەوە: (**تَخرُجُون**)، بەو شێوەیە دێنەوە دەر، واتە: هەم بکەر نادیار (**مَجهُولُ الفاعِل**)، هەم بکەر دیار (**مَعلُومُ الفاعِل**)، هاتوە.

٧)- ﴿ وَٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْأَزْوَٰجَ كُلَّهَا ﴾، هەروەها {خوا ﷻ کە بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوییە}، ئەو زاتەیە کە هەموو جووتەکانی هێناونە دی، (**فَيُطلَقُ عَلَى كُلٌ وَاحِدٍ مِنْهُمَا أَنَّهُ زَوجٌ لِلآخَرِ مِثْلَ الشَّفْعِ**)، وشەی (**أزوَاج**) کۆی (**زَوج**)ە، (**زَوج**)یش ئەوەیە شتێك لەگەڵ شتێکی دیکەدا، کە لە بەرانبەریەتی، پێکەوە دەبن، بەهەر کامیان دەگوترێ: (**زَوْج**)، ئەو (**زَوْج**)ی ئەوەو، ئەویش (**زَوج**)ی ئەوە، ئنجا ئەوە لە مرۆڤان داو، لە ئاژەڵانداو، تەنانەت لە شتەکانی دیکەش دا، وەك پێڵاو و، نەعل، گۆرەوی و ئەو شتانەی دووانن، بە هەر کامێکیان دەگوترێ: (**زَوج**) نەك هەتا پێکەوە نەبن وشەی (**زَوج**)یان بۆ بەکارنەیەت، بەڵکو (**زوج**) بۆ هەر کامێکیان بەکاردێ، ئنجا ئایا لێرەدا مەبەست لە (**أزوَاج**)، تەنیا جووتەکانی ژیاندارانن، واتە: ڕووەك بە هەموو جۆرەکانیەوەو، ژیانداران بە هەموو جۆرەکانیانەوە، هەر لە زیندەوەرە گچکەکانەوە بگرە، هەتا درشتەکان، دوایی پەرەورەکان، دوایی خشۆکەکان، ئاژەڵان و، درندەکان، تاکو دەگاتە مرۆڤ، ئایا مەبەست پێی ئەوەیە، یاخود مەبەست پێی هەموو دروستکراوەکانە؟! لە ڕاستیی دا هەردووکیان دەگرێتەوە، وەك لە شوێنی دیکەدا، هەم لە سوورەتی (**یس**)داو هەم لە سوورەتی (**الذّاريات**)دا، خوا ﷻ باسی ئەوەی کردوە، کە دەفەرموێ: ﴿ وَمِن كُلِّ شَىْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٤٩﴾ ﴾، واتە: لە هەر شتێك جووتمان دروست کردوە، (**زَوج**) واتە: جووت، لە هەموو شتێك، کاتی خۆی وایانزانیوە، تەنیا لە ژیانداراندا جووت هەیە، بەڵام ئێستا دەرکەوتوە کە هیچ ڕووەکێك نیە، نێرو مێی نەبێ، ئنجا هەیە نێرو

مێیەکەی بە جیان، وەك دارخورماو، هەیە نێرو مێیەکەی لە نێو خۆی دایە، وەك گەڵێك لە گوڵ و ڕووەکەکان، بەڵکو ئێستا دەرکەوتوە، کە ماددەی بێ ژیانیش، جۆرێك لە جووتێتیی تێدایە، کە لە سێ بەش پێك دێ: نێوك، کە لە پرۆتۆن و نیوترۆن پێك دێ، پرۆتۆن (proton) بارگەیەکی موجیبی هەیە، بەڵام نیوترۆن (Neotron) بێ بارگەیەو، ئەلیکترۆن(Electron)یش بارگەیەکی سالیبی تێدایە، واتە: ئەوانیش هەر ساردو گەرم و جۆرێك لە جووتێتییان تێدایە، لە گەردیلەوە بگرە تاکو هەر شتێکی دیکە، دوایی ئاسمان و زەوی، دنیاو دوارۆژ، چاك و خراپ، ڕاست و چەوت، ساردو گەرم، بە هەشت و دۆزەخ، ئەوانەش هەموویان هەر جووتن و دوو دوو پێکەوە، لە بەرانبەر یەکدیدان.

٨)- ﴿ وَجَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلْفُلْكِ وَٱلْأَنْعَٰمِ مَا تَرْكَبُونَ ﴾، لە کەشتییەکان و لە ئاژەڵان، هۆکاری وای بۆ ڕەخساندوون، سواریان بن، (**مَا تَرْكَبُونَ**)، صیلەکەی قرتێنراوە، کە بە زۆریی لە قورئاندا وایە، واتە: (**مَا تَرْكَبُونَه**)، ئەوەی سواری دەبن، لە بارەی (**الأنعام**) یشەوە دوو ڕا هەن:

أ- وشترو ڕەشەوڵاخ و مەڕو بزن.

ب- ڕایەکی دیکەش هەیە، کە (**الأنعام**) هەموو ئاژەڵەکانی دیکەش بگرێتەوە، بە فیلەوەو، بە وڵاخە بەرزەوەو، بە گوێدرێژو هێسترەوە، هەموویان، ئنجا هی ئەوان دیارە، مرۆڤ سواری پشتیان دەبێ، (**مَا تَرْكَبُونَ**) ئەوانەی سواریان دەبن، بەڵام هی کەشتیی، تێیدا سوار دەبین، کەچی لێرەدا دەفەرموێ: (**مَا تَرْكَبُونَ**)، بۆیەش خوا ﷻ نەیفەرمووە: (**مَا تَرْكَبُونَهُ**)، یان (**مَا تَرْكَبُونَ فِيهِ**)، لێرەدا بەرکارخواستنی ڕاستەوخۆ، واتە: بێ ئەوەی پێویستیی بە پیتێك بێ، زاڵکراوە بە بەرکار خواستن بە هۆی پیتەوە، چونکە مەبەستەکە دیارە وصیلەکەش، قرتێنراوە لەبەر ئەو زاڵکردنە، بۆیە خوا ﷻ فەرموویەتی: (**مَا تَرْكَبُونَ**).

هەڵبەتە خوا ﷻ کە سێ جاران (**الَّذي**) دووبارە کردۆتەوە، لەبەر ئەوەیە کە هەر کام لەو نیعمەت و چاکانەی خوا ﷻ سەربەخۆن، واتە: هەر کامیان لە خودی خۆیدا، نیعمەت و چاکەی خوای بەخشەرە، لە سوورەتی (**يس**)یش دا، خوا

ﷻ ئاماژەی بە کەشتییەکان و، بە وڵاخی سواریی کردوە، ئنجا ئەگەر حوشتر بێ بە تەنیا، یاخود ئەوانی دیکەش بن، کە دەفەرموێ: ﴿ وَءَايَةٌ لَّهُمْ أَنَّا حَمَلْنَا ذُرِّيَّتَهُمْ فِى ٱلْفُلْكِ ٱلْمَشْحُونِ ﴿٤١﴾ وَخَلَقْنَا لَهُم مِّن مِّثْلِهِۦ مَا يَرْكَبُونَ ﴿٤٢﴾ ﴾، واتە: نیشانەیەکی دیکە بۆ ئەوان ئەوەیە، کە ئێمە وەچەی ئەوانمان لە کەشتیی پڕدا هەڵگرتوە.

وا پێدەچێ مەبەست پێی کەشتییەکەی نووح بێ، واتە: وەچەی نووح ﷺ، لەو کەشتییە پڕەدا هەڵمانگرتن، چونکە ئەوانەی ئێستاش هەر لە وەچەی ئەوانەن، کە لەو کەشتییەدا هەڵگیراون، ﴿ وَخَلَقْنَا لَهُم مِّن مِّثْلِهِۦ مَا يَرْكَبُونَ ﴿٤٢﴾ ﴾، لە شێوەی ئەو کەشتییەش شتێکمان بۆ دروست کردوون، کە سواری ببن، واتە: کەشتیی لە دەریاداو، ئەوەی لە شێوەی کەشتییشە، لە وشکانیی دا، هەندێك لە زانایان بە حوشتریان گوتوە: (**سفينَة الصَّحراء**)، کەشتیی بیابان، بەڵام پێم وایە ئەوە تەنیا حوشتر ناگرێتەوە، بەڵکو هەموو ئەو ئاژەڵ و وڵاخانەی بۆ بارو سوار بەکاردەهێنرێن، دەیگرێتەوە، لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ وَخَلَقْنَا لَهُم مِّن مِّثْلِهِۦ ﴿٤٢﴾ ﴾، لە شێوەی کەشتیی دا، ئێمە ناچار ناکات بڵێین: تەنیا مەبەست پێی حوشترەو وشەی (**الأنعام**)یش لە شوێنی خۆیدا باسمان کردوە، کە جگە لە حوشترو، ڕەشەوڵاخ و مەڕو بزن، پێم وایە ئاژەڵەکانی دیکەش دەگرێتەوە، فیلیش دەگرێتەوە، کە لە هەندێ وڵاتان فیل زیاتر بەکاردێ بۆ بارو سوار، هەروەها گوێدرێژ دەگرێتەوەو، هێستر دەگرێتەوەو، وڵاخە بەرزەش دەگرێتەوە، بە هەر دووك جووتی ئەسپ و ماینەوەو، ئەگەر حوشتر لە هەندێك شوێنان هەیە، کەرو هێسترو ئەسپ و ماین، لە هەندێ شوێنان زیاتر هەن و، فیل لە هەندێ شوێنان زیاتر هەیەو، بۆ ئەو مەبەستە بەکاردەهێنرێن.

خواش ﷻ وەختێ وشەیەك بەکاردێنێ، چۆن چەمك و واتایەکەی فراوانترو گشتگیرتر بێ، ئەوە زیاتر شایستەی کتێبی خوایە، وەك (**الطَّبَري**) پێشەوای توێژەرەوان عادەتی وایە، لە تەفسیرەکەیدا.

٩)- ﴿ لِتَسۡتَوُۥاْ عَلَىٰ ظُهُورِهِۦ ﴾، بۆ ئەوەی بچنە سەر پشتی، واتە: پشتی ئەو شتەی خوا ڕەخساندوویەتی بۆ سوار بوون، ﴿ وَجَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلۡفُلۡكِ وَٱلۡأَنۡعَٰمِ مَا تَرۡكَبُونَ ﴾، ئەم (مَا)یە، واتە: (الَّذِي تَرْكَبُونَهُ)، ئەوەی سواری دەبن، ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ لِتَسۡتَوُۥاْ عَلَىٰ ظُهُورِهِۦ ﴾، ئەگەر بۆ کەشتیی و بۆ ئاژەڵەکان چووبایەوە، دەبوو فەرمووبای: (لِتَسْتَوُا عَلَى ظُهُورِها)، بەڵام لەبەر ئەوەی بۆ (مَا)یەکە دەگەڕێتەوە، ئەوەی سواری دەبن، کە دیارە کاتی خۆی تەنیا کەشتیی و حوشترو ئاژەڵەکان هەبوون، بەڵام ئێستا چەندان جۆرە هۆکاری بارو سوارو هاتوچۆ هەن، سەیارەو شەمەندەفەر، بە هەموو جۆرەکانیانەوەو، فڕۆکە لە ئاسمان و لە نێو هەوادا، (ما) هەمووی دەگرێتەوە.

(الإسْتِوَاءُ: الإعْتِلاءُ): چوونە سەر، بچنە سەر پشتی، یاخود سەقامگیر بن لەسەر پشتی، (ظُهُور)یش کۆی (ظَهر)ە، واتە: پشتەکانیان، (ظَهر)یش زیاتر پشتی ئاژەڵەکان دەگرێتەوە، نەك کەشتیی، بەڵام ئەمە زاڵکردنی ئاژەڵانە بەسەر کەشتیی دا، هەرچەندە دەشگونجێ بڵێین: کەشتییش هەر دەچیە سەر پشتی، یا بچیە نێویشی، یان چەند قاتیش بێ، ناچیە ژێری، هەر دەچیە سەری.

١٠)- ﴿ ثُمَّ تَذۡكُرُواْ نِعۡمَةَ رَبِّكُمۡ إِذَا ٱسۡتَوَيۡتُمۡ عَلَيۡهِ ﴾، {(ثُمَّ): لێرەدا بۆ ڕیزبەندیی کاتیی و پلەییشە}، واتە: دوای ئەوەی دەچنە سەر پشتی، یادی چاکەی پەروەردگارتان بکەنەوە، ﴿ إِذَا ٱسۡتَوَيۡتُمۡ عَلَيۡهِ ﴾، دوای ئەوەی سەقامگیر بوون و چوونە سەر پشتی ئەو هۆکارەی خوا ﷻ بۆی ڕەخساندوون، ئنجا کەشتییە، یان ئاژەڵەکانن، یان هۆکاری دیکەن، کە خوا ﷻ توانای داناوە بە مرۆڤ، بیانڕەخسێنێ، وەك فڕۆکەو شەمەندەفەرو جۆرەکانی سەیارە.

١١)- ﴿ وَتَقُولُواْ سُبۡحَٰنَ ٱلَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَٰذَا ﴾، {چاکەی پەروەردگارتان یاد بکەنەوە، ئنجا} بڵێن: پاکیی بۆ ئەو کەسەی ئەمەی بۆ ڕەخساندووین، ﴿ سَخَّرَ لَنَا هَٰذَا ﴾، واتە: (هَذا المَرکوب)، ئەم هۆکارە کە سواری دەبین، بۆی ڕەخساندووین، بۆی ملکەچ کردووین.

١٢)- ﴿ وَمَا كُنَّا لَهُۥ مُقْرِنِينَ ﴾، ئێمە بۆ ئەو هۆکارەش، ملپێکەچکەر نەبووین و توانامان بەسەریدا نەدەشکا، (مُقرِنِين أي: مُطِيقِين، أَقْرَنَ، أي: أَطَاقَ) واتە: توانای بەسەریدا شکا، یاخود (مُقرِنِين، أي مُطَوِّعِين)، واتە: توانای ئەوەمان نەبوو، دەستەمۆی بکەین و ملکەچی بکەین، ئەگەر خوا ﷻ بۆی ملکەچ نەکردباین، هەندێکیش (مُقرِنِين)یان بە (ضَابِطِين)، واتە: کۆنترۆڵکەران، کە ئێمە مەرزەمیان بکەین، ئێمە توانامان بەسەردا نەدەشکان مەرزەمیان بکەین، ئەگەر خوا بە تایبەت ئاژەڵەکانی وا نەڕەخساندبانایە، کە حوشترێکی گەورە، منداڵێکی گچکە دەتوانێ یەخی بدات، فیلێکی گەورە، منداڵێك دەتوانی باری لێ بنێ، چونکە خوا ﷻ دەستەمۆی کردوە، هەروەها ئاژەڵەکانی دیکە، لە ئەسپ و مایین و هێسترو کەر، هەر کامێك لەوانە، ئەگەر خوا ﷻ دەستەمۆو ملکەچی نەکردبایەو ڕامی نەکردبایە، مرۆڤ توانای بەسەریدا نەدەشکا.

١٣)- ﴿ وَإِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە بۆ لای پەروەردگارمان دەگەڕێینەوە، (الإنقِلابُ: الرُّجُوعُ إلى المَكانِ الَّذِي يُفارِقُهُ)، وشەی (إنقِلاب)، واتە: گەڕانەوە بۆ ئەو شوێنەی، لێی جیا دەبێتەوە، کەواتە: ئێمە کاتی خۆی لە لای پەروەردگارمانەوە هاتووین و بۆ لای ئەویش دەگەڕێینەوە، واتە: مرۆڤ دەبێ بە سەفەرە جوزئییەکانی خۆی و، ئەو سەفەرانەی کە لە ژیانی دنیادا دەیانکات، لەوێ بووەو لەوێ بووە، سەفەری ژیانی خۆی بێتەوە بیر، لەو بارەوەش ئەو فەرمایشتە دێنین:

{عَـن ابـنِ عُمَـرَ رَضِيَ اللـهُ عَنْهُـمَا، أَنَّ رَسـولَ اللـهِ ﷺ، كانَ إذا سـافَرَ رَكِـبَ رَاحِلَتَـهُ ثُـمَّ كَـبَّرَ ثَلاثَـةً فَقَـالَ: ﴿ سُبْحَٰنَ ٱلَّذِى سَخَّرَ لَنَا هَٰذَا وَمَا كُنَّا لَهُۥ مُقْرِنِينَ وَإِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ ﴾}، (أخرجـه مسـلم: ٢٧٨، وأبـو داود ٢٥٩٩، والترمـذي ٣٤٤٧).

واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی عومـەر (خـوا لێیـان ڕازی بـێ)، دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ کاتێـك بـە سـەفەر دەچـوو، سـواری حوشـترەکەی دەبـوو، دوایـی سـێ جـاران (أللهُ أَكْبَر)ی دەکـرد، دوای دەیفەرمـوو: (سُـبْحَانَ الَّـذِي سَـخَّرَ لَنَـا هَـذَا، وَمَـا كُنَّـا لَـهُ مُقرِنِـين، وَإِنَّـا إِلى رَبِّنـا لَمُنقَلِبـون)، پاکیـی بـۆ ئـەو کەسـەی ئەمـەی بـۆ دەسـتەمۆ کردوویـن

و، ئێمە توانامان بەسەریدا نەدەشکاو، توانادار نەبووین بەسەریدا، ئەگەر خوا ﷻ ملکەچ و دەستەمۆی نەکردبایە، بە دڵنیاییی ئێمە بۆ لای پەروەردگارمان دەگەڕێینەوە.

واتە: وەك چۆن ئێستا سەفەر دەکەین، لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێك، دواییش لەم سەر زەوییەوە سەفەر دەکەین و، ڕووحەکانمان دەچنەوە بۆ خزمەت خوا ﷻ.

سُبْحَانَكَ اللّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە یازدە (١١) ئایەت پێك دێ: (١٥ - ٢٥)، کە تەوەری سەرەکییان خستنەڕووی پووچەڵیی شیرکی پاڵدانی ڕۆڵەیە بۆ لای خوا، بە تایبەت بەندەی مێینە، کە مەبەستیان فریشتەکان بووە، گوایە مێینەن!

ئنجا خوا ﷻ ڕوونی کردۆتەوە، کە لاف لێدەرانی ئەو ئەفسانەیە، نە بەڵگەی عەقڵیی و ئەزموونییان هەیە، نە هی نەقڵیی و، سەرچاوە گرتوو لە وەحیی خوا، تەنیا پاساویشیان لەو بارەوە، لاساییکردنەوەو شوێنکەوتنی پێشینیانەو، خوای زاناو شارەزاش، ئەو بیانوو و پاساوەشی لێ هەڵوەشاندوونەوە، بەوە کە لە دوای ڕانوێنرانی ڕێی ڕاست و دروست، لاساییکردنەوەی پێشینان هیچ مانای نیەو، نیشانەی نەزانیی و کەودەنییە.

﴿ وَجَعَلُوا۟ لَهُۥ مِنْ عِبَادِهِۦ جُزْءًا ۚ إِنَّ ٱلْإِنسَـٰنَ لَكَفُورٌ مُّبِينٌ ﴿١٥﴾ أَمِ ٱتَّخَذَ مِمَّا يَخْلُقُ بَنَاتٍ وَأَصْفَىٰكُم بِٱلْبَنِينَ ﴿١٦﴾ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِمَا ضَرَبَ لِلرَّحْمَـٰنِ مَثَلًا ظَلَّ وَجْهُهُۥ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ ﴿١٧﴾ أَوَمَن يُنَشَّؤُا۟ فِى ٱلْحِلْيَةِ وَهُوَ فِى ٱلْخِصَامِ غَيْرُ مُبِينٍ ﴿١٨﴾ وَجَعَلُوا۟ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةَ ٱلَّذِينَ هُمْ عِبَـٰدُ ٱلرَّحْمَـٰنِ إِنَـٰثًا ۚ أَشَهِدُوا۟ خَلْقَهُمْ ۚ سَتُكْتَبُ شَهَـٰدَتُهُمْ وَيُسْـَٔلُونَ ﴿١٩﴾ وَقَالُوا۟ لَوْ شَآءَ ٱلرَّحْمَـٰنُ مَا عَبَدْنَـٰهُم ۗ مَّا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ ﴿٢٠﴾ أَمْ ءَاتَيْنَـٰهُمْ كِتَـٰبًا مِّن قَبْلِهِۦ فَهُم بِهِۦ مُسْتَمْسِكُونَ ﴿٢١﴾ بَلْ قَالُوٓا۟ إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَـٰرِهِم مُّهْتَدُونَ ﴿٢٢﴾ وَكَذَٰلِكَ مَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ فِى قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَآ إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَـٰرِهِم مُّقْتَدُونَ ﴿٢٣﴾ ۞ قَـٰلَ أَوَلَوْ جِئْتُكُم بِأَهْدَىٰ مِمَّا وَجَدتُّمْ

عَلَيۡهِ ءَابَآءَكُمۡۖ قَالُوٓاْ إِنَّا بِمَآ أُرۡسِلۡتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿٢٤﴾ فَٱنتَقَمۡنَا مِنۡهُمۡۖ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ﴿٢٥﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{هەروەها (بێبڕوایـەکان)، لـە نێـو بەندەکانـی (خـوا)دا، بـەش (ڕۆڵە)ێکیـان بـۆ دانـا، بەڕاستیی مـرۆڤ(ی بێبـڕوا)، سـپڵەیەکی زۆر ئاشـکرایە ﴿١٥﴾ (چـۆن خـوا ڕۆڵـەی دەبـێ!)، یـان ئایا لەوانـەی هێناونیـە دی، کچانـی بـۆ خـۆی پەسـند کـردوون و، کوڕانیشـی تایبـەت کـردوون بـە ئێـوەوە؟ (ئـەی بێبڕوایـەکان!) ﴿١٦﴾ هـەر کاتیـش یەکێکیـان مـوژدەی بـەوە پێـدرا، کـە بـۆ (خـوای) بـە بەزەیـی بـە وێنـەی هێناوەتـەوە (کـە مێینەیـە)، ڕووی ڕەش دادەگـەڕێ و لەبـەر خۆیـەوە پیشـخۆرەوەیە (پەسـت و بێـزارە) ﴿١٧﴾ ئایـا کەسـێك (پاڵدەدەنـە لای خـوا، وەك ڕۆڵـە)، کـە لـە ڕازاوەیـی دا پێـدەگات و، لـە دمبەدمەشـدا ناڕوونکەرەوەیـە (بـۆ مەبەسـتەکانی)؟ ﴿١٨﴾ هەروەها (بێبڕوایـەکان)، ئـەو فریشـتانەیان بـە مێینـە دانـان، کـە بەنـدەی (خـوای) بـە بەزەییـن! ئایـا ئامـادەی دروسـتکرانیان بـوون، (تاکـو ڕەگەزیـان بزانـن، لـە حاڵێکـدا کـە بـێ ڕەگـەزن)؟ شـایەدییدانەکەیان دەنـووسرێ و، لێشـیان دەپرسرێتـەوە، (لەسـەر چ بنەمایـەك قسـەی وایانکـردوە؟!) ﴿١٩﴾ (بێبڕوایـەکان) گوتیشـیان: ئەگـەر (خـوای) بـە بەزەیـی ویسـتبای (ڕێـمان لێبگـرێ)، نەماندەپەرسـتن، هیـچ زانیارییەکیـان بـەوە نیـە، (ئـەوان بـەس لـە گۆتـرە دەدوێـن و، قسـەی بـێ بناغـە دەکـەن) ﴿٢٠﴾ یـان ئایـا پێـش وی (بـەر لـە قورئـان)، کتێبێکـمان پێـداون، ئنجـا ئـەوان تونـد دەسـتپێوە گرتوونـی؟ ﴿٢١﴾ (نەخێـر) بەڵکـو گوتیـان: ئێمـە بـاب و باپیرانمـان، لەسـەر ڕێیـەك لـێ هەڵکەوتـوەو، ئێمـەش بـە شـوێنەوارەکانیاندا ڕاسـتە ڕێ بوویـن ﴿٢٢﴾ هـەر بـەو شـێوەیە لـە پێـش تۆشـدا (ئـەی موحەممـەد!)، هیـچ ترسـێنەرێکمان (ورياكەرەوەيەكـمان)، لـە هیـچ ئاوەدانییەکـدا، نەنـاردوە، مەگـەر خۆشـگوزارانەکانی

گوتوویانە: ئێمە باب و باپیرانی خۆمامان لەسەر ڕێیەك لێ هەڵکەوتووە، بە دوای شوێنەوارەکانیاندا پەیڕەوییکارین ﴿٢٣﴾ (پێغەمبەرەکەیان) گوتی: ئایا ئەگەر (بەرنامەیەکی) ڕێنماییکارترم بۆ هێنابن، لەوەی باب و باپیرانتان لەسەری دیوە (هەر شوێنی ناکەون)؟ گوتیان: بێگومان ئێمە، بەوەی پێی نێردراون بێبڕواین ﴿٢٤﴾ ئیدی سەرەنجام تۆڵەمان لێکردنەوە، ئنجا سەرنج بدە! سەرەنجامی بە درۆدانەرانی (پەیام و پێغەمبەرانی خوا) چۆن بووا ﴿٢٥﴾].

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(جُزْءًا): واتە: بەشێك، (جُزْءُ الشَّيءِ: مَا يَتَقَوَّمُ بِهِ جُملَتُهُ، ﴿لِكُلِّ بَابٍ مِّنْهُمْ جُزْءٌ مَّقْسُومٌ ﴿٤٤﴾﴾ أي: نَصِيب)، بەشی هەر شتێك، ئەوەیە کە تێکڕای شتەکە لە چەند بەشێك پێك دێ، وەك خوا ﷻ لە سووڕەتی (الحِجر)دا فەرموویەتی: ﴿لِكُلِّ بَابٍ مِّنْهُمْ جُزْءٌ مَّقْسُومٌ ﴿٤٤﴾﴾، لە هەر دەروازەیەك لە دەروازەکانی دۆزەخەوە، بەشێکی دیارییکراو لە بێبڕوایەکان دەچنە ژوورێ.

(وَأَصْفَىٰكُم): واتە: ئێوەی هەڵبژاردووەو تایبەت کردوە، (أَصْلُ الصَّفَاءِ خُلُوصُ الشَّيءِ مِنَ الشَّوْبِ)، وشەی (صَفَاء): لە بناغەدا بریتیە لەوەی شتێك لە خڵتە پاك بێتەوە، (الصَّفَا: الحِجَارَةُ الصَّافِيةُ، وَالإِصطِفَاءُ تَنَاولُ صَفْوِ الشَّيء)، (صف) بە بەردێکی سپیی لووسی ساف دەگوترێ، (اصطفاء)یش ئەوەیە کە هەڵبژاردەی شتێك وەربگری.

(ظَلَّ): (ظَلْتُ، وَظِلْتُ، بِحَذْفِ إِحْدَى اللاَّمَيْنِ، وَعَبَّرَ بِهِ عَمَّا يُعْمَلُ فِي النَّهَارِ، وَيَجْرِي مَجْرَى صِرْتُ)، (ظَلْتُ وَظِلْتُ): بە لابردنی یەکێك لە دوو لامەکانی، کە لە ئەسڵ دا (ظَلَلْتُ) یان (ظَلِلْتُ)یە، تەعبیری پێ دەکرێ لەو شتەی بە ڕۆژ دەکرێ، وەك چۆن (بَاتَ) تەعبیری پێدەکرێ بەوەی بە شەو دەکرێ.

(مُسْوَدًّا): واتـە: ڕەش هەڵگـەڕاو، ڕەش داگـەڕاو، (إِسْـوَدَّ، وَاسْـوَادَّ فَهُـوَ مُسْـوَدٌّ)، ڕووی ڕەش داگـەڕاوە لـە خەفەتـان، بـە یەکێـك دەگوتـرێ: شـین و مـۆر بۆتـەوە، یـان ڕەش هەڵگـەڕاوە.

(كَظِيمٌ): (الكَظَمُ: مَخْـرَجُ النَّفَـس)، (كَظَـم): ئـەو شـوێنەیە کـە هەناسـەی لێـوە دێ، واتـە: قوڕقوڕاگـە، (الكُظُـومُ: إحتِبَـاسُ النَّفَـسِ وَيُعَـبَّرُ بِـهِ عَـنِ السُّـكُوتِ، وَكَظْـمُ الغَيْـظِ: حَبْسُـهُ)، (كُظُوم): بریتیـە لـە حەپسـکردنی هەناسـەو، تەعبیـری پـێ دەکـرێ لـە بـێ دەنگیـی، بـێ دەنگییـەك لـە تووڕەیـی و پەسـتیی، (كَظْمُ الغَيْـظ)، ئەوەیـە ڕق و تووڕەیـی حەپـس بکـرێ و نەهێڵـرێ بێتـە دەرێ.

(يُنَشَّؤُاْ): (النُّشْـأُ وَالنَّشـأَةُ: إِحْـدَاثُ الـشَّيءِ وَتَرْبِيَتُـهُ، يُنَشَّـأُ فِي الحِلْيَـةِ: يُـرَبَّى كَتَرْبِيَـةِ النِّسَـاء)، (نُشأٌ ونَشْأَة): بریتیـە لـەوەی شـتێك پەیـدا بکـرێ و پـەروەردە بکـرێ، (يُنَشَّأُ فِي الحِلْيَـةِ)، واتـە: پـەروەردە دەکـرێ، وەك پـەروەردە بوونـی ئافرەتـان، لـە خشـڵ و جوانییـدا.

(ٱلْحِلْيَةِ): (الحُلِيُّ جَمْـعُ الحَـلِي، نَحَـو الثُّدِي وَالثُّـدِي، وَقِيْـلَ: الحِليَـةُ جَمْعُهَـا حِـليّ)، (حُـلِي): کـۆی (حَـلِي)ە، وەك (الثَّدِي، وَالثُّـدِي)، (ثَدِي) کۆیەکەیەتی، (ثُـدي) تاکەکەیەتی، واتـە: مەمـك، هەروەهـا گوتـراوە: (حِليَـة) کۆیەکـەی (حِـليّ)ە، خەشـڵەکان.

(ٱلْخِصَامِ): واتـە: مشـتومڕ، یاخـود شـەڕە قسـە، (الخَصْـمُ: مَصْـدَرُ خَصَمتُـهُ، أي: نَازَعتُـهُ)، شـەڕە قسـەم لەگەڵـی کـرد، یـان ناکـۆك بـووم لەگەڵـی، (مُخَاصَمَـة وَخِصَـام)، هەردووکیـان چاوگـن، (وَالخَصِـمُ: المُختَـصُّ بِالخصُمَـة)، (خَصِـم): کەسـێکە تایبـەت بـێ بـە شەڕەقسـەو موناقەشـەوە.

(يَخْرُصُونَ): (الخَـرصُ: حَـرْزُ الثَّمَـرَةِ، وَالخِـرْصُ المَحْـزُورُ، وَقِيْـلَ: الخَـرْصُ الكَـذِبُ)، (خَـرص): بریتیـە لـە قرسـاندنی میـوە بـە درەختەکەیـەوە، بیقرسـێنی چەنـدی پێـوە دەبـێ، (خِـرْص): بریتیـە لـەوەی قرسـێنراوە، هەندێکیـش گوتوویانـە: (خَـرْص)، واتـە: درۆ، (حَقِيْقَـةُ ذَلِـكَ أَنَّ كُلَّ قَـولٍ مَقـولٍ عَـن ظَـنٍ تَخمِـينٍ: خَـرْصٌ)، ئەویـش بەهـۆی

ئەوەوە، کە هەر قسەیەك لەسەر بناغەی گۆترەو گومان گوترابێ، جۆرێکە لە قرساندن.

(ءَاثَٰرِهِم): (أَثَـرُ الشَّيء: حُصُولُ مَا يَدلُّ عَلَى وُجُودِهِ، أَثَـر وَإِثْـر)، (آثَـار) کـۆی (أثـر)ە، کە بریتیە لە پەیدابوونی شوێنەوار لەسەر شتێك، کە بەڵگە بێ لەسەر ئەوەی، ئەو شتە هەیە، کە هەم (أَثَـر)ی پێ دەگوترێ، هەم (إِثـر)ی پێ دەگوترێ، هەردووکیان بە مانای شوێنەوارن.

(مُتۡرَفُوهَآ): خۆشگوزەرانەکانی، (التُّرْفَـةُ: التَّوَسُّعُ فِي النِّعْمَـةِ، وأَتْـرَفَ فَهُـوَ مُـتْرَفٌ)، (تُرْفَـة): بریتیە لە فراوانیی لە نازو نیعمەتدا، دەگوترێ: (أَتْـرَفَ)، واتە: خۆشگوزەران بوو، (فَهُـوَ مُـتْرَفٌ)، ئەو خۆشگوزەرانە.

(مُّقۡتَدُونَ): (قَدا يَقْدُو قَدْواً، قَرُبَ: يَقْرُبُ، قُرباً)، واتە: نزیك بوونەوە، هەروەها بە مانای خێرایی کرد، دێ، (أسرَعَ)، (قَدا الطَّعَامُ أي: طاب طَعْمُهُ و رَائِحَتُهُ)، واتە: تامەکەی و بۆنەکەی خۆش بوو، (إقتَدى بِهِ)، واتە: کارێکی کرد، وەك کارەکەی وی، خۆی وەك ئەو لێکرد، وەك لە سوورەتی (الأنعام)، ئایەتی ژمارە: (٩٠)دا، دەفەرموێ: ﴿فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقۡتَدِهۡ﴾، واتە: بە دوای ڕێنمایی ئەوان بکەوە[١].

(فَٱنتَقَمۡنَا مِنۡهُمۡ): تۆڵەمان لێکردنەوە، (إِنْتَقَمَ مِنْهُ: عَاقَبَهُ، النِّقْمَةُ: العُقُبَةُ، نَقَمَ، يَنْقِمُ، نَقْمَاً، وَنقُومَاً: عَاقَبَهُ، نَقَمَ الشَّيءَ: أَنْكَرَهُ وَعَابَهُ)، (إِنْتَقَمَ مِنْهُ)، واتە: سزایدا، چونکە (نِقْمَة) بە مانای سزایە، (نَقَمَ، يَنْقِمُ، نَقْمَاً، وَنقُوماً)، بە مانای سزایدا، دێ، (نَقَمَ الشَّيء)، ڕەخنەی لێگرت و عەیبی لێگرت.

---

(١) الُمعجَمُ الوَسيط: ص٩٤٨.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خوای بەرزومەزن لەم یازدە (١١) ئایەتەدا، وەك پێشتریش گوتمان: پووچەڵیی جۆرێك لە هاوبەش بۆ خوا دانان، کە بریتیە لە هاوبەش بۆ خوا دانان، بە پاڵدانی ڕۆڵە بۆ لای خوا، (**نِسبَةُ الوَلَدِ إلى الله ﷻ**)، لەم چەند ئایەتە موبارەکەدا، ئەو بیرۆکەیە پووچەڵ دەکاتەوە، ئەو بیرۆکەیەش کاتی خۆی، بەڵێ لەو ژینگەو کۆمەڵگایەدا، کە پێغەمبەری خاتەمی ﷺ تێدا هاتوە، کە کۆمەڵگای نەفامیی، عەرەب بووە و لەسەردەمی نەفامییان دا، ئەو کاتە ئەو بیرۆکەیە زۆر زەق بووەو، کاتی خۆی لە تەفسیری سووڕەتی (**الأنعام**)دا باسمان کرد، بەڵام ئەوە تەنیا لە کۆمەڵگای عەرەبیی، پێش ئیسلامدا نەبووە، بەڵکو لە زۆربەی کۆمەڵگایەکاندا ئەو بیرۆکەیە هەبووە، ئێستاش لەگەڵدا بێ ئەو بیرۆکەیە هەر هەیە، نەصرانییەکان ئێستاش لەگەڵ دابێ، عیسا ؑ بە ڕۆڵەی خوا ﷻ دەزانن، هەروەها لە ڕۆژهەلاتی ئاسیادا ئەو بیرۆکەیە هەیە، لە نێو گەلێك لە کۆمەڵگاکاندا، کەم و زۆر، ئەو بیرۆکەیە هەر هەیە، بە تایبەت کە فریشتەکان پاڵدەدەنە لای خوا، وەك مێینەو، شەیتانەکانیش پاڵدەدەنە لای خوا، وەك کوڕ، وەك لە سووڕەتی (**الأنعام**)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَخَرَقُوا۟ لَهُۥ بَنِينَ وَبَنَٰتٍۭ بِغَيْرِ عِلْمٍ ﴿١٠٠﴾ ﴾، واتە: کوڕان و کچانیان بۆ هەڵتاشین بەبێ زانیاریی، کە کاتی خۆی لە بەرگی پێنجەمی تەفسیری قوڕئانی بەرزو بەپێزدا باسمان کردوەو، لەو بارەوە دواوین.

ئنجا لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلُوا۟ لَهُۥ مِنْ عِبَادِهِۦ جُزْءًا ﴾، هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، بێبڕوایەکان، بەشێکیان بۆ خوا بڕیاردا لە بەندەکانی، واتە: بەندەکانیان کردنە بەشێك لە خوا، چونکە ڕۆڵەی هەر کەسێك، بەشێکە لەو کەسە، وەك کوردەواریی خۆمان بە منداڵ دەڵێن: (جگەرگۆشە)، واتە: پارچەی جگەر، یانی

گۆشـەی جگـەری مرۆڤـە، کـە تەعبیرەکەیـان وا هاتـوە، ئەگەرنـا وەچـەی مـرۆڤ لـە نوتفـەی مـرۆڤ، بـاب و دایـك پەیدادەبـێ، کـە دیـارە ئـەو نوتفەیـش لـە خوێـن پەیدادەبـێ، ئـەو خوێنـەش بـە دڵنیایـی لـەو خواردنـە هەرسـکراوە، کـە مـرۆڤ دەیخـوات، دەڕەخسـێ، ﴿إِنَّ ٱلْإِنسَـٰنَ لَكَفُورٌ مُّبِينٌ﴾، بـە دڵنیایـی مـرۆڤ زۆر سپڵەیەکی ئاشـکرایە، سـپڵەیەکی ڕوون و زەقـە، گومانـی تێدانیـە کـە ئینسـان لێـرەدا، کـە (أل)ی ناسـاندنی لەسـەرە، مەبەسـت پێـی (جِنس)ی مـرۆڤ نیەو هەمـوو مرۆڤێك وانیــە، بەڵکـو مەبەسـت مرۆڤێکــی تایبەتــە، واتــە: مرۆڤــی بێبــڕوا، زۆر ســپڵەیە، سپڵەیەکی ئاشـکرا، هیـچ پـەردەی بەسـەرەوە نیـە، لەبـەر ئـەوەی ئـەو هەمـوو نـازو نیعمەتانـەی لـە ئایەتەکانـی پێشـوودا باسـکران، خـوا ﷻ بـۆی ڕەخسـاندوون، کەچـی وا مامەڵـە لەگـەڵ خـوا دەکات، کـە هەندێـك لـە دورسـتکراوەکانی خـوا بـە ڕۆڵـەی خـوا دابنـێ و، ئـەوەش سـپڵەییە بەرانبـەر بـە خـوا ﷻو نەناسـینی قـەدرو پایـەی بـەرزو بـێ وێنـەی خوایـە.

﴿أَمِ ٱتَّخَذَ مِمَّا يَخْلُقُ بَنَاتٍ وَأَصْفَىٰكُم بِٱلْبَنِينَ﴾، {چـۆن ڕۆڵـەی پاڵدەدەنـە لا!} یـان ئایـا لەوانـەی دروسـتیکردوون، کچانـی بـۆ خـۆی هەڵبـژاردوون و، ئێوەشـی تایبـەت کـردوە بـە کوڕانـەوە! لێرەدا خـوا ﷻ بەپێـی عەقڵـی دواکەوتووانـەو پووچـی بێبڕوایـەکان قسـە دەفەرمـوێ، کـە ئـەوان کوڕیـان پـێ چاکتر بـووە لـە کـچ و، بـە کوڕ زۆر دڵخـۆش دەبـوون و، بـە کچـان دڵتەنـگ دەبـوون، ئەگـەر کچیـان بووبایـە، بەڵکـو جـاری وابـوو کچیـان زینـدە بـە چـاڵ دەکـردن، هەنـدێ لـە تیرەکانـی عـەرەب، کچیان زینـدە بەچـاڵ دەکـردن، بۆیـە خـوا دەفەرمـوێ: چـۆن لەوانـەدا کـە دروسـتیکردوون، کچـان - کـە بـەلای ئێـوەوە نەویسـتراون - بـۆ خـۆی هەڵدەبژێـرێ، کەچـی کـوڕان، دەدا بـە ئێـوەو ئێـوەی تایبـەت کـردوون بـە کوڕانـەوە؟ دیـارە کچیشـی هـەر داونـێ، بـەڵام ئەگـەر بـەو پێیـە بـێ، یـانی: خـوا خـۆی بـەس کچـی هـەن، بـەڵام ئێـوە وێـڕای کچـان، کوڕیشـی داونـێ، (أَصْفَكُـم أي: ءَاثَرَكُـم)، واتـە: ئێـوەی هەڵبـژاردوەو، تایبـەت کـردوە، (خَصَّكُـم بِالبَنِيـن)، کـە ئـەوەش شـتێکی نامەنتیقییـە.

﴿ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِمَا ضَرَبَ لِلرَّحْمَٰنِ مَثَلًا ﴾، کاتێـك یەکێکیـان مـوژدەی ئـەوەی پـێ بـدرێ، کـە بـۆ (خـوای) خـاوەن بەزەیـی بەوێنـەی هێناوەتـەوە، (کـە بریتیـە لـە مێینـە)، ﴿ ظَلَّ وَجْهُهُۥ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ ﴾، ڕووی ڕەش دادەگـەڕێ، دەم و چـاوی ڕەش و تاڵـخ دەبـێ و، زۆریـش لەبـەر خۆیـەوە پیـش دەخواتـەوە، (كَظْم): بریتیـە لـە قورقوڕاگـە، کـە شـوێنی هەناسـەیە، (كَاظِم): کەسێکە هەناسـەی خـۆی بگـرێ، یاخـود تووڕەیـی خـۆی بگـرێ، (كَظِيم): کەسێکە دڵـی پـڕ بووبـێ لـە پەسـتیی و تووڕەیـی، بـەڵام خـۆی بگـرێ و، پیـش بخواتـەوە لەبـەر خۆیـەوە.

﴿ أَوَمَن يُنَشَّؤُا۟ فِى ٱلْحِلْيَةِ ﴾، ئەمـە دەگونجـێ فەرمایشـتی خـوا بـێ، واتـە: خـوای بـەرزو مـەزن، وەك فەرمایشـتی خـۆی بیخاتـە ڕوو، یـانی: چـۆن کەسـێك کـە لـە جوانیـی و ڕازاوەیـی دا پـێ دەگەیەنـرێ، لـە کاتـی مشـتومڕو شـەڕە قسەشـدا، ڕوونکـەرەوە نیـە بـۆ مەبەسـتەکانی، چـۆن ئـەوە پاڵ دەدەنـە لای خـوا!، دەشـگونجێ ئەمـە لەسـەر زمانـی مـوژدە پێدراوان بـە کـچ، لـە کافـرەکان، فەرمووبێتێ، واتـە: چۆن دەبـێ مـوژدەی کەسـێکم پـێ بـدەن، کـە لـە جوانیـی و ڕازاوەیـی دا پێدەگەیەنـرێ، نـەك لـە زبریـی دا وەك پیـاوان؟ ﴿ وَهُوَ فِى ٱلْخِصَامِ غَيْرُ مُبِينٍ ﴾، هەروەهـا لـە کاتی شـەڕە قسـەو موناقەشەشـدا، ناڕوونکەرەوەیـە بـۆ مەبەسـتەکانی خـۆی، ئافـرەت لـە ئەنجامـی ئـەوەدا، کـە هەسـت و سـۆزی زیاتـرە، لـە ڕووی دیالـۆگ و وتوێـژەوە، بـە گشـتیی ئافرەتـان لـەو ڕووەوە لـە پیـاوان بەجـێ دەمێنـن، هـەر بۆیـەش ئـەو هەمـوو فەیلەسـووف و بیرمەندانـەی کـە بـوون لـە مێـژووی بەشـەردا، بـە دەگمـەن فەیلەسـووفێکی ئافرەتـت دەسـت دەکـەوێ، خـوا ﷻ توانـای عەقڵیی زیاتـری داوە بە پیاوان، هـەروەك چـۆن توانـای هەسـت و سـۆزیی زیاتـری داوە بـە ئافرەتـان، لەبـەر ئـەوەی هـەر کامیـان ئەرکەکـەی ئـەو توانایـە دەخـوازێ، هـەروەك دەنگـی پیاوانـی گـڕو زبـر کـردوە، جەسـتەیانی ماسـوولکەدارو بەهێزتـر کـردوە، دیسـان دەنگـی ئافرەتـان و جەسـتەی ئافرەتانـی نـەرم و ناسـك کـردوە، لەبـەر ئـەوەی ئەرکەکانـی هـەر کامێکیـان، ئەرکـە خواڕسـك و زگماکەکانیـان، ئـەو سـیفەتانە دەخـوازن.

﴿ وَجَعَلُوا۟ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ ٱلَّذِينَ هُمْ عِبَٰدُ ٱلرَّحْمَٰنِ إِنَٰثًا ﴾، ئـەو فریشـتانەی کـە بەنـدەی (خـوای) خـاوەن بەزەیـن، کردیاننـە مێینـە، ئەمـە خوێنراویشـەتەوە: (وَجَعَلُوا المَلائِكَةَ الَّذِينَ هُـمْ عِنـدَ الرَّحْمَـن)، ئەوانـەی کـە لـەلای (خـوای) خـاوەن بەزەییـن، واتـە: لێـوەی نیزیکـن، بـە مێینەیـان لـە قەڵـەم دان، ﴿ أَشَهِدُوا۟ خَلْقَهُمْ ﴾، ئایـا ئامادەیـی دروسـتکرانیان بـوون، (تاکـو بزانـن ڕەگەزیـان هەیـەو، ڕەگەزەکەشـیان مێیـە)؟، لـە حاڵێکـدا کـە فریشـتە ڕەگەزیـان نیـە، نـە نێـرن، نـە مـێ، ﴿ سَتُكْتَبُ شَهَٰدَتُهُمْ وَيُسْـَٔلُونَ ﴾، ئـەو شـایەدیدانەیان دەنـووسرێ و، لێشـیان دەپرسرێتـەوە، واتـە: ئـەو شـایەدیدانە، کـە لـە گۆتـرە فریشـتەکان بـە مێینـە لـە قەڵـەم دەدەن، لەسـەریان دەنـووسرێ و، دواییـش لێیـان دەپرسرێتـەوە.

﴿ وَقَالُوا۟ لَوْ شَآءَ ٱلرَّحْمَٰنُ مَا عَبَدْنَٰهُم ﴾، ئنجا بیانـوو و پاساوی هاوبەش بـۆ خـوا دانـەرەکان دەخاتـە ڕوو، کـە ئەمـە بیانـوو و پاساوێکی دێرینیـان بـووە، کـە گومڕاییـی و سـەرگەردانیی و سەرلێشـێواویی خۆیـان، لـە ملـی قـەدەرو ویسـتی خـواوە پێچـاوە، ﴿ وَقَالُوا۟ لَوْ شَآءَ ٱلرَّحْمَٰنُ ﴾، گوتیـان: ئەگـەر (خـوای) خـاوەن بەزەیـی ویسـتبای ڕێـمان لـێ بگـرێ، ﴿ مَا عَبَدْنَٰهُم ﴾، ئێمـە ئـەو پەرسـتراوانەی جگـە لـە خوامـان نەدەپەرسـتن، ئەگـەر فریشـتەن، ئەگـەر خڕۆکـەن، ئەگـەر داروبـەردن، مرۆڤـن، هەرچـی هـەن، یاخـود: ﴿لَوْ شَآءَ ٱلرَّحْمَٰنُ ﴾، ئەگـەر (خـوای) خـاوەن بەزەیـی ویسـتبای نەیانپەرسـتین (عَـدَمَ عِبادَتِهِـم)، ﴿ مَا عَبَدْنَٰهُم ﴾، ئێمـە نەماندەپەرسـتن، ﴿مَّا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ ﴾، خـوا ﷻ لێـرەدا هـەر ئەوەنـدە، وەڵامدەداتـەوە، دەفەرمـوێ: لەوبـارەوە هیـچ جـۆرە زانیارییەکیـان نیـە، ﴿مِنْ عِلْمٍ ﴾، (مِـن) بـۆ بەشـێك (تَبْعِيـض)ە، واتـە: هیـچ ئەندازەیـەك لـە زانیارییـان لـەو بـارەوە نیـە، ﴿إِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ ﴾، ئـەوان تەنیـا قسـەی گۆتـرە دەکـەن، قسـەیەك هـەروا بـە قرسـاندن و، بـە گومـان دەیکـەن، نـەك لـە ڕووی زانیارییـەوە.

هەڵبەتـە دوایـی خـوا ﷻ لـە شـوێنی دیکـە، بەرپەرچـی ئـەو قسـەیانی داوەتـەوە، لـە سـوورەتی (الأنعـام)دا، هەروەهـا لـە سـوورەتی (النَّحـل)دا، کاتـی خـۆی لـە بەرگـی

پێنجەمـی ئـەم تەفسـیرە، هەروەهـا لـە بەرگـی سـێزدەیەمی ئـەم تەفسـیرەدا، لەوبارەوە قسـەمان کـردوە، دواتریـش لـە مەسـەلە گرنگـەکان جارێکـی دیکە، قسـەی لـێ دەکەینـەوە.

کـە لـە ڕاستییدا بیانووگرتـن بە ویستی خـوا، لەبەر ئـەوەی خوا ﷻ ویستوویەتی، شـتێکی بێجێیـە، بێگومـان هیـچ شـتێك بـە بـێ ویسـتی خـوا نابـێ، بـەڵام ئـەوان مەبەسـتیان ئـەوە بـووە: مـادام بـە ویسـتی خوایـە، کەواتـە: بـە ڕەزامەندیـی خواشـە، لێـرەدا ویسـت و ڕەزامەندیـی خوایـان تێکـەڵ کـردوون، بـەڵام لـەوەدا نەیانپێـکاوە، ئەگەرنـا بێگومـان هەمـوو شـتێك بـە ویسـتی خوایـە، چونکـە هیـچ شـتێك ناگونجـێ، لـە دروسـتکراوانی خـوادا بێتـە دی، بەبـێ ویسـت و زانیاریـی و دەسـتەڵاتی خـوا، بـەڵام ئایـا مەرجـە هـەر شـتێك بـە ویسـتی خـواو زانیاریـی خـوا بـێ، خـوا لێـی ڕازی بـێ؟ بـە تەئکیـد نەخێـر، هەڵەکەیـان لێرەدایـە.

﴿ أَمْ ءَاتَيْنَٰهُمْ كِتَٰبًا مِّن قَبْلِهِۦ فَهُم بِهِۦ مُسْتَمْسِكُونَ ﴾، یـان ئایـا پێـش ئـەوە، واتـە: پێـش وی، ڕاناوەکـە بـۆ قورئـان دەچێتـەوە، بەپێـی سـیاق، ئایـا پێـش وی، پێـش قورئـان، کتێبێکـمان پێـداون، ئـەوان پێـوەی دەسـتگرتووبن، تونـد دەسـتیان پێـوە گرتبـێ؟ واتـە: ئـەو قسـانەی دەیکـەن، کـە بناغەیەکـی عەقڵییـان نیـە، ئایـا بناغەیەکـی نەقڵییـان هەیـە؟

﴿ بَلْ قَالُوٓا۟ إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّهْتَدُونَ ﴾، واتـە: (لَيْسَ لَهُمْ نَقْلٌ يَتَمَسَّكُونَ بِهِ)، هیـچ وەحییێکیـان لەبەردەسـتدا نیـە، دەسـتیان پێـوە گرتبـێ، بەڵکـو گوتیـان: ئێمـە بـاب و باپیرانمـان لەسـەر ڕێیـەك لێهەڵکەوتـوەو، ئێمـە بـە شـوێنەواری ئەوانـدا، ڕێـی ڕاسـتگرتووین، واتـە: بـە دوای ئـەوان دەکەویـن و، دواکەوتنـی ئەوانیـش ڕێیەکـی ڕاسـتەو گرتوومانەتـە بـەر، وشـەی (أُمَّـة) بـە مانـای میللـەت و تەریقـەت دێ، واتـە: ئێمـە بـاب و باپیرانمـان لێهەڵکەوتـوە، بینیومانـن، پێشـینانمان لەسـەر ڕێیـەك بـوون، ئێمـەش بـە شـوێنەواری ئەوانـدا، ڕێـی ڕاسـتمان گرتـوە.

﴿ وَكَذَٰلِكَ ﴾، خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: هـەر بـەو شـێوەیە، یـانی: ئـەوە تەنیـا کافرەکانـی ڕۆژگاری تـۆ نیـن، ئـەی موحەممـەد ﷺ! پاسـاوی بتپەرسـتیی بـەوە دەدەنـەوە، کـە چاویـان لـە بـاب و باپیرانیـان و پێشـینانیان کـردوەو، لاسایی ئەوانیـان کردۆتـەوە، بەڵکـو عادەتـی هەمـوو گەلـە پێشـووەکان وابـووە، ﴿ مَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ فِى قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ ﴾، لـە پێـش تـۆدا، لـە هیـچ ئاوەدانییەکـدا، هیـچ وریاکـەرەوەو ترسـێنەرێکمان نەنـاردوە، هیـچ پێغەمبەرێکـمان نەنـاردوە، ﴿ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَآ ﴾، مەگـەر خۆشـگوزەرانەکانی گوتوویانـە، خۆشـگوزەرانەکانی، واتـە: ئەوانـەی خۆیـان سـەپاندوە بەسـەر خەڵـك و وڵاتـداو، هەمـوو شـتێکیان لـە دەسـتی خۆیانـدا، چـڕ کردۆتـەوەو کـورت هەڵێنـاوەو، قـۆرخ کـردوە، ﴿ إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّقْتَدُونَ ﴾، {ئەوانـە بـە هـەر کام لـە پێغەمبەرانیـان گوتـوە:} ئێمـە بـاب و باپیرانمـان لـێ هەڵکەوتـوە، لەسـەر ڕێیـەك و بـە شـوێنەوارەکانی ئەوانـدا، چـاو لێکەریـن پەیڕەویـی لـەوان دەکەیـن و، شـوێن هەنگاوەکانـی ئـەوان دەکەویـن.

پێشـێ فەرمـووی: ﴿ عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّهْتَدُونَ ﴾، ئێمـە بـە شـوێنەواری ئەوانـدا، ڕێـی ڕاسـتمان گرتـوە، واتـە: شـوێنەوارەکانی ئـەوان، ڕێیەکـی ڕاسـتن.

لێـرەش دا دەفەرمـوێ: ﴿ عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّقْتَدُونَ ﴾، بـە شـوێنەوارەکانی ئەوانـدا، چاومـان لـەوان کـردوە، واتـە: لـە ئایەتـی پێشـێدا دەفەرمـوێ: ڕێیەکەیـان ڕاسـتە، لەمەشـدا دەفەرمـوێ: ئـەو بـاب و باپیرانەمـان پێکاویانـەو، تێگەیشـتوو بـوون، ڕێ ڕاسـتگرتوو بـوون، بۆیـە ئێمـەش بـە شـوێن پێـی ئەوانـدا دەچیـن، وەك ئـەوان چییـان کـردوە، ئێمـەش وا دەکەیـن، (**الإقْتِـدَاءُ هُـوَ أَنْ تَفْعَـلَ كَـمَا فَعَلَـهُ مُقْتَـدَاكَ**)، (**إِقْتِـدَاء**) یانـی پەیڕەویـی لێکراوەکـە چـی کـردوە، تـۆش وەك ئـەو بکـەی و خـۆت بشـوبهێنی بـەوەوە.

﴿ قَٰلَ أَوَلَوْ جِئْتُكُم بِأَهْدَىٰ مِمَّا وَجَدتُّمْ عَلَيْهِ ءَابَآءَكُمْ ﴾، {ئـەو پێغەمبـەرە ﷺ، کـە بـۆ هـەر کام لـەو کۆمەڵگایانـە نێـردراوە}، فەرمـووی: ئـەدی ئەگـەر بەرنامەیەکـی

ڕێنماییکارتر لەوەی ئێوە، باب و باپیرانتان لەسەر بینیوەو، لێهەڵکەوتوە، بۆتان بێنم، واتە: ئەگەر بەرنامەیەکتان بۆ بێنم، باشتر ڕێنماییتان بکات، لەوەی کە باب و باپیرانتان لەسەری بوون، هەڵبەتە لێرەدا مەبەست لە: (**مُفَاضَلَة**) ئەوە نیە کە ڕێی وانیش ڕاست بێ، بەڵام ئەوەی پێغەمبەران هێناویانە، ڕاستتر بێ، بەڵکو مەبەست لێرەدا، لەگەڵدا ڕۆیشتن و دڵڕاگرتنی بەرانبەرەکانە، ناکرێ یەکسەر بڵێی: ئێوە لە گومڕایی دان، ئەو کاتە گوێت بۆ ناگرن! دەفەرموێ: گریمان ڕێی باب و باپیری ئێوەش ڕاست بووە، بەڵام ئایا ئەگەر ڕێیەکی باشترو چاکترو ڕاستتر هەبێ؟! ئەمە پێی دەگوترێ: (**مُجَارَاةُ الخَصْم**)، لەگەڵ کەسێك دا بڕۆی کە لەگەڵیدا ناکۆکی، یانی: یەکسەر لە دەماری نەدەی، بۆ ئەوەی گوێت بۆ بگرێ، ﴿ قَالُوٓاْ إِنَّا بِمَآ أُرۡسِلۡتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴾، خۆشگوزەرانەکان، گوتیان: ئێمە بەوەی ئێوەی پێ ڕەوانەکراون، بێبڕواین، هەڵبەتە کە گوتوویانە: ئەوەی پێ ڕەوانەکراون، واتە: ئەوەی کە پێتان وایەو لاف لێ دەدەن پێی ڕەوانەکراون.

یاخود: بە توانج و تەوسەوە بووە، واتە: ڕاست ناکەن و ئەوەی گوایە ئێوەی پێ ڕەوانە کراون، ئێمە پێی بێبڕواین، ئەگەرنا، ئەگەر قەناعەتیان وابووایە، خوا ﷻ ڕەوانی کردوون، ئەو کاتە ئەگەر دانیان بەوەدا نەهێنابایە، هەڵوێستەکەیان نالۆژیکیی دەبوو، بە لای خۆشیانەوە، واتە: بە مەنتیقی خۆشیان نا لۆژیکیی دەبوو.

﴿ فَٱنتَقَمۡنَا مِنۡهُمۡ ﴾، تۆڵەمان لێ ستاندن، هەقمان لێکردنەوەو، سزامان دان، ﴿ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ﴾، ئنجا سەرنج بدە! سەرەنجامی بە درۆ دانەران چۆن بوو! سەرەنجامێکی زۆر خراپیان هەبوو، خوای دادگەر، سزایەکی سەختی دان، چونکە دوای ئەوەی خوا ﷻ پێغەمبەرانی بۆ ناردوون و پەیامی خۆی پێدا ناردوون، ئەوان بەبیانووی ئەوەی بە دوای باب و باپیرانی خۆیان کەوتوون، ئامادە نەبوون، گوێ بۆ پەیام و بانگەوازی پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام**) بگرن.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**رەخنەگرتنی خوای تاك و پاك، لە هاوبەشدانەرانی رۆڵەی مێینە بۆ خوا دانەرو، پووچەڵکردنەوەی ئەو بیرۆکە ئەفسانەییەی کە فریشتەکان بە رۆڵەی خوا دادەنێ و، گوایە مێینەن و کچانی خوان، پاکیی و بێگەردیی بۆ خوا:**

خوا ﷻ دەفەرمویٚ: ﴿ وَجَعَلُوا لَهُۥ مِنْ عِبَادِهِۦ جُزْءًا إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَكَفُورٌ مُّبِينٌ ﴿١٥﴾ أَمِ ٱتَّخَذَ مِمَّا يَخْلُقُ بَنَاتٍ وَأَصْفَىٰكُم بِٱلْبَنِينَ ﴿١٦﴾ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِمَا ضَرَبَ لِلرَّحْمَٰنِ مَثَلًا ظَلَّ وَجْهُهُۥ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ ﴿١٧﴾ أَوَمَن يُنَشَّؤُا۟ فِى ٱلْحِلْيَةِ وَهُوَ فِى ٱلْخِصَامِ غَيْرُ مُبِينٍ ﴿١٨﴾ وَجَعَلُوا ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ ٱلَّذِينَ هُمْ عِبَٰدُ ٱلرَّحْمَٰنِ إِنَٰثًا أَشَهِدُوا خَلْقَهُمْ سَتُكْتَبُ شَهَٰدَتُهُمْ وَيُسْـَٔلُونَ ﴿١٩﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دە بڕگەدا:

١)- ﴿ وَجَعَلُوا لَهُۥ مِنْ عِبَادِهِۦ جُزْءًا ﴾، بەشێکیان بۆ خوا دانا لە بەندەکانی، واتە: بەندەکانیان کردنە بەشێك لە خوا، (**الجُزْءُ: بَعْضٌ مِنْ كُلٍ، وَقِطْعَةٌ مِنْهُ، وَالوَلَدُ كَجُزْءٍ مِنَ الوَالِدِ، لأَنَّهُ مُنْفَصِلٌ عَنْهُ**)، (**جُزْء**): بریتیە لە بەشێك لە هەموو، پارچەیەك لە شتێك، ئنجا رۆڵەش وەك بەشێك وایە لە باب و دایكی، چونكە لەوان جیابۆتەوەو، ئەگەر فریشتەكان رۆڵەی خوابن، مانای وایە بەشێكن لە خواو، لەو جیابوونەوە.

٢)- ﴿ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَكَفُورٌ مُّبِينٌ ﴾، خوا ﷻ لێرەدا هەر ئەوەندە، وەڵام دەداتەوە دەفەرمویٚ: بە دڵنیایی مرۆڤ سپڵەیەکی زۆر ئاشکرایە، وشەی (**الإِنْسَان**) کە (**أل**)ی ناساندنی لەسەرە، بۆ ناساندنی (عهد)ە، واتە: مرۆڤەکە، مرۆڤە بێبڕوایەکە، زۆر سپڵەو

پێنەزانە، (**كَفُور**)یش، واتە: (**جاحِدُ النِّعْمَة**)، نادیدەگری چاکەی خوا، (**مُبِين**)یش واتە: ڕۆشن یان: ڕۆشنکەرەوە بۆ سپڵەییەکەی، چونکە وشەی (**مُبِين**) بەپێی سیاق، مانایەکەی دیاریی دەکرێ، ئەگەرنا (**مُبِين**)، دەگونجێ لە (**أبانَ**)ی (**لازِم**)ەوە بێ و، دەگونجێ لە (**أبانَ**)ی (**مُتَعَدِّي**)ەوە بێ، واتە: مرۆڤ سپڵەیە، سپڵەییەکەشی زۆر ڕۆشنە، یاخود: مرۆڤ سپڵەیەو، زۆریش ڕۆشنکەرەوەیە بۆ سپڵەییەکەی و، بێ ئەمەگییەکەی، لە بەرانبەر خوای بەرزی مەزندا.

لە سوورەتی: (**الأنعام**)دا هەروەك سەرنجدانێکی خێرا، خوا ﷻ باسی ئەو ڕۆڵە پاڵدانە بۆ لای خوا ﷻ دەکات، کە دەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلُوا۟ لِلَّهِ شُرَكَآءَ ٱلْجِنَّ وَخَلَقَهُمْ ۖ وَخَرَقُوا۟ لَهُۥ بَنِينَ وَبَنَٰتٍۭ بِغَيْرِ عِلْمٍ ۚ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٠٠﴾ بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُۥ وَلَدٌ وَلَمْ تَكُن لَّهُۥ صَٰحِبَةٌ ۖ وَخَلَقَ كُلَّ شَىْءٍ ۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿١٠١﴾ ﴾، واتە: هاوبەشی جندیان بۆ خوا دانان، لە حاڵێکدا خوا ﷻ جندەکانی دروستکردوون و، بێ زانیاریی کوڕان و کچانیان بۆ هەڵتاشین، پاك و بەرزە خوا، لەوەی ئەوان پێی وەسف دەکەن، (دوایی خوای زانا بەرپەرچیان دەداتەوەو دەفەرموێ:) خوا بەدیهێنەرو داهێنەری ئاسمانەکان و زەوییە،ڕۆڵەی چۆن دەبێ، هاوسەری نەبێ[1]، هەموو شتێکی هێناوەتە دی و بە هەموو شتێکیش زانایە.

خوا ﷻ کە لە شوێنێکدا بیرۆکەیەك پووچەڵ دەکاتەوە، جاری وایە بە پێویستی نازانێ، لە شوێنەکانی دیکە بیهێنێتەوە، ئنجا کە پێشتر لە سوورەتی (**الأنعام**)دا، کە پێش ئەم سوورەتە دابەزیوە، خوا ﷻ بەرپەرچی ئەو بیرۆکەیەی داوەتەوە، بە پێویستیی نەزانیوە لێرەدا دووبارە بەرپەرچی بداتەوە.

---

(١ ) دیارە: (صاحبة) بە مانای (زَوجَة) دێ، بەڵام لەبەر ئەوەی خوا ﷻ جووتی نیە، وشەی: (صاحبة)ی بەکارهێناوە، واتە: هاوەڵ، هاوەڵێکی مێینە، ئەگەر هاوسەری نەبێ، چۆن ڕۆڵەی دەبێ؟!.

٣)- ﴿ أَمِ ٱتَّخَذَ مِمَّا يَخْلُقُ بَنَاتٍ ﴾، بەڵکو ئایا لەوەدا کە دروستیکردوون، کچانی هەڵبژاردوون بۆ خۆی، (أَم) یانی: (بَلْ أَ)، بەڵکو ئایا، (إتَّخَذَ، إتِّخَاذ) بریتیە لە گرتنی شتێك، بە گرنگیی پێدانەوە و مانای هەڵبژاردنی تێدایە، واتە: ئایا خوا ﷻ بە گرنگیی پێدانەوە کچانی بۆ خۆی هەڵبژاردوون، لە نێو دروستکراوەکانیدا؟ ئەم پرسیارکردنە (إسْتِفْهَامُ تَقْرِيعٍ وَتَوْبِيخ)، پرسیارکردنی سەرزەنشتکردن و ڕەخنەلێگرتنە.

٤)- ﴿ وَأَصْفَىٰكُم بِٱلْبَنِينَ ﴾، {چۆن لەوانەدا کە دروستیکردوون، کچانی بۆ خۆی داناون}، کەچی ئێوەی تایبەت کردوە بە کوڕانەوە؟ (آثَرَكُم وَفَضَّلَكُم بِالبَنِين)، ئێوەی هەڵبژاردوەو بە پێدانی کوڕان پەسندی کردوون، دەگوترێ: (أَصْفَيْتُهُ الوُدَّ: أَخْلَصْتُهُ لَهُ)، خۆشەویستیی خۆمم بۆ ساغکردەوە، خڵتەم پێوە نەهێشت، واتە: ئایا خوا ئێوەی هەڵبژاردوە بەسەر خۆیداو ئێوەی تایبەت کردوە بە کوڕانەوە، لە حاڵێکدا ئێوە کوڕتان پێ چاکن و، کچتان پێ خراپن، ئایا خوا ﷻ بۆچی ئەوەی ئێوە پێتان خراپە، بۆ خۆی هەڵیبژاردوەو ئەوەی ئێوە پێتان چاکە، کە کوڕانن داونی بە ئێوە؟!

هەڵبەتـە ئـەوەم نەبینیـوە لـە تەفسـیرەکاندا بـاس بکـرێ، بـەڵام بێگومـان خـوا ﷻ بـەس کـوڕی نـەداون بـە بێبڕوایـەکان، کچیشـی داونـێ، بـەڵام واتـە: لـە حاڵێکـدا کـە وەك ئێـوە گومـان دەبـەن، خـۆی تەنیـا کچـی هەڵبـژاردوون، کەچـی کـوڕو کچـی داون بـە ئێـوە، بـەڵام باسـی کچەکانـی نەکـردوە، تەنیـا باسـی کوڕەکانـی کـردوە، لەبـەر ئـەوەی ئـەوان کچیـان نادیـدە گرتـوون، یاخـود پێیـان کـەم و بـێ بایـەخ بـوون، بۆیـە کـە دەفەرمـوێ: کـوڕانی بـە ئێـوەوە تایبـەت کـردوون، بـۆ ئێـوەی هەڵبـژاردوون، بۆیـە تەنیـا باسـی کوڕانـی کـردوە، چونکـە کچانیـان بـەوە نەزانیـون پشـك و بەشـێکی وابـن، کـە خـوا ﷻ تایبەتیـان بـکات بەوانـەوەو، ئەوانیـان بـۆ هەڵبژێـرێ و، بـۆ ئەوانیـان هەڵبژێـرێ!

٥)- ﴿ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِمَا ضَرَبَ لِلرَّحْمَٰنِ مَثَلًا ﴾، هەر کاتێك یەکێکیان موژدەی بەوە پێ بدرێ، کە بۆ (خوای) خاوەن بەزەیی بە نموونە هێناوەتەوە، کە بە تەئکید کچیان بە نموونە هێناوەتەوە، واتە: (إذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِالبِنْت)، وەك لە سوورەتی (النَّحل)

دا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِٱلۡأُنثَىٰ ﴿٥٨﴾ ﴾، بەڵام لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ بِمَا ضَرَبَ لِلرَّحۡمَٰنِ مَثَلٗا ﴾، ئەگەر یەکێکیان موژدەی ئەوەی پێ بدرێ، کە بۆ (خوای) خاوەن بەزەیی بە نموونە هێناوەتەوە، (کە کچانن)، چی لێ دێ؟

٦)- ﴿ ظَلَّ وَجۡهُهُۥ مُسۡوَدّٗا وَهُوَ كَظِيمٌ ﴾، ڕووی ڕەش دادەگەڕێ و، زۆر پیشخۆرەوەشە، (**إِغْتَمَّ لِذَلِكَ، فَاسْوَدَّ وَجْهُهُ، وَاشْتَدَّ حُزْنُهُ، وَامْتَلأَ مِنَ الكَرْبِ**)، بە هۆی ئەو موژدە پێدرانەوە، ڕووی ڕەش دادەگەڕێ و، زۆر پەست و تووڕەو نیگەران دەبێ و، دڵی پڕ دەبێ لە ڕق و خەفەت.

پێشتر گوتمان: کە (**مَثَل**)، یانی: (**شَبِيه**)، وێنە، (**ظَلَّ**): (**صَارَ**) بوو، بەکارێك دەگوترێ، بە ڕۆژێ بکرێ، واتە: ڕووی ڕەش دادەگەڕێ، (**صَارَ وَجهُهُ مُسْوَدّاً**)، (**كَظِيم**): (**المُمسِكُ عَنِ الكَلَامِ غَضَباً وَكَرَباً وَحُزْنَاً**)، (**كظيم**) کەسێکە بێدەنگ بێ، بەهۆی زۆر تووڕەیی و زۆر دڵخەفەتیی و خەمبارییەوە، بە کوردیی پێی دەڵێن: پیشخواردنەوە، لەبەر خۆی هەر پیش دەخواتەوە، هەر مشەمشیەتی و پیش دەخواتەوەو، تووڕەییەکەی لە دڵی دایەو دەری نابڕێ.

٧)- ﴿ أَوَمَن يُنَشَّؤُاْ فِي ٱلۡحِلۡيَةِ وَهُوَ فِي ٱلۡخِصَامِ غَيۡرُ مُبِينٖ ﴾، پێشتریش گوتمان: ئەمە دوو ئەگەری هەن:

أ- فەرمایشتی خوایە ﷻ: ئایا کەسێك بۆ خوا دادەنێن، کە لە ڕازاوەیی و لە نێو خشڵ و جوانییدا پێ دەگەیەنرێ و، ئەو لە کاتی مشتومڕیشدا ناڕوونکەرەوەیە بۆ مەبەستەکانی خۆی، باش ناتوانێ مەبەستی خۆی بگەیەنێ و ڕوون بکاتەوە.

ب- یان قسەی ئەو کەسەیە، کە موژدەی مێینەی پێدراوە، دەڵێ: ئایا کەسێك کە لە نێو جوانیی و ڕازاوەیی دا، پێ دەگەیەنرێ (کە کچە) و لە کاتی شەڕەقسەو موناقەشەشدا ڕوونکەرەوە نیە بۆ مەبەستی خۆی، موژدەی ئەوەم پێدەدەن؟ ﴿ يُنَشَّؤُاْ ﴾، خوێنراویشەتەوە: (**يَنشَأُ**)، پێ دەگات.

﴿ٱلْحِلْيَةِ﴾، (إسمٌ لِما يُتَحَلّى بِهِ) خشڵ و جوانیی و، ئەوەی خۆی پێ دەڕازێنرێتەوەو جوان دەكرێ.

كە دەفەرموێ: ﴿أَوَمَن يُنَشَّؤُا۟ فِى ٱلْحِلْيَةِ﴾، (نَشْأُ الشَّيء فِي حَالَةٍ، هوَ أَن يَكُونَ ابتِداءَ وجودِهِ مُقارِناً لِتِلكَ الحالَةِ، فَتَكُونُ لَهُ بِمَنزِلَةِ الظَّرْفِ)، ئەو جوانیی و ڕازاوەییە، وەك زەڕفێك دەبێ، كە ئەو ئافرەتەی تێدا پەروەردە دەكرێ و پێدەگات و، گەشە دەكات، لێرەدا خوا ﷻ بەپێی ئەو بنچینەیە كە دەڵێ: (أَدِينُكَ مِنْ فَمِكَ)، بە زاری خۆت دەتگرم و بە قسەی خۆت، بەو لۆژیكە، ئەو بێبڕوایانە دەدوێنێ، ئەگەر نا بێگومان، ئافرەت كەحەزی بە جوانیی دێ، بۆوی نوقسانیی نییە.

ئەوەی خواش ﷻ دەیفەرموێ، سەدا سەد وایە، چونكە ئەوە سروشتی ئافرەتانەو ئافرەت زیاتر كەیفی بە جوانیی و ڕازانەوەو خۆ جوان كردن دێ، هەروەها لە ڕووی وتوێژو قسەو، لە ڕووی فیكرییشەوە، ئافرەت لە چاو پیاو، وەك پێویست ناتوانێ مەبەستەكانی خۆی چاك ڕوون بكاتەوە، لەبەر ئەوەی سۆزو هەست و نەستی، بەهێزترە لە عەقڵ و بیركردنەوەی، ئەویش لەبەر ئەوەی ئەو ئەركە سرووشتییەی بۆ ئافرەت دانراوە، كە بریتیە لە ئەركی دایكایەتیی و، كابانیەتیی و، منداڵ بە خێو كردن و، پەروەردەكردن، زیاتر پێویستیی بە سۆزو بەزەییە، هەروەك حەوجێی دەنگی بە سۆزو ناسكەو جەستەی ناسكە، نەك جەستەیەكی ماسوولكەداری بەهێزو، دەنگێكی گڕ، كە لە پیاواندا هەیە.

هەروەك پیاویش، كە ئەركەكەی زیاتر لە دەرەوەیماڵە، بە سرووشت و خوارسك، پێش ئەوەی شەریعەتیش وا بڵێ، هەر زگماك و خوارسك وادەڵێ، لە هەموو گەل و نەتەوەكانیش دا هەر وایە، مەگەر ئەوانەی كە لە خوارسك و زگماك لایان دابێ، ئەگەرنا زیاتر، سوپایەكان لە پیاوان پێك دێن و، ئیشە قورسەكان زیاتر پیاوان دەیانكەن، ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ گەرماو سەرمادا پیاوان دەیكەن، لە دەرەوەی ماڵ، بەڵام ئافرەتان زیاتر، لە نێو ماڵدا ڕۆڵی خۆیان دەبینن، ئەگەر پیاوان خانووبەرەو شار دروست دەكەن، ئافرەتانیش

مـرۆڤ دروسـت دەکـەن، تەنیـا ئافـرەت توانـای مـرۆڤ دروسـتکردنی هەیـە، یەکـەم لـە نێـو هەنـاوی خۆیـدا، دواییـش لـە کـۆش و باوەشـی پـڕ سـۆزو گەرمـی دا، ئـەوەش حاڵەتێکـی سرووشـتییە، پێـش ئـەوەی شـەرع وا بفەرمـوێ، زگـماکی مرۆڤـەکان و سرووشـتی مرۆڤـەکان و بەرژەوەندیـی مرۆڤـەکان، ئـەوە دەخـوازێ.

﴿ وَهُوَ فِي الْخِصَامِ غَيْرُ مُبِينٍ ﴾، (هُـوَ) ڕاناوەکـەی دەچێتـەوە بـۆ (مَـن) بۆیـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَهُوَ ﴾، ئەگەرنـا دەبـوو فەرمووبـای: (وَهِـيَ)، بـەڵام: ﴿ أَوَمَن ﴾، دەگەڕێتـەوە بـۆ (مَن)ەکـە، (مَن)یـش (مُذَكَّر مَجَازِي)ە، ئـەو کەسـەی پاڵـی دەدەنـە لای خـوا، وەك ڕۆڵـە، لـە نێـو خشـڵ و جوانیـی و ڕازاوەیـی دا پێـدەگات، لـە کاتـی مشـتومڕو شەڕەقسەشـدا، ناڕوونکەرەوەیـە بـۆ مەبەسـتەکانی خـۆی، (الخِصَـامُ: الجِدَالُ وَالنِـزاعُ بِالـكلام)، (خصـام) بریتیـە لـە شـەڕە قسـەو مشـتومڕ.

٨)- ﴿ وَجَعَلُوا الْمَلَائِكَةَ الَّذِينَ هُمْ عِبَادُ الرَّحْمَٰنِ إِنَاثًا ﴾، ئەو فریشتانەی کە بەندەی (خوای) بە بەزەیین، بە مێینەیان دانان، ﴿ عِبَادُ الرَّحْمَٰنِ ﴾، خوێندراویشەتەوە: (عِندَ الرَّحْمَن)، ئەوانەی کە لە لای (خوای) بە بەزەیین، کە فریشتەکانن، لە لای خوان، واتە: پێگەیان لە خوا نزیکە، بەو واتایە کە ئەوان دروستکراوی مەعنەویین، چی خوا ﷻ بفەرموێ: ئەوان بێ فەرمانیی خوا ناکەن، لەو ڕووەوە لە خوا نزیکن، ئەو فریشتانەی کە بەندەی خوان، یان لە خوا نیزیکن، بە مێینەیان دانان.

٩)- ﴿ أَشَهِدُوا خَلْقَهُمْ ﴾، ئایا دروستکردنیان بینیوە؟ ئەم پرسیارکردنە، پرسیارکردنی نکووڵییلێکەرانەیە، واتە: (مَا شَهِدوا خَلقَهُم)، ئامادە نەبوون لە کاتی دروستکرانیاندا، (أَحَضَروا)، ئایا ئامادە بوون؟ کاتێ دروستکراون، تاکو بزانن داخۆ مێن یان نێرن؟ لە ڕاستییدا فریشتەکان ڕەگەزیان هەر نیە، چونکە ڕەگەز بۆ ئەو دروستکراوانەیە، کە دەبێ پێکەوە جووت بن، تاکو وەچەیان هەبێ، بەڵام فریشتەکان وەچەیان نیە.

﴿ أَشَهِدُوا خَلْقَهُمْ ﴾، خوێندراویشـەتەوە: (أَأُشْـهِدُوا)، ئنجـا ئەگـەر بفەرمـوێ: (أَشَـهِدوا)، واتـە: (أَحَـضِروا)، ئایـا ئامـادە بـوون لـە کاتـی دروسـتکرانیان دا؟ ئەگـەر

(**أَأُشْهِدُوا**) بێ، واتە: ئایا ئامادە کراون، لە کاتی دروستکرانیان دا، تاکو بزانن چۆنن؟!

١٠)- ﴿ سَتُكْتَبُ شَهَادَتُهُمْ وَيُسْأَلُونَ ﴾، بە دڵنیایی شایەدییدانەکەیان دەنووسرێ و، لێشیان دەپرسرێتەوە، (**المُرَادُ بِشَهَادَتِهِم، إدِّعَاءُهُم أَنَّ المَلائِكَةَ إِنَاثٌ، وَأُطْلِقَ عَلَيهَا الشَّهَادَةُ تَهَكُّماً بِهِم**)، ئەوان لێرەدا شایەدییەکیان نەداوە، بەڵام ئەو لاف لێدانەی، گوتوویانە: فریشتەکان مێینەن، خوا ﷻ بە شایەدییدانی داناوە، وەك گاڵتە پێکردنیان، یاخود: هەر کەسێك لافێك لێ بدات، ئیددیعایەك بکات، وەك ئەوە وایە شایەدیی بدات، خواش ﷻ دەفەرموێ: ئەو شایەدییدان و لاف لێدانەیان دەنووسرێ، لێشیان دەپرسرێتەوە.

﴿ وَيُسْأَلُونَ ﴾، یانی: پرسیارکردنی هەڕەشە لێکردن و، سەرزەنشتکردن، وەك خوا ﷻ لە سوورەتی (**التَّكَاثُر**)دا، دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ لَتُسْأَلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ النَّعِيمِ ﴿٨﴾ ﴾، دوایی لەو ڕۆژەدا، لە نیعمەت و چاکەکان لێتان دەپرسرێتەوە، واتە: لێپرسینەوەی سەرزەنشتکردن، کە ئایا خوا ﷻ فلان شتەی نەدانێ، فلان شتەی نەدانێ... کوا چیتان پێکرد؟

لێرەدا خوا ﷻ لەم ئایەتانەدا، حەوت شتی باسکردوون:

١- هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، هەندێك لە بەندەکانی خوایان کردوون، بە بەشێك لە خواو، ڕۆڵەی خوا، وایانداناوە فریشتەکان کچانی خوان!!

٢- گوایە خوا ﷻ، کچانی هەڵبژاردوون و، پەسندی کردوون بەسەر کوڕاندا بۆ خۆی، لە حاڵێکدا کە ئەوان، کچانیان بە کەم بایەخ داناون و، کوڕیان پێ چاکتر بوون، خواش ﷻ هەر بە عەقڵی خۆیان دەیانگرێ: ئێوە مادام خۆتان کوڕتان پێ چاکە، ئایا خوا ﷻ بە ئەندازەی ئێوەش لێی نازانێ، کە مادام ئێوە کوڕانتان پێ چاکن، ئەویش هەر کوڕانی بۆ خۆی کردبانە ڕۆڵە، بە پێی عەقڵەکەی ئێوە؟ واتە: بە لۆژیکی خۆشتان، ئەوە شتێکی ڕەوا نیە، جگە لەوەی لە واقیعدا خوا ﷻ ڕۆڵەی نیە.

٣- بێبڕوایان لە کاتێکدا هەواڵی لە دایك بوونی کچیان پێدراوە، روویان ڕەش داگەڕاوەو زۆر پەست و تووڕە بوون، پیشیان خواردۆتەوە، ئەمەش خوا ﷻ وەك بەڵگەیەکی دیکە باسی دەکات، لەسەر ئەوەی شتێکی نارەوایە، مێینە پاڵ بدرێتە لای خوا، کە خۆتان ئەگەر هەواڵ و موژدەتان پێبدرێ، لە خەفەتان رووتان ڕەش هەڵدەگەڕێ و، دەست دەکەن بە پیش خواردنەوەو پەستیی و تووڕەیی داتاندەگرێ.

٤- هەروەها خوا بەڵگەیەکی دیکەش هەر لەسەر ئەوە دێنێتەوە، کە دەفەرموێ: ئایا کچانێك کە لە ڕازاوەیی و خشڵ و جوانییدا، پێ دەگەیەنرێن، چۆن دەبێ پاڵبدرێنە لای خوا! یانی: سرووشتی ئافرەتان وایە.

دەشگونجێ ئەمە قسەی ئەو بێبڕوایە موژدە پێدراوە بێ و بەهۆی ئەوەوە کە کچی بووە، بڵێ: چۆن دەبێ کچێك کە لە جوانیی و ڕازاوەیی دا پێدەگات، موژدەو هەواڵم پێ بدەن؟ کە ئەوەش هەواڵێکی خۆش نیە، یانی: ئەگەر وایە، چۆن ئەوە پاڵدەدەنە لای خوا، کە بۆ خۆتان بە هەواڵێکی ناخۆشی دادەنێن؟!.

٥- کچان ئاوا پێناسە کراون: ﴿وَهُوَ فِي الْخِصَامِ غَيْرُ مُبِينٍ أَوَمَن يُنَشَّؤُا فِي الْحِلْيَةِ﴾، ئایا کەسێك لە جوانیی دا پێدەگەیەنرێ و لە کاتی وتووێژدا ناڕوونکەرەوەیە، بۆ مەبەستی خۆی، واتە: ئافرەتان مەبەستی خۆیان چاك دەرنابڕن و ڕوونی ناکەنەوە لە چاو پیاوان، بێگومان ئەمەش شتێکی ڕێژەییە، بەڵام بە گشتیی، هەم ئافرەتان زیاتر کەیفیان بە جوانیی دێ، تەماشای هەموو ئافرەتان بکەی، هەر وایە، ئافرەت دەکەوێتە تەمەنیشەوە، هەر پێی خۆشە خۆی بڕازێنێتەوە، بە هەموو شێوەکانی خۆڕازاندنەوە، هەڵبەتە وەنەبێ، پیاویش کەیفی لێ نەبێ، بەڵام ئەوە زیاتر کاری ئافرەتانە، دیسان لە ڕووی وتوێژو شەڕە قسەوەش، پیاوان زیاتر توانای ئەوەیان هەیە، لەبەر ئەوەی توانای هۆشیی پیاوان زیاترە لە هی ئافرەتان، هەروەك چۆن ئافرەتان ڕەحم و بەزەیی و سۆزیان زیاترە لە پیاوان.

٦- بێبڕوایەکان فریشتەکانیان بە مێینە داناون، لە حاڵێکدا کە ئەوان لە خزمەت خوادان و لە خواوە ﷻ بەندەی زۆر نیزیکن!! کە ئەوە شتێکی بێ جێیە.

٧- بێبڕوایان بێ ئەوەی ئامادەی دروستکرانی فریشتەکان بن، ڕەگەزیان بۆ دیاریی کردوون، گوایە مێینەن، بە دڵنیاییەوەش بەبێ ئاگادار بوون لە شتێك، دروست نیەو، شتێکی ڕەوا نیە، لە بارەیەوە قسە بکرێ.

کەواتـە: لێـرەدا خـوا ﷻ حـەوت ڕەخنـەی گرتـوون، لەوانـەی گیـرۆدە بـوو، بـە شـیرکی ڕۆڵـە پاڵـدان، بـۆ لای خـوای بـەرزی مـەزن.

## مەسەلەی دووەم:

**پاساو دانەوەی کافرەکان و بیانوو هێنانەوەیان، بۆ پەرستنی فریشتان، بەوە کە خوا ئەوەی ویستوە، کەواتە: لێشی ڕازییە! بەرپەرچدانەوەی خواش بۆیان، کە لە گۆترە قسە دەکەن، چونکە هیچ کتێبیان لەو بارەوە پێش قورئان پێنەدراون، بەڵکو تاکە بەڵگەیان بۆ ئەوە، شوێنکەوتنی پێشینانیان و لاساییکردنەوەی کوێرانەی ڕابردووانیانە، کە هەر ئەوەش پاساوو بیانووی بێبڕوایانی پێشووشیان بووە، بۆ گرتنی ڕێی بتپەرستیی و، هاوبەش بۆ خوا دانان و، وەڵامنەدانەوەی پەیامی یەکتاپەرستانەی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ):**

خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ وَقَالُوا۟ لَوْ شَآءَ ٱلرَّحْمَٰنُ مَا عَبَدْنَٰهُم ۗ مَّا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ ﴿٢٠﴾ أَمْ ءَاتَيْنَٰهُمْ كِتَٰبًا مِّن قَبْلِهِۦ فَهُم بِهِۦ مُسْتَمْسِكُونَ ﴿٢١﴾ بَلْ قَالُوٓا۟ إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّهْتَدُونَ ﴿٢٢﴾ وَكَذَٰلِكَ مَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ فِى قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَآ إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّقْتَدُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:

١)- ﴿ وَقَالُوا۟ لَوْ شَآءَ ٱلرَّحْمَٰنُ مَا عَبَدْنَٰهُم ﴾، هەروەها (هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان)، گوتیان: ئەگەر (خوای) بە بەزەیی ویستبای، ئێمە نەمان دەپەرستن.

لێرەو لە زۆر شوێنی دیکەی قورئانیش، چەند وشەیەك قرتێنراون، لەبەر ئەوەی بە سیاق و سەلیقە دەزانرێن، ﴿ وَقَالُوا۟ لَوْ شَآءَ ٱلرَّحْمَٰنُ ﴾، واتە: (**لَو شَاءَ الرَّحْمَنُ عَدَمَ عِبَادَتِنَا إِيَّاهُم**)، ئەگەر خوای بە بەزەیی ویستبای نەیانپەرستین، نەماندەپەرستن، یاخود: (**لَو شَاءَ الرَّحمَنُ أَن يَمْنَعَنَا عَنْ عِبَادَتِهِم، مَا عَبَدنَاهُم**)، ئەگەر خوا ویستبای ڕێگریی پەرسترانیانمان لێ بکات، نەماندەپەرستن، ڕاناوی

سـەر (مَـا عَبَدنَاهُـم)، بـۆ پەرسـتراوەکانیان دەچێتـەوە، ئنجـا ئەگـەر فریشـتەکانن، ئەگـەر پەیکەرەکانـن، هـەر شـتێك هـەن.

لێـرەدا هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرەکان، دوو شـتیان تێکـەڵ کـردوون، کـە بریتیـن لـە: ویسـتی خـواو، ڕەزامەندیـی خـوا، پێیـان وابـووە هـەر شـتێك خـوا لـە بەندەکانـی بـوێ، مانـای وایـە لێشـی ڕازییـە! ئـەوەش هەڵەیەکـی کوشـندەی هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرو بێبڕوایەکانـە، بەڵکـو جـاری وایـە هەندێـك لـە مسـوڵمانانیش، گرفتـار دەبـن بـەو تێگەیشـتنە هەڵەیـەوە.

بێگومـان هیـچ شـتێك نیـە بـە ویسـتی خـوا نەبـێ، هـەروەك هیـچ شـتێك نیـە بـە زانیاریـی خـوا نەبـێ و، هیـچ شـتێك نیـە دەسـەڵاتی خـوای لـە پشـتەوە نەبـێ، بـەڵام مـەرج نیـە هەمـوو شـتێك، ڕەزامەندیـی خـوای لەگـەڵ دابـێ، هـەر شـتێك خـوا نەیـەوێ نابـێ، هـەر شـتێك خـوا نەیهێنێتـە دی، نایەتـە دی، هـەر شـتێك خـوا ﷻ زانیاریـی پێـی نەبـێ، بوونـی نیـە، هەمـوو شـتێك پەکـی کەوتـوە لەسـەر ئـەوە، کـە خـوا بیزانـێ، بیـەوێ، بیتوانـێ، واتـە: دەسـەڵاتی خـواو، زانیاریـی خـواو، ویسـتی خـوا، پێـوەی پەیوەسـت بـن، بـەڵام مـەرج نیـە ڕەزامەندیـی خـوا لەگـەڵ هەمـوو شـتێك دابـێ، وەك لـە سـوورەتی (الزُّمَر)دا، خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ إِن تَكْفُرُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِيٌّ عَنكُمْۖ وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلْكُفْرَۖ وَإِن تَشْكُرُواْ يَرْضَهُ لَكُمْ ﴿٧﴾ ﴾، واتـە: ئەگـەر بێبڕوابـن خـوا لێتـان بێنیـازەو، ئـەو (خـوا) کوفـر بـۆ بەندەکانـی (یاخـود سـپڵەیی بـۆ بەندەکانـی) پەسـند نـاکات، بـەڵام ئەگـەر سوپاسـگوزاریی بکـەن، بـۆ ئێـوەی پێخۆشـەو بۆتـان پەسـند دەکات.

دیـارە سـپڵەیی و سوپاسـگوزاریی، یاخـود بێبڕوایـی و بڕواداریـی، هەردووکیـان بـە ویسـتی خـوان، بـەڵام هەردووکیـان بەپێـی ڕەزامەندیـی خـوا نیـن، بەڵکـو ڕەزامەندیی خـوا لەگـەڵ سوپاسـگوزاریی و بڕواداریـی دایـە، بـەڵام لەگـەڵ ناسوپاسـیی و بێبڕوایـی دا نیـە.

٢)- ﴿ مَّا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ ﴾، (بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ:) لەو بارەوە هیچ زانیارییەکیان نیە، (مِنْ) بۆ (تَبعِيض)ە، واتە: هیچ ئەندازەیەك زانیاریی هەرچەندە کەمیشیان لەو بارەوە نیە، ئێمە کاتی خۆی لە تەفسیری هەردوو ئایەتەکانی: (١٤٨و ١٤٩)ی سوورەتی (الأنعَام)دا، هەروەها دواتریش لە تەفسیری ئایەتی ژمارە: (٣٥)ی سوورەتی (النَّحْل)دا، کە هەر باسی ئەو مەسەلەیە دەکەن، کورتە باسێکمان کردوە، بۆیە لێرەدا ناچینە نێو وردەکارییەکانەوە.

ئەو شوێنەی خوا ﷻ لە سوورەتی (النَّحْل)دا: دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُواْ لَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا عَبَدْنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَيْءٍ نَّحْنُ وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمْنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَيْءٍ ﴿٣٥﴾ ﴾، لە دوو ئایەتەکەی سوورەتی (الأنعَام)یش، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ سَيَقُولُ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُواْ لَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشْرَكْنَا وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمْنَا مِن شَيْءٍ ۚ كَذَٰلِكَ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ حَتَّىٰ ذَاقُواْ بَأْسَنَا ۗ قُلْ هَلْ عِندَكُم مِّنْ عِلْمٍ فَتُخْرِجُوهُ لَنَآ ۖ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنْ أَنتُمْ إِلَّا تَخْرُصُونَ ﴿١٤٨﴾ قُلْ فَلِلَّهِ ٱلْحُجَّةُ ٱلْبَٰلِغَةُ ۖ فَلَوْ شَآءَ لَهَدَىٰكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿١٤٩﴾ ﴾، ئێمە کاتی خۆی، لەبەر ڕۆشنایی ئەم دوو ئایەتە موبارەکەدا، کورتە باسێکمان لەو بارەوە کردوە، لە سوورەتی (الأنعَام)دا، دەفەرموێ: ﴿ سَيَقُولُ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُواْ ﴾، لە مەودوا ئەوانەی بۆ خوا هاوبەش دانەرن، دەڵێن، واتە: خوا هەواڵیداوە کاتێك دێ، کە ئەوە دەڵێن، ئنجا لە سوورەتی (النَّحْل) لە ئایەتی ژمارە (٣٥)دا دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُواْ ﴾، لە سوورەتی (الأنعَام)دا، کە پێش (النَّحْل) دابەزیوە، خوا ﷻ فەرموویەتی: لە مەودوا هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان دەڵێن، ئنجا ئەوەی پێشتر هەواڵی پێداوە، لە سوورەتی (النَّحْل)دا، هێناویەتی کە گوتوویانە: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُواْ لَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا عَبَدْنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَيْءٍ نَّحْنُ وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمْنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَيْءٍ ﴾، خواش ﷻ هەر بەوەندە ئیکتیفا دەکات، بۆ بەرپەرچدانەوەیان: ﴿ كَذَٰلِكَ فَعَلَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ فَهَلْ عَلَى ٱلرُّسُلِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿٣٥﴾ ﴾.

کورتـەی بەرپەرچدانەوەکـەش هـەر ئەوەیـە کـە گوتمـان: ئـەوان پێیـان وابـووە، هـەر شـتێك خـوا ویسـتبێتی و، ویسـتی خـوای لەسـەر بووبـێ، دیـارە ڕەزامەندیـی خواشـی لەسـەرە، بـەڵام لـە ڕاسـتییدا ئـەوە تەنیـا لەسـەر گومـان هەڵچـنراوەو، هیـچ بەڵگەیەکـی لـە پشـتەوە نیـە، چونکـە هیـچ شـتێك بەبێ ویسـتی خـوا نابێ و، ویسـتی خـوا وەك ئاسـمان وایـە، مـرۆڤ هەرچـی بیـکات، لـە ژێـر سـێبەری ئاسـمان دایـە، بـەڵام ڕەزامەندیـی خـوا لەگـەڵ ئـەو شـتانەدایە، کـە باشـن و بـە سـوودن، لەگـەڵ ئەو شـتانەدا نیـە کـە زیـان بەخشـن، وەك لـە سـوورەتی (الزُّمَـر)دا دەفەرمـوێ: ﴿وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلْكُفْرَ ۖ وَإِن تَشْكُرُوا۟ يَرْضَهُ لَكُمْ ۝٧﴾.

ئنجـا ئایـا ئێمـە بەچـی دەزانیـن: خـوا لـە چـی ڕازییـەو، لـە چـی ڕازیـی نیـە؟ دەبـێ لـە ئاوێنـەی شـەریعەتدا تەماشـای شـتەکان بکەیـن و، هـەر شـتێك شـەریعەتی خـوا پەسـندی کردبـێ، دیـارە خـوا لێـی ڕازییـەو هـەر شـتێك شـەریعەتی خـوا ڕەفـزی کردبـێ، دیـارە خـوا لێـی ناڕازییـە، بـا هـەردوو لاشـیان بـە ویسـتی خـوا بـن، واتـە: ویسـتنی خـوا بـۆ شـتێك، نیشـانەی ڕازیـی بوونـی خـوا نیـە لـەو شـتە، بەڵکـو بـۆ ئـەوەی بزانیـن خـوا لێـی ڕازییـە یـان ڕازیـی نیـە؟ دەبـێ تەماشـای شـەریعەتەکەی بکەیـن، بۆیـە هەندێـك لـە زانایـان گوتوویانـە: خـوا ویسـتنی وەدیهێنـان (**تکویـن**)ی هەیـە، ویسـتنی ئـەرك پێ سپاردنیشـی هەیـە، (**المَشيئة التَكوينيّة وَالمَشيئة التَّشْرِيعيَّة**)، ئنجـا ئێمـە دەبـێ هەوڵبدەیـن، بەپێـی ویسـتی یاسـادانەرانەی خـوا بەڕێـوە بچیـن، نـەك ویسـتی بەدیهێنەرانـەی خـوا ﷻ، کـە لەگـەڵ هەمـوو شـتێك دایـە.

٣)- ﴿إِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ﴾، (بۆ ئەو قسەیەیان)، ئەوان تەنیا لە گۆترە قسە دەکەن، (**الخرص: التَوَهّمُ والظَّنُّ الّذي لاَ حُجّةَ فِيهِ، وَالخَرصُ: حَرْزُ الثَّمَرَةِ**)، (**خَرْص**) بریتیە لە گومان بردن و، وەهم کردن و بەکارهێنانی خەیاڵ، شتێك کە هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نەبێ، وشەی (**خَرص**) لە ئەصڵدا قرساندنی میوەیە، بۆ وێنە:

کەسـێك دەڵـێ: مـن ئـەو باخـی خورمایـان و ڕەزەت پـێ دەفرۆشـم، وەرە تەماشـای بکـە، چەنـد کەسـێکی شـارەزا بێنـەو بیخەملێنـە، داخـۆ چەندیـان میـوە

پێوەیە؟ بە کوردیی قرساندنیشی پێ دەڵێن و بە گۆترەشی پێ دەڵێن، یاخود دەڵێن: ئەو شتە لە گۆترە بە چەند؟ بێ ئەوەی بیپێوێ چەند ڕبە یان چەند تەنەکەیە؟ یاخود بێ ئەوەی بیکێشێ، چەند کیلۆیە؟ واتە: ئەوانە هەر لە گۆترە قسە دەکەن، نەك بە وردیی و بەبەڵگەوە، ئەوە لە ڕووی عەقڵییەوە، هیچ بەڵگەیەکیان نییە.

ئنجا بابزانین ئایا لە ڕووی نەقڵییەوە، هیچ بەڵگەیان هەیە، بۆ ئەوە کە ڕەزامەندیی خوا لە پەرستنی ئەو شتانەدایە، کە بە هاوبەشی خوایان دادەنێن و دەیانپەرستن؟!.

٤)- ﴿ أَمْ ءَاتَيْنَٰهُمْ كِتَٰبًا مِّن قَبْلِهِۦ فَهُم بِهِۦ مُسْتَمْسِكُونَ ﴾؟، واتە: یان ئایا پێش ئەو (پێش قورئان)، کتێبێکمان پێداون، کە ئەوان توند دەست پێوە گرتووینی؟ (أَم): (للإستِفهَامِ الإنكَارِيِّ)، واتە: (بَل أَأَتَيْنَاهُم كِتَاباً مِنْ قَبْلِهِ)، بەڵکو ئایا، ئێمە پێش قورئان کتێبمان پێداون، کە ئەوان دەست پێوە گرتووینی؟ کە ئەمە بۆ نکووڵییکردنەو واتایەکەی ئاوایە: (مَا آتَيْنَاهُم كِتَاباً مِنْ قَبْلِهِ)، چۆن دەزانین ئەو ڕاناوە بۆ قورئان دەچێتەوە؟ (مِنْ قَبْلِهِ)، (هـ)یەکە، لەبەر ئەوەی لە سەرەتای ئەم سووڕەتەوە باسی قورئان کراوە، بۆ وی دەگەڕێتەوەو، هەر شتێك بە سیاق و سەلیقە بزانرێ، ڕاناوەکە بۆ ئەوێ دەچێتەوە، بێ ئەوەی باس بکرێ، واتە: وانیەو هیچ کتێبێکمان پێنەداون، چونکە وەك زۆرجار گوتوومانە: پرسیار لێکردنی نکووڵییلێکەرانە، بە مانای لابردنە، واتە: (مَا آتَيْنَاهُم كِتَاباً مِنْ قَبْلِهِ)، پێش قورئان هیچ کتێبێکمان پێنەداون.

کەواتە: لە ڕووی عەقڵییەوە هەر لە گۆترە قسە دەکەن و، بە قرساندن و بە گومان و، لە ڕووی نەقڵییشەوە قسەکانیان پشت ئەستوور نین، بە هیچ بەڵگەیەکی نەقڵیی و شەرعیی.

﴿ فَهُم بِهِۦ مُسْتَمْسِكُونَ ﴾، دەڵێ: (أَمْسَكَ بِالشَّيءِ: شَدَّدَهُ عَلَيهِ، مَجَازٌ فِي مَعْنَى الثَّبَاتِ عَلَى الشَّيء)، (أَمْسَكَ بِالشَّيء)، واتە: توند دەستی پێوە گرت،

(**إستَمْسَكَ بِهِ**)، ئەمە زێدەڕۆییە، کە (**س**)و، (**ت**)ی تێدا زیاد کراون، (**زِيَادَةُ المَبْنَى تَدُلُّ عَلَى زِيَادَةِ المَعنَى أو قُوَّةِ المَعنَى**)، زۆر بە توندیی دەستیان پێوە گرتوە، کە ئەمە لە ئەصڵدا بە مانای دەست پێوە گرتنە، بەڵام بە (**مَجَاز**) بە مانای چەسپاویی و مانەوەیە لەسەر شتێك.

٥)- ﴿ بَلْ قَالُوٓا۟ إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ ﴾، ئنجا لە وەڵامی ئەو پرسیارە نکووڵیلێکەرانەیەدا، خوا ﷻ دەفەرموێ: واتە: نە بەڵگەی عەقڵییان هەیەو، نە بەڵگەی نەقڵیی، بەڵکو بیانوو و پاساویان بۆ پەرستنی پەرستراوەکانیان، هەر ئەوە بوو، کە گوتیان: ئێمە باب و باپیرانی خۆمان لەسەر ڕێیەك لێ هەڵکەوتوە، (**الأُمَّة: المِلَّةُ وَالدِّين**)، (**أُمَّة**): وەك چۆن بە مانای کۆمەڵە خەڵکێك هاتوە، بە مانای ڕێبازێکیش هاتوە، کە کۆمەڵە خەڵکێکی لەسەرینی، واتە: ئایین و بەرنامەیەك.

٦)- ﴿ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّهْتَدُونَ ﴾، ئێمە لەسەر شوێنەواری ئەوان دەڕۆین، ئنجا کە دەشڕۆین بە ڕێی ڕاستدا دەڕۆین، چونکە (**مُهْتَدِي**) کەسێکە ڕێی ڕاستی گرتبێ، هیدایەتی وەربگرتبێ، هیدایەتیش واتە: پێشاندانی ڕێی ڕاست، کەواتە: (**مُهْتَدِي**) کەسێکە، ئەو ڕێیە ڕاستەی پێشانی دراوە، گرتوویەتی، وشەی (**آثَار**) کۆی (**أَثَر**)ە، واتە: شوێنەوار، کەسێك بە شوێنێکدا دەڕوا، شوێن پێیەکەی پێی دەگوترێ: (**أَثَر**)، ئنجا کە لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّهْتَدُونَ ﴾، بە شوێنەواری ئەواندا ڕێی ڕاستگرتووین، مەبەستیان ئەوەیە کە بە شوێنەوارەکانی ئەواندا دەڕۆین، بەڵام لێرەدا: (**عبّر عَنِ الإتبَاعِ بالإهْتِدَاءِ، لِشِدَّةِ غُرُورِهِم بِأحْوَالِ آبائِهِم**)، لە جیاتی (**إتباع**)، لە جیاتی ئەوەی بڵێن: (**وَإنَّا عَلى آثَارِهِم مُتَّبِعُون**)، شوێن شوێنەوارەکانیان کەوتووین، فەرموویەتی: ﴿ عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّهْتَدُونَ ﴾، تەعبیریان لە شوێنکەوتن کردوە، بە (**إهتِدَاء**)، واتە: ئێمە بە شوێنەواری ئەواندا ڕێی ڕاستمان گرتوەو، گومانی تێدانیە ڕێی ئەوان ڕاستە، مانای ئەوەیە زۆر لە خۆیان بایی بوون، بەوە کە باب و باپیرانیان لەسەر ڕێیەکی ڕاست بوون.

ئەم تەعبیرەش دوو واتای هەن:

أ- کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّهۡتَدُونَ ﴾، (إِنَّا) دەبێتە نیهاد (مُبْتَدَأ)، (آثَارِهِم) دەبێتە گوزارەی یەکەم و (مُهْتَدون) دەبێتە گوزارەی دووەم.

یانی: ئێمەش لەسەر شوێنەواری ئەوانین، ڕێی ڕاستگرتووین.

ب- دەشگونجێ ﴿ عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم ﴾، پەیوەست بێتەوە بە (مُهْتَدُون) و وشەی (مُهْتَدُون)، مانای ڕۆیشتووان، (سَائِرون)ی بخرێتە نێو، واتە: ئێمە بە شوێنەواری ئەواندا دەڕۆین، بەڵام بۆیە وشەی (مُهْتَدُون)یان بەکارهێناوە، واتە: بە شوێنەواری ئەواندا، ئێمە ڕێی ڕاستمان گرتوە.

٧)- ﴿ وَكَذَٰلِكَ مَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ فِي قَرۡيَةٖ مِّن نَّذِيرٍ ﴾، (خوا ﷻ لە وەڵامیاندا دەفەرموێ:) هەر بەو شێوەیە لە پێش تۆدا لە هیچ ئاوەدانییەکدا هیچ وریا کەرەوەیەکمان نەناردوە، ﴿ وَكَذَٰلِكَ ﴾، ئەو (ك)ە، پەیوەستە بە ڕستەی دوایی کە دەفەرموێ: ﴿ قَالَ مُتۡرَفُوهَآ ﴾، واتە: کاتی خۆیشی هەر بەو شێوەیە بووە، وامەزانە بەس بێبڕوایەکانی ڕۆژگاری تۆ وان، بەڵکو بێبڕوا خۆشگوزەران و خۆ سەپێنەکانی هەموو کۆمەڵگاکان، هەر ئەوە عادەتیان بووەو، هەر ئەوە قسەیان بووە، ﴿ وَكَذَٰلِكَ ﴾، هەر بەو شێوەیە، ﴿ مَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ فِي قَرۡيَةٖ مِّن نَّذِيرٍ ﴾، لە پێش تۆدا، لە هیچ ئاوەدانییەکدا، هیچ وریاکەرەوەو ترسێنەرێکمان نەناردوە:

٨)- ﴿ إِلَّا قَالَ مُتۡرَفُوهَآ إِنَّا وَجَدۡنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٖ ﴾، مەگەر خۆشگوزەرانەکانی ئەو ئاوەدانییە گوتوویانە: ئێمە باب و باپیرانمان لەسەر ڕێیەك، لەسەر ئایینێك لێ هەڵکەوتوە.

٩)- ﴿ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّقۡتَدُونَ ﴾، ئێمەش بە شوێن شوێنەوارەکانی ئەوان دەکەوین، ئەوان چییان کردوە، ئێمەش وا دەکەین، پێشتریش گوتراوە: (قَرية)، لە بەکارهێنانی قوڕئان دا و، لە زمانی عەرەبییدا، یانی: ئاوەدانییەکی گەورەو بە شاری قەڵەباڵغ و گەورە گوتراوە: (قَرية): بۆیە بە مەککە گوتراوە: (أُمُّ القُرَاء)، دایکی ئاوەدانیی و شارە قەڵەباڵغەکان.

﴿نَذِيرٍ﴾یش مەبەست پێی پێغەمبەرێکە، خەڵك وریا دەكاتەوەو هۆشداریيان پێدەدات، ﴿مُتْرَفُوهَآ﴾، كۆی (مُـتْرَف)ە، (المُـتْرَفُ: مَـنْ أُعْطِـيَ الـتَّرَفَ، أي: النِّعْمَـةَ)، (مُتْرَف) كەسێك كـە نـازو نیعمەتـی پێدرابـێ، خۆشگوزەرانكراو.

كـە گوتوويانـە: ﴿وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّقْتَدُونَ﴾، ئێمـە بـە شـوێنەواری ئەوانـدا چاولێكەریـن، لـە شـێكردنەوەی وشـەكاندا گوتمـان: (قَـدَى يَقْـدو قَـدواً، أي: قَـرُبَ)، واتـە: نزیـك بـوّوە، (إقتَـدى بِـهِ: فَعَـلَ مِثْـلَ فِعْلِـهِ تَشَـبُّهاً)، ئـەو چیكـردوە ئەویـش وایكـرد، خـۆی وەك ئـەو چوانـد، وەك خـوا ﷻ لـە سـوورەتی (الأنعَـام)دا، دەفەرمـوێ: ﴿فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقْتَدِهْ ۝٩٠﴾، تـۆش ڕێنمایـی ئـەوان ڕەچاو بكـە، وەك ڕێنماییەكەی ئـەوان بكـە، ئەمـە فەرمانـە بـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ كـە چـاو لـە پێغەمبەرانـی پێشـووی خـۆی بـكات.

كەواتە: ئەوان هەم (مُهْتَدُون)یان بەكارهێناوە، هەم (مُقْتَدُون)، ئەمەش یانی:

أ- ئێمە بەپێی ڕێبازو ئایینەكەی ئەوان بەڕێوە دەچین و، ڕێبازو ئایینی ئەوان ڕاستە.

ب- ئێمە بە شوێن پێی ئەواندا هەنگاو دەنێین، هەم ڕێبازەكەیان پەیڕەویی لێدەكەین و هەم شوێن خۆشیان دەكەوین، هەم (إهتِدَى) دەكەین بە بەرنامەكەیان، هەم (إقتِدَى) دەكەین بەخۆشیان، بەرنامەكەیان دەكەینە پەیڕەویی لێكراو و، خۆشیان دەكەینە چاولێكراوو، شوێن پێ هەڵگیراو.

مەسەلەی سێیەم:

**پرسیارکردنی ئەو پێغەمبەرە، یان هەر کام لە پێغەمبەرانی کە بۆ ئەو گەل و ئەو کۆمەڵگایانە نێردراون، کە ئایا هەرچەندە ڕێی ڕاست و دروستیشی بۆ هێنابن، هەر لەسەر لاساییکردنەوەی پێشینانیان سوور دەبن؟ وەڵامدانەوەی وانیش بەوە، کە پێیان بێبڕوان و، سەرەنجام سزادانیان لە لایەن خوای دادگەرەوە:**

خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ قَـٰلَ أَوَلَوْ جِئْتُكُم بِأَهْدَىٰ مِمَّا وَجَدتُّمْ عَلَيْهِ ءَابَآءَكُمْ ۖ قَالُوٓا۟ إِنَّا بِمَآ أُرْسِلْتُم بِهِۦ كَـٰفِرُونَ ﴿٢٤﴾ فَٱنتَقَمْنَا مِنْهُمْ ۖ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴿٢٥﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿ قَـٰلَ أَوَلَوْ جِئْتُكُم بِأَهْدَىٰ مِمَّا وَجَدتُّمْ عَلَيْهِ ءَابَآءَكُمْ ﴾، (پێغەمبەرەکەیان) گوتی: ئایا ئەگەر بەرنامەیەکم بۆ هێنابن ڕێنماییکارتر لەوەی باب و باپیرانتان لەسەری دیوە؟! واتە: ئەو (نَذِير)ە، گوتی: کە پێشتر باسی کراوە: ﴿ وَكَذَٰلِكَ مَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ فِى قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ ﴿٢٣﴾ ﴾، کە مەبەست پێی پێغەمبەرانە (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، هەر پێغەمبەرێك کە بۆ هەر کۆمەڵگایەك نێردراوە، بە کۆمەڵگاکەی خۆی فەرمووە: ﴿ أَوَلَوْ جِئْتُكُم بِأَهْدَىٰ مِمَّا وَجَدتُّمْ عَلَيْهِ ءَابَآءَكُمْ ﴾، ئایا ئەگەر بەرنامەیەکم بۆ هێنابن، ڕێنماییکارتر لەوەی باب و باپیرانتان لەسەری بینیوە، لەسەری ڕۆیشتوون و ئێوەش ئەوانتان لێ هەڵکەوتوە لەسەری، واتە: ئەگەر شتێکی باشتریشتان بۆ بێنم، هەر بە دوای شتە خراپەکەی باب و باپیرانتان دەکەون؟

وشەی (قَالَ)، خوێنراویشەتەوە: (قُلْ)، واتە: بە فەرمانیش خوێنراوەتەوە: (قُلْ أَوَلَو جِئْتُكُم)، (ئەی موحەممەد ﷺ!) پێیان بفەرمووە: ئایا ئەگەر بەرنامەیەکیشم

بـۆ هێنابـن، ڕێنماییکارتـرو، ڕێ پێشـاندەرتر، لـەوەی بـاب و باپیرانتـان لەسـەری لێهەڵکەوتـوە، هـەر لەسـەر حاڵـی خۆتـان بـەردەوام دەبـن، (**جِئْتُكُم**)یـش، خوێندنەوەیەکـی دیکـەی هەیـە: (**جِئْنَاكُـم**)، (**قَـالَ أَوَلَـو جِئنَاكُـم**)، گوتیـان: ئەگـەر بۆشـمان هێنابـن، بەرنامەیـەك و ڕێنماییکار لـەوەی باپیرانتان لەسـەری لێهەڵکەوتوون، کـە لێـرەدا ئـەم پرسـیارکردنە، پرسـیارکردنی دەگونجـێ نکووڵیلێکەرانـە بـێ، واتـە: ئەگـەر ڕێبـازو بەرنامەیەکـی ڕێنماییکارتـرو، ڕێ پێشـاندەرتر، لـەوەی بـاب و باپیرانتـان لەسـەری بـوون، بۆتـان بێنـم، نابـێ هـەر لەسـەر ئـەوەی پێشـوو بـڕۆن.

دەشـگونجێ پرسـیارکردنێکی دان پێپێداهێنـەر (**إِسـتِفهَام تَقْرِيـرِي**)، بـۆ ئـەوەی بانگیـان بـکات، تاکـو بیـر بکەنـەوە، واتـە: تەماشـا بکـەن، ئایـا ئەگـەر بەرنامەیـەك و ئایینێکـی باشـتر لـەوەی بـاب و باپیرانتـان لەسـەری بـوون، بـۆم هێنابـن، هـەر ئـەوە هەڵوێسـتتان دەبـێ؟!

لێـرەدا کـە ئـەو پێغەمبـەرە ﷺ، گوتوویەتـی: ﴿ بِأَهْدَىٰ ﴾، یـانی: ئـەوەی لەسەریشـنی، هـەر ڕێنمایـی تێدایـە، بـەڵام بەرنامەیەکـم بـۆ هێنـاون کـە زیاتـر ڕێنماییتـان دەکات، بێگومـان ئەمـە جۆرێـك بـووە لـە بەدەمـەوەدان، کـە بـە عەرەبیی پێـی دەگوتـرێ: (**إِرخَـاءُ العِنَـان**)، جڵـەو بـۆ شـل کـردن، تاکـو لایەنـی بەرانبـەر گوێـت بـۆ بگـرێ، ئەگـەر تـۆ یەکسـەر بڵێـی: ئـەوەی تـۆ هـەر هیچـەو پووچـە، گوێـت بـۆ ناگـرێ، بـەڵام ئەگـەر بڵێـی: گریـمان ئـەوەی تـۆش ڕێیەکـی ڕاسـتە، بـەڵام ئەگـەر ڕێیەکـی باشـترو چاکـتر هەبـێ، ئایـا بەپێـی عەقـڵ و لۆژیـك هەمیشـە مـرۆڤ لـە نێـوان چـاك و چاکـتردا، چاکەکـە هەڵنابژێـرێ و، لـە نێـوان ڕاسـت و ڕاسـتردا، ڕاستەکە هەڵنابژێـرێ؟ ئەگەرنـا بـە تەئکیـد ئـەوەی ئـەوان لەسـەری بـوون، گومڕایـی و سـەرگەردانیی بـووە.

٢)- ﴿ قَالُوٓاْ إِنَّا بِمَآ أُرۡسِلۡتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴾، خەڵکەکە (یاخود: بڕیار بەدەستانی کۆمەڵگایەکان)، گوتیان: ئێمەی بەوەی ئێوە پێ ڕەوانەکراون، بێبڕواین.

٣)- ﴿ فَٱنتَقَمۡنَا مِنۡهُمۡ ﴾، (لە ئەنجامی ئەوەدا) ئێمەش تۆڵەمان لێکردنەوە، (الإنتِقَامُ: إفْتِعَالٌ مِنَ النَّقْمِ، وَهُوَ المُكافَأَةُ بِالسُّوءِ)، (نَقَمَ وَنَقِمَ كَعَلِمَ وَضَرَبَ)، واتە: هەم بە (نَقَمَ) هاتوە، هەم بە (نَقِمَ) هاتوە، (نَقِمَ) وەك (عَلِمَ)، (نَقَمَ)ش وەك (ضَرَبَ)، (نَقِمَ وَنَقَمَ أي: كَافَأَ بِالسُّوءِ عَلَى السُّوءِ)، واتە: لەسەر خراپە سزای خراپی دا.

کەواتە: ﴿ فَٱنتَقَمۡنَا مِنۡهُمۡ ﴾، واتە: سزایەکی خراپمان دان، خراپ بۆ ئەوان، لەسەر ئەو کارە خراپەی کردبوویان، تۆڵەمان لێستاندنەوە.

٤)- ﴿ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ﴾، سەرنج بدە! سەرەنجامی بە درۆدانەران چۆن بوو؟! لە زمانی عەرەبیدا ئەم پەندە هاتوە، (هوَ كَالأَرْقَمِ إنْ يُتْرَكْ يَلْقَمْ، وَإنْ يُقْتَلْ يَنْقَمْ)، واتە: فڵانکەس وەك (الأرقَم)ە، (ماری بەڵەك، ماری جنجر)، ئەگەر وازی لێ بهێنرێ، پێوە دەدات و، ئەگەر بشکوژرێ، تۆڵە دەستێنێتەوە، یانی: بە برینداریی.

﴿ كَيۡفَ ﴾، (الإستِفهَامُ عَنِ الحَالَةِ)، (كَيْف) بۆ پرسیارکردنە لە حاڵ و باڵ، واتە: سەرنج لە حاڵیان بدە، حاڵیان چۆن بوو، حاڵی بەدرۆ دانەران و چۆن سزادران؟!

## کورتە باسێک لە بارەی
## ناڕەوایی شوێنکەوتنی کوێرانەی پێشینانەوە:

زۆر بە کورتیی و گوشراویی ئەم باسە، لە چوار بڕگەدا، دەخەینە ڕوو:

### بڕگەی یەکەم: چەمك و واتای شوێنکەوتنی کوێرانە:

کە دەڵێین: شوێنکەوتنی کوێرانە، بە عەرەبیی: (التَّقْلِيدُ الأَعْمَى)، ئایا مەبەستمان پێی چییە؟ دەڵێین: ئەوە چەند نیشانەیەکی هەیە:

١- ئەوەیە کە ئەو شوێنکەوتن و چاولێکردنەی پێشینان، لەسەر بناغەی زانست و عەقڵ نەبێ و، لەبەر ڕۆشنایی زانست و عەقڵدا نەبێ، هەروا لە گۆترە، کەسێك بە دوای پێشینان بکەوێ، ئەوەشم لەوە وەرگرتوە کە دوایی باسی دەکەین و خوای بەرزی مەزن دەفەرموێ: ﴿أَوَلَوْ كَانَ ءَابَآؤُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ شَيْـًٔا وَلَا يَهْتَدُونَ ١٧٠﴾ البَقَرَة، واتە: ئەدی ئەگەر باب و باپیرانیان نەیانفامیی بێ و، بەڕێیان نەزانیی بێ؟ لە ئایەتێکی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿أَوَلَوْ كَانَ ءَابَآؤُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ شَيْـًٔا وَلَا يَهْتَدُونَ ١٠٤﴾ البَقَرَة، واتە: ئەدی ئەگەر باب و باپیرانیان نەیانزانییبێ و، ڕێگاش شارەزا نەبووبن؟ هەر دەبێ شوێنیان بکەون؟!

کەواتە: لاساییکردنەوەی کوێرانە ئەوەیە، ئەو شوێنکەوتن و چاولێکردنە، پشت ئەستوور نەبێ، نە بە بەڵگەی عەقڵیی و، نە بە بەڵگەی زانستیی.

٢- ئەوەیە کە ئەو چاولێکردنە لەسەر بناغەی بە پیرۆزگرتن و، دەمارگیریی و داخراویی بێ، بۆ وێنە: باب و باپیرانمان وایان نەگوتوە، با ئێمەش وا نەڵێین، یان: ئەوان وایان نەکردوە، با، ئەمەش وا نەکەین!.

٣- ئەوەیە کە ئەو شتەی چاوی لێ دەکرێ، یان پەیڕەویی لێ دەکرێ و لە باب و باپیران وەردەگیرێ، پشت ئەستوور نەبێ، نە بە بەڵگەیەکی عەقڵیی و، نە بە بەڵگەیەکی نەقڵیی، سەرچاوەگرتوو لە وەحیی خوای پەروەردگار.

چونکـە فەرهەنگەکانـی زمـان، ئـاوا باسـی (**تقلیـد**) دەکـەن، بـۆ وێنـە: (**المُعجَـمُ الوَسِـيط**)[1]، دەڵـێ: (**قَلَّـدَ فُلَانَـاً: اتَّبَعَـهُ فِيـما يَقُـول، أو يَفعَـلُ مِـن غَـيرِ حُجَّـةٍ وَلا دَليـل، وَقَلَّـدَهُ: حَـاكَاهُ يُقَـالُ: قَلَّـدَ القِـردُ الإنْسَـانَ، وَتَقَلَّـدَ القِـلادَةَ: لَبِسَـهَا**)، (**قَلَّـدَ فُلَانَـاً**)، واتـە: شـوێنیکەوت لـەوەدا کـە دەیڵـێ، یـان دەیـکات، بەبـێ بەڵگـەو بەرچـاو ڕوونیـی {هـەر لـە خـۆوە کـە ئـەو وادەڵـێ و وادەکات، ئەویـش وابڵـێ و وابـکات}، دەگوتـرێ: (**وَقَلَّـدَهُ: حَـاكَاهُ**)، واتـە: وەك ئـەوی کـرد، هەروەهـا دەگوتـرێ: (**قَلَّـدَ القِـردُ الإنْسَـانَ**)، واتـە: مەیموونەکـە چـاوی لـە مـرۆڤ کـرد، شـتێکی بـاوە، دەڵێـن: مەیمـوون لاسـایی مـرۆڤ دەکاتـەوە، (**وَتَقَلَّـدَ القِـلادَةَ**)، واتـە: گـەردن بەندەکـەی، یـان ملوانکەکـەی بـە ملـدا کـرد، بەڵکـو (**مِقـلاد**) یـان (**قِـلادَة**)، بـەوە دەگوتـرێ: کـە لـە ملـی وڵاخیـش دەکـرێ و ڕادەکێـشرێ، ئـەو سـارو ڕێشـمە.

## بڕگەی دووەم: چەمك و واتای کۆششکردن (إجتِهَاد) و شوێنکەوتن (اتباع) و لاساییکردنەوە (تَقلِيد)[2]:

١- (**الإجْتِهَاد**): کۆششکردن و بەکارهێنانی عەقڵی خۆت.

٢- (**الإتِّبَاع**): شوێنکەوتن، ئەوەیە خۆت بەڕێیە نەزانی، بەڵام بە دوای کەسێك بکەوی، کە بەڕێیە دەزانێ، لەبەر ئەوەی لە بەڵگەکەی تێگەیشتووی، یانی: بە بەرچاو ڕوونییەوە شوێنی بکەوی.

---

(١) ص٧٥٤.

(٢) لەکتێبـی دووەمـی مەوسـووعەی: [بیرکردنـەوەی ئیسـلامیی لـە نێـوان وەحیـی و واقیعـدا] بەدرێـژی لەوبـارەوە دواویـن.

٣- (التَّقلِيد): ئەوەیە کە شوێن کەسێك بکەوی، بەبێ ئەوەی بزانی لەسەر چ بناغەیەك ئەو شتەی گوتوەو، یان کردوەو، تۆش لە خۆتەوە شوێنی بکەوی.

١)- (الإجتِهَاد): لە ڕووی زاراوەییەوە، ئاوا پێناسە کراوە، بۆ وێنە: (الغَزَّالِي)، لە: (المُستصفى مِن عِلمِ الأُصُول)دا[1]، دەڵێ: (**الإجتِهادُ هوَ بَذل المُجتَهِدِ وُسْعَهُ فـي طلب العلم بأحكام الشريعة، والإجتهاد التام: أن يبذل الوسع فـي الطلب بحيث يَحُسُّ من نفسه بالعَجْز عن مزيد طلب**)، (الإجتِهَاد): بریتیە لەوە کە بابای کۆششکەر، توانای خۆی لە پەیداکردنی زانیاریی بە حوکمە شەرعییەکاندا، سەرف بکات و، کۆششکردنی تەواویش ئەوەیە، کە ئەوپەڕی توانای خۆی لە داواکردنی زانست بە حوکمە شەرعییەکاندا سەرف بکات، بەشێوەك هەست بکات، چی دیکەی لە تواناندا نیە، واتە: ئەوپەڕی توانای خۆی بەکاربێنێ.

یـەکی دیکـە لـە زانایـان گوتوویـەتی[2]: (**الإجتِهـادُ: إستِفرَاغُ الجُهـدِ وَبَـذلُ غَايـة الوسعِ إما فـي دَركِ أحـكامِ الشَّريعـةِ، وَإمَّا فـي تَطبِيقِهـا**)، (الإجتِهـاد): بریتیـە لـە بەکارهێنانی ئەوپـەڕی توانـاو کۆششـکردن، لـە زانینـی حوکمـە شـەرعییەکان یاخـود بـۆ جێبەجـێ کردنیانـدا لەسـەر ئـەرزی واقیـع.

٢)- (الإتِّبَاع): ئەوەیە کە ئینسان شوێن زانایان بکەوێ، لە شتێکدا کە گوتوویانە، لەبەر ئەوەی بە بەڵگە شەرعییەکانیان ئاشنایە، لەو بارەوە لە کتێبی: (**التَّجدِيد الأصُولِي، نَحوَ صِياغَةٍ تَجدِيدِية لِعلمِ الأصُول**)، (**بإشرَاف الدكتور: أحمَد الَيسوني**)دا[3]، هاتوە: (**إنعِقَادُ الإجمَاع مِن عَهدِ الصَّحَابَةِ والتَّابِعين، عَلى أنَّ العَامَّةَ يَستَفتُونَ العُلَمَاءَ ويَتَّبِعونَهُم فِي الأحكَامِ الشَّرعيَّة، وَلا يُنكِرونَ عَلَيهِم هَذا السُّلوكَ وهَذَا مَعْلوم مِن تواتر عُلَمَائِهم وَعَامَّتِهِم**)، واتە: یەکدەنگیی دامەزراوە لەسەردەمی هاوەڵان و شوێنکەوتووانیاندا، کە خەڵك بە گشتیی پرسیار لە زانایان دەکەن و، لە یاسا شەرعییەکاندا شوێنیان دەکەون و ئەوەشیان لێ بە ڕەخنە ناگرن، ئەوەش بە تەواتوور لە زانایان و لە خەڵك بە گشتییەوە، (واتە: خەڵکی مسوڵمان) زانراوە.

---

(١) ج٢، ص٣٨٢.

(٢) المُوافَقَاتِ للشاطبي، تَعلِيق: عَبدالله درّاز، ج٤، ص٨٩.

(٣) ص٧٧٦.

٣)- (**التَّقلِيد**): (**البَاجي**) له كتێبی: (**إحكَامُ الفُصُول فـي الأُصُول**)[١]، دەڵێ: (**هوَ التِزامُ حُكمِ المُقَلِّدِ من غَيرِ دَلِيلٍ**)، واته: تەقلید بریتیه له پابەندیی به قسەی كەسێكەوە، كه تەقلیدی لێ دەكرێ، بێ ئەوەی بەڵگەی هەبێ، (داخۆ پێكاویەتیی یان نەیپێكاوە)، هەروەها له سەرچاوەی پێشوودا هاتوه، (**الرجوعُ في الحُكْمِ إلى قَولِ المُقَلَّدِ مِن غَيرِ عِلمٍ بِالصَّوَابِ وَلا خَطَئِهِ**)، واته: تەقلید گەڕانەوەیه له حوكمدا بۆ قسەی بابای لاساییكراوە، بەبێ زانیاریی هەبوون بەوە، ئایا پێكاویەتی یان نەیپێكاوە!.

(**جَـلال الدِّيـن المحـلِّي**)، لـه هەمـان سـەرچاوەی پێشـوودا دەڵـێ: (**التَّقلِيـدُ: قبُـولُ قَـولِ القَائِـلِ بِـلا حُجَّـةٍ يَذكُرُهـا**)، تەقلیـد بریتیـه لـه شـوێنكەوتنی قسـەی كەسـێك، بـێ ئـەوەی بەڵگەیـەك بـاس بـكات، (یاخـود: ئەگـەر بەڵگەشـی هەبـێ، بـێ ئـەوەی بابـای لاسـاییكەرەوە، لـه بەڵگەكـه تێگەیبـێ).

كەواتـه: ئـەوەی لـه ئیسـلامدا ڕەوایـه، بێگومـان بریتیـه (**إجتِهَـاد**) كـردن، كـه مرۆڤ بـۆ خـۆی هەوڵبـدات شـتەكه بزانـێ، یاخـود شـوێنكەوتن، واتـه: شـوێنكەوتنی بابایەك كـه شـارەزایه، لەبـەر ئـەوەی تـۆ دەزانـی بەڵگەكـەی چییـەو، بەڵگەكـەی قەناعـەت هاتـووی، بـەڵام ئـەوەی لـه ئیسـلامدا ڕەوا نیـه، بریتیـه لـه لاسـاییكردنەوەی كوێرانـه.

## بڕگەی سێیەم: شوێنكەوتنی كوێرانەی پێشینان، عادەتی كافر و هاوبەش بۆ خوا دانەرەكانە:

بـه لای كەمـەوە، لـه پێنـج سـوورەتی قورئانـدا، خـوا ﷻ سەرزەنشـتی كافرەكانـی كـردوە، لـه سـۆنگەی ئـەوەوە كـه پاسـاوی شـیرك و كوفـرو ڕێیـه چەوتەكانـی خۆیـان، بـەوە داوەتـەوە گوتوویانـە: بـاب و باپیرانمـان لەسـەری لێهەڵكەوتـوەو، بـاب و باپیرانمـان و پێشینانیشـمان هـەر وایـان كـردوەو وایـان گوتـوه!

-----

(١) ص١٧٣.

هەڵوێستی هاوبەشدانەرو بێبڕوایەکان (بە شوێنکەوتنی کوێرانەی پێشووان) بەلای کەمەوە لە پێنج سوورەتاندا هاتوە:

١- لە سوورەتی (**البقرة**)، ئایەتی ژمارە: (١٧٠)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اتَّبِعُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ قَالُوا بَلْ نَتَّبِعُ مَا أَلْفَيْنَا عَلَيْهِ آبَاءَنَا ۗ أَوَلَوْ كَانَ آبَاؤُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ شَيْئًا وَلَا يَهْتَدُونَ ﴾، واتە: ئەگەر پێیان بگوترێ: (واتە: بە بێبڕوایەکان)، شوێن ئەوە بکەون کە خوا دایبەزاندوە، دەڵێن: بەڵکو شوێن ئەوە دەکەوین، کە باب و باپیرانمان لەسەری لێهەڵکەوتوە، ئایا ئەگەر باب و باپیرانیان هیچ شتێکیان نەفامیبێ و بەڕێی ڕاستیان نەزانیبێ؟.

٢- لە سوورەتی (**المائدة**)، ئایەتی ژمارە: (١٠٤)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا إِلَىٰ مَا أَنزَلَ اللَّهُ وَإِلَى الرَّسُولِ قَالُوا حَسْبُنَا مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ آبَاءَنَا ۚ أَوَلَوْ كَانَ آبَاؤُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ شَيْئًا وَلَا يَهْتَدُونَ ﴾، واتە: ئەگەر پێیان بگوترێ: وەرن بۆ ئەوەی خوا دایبەزاندوەو بۆ لای پێغەمبەر، دەڵێن: ئەوەمان بەسە کە باب و باپیرانمان لەسەری لێ هەڵکەوتوەو بینیوە، ئایا ئەگەر باب و باپیرانیان شتێکیان نەزانیبێ و، بە ڕێی ڕاستدا نەڕۆیشتبن (هەر شوێنیان دەکەون؟).

٣- لە سوورەتی (**الأعراف**)، ئایەتی ژمارە: (٢٨)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا فَعَلُوا فَاحِشَةً قَالُوا وَجَدْنَا عَلَيْهَا آبَاءَنَا وَاللَّهُ أَمَرَنَا بِهَا ۗ قُلْ إِنَّ اللَّهَ لَا يَأْمُرُ بِالْفَحْشَاءِ ۖ أَتَقُولُونَ عَلَى اللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴾، واتە: ئەگەر (بێبڕوایان) خراپەیەکیان کرد، دەڵێن: باب و باپیرانمان لەسەری بینیوەو خوا فەرمانی پێکردووین، بڵێ: خوا فەرمان بە شتی خراپ ناکات، چۆن شتێك بە ناوی خواوە دەڵێن کە زانیارییتان لە بارەیەوە نیە.

٤- لە سوورەتی (**الأحزاب**)دا، دیسان خوا ﷻ لە کافرەکان نەقڵ دەکات: ﴿ وَقَالُوا رَبَّنَا إِنَّا أَطَعْنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَاءَنَا فَأَضَلُّونَا السَّبِيلَا ﴿٦٧﴾ رَبَّنَا آتِهِمْ ضِعْفَيْنِ مِنَ الْعَذَابِ وَالْعَنْهُمْ لَعْنًا كَبِيرًا ﴿٦٨﴾ ﴾، واتە: (کافرەکان) گوتیان: ئەی پەروەردگارمان! ئێمە

فەرمانبەریی سەرۆکەکانمان و، بەساڵداچووەکانمان کرد، ئنجا ئەوانیش لە ڕێ گومڕایان کردین، پەروەردگارمان! سزای چەند قاتیان بدەو، نەفرینێکی گەورەیان لێ بکە.

٥- لە سوورەتی (**الزخرف**)یش ئەو سوورەتەی دەیتوێژینەوە، لە ئایەتی ژمارە (٢٢)دا، دەفەرموێ: ﴿ بَلْ قَالُوٓاْ إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّهْتَدُونَ ﴾، لە ئایەتی دوای ئەویش ئایەتی ژمارە (٢٣)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ مَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ فِى قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَآ إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّقْتَدُونَ ﴾.

کەواتـە، شـوێنکەوتنی پێشـینان و، لاسـاییکردنەوەیان و، شـوێنکەوتنی کوێرانـە، بـێ ئـەوەی بەرچـاو ڕوونیـی هەبـێ، کـە ئەوانـە لـە شـتەدا پێکاویانـە، واتـە: بـێ ئـەوەی شـتەکە هەڵقـوڵاوی عەقـڵ بـوو بـێ، یـان هەڵقـوڵاوی زانیاریـی بـوو بـێ، یـان هەڵقوڵاوی وەحیـی خـوا ﷻ بووبـێ، ئـەوە لـە ڕاسـتیی دا عادەتـی بێبڕوایانـەو مسـوڵمانان دەبـێ خۆیـان لـەوە دوور بگـرن.

## بڕگەی چوارەم: شوێنکەوتنی پێشینی چاك (إتباع السَّلَفُ الصَّالِح)، بە بەرچاو ڕوونییەوە، نەك هەر ڕەوا، فەرزیشە:

بـە بەڵگـەی ئایەتـی ژمـارە (٩٠) لـە سـوورەتی (**الأنعَـام**)دا، کـە خـوا ﷻ، دوای ئـەوەی باسـی هـەژدە لـە پێغەمبـەران دەکات و ناوی هـەژدە لـە پێغەمبـەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) دێنـێ، بەپێـی ڕیزبەندیـی کـە لـە ئایەتەکانـدا هاتـوون: (ئیبڕاهیـم و ئیسـحاق و یەعقـوب و نـووح و داوودو سـولەیمان و ئەییـووب و یوسـوف و مووسـاو هـاڕوون و زەکەریـاو یەحیـاو عیسـاو ئیلیـاس و ئیسـماعیل و ئەلیەسـەع و یونـوس و لـووط)ن، دوایـی خـوا ﷻ بـە پێغەمبـەر ﷺ دەفەرمـوێ: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقْتَدِهْ ﴾، واتـە: ئەوانـە کەسـانێکن خـوا ڕاسـتە ڕێـی کـردوون، تـۆش بـە دوایـی ڕێنمایـی ئـەوان بکـەوەو، ڕێنمایـی ئـەوان چـاو لـێ بکـە.

کەواتــە: ڕێنمایــی پێشــینان چاولێکــردن، مــادام ئــەوان لەســەر هــەق بووبــن، شــتێکی زەمکــراو نیــە، بەڵکــو شــتێکی پەســندەو، تەنانــەت خــوا ﷻ فەرمانــی بــە پێغەمبــەری خاتــەم ﷺ کــردوە، کــە چــاو لــە پێغەمبەرانــی پێــش خــۆی بــکات، دەفەرمــوێ: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُ ﴾، ئەوانــە کەســانێکن خــوا ﷻ ڕاســتە ڕێــی کــردوون، ﴿ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقۡتَدِهۡ ﴾، تــۆش ئــەو ڕێنمایــی و هیدایەتــەی ئــەوان لەســەری بــوون، چــاوی لــێ بکــە.

کەواتــە: دەتوانیــن بڵێیــن: پوختــەی ئــەم کورتــە باســە و ئەنجامگیرییــەك کــە لــەم کورتــە باســەی دەکەیــن، ئەوەیــە:

ڕەفــز کردنــی شــوێن کەوتنــی کوێرانــەی پێشــینان و، لــە بەرانبەریــدا: عەقڵــی خــۆ بەکارهێنــان و، ڕێزگرتــن لــە بەرهــەم و ڕێبــازی بەڵگەداریــی پێشــینانمان، دەبــێ عەقڵی خۆشــت بەکاربێنــی و ڕێزیــش لــە بەرهەمــی بەڵگــەداری پێشــینان بگــری، لــەوەدا کــە ئــەوان بەرهەمیــان هێنــاوە، لەبــەر ڕۆشــنایی وەحیــی خــوادا، هەڵبەتــە هــی پێغەمبــەران (عَلَيْهِـمُ الصَّـلَاةُ وَالسَّـلَامُ)، بەبــێ مــەرج، مــادام لــە ڕووی ســەنەدەوە جێــی متمانــەو دڵنیایــی بــێ، بــەڵام هــی جگــە لــە پێغەمبــەران، هــی زاناکانــی دیکــە، لــە بەرهــەم و کەلەپووریــان بەهرەمەنــد بیــن، بــەڵام بــە بەرچــاو ڕوونییــەوەو، بــە هەڵســەنگاندنی و لــە مەحەکــی وەحیــی و عەقــڵ دانی.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـە لـە بیسـت (٢٠) ئایـەت پێـك دێ، ئایەتـەكانی: (٢٦ - ٤٥)، لـە سـێ ئایەتـی سـەرەتایاندا، واتـە: (٢٦ - ٢٨)، ئاماژەیـەكی بـە هەڵوێسـتی ئیبراهیـم (**خَلِیـلُ اللـه**) ﷺ كـراوە، كـە چـۆن حاشـای لـە پەرسـتراوەكانی بابـی و گەلەكـەی كـردووە، خـۆی بـۆ پەرسـتنی خـوا ﷻ یەكلاكردۆتـەوە، پاشـان ئـەو خـوا بـە یەكگرتنـەی كردۆتە میـرات و، وشـەیەكی بـەردەوام لـە وەچەكەیـدا.

دوایـی خـوا ﷻ باسـی هەڵوێسـتی نەرێنییانـەی گـەل و كۆمەڵـگای پێغەمبـەری خاتـەم (موحەممـەد)ی ﷺ كـردوە، لـە بەرانبـەر پێغەمبـەرو قورئانـدا، كـە قورئانیـان بـە جـادوو دانـاوەو، خۆزگەشـیان خواسـتوە قورئـان بـۆ پیاوێكـی مـەزن، لـە یەكێك لـە دوو شـارە ناودارەكانـدا، مەككـەو **طائیـف** دابەزیبایـە، لـە جیاتـی موحەممـەد ﷺ، ئنجـا خـوا ﷻ بـەو بۆنـەوە، باسـی ئـەوە دەكات، كـە ژیانـی دنیـا لـە لای زۆر كـەم بایەخـە -لـە ڕووە ماددییەكەیـەوە- ئەگـەر لەبـەر ئـەوە نەبووایـە، خەڵـك تێكـڕا بێبڕوابـن و هەموویـان وەسـەر كوفـر بگەڕێـن، بێبڕوایانـی یەكجـار ساماندارو، هەبووتـر لـەوەی كـە هـەن، دەكـرد.

پاشـان باسـی ئـەوە دەكات، كـە هـەر كـەس لـە ئاسـت یـادی خـوادا، كوێـرو كوتربـێ و خـۆی گێـل بـكات، خـوا شـەیتانێكی گومڕاكـەری بـۆ دەڕەخسـێنێ، كـە هەمیشـە لەگەڵیـدا دەبـێ و، دنەدنـەی دەدا بـۆ خراپـە.

دوایـی چەنـد ڕێنماییەكـی گـەورەو گرنـگ، بـە پێغەمبـەری خاتـەم موحەممـەد ﷺ ڕادەگەیەنـێ، وێـڕای خسـتنەڕووی چەنـد ڕاستییەكی مەزن.

لـە كۆتاییشـدا پێـی ڕادەگەیەنـێ، كـە لـە پێغەمبەرانـی پێشـوو بپرسـێ: ئایـا خـوا ﷻ پێشـتر پەرسـتراوانێكی دانـاون، لـە جیاتـی وی بپەرسـترێن؟ كـە وەڵامەكـە

دیارەو خوا ﷻ لەسەر زمانی هیچ کام لە پێغەمبەران (عَلَيهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلاَم)، نەیفەرمووەو، نەیناردوە، جگە لە خوا ﷻ بپەرسترێ و بەندایەتیی بۆ بکرێ.

﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦٓ إِنَّنِى بَرَآءٌ مِّمَّا تَعْبُدُونَ ﴿٢٦﴾ إِلَّا ٱلَّذِى فَطَرَنِى فَإِنَّهُۥ سَيَهْدِينِ ﴿٢٧﴾ وَجَعَلَهَا كَلِمَةًۢ بَاقِيَةً فِى عَقِبِهِۦ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٢٨﴾ بَلْ مَتَّعْتُ هَٰٓؤُلَآءِ وَءَابَآءَهُمْ حَتَّىٰ جَآءَهُمُ ٱلْحَقُّ وَرَسُولٌ مُّبِينٌ ﴿٢٩﴾ وَلَمَّا جَآءَهُمُ ٱلْحَقُّ قَالُوا۟ هَٰذَا سِحْرٌ وَإِنَّا بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿٣٠﴾ وَقَالُوا۟ لَوْلَا نُزِّلَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنَ ٱلْقَرْيَتَيْنِ عَظِيمٍ ﴿٣١﴾ أَهُمْ يَقْسِمُونَ رَحْمَتَ رَبِّكَ ۚ نَحْنُ قَسَمْنَا بَيْنَهُم مَّعِيشَتَهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۚ وَرَفَعْنَا بَعْضَهُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَٰتٍ لِّيَتَّخِذَ بَعْضُهُم بَعْضًا سُخْرِيًّا ۗ وَرَحْمَتُ رَبِّكَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ﴿٣٢﴾ وَلَوْلَآ أَن يَكُونَ ٱلنَّاسُ أُمَّةً وَٰحِدَةً لَّجَعَلْنَا لِمَن يَكْفُرُ بِٱلرَّحْمَٰنِ لِبُيُوتِهِمْ سُقُفًا مِّن فِضَّةٍ وَمَعَارِجَ عَلَيْهَا يَظْهَرُونَ ﴿٣٣﴾ وَلِبُيُوتِهِمْ أَبْوَٰبًا وَسُرُرًا عَلَيْهَا يَتَّكِـُٔونَ ﴿٣٤﴾ وَزُخْرُفًا ۚ وَإِن كُلُّ ذَٰلِكَ لَمَّا مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۚ وَٱلْـَٔاخِرَةُ عِندَ رَبِّكَ لِلْمُتَّقِينَ ﴿٣٥﴾ وَمَن يَعْشُ عَن ذِكْرِ ٱلرَّحْمَٰنِ نُقَيِّضْ لَهُۥ شَيْطَٰنًا فَهُوَ لَهُۥ قَرِينٌ ﴿٣٦﴾ وَإِنَّهُمْ لَيَصُدُّونَهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ ﴿٣٧﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَنَا قَالَ يَٰلَيْتَ بَيْنِى وَبَيْنَكَ بُعْدَ ٱلْمَشْرِقَيْنِ فَبِئْسَ ٱلْقَرِينُ ﴿٣٨﴾ وَلَن يَنفَعَكُمُ ٱلْيَوْمَ إِذ ظَّلَمْتُمْ أَنَّكُمْ فِى ٱلْعَذَابِ مُشْتَرِكُونَ ﴿٣٩﴾ أَفَأَنتَ تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ أَوْ تَهْدِى ٱلْعُمْىَ وَمَن كَانَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٤٠﴾ فَإِمَّا نَذْهَبَنَّ بِكَ فَإِنَّا مِنْهُم مُّنتَقِمُونَ ﴿٤١﴾ أَوْ نُرِيَنَّكَ ٱلَّذِى وَعَدْنَٰهُمْ فَإِنَّا عَلَيْهِم مُّقْتَدِرُونَ ﴿٤٢﴾ فَٱسْتَمْسِكْ بِٱلَّذِىٓ أُوحِىَ إِلَيْكَ ۖ إِنَّكَ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٤٣﴾ وَإِنَّهُۥ لَذِكْرٌ لَّكَ وَلِقَوْمِكَ ۖ وَسَوْفَ تُسْـَٔلُونَ ﴿٤٤﴾ وَسْـَٔلْ مَنْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رُّسُلِنَآ أَجَعَلْنَا مِن دُونِ ٱلرَّحْمَٰنِ ءَالِهَةً يُعْبَدُونَ ﴿٤٥﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{(ئەی موحەممەد) یادیش بکەوە کاتێك ئیبراهیم بە بابی و گەلەکەی گوت: بێگومان من لەوەی دەیپەرستن، بێزارو دوورم ﴿٢٦﴾ (هیچ شتێك ناپەرستم)، جگە لەو کەسەی وەدیهێناوم، بە دڵنیایی ئەو ڕاستە ڕێم دەکات ﴿٢٧﴾ ئەو قسەیەشی کردە وشەیەکی بەردەوام لە وەچەکەیدا، بەڵکو (لە ڕێی چەوت) بگەڕێنەوە (و لەسەر ڕاستە شەقام بەردەوام بن) ﴿٢٨﴾ (منیش لادەرانی وەچەکەیم لە نێو نەبرد)، بەڵکو ئەوانەو باب و باپیرانیشیانم (لە ژیاندا) بەهرەمەند کردن، هەتا هەق و پێغەمبەرێکی ڕۆشنیان بۆ هات ﴿٢٩﴾ (کەچی) کاتێك هەق (قورئان)یان بۆ هات، گوتیان: ئەمە جادوویەو ئێمە پێی بێبڕواین ﴿٣٠﴾ هەروەها گوتیان: دەبووایە ئەم قورئانە، دابەزیبایە سەر پیاوێکی مەزن لە دوو ئاوەدانییەکان (مەککەو تائیف)دا ﴿٣١﴾ ئایا ئەوان بەزەیی پەروەردگارت دابەش دەکەن؟ ئێمە لە ژیانی دنیادا بژیوو گوزەرانیانمان، لە نێواندا دابەشکردووە، هەندێکیانمان بە چەندان پلە بەسەر هەندێکیاندا بەرز کردوە، تاکو هەندێکیان هەندێکیان بەکاربێنن (و بیانکەنە کارپێکراو)، بەزەیی پەروەردگاریشت لەوەی کۆی دەکەنەوە (لە ماڵ و سامان) باشترە ﴿٣٢﴾ ئەگەر لەبەر ئەوەش نەبووایە، خەڵك ببنە یەك کۆمەڵ (ی خڕ بووەوە لەسەر کوفرو هەموویان وەسەر کوفر بگەڕێن)، ئەوانەی بێبڕوان بە (خوای) بە بەزەیی، سەربانی خانووەکانیانمان بۆ دەکردنە زیو، هەروەها ئەو پەیژانەش کە پێیاندا سەردەکەون، (بۆمان دەکردنە زیو) ﴿٣٤﴾ دیسان بۆ ماڵەکانیان و دەرگاکانیان و تەختانێك کە لەسەریان پاڵدەدەنەوە (لە زیو) بۆمان دەڕەخساندن ﴿٣٣﴾ هەروەها زێڕو ڕازاوەیی(مان بۆ دەستەبەر دەکردن)و، هەموو ئەوەش تەنیا بەهرەو ڕابواردنی ژیانی دنیایەو، (مەنزڵگای) کۆتایی لەلای پەروەردگارت بۆ پارێزکارانە ﴿٣٥﴾ هەر کەسیش لە

ئاست (قورئانی) بیرخەرەوەی (خوای) بە بەزەیی دا، خۆی کوێرو گێل بکات، شەیتانێکی بۆ دەرەخسێنین، بۆی دەبێتە هاودەم ﴿٣٦﴾ ئنجا ئەوان (شەیتانەکان) لە ڕێ (ی خوا) لایان دەدەن، کەچی پێیان وایە، ڕێ ڕاستگرتوون ﴿٣٧﴾ هەتا کاتێك (یەکێکیان) هاتە لامان (لە ڕۆژی دوایی دا) گوتی: خۆزگە نێوان من و نێوان تۆ (ئەی شەیتان)، دووریی خۆرهەڵات و خۆرئاوا بووایە، چونکە (تۆی) خراپترین هاوەڵ ﴿٣٨﴾ (پێیان دەگوترێ:) چونکە ستەمتان کردوە، ئەمڕۆ هاوبەشییتان لە سزاو ئازاردا، هەرگیز سوودتان پێناگەیەنێ ﴿٣٩﴾ (ئەی موحەممەد!) ئایا تۆ بەکەڕان دەبیستێنی؟ یان ڕێنمایی کوێران دەکەی؟ هەروەها کەسێك کە لە گومڕاییەکی ئاشکرادا بێ (بۆت دەهێنرێتە دەر)؟ ﴿٤٠﴾ ئنجا ئەگەر نەتهێڵین، بێگومان ئێمە تۆڵەستێنین لێیان ﴿٤١﴾ یان ئەگەر ئەوەی بەڵێنمان پێیان داوە، (هەڕەشەمان پێی لێیان کردوە)، پێشانت بدەین، بە دڵنیایی ئێمە تواناداریین بەسەریاندا (لە هەردوو حاڵێ دا سزادانیان مسۆگەرە) ﴿٤٢﴾ کەواتە: توند دەست بەو (پەیام)ەوە بگرە، کە بۆ لات سروشکراوە، مسۆگەر تۆ لەسەر ڕێیەکی ڕاستی ﴿٤٣﴾ بەڕاستییش ئەو (قورئانە) بیرخەرەوەیە بۆ تۆو خەڵکەکەت و، لەمەودواش لێتان دەپرسرێتەوە (چۆنتان مامەڵە لەگەڵدا کردوە)؟ ﴿٤٤﴾ لەو پێغەمبەرانەشمان بپرسە کە بەر لە تۆ ناردوومانن: ئایا هیچ پەرستراوانێکمان داناون، کە جگە لە (خوای) بە بەزەیی بپەرسترێن؟! ﴿٤٥﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(بَرَآءٌ): (أَصْلُ البُرْءِ، والبَرَاءَةِ وَالتَبَرِّي: التَقَصِّي مِمَّا يُكْرَهُ مُجَاوَرَتُهُ، والبَرَءَ مَصْدَرُ: البَرَاءَة)، واتە: (بُرْء)و (بَرَاءَة)و (تَبَرِّي)، هەرسێکیان واتە: دووریی لە شتێك، کە نیزیکی لێی، شتێکی نەویستراو بێ، وشەی: (بَرَء) چاوگە بە مانای (بَرَاءَة)، دووریی، حاشا لێکردن.

(عَقِبِهِۦ): (العَقِبُ مُؤَخَرُ الرِّجْلِ، وَآسْتُعِيرَ لِلوَلَدِ، وَوَلَدِ الوَلَد)، (عَقِبْ) بە مانای پاژنە پێ دێ، بەڵام خوازراوەتەوە بۆ ڕۆڵەو، ڕۆڵەی ڕۆڵە، ئنجا کوڕ بێ، یان کچ، (يُقَالُ جَاءَ فِي عَقِبِ الشَّهْرِ أي: آخِرِه)، ئەگەر بگوترێ: لە عەقیبی مانگەکەدا هات، واتە: لە کۆتایی مانگدا هات.

(قَسَمْنَا): دابەشمان کردوە، (القَسْمُ إِفْرَازُ النَّصِيبِ، قَسَمْتُ كَذَا قَسْماً وَقِسْمَةً: وَزَّعْتُهُ)، (قَسْم): بریتییە لە دیارییکردنی پشك و بەش، دەگوترێ: (قَسَمْتُ كَذَا)، ئەو شتەم دابەش کرد، ئنجا (قَسْماً وَقِسْمَةً)، هەردووکیان چاوگن، واتە: دابەشکردن.

(مَّعِيشَتَهُمْ): (المَعِيْشَةُ: مَا يُتَعَيَّشُ بِهِ، وَالعَيْشُ: الحَيَاةُ المُخْتَصَّةُ بِالحَيْوَان)، (مَعِيشة) بریتییە لەوە کە مرۆڤ، پێی دەژی، (عَيش): بریتییە لەو ژیانەی تایبەتە بە ژیاندارانەوە، بۆیە وشەی (مَعِيْشَة)، دەگونجێ بڵێی: بژیو، دەشگونجێ بڵێی: گوزەران، واتە: شتێك کە ژیانی مرۆڤ پێی دەگوزەرێ.

(سُخْرِيًّا): (السُّخْرِيُّ: الَّذِي يُقْهَرُ فَيَتَسَخَّرُ بِإِرَادَتِهِ)، کەسێك کە لایەنێکی دیکە، دەیخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوەو، ئەویش بەکاردەهێنرێ بە ویستی خۆی، (التَّسْخِيرُ: سِيَاقَةٌ إِلى الغَرَضِ المُخْتَصّ بِهِ قَهْراً)، (تَسْخِير): بریتییە لە لێخوڕینی شتێك، بەرەو

ئەو مەبەستە تایبەتەی، کە لێی ویستراوە، بەڵام بە شێوەیەك کە ویستی خۆی لە ئارادا نەبێ، (تَسخِیر) واتە: ڕامکردن و، دەستەمۆ کردن و، مل پێکەچ کردن.

(لِبُیُوتِهِمۡ ): (**أَصْلُ البَيْتِ: مَأْوَى الإِنْسَانِ بِاللَّيْلِ، بَاتَ أي: أَقَامَ بِاللَّيْلِ، وَالبَيْتُ: المَسْكَنُ**)، (**بَيت**) لە ئەسڵدا ئەو شوێنەیە کە مرۆڤ بە شەوێ، تێیدا دەحەوێتەوە، دەگوترێ: (**بَاتَ أي: أَقَامَ بِاللَّيل**)، بە شەوێ مایەوە، (**ظَلَّ**) بە ڕۆژێ لەو شوێنە بوو، یاخود ئەو کارەی کرد، کەواتە: (**بَيت**) واتە: مەسکەن، شوێنی سوکنا، شوێنی تێدا نیشتەجێ بوون.

(سُقُفًا ): (**جَمَعُ السُّقُف**)، (**سَقف**) بە (**سُقُف**) کۆ دەکرێتەوە، (**السَّمَاءُ: البَيْت**)، (**سماء**) سەربانی خانوو، نەك هەر دیوی دەرێی، دیوی نێوەو دیوی دەرەوە، پێی دەگوترێ: سەقف.

(وَمَعَارِجَ ): (**أي: مَصَاعِد، عَرَجَ: مَشَى مِشْيَةَ العَارِجِ، وَعَرِجَ: صَارَ ذَلِكَ خِلْقَةً لَهُ**)، (**مَعَارِج**) کۆی (**مِعرَاج**)ە، واتە: (**مَصْعَد**) کە بە (**مَصَاعِد**) کۆ دەکرێتەوە، بە پەیژەو قادرمە دەگوترێ، هەر شتێك مرۆڤ پێیدا سەردەکەوێ، بۆ سەربان، یاخود بۆ شوێنی بەرز، دەگوترێ: (**عَرَجَ**) واتە: وەك ڕۆیشتنی شەل، ڕۆیی، بەڵام (**عَرِجَ**) واتە: ڕۆیشت بە شێوەیەك، ئەو جۆرە ڕۆیشتنە کە شەلییە، تێیدا بۆتە خەسڵەتێکی بنەڕەتیی، یانی: (**عَرَجَ**) خۆی شەلاند، (**عَرِج**) بەشەلیی ڕۆیی، شەلییەکی بەردەوام.

(يَظۡهَرُونَ ): (**أي: يَصْعَدُون، ظَهَرَ عَلَيْهِ: غَلَبَهُ**)، (**يَظهَرُون**) لێرەدا بە مانای (**يَصْعَدُون**) یانی: سەردەکەون، ئەگەرنا (**ظَهَرَ عَلَيْهِ**)، واتە: بەسەریدا زاڵ بوو.

(وَسُرُرًا ): (**جَمعُ أَسِرَّة وَهِيَ جَمْعُ سَرِير**)، (**سُرُر**) کۆی (**أَسِرَّة**)یە، (**أَسِرَّة**)ش کۆی (**سَرير**)ە، واتە: تەخت، تەختێك کە مرۆڤ لەسەری ڕادەکشێ، یان ئیسراحەت دەکات، دەگونجێ ئێستا بەو قەنەفەو شتانە بگوترێ، کە خەڵك لەسەریان پاڵ دەداتەوە.

(يَتَّكِـُٔونَ ): (الإتِّـكَاءُ وَالتَّـوَكُّأُ: التَّحَامـلُ عَـلَى الـشَّيء)، (إتِّـكاء وتـوكّأ) بريتيـه لـەوە، کـه ئینسـان سـەنگی خـۆی بداتـه سـەر شـتێك، بـه کوردیـی: شـان دادان، یاخـود پاڵدانـەوە.

( وَزُخْرُفًا ): (الزخـرف: الذَّهَـبُ والزِّينَـةُ وَالأَمْتِعَـةُ وَالأَثَـاثُ، وَالنَّقْـشُ)، وشـەی (زُخـرُف): بـه مانـای زێـڕ هاتـووەو، بـه مانـای جوانیـی هاتـووەو، بـه مانـای کەلوپەلـی مـاڵ هاتـووەو، بـه مانـای نەخـش و نیـگار هاتـوە، دەگوتـرێ: (زَخْرَفْـتُ الـدَّارَ أي: زَيَّنْتُهَـا)، ماڵەکـەم ڕازانـدەوەو، نەخـش و نیـگارم تێـدا دروسـت کـرد.

(يَعْشُ): واتـه: خـۆی کوێـر بـکات، دەگوتـرێ: (عَشَـوتُ إلى النَّـارِ أي: قَصَدتُهَـا، وَعَشَـيْتُ عَنْهَـا: أَعْرَضْـتُ، والعَشَـا: ظُلْمَـةٌ تَعْـتَرِضُ فِي العَـينِ، يُقَـالُ: رَجُـلٌ أَعْـشَى وَامْـرَأَةٌ عَشْـوَاء، يَخْبِـطُ خَبـطَ عَشْـوَاء)، واتـه: (عَشَـوْتُ إلى النَّـار)، ڕووم لـه ئاگرەکـه کـرد، (عَشَـيْتُ عَنْهَـا) ڕووم لـێ وەرگێـڕا، ﴿ وَمَن يَعْشُ عَن ذِكْرِ ٱلرَّحْمَٰنِ ﴾، هـەر کەسـێك ڕوو وەربگێـڕێ لـه یادخـەرەوەی خـوای بـه بەزەیـی، یاخـود لـه ئاسـتیدا خـۆی کوێـر بـکات، خـۆی لـێ گێـل بـکات، (العَشَـا)، بریتیـه لـه تاریکییـەك کـه دێتـه بەرچـاو و ڕێـی دیـتن دەگـرێ، (رَجُـلٌ أَعْـشَى وَامْـرَأَةٌ عَشْـوَاء)، پیاوێـك کـه بـه تایبـەت بـه شـەو نەبینـێ، پێـی دەگوتـرێ: شـەو کوێـر، پێـی دەگوتـرێ: (أَعْـشَى)، کتێبێـك هەیـه (صُبْحُ الأَعْـشَى)، بەرەبەیانـی بابـای شـەو کوێـر، کـه بەشـەو نابینـێ، (إمْـرَأَةٌ عَشْـوَاء)، بـۆ ئافرەتـه، ئافرەتـی شـەوکوێر، هـەر بۆیـه لـه پەنـدی عەرەبییـدا هاتـوە، دەڵـێ: (فُـلانٌ يَخْبِـطُ خَبـطَ عَشْـوَاء)، فڵانکـەس قسـه دەکات، یـان کارێـك دەکات، بـێ ئـەوەی بەرپێـی خـۆی ببینـێ، وەك چـۆن ئافرەتـی شـەوکوێر، دەڕوات و بـەدەرو دیـواران دەکـەوێ.

(نُقَيِّضْ): (نُهَيِّء) بۆی ئامادەو ساز دەکەین، بۆی دەڕەخسێنین.

(قَرِينٌ): (أي: مُـلاَزِم، وَصَاحِـب)، کەسـێك کـه بـەردەوام لەگەڵیەتیـی و هاوەڵیەتیـی، هـاوڕاز، هـاودەم.

(لَذِكْرٌ لَّكَ): (ذِكْر): هەم بە مانای ناو و ناوبانگ، هەم بە مانای بیرخەرەوە دێ، (أي: شَرَفٌ وَمُذَكِّرٌ)، واتە: ناوو ناوبانگەو، بیرخەرەوەشە، مەبەست پێی قورئانی بەرزی بەپێزە.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە موبارەکەی کە دەفەرموێ: ﴿ وَقَالُوا۟ لَوْلَا نُزِّلَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنَ ٱلْقَرْيَتَيْنِ عَظِيمٍ ﴿٣١﴾ ﴾، لەو بارەوە چەند ڕیوایەتێک هاتوون، ئێمە ئەو ڕیوایەتەیان دێنین، کە لە ڕووی سەنەدەوە لە هەموویان باشترە:

(عَنْ قَتَادَةَ قَالَ: الرَّجُلُ: الوَلِيدُ ابْنُ المُغِيرَة، قَالَ لَوْ كَانَ مَا يَقُولُ مُحَمَّدُ حَقاً، أُنْزِلَ عَلَيَّ هَذَا القُرْآنُ، أَو عَلَى أَبِي مَسْعُودٍ الثَّقَفِي، وَالقَرْيَتَانِ الطَّائِفُ وَمَكَّة، وَأَبُو مَسْعُودٍ الثَّقَفِي مِنَ الطَّائِف وَاسْمُهُ: عُرْوَةُ ابن مَسْعُودٍ)، (أخرَجَهُ عَبدُالرَّزَاق فِي تَفسِيرِهِ، ج٢، ص١٩٦، وَالطَّبَرِي فِي جَامِع البَيَان برقم: ٣٠٨٨١، وَعَبدُ بِن حُمَيد فِي تَفسِيرِهِ كَمَا فِي فَتحُ البَارِي: ج٦، ص٣١٥، قَالَ مُؤَلِّفَا الإستِيعاب فِي بَيَانِ الأَسبَاب، قُلْنَا: وَهُوَ مُرْسَلٌ صَحِيحٌ الإِسْنَادِ، وَذَكَرَهُ السيوطي فِي الدُّرُّ المَنثُور: ج٧، ص٣٧٥، وَ زَادَ نِسبَتَهُ لابنِ المُنذِر وَ ابن أَبِي حَاتَم)[1].

واتە: قەتادە (کە یەکێکە لە زانایانی شوێنکەوتووان، دوای هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ) گوتوویەتی: ئەو پیاوە کە ئەو قسەیەی کرد: ﴿ وَقَالُوا۟ لَوْلَا نُزِّلَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنَ ٱلْقَرْيَتَيْنِ عَظِيمٍ ﴿٣١﴾ ﴾، وەلیدی کوڕی موغیرە بوو، کە یەکێک بووە لە زلە زلە بێبڕوایەکانی مەککەو، گوتی: ئەگەر ئەوەی موحەممەد دەیڵێ هەق بووایە، ئەم قورئانە بۆ سەر من دادەبەزی، یاخود بۆ سەر ئەبوو مەسعوودی سەقەفیی، دوو شارەکانیش تائیف و مەککە بوون، ئەبوو مەسعوودی سەقەفییش، لە تائیف بووەو ناوی عوروەی کوڕی مەسعوود بووە.

---

(١) الإستِيعاب فِي بَيَانِ الأَسبَاب: ج٣، ص١٩٦ و ١٩٧.

## مانای گشتیی ئایەتەكان

خـوای زانـاو كارزان لـەم سـووڕەتە موبارەكـەدا، وەك پێشـتر گوتمـان: ئامـاژە دەكات بـە سـێ لـە پێغەمبـەران (عَلَيْهِـمُ الصَّـلَاةُ وَالسَّـلَام)و، هەڵوێسـتیان لـە بەرانبـەر خـوا بـە یەككگرتنـدا، كـە بریتـی بـووە لـە تەبەننیـی كردنـی خـوا بـە یەككگرتـن، پاشـان بەرپەرچدانەوەیـان بـۆ شـیرك و هاوبـەش بـۆ خـوا دانـان، كـە یەكەمیـان ئیبراهیمـە عليه السلام، دووەمیـان مووسـایە عليه السلام، سێیەمیشـیان عیسـایە عليه السلام.

باسـكردنی ئـەم سـێ پێغەمبـەرە (عَلَيْهِـمُ الصَّـلَاةُ وَالسَّـلَام)، كـە باسـی ئیبراهیـم سـێ ئایەتـی بـۆ تەرخانكـراون و، باسـی مووسـا یـازدە (١١) ئایـەت و، هـی عیسـاش نـۆ (٩) ئایـەت و بـە هـەر سێكیان: بیسـت و سـێ (٢٣) ئایەتیـان بـۆ تەرخانكـراون، لـە كـۆی ئـەو (٨٩) ئایەتـەی ئـەم سـووڕەتەیان لـێ پێـك دێ، حیكمەتەكـەی ئەوەیـە كـە خـوا ﷻ بـە پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ دەفەرمـوێ: ئـەو حاڵەتـەی تـۆ تێیـدای كـە لەگـەڵ ئەهلـی كوفـرو شـیركدا، بەرەنگاربوویـەوەو ئەوانـە بـە شـێوەی ناشایسـتەو بـێ نەزاكـەت لەگـەڵ تـۆدا دەدوێـن، بـە شـێوەیەك كـە شایسـتەی پایـەی بـەرزی تـۆ نیـە، مامەڵـەت لەگـەڵ دا دەكـەن، تەنیـا تـۆ وانـی، بەڵكـو ئیبراهیمـی باپیرەشـت هەر وابـووە، مووسـاش هـەر وابـووەو، لەگـەڵ فیرعەونییەكانـدا، هەروەهـا عیسـاش عليه السلام هـەر وابـووە، ﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦٓ إِنَّنِى بَرَآءٌ مِّمَّا تَعْبُدُونَ ﴾، واتـە: یـاد بكـەوە ئـەی موحەممـەد! ﷺ كاتێـك ئیبراهیـم عليه السلام، بـە بابـی و بـە گەلەكـەی فەرمـوو: بـە دڵنیایـی مـن دوور و بێـزارم لـەوەی ئێـوە دەیپەرسـتن، واتـە: ئـەوەی جگـە لـە خـوا ﷻ دەیپەرسـتن، مـن دوورو بێـزارم و حاشـای لـێ دەكـەم.

﴿ إِلَّا ٱلَّذِى فَطَرَنِى فَإِنَّهُۥ سَيَهْدِينِ ﴾، هیـچ شـتێك ناپەرسـتم جگـە لـەو زاتـەی، منـی هێناوەتـە دی، منـی داهێنـاوە، بۆیـەش بـەس ئـەو دەپەرسـتم، چونكە ڕاسـتەڕێم دەكات، هـەم ڕێـم پێشـان دەدات و، هـەم ڕاسـتە ڕێـم دەكات، ڕێـم پێشـان دەدات،

کـە چـۆن بەندایەتیـی بـۆ ئـەو بکـەم، ڕاسـتە ڕێشـم دەکات و یارمەتییـم دەدات، چـۆن ئـەو ڕێیـە ڕاسـتە بگـرم.

﴿ وَجَعَلَهَا كَلِمَةَۢ بَاقِيَةً فِي عَقِبِهِۦ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴾، ئیبراهیـم ﷺ ئـەو وشـەیەی خـوا بـە یەکگرتـن و ڕەفزکردنـی شـیرك) کـردە شـتێکی بـەردەوام لـە وەچەکەیـدا، بەڵکـو بگەڕێنـەوە، واتـە: ئەوانەیـان کـە لایانـداوە بگەڕێنـەوە، یاخـود: بەڵکـو هەمیشـە عادەتیـان وابـێ، بـۆ لای خـوا بگەڕێنـەوە، چونکـە گەڕانـەوە بـۆ لای خـوا، مـەرج نیـە تەنیـا لـە کوفـرو شـیرکەوە بـێ، بەڵکـو جـاری وا هەیـە، ئینسـان لـە تاعەتێکـی کەمـترەوە، بـەرەو تاعەتێکـی زیاتـر، لـە پایەندییەکـی کەمـتر، بـەرەو پابەندییەکـی باشـتر، بـۆ لای خـوا دەگەڕێتـەوە، بۆیـە گەڕانـەوە بـۆ لای خـوا، خاڵـی هاوبەشـی هەمـوو ئەهلـی ئیمانـە.

ئـەم سـێ ئایەتـە موبارەکـە، هـەروا بـە کورتیـی ئاماژەیـان کـرد، بـە هەڵوێسـتی ئیبراهیـم ﷺ لـە بەرانبـەر بابـی و گەلەکەیـدا، کەواتـە: ئـەی موحەممـەد! ﷺ هەروەهـا ئـەی شـوێنکەوتووانی موحەممـەد تاکـو ڕۆژی دوایـی! ئێـوەش ئەگـەر بـاب و باپیرانتـان، نیزیکتریـن کەسـتان کـە بابـەو، دایکـە، هەروەهـا خۆشەویسـترین کەسـتان، کـە خەڵـك و قەومتانـن، لەگەڵتانـدا سـازگار نەبـوون، بـۆ تەنیـا بەندایەتیـی کـردن بـۆ خـواو، ڕێـی ڕاسـتی خـوا گرتـن، ئێـوە دەسـتبەرداری تەنیـا خـوا پەرسـتیی خۆتـان مەبـن و، بـۆ هیـچ شـتێك سـازش مەکـەن و، دامەبـەزن لـەو ڕێیـە ڕاسـتەی کـە خۆتـان گرتووتانـە.

لـەو ڕووەوەش ئیبراهیـم ﷺ بکەنـە سەرمەشـقی خۆتـان، کـە ئـاوا زۆر بـە زەقیی و بـە ڕوونیـی و ڕاشـکاویی، بەبـێ منجـە منـج، بـە بابیشـی گوتـوەو، بـە گەلەکەیشـی گوتـوە: مـن بەرییـم و بێـزارم لـەوەی ئێـوە دەیپەرسـتن، جگـە لـەو زاتـەی منـی هێناوەتـە دی، هیچـی دیکـە ناپەرسـتم و، بـەس ئەویـش ڕێـم پێشـان دەدات، هـەم ڕێـی بەندایەتیـی کـردن بـۆ خـوا، لـە ژیانـی تاکییـم، لـە ژیانـی خێزانییـم، لـە ژیانـی

کۆمەڵایەتییم، لە ژیانی سیاسییمدا، بە گشتیی لە هەموو ڕوویەکەوە ئەو ڕێی ڕاستم پێشان دەدات و دەمخاتە سەر ڕاستە ڕێ، وەك چۆن ئیبراهیم ﷺ ئەو ڕێبازە ڕاستەی هێندە بەلاوە گرنگ بوو، کە کردیە میراتیش و، کردیە وشەیەکی بەردەوام لە وەچەکەیدا، ئێوەش هەر وابن، ئێوەش ئەو ڕێیە، هەم خۆتان تەبەننیی بکەن و، هەم هەوڵ بدەن دەوروبەرتان و وەچەو ڕۆڵەکانیشتان تەبەننیی بکەن.

﴿ بَلْ مَتَّعْتُ هَـٰٓؤُلَآءِ وَءَابَآءَهُمْ حَتَّىٰ جَآءَهُمُ ٱلْحَقُّ وَرَسُولٌ مُّبِينٌ ﴾، (بَل): (للإِضرَاب الإنتِقالي)، (بَلْ) بۆ گواستنەوەو هەڵکشینە، واتە: ئەوانەی لە وەچەی ئیبراهیم ﷺ کە ئاوا ئامۆژگاریی کردبوون و ڕایسپارد بوون، کاتێك لایاندا، بەهۆی لادان و تاوانیانەوە نەمفەوتاندن، بەڵکو ئەوان و باب و باپیرانیشیانمان بەهرەمەند کردو، لە ژیاندا هێشتماننەوە، نازو نیعمەتی دنیامان بۆ ڕەخساندن، ﴿ حَتَّىٰ جَآءَهُمُ ٱلْحَقُّ وَرَسُولٌ مُّبِينٌ ﴾، تاکو هەقیان بۆ هات، کە لە قورئاندا بەرجەستەیە، ﴿ وَرَسُولٌ مُّبِينٌ ﴾، هەروەها پێغەمبەرێکی ڕوونکەرەوەیان بۆ هات، ڕوونکەرەوە بۆ حاڵی خۆی و بۆ پەیامی خۆی، یاخود: پێغەمبەرێکی ڕوون و ڕۆشن، کە هەر کەسێك تەماشای بکات، دەزانێ پێغەمبەرو ڕەوانەکراوی خوایە.

﴿ وَلَمَّا جَآءَهُمُ ٱلْحَقُّ قَالُوا۟ هَـٰذَا سِحْرٌ وَإِنَّا بِهِۦ كَـٰفِرُونَ ﴾، کاتێ هەقیان بۆ هات، (ئەو هەقەی خوا ﷻ بە پێغەمبەری خاتەمدا ﷺ ناردوویەتی، کە لە قورئاندا بەرجەستەیە)، گوتیان: ئەمە جادوویەو ئێمە پێی بێبڕواین.

﴿ وَقَالُوا۟ لَوْلَا نُزِّلَ هَـٰذَا ٱلْقُرْءَانُ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنَ ٱلْقَرْيَتَيْنِ عَظِيمٍ ﴾، بە نسبەت قورئانەوە، تۆمەتباریان کرد، کە ئەوە جادوویەو، ئەوان پێی بێبڕوان، بە نسبەت پێغەمبەریشەوە ﷺ گوتیان: دەبوایە ئەم قورئانە دابەزیبایە سەر پیاوێکی مەزن، لە دوو ئاوەدانییە گەورەکەدا، ئنجا مەرج نیە، تەنیا دوو پیاویان مەبەست بووبن، لە هەر کام لەم دوو شارەدا، بەڵکو پیاوێکی مەزن، لە یەکێك لەو دوو

شارەدا، چونکە زۆربەی توێژەرەوان، هەر باسی دووان دەکەن، بۆ وێنە: وەلیدی کوڕی موغیرەو مەسعوودی کوڕی عوروەی سەقەفیی، یەکەمیان لە مەککەو، ئەوی دیکە لە تائیف، بەڵام ئایەتەکە ئەوە ناگەیەنێ، کە ئاماژە بێ بە دوو پیاوان، بەڵکو ئاماژەیە بە پیاوێکی مەزن، لە یەکێك لەو دوو شارانەدا، کە دیارە جگە لەو دووانەش، خەڵکی دیکەشی لێ هەبووە، کە بە پێوەری ئەوان مەزن بووە، پیاوی مەزنیش لە لای ئەوان ئەوە بووە، سامانی زۆر بێ و، قەڵەباڵغیی بە دەورەوە هەبێ و، دەسەڵاتی هەبێ، پێوەری ئەوان بەو شێوەیە بووە، واتە: ئەو موحەممەدە ﷺ کە لە ڕووی سەروەت و سامانەوە زۆر دەستی پڕ نیەو، لە ڕووی خزم و کەس و قەومەوە، یاخود شوێنکەوتووانەوە، دەوری زۆر قەڵەباڵغ نیە، خەڵکی زۆر بە دەوری خۆیەوە کۆنەکردۆتەوە، شایستەی ئەوە نەبوو، کە ئەو قورئانەی دابەزێتە سەری!!

خواش ﷻ وەڵامێکی زۆر ددان شکێنیان دەداتەوە، دەفەرموێ: ﴿ أَهُمْ يَقْسِمُونَ رَحْمَتَ رَبِّكَ ﴾، ئایا ئەوان بەزەیی پەروەردگارت دابەش دەکەن، پلەی پێغەمبەرایەتیی، پلەیەکی زۆر بەرزو ناوازەیەو، بەرجەستەکەری بەزەیی خوایە، ئایا ئەوان ئەو بەزەییەی خوا دابەش دەکەن! تاکو بە کەیفی خۆیان بیدەن و بەو و نەیدەن بەو؟!، ﴿ نَحْنُ قَسَمْنَا بَيْنَهُم مَّعِيشَتَهُمْ فِي الْحَيَوٰةِ الدُّنْيَا ﴾، (نەك هەر بەزەیی خوا بەدەست ئەوان نیە)، بەڵکو بژیوو ژیان و گوزەرانی دنیاشیان، ئێمە لە نێوانیاندا بەشمان کردوە، ئێمە بژیوی خۆشیانمان لە نێواندا دابەش کردوەو، لە ژیانی دنیادا، ﴿ وَرَفَعْنَا بَعْضَهُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَٰتٍ ﴾، هەندێکیانمان چەندان پلە، بەسەر هەندێکیاندا بەرزکردۆتەوە، ﴿ لِّيَتَّخِذَ بَعْضُهُم بَعْضًا سُخْرِيًّا ﴾، تاکو هەندێکیان هەندێکیان بەکاربێنن، یاخود هەندێکیان هەندێکیان بە کارپێکراو بگرن.

(سُخْرِيٌّ): (مَن يُسْتَخْدَم)، کەسێك بەکاربهێنرێ، تەعبیرەکەش ئەوە دەگەیەنێ، کە هەموویان یەکدیی بەکاردێنن، دەوڵەمەندیش هەژار بەکاردێنێ، هەژاریش دەوڵەمەند بەکاردێنێ، دەسەڵاتداریش بێ دەسەڵات بەکاردێنێ، بێ دەسەڵاتیش

دەسـەڵاتدار بەکاردێنـێ، هەڵبەتـە لـە حاڵێکـدا، کـە حاڵەتێکـی ئاسـایی و شـەرعیی بـێ لـە کۆمەڵـگاداو، ئـەو حوکمڕانـە خەڵـك هەڵیبژاردبـێ، حوکمڕانەکـە خزمەتـی خەڵـك دەکات، خەڵکیـش خزمەتـی دەکات و بـە قسـەی دەکات، دەوڵەمەندەکـە کـە بـە شـێوەی شـەرعیی دەوڵەمەنـد بووبـێ، ئـەو پێویسـتیی بـە کەسـانێك هەیـە، هـاوکاری بـن، ئـەو خەڵکەکـە بەکاردێنـێ، ئەوانـەی کـە هێنـدەی وی سـامانداریین، بـەڵام خەڵکەکـەش ئـەو بەکاردێنـن، واتـە: شـتەکە پەیوەندییەکـی دوو سـەرەیە، هـەر کامێکیـان ئـەوی دیکـە بەکاردێنـێ، چونکـە خـوا ﷻ لـە پەیوەندیـی نێـوان ئافرەتـان و پیاوانیشـدا دەفەرمـوێ: ﴿ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعۡضَهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٍ ﴿٣٤﴾﴾النِّسَاء، واتـە: پیـاوان سەرپەرشـتیارن بەسـەر ئافرەتانـەوە، بـە هـۆی ئـەوەوە کـە خـوا هەندێکیانـی بەسـەر هەندێکیانـدا بـەرز کردۆتـەوەو، زێدەیـی پێـداوە، ئنجـا ئەگـەر زێدەیـی بـەس بـە پیـاوان دابایـە، بەسـەر ئافرەتانـدا، دەیفەرمـوو: (**بِمَـا فَضَّـلَ الرِّجَـالَ عَـلَى النِّسـاء**)، بـەڵام نـا، ئەگـەر پیـاو جەسـتەیەکی ماسـوولکەدارو بەهێـزی هەیـەو، ئەگـەر پیـاو دەنگێکـی گـڕو بەهێـزی هەیـەو، ئەگـەر پیـاو عەقـڵ و هۆشـێکی بەهێزتـری هەیـە، لـە بەرانبـەردا ئافرەتیـش عەتـف و سـۆزو بەزەییەکـی زیاتـری هەیـە لـە پیـاو، جەسـتەی نـەرم و ناسـکترە، دەنگـی بـە سـۆزو جۆشـترە، کەواتـە: هـەر کامێکیـان خاڵـی بەهێـزی خـۆی هەیـە، بۆیـە هـەر کامێکیـان زێدەیـی هەیـە، بەسـەر ئـەوی دیکـەدا.

بۆیـە لێـرەش کـە دەفەرمـوێ: ﴿لِّيَتَّخِذَ بَعۡضُهُم بَعۡضٗا سُخۡرِيّٗا﴾، هەندێکیـان هەندێکیـان بەکاربێنـن، واتـە: لـە هـەر ڕوویەکـەوە تەماشـای بکـەی، وایـە، بـۆ وێنـە: بەرپرسـی فەرمانگەیـەك، کارمەنـدەکان بەکاردێنـێ، ئەوانیـش ئـەو بەکاردێنـن، هەروەهـا وەسـتایەك کرێـکارەکان بەکاردێنـێ، کرێکارەکانیـش وەسـتا بەکاردێنـن، ئەندازیارێـك چەنـد وەسـتایەك بەکاردێنـێ، وەسـتایەکانیش ئەندازیـار بەکاردێنـن، حوکمڕانـان خەڵـك و کۆمەڵـگا بەکاردێنـن، خەڵـك و کۆمەڵـگاش حوکمڕانـان

بەکاردێنێ، ئەوە لە حاڵێکدا کە حاڵەتێکی ئاسایی و ڕەوا بێ، نەك دەستەڵاتەکە بە خۆسەپاندن بێ و، سەروەت و سامان وەسەرێك نانی قەدەغەو حەڕام بێ.

﴿ وَرَحْمَتُ رَبِّكَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ﴾، بەزەیی پەروەردگاریشت، باشترە لەوەی کۆی دەکەنەوە لە ماڵ و سامان، کە بەزەیی پەروەردگارت، لە دنیادا لە پێغەمبەرایەتیی دا بەرجەستەیە، لە ئیماناو لە هیدایەت دا بەرجەستەیە، لە ڕۆژی دواییشدا لە بەهەشتدا بەرجەستەیە.

﴿ وَلَوْلَآ أَن يَكُونَ ٱلنَّاسُ أُمَّةً وَٰحِدَةً ﴾، خوای پەروەردگار بێ بایەخیی ژیانی دنیا لە ڕووە ماددییەکەیەوە دەخاتە ڕوو و دەفەرموێ: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە، خەڵك هەمووی ببنە یەك کۆمەڵ، ﴿ لَّجَعَلْنَا لِمَن يَكْفُرُ بِٱلرَّحْمَٰنِ ﴾، ئەوەی بێبڕوا دەبێ، بە خوای خاوەن بەزەیی، بۆمان دەڕەخساندن، ﴿ لِبُيُوتِهِمْ سُقُفًا مِّن فِضَّةٍ ﴾، بۆ ماڵەکانیان، بۆ خانووەکانیان، سەربانی خانووەکانمان بۆ دەکردن بە زیو، ﴿ وَمَعَارِجَ عَلَيْهَا يَظْهَرُونَ ﴾، هەروەها چەند پەیژەیەك کە پێیاندا سەرکەون، ئەوانیشمان بۆ دەکردن بە زیو.

﴿ وَلِبُيُوتِهِمْ أَبْوَٰبًا وَسُرُرًا عَلَيْهَا يَتَّكِـُٔونَ ﴾، هەروەها بۆ ماڵەکانیان، دەرگاکانی ماڵەکانیان و، چەند تەخت و قەنەفەیەك کە لەسەریان شان دادەن و، پاڵ دەدەنەوە، ئەوانیشمان بۆ دەکردن بە زیو.

﴿ وَزُخْرُفًا ﴾، هەروەها زێڕی زۆریشمان پێ دەبەخشین، یاخود: زرق و برق و ڕازاوەیی زۆریشمان پێ دەبەخشین، یاخود: کەل و پەلی جۆراو جۆریشمان پێ دەبەخشین، واتە: زیاتر لەوەی کە لە ئێستادا هەیە، ئەگەرنا ئەهلی کوفر بە زۆریی وایە لەوانەیان هەیە، بەڵام واتە: زیاتر لەوەی ئێستا هەیانە، پێمان دەدان، بەڵام خوا ﷻ وای نەکردوە، تاکو خەڵك هەمووی وەسەر کوفر نەگەڕێ، وەك دوایی لە مەسەلە گرنگەکان دا باسی دەکەین، حەسەنی بەصرِیی (خوا

لێـی ڕازی بـێ) دەڵـێ: خـوا ﷻ واشـی نەکـردوە، زۆربـەی خەڵـك مەیلیـان بـەلای دنیـادا کـردوە، ئـەدی ئەگـەر وای کردبایـە؟!

﴿ وَإِن كُلُّ ذَٰلِكَ لَمَّا مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ﴾، هیـچ کام لـەوەش نیـە، مەگـەر تەنیـا ڕابواردنێکـی کەمـی ژیانـی دنیایـە، ﴿ مَتَٰعُ ﴾: (مَـا يُتَمَتَّـعُ بِـهِ، مَـدَةٌ قَصِـيرَة)، شـتێك کـە ماوەیەکـی کـەم بەهـرەی لـێ وەردەگیـرێ، ژیانـی دنیـاش هـەر بـۆ خـۆی ماوەیەکــی کەمــە، ﴿ وَٱلْءَاخِرَةُ عِندَ رَبِّكَ لِلْمُتَّقِينَ ﴾، ﴿ وَٱلْءَاخِرَةُ ﴾، سـیفەتی وەسـفکراوێکی قرتێـنراوە، واتـە: (وَالـدَّارُ الآخِـرَة)، (وَالمَثُوبَـةُ الأَخِـرَة)، مەنزڵـگای کۆتایی، پاداشـتی کۆتایـی لـە لای پـەروەردگارت بـۆ پارێـزکاران دانـدراوەو، تەنیـا لـە گـرەوی ئـەوان دایـە.

﴿ وَمَن يَعْشُ عَن ذِكْرِ ٱلرَّحْمَٰنِ نُقَيِّضْ لَهُۥ شَيْطَٰنًا فَهُوَ لَهُۥ قَرِينٌ ﴾، هـەر کەسـێك لـە بەرانبـەر یـادی (خـوای) بـە بەزەیـی دا، یاخـود لـە بەرانبـەر کتێبـی بیرخـەرەوەی (خـوای) بـە بەزەییـدا، خـۆی کوێـر بـکات، پشـتی تـێ بـکات و خـۆی لـێ گێـل بـکات، ﴿ نُقَيِّضْ لَهُۥ شَيْطَٰنًا ﴾، شـەیتانێکی بـۆ ئامـادەو سـاز دەکەیـن، ﴿ فَهُوَ لَهُۥ قَرِينٌ ﴾، کـە ئـەو شـەیتانە بـۆ وی، دەبێتـە هاوەڵێکـی بـەردەوام، هەمیشـە لەگەڵیـدا دەبـێ، هـاوڕازی دەبـێ، تاکـو بـەردەوام دنـەی بـدات بـەرەو خراپـە، هـەروەك بەپێچەوانـەوە: ئەگـەر هیدایەتـی خـوا وەربگـرێ بـە دڵ و گیـان، خـوا ﷻ فریشـتانی بـۆ دەڕەخسـێنێ، هەمیشـە ئیلهامـی بـۆ بکـەن و، خورپـەو نیەتـی چـاك بخەنـە دڵـی، بـەڵام هـەر کەسـێك لـە بەرانبـەر بەرنامـەی خـواو، کتێبـی خـواو یـادی خـوادا، خـۆی کوێـرو کوتـر بـکات، شـەیتانێکی بـۆ ئامـادە دەکـرێ، هەمیشـە لەگەڵیـدا دەبـێ.

﴿ وَإِنَّهُمْ ﴾، یـانی: ئـەو شـەیتانانە، پێشـێ باسـی شـەیتانێکی کـردوە، بـەڵام بـۆ هـەر کەسـێك شـەیتانێك، کەواتـە: دەبـن بـە کـۆ، ﴿ وَإِنَّهُمْ ﴾، واتـە: شـەیتانەکان، ﴿ لَيَصُدُّونَهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ ﴾، ئـەو مرۆڤـە بێبڕوایانـە، لـە ڕاسـتە شـەقام لادەدەن، ﴿ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ ﴾، بـەڵام ئـەو مرۆڤانـە، پێیـان وایـە ڕێـی ڕاسـتیان

گرتوەو، یاخود ئەو مرۆڤانە پێیانووایە، شەیتانەکان ڕێی ڕاستیان گرتوە، بۆیە وا چاك بە قسەیان دەکەن.

﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَنَا ﴾، هەتا یەکێکیان هات، بۆ لامان، واتە: لە ڕۆژی دوایی دا، ﴿ قَالَ يَٰلَيْتَ بَيْنِى وَبَيْنَكَ بُعْدَ ٱلْمَشْرِقَيْنِ فَبِئْسَ ٱلْقَرِينُ ﴾، لەو ڕۆژەدا، لە ڕۆژی دوایی دا دەڵێ: هەی خۆزگە لە نێوان من و تۆدا، دووریی هەردوو ڕۆژهەڵاتەکان ببووایە، زانایان لێرەدا دەڵێن: ڕۆژهەڵات زاڵکراوە بەسەر ڕۆژئاوادا، واتە: بریا هێندەی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، من و تۆ لێك دووربایەن، ﴿ فَبِئْسَ ٱلْقَرِينُ ﴾، تۆ خراپترین هاودەم و هاوڕازو، خراپترین دۆست و نیزیکی.

﴿ وَلَن يَنفَعَكُمُ ٱلْيَوْمَ إِذ ظَّلَمْتُمْ أَنَّكُمْ فِى ٱلْعَذَابِ مُشْتَرِكُونَ ﴾، خوا ﷻ دەفەرموێ: کە کاتی خۆی ستەمتان کردوە، ئەمڕۆ ئەوە هەرگیز سوودتان پێ ناگەیەنێ، کە ئێوە لە سزادان و ئازاردراندا هاوبەشن، هەر کەسە سزای پڕ بە پێستی خۆی هەیەو، سزادرانی هیچ کەس، نابێتە هۆی لە کۆڵکرانەوەی سزای یەکێکی دیکە.

خوا ﷻ لە کۆتایی ئەم ئایەتانەدا، ڕوو دەکاتە پێغەمبەری خاتەم ﷺ و چەند ڕێنماییەکی دەکات، چەند ڕاستییەکی مەزنی دەخاتە بەرچاو، دەفەرموێ:

﴿ أَفَأَنتَ تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ ﴾، ئایا تۆ دەتوانی بە کەڕان ببیستێنی، (صُم) کۆی (أَصَمّ)ە، واتە: کەڕ، (صُم) واتە: کەڕان، ئایا دەتوانی بە کەڕان ببیستێنی؟ ﴿ أَوْ تَهْدِى ٱلْعُمْىَ ﴾، یان دەتوانی کوێران ڕێنمایی بکەی، (عُمي) کۆی (أعمی) یە، ﴿ وَمَن كَانَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴾، هەروەها ئایا تۆ دەتوانی کەسێك لە گومڕاییەکی ڕوون و ئاشکرادا بێ، دەری بێنی و ڕێنمایی بکەی، واتە: بە تەئکید ناتوانی ئەوە بکەی، کەواتە: ئەوانەی لە ئاست بیستنی هەقدا، خۆیان کەڕ کردوەو، لە ئاست دیتنی هەقدا، خۆیان کوێر کردوەو، لە ئاست وەرگرتنی ڕێنمایی خوادا، ڕێی گومڕاییان گرتوەو، سووچ و خەتای تۆ نیە، کە ئەوانە ناگەڕێنەوەو ڕێی ڕاست ناگرن، تۆ ئەرکی خۆت بەرانبەریان جێبەجێ کردوە.

﴿ فَإِمَّا نَذْهَبَنَّ بِكَ فَإِنَّا مِنْهُم مُّنتَقِمُونَ ﴾، ئنجا ئەگەر تۆ لابەرین، بە دڵنیایی ئێمە تۆڵە ستێنین لەوان، تۆڵەیان لێ دەکەینەوە.

﴿ أَوْ نُرِيَنَّكَ الَّذِي وَعَدْنَاهُمْ ﴾، یان ئەگەر ئەوەی گفتمان پێیان داوە، پێشانت بدەین، واتە: ئەو سزایەی گفتمان پێیان داوە، ﴿ فَإِنَّا عَلَيْهِم مُّقْتَدِرُونَ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە بەسەر ئەواندا تواناداریـن، واتە: چ نەتهێڵین و، چ بتهێڵین، سزادرانی ئەوان هەر مسۆگەرە.

﴿ فَاسْتَمْسِكْ بِالَّذِي أُوحِيَ إِلَيْكَ ﴾، ئنجا توند دەست بگرە بەوەوە، کە بۆ لای تۆ سروشکراوە، سزادرانی ئەوان مسۆگەرە، لە هەردوو حاڵەتی مانی پێغەمبەرو نەمانیدا، واتە: ئەگەر ئەوان لەسەر کوفر بمێننەوە، بەڵام ئەگەر بگەڕێنەوەو، پەشێمان ببنەوە، بە تەئکید لە جیاتی سزا، پاداشت چاوەڕێیان دەکات، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ فَاسْتَمْسِكْ بِالَّذِي أُوحِيَ إِلَيْكَ ﴾، ئنجا زۆر بە توندیی دەست بەوەوە بگرە، کە بۆ لای تۆ سروشکراوە (کە قورئانە)، ﴿ إِنَّكَ عَلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴾، بە دڵنیایی تۆ لەسەر ڕێیەکی ڕاستی، لەسەر ڕاستە شەقامێکی، گرێ و گۆڵی تێدانیە، چاڵ و چۆڵی تێدا نیە، ڕێك و ڕوونە.

﴿ وَإِنَّهُ لَذِكْرٌ لَّكَ وَلِقَوْمِكَ ﴾، بە دڵنیایی ئەو، (ڕاناوەکەی بۆ قورئان دەچێتەوە، ئەم قورئانە)، بیرخەرەوەیە، بۆ تۆش و بۆ خەڵکەکەشت، یاخود مایەی ڕێزو حورمەتە بۆ خۆشت و بۆ خەڵکەکەشت، ئەگەر دەستی پێوە بگرن، ﴿ وَسَوْفَ تُسْأَلُونَ ﴾، لەمەودواش لێتان دەپرسرێتەوە، چونکە کەسێك قورئان بە زمانی خۆی بۆی هاتبێ، ئاسانتر دەتوانێ لێی تێبگات، بۆیە ئەرکی لە بەرانبەریدا قورسترەو، بەرپرسیارییەکەی زیاترە، زیاتریش واپێدەچێ (**ذِكْر**) لە هەموو قورئاندا بە مانای (بیرخەرەوە) بێ، واتە: بیرخەرەوەی ڕاستییەکان، ئەو ڕاستییانەی کە لە زگماك و ناخی مرۆڤدا، خوا ﷻ دایناون، قورئان هاتوە، ئەو ڕاستییانەمان بیر بخاتەوە.

﴿ وَسْئَلْ مَنْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رُّسُلِنَآ ﴾، لە ئەو پێغەمبەرانەی لە پێش تۆدا ناردوومانن، پرسیار بکە، لێیان بپرسە: ﴿ أَجَعَلْنَا مِن دُونِ ٱلرَّحْمَٰنِ ءَالِهَةً يُعْبَدُونَ ﴾، ئایا ئێمە جگە لە (خوای) بە بەزەیی، پەرستراوانێکی دیکەمان داناون، بپەرسترێن؟ لێیان بپرسە لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، وەك لە مەسەلە گرنگەکاندا باسی دەکەین، دەگونجێ ئەوە ڕوویدابێ و پێغەمبەر ﷺ لە پێغەمبەرانی پرسیبێ، لە شەوی میعراجدا، شەوی شەوڕۆو بەرزبوونەوەدا، بەشێك لە زانایان وادەڵێن و، هەندێك ڕیوایەت لەو بارەوە هەن، دەشگونجێ مەبەست ئەوە بێ، کە تۆ مادام ناتوانی لێیان بپرسی، کەواتە: بە عەقڵ و هۆشی خۆت تێبفکرە: ناگونجێ خوا ﷻ، بە هیچ کام لە پێغەمبەرانی فەرمووبێ: جگە لەو بپەرستن و بەندایەتیی بۆ جگە لە خوا بکەن!.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**ئیبراهیم ﷵ بە بابی و گەلەکەی فەرمووە: من لە پەرستراوەکانتان بێزارو بەریم و، جگە لە پەیداکەری خۆم ناپەرستم، تەنیا ئەویش ڕاستە ڕێم دەکات، ئیبراهیم ﷵ ئەو قسەیەشی لە نێو وەچەکەیدا، کردوە بە پەیامێکی بەردەوام:**

خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦٓ إِنَّنِى بَرَآءٌ مِّمَّا تَعْبُدُونَ ﴿٢٦﴾ إِلَّا ٱلَّذِى فَطَرَنِى فَإِنَّهُۥ سَيَهْدِينِ ﴿٢٧﴾ وَجَعَلَهَا كَلِمَةًۢ بَاقِيَةً فِى عَقِبِهِۦ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٢٨﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦٓ ﴾، یاد بکەوە! (ئەی موحەممەد! ﷺ) کاتێك ئیبراهیم ﷵ بە بابی و بە گەلەکەی فەرموو، بابی ئیبراهیم ﷵ ناوی ئازەر بووە، وەك لە سوورەتی (**الأنعام**)دا هاتووە، تەنیا لەوێشدا ناوی بابی ئیبراهیم ﷵ هاتوە: ﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ ءَازَرَ أَتَتَّخِذُ أَصْنَامًا ءَالِهَةً إِنِّىٓ أَرَىٰكَ وَقَوْمَكَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٧٤﴾ ﴾، گەلی ئیبراهیمیش ئەو خەڵکە بوو کە لە نێویاندا ژیاوە، کە وەك لە تەفسیری سوورەتی (**إبرَاهِيم**)دا، بەسەرهاتی ئیبراهیم (**خَلِيلُ الله**)مان بە درێژیی هێناو، باسمان کرد، ئیبراهیم ﷵ لە ئووری کلدانییەکان بووە، لە باشوری عێراق، بەڵام دوایی لەوێ بەو شێوەیە، لەگەڵ بابی و گەلەکەیدا ڕووبەڕوو بۆتەوەو، پەیکەرەکانی شکاندوون و، ئەوانیش ویستوویانە بیسووتێنن و، فڕێیان داوەتە نێو مەنجەنیق و، بە مەنجەنیق هەڵیان داوە بۆ نێو ئەو ئاگرە نێڵدراوو بڵێسەدار کراوەی کە زۆر بەرز بووە،

بەڵام خوا ﷻ سەلامەتی کردووەو، لەوێوە کۆچی کردوە بۆ شام، بەسەرهاتەکەمان لە سوورەتی (إبْرَاهِيم)دا بە تەفصیلْ هێناو، لێرە باسی ناکەین، گرنگ ئەوەیە ئیبراهیم ﷺ پێشێ لەگەڵ بابی و، ئنجا لەگەڵ خەڵکەکەی دا، کە لە نێویاندا ژیاوە، ڕووبەڕوو بۆتەوە.

٢)- ﴿إِنَّنِي بَرَآءٌ مِّمَّا تَعْبُدُونَ﴾، (پێی گوتوون:) بە دڵنیایی من بێزارم لەوەی دەیپەرستن، وشەی (بَرَآء) چاوگە، بەڵام بە مانای (بَرِيء)ە، پێشتر گوتمان: (البَرِيء) واتە: دوور، کەسێك کە لە شتێك دوور بێ، دووریی لێ بگرێ و حاشای لێ بکات، بەڵام لێرەدا دەڵێ: (البَرَآءُ: مَصْدَرٌ بِوَزْنِ فَعَال، مِثْلُ ظَمَاء وَسَمَاع، يُخْبَرُ بِهِ، وَيُوصَفُ بِهِ)، (بَرَآء)، چاوگە لەسەر کێشی: (فَعَال) وەك (ظَمَاء) واتە: تینوویی، هەروەها (سَمَاع) واتە: گوێبیست بوون، هەواڵیشی پێ دەدرێ و شتیشی پێ وەسف دەکرێ، کە دەفەرموێ: ﴿مِّمَّا تَعْبُدُونَ﴾، (مِمَّا) (مِن) بۆ هەندێکەو (مَا)ش (مَوصُولة)یە، واتە: (مِنَ الَّذِي تَعبُدُون)، لەوەی ئێوە دەیپەرستن، هەرچی بووبێ.

ئـەوەی لێـرەدا جێـی سـەرنجە، ئەوەیـە کـە ئیبراهیـم ﷺ زۆر بـە ڕوون و ڕاشـکاویی و بـێ پێـچ و پەنـا، بێزاریـی و دووریـی خـۆی، دەربڕیـوە لـە پەرسـتراوی بابـی و گەلەکەشـی، یـان لـە پەرسـتراوەکانیان.

٣)- ﴿إِلَّا ٱلَّذِى فَطَرَنِى﴾، جگە لەوەی دایهێناوم، ئەمە شتێکی لە پێشەوە مەزەندە کراوەو بە سیاق دەزانرێ، واتە: (لاَ أَعْبُدُ إلاَّ الَّذِي فَطَرَنِي)، ناپەرستم جگە لەو کەسەی، منی داهێناوە، ئەمە: (إستِثْنَاءٌ مِنْ ﴿مِّمَّا تَعْبُدُونَ﴾، أي مِنَ الَّذِينَ تَعبُدُونَهُم)، ئەمە هەڵاواردنە لەوەی کە دەفەرموێ: ﴿مِّمَّا تَعْبُدُونَ﴾، لەوانەی دەیانپەرستن، واتە: من بێزارم لەوانەی دەیانپەرستن، جگە لە کەسێك کە منی بەدیهێناوە، ئەوە ئەگەر بمانەوێ هەڵاواردنێکی پەیوەست (إستِثنَاء مُتَّصل) بێت، دەشگونجێ بڵێین: هەڵاواردنێکی دابڕاو (إستِثنَاء مُنقَطِع)ە، کە بگوترێ: کەس ناپەرستم جگە لەوەی منی بەدیهێناوە (لاَ أَعْبُدُ إلاَّ الَّذِي فَطَرَنِي)، دەبێ (لاَ أَعْبُدُ) مەزەندە بکرێ، لە پێشیەوە، ئەو کاتە دەبێتە هەڵاواردنێکی

دابڕاو، بەڵام بە پێی مانای پێشیێ بێ: یانی: ئەوانەی دەیانپەرستن، کە لە نێویاندا خوای پەروەردگاریش هەبووە، هەموو ئەوانەی ئێوە دەیانپەرستن، من بێزارییان لێ دەکەم، جگە لەو زاتەی منی وەدیهێناوەو، کە ئەویش هەر لە نێو پەرستراوەکانیاندا بووە، کەواتە: بە پێی ئەو مانایە بێ، هەڵاواردنەکە دەبێتە هەڵاواردنێکی پەیوەست، چونکە ئەوەی کە جیاکراوەتەوەو جیاکراوە (**مُسْتَثْنى**)یەکە، بەشێك دەبێت لە لێجیاکراو (**مُستَثْنَى مِنْهُ**) ەکە، بەڵام ئەگەر جیاکراوە (**مُستَثنى**) بەشێك نەبێت لە لێ جیاکراو (**مُستَثْنَى مِنْهُ**)ەکە، ئەو کاتە دەبێتە هەڵاواردنێکی دابڕاو.

٤)- ﴿ فَإِنَّهُۥ سَيَهۡدِينِ ﴾، بە دڵنیایی ئەو من ڕێنمایی دەکات، یاخود: من ڕاستە ڕێ دەکات، هیدایەت هەم مانای گشتیی هەیە، واتە: ڕێنمایی کردن و ڕێ پێشاندان، هەم مانای تایبەتیی هەیە، واتە: خستنە سەر ڕاستە ڕێ، لێرەشدا هەردووکیان گونجاون، خوا ﷻ هەم ڕێ پێشانی بەندەکانی خۆی دەدات، هەم دەشیانخاتە سەر ڕاستە ڕێ و، وایان لێدەکات ئەو ڕێیە بگرن، دوای ئەوەی ڕێنمایی خوا قبووڵ دەکەن، لەبەرەکەتی قبووڵ کردنی ڕێنمایی خواوە، خوا دەستیشیان دەگرێ و ڕاستە ڕێیان دەکات.

٥)- ﴿ وَجَعَلَهَا كَلِمَةَۢ بَاقِيَةٗ فِي عَقِبِهِۦ ﴾، (ئیبڕاهیم) ئەو (وشەی)ەی کردە وشەیەکی بەردەوام، لە وەچەکەیدا، ڕاناوی (ها) لە: ﴿ وَجَعَلَهَا ﴾دا، دەگونجێ بگەڕێتەوە بۆ وشەی خوا بە یەکگرتن (**كَلِمَةَ التَوحِيدِ**)، کە لە ڕستەکانی پێشێ دەفامرێتەوە، کردی بە وشەیەکی بەردەوام لە وەچەکەیدا، لە نێو ڕۆڵەکانیدا، یاخود (ها) دەگەڕێتەوە بۆ ڕەتکردنەوەی شیرك، یان دەگەڕێتەوە بۆ ئیسلام، واتە: پەیامی ئیسلامی کردە وشەیەکی بەردەوام لە وەچەکەیدا.

﴿ وَجَعَلَهَا ﴾، بکەر (**فاعِل**)ەکەی، دەگونجێ بگەڕێتەوە بۆ خوا ﷻ، وەك هەر کام لە: (**الزَّمَخشَري، وإبْنُ العَرَبِي، والقُرطُبي**)، گوتوویانە: واتە: (**وَجَعَلَ اللهُ هَذِهِ الكَلِمَة، كَلِمةً باقِيَةً فِي عَقِبِهِ**)، خوا ﷻ ئەو وشەیەی ئیبڕاهیم گوتی: کە یەکتایی خوا بوو لە پەرستاندا، یاخود ڕەفزی شیرك بوو، یاخود پەیام و بەرنامەی خوا بوو، کردی بە وشەیەکی بەردەوام لە وەچەکەیداو، ڕایسپاردن ئەوانیش لەسەر ئەو ڕێیە بڕۆن،

دەشـگونجێ بکـەر (**فاعِل**)ەکـەی ئیبراهیـم ﷺ بـێ، هـەروەك هـەر کام لـە: (**فَخرَ الدِّين الـرَّازي، والشَّـوْكاني، وَمُحَمَّـد الطَّاهِـر بِـن عَاشُـور**) و هـی دیکـەش، وایـان گوتـوە.

هەڵبەتـە مانـای دووەمیـان گونجاوتـرە لەگـەڵ سـیاقەکەدا، چونکـە نزیکترین شـت کـە ڕاناوەکـە بـۆی بگەڕێتـەوە، ئیبراهیمـە ﷺ، هەڵبەتـە هەمـوو شـتێك بـە ویسـتی خوایـە، بـەڵام ڕەوتەکـە هەمـووی مـەدح و ستایشـە بـۆ ئیبراهیـم، واتـە: ئیبراهیـم وەچەکـەی خـۆی ڕاسـپارد، کـە ئەوانیـش خـوا بـە یەکگـر (**موحّد**)بـن.

وەك خـوا ﷻ لـە سـوورەتی (**البقـرة**)دا دەفەرمـوێ: ﴿ وَوَصَّىٰ بِهَآ إِبْرَٰهِـۧمُ بَنِيهِ وَيَعْقُوبُ يَٰبَنِيَّ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰ لَكُمُ ٱلدِّينَ فَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٣٢﴾ ﴾، واتــە: ﴿ وَوَصَّىٰ بِهَآ إِبْرَٰهِـۧمُ بَنِيهِ وَيَعْقُوبُ ﴾، هــەم ئیبراهیــم ڕۆڵەکانــی خــۆی ڕاسـپارد، هـەم یەعقووبیـش، چییـان گـوت؟: ﴿ يَٰبَنِيَّ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰ لَكُمُ ٱلدِّينَ فَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٣٢﴾ ﴾، واتـە: ئـەی ڕۆڵەکانـم! خـوا ئاییـن و بەرنامـەی بـۆ هەڵبـژاردوون، ئنجـا بـە ملکەچیـی بـۆ خـوا نەبـێ، مەمـرن، واتـە: بەپێـی ئیسـلام بژیــن، تاکــو لەســەر ئــەو بەرنامەیــەش گیــان بســپێرن، وشــەی (**عَقِــب**) بــە مانــای (**ذُرِيَّـة**)و بــە مانــای (**أولاد**) دێ، واتــە: وەچــەو، ڕۆڵــەکان.

کەواتــە: ئیبراهیــم ﷺ، لەلایەکــەوە بێزاریــی و دووریــی خــۆی لــە بابــی و لــە گەلەکــەی ڕاگەیانــدوە، هەروەهــا لــە پەرســتراوەکانیان و تەنیــا پەرســتنی خــوای، تەبەننیــی کــردوەو ڕاگەیانــدوە، لەلایــەکی دیکــەوە: کارێکیشــی کــردوە، ئەوە بــەردەوام بـێ لـە نێـو ڕۆڵەکانیـدا، لـە نێـو وەچەکەشـیدا، بـۆ ئـەوەی بگەڕێنـەوە بـۆ لای خـوا، واز لــە ڕێچکــەکان و لــە پەرســتراوەکانی دیکــە بێنــن، تەنیــا ڕاســتە شــەقامی خــوا بگـرن و تەنیـا بەندایەتیـی بـۆ خـوا بکـەن.

٦)- ﴿ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴾، بەڵکو بگەڕێنەوە، واتە: ئەوانەی لایانداوە، لە شیرکەوەو لە کوفرەوە، بگەڕێنەوە بۆ تەوحیدو بۆ ئیمان، یاخود بگەڕێنەوە بۆ بەندایەتیی کردن بۆ خواو بۆ خواپەرستیی.

وەك لە سەرەتاوەش گوتمان: ئەمە هەمووی دڵدانەوەیە بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ، كە لەم سوورەتەدا ئەم سێ ئایەتە بۆ ئیبراهیم عليه السلام تەرخانكراون، دواتر یازدە (١١) ئایەت بۆ بەسەرهاتی مووسا عليه السلام لەگەڵ فیرعەونداو، دواتریش نۆ (٩) ئایەت بۆ باس و خواسێك دەربارەی عیسا عليه السلام، ئەو سێ پێغەمبەرە: ئیبراهیم و مووسا و عیسا، هەمان ئەو پەیام و بەرنامەیان هێناوە، كە پێغەمبەری خاتەم هێناویەتی.

كەواتە: ئەی موحەممەد! ئەو پێغەمبەرانە، سەرمەشقی تۆن، ئەوانیش ئەوەتا لەگەڵ نزیكترین كەسانی خۆیاندا، لەگەڵ كۆمەڵگاو گەلەكەی خۆیاندا ڕووبەڕوو بوونەوە، ئیبراهیم لەگەڵ بابی و گەلەكەیداو، مووساش بەرەنگاری فیرعەون و دارو دەستەو شوێنكەوتووانی بۆتەوە، هەروەها عیساش هەمان ئەو خوا بەیەكگرتنەی بە بەنوو ئیسرائیل ڕاگەیاندوە، كە تۆ فەرمانت پێكراوە، كە پێشێ بە گەلەكەی خۆت و، كۆمەڵگایەكەی خۆت، دواتریش هەموو مرۆڤایەتیی ڕابگەیەنی.

## مەسەلەی دووەم:

**بێبڕوایانی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺو، باب و باپیرانیان خوا ﷻ لە نازو نیعمەت و ژیانی دنیا بەهرەمەندی کردوون، کە چی کاتێك قورئانی ڕاست و، پێغەمبەری ڕۆشنیان بۆ نێردراون، قورئانیان بە جادوو داناوەو، خۆزگەشیان خواستوە، قورئان دابەزیبایە سەر پیاوێکی مەزن، لە یەکێك لە دوو شارەکان! (واتە: ئەو پلەی پێغەمبەرایەتییە نەدرابایە موحەممەد ﷺو بە حیساب بە شایستەی ویان نەزانیوە)، بەڵام بێگومان نەك هەر ئەوان بەزەیی خوایان بەدەست نیە، کە لە پێغەمبەرایەتییدا بەرجەستەیە، بگرە ژیانی دنیاو بژیویشیان بەدەست نیە، بەڵکو بە پێی ویستی حەکیمانەی خوا، پلە پلەیی تێدا کراوە تاکو مەداری یەکدی ساز بکەن:**

خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ بَلْ مَتَّعْتُ هَٰٓؤُلَآءِ وَءَابَآءَهُمْ حَتَّىٰ جَآءَهُمُ ٱلْحَقُّ وَرَسُولٌ مُّبِينٌ ﴿٢٩﴾ وَلَمَّا جَآءَهُمُ ٱلْحَقُّ قَالُوا۟ هَٰذَا سِحْرٌ وَإِنَّا بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿٣٠﴾ وَقَالُوا۟ لَوْلَا نُزِّلَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنَ ٱلْقَرْيَتَيْنِ عَظِيمٍ ﴿٣١﴾ أَهُمْ يَقْسِمُونَ رَحْمَتَ رَبِّكَ ۚ نَحْنُ قَسَمْنَا بَيْنَهُم مَّعِيشَتَهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۚ وَرَفَعْنَا بَعْضَهُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَٰتٍ لِّيَتَّخِذَ بَعْضُهُم بَعْضًا سُخْرِيًّا ۗ وَرَحْمَتُ رَبِّكَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ﴿٣٢﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە یازدە برگەدا:

١)- ﴿ بَلْ مَتَّعْتُ هَٰٓؤُلَآءِ وَءَابَآءَهُمْ ﴾، بەڵکو من ئەوانەو باب و باپیرانیانم بەهرەمەند کرد، (**الطَّبَري**) دەڵێ: (**فَلَم أُعَاجِلهُم بِالعقُوبَةِ عَلَى كُفْرِهِم**)، پەلەم نەکرد، لەوەدا کە سزایان بدەم لەسەر کوفرەکەیان، یانی: بە سزادان ئەوانم نەفەوتاند، تاکو کتێبێکم بۆ سەر دابەزاندن و ڕەوانەکراوێکی ڕۆشنم لە نێودا ناردن، کە بەو بەڵگانەی بە بەڵگەیان دێنێتەوە، بۆیان ڕوون دەکاتەوە، کە پێغەمبەری خوایەو، لەوەدا کە دەیڵێ: لەسەر هەقە،

﴿ هَـٰٓؤُلَآءِ ﴾، بە تەئکید مەبەست پێی کۆمەڵگەی پێغەمبەرە ﷺ ﴿ وَءَابَآءَهُمْ ﴾، واتە: خۆیان و پێشینانیان، باب و باپیرانیشیانمان ژیاندو بەهرەمەندمان کردن.

٢)- ﴿ حَتَّىٰ جَآءَهُمُ ٱلْحَقُّ ﴾، تاکو هەقیان بۆ هات، واتە: باب و باپیرانیانمان لە بەین نەبرد، چونکە ئەگەر ئەوان لە بەین چووبان، ئەوانەی ئێستاش پەیدا نەدەبوون لەوان، ئەوانمان ژیاندو بەهرەمەندمان کردن، لە ژیانی دنیا، هەروەها ئەمانەش تاکو هەقیان بۆ هات، کە ئەو هەقەش لە قورئاندا بەرجەستەیە.

٣)- ﴿ وَرَسُولٌ مُّبِينٌ ﴾، پێغەمبەرێکی ڕۆشنیش، واتە: هەر کەسێك تەماشای بکات، دەزانێ ئەوە پێغەمبەری خوایە.

یاخـود: ﴿ مُّبِينٌ ﴾، واتـە: ڕۆشـنکەرەوەیە، واتـە: مەبەسـتەکانی خـۆی و، پەیامەکـەی خـۆی ڕۆشـن دەکاتـەوە.

٤)- ﴿ وَلَمَّا جَآءَهُمُ ٱلْحَقُّ قَالُوا۟ هَـٰذَا سِحْرٌ ﴾، ئنجا کاتێك هەقیان بۆ هات، گوتیان: ئەمە جادوویە.

واتـە: کاتێـك هـەق و پێغەمبەرێکـی ڕۆشـن و ڕۆشـنکەرەوەیان بـۆ هـات، بێبڕوابـوون، کاتێـك هەقیـان بـۆ هـات گوتیـان: ئـەوە جادوویـە، (**الطَّـبَرِي**)[1] کـە ئـەوەی پێشێشـمان لـێ نەقـڵ کـرد، زۆرجـاران ڕوونکردنـەوەو داڕشـتنەکەی لـە هـی هەموویـان ڕوونـترو ئاسـانترو ڕێکـترە، بـە خۆڕاییـش پێـی نەگوتـراوە: (**إمَـامُ المُفَسِّرين**)، پێشـەوای ڕوونکەرەوانـی قورئـان، لـە تەفسـیری ئـەم ڕسـتەیەدا: ﴿ وَلَمَّا جَآءَهُمُ ٱلْحَقُّ قَالُوا۟ هَـٰذَا سِحْرٌ وَإِنَّا بِهِۦ كَـٰفِرُونَ ﴾، دەڵـێ: (**أي: هَـذَا سِـحْرٌ يَسْـحَرُنَا بـهِ، وَلَيْـسَ وَحِـياً مِنَ اللـهِ، وَإنَّـا بـهِ جَاحِـدُونَ، نُنْكِـرُ أَنْ يَكُـونَ هَـذَا مِـنْ عِنْـدِ اللـه**)، گوتیـان: ئەمـە جادوویـە، دەیـەوێ ئێمـەی پـێ جـادوو بـکات و، سروش نیـە لـە خـواوە، بۆیـە ئێمـە نکووڵیـی دەکەیـن لـەوە، کـە لـە لایـەن خـواوە نێردرابـێ.

---

(١) جامع البيان: ج٢٥، ص٦٦.

٥)- ﴿ وَإِنَّا بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴾، ئێمەش پێی بێبڕواین، هەڵبەتە هەموو بێبڕوایەکان کە گوتوویانە: ئێمە بەوە بێبڕواین، واتە: بڕوامان وانیە، ئەوە خوا ناردبێتی، نەك بڵێن: خوا ناردوویەتی و بڕواشی پێ ناکەین، بەڵکو گوتوویانە: پێمان وانیە خوا ناردبی.

٦)- ﴿ وَقَالُواْ لَوۡلَا نُزِّلَ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانُ عَلَىٰ رَجُلٖ مِّنَ ٱلۡقَرۡيَتَيۡنِ عَظِيمٍ ﴾، گوتیان: دەبووایە ئەم قورئانە، بۆ سەر پیاوێکی مەزن لە دوو شارەکەدا دابەزیبایە، لە هۆی هاتنە خوارەوەکەشی دا باسمان کرد، بۆیە خوا ﷻ بە صیغەی کۆ فەرموویەتی: ﴿ وَقَالُواْ ﴾، لەبەر ئەوەی ئەگەر وەلیدی کوڕی موغیرەش وایگوتبێ، بەڵام تەعبیری کردوە، لە کۆی دەوروبەرەکەی و قەومەکەی.

﴿ لَوۡلَا ﴾: (حَـرْفُ تَحْضِيـضٍ، اسْـتُعْمِلَ هُنَـا فِـي مَعْنَـى إِبْطَـالِ كَونِـهِ رَسـولاً، لأَنَّ التَحْضِيـضَ عَـلَى تحصيـل مَـا هُـوَ مَقْطُـوعٌ بِانْتِفَـاءِ حُصُولِـهِ، يَسْـتَلْزِمُ الجَـزْمَ بِانتِفَائِـهِ)، ﴿ لَوۡلَا ﴾، لێـرەدا پیتـی هاندانـە، بـەڵام بەکارهێـنراوە، لـە مانـای هەڵوەشـانەوەی ئـەوەدا، کـە ئـەو (موحەممـەد) ڕەوانەکـراو بـێ لـە خـواوە، چونکـە هانـدان بـۆ پەیداکردنـی شـتێك، کـە دڵنیـای پەیـدا نابـێ، ئـەوە دەخـوازێ کـە دڵنیـای ئـەو شـتە نیـە، یەکێـك بـە یەکێـك دەڵـێ: گێزەرێکـم لێـرە بـۆ هەڵقەنـە، یـان ئـاوم بـۆ لـەو بـەردە پەیـدا بکـە، یـان: دەبووایـە گێزەرێکـت لێـرە هەڵقەندبایـە، یـان دەبووایـە وابکـەی، کـە دەزانـێ وانیـە، ئـەوە یـانی: نکوولیـی لـەوە دەکـەم، ئـەوە هەبـێ، یـان بتوانـی وابکـەی.

کـە لێـرەدا دەڵێـن: ﴿ وَقَالُواْ لَوۡلَا نُزِّلَ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانُ عَلَىٰ رَجُلٖ مِّنَ ٱلۡقَرۡيَتَيۡنِ عَظِيمٍ ﴾، کـە دەشـزانن بـەو جـۆرە لەسـەر بابایـەکی وا دانەبەزیـوە، مەبەسـتیان ئەوەیـە کـە ڕاسـت نیـە ئـەو قورئانـە، لـە خـواوە دەبەزێترابـێ و هاتبـێ، ئەگـەر لەلایـەن خـواوە بووایـە، دەبووایـە دابەزێتـە سـەر پیاوێکـی مـەزن، لـە یەکێـك لـە دوو شـارەکان، ئنجـا کـە دانەبەزیوەتـە سـەر وان، کەواتـە: دانەبەزیـوە بـۆ سـەر تـۆش ئـەی موحەممـەد! ﷺ مەبەسـتیان ئـەوە بـووە.

پێشتر باسمان کرد، کە ئەو دوو پیاوانە کێ بوون، یاخود ئەو پیاوە کێ بووە، لە دوو شارەکاندا، بە نسبەت دوو شارەکانەوە: (**التَّعرِيفُ فِي القَريَتَيْنِ لِلعَهْدِ**)، ناساندن لە (**القَريَتَين**)دا، دوو شارە گەورەکان، بۆ عەهدە، واتە: دوو شارەکە کە زانراون، زۆربەی توێژەرەوان دەڵێن: مەبەست پێیان مەککەو تائیف بووە، کە پیاوەکەیانیان بە مەزن داناوە، ﴿عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنَ ٱلْقَرْيَتَيْنِ عَظِيمٍ﴾، پیاوێکی مەزن لە یەکێك لە دوو شارەکاندا، دیارە ئەو کاتە پیاو مەزنی مەککە، بەڕای هەندێ لە توێژەران، (**الوَلِيدُ بْنُ المُغِيْرَة**)بووە، هەندێکیش گوتوویانە: نەخێر بەڵکو (**عُتبَة إبن رَبِيعَة**) بووە، هەروەها پیاوە مەزنەکەی تائیف کە ئەوان مەبەستیان بووە، (**كِنَانَةُ إبن عَبدُ يالَيل**) بووە، هەندێکیش گوتوویانە: (**عُروَةُ بن مَسعود الثَّقفي**) بووە.

ڕایەکی دیکەش ئەوەیە، کە مەبەستیان پیاوێکی دیارییکراو، یان دوو پیاوی دیارییکراو نەبوون، بەڵکو بە گشتیی گوتوویانە: دەبوایە قورئان دابەزێتە سەر پیاوێکی مەزن لە نێو تائیف دا، یاخود لە نێو مەککەدا، کە بەو پێوەرەی ئەوان، هەم مەککە و هەم تائیفیش، پڕبوون لەو جۆرە پیاوانەی ئەوان بە مەزنیان داناون!

ئەوان پێیان وابووە، ئەوەی شایستەیی لە مرۆڤدا دێنێتە دی، بۆ پێغەمبەرایەتیی ئەوەیە کە مەزن بێ، ئەو مەزنییەی ئەوانیش مەبەستیان بووە، هەبوونی سەروەت و سامان بووە، دەستڕۆیشتوویی و دەور قەڵەباڵغ بوون بووە، بە خزم و کەس و قەوم، خاوەنی (**مَحاسِنُ التأويل**)، (**جَمال الدين القاسمي**)[1]، لە تەفسیرەکەیدا دەڵێ:

(**وَلَمْ يَعْلَمُوا أَنَّهَا رُتْبَةٌ رُوحَانِيَّةٌ، تَسْتَدْعِي عِظَمَ النَّفْس بِالتَّحَلِّي بِالفَضَائِلِ وَالكَمَالَاتِ القُدْسِيَّة، لاَ التَزخرفَ بِالزَّخَارِفِ الدُّنيَوِيَّة**)، واتە: ئەوانە نەیانزانیوە کە

---

(١) ج٨، ص٣٣٧.

پێغەمبەرایەتیی پلەیەکی ڕووحانیی و مەعنەوییەو ئەوە دەخوازێ ئەو ڕووحەو، ئەو نەفسە مەزن و ڕازێنرانەوە بێ بە سیفەتە بەرزەکان و تەواوییە پاکییەکان، نەك خۆڕازاندنەوە بە زرق و برقی دنیایی.

بەرگ و پۆشاکی وابێ، وڵاخی سوارییەکەی - ئەو کاتە - وابێ و، خانووبەرەی وابێ، سەروەت و سامانی وابێ، خزم و خەڵکی وابێ، ئەوانە شتی ڕووکەشیی و ڕواڵەتیی، دنیایین و زوو تێپەڕن، ئەوەی دەمێنێتەوە، سیفەتە مەعنەوییەکانن.

خوا ﷻ لە وەڵامیاندا دەفەرموێ:

٧)- ﴿ أَهُمْ يَقْسِمُونَ رَحْمَتَ رَبِّكَ ﴾، ئایا ئەوان بەزەیی پەروەردگارت دابەش دەکەن؟ هەمزە (أ)ی سەر: ﴿ أَهُمْ ﴾، (للإستِفهامِ الإنكاريّ)، پرسیارکردنی نکووڵیلێکەرانەیە، واتە: بێگومان ئەوان بەزەیی پەروەردگارت دابەش ناکەن، مەبەست لە بەزەیی پەروەردگاریش پلەی پێغەمبەرایەتیی بووە، چونکە بەزەیی خوا ﷻ لە ژیانی بەشەردا، وەك لە پلەی پێغەمبەرایەتییدا بەرجەستە بووە، لە هیچ شتێکی دیکەدا بەرجەستە نەبووە، لەبەر ئەوەی بەبێ پێغەمبەرایەتیی، مرۆڤایەتیی لەسەر هەموو نیعمەتەکانی دیکە، کە خوا پێی داون، قەرزار دەبێتەوە، بە شێوەیەك مامەڵە لەگەڵ نیعمەتەکانی خوادا دەکات، کە لە جیاتی لێیان بەهرەمەند بێ، لێیان زەرەرمەند دەبێ، ئەگەر دەسەڵاتە، ئەگەر سەروەت و سامانە، ئەگەر زانیارییە، ئەگەر عەقڵە، ئەگەر لەشساغییە، هەرچی هەیە، لە ڕاستیدا پێغەمبەرایەتیی و وەحیی، ڕووحێکە بە بەر ژیانی مرۆڤدا دەکرێ، وەك خوا ﷻ لە کۆتایی سوورەتی (الشّورى)دا دەفەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا ﴿٥٢﴾ ﴾.

٨)- ﴿ نَحْنُ قَسَمْنَا بَيْنَهُم مَّعِيشَتَهُمْ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ﴾، (نەك هەر دابەشکردنی بەزەیی خوا بە دەست ئەوان نیە)، بەڵکو ئێمە بژیویانمان لە نێوياندا (لە ژیانی دنیادا) دابەشکردوە، ﴿ مَّعِيشَتَهُمْ ﴾، خوێندراویشەتەوە: (مَعَايِشَهُم)، (المَعيشَةُ: مَا يُتَعَيَّشُ بِهِ)، (معيشة) شتێکە مرۆڤ پێی بژی، واتە: بژیو، ڕۆزیی، ئێمە نەك هەر دابەشکردنی بەزەیی خۆمانمان، نەداوەتە

دەست وان، بەڵکو دابەشکردنی بژیوێ، کە پێی دەژین لە ژیانی دنیادا، ئەوەش بە دەست ئێمەیە، بەپێی سیستمی ئێمەو، بە ویستی ئێمەیە، زانایان گوتوویانە: ئەمە هۆکار دۆزییە بۆ نکووڵیی و ئەو لابردنەی کە لە نکووڵییەکە وەردەگیرێ، بەڵگە هێنانەوەیە لەسەری، واتە: ئێمە وەك چۆن بژیویانمان دابەشکردوە، بۆیە ئەوان لە کاروبارياندا، بەو شێوەیە کە ئێمە سیستممان داناوە، بەڕێوە دەچن، لە بواری ژیان و گوزەرانیاندا، بە هەمان شێوە لە دابەشکردنی بەزەیی خۆشمان و سپاردنی ئەرکی پێغەمبەرایەتییشدا، بە هەمان شێوە، ئەوەش هەر بەدەستی ئێمەیە، بەدەست ئەوانەوە نیە.

کەواتـە: هـەر بـەوە کـە تەماشـا دەکـەن، هۆکارەکانـی دابـەش کرانـی بژیـو، لـە ژیانـی دنیایانـدا بەدەسـت خوایـە، دەبووایـە بزانـن ئـەو پلـەی پێغەمبەرایەتییـەش، بەپێـی بۆچوونـی ئـەوان و بەپێـی خۆزگـەی ئـەوان نیـە، بەپێـی پێوەرەکانـی ئەوانیـش نیـە، بەڵکـو بەپێـی پێـوەری خوایـە ﷻ کـە جیایـە لـە پێـوەری وان، پێـوەری ئـەوان بریتیـە لــە ســەروەت و ســامان، دەسترۆیشــتوویەتیی و دەور قەڵەباڵــغ بــوون و، هەمـوو ئـەو شـتانە کـە بەزۆریـی وایـە، مرۆڤـەکان لەسـەر ئـەو شـتانە قـەرزدار دەبنـەوە، ئەگـەر بـە شـێوەیەك مامەڵەیـان پـێ نەکـەن، کـە جێـگای ڕەزامەندیـی خـوا بـێ، مـرۆڤ لەسـەر قەڵەباڵغیـی دەوروبـەری و، لەسـەر سـەروەت و سـامانەکەی و، لەسـەر ئـەو نـازو نیعمەتانـەی دیکـە، کـە خـوا ﷻ پێـی داون، مـادام ئیمانیـان لەگەڵـدا نەبـێ، لەسـەریان قـەرزدار دەبێتـەوەو دەبنـە مایـەی شـەرمەزاریی.

بـەڵام پێـوەری خـوا ﷻ ئەوەیـە، کـە ئـەو مرۆڤـە عەقڵـی چەنـدە، مەعدەنەکـەی چەنــد پاکــەو، ڕەوشــتەکەی چەنــد بــەرزەو، ئاکارەکانــی و، دیــوی مەعنەویــی و ڕووحیـی، چۆنـە؟ کـە مـرۆڤ بـە ڕووح مرۆڤـە، نـەك بـە جەسـتەو بـە سـەروەت و سـامان و بـەو قەڵەباڵغییـەی لـە دەوریەتـی.

٩)- ﴿ وَرَفَعۡنَا بَعۡضَهُمۡ فَوۡقَ بَعۡضٖ دَرَجَٰتٖ ﴾، ئێمە هەندێکیانمان بەسەر هەندێکیان دا بە چەند پلە بەرز کردۆتەوە.

١٠)- ﴿لِّيَتَّخِذَ بَعْضُهُم بَعْضًا سُخْرِيًّا﴾، تاکو هەندێکیان هەندێکیان بە ئیشپێکەر بگرن، (سُخْرِيًّا أي: مُسَخَّرًا، وَاللامُ لِلتَّعْلِيلِ، فَالكُلُّ مُسْتَعْمَلٌ لِغَيْرِه)، بۆ ئەوەی هەندێکیان هەندێکیان بە کارپێکراو بگرن، (سُخْرِيٌّ): (مُسَخَّر)، کارپێکراو، بەکارهێنراو، لە ڕاستییدا، لە کۆمەڵگای مرۆڤایەتییدا، هەموو چین و توێژەکان یەکدی بەکاردەهێنن.

﴿سُخْرِيًّا﴾، خوێندراویشـەتەوە: (سِخْرِيًّا)، هەردووکیـان هـەر بەمانـای کارپێکراو دێـن، هەندێکیـش گوتوویانـە: (سِخرِياً) بـە مانـای گاڵتەپێکـراو، نـەك کارپێکـراو، بـەڵام ئـەو مانایـە بێهێـزەو، لەگـەڵ سـیاقی ئایەتەکانیشـدا ناگونجـێ.

١١)- ﴿وَرَحْمَتُ رَبِّكَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ﴾، بەزەیی پەروەردگاریشت باشترە لەوەی، پەزمەندەی دەکەن و، کۆی دەکەنەوە.

بەزەیـی پـەروەردگارت، دەگونجـێ مەبەسـت پێـی پێغەمبەرایەتیـی بـێ و، دەگونجـێ مەبەسـت پێـی بەهەشـت بـێ و، دەگونجـێ مەبەسـت پێـی ئیـمان و تاعـەت بـێ، ئـەوە باشـترە لـەوەی کـۆی دەکەنـەوە سـەر یـەك.

ئـەم ئایەتـە موبارەکـە باسـی حیکمـەتی ئـەو بەرزیـی و نزمییـە دەکات کـە لـە کۆمەڵـگای بەشـەردا هەیـەو، هـەر کۆمەڵگایـەك ئـەو بەرزیـی و نزمییـەی تێدایـە، بەرزیـی و نزمییەکـەش مـەرج نیـە، تەنهـا لـە ڕووی سـەروەت و سـامانەوە بـێ، بەڵکـو لـە ڕووی عەقـڵ و هۆشـەوەیە، لـە ڕووی هێـزی جەسـتەوەیە، لـە ڕووی ڕەوشـت و ئاکارەوەیـە، خـوا ﷻ وایدانـاوە، هەنـدێ کـەس هـەر بـە زگـماك، بـە حەوسـەڵەترە لـەوی دیکـەو، یەکێـك هێدیـی و مەندتـرەو، یەکێـك زوو تـوورە دەبـێ، یەکێـك درەنـگ تـوورە دەبـێ، هـەر بـە فیتـرەت هەندێکیـان هۆشـیان تیژتـرەو، هەندێکیـان هۆشـیان کولـە، هەندێکیـان زمـان پاراوتـرن و، ڕەوانبێژتـرن، هەندێکیـان هێـزی جەسـتەیان زیاتـرە، هەندێکیـان لـە ڕووی کۆمەڵایەتییـەوە توانایـی تێکەڵیـی و گونجاوییـان لەگـەڵ خەڵکـدا زیاتـرە، هەندێکیـان ڕەوشـت و ئاکاریـان جوانـترەو زیاتـر توانایـان هەیـە، ڕاسـتبێژ بـن و، ئەمیـن بـن و، دادگـەر بـن و، بـە ڕەحـم بـن، هەندێکیـان کەمـتر ئـەو توانایەیـان هەیـە.

هەڵبەتـە مـرۆڤ هەمـووی خـوای پـەروەردگار، وای خوڵقانـدوە، بتوانـێ شـتە چاکـەکان وەدەسـت بێنـێ، بـەڵام هەرچـۆن بـێ، بەرزیـی و نزمیـی هـەر هەیـە، ئنجـا لـە ئەنجامـی ئـەو بەرزیـی و نزمییـەدا، چ لـە سـیفەتە مەعنەوییـەکان، چ لـە سـیفەتە جەسـتەییەکاندا، لـە ئەنجامـی ئـەوەدا، کاروبـارەکان جۆراوجـۆر دەبـن، ئـەو کاروبارانـەی کۆمەڵـگا دابـەش دەبـن بەسـەر خەڵکـداو، دابـەش بوونـی کارەکانیـش بەسـەر خەڵکـدا، دەبێتـە هـۆی ئـەوەی هـەر کام لـە توێژەکانـی کۆمەڵـگا، بەڵکـو تاکەکانـی کۆمەڵـگا، ئـەوی دیکـە بەکاربێنـێ، بـۆ وێنـە: پزیشـك خزمەتـی نەخۆشـەکان دەکات، بـەڵام نەخۆشـەکانیش خزمەتـی پزیشـك دەکـەن، هەروەهـا وەسـتاو کرێـکار پێکـەوە خزمەتـی یەکدیـی دەکـەن، هەروەهـا کاربەدەسـتان لەگـەڵ هاووڵاتییـان، کاربەدەسـتان خزمەتـی هاووڵاتییـان دەکـەن، کاروباریـان بـۆ رادەپەڕێنـن، هاووڵاتییانیـش خزمەتـی کاربەدەسـتان دەکـەن، بـە قسـەیان دەکـەن و، فەرمانبەرییـان دەکـەن، هەروەهـا دەوڵەمەنـدو نـەدار، دەوڵەمەنـد خزمەتـی نـەدار دەکات، یـان فرۆشـیار خزمەتـی کڕیـار دەکات، هەروەهـا هەمـوو توێژەکانـی کۆمەڵـگا بـەو شـێوەیەن، ئەگـەر ورد لێکـی بدەینـەوە، هـەر کامێکیـان لـە خزمـەت ئـەوی دیکەدایـە.

هەڵبەتـە ئـەوە لـە حاڵەتێکـی ئاسـایی و سروشـتیی کۆمەڵـگادا، بـەڵام کاتێـك کـە هەندێـك لـە کۆمەڵـگا خۆیـان بەسـەر خەڵکـدا دەسـەپێنن و، سـتەم لەوانـی دیکـە دەکـەن، ئـەوە حاڵەتێکـی ناسرووشـتیی و نائاسـاییە، شـەریعەتی خـواو پێغەمبـەران هاتـوون، ئـەم حاڵەتـە ناسرووشـتیی و نائاسـاییەی کۆمەڵـگا بگـۆڕن، کـە هەندێـك خۆیـان بسـەپێنن بەسـەر کۆمەڵگادا، لـە ڕووی سیاسـییەوە، کـە بـە شـێوەی میزاجیـی و، بـە شـێوەی بنەماڵەیـی و، بـە شـێوەی میراتیـی و، بـە شـێوەی خۆسـەپاندن حوکمڕانیـی بکـەن، هەروەهـا سـەروەت و سـامان قـۆرخ بکـەن، بـۆ خۆیـان و خـزم و دەوروبەریـان، ئـەوە حاڵەتێکـی نائاساییەو، دەبـێ بگـۆڕدرێ، ئەگەرنا لە ڕاستییدا کە دەفەرمـوێ: ﴿لِّيَتَّخِذَ بَعۡضُهُم بَعۡضٗا سُخۡرِيّٗا﴾، بـۆ ئـەوەی هەندێکیـان هەندێکیان

بەكاربێنن، نەیفەرمووە: هەندێكیان ئەوانی دیكە، بەڵكو فەرموویەتی: هەندێكیان هەندێكیان، وەك چۆن لە مەسەلەی پیاوو ئافرەتدا، خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ﴿٣٤﴾ ﴾النّساء، چونكە وەك پێشتریش باسمان كرد، پیاو هەندێ سیفەتی تێدان، لە ئافرەتدا نین و، ئافرەت هەندێ سیفەتی تێدان، لە پیاودا نین.

كەواتە: هەر كامێكیان فەزڵ و زێدەییەكی هەیە، بەسەر ئەوی دیكەدا، نەك بە ڕەهایی پیاو زێدەیی هەبێ بەسەر ئافرەتدا، یان ئافرەت زێدەیی هەبێ بەسەر پیاودا، بەڵكو پیاو هەندێ سیفەتی هەن:

هێزی جەستەو، هۆشێكی بەهێزترو، غیرەت و جورئەتێكی زیاتر، جەستەیەكی ماسوولكەیی و، دەنگێكی گڕ، ئافرەتیش لە بەرانبەردا، ڕەحم و سۆزێكی زیاترو، جەستەیەكی نەرمترو، دەنگێكی بە سۆزو ناسكتر، هەر كامێكیان خاڵی بەهێزی خۆی هەیە، هەر كامێكیان زێدەیی هەیە بەسەر ئەوی دیكەدا، هەر كامێكیان شتێكی هەیە، ئەوی دیكە نیەتی، یاخود بەو شێوەیەو بەو ئەندازەیە نیەتی، ئنجا لێرەش بە هەمان شێوە كە دەفەرموێ: ﴿ لِّيَتَّخِذَ بَعْضُهُم بَعْضًا سُخْرِيًّا ﴾، بۆیە هەندێكیانمان بە چەندان پلە، بەسەر هەندێكیاندا بەرز كردوونەوە، تاكو هەندێكیان هەندێكیان بەكاربێنن.

## مەسەلەی سێیەم:

**خستنەڕووی کەم بایەخیی ژیانی دنیا لە ڕووە ماددییەکەیەوە، بەوە کە ئەگەر لەبەر یەکدەنگ نەبوونی خەڵك نەبووایە لەسەر کوفر، خوا ﷻ سەربان و دەرگاو پەیژەو تەختەکانی بێبڕوایانیشی دەکردنە زیوو زێڕ، چونکە ژیانی دنیا بەهرەیەکی کەمەو، مەنزڵگای دواڕۆژیش لە گرەوی پارێزکاران دایە:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْلَآ أَن يَكُونَ ٱلنَّاسُ أُمَّةً وَٰحِدَةً لَّجَعَلْنَا لِمَن يَكْفُرُ بِٱلرَّحْمَٰنِ لِبُيُوتِهِمْ سُقُفًا مِّن فِضَّةٍ وَمَعَارِجَ عَلَيْهَا يَظْهَرُونَ ﴿٣٣﴾ وَلِبُيُوتِهِمْ أَبْوَٰبًا وَسُرُرًا عَلَيْهَا يَتَّكِـُٔونَ ﴿٣٤﴾ وَزُخْرُفًا ۚ وَإِن كُلُّ ذَٰلِكَ لَمَّا مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۚ وَٱلْـَٔاخِرَةُ عِندَ رَبِّكَ لِلْمُتَّقِينَ ﴿٣٥﴾ ﴾:

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:

١)- ﴿ وَلَوْلَآ أَن يَكُونَ ٱلنَّاسُ أُمَّةً وَٰحِدَةً ﴾، ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە، خەڵك ببنە یەك كۆمەڵ، (الطَّبَري)[1] لە تەفسیرەكەی خۆیدا، دەڵێ: **(وَلَوْلاَ أَنْ يَكُونَ النَّاسُ أُمَّةً وَاحِدَةً عَلَى الكُفْرِ، فَيَصِيرَ جَمِيعُهُم كُفَّاراً، لَجَعَلْتُ لِلكُفَّارِ لِبُيُوتِهِم سُقُفَاً مِنْ فِضَّة)**، ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە، خەڵك ببێتە یەك كۆمەڵ لە كوفرداو، هەموویان ببنە بێبڕوا، ئەوانەی بێبڕوان بۆ خانووەكانیان، سەربانی زیومان بۆ دەڕەخساندن.

٢)- ﴿ لَّجَعَلْنَا لِمَن يَكْفُرُ بِٱلرَّحْمَٰنِ لِبُيُوتِهِمْ سُقُفًا مِّن فِضَّةٍ ﴾، بۆ ئەوانەی بێبڕوان بە (خوای) بە بەزەیی سەربانە زیوییەكانمان بۆ دەڕەخساندن.

(سُقُفاً مِن فِضَّة)، (سُقُف) كۆیە، (سَقف) تاكەكەیەتی، هەروەك بە (سَقف) یش خوێندراوەتەوە: ﴿ لِبُيُوتِهِمْ سُقُفًا مِّن فِضَّةٍ ﴾، (سَقف) یان (سُقُف) (أَعَالِي

---

[1] **جامع البيان: ج٢٥، ص٧٠.**

**بُيوتِهِـم وَهـيَ السُّـطُوحُ**)، سـەرەوەی خانووەکانیـان، بـە کوردیـی دەڵێیـن: سـەربان، ئەوەمـان بـۆ دەکـردن بـە زیـو.

٣)- ﴿ وَمَعَارِجَ عَلَيْهَا يَظْهَرُونَ ﴾، پەیژەی زیویشمان بۆ دەڕەخساندن، کە پێیاندا سەربکەون، پەیژەو قادرمەکانیشیانمان بۆ دەکردن بە زیو، (**مَعَارِج**) کۆی (**مِعرَاج**) یان (**مَعْرَج**)ە، واتە: پەیژە، (**مَعَارِج أي: مَرَاقِي جَمْع مِرْقَاة**)، پەیژەکان، پەیژە، هەروەها (**دَرَج**)یشی پێ دەڵێن، ﴿ عَلَيْهَا يَظْهَرُونَ ﴾، (**عَلَيهَا يَعْلون، يَصْعَدُون**)، بەو پەیژانەدا سەردەکەوتن بۆ سەرەوەی خانووەکانیان، یاخود بە قاتەکاندا.

٤)- ﴿ وَلِبُيُوتِهِمْ أَبْوَابًا ﴾، هەروەها بۆ ماڵەکانیان دەرگامان بۆ دەڕەخساندن، (دیسان لە زیو) چونکە پێشێ فەرموویەتی: (**مِنْ فِضَّةٍ**)، کەواتە: یانی دەرگایەکانیشمان بۆ دەکردن بە زیو.

٥)- ﴿ وَسُرُرًا عَلَيْهَا يَتَّكِئُونَ ﴾، هەروەها تەختانێك (لە زیو) کە لەسەریان پاڵدەدەنەوە، (**وَسُرُراً مِنْ فِضَّةٍ عَلَيْهَا يَتَّكِئُون**)، (**سُرُر**) کۆی (**سَرِير**)ە، (**سَرِير**) بە مانای تەخت دێ، کە مرۆڤ لەسەری ڕادەکشێ، یان لەسەری دەخەوێ و، یان لەسەری شاندا دەدات، ﴿ يَتَّكِئُونَ ﴾، (**التَوَكّؤُ وَالإِتِّكَاءُ: التَحامُلُ عَلَى الشَّيء**)، ئەوەیە ئینسان پاڵ بە شتێکەوە بدات، سەنگ بداتە سەر شتێك، واتە: شانی لەسەردا بدات.

٦)- ﴿ وَزُخْرُفًا ﴾، هەورەها زێڕیشمان بۆ دەڕەخساندن، کەل و پەلەکانیانمان هەموو بۆ دەکردن بە زیو، سەربان و دەرگاو پەیژەو تەخت و قەنەفەکانمان وادەکرد، کە بتوانن لە زیو دروستیان بکەن، ئەو کاتە زێڕو زیو، دوو کانزای زۆر بە نرخ بوون و، ئێستاش زۆر بە نرخن، بەڵام ئەو کاتە نرخ و بەهایەکەیان لێك نزیك بووە، هەروەها زێڕی زۆریشمان بۆ دەڕەخساندن، وەك لە سوورەتی (**الإسرَاء**) لە ئایەتی ژمارە (٩٣)دا، دەفەرموێ: ﴿ أَوْ يَكُونَ لَكَ بَيْتٌ مِّن زُخْرُفٍ ﴿٩٣﴾ ﴾، یان ماڵێکت هەبێ، خانووێکت هەبێ، لە زێڕ (**زُخرُف**)، بەڵام ئەوە لەو سیاقەدا، ئەگەرنا وشەی (**زُخرُف**)، بە مانای زێڕیش هاتووە، بە مانای ڕازاوەییش هاتووە، بە مانای نەخش و نیگاریش هاتووە، بە مانای کەل و پەلی نایابیش هاتوە.

٧)- ﴿وَإِن كُلُّ ذَٰلِكَ لَمَّا مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾، ئەمەش هەمووی تەنیا ڕابواردنێکی کەمی ژیانی دنیایە، ﴿مَتَٰعُ﴾، واتە: بەهرە وەرگرتنێکی کەم، هەروەها خوێندراویشەتەوە: (وَإِنْ كُلُّ ذَٰلِكَ لَما مَتَاعُ الحَيَاةِ الدُّنيَا)، ئنجا ئەگەر (لَمَا) بێ، ئەو کاتە (ل) بۆ جەختکردنەوەیەو، (مَا)یەکە بە مانای (إنْ)ە، (إن)ی (مُخَفَّفَة) لە (مُثَقَّلَة) بۆ تەئکیدەو (ل) کە ئەو (إنْ)ە، کە بۆ جەختکردنەوەیە لە (إن)ی (شَرْطِيَّة) جیا دەکاتەوە، یانی: هەر کامێك لەمانە بە تەئکید تەنیا ڕابواردنی کەمی ژیانی دنیایە، بەڵام ئەگەر بە (إنَّ) بخوێنرێتەوە: (وَإِنَّ كُلُّ ذَٰلِكَ لما مَتَاعُ الحَيَاةِ الدُّنيَا)، یانی: بە دڵنیایی ئەوە هەمووی تەنیا ڕابواردنێکی کەمی ژیانی دنیایە، واتە: ئەگەر (لَمَا) بێ، ئەو کاتە زیاد کراوە بۆ تەئکید، واتە: (وَإِنْ كُلُّ ذَٰلِكَ لَمَتَاعُ الحَيَاةِ الدُّنيَا).

٨)- ﴿وَٱلْءَاخِرَةُ عِندَ رَبِّكَ لِلْمُتَّقِينَ﴾، دوارۆژیش لە لای پەروەردگارت بۆ پارێزکارانە، یانی: مەنزڵگای دوارۆژ، چونکە (الآخِرَة) سیفەتی مەوصووفێکی قرتێنراوە، واتە: مەنزڵگای دوارۆژ لە لای پەروەردگارت، تەنیا بۆ پارێزکارانە، واتە: ئەو بەهەشتە تەنیا لە گرەوی ئیمانداران دایە.

خـوا ﷻ باسـی هەڵوێسـتی بێبڕوایـان دەکات، کـە چـۆن پێشـنیاریان کـردوە، یـان خۆزگەیـان خواسـتوە، قورئـان بـۆ سـەر پیاوێکـی مـەزن، لەسـەر یەکێـك لـە دوو شـارەکان دابەزیبایـە، پیـاوی مەزنیـش مەبەسـتیان پێـی پیاوێکـی سـامانداروو دەسترۆیشـتوو و دەور قەڵەباڵـغ بـووە، ئنجـا خـوا ﷻ بـەو بۆنەیـەوە ئـەو ڕاسـتییەی ڕاگەیانـد، کـە ئەگـەر لەبـەر ئـەوە نەبووایـە خەڵـك هەمـووی لەسـەر کوفـر کۆببنەوە، ئەوانـەی بێبـڕوان بـە خـوای بـە بەزەیـی، وای بۆ دەکـردن، کـە سـەربانی خانووەکانیان زیـو بـێ، هەروەهـا پەیـژەکان کـە پێیانـدا سـەردەکەون بـۆ سـەر بـان، زیـو بـن، هەروەهـا دەرگاکانیـان زیـو بـن، ئـەو تەخـت و قەنەفانـەی لەسـەریان پشـوو دەدەن و، شـان دادەدەن و پـاڵ دەدەنـەوە زیـو بـن، هەروەهـا زێـڕو زەمبەرێکـی زۆر، یاخـود ڕازاوەییەکـی زۆریـان هەبـێ.

کەواتـــــە:

﴿وَإِن كُلُّ ذَٰلِكَ لَمَّا مَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا﴾، واتـە: (مَا كُلُّ ذَلِكَ إلاَّ مَتَـاعُ الحَيَـاةِ الدُّنيـا)، (إنْ) لێـرەدا بـە مانـای (مَا)یـە بـۆ لابـردن (نفـي)ە، (لَـمَّا)ش، بـە مانـای (إلاَّ) یـە، واتـە: هیـچ کام لـەوە نیـە، مەگـەر ڕابواردنـی کەمـی ژیانـی دنیـا بـێ، بـەڵام ئەمـە بەجـۆری دیکـەش خوێندراوەتـەوە: (وَإنَّ كُلَّ ذَلِـكَ لَـما مَتَـاعُ الحَيَـاةِ الدُّنيـا)، (إنَّ) بـۆ تەئکیـد، یـانی: بـە دڵنیایـی هەمـوو ئـەوەی باسـکرا، (لَـمَا مَتَـاعُ الحَيَـاةِ الدُّنيـا)، (ل) لێـرەدا بـۆ تەئکیـدە، (مَا)یەکـەش زیـاد کـراوە، بـۆ جەختکردنـەوە، واتـە: (وَإنَّ كُلَّ ذَلِـكَ لَـمَتَاعُ الحَيَـاةِ الدُّنيـا)، کەواتـە: هـەم (إنَّ)، هـەم (ل)ەکـەش و، هـەم (ما)یەکـەش هـەر سـێکیان بـۆ جەختکردنـەوەن.

﴿وَٱلۡأٓخِرَةُ عِندَ رَبِّكَ لِلۡمُتَّقِينَ ﴿٣٥﴾﴾، مەنزڵـگای کۆتایـی لە لای پەروەردگارت بـۆ پارێزکارانـە، وشـەی (أخِـرَة)، واتـە: کۆتایـی، بـەڵام ئەمـە بـە سیاق دەزانـرێ و، لـە هەنـدێ شـوێنی دیکەشـدا خـوا ﷻ وەصـف کراوەکـەی هێنـاوە، ﴿وَإِنَّ ٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَ ﴿٦٤﴾﴾العَنكَبُوت، (الـدار الآخـرة: المَثُوبَـةَ الأَخِـرَة)، پاداشـتی ڕۆژی دوایـی، یـان مەنزڵـگای ڕۆژی دوایـی، لـە لای پەروەردگارتـە، بـەڵام بـۆ پارێـزکاران تەرخانکـراوە.

## شەش کورتە سەرنج لە بارەی دنیا و دواڕۆژەوە:

١- لەو بارەوە قسەیەك لە حەسەنی بەصرِییەوە هاتوە، لە باسی ئەم ئایەتە موبارەکەدا، کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ئەگەر خەڵك هەموویان لەسەر کوفر کۆ نەبووبانەوە، ئەوانەی بێبڕوا دەبوون بەرانبەر خوای بە بەزەیی، هەموو دەرو دیوارو خانووبەرەو دەرگاو پەنجەرەمان بۆ دەکردن بە زێڕو زیو، حەسەنی بەصرِیی گوتوویەتی: (لَوْلَا أَنْ يَكُونَ النَّاسُ كُفَّاراً أَجْمَعُونَ، يَمِيلُونَ إِلَى الدُّنْيَا، لَجَعَلَ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى الَّذِي قَالَ، ثُمَّ قَالَ: وَاللَّهِ لَقَدْ مَالَتِ الدُّنْيَا بِأَكْثَرِ أَهْلِهَا، وَمَا فَعَلَ ذَلِكَ، فَكَيْفَ لَوْ فَعَلَهُ!)[١]، واتە: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە، خەڵك هەمووی بێبڕوا دەبن، تێکڕایان، بە لای دنیادا بشکێنەوە، خوا (تَبَارَكَ وَتَعَالَى) ئەوەی فەرموویەتی، ئەنجامی

---

(١) جامع البيان: رقم: ٣٠٨٩٤.

دەدات، (هەموو شتی بۆ دەکردن بە زیوو زێڕ)، دوایی حەسەنی بەصڕایی گوتوویەتی: بە خوا ژیانی دنیا زۆربەی خەڵکی لار کردۆتەوەو پەلکێش کردوە بەلای خۆیدا، لە حاڵێکدا خوا ﷻ واشی بۆ نەکردوون، ئەدی ئەگەر وای کردبایە!

واتە: زۆربەی خەڵکی دنیا، بە لای دنیادا پەلکێش بوون، بە لای ڕابواردنی دنیاداو، بە لای نازو نیعمەتی دنیادا، لە ڕووە ماددییەکەیەوەو، ڕووە مەعنەوییەکەیان فەرامۆش کردوە، ڕۆژی دواییان فەرامۆش کردوەو، خواو خەڵکیان لەبیر چووە، هەر لە سوڕگەی خۆیاندا دەخولێنەوەو، ئاگایان لە خواو خەڵك نەماوەو، لە حاڵێك دا خوا ﷻ واشی بۆ نەکردوون، کە فەرموویەتی، ئەدی ئەگەر وای بۆ کردبایە!!

٢- یەکێکی دیکە لە زانایان، (إبنُ زَید) دیسان (الطَبَري)[١] ئەم دەقەی لێوە دێنێ، لە بارەی تەفسیری ئەو ئایەتەوەو دەڵێ: **(وَلَولاَ أَنْ يَكُونَ النَّاسُ أُمَّةً وَاحِدَةً عَلَى طَلَبِ الدُّنيا وَرَفضِ الأخِرَة)**، ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە، خەڵك هەموویان ببنە یەك کۆمەڵ، لەسەر داواکردنی دنیاو ڕەتکردنەوەی ڕۆژی دوایی [خوا عز وجل ئاوای بۆ دەکردن].

٣- تەنیا یەك جار خوا ﷻ باسی زیو (**فِضَّة**)ی کردوە، کە باسی (**سُقُف**) یان (**سَقْف**) دەکات، سەقفی خانووەکان، یان سەربانەکانیان، بەڵام دوایی کە باسی پەیژان (**مَعَارِج**) دەکات و، باسی دەرگایان (**أَبوَاب**) دەکات و، باسی تەختان (**سُرُر**) دەکات، وشەی (**فِضَّة**) ی بەکارنەهێناوە، هۆکارەکەی ئەوەیە: (**حُذِفَ الوَصْفُ مِنَ المَعطُوفَاتِ لِدَلالَةِ مَا وُصِفَ المَعطُوفُ عَلَيهِ**)، بۆیە وەصفی زیو قرتێنراوە لەوانی دیکە، کە بادراونەوەو، گێڕدراونەوە بۆ سەر (**سُقُف**)، چونکە لەوێ کە باسکراوە، مانای وایە هەمان ئەو زیوە، بۆ پەیژەکانیش و بۆ دەرگاکانیش و بۆ تەخت و قەنەفەکانیش هەر هەیە.

٤- لەو بارەوەش فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ زۆرن، بەڵام دوو فەرمایشتان بە نموونە دێنین:

---

(١) جامع البيان: رقم: ٣٠٨٩٨.

١- {الدُّنيَا سِجْنُ المُؤْمِنِ وَجَنَّةُ الكَافِرِ}، (أخرجه مُسلِم: ٢٩٥٦، والترمِذي: ٢٣٢٤، وابنُ مَاجه: ٤٣١٣)، واته: دنیا حەپسخانەی بڕوادارو بەهەشتی بێبڕوایانە.

یانی: مرۆڤی بڕوادار وەك چۆن كەسێك لە حەپسخانەدا دەبێ، لە سجن و زینداندا دەبێ، بە چوار دیوارێك ڕێی لێگیراوەو، لە ژوورێك و چوار دیوارێكدا قەتیس كراوە، مرۆڤیش لە ژیانی دنیادا، لەبەر ئەوەی پابەندە بە سنوورەكانی شەریعەتەوە، بە كەیفی خۆی ڕەفتار ناكات و، بە كەیفی خۆی قسە ناكات، بەڵكو ئاگاداری خولیاو نیەتەكانی نێو دڵیشی دەبێ، لەو ڕووەوە خۆی بە كۆتكراوو بەندكراو دەبینێ، واتە: كۆت و بەندی شەریعەت، كە دەزانێ ئەوە لە قازانجی دنیاو دوارۆژیەتی، بەڵام بابای بێبڕوا، خۆی بەرهەڵدا دەبینێ، هیچ سنوورو لەمپەرێك لەبەردەمی خۆیدا نابینێ، هەر بۆیەش یەكێك لە عاریفە گەورەكان دەڵێ:

(وَمَن أَبَاحَ النَّفسَ مَا تَهْوَاهُ فَإِنَّمَا إِلَـهَهُ هَوَاهُ)

واتە: هەر كەسێك نەفسی چی ئارەزووی كرد، پێی بدات و، ڕێی پێبدات، ئەوە پەرستراوی بۆتە هەواو ئارەزووی خۆی.

٢- {لَو كَانَتِ الدُّنيَا تَعْدِلُ عِنْدَ اللهِ جَنَاحَ بَعُوضَةٍ، مَا سَقَى مِنْهَا كَافِراً شَرْبَةَ مَاءٍ}، (أخرجه التِّرمِذي: ٢٣٢٠، وابن مَاجه: ٤١١٠، بسندٍ حَسَن).

واتە: ئەگەر دنیا لە لای خوا ﷻ بە قەد باڵە مێشوولەیەك نرخی ببووایە، قوومە ئاوێكی لێ نەدەدا بە مرۆڤی بێبڕوا.

٥- قۆڵە نەزیلەیەك:

ڕۆژێك جوولەكەیەكی توونچیی، كە گەرماوی داگیرساندوەو، سووتەمەنیی و داری داونە بەر گەرماو و، لە ئارەق و تۆزو دووكەڵدا، غەرق بووە، تەماشا دەكات ئەبوو حەنیفە ڕەحمەتی خوای لێ بێ، سواری وڵاخەو خەڵكێك لە خزمەتی دایە، دێ، چونكە ئەبوو حەنیفە وێڕای ئەوەی زانایەكی گەورە بووە، بازرگانێكی

گـەورەش بـووە، دیـارە بـە بازرگانییەکـەی خزمەتـی خۆشـیی و قوتابیەکانیشـی و، خزمەتـی خەڵکیشـی پێکـردوە، ئنجـا لەگـەڵ ئـەوەدا کـە زۆر سـاماندار بـووە، بـەڵام یەکجـار خـوا پەرسـت و زاهیـدو بـۆ خـوا صوڵحـاو بـووە، ساماندار بـوون و دەستڕۆیشـتن، لـە ڕووی سـەروەت و سامانەوە، یـان لـە ڕووی دەسـەڵاتەوە، لەگـەڵ بـۆ خـوا صوڵحـان و دینداریـی و پارێزکاریـی دا تێکناگیـرێ..

ئنجا جوولەکـە کـە ئەبـوو حەنیفـە دەبینـێ، بـە بەرگێکـی جـوان و بۆنێکی خـۆش و بە سـواری وڵاخ، خۆیشـی غەرقـی تـۆزو ئـارەق و دووکـەڵ بـووە، دەڵـێ: ئـەی ئیـمام! دەڵـێ: بەڵـێ، دەڵـێ: فەرموودەیەکـی پێغەمبـەری ئێـوە هەیـە، کـە دەڵـێ: {**الدُّنيَا سِجْنُ المُؤْمِنِ وَجَنَّـةُ الكَافِرِ**} واتـە: دنیـا سـجنی بـڕوادارەو، بەهەشـتی بێبڕوایـە، ئنجـا ئایـا ئێسـتا تـۆ وەك لـە بەهەشـتدا بـی، دێیـە بەرچـاو، یـان مـن، ئایـا ژیانـی مـن وەك سـجن و زیندانـە، یـان هـی تـۆ؟ واتـە: فەرمایشـتەکەی پێغەمبـەر ﷺ پێچەوانـەی حاڵـی مـن و تۆیـە!!

ئەبـوو حەنیفـە پیاوێکـی زۆر عاقـڵ و بلیمـەت بـووەو قـەد دانەمـاوە، پێـی دەڵـێ: جوولەکـە بـە تەئکیـد حاڵـی تـۆ ناخۆشـەو، حاڵـی مـن خۆشـە، بـەڵام حاڵـی تـۆ ئـەوەی ئێسـتات، لـە چـاو ئـەو سـزاو دۆزەخـەی چاوەڕێـت دەکات، ئێسـتات وەك بەهەشـتێیە، منیـش ئـەو حاڵـەی کـە تێیدام، لـە چـاو ئـەو بەهەشـتەی کـە چاوەڕێـم دەکات، ئێـرەم وەك سـجن و زینـدان وایـە.

وەڵامێکی زۆر پڕ بە پێست و هەق و ڕاست بووە.

٦- شاعیرێك (**القُرطُبي**) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1]، چوار دێڕە شیعری لێوە دێنێ، لە بارەی ژیانی دنیاو چۆنیەتیی مامەڵەکردن لەگەڵ ژیانی دنیادا، ئەم چوار دێڕە شیعرە دێنێ، پێم خۆشبوو بیانهێنم:

**تمتّع من الأيام إن كنت حـازماً ... فإنك فيهـــا بين ناه وآمـــر**

---

(١) جامع لأحكام القرآن: ج٢٥، ص:٧٠.

إذا أبقت الدنيا على المرء دينه ... فما فاته منها فليس بضـائر
فلا تزن الدنيا جناح بعوضـة ... ولا وزن رقٍّ من جناح لطائر
فلم يرض بالدنيا ثواباً لمحسن ... ولا رَضِيَ الدُّنيا عِقَابَاً لِكَافِـرِ

واتـە: لـە ڕۆژانێکـی کەمـی ژیانـی دنیـادا، بەهـرە وەربگـرە، ئەگـەر تـۆ خـاوەن عەقڵێکـی باشـی و وریـای، (واتـە: مەچـوو هەمـوو ڕۆژەکانـی ژیانـت بکـەی بـە ڕابـواردن و بەهـرە وەرگرتنـی ماددیـی)، چونکـە لـە ڕۆژەکانـی ژیانتـدا، لـە نێـوان ئـەوە دای، کـە شـت قەدەغـە بکـەی لـە خەڵکێـك و، ڕێگریـی لـە خراپـە بکـەی، یاخـود فەرمانیـان پـێ بکـەی بـە چاکـە، (واتـە: تـۆ دەبـێ زیاتـر مشـووری ئـەوە بخـۆی کـە لـە ژیانتـدا بـەو شـێوەیە بـی، لـە ڕۆژانێکـی کەمـدا بەهـرە وەربگـرە، بایـی ئەوەنـدە کـە جەسـتەت پێویسـتیی پێیەتـی و ژیانـت پێـی بەڕێـوە دەچـێ، بـەڵام هـەوڵ بـدە ئەرکـی فەرمـان بـە چاکـە و ڕێگریـی لـە خراپـە ئەنجـام بـدەی).

ئەگـەر دنیـا دینداریيەکـەی بـۆ مـرۆڤ هێشـتەوە، ئەوەنـدەی لـە دنیـا، لە دەسـتی دەچـێ، هیـچ زیانـی پـێ ناگەیەنـێ، مـادام دینـی سـەلامەت بووبێ.

دنیـا هێنـدەی کێشـی باڵـە مێشـوولەیەك کێشـی نیـە، هەروەهـا هێنـدەی پەڕێـك لـە باڵـی باڵندەیـەك کێشـی نیـە (واتـە: لـە تـەرازووی خـوادا).

بۆیـەش خـوا ﷻ ڕازی نەبـووە لـە دنیـادا پاداشـتی چاکـەکار بداتـەوە، هەروەهـا ڕازیـش نەبـووە، دنیـا بکاتـە شـوێنی سـزا، بـۆ بێبـڕوا.

دنیـا نـە شـوێنی پاداشـتە بـۆ چاکـەکارو، نـە شـوێنی سـزایە بـۆ بێبـڕوا، نـە جێـی سـزای تێـدا دەبێتـەوەو، نـە جێـی پاداشـتی تێـدا دەبێتـەوە، هێنـدە کـەم و کـورت و کـەم بایەخـە لـە ڕووە ماددییەکەیـەوەو لـە چـاو قیامـەت.

## مەسەلەی چوارەم:

**ئەوانەی لە ئاست قورئانی بیرخەرەوەی خوای بە بەزەیی دا خۆیان کوێر دەکەن و، نادیدەی دەگرن و، پشتی تێدەکەن، خوا ﷻ شەیتانێکی گومڕاکەریان بۆ دەرەخسێنێ و دەبێتە هاودەمیان، کەچی ئەوان پێیان وایە ڕێ ڕاستگرتوون، بەڵام کە لە ڕۆژی قیامەتدا دێنە لای خوا، دووریيان لێیان بە ئاوات دەخوازن، (واتە: لە شەیتانەکان)، بێگومان پێکەوە بەشداربوونیشیان لە سزاو ئازاردا، هیچ سوودیان پێناگەیەنێ و، هەر کەسەو سزاو ئازاری خۆی:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يَعْشُ عَن ذِكْرِ ٱلرَّحْمَٰنِ نُقَيِّضْ لَهُۥ شَيْطَٰنًا فَهُوَ لَهُۥ قَرِينٌ ﴿٣٦﴾ وَإِنَّهُمْ لَيَصُدُّونَهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ ﴿٣٧﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَنَا قَالَ يَٰلَيْتَ بَيْنِى وَبَيْنَكَ بُعْدَ ٱلْمَشْرِقَيْنِ فَبِئْسَ ٱلْقَرِينُ ﴿٣٨﴾ وَلَن يَنفَعَكُمُ ٱلْيَوْمَ إِذ ظَّلَمْتُمْ أَنَّكُمْ فِى ٱلْعَذَابِ مُشْتَرِكُونَ ﴿٣٩﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دە بڕگەدا:

١)- ﴿ وَمَن يَعْشُ عَن ذِكْرِ ٱلرَّحْمَٰنِ ﴾، هەر کەسێك لە قورئانی بیرخەرەوەی (خوای) بە بەزەیی، پشت هەڵکردوو بێ، یاخود چاو نووقاو بێ، خۆی کوێر کردبێ.

٢)- ﴿ نُقَيِّضْ لَهُۥ شَيْطَٰنًا ﴾، ئێمە شەیتانێکی بۆ دەرەخسێنین، بۆ ئامادە دەکەین، (**التَّقْيِيضُ: التَّهِيئَةُ والإِتَاحَةُ**)، بریتیە لە ئامادەکردن و ساز کردن، وشەی: (**يَعْشُ**) خوێندراویشەتەوە: (**يَعْشَا**)، ئنجا (**عَشَا، يَعْشُو، عَشَاً: لَحِقَهُ مَا يَلْحَقُ الأَعْشَى، وَهُوَ الَّذِي لاَ يُبْصِرُ بِاللَّيلِ**)، بەڵام (**عَشِيَ، يَعْشَا، عَشَاً أي: عَمِيَ**)، (**عَشَا، يَعْشُو، عَشَاً**)، ئەوەیە کە بابای شەو کوێر، کە بە شەوێ نابینێ چی بەسەر هاتوە، ئەویش وای بەسەر بێ، بەڵام (**عَشِيَ، يَعْشَا، عَشاً**)، واتە: کوێر بوو، کەواتە: ئەگەر بخوێندرێتەوە: ﴿ وَمَن يَعْشُ ﴾، یانی: هەر کەسێك شەو کوێر بێ، یاخود خۆی نابینا بکات، بەڵام ئەگەر بفەرموێ: (**يَعشا**)، واتە: هەر کەسێك کوێر بێ، هەروەها لە

زمانی عەرەبییدا دەڵێ: (**عَشِيَ إِلى النَّارِ أي: أَقْبَلَ**)، بەڵام (**عَشِيَ عَنِ الذِّكْرِ أي: أعرَضَ**)، لێرەدا: ﴿ وَمَن يَعْشُ عَن ذِكْرِ ٱلرَّحْمَٰنِ ﴾، (**ضُمِّنَ مَعْنى الإعْرَاض**)، واتە: هەر کەسێك لە ئاست قورئاندا، کە بیرخەرەوەیە، بیرخەرەوەی خوای بە بەزەیی، خۆی کوێر بکات و، پشتی تێبکات، ئەوە شەیتانێکی بۆ ئامادە دەکەین.

٣)- ﴿ فَهُوَ لَهُۥ قَرِينٌ ﴾، کە دەبێتە هاودەم و هاوڕازی، (**القَرِينُ: المُلاَزِم وَالصَّاحِب**)، کەسێك کە هەمیشە لەگەڵ کەسێکە و، هاوەڵیەتی و لێی جیا نابێتەوە، (**الطَّبَرِي**) لە تەفسیرەکەی خۆی دا[1] دەڵێ: (**وَأَصْلُ الْعُشُوِّ: النَّظَرُ بِغَيْرِ ثَبَتٍ، لِعِلَّةٍ فِي الْعَيْنِ، يُقَالُ مِنْهُ: عَشَا فُلَانٌ يَعْشُو عَشْوًا وَعُشُوًّا: إِذَا ضَعُفَ بَصَرُهُ، وَأَظْلَمَتْ عَيْنُهُ، كَأَنَّ عَلَيْهِ غِشَاوَةً**)، وشەی (**عُشُوٌّ**) لە ئەصڵدا بە مانای تەماشاکردنە بەبێ چاو چەسپاندن، لەسەر شتێك، یان بەبێ چاك دیتن، بەهۆی ئەوەوە کە نەخۆشییەك لە چاودا هەیە، دەگوترێ: (**عَشَا فُلَانٌ يَعْشُو عَشْوًا وَعُشُوًّا**)، ئەگەر چاوی بێهێز بوو، چاوی تاریك داهات، وەك پەردەیەکی بەسەرەوە بێ.

٤)- ﴿ وَإِنَّهُمْ لَيَصُدُّونَهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ ﴾، بە دڵنیایی ئەو (شەیتانە قەرین)انە، ئەو (بێبڕوای)انە (کە لە ئاست کتێبی خوادا کوێر بوون و نادیدەیان گرتوە)، هەڵدەخەڵەتێنن و لە ڕێ لایان دەدەن (لە ڕاستە شەقامی خوا).

٥)- ﴿ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ ﴾، کەچی پێیان وایە، (لە ڕێ لادراوەکان پێیان وایە)، ڕێی ڕاستیان گرتوە، یاخود: پێیان وایە: شەیتانەکان ڕێی ڕاستیان گرتوەو ڕێی ڕاست پێشانی ئەوانیش دەدەن.

شایانی باسە: وشەی (**أَعْشَى**)، بە مانای پیاوی شەو کوێرو، (**عَشْوى**) بە مانای ئافرەتی شەو کوێرە، ئنجا لێرەوە ئەو پەندە عەرەبییە هاتوە، کە دەڵێ: (**فُلان يَخْبِطُ خَبْطَ عَشْوى**)، واتە: فلانکەس بە ڕێیەدا دەڕوات و هەڵسوکەوت دەکات، وەك چۆن ئافرەتی شەو کوێر هەڵسوکەوت دەکات، کە بە شەوێ نابینێ و، بەسەر دەرو دیواردا دەکەوێ، ئەو پەندە لەوەوە هاتوە.

---

(١) جامع البيان: ج ٢٥، ص:٧٣.

کەواتــە: کــە دەفەرمــوێ: ﴿ وَإِنَّهُمْ لَيَصُدُّونَهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ ﴾، پێشــێ باســی قەرینێك دەكات، ﴿ فَهُوَ لَهُۥ قَرِينٌ ﴾، هــەر کەسێك لــە ئاســت قورئانــی بیرخــەرەوەی خــوای بــە بەزەییــدا، کوێــر بــێ، یاخــود شــەو کوێــر بــێ، چــاك چــاوی نەکاتــەوەو ســەرنجی نــەدا، شــەیتانێکی بــۆ ئامــادە دەکەیــن، بــۆی دەبێتــە قەریــن، واتــە: هــاوڕێ و هــاوەڵ و هــاوڕاز، دوایــی دەفەرمــوێ: ﴿ وَإِنَّهُمْ لَيَصُدُّونَهُمْ ﴾، ﴿ وَإِنَّهُمْ ﴾، ڕاناوی کۆیــە بــۆ: ﴿ قَرِينٌ ﴾ دەچێتــەوە، لەبــەر ئــەوەی هــەر کامێــك لــە مرۆڤــەکان، کــە لــە ئاســت بەرنامــەو کتێبــی خــوادان، کوێــر دەبــن، خــوا ﷻ قەرینێکیــان بــۆ دەڕەخسێنێ، کەواتــە: دەبــن بــە کــۆ.

کەواتــە: قەرینــەکان، ئــەوان لــە ڕێ لادەدەن، وشــەی: ﴿ ٱلسَّبِيلِ ﴾، کــە (أل)ی ناســاندنی لەســەرە، دەگونجــێ بڵێــی: لــە ڕێبازەکــە، کەواتــە: (أل)ی ناســاندنەکە بــۆ (عهــد)ە، یــانی: لــە ڕێبازەکــە، واتــە: ڕێبــازە زاندراوەکــە، کــە ڕێبــازی خوایــە، دەشــگونجێ ئــەو ناســاندنە بــۆ جینــس بــێ، واتــە: لــە جینســی ڕێــی ڕاســت، لــە هەمــوو ڕوویەکــەوە لایــان دەدەن.

﴿ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ ﴾، (يَحْسَـبُ المَصْـدُودونَ أَنَّهُـم مُهْتَـدُون)، لــە ڕێ لادراوەکان پێیــان وایــە، ڕێــی ڕاســتیان گرتــوە، یاخــود: لــە ڕێ لادراوەکان پێیــان وایــە ئــەو شــەیتانە قەرینانــەی لــە ڕێیــان لاداون، ڕێــی ڕاســتیان گرتــوە، بۆیــە ئەوانیــش لێیــان بەهرەمەنــد دەبــن.

(**إهْتِـدَاء**): بریتیــە لــە زانیاریــی هەبــوون لــە ڕێــی ڕاســت و بەهــرە وەرگرتنیــش لــەو زانیارییــە، یــانی: (**إهْتِـدَاء**) بریتیــە لــە ڕێــی ڕاســت زانیــن و ڕێــی ڕاســت گرتــن.

٦)- ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَنَا ﴾، هەتا کاتێك هات بۆ لامان، واتە: یەکێك هات بۆ لامان، ئەمە خوێنراویشەتەوە: (**حَتَّى إِذَا جَاءَانَا**)، واتە: مرۆڤە لە ڕێ لادراوەکەو، شەیتانە هاوەڵەکەشی هاتن بۆ لامان.

٧)- ﴿قَالَ يَٰلَيۡتَ بَيۡنِي وَبَيۡنَكَ بُعۡدَ ٱلۡمَشۡرِقَيۡنِ﴾، (مرۆڤە لە ڕێ لادراوەکە) گوتی: خۆزگە لە نێوان من و لە نێوان تۆدا، دووریی دوو ڕۆژهەڵاتەکان بووایە، کە مەبەست لە دوو ڕۆژهەڵاتەکان، واتە: ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، بەڵام ڕۆژهەڵات زاڵکراوە بەسەر ڕۆژئاوادا، ئنجا نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا دووریی، بە ئەندازەی پانایی زەوییە، واتە: بە ئەندازەی ئەمسەرو ئەوسەری زەوی، من و تۆ لێك دوور باین.

٨)- ﴿فَبِئۡسَ ٱلۡقَرِينُ﴾، واتە: تۆ خراپترین هاوڕازو هاوەڵ بووی.

٩)- ﴿وَلَن يَنفَعَكُمُ ٱلۡيَوۡمَ إِذ ظَّلَمۡتُمۡ﴾، (ئەمە کورتکردنەوەی چەند ڕستەیەکە: سەرەنجام هەموویان خرانە نێو سزاوە، ئنجا خوا ﷻ پێی فەرموون:) هەرگیز ئەمڕۆ سوودتان پێناگەیەنێ، کە پێشتر ستەمتان کردوە، ئەوە کە لە سزادا هاوبەشن، واتە: هاوبەشییتان لە سزادا، سوودتان پێناگەیەنێ، چونکە هەر کەسە پڕ بە پێستی تاوان و خراپەی خۆی، سزا دەدرێ.

کەواتـە: ﴿وَلَن يَنفَعَكُمُ﴾، (لَـن) بـۆ جەختکردنـەوەو هەمیشـەیی کـردن (**تأكيـد وتأبيـد**)ە، واتـە: هەرگیـز سـوودتان پێناگەیەنـێ، ﴿ٱلۡيَوۡمَ﴾، ئەمـڕۆ، ﴿إِذ ظَّلَمۡتُمۡ﴾، (إذ) (**ظَـرْفُ مُبْهَـمٍ للزَّمَـانِ المَاضِي**)، (إذ) بـۆ (**ظَـرف**)ە، بـۆ کاتـی ڕابـردوو، کـە لێرەدا مەجـازە بـۆ هـۆکار، واتـە: لـە ئەنجامـی ئـەوەدا کـە ئێوە سـتەمتان کـردوە.

١٠)- ﴿أَنَّكُمۡ فِي ٱلۡعَذَابِ مُشۡتَرِكُونَ﴾، واتە: بە هۆی ئەوەوە لەسزادا هاوبەشن، سوودتان پێ ناگەیەنێ، خوێندراویشەتەوە: (**إِنَّكُم فِي العَذَابِ مُشْتَرِكُون**)، ئنجا ئەگەر (**إنَّكُم**) بێ، ئەمە ڕستەیەکی دەست پێکردنە (**جُمْلَة إسْتِئْنَافِيَّة**)، واتە: بە دڵنیایی ئێوە لە سزادا هاوبەشن.

ئنجا ئەگەر بە (**إنكم**) بخوێندرێتەوە:

کـە دەفەرمـوێ: ﴿وَلَن يَنفَعَكُمُ ٱلۡيَوۡمَ إِذ ظَّلَمۡتُمۡ﴾، ئەمـە لـەوێ تـەواو دەبـێ، یـانی: ئەمـڕۆ هیـچ سـوودتان پێناگەیەنـێ، کـە کاتـی خـۆی سـتەمتان کـردوە، هەرگیـزاو هەرگیـز.

(**إِنَّكُم فِي العَذَابِ مُشتَرِكون**)، بە دڵنیایی ئێوە لە سزادا هاوبەشن، بەڵام ئەگەر (**أَنَّكُم**) بێ، واتە: ئەمڕۆ ئێوە، بەهۆی ئەوەوە کە لە سزادا هاوبەشن، سوودتان پێ ناگەیەنێ.

یەکێك لە توێژەرەوان ئاوا ئەم ئایەتە موبارەکە مانا دەکات: (**تَقَرَّرَ اليَومُ انتِفَاءُ انتِفَاعِكُم بِالإشتِرَاكِ فِي العَذَابِ انتِفاءً مُؤَبَّداً مِنَ الآن**)، ئەمڕۆ چەسپاوە سوود نەبینینی ئێوە، بە هۆی بەشدارییتان و، هاوبەشییتانەوە پێکەوە لە سزادا، کە هەرگیز سوود نابینن و ئەوە کەڵکێکتان پێ ناگەیەنێ، واتە: لێرەدا لەم ئایەتە موبارەکەدا، سێ وشە بەکارهاتوون:

١- (**لَن**): بەکارهاتوە بۆ کۆتایی پێهێنان لە داهاتوودا (**لِلتَأبِيدِ المُستَقْبَلِي**).

٢- (**اليَومَ**): بەکارهاتوە بۆ ئێستا، (**لِلحَال**).

٣- (**إذ**) بەکارهاتوە بۆ ڕابردوو، (**لِلمَاضِي**).

ئنجا ئەم سێیە، یەکیان بۆ داهاتوو، یەکیان بۆ ئێستا، یەکیان بۆ ڕابردوو، هاتوون، هەمووشیان پەیوەندییان هەیە بە: ﴿يَنفَعَكُمُ﴾، مانایەکەشی ئاوایە: ئەمڕۆ هەرگیز سوودتان پێناگەیەنێ، کە پێکەوە بەشدارن لە سزادا، بە هۆی ئەوەوە کە لە ڕابردوودا ستەمتان کردوەو، ستەمەکەش بریتیە لە شیرك و کوفر.

هەڵبەتە ئێمە لە تەفسیری (**فُصِّلَت**)دا کورتە باسێکمان لە بارەی نیزیکی فریشتان لە بڕواداران و، هی شەیتانان لە کافرانەوە کردوەو، لێرە ناگەڕێینەوە سەری.

## مەسەلەی پێنجەم و کۆتایی:

**دڵدانەوەی خوا ﷻ بۆ پێغەمبەر ﷺ کە ئەوانەی هیدایەت وەرناگرن، سووچی خۆیانەو حەتمەن دووچاری سزاش دەبن، بۆیە پێویستە توند دەست بە پەیامی خواوە بگرێ و، دڵنیابێ لەسەر ڕاستە ڕێیەو بەرنامەکەی بیرخەرەوەو مایەی پایە بەرزییە، لە پێش ویشدا هیچ پێغەمبەرێك بە جگە لە خوا پەرستیی نەنێردراوە:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ أَفَأَنتَ تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ أَوْ تَهْدِى ٱلْعُمْىَ وَمَن كَانَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٤٠﴾ فَإِمَّا نَذْهَبَنَّ بِكَ فَإِنَّا مِنْهُم مُّنتَقِمُونَ ﴿٤١﴾ أَوْ نُرِيَنَّكَ ٱلَّذِى وَعَدْنَٰهُمْ فَإِنَّا عَلَيْهِم مُّقْتَدِرُونَ ﴿٤٢﴾ فَٱسْتَمْسِكْ بِٱلَّذِىٓ أُوحِىَ إِلَيْكَ إِنَّكَ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٤٣﴾ وَإِنَّهُۥ لَذِكْرٌ لَّكَ وَلِقَوْمِكَ وَسَوْفَ تُسْـَٔلُونَ ﴿٤٤﴾ وَسْـَٔلْ مَنْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رُّسُلِنَآ أَجَعَلْنَا مِن دُونِ ٱلرَّحْمَٰنِ ءَالِهَةً يُعْبَدُونَ ﴿٤٥﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە سێزدە بڕگەدا:

خوا ﷻ لە کۆتایی ئەو ئایەتانەدا، ڕوو لە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەکات، بە پرسیارکردنی نکووڵیلێکەرانەوە دەفەرموێ:

١)- ﴿ أَفَأَنتَ تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ ﴾، ئایا تۆ بە کەڕان دەبیستێنی؟ ﴿ ٱلصُّمَّ ﴾، کۆی (أَصَم)ە، واتە: کەڕ، ﴿ ٱلصُّمَّ ﴾، واتە: کەڕان.

٢)- ﴿ أَوْ تَهْدِى ٱلْعُمْىَ ﴾، یان ئایا تۆ ڕێنمایی کوێران دەکەی؟ ﴿ ٱلْعُمْىَ ﴾، کۆی (أَعْمَى)یە.

٣)- ﴿ وَمَن كَانَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴾، یان دەتوانی کەسێك کە لە گومڕاییەکی ئاشکرا دایە، ڕێنمایی بکەی؟ واتە: ئەوە بە تۆ ناکرێ، ئەوانەش هەستەوەرەکانی خۆیان لە کارخستوون، نە بە گوێیان هەق دەبیستن، نە بەچاویان هەق دەبینن، نە بە عەقڵیشیان ڕێی ڕاست دەدۆزنەوەو، لە گومڕاییدان.

کەواتـە: ئەمـە دڵدانەوەیـە بـۆ پێغەمبـەر ﷺ، کـە کـەم و کوڕیـی و سـووچی تـۆ نیـە، ئەوانـە ڕێـی ڕاسـت ناگـرن، بەڵکـو خۆیـان نایانـەوێ، ببیسـتن و ببینـن و عەقـڵ و هۆشـی خۆیـان بەکاربێنـن.

٤)- ﴿ فَإِمَّا نَذْهَبَنَّ بِكَ ﴾، لە حاڵێکدا کە ئێمە تۆ لابەرین، واتە: بتمرێنین.

٥)- ﴿ فَإِنَّا مِنْهُم مُّنتَقِمُونَ ﴾، ئەوە بە دڵنیایی ئێمە لەوان تۆڵەستێنین.

٦)- ﴿ أَوْ نُرِيَنَّكَ ٱلَّذِى وَعَدْنَٰهُمْ ﴾، یان ئەگەر ئەوەی گفتمان پێداون، پێشانی تۆی بدەین.

٧)- ﴿ فَإِنَّا عَلَيْهِم مُّقْتَدِرُونَ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە بەسەر ئەوان دا تواناداریـن، واتە: لە هەردوو حاڵاندا سزادرانی ئەوان مسۆگەرەو، بڕاوەتەوە، چ تۆ لابەرین، بە تەئکید ئێمە تۆڵەستێنین لە ئەوان و تۆڵەیان لێ دەستێنین، سزایان دەدەین، چ تۆ بهێڵینەوە و، پێشانت بدەین ئەوەی کە بەڵێنمان پێداون و هەڕەشەمان پێ لێکردوون، ئەوە ئێمە بەسەر ئەواندا بە توانایـن و توانادارین، ئەوەی بمانەوێ بەسەریان دێنین.

وشـەی (إِمَّـا) لـە ئەصڵـدا: (إِنْ مَا)یـە، (إِنْ) بـۆ مەرجـە، (**إِن الشَّرطيَّة**)یـە، (**مَـا**)ش زیادکـراوە بـۆ جەختکردنـەوە، (**وَإِمَّـا**) (**نون**)ەکـەش لـە (**میم**)ەکـەدا (**دَغـم**) کـراوە، ئەصڵـی خـۆی (**إن مَا**)یـە، بۆتـە (**إمَّـا**)، واتـە: لـە حاڵێکـدا ئەگـەر هاتـوو.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ فَإِنَّا مِنْهُم مُّنتَقِمُونَ ﴾، هەروەهـا دەفەرمـوێ: ﴿ فَإِنَّا عَلَيْهِم مُّقْتَدِرُونَ ﴾، (**تَقْدِيـمُ المَجرُورَيـنِ عَـلَى مُتَعَلَّقِيهِـما، لِلإهتِـمامِ فِي التّمكُّـنِ بِالإنتقـامِ وَالإقتِـدارِ عَلَيْهِـم**)، لـە هەردووکیـان دا کـە (**جـارٌ وَمَجـرور**)، پێشـخراوەو لـە ئەصـڵ دا ئاوایـە: (**فَإِنَّـا مُنْتَقِمـونَ مِنْهُـم**)، هەروەهـا ئـەوەی دیکـە کـە دەفەرمـوێ: ﴿ فَإِنَّا عَلَيْهِم مُّقْتَدِرُونَ ﴾، لـە ئەصڵـدا ئاوایـە: (**فَإِنَّـا مُقتَـدِرُونَ عَلَيْهِـم**)، ئەمـە بـۆ گرنگیـی پێدانـە، بـەوە کـە خـوا ﷻ دەستڕۆیشـتوویە بـۆ تۆڵـە لێسـتاندنەوەیان، هەروەهـا دەستڕۆیشـتوویە بـۆ هـەر شـتێك کـە بیـەوێ پێشـانی پێغەمبـەر ﷺ بـدات، هەڕەشـەیەك کـە لـە کافرەکانـی کـردوە.

وشـەی (وَعـد): ﴿ ٱلَّذِى وَعَدْنَٰهُمْ ﴾، هـەم بـۆ هەڕەشـەو، هـەم بـۆ جگەلـە هەڕەشـەش بەکاردەهێـنرێ.

﴿ مُّقْتَدِرُونَ ﴾، (الإقْتِـدَارُ: إمْتِلاَكُ تَمَـامِ القُـدْرَةِ، أَو شِـدَّةُ القُـوَّة)، (إقتـدار): بریتیـە لـە بەدەسـتەوە گرتنـی تـەواوی دەسـەڵات و، یـان زۆر بەهێزیـی، ئـەم تەعبیـرە کـە لێـرە هاتـوە، لـە سـوورەتی (یُونُـس) ئایەتـی (٤٦)دا، بـەم جـۆرە هاتـوە: ﴿ وَإِمَّا نُرِيَنَّكَ بَعْضَ ٱلَّذِى نَعِدُهُمْ أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ ثُمَّ ٱللَّهُ شَهِيدٌ عَلَىٰ مَا يَفْعَلُونَ ﴾، واتـە: ئەگـەر هەندێـك لـەوەی بەڵێنیـان پـێ دەدەیـن، پێشـانی تـۆی بدەیـن، (کـە سـزادانیانە)، یاخـود تـۆ بمرێنیـن و پێشـانت نەدەیـن، شـوێنی گەڕانەوەیـان بـۆ لای ئێمەیـە، دوایـی خـوا ﷻ چاودێـرە بەسـەر ئـەوەوە کـە دەیانکـرد.

یانی: ئەگەر لە دنیاشدا سزایان نەدەین، لە دوارۆژدا سزادانیان مسۆگەرە.

یەکێـك بـۆی هەیـە، بڵـێ خـوا ﷻ بۆچـی دەفەرمـوێ: ﴿ فَإِمَّا نَذْهَبَنَّ بِكَ ﴾، ئنجا ئەگـەر تـۆ لابەریـن، دوایـی دەفەرمـوێ: ﴿ أَوْ نُرِيَنَّكَ ﴾؟ یـان پێشـانت بدەیـن.

مـن گوڵبژێـر لـە هەمـوو تەفسـیرەکان دەکـەم و ئـەوەی بـە دڵـم بـێ، جـاری وایـە ڕایـەك لـە یەکێکیانـەوە دێنـم و، مـەرج نیـە هەمـوو جارێـك ئامـاژەی پێبـدەم، تەفسـیرەکانم لـە سـەرەتاوە بـاس کـردوون و لـە کۆتاییـدا ناویـان دێنیـن، ئنجا لێـرەدا یەکیـان دەڵـێ: (فَائِـدَةُ التَّرْدِيـدِ فِي هَـذَا الـشَّرْطِ تَعْمِيـمُ الحَالَـيْنِ، حَـالَ حَيَـاةِ النَّبِـيِّ ﷺ وَحَـالَ وَفَاتِـهِ، وَالمَقْصُـودُ: وَقـتَ ذَيِنِـكَ الحَالَـيْنِ، لأنَّ المَقْصُـودَ تَوْقِيْـتُ الإِنْتِقَـامِ مِنْهُـم)، ئـەوە کـە خـوا ﷻ دوو ئەگـەری هێنـاون، سـوودەکەی ئەوەیـە کـە هـەردوو حاڵەکان، حاڵـی ژیانـی پێغەمبـەر ﷺو حاڵـی مردنـی، یانـی: چ لـە حاڵـی ژیانـت دا، چ لـە حاڵـی مردنتـدا، لـە هـەردوو حاڵەکانـت دا، ئـەوان سـزادرانیان مسـۆگەرەو بڕاوەتـەوە، لێـرەدا مەبەسـت کات دیارییکردنـە بـۆ تۆڵـە لێسـتاندنەوەو، بـۆ سـزادانیان، کـە چ تـۆ بمرێنیـن، تۆڵەیـان لـێ دەسـتێنین، چ تـۆ بهێڵیـن، ئـەوە هەندێکـت پێشـان دەیـن، یـان ئـەوەی هەڕەشـەمان پـێ لێکـردوون پێشـانت بدەیـن، لـە هـەردوو حاڵانـدا ئێمـە توانامـان بەسـەریاندا دەشـکێ و لـە دەسـتی ئێمـە دەربـاز نابـن.

٨)- ﴿ فَٱسْتَمْسِكْ بِٱلَّذِىٓ أُوحِىَ إِلَيْكَ ﴾، کەواتە: دەست بگرە بەوەوە کە بۆ لات سروشکراوە، (المَسْكُ: أَخْذُ الشَّيء)، (مَسْك) ئەوەیە ئینسان شتێك بگرێ، بەڵام: (الإِسْتِمْسَاكُ: شِدَّةُ المَسْكِ)، (إِسْتِمْسَاكُ) ئەوەیە کە ئینسان زۆر بە توندیی بیگرێ، کە لێرەدا مەبەست بەردەوام بوونە، لەسەر دەستگرتنی پێغەمبەر ﷺ بە قورئانەوە، بە وەحیی خوای پەروەردگارەوە.

٩)- ﴿ إِنَّكَ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴾، بە دڵنیایی تۆ لەسەر ڕێیەکی ڕاستی، ئەمە بەڵگە هێنانەوەیە، بۆ فەرمانکردنی بە دەست پێوەگرتنی وەحیی، واتە: توند دەست بەو وەحییەوە بگرە، کە بۆ لات سروشکراوە، چونکە بێگومان تۆ لەسەر ڕێیەکی ڕاستی.

١٠)- ﴿ وَإِنَّهُۥ لَذِكْرٌ لَّكَ وَلِقَوْمِكَ ﴾، بە دڵنیایی ئەو بیرخەرەوەیە بۆ خۆت و خەڵکەکەت، یانی: ئەو قورئانە، ڕاناوەکەی بۆ قورئان دەچێتەوە، یان بۆ وەحیی دەچێتەوە، وەحییەکەش لە قورئان دا بەرجەستەیە، ئنجا دەڵێ: (ذِكْرُ العَقْلِ والتَّفْكِيرِ، وَذِكرُ لِسَانِ الصِّيتِ والشَّرَفِ)، (ذِكر)ە بۆ خۆت و بۆ گەلەکەت، واتە: بیرخەرەوەیە بۆ عەقڵ و هۆشت، یاخود باس و خواسی زمانەو ناوبانگە، بۆ خۆشت و بۆ خەڵکەکەشت.

هەرچەنـدە زۆرێـك لـە توێژەرەوانـی قورئـان وەك (الطَّـبَري) و (إِبـنُ كَثـير) هەموویـان، (ذِكر)یـان بـە مانـای شـەرەف و ناوبانـگ هێنـاوە، واتـە: ناوبانگـە بـۆ خـۆت و بـۆ گەلەکـەت.

هەڵبەتـە ئـەم ڕسـتە قورئانییـە، لـە سـەرەتای سـوورەتی (الأنبياء)یشـدا هاتـوە، بەڵام مـن پێـم وایـە، لێـرەدا واباشـترە بیرخـەرەوە بـێ، یانـی: بیرخسـتنەوەو، ئامۆژگارییـە، بـۆ خـۆت و بـۆ کۆمەڵگاکەشـت، لـە قۆناغـی یەکەمـدا، ئەگەرنـا دوایـی: ﴿ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿١٠٤﴾ ﴾ **یُوسُف**، قورئـان تەنیـا بیرخەرەوەیـە بـۆ هەمـوو جیهانییـان.

دەشـگونجێ مەبەسـت لـە (ذِکـر) هـەم لێـرە، هـەم لـە شـوێنەکانی دیکـەش، مەبەسـت ناوبانـگ بـێ و پێگـەو پلـەی بـەرز بـێ، کـە بێگومـان هەر کەسـێك دەسـت بـە قورئانـەوە بگـرێ و ڕێـزی قورئـان بگـرێ و قورئـان لـە بـاوەش بگـرێ، وەك چـۆن

بـۆی دەبێتـە پەنـدو ئامۆژگاریـی و بیرخـەرەوە، بـە هەمـان شـێوە بۆشـی دەبێتـە ناوو ناوبانـگ و پایەدارییـش، بـەڵام وابێدەچـێ زیاتـر مانـای یەکـەم مەبەسـت بـێ، واتـە: بیرخەرەوەیـە بـۆ خـۆت و گەلەکـەت.

١١)- ﴿وَسَوْفَ تُسْـَٔلُونَ﴾، لە مەودواش لێتان دەپرسرێتەوە، بە تایبەت لە خۆت و لە گەلەکەت، چونکە بە زمانی خۆتان ئەو وەحیی و پەیامەی خواتان بۆ هاتوە، ئێوە زیاتر بەرپرسیارن لێی و، لێتان دەپرسرێتەوە، چونکە ئاسانتر دەستتان دەیگاتێ، لە خەڵکێکی دیکە کە یان زمانی عەرەبیی نازانێ و دەبێ بۆی تەرجەمە بکرێ، یان دەبێ زۆر خۆی ماندوو بکات، تاکو فێری زمانی قورئان دەبێ.

لە کۆتاییدا خوا ﷻ دەفەرموێ:

١٢)- ﴿وَسْـَٔلْ مَنْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رُّسُلِنَآ﴾، بپرسە لەوانەی ناردوومانن، (ئەو پێغەمبەرانەی ناردوومانن) لە پێش تۆدا، لێیان بپرسە.

١٣)- ﴿أَجَعَلْنَا مِن دُونِ ٱلرَّحْمَٰنِ ءَالِهَةً يُعْبَدُونَ﴾، ئایا جگە لە (خوای) بە بەزەیی، پەرستراوانێکی دیکەمان داناون بپەرسترێن؟ لەو بارەوە ئەم ڕیوایەتە هاتوە، کە (**الطَّبَري**)[1] هێناویەتی:

(قَالَ ابْنُ زَيْدٍ، فِي قَوْلِهِ: ﴿وَسْـَٔلْ مَنْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رُّسُلِنَآ﴾ **الزخرف: ٤٥، قَالَ: جُمِعُوا لَهُ لَيْلَةَ أُسْرِيَ بِهِ بِبَيْتِ الْمَقْدِسِ، فَأَمَّهُمْ، وَصَلَّى بِهِمْ، فَقَالَ اللَّهُ لَهُ: سَلْهُمْ قَالَ: فَكَانَ أَشَدَّ إِيمَانًا وَيَقِينًا بِاللَّهِ وَبِمَا جَاءَ مِنَ اللَّهِ، أَنْ يَسْأَلَهُمْ**).

واتـە: ئیبنـو زەیـد گوتوویـەتی: پێغەمبـەر ﷺ ئـەو شـەوەی شـەوڕۆیی پێکـرا، لـە (**بَيتِ المَقدِس**) (پێغەمبـەران) بـۆی کـۆ کرانـەوە، ئەویـش پێـش نوێژیـی بـۆ کـردن و نوێـژی بـۆ کـردن، خـواش ﷻ پێـی فەرمـوو: لێیـان بپرسـە لـەو بـارەوە، بـەڵام ئیمانەکـەی بەهێزتـر بـوو، بـڕوا پتەوییەکـەی بـە خـوا زیاتـر بـوو، بـەوەی بـۆی نێـردراوە، لەلایـەن خـواوە کـە پرسـیاریان لـێ بـکات، واتـە: پرسـیاری لێیـان نەکـرد.

---

(١) جامع البيان: برقم: ٣٠٩٣٦

(الـرَّازي) لـە تەفسـیرەکەی خـۆی دا[1]، سـێ ڕای هێنـاون، لەوبـارەوە کـە ئایـا فەرمـان بـە پێغەمبـەر ﷺ کـراوە، لـە پێغەمبەرانـی پێشـوو بپرسـێ: کـە ئایـا خـوا ﷻ هیـچ پەرسـتراوی دیکـەی دانـاون بپەرسـترێن، وەك هاوبـەش لەگـەڵ خـوادا؟:

{١- إسأل مؤمني أهلِ الكِتَاب.

٢- إسأل الأنبِياءَ فِي لَيلَةِ المعرَاج.

٣- ذِكرُ السّؤالِ فِي مَوضِعٍ لا يُمكِن السُّؤالُ فِيهِ، يَكُون المُرَادُ فِيهِ النَّظَرُ وَالإِسْتِدلالُ، كَقَولِ مَنْ قَالَ: سَلِ الأَرْضَ مَنْ شَقَّ أَنْهَارَكَ، وَغَرَسَ أَشْجَارَكَ، وَجَنَى ثِمَارَكَ، فَإِنَّها إِنْ لَمْ يُجِبكَ جَوَاباً، أَجَابَتكَ اعتِبَاراً، فَهَاهُنا سُؤالُ النَّبِيِّ ﷺ عَنِ الأَنبِيَاءِ الَّذِينَ كَانوا قَبْلَهُ مُمتَنِعٌ، فَكَانَ المُرَادُ مِنهُ، أُنْظُر فِي هَذِهِ المَسألَةِ بِعَقلِكَ وَتَدَبَّر فيها بِفَهمِكَ}.

واتـە: کـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: پرسـیار لـە پێغەمبەرانـی دیکـە، کـە لـە پێـش تـۆدا ناردوومانـن بکـە، ئایـا هیـچ پەرستراوانێکمان دانـاون، بپەرسـترێن جگـە لـە خـوا، ئەمـە سـێ وەڵامـی هـەن:

١- لە بڕوادارانی خاوەن کتێبان بپرسە، (ئەوانەی هاوچەرخی خۆتن، لێیان بپرسە: ئایا لە کتێبەکانی خوادا هەیە، جگە لە خوا بپەرسترێ؟).

٢- لە پێغەمبەران بپرسە، لە شەوی میعراجدا، وەك ئەو دەقەی هێنامان لە (إِبنُ زَيد)ەوە.

٣- باسکردنی پرسیارکردن، لە شوێنێکدا کە نەگونجێ پرسیار بکرێ، مەبەست لێی سەرنج دان و بەڵگە هێنانەوەیە، وەك قسەی کەسێك کە دەڵێ: لە زەوی بپرسە! کێ ڕووبارەکانی تێدا ڕۆیشتاندوون و، کێ درەختەکانی تێدا ڕواندوون و، کێ بەرو میوەکانی تێدا پێگەیاندوون، ئەگەر وەڵامت نەداتەوە بە وەڵام دانەوە، وەڵامت دەداتەوە بە پەندو عیبرەت، لێرەشدا پرسیارکردنی پێغەمبەر ﷺ، لە پێغەمبەرانی پێشووی، شتێکی نەگونجاوە، بەڵام مەبەست پێی یانی: لەم پرسەدا عەقڵی خۆت بەکاربێنەو،

---

(١) مفاتيح الغيب: ج٢٧، ص:١٩١، ١٩٢.

لە تێگەیشتنی خۆت ڕامێنە، ئەو کاتە دەزانی ناگونجێ و، نەگونجاوە خوا ﷻ بەهیچ کام لە پێغەمبەرانی فەرموو بێ: جگە لە خوا ﷻ بپەرستن، پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) هەموویان تەنیا بە یەکتا پەرستیی خواوە ڕەوانەکراون، پەیامەکەیان کاکڵ و جەوهەرەکەی، ئەوەیە کە مرۆڤەکان تەنیا بەندایەتیی بۆ خوا بکەن.

خـوا بـە لوتـف و کەرەمـی خـۆی یارمەتیـی هەمـوو لایەکمان بـدات، ئێمـەش تەنیا خواپەرستیی، لـە ژیانـی تاکیـی و خێزانیـی و کۆمەڵایەتیـی و سیاسـیی خۆمانـدا زیاتـر تـۆخ بکەینـەوە و، ڕەنـگ پێبدەینـەوە، بـە شـێوەیەك بیـن، کـە تەنیـا خواپەرسـت بیـن و، تەنیـا خـوا بـە پەرسـتراو بزانیـن، بـە واتـاو چەمکـی فـراوان و گشـتگیری پەرسـتن، خـوا پەرسـتیی لـە هەمـوو هەڵسـوکەوتەکانماندا ڕەنـگ بداتـەوە، بێگومـان خـواش ﷻ لـە سـوورەتی (الأنبیـاء)دا، دەفەرمـوێ: ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِىٓ إِلَيْهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعْبُدُونِ ﴿٢٥﴾﴾، واتـە: (ئـەی موحەممـەد ﷺ!) لـە پێـش تـۆدا هیـچ کام لـە ڕەوانەکراوانمـان نەناردوون، مەگـەر ئاگادارمـان کـردوەو، سروشـمان بـۆ کـردوە: جگـە لـە مـن هیـچ پەرسـتراوێك نیـە، ئنجـا تەنیـا بەندایەتیـی بـۆ مـن بکـەن، خـوا ﷻ یارمەتییـمان بـدات، کـە ئەهلـی تەوحیـد بیـن و بمانپارێـزێ لـە شـیرك، لـە هەمـوو جۆرەکانـی شـیرك، گـەورەو گچکـەو ئاشـکراو پەنهـان - چونکـە شـیرك ئـەو گوناهەیـە، کـە قەڵەمـی عەفـووی بەسـەردا نایـەت - هەروەهـا بمانـکات بـە ئەهلـی خـوا پەرسـتن و خـوا بەیەکگرتـن، بـە مانـای فـراوان و گشـتگیری پەرسـتن.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە یـازدە (١١) ئایـەت پێـك دێ، ئایەتەکانـی: (٤٦ - ٤٥)، تێیانـدا گۆشـەیەك لـە بەسـەرهاتی مووسـا ﷺو فیرعـەون و دەسـتەو دایەرەکەی باسـکراوە، کـە مووسـا ﷺ بـە چەنـد بەڵگـەو نیشـانەیەکەوە، چـووە بـۆ لای فیرعـەون و دارو دەسـتەکەی و گەلەکـەی، ئەوانیـش بـە نیشـانەکانی پێکەنیـون و، دوای ئـەوەی سـزای خـوا گرتوونـی و، بەڵایـان بەسـەرهاتوە، داوایـان لـە مووسـا کـردوە، کـە بۆیـان لـە خوا بپاڕێتـەوەو، بەڵایـان لەسـەر لابـەرێ، ئەوانیـش ڕێـی ڕاسـت دەگـرن، کەچـی دوای لابرانـی بـەڵاش، پەیمانیـان هەڵوەشـاندۆتەوە.

هەروەهـا باسـی فیرعـەون کـراوە، کـە خـۆی بـە حوکمڕانیـی میسـڕەوە بـاداوەو، شـانازیی بـە کۆشـك و تەلارەکەیـەوە کـردوە، کـە جۆگـەو ڕووبـار بـە ژێریانـدا دەڕۆن، تانەشـی لـە مووسـا ﷺ داوە و، پێشـنیاری کـردوە، کـە دەبووایـە بازنـەی زێـڕو فریشـتەکان لەگەڵیـدا ببوونایـە، واتـە: مـادام بازنـەی زێـڕی بـۆ دانەبەزێـنراون و، فریشـتەی لەگـەڵ نەنێـردراون، کەواتـە: ڕاسـت نـاکات پێغەمبـەر نیـە، ئیـدی بـەو قسـەو قاڵانـە، خەڵکەکـەی خـۆی عەقـڵ سـووك کـردوە، ئەوانیـش شـوێنی کەوتوون و سـەرەنجام گیـرۆدەی سـزاو جەزرەبـەی خـوا بـوون.

﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِيْهِۦ فَقَالَ إِنِّى رَسُولُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٦﴾ فَلَمَّا جَآءَهُم بِـَٔايَٰتِنَآ إِذَا هُم مِّنْهَا يَضْحَكُونَ ﴿٤٧﴾ وَمَا نُرِيهِم مِّنْ ءَايَةٍ إِلَّا هِىَ أَكْبَرُ مِنْ أُخْتِهَا ۖ وَأَخَذْنَٰهُم بِٱلْعَذَابِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٤٨﴾ وَقَالُواْ يَٰٓأَيُّهَ ٱلسَّاحِرُ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ بِمَا عَهِدَ عِندَكَ إِنَّنَا لَمُهْتَدُونَ ﴿٤٩﴾ فَلَمَّا كَشَفْنَا عَنْهُمُ ٱلْعَذَابَ إِذَا هُمْ يَنكُثُونَ ﴿٥٠﴾ وَنَادَىٰ فِرْعَوْنُ فِى قَوْمِهِۦ قَالَ يَٰقَوْمِ أَلَيْسَ لِى مُلْكُ مِصْرَ وَهَٰذِهِ

ٱلۡأَنۡهَٰرُ تَجۡرِي مِن تَحۡتِيٓۚ أَفَلَا تُبۡصِرُونَ ﴿٥١﴾ أَمۡ أَنَا۠ خَيۡرٞ مِّنۡ هَٰذَا ٱلَّذِي هُوَ مَهِينٞ وَلَا يَكَادُ يُبِينُ ﴿٥٢﴾ فَلَوۡلَآ أُلۡقِيَ عَلَيۡهِ أَسۡوِرَةٞ مِّن ذَهَبٍ أَوۡ جَآءَ مَعَهُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ مُقۡتَرِنِينَ ﴿٥٣﴾ فَٱسۡتَخَفَّ قَوۡمَهُۥ فَأَطَاعُوهُۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَوۡمٗا فَٰسِقِينَ ﴿٥٤﴾ فَلَمَّآ ءَاسَفُونَا ٱنتَقَمۡنَا مِنۡهُمۡ فَأَغۡرَقۡنَٰهُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴿٥٥﴾ فَجَعَلۡنَٰهُمۡ سَلَفٗا وَمَثَلٗا لِّلۡأٓخِرِينَ ﴿٥٦﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە دڵنیایی مووساشمان بە نیشانەکانمانەوە ناردە لای فیرعەون و، بڕیار بە دەستەکانی، گوتی: بێگومان من نێرراوی پەروەردگاری جیهانییانم (بۆ لاتان) (٤٦) ئنجا کاتێك نیشانەکانمانی بۆ هێنان، ئەوان (دارو دەستەی فیرعەون)، کتوپڕ پێیان پێکەنین (٤٧) هیچ نیشانەیەکیشمان پێشان نەدان، مەگەر لە خوشکەکەی (لە هی پێشووی) گەورەتر بوو و، بە ئازارو سزاش گرتمانن، بەڵکو بگەڕێنەوە (٤٨) گوتیشیان: هۆ ئەی جادووگەر! بە هۆی پەیمانێکەوە، کە پەروەردگارت پێیداوی، بۆمان لێی بپاڕێوە، (ئەگەر بەڵامان لەسەر لابدات)، مسۆگەر ئێمە ڕێ ڕاستگرتوو دەبین (٤٩) کەچی کاتێك سزاو ئازارمان لێ لابردن (بەڵایەکەمان لێ دوورخستنەوە)، یەکسەر ئەوان بەڵێنیان شکاند (٥٠) فیرعەونیش لە نێو گەلەکەیدا، بانگی کرد (جاڕیدا)، گوتی: ئەی گەلەکەم! ئایا حوکمڕانیی میسر هی من نیەو، ئەم ڕووبارانەش بە ژێر (کۆشکەکەمدا) دەڕۆن، ئایا نابینن (یان: بە عەقڵ و دڵ نازانن)؟ (٥١) یان ئایا من باشترنیم لەو کەسە (مووسا)، کە ئەو بێ بایەخەو، نیزیکە (نەتوانێ قسە بکات و) مەبەستی ڕوون بکاتەوە (٥٢) (ئەگەر ڕاست دەکات پێغەمبەرە)، دەبوایە بازنەی زێڕی فڕێدرابانە سەر، یان فریشتەکان وێڕای هاتبانایە (٥٣) ئیدی خەڵکەکەی (عەقڵ) سووککردو سەرەنجام

بـە قسـەیان کـرد، چونکـە ئـەوان کۆمەڵێکـی لادەربـوون (٥٤) ئنجا کاتێـك تێمەیـان تـووڕە کـرد، تۆڵەمـان لێسـتاندن و تێکڕایانمـان نغـرۆ کـرد (خنکاندمانـن) (٥٥) لـە ئاکامیشـدا بـۆ ئەوانـی دیکـە کردماننـە پێشـەنگ و پەنـد (٥٦)}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(أُخْتِهَا): (أي: مِـنَ الأَيَـةِ الَّتِـي تَقَدَّمَتْهَـا، وَسَـمَّاهَا أُخْتَـاً لَهَـا، لاشْـتِرَاكِهِمَا فِي الصِّحَّـةِ وَالإِبَانَـةِ وَالصِّـدْقِ)، کـە دەفەرمـوێ: ﴿وَمَا نُرِيهِم مِّنْ ءَايَةٍ إِلَّا هِيَ أَكْبَرُ مِنْ أُخْتِهَا﴾، (أُخْت) واتـە: خوشـك، کـە دەفەرمـوێ: (أُخْتِهَـا) واتـە: لـەو ئایەتـەی، لـەو نیشـانەی کـە لـە پێشـیەوە بـووە، بۆیـە بـە خوشـکی نـاوی هێنـاوە، چونکـە هـەر کام لـە دوو نیشـانەکان، لـە ڕووی ڕاسـتیی و تەواویـی و ڕوونیـی و ڕوونکردنـەوەو ڕاسـتگۆییەوە، وەك یـەك بـوون، یـان هاوبـەش بـوون، وەك چـۆن دوو کـچ کـە لـە دایکێـك دەبـن، بـە خوشـك دادەنرێـن، لـەو ڕووەوە کـە دایکیـان یەکـە، یەکسـانن، ئـەو نیشـانانەش کـە خـوا ﷻ بـە مووسـای ﵇ دابـوون، لـەو ڕووەوە، کـە هەموویان نیشـانەی تـەواو بـوون و، دەرخـەرو ڕوونکـەرەوەی پێغەمبـەر بوونـی مووسـا بـوون و، ڕاسـت و تێـرو تـەواو بـوون، هەموویـان وەك یـەك بـوون.

کـە گوتوویانـە: (يَـٰٓأَيُّهَ ٱلسَّاحِرُ)، هـۆ ئـەی جادووگـەر! (ساحِر)، بـە مانـای جادووگەر دێ، بـەڵام مـەرج نیـە، وشـەکە مەبەسـت پێـی زەم بووبـێ، چونکـە لـە لای ئـەوان زانیاریـی جـادوو، شـتێکی پەسـند بـووە، کەواتـە: (سـاحِر)، واتـە: مامۆسـتا، زانـا.

(عَهِدَ عِندَكَ): واتـە: پەیمانـی بـە تـۆ داوە، بەڵێنـی لـە لای تـۆ هەیـە، (عَهِدَ فُلاَنٌ إلى فُلاَنٍ، يَعْهَـدُ عَهْـدَاً، أَلْقَـى إِلَيْـهِ العَهْـدَ وَأَوْصَـاهُ بِحِفْظِـهِ)، دەگوتـرێ: فـڵان عەهـدی بـۆ لای فڵانکـەس کـرد، (يَعْهَـدُ عَهْـدَاً)، واتـە: پەیمانێکـی بـۆلا هاویشـت، ڕاشیسـپارد، کـە ئـەو پەیـمان و بەڵێنـە بپارێـزێ.

(كَشَفۡنَا عَنۡهُمُ ٱلۡعَذَابَ ): (أَزَلْنَا عَنْهُمُ العَذَاب، وَالكَشْفُ: رَفْعُ وَإِزَالَةُ مَا يَسْتُرُ الشَّيءَ)، کە دەفەرموێ: (كَشَفۡنَا عَنۡهُمُ ٱلۡعَذَابَ )، واتە: سزاکەمان لێ لابردن، بەڵایەکەمان لێ لادان.

(كَشْف): بریتیە لە بەرزکردنەوەو لادانی شتێك، کە شتێك دادەپۆشێ، بۆ وێنە: سەری مەنجەڵێك کە لادەدرێ، یاخود پەردەیەك کە لەسەر شتێك لادەدرێ، دەگوترێ: (كَشَفَهُ) واتە: لایبرد، لایدا.

(يَنكُثُونَ ): (النَّكْثُ: النَّقْضُ وَاسْتُعِيرَ لِنَقْضِ العَهْدِ)، (نَكث): بە مانای هەڵوەشاندنەوە دێ، بە تایبەت کەسێك کە ڕیسێك دەچنێ، یان دەیهۆنێتەوە، دوایی هەڵبوەشێنرێتەوە، پێی دەگوترێ: (نَكْث) کە (نَقض)یشی بۆ بەکاردەهێنرێ، بەڵام لێرەدا خوازراوەتەوە بۆ هەڵوەشاندنەوەو شکاندنی بەڵێن و پەیمان.

(مَهِينٌ): (المَهِينُ: الضَّعِيفُ وَالذَّلِيلُ وَالحَقِير)، بە مانای بێهێزو زەبوون و کەم بایەخ دێ، حاشای مووسا عليه السلام، دیارە فیرعەون لە هەمبانەی خۆیدا گوێزی ژماردوون، بۆیە مووسای وا هاتۆتە بەرچاو، ئەگەرنا هیچکەس لە مووسا عليه السلام، لە ڕۆژگاری خۆیدا خاوەن عیزەتتر نەبووە، وەك هەر کام لە پێغەمبەرانی دیکە.

(يُبِينُ ): دەردەخا (يُبَيِّن، يُوَضِّح)، ﴿وَلَا يَكَادُ يُبِينُ ﴾، خەریکە نەزانێ قسان بکات، یاخود مەبەستی خۆی دەربخات.

(أَسۡوِرَةٌ ): (جَمْعُ سِوَار مِنْ إسْتِوَار الفَارِسِي)، (أَسْوِرَة مِنْ ذَهَب، وَأَسَاوِرَ مِنْ فِضَّة)، ﴿ فَلَوۡلَآ أُلۡقِيَ عَلَيۡهِ أَسۡوِرَةٌ ﴾، (أَسْوِرَة)، کۆی (سِوار)ە ئەویش لە (إستِوار)ی فارسییەوە هاتوە، واتە: ئەوەی لە دەست دەکرێ، ئنجا ئەگەر (أَسْوِرَة) بێ، ئەوەیە کە لە زێڕ دروستکرابێ، بەڵام ئەگەر (أَسَاوِر) بێ، کە کۆی (سوار)ە، لە زیوە، وەك خوا ﷻ لە سوورەتی (الإنسَان)دا، دەفەرموێ: ﴿وَحُلُّوٓاْ أَسَاوِرَ مِن فِضَّةٖ ﴿٢١﴾ ﴾، ڕازێنرانەوە بە بازنەی لە زیو، زانایان وایانگوتوە، بەڵام دەشگونجێ بگوترێ: (أَسْوِرَة مِن فِضَّة، وَأَسَاوِرَ مِنْ ذَهَب)، بە هەرحاڵ هەندێك لە زانایان

وایـان هاتۆتـە بەرچـاو، کـە ئەگـەر (أَسْـوِرَة) بـێ مانـای وایـە، ئـەو بازنانـە لـە زێـڕ دروسـتبوون، بـەڵام ئەگـەر وشـەی (أَسَاوِر) بەکاربهێـنرێ، هەردووکیـان کـۆن، کـۆی (سِـوار)ن، مانـای وایـە لـە زیـو دروسـت بـوون.

(مُقْتَرِنِينَ ): واتـە: پێکـەوە، (قَـرْنُ شَيءٍ بِـشَيء)، پێکـەوە جووتکـردنی شـتێك لەگـەڵ شـتێك دا، (الإقـتِرانُ: كَالإزدِوَاجِ فِـي كَونِـهِ اجْتِـمَاعَ شَـيْئَيْنِ، أو أَشْـيَاءَ فِـي مَعْنَـىً مِـنَ المَعَـانِي)، (إقـتِران) وەك (إزدِوَاج)ە، لـەوەدا کـە دوو شـت یاخـود چەنـد شـتێك لـە مەبەسـتێك لـە مەبەسـتەکاندا یەکـبن و پێکـەوە بـن.

( فَٱسْتَخَفَّ قَوْمَهُۥ): (أي: حَمَلَهُـمْ أَنْ يَخِفُّـوا مَعَـهُ، أو وَجَدَهُـم خِفَافَـاً فِـي أَبْدَانِهِـم وَعَزَائِمِهِـم)، خەڵکەکـەی خـۆی وا لێکـرد، کـە لەگەڵـی سـووك بـن، بـە ئاسـانیی بـە دەسـتیەوە بێـن، واتـە: (أَزْعَجَهُـم وَاسـتَفَزَّهُم)، یاخـود خەڵکەکـەی سـووك بینـی، لـە ڕووی جەسـتەیانەوە سـووکی دیـتن و، لـە ڕووی عەقـڵ و عەزیمەتیانـەوە سـووکەڵەی هاتنـە بەرچـاو.

(ءَاسَفُونَا ): (الأَسَـفُ: الحُـزْنُ وَالغَضَـبُ مَعَـاً)، وشـەی (أَسَـف): بـە خەمباریـی و تووڕەیـی پێکـەوە دەگوتـرێ، بـەڵام خەمباریـی بـۆ خـوا ﷻ بەکارناهێـنرێ، لـە قورئاندا وشـەی خەفـەت خـواردن بەکارنەهاتـوە، هەروەهـا لـە سـوننەتدا، بـەڵام وشـەی تووڕەیـی بـۆ خـوا ﷻ بەکارهاتـوە، {غضـب اللـه علیهـم}، {سَـبَقَتْ رَحْمَتِـي غَضَبِـي}، (أخرجـه مسـلم: ٢٧٥١)، بۆیـە (ءَاسَفُونَا )، واتـە: (أَغْضَبُونَـا) تووڕەیـان کردیـن.

(سَلَفًا ): (السَّـلَفُ: المُتَقَـدِّمُ)، (سـلف) ئەوەیـە کـە تێپەڕییبـێ و، ڕۆیشـتبێ، پێشـەنگ، کەواتـە: ﴿ سَلَفًا وَمَثَلًا ﴾، واتـە: (مُعتَـبَرَاً مُتَقَدِّمَـاً)، پەنـد لێوەرگیراوێکـی ڕابـردوو.

(وَمَثَلًا ): (شَـبَهَاً)، هەروەهـا (مَثَـل) بـە مانـای وێچـوو دێ، شـتێك بـە شـتێك بچـێ، (هَـذَا مِثْـلُ هَـذَا، شِـبْهُهُ، أو شَـبِيهُهُ)، (مَثَـل ومِثْـل)، وەك (شِـبْهُ وشَـبَه)، یـانی: ئـەو شـتە وەك ئـەو شـتە، بـەڵام وێـڕای ئـەوەش (مَثَـل) لـە زمانـی عەرەبییـدا، بـە مانـای

پەندیش دێ، کە ئێمە بە کوردیی دەڵێین پەند، پەندی پێشینان، کە بەمجۆرە پێناسە کراوە: (قَوْلٌ فـي شَيءٍ يُشْبِهُ قَولاً فـي شَيءٍ آخَر، بَيْنَهُمَا مُشَابَهَةٌ لِيُبَيِّنَ أَحَدُهُمَا الآخَرَ وَيُصَوِّرَهُ مِثلُ: الصَّيْفَ ضَيَّعْتِ اللَّبَن)، (مَثَل): پەند، بریتییە لە قسەیەك لە بارەی شتێکەوە، کە وەك قسەیەکی دیکە دەچێ، لە بارەی شتێکی دیکەوەو لە نێوانیاندا وێکچوون هەیە، تاکو یەکێکیان ئەوی دیکە ڕوون بکاتەوەو، وێنای بکات، بۆ وێنە: عەرەب گوتوویانە: (الصَّيْفَ ضَيَّعْتِ اللَّبَن)، {لە هاوینێ دا شیرەکەت لە دەست دا}، کە ئەوە بەسەرهاتێکی هەیە: پیاوێك ویستوویەتی ئافرەتێك بێنێ، داوای لێکردوە هاوسەرگیریی لەگەڵ بکات، ئەو کاتەش کەشی هاوین بووەو ئافرەتەکە ڕەفزی کردوە، ئنجا ئایا خزمی بووە، یان بێگانە بووە، دوایی وا بووە کە ئەو ئافرەتە، هاوسەرگیریی کردبێ، یان نەکردبێ، گرنگ ئەوەیە هەژار کەوتوەو، هەژاریی و ناچاریی سەری پێ بە ماڵی ئەو کابرایەدا کردوەو، داوای هاوکاریی لێکردوە، ئەویش پێیگوتوە: لە هاوینێ دا شیرەکەت زایە کرد، دیارە دەبێ چووبێ، داوای شیرێك و خۆراکێکی لێ کردبێ، ئەویش گوتی: لە هاوینێ دا، واتە: ئەو کاتەی کە هاتم داوام لێ کردی هاوسەرگیرییم لەگەڵدا بکەی و ڕەفزت کردم، ئەگەرنا ئێستا شیرت دەبوو.

پەندیی کوردییش بۆ وێنە: (دیزە دەرخۆنەی دیتەوە)، یان (بانێکەو دوو هەوایە)، هەموو ئەوانە بەسەرهاتیان لەسەرە، پەند (مَثَل)یش، عادەت وایە مانای زۆر، لە چەند وشەیەکی کەمدا کۆ دەکاتەوە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

بەسەرهاتی مووسا ﷺ لە سێ ئایەتی پێشوودا ڕابرد، ئەمجارە خوا بەسەرهاتی دووەم، بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەگێڕێتەوە، هەڵبەتە گۆشەیەك لە بەسەرهاتی مووسا، کە وەك گوتمان هەم بۆ دڵدانەوەی پێغەمبەر ﷺو، هاوەڵان و شوێنکەوتووانی بەڕێزیەتی (خوا لێیان ڕازی بێ)، هەروەها بڕواداران تاکو ڕۆژی دوایی، تاکو ژیانی مرۆڤ لەسەر زەوی مابێ، هەروەها هۆشدارییدانیشە بە نەیارەکانی پێغەمبەر ﷺ، کە: بترسێن لەوەی هەمان سەرەنجامی شووم و خراپ، کە بەسەر فیرعەون و دەستەو دایەرەکەی هات، بەسەر ئێوەش بێ، هەروەك چۆن ئەوان بە مووسا ﷺ بێبڕوا بوون، بە ئایەتەکانی پێکەنین و ڕێزیان لە مووسا نەگرت، فیرعەون خۆی بەسەردا هەڵکێشا، بەڵام دوایی تووشی سزاو جەزرەبەی خوا ﷻ بوون، ئێوەش بترسێن کە هەمان چارەنووس بەسەر ئێوەش بێت، چونکە ئەگەر هەر لە ڕێی وانەوە بڕۆن، هەمان شت کە هاتۆتە ڕێی وان، دێتە ڕێی ئێوەش.

﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَـٰتِنَآ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِي۟هِۦ ﴾، بە دڵنیایی مووسامان بە نیشانەکانمانەوە نارد بۆ لای فیرعەون و، بڕیار بە دەستەکانی، دەستەو دایەرەکەی، (الملأ): (أَشْرَافُ قَوْمِهِ)، ئەوانەی لە خەڵکەکەی ناو بەدرەوە بوون و، دەستڕۆیشتوو بوون و، بڕیار بەدەست بوون، بۆیەش ناویان لێنراوە: (مَلأ): (لإِنَّهُم يَمْلَئُونَ القُلُوبَ هَيْبَةً وَالعُيُونَ رِوَائَاً)، لەبەر ئەوەی دڵی خەڵکیان پڕ دەکرد لە سام و هەیبەت و، چاویشیان پڕ دەکردن لە جوانیی، تەماشایان دەکردن، زرق و برقی دنیایان زۆر بوو، ﴿ فَقَالَ إِنِّى رَسُولُ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴾، مووسا ﷺ فەرمووی: من ڕەوانەکراوی پەروەردگاری جیهانییانم، واتە: خوا ﷻ منی بۆ لای ئێوە ڕەوانە کردوە، کە پەیامی خواتان پێ بگەیەنم.

ئێمە بەسەرهاتی مووسا عليه السلام، کە لە سەرەتای سووڕەتی: (**القَصَص**)دا، پێنج ئاڵقەیمان باسکردوون و، لە سووڕەتی: (**الأعرَاف**)یشدا هەشت ئاڵقەی، واتە: هەر سێزدە ئاڵقەکەی بەسەرهاتی مووسا عليه السلاممان باسکردوون، کە بە پلەی یەکەم مووسا عليه السلام خوا ﷻ ناردوویەتی، گەلی بەنوو ئیسرائیل لە ژێر چنگی فیرعەون دەربێنێ، کە سۆغرەو پێگاری پێ دەکردن، ئافرەتەکانی دەهێشتەوەو، نێرینەکانی سەر دەبڕین، بەڵام وێڕای ئەوە بە دڵنیایی پەیامی خواشی بە فیرعەون و بە گەلەکەی کە قیبتییەکان بوون و لە میسر نیشتەجێ بوون، بەوانیش گەیاندوە.

﴿ فَلَمَّا جَآءَهُم بِـَٔايَـٰتِنَآ إِذَا هُم مِّنْهَا يَضْحَكُونَ ﴾، ئنجا کاتێك نیشانەکانی ئێمەی بۆ هێنان، کتوپڕ بەو نیشانانە پێکەنین، خەڵکەکە ئەو نیشانانەیان کردنە مایەی گاڵتە پێکردن و، پێ پێکەنین، دیارە کە مووسا عليه السلام کە گۆچانی فڕێداوە بۆتە مارو، دەستی بردۆتە بن قۆڵی و، بن هەنگڵی، دوایی دەری هێناوەتەوە، وەك گڵۆپێکی زۆر بە شۆق ئایساوە، نیشانەکانی دیکە کە خوا ﷻ هەم لە سووڕەتی (**النَّمل**)داو، هەم لە سووڕەتی (**الإسرَاء**)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ تِسْعَ ءَايَـٰتٍۭ بَيِّنَـٰتٍ ﴿١٠١﴾ ﴾، نۆ نیشانەی ڕۆشنمان بە مووسا دابوون، ئنجا کاتێك ئەو نیشانانەیان بینیون، پێیان پێکەنیون.

﴿ وَمَا نُرِيهِم مِّنْ ءَايَةٍ إِلَّا هِىَ أَكْبَرُ مِنْ أُخْتِهَا ﴾، هیچ نیشانەیەکیشمان پێشان نەداون، مەگەر گەورەتر بووە لە خوشکەکەی، واتە: لەوەی کە لە پێشیەوە بووە، یاخود لە دوایەوە بووە، وەك لە کوردەوارییدا دەڵێن، یەك لە یەکی گەورەترو، نیشانەکانی کە خوا ﷻ بە مووسا عليه السلامی داون، هەموویان گەورە بوون، تەماشای هەر کامێکیانت کردبایە، دەتگوت ئەوەیان لەوی دیکە گەورەترە، ﴿ وَأَخَذْنَـٰهُم بِٱلْعَذَابِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴾، بە سزاو ئازاریش گرتمانن، بەڵکو بگەڕێنەوە، واتە: بەڵکو بگەڕێنەوە لەو سەرکەشیی و یاخیی بوونە.

﴿ وَقَالُوا۟ يَـٰٓأَيُّهَ ٱلسَّاحِرُ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ بِمَا عَهِدَ عِندَكَ ﴾، کاتێك کە خوا ﷻ بە سزا گرتنی و بەڵای بۆ ناردن، ئەوانیش گوتیان: ئەی جادووگەر! ﴿ ٱدْعُ لَنَا

رَبَّكَ بِمَا عَهِدَ عِندَكَ ﴾، بۆمان لە پەروەردگارت بپاڕێوە، بەهۆی ئەوەوە کە پەروەردگارت بەڵێنی بە تۆ داوە، پەیمانی لە لای تۆ داناوە، کە داوات بگرێتەوە، ﴿ إِنَّنَا لَمُهْتَدُونَ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە ڕێ ڕاستگرتوو دەبین، ئەگەر ئەو بەڵایەمان لەسەر لابچێ، کاتی خۆی لە بەسەرهاتی مووسادا ﷺ، بە درێژیی باسمان کردوە، کە هەر جارێك بەڵایەکیان بەسەر هاتوەو، نارەحەت بوون، چوون بۆ لای مووساو، داوایان لێکردوە، ئەوجارە ئەو بەڵایەیان لێ لابەرێ، بڕوا دێنن، بەڵام کە بەڵایەکەیان لێ لاچووە، گەڕاونەوە سەر بەزمی پێشوویان، هەر بەو شێوەیە، لە پەیمانی کۆندا بە درێژیی باسی بەڵایەکانیش کراوە، لە سوورەتی: (الأعرَاف) دا، خوا ﷻ باسی حەوتیان دەکات، کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ أَخَذْنَآ ءَالَ فِرْعَوْنَ بِٱلسِّنِينَ وَنَقْصٍ مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٣٠﴾ فَإِذَا جَآءَتْهُمُ ٱلْحَسَنَةُ قَالُوا۟ لَنَا هَٰذِهِۦ ۖ وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ يَطَّيَّرُوا۟ بِمُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓ ۗ أَلَآ إِنَّمَا طَٰٓئِرُهُمْ عِندَ ٱللَّهِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٣١﴾ وَقَالُوا۟ مَهْمَا تَأْتِنَا بِهِۦ مِنْ ءَايَةٍ لِّتَسْحَرَنَا بِهَا فَمَا نَحْنُ لَكَ بِمُؤْمِنِينَ ﴿١٣٢﴾ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ ٱلطُّوفَانَ وَٱلْجَرَادَ وَٱلْقُمَّلَ وَٱلضَّفَادِعَ وَٱلدَّمَ ءَايَٰتٍ مُّفَصَّلَٰتٍ فَٱسْتَكْبَرُوا۟ وَكَانُوا۟ قَوْمًا مُّجْرِمِينَ ﴿١٣٣﴾ ﴾.

١- ﴿ بِٱلسِّنِينَ ﴾، وشکەساڵیی و، ساڵی گرانیی.

٢- ﴿ وَنَقْصٍ مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ ﴾، لە دەستدانی بەروبووم و میوەو کشتوکاڵ، دوایی باسی پێنجی دیکەیان دەکات:

٣و ٤و ٥و ٦و ٧- ﴿ ٱلطُّوفَانَ وَٱلْجَرَادَ وَٱلْقُمَّلَ وَٱلضَّفَادِعَ وَٱلدَّمَ ﴾، تۆفان و، کوللەو، ئەسپێ و، بۆق و، خوێن، کە لە شوێنی خۆی دا بە درێژیی باسمان کردوە، چۆنیەتیی ئەو بەڵایانە چۆن بوون؟ ئەمانە حەوتیان، دووانیشیان: گۆچانەکەی و دەستی بوون، ئەوە نۆ.

هەندێکیش لە زانایان بە جۆرێکی دیکە باسی ئەو نۆیانە دەکەن، بەڵام ئەو نۆیانەی گوتمانن، لە هەموویان ئاشکراترن.

﴿ فَلَمَّا كَشَفْنَا عَنْهُمُ ٱلْعَذَابَ إِذَا هُمْ يَنكُثُونَ ﴾، ئنجا کاتێك ئێمە ئازارو سزامان لێ لابردن، ئەوان کتوپڕ هەڵیانوەشاندەوە، واتە: ئەو بەڵێنەی دابوویان، کە ڕێی ڕاست دەگرن، ئەو بەڵێنەیان هەڵوەشاندەوە، کە ئەوەش بەس جارێك نەبووە، بەڵام لێرەدا خوا ﷻ بە کورتیی باسی دەکات، ئەگەرنا هەتا ئەو نیشانانە هەموویان تەواو بوون، هەموو جارێ پەیمانیان هەڵوەشاندۆتەوە، نە جارێك بووەو، نە دوو و نە سێ!!

﴿ وَنَادَىٰ فِرْعَوْنُ فِي قَوْمِهِۦ ﴾، دوای ئەوەی خوا بە گشتیی باسی گەلی فیرعەونی کرد، کە چۆن لەگەڵ مووسادا ﷺ، بێ بەڵێن و بێ پەیمان بوون، ئنجا باسی فیرعەون دەکات بە تایبەت، دەفەرموێ: فیرعەون لە نێو خەڵکەکەیدا بانگی کرد، هەڵبەتە خۆی بانگی نەکردوە، یانی: جارڕیداو جارچیی ڕاسپاردن، جاڕ بدەن و بانگ بکەن، ﴿ قَالَ يَٰقَوْمِ أَلَيْسَ لِي مُلْكُ مِصْرَ ﴾، گوتی: ئەی خەڵکەکەم! ئایا حوکمڕانیی میسڕ هی من نیە؟! ﴿ وَهَٰذِهِ ٱلْأَنْهَٰرُ تَجْرِي مِن تَحْتِيٓ ﴾، ئەم ڕووبارانەش بە ژێرمدا دەڕۆن، واتە: بە ژێر کۆشکەکەمدا، کە لە ڕووباری نیلەوە چەند جۆگەیەکیان هەڵبەستوون، بۆ جوانیی و ئاودێریی و بۆ هەر مەبەستێکی دیکەی ویستوویانە، ئنجا ئەو جۆگەو ڕووبارانە، هەندێکیان بە ژێر کۆشکەکەی یان بەملاولای کۆشکی فیرعەوندا ڕۆیشتوون، ﴿ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴾، ئایا نابینن! واتە: ئایا حوکمڕانییەکەی من و کۆشك و تەلارەکەم و، ئەو جۆگەو جۆبارانە کە بە ژێر کۆشکەکەمدا دەڕۆن، نابینن؟!.

﴿ أَمْ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْ هَٰذَا ٱلَّذِي هُوَ مَهِينٌ ﴾، یان ئایا من چاکترم لەو کەسەی، کە ئەو بێ بایەخە، یاخود بێ هێزو بێ توانایە، کە مەبەستی مووسا ﷺ بووە، حاشای مووسا، بەڵام لە بێ بایەخان وایە، هەموو کەس بێ بایەخە، مرۆڤ خۆی چۆن بێت، ئاواش تەماشای خەڵك دەکات! ﴿ وَلَا يَكَادُ يُبِينُ ﴾، نیزیکە نەتوانێ ڕوون بکاتەوە، واتە: نیزیکە نەتوانێ مەبەستەکانی خۆی ڕوون بکاتەوەو بگەیەنێ.

هەڵبەتە وەك دوایی باسی دەکەین، هەموو توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: ئەم قسەیەی فیرعەون درۆ بووەو، ئەوی دیکەشیانی تۆمەت بووە، چونکە دوای ئەوەی بە ڕوونیی لە قورئاندا هاتوە، کە مووسا ﷺ لە خوا ﷻ دەپاڕێتەوە: ﴿ وَٱحۡلُلۡ عُقۡدَةً مِّن لِّسَانِي ﴿٢٧﴾ يَفۡقَهُواْ قَوۡلِي ﴿٢٨﴾ ﴾طه، گرێیەك لە زمانم بکەوە، بۆ ئەوەی لە قسەم تێبگەن، سەرەنجام خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ قَالَ قَدۡ أُوتِيتَ سُؤۡلَكَ يَٰمُوسَىٰ ﴿٣٦﴾ ﴾طه، گوتی: داواکراوەکەتت پێدرا، ئەی مووسا! کەواتە: خوا ﷻ زمانی کردۆتەوە، بەڵام فیرعەون لە مووسا هەر لە بەهانە بووە، لەبەر ئەوەی کاتی خۆی لە ماڵی فیرعەوندا گەورە بووە، باوە کە مووسا زمانی لەنگیی تێدا هەبووە، یاخود زمانی لە هەندێ پیتاندا گرتوویەتی، ئنجا کە وەختی خۆی فیرعەون ئەو سەرنجەی لەسەری هەبووە، بەپێی ئەو سەرنجەی پێشێی حوکمی داوە، ئەگەرنا بێگومان خوا ﷻ پێغەمبەرێك بنێرێ، ئەوەندە زمانپاراویی و ڕەوانبێژیی پێ دەدات، کە مەبەستی خۆی بگەیەنێ و ئەوەی دەیەوێ ڕوونی بکاتەوە، کەواتە: ئەوە هەر قسەیەك بووەو، بە حوکمی سەرنجی پێشووی فیرعەون لە بارەی مووساوە، گوتراوە، نەك بە حوکمی ئێستای، کە تەماشاش دەکەین مووسا ﷺ، لەگەڵ فیرعەوندا وتوێژی کردوە، بە تایبەتی ئەوەی لە سووڕەتی (**الشُّعَراء**)دا هاتوە، هەروەها لە سووڕەتی (**طه**)دا، زۆر بە ڕوونیی دیارە کە قسەکانی مووسا ﷺ بەڵگەدارو ڕوون و پتەوو مەحکەم بوون.

﴿ فَلَوۡلَآ أُلۡقِيَ عَلَيۡهِ أَسۡوِرَةٞ مِّن ذَهَبٍ ﴾، دەبووایە بازنەی لە زێڕی بۆ هەڵدرابان، واتە: لە ئاسمانەوە لەلایەن خواوە، دەبووایە بازنەی زێڕی بۆ نێردرابانایە، ﴿ أَوۡ جَآءَ مَعَهُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ مُقۡتَرِنِينَ ﴾، یاخود فریشتەکان لەگەڵی بوونایەو هاودەم و هاوڕێی بوونایە، یانی: وێڕای مووسا، فریشتەکان هاتبانایەو، بە کۆمەڵ لەگەڵی بوونایە، بەڵام ئێستا مادام بازنی زێڕی بۆ فڕێنەدراون و، فریشتەی لەگەڵ نەنێردراون، کەواتە: ڕاست ناکات پێغەمبەر نیە، مێژوو زانان دەڵێن: ئەو کاتە پادشاکانی میسرو هەندێ شوێنی دیکە، عادەتیان وابووە، بازنەی زێڕیان

لـە دەسـت بـووە، واتـە: مـادام مووسـا ﷺ بازنـەی زێـڕی لـە دەسـت نیـن، وەك دنیایەتیـی، وەك لای خـواش فریشـتەی لەگـەڵ نیـن، کەواتـە: نـە بەڵگەیەکـی دنیایـی هەیـەو، نـە بەڵگەیەکـی دینیـی و مەعنەوییشـی هەیـە، کـە ئـەو داوایـەی دەیـکات ڕاسـت بـێ.

﴿ فَٱسْتَخَفَّ قَوْمَهُۥ فَأَطَاعُوهُ ﴾، فیرعـەون خەڵکەکـەی خـۆی سـووککرد، واتـە: عەقڵـی سـووککردن و چەواشـەی کـردن و گەوجاندنـی.

یاخـود: خەڵکەکـەی خـۆی سـووك بینـی، (أي: جَعَلَهُـم خِفَافَـاً، أو وَجَدَهُـم خِفَافَـاً)، سـووکی کـردن، یـان بـە سـووکی بینیـن، سـووکی لـێ هەڵکەوتـن، ﴿ فَأَطَاعُوهُ ﴾، ئەوانیـش بـە قسـەیان کـرد، لەبـەر ئـەوەی سـووکەڵە بـوون، لـە ڕووی عەقـڵ و تێگەیشـتنەوە، وەك چـۆن بـا کـە دێ، ناتوانـێ بـەرد ڕامالـێ، بـەڵام دەتوانـێ پـووش و پـەڵاش و خانگەرۆشـك ڕابـدات، بۆیـە فیرعـەون توانـی هەڵیانخەڵەتێنـێ ئەوانیـش بـە قسـەیان کـرد، ﴿ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا فَٰسِقِينَ ﴾، بـە دڵنیایـی ئـەوان کۆمەڵێکـی لادەربـوون، لادەربـوون لـە حوکمـی عەقـڵ و زگـماك و شـەریعەتی خـوا، بۆیـە کەوتنە داوی فیرعەونـەوە.

﴿ فَلَمَّآ ءَاسَفُونَا ٱنتَقَمْنَا مِنْهُمْ ﴾، کاتێـك ئێمەیـان تـووڕە کـرد، بوونـە هـۆکاری تووڕەیـی ئێمـە، تۆڵەمـان لێسـتاندن، ﴿ فَأَغْرَقْنَٰهُمْ أَجْمَعِينَ ﴾، هەموویانـمـان خنکانـدو، نغرۆمـان کـردن (لـە دەریـای سـووردا، وەك لـە بەسـەرهاتەکەیدا بـە تەفصیـڵ باسـمان کـردوە).

﴿ فَجَعَلْنَٰهُمْ سَلَفًا وَمَثَلًا لِّلْءَاخِرِينَ ﴾، گێڕامانـن بـە پێشـەنگ و بـە پەنـد، بـۆ ئەوانـی دوایـان، واتـە: گێڕامانـن بـە پەندێـك کـە پێشـکەوتووەو بۆتـە پێشـەنگ، بـۆ ئـەو گـەل و نەتەوانـەی دوایـی دێـن، کـە پەنـد لـە فیرعـەون و دارو دەسـتەکەی وەربگـرن، خۆشـیان لـەوە بـە دوور بگـرن کـە بـە دەردی ئـەوان بچـن.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**نێررانـی مووسـا ﷺ بـە بەڵگـەو نیشـانەکانەوە بـۆ لای فیرعـەون و دارو دەسـتەکەی و ڕاگەیاندنـی مووسـا، کـە پێغەمبـەری جیهانییانـە بـۆ لای ئـەوان، کەچـی پێکەنینیـان بـە نیشـانەکان، هەرچەنـدە یـەك لـە یەکـی گەورەتـر بـوون و، سـەرەنجام سـزادرانیان و، دوایـی بەڵێندانیـان بـە مووسـا، کـە ئەگـەر داوایـان بـۆ لـە خـوا بـکات، ئـازارو بەڵایـان لەسـەر لابـدات، ڕێـی ڕاسـتگرتوو دەبـن، بـەڵام بـێ بەڵێنیـی و پەیـمان شـکاندنیان:**

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِآيَاتِنَا إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِيْهِ فَقَالَ إِنِّي رَسُولُ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿٤٦﴾ فَلَمَّا جَاءَهُم بِآيَاتِنَا إِذَا هُم مِّنْهَا يَضْحَكُونَ ﴿٤٧﴾ وَمَا نُرِيهِم مِّنْ آيَةٍ إِلَّا هِيَ أَكْبَرُ مِنْ أُخْتِهَا وَأَخَذْنَاهُم بِالْعَذَابِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٤٨﴾ وَقَالُوا يَا أَيُّهَ السَّاحِرُ ادْعُ لَنَا رَبَّكَ بِمَا عَهِدَ عِندَكَ إِنَّنَا لَمُهْتَدُونَ ﴿٤٩﴾ فَلَمَّا كَشَفْنَا عَنْهُمُ الْعَذَابَ إِذَا هُمْ يَنكُثُونَ ﴿٥٠﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دە بڕگەدا:

١)- ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِآيَاتِنَا ﴾، بە دڵنیایی مووسامان بە نیشانەکانمانەوە نارد، واتە: مووسامان ناردو، نیشانەکانی پێ بوون، کە بێگومان لێرەدا مەبەست لە نیشانەکان (آیات)، ئەو موعجیزانە بوون، کە بەڵگە بوون لەسەر ڕاستیی پێغەمبەرایەتیی مووسا ﷺ، وەك لە سووڕەتی (الإسرَاء)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَىٰ تِسْعَ آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ فَسْأَلْ بَنِي إِسْرَائِيلَ إِذْ جَاءَهُمْ فَقَالَ لَهُ فِرْعَوْنُ إِنِّي لَأَظُنُّكَ يَا مُوسَىٰ مَسْحُورًا

﴿١٠١﴾ قَالَ لَقَدْ عَلِمْتَ مَآ أَنزَلَ هَٰٓؤُلَآءِ إِلَّا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ بَصَآئِرَ وَإِنِّى لَأَظُنُّكَ يَٰفِرْعَوْنُ مَثْبُورًا ﴿١٠٢﴾﴾، واتە: بە دڵنیایی نۆ نیشانەی ڕووغان بە مووساداں، لە بەنوو ئیسرائیل بپرسە (ئەی موحەممەد ﷺ!) کاتێك کە مووسا چوو بۆ لایان، فیرعەون پێیگوت: ئەی مووسا! من بە جادوو لێکراوت تێدەگەم، {(مووساش عليه السلام) وەڵامی دایەوەو}، گوتی: ئەو نیشانانە تەنیا پەروەردگاری جیهانییان داییەزاندوون و، ناردوونی و منیش بە سەر بە فەتارەت چووت تێدەگەم، ئەی فیرعەون! کە هەر واش بوو.

٢)- ﴿إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِي۟هِۦ﴾، {مووسامان بە نیشانەکانمانەوە، بە بەڵگەو موعجیزەکانەوە}، بۆ لای فیرعەون و دارو دەستەکەی، نارد، (**المَلأ: العُظَمَاءُ، وَالمُتَنَفِّذُونَ مِنْ قَوْمِهِ**)، (**ملأ**) مەزنەکان و زلەزلەکان و، قسە ڕۆیشتووەکان و بڕیار بە دەستەکان لە گەلەکەی.

٣)- ﴿فَقَالَ إِنِّى رَسُولُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾، {مووسا عليه السلام} فەرمووی: من ڕەوانە کراوی پەروەردگاری جیهانییانم.

هەمـوو پێغەمبـەران (عَلَيْهِـمُ الصَّـلَاةُ وَالسَّـلَامُ) نێـرراوو نوێنـەری خـوا بـوون بـۆ لای خەڵـك و، پەیـام هەڵگـرو پەیـام هێنـەری خـوا ﷻ بـوون.

٤)- ﴿فَلَمَّا جَآءَهُم بِـَٔايَٰتِنَآ إِذَا هُم مِّنْهَا يَضْحَكُونَ﴾، ئنجا کاتێك بە نیشانەکانمانەوە چوو بۆ لایان، نیشانەکانمانی بۆ بردن و نیشانی دان، وەك بەڵگە لەسەر ئەوە کە ڕاست دەکات، خوای پەروەردگار ناردوویەتی، ئەوان کت و پڕ، دەستیان کرد بە پێکەنین بە نیشانەکانی، پێکەنینی دەستەو دایەرەکەی فیرعەون بە نیشانەکانی مووسا، هەروەك گاڵتە پێکردنەکەی هۆزی بێبڕوای قورەیش بووە، لە ڕۆژگاری خۆیدا، بە پێغەمبەر ﷺو شوێنکەوتووەکانی لە هاوەڵانی بەڕێزی (خوا لێیان ڕازی بێ)، وەك خوا ﷻ لە سوورەتی (**المُطَفِّفِين**)دا، دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ أَجْرَمُوا۟ كَانُوا۟ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يَضْحَكُونَ ﴿٢٩﴾﴾، واتە: ئەوانەی تاوانبارییان کرد بوو، بەوانەی بڕوایان هێنابوو پێدەکەنین، ﴿وَإِذَا مَرُّوا۟ بِهِمْ يَتَغَامَزُونَ ﴿٣٠﴾﴾، هەرکات بڕواداران بە لایاندا تێدەپەڕین، چاو

و برۆیان لێك هەڵدەتەکاندو ئاماژەیان بۆ یەکدی دەکرد، ﴿ وَإِذَا ٱنقَلَبُوٓاْ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِمُ ٱنقَلَبُواْ فَكِهِينَ ﴿٣١﴾ ﴾، کاتێکیش دەگەڕانەوە بۆ لای ماڵ و خێزانیان، زۆر شادمانانەو زۆر خۆشحاڵانە دەگەڕانەوە، (کە ئەمڕۆش بەرهەم و دەستکەوتێکیان بووە، گاڵتەیان بە بڕواداران کردوە!) ﴿ وَإِذَا رَأَوۡهُمۡ قَالُوٓاْ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَضَآلُّونَ ﴿٣٢﴾ ﴾، کاتێك بینیبایانن دەیانگوت: ئەوانە سەرگەردان و گومڕاو سەر لێشێواون، ﴿ وَمَآ أُرۡسِلُواْ عَلَيۡهِمۡ حَٰفِظِينَ ﴿٣٣﴾ ﴾، هەرچەندە وەك پارێزەریش نەناردرابوونە سەریان.

بـەڵام لـە ڕۆژی دوایـی دا: ﴿ فَٱلۡيَوۡمَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنَ ٱلۡكُفَّارِ يَضۡحَكُونَ ﴿٣٤﴾ ﴾، ئەمـڕۆ ئەوانـەی بڕوایـان هێنـا بـوو، بـە بێبڕوایـەکان پێدەکەنـن، ﴿ عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِ يَنظُرُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾، لەسـەر تەختـان شـانیان داداوە، پاڵیـان داوەتـەوەو تەماشـا دەکـەن، تەماشـای بێبڕوایـان دەکـەن چـۆن سـزا دەدرێـن، ﴿ هَلۡ ثُوِّبَ ٱلۡكُفَّارُ مَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ ﴿٣٦﴾ ﴾، ئایـا ئەوانـەی بێبـڕوان، سـزای ئەوەیـان درایـەوە، کـە دەیانکـرد؟ بـە تەئکیـد بەڵـێ، سـزایان درایـەوە.

پێشـتریش گوتمـان: ئـەوە هەمـووی دڵدانەوەیـە بـۆ پێغەمبـەر ﷺو، بـۆ بـڕواداران، چونکـە ئـەوان ئـەو کاتـە لە حـاڵ و وەزعێکـی وا دابـوون، بێبڕوایەکان پێیـان پێکەنیون و گاڵتەیـان پێکـردوون، بەڵکـو لـەوەش زیاتـر ئازاریـان داون، واتـە: بڕوادارینـە! دڵتـان لـە خۆتـان دانەمێنـێ، لـە پێـش ئێوەشـدا مووسـا ﷺ و شـوێنکەوتووانی گاڵتەیـان پێکـراوە، لـە لایـەن فیرعەونییـە ناحەزەکانیانـەوە.

٥)- ﴿ وَمَا نُرِيهِم مِّنۡ ءَايَةٍ إِلَّا هِيَ أَكۡبَرُ مِنۡ أُخۡتِهَا ﴾، هیچ نیشانەیەکمان پێشان نەدەدان، {پێشانی فیرعەون و دارو دەستەکەی}، مەگەر گەورەتر بوو لە خوشکەکەی، لێرەدا: ﴿ أُخۡتِهَا ﴾، خوازراوەتەوە بۆ ئەوە کە ئەو نیشانانە، هەموویان لە یەك سەرچاوە هاتوون، وەك چۆن چەند کچێك، لە دایکیاندا پێك دەگەنەوە، ئەو نیشانانەش هەموویان لەوەدا کە گەورە بوون، جێی سەرنج بوون و، بەڵگە بوون، لەسەر ڕاستیی مووسا ﷺ، ئەوە هەموویان پێك گەیشتوونەوەو خاڵی هاوبەشیان بووە، کە

دەفەرموێ: ﴿ وَمَا نُرِيهِم ﴾، ئەمە بۆ ئامادەکردنی وێنەکەیە، (لاستِحضَارِ الصُّورَةِ)، کە دەفەرموێ: هیچ نیشانەیەکیان پێشان نادەین، مەگەر گەورەتر لە خوشکەکەی، واتە: (مِنْ أُخْتِهَا السَّابِقَة)، لە خوشکە پێشووەکەی، هەروەك لە سوورەتی (الكَهف)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَكَانَ وَرَآءَهُم مَّلِكٌ يَأْخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصْبًا ﴿٧٩﴾ ﴾، لە پشتیانەوە حوکمڕانێك هەبوو، هەر کەشتییەکی دەست بەسەردا دەگرت، واتە: (كُلَّ سَفِيْنَةٍ صَالِحَةٍ)، هەر کەشتییەکی باشی دەست بەسەردا دەگرت.

٦)- ﴿ وَأَخَذْنَٰهُم بِٱلْعَذَابِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴾، ئێمە بە سزا گرتمانن، بەڵکو بگەڕێنەوە، کە دەفەرموێ: بگەڕێنەوە، ئەمە خوازراوەتەوە بۆ دان پێهێنان و ملکەچ کردن بۆ پەیامەکەی، کە بە مووسادا ﷺ نێردراوە.

٧)- ﴿ وَقَالُواْ يَٰٓأَيُّهَ ٱلسَّاحِرُ ﴾، گوتیان: هۆ ئەی جادووگەر! وشەی (أَيُّهَا)، هەم بە (ها) (ه) و (ا) خوێنراوەتەوە، هەم بە (أَيُّهَ)، واتە: تەنیا بە (ه)، بە بێ ئەلیفیش خوێنراوەتەوە، کە ئەمە دەگونجێ وەك تانەدان بووبێ لە مووسا ﷺ، کە تۆ جادووگەری، بەڵام ئەوە پێناچێ، چونکە سیاقەکە وای ناگەیەنێ، ئەگەرنا فیرعەون مووسای بە جادووگەر تۆمەتبار کردوە، بەڵام لێرەدا سیاقەکە تانەدان ناگەیەنێ، چونکە ئەوان داوایان لە مووسا ﷺ کردوەو، کەسێکیش داوا لە کەسێك بکات، لە حاڵەتی داوا لێکردندا مەدحی دەکات، نەك سەرزەنشتی بکات، پیشەی جادووگەرییش لە لای ئەوان، پیشەیەکی گرنگ و گەورە بووە، کەسێك کە جادووگەر بووە، مامۆستاو زانا بووەو، جادووش زانیارییەکە، بەڵام زانیارییەکە بۆ مەبەستی خراپ بەکاردەهێنرێ، یەکێك لە زانایان گوتوویەتی: (هَذَا خِطَابُ تَعْظِيمٍ لِمُوسى لأَنَّ السَّاحِرَ هُوَ العَالِم)، ئەمە دواندنێکی بە مەزنگرتنەو، ستایشکردنە بۆ مووسا ﷺ، چونکە جادووگەر بە مانای زانا دێ، واتە: مامۆستاو شارەزا.

٨)- ﴿ ادْعُ لَنَا رَبَّكَ بِمَا عَهِدَ عِندَكَ ﴾، {گوتیان: ئەی جادووگەر!}، بۆمان لە پەروەردگارت بپاڕێوە، بە هۆی ئەوەوە کە بەڵێنی بە تۆ داوە.

٩)- ﴿ إِنَّنَا لَمُهْتَدُونَ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە ڕێی ڕاستگرتوو دەبین.

١٠)- ﴿ فَلَمَّا كَشَفْنَا عَنْهُمُ ٱلْعَذَابَ إِذَا هُمْ يَنكُثُونَ ﴾، بەڵام کاتێك ئازارمان لێ لابردن، {ئەو بەڵایەی کە بۆمان ناردبوون، بەڵایەکەمان لێ دوورخستنەوە}، کت و پڕ ئەوان پەیمانیان شکاندو، بێ بەڵێن دەرچوون، (نەهاتنە ژێرباری وەرگرتنی پەیامەکەی مووسا ﷺ).

کەواتـە: کـە گوتوویانـە: ﴿ وَقَالُوا۟ يَـٰٓأَيُّهَ ٱلسَّاحِرُ ﴾، ڕای ڕاسـتتر ئەوەیـە، کـە ئەمـە دواندنـی مووسـا ﷺیـە، بـە ڕێزلێگرتـن و بـە مەزنگرتنـەوەو، جۆرێـك بـووە لـە ستایشـکردنی مووسـا ﷺ، چونکـە لـە لای ئـەوان جادووگـەر، مامۆسـتاو شـارەزایەك بـووەو، ڕێزلێگیـراو بـووە، هەمـوو ئەوانـەی کـە دینـی ڕێـك و ڕاسـت و دروسـتیان لەبـەر دەسـتدا نەبـێ، سـەرچاوە گرتـوو لـە وەحیـی و دەسـتکاریی نەکـراوی خـوا، پەنـا دەبەنـە بـەر چـاو بەسـت و جـادوو فـرت و فێـڵ و خەڵـك فریـودان، ئەوانیـش کـە دینێکی ڕاسـت و دروسـت، کـە لـە وەحییـەوە سـەرچاوەی گرتبـێ، لەبـەر دەسـتیاندا نەبـووە، بۆیـە وەك قەرەبوویەکـی ئـەوە، پەنایـان بردۆتـە بـەر جـادوو، ئـەم مانایـە زیاتـر پـێ دەچـێ.

دەشـگونجێ مەبەسـت پێـی تانـە لێدانـی مووسـا ﷺ بـێ و، تۆمەتبارکردنـی بـێ بـەوەی جادووگـەرە.

دەشـگونجێ ئەمـە جۆرێـك بووبـێ لـە گاڵتـە پێکـردنی مووسـا ﷺ، بـەڵام مانـای یەکەمیـان لـە هەموویـان زیاتـر، بـە عەقـڵ و دڵـەوە دەنووسـێ.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ بِمَا عَهِدَ عِندَكَ ﴾، بۆمـان لـە پـەروەردگارت بپاڕێـوە، بەهـۆی ئـەوەوە کـە عەهـدی بـۆ لای تـۆ کـردوە، (**إبـنُ عَجيبـة**) خاوەنـی (**البَحـرُ المَديـد في تَفسـير كِتـابِ اللهِ المَجيـد**)[1]، کـە یەکێـك لـە عاریفـە گەورەکانـە، سـێ واتـای بـۆ ئـەو ڕسـتەیە هێنـاون:

١- (**لِعَهدِهِ عِنْدَكَ بأنْ دَعْوَتَكَ مُستَجَابَةٌ**)، بەڵێنی بە تۆ داوە، کە پاڕانەوەی تۆ وەرگیراوە.

---

(١) ج٧، ص:٢١.

٢- (بِمَا عَهِدَ عِنْدَكَ مِنَ النُّبُوَّةِ وَالجَاه)، بە هۆی ئەوەوە کە بەڵێنی لە لای تۆ هەیەو، تۆی کردوە بە پێغەمبەرو شکۆداری کردووی.

٣- (بِمَا عَهِدَ عندك مِنْ كَشْفِ العَذَابِ عَمَّنِ اهْتَدَى)، بە هۆی ئەوەوە کە بەڵێنی بە تۆ داوە، هەر کەسێك ڕێی ڕاست بگرێ، سزای لەسەر لادەچێ.

٤- (بِمَا خَصَّكَ بِعِلْمِهِ دُونَ غَيْرِك، مِمَّا اسْتَطَعْتَ بِهِ أَنْ تَأْتِيَ بِخَوَارِقِ العَادَات)، ئەم لێکدانەوەیەی چوارەم هی (محمد الطاهر بن عاشور)ە[1]، واتە: بە هۆی ئەوەوە کە زانیارییەکی بە تۆ داوە، نەیداوە بە جگە لە تۆو، بەهۆی ئەو زانیارییەوەش تۆ ئەو شتە یاسادڕانە دێنی، ئەو شتە سەیرو سوڕهێنەرانە دێنی.

ئەوان پێیان وابووە مووسا ﷺ بۆ خۆی ئەو شتانە دروست دەکات.

هەڵبەتە کە دەفەرموێ: ﴿ بِمَا عَهِدَ عِندَكَ ﴾، (ما) لە (بِما)دا: (مَا المَصْدَرِيَّة)یە، وەك خاوەنی تەفسیری (المیزان)[2]، دەڵێ: (أي: بِعَهدِهِ عِنْدَك)، واتە: بە هۆی پەیمانەکەیەوە لە لای تۆ، واتە: بە هۆی پەیمانەکەیەوە لە لای تۆ، کە ئەگەر بڕوا بێنین ئەو بەڵایەمان لەسەر لابەرێ، بەڵام کە بەڵایەکەیان لەسەر لاچوو، وەك لە بەسەرهاتی مووسادا ﷺ، بە تەفصیل باسمان کردوە، ئەوان پەیمانەکەیان هەڵوەشاندۆتەوە، ﴿ إِذَا هُمْ يَنكُثُونَ ﴾: (النَّكْثُ: نَقْضُ الحَبْلِ المُبْرَمِ)، (نَكْث): بریتیە لەوەی پەتێك چاك چنرابێ و، ڕێسرابێ، هەڵبوەشێنرێتەوە.

---

(١) التحرير والتنوير: ج١٠، ص:٢٢٧.

(٢) الميزان: ج١٨، ص:١١٠.

## مەسەلەی دووەم:

جاڕدانی فیرعەون بەنێو گەلەکەیدا، کە مادام حوکمڕانی میسرەو، ڕووبار گەل بە ژێر کۆشکەکەیدا دەڕۆن، بێگومان لە مووسا باشترە، کە بابایەکی بێ بایەخەو، قسە نابڕوونەو، نە بازنەی زێڕی بۆ فڕێدراون و، نە فریشتەش هاوەڵنی، کەواتە: ئەو دەعوایەی دەیکات ڕاست نیەو، لە لایەن پەروەردگاری جیهانییانەوە، نەنێردراوە:

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَنَادَىٰ فِرْعَوْنُ فِي قَوْمِهِۦ قَالَ يَٰقَوْمِ أَلَيْسَ لِي مُلْكُ مِصْرَ وَهَٰذِهِ ٱلْأَنْهَٰرُ تَجْرِي مِن تَحْتِيٓ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٥١﴾ أَمْ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْ هَٰذَا ٱلَّذِي هُوَ مَهِينٌ وَلَا يَكَادُ يُبِينُ ﴿٥٢﴾ فَلَوْلَآ أُلْقِيَ عَلَيْهِ أَسْوِرَةٌ مِّن ذَهَبٍ أَوْ جَآءَ مَعَهُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ مُقْتَرِنِينَ ﴿٥٣﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:

١)- ﴿وَنَادَىٰ فِرْعَوْنُ فِي قَوْمِهِۦ﴾، فیرعەون لە نێو خەڵکەکەی دا جاڕی دا، (النِّدَاءُ: رَفْعُ الصَّوْتِ، وَإِسْنَادُهُ إِلى فِرْعَون مَجَازٌ عَقْلِيٌّ، إذْ هُوَ الَّذِي أَمَرَ بِالنِّدَاء)، (نِدَاء): دەنگ بەرزکردنەوەیە، بەڵام کە پاڵ دراوەتە لای فیرعەون، مەجازێکی عەقلییە، چونکە ئەو بووە کە فەرمانی کردوە بانگ بکرێ، ئەگەرنا فیرعەون خۆی پێ لەوە گەورەتر بووە، دەست لە بن گوێیان بنێ و بانگ بکات، وەك چۆن کەسێك بانگ دەدات، بەڵکو فەرمانی کردوەو، جاڕیان داوە، لە نێو کووچەو کۆڵان و ئەو شوێنانەدا کە خەڵکیان تێدا بووە.

٢)- ﴿قَالَ يَٰقَوْمِ أَلَيْسَ لِي مُلْكُ مِصْرَ﴾، (فیرعەون) گوتی: ئایا حوکمڕانیی میسرِ هی من نیە؟ کێ حوکمڕان و پادشایە لە میسرِ، بەس من نیم! وشەی: ﴿مُلْكُ﴾، بە مانای حوکمڕانیی دێ، (حُكْمُ مِصْر) واتە: حوکمڕانیی و تەصەڕڕوف کردن لە میسرِدا.

٣)- ﴿وَهَٰذِهِ ٱلْأَنْهَٰرُ تَجْرِي مِن تَحْتِيٓ﴾، ئەو ڕووبارانەش کە بە ژێرمدا دەڕۆن، قیبتییەکان جۆگەو جۆ باریان لە ڕووباری نیلەوە هەڵبەستوون، جۆگەی گەورە گەورە، کە هەر کامێکیان وەك ڕووبارێك بووەو، بە ژێر کۆشکەکەیدا ڕۆیشتوون، بەڵام ئەو کە دەڵێ: ﴿تَجْرِي مِن تَحْتِيٓ﴾، یانی: بە ژێر کۆشکەکەمدا دەڕۆن، ئەگەرنا وەك پێشینان دەڵێن: (ئاویان لە ژێر فڵانکەس کرد)، کەسێك کە ئاوی بێتە ژێر، لە شوێنەکەی هەڵدەستێ، مەبەستی ئەوە بووە کە ئاو بە ژێر کۆشك و تەلارەکەمدا دەڕۆن، کە بێگومان دیمەنێکی جوانی هەبووە.

٤)- ﴿أَفَلَا تُبْصِرُونَ﴾، ئایا نابینن! بۆ پرسیارکردن بۆ پێپێلێنان (**الإستِفهَامُ لِلتَقْرِير**)ە، واتە: بە دڵنیایی ئێوە دەبینن، کۆشکەکانیش دەبینن و، حوکمڕانیی منیش دەبینن و، باڵا دەستیی منیش دەبینن لە میسرِدا.

٥)- ﴿أَمْ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْ هَٰذَا ٱلَّذِي هُوَ مَهِينٌ﴾، بەڵکو ئایا من چاکتر نیم لەو کەسەی کە ئەو بێ بایەخە، بێ هێزو بێ توانایە؟ پرسیار کردنەکە لێرەدا، چاوەڕێی وەڵام ناکات، چونکە پرسیارکردنی نکووڵییلێکەرانەیە، واتە: بە دڵنیایی من چاکترم لەو کەسەی بێ بایەخە، کە مەبەستی مووسایە ﷺ، بێگومان مووساش هەرگیز لەگەڵ فیرعەون و هەزارانی وەك فیرعەون، پەنجەیەکیشی نەچۆتە تەرازووەوەو، چ جای خۆی، بەڵام هەمیشە ئەو حوکمڕانە خۆسەپێن و بە زەبرو زۆرانە، کەم بایەخ و کەم مایە، تەماشای غەیری خۆیان دەکەن، بەو تۆزە دەسەڵاتەی هەیانەو، پێنج و دوو ڕۆژێك کە دەژین و، سەروەت و سامانێك، یان کۆشك و تەلارێك، یان ئیمکانیەتێك کە بە دەستیانەوەیە، پێی بوغڕا دەبن و پێی لە کەوڵی خۆیان دەردەچن و، جۆرێك لە سەرخۆشیی و بێ هۆشییان بەسەردا دێنێ.

ئنجا دوای ئەوەی مووسا ﷺ تۆمەتبار دەکات بەوە کە: ﴿مَهِينٌ﴾ە، یانی: بێ دەسەڵاتە، یان بێهێزە، یان بێ بایەخە، تۆمەتێکی دیکەشی دەداتە پاڵ:

٦)- ﴿وَلَا يَكَادُ يُبِينُ﴾، نیزیکە نەتوانێ قسە بکات، ﴿يُبِينُ﴾، (**أي: يُبَيِّن**)، مەبەستەکانی ڕوون بکاتەوەو دەربخات، (**أي: وَيَكَادُ أَنْ لاَ يُبِين**)، نیزیکە نەتوانێ

مەبەستی خۆی دەربخات، لەبەر ئەوەی زمانی تەواو نیە، بەڵام وەك پێشتر گوتمان: ئەمە تۆمەتێك بووە، فیرعەون بە مووسای کردوە، کە تۆمەتێکی بێ بنەما بووە، لەبەر ئەوەی خوا ﷻ لە سوورەتی (**طه**)دا، بەڵێنی بە مووسا ﵇ داوە، دوای ئەوەی خوا ﷻ پێی دەفەرموێ: بچۆ بۆ لای فیرعەون: ﴿ اذْهَبْ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُ طَغَىٰ ﴿٢٤﴾ ﴾**طه**، مووسا ﵇ لێی دەپاڕێتەوەو دەفەرموێ: ﴿ قَالَ رَبِّ اشْرَحْ لِي صَدْرِي ﴿٢٥﴾ وَيَسِّرْ لِي أَمْرِي ﴿٢٦﴾ وَاحْلُلْ عُقْدَةً مِّن لِّسَانِي ﴿٢٧﴾ يَفْقَهُوا قَوْلِي ﴿٢٨﴾ وَاجْعَل لِّي وَزِيرًا مِّنْ أَهْلِي ﴿٢٩﴾ هَارُونَ أَخِي ﴿٣٠﴾ اشْدُدْ بِهِ أَزْرِي ﴿٣١﴾ وَأَشْرِكْهُ فِي أَمْرِي ﴿٣٢﴾ كَيْ نُسَبِّحَكَ كَثِيرًا ﴿٣٣﴾ وَنَذْكُرَكَ كَثِيرًا ﴿٣٤﴾ إِنَّكَ كُنتَ بِنَا بَصِيرًا ﴿٣٥﴾ قَالَ قَدْ أُوتِيتَ سُؤْلَكَ يَا مُوسَىٰ ﴿٣٦﴾ ﴾**طه**، مووسا ﵇ دوای ئەوەی خوا ﷻ فەرمانی پێ دەکات بچێ بۆ لای فیرعەون، کە یاخیی بووە، چەند داوایەك لە خوای بەخشەر دەکات، دەفەرموێ: پەروەردگارم! سینەم گوشادو فراوان بکەو، کارم ئاسان بکەو، گرێیەك کە لە زمانمدا هەیە بیکەوە، بۆ ئەوەی لە قسەم تێبگەن و، لە نیزیکانی خۆم وەزیرو پاڵپشتێکم بۆ بڕەخسێنە، با هاڕوونی برام بێ، لە کارەکەمدا بەشداری بکە، تاکو زۆر تۆ بە پاك بگرین و، زۆر یادی تۆ بکەین، بێگومان تۆ ئێمە دەبینی و هەر بینیوتین.

خواش ﷻ بۆ هەموو ئەو داوایانەی مووسا ﵇، دەفەرموێ: داواکارییەکەت پێدرا ئەی مووسا! ئەوەی داوات دەکرد، بۆت جێبەجێ کرا!

کەواتە: مووسا ﵇ لەو ڕۆژەوە گرێ لە زمانیدا نەماوە، بەڵام گوتراوە: کاتی خۆی کە مووسا لە ماڵی فیرعەوندا گەورە بووە، جۆرێك لە زمان گیرانی هەبووەو یان زمانی گرتوویەتی، یان هەندێ پیت باش بۆی نەبێژراون، ئنجا بەو وێنا کردنە پێشووەوە، فیرعەون مووسای بەوە تۆمەتبار کردوە، ئەگەرنا وەك چۆن خوا ﷻ هاڕوونی لەسەر داوای مووسا کردۆتە پێغەمبەر، وەك لە سوورەتی (مَریَم)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَوَهَبْنَا لَهُ مِن رَّحْمَتِنَا أَخَاهُ هَارُونَ نَبِيًّا ﴿٥٣﴾ ﴾، واتە: هاڕوونی برایمان پێدا وەك پێغەمبەر، لە بەزەیی خۆمانەوە، ئنجا ئەگەر برایەکەی لەسەر

داوای مووسا کردبێتە پێغەمبەر، بە دڵنیایی ئەو گرێیەی لە زمانیشی دا بووە، کە تاکە ئامرازی مووسا ﷺ بووە، بۆ ئەوەی پەیامی خوای پێ بگەیەنێ، خوای پەروەردگار ئەو زمانەی مووسای رێك و ڕاست کردوە، بێ گرێ و گۆڵی کردوە، کەواتە: ئەو قسەیەی هیچ بنەمایەکی نیەو، ئەوەی دیکەشیانی کە دەڵێ: ﴿مَهِينٌ﴾، بێ پێگەیەو بێ بایەخە، ئەوەش جنێوێك بووەو قسەیەکی ناشیرین بووە بە مووسای ﷺ گوتوە، ئەو قسە ناشیرینانەش هەر لە فیرعەون و هاو وێنانی فیرعەون دەوەشێنەوە.

٧)- ﴿ فَلَوْلَآ أُلْقِيَ عَلَيْهِ أَسْوِرَةٌ مِّن ذَهَبٍ ﴾، (فیرعەون بۆ زیاتر خەڵك چەواشە کردن و، گەوجاندنیان دەڵێ:) دەبووایە بازنە زێڕەکانی بۆ فڕێدرابانەیە، بازنەکانی کە لە زێڕن، بۆی فڕێدرابانایە، ﴿أَسْوِرَةٌ﴾، خوێنراویشەتەوە: (أَسَاوِر)، کە هەردووکیان کۆی (سِوَار)ن و لە (دِستِوار) یان (دُستِوار)ی فارسییەوە هاتوە، ﴿ فَلَوْلَآ ﴾، (لولا): **(حَرفُ تَحضيضٍ مُستَعمَلٌ فِي التَّعْجيز)**، (لَولا) لێرەدا پیتێکە بۆ هاندان، بەڵام بەکارهێنراوە بۆ بێ توانا پیشاندان، کە مووسا ﷺ ناتوانێ و ئەوەی بۆ ناکرێ بازنەی بۆ فڕێ بدرێن.

٨)- ﴿أَوْ جَآءَ مَعَهُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ مُقْتَرِنِينَ ﴾، دەبووایە فریشتەکان لەگەڵیدا بێن، پێکەوە هاودەم بن، **(الإلقَاءُ: الرَّميُ، وَهوَ مُستَعمَلٌ هُنا فِي الإنْزَال)**، (إلقاء) بە مانای فڕێدانە، بەڵام لێرەدا بەکارهێنراوە بۆ دابەزێنران، یانی: مادام بازنەی زێڕی بۆ دانەبەزێنراون، فریشتەشی لەگەڵدا نەنێردراون، کەواتە: ڕاست ناکات، پێغەمبەر نیە.

**(أَسَاوِر)** کۆی **(سِوار)**ە، واتە: بازن، کە ئاوا پێناسە کراوە: **(حَلْقَةٌ عَرِيضَةٌ مِنْ ذَهَبٍ، أو فِضَّةٍ تُحيطُ بِالرَّسْغِ، وَهُوَ عِنْدَ مُعظَمِ الأُمَمِ مِنْ حِليَةِ النِّسَاءِ، وَكَانَ السِّوَار مِنْ شِعَارِ المُلُوكِ فِي فارسَ وَ مِصرَ، يَلبَسُ المَلِكُ سُوارَينِ، أو اثنَين فِي الرَّسْغَيْنِ وَاثنَينِ عَلَى العَضُدَينِ)**، سەرچاوە مێژووییەکان دەڵێن: **(سِوار)** واتە: بازن، ئاڵقەیەکی پانە، لە زێڕ یاخود لە زیو، دەوری مەچەك دەدات، لە دەست دەکرێن و لە لای زۆربەی گەلان خشڵی ئافرەتانە، خۆیانی پێ دەڕازێننەوە، بەڵام کاتی خۆی لە

وڵاتی فارس و ڕۆم دروشمی پادشاو حوکمڕانان بووە، کە حوکمڕان، دوو بازنی لە دەستی کردوون، هەر بازنە لە دەستێکی، یان جاری وا هەبووە، دوو بازنی لە مەچەکی دا بوون، دووش لە قۆڵی، واتە: چوار بازنی لە دەست کردوون.

دیارە فیرعەون وایزانیوە، پێغەمبەرایەتییش هەر پادشایەتییە، گوتوویەتی: بۆچی بازنی پێ نین، ئەگەر لافی پێغەمبەرایەتیی لێ دەدات، وایزانیوە، ئەویش هەر پادشایەتیی و حوکمڕانێتی ستەمکارانەیە، کە بە زرق و برق چاوی خەڵک هەڵخەڵەتێنن.

کە فیرعەون دەڵێ: ﴿ فَلَوْلَا أُلْقِيَ عَلَيْهِ أَسْوِرَةٌ مِّن ذَهَبٍ أَوْ جَآءَ مَعَهُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ مُقْتَرِنِينَ ﴾، (أو لِلتَّرديدِ)، دەبوویە بازنەی هەبن، یان دەبوویە فریشتەی لەگەڵدا بن، وشەی: ﴿ مُقْتَرِنِينَ ﴾یش، (حَالٌ مُؤَكِّدَةٌ لِمَعْنَى مَعَهُ، لِئَلاَّ يُحْمَلَ مَعْنَى المَعِيَّةِ عَلَى التَّأييدِ القَوْلِي فَقَط)، بۆیە گوتوویەتی: فریشتەکان لەگەڵی بێن، بە جووتیی، تاکو وا نەزانرێ، کە مەبەست لە لەگەڵدا بوونی فریشتەکان، تەنیا لەگەڵدا بوون و پشتگیرییکردنی مەعنەوییە، بەڵکو بە جەستەش لەگەڵیدا دەبن.

## مەسەلەی سێیەم و کۆتایی:

**فیرعەون خەڵکەکەی گەوجاندو کەودەنی کردن و سووکەڵەی کردن، ئەوانیش فەرمانبەری بوون، چونکە لادەر بوون لە زگماك و عەقڵ، سەرەنجامیش خوا ﷻ لێیان تووڕە بوو و تۆڵەی لێ ستاندن و لە دەریادا خنکاندنی و، کردنی بە پەندو عیبرەتی پێشەنگ بۆ خەڵك:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَاسْتَخَفَّ قَوْمَهُ فَأَطَاعُوهُ إِنَّهُمْ كَانُوا قَوْمًا فَاسِقِينَ ﴿٥٤﴾ فَلَمَّا آسَفُونَا انْتَقَمْنَا مِنْهُمْ فَأَغْرَقْنَاهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٥٥﴾ فَجَعَلْنَاهُمْ سَلَفًا وَمَثَلًا لِلْآخِرِينَ ﴿٥٦﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿ فَاسْتَخَفَّ قَوْمَهُ ﴾، خەڵکەکەی خۆی سووك کرد، یان سووك هاتە بەرچاو، (أَخَفَّهُ أي: جَعَلَهُ خَفِيْفاً)، سووکی کردن، بەڵام (اسْتَخَفَّهُ: مُبَالَغَةٌ مِنْهُ)، بۆ زێدە ڕۆیی تێداکردنە، زۆری سووك کردن، توێژەرەوانی قورئان زۆریان قسە لەسەر ئەم وشەیە کردوە، ئێمەش هەوڵ دەدەین هەقی خۆی پێ بدەین.

(إستَخَفَّ قَوْمَهُ)، بە چوار واتای سەرەکیی لێکیان داوەتەوە:

١- (جَعَلَهُم خِفَافَ العُقُولِ)، خەڵکەکەی وا لێکرد عەقڵی سووك کردن، بە کوردیی دەگوترێ: کەودەنی کردن، گەوجاندنی و نەفامی کردن.

٢-(وَجَدَهُم خِفَافَ العُقُولِ)، خەڵکەکەی عەقڵ سووك هاتە بەرچاو، عەقڵ سووکی لێ هەڵکەوتن.

٣- (إستَهَانَ بِعقُولِهِم)، گاڵتەی بە عەقڵیان کرد.

٤- (طَلَبَ مِنْهُم الخِفَّةَ وَالسُّرْعَةَ فِي مُطَاوَعَتِهِ)، لێی خواستن کە سووك بن، بە خێرایی دەست و برد بکەن، سووکەڵە بەدەستیەوە بێن، لە فەرمانبەریی کردنیدا.

ئەم چوار واتایەیان بۆ (إستَخَفَّ) هێناون و هەر چواریشیان گونجاون.

بە پێویستی دەزانم قسەیەکی (سَید قُطب)، (ڕەحمەتی خوا لێبێ) بهێنم، لە تەفسیرەکەی خۆی (فِي ظِلالِ القُرآن)دا[1]، ئەم قسەیەی دەربارەی: ﴿ فَٱسۡتَخَفَّ قَوۡمَهُۥ فَأَطَاعُوهُۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَوۡمٗا فَٰسِقِينَ ﴾، کردوە:

**(واستخفاف الطغاة للجماهير أمر لا غرابة فيه؛ فهم يعزلون الجماهير أولاً عن كل سبل المعرفة، ويحجبون عنهم الحقائق حتى ينسوها، ولا يعودوا يبحثون عنها؛ ويلقون في روعهم ما يشاءون من المؤثرات حتى تنطبع نفوسهم بهذه المؤثرات المصطنعة . ومن ثم يسهل استخفافهم بعد ذلك، ويلين قيادهم، فيذهبون بهم ذات اليمين وذات الشمال مطمئنين! ولا يملك الطاغية أن يفعل بالجماهير هذه الفعلة، إلا وهم فاسقون لا يستقيمون على طريق، ولا يمسكون بحبل الله).**

واتە: گەوجاندنی تاغووتەکان بۆ خەڵك و جەماوەر، یان سووكەڵە كردنیان، كارێكە هیچ سەیرییەكی تێدانیە، چونكە خەڵك و جەماوەر، كەنارگیر دەكەن لە هەموو ڕێیەكانی زانست و، وادەكەن كە خەڵك هۆشیارو زانا نەبێ، ڕاستییەكانیان لێ دەشارنەوە، تاكو لە بیریان دەچنەوە، وایان لێ دێ لەو ڕاستییانە هەر نەكۆڵنەوەو، ئەو تاغووتانە ئەو كارتێكەرانەی بیانەوێ، دەخەنە دڵی خەڵكەوە تاكو لە دڵیاندا جێگیر دەبن، دوایی دەروونیان بەپێی ئەو كارتێكەرانە كە تاغووتەكان ویستوویانە، كارتێكراو دەبن، پاشان بە ئاسانیی دەتوانن بیانگەوجێنن و خەڵكەكەش بە ئاسانیی دوایان دەكەون، ئەو كاتە ئەو تاغووت و خۆسەپێنانە، بە لای ڕاست و چەپدا دەیانبەن زۆر بە ئارامیی، بابای خۆسەپێن و حوكمڕانانی لە خوا یاخیی، ناتوانن ئەوە بە خەڵك و جەماوەر بكەن، مەگەر لە حاڵێكدا ئەو خەڵك و جەماوەرە لاڕێ بن، لە ڕێ هەڵە كرابن و دەستیان بە ڕێسمانی خواوە نەگرتبێ.

---

(١) ج٥، ص:٣١٩٤.

کەواتـە: کـە دەفەرمـوێ: ﴿ فَٱسۡتَخَفَّ قَوۡمَهُۥ ﴾، خەڵکەکـەی خـۆی سـووکەڵە کـرد، بـە هەمـوو ئـەو واتایانـەی کـە گوتمـان، یـان سـووکەڵەی بینیـن، یـان گەوجاندنی و نەفامـی کـردن و، لـە نێوەڕۆکـی خۆیـان خاڵیـی کردنـەوە.

٢)- ﴿ فَأَطَاعُوهُ ﴾، ئەوانیش بە قسەیان کرد، کەواتە: فەرمانبەرییەکەیان بۆ فیرعەون لە ئەنجامی بێ کێشیی و، سووکەڵەییانەوە بووەو، لە ئەنجامی ئەوەدابووە کە لە نێوەڕۆکی خۆیان خاڵیی کرابوونەوە.

٣)- ﴿ إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَوۡمٗا فَٰسِقِينَ ﴾، بە دڵنیایی ئەوان کۆمەڵێکی لاڕێ و لادەر بوون، بەهۆی لاڕێ و لادەرییانەوە، ئامادەیی ئەوەیان هەبوو کە فیرعەون بیانگەوجێنێ و نەفام و کەودەنیان بکات، سەرەنجام ئەوانیش فەرمانبەری بوون و بە قسەیان کرد.

٤)- ﴿ فَلَمَّآ ءَاسَفُونَا ٱنتَقَمۡنَا مِنۡهُمۡ ﴾، کاتێك ئێمەیان تووڕە کرد، تۆڵەمان لێ ستاندنەوە، یانی: شایستەی ئەوە بوون خوا تۆڵەیان لێ وەربگرێتەوە، ﴿ فَلَمَّآ ءَاسَفُونَا ﴾، (أي: فَلَمَّا أسخَطُونا، وأغضَبُونا)، (وَالأَسَفُ: الحُزنُ وَالغَضَبُ مَعَاً)، کاتێك ئێمەیان تووڕەو پەست کرد، وشەی (**أَسَف**)، بە مانای تووڕەیی و دڵتەنگیی و خەفەتباریی دێ، لە یەك کاتدا، بەڵام وشەی خەفەتباریی و دڵتەنگیی بۆ خوا بەکار نایەت، بە پێچەوانەی تووڕەیی، کە خوا ﷻ وشەی تووڕەیی بەکارهێناوە لە قورئاندا، کاتێك ئێمەیان تووڕە کرد، تۆڵەمان لێ ستاندنەوە، لەبەرچی خوا ﷻ لێیان تووڕە بوو؟ لەبەر ئەوەی ئەو ڕێزەی خوا لێی نابوون، لە خۆیاندا نەیانهێشت و، خوا دایناوە کە مرۆڤ ڕێزلێگیراو بێ و، مرۆڤ قەدر گران بێ و، قەدرو قیمەتی خۆی بزانێ.

کاتێـك خەڵـك قیمەتـی خـۆی لـە دەسـت دەدات و، دەبێتـە پـووش و پـەڵاش، بـە دوای حوکمڕانـە لـە خـوا یاخیـی و خۆسـەپێنەکانەوەو، شایسـتەی ئـەوە نامێنـن کـە بـەردەوام بـن لـە ژیانـدا، خـوا ﷻ لایـان دەبـات، سـەرزەوییان لـێ پـاك دەکاتـەوە بـە تاغووتەکەشـەوە، جۆماڵێکیـان دەکات.

٥)- ﴿ فَأَغۡرَقۡنَٰهُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴾، ئنجا تێکڕایانمان نغرۆ کردو، خنکاندمانن.

٦)- ﴿ فَجَعَلْنَٰهُمْ سَلَفًا وَمَثَلًا لِّلْآخِرِينَ ﴾، ئنجا گێڕامانن بە پێشەنگ و بە پەند بۆ ئەوانی دیکە، وشەی (سَلَف)، خوێندراویشەتەوە: (سُلُفاً)، (سُلُف) کۆی (سَلَف)ە، واتە: پێشەنگەکان، پێشینەکان، خاوەنی تەفسیری: (**البَحرُ المَدید في تَفسیرِ کِتابِ اللهِ المَجید**)[1]، گوتوویەتی:

**١- أي: جَعَلنَاهُم قُدْوَةً لِمَن بَعْدَهُ، مِنَ الكُفَّار يَسلُكُونَ مَسلَكَهُم، فِي استيجَابِ مثلَ مَا حَلَّ بِهِم مِنَ العَذَابِ، فَكُلّ مَن تَفرعَنَ وَتَجَبَّر، فَفِرعَونُ إمَامُهُ وَقُدْوَتُهُ.**

**٢- جَعَلنَاهُم مُتَقَدِّمِينَ فِي الهَلاَكِ، لِيَتعِظَ بِهِم مَن بَعْدَهُم إلى يَومِ القِيَامَة.**

واتە: کردمانن بە پێشەنگ بۆ هەموو ئەو کافرانەی لە دوایانەوە دێن و وەك وان دەکەن، ئەو کاتە هەر کەسێ وەك ئەوان بکات، پێویست دەکات هەمان سزاش بدرێ، هەر کەسێك وەك فیرعەون بکات و خۆی بسەپێنێ، دیارە فیرعەون پێشەواو سەرمەشقیەتی، چی بەسەر فیرعەون و گەلەکەی هاتوە، ئەوەش بەسەر ئەو دێ.

واتایەکی دیکەی ئەوەیە: ئەوانمان کرد بە پێشەنگ لە فەوتاندا، تاکو ئەوانەی دوایی دێن، هەتا ڕۆژی دوایی پەندیان لێ وەربگرن.

کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَثَلًا ﴾، (مَثَل) بە مانای پەند دێ، دەشگونجێ بەمانای ئامۆژگاریی بێ، دەشگونجێ بە مانای بەسەرهاتێکی سەرسوڕهێنەر بێ، کە وەك چۆن پەندی پێشینان بڵاودەبێتەوەو بەدەمەوە دەگیرێ، ئەو بەسەرهاتەش ئاوا وەك پەندێك بەسەر زارو زمانانەوە بێ.

کەواتە: ﴿ وَمَثَلًا ﴾، یانی: (عِبْرَةً وَمِثَالاً)، واتە: کردمانن بە عیبرەت و شوێنی پەند لێوەرگرتن و، کردمانن بە وێنەیەك وەك چۆن پەندی پێشینان بەسەر زارانەوە دەبێ، ئەوانیش ئاوا بەسەرهاتی سەرسوڕهێنەری ئەوان، بەسەر زارانەوە ببێ.

---

(١) ج٧، ص:٢٣.

لە سوورەتی (الروم)دا، لە بارەی (إستخفاف)ەوە، هاتوە، لە ئایەتی (٦٠)دا: ﴿ فَٱصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ ۖ وَلَا يَسْتَخِفَّنَّكَ ٱلَّذِينَ لَا يُوقِنُونَ ﴾، واتە: خۆڕاگر بە، بەڵێنی خوا ڕاستە، با ئەوانەی دڵنیانین، یاخود زانیاریی تەواویان نیە دەربارەی ڕۆژی دوایی، ئەوانە تۆ هەڵنەقەنن و تۆ نەجووڵێنن، (أي: وَلا يَدفعُكَ الَّذِينَ لا يُوقِنُونَ بأنَّهُم مَبعُوثُونَ إلى الإستِعجَالِ وَتَركِ الصَّبرِ)[1]، ئەوانەی یەقینیان نیە، کە زیندوو دەکرێنەوە، با تۆ ناچار نەکەن، کە پەلە بکەی و خۆڕاگریی لە دەست بدەی.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

---

(١) المُختَصَر في تفسير القرآنِ الكَريم، جَمَاعَة مِن عُلَمَاءِ التفسير: ص:٤١٠.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـە لـە نـۆ (٩) ئایـەت پێـك دێ، ئایەتـەكانی: (٥٧ - ٦٥)، هەموویـان لـە بـارەی عیسـای كـوڕی مەریەمـەوەن ﷺ، خـوا لـە مەریـەم ڕازی بـێ، شـەش (٦) ئایەتـی سـەرەتایان، باسـی بـە نموونـە هێنرانـەوەی عیسـا ﷺ دەكـەن، لەلایـەن هاوبەشـدانەرانەوە، بـە حیسـاب وەك بەڵگـە لەسـەر ئـەوە ئەگـەر پەرسـتەرو پەرسـتراوەكان - جگـە لـە خـوا - سـزا بدرێـن، دەبـێ عیسـاش سـزا بـدرێ، ئەگەرنـا نابـێ بتەكانـی ئەوانیـش سـزا بدرێـن و، نابـێ خۆشـیان سـزا بدرێـن!

بـەو بۆنەیەشـەوە باسـی عیسـا ﷺ كـراوە، وەك بەندەیەكـی هەڵبژێـردراوی خوا و، زانیاریـی لـە بـارەی ئاخیـر زەمانەوە.

سـێ ئایەتـی كۆتاییـش لـە بـارەی هاتنـی عیسـاوە ﷺ بـۆ بەنـی ئیسـرائیل و نێوەڕۆكـی پەیـام و بەرنامەكەینـی، كـە بریتـی بـووە لـە یەكتاپەرستیی، بـەڵام دوای خـۆی، شـوێنكەوتووانی بوونـە چەنـدان حیزبـی جـۆراو جـۆری پێكـەوە ناكـۆك و ناتەبـا.

﴿وَلَمَّا ضُرِبَ ٱبْنُ مَرْيَمَ مَثَلًا إِذَا قَوْمُكَ مِنْهُ يَصِدُّونَ ﴿٥٧﴾ وَقَالُوٓاْ ءَأَٰلِهَتُنَا خَيْرٌ أَمْ هُوَ ۚ مَا ضَرَبُوهُ لَكَ إِلَّا جَدَلًۢا ۚ بَلْ هُمْ قَوْمٌ خَصِمُونَ ﴿٥٨﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا عَبْدٌ أَنْعَمْنَا عَلَيْهِ وَجَعَلْنَٰهُ مَثَلًا لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٥٩﴾ وَلَوْ نَشَآءُ لَجَعَلْنَا مِنكُم مَّلَٰٓئِكَةً فِى ٱلْأَرْضِ يَخْلُفُونَ ﴿٦٠﴾ وَإِنَّهُۥ لَعِلْمٌ لِّلسَّاعَةِ فَلَا تَمْتَرُنَّ بِهَا وَٱتَّبِعُونِ ۚ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٦١﴾ وَلَا يَصُدَّنَّكُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ ۖ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٦٢﴾ وَلَمَّا جَآءَ عِيسَىٰ بِٱلْبَيِّنَٰتِ قَالَ قَدْ جِئْتُكُم بِٱلْحِكْمَةِ وَلِأُبَيِّنَ لَكُم بَعْضَ ٱلَّذِى تَخْتَلِفُونَ فِيهِ ۖ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ

وَأَطِيعُونِ ﴿٦٣﴾ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ رَبِّى وَرَبُّكُمْ فَٱعْبُدُوهُ ۚ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٦٤﴾ فَٱخْتَلَفَ ٱلْأَحْزَابُ مِنۢ بَيْنِهِمْ ۖ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مِنْ عَذَابِ يَوْمٍ أَلِيمٍ ﴿٦٥﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{هەروەها کاتێك (عیسای) کوڕی مەریەم بە نموونە هێنرایەوە، یەکسەر خەڵکەکەت (ئەی موحەممەدا) بەهۆیەوە، کردیانە هەراو گاڵە گاڵ ﴿٥٧﴾ گوتیشیان: ئایا پەرستراوەکانمان باشترن یان ئەو؟ تەنیا بۆ مشت و مڕو شەڕە قسە، بۆیان بە وێنە هێنایەوە، بەڵکو ئەوان کۆمەڵێکی زۆر شەڕەقسەکەرن (و حەز لە ناکۆکییکەرن ﴿٥٨﴾ ئەو (عیسا ﷺ) تەنیا بەندەیەك بوو، چاکەمان لەگەڵیدا کردبوو، (کردبوومانە پێغەمبەر)و گێڕابوومان بە وێنەیەك، (لەسەر باڵادەستیی و توانایی بێ سنوورمان)، بۆ وەچەی ئیسرائیل ﴿٥٩﴾ ئەگەر ویستباشمان بەشێك لە ئێوەمان لەسەر زەوی، دەگێڕان بە فریشتە، دەبوونە جێنشینتان ﴿٦٠﴾ بە دڵنیاییش ئەو (عیسا ﷺ)، زانیاریی و نیشانەیە بۆ کاتەکە (ئاخیر زەمان)، ئنجا لە بارەی (ئاخیر زەمان)ەوە، دوو دڵییتان نەبێ و شوێنم بکەون، ئەوە ڕێی ڕاستە ﴿٦١﴾ با شەیتانیش (لە ڕێی ڕاست) لاتان نەدات، بێگومان ئەو دوژمنێکی ئاشکرایە بۆتان ﴿٦٢﴾ کاتێك عیساش بەڵگە ڕۆشنەکانی هێنان، گوتی: حیکمەتم بۆ هێناون و (هاتووشم)، تاکو هەندێك لەوەی تێیدا ناکۆکیی و ڕاجیایی دەکەن، بۆتان ڕوون بکەمەوە، دەجا پارێز لە خوا بکەن و فەرمانبەرییم بکەن ﴿٦٣﴾ بەڕاستیی تەنیا خوا خۆی پەروەردگاری من و پەروەردگاری ئێوەشە، دەجا بیپەرستن، ئەمە ڕێی ڕاستە ﴿٦٤﴾ سەرەنجامیش حیزبە (شوێن ئارەزوو کەوتووەکان)، لە نێو خۆیاندا ڕاجیاو ناکۆك بوون، ئنجا سزای سەخت لە ئازاری ڕۆژێکی بە ئێش و ژان بۆ ئەوانەی ستەمیان کردوە، (وەك هاوبەش بۆ خوا دانان و لە ڕێی خوا لادان) ﴿٦٥﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(مَثَلًا ): (صِفَةً وَوَصْفَـاً، وَالمَثَـلُ عِبَارَةٌ عَنْ قَـوْلٍ فِـي شَيءٍ، يُشْـبِهُ قَـولاً فِي شَيءٍ آخَـرَ، بَيْنَهُـمَا مُشَـابَهَةٌ لِيُبَـيِّنَ أَحَدُهُـمَا الأَخَـرَ، وَيُصَـوِّرَهُ)، [وشـەی (مَثَـل) بـە مانـای ئاوەڵنـاو دێ و، بـە مانـای وەسـفکردنی شـتێکیش دێ، بـە پێـی سیاق ماناکـەی دیاریـی دەکـرێ]، (مَثَـل) بریتیـە لـە قسـەیەك لـە بـارەی شـتێکەوە، وەك قسـەیەکی دیکـە بچـێ لـە بـارەی شـتێکی دیکـەوە، کـە وێکچـوون هەبـێ لـە نێوانیانـدا، تاکـو یەکێکیـان ئـەوی دیکـە ڕوون بکاتـەوە، بـە کوردیـی دەڵێیـن: پەنـد.

(يَصِدُّونَ ): (صَـدَّ، يَصِـدُّ، صَـدَّاً، أي: ضَـجَّ وَعَـجَّ)، لـە (لِسـانُ العَـرَب)دا، دەڵـێ: (صَـدَّ، يَصِـدُّ، صَـدّاً)، واتـە: دەنگـی بـەرز کـردەوەو هـەرای کـردو گاڵـەی کـرد.

(جَدَلًا ): (الجِـدَالُ: الـصِّرَاعُ وَإِسـقَاطُ الإِنْسَـانِ صَاحِبَـهُ عَـلَى الجَدَالَـةِ وَهِـيَ الأَرْضُ الصُّلْبَـة)، (جِـدَال) شـەڕە قسـەیە، ئـەوە کـە مـرۆڤ هەوڵبـدات هاوەڵەکـەی بخاتـە سـەر (جَدَالَـة)، یـانی: زەوی ڕەق.

(خَصِمُونَ ): (الخَصِـمُ: المُختَـصُّ بِالخصُومَـة)، (خَصِـمْ) کۆیەکـەی (خَصِمـون)ە، بریتیـە لـە کەسـێك، کـە پسـپۆڕ و تایبـەت بێ بـە شەڕەقسـەو دمبەدمەو مشـتومڕەوە، (الخَصِـمُ: الكَثِـيرُ المُخَاصَمَـة وَالمُنَازَعَـة)، (خَصِـمْ): کەسـێك زۆر شـەڕە قسـەو، ناکۆکیـی و، دەمەقاڵـێ بـکات.

(يَخْلُفُونَ ): (خَلَـفَ فُـلاَنٌ فُلاَنَـاً: قَـامَ بِالأَمْـرِ عَنْـهُ)، کـە دەگوتـرێ: (خَلَـفَ فُـلاَنٌ فُلاَنَـاً)، فڵانکـەس لـە شـوێنی فڵانکـەس دانیشـت، واتـە: لـە جیاتـی ئـەو کارەکـەی جێبەجـێ کـرد.

(فَلَا تَمْتَرُنَّ بِهَا ): تێیـدا دوو دڵ مەبـن، (المِريَـةُ: الـتَّرَدُّدُ فِي الأَمْـرِ، وَهـوَ أَخَـصُّ مِـنَ الشَّـكِّ)، (مِريَـة): بریتیـە لـە دڵ دڵـدان لـە شـتێك دا، دوو دڵ بـوون لـە شـتێك دا، کـە

تایبەتترە لە (شَك)، واتە: دوو دڵیی، بەڵام (مِريَة)، بریتیە لە دوو دڵیی لە بارەی شتێکەوە، هیچ بیانوو پاساوی نەبێ.

(فَوَيْلٌ): (وَيل: القُبْحُ، العَذَابُ، وَادٍ فِي جَهَنَّم، وَقَدْ يُسْتَعْمَلُ فِي التَّحَسُّر)، (ویل) بە مانای ناقۆڵایی هاتووە، بە مانای سزا هاتووە، بە مانای شیوێك لە دۆزەخدا هاتوە، جاری واش هەیە، بەکاردەهێنرێ بۆ خەفەت و خەم لێ خواردن، (وَيلَهُ) واتە: بێ قەزا بێ، شایستەی ئەوەیە خەفەتی بۆ بخوات.

## هۆی هاتنەخوارەوەی ئایەتەکان

لە بارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە موبارەکانەوە: ﴿وَلَمَّا ضُرِبَ ٱبْنُ مَرْيَمَ مَثَلًا إِذَا قَوْمُكَ مِنْهُ يَصِدُّونَ ﴿٥٧﴾ وَقَالُوٓا۟ ءَأَٰلِهَتُنَا خَيْرٌ أَمْ هُوَ مَا ضَرَبُوهُ لَكَ إِلَّا جَدَلًۢا بَلْ هُمْ قَوْمٌ خَصِمُونَ ﴿٥٨﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا عَبْدٌ أَنْعَمْنَا عَلَيْهِ وَجَعَلْنَٰهُ مَثَلًا لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٥٩﴾ وَلَوْ نَشَآءُ لَجَعَلْنَا مِنكُم مَّلَٰٓئِكَةً فِى ٱلْأَرْضِ يَخْلُفُونَ ﴿٦٠﴾ وَإِنَّهُۥ لَعِلْمٌ لِّلسَّاعَةِ فَلَا تَمْتَرُنَّ بِهَا وَٱتَّبِعُونِ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٦١﴾﴾، ئەم بەسەرهات و گێردراوەیە هەیە:

{عَنِ إبْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ لِقُرَيشٍ: إنَّهُ لَيْسَ أَحَدٌ يُعْبَدُ مِنْ دُونِ اللهِ فِيهِ خَيْرٌ، قَالوا: أَلَسْتَ تَزْعُمُ أَنَّ عِيسَى كَانَ نَبِيًّا، وَعَبْدًا مِنْ عِبَادِ اللهِ صَالِحًا، وَقَد عَبَدَتْهُ النَّصَارَى؟ فَإِنْ كُنْتَ صَادِقًا، فَإِنَّهُ كَآلِهَتَهُمْ، فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿وَلَمَّا ضُرِبَ ٱبْنُ مَرْيَمَ ...﴾، قُلْتُ: وَمَا يَصِدُّون؟ قَالَ: يَضِجُّونَ، «وَإِنَّهُ لَعِلْمٌ لِلسَّاعَةِ»؟، قَالَ: هُوَ خُرُوجُ عِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ عَلَيْهِ السَّلَام قَبْلَ يَوْمِ الْقِيَامَةِ} (أخرجه: أحمد: ٢٩٢١، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده حسن، والطَّبراني: ١٢٧٤، والواحدي في أسباب النزول: ٧٤٠، وَقَالَ الهَيثَمي فِي المَجمَع: (ج٧، ص١٠٤)، سَنَدُهُ حَسَن، وَقَال

مؤلِّفا الإستيعاب: قُلنَا إسنَادٌ حَسَن، وَذَكَرَهُ السيوطي في الدر المَنشور: ج٧، ص٣٨٥، وَزاد نِسبَتُهُ لابن مَردَويه)[1].

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێك بە قوڕەیشییەكانی فەرموو: {لَيْسَ أَحَدٌ يُعْبَدُ مِنْ دُونِ اللَّهِ فِيهِ خَيْرٌ}، واتە: هیچ كام لەوانەی جگە لە خوا، یان لە جیاتی خوا دەپەرسترێن، خێریان پێوە نیە، ئەوانیش گوتیان: ئەدی تۆ پێت وانیە، كە عیسا ﷺ پێغەمبەر بووەو، بەندەیەك بووە لە بەندەكانی خوا، نەصرانییەكانیش عیسایان پەرستوە، ئنجا ئەگەر تۆ ڕاست بكەی، ئەویش وەك پەرستراوەكانی ئێمەیە، (واتە: ئەگەر ئێمەو پەرستراوەكانمان بچینە دۆزەخ، مانای وایە عیساو ئەوانەشی عیسایان پەرستوە، دەچنە دۆزەخ)، خوا ﷻ بەم بۆنەوە ئەم ئایەتانەی دابەزاندن، ﴿وَلَمَّا ضُرِبَ ٱبۡنُ مَرۡيَمَ ...﴾.

یەكێك لە گێڕەرەوەكان دەڵێ: لە عەبدوڵڵای كوڕی عەبباسم پرسی، مانای: (يَصِدُّون) چییە؟ گوتی: (يَضِجُّون) دەنگە دەنگ و هەرا دەكەن، گوتم: ئەدی كە دەفەرمویٚ: (وَإِنَّهُ لَعِلمٌ لِلسَاعَة)، ئەو زانیارییە بۆ ئاخیر زەمان؟ عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس گوتی: مەبەست پێی دەرچوونی عیسای كوڕی مەریەمە، پێش هاتنی ڕۆژی قیامەت (واتە: پێش ئاخیر زەمان).

---

(١) الإستيعاب في بَيانِ الأسباب: ج٢، ص١٩٩.

## ماناى گشتیی ئایەتەكان

ئەمە بەسەرهاتی سێیەمە، لەم سوورەتە موبارەكەدا، كە چەند قسەیەكە لە بارەی عیساوە عليه السلام و لە دوو سێ ئایەتی كۆتاییدا، عیسا عليه السلام باسی پەیامی خۆی دەكات.

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَمَّا ضُرِبَ ٱبۡنُ مَرۡيَمَ مَثَلًا ﴾، كاتێك كوڕی مەریەم بە وێنە هێندرایەوە، ﴿ إِذَا قَوۡمُكَ مِنۡهُ يَصِدُّونَ ﴾، یەكسەر خەڵكەكەت، بەهۆی بە وێنە هێنرانەوەی عیساوە عليه السلام، دەنگیان بەرز كردەوەو هەراو گاڵەیان كرد.

﴿ وَقَالُوٓاْ ءَأَٰلِهَتُنَا خَيۡرٌ أَمۡ هُوَ ﴾، گوتیان: پەرستراوەكانی ئێمە چاكترن، یان ئەو (عیسا)؟، واتە: مادام هەر پەرستراوێك و تێكڕای پەرستەرەكان، سزا بدرێن و خێریان پێوە نەبێ، وەك لە فەرمایشتەكەی پێغەمبەردا هاتووە ﷺ، یاخود سووتەمەنی دۆزەخ بن، وەك لە سوورەتی (الأنبياء)دا هاتووە: ﴿ إِنَّكُمۡ وَمَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنتُمۡ لَهَا وَٰرِدُونَ ﴿٩٨﴾ ﴾، واتە: ئێوەو ئەوانەی دەیانپەرستن، بەردی دۆزەخن، ئێوە دەچنە نێوی، كەواتە: ئەگەر ئێمەو پەرستراوەكانمان، بت و پەیكەرەكان بچینە دۆزەخەوە، دەبێ عیسا و ئەوانەش كە دەیپەرستن بچنە دۆزەخەوە.

ئنجا بە هۆی ئەوەوە كردیان بە هەراو گاڵە، گوتیان: قسەیەكی بە قوەتمان كردوە، كە وەك دوایی باسی دەكەین، عەبدوڵڵای كوڕی زەبعەریی بووە، بە حیساب ئەو قسەیەی لە ڕووی پێغەمبەردا ﷺ كردوە، بەڵام دیارە هەر ئایەتەكانی سوورەتی (الأنبياء)، وەڵامی ئەو قسەیان تێدایە كە خوا دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ سَبَقَتۡ لَهُم مِّنَّا ٱلۡحُسۡنَىٰٓ أُوْلَٰٓئِكَ عَنۡهَا مُبۡعَدُونَ ﴿١٠١﴾ لَا يَسۡمَعُونَ

حَسِيسَهَاۖ وَهُمۡ فِي مَا ٱشۡتَهَتۡ أَنفُسُهُمۡ خَٰلِدُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾، واتە: ئەوانەی لە لای ئێمەوە بڕیاری هەرە چاکیان بۆ دراوە، دوورن لە دۆزەخ، گوێیان لە هەستی دۆزەخ و قرچە قرچی ئاگری دۆزەخ نابێ و، ئەوان هەرچی نەفسیان بیخوازێ، تێدان و بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە.

﴿ مَا ضَرَبُوهُ لَكَ إِلَّا جَدَلَۢا ﴾، لێرەش خوا ﷻ دەفەرموێ: عیسایان بە وێنە نەهێنایەوە، مەگەر بۆ شەڕە قسەو، دمبە دمە، ﴿ بَلۡ هُمۡ قَوۡمٌ خَصِمُونَ ﴾، بەڵکو ئەوان کۆمەڵێکن، زۆر حەزیان لە مشت و مڕو شەڕە قسەیە، حەزیان لە ناکۆکیی و دەمەقاڵێیەو بە دوای هەقدا ناگەڕێن.

﴿ إِنۡ هُوَ إِلَّا عَبۡدٌ أَنۡعَمۡنَا عَلَيۡهِ وَجَعَلۡنَٰهُ مَثَلٗا لِّبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ﴾، عیسا عليه السلام تەنیا بەندەیەك بوو، گەورەترین چاکەمان لەگەڵیدا کردبوو، باشترین چاکە، خوا ﷻ لەگەڵ یەکێك لە مرۆڤەکانیدا بیکات، بریتیە لە پێ بەخشینی پلەی پێغەمبەرایەتیی، کە بە موحەممەد ﷺ ئەو پلەو پایە، دەرگایەکەی گاڵە دراوەو کۆتایی هاتوە، موحەممەد کۆتایی پێغەمبەرانە ﷺ، وەك دەفەرموێ: ﴿ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٖ مِّن رِّجَالِكُمۡ وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَۗ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٗا ﴿٤٠﴾ ﴾الأحزاب.

﴿ وَجَعَلۡنَٰهُ مَثَلٗا لِّبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ﴾، کردبوومان بە نموونەیەك بۆ بەنی ئیسرائیل، وەك وێنەیەك لەسەر باڵا دەستیی و دەستکراوەیی خواو، کە دەتوانێ مرۆڤ بەبێ باییش بخوڵقێنێ، وەك عیساو، دەشتوانێ بەبێ بابی و دایك بیانخوڵقێنێ، وەك ئادەم و حەووا.

﴿ وَلَوۡ نَشَآءُ لَجَعَلۡنَا مِنكُم مَّلَٰٓئِكَةٗ فِي ٱلۡأَرۡضِ يَخۡلُفُونَ ﴾، ئەگەر ویستباشمان لە ئێوە فریشتەمان دروست دەکردن، لە زەویدا کە بەدوای یەکدا دێن، یان: لە جیاتی ئێوە فریشتەمان لەسەر زەوی دادەنان.

بەڵام پێم وایە مانای یەکەم بەهێزترە، واتە: خۆتانمان دەکرد بە فریشتە، کە لە شوێنی ئێستای ئێوە، لەسەر زەوی بووبان بە جێنشینتان.

﴿ وَإِنَّهُۥ لَعِلْمٌ لِّلسَّاعَةِ ﴾، بە دڵنیایی عیسا ﷺ زانیارییە بۆ کاتەکە (**ساعة**)، ئەو کاتەی ئاخیر زەمانی تێدا دێ، لێرەدا (**ساعة**) زیاتر مەبەست پێی ئاخیر زەمانە، واتە: پێچرانەوەی ئەم ژیانە دنیاییە، لە دوای فووی یەکەم لە لایەن ئیسرافیلەوە بە کەڕەنا (**صور**)دا، بەڵام قیامەت لە دوای فووی دووەمەوە لە لایەن ئیسرافیلەوە، کە بە صووردا دەکرێ، پەیدادەبێ، کە کاتی هەڵسانەوەو زیندوو کرانەوەیە، ﴿ فَلَا تَمْتَرُنَّ بِهَا ﴾، ئنجا دوو دڵ مەبن، لە بارەی ئاخیر زەمان (**ساعة**)ەوە، ﴿ وَٱتَّبِعُونِ ﴾، شوێنم بکەون، خوا ﷻ دەفەرموێ: شوێنم بکەون، یاخود ئەمە لەسەر زمانی پێغەمبەرە ﷺ، کە گوتوویەتی: شوێنم بکەون، واتە: ئەی موحەممەد! بفەرموو شوێنم بکەون، ﴿ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴾، ئەمەیە ڕێی ڕاست.

﴿ وَلَا يَصُدَّنَّكُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ ﴾، با شەیتانیش لاتان نەدات، لە خۆتان وریا بن، شەیتان لاتان نەدات لە ڕاستە ڕێ، ﴿ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴾، بە دڵنیایی ئەو دوژمنێکی ئاشکرایە بۆ ئێوە.

﴿ وَلَمَّا جَآءَ عِيسَىٰ بِٱلْبَيِّنَٰتِ ﴾، کاتێك عیسا ﷺ بەڵگە ڕۆشنەکانی هێنان، ﴿ قَالَ قَدْ جِئْتُكُم بِٱلْحِكْمَةِ ﴾، بە خەڵکەکەی گوت: من حیکمەتم بۆ هێناون، واتە: هەموو ئەو ڕەوشت و بەها بەرزانەی، کە دەبێ تاك و کۆمەڵ خۆیانیان پێ برازێننەوە، هەموو ئەو خووخدە خراپانەی کە دەبێ خۆیانیان لێبژار بکەن، ئەوەم بۆ هێناون، کە ئەوە باشترین مانای حیکمەتە، ﴿ وَلِأُبَيِّنَ لَكُم بَعْضَ ٱلَّذِى تَخْتَلِفُونَ فِيهِ ﴾، هەروەها هاتووم تاکو، هەندێك لەوەی تێیدا کەوتوونە ڕاجیایی، بۆتان ڕوون بکەمەوە، ﴿ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴾، ئنجا پارێز لە خوا بکەن و فەرمانبەرییم بکەن.

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ رَبِّي وَرَبُّكُمْ ﴾، بە دڵنیایی بەس خوا پەروەردگاری من و ئێوەشە، ﴿ فَٱعْبُدُوهُ ﴾، ئنجا بەندایەتیی بۆ بکەن، ﴿ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴾، ئەمەیە ڕێی ڕاست و بێ گرێ و گۆڵ.

بەڵام ئایا وایان کرد؟

﴿ فَٱخْتَلَفَ ٱلْأَحْزَابُ مِنۢ بَيْنِهِمْ ﴾ حیزبەکان لە نێو خۆیاندا کەوتنە ڕاجیایی و ناکۆکیی و دەمەقاڵێ، واتە: شوێنکەوتووانی عیسا ، لە دوای خۆی بوونە چەند پێڕو تاقم و کۆمەڵێ پێکەوە ناکۆك، ﴿ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مِنْ عَذَابِ يَوْمٍ أَلِيمٍ ﴾، سزای سەخت بۆ ئەوانەی ستەمیان کردوە، لە ئازاری ڕۆژێکی بە ئێش، لەوێ سزای ئەو لادان و ستەم و خراپەیان وەردەگرنەوە.

خوا ﷻ بە لوتف و کەرەمی خۆی، ئێمە لەو کەسانە بگێڕێ، کە بە دوای هەموو پێغەمبەران دەکەون، ئەو ڕێباز و ڕاستە شەقامەی خوا بە پێغەمبەراندا ناردوویەتی، چاك لێی تێدەگەن و، باشیش پێوەی پابەند دەبن، بە تایبەت پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ کە سەروەرو گەورەی پێغەمبەرانە، تەواوکەری کارو پرۆژەکەیانە.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

وێنـە هێنانـەوەی هاوبەشـدانەران بـە عیسـای کـوڕی مەریـەم ﷺ، کـە ئەگـەر پەرسـتەرو پەرسـتراوەکان (العَبَـدَةُ وَالآلِهَـة) سـزابار بـن، عیسـاش بەردەکـەوێ و، هـەراو گاڵەکردنیـان بـەو بۆنەیـەوەو، بەرپەرچدانـەوەی خـوا بۆیـان، کـە عیسـا بەندەیەکـی خـوا پەسـند بـووەو، نموونەیـەك بـووە بـۆ بەنـی ئیسـرائیل و ئەگـەر خـوا ویسـتبای بەشـێك لـە مرۆڤانـی دەگێـڕان، بـە فریشـتەی جێنشـینی مرۆڤـان، لەسـەر زەوی و، عیسـا هـۆی زانیارییـە بـۆ هاتنـی ئاخیـر زەمـان، کـە نابێ تێیـدا دوو دڵ بـن و، پێویسـتە پەیڕەویـی لـە خـواو ڕاسـتە ڕێیەکـەی بکـەن و دەبـێ وریـا بـن، شـەیتانی دوژمنیـان لایـان نـەدات:

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿وَلَمَّا ضُرِبَ ٱبْنُ مَرْيَمَ مَثَلًا إِذَا قَوْمُكَ مِنْهُ يَصِدُّونَ ﴿٥٧﴾ وَقَالُوٓا۟ ءَأَٰلِهَتُنَا خَيْرٌ أَمْ هُوَ ۚ مَا ضَرَبُوهُ لَكَ إِلَّا جَدَلًۢا ۚ بَلْ هُمْ قَوْمٌ خَصِمُونَ ﴿٥٨﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا عَبْدٌ أَنْعَمْنَا عَلَيْهِ وَجَعَلْنَٰهُ مَثَلًا لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٥٩﴾ وَلَوْ نَشَآءُ لَجَعَلْنَا مِنكُم مَّلَٰٓئِكَةً فِى ٱلْأَرْضِ يَخْلُفُونَ ﴿٦٠﴾ وَإِنَّهُۥ لَعِلْمٌ لِّلسَّاعَةِ فَلَا تَمْتَرُنَّ بِهَا وَٱتَّبِعُونِ ۚ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٦١﴾ وَلَا يَصُدَّنَّكُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ ۖ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٦٢﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چواردە بڕگەدا:

بـەر لـەوەی بڕگـەکان هەموویـان بێنیـن، ئـەم شـەش ئایەتـە، بـە تایبەتـی چـوار ئایەتـی یەکەمیـان، باسـی ئـەوە دەکـەن، کـە ڕۆژێـك هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرەکان لـە کـۆڕو مەجلیسـی پێغەمبـەردا ﷺ بـوون و، وەك لـە هـۆی هاتنـە خوارەوەکەیـدا

باسـمان کـردوە، پێغەمبـەر ﷺ فەرموویەتـی: {لَيْـسَ أَحَـدٌ يُعْبَـدُ مِـنْ دُونِ اللَّـهِ فِيـهِ خَـيْرٌ} (**أخرجـه أحمـد: ٢٩٢١، تعليـق شـعيب الأرنـؤوط: إسـناده حسـن**)، واتـە: هیـچ کام لەوانـەی جگـە لـە خـوا، یـان لـە جیاتـی خـوا دەپەرسـترێن، خێریـان پێـوە نیـە، ئەوانیـش گوتوویانـە، ئایـا تـۆ پێـت وا نیـە کـە عیسـا پێغەمبـەر بـووەو بەندەیـەك بـووە لـە بەنـدە چاکەکانـی خـوا، لەگـەڵ ئەوەشـدا کـە نەصرانییـەکان پەرسـتوویانە، ئنجـا ئەگـەر ڕاسـت بکـەی، ئەویـش هـەر وەك پەرسـتراوەکانی ئێمـە وایـەو دەبـێ وەك پەرسـتراوەکانی ئێمـە بچێتـە دۆزەخـەوە! ئیـدی خـوا ﷻ بـەو بۆنـەوە، ئـەم ئایەتـە موبارەکانـەی دابەزانـدن.

١)- ﴿وَلَمَّا ضُرِبَ ٱبْنُ مَرْيَمَ مَثَلًا﴾، کاتێك کوڕی مەریەم بە وێنە هێنرایەوە، سەلامی خوایان لەسەر بێ.

٢)- ﴿إِذَا قَوْمُكَ مِنْهُ يَصِدُّونَ﴾، کت و پڕ خەڵکەکەت، بەهۆی بە وێنە هێنانەوەیەوە، کردیان بە دەنگە دەنگ و گاڵە، وشەی: ﴿مِنْهُ﴾، یانی: (**مِن هَذا المَثَل**)، بە هۆی ئەو وێنەیەوە، واتە: گاڵە گاڵ و دەنگ بەرزکردنەوەکەیان لەو وێنە هێنانەیەوە سەری گرت، ﴿يَصِدُّونَ﴾، (**أي: يَضِجُّون**)، واتە: دەنگیان هەڵێناو، هەرایان کرد، وەك گاڵتە کردن، وشەی ﴿يَصِدُّونَ﴾، خوێنراویشەتەوە: (**يَصُدُّون**)، بەڵام چ بە: ﴿يَصِدُّونَ﴾ بێ، چ بە (**يَصُدُّون**) بێ، هەر بە مانای (**يَضِجُّون، يَصِيحون، وَيَرفَعونَ أَصْوَاتَهُم**)، بە مانای دەنگیان هەڵێناو، گاڵەیان کرد، هەردووك خوێندنەوەکە بەو واتایە دێن.

وەك (**الطَّبَري**) لـە تەفسـیرەکەی خـۆی دا[١] دەڵـێ: (**وَالصَّـوَابُ مِـنَ الْقَـوْلِ فِي ذَلِـكَ أَنَّهُـمَا قِرَاءَتَـانِ مَعْرُوفَتَـانِ، وَلُغَتَـانِ مَشْـهُورَتَانِ بِمَعْنًـى وَاحِـدٍ، وَلَـمْ نَجِـدْ أَهْـلَ التَّأْوِيـلِ فَرَّقُوا بَـيْنَ مَعْنَـى ذَلِـكَ إِذَا قُـرِئَ بِالضَّـمِّ وَالْكَـسْرِ، وَلَـوْ كَانَ مُخْتَلِفًـا مَعْنَـاهُ، لَقَـدْ كَانَ الِاخْتِـلَافُ فِي تَأْوِيلِـهِ بَـيْنَ أَهْلِـهِ مَوْجُـودًا وُجُـودَ اخْتِـلَافِ الْقِـرَاءَةِ فِيـهِ بِاخْتِـلَافِ اللُّغَتَـيْنِ، وَلَكِـنْ لَـمَّا**

---

(١) جامع البيان: ج٢٥، ص:٨٨.

لَـمْ يَكُـنْ مُخْتَلِـفَ الْمَعْنَـى لَـمْ يَخْتَلِفُـوا فِي أَنَّ تَأْوِيلَـهُ: يَضِجُّـونَ وَيَجْزَعُـونَ، فَبِـأَيِّ الْقِرَاءَتَيْنِ قَـرَأَ الْقَـارِئُ فَمُصِيـبٌ)، واتـە: قسـەی ڕاسـت لـەوەدا ئەوەیـە، کـە ئـەو دووانـە دوو خوێندنـەوەی نـاسراون و دوو زاری بـاون و یـەك واتایـان هەیـە، هیـچ کام لەوانـەی قورئانیـان مانـا کـردوە، جیاوازییـان نەخسـتۆتە نێـوان مانـای ئـەو دوو وشـەیەوە، چ بـە بـۆر (ضَـم) بخوێنرێتـەوەو، چ بـە ژێـر (کـسر)، چ بـە (يَصِـدُّون)، چ بـە (يَصُـدُّون)، هەردووکیـان بـە مانـای (يَضِجُّـونَ وَيَجْزَعُـونَ)، دەنگیـان بـەرز کردۆتـەوەو خۆیـان نارەحـەت کـردوەو گاڵەیـان کـردوە.

٣)- ﴿ وَقَالُوٓاْ ءَأَٰلِهَتُنَا خَيۡرٌ أَمۡ هُوَ ﴾، هەروەها گوتیان: ئایا پەرستراوەکانی ئێمە باشترن یان ئەو؟ ئنجا ﴿ ءَأَٰلِهَتُنَا ﴾، خوێندراوەتەوەش: (آلِهَتُنا)، یانی: بەبێ (هَمزةُ الإستِفهام)یش: (وَ قَالوا آلِهَتُنَا خَيرٌ أَم هوَ)، پەرستراوەکانی ئێمە باشترن یان ئەو؟ ئەوان بینایان کردوە، لەسەر فەرمایشتەکەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: {لَيْسَ أَحَدٌ يُعْبَدُ مِنْ دُونِ اللَّهِ فِيهِ خَيْرٌ}، (أخرجه أحمد: ٢٩٢١، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده حسن)، واتە: هیچ کام لەوانەی جگە لە خوا، یان لە جیاتی خوا دەپەرسترێن، خێریان پێوە نیە، هەندێك دەڵێن: بینا لەسەر ئەو فەرمایشتە وایان گوتوە، واتە: ئەگەر هەر کەسێك کە لەگەڵ خواداو لە جیاتی خوادا بپەرسترێ، خێری پێوە نەبێ، ئەوە تەنیا پەرستراوەکانی ئێمە بت و سەنەمەکان و پەرستراوەکانی ئێمە ناگرێتەوە، بەڵکو عیسای کوڕی مەریەمیش دەگرێتەوە.

٤)- ﴿ مَا ضَرَبُوهُ لَكَ إِلَّا جَدَلَۢا ﴾، تەنیا بۆ شەڕە قسە لە دژی تۆ ئەویان بە نموونە هێنایەوە.

٥)- ﴿ بَلۡ هُمۡ قَوۡمٌ خَصِمُونَ ﴾، بەڵکو ئەوان کۆمەڵێکی زۆر مشتومڕکەرو زۆر چەنەبازن حەزیان بە شەڕە قسەو دەمەقاڵێ دێت، چونکە (خَصِم)، واتە: (كَثيرُ الخُصُومَة)، کەسێك کە زۆر شەڕە قسەو دمبە دمە بکات، ﴿ خَصِمُونَ ﴾یش، کۆیەکەیەتی.

٦)- ﴿ إِنۡ هُوَ إِلَّا عَبۡدٌ أَنۡعَمۡنَا عَلَيۡهِ ﴾، ئەو تەنیا بەندەیەك بوو، ئێمە چاکەمان لەگەڵی دا کرد بوو، چاکەکەش کە خوا ﷻ دەیفەرموێ، مەبەست پێی بەخشینی پلەی پێغەمبەرایەتییە.

٧)- ﴿ وَجَعَلْنَـٰهُ مَثَلًا لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴾، کردبووشمان بە وێنەیەك بۆ وەچەی ئیسرائیل، بۆ گەلی جوولەکە، وشەی (مَثَل)، ﴿ مَثَلًا ﴾، (أي: أمْراً عَجِيْباً، حَقِيْقاً بِأَن يَسِيرِ بِذِكْرِهِ كَالأَمْثَالِ السَّائِرَة)، واتە: حاڵەتێکی سەرسوڕهێنەر، شایستەی ئەوە بووە، کە باس بکرێ، وەك ئەو پەندانەی دەهێنرێنەوە، یاخود وشەی: (مَثَلاً: أي عِبرةً)، کردبوومان بە پەندێك و شوێنی دەرس و پەند لێوەرگرتن، چونکە عیسا ﷺ خوا ﷻ بەبێ باب دروستی کردوەو تەنیا دایکی هەیە کە مەریەمە (خوا لێی ڕازی بێ)، بابی دیار نیە، کەواتە: ئەوە جێی هەڵوەستەو پەند لێوەرگرتنە، کە دەسەڵاتی خوا ﷻ لە دروستکردنی مرۆڤەکاندا سنووری نیە.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَجَعَلْنَـٰهُ مَثَلًا لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴾، کردبوومـان بـە وێنـە وەك پەندێـك، یاخـود وەك عیبـڕەت بـۆ بەنـی ئیسـرائیل، ئەمـە ئـەوەی لـێ وەردەگیـرێ کە عیسـا ﷺ تەنیـا بـۆ لای بەنـی ئیسـرائیل ڕەوانکـراوە، تەنیـا بـۆ وەچـەی یەعقـووب ﷺو، عیسـاش جگـە لـە بەنـی ئیسـرائیلی بـۆ پەیامەکـەی خـۆی بانـگ نەکـردوە.

کەواتـە: کـە دوایـی خەڵکێـك لـە وڵاتانـی ڕۆژئـاواو ئەورووپـای ئێسـتا، کـە کاتـی خـۆی ڕۆمیـان پـێ گوتـوەو، لـە یۆنـان و، لـە شـوێنەکانی دیکـەدا، شـوێنی عیسـا ﷺ کەوتـوون، لـە ڕاسـتییدا هـەر لـە خۆیانـەوە شـوێنی کەوتـوون، بـەڵام عیسـا پێغەمبەرێـك بـووەو، تایبـەت بـۆ گەلـی ئیسـرائیل ڕەوانـە کـراوە، هـەم لێـرەدا وا دەفەرمـوێ، هـەم لـە سـوورەتی (الصَّف)دا: ﴿ وَإِذْ قَالَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ يَـٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُم مُّصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَىَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَمُبَشِّرًۢا بِرَسُولٍ يَأْتِى مِنۢ بَعْدِى ٱسْمُهُۥٓ أَحْمَدُ ﴿٦﴾ ﴾، واتـە: یـاد بکـەوە کـە عیسـای کـوڕی مەریـەم گـوتی: ئـەی بەنـی ئیسـرائیل! مـن ڕەوانـە کـراوی خـوام بـۆ لای ئێـوەو، بەڕاسـتدانەری ئـەو تەوراتـەم کـە لـە پێـش دەسـتی منـەوە نێـردراوەو، موژدەشـتان پێـدەدەم بـە پێغەمبەرێـك لـە دوای مـن دێ، نـاوی ئەحمـەدە ﷺ.

٨)- ﴿ وَلَوْ نَشَآءُ لَجَعَلْنَا مِنكُم مَّلَـٰٓئِكَةً فِى ٱلْأَرْضِ يَخْلُفُونَ ﴾، ئەگەر ویستباشمان ئێمە لە ئێوە هەندێك فریشتەمان دەگێڕان، واتە: هەندێك لە ئێوەمان دەکردنە فریشتە، لە زەویدا دەبوونە نیشتەجێ و جێداری ئێوە، یاخود هەندێکیان لە دوای هەندێکیان

دەهاتن، هەردوو واتایەکەی هەن. ﴿ يَخْلُفُونَ ﴾، (أن يَخلُفُونَكُم)، دەبوونە جێنشینی ئێوە، یاخود: ﴿ يَخْلُفُونَ ﴾، واتە: (يَخلُفُ بَعْضُهُم بَعْضَاً)، هەندێکیان دەبوونە جێنشینی هەندێکیان، بە دوای یەکدا دەهاتن.

کەواتە: ﴿ وَلَوْ نَشَآءُ لَجَعَلْنَا مِنكُم مَّلَٰٓئِكَةً فِى ٱلْأَرْضِ يَخْلُفُونَ ﴾، سێ واتای هەن:

أ- واتە: هەندێکتانمان دەکردن بە فریشتە.

ب- دەمانتوانی لە وەچەی ئێوە فریشتان پەیدا بکەین.

ج- لە جێی ئێوە فریشتەمان دادەنان.

وەك خــوا ﷻ دەفەرمــوێ: ﴿ أَرَضِيتُم بِٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا مِنَ ٱلْـَٔاخِرَةِ ﴿٣٨﴾ ﴾التوبـة، (أي: بَـدَلاً مِـنَ الأخِـرَة)، ئایا ژیـانی دنیاتـان هەڵبژارد بەسـەر (مەنزڵگای) دوایــی دا، واتــە: دەســەڵاتی خــوا ســنووری نیــەو هەمــوو شــتی پــێ دەکــرێ، کــە ئێســتاش وایکــردوە، ئێــوەش بــن و، فریشــتەش بــن و، جندیــش بــن، ئێــوە ڕۆڵــی خۆتــان دەگێــڕن، فریشــتەش ڕۆڵــی خۆیــان دەگێــڕن، هــەروەك جندیــش کــە لەســەر زەویــن، ئەوانیــش ڕۆڵــی خۆیــان دەگێــڕن.

٩)- ﴿ وَإِنَّهُۥ لَعِلْمٌ لِّلسَّاعَةِ ﴾، بە دڵنیایی ئەو زانیارییە بۆ ئاخیر زەمان (ساعة)، ئەمە دوو واتای هەن:

١- عیسا عليه السلام هۆکارە بۆ زانیاریی هەبوون بە ئاخیر زەمان، کە مەبەست پێی دابەزینیەتی، بەر لەوەی ئاخیر زەمان بێ، واتە: کاتێ عیسا عليه السلام دادەبەزێ بۆ سەر زەوی، لە ئاسمان دادەبەزێ، ئەوە دەزانرێ کە کۆتایی هاتنی ژیانی مرۆڤ لەسەر زەوی، زۆر نزیك بۆتەوە، ئەم ڕایە لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس و موجاهیدو قەتادەوە (خوا لێیان ڕازی بێ)، گێڕدراوەتەوە واتە: ڕاناوی: ﴿ وَإِنَّهُۥ ﴾، دەچێتەوە بۆ عیسا عليه السلام.[1]

٢- ڕایەکی دیکە هەیە، کە ڕاناوی ﴿ وَإِنَّهُۥ ﴾، دەچێتەوە بۆ قورئان، (أي: القرآن عِلمٌ لِلسَّاعة)، زانیارییەو هۆکاری زانیارییە دەربارەی ئاخیر زەمان، واتە: قورئان هۆکاری زانیاریی هەبوونە بە ڕۆژی دوایی بە گشتیی، یاخود بە ئاخیر زەمان، چونکە وشەی

---

(١) دوایی لەو بارەوە سێ دەقی سوننەت دێنین

**(ساعة)** بە کاتێکی دیارییکراو دەگوترێ، کە ئاخیر زەمانی تێدا دێ، یاخود قیامەتی تێدا دێ، یاخود هەردوو قۆناغی ئاخیر زەمان و قیامەتی تێدا دێن، لە ڕۆژی دوایی دا، ئەم ڕایەش حەسەن و قەتادەو ئیبنو جوبەیر پەسندیان کردوە، چونکە لە نێو قورئان دا ئەو بەڵگە جۆراو جۆرانە هەن، بۆ ئیسپاتی ئەوە کە زیندوو کرانەوەو سزاو پاداشت هەیە.

١٠)- ﴿ فَلَا تَمْتَرُنَّ بِهَا ﴾، واتە: تێیدا دوو دڵ مەبن، لە بارەی **(سّاعة)**ەوە دوو دڵ مەبن، **(الإمتِراء: الشَّكُّ)**، دوو دڵیی.

١١)- ﴿ وَٱتَّبِعُونِ ﴾، هەروەها شوێنم بکەون، **(إتَّبِعوا مَا أرْسَلتُ إلَيكُم مِن كَلامي وَرسولي)**، شوێن ئەوە بکەون، کە بۆم ناردوون لە فەرمایشتەکەم و ڕەوانە کراوەکەم، ئنجا ئەگەر وابێ، ئەوە ڕاستەوخۆ فەرمایشتی خوایە، یاخود: لێرەدا وشەی **(قُل)** کە بە سیاق و سەلیقە دەزانرێ، قرتێنراوە، یانی: **(قُلِ اتَّبِعونِ)** ئەی پێغەمبەر ﷺ ئەی موحەممەد! بڵێ: شوێنم بکەون، ﴿ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴾، ئەمە ڕێی ڕاستە، کەواتە: دەگونجێ، ﴿ وَٱتَّبِعُونِ ﴾، فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ بێ و، خوا ﷻ لەسەر زمانی ئەو فەرموویەتی.

١٢)- ﴿ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴾، ئا ئەمە ڕێی ڕاستە، واتە: قورئان ڕێی ڕاستە، یاخود: خوا بەیەکگرتن و تەنیا بەندایەتیی بۆ خوا کردن، یاخود ئایینی ئیسلام بە گشتیی، ڕێی ڕاستە، هەموویان دەگرێتەوە.

١٣)- ﴿ وَلَا يَصُدَّنَّكُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ ﴾، با شەیتانیش لاتان نەدات، لاڕێتان نەکات، هەتڵەتان نەکات، ﴿ وَلَا يَصُدَّنَّكُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ ﴾، وەك ئەوە وایە، کە لە عەڕەبییدا دەگوترێ: **(لا أَعْرِفَنَّكَ تَفْعَلُ كَذَا)**، یان **(لاَ أُلْفَيَنَّكَ فِي مَوضِعِ كَذَا)**، نەزانم تۆ ئەوەت کردبێ، یان: نەتبینم لە فڵانشوێن، واتە: ئەوە مەکەو لە فڵان شوێن مەبە، لێرەش واتە: لە خۆتان وریابن و با شەیتان لاتان نەدات.

١٤)- ﴿ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴾، بە دڵنیایی ئەو بۆ ئێوە دوژمنێکی ئاشکرایە، ئەمە هۆکار دۆزیی **(تَعلِيل)**ە، بۆ ئەوەی ڕابرد، واتە: چونکە ئەو بۆ ئێوە دوژمنێکی ئاشکرایە، دەبێ لە خۆتان وریا بن، ئەگەرنا لە ڕاستە شەقامی خوا لاتان دەدات.

## هەندێک وردەکاریی مانای (وَلَمَّا ضُرِبَ ٱبۡنُ مَرۡيَمَ مَثَلًا)

(الطَّبَرِي) لە تەفسیرەکەی خۆی دا دەڵێ: (وَلَمَّا شَبَّهَ اللَّهُ عِيسَى فِي إِحْدَاثِهِ وَإِنْشَائِهِ إِيَّاهُ مِنْ غَيْرِ فَحْلٍ بِآدَمَ، فَمَثَّلَهُ بِهِ بِأَنَّهُ خَلَقَهُ مِنْ تُرَابٍ مِنْ غَيْرِ فَحْلٍ، إِذَا قَوْمُكَ يَا مُحَمَّدُ مِنْ ذَلِكَ يَضِجُّونَ وَيَقُولُونَ: مَا يُرِيدُ مُحَمَّدٌ مِنَّا إِلَّا أَنْ نَتَّخِذَهُ إِلَهًا نَعْبُدُهُ، كَمَا عَبَدَتِ النَّصَارَى الْمَسِيحَ)[1].

واتە: دوای ئەوەی خوا ﷻ، لەوەدا کە عیسای هێناوەتە دی و پێکەیاندوە، بەبێ هەبوونی باب، چواندوویەتی بە ئادەمەوە، کە ئادەمیش نە بابی هەبووەو نە دایك، {لە سوورەتی (آلِ عِمران)دا، دەفەرمووێ: ﴿ إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ ٱللَّهِ كَمَثَلِ ءَادَمَۖ خَلَقَهُۥ مِن تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ۝٥٩ ﴾}، خەڵکەکەت، ئەی موحەممەد! ﷺ بەهۆی ئەوەوە کردیان بە هەراو گاڵەو گوتیان: موحەممەد ئەوەی لە ئێمە دەوێ، کە بیگرین بە پەرستراو، هەروەك چۆن نەصرانییەکان مەسیح دەپەرستن.

هەر (الطبري) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[2]، ڕایەکی دیکە دێنێ، دەڵێ: (بَلْ عَنَى بِذَلِكَ قَوْلَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ ﴿ إِنَّكُمۡ وَمَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنتُمۡ لَهَا وَٰرِدُونَ ۝٩٨ ﴾الأنبياء، قِيلَ الْمُشْرِكِينَ عِنْدَ نُزُولِهَا: قَدْ رَضِينَا بِأَنْ تَكُونَ آلِهَتُنَا مَعَ عِيسَى وَعُزَيْرٍ وَالْمَلَائِكَةِ، لِأَنَّ كُلَّ هَؤُلَاءِ مِمَّا يُعْبَدُ مِنْ دُونِ اللَّهِ).

واتە: بەڵکو مەبەست لەم وێنە هێنانەوەیە، فەرمایشتی خوایە کە فەرمووی: ﴿ إِنَّكُمۡ وَمَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنتُمۡ لَهَا وَٰرِدُونَ

---

(١) جامع البيان، برقم: ٣٠٩٦٨.

(٢) جامع البيان، برقم: ٣٠٩٧١

(٩٨) ﴾الأنبياء، قسـەی هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرەکان، لـە کاتـی دابەزینـی ئـەو ئایەتـەی سـوورەتی (الأنبیـاء)، کـە گوتیـان: ئێمـە ڕازییـن، پەرسـتراوەکانی ئێمـەش لەگـەڵ عیسـاو عوزەیـرو فریشـتەکاندا بـن، چونکـە هەمـوو ئەوانـە لەجیاتـی خـواو، لەگـەڵ خـوادا پەرسـتراون.

دەشـگونجێ بەهـۆی ئـەو فەرموودەیـەی پێغەمبـەرەوە ﷺ بـوو بـێ، کـە لـە هـۆی هاتنـە خوارەوەکـەی دا باسـمان کـرد، کـە دەفەرمـوێ: {لَيْـسَ أَحَـدٌ يُعْبَـدُ مِـنْ دُونِ اللَّـهِ فِيـهِ خَـيْرٌ}، واتـە: هیـچ کامـە لەوانـەی جگـە لـە خـوا، یـان لـە جیاتـی خـوا دەپەرسـترێن، خێریـان پێـوە نیـە.

(**القُرطُبـي**)، لـە تەفسـیرەکەی خۆیـدا[1] ئـاوا لـە بـارەی ئـەو ئایەتانـەوە قسـە دەکات، دەڵـێ: (لَـمَّا أَنْـزَلَ اللـهُ: ﴿ وَسْـَٔلْ مَنْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رُّسُلِنَآ أَجَعَلْنَا مِن دُونِ ٱلرَّحْمَٰنِ ءَالِهَةً يُعْبَدُونَ (٤٥) ﴾الزخـرف، تَعَلَّـقَ المُشرِكُـونَ بِأَمْـرِ عِيْـسَى، قَالُـوا: مَـا يُرِيـدُ مُحَمَّـدُ إلاَّ أَنْ نَتَّخِـذَهُ إلَهَـاً كَـمَا اتَّخَـذَتِ النَّصَـارى ابـن مَرِيَـمَ إلَــهَاً، وعَـن مُجَاهِـد قَـال: إنَّ قُرَيشَـاً قَالَـت: أنَّ مُحَمَّـدَاً يُرِيـدُ أَنْ نَعبُـدَهُ كَـمَا عَبَـدَ قَـوْمُ عِيْـسَى، عِيْـسَى، فَأَنْـزَلَ اللـهُ هَـذِهِ الآيَـة..).

واتــە: قەتـادە گوتوویەتـی: کاتێـك خـوا ﷻ ئـەو ئایەتـەی دابەزانـد، کـە هـەر لـە سـوورەتی (**الزخـرف**)دا هاتـوە: (لـەو پێغەمبەرانـەی لـە پێـش تـۆدا ڕەوانمـان کـردوون بپرسـە، ئایـا جگـە لـە (خـوای) بـە بەزەیـی، پەرسـتراوانێکی دیکەمـان دانـاون بپەرسـترێن؟) هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرەکان عیسـایان ؈ کـردە بیانـوو، گوتیـان: موحەممـەد ﷺ دەیـەوێ ئێمـە بـە پەرسـتراوی بگریـن، وەك چـۆن نەصرانییـەکان کـوڕی مەریەمیـان بـە پەرسـتراو گـرت، هەروەهـا لـە موجاهیـدەوە هاتـوە، کـە گوتوویەتـی: قورەیشـییەکان گوتیـان: موحەممـەد دەیـەوێ بیپەرسـتین، وەك چـۆن گەلـی عیسـا عیسـایان پەرسـت، خـواش ﷻ ئـەم ئایەتـەی نـاردە خـوار.

---

(١) ج٢٥، ص٨٠ و ٨١.

**(القُرطُبـي)** ڕیوایەتێکـی دیکـە[1]، هـەر لـەو بـارەوە دێنـێ: **(قَـالَ ابْـنُ عَبَّـاسٍ: أَرَادَ بِـهِ مُنَاظَـرَةَ عَبْـدِ اللهِ بْـنِ الزِّبَعْـرِي مَـعَ النَّبـيِّ ﷺ فِي شَـأْنِ عِيْـسَى)**، واتـە: عەبدوڵڵای کـوڕی عەبباس (خـوا لێیـان ڕازی بـێ)، گوتوویەتـی: خـوا ﷻ مەبەسـتی لـەو وێنـە هێنانەوەیـە، ئـەو وتووێـژەی عەبدوڵڵای کـوڕی زەبعەریـی بـووە لەگـەڵ پێغەمبـەردا ﷺ لـە بـارەی عیسـاوە، کـە پێـی گـوت: ئایـا تـۆ پێـت وا نیـە عیسـا ؈ پێغەمبـەری خـوا بـووەو، بەندەیەکـی چاکـی خـوا بـووە؟ پێغەمبەریـش ﷺ فەرمـووی: بـا، گـوتی: مـادام هەمـوو ئەوانـەی لـە جیاتـی خـوا ﷻ دەپەرسـترێن بچنـە دۆزەخ، دەبـێ عیسـاش بچێتـە دۆزەخ!.

هەڵبەتـە ئـەو هۆکارانـە هەموویـان گونجـاون، چ بەهـۆی فەرمایشـتەکەی پێغەمبـەرەوە ﷺ بـوو بـێ، چ بەهـۆی ئایەتەکـەی سـوورەتی **(الأنبیاء)**ەوە بـوو بێ، چ بەهـۆی ئایەتەکـەی سـوورەتی **(آلِ عمـران)**ەوە بـوو بـێ، گرنـگ ئەوەیـە هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرەکان، ئـەوە کە پەرسـتراوەکان لەگـەڵ پەرستەرەکانیاندا دەچنـە دۆزەخەوە، کردوویانـە بـە بەڵگـەو دەسـتەچیلەی ئـەوە: عیسـاو عوزەیـرو فریشـتەکانیش کـە دەپەرسـترێن، دەبـێ بچنـە دۆزەخـەوە، بـەڵام بێگومـان پێوانـە (قیـاس) کردنەکەیـان لـە جێـی خۆیـدا نیـەو، ئەمـە لـە زمانـی عەرەبییـدا پێـی دەگوتـرێ: **(قِیـاسٌ مَـعَ الفَـارِق)**، پێوانەکـردن لەگـەڵ جیاوازیـی دا، یـان کوردەواریـی دەڵێـن: قیاسـی کەشـکێ لـە مەشـکێ، چونکـە:

١- خوا ﷻ لە ئایەتەکەدا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنتُمْ لَهَا وَٰرِدُونَ ﴿٩٨﴾ ﴾الأنبياء، ئێوەو ئەو شتانەی دەیانپەرستن، نەیفەرموە: ئێوەو ئەو کەسانە، **(مَا)** بۆ شتانە، نەك بۆ شەخسان، نەیفەرموە: **(إِنَّكُم وَمَن تَعبُدونَ)**، کەواتە: مەبەست پێی پەیکەرو بت و سەنەم و ئەو شتانە بوون کە پەرستوویانن.

---

(١) ج٢٥، ص٨٠ و ٨١.

٢- خوا ﷻ لێرەدا کە وا دەفەرموێ، هەر لەو سیاقەشدا، دەفەرموێ: ﴿ إِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنتُمْ لَهَا وَٰرِدُونَ ﴿٩٨﴾ لَوْ كَانَ هَٰٓؤُلَآءِ ءَالِهَةً مَّا وَرَدُوهَا ۖ وَكُلٌّ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٩٩﴾ لَهُمْ فِيهَا زَفِيرٌ وَهُمْ فِيهَا لَا يَسْمَعُونَ ﴿١٠٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ سَبَقَتْ لَهُم مِّنَّا ٱلْحُسْنَىٰٓ أُو۟لَٰٓئِكَ عَنْهَا مُبْعَدُونَ ﴿١٠١﴾ لَا يَسْمَعُونَ حَسِيسَهَا ۖ وَهُمْ فِى مَا ٱشْتَهَتْ أَنفُسُهُمْ خَٰلِدُونَ ﴿١٠٢﴾ لَا يَحْزُنُهُمُ ٱلْفَزَعُ ٱلْأَكْبَرُ وَتَتَلَقَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ هَٰذَا يَوْمُكُمُ ٱلَّذِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴿١٠٣﴾ ﴾(الأنبياء)، فەرموویەتی: بە دڵنیایی ئێوەو ئەو شتانەی دەیانپەرستن لە جیاتی خوا، دەبنە سووتەمەنیی دۆزەخ، ئێوە دەیچنە نێوی، ئەگەر ئەوانەش پەرستراو بوونایە، نەدەچوونە نێو دۆزەخ، هەموویان تێیدا هەمیشەیی دەبن، لەوێدا هەناسەدانەوەیان هەیە، (هەناسەدانەوەی زۆر بە زەحمەت)، ئەوان لەوێدا نابیستن، بە دڵنیایی ئەوانەی پێشتر چاکەیان لە لایەن ئێمەوە بۆ بڕیاردراوە، ئەوانە لە دۆزەخ دوورخراوەن و گوێیان لە هەست و خوستی دۆزەخیش نابێ، (گوێیان لە قرچەقرچی ئاگرەکەشی نابێ)، لەوەدا کە نەفسەکانیان ئارەزووی دەکەن، تێیدا دەمێننەوەو، ڕاچڵەکینی گەورە، دڵتەنگیان ناکات، فریشتەکان پێشوازییان لێ دەکەن، پێیان دەڵێن: ئەوە ئەو ڕۆژە بوو، کە بەڵێنتان پێدراوەو گفتتان پێ درا، کەواتە: هەر لەو سیاقەدا خوا ﷻ وەڵامی ئەو قسانەی داوەتەوە.

قورئانیش و فەرمایشتی پێغەمبەریش ﷺو، هەر قسەیەکی دیکەش، نابێ لێك دابڕێنرێ، بەڵکو دەبێ پێشکەوتوو و پەیوەست بوو (سَابِق ولاحِق)، ئەوەی پێشی هاتووەو ئەوەی دوایی، هەمووی پێکەوە سەرنج بدرێ، ئەگەرنا هەر قسەیەك قڵت و بڕی بکەی، پێشەوەی بێنی و دواییەکەی نەهێنی، یان: هی دوایی بێنی و هی پێشەوەی نادیدە بگری، هەر هەڵە دەردەچێ، وەك ئایەتەکەی سوورەتی: (المَاعون) کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ ﴿٤﴾ ﴾، سزای سەخت بۆ نوێژکەران، بەڵام دواییەکەی لەگەڵ نەڵێی: ﴿ ٱلَّذِينَ هُمْ عَن

﴿ صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ ﴿٥﴾ ﴾، ئەوانـەی لـە نوێژەکانیـان بێئـاگان، بێگومـان مانایەکـەی هەڵـە دەردەچـێ، یـان ئایەتەکـەی سـوورەتی (النّسـاء) کـە دەفەرمـوێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَقْرَبُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ سُكَـٰرَىٰ ﴿٤٣﴾ ﴾، ئەگـەر لەسـەر (لَا تَقْرَبُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ) بوەسـتی، هەڵەیـە، چونکـە خـوا فەرموویـەتی: بـە سەرخۆشـیی توخنـی نوێـژێ مەکـەون، نەیفەرمـوە: توخنـی نوێـژێ مەکـەون.

ئنجا با چوار فەرمایشتیش لە بارەی ئەم ئایەتانەوە، بێنین:

**١- {عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَا ضَلَّ قَوْمٌ بَعْدَ هُدًى كَانُوا عَلَيْهِ إِلاَّ أُوتُوا الْجَدَلَ، ثُمَّ تَلاَ هَذِهِ الآيَةَ: ﴿ مَا ضَرَبُوهُ لَكَ إِلَّا جَدَلًۢا ۚ بَلْ هُمْ قَوْمٌ خَصِمُونَ ﴿٥٨﴾ ﴾ الزخرف}، (أخرجه ابْنُ مَاجَه: ٤٨، وَأَحْمَد: ٢٢٢٥٨، تعليق شعيب الأرنؤوط: حديث حسن بطرقه وشواهده).**

واتـە: ئەبـوو ئومامـە ﷺ، دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرمـووی هیـچ کۆمەڵێـك، دوای ئـەوەی ڕێنمایـی و ڕێ ڕاسـت پێشـاندرانیان پێـدراوە، گومـڕا نەبـوون، مەگـەر بەهـۆی شـەڕە قسـەو، مشـتومڕەوە (کـە هـەر کامێکیـان بیـەوێ قسـەی خـۆی سـەرکەوێ، بـێ ئـەوەی تەماشـا بکـەن، داخـۆ هـەق لـە کوێیـە).

چونکـە وەك لـە شـیکردنەوەی مانـای وشـەکاندا هێنامـان، (**جِـدَال**) ئەوەیـە دوو کـەس، هـەر کامێکیـان بیـەوێ ئـەوی دیکـە بخـات، دەگوتـرێ: (**الجِدالـة: الأَرْضُ الصُّلْبَـة**) زەوییـەکی سـەخت، کـە دوو کـەس زۆران دەگـرن، ملانـە دەگـرن و هـەر کامێکیـان دەیـەوێ ئـەوی دیکـە بخاتـە سـەر زەوی، (**جِدال**)یـش لـەوەوە هاتـوە، هـەر بۆیـە لـە ئیسـلامدا (**جِـدال**) مەگـەر بـە ناچاریـی، ئەگەرنـا بـە شـتێکی ناپەسـند دانـدراوە، بـەڵام وتووێـژو گفتوگـۆ (**حـوار**) پەسـندە.

**٢- پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {الأَنْبِيَاءُ إِخْوَةٌ لِعَلَّاتٍ، أُمَّهَاتُهُمْ شَتَّى وَدِينُهُمْ وَاحِدٌ، وَأَنَا أَوْلَى النَّاسِ بِعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ، لِأَنَّهُ لَمْ يَكُنْ بَيْنِي وَبَيْنَهُ نَبِيٌّ، وَإِنَّهُ نَازِلٌ، فَإِذَا رَأَيْتُمُوهُ فَاعْرِفُوهُ: رَجُلٌ مَرْبُوعٌ إِلَى الْحُمْرَةِ وَالْبَيَاضِ، عَلَيْهِ ثَوْبَانِ مُمَصَّرَانِ كَأَنَّ رَأْسَهُ يَقْطُرُ، وَإِنْ لَمْ يُصِبْهُ بَلَلٌ، فَيَدُقُّ**

**الصَّلِيبَ، وَيَقْتُلُ الْخِنْزِيرَ، وَيَضَعُ الْجِزْيَةَ، وَيَدْعُو النَّاسَ إِلَى الإِسْلَامِ} (أخرجه أحمد: ٩٢٧٠)**، واتە: پێغەمبەران بران، دایکانیان جۆراوجۆرن، بەڵام یەك ئایینیان هەیە، (وەك چۆن پیاوێك چەند هاوسەرێکی هەن، منداڵەکانی باوکیان یەکە، بەڵام دایکیان جیان)، منیش نزیکترین کەسم و لە پێشترین کەسم لە عیسای کوڕی مەریەمەوە، چونکە لە نێوان من و ئەودا هیچ پێغەمبەرێك نەبووە، ئەویش دادەبەزێ (لە ئاسمان)، کە دیتتان بیناسن پیاوێکی دەستەیە بە لای سوورو سپیی دا، دوو پۆشاکی (**مُمَصَّر**)ی لە بەردان سەری بەبێ تەڕبوون وەك ئاوی لێ بتکێ، خاچ دەشکێنێ، (ئەو خاچەی ئێستا نەصرانییەکان لە ملی دەکەن و بە پیرۆزی دەگرن)، بەراز دەکوژێ و، سەرانە لا دەبات و خەڵك بۆ ئیسلام بانگ دەکات.

واتە: هەر ئەو شەریعەتەی پێغەمبەر موحەممەد ﷺ هێناویەتی، عیسا عليه السلام هەر ئەوە تەبەننیی دەکات، لە دوای پێغەمبەری خاتەمەوە، هیچ پێغەمبەرێك نایەت، عیساش پێغەمبەرێکی پێشترەو لە ئاسمانەوە دادەبەزێ و، شەریعەتی پێغەمبەری کۆتایی جێبەجێ دەکات.

**٣- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: وَاللَّهِ لَيَنْزِلَنَّ ابْنُ مَرْيَمَ حَكَمًا عَدْلاً، فَلَيَكْسِرَنَّ الصَّلِيبَ، وَلَيَقْتُلَنَّ الْخِنْزِيرَ، وَلَيَضَعَنَّ الجِزْيَةَ، وَلَيُتْرَكُنَّ الْقِلاصُ، فَلا يُسْعَى عَلَيْهَا، وَلَيَذْهَبَنَّ الشَّحْنَاءُ وَالتَّبَاغُضُ وَالتَّحَاسُدُ، وَلَيُدْعُوَنَّ إِلَى الْمَالِ، فَلا يَقْبَلَهُ أَحَدٌ} (أخرجه البخاري: ٢٢٢٢، ومسلم: ١٥٥، والترمذي: ٢٢٣٣، وابن ماجه: ٤٠٧٨ وأبي عوانة: ٣١٣، غيرهم).**

واتە: ئەبوو هورەیرە رضي الله عنه، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: عیسای کوڕی مەریەم وەك حاکمێکی دادگەر دادەبەزێ (لە ئاسمان)، خاچ دەشکێنێ و بەراز دەکوژێ، (کە ئێستا نەصرانییەکان، لە ئەنجامی لادان لە دینی خواوە، گۆشتی بەرازیان ڕەوا کردوە، مەییان ڕەوا کردوەو، زینایان ڕەوا کردوە)و، سەرانە لادەبات، (واتە: کەس نامێنێ وەك خاوەن کتێب سەرانەیان لێ وەربگیرێ، هەموو خەڵك دێتە ژێر سێبەری ئیسلامەوە)و، حوشتری زۆرباش واز لێدەهێنرێن، کەس سواریان

نابێ بۆ ئیش و کار، (ماڵ و سامان زۆر دەبێ)، کینەو ڕق لە یەکدی هەستان و حەسوودیی بەیەکدیی بردن نامێنێ، عیسا ﷺ بانگ دەکات بۆ ماڵ و سامان، کە خەڵك وەریبگرێ، بەڵام کەس لێی وەرناگرێ، (خەڵك لەو کاتەدا دەوڵەمەندو بێ نیاز دەبن لەوەی صەدەقەو زەکات وەربگرن).

٤- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «كَيْفَ أَنْتُمْ إِذَا نَزَلَ ابْنُ مَرْيَمَ فِيكُمْ، وَإِمَامُكُمْ مِنْكُمْ»} (أخرجه البخاري: ٣٤٤٩، ومسلم: ١٥٥)، واته: ئەبوو هورەیرە ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: حاڵتان چۆن دەبێ، کاتێك کوڕی مەریەم دادەبەزێتە نێوتان و، پێشەوایەکەتان لە خۆتان دەبێ!

واتە: ئەو کەسەی پێشنوێژییتان بۆ دەکات، هەر لە خۆتان دەبێ، (ئیمامەکە قامەتی نوێژکردنی بۆ کراوە، دەڵێ: ئەی عیسای مەسیح! پێشبکەوە، دەڵێ: نەخێر مادام قامەت بۆ تۆ کراوە، تۆ ئیمامەتییەکە بکە).

مەسەلەی دووەم:

**دوای ئـەوەی عیسـا ﷺ بەڵگـە ڕۆشـنەکانی هێنـاون، بـە خەڵکەکـەی ڕاگەیانـدوە کـە: حیکمەتـی بـۆ هێنـاون و، ڕوونکردنـەوەی هەندێـك لـە ڕاجیاییەکانـی پێیراگەیانـدوون، پێشـیراگەیاندوون کـە تەنیـا خـوا پـەروەردگاری خۆیشـی و ئەوانیشـە، کەچـی پەیڕەوانـی بەرنامەکـەی دوای خـۆی، بوونـە چەنـدان حیـزب و تاقمـی پێکـەوە ناکـۆکی جـۆراو جـۆرو، سـەرەنجام سـزای دادگەرانـەی خـوا لەسـەر سـتەمکارانیان پێویسـت بـوو:**

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَمَّا جَآءَ عِيسَىٰ بِٱلۡبَيِّنَٰتِ قَالَ قَدۡ جِئۡتُكُم بِٱلۡحِكۡمَةِ وَلِأُبَيِّنَ لَكُم بَعۡضَ ٱلَّذِي تَخۡتَلِفُونَ فِيهِۖ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿٦٣﴾ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ رَبِّي وَرَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُوهُۚ هَٰذَا صِرَٰطٞ مُّسۡتَقِيمٞ ﴿٦٤﴾ فَٱخۡتَلَفَ ٱلۡأَحۡزَابُ مِنۢ بَيۡنِهِمۡۖ فَوَيۡلٞ لِّلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنۡ عَذَابِ يَوۡمٍ أَلِيمٍ ﴿٦٥﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:

١)- ﴿ وَلَمَّا جَآءَ عِيسَىٰ بِٱلۡبَيِّنَٰتِ ﴾، کاتێك عیسا ﷺ بەڵگە ڕۆشنەکانی هێنان، (**البَيِّنَات: المُعجِزَات، أو آياتُ الإنجيل، أو الشَّرائِع**)، بەڵگە ڕۆشنەکان، دەگونجێ مەبەست موعجیزەکانی بێ، وەك زیندوو کردنەوەی مردوو، چاککردنەوەی نەخۆشی گول و بەڵەك و کەڕو کوێری زگماك و تا دوایی، دەشگونجێ مەبەست ئایەتەکان و ڕستەکانی ئینجیل بێ، دەشگونجێ مەبەست ئەو حوکمە شەرعییە ڕۆشنانە بێ کە هێناونی.

٢)- ﴿ قَالَ قَدۡ جِئۡتُكُم بِٱلۡحِكۡمَةِ ﴾، (کاتێك عیسا ﷺ بەڵگە ڕۆشنەکانی هێنان)، فەرمووی: بە دڵنیایی حیکمەتم بۆ هێناون، حیکمەت ئەگەر بمانەوێ بە یەك وشە مانای بکەین، واتە: دانایی، کارامەیی، لێزانیی، بەڵام لە ڕاستییدا (حیکمەت) وەك لە ئایەتەکانی سوورەتی (**الإسراء**) وەردەگیرێ و، لە تەفسیری سوورەتی (**الإسراء**)دا باسمان

کردوە، بریتیە لە خۆ ڕازاندنەوە بە سیفەتە بەرزو جوانەکان و، لە خۆ داڕنینی سیفەتە نزم و پەست و خراپەکان، چونکە خوا ﷻ دوای ئەوەی لە ئایەتەکانی: (٢٢ - ٣٩)دا، بیست و چوار (٢٤) خەسڵەت باس دەکات، دوازدە (١٢)یان بەرزو پەسندو چاك و، دوازدە (١٢)شیان نزم و پەست و خراپ، دوایی دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ مِمَّآ أَوۡحَىٰٓ إِلَيۡكَ رَبُّكَ مِنَ ٱلۡحِكۡمَةِ (٣٩)﴾، ئەوە ئەو حیکمەتەیە کە پەروەردگارت بۆی سروش کردووی.

کەواتە: حیکمەت بریتیە لە خۆ ڕازاندنەوە بە سیفەتە بەرزو پەسندەکان و، خۆ بژارکردن لە سیفەتە نزم و خراپەکان.

بەڵام زانایان و توێژەرەوان هەندێکیان گوتوویانە: حیکمەت واتە: شەریعەت، هەندێکیان گوتوویانە: ئەو ئینجیلەی کە حیکمەت دەگرێتە خۆی، چونکە تەورات بریتی بووە لە بەرنامەیەك کە هەموو پێغەمبەرانی بەنوو ئیسرائیل کاریان پێکردوە، بەڵام ئینجیل کۆمەڵێك ئامۆژگاریی رووحیی و ڕەوشت و ئاکاری بەرزو پەسندی تێدان.

٣)- ﴿وَلِأُبَيِّنَ لَكُم بَعۡضَ ٱلَّذِي تَخۡتَلِفُونَ فِيهِ﴾، (هەروەها هاتووم) تاکو، هەندێك لەوەی تێیدا کەوتوونە ڕاجیایی، بۆتان ڕوون بکەمەوە.

٤)- ﴿فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ﴾، دەجا پارێز لە خوا بکەن و، فەرمانبەریی من بکەن، پارێز لە خوا بکەن بە شوێنکەوتنی کتێبەکەی و، فەرمانبەریی من بکەن، بەوە کە ڕێبازەکەم بگرن.

لێرەدا هەم (طَبَري)، هەم هەندێك لە توێژەرەوانی دیکە، لە ڕوونکردنەوەی ئەو قسەیەدا، کە عیسا علیه السلام فەرموویەتی: ﴿وَلِأُبَيِّنَ لَكُم بَعۡضَ ٱلَّذِي تَخۡتَلِفُونَ فِيهِ﴾، تاکو ئەوەی تێیدا کەوتوونە ڕاجیایی بۆتان ڕوون بکەمەوە، گوتوویانە: (**الأُمُور الدِّينيَّة لاَ الدُّنيَويَّة**)، کاروباری ئایینی نەك کاروباری دنیایی، بەڵام ئەوە قسەیەکە هەر لەخۆوە کردوویانە، ئنجا (طَبَري)ە، یان هەر کەسێکی دیکەیە، چونکە عیسا علیه السلام نەیگوتوە: کاروباری دینیتان بۆ ڕوون دەکەمەوەو، لە

هـی دنیایـی دەگەڕێـم، دینیـش بـۆ ڕێکخسـتنی دنیـا هاتـوە، کەواتـە: ئـەو قسـەیە هەرچەنـدە (طَـبَري)و ژمارەیـەك لـە توێـژەرەوان كـە ڕەنگـە لەویـان وەرگرتبـێ، هێناویانـە، بـەڵام لـە ڕاسـتییدا قسـەیەکە لـە جێـی خۆیـدا نیـە.

٥)- ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ رَبِّى وَرَبُّكُمْ ﴾، بە دڵنیایی بەس خوا پەروەردگاری من و ئێوەشە.

٦)- ﴿ فَٱعْبُدُوهُ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴾، ئنجا بەندایەتیی تەنیا بۆ خوا بکەن، ئا ئەمە ڕێی ڕاستە.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ رَبِّى وَرَبُّكُمْ فَٱعْبُدُوهُ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴾، ئـەم ڕاسـتییە لـە سـوورەتی (آلِ عمـران)، ئایەتـی (٥١)دا هاتـوەو، لـە سـوورەتی (المائِـدة)، ئایەتـی (١١٧)دا هاتـوەو، لـە سـوورەتی (مَريَـم) ئایەتـی (٣٦)دا هاتـوەو، لـەم سـوورەتی (الزخـرف) ئایەتـی (٦٥)ش دا هاتـوە، واتـە: لـە چـوار شـوێن لـە قورئانـدا دووبـارە بۆتـەوە، ئـەوەش بەرپەرچدانـەوەی نەصرانییەکانـە، کـە دەڵێـن: عیسـا کـوڕی خوایـەو، بەشـێکە لـە خـوا، یـان بەشـێك لـە پەروەردگارێتیـی هەیـە، ئـەوە هەمـووی بەرپەرچدانـەوەی ئـەو قسـانەی ئەوانـە، خـوا ﷻ زانیویەتـی نەصرانییـەکان بەزۆریـی ئـەوە دەبێتـە هـۆی گومڕاییـان، بۆیـە ئـەو ڕاسـتییەی لـە چـوار شـوێن لـە قورئانـدا دووبـارە کردۆتـەوە، سـوورەتەکانی: (آلِ عمـران، المائِـدة، مَريَـم، الزخـرف)، [بـە دڵنیایـی هـەر خـوا پـەروەردگاری مـن و ئێوەشـە، بیپەرسـتن، ئـا ئـەوە ڕێـی ڕاسـتە].

بـەڵام بگوتـرێ: عیسـا کـوڕی خوایـە، یـان یەکێکـە لـە سـێیەکان، ﴿ لَقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ .... ﴿٧٢﴾ ﴾المائِـدة، بـە تەئکیـد ئـەوە شـیرك و بێبڕواییـە.

٧)- ﴿ فَٱخْتَلَفَ ٱلْأَحْزَابُ مِنۢ بَيْنِهِمْ ﴾، حیزبەکان و، کۆمەڵەکان، لە نێو خۆیاندا کەوتنە ڕاجیایی، (الأَحْزابُ: الفِرَقُ النَّصْرانِيَّة الكَثيرَة)، (الأَحْزاب) مەبەست پێی دەستەو تاقمە زۆرەکانی نەصرانییەکانە.

٨)- ﴿فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ ظَلَمُوا﴾، ئنجا سزای سەخت بۆ ئەوانەی ستەمیان کرد.

٩)- ﴿مِنْ عَذَابِ يَوْمٍ أَلِيمٍ﴾، لە ئازار ڕۆژێکی بە ئێش، لە سوورەتی (مَريَم)دا دەفەرموێ: ﴿فَاخْتَلَفَ الْأَحْزَابُ مِن بَيْنِهِمْ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا مِن مَّشْهَدِ يَوْمٍ عَظِيمٍ (٣٧)﴾، حیزبەکان، (تاقمەکانی نێو نەصرانییەکان)، لەنێو خۆیاندا کەوتنە ڕاجیایی، ئنجا سزای سەخت بۆ ئەوانەی بێبڕوان، لە دیمەنی ڕۆژێکی مەزندا، بەڵام لێرەدا دەفەرموێ: ﴿مِنْ عَذَابِ يَوْمٍ أَلِيمٍ﴾، ئەمەش یانی: ئەو ڕۆژە هەم ڕۆژێکی بە ئێشە، هەم ڕۆژێکی مەزنەو، دیمەنێکی زۆر سامناکی مەزنی هەیە.

لێرەدا دەفەرموێ: ﴿فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ ظَلَمُوا﴾، بەڵام لەوێ دەفەرموێ: ﴿فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا﴾، بۆ ئەوەی بزانرێ: ئەوانە هەم بێبڕوا بوون و، هەم ستەمکاریش بوون.

زانایان زۆریان قسە کردوە لە بارەی حیزب و دەستەو تاقمەکانی نەصرانییەکانەوە، هەندێکیان گوتوویانە: ئەوانە چوار تاقم بوون:

١- (النَّسْطُورِيَّة)، کە گوتوویانە: عیسا کوڕی خوایە.

٢- (اليعَاقِبَة)، کە گوتوویانە: عیسا هەر بۆ خۆی خوایە.

٣- (المَلْكَانِيَّة)، کە گوتوویانە: عیسا سێیەمی سێیەکانە، (ثَالِثُ ثَلاثَة)، کە ئەمانە کاسۆلیکەکانن، گوتوویانە: (الأب، الإبن، الرُّوح القُدُس)، باب و کوڕو گیانی پیرۆز، باب خوایە، کوڕ عیسایە، گیانی پیرۆز جیبریلە، گوتوویانە: خوا لە سێ بەشان پێك دێ، کە پێیان دەڵێن: (الأقَانيمُ الثَّلاثَة)، سێ پێکهاتەکان.

٤- (الأَرِيسِيَّة)، ئەم کۆمەڵە تەفسیرەکان کەمتر باسیان کردوون، بەڵام لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوەو، خۆم لێرەدا هێنام، ئەگەرنا بە زۆریی تەفسیرەکان ئەو سێیەی باسم کردن، باسیان کردوون، بەڵام بە دڵنیایی ئەوەی چوارەمیان، پێشترێ زۆرینە بوون، کە گوتوویانە: عیسا بەندەی خواو ڕەوانەکراوی خوایە، هەر بۆیەش پێغەمبەر ﷺ، کە

نامە دەنووسێ بۆ هیرەقل دەنووسێ: {أَسْلِمْ تَسْلَمْ وَأَسْلِمْ يُؤْتِكَ اللَّهُ أَجْرَكَ مَرَّتَيْنِ، وَإِنْ تَوَلَّيْتَ، فَإِنَّ عَلَيْكَ إِثْمَ الْأَرِيسِيِّينَ}[١]، واتە: مسوڵمان بە سەلامەت دەبی و، مسوڵمان بە خوا دوو جاران پاداشتت دەداتەوەو، ئەگەر پشت هەڵبکەی (بڕوا نەهێنی)، بە دڵنیایی گوناهو ئۆباڵی ئەریسییەکان لە ئەستۆی تۆیە!

واتە: ئەوانەی کە بەندایەتییان بۆ خوا کردوە، عیسایان بە پێغەمبەری خوا زانیوە، گوناهی ئەوان لە ئەستۆی تۆدا دەبێ، چونکە ئەگەر تۆ ئیسلام قبووڵ نەکەی، ئەوانەی لەسەر ڕێیەکی ڕاستن، دوایی دەچەوسێنرێنەوە، بە زۆر سییانە (**ثالوث**)یان بەسەردا دەسەپێنرێ و، گوناهی وان لە ئەستۆی تۆدا دەبێ.

لە کۆبوونەوەی (**نيقيّة**)دا کە لە ساڵی (٣٢٥)زایینی دا، لەلایەن (**قسطنطين**)ەوە بەسترا، بە ڕەسمیی (**ثالوث**)ی تەبەنیی کرد، کە پەرستراو سێیەو، سێ بەشە: خواو کوڕو گیانی پیرۆز، بۆیەش زانایان گوتوویانە: (**تَرَوَّمَتِ النَّصْرَانِيَّةُ، وَلَمْ يَتَنَصَّرِ الرُّوم**)، نەصرانییەت ڕۆمایەتیی قبووڵ کرد، نەك ڕۆم نەصرانییەت قبووڵ بکات، ڕۆم نەصرانییەت و مەسیحیەتی عیسای ﷺ وەرنەگرت و تەبەنیی نەکرد، بەڵکو نەصرانییەت تەنازولی کرد بۆ فیکرەی ڕۆمەکان، کە هاوبەش بۆ خوادانان (**الإشراك بالله**) بوو.

ئێمە بەسەرهاتی چۆنیەتیی لە ڕێ لادرانی ئایینی مەسیح، لە ڕاستە شەقامی تەوحید، بەرەو شیرك و سێ پەرستراویی، لە مەوسووعەی: (درەوشاوەیی ئیمان و پووچەڵیی ئیلحاد لەبەر تیشکی زگماك و عەقڵ و زانست و وەحیی دا)، لە ژێر ناوونیشانی: (سەر گوزشتەی سەرهەڵدانی ئیلحاد لە ڕۆژئاوادا)، باسمان کردوە، هەروەها لە کتێبی: (چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم)دا، لە باسی عەلمانییەتداو لە: (دیبەیتی ساڵ، سیکۆلاریزم و دیموکراسیی لە هەرێمی

---

(١ ) أخرجه البخاري في: ٦٥ كتاب التفسير: ٣ سورة آل عمران: ٤ باب قل يا أهل الكتاب تعالوا إلى كلمة سواء، برقم: ٢٧٨٢.

کوردستاندا)، لەوێشدا باسمان کردوە، چونکە زۆر گرنگە ئەو بەسەرهاتە بزانرێ، کە چۆن ئایینی مەسیح، لە ڕێی ڕاستە شەقامی خوا بەیەکگرتن (توحید) لایدا، سەری کێشا بۆ ئەوە کە بووە: سێ پەرستراویی.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـە لـە هەشـت (٨) ئایـەت پێـك دێ، ئایەتەكانـی: (٦٦ - ٧٣)، كـە سـەرەتا باسـی كتوپڕ هاتنـی ئاخیـر زەمان **(السَّاعة)** كـراوە.

دوایـی باسـی پێكـەوە بوونـە دوژمـن و، ناكـۆك بوونـی هەمـوو ئەوانـەی لـە دنیـادا پێكـەوە دۆسـت و خۆشەویسـت بـوون، جگـە لـە پارێـزكاران، باسـی ئـەوە كـراوە، كـە خـوای میهرەبـان بـە هـەر سـێك سـیفەتی: **(عِبـادي، آمَنـوا بآياتِنـا، وَكانـوا مُسـلِمين)**، پێناسـەیان دەكات.

ئنجـا باسـی ئـەو پاداشـت و نـازو نیعمەتـە كـراوە، كـە بۆیـان دانـراوە و، لـە ڕووی مەعنەوییـەوە بـە: ﴿ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡكُمُ ٱلۡيَوۡمَ وَلَآ أَنتُمۡ تَحۡزَنُونَ ﴾، (نـە ترسـتان لەسـەرەو، نـە خـەم و پـەژارە دادەگـرن)، ئـەو نـازو نیعمەتـە پێناسـەكراوەو، لـە ڕووی ماددییشـەوە بـە كۆمەڵێـك وەسـفی گـەورەو گرنـگ ئـەو نـازو نیعمەتـە پێناسـە كـراوە، كـە دەتوانیـن لـە حـەوت خاڵـدا بیانخەینـە ڕوو:

١- خۆتان و هاوسەرانتان بچنە بەهەشت: ﴿ ٱدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ أَنتُمۡ وَأَزۡوَٰجُكُمۡ تُحۡبَرُونَ ﴾.

٢- شادمان دەكرێن، **(تُحْبَرُونَ)**، یانی: گەش و گۆڵ و جوان و بەرچاو دەكرێن.

٣- لە قاپ و پەرداخی زێڕدا خواردن و خواردنەوەیان بەسەردا دەگێڕدرێ: ﴿ يُطَافُ عَلَيۡهِم بِصِحَافٖ مِّن ذَهَبٖ وَأَكۡوَابٖ ﴾.

٤- هەرچی نەفسیان ئارەزووی بكات و چاویان چێژی لێ بكات، بۆیان هەیە: ﴿ وَفِيهَا مَا تَشۡتَهِيهِ ٱلۡأَنفُسُ وَتَلَذُّ ٱلۡأَعۡيُنُ ﴾.

٥- تێیدا هەر ماوو هەمیشەیی دەبن: ﴿ وَأَنتُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾،

٦- بەهەشت دەكرێتە میراتیان، واتە: بەهەشتیان وا پێدەدرێ، وەك چۆن میراتێك بە كەسێك دەگات، كە هیچ كەسی دیكە داوای ناكات و، بە ئاسانیی دێتە دەستیان: ﴿ وَتِلْكَ ٱلْجَنَّةُ ٱلَّتِيٓ أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾.

٧- میوەجاتی زۆرو جۆراو جۆریان هەیە لەوێدا: ﴿ لَكُمْ فِيهَا فَٰكِهَةٌ كَثِيرَةٌ مِّنْهَا تَأْكُلُونَ ﴾.

﴿ هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا ٱلسَّاعَةَ أَن تَأْتِيَهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٦٦﴾ ٱلْأَخِلَّآءُ يَوْمَئِذٍۭ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ إِلَّا ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٦٧﴾ يَٰعِبَادِ لَا خَوْفٌ عَلَيْكُمُ ٱلْيَوْمَ وَلَآ أَنتُمْ تَحْزَنُونَ ﴿٦٨﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا وَكَانُوا۟ مُسْلِمِينَ ﴿٦٩﴾ ٱدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ أَنتُمْ وَأَزْوَٰجُكُمْ تُحْبَرُونَ ﴿٧٠﴾ يُطَافُ عَلَيْهِم بِصِحَافٍ مِّن ذَهَبٍ وَأَكْوَابٍ وَفِيهَا مَا تَشْتَهِيهِ ٱلْأَنفُسُ وَتَلَذُّ ٱلْأَعْيُنُ وَأَنتُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٧١﴾ وَتِلْكَ ٱلْجَنَّةُ ٱلَّتِيٓ أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٧٢﴾ لَكُمْ فِيهَا فَٰكِهَةٌ كَثِيرَةٌ مِّنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿٧٣﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەكان

{ئایا تەنیا چاوەڕێی ئاخیر زەمان ناكەن، كە كتوپڕ بۆیان بێ، بێ ئەوەی هەست بكەن! ﴿٦٦﴾ دۆستان(ی زۆر نیزیك) لەو ڕۆژەدا لە یەكدی دەبنە دوژمن، جگە لە پارێزكاران ﴿٦٧﴾ (خوا دەفەرموێ:) ئەی بەندەكانم! ئەمڕۆ نە ترستان لەسەرەو، نە خەمبار دەبن ﴿٦٨﴾ ئەوانەی بڕوایان بە نیشانەكانمان هێنا بوو، (بۆ خواش) ملكەچ بوون ﴿٦٩﴾ خۆتان و هاوسەرانتان بچنە بەهەشتەوە، شادمان دەكرێن (بە چاكەو نیعمەتی بێ وێنەی خوا)، ﴿٧٠﴾ قاپە زێڕینە پڕ (لە خۆراك)

ەكان و، پەرداخـە (زێڕینـە پـڕ لـە خواردنەوە)كانیـان، بەسـەرەوە دەگێڕدرێـن و، هەرچی نەفسیان ئارەزووی بكات و، چاویان چێژی لێ وەربگرێ، تێیدایەو، ئێوە تێیدا هەرماوو هەمیشەیی دەبن ﴿٧١﴾ ئەو بەهەشتەش كە میرات ئاسا پێتان خەڵاتكراوە، لە سۆنگەی ئەوەوە كە دەتانكرد ﴿٧٢﴾ بۆ ئێوە میوەی (جۆراوجۆری) زۆر هەیە لەوێدا، كە لێی دەخۆن ﴿٧٣﴾}.

## شیكردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(ٱلسَّاعَةَ): (جُزْءٌ مِنْ أَجْزَاءِ الزَّمَانِ، وَيُعَبَّرُ بِهِ عَنِ القِيَامَةِ، وَسُمِّيَت بِذَلِكَ تَشْبِيهاً لِسُرْعَةِ حِسَابِهِ)، (سَاعَة): بەشێكە لە بەشەكانی كات، تەعبیری پێ دەكرێ لە قیامەت، (وشەی قیامەت لە لای زانایان، زۆرجار بەكاردەهێنرێ بۆ قۆناغی ئاخیر زەمان و، قۆناغی زیندوو بوونەوەش، بەڵام لە قورئاندا وشەی قیامەت، بۆ قۆناغی دووەم، واتە: قۆناغی زیندووكرانەوەو سزاو پاداشت بەكاردەهێنرێ و، بۆ قۆناغی ئاخیر زەمان، (ساعَة) زیاتر بەكاردەهێنرێ و، (اليَوْمِ الآخِر) و (الآخِرة) ش بۆ هەردووك قۆناغەكان بەكاردەهێنرێ)، بۆیە وشەی (سَاعَة) بۆ ڕۆژی دوایی بەكارهێنراوە، چونكە زۆر بەخێرایی لێپرسینەوەو سزاو پاداشتی تێدا دەكرێ.

(بَغْتَةً): (البَغْتُ: مُفَاجَأَةُ الشَّيءِ مِنْ حَيْثُ لاَ يُحْتَسَب)، (بغت): بریتیە لە شتێك كتوپڕ بێ، بێ ئەوەی حیسابی بۆ بكرێ و چاوەڕوانیی بكرێ.

(لَا يَشْعُرُونَ): (أي: لا يُدْرِكُونَهُ بِالحَوَاسّ)، یانی: بەهەستەوەرەكانیان دەركی ناكەن.

(ٱلْأَخِلَّآءُ): (جَمْع خَليل، الخُلَّةُ: المَوَدَّةُ، خَالَلْتُهُ: مُخَالَّةً وَخِلاَلاً فَهُوَ خَلِيلٌ، وَالخُلَّةُ: مِنْ تَخَلُّلِ وُدٍّ نَفسِهُ وَمُخالَطَتِهِ)، (أَخِلاَّء) كۆی (خَليل)ە، یانی: دۆست و نیزیك، (خُلَّة) بە مانای خۆشویستن دێ، دەگوترێ: (خَالَلْتُهُ: مُخَالَّةً وَخِلاَلاً فَهُوَ

**خَلِيْلٌ**) واتە: خۆشمویست بە خۆشویستن، ئەو خۆشویستراوە، (**الخُلَّةُ: مِنْ تَخَلُّلِ وُدِّ نَفْسِهِ وَمُخالَطَتِهِ**) لەوەوە هاتوە، کە خۆشەویستیی ئەو کەسە یان ئەو شتە، تێکەڵ و ئاوێتە بووبێ لەگەڵ دڵ و دەروونیدا.

(**تُحْبَرُونَ**): واتە: دڵخۆش دەکرێن، شادمان دەکرێن، یان: گەش و گوڵ دەکرێن، (**الحِبرُ وَالحَبْرُ: الأَثَرُ المُسْتَحْسَنُ**)، (**حِبرٌ وَحَبْرٌ**) یانی: شوێنەوارێکی بە پەسند دانراو، (**يُحْبَرُون: أي: يَفْرَحُونَ ويَظْهَرُ عَلَيهِم حَبَارُ نَعِيمِهِم**)، واتە: دڵخۆش دەبن، تاکو شوێنەواری ئەو نازو نیعمەتە لەسەر دەم و چاویان دەردەکەوێ، مرۆڤ کە دڵخۆش بێ، دەم و چاوی زیاتر دەدرەوشێتەوەو، بە پێچەوانەوە: ئەگەر تووڕەو پەست و خەمبار بێ، دەم و چاوی تاریك دادێ.

(**يُطَافُ عَلَيْهِم**): بەسەریانەوە دەگێڕدرێ، (**الطَّوْفُ: المَشِيُ عَلَى الشَّيء**)، (**طَوْف**): ڕۆیشتنە بە دەوری شتێکدا، (**طَافَ، يَطوفُ**)، یانی: بەدەوری دا گەڕا، دەگەڕێ، (**يُطَافُ عَلَيْهِم**): واتە: بەسەریانەوە دەگێڕدرێ.

(**بِصِحَافٍ مِّن ذَهَبٍ**): بە قاپی لە زێڕ دروستکراو، (**صِحَافٍ**) واتە: قاپەکان، دەفرەکان، کە کۆی (**صَحِيْفَة**)یە، (**الصَّحِيْفَة: المَبْسُوطُ مِنَ الشَّيء**)، (**صحيفة**) شتێك کە بڵاوکرابێتەوە، (**الصَّحْفَةُ: جَمْعُ صِحَاف، مِثْلُ قَصْعَةٍ عَرِيْضَة**)، (**صَحْفَةٌ**)، بە (**صِحَاف**) کۆ دەکرێتەوە، وەك (**قَصْعَةٍ**)، قاپێکی فراوانە، کە خواردنی تێدەکرێ.

(**وَأَكْوَابٍ**): کۆی (**کوب**)ە، (**الكُوب: قَدَحٌ لاَ عُرْوَةَ لَهُ**)، (**کوب**): فنجانە، یان پەرداخێکە، دەسکی نەبێ، هەنگڵی نەبێ، (**الكُوبَةُ: الطَّبْلُ الَّذِي يُلْعَبُ بِهِ**)، (**طَبل**) پێی دەگوترێ: (**کوبة**)، ئەوەی کە لێدەدرێ و یاریی پێ دەکرێ.

(**تَشْتَهِيهِ ٱلْأَنفُسُ**): نەفسەکان ئارەزووی بکەن، (**أَصْلُ الشَّهْوَةِ: نُزوعُ النَّفْسِ إلى ما تُرِيدهُ**)، (**شهوة**) بریتیە لەوەی نەفس بەرەو شتێك بچێ کە دەیەوێ، یانی: ئارەزوو کردن، (**الشَّهْوَةُ: المُشْتَهَى**)، (**شهوة**) بە مانای ئارەزوو کراو دێ، (**وَقُوَّةُ الإشتِهاءِ**)، هەروەها بە هێزی ئارەزوو کردنیش دەگوترێ شەهوەت، هەم

ئەو شتەی ئارەزوو دەکرێ، هەم بەو هێزەی مرۆڤ بەهۆیەوە، ئارەزووی شتان دەکات، هەردووکیان وشەی شەهوەتیان بۆ بەکاردەهێنرێ.

(وَتَلَذُّ ٱلۡأَعۡيُنُ): چاوەکان چێژی لێ وەردەگرن، (تَلَذُّ: مُضَارِعُ لَذَّ، بِوَزْنِ عَلِمَ، أي لَذِذَ)، بەڵام دوایی دوو (ذ)یەکان تێکدا دەغم دەکرێن، (لَذِذَ) دەبێتە (لَذَّ) چێژی وەرگرت، (إذا أَحَسَّ لَذَّةً)، ئەگەر هەستی بە چێژێك كرد، (لَذَّ بِهِ، وَلَذَّهُ) هەردووکیان بەکاردەهێنرێن، (لَذَّ بِهِ)، واتە: چێژی بەهۆی ئەووەوە وەرگرت، (وَلَذَّهُ) واتە: چێژی لێوەرگرت، ئنجا: (وَتَلَذُّ ٱلۡأَعۡيُنُ) ئەصڵی خۆی (تَلَذُّهُ الأعيُن) بووە، چاوەکان چێژی لێ وەردەگرن.

(أُورِثۡتُمُوهَا): (أُعْطِيتُمُهَا، وَمُلِّكْتُمُوهَا)، پێتان دراوەوو کراوە بە موڵکی ئێوە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خوا ﷻ لە پێش کۆتایی ئەم سوورەتەدا، لەم هەشت ئایەتەدا باسی ئەو نازو نیعمەتانە دەکات، کە بۆ ئەهلی ئیمان و پارێزکاران دانراون و، لە ئایەتەکانی کۆتاییش دا، باسی ئەو سزاو ئازارو جەزرەبەو مەینەتییانە کراوە، کە بۆ ئەهلی کوفرو شیرك و تاوان دانراون، کە لە دەرسی کۆتایی دا تەفسیریان دەکەین.

سەرەتا خوا دەفەرموێ: ﴿ هَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّا ٱلسَّاعَةَ أَن تَأۡتِيَهُم بَغۡتَةً وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ﴾، ئایا جگە لە (ساعَة) چاوەڕێی چی دەکەن، کە کت و پڕ بۆیان بێ، لە حاڵێکدا ئەوان هەست ناکەن، وشەی (ساعَة)، وەك پێشتریش گوتمان، یانی: ئەو کاتەی دیارییکراوە، بۆ شتێك، وشەی (ساعَة) بەشێکە لە کات، کەم بێ یان زۆر بێ، دوایی بە پێی عورف و باوی خەڵك دیاریی دەکرێ، بە کوردیی دەڵێن: کاژێرو ئەوەی کاتەکەی پێ دەژمێردرێ، کاتژمێری بۆ بەکاردێ، بەڵام پێم وایە باشترە لە جیاتی کاژێر، هەر بگوترێ: (ساعَة)، یان سەعات،

کوردەواریی خۆمان دەڵێن، دوو سەعاتی پێچوون، ئەم وشەی سەعاتە، کە بۆ کات بەکاردەهێنرێ، هەر (**ساعَة**)ی عەرەبییە، بەڵام کوردێنراوە، زۆرجار وشەی سەعات، وەك چۆن بۆ کاتەکە بەکاردەهێنرێ، بۆ ئامێرەکەش بەکاردەهێنرێ، کە کاتی پێ دەژمێردرێ، بۆیە ئەگەر بە ئامێرەکە بگوترێ: کاتژمێرو بە کاتەکە بگوترێ: سەعات باشە.

ئنجا (**السَّاعة**) لە باوو زاراوەی ئێستای مرۆڤاندا، بەشێکە لە بیست و چوار بەشی شەوو ڕۆژێك کە بە شێوەی ئێوکۆیی (**مَعَدَّل**)، ڕۆژ دوازدە سەعات، شەو دوازدە سەعات، ئەوە بیست و چوار، هەر کامێك لە بەشەکان پێی دەگوترێ: (**ساعة**) بە عەرەبیی، بەڵام لە ئەسڵی زمانی عەرەبیی دا، (**ساعة**) یانی: بەشێك لە کات و، مەرج نیە یەك لەسەر بیست و چواری شەوو ڕۆژێك بێت.

دوایی لە بەکارهێنانی قورئاندا، وشەی (**السَّاعة**) بە زۆریی بۆ ئاخیر زەمان بەکارهێنراوە، جاری واش هەیە، بۆ هاتنی قیامەت بەکارهێنراوە، جاری واش هەیە، بۆ هاتنی ڕۆژی دوایی، بە هەردوو قۆناغی ئاخیر زەمان و ڕۆژی دوایی بەکارهێنراوە.

لێرە کە دەفەرموێ: ﴿ هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا ٱلسَّاعَةَ أَن تَأْتِيَهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴾، ئایا چی چاوەڕێ دەکەن جگە لە (**ساعة**)، کە کت و پڕ بۆیان بێت، بێ ئەوەی هەستی پێ بکەن، بێگومان ئەوە مەبەست پێی ئاخیر زەمانە، چونکە تاکو ئاخیر زەمان نەیەت، قیامەت نایەت، ئنجا ئاخیر زەمان کت و پڕ دێ، وەك لێرەدا وا دەفەرموێ و، لە سوورەتی (**الأعراف**)یش دا، کە کاتی خۆی تەفسیرمان کردوە، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا ۖ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ رَبِّى ۖ لَا يُجَلِّيهَا لِوَقْتِهَآ إِلَّا هُوَ ۚ ثَقُلَتْ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ لَا تَأْتِيكُمْ إِلَّا بَغْتَةً ۗ يَسْـَٔلُونَكَ كَأَنَّكَ حَفِىٌّ عَنْهَا ۖ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ ٱللَّهِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨٧﴾ ﴾.

واتــە: لــە بــارەی (**ســاعة**)وە لێــت دەپرســن، کــەی لەنگــەر دەگــرێ (کــەی دەگاتــە جــێ)؟، بڵــێ زانیارییەکــەی لــە لای پەروەردگارمــە، بــەس ئــەو بــۆ کاتەکــەی دەری دەخــات، قورســە لەســەر ئاســمانەکان و زەوی، کتوپــڕ نەبــێ، بۆتــان نایــەت، لێــت دەپرســن وەك تــۆ زۆر پێــی شــارەزا بــی (یــان زۆر خەمخــۆری بــی)، بڵــێ زانیارییەکــەی لــە لای خوایــە، بــەڵام زۆربــەی خەڵکــی نازانــن.

هەروەهــا لــە زۆر شــوێنی دیکەشــدا، خــوا ﷻ باســی ئاخیــر زەمــان دەکات و وای بــاس دەکات، کــە کتوپــڕ دێ، بــەڵام قیامــەت بــاس نەکــراوە، چــۆن دێ، مــەرج نیــە کــت و پــڕ بــێ، ئنجــا ماوەیەکیــش دەکەوێتــە نێــوان (**ســاعة**) و (**قیامة**)، ئاخیــر زەمــان و قیامەتــەوە، لــە فەرمایشــتی صەحیحــی پێغەمبــەردا ﷺ هاتــوە، کــە فەرموویەتــی: چــل، ئنجــا یەکێــك لــە ڕاوییــەکانی ئەبــوو هورەیــرە، کــە فەرمایشــتەکەی پێغەمبــەری ﷺ لــێ گێڕراوەتــەوە، گوتوویەتــی: چــل ڕۆژ، گوتوویەتــی ئامــادە نیــم ئــەو ڕایــە قبووڵ بکــەم، هەروەهــا چــل هەفتــە، مانــگ، ســاڵ، ئەویــش هــەر گوتوویەتــی (أَبَيتُ) واتــە: نازانــم و دیــار نیــە ئــەو شــتە چەنــدە[1].

گرنــگ ئەوەیــە لــە نێــوان ئاخیــر زەمــان و قیامەتــدا، ماوەیــەك هەیــەو، خــواش ﷻ کــە باســی ئاخیــر زەمــان دەکات، وای بــاس دەکات کــە کتوپــڕ دێ.

پێویســتە ئــەوەش بگوتــرێ، کــە دەفەرمــوێ: ﴿ هَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّا ٱلسَّاعَةَ أَن تَأۡتِيَهُم بَغۡتَةً وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ﴾، ئــەم وشــەی (**السّــاعة**)، هەرچەنــدە وەك زاراوەیەکــی شــەرعیی، بــۆ ئاخیــر زەمــان یــان بۆ قیامــەت بــەکاردێ، بەڵام دەشــگونجێ مەبەســت پێــی ئــەو کاتــە بــێ، کــە مرۆڤــەکان هــەر کامێکیــان تێیــدا دەمــرن، واتــە: ئایــا چاوەڕێــی چــی دەکــەن، جگــە لــەوەی ئــەو کاتــە بــێ، کــە کتوپــڕ دێ و تێیــدا دەمــرن، بــە تایبەتــی لــەم ڕۆژگارەی ئێســتاماندا، کــە جەڵتــەی دەمــاغ و وەســتانی

---

(١) صحيح البخاري

دڵ و، ڕووداوی هاتووچـۆو، ڕووداوی کتوپـڕ، زۆر بـوون[1]، بەبـێ ئـەوەی مـرۆڤ هەست پـێ بکات، وەك دەڵێن: تاکو نەخۆشێك دەمرێ، سەد ساغ دەمرێ، هەتا پیرێك دەمـرێ، سـەد گەنـج دەمـرێ، ئەمـەش داچڵەکاندنێکـە لـە لایـەن خـوای پـەروەردگارەوە، کەواتـە: ئـەو سـەفەرە هـەر لەبـەرە، چ سـەفەری مەرگـی هـەر کامێك، چ سـەفەری کۆتایـی هاتنـی ئـەم ژیانـی دنیایـەو پێچرانـەوەی بـە تێکـڕا.

﴿ ٱلْأَخِلَّآءُ يَوْمَئِذٍۭ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ ﴾، لـەو ڕۆژەدا، ئەوانـەی یەکدییـان خۆشویسـتوە، دڵسـۆزی یەکـدی بـوون، زۆر لـە یەکـدی نیزیـك بـوون، لـەو ڕۆژەدا هەندێکیـان دەبنـە دوژمنـی هەندێکیـان، واتـە: پێکـەوە دەبنـە دژو ناکـۆك، ﴿ إِلَّا ٱلْمُتَّقِينَ ﴾، جگـە لـە پارێـزکاران، چونکـە ئەوانـەی پارێـزکار بـوون و، لەبـەر خـوا یەکدییـان خۆشویسـتوە، لـەو یەکدیـی خۆشویسـتنەی لەبـەر خـوا ﷻ بـووە، لـە دنیاشـدا لێـی بەهرەمەنـد بـوون، هـاوکاری یەکدیـی بـوون بـۆ چاکـەو، بـۆ خـوا پەرستیی، بـۆ چاکەکاریـی، بـۆ ڕاستیی و دروستیی، لـە دواڕۆژیشـدا لێـی بەهرەمەنـد دەبـن، لـەو دۆسـتایەتیی و نیزیکیـی و خۆشەویسـتییە، بـەڵام ئەوانـی دیکە، لە دنیاشـدا لێـی زەرەرمەنـدن، بـە مانـا ڕاسـتەقینەکەی، بەڵـێ ڕەنگـە هەندێـك بەهـرەی ماددیـی و سـوودی زوو تێپەڕیـان وەرگرتبـێ، بـەڵام لـە درێژخایەنـدا، زەرەریـان لـێ کـردوە، هەموو ئەوانـەی لەبـەر بەرژەوەندییەکـی دنیایـی، یـان لەسـەر بناغـەی سـتەم و خراپـە، لێـك کۆدەبنـەوە، بـە تەئکیـد هـەر لـە دنیاشـدا، زیانەکەیـان دەردەکـەوێ، بـەڵام زەرەری گـەورە لـە دواڕۆژدا دەردەکـەوێ، بۆیـە لـەوێ لێـك دەبنـە دوژمـن، جگـە لە پارێـزکاران.

﴿ يَٰعِبَادِ لَا خَوْفٌ عَلَيْكُمُ ٱلْيَوْمَ وَلَآ أَنتُمْ تَحْزَنُونَ ﴾، ئـەم دواندنـە بـۆ پارێزکارانـە، ئـەی بەندەکانـم! ئەمـڕۆ نـە ترسـتان لەسـەرەو، نـە پـەژارەش دادەگـرن، ترسـتان لەسـەر نیـە بـۆ داهاتـوو، چونکـە دەزانـن ئێـوە لـە خـەم ڕەخسـیون و، بـەڕەی خۆتـان لـە ئـاوێ دەرهێنـاوەو، خـوا بەختـەوەری کـردوون، ژیانـی هەمیشـەیی

---

(١) ئێسـتاش نەخۆشـی ڤایرۆسـی کۆڤیـد نـۆزدە (١٩) کـە بـە کۆرۆنـا نـاسراوە، بۆتـە سـەربارە! کـە هەتـا ئێسـتا (٢٠٢١/١٠/١٥ز) دەوری پێنـج ملیـۆن کەسـی پـێ مردوە

و بەهەشتی نەبڕاوەتان بە قسمەت بووەو، خەمباریش نین، چونکە دەزانن بە هۆی ئەو ژیانە دنیاییەوە، کە گوزەراندووتانە ئەو بەهەشتەتان دەستکەوتوە، واتە: خەم و پەژارە داناگرن بۆ دنیا، بۆ ژیانی دنیا کە تێپەڕیوە، بەڵکو دڵخۆشن کە ژیانی دنیایەکەتان بە شێوەیەك گوزەراندوە، کە ڕەزامەندیی خواو بەهەشتی پێ وەردەگرن.

﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا وَكَانُوا۟ مُسْلِمِينَ ﴾، ئەوانەی بڕوایان هێنابوو، ملکەچ بوون، بڕوایان هێنابوو بە هەموو ئەو شتانەی پێویست بوو بڕوایان پێ بهێنرێ، ملکەچیش بوون بۆ خوا ﷻ و، بۆ شەریعەتی خوا، واتە: ئەوانەی لە دنیادا، هەم ئەهلی ئیمان بوون، هەم ئەهلی ئیسلام بوون، ئەهلی ئیمان بوون بە عەقڵ و دڵ و دەروونیان و، ئەهلی ئیسلام بوون بە ڕواڵەت و جەستەیان، هەم خوایان بە ڕاست دەزانی، هەم ئەوپەڕی خۆشویستن و بە بەرزگرتن و، بە مەزنگرتن و، پشت پێ بەستن و، ملکەچ کردنیان بۆ خوا هەبوو، هەروەها ئەوپەڕی ڕێزو خۆشەویستیی لە دوایی خوای پەروەردگار، بۆ پێغەمبەری خوایان ﷺ هەبوو و، ئەوپەڕی پەسندکردنیان بۆ بەرنامەی خوا هەبوو، کە بە پێغەمبەری خاتەمدا ناردوویەتی، ئەوە وەك ئیمان، وەك ئیسلامیش ئەوپەڕی پابەندیی و ملکەچییان هەبوو بۆ خواو، هەم شوێنکەوتنیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ و هەم پەیڕەویی کردنیان لە شەریعەت و بەرنامەی خوا، ﴿ ٱدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ أَنتُمْ وَأَزْوَٰجُكُمْ ﴾، بچنە بەهەشتەوە، خۆتان و هاوسەرانتان، هەندێکیان گوتوویانە: (**أزواجُكُم أي: أصْنَافُكُم أو أقْرَانُكُم**)، هاودەم و هاوڕازانتان، بەڵام زیاتر وا پێدەچێ مەبەستی هاوسەران بێ، خۆتان و هاوسەرانتان بچنە بەهەشتەوە، ﴿ تُحْبَرُونَ ﴾، واتە: دڵخۆش دەکرێن، یان بەختەوەر دەکرێن، یان گەش و گۆڵ و پڕ نازو نیعمەت دەکرێن، شادمان دەبن بە شێوەیەك، کە شوێنەواری ئەو نازو نیعمەتەی پێتان دراوە، لەسەر دەم و چاوتان دەردەکەوێ.

﴿ يُطَافُ عَلَيْهِم بِصِحَافٍ مِّن ذَهَبٍ ﴾، قاپە لە زێڕ دروستکراوەکانیان بەسەرەوە دەگێڕدرێن، ﴿ وَأَكْوَابٍ ﴾، هەروەها کووپ و پەرداخە لە زێڕ دروستکراوەکانیان،

بەسـەرەوە دەگێردرێـن، ئنجـا بێگومـان قـاپ و دەفرەکانیـان کـە بەسـەرەوە دەگێردرێـن، هەروەهـا پـەرداخ و کووپەکانیـان کـە بەسـەرەوە دەگێردرێـن، خاڵیـی نیـن، لـە دنیاشـدا کـەس قاپـی بـە تـاڵ بەسـەر میوانـەوە ناگێـڕێ، پەرداخـی بـە تـاڵ بەسـەر میوانـەوە ناگێـڕێ، چ جـای لـە بەهەشـتی خـوادا، کەواتـە: قاپـی زێـڕی پـڕ لـە خواردەمەنـی و، پەرداخـی زێـڕی پـڕ لـە خواردنـەوە، کـە هـەر خـوا ﷻ دەزانـێ، ئـەو خواردنانـەو ئـەو خواردنەوانـە چیـن و چۆنـن؟ بێگومـان نایابتریـن و چاکترین شـتن، کە ئێمـە ئێسـتا بۆمـان وێنـا ناکرێـن، وەك خـوا لـە سـوورەتی (السَّجدة)دا، دەفەرمـوێ: ﴿ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٧﴾ ﴾، واتـە: هیـچ نەفسـێك نازانـێ، ئـەوەی بۆیـان پەنهانکـراوە، لـەوەی پێـی دڵخـۆش و دڵشـاد دەبـن، بـە هـۆی ئـەوەوە کـە کردوویانـە، هیـچ نەفسـێك نازانـێ، یـانی: هەتـا نەچیـە بەهەشـت، نازانـی چـی تێدایـە، ئـەوەی خـوا ﷻ باسـی دەکات، عەقڵـی ئێمـە هـەر لەوەنـدە حاڵیـی دەبـێ، عەبدوڵـڵای کـوڕی عەبباس (خـوا لێیـان ڕازی بـێ) دەڵـێ: ئـەو نـازو نیعمەتانـەی خـوا ﷻ باسـیان دەکات لـە قورئانـدا، لەگـەڵ ئەوانـەی دنیـا، تەنیـا لـە نـاودا یەکدەگرنـەوە، بـەڵام لـە نێوەڕۆکـدا هـەر خـوا ﷻ دەزانـێ، ئـەو نـازو نیعمەتانـەی بەهەشـت چۆنـن، ئـەو ئایەتـەی سـوورەتی (السَّجدة)ش، زۆربـاش ئـەو مەبەسـتە دەگەیەنـێ، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ ﴾، واتـە: هیـچ نەفسـێك، هیـچ کەسـێك، نازانـێ ئـەوەی بۆیـان پەنهانکـراوە، لـە شـتێك کـە هێنـدە پـێ دڵخـۆش دەبـن، فرمێسـکی شـادییان بـۆی دێ و ئەوپـەڕی جێـی دڵخۆشـییە، لێـرەش دەفەرمـوێ: بچنـە بەهەشـتەوە، خۆتـان و هاوسـەرانتان: ﴿ تُحْبَرُونَ ﴾، لەوێـدا شـادمان و بەختـەوەر دەکرێـن.

﴿ يُطَافُ عَلَيْهِم بِصِحَافٍ مِّن ذَهَبٍ وَأَكْوَابٍ ﴾، قاپـە لـە زێـڕ دروسـتکراوەکانیان بەسـەرەوە دەگێڕرێـن، یـانی: خـۆراکی نێـو قاپە لە زێـڕ دروسـتکراوەکان، ﴿ وَأَكْوَابٍ ﴾، هەروەهـا خواردنـەوە لـە نێـو کووپـە زێڕینەکانـدا، ﴿ وَفِيهَا مَا تَشْتَهِيهِ ٱلْأَنفُسُ وَتَلَذُّ ٱلْأَعْيُنُ ﴾، لـەو بەهەشـتەدا هەیـە هەرچـی نەفسـەکان دەیخـوازن و،

هەرچی چاوەکان چێژی لێ وەردەگرن، لێرەدا خوا ﷻ یەك تەعبیری بەکارهێناوە، پێویست بە هیچ شتێکی دیکە ناکات، بەکاربهێنرێ بۆ وەسفی بەهەشت: هەرچی نەفس بیخوازێ و هەرچی چاو لەززەتی لێ بکات، لێیەتی ﴿وَأَنتُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾، ئێوە لەوێشدا، بەهەمیشەیی دەمێننەوەو هەر ماو دەبن.

﴿وَتِلْكَ ٱلْجَنَّةُ ٱلَّتِىٓ أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾، ئەو بەهەشتەی وەك میرات پێتان دراوە، بە هۆی ئەوەوە کە کردووتانە.

﴿لَكُمْ فِيهَا فَٰكِهَةٌ كَثِيرَةٌ مِّنْهَا تَأْكُلُونَ﴾، بۆ ئێوە لەوێدا میوەی زۆر هەیە لێی دەخۆن، واتە: میوەی زۆرو جۆراو جۆر.

شایانی باسە: خوا ﷻ بۆ نازو نیعمەتی بەهەشت، زۆر باسی میوە دەکات، چونکە میوە بەزۆریی بۆ لەززەت دەخورێ، بۆ لابردنی برسیەتیی و تینوێتیی و میوە ناخورێ، بەڵکو تەنیا بۆ لەززەت و خۆشیی و چێژوەرگرتن دەخورێ، بۆیە عادەتی خەڵك وایە، یان پێش نان خواردن میوە دەخوات، یان دوای نانخواردن، نەك بۆ ئەوەی ئازاری برسیەتیی پێ لابەرێ، مەگەر کەسێك خواردنی دەست نەکەوێ، پەنا بەرێتە بەر میوە، ئەگەرنا کەسێ خواردنی لەبەردەستدا بێ، بۆ لابردنی برسیەتیی، خواردن دەخوات، نەك میوە، ئنجا خوا ﷻ بۆیە بە زۆریی باسی میوە دەکات، چونکە خواردن و خۆراکی بەهەشت، بۆ لابردنی برسیەتیی نیە، بەڵکو تەنیا بۆ لەززەت و چێژ وەرگرتنە.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**ئاخیر زەمان کت و پڕ دێ، بێ ئەوەی خەڵك هەست بکات و، لەو ڕۆژەشدا سەرجەم ئەوانەی لە دنیادا دۆست و خۆشەویستی یەکدی بوون، دەبن بە دوژمن و ناحەزی یەکدی، جگە لە پارێزکاران:**

خوا ﷻ دەفەرموآ: ﴿ هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا ٱلسَّاعَةَ أَن تَأْتِيَهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٦٦﴾ ٱلْأَخِلَّآءُ يَوْمَئِذٍۭ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ إِلَّا ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٦٧﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا ٱلسَّاعَةَ ﴾، ئایا جگە لە کاتەکە (**ساعة**)، چاوەڕێی چی دیکە دەکەن؟ ئایا تەنیا چاوەڕێی کاتەکە (**ساعة**) ناکەن؟ لێرەدا (**هَل**) بۆ پرسیارکردنی نکووڵییلێکردنە، واتە: جگە لە هاتنی ئاخیر زەمان، چاوەڕێی هیچی دیکە ناکەن، وشەی: (**يَنظُرُون**)، یانی: (**يَنتَظِرُون**)، چاوەڕێ دەکەن، (**أي: لا يَنتَظِرُونَ إلاَّ حُلُولَ السَّاعة**)، جگە لە هاتنی (**سَّاعة**) ئاخیر زەمان، چاوەڕێی هیچی دیکە ناکەن، واتە: سەرەنجام ئەم ژیانە دنیاییە هەر (**سَّاعة**)ی بە دوادا دێ.

ئنجا هەم ژیانی دنیای هەر کام لە مرۆڤەکان، ئەو کاتەی بەدوادا دێ، کە ژیانە دنیاییەکەی کۆتایی پێ دێ، وەك گوتراوە: (**مَن مَاتَ فَقَدْ قَامَت قِيَامَتُهُ**)، هەر کەسێك مرد، قیامەتی ئەو هاتوە، هەم ژیانی کۆی مرۆڤەکان لەسەر زەوی، سەرەنجامەکەی هەر ئەوەیە ئاخیر زەمان بێ و، ئەم ژیانە دنیاییە بپێچرێتەوەو، قۆناغێکی دیکە بێتە پێش.

پێغەمبەری خواش ﷺ وشەی (ساعة)ی بەکارهێناوە، بۆ مردنی جیلێك لە بەشەر، وەك لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە:

{عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه، أَنَّ أَعْرَابِيًّا سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، عَنْ قِيَامِ السَّاعَةِ؟ فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: «مَا أَعْدَدْتَ لَهَا؟» قَالَ: لَا، إِلَّا أَنِّي أُحِبُّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ، قَالَ: «الْمَرْءُ مَعَ مَنْ أَحَبَّ» ثُمَّ قَالَ: «أَيْنَ السَّائِلُ عَنِ السَّاعَةِ؟» قَالَ: وَثَمَّ غُلَامٌ فَقَالَ: «إِنْ يَعِشْ هَذَا، فَلَنْ يَبْلُغَ الْهَرَمَ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ»} (أخرجه أحمد: ١٣٢٢٤، قال شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح)، واتە: ئەنەس رضي الله عنه دەڵێ: ئەعرابییەك پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد: دەربارەی ئاخیر زەمان، کەنگێ دێ؟ پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووی: چیت بۆ ئامادە کردوە؟ گوتی: هیچ، تەنها خواو پێغەمبەری خوام خۆشدەوێن، فەرمووی: مرۆڤ لە قیامەتدا لەگەڵ ئەو کەسەدایە کە خۆشیدەوێ، دوایی فەرمووی: کوا پرسیارکەر دەربارەی ئاخیر زەمان؟ (کابراش هات)، پێغەمبەر ﷺ تەماشای خەڵکەکەی کرد، کە وەستابوون، یەکێك کە لە هەموویان گەنجتر بوو فەرمووی: ئەگەر ئەم گەنجە، تەمەن بکات، پیر نابێ کە ئێوە (ساعة)تان دێ، واتە: تاکو گەنج پیر دەبێ، پیرەکان دەمرن.

ئنجا کەسێك ورد نەبێ و بە وردیی سەرنجی فەرمایشتەکانی پێغەمبەر ﷺ نەدات، لەوانەیە وای زانیبێ، کە پێغەمبەر ﷺ پێی وابووە، ئاخیر زەمان زوو دێ، تاکو ئەو گەنجە پیر دەبێ، ئاخیر زەمان دێ! بەڵام نەخێر، فەرموویەتی: (**حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ**)، یانی: (**ساعة**)ی ئێوە، ئاخیر زەمانی ئێوە، چونکە هەر کەسێك مرد، بۆ وی ئاخیر زەمانیەتی و، کۆتایی کاتەکەیەتی.

هەروەها لە فەرمایشتێکی دیکەدا لە صەحیحی بوخاریی دا هاتووە: {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، قَالَ: بَيْنَمَا النَّبِيُّ ﷺ فِي مَجْلِسٍ يُحَدِّثُ القَوْمَ، جَاءَهُ أَعْرَابِيٌّ فَقَالَ: مَتَى السَّاعَةُ؟ فَمَضَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُحَدِّثُ، فَقَالَ بَعْضُ القَوْمِ: سَمِعَ مَا قَالَ، فَكَرِهَ مَا قَالَ. وَقَالَ بَعْضُهُمْ: بَلْ لَمْ يَسْمَعْ، حَتَّى إِذَا قَضَى حَدِيثَهُ قَالَ: «أَيْنَ «أُرَاهُ» السَّائِلُ عَنِ السَّاعَةِ»

قَالَ: هَا أَنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: «فَإِذَا ضُيِّعَتِ الأَمَانَةُ فَانْتَظِرِ السَّاعَةَ»، قَالَ: كَيْفَ إِضَاعَتُهَا؟ قَالَ: «إِذَا وُسِّدَ الأَمْرُ إِلَى غَيْرِ أَهْلِهِ فَانْتَظِرِ السَّاعَةَ»} (أخرجه البخاري: ٥٩).

واتە: لە کاتێك دا پێغەمبەر ﷺ لە کۆڕێك دا بۆ خەڵکەکە دەدوا، ئەعرابییەك هاتە لای گوتی: ئاخیر زەمان کەیە؟ پێغەمبەری خواش بەردەوام بوو قسەی دەکردن، هەندێك لە خەڵکەکە گوتیان: ئەوەی گوتی بیستی، بەڵام ئەوەی گوتی پێیناخۆش بوو، هەندێکیشیان گوتیان: بەڵکو نەیبیست، هەتا کاتێك قسەی تەواو کرد، فەرمووی -پێم وایە- کوا پرسیارکار لە بارەی ئاخخیر زەمانەوە؟ گوتی: ئەوە منم ئەی پێغەمبەری خوا! فەرمووی: هەرکات سپاردە زایەکرا چاوەڕێی ئاخیر زەمان بکە، گوتی: چۆن زایە دەکرێ؟ فەرمووی: هەر کات سپاردە بە کەسی ناشایست سپێررا، چاوەڕێی کاتی کۆتایی (ئەو کارە) بکە.

کەواتە: وشەی (ساعة) لێرەدا مەرج نیە مەبەست پێی (السَّاعة الكُبرى) بێ، واتە: ئاخیر زەمانی گەورە کە بەسەر هەموو گۆی زەوی دادێ، بەڵکو دەگونجێ مەبەست پێی: (السَّاعة الصُغرى) بێ، (ساعة)ی گچکە، ئاخیر زەمانی هەر کامێك لە مرۆڤەکان، یاخود هەر جیلێك لەو مرۆڤانە، کە هەروەك لە فەرمایشتەکەی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە، کە فەرمووی: {إِنْ يَعِشْ هَذَا فَلَنْ يَبْلُغَ الْهَرَمَ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ} (أخرجه أحمد: ١٣٢٢٤، قال شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح)، واتە: ئەگەر ئەمە، ئەم گەنجە بژی و تەمەن بکات، ناگاتە قۆناغی پیریی، کە ئاخیر زەمانی ئێوە دێ، واتە: تاکو گەنج پیر دەبێ، پیرەکان دەمرن.

٢)- ﴿أَن تَأْتِيَهُم بَغْتَةً﴾، (ئایا جگە لە ئاخیر زەمان چاوەڕێی چی دەکەن؟)، کە کت و پڕ بۆیان بێ، (بَغتَةً أي: فَجأَةً)، (بَغتَة: وَهِيَ حصُولُ الشَّيءِ مِنْ غَيرِ تَوَقُّعٍ)، (بغتة) پەیدابوونی شتێکە، بێ ئەوەی چاوەڕوانیی کرابێ.

٣)- ﴿وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ﴾، لە حاڵێك دا ئەوان هەست ناکەن، بەبێ ئەوەی هەست بکەن، (الشُّعُورُ: العِلْمُ بِحصُولِ الشَّيءِ الحَاصِل)، (شعور): بریتیە لە زانیاریی هەبوون بە

شتێك كە هەبێ، بەڵام تۆ هەستی پێ بكەی، هەندێكیش گوتوویانە: (**شعُورٌ**) بریتیە لە: (**إدْرَاكُ الشَّيءِ بِالحَوَاسّ**)، زانینە بە هەستەوەرەكان، یان دەنگی ببیستی، یان ببینی، یان تامی بكەی، یان بۆنی بكەی، یان دەستی لێ بدەی.

لـە سـوورەتی (**يَس**)یـش دا خـوای بـەرزی مـەزن هەمـان ڕاسـتیی دەفەرمـوێ: ﴿ مَا يَنظُرُونَ إِلَّا صَيۡحَةً وَٰحِدَةً تَأۡخُذُهُمۡ وَهُمۡ يَخِصِّمُونَ ﴿٤٩﴾ ﴾، چاوەڕێـی هیـچ ناكـەن، جگـە لـە هاڕژنێكـی گـەورە، [چریكـەو دەنگێكـی گـەورە]، دەیانگـرێ، لـە حاڵێكـدا ئـەوان خەریكـی مشـت و مـڕن، واتـە: خەریكـی مامەڵـەو كڕیـن و فرۆشـتن و كاری دنیایـی خۆیانـن، وەك ئێمـە لـەو بـارەوە، لـە تەفسـیری سـوورەتی (**الأعـراف**) دا كـە پێشـتر هێنامـان، كورتـە باسـێكمان كـردوەو چەنـد فەرمایشـتێكی پێغەمبەرمـان ﷺ هێنـاون، باسـی ئـەوە دەكـەن كـە ئاخیـر زەمـان لـە كاتێكـدا دێ، خەڵـك لـە گەرمـەی ئیـش و كارو، كڕیـن و فرۆشـتن و، هەڵسـوكەوتی دنیـا دان.

٤)- ﴿ ٱلۡأَخِلَّآءُ يَوۡمَئِذِۢ بَعۡضُهُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوٌّ إِلَّا ٱلۡمُتَّقِينَ ﴾، لەو ڕۆژەدا ئەوانەی پێكەوە دۆست و خۆشەویست بوون، هەموویان لێك دەبنە دوژمن، جگە لە پارێزكاران، (**الأخِلاء: جَمعُ خَليل، وَهوَ الصَاحِبُ المُلازم، الذي تَخَلَّلَ حُبُّهُ القَلبَ**)، (**أخِلأء**) كۆی (**خَليل**)ە، كە بریتیە لە كەسێك هەمیشە لەگەڵ مرۆڤدا بێ، یاخود كەسێك كە خۆشەویستییەكەی تێكەڵ بە دڵ و دەروونی بەرانبەرەكەی بووبێ.

﴿ بَعۡضُهُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوٌّ ﴾، (**العَـدُوّ: المُبغِـض**)، (**عـدوّ**) كەسـێك ڕقـی لـە كەسـێك هەڵسـێ، (**الأخِـلأء**) (**أل**)ی ناسـاندنەكەی بـۆ (**جِنـس**)ە، واتـە: كـۆی ئەوانـەی دۆسـت و خۆشەویسـتن، لـەو ڕۆژەدا لێـك دەبنـە دوژمـن و ناحـەز.

٥)- ﴿ إِلَّا ٱلۡمُتَّقِينَ ﴾، جگە لە پارێزكاران، لەبەر ئەوەی پارێزكاران لەبەر خوا ﷻ یەكدییان خۆشویستوەو، لەسەر ڕێیەكی ڕاست و دروست بوون، هەندێكیش گوتوویانە: وشەی (**خَلیل: مَنْ يَرْفَعَ خُلَّةَ صَاحِبِهِ وَحَاجَتَهُ**)، (**خلیل**) كەسێكە پێویستیی و ئاتاجیی هاوەڵەكەی لابەرێ، واتە: هاوكاری بێ، دیارە هۆكاری لێك بوونە دوژمنی بێبڕواو

تاوانبارانیش، سەرەنجامی شوومیانە کە لە دوارۆژدا دەیبینن و، هی پارێزکارانیش سەرەنجامی خێریانە، کە لەوێش دۆستایەتیی و خۆشەویستییەکەیان هەر بەردەوامە.

**لەو بارەوەش ئەم سێ دەقەی سوننەت دێنین:**

**١- {عَنْ مُعَاذٍ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: قَالَ اللهُ تَعَالَى: «وَجَبَتْ مَحَبَّتِي لِلْمُتَحَابِّينَ فِيَّ، وَالْمُتَجَالِسِينَ فِيَّ، وَالْمُتَزَاوِرِينَ فِيَّ، وَالْمُتَبَاذِلِينَ فِيَّ»} (أخرجه أحمد: ٢٢٠٣٠، تعليق شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح رجاله ثقات رجال الشيخين غير إسحاق بن عيسى فمن رجال مسلم).**

واتـە: موعـاز ﷺ، دەڵـێ: گوێـم لـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـوو دەیفەرمـوو: خـوای بـەرز فەرموویەتـی، خۆشەویسـتیی مـن پێویسـت بـووە، بـۆ ئەوانـەی لـە پێنـاوی منـدا یەکدییـان خـۆش دەوێ و، بـۆ ئەوانـەی لـە پێنـاوی منـدا پێکـەوە دادەنیشـن و، بـۆ ئەوانـەی لـە پێنـاوی منـدا سـەردان و هاموشـۆی یەکـدی دەکـەن و، بـۆ ئەوانـەی لـە پێنـاوی منـدا چاوپۆشـیی لـە یـەك دەکـەن،

٢- پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: **{لَوْ أَنَّ رَجُلَيْنِ تَحَابَّا فِي اللهِ، أَحَدُهُمَا فِي المَشْرِقِ، وَالأَخَرُ فِي المَغْرِبِ، لَجَمَعَ اللهُ تَعَالى بَيْنَهُمَا يَوْمَ القِيَامَة، يَقُولُ: هَذَا الَّذِي أَحْبَبْتَهُ فِيَّ} (أخرجه إبنُ عَساكِر، وابن كثير: ج٤، ص١٣٥)!!**

واتـە: ئەگـەر دوو پیـاو یەکدییـان خـۆش بـوێ لـە پێنـاوی خـوادا، یەکیـان لـە ڕۆژهـەڵات بـێ، یەکیـان لـە ڕۆژئـاوا بـێ، خـوای بـەرز لـە ڕۆژی قیامەتـدا، پێکـەوە کۆیـان دەکاتـەوەو دەفەرمـوێ: ئـا ئـەوە بـوو لـە پێنـاوی منـدا خۆشـت دەویسـت، بـە هـەر کامێکیـان وا دەفەرمـوێ.

**٣- {عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، قَالَ: أَعْجَزُ النَّاسِ مَنْ عَجَزَ عَنْ اكْتِسَابِ الإِخْوَانِ، وَأَعْجَزُ مِنْهُ مَنْ ضَيَّعَ مَنْ كَسَبَ مِنْهُم} (الأساس فِي التَّفْسير: ج٩، ص٥١٧٣).** واتە: عەلی (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: دەستە پاچەترین کەس ئەوەیە، نەتوانێ برایان پەیدا بکات، لەویش دەستە پاچەتر

ئەوەیە، ئەوانەی پەیدای کردوون لە دەستیان بدات، واتە: نەتوانێ پارێزگاریی لە دۆست و ڕەفیقەکانی خۆی بکات.

خـوا بـە لوتـف و کەرەمـی خـۆی ئێمـە لـەو کەسانە بگێـڕێ، کـە لـە پێنـاوی خـوادا خەڵکیـان خـۆش دەوێ و، ڕێزیـان لـێ دەگـرن و، وابیـن هـەق و مافەکانـی برایەتییـش بدەیـن، کـە برایەتییـان لەگەڵـدا دەکەیـن، خـوا ﷻ لـەو کەسـانەمان بگێـڕێ، لەگـەڵ هیـچ کەسێکدا دۆستایەتیی و نیزیکـی نەکەیـن، کـە لـە ڕۆژی دواییـدا لێـی پەشـێمان بیـن و، لـە دنیـادا بۆمـان ببـێ بـە مایـەی مەینەتیـی و دوورکەوتنـەوە لـە ئیسـلام، بێگومـان پێشـینانی خۆمـان دەڵێـن: پـارە دینـدەرەو دینبـەرە، بـەڵام برادەریـش دینـدەرەو دینبـەرە، بەهـۆی ڕەفیقـی باشـەوە، مـرۆڤ دەگونجـێ بـەرەو ڕاسـتە شـەقامی خـوا بچێـت و، زۆر بەهرەمەنـد بـێ، هـەروەك بەهـۆی دۆسـت و هاوەڵـی خراپیشـەوە دەگونجـێ مـرۆڤ، تووشـی زیـان و زەرەری گـەورە ببـێ، ئـەوەش فەرمایشـتی پێغەمبـەرە ﷺ کـە دەفەرمـوێ[1]: وێنـەی هـاوەڵ و دۆسـت و بـرادەری چـاك و هـاوەڵ و دۆسـت و بـرادەری خـراپ، وەك عەتـر فـرۆش و کورەچیـی وایـە، دوایـی لـە درێـژەی فەرموودەکـەدا دەفەرمـوێ: کابـرای عەتر فـرۆش، یـان لێـی دەکڕیـی، یـان دەتداتـێ، یـان بۆنـی خۆشـت بـۆ دێ، بـەڵام بابـای ئاسـنگەرو کورەچیـی، یـان بەرگـت دەسـووتێنێ، بـە پریشـکی ئاگـر، یـان بۆنـی ناخۆشـت بـۆ دێ و، بـە دەنگـی تەقـە تـەق جـاڕس دەبـی.

---

(١) أخرجه البخاري: (٥٥٣٤)، ومسلم: (٢٦٢٨).

## مەسەلەی دووەم:

**بانگکردنی خوا بۆ بەندە پارێزکارەکانی، کە لەو ڕۆژە (ڕۆژی دوایی)دا، ترس و خەم و پەژارەیان نیەو، فەرمان پێکردنیان بە چوونە بەهەشتەوە، کە تێیدا شادمان دەبن و، هەرچی ئارەزووی بکەن و، چاویان چێژ لە دیتنی بکات هەیانەو، ئەو بەهەشتەش خەڵاتی خوایە لەسەر کردەوەکانیان، پێیان دەدرێ و هەرچی جۆری میوەیە تێیدایە:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ يَٰعِبَادِ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡكُمُ ٱلۡيَوۡمَ وَلَآ أَنتُمۡ تَحۡزَنُونَ ﴿٦٨﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَكَانُواْ مُسۡلِمِينَ ﴿٦٩﴾ ٱدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ أَنتُمۡ وَأَزۡوَٰجُكُمۡ تُحۡبَرُونَ ﴿٧٠﴾ يُطَافُ عَلَيۡهِم بِصِحَافٖ مِّن ذَهَبٖ وَأَكۡوَابٖۖ وَفِيهَا مَا تَشۡتَهِيهِ ٱلۡأَنفُسُ وَتَلَذُّ ٱلۡأَعۡيُنُۖ وَأَنتُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٧١﴾ وَتِلۡكَ ٱلۡجَنَّةُ ٱلَّتِيٓ أُورِثۡتُمُوهَا بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٧٢﴾ لَكُمۡ فِيهَا فَٰكِهَةٞ كَثِيرَةٞ مِّنۡهَا تَأۡكُلُونَ ﴿٧٣﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:

١)- ﴿ يَٰعِبَادِ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡكُمُ ٱلۡيَوۡمَ وَلَآ أَنتُمۡ تَحۡزَنُونَ ﴾، ئەی بەندەکانم! ئەمڕۆ نەترستان لەسەرەو نەخەمبار دەبن.

﴿ يَٰعِبَادِ ﴾، هەم بە ژێر (كَسْر) خوێنراوەتەوە (يا عبادِ)، هەم بە (ي)، (يا عِبادي).

(الطبري) لە قەتادەوە ئەم گێڕدراوەیە دێنێ، دەڵێ: (عَنْ قَتَادَةَ قَالَ: ثَنَا الْمُعْتَمِرُ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ سَمِعْتُ أَنَّ « النَّاسَ حِينَ يُبْعَثُونَ لَيْسَ مِنْهُمْ أَحَدٌ إِلَّا فَزِعَ، فَيُنَادِي مُنَادٍ: يَا عِبَادَ اللَّهِ! لَا خَوْفٌ عَلَيْكُمُ الْيَوْمَ وَلَا أَنْتُمْ تَحْزَنُونَ، فَيَرْجُوهَا النَّاسُ كُلُّهُمْ قَالَ: فَيَتْبَعُهَا {الَّذِينَ آمَنُوا بِآيَاتِنَا وَكَانُوا مُسْلِمِينَ}الزخرف: ٦٩، قَالَ: فَيَيْأَسُ النَّاسُ مِنْهَا غَيْرَ الْمُسْلِمِينَ)[1].

---

(١) جامع البيان: ٢١-٣١.

قەتـادە دەڵـێ: موعتەمیـر لـە بابیـەوە بـۆی بـاس کردوویـن، گوتوویەتـی: گـوێ بیسـت بـووم خەڵـك کـە لـە ڕۆژی دواییـدا زینـدوو دەکرێنـەوە، هیـچ کامیـان نیـە دانەچڵەکـێ و، بانگکەرێـك بانـگ دەکات، ئـەی بەندەکانـی خـوا!، نـە ترسـتان لەسـەرەو، نـە خـەم و پـەژارە دادەگـرن، ئنجـا هەمـوو خەڵـك بـە ئومێـدن، کـە ئـەو موژدەیـان بـۆ بێتـە دی، بـەڵام لـە دوایـی دا: (**الَّذِيـنَ آمَنُـوا بِآيَاتِنَـا وَكَانُـوا مُسْـلِمِينَ**)، ئەوانـەی بڕوایـان هێنابـوو و ملکەچیـش بـوون، شـوێنی دەکـەون، ئیـدی بێجگـە لـە مسـوڵمانان، ئەوانـی دیکـە بـێ ئومێـد دەبـن، دەزانـن کـە ئـەو مـوژدەدان و دڵنیـا کردنەوەیـە، بـە نەمانـی تـرس و خـەم و پـەژارە، تایبەتـە بـە ئەهلـی ئیـمان و ملکەچانـەوە بـۆ خـوا ﷻ.

٢)- ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا وَكَانُوا۟ مُسْلِمِينَ ﴾، ئەوانەی بڕوایان بە ئایەتەکانی ئێمە هێناوەو، ملکەچیش بوون، ئایەتەکان (**آيات**) وەك زۆر شوێنی دیکەی قورئان، لێرەش دەگونجێ مەبەست پێی ڕستەکانی فەرمایشتی خوا بێ، دەشگونجێ مەبەست پێی نیشانەکانی خوا ﷻ بێ، کە لە بوونەوەرو دەوروبەردا دایناون، دەشگونجێ مەبەست پێی موعجیزەکانی خوا ﷻ بێ، کە بە پێغەمبەرانی داون، هەموویان گونجاون، بەڵام زیاتر وا پێدەچێ، مەبەست پێی ڕستەو بڕگەکانی فەرمایشتی خوا بێ.

﴿ وَكَانُوا۟ مُسْلِمِينَ ﴾، هەروەهـا ئـەوان ملکەچیـش بـوون، وشـەی (**مُسـلِم**) لـە ئەسـڵدا واتـە ملکـەچ بـۆ خـوا، دوایـی وەك زاراوەیەکـی عورفیـی، کـراوە بـە نـاو بـۆ شـوێنکەوتووانی پێغەمبـەری خاتـەم موحەممـەد ﷺ.

(**الطَّـبَرِي**) لـە تەفسـیری ئـەو دوو ئایەتـەدا دەڵـێ: (**وَفِي هَـذَا الـكَلَامِ مَحْـذُوفٌ اسْـتُغْنِي عنـه بِدَلَالَـةِ مَـا ذُكِـرَ عَلَيْـهِ، وَمَعْنَـى الـكَلَامِ:** ﴿ ٱلْأَخِلَّآءُ يَوْمَئِذٍۭ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ إِلَّا ٱلْمُتَّقِينَ ﴾، **فَإِنَّـهُ يُقَـالُ لَهُـمْ:** ﴿ يَـٰعِبَادِ لَا خَوْفٌ عَلَيْكُمُ ٱلْيَوْمَ وَلَآ أَنتُمْ تَحْزَنُونَ ﴿٦٨﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا وَكَانُوا۟ مُسْلِمِينَ ﴾).

واتـە: لـەم فەرمایشـتەدا قرتێندراوێـك هەیـە، کـە بـە پێویسـت نەزانـراوە بـاس بکـرێ و، ئـەوەی بـاس کـراوە دەیگەیەنـێ، واتـای قسـەکەش ئاوایـە: دۆسـت و

خۆشەویستان، لەو ڕۆژەدا هەموویان لێك دەبنە دوژمن، (كە لە ئایەتی پێشێ دا هاتوە)، جگە لە پارێزكاران، ئەوان پێیان دەگوترێ: ئەی بەندەكانم! ئەمڕۆ نە ترستان لەسەرەو، نە خەم و پەژارەش دادەگرن، ئەوانەن كە بڕوایان بە ئایەتەكانی ئێمە هێنابوو، ملكەچیش بوون بۆ خوا.

شایانی باسە: هەم لێرەدا، هەم لە چەند شوێنێكی دیكەی قورئاندا، خوا ﷻ بۆ ئیمانداران و، بۆ مسوڵمانان ئەم تەعبیرەی بەكارهێناوە، بۆ نموونە لە سوورەتی (یُونُس)دا دەفەرموێ: ﴿أَلَآ إِنَّ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٢﴾﴾، هەروەها لە سوورەتی (فُصِّلَت)دا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُوا۟ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَـٰمُوا۟ تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا۟ وَلَا تَحْزَنُوا۟ وَأَبْشِرُوا۟ بِٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴿٣٠﴾﴾، دیسان لە چەند شوێنێكی دیكەشدا هاتوە.

ئنجا كە دەفەرموێ: ﴿لَا خَوْفٌ عَلَيْكُمُ ٱلْيَوْمَ وَلَآ أَنتُمْ تَحْزَنُونَ﴾، (خَوف) كە بە كوردیی دەگوترێ: ترس، بریتیە لە هەراسان بوونی مرۆڤ، بە نسبەت داهاتووەوە، كە شتێكی بەسەر بێ و، شتێكی بێتە ڕێ، زیانی لێ بدات، واتە: (تَوَقُّعُ مَكْروهٍ فِي المُستَقبَل)، شتێك كە ناپەسند بێ و، نا خۆشویستراو بێ، یاخود زیان و ناڕەحەتییەك بێ لە داهاتوودا چاوەڕێی بكات، ئەوە ترسە، یاخود لە دەستدانی بەرژەوەندییەك و، لە دەستدانی خۆشییەك و، ترس بە هۆی ئەوەوەیە، یان ناخۆشییەكت بەسەربێ، یان خۆشییەكت لەدەست بچێ.

بەڵام (حُزن): دڵتەنگیی و خەمباریی و، پەژارە، زیاتر پەیوەندیی بە ڕابردووەوە هەیە، ئنجا ئەهلی ئیمان و ئەهلی ئیسلام و دۆستانی خوا، نە بۆ داهاتوو ترس و هەراسانییان هەیە، نە بۆ ڕابردوو خەم و پەژارەو دڵتەنگییان هەیە.

هەر كام لە هەراسان بوون بە نسبەت داهاتووەوەو، ئنجا چ بەهۆی ئەوەوە كە مەترسییت هەبێ، خێرێكت لە دەست بچێ، یاخود زیان و خراپەیەكت

تووش بێ، هەروەها دڵتەنگ بوون و پەژارە داربوون بە نسبەت ڕابردووەوە، دوو حاڵەتی دەروونیی نەرێنیی زۆر خراپن، یەکی مرۆڤ دەخەن، هەر کامێکیان بە جیاو بە تایبەت ئەگەر هەردووکیان کۆببنەوە، خراپتریش پەکی دەخەن.

بەڵام لاچوونی ئەو دوو حاڵەتە دەروونییە نەرێنییە لە مرۆڤ دا، مرۆڤ وا لێ دەکات زیاتر بتوانێ، تواناکانی خۆی، لە خێرو چاکەو مەصڵەحەتدا بەکاربێنێ، بێگومان بە هۆی ئیمانەوەش، ئینسان هەم بۆ ڕابردوو، هەست بە دڵ ئاسوودەیی دەکات، ئەوەی پەرێزی پاکە، بێ باکە، هەم بە نسبەت داهاتووشەوە، مرۆڤی بڕوادار بە هۆی پشت بە خوا بەستنی و، بە هۆی ڕوو لە خوا کردنی و، بە هۆی یەقینی کە خوایەك و، پەروەردگارێك و، خاوەنێك سەرپەرشتیی دەکات و، ئاگای لێیەتی، هەرچی هەراسانیی و بێزاریی و، مەترسیی هەیە، لە دڵ و دەروونیدا دەڕەوێتەوە.

٣)- ﴿ ٱدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ أَنتُمْ وَأَزْوَٰجُكُمْ تُحْبَرُونَ ﴾، بچنە بەهەشتەوە، (خوا فەرمانیان پێ دەکات، لە ڕێی فریشتەکانەوە)، ئێوەو هاوسەرانتان، لەوێدا شادمان دەکرێن.

وشەی: ﴿ وَأَزْوَٰجُكُمْ ﴾، زۆربەیان وایان لێکداوەتەوە: هاوسەرانتان، بەڵام وشەی (**زَوْج**) وەك چۆن بە مانای هاوسەر دێ، بە مانای هەر کەسێکی دیکەش دێ، کە لەگەڵ مرۆڤدا هاودەم و هاوڕاز بێ، وەك لە سووڕەتی (**الصافات**)دا هاتووە: ﴿ ٱحْشُرُوا۟ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ وَأَزْوَٰجَهُمْ وَمَا كَانُوا۟ يَعْبُدُونَ ﴿٢٢﴾ مِن دُونِ ٱللَّهِ ...﴿٢٣﴾ ﴾، لەوێدا: ﴿ وَأَزْوَٰجَهُمْ ﴾، (**أي: وَأَصْنَافَهُم وَأَشْكَالَهُم وَأَمْثَالَهُم**)، یانی: جۆرەکانیان و شێوەکانیان و وێنەکانیان، چونکە مەرج نیە هەر کەسێك بێبڕوا بووبێ، خێزانەکەشی لەگەڵیدا بێبڕوا بووبێ، بۆ وێنە: فیرعەون، هەروەك مەرجیش نیە، هەر کەسێك بڕوادار بووبێ، هاوسەرەکەشی لەگەڵیدا بڕوادار بووبێ، وەك: نووح و لووط عليهما السلام، ئنجا لەوێ بە پێی سیاق دەزانرێ کە: ﴿ ٱحْشُرُوا۟ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ وَأَزْوَٰجَهُمْ ﴾، (**أي: وَأَمْثَالَهُم**)، واتە: ئەوانەی کە وەك ئەوان بوون و شێوەیان بوون.

بەڵام لێرەدا زیاتر وا پێدەچێ، مەبەست لە: ﴿ وَأَزْوَاجُهُمْ ﴾، واتە: هاوسەرانتان، کە هاوژینتان بوون، ئنجا ئەگەر دوێنراوەکان پیاوان بن، واتە: ژنەکانتان و، ئەگەر دوێنراوەکان ئافرەتان بن، واتە: مێردەکانتان.

(**تُحبَرون أي: تُنْعَمُون**)، واتە:

أ- بەهرەمەند دەکرێن و دەکرێن بە خاوەن نیعمەت.

ب- یاخود (**تُسَرُّون**)، واتە: دڵخۆش و شادمان دەکرێن.

ج- یاخود: (**تَفْرَحون**)، واتە: شادمان و دڵخۆش دەبن، (**تُحبَرون: مَبنيٌّ لِلمَجهولِ مضارِع: حُبِرَ، مِن حَبَرَهُ إذا سَرَّهُ، وَالحَبرُ: مَصدَرُ، الإسمُ: الحبور**)، (**تُحْبَرون**)، واتە: شادمان و دڵخۆش دەکرێن، یاخود خاوەن نیعمەت دەکرێن، بەهرەمەند دەکرێن، بکەر نادیار (**مَجهولُ الفاعِل**)ەو (**مُضارِع**)ی (**حُبِر**)ەیە، واتە: دڵخۆش کرا، (**حَبَرَهُ أي: سَرَّهُ**)، واتە: دڵخۆشی کرد، (**حَبْر**) چاوگە، واتە: دڵخۆشبوون و شادمانبوون، ناوەکەش بریتیە لە (**حبور**)، واتە: دڵخۆشیی و شادمانیی.

زانایان بۆ شیکردنەوەی ئەم وشەیە، زۆریان قسە کردوە، بە زۆر تەعبیر، بۆ وێنە:

(**الشنقيطي**) لە (**أضواء البيان**)ەکەیدا[1]، دەڵێ: (**تُكرَمُونَ بِأعظَمِ أنواعِ الإكرامِ وَأَتَمِّها**)، واتە: ڕێزتان لێدەگیرێ، بە مەزنترین جۆرەکانی ڕێزلێگرتن و تەواوترینی، بەڵام گومانی تێدانیە، کە (**حُبور**) بە مانای دڵخۆشیی و شادمانیی دێ، ئنجا مرۆڤ دیارە بە چی شادمان و دڵخۆش دەبێ؟ بە نازو نیعمەت و، بە خۆشیی و چاکە، کەواتە: ئەو دووانە، دڵخۆش بوون و شادمان بوون، لەگەڵ خاوەن نیعمەت بوون، دوو شتی ئاوێتەو تێکهەڵکێشن و هەر کەسێك خاوەن نیعمەت بێ، دڵخۆش دەبێ و، هەر کەسێك دڵخۆش و شادمان بێ لە ڕۆژی دوایی دا، دیارە لە بەهەشت دایەو، خاوەن نازو نیعمەتە.

---

(١) ج٧، ص١٤٣.

٤)- ﴿ يُطَافُ عَلَيْهِم بِصِحَافٍ مِّن ذَهَبٍ وَأَكْوَابٍ ﴾، {ئنجا خوا ﷻ هەندێك لە نازو نیعمەتەكان باس دەكات}: بەسەریانەوە دەگێڕدرێ، بە قاپە زێڕینەكان و پەرداخە زێڕینەكان، (**صِحَاف**) كۆی (**صَحْفَة**)یە، كە بریتیە لە دەفرێكی بازنەیی، زارەكەی فراوانە، لای خوارەوەی وەك شێوەی تۆپ، یاخود شێوەیەكی خڕ كۆتایی دێ، بە كوردیی دەڵێن: قاپ، دەفر، بەكاردەهێنرێ بۆ خواردن تێكردن، یان بۆ بۆ میوە تێكردن، (**كوب**)یش كە بە (**أكواب**) كۆ دەبێتەوە، (**إِنَاءٌ لِلشَّرَابِ وَهُوَ أَصْغَرُ مِنَ الإِبْرِيقِ**)، دەفرێكە بۆ خواردنەوە بەكاردەهێنرێ، كە لە سوڕاحیی گچكەترە، (**إبريق**) واتە: مەسینە، یاخود سوڕاحیی.

ئنجا كە بە قاپە زێڕینەكان و پەرداخە زێڕینەكانەوە، بەسەریانەوە دەگەڕێن، وەك پێشتریش گوتوومانە، بێگومان قاپەكان خاڵیی نین، هەروەها پەرداخەكانیش خاڵیی نین، بەڵكو قاپەكان و دەفرەكان پڕن لە خواردن و خۆراكی بەلەززەت، یاخود میوە، پەرداخەكانیش پڕن لە جۆرە خواردنەوەی بە لەززەت، كە شێوەی ئەوەی لە بەهەشت دایە، لە دنیادا نیە.

٥)- ﴿ وَفِيهَا مَا تَشْتَهِيهِ ٱلْأَنفُسُ وَتَلَذُّ ٱلْأَعْيُنُ ﴾، لەو بەهەشتەدا هەیە، هەرچی نەفسەكان بیخوازن و چاوەكان چێژی لێوەربگرن.

پێشێ باسی بەهەشت كرا: ﴿ ٱدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ ﴾، ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَفِيهَا ﴾، واتە: لەو بەهەشتەدا هەیە، ﴿ مَا تَشْتَهِيهِ ٱلْأَنفُسُ ﴾، هەرچی نەفسەكان بیخوازن و ئارەزووی بكەن، ئەم وشەیە، ﴿ مَا تَشْتَهِيهِ ﴾، خوێندراویشەتەوە: (**مَا تَشْتَهِي**)، واتە: صیلەكەی لەگەڵ نەهێنراوەو هەریەك واتایان هەیە، هەرچی نەفسەكان بیخوازن و ئارەزووی بكەن، تێیدا هەیە لەو بەهەشتەدا.

﴿ وَتَلَذُّ ٱلْأَعْيُنُ ﴾، واتە: (**وَفيها مَا تَلَذُّ الأعيُن**)، هەروەها هەرچی چاوەكان لەززەتی لێ بكەن و چێژی لێ وەربگرن، (**أي: مَا تَلتَذُّ بِهِ الأَعْيُن، أي: بِرؤيَتِهِ**)، چاوەكان چێژ وەربگرن لە دیتنی، وەك لە سووڕەتی (**البَقَرَة**)دا لە وەسفی

مانگایەکـەدا، خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿صَفْرَآءُ فَاقِعٌ لَّوْنُهَا تَسُرُّ ٱلنَّٰظِرِينَ ۝٦٩﴾، زەردە ڕەنگەکـەی زۆر تۆخـە، بینـەران دڵخـۆش دەکات.

٦)- ﴿وَأَنتُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾، ئێوە لەوێدا هەمیشەیین، واتە: هەر ماون، دەمێننەوە.

(**محمـد الطاهـر بـن عاشـور**) لـە تەفسـیرەکەی خۆیـدا[1] وشـەی (**تَلَـذُّ**) تۆزێـك شی دەکاتـەوە، لـە ڕووی زمانەوانییـەوە، دەڵـێ:

**(وتَلَـذُّ مُضَـارِعُ لَـذَّ بِـوَزْنِ عَلِـمَ: إِذَا أَحَـسَّ لَـذَّةً، وَحَـقُّ فِعْلِـهِ أَنْ يَكُـونَ قَـاصِرًا فَيُعَـدَّى إِلَى الـشَّيْءِ الَّـذِي بِـهِ اللَّـذَّةُ بِالْبَـاءِ، فَيُقَـالُ: لَـذَّ بِـهِ، وَكَـثُرَ حَـذْفُ الْبَـاءِ وَإِيصَـالُ الْفِعْـلِ إِلَى الْمَجْـرُورِ بِنَفْسِـهِ، فَيَنْتَصِـبُ عَـلَى نَـزْعِ الْخَافِـضِ، وَكَـثُرَ ذَلِـكَ فِي الْـكَلَامِ حَتَّـى صَـارَ الْفِعْـلُ بِمَنْزِلَـةِ الْمُتَعَـدِّي فَقَالُـوا: لَـذَّهُ. وَمِنْـهُ قَوْلُـهُ هُنَـا: وَتَلَـذُّ الْأَعْـيُنُ التَّقْدِيـرُ، وَتَلَـذُّهُ الْأَعْـيُنُ. وَالضَّمِـيرُ الْمَحْـذُوفُ هُـوَ رَابِـطُ الصِّلَـةِ بِالْمَوْصُـولِ. وَلَـذَّةُ الْأَعْـيُنِ فِي رُؤْيَـةِ الْأَشْـكَالِ الْحَسَـنَةِ وَالْأَلْـوَانِ الَّتِـي تَنْـشَرِحُ لَهَـا النَّفْـسُ، فَلَـذَّةُ الْأَعْـيُنِ وَسِـيلَةٌ لِلَـذَّةِ النُّفُـوسِ).**

واتـە: وشـەی (تَلَـذُّ) (مُضَـارِع)ی (لَذَّ)یـە، لەسـەر کێشـی (عَلِـمَ)، کەواتـە: (لَـذَّ) لـە ئەصڵـدا (لَذِذَ)یـە، دەگوتـرێ: (لَـذَّ)، (إذَا أَحَـسَّ لَـذَّةً)، ئەگـەر هەسـتی کـرد، بـە چێژێك، بـە تامێـك، کردارەکـەی دەبووایـە (قـاصِر) بـێ و، پـاڵ بدرێتـە لای ئـەو شـتەی، کـە چێـژی لێوەردەگـرێ، بـە هـۆی پیتـی (ب)ەوە، بگوتـرێ، (لَـذَّ بِـهِ)، چێـژی لێوەرگـرت، بـەڵام لـە قسـەکردنێ دا، ئـەو (ب)یـە زۆر لابـراوەو یەکسـەر کردارەکـە، لکێـنراوە بـەو شـتەوە، کـە بـە هـۆی (ب)کـەوە مەجـڕوور بـووە، کـە ئـەو کاتـە دەگوتـرێ: (**يَنْتَصِـبُ عَـلَى نَـزْعِ الْخَافِـضِ**)، واتـە: ئـەو شـتەی مەجـڕووری کـردوە، لابـراوە، بۆیـە (**مَنصـوب**) بـووە، ئەمـە لـە قسـاندا زۆر بـووە، هەتـا وای لێهاتـوە (**فِعـل**)ی (لَـذَّة)، کـە لـە ئەصڵدا (**قـاصِر**)ەو بـەرکار ناخـوازێ بـۆ خـۆی، دەبـێ بەهـۆی پیتێکەوە بـەرکاری بدرێتـێ، وای لێهاتـوە وەك (**مُتَعَـدِّي**) لێهاتـوە، کـە گوتوویانـە: (لَـذَّهُ)، چێـژی لێوەرگـرت، [ئەصڵـی خـۆی دەبـێ بگوتـرێ: (لَـذَّ بِـهِ)، کـە لێرەدا خـوا ﷻ، ئـەو تەعبیـرەی بەکارهێنـاوە، بەو

---

(١) التحرير والتنوير: ج٢٥، ص:٢٥٥.

ئیعتیبـارە بـەکاری هێنـاوە، کـە (لَـذَّ) فیعلێکـی (مُتَعَدِّي)یـە}، کـە دەفەرمـوێ: (وَتَلَـذُّ الأَعْيُن) ئـەوەی کـە چـاوەکان چێـژی لـێ وەردەگـرن، واتـە: (وَتلتَـذُّ بـهِ الأَعْيُن)، واتـە: چـاوەکان چێـژی لـێ وەردەگـرن، چێـژی چاوەکانیـش بـە دیتنـی شـێوە جوانـەکان و، ئـەو ڕەنگانەیـە کـە دڵـی مـرۆڤ لەگەڵیانـدا دەپشـکوێ، بـە تەئکیـد چێـژ وەرگرتنـی چاوەکانیـش، ئامرازێکـە بـۆ چێـژ وەرگرتنـی نەفسـەکە.

٧)- ﴿ وَتِلْكَ ٱلْجَنَّةُ ٱلَّتِىٓ أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾، ئەو بەهەشتەش، کە کراوە بە میراتی ئێوە، بە هۆی ئەوەوەیە کە ئەنجامتان دەدات، بە هۆی کردەوەکانتانەوەیە.

لێـرەدا خـوا ﷻ وشـەی: ﴿ أُورِثْتُمُوهَا ﴾ی بەکارهێنـاوە، گوتـراوە: (إيثَـارُ وأُرِثتُمُهَا عَـلَى أُعْطِيتُمُوهَـا، أو أُتِيتُمُوها لِسَـبَبَين:

١- قوةُ مُلكية الإرثِ بِالنِّسْبَةِ لِغَيرِه.

٢- الميراثُ لِمَن هُوَ أَقْرَبُ، وَأَهْلُ الجَنَّةِ يُؤْثَرونَ عَلَى غَيْرِهِم لِقُرْبٍ مِنَ اللهِ تَعَالى).

واتـە: بۆیـە وشـەی (وأُرِثتُمُهـا) بەسـەر (أُعْطِيتُمُوهـا)دا هەڵبژێـرراوە، کراوەتـە میراتتـان لـە جیاتـی پێتـان دراوە، یـان پێتـان بەخـشراوە، بەکارهێنـاوە لەبـەر دوو هـۆکار:

١- لەبەر ئەوەی خاوەندارێتیی میرات، بە نسبەت جۆرەکانی دیکەی خاوەندارێتییەوە، زۆر بەهێزە.

٢- میرات بۆ کەسێکە کە نیزیکترەو، ئەهلی بەهەشتیش هەڵدەبژێردرێن بەسەر خەڵکی دیکەدا، لەبەر ئەوەی لە خوای بەرز نیزیکترن.

دەڵێـم هۆکارێکـی دیکەشـی هەیـەو زانایانیـش باسـیان کـردوە، ئەویـش ئەوەیـە، کـە میـرات بەبـێ مانـدوو بوونی مـرۆڤ، بە مـرۆڤ دەگات، بەبـێ ئارەقـە پێوەکردنی، ئـەو بەهەشـتەش بـە لەبـەر چاوگرتنـی، ئێوەڕۆکـی بەهەشـت و نـازو نیعمەتەکانـی و، بـەردەوام بوونـی بـۆ هەتـا هەتایـە، لـە قـەدەر ئـەو کردەوانـە نیـە، کـە مـرۆڤ

لـە ژیانێکـی کـەم و کورتـی دنیـادا ئەنجامـی داون، کەواتـە: هـەر وەك بـە بـەلاش و، بەبـێ بەرانبـەر درابیەنەتـێ، بۆیـە وشـەی: (**وأُرِثتُمُها**)ی بـۆ بەکارهێنـاوە، وەك چـۆن کەسـێك کـە میراتـی پـێ دەگات، بـەو پـارەوەو بـەو ماڵـەوە مانـدوو نەبـووە، بەهەمـان شـێوە، ئەهلـی بەهەشـتیش کـە دەچنـە بەهەشـتەوە، بەڵـێ لـە دنیـادا کـردەوەی باشـیان کـردوە، خـوای پـەروەردگار دەفەرمـوێ: ﴿بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾، بـەڵام لـە ڕاسـتیی دا، کردەوەکانـی بـڕواداران، تەنیـا هـۆکارن بـۆ چوونـە بەهەشـت و نرخـی بەهەشـت نیـن، بەهەشـت زۆر زۆر لـەوە مەزنـترو گرنگـترە، کـە ئـەو کـردەوە چاکانـە نرخـی بـن، بـەڵام هۆکارینـی.

٨)- ﴿لَكُمْ فِيهَا فَاكِهَةٌ كَثِيرَةٌ مِّنْهَا تَأْكُلُونَ﴾، بۆ ئێوە لەو بەهەشتەدا زۆر میوە هەن، واتە: میوەی جۆراوجۆرو زۆر هەن، وەك لە سوورەتی (**الواقِعَة**)دا دەفەرموێ: ﴿لَّا مَقْطُوعَةٍ وَلَا مَمْنُوعَةٍ ﴿٣٣﴾﴾، واتە: ئەو میوەیەی لە بەهەشتدا هەیە، نە دەبڕێ و نە قەدەغەش دەکرێ.

بۆیـەش زۆر باسـی میـوە کـراوە، لـە بەهەشـتدا، وەك پێشـتریش باسـمان کـرد، چونکـە میـوە بـۆ چێـژ وەرگرتـن و لـەززەت دەخـورێ، نـەك بـۆ لابردنـی ئازاریـی برسـیەتیی، کـە بێگومـان لـە بەهەشـتدا برسـیەتیی و، تینوەتیـی و، هیـچ شـتێکی تێدانیـە، مایـەی نارەحەتیـی مـرۆڤ بێـت.

لێـرەدا بـە چاکـی دەزانـم، ئاماژەیـەك بکـەم بـە قسـەیەکی (**فخرالدیـن الـرازي**)، دیـارە هەمـوو زانایـان و پێشـەوایان، جێـی ڕێـزو حورمەتمانـن، بـەڵام هەر کاتێـك بزانم بیرۆکەیـەك هەیـە، قسـەیەك هەیـە، عەقڵـم نەیبـڕێ، یـان پێـم وابـێ نەگونجـاوە، یـان خاوەنەکـەی نەیپێـکاوە، ئـەوەی بـە پێویسـتی بزانـم ئامـاژەی پێدەکـەم، زۆرجاریـش بـە پێویسـتی نازانـم و لێـی دەگەڕێـم.

## ناز و نیعمەتەکانی بەهەشت و سەرنجێك لەسەر قسەیەکی ڕازیی:

لێرەدا (**فخرالدین الرازي**) لە تەفسیری ئەم ئایەتانەدا، قسەیەك دەکات، لە تەفسیرەکەیدا[1]، کە قسەکەیم بە دڵەوە نانووسێ، پێم وایە نەیکردبایە باشتر بوو، دەڵێ:

**(وَآعلَم أنّ الله تعالى بَعَثَ مُحَمَّداً إلى العَرَب أوّلاً، ثُمَّ إلى العالَمينَ ثانياً، وَالعَرَبُ كانوا في ضِيقٍ شَدِيدٍ بِسَبَبِ المأكُولِ وَالمَشروبِ وَالفَاكِهة، فَلِهَذَا السَّبَب تَفَضَّلَ اللهُ عَلَيهِم بِهَذِهِ المَعاني مَرَّةً بَعدَ أُخرَى تَكْمِيلاً لِرَغبَتِهِم وَتَقوِيَةً لِدَواعِيهِم)**

واتە: بزانە کە خوای بەرز، موحەممەدی ﷺ سەرەتا بۆ گەلی عەرەب ناردووە، دوایی بۆ هەموو جیهانییان، گەلی عەرەب ئەو کاتە زۆر لە سەغڵەتیی دا بوون، بەهۆی کەم خۆراکیی و کەم خواردنەوەیی و، کەم میوەییەوە، لەبەر ئەو هۆیە خوا ﷻ ئەو مەبەستانەی بۆ ڕوونکردوونەوە، جار لە دوای جار، تاکو زیاتر ئارەزوومەندیان بکات، بۆ بەهەشت و زیاتر پاڵنەرو هاندەریان بەهێز بکات.

### تێبینیی و سەرنجەکەشم ئەوەیە:

خوا ﷻ ئەوەی کە فەرموویەتی، وێڕای نەتەوەی عەرەب، کوردیش و فارسیش و ئینگلیزو تورك و هەموو گەلانی دنیاشی لەبەرچاو گرتوون و، لە ڕاستیی دا ئەوەی خوا ﷻ بەهەشتی پێ وەسف دەکات، وەڵامگۆی ئارەزوو و ڕەغبەتی هەموو مرۆڤەکانە، واتە: بەس ئەوە نیە، تەنیا گەلی عەرەب، کەیفیان بە خواردنەوەو خواردنی خۆش و، کەیفیان بە میوە هاتبێ و، کەیفیان بە کانیی و سەرچاوەو ئاوی سازگارو خۆش هاتبێ، بەڵکو بۆ هەموو مرۆڤەکان هەروایە.

بەڵگەشمان ئەوەیە تەماشای واقیع بکە، لە هەموو وڵاتاندا خەڵك هەوڵدەدات، لەسەر کانیی و سەرچاوەو، لەسەر کەناری ڕووبارەکان و لەسەر

---

(١) ج٢٧، ص١٩٩.

کەنـاری دەریایـەکان، خانووبـەرەو شـوێنی خۆیـان سـاز بکـەن، وەك چـۆن خـوا ﷻ باسـی بەهەشـت دەکات دەفەرمـوێ: (**تَجري مِنْ تَحتِها الأنهار**)، هەمـوو وڵاتانـی دنیا تەماشـا بکـەن - مەگـەر ئەوانـەی دەسـتیان نـەڕوا - هـەوڵ دەدەن خانووبەرەکانیـان و، دارو درەخـت و سـەوزایی و مێـرگ و مێرگـوزار بـێ، پاشـان هەمـوو گەلانـی دنیـا تەماشـا بکـە! کەیفیـان بـە میـوە دێ و، کەیفیـان بـە خواردنـەوە خۆشـەکان دێ و، کەیفیـان بـە خواردنـە بـە لەززەتـەکان دێ.

کەواتــە: ئەوانــە خاڵــی هاوبەشــی هەمــوو مرۆڤەکانــن و، ئــەوەی خــوا ﷻ بەهەشـتی پـێ وەسـف دەکات، خـوا ﷻ زانیویەتـی ئـەوە، وەڵامـدەرەوەی غەریـزەو ئـارەزووی هەمـوو مرۆڤەکانـە، نـەك تەنیـا هـی گەلـی عـەرەب.

## چاو پێداخشاندنێکی نیعمەتەکانی بەهەشت:

لێـرەدا چاوێـك دەگێڕینـەوە بـەو نـاز و نیعمەتانـەدا، کە خـوا ﷻ بۆ بەهەشـتییانی داناون، کـە لـە سـێزدە (١٣) بڕگـەدا، ئەو نـازو نیعمەتانـەی بەهەشـت دەخاتەڕوو:

١- ﴿ يَـٰعِبَادِ ﴾، ئەی بەندەکانم! کەواتە: ئەوانە لە لای خوا خۆشەویستن، خوا ﷻ پاڵیان دەداتە لای خۆی، چونکە بۆ خوا ملکەچ بوون و فەرمانبەری خوا بوون.

٢- ﴿ لَا خَوْفٌ عَلَيْكُمُ ٱلْيَوْمَ وَلَآ أَنتُمْ تَحْزَنُونَ ﴾، ئەمڕۆ نە ترستان لەسەرەو نە خەم و پەژارەش داتان دەگرێ، هەڵبەتە نەبوونی ترس و، نەبوونی خەم و پەژارەو دڵتەنگیی، لە گەورەترین نازو نیعمەتەکانی بەهەشتن، هەروەك هەبوونی ترس و دڵەڕاوکێ و هەراسانیی و هەبوونی خەفەت و دڵتەنگیی و مەینەتیی لە دنیادا، گەورەترین ناخۆشییەکانی ژیانن لە دنیادا.

٣- ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا وَكَانُوا۟ مُسْلِمِينَ ﴾، ئەوانەی بڕوایان بە ئایەتەکانی ئێمە هێنابوو و ملکەچیش بوون، لێرەدا خوا ﷻ دەیخاتەوە بەرچاویان، کە ئێوە بە هۆی ئەو ئیمانەی هەتانبووەو، بە هۆی ئەو ملکەچییەیەوەی بۆ خوا هەتانبووە، تووشی ئەو نازو نیعمەتە بوون، بێگومان زۆریش خۆشە، مرۆڤ تەقدیر بکرێ و هەست بکات پێزانین

هەیە، بۆیە یەکێك لە سیفەتەکانی خوا ﷻ بریتیە لە: (**الشَّكور**)، وەك فەرموویەتی: (**والله غفور شكور**) هەروەها فەرموویەتی: ﴿ وَكَانَ ٱللَّهُ شَاكِرًا عَلِيمًا ﴾ النساء، خوا سوپاسگوزارەو، هەوڵ و تێکۆشانی بەندەکانی لەبەرچاوە.

٤- ﴿ ٱدْخُلُواْ ٱلْجَنَّةَ ﴾، (خوا پێیان دەفەرموێ:) بچنە بەهەشتەوە، یانی: مۆڵەتەو فەرمانیان پێ دەکات بچنەتێی.

٥- ﴿ أَنتُمْ وَأَزْوَٰجُكُمْ ﴾، خۆتان و هاوسەرانتان، یەکجار خۆشە، مرۆڤ خۆی و ئەوانەی لێی نزیك بوون، بە تایبەتی ئەگەر مێردە ژنەکەی و، ئەگەر ژنە مێردەکەی، لە شوێنی دیکەدا دەفەرموێ: خۆیان و هاوسەرانیان و باب و دایکیان و ڕۆڵەو وەچەشیان، وەك لە سوورەتی (**الرَّعد**)دا، هاتوەو، لە سەرەتای سوورەتی (**غافِر**)دا هاتوەو، لە سوورەتی (**الطور**)یشدا هاتوە، لەو بارەوە کە تێمە لە تەفسیری سوورەتی: (**غافِر**)دا باسمان کردوە، خوا ﷻ لەسەر زمانی فریشتەکان دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يَحْمِلُونَ ٱلْعَرْشَ وَمَنْ حَوْلَهُۥ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَيُؤْمِنُونَ بِهِۦ وَيَسْتَغْفِرُونَ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ رَبَّنَا وَسِعْتَ كُلَّ شَيْءٍ رَّحْمَةً وَعِلْمًا فَٱغْفِرْ لِلَّذِينَ تَابُواْ وَٱتَّبَعُواْ سَبِيلَكَ وَقِهِمْ عَذَابَ ٱلْجَحِيمِ ﴿٧﴾ رَبَّنَا وَأَدْخِلْهُمْ جَنَّٰتِ عَدْنٍ ٱلَّتِي وَعَدتَّهُمْ وَمَن صَلَحَ مِنْ ءَابَآئِهِمْ وَأَزْوَٰجِهِمْ وَذُرِّيَّٰتِهِمْ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٨﴾ ﴾.

واتە: ... پەروەردگارمان بیانخە ئەو بەهەشتەوە، کە بەڵێنت پێداون، هەروەها ئەوانەی چاك بوون، لە باب و باپیرانیان، (واتە: باب و دایکیان)و لە هاوسەرانیان و لە وەچەو ڕۆڵەکانیان.

٦- ﴿ تُحْبَرُونَ ﴾، دەگوترێ: (**حَبَرَهُ، يَحبُرُهُ، حُبُوراً، أي: سَرَّهُ وَنَعَّمَهُ، وَحَبَّرَهُ أي: حَبَرَهُ، وَحَبَّرَ وَحَبَرَ الشَّيءَ: زَيَّنَهُ وَنَمَّقَهُ**)[1]، (**حَبَرَهُ، يَحبُرُهُ، حُبُوراً**)، واتە: دڵخۆشیی کردو خاوەن نیعمەتی کرد، هەروەك (**حَبَّرَهُ**)، بە مانای (**حَبَرَهُ**) دێ، واتە: چ بە چواریی (**رُباعي**)، چ بە سیانیی (**ثُلاثي**)، بەیەك واتا دێن، (**وَحَبَّرَ وَحَبَرَ الشَّيءَ: زَيَّنَهُ وَنَمَّقَهُ**)، شتەکەی جوانکردو ڕازاندیەوە.

---

(١) الْمعجَمُ الوَسيط: ص:١٥١.

کەواتــە: ﴿ تُحۡبَرُونَ ﴾، واتــە: دەڕازێنرێنــەوە، یاخــود دڵشــادو دڵخــۆش دەکرێــن، (حُبـور) هـەم بـە مانـای ڕازێندرانـەوە دێ، هـەم بـە مانـای دڵخۆشـکران و شـادمان کران.

٧- ﴿ يُطَافُ عَلَيۡهِم ﴾، بەسەریانەوە دەگێڕدرێ، واتە: بۆ خۆیان ناچن ئەرك بکێشن، خواردن و خواردنەوەکان بێنن، بەڵکو خزمەتیان دەکرێ، لەلایەن کێوە؟ لە سوورەتی (**الواقِعة**)دا، دەفەرموێ: ﴿ يَطُوفُ عَلَيۡهِمۡ وِلۡدَٰنٞ مُّخَلَّدُونَ ﴿١٧﴾ ﴾، واتە: کوڕانێکی هێڵدراوە، واتە: هێڵدراوە لەو تەمەنەدا کە تێیدان، خوا ﷻ تایبەت بۆ خزمەتی بەهەشتییانی خوڵقاندوون، وەك چۆن حۆرییەکان لەوێ دەخوڵقێنێ بە تایبەت، ئەو خزمەتکارانەش کوڕیژگەی نەوجەوان و مێرد منداڵن، تایبەت خوا ﷻ دروستیان دەکات و لەو تەمەنەدا دەیانهێڵێتەوە: ﴿ بِأَكۡوَابٖ وَأَبَارِيقَ وَكَأۡسٖ مِّن مَّعِينٖ ﴿١٨﴾ ﴾، بە پەرداخەکانەوەو بە سوڕاحییەکانەوە، لە خواردنەوەی (**مَعين**)، یاخود: شەڕابێك کە لە کانیی و سەرچاوەوە هێنراوە.

لــە ســوورەتی (**الإنسان**)یشــدا، خــوا ﷻ هەمــان شــت دووبــارە دەکاتــەوە، کــە دەفەرمــوێ: ﴿ وَيَطُوفُ عَلَيۡهِمۡ وِلۡدَٰنٞ مُّخَلَّدُونَ إِذَا رَأَيۡتَهُمۡ حَسِبۡتَهُمۡ لُؤۡلُؤٗا مَّنثُورٗا ﴿١٩﴾ ﴾، واتــە: بەســەریانەوە دەگەڕێــن، کوڕانێکــی هێڵــدراوە، هەمیشــەیی، یاخــود: هێڵــدراوە لــە تەمەنێکــی دیارییکــراودا، ئەگــەر بیانبینــی، پێــت وایــە گەوهــەری بڵاوکــراوەن.

هێنــدە جــوان و پــاك و خاوێــن و ڕێکــن، بەســەریانەوە دەگەڕێــن، خــواردن و خواردنەوەیــان بــۆ دەبــەن.

بــەڵام لێـرەدا دەفەرمـوێ: ﴿ يُطَافُ عَلَيۡهِم ﴾، بەسـەریانەوە دەگێـڕدرێ، چونکـە لـە شـوێنەکانی دیکـە، هـەم لە سـوورەتی (**الواقِعـة**)و، هەم لە سـوورەتی (**الإنسـان**)دا هاتوە، کـە کێـن بەسـەریانەوە دەگەڕێـن، ئـەو مێـرد منداڵانـەن، کـە خـوا ﷻ دەیانشـوبهێنێ بە گەوهـەری بڵاوکـراوەوە، بۆیـە لێـرە بەپێویسـت نەزانـراوە ئـەوە بـاس بکرێ.

٨- ﴿ بِصِحَافٖ مِّن ذَهَبٖ وَأَكۡوَابٖ ﴾، بەسەریانەوە دەگێڕدرێ، بە قاپ و دەفرە زێڕینەکان و، بە پەرداخە زێڕینەکانەوە، یانی: قاپەکان لە زێڕ دروستکراون و، پەرداخەکانیش هەروا، بەڵام کە پێشێ زێڕ (**ذَهَب**)ی باسکردوە، بە پێویستی نەزانیوە بفەرموێ: (**وأكوابٍ مِنَ**

ذَهَب)، چونکە پەرداخەکانیش هەر دیارە کە لە زێڕ دروستکراون، ئەو زێڕەش هەر خوا ﷻ دەزانێ چ جۆرە کانزایەکە لە بەهەشت دا، بە دڵنیایی زێڕەکەی بەهەشت و، زیوەکەی و، ئاوریشمەکەشی و، هەموو کەل و پەلەکانی دیکەی کە لە بەهەشتن، جیان لەوانەی دنیا.

٩- ﴿ وَفِيهَا مَا تَشْتَهِيهِ ٱلْأَنفُسُ وَتَلَذُّ ٱلْأَعْيُنُ ﴾، لەوێدا هەیە (لەو بەهەشتەدا)، هەر شتێك نەفسەکان ئارەزووی بکەن و چاوەکان چێژی لێ وەربگرن، ئەم تەعبیرە: ﴿ وَفِيهَا مَا تَشْتَهِيهِ ٱلْأَنفُسُ وَتَلَذُّ ٱلْأَعْيُنُ ﴾، لە بەهەشت دا هەیە، هەرچی نەفسەکان ئارەزووی بکەن و چاوەکان چێژی لێوەربگرن، هەرچی نازو نیعمەت هەیە، دەیگرنە خۆیان، وەك لە سوورەتی (السَّجدة)شدا هاتوە، کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِىَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٧﴾ ﴾، واتە: هیچ نەفسێك، هیچ کەسێك نازانێ، ئەوەی بۆیان پەنهانکراوە، لەوەی مایەی دڵخۆشیی و شادمانییانە، لە پاداشتی ئەوەدا، کە دەیانکرد.

فەرمایشتێکی پێغەمبەر ﷺ لەو بارەوە هاتوە: {عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ ﵁، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: قَالَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ: أَعْدَدْتُ لِعِبَادِيَ الصَّالِحِينَ، مَا لَا عَيْنٌ رَأَتْ، وَلَا أُذُنٌ سَمِعَتْ، وَلَا خَطَرَ عَلَى قَلْبِ بَشَرٍ، ذُخْرًا، بَلْهَ مَا أَطْلَعَكُمُ اللهُ عَلَيْهِ، ثُمَّ قَرَأَ: ﴿ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِىَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٧﴾ ﴾السجدة}، (أخرجه البخاري: ٤٥٠٢، ومسلم: ٢٨٢٤).

ئەوە هەر تەفسیری ئەو ئایەتە موبارەکەیە، کە دەفەرموێ: ﴿ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِىَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ ﴿١٧﴾ ﴾، حەدیسەکە دەفەرموێ: لە بەهەشتدا هەیە، ئەوەی هیچ چاوێك نەیدیوەو، هیچ گوێیەك نەیبیستوە و، بەسەر دڵی هیچ کەسێکدا نەهاتوە، پاشەکەوتە، واز لەوە بێنە کە خوا ئێوەی لێ ئاگادار کردوە، دوایی خوێندیەوە: ﴿ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِىَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ ﴿١٧﴾ ﴾[1]،

---

(١) بَلْهَ: اترك: لێگەڕێ، وازی لێ بێنە، یانی: وێڕای ئەوە کە خوا باسیکردوە، ئەوانەی دیکەش لە بەهەشت دا هەن.

چونکـە هـەر شـتێك هەبـێ، یـان دەبـێ بـە چـاوی خـۆت بینیبـت، ئەگـەر بـە چاویـش نەتدیبـێ، بۆیـان بـاس کـردووی، لـە فـڵان وڵاتـەو، فـڵان شـوێنە، فـڵان شـتەی لێیـە، بۆیـان بـاس کـردووی و بیسـتووتە، یاخـود دەبـێ بـە خەیاڵتـدا هاتبـێ، ئنجـا پێغەمبـەر ﷺ دەفەرمـوێ: ئـەوەی لـە بەهەشـتدا هەیـە، نـە هیـچ چاوێـك دیویەتـی، نـە هیـچ گوێیـەك بیسـتوویەتی، نـە بـە خەیاڵـی هیـچ کەسیشـدا هاتـوە، کەواتـە: تـۆ ئێسـتا لـە دەروونتـدا هەرچەنـدە خەیـاڵ بکـەی، هـەر ناگاتـە ئـەو ئاسـتەی، کـە لـە بەهەشـت دا خـوا ﷻ ئامـادەی کـردوە بـۆ بـڕواداران، هەرچـی خەیاڵـە بیکـە، دیسـان وەختـێ بەهەشـت دەبینـی، دەزانی ئـەوەی لـەو بەهەشـتەدا هەیـە، نەهاتۆتە خەیاڵـی هیـچ مرۆڤێکـەوە، بـە دەقـی فەرمایشـتی پێغەمبـەر ﷺ، خـواش ﷻ کـە لـە سـوورەتی (السَّجدة)دا، دەفەرمـوێ: هیـچ کەسـێك نازانـێ، ئـەوەی بـۆی پەنهانکـراوە، لـە شـتێك کـە پێـی دڵخـۆش دەبـێ و مایـەی شـادمانیی و بەختەوەرییەتـی.

١٠- ﴿وَأَنتُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾، ئێوە لەوێدا دەمێننەوە، لێرەدا بەس دەفەرموێ: دەمێننەوەو هەمیشەیی دەبن، لە شوێنی دیکەدا قەیدی تاهەتایەشی خراوەتە سەر (خَالِدِينَ فِيْهَا أَبَدًا)، واتە: بە هەمیشەیی کە هەرگیز لێی نایەنە دەرێ، لەوێدا دەمێننەوە.

١١- ﴿وَتِلْكَ ٱلْجَنَّةُ ٱلَّتِىٓ أُورِثْتُمُوهَا﴾، ئەو بەهەشتەی کە کراوە بە میراتتان، چۆن میراتێکتان دەدرێتێ، ئاوا کراوە بە میراتتان، بە موڵکتان.

١٢- ﴿بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾، بە هۆی ئەوەوە کە کردووتانە، ئەوەش جۆرێکە لە پێزانین و تەقدیر، لە لایەن خوای کاربەجێ و کارزان و میهرەبانەوە، بۆ بەندەکانی، کە ئێوە کردەوەی چاکتان هەبووەو لە بەرانبەر کردەوەی چاکتاندا، ئەو بەهەشتەتان پێدراوە، هەڵبەتە کردەوە چاکەکانی ئێمە، بەس هۆکارن بۆ چوونە بەهەشت، بەڵام بە دڵنیایی نرخ و تێچووی نازو نیعمەتەکانی بەهەشت نین، وەك پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتێکدا دەفەرموێ: {«**لَنْ يُنَجِّيَ أَحَدًا مِنْكُمْ عَمَلُهُ» قَالُوا: وَلاَ أَنْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «وَلاَ أَنَا، إِلَّا أَنْ يَتَغَمَّدَنِي اللَّهُ بِرَحْمَةٍ منه وفضل، ..**»} (**أخرجه البخاري: ٦٤٦٣**). واتە: هیچ کامێك لە ئێوە،

کردەوەکەی دەربازی ناکات (نایخاتە بەهەشت)، گوتیان: تۆش ئەی پێغەمبەری خوا! (کردەوەکەت ڕزگاری ناکات و ناتخاتە بەهەشت)؟ فەرمووی: منیش مەگەر خوا بەزەیی و بەخششی خۆی دامبپۆشێ (ئەگەرنا منیش بە هۆی کردەوەکەمەوە ناچمە بەهەشت).

بـۆ ئـەوەی بـە هەڵـە لـە فەرمایشـتی پێغەمبـەر ﷺ تێنەگەیـن، دەڵێیـن: واتـە: کردەوەکـەی منیـش بایـی و نرخـی بەهەشـت نیـە، بـەڵام هـۆکارە!

کـە لێـرەدا دەفەرمـوێ: ﴿جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ١٧﴾، یـان: ﴿بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ﴾، واتـە: کردەوەکانـی ئێمـە، هـۆکارن بـۆ چوونـە بەهەشـت، بـەڵام نـرخ و بەهـای بەهەشـت نیـن، بەهەشـت زۆر گرانـترەو، زۆر بەهادارتـرە، لەوەنـدە کردەوانـەی ئێمـە، کـە لـە ماوەیەکـی کەمـی ژیانـی دنیـادا دەیانکەیـن.

کەواتـە: تێکگیـران نیـە، لـە نێـوان فەرمایشـتەکەی پێغەمبـەر ﷺو ئایەتەکانـدا، ئایەتـەکان دەفەرمـوون: کردەوەکانـی ئێـوە هـۆکارن بـۆ چوونـە بەهەشـت، بـەڵام پێغەمبـەر ﷺ دەفەرمـوێ: کردەوەکانـی ئێمـە، نرخـی تـەواوی بەهەشـت نیـن، تەنانـەت کـردەوەکانی ویـش!.

١٣- ﴿لَكُمۡ فِيهَا فَٰكِهَةٞ كَثِيرَةٞ مِّنۡهَا تَأۡكُلُونَ﴾، ئەو بەهەشتەی کە کراوە بە میراتتان و، پێتان خەڵات کراوە بە هۆی کردەوەکانتانەوە، بۆ ئێوە لەوێدا هەیە، میوەی زۆر کە لێیان دەخۆن، واتە: میوەی زۆرو جۆراوجۆر، لەبەر ئەوەی نیعمەتەکانی بەهەشت هەموویان تەنیا بۆ چێژو لەززەت وەرگرتنن، نەك بۆ لابردنی ئازاری برسیەتیی و تینووەتیی، ئەو نازو نیعمەتەی لە بەهەشتدا هەیە، خوا ﷻ زیاتر باسی میوەو باسی خواردنەوەکان دەکات، هەرچەندە جاروبار باسی گۆشتی باڵندەش دەکات و، باسی شتی دیکەش دەکات، چونکە هەموو ئەوانەی دەخورێن و دەخورێنەوە، تەنیا بۆ چێژ وەرگرتنن، نەك بۆ لابردنی ئازاری برسیەتیی و تینووەتیی.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـە شـازدە (١٦) ئایـەتی کۆتایـی سـوورەتی (**الزخـرف**)ە، ئایەتەکانـی: (٧٤ - ٨٩)، کـە چـوار بابـەتی سـەرەکیی دەگرنـە خۆیـان:

پێنـج ئایەتـی: (٧٤ - ٧٨): باسـی سـزای سـەخت و دژواری بێبڕوایانـی تاوانبـار، لـە ڕۆژی دوایـی دا دەکـەن.

دوو ئایەتـی: (٧٩ - ٨٠) باسـی بـاڵا دەسـتیی خـوای بـەرزو مـەزن و، بیسـتنی هەسـت و خوسـتیان و، تۆمارکردنـی کردەوەکانیانـە، لـە لایـەن فریشـتەکانەوە.

حـەوت ئایەتـی دوای ئەوانیـش: (٨١ - ٨٧)، هەموویـان جارێکـی دیکـە، دەربـارەی خسـتنەڕووی یەکتایـی خـوان، لـە پەرسـتراوێتیی و پەروەردگارێتییـداو، دووریـی خـوا لـە ڕۆڵـەو هاوبـەش و، تـکا لـەلا کردنـی پەرسـتراوانی سـاختەیە.

دوو ئایەتـی کۆتاییـش: (٨٨ - ٨٩)، باسـی سـکاڵا کردنـی پێغەمبـەری خوایـە ﷺ لـە گەلەکـەی کـە بـڕوا ناهێنـن و، فەرمانکردنـی خوایـە پێـی، کـە چاوپۆشـییان لێبـکات و وازیـان لـێ بێنـێ و، دڵنیابـێ کـە دوایـی دەزانـن، چ کەتنێکـی گەورەیـان کـردوە، چ سـزایەکی بێـڕەزا ڕووبەڕوویـان دەبێتـەوە!

﴿إِنَّ ٱلْمُجْرِمِينَ فِى عَذَابِ جَهَنَّمَ خَٰلِدُونَ ﴿٧٤﴾ لَا يُفَتَّرُ عَنْهُمْ وَهُمْ فِيهِ مُبْلِسُونَ ﴿٧٥﴾ وَمَا ظَلَمْنَٰهُمْ وَلَٰكِن كَانُوا۟ هُمُ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٧٦﴾ وَنَادَوْا۟ يَٰمَٰلِكُ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَ قَالَ إِنَّكُم مَّٰكِثُونَ ﴿٧٧﴾ لَقَدْ جِئْنَٰكُم بِٱلْحَقِّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَكُمْ لِلْحَقِّ كَٰرِهُونَ ﴿٧٨﴾ أَمْ أَبْرَمُوٓا۟ أَمْرًا فَإِنَّا مُبْرِمُونَ ﴿٧٩﴾ أَمْ يَحْسَبُونَ أَنَّا لَا نَسْمَعُ سِرَّهُمْ وَنَجْوَىٰهُم ۚ بَلَىٰ وَرُسُلُنَا لَدَيْهِمْ يَكْتُبُونَ ﴿٨٠﴾ قُلْ إِن كَانَ لِلرَّحْمَٰنِ وَلَدٌ فَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْعَٰبِدِينَ ﴿٨١﴾ سُبْحَٰنَ رَبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ رَبِّ

ٱلْعَرْشِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٨٢﴾ فَذَرْهُمْ يَخُوضُواْ وَيَلْعَبُواْ حَتَّىٰ يُلَٰقُواْ يَوْمَهُمُ ٱلَّذِى يُوعَدُونَ ﴿٨٣﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى فِى ٱلسَّمَآءِ إِلَٰهٌ وَفِى ٱلْأَرْضِ إِلَٰهٌ وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٨٤﴾ وَتَبَارَكَ ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَعِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٨٥﴾ وَلَا يَمْلِكُ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِهِ ٱلشَّفَٰعَةَ إِلَّا مَن شَهِدَ بِٱلْحَقِّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿٨٦﴾ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٨٧﴾ وَقِيلِهِۦ يَٰرَبِّ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ قَوْمٌ لَّا يُؤْمِنُونَ ﴿٨٨﴾ فَٱصْفَحْ عَنْهُمْ وَقُلْ سَلَٰمٌ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿٨٩﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بێگومان تاوانباران لە ئازاری دۆزەخدا، هەر ماون و هەمیشەیین ﴿٧٤﴾ ئازار لەسەریان خاو ناکرێتەوەو ئەوان تێیدا بێهیوان ﴿٧٥﴾ ستەمیشمان لێ نەکردن، بەڵکو خۆیان ستەمکار بوون ﴿٧٦﴾ بانگیشیان کرد ئەی مالیك! با پەروەردگارت تەواومان بکات (بمانمرێنێ)، (مالیك سەرپەرشتیاری دۆزەخ) گوتی: بە دڵنیایی ئێوە هەر ماوەوەن ﴿٧٧﴾ بەڕاستیی هەقمان بۆ هێنابوون، بەڵام زۆربەتان هەقتان پێناخۆش بوو ﴿٧٨﴾ یان ئەوان پیلان و نەخشەی کارێکیان داناوە، بێگومان ئێمەش نەخشە دانەرین (لە دژیان) ﴿٧٩﴾ یان ئایا پێیان وایە ئێمە (قسەی) پەنهان و چپەیان نابیستین؟ با، (سەرباره) نێرراوانیشمان لەلایانن، (هەرچی دەیڵێن و دەیکەن) دەینووسن ( و تۆماری دەکەن) ﴿٨٠﴾ بڵێ: ئەگەر (گریمان خوای) بە بەزەیی ڕۆڵەی هەبێ، ئەوە من یەکەمی پەرستەرانم (بۆی) ﴿٨١﴾ پاکیی بۆ پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی، پەروەردگاری عەرش (لەوەی باسی دەکەن و خوای پێ وەسف دەکەن) ﴿٨٢﴾ دەجا لێیان گەڕێ (ئەی پێغەمبەر!) با تێبرژێن (بۆ نێو ناهەق)و یاریی بکەن، تاکو دەگەنە ئەو ڕۆژەیان کە گفتیان پێدەدرێ ﴿٨٣﴾ هەروەها (خوا) ئەو کەسەیە، کە لە ئاسمانێ پەرستراوەو، لە

زەویشـدا پەرسـتراوەو، ئـەو کاربەجێـی زانایـە ﴿٨٤﴾ بـەرزو بـە پێزیشـە، ئـەو کەسـەی حوکمڕانیـی ئاسـمانەکان و زەوی و ئـەوەی نێوانیشـیانی هەیـەو، زانیاریـی کاتەکـە(ی ڕۆژی دوایـی) لەلایـەو، بـەس بـۆ لای ویـش دەگێڕدرێنـەوە ﴿٨٥﴾ ئەوانـەش کـە جگـە لـەو (خـوا) لێیـان دەپاڕێنـەوە، تـکا کردنیـان (لـە لای وی) بەدەسـت نیـە، مەگـەر کەسـانێك شـایەدیی بـە هـەق بدەن و بشـزانن (و بە بەرچـاو ڕوونییەوە ئەو شـایەدییە بـدەن) ﴿٨٦﴾ ئەگـەر لێشـیان بپرسـی: کـێ دروسـتیکردوون؟ بـە جەختکردنـەوە دەڵێـن خـوا، ئـەدی چـۆن (لـە پەرسـتنی خـوا) لادەدرێـن؟ ﴿٨٧﴾ هەروەهـا (خوا) قسەکەیشـی (هـی پێغەمبـەر دەزانـێ کـە گوتـی:) ئـەی پـەروەردگارم! بێگومـان ئەوانـە کۆمەڵێکـن بـڕوا ناهێنـن ﴿٨٨﴾ ڕوویـان لێوەربگێـڕەو بڵـێ: سـەلام، لـە مـەودوا دەزانـن (تووشـی چ سـزایەك دەبـن!) ﴿٨٩﴾}

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(**ٱلْمُجْرِمِينَ**): واتـە: تاوانبـاران، (**الجُـرْمُ: قَطْـعُ الثَّمَـرَةِ مِـنَ الشَّـجَرَةِ، وَاسْـتُعِيرَ لِـكُلِّ اكتِسَابٍ مَكْرُوه**)، (**جُرم**): لـە ڕیشـەی زمانـدا بەمانـای چنینـی میـوە لـە درەخـت دێ، بـەڵام دوایـی خوازراوەتـەوە بـۆ وەدەسـتهێنانی، هـەر کارێکـی ناپەسـندو خـراپ.

(**لَا يُفَتَّرُ عَنْهُمْ**): لەسـەریان سـووك ناکـرێ، لەسـەریان خـاو ناکرێتـەوە، (**الفُتُـورُ: سُـكُونٌ بَعْـدَ حِـدَّةٍ، وَلِـينٌ بَعْـدَ شِـدَّةٍ، وَضَعْـفٌ بَعْـدَ قُـوَّةٍ، وَبالتَّضْعِيـفِ يَتَعَـدَّى إلى مَفْعُـولٍ: لا يُفَـتِّرُهُ أَحَـدٌ**)، (**فتُـورُ**): بریتیـە لـە وەسـتان لـە دوای جووڵـەی خێـراو، نەرمیـی لـە دوای توندیـی و، بێهێزیـی لـە دوای بەهێزیـی، بـەڵام (**فَـتَّرَ**) ئەگـەر بـە (**تَضعیـف**) بـێ، (**فَـتَرَ**) واتـە: خـاو بـۆوە، سـووك بـوو، بـەڵام (**فَـتَّرَ**)، پێویسـتی بـە بـەرکار هەیـە، ئـەو کاتـە: (**لَا يُفَتَّرُ عَنْهُمْ**) واتـە: (**لا يُفَـتِّرُهُ أَحَـدٌ عَنْهُـم**)، هیچکـەس ئـەو سـزایەیان لەسـەر خـاو ناکاتـەوە.

(مُبْلِسُونَ): (الإِبْلاَسُ: اليَأْسُ وَالذُلُّ، وَمِنْ لَوَازِمِهِ: السُّكُوتُ)، (أَبْلَسَ، يُبْلِسُ وَهُوَ مَبْلِسٌ)، (إبلاس): بریتیە لە نائومێدیی و زەبوونیی، لە ئەنجامی نائومێدیی و زەبوونییشدا، بێدەنگیی پەیدادەبێ، بۆیە هەندێکیان (مُبلِسون)یان بە (ساکِتون) لێکداوەتەوە، کە لە ڕاستییدا بێدەنگییەکە، دەرهاویشتەی نائومێدیی و زەبوونییەکەیە.

(لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَ): با پەروەردگارت تەواومان بکات، واتە: کۆتاییمان پێ بێنێ، بمانمرێنێ، (القَضَاءُ: الإِمَاتَةُ، قَالَ اللهُ ﷻ: ﴿فَوَكَزَهُۥ مُوسَىٰ فَقَضَىٰ عَلَيْهِ ۝١٥﴾ القصص)، مووسا ﷺ بۆ کسێکی لێدا، یان مستێکی لێدا تەواوی کرد، مراندی.

(مَّٰكِثُونَ): (المُكْثُ: ثَبَاتٌ مَعَ الإِنْتِظَارِ، مَكَثَ، مُكْثَاً وَمَكْثَاً)، (مَاكِثُون) واتە: دەمێننەوە، (مُكْث) واتە: مانەوە لەگەڵ چاوەڕوانییکردندا، دەگوترێ: (مَكَثَ مُكْثَاً، وَمَكَثَ مَكْثَاً)، هەردووکیان بە مانای مانەوە لەگەڵ چاوەڕوانییدا.

(أَبْرَمُوٓاْ أَمْرًا): (الإِبْرَامُ: إِبْرَامُ الأَمْرِ، وَأَصْلُهُ إِبْرَامُ الحَبْلِ، وَهُوَ تَرديدُ فَتْلِهِ، وَالمُبْرَمُ: المُحْكَمُ فَتْلاً)، (إِبْرَام): بریتیە لە پتەوکردنی کارێك، بە مەحکەمیی بکرێ و پتەو بێ، ڕیشەکەی لەوەوە هاتوە، لە (إِبْرَامُ الحَبْل)، واتە: چنین و هۆنینەوەی پەتێك، ئەویش ئەوەیە چنینەکەی با بدرێ و، بچنرێ و بهۆنرێتەوە، (المُبْرَمُ: المُحْكَمُ فَتْلاً)، دەگوترێ: (حَبْلٌ مُبْرَم أي: مُحْكَم فَتْلاً)، واتە: زۆر چاك هۆندراوەو چندراوە.

(سِرَّهُمْ): واتە: پەنهانیان، (الإِسْرَارُ: خِلاَفُ الإِعْلاَنِ، السِّرُّ: الحَدِيثُ المُكَتَّمُ فِي النَّفْس)، (إِسْرَار): پێچەوانەی (إِعْلاَن)ە، (إِعْلاَن) واتە: ئاشکراکردن، (إِسْرَار) واتە: پەنهانکردن، (سِرّ)یش: بریتیە لەو قسەیەی لە دڵدا دەشاردرێتەوە.

(وَنَجْوَىٰهُم): واتە: چپەچپیان، (نَاجَيْتُهُ أي: سَارَرْتُهُ، وَأَصْلُهُ أن تَخْلوَ بِهِ فِي نَجوَةٍ مِنَ الأرض)، (ناجَيتُهُ) واتە: چپەم لەگەڵ کرد، سرکەم لەگەڵ کرد، ئەصڵەکەشی لەوەوە هاتوە، کە تۆ کەسێك ببەیە شوێنێکی چۆڵایی لە زەوییەکدا (واتە: شوێنێکی پەنا)و قسەی خۆتی لەگەڵ بکەی.

(**يَخُوضُواْ**): (**الخَـوْضُ: الـشُّرُوعُ فِي المَـاءِ وَالمـرُورُ فيـهِ، وَيُسْـتَعَارُ فِي الأُمُـورِ، وَأَكْـثَرُ مَـا وَرَدَ فِي القُـرْآنِ، وَرَدَ فِيـما يُـذَمُّ الـشُّروعُ فيـهِ**)، (**يَخُوضُـوا**) واتـە: لێیـان گـەڕێ، تێبڕژێـن، (**خَـوض**) واتـە: تێـڕژان، چوونـە نێـو ئـاو، بـە نێـو ئـاودا ڕۆیشـتن، بـەڵام خوازراوەتـەوە بـۆ چوونـە نێـو قسـان، چوونـە نێـو کارێـك، بـە زۆریـی کـە لـە قورئانـدا هاتـوە، لـە بـارەی ئـەو شـتانەوە هاتـوە، کـە خراپـە مـرۆڤ تێیـان بـڕژێ و تێیانـدا دەسـتبەکار بـێ، بـە تایبەتیـی قسـەی بـەلاش و پـووچ و خـراپ.

(**وَتَبَارَكَ**): واتـە: بـەرزو بـە پێـزو بەردەوامـە، (**البَرَكَـةُ: ثُبُـوتُ الخَـيْرِ الإِلَهِـيِّ فِي شَيءٍ، وَتَبَـارَكَ: تَنْبِيـهٌ عَـلَى اخْتِصَاصِـهِ تَعَـالى بِالخَـيْرَات**)، (**بَرَكَـة**): بـە مانـای چەسپاویی چاکـەو پێـزی خوایـە ﷻ لـە شـتێکدا، (**تَبَـارَكَ**)، ئاگادارکردنەوەیـە، بـۆ ئـەوە کـە خـوا ﷻ تایبەتمەنـدە بـە خێـرو پێـزو چاکەکانـەوە.

(**فَٱصْفَحْ عَنْهُمْ**): واتـە: چاوپۆشـییان لـێ بکـە، (**الصَّفْـحُ: تَـرْكُ التَّثْرِيـبِ وَأَبْلَـغُ مِـنَ العَفْـوِ**)، (**صَفْـح**): بریتیـە لـە وازلێهێنانـی سـەرکۆنە کـردن، کە ئەمـە زێدەڕۆیـی زیاتری تێـدا هەیـە، لـە لێبـوردن، (**عَفـو**) واتـە: لێبـوردن، بـەڵام (**صَفـح**) واتـە: چاوپۆشـیی، لێبـوردن ئەوەیـە، لەبـەر چـاوت بـێ، ئـەو هەڵەیـەی لـە گەڵـت دا کـردوە، بـەڵام چاوپۆشـیی ئەوەیـە، هـەر لەبیـری خۆتـی بەریـەوە، کـە ئـەو خراپەیـەی کـردوە، چونکـە (**صَفـح**) لـەوەوە هاتـوە، تـۆ لامـل بکەیـە شـتێك، واتـە: نادیـدەی بگـری و خـۆتی بەسـەرەوە نەبـەی.

(**سَلَٰمٌ**): (**السَّـلاَمُ: دُعَـاءٌ بِالسَّـلاَمَةِ**)، (**سـلام**) لـە سـیاقی خۆیـدا، پاڕانەوەیـە بـۆ سـەلامەتیی بەرانبـەر، (**وَالسَّـلْمُ وَالسِّـلْمُ وَالسَّـلاَمُ: الصُّلْـحُ**)، (**سـلِم وسَـلْم وسـلام**) هـەر سـێ وشـە کـە بـە مانـای صوڵـح و پێکهاتـن و ئاشـتەوایی دێـن، بـەڵام لێـرەدا: (**فَٱصْفَحْ عَنْهُمْ**) چاوپۆشـییان لێبکـە، خۆتیـان بەسـەرەوە مەبـە، (**وَقُـلْ سَـلاَم**) بشـڵێ: سـەلام، ئـەم سـەلامە، داوای ئاشـتیی بـۆ کـردن نیـە، بەڵکـو یـانی: خـوا حافیزییـان لـێ بکـەو، وازیـان لـێ بێنـە، کەواتـە: ئـەم سـەلامە بـۆ وازلێهێنانـە، وەك لـە سـوورەتی:

(**الفُرقــان**)دا، دەفەرمــوێ: ﴿ وَعِبَادُ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى ٱلْأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلْجَٰهِلُونَ قَالُوا۟ سَلَٰمًا ﴿٦٣﴾ ﴾، واتـە: (**قَالُـوا: قَوْلاً ذَا سَـلاَمَةٍ**)، قسـەیەکیان کـرد، قسـەیەکی سـەلامەت و، بێمـزەڕەت و بـێ زیـان، یاخـود: (قَالُوا۟ سَلَٰمًا )، واتـە: سـەلامیان کـردو، سـەلامەکەش واتـە: خواتـان لەگـەڵ و خـوا حافیزتـان بـێ، ئێمـە لەگـەڵ ئێـوەدا نایەینـە نێـو تـەرازووەوە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

وەك لـە سـەرەتای پێناسـەی ئـەم دەرسـەدا گوتمـان، ئـەو شـازدە ئایەتـەی کۆتایـی (**الزخـرف**) چـوار بابەتـی سـەرەکیی دەگرنـە خۆیـان، سـەرەتا خـوا ﷻ وەك چـۆن لـە ئایەتەکانـی پێشـێدا، باسـی ئـەو نـازو نیعمـەت و خێـرو خۆشـییەی کـرد، کـە لـە بەهەشـتدا بـۆ پارێـزکاران، بـۆ بڕوادارانـی بـۆ خـوا ملکـەچ دانـراوەو ئامـادە کـراوە، ئنجـا باسـی سـزاو ئـازارو جەزرەبـەو مەینەتییـەك دەکات، کـە بـۆ تاوانبـاران، واتـە: بێبڕوایـان و هاوبـەش بـۆ خـوا دانەرانـی تاوانبـار، ئامـادە کـراوە لـە دۆزەخـدا، دەفەرمـوێ:

﴿ إِنَّ ٱلْمُجْرِمِينَ فِى عَذَابِ جَهَنَّمَ خَٰلِدُونَ ﴾، بـە دڵنیایـی تاوانبـاران، لـە ئـازاری دۆزەخـدا هـەر مـاون، واتـە: بـەردەوام دەبـن، تێیـدا هەمیشـەیین و لێـی ناچنـە دەرێ، ﴿ لَا يُفَتَّرُ عَنْهُمْ ﴾، لێـی دەربـاز نابـن و، تێیـدا دەمێننـەوە، سـەربارە: لەسەریشـیان سـووك ناکـرێ، (**فَتَرَ**)، واتـە: (**سَكَنَ**)، وەسـتا، سـووك بـوو، ئنجـا (**فَتَّرَ**)، واتـە: (**سَكَّنَ**)، سـووکی کـرد، وەسـتاندی.

کەواتـە: ﴿ لَا يُفَتَّرُ عَنْهُمْ ﴾، یـانی: هیـچ کەسـێك، تۆزێـك ئـەو ئـازارو سـزایەیان لەسـەر خـاو ناکاتـەوەو سـووك نـاکات، ﴿ وَهُمْ فِيهِ مُبْلِسُونَ ﴾، ئـەوان لـە نێـو ئـەو ئـازاری دۆزەخـەدا، نائومێـدو بـێ هیـوان، لـە ئەنجامـی بـێ هیوایـی و نائومێدیـی و

زەبوونییدا، بێ دەنگ دادەنیشن و قسان ناکەن، چونکە پێشێ زۆر دەپاڕێنەوەو دەلاڵێنەوەو دەکرووزێنەوە، وەك لە ئایەتەکانی دیکەدا هاتوە، بۆ وێنە لە سووڕەتی (غافِر)دا:

﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ فِى ٱلنَّارِ لِخَزَنَةِ جَهَنَّمَ ٱدْعُوا۟ رَبَّكُمْ يُخَفِّفْ عَنَّا يَوْمًا مِّنَ ٱلْعَذَابِ ﴿٤٩﴾ ﴾، واتە: ئەوانەی لە نێو ئاگری دۆزەخدان، بە دۆزەخەوانەکان (سەرپەرشتیارانی دۆزەخ)یان گوت: لە پەروەردگارتان بپاڕێنەوە، یەك ڕۆژ ئازارمان لەسەر سووك بکات!

ئەوانیش وەڵام دەدەنەوە:

﴿قَالُوٓا۟ أَوَلَمْ تَكُ تَأْتِيكُمْ رُسُلُكُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ ۖ قَالُوا۟ بَلَىٰ ۚ قَالُوا۟ فَٱدْعُوا۟ ۗ وَمَا دُعَٰٓؤُا۟ ٱلْكَٰفِرِينَ إِلَّا فِى ضَلَٰلٍ ﴿٥٠﴾ ﴾، گوتیان: ئایا پێغەمبەرەکانتان، بەڵگە ڕۆشنەکانیان بۆ نەهێنان؟ گوتیان با، (فریشتەکان و سەرپەرشتیارانی دۆزەخ) گوتیان: ئنجا خۆتان بپاڕێنەوەو، پاڕانەوەی بێبڕوایانیش تەنیا لە ون بوون دایە.

واتە: کەس گوێی ناداتێ و زایە دەبێ و بێ ئاکام و بێ بەرهەم دەبێ، بۆیە لێرەدا دەفەرموێ: لەوێدا نائومێد دەبن لە دۆزەخدا.

﴿ وَمَا ظَلَمْنَٰهُمْ وَلَٰكِن كَانُوا۟ هُمُ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، ئێمەش ستەممان لێ نەکردوون، بەڵکو ئەوان خۆیان ستەمکار بوون، کە هاوبەشیان بۆ خوا داناو، بێبڕوا بوون بە خواو، بە پێغەمبەرانی خواو، بە پەیامی خواو، بە ئایەتەکانی خوا، سەربارەش تاوانبارو خراپەکار بوون، کەواتە: کردەی دەستی خۆیانە، ئەو سەرەنجامەی بۆ هێناونە پێش، وەك پێشینان گوتوویانە: (چ بچێنی ئەوە دەدروویەوە)، ئەوانیش لە دنیادا، تۆی کوفرو شیرك و گوناهو تاوان و ستەم و لادانیان چاندوە، بۆیە لە ڕۆژی دواییشدا، ئەوەی کە لە دنیادا تۆوەکەیان ڕژاندوەو، چاندوە، هەر بەرهەمی ئەوە هەڵدەگرنەوە.

﴿ وَنَادَوْا۟ يَـٰمَـٰلِكُ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَ ﴾، بانگیان کرد ئەی مالیك! با پەروەردگارت تەواومان بکات و، کۆتاییمان پێ بێنێ، مالیك ئەو فریشتەیە کە سەرپەرشتیی هەموو دۆزەخ دەکات، بە دڵنیایی ئەویش کۆمەڵێك فریشتەی لەبەردەست دان، لە سوورەتی: (المُدَّثر)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ عَلَيْهَا تِسْعَةَ عَشَرَ ﴿٣٠﴾ وَمَا جَعَلْنَآ أَصْحَـٰبَ ٱلنَّارِ إِلَّا مَلَـٰٓئِكَةً ۙ وَمَا جَعَلْنَا عِدَّتَهُمْ إِلَّا فِتْنَةً لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِيَسْتَيْقِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ وَيَزْدَادَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِيمَـٰنًا ۙ وَلَا يَرْتَابَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْمُؤْمِنُونَ ۙ وَلِيَقُولَ ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَٱلْكَـٰفِرُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَـٰذَا مَثَلًا ۚ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ ۚ وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ ۚ وَمَا هِىَ إِلَّا ذِكْرَىٰ لِلْبَشَرِ ﴿٣١﴾ ﴾، دۆزەخ نۆزدە فریشتەی لەسەرن، کەواتە: لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ وَنَادَوْا۟ يَـٰمَـٰلِكُ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَ ﴾، گوتیان: ئەی مالیك! با پەروەردگارت کۆتاییمان پێ بێنێ، مالیك سەرپەرشتیاری گشتیی دۆزەخە، ئەویش نۆزدە فریشتەی لەبەردەست دان، وەك خوا ﷻ لێرەدا دەفەرموێ:

دۆزەخ نۆزدە (فریشتە) سەرپەرشتیی دەکەن و، ئێمە هاوەڵانی دۆزەخمان بە فریشتە داناون، ژمارەکەشیان تاقیکردنەوەیە بۆ ئەوانەی بێبڕوان، تاکو ئەوانەی کتێبیان پێدراوە، دڵنیابن، (چونکە لە کتێبەکانی ئەوانیشدا باسی ئەو نۆزدە فریشتەیە کراوە، کە سەرپەرشتیاری دۆزەخن) و، بۆ ئەوەی بڕوادارانیش ئیمانیان زێدە ببێ و، بۆ ئەوەش ئەوانەی کتێبیان پێدراوەو بڕواداران، نەکەونە دوو دڵییەوەو، بۆ ئەوەی ئەوانەی دڵیان نەخۆشیی تێدایەو بێبڕوایان بڵێن: خوا ﷻ چی ویستوە لەو وێنەیە، کە ئەو وێنەیەی هێناوەتەوە؟ خوا ﷻ هەر بەو شێوەیە هەر کەسێ بیەوێ گومڕای دەکات و هەر کەسێك بیەوێ ڕاستە ڕێی دەکات، (ئەگەرنا هەموویانی ڕێنمایی کردوەو ڕێی پیشانی هەموویان داوە، بەڵام ئەوانەی هیدایەتی خوا قبووڵ بکەن، ئەوە خوا ﷻ ڕاستە ڕێیان دەکات و، ئەوانەش کە هیدایەتی خوا ڕەفز بکەن و بەرپەرچ بدەنەوە، خوا ﷻ گومڕایان دەکات)، سەربازەکانی پەروەردگاریشت، تەنیا خۆی ژمارەیان دەزانێ، ئەوەش کە باس کراوە، تەنیا بیرخەرەوەیە بۆ مرۆڤەکان.

ئێمە لەم تەفسیرە کوردییەماندا، ئەو میتۆدەمان ڕەچاو کردوە، کە هەمیشە هەوڵدەدەین، قورئان بە قورئان تەفسیر بکەین و، لە دوای قورئان، بە دەقەکانی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ، چونکە بێگومان باشترین ڕوونکەرەوە بۆ قورئان، خودی قورئانە، خوا ﷻ لە شوێنێك شتێك بە کورتیی دێنێ، لە شوێنێکی دیکە بە درێژیی دەیهێنێ، لە شوێنێك لایەنێکی مەسەلەیەك باس دەکات و، لە شوێنێکی دیکە لایەنەکانی دیکەی باس دەکات.

ئنجا لێرەدا کە تاوانباران داوا لە مالیك دەکەن: ﴿وَنَادَوْا يَا مَالِكُ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَ﴾، بانگیان کرد: ئەی مالیك! با پەروەردگارت تەواومان بکات، کۆتاییمان پێ بێنێ و، بمانمرێنێ، وەك لە سوورەتی (**القَصَص**)دا هاتوە: ﴿فَوَكَزَهُ مُوسَىٰ فَقَضَىٰ عَلَيْهِ ⁽١٥⁾﴾، واتە: مووسا عليه السلام مستێکی لێداو تەواوی کرد، ﴿فَقَضَىٰ عَلَيْهِ﴾، تەواوی کردو، کۆتایی پێ هێنا، بووە هۆی مردنی.

ئایا مالیك چی وەڵام دەداتەوە؟ ﴿قَالَ إِنَّكُم مَّاكِثُونَ﴾، (مالیك) گوتی: ئێوە دەمێننەوە، ئنجا لە تەفسیرەکان دا هاتوە، هەندێك لە زانایان دەڵێن: دوای ساڵێك و، هەندێك دەڵێن: دوای بیست ساڵ و، هەندێك دەڵێن: دوای حەفتا ساڵ و، هەندێك دەڵێن: دوای هەزار ساڵ، مالیك وەڵام دەداتەوەو دەڵێ: ئێوە دەمێننەوە، بەڵام بە هەرحاڵ ئەوە هەمووی قسەیەو، هەتا بە سەنەدێکی ڕاست، نەچێتەوە سەر پێغەمبەر ﷺ، وەك تەفسیری ئایەتەکان، ناگونجێ باس بکرێ، ساڵ و مانگ و هەفتەو ڕۆژیش، بە چەمکی باویان تایبەتن بە خەڵکی سەر خڕۆکەی زەوییەوە! ﴿قَالَ إِنَّكُم مَّاكِثُونَ﴾، مالیك گوتی: ئێوە دەمێننەوە، واتە: بەردەوام دەبن لە سزاداو خوا ناتانمرێنێ، وەك لە شوێنی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحْيَىٰ ⁽١٣⁾﴾**الأعلى**، واتە: نە تێیدا دەمرێ و، نە تێشیدا دەژی، نە ژیانێك دەژی، کە بە ژیان لە قەڵەم بدرێ و نە مردنیشی بەسەردا دێ، کە کۆتایی پێ بێ، لە شوێنی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُ مَن يَأْتِ رَبَّهُ مُجْرِمًا فَإِنَّ لَهُ جَهَنَّمَ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحْيَىٰ ⁽٧٤⁾﴾**طه**، واتە: هەر کەسێك بە تاوانباریی بێتە لای پەروەردگاری، (واتە:

تـاوان لەگـەڵ خـۆی بهێنێتـەوە بـۆ لای پـەروەردگاری)، دۆزەخـی بـۆ هەیـە، نـە تێیـدا دەمـرێ و، نـە تێشـیدا دەژی، واتـە: نـە کۆتایـی پـێ دێ، وەك چـۆن مـردن لـە دنیـادا هەیـە، بـەڵام لـە ڕۆژی دواییـدا مـردن نیـە، نـە ژیانێکیـش دەژی، کـە بـە ژیـان لـە قەڵـەم بـدرێ.

﴿ لَقَدْ جِئْنَاكُم بِالْحَقِّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَكُمْ لِلْحَقِّ كَارِهُونَ ﴾، بـە دڵنیایـی ئێمـە هەقـمان بـۆ هێنابـوون، بـەڵام زۆربەتـان کەیفتـان بـە هـەق نایـەت و، ناخۆشویسـتن بـۆ هـەق، هـەق واتـە: شـتی چەسـپاو و ڕاسـت، کـە لێـرەدا مەبەسـت پێـی خـوا ﷻ بـە یەکگرتنـەو، بەندایەتیـی کردنـە بـۆ خـواو، پەیڕەویـی کردنـە لـە بەرنامـەی خـواو، شـوێن پێهەڵگرتنـی پێغەمبـەری خوایـە ﷺ، هەقـمان بـۆ هێنابـوون، بـەڵام زۆربەتـان ناخۆشویسـت بـوون بـۆ هـەق، هەقتـان نەدەویسـت، بۆچـی دەفەرمـوێ: زۆربەتـان؟ چونکـە دوایـی بەشـێکیان، ئـەو هەقـەی خـوا ﷻ ناردوویەتـی، قبووڵیـان کـردوە، کەواتـە: کـە دەفەرمـوێ: ﴿ لَقَدْ جِئْنَاكُم بِالْحَقِّ ﴾، واتـە: لـە ژیانـی دنیـادا هەقـمان بـۆ هێنابـوون، بـەڵام زۆبەتـان هەقتـان نەویسـت و، ڕەفزتـان کـردو، ناخۆشویسـتنتان هەبـوو بـۆ هـەق، هەقتـان دەکەڕهانـدو، هەقتـان دەدزا، بۆیـە ڕەتتـان کـردەوە، بـەڵام کەمێکتـان ئەوانـە بـوون کـە بڕوایـان هێنـاو، هەقیـان قبـووڵ کـرد.

﴿ أَمْ أَبْرَمُوا أَمْرًا ﴾، یـان ئایـا پیلانێکیـان گێـڕاوە، (إبـرام) واتـە: هۆنیـن و ڕسـتنی ڕیسـێك، پەتێـك، مەبەسـت پێـی ئەوەیـە کارێکـی مەحکەمیـان کـردوەو نەخشـەیەکی باشـیان دانـاوە، ﴿ فَإِنَّا مُبْرِمُونَ ﴾، بـە دڵنیایـی ئێمـەش بکـەری کارێکـی مەحکەمیـن، ڕۆنـەری نەخشـەو پلانێکـی مەحکەمیـن لەبەرانبەریانـدا.

ئنجـا هەندێـك لـە زانایـانی ڕوونکـەرەوەی قورئـان گوتوویانـە: ئەمـە مەبەسـت پێـی ئـەوە بـووە، کـە بێبڕوایـان لـە (**دار النَّـدوة**)دا دانیشـتن و کۆبوونەوەیـان کـرد، لـە دژی پێغەمبـەر ﷺ کـە چـۆن لـە بەینـی بـەرن؟ بـەڵام پێـم وایـە، ئـەم سـوورەتە لـەو سـەرو حـەدەدا نەهاتۆتـە خـوارێ، واتـە: سـاڵی سێزدەیەمی پێغەمبەرایەتیـی، کە کافـرەکانی مەککـە لـە کاتی دەرچـوونی پێغەمبـەردا بـۆ کۆچکـردن بـەرەو مەدینـە پیلانی

کوشتنییان دانا، لە (**دار النَّدوة**)دا، بەڵکو ئەم سوورەتە لە ساڵانی هەشت و نۆدا هاتۆتە خوارێ، ئنجا زلە زلەکان و بڕیار بە دەستانی قورەیش و هۆزەکانی دیکەش، کە لە مەککە بوون و لە (**دار النَّدوة**)دا، کۆبوونەوە، بەس ئەو جارە کۆنەبوونەوەو جارانی دیکەش کۆبوونەوە، کە نەخشە دابنێن لە دژی پێغەمبەر ﷺ و پەیامەکەی، ئنجا مەبەستی ئەو ئایەتانە یەکێك لەو جارانەیەو، ئەوەش کاری بەردەوامیان وابووە، لە (**دار النَّدوة**)دا دانیشتوون و نەخشەیان داناوە، خوا ﷻ دەفەرموێ: ئەگەر ئەوان نەخشە دادەنێن، لە دژی پێغەمبەری من و پەیامی من و قورئانی من، ئەوە ئێمەش نەخشەدانەرو پلان دانەرین لە دژیان.

﴿ أَمْ يَحْسَبُونَ أَنَّا لَا نَسْمَعُ سِرَّهُمْ وَنَجْوَىٰهُم ﴾، یان ئایا پێیان وایە، ئێمە قسەی پەنهانیان، ئەو قسەیەی کە لە دڵیاندا پەنهانی دەکەن و، سرکە سرك و چپە چپیان، لە بەینی خۆیان دا، نابیستین!، ﴿ بَلَىٰ ﴾، با، ئەوەش دەبیستین و ئاگامان لێیەتی، ﴿ وَرُسُلُنَا لَدَيْهِمْ يَكْتُبُونَ ﴾، سەرباره نوێنەرەکانیشمان، ڕەوانەکراوەکانیشمان (کە فریشتەکانن) لەلایانن و، دەنووسن و تۆمار دەکەن.

جارێکی دیکەش خوا ﷻ دێتە سەر باسی بەیەکگرتن و یەکتایی خۆی، هەم لە پەروەردگارێتییداو، هەم لە بەدیهێنەرایەتییداو، هەم لە خاوەندارێتیی داو، هەم لە پەرستراوێتییدا.

﴿ قُلْ إِن كَانَ لِلرَّحْمَٰنِ وَلَدٌ فَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْعَٰبِدِينَ ﴾، (ئەی محەممەد ﷺ!) بفەرموو: ئەگەر (خوای) بە بەزەیی ڕۆڵەی هەبێ، ئەوە من یەکەمینی خواپەرستانم، واتە: من یەکەمینی خواپەرستانم، ئەگەر ڕۆڵەی هەبێ دەبێ من بزانم و کە من نەزانم، کەواتە: نیەتی، ئەوە واتایەکی.

یاخود ئەگەر (خوای) بە بەزەیی ڕۆڵەی هەبوایە، من یەکەمین پەرستەرانم، یەکەمین کەس دەبووم ئەویشم دەپەرست، ئەگەر گریمان خوا ﷻ ڕۆڵەی هەبوایە، چونکە ئەویش هەر بەشێك دەبوو لە خوا ﷻ و دەبوو ئەویش

پەرستراباید، ئـەم ئایەتـە چەنـد مانایەکـی هـەن، بـەڵام ئـەو دوو مانایـە زیاتـر سـەرەکیین.

ئەمـەش هەمـووی وەك قسـەی نەرمکـردن و خاتـر گرتنـە لەگـەڵ بەرانبـەردا، کـە یەکسـەر لـە دەمـاری نـەدەی و بڵێـی: باشـە بـا بزانیـن، کـە ئێـوە دەڵێـن: خـوا ڕۆڵـەی هەیـە، ئەگـەر وابـێ مـن یەکەمینـی خواپەرسـتانم و دەبـێ بزانـم، یاخـود: مـن یەکـەم کەسـم دەیپەرسـتم، دەی فەرمـوون: بـا لێـی بکۆڵنـەوە، داخـۆ خـوا ﷻ دەگونجـێ ڕۆڵـەی هەبـێ؟!.

﴿ سُبْحَٰنَ رَبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ رَبِّ ٱلْعَرْشِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴾، دووره پەروەردگاری ئاسـمانەکان و زەوی و پـەروەردگاری عـەڕش، (ئـەو تەخـت و بارەگایـەی کـە تەنیـا خـۆی دەزانـێ چۆنـە؟)، لـەوەی ئـەوان خـوای پـێ وەسـف دەکـەن، لـەو وەسـفەی ئـەوان دەیڵێـن، خـوا ﷻ دووره لـەوە، پاکـە لـەو جـۆره وێناکردنـە، کـە ڕۆڵـەی هەبـێ و، وەچـەی هەبـێ و، هاوبەشـی هەبـێ.

﴿ فَذَرْهُمْ يَخُوضُوا۟ وَيَلْعَبُوا۟ ﴾، ئنجـا لێیـان گـەڕێ بـا تێبرژێـن و یاریـی بکـەن، واتـە: تێبرژێنـە نێـو قسـەی پـووچ و بـێ کەڵـك، بـا بەشـێوەیەك هەڵسـوکەوت بکـەن، کـە هەڵسـوکەوتەکەیان دەشـوبهێتە یاریـی منـداڵان، قسـەکەیان وەك ڕژانـە نێـو باتـڵاغ و چڵپاوێکـە، کـردەوەو هەڵسوکەوتەکانیشـیان، وەك یاریـی و گەمـەی منداڵانن، لێیـان گـەڕێ بـا سـەرگەرمی ئـەوە بـن، ﴿ حَتَّىٰ يُلَٰقُوا۟ يَوْمَهُمُ ٱلَّذِى يُوعَدُونَ ﴾، تاکـو ڕووبـەڕووی ئـەو ڕۆژەیـان دەبنـەوە، کـە بەڵێنیـان پێـدراوە، ئەمـەش هەڕەشـەیەکی گەورەیـە بۆیـان، واتـە: لێیـان گـەڕێ بـا سـەرگەرمی قسـەو ڕەفتـاری پـووچ و بێکەڵکی خۆیـان بـن، تاکـو گیـرۆدەی ئـەو ڕۆژە دەبـن، کـە بەڵێنیـان پێـدراوە.

﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى فِى ٱلسَّمَآءِ إِلَٰهٌ وَفِى ٱلْأَرْضِ إِلَٰهٌ وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْعَلِيمُ ﴾، ئەویـش (خـوا ﷻ) ئـەو کەسـەیە، کـە لەسـەرێ تەنیـا ئـەو پەرسـتراوەو، لەسـەر زەویـش بـەس ئـەو پەرسـتراوەو، هـەر ئـەو کاربەجێـی زانایـە، یـانی: هەرچـی کاربەجێیـی و

کارامەیی و لێزانیی هەیەو، هەرچی زانیاریی و شارەزایی هەیە، لە لای خوای پەروەردگارە، ﴿ وَتَبَارَكَ ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ﴾، بەرزو بە پێزەو، بەردەوامەو، خاوەن خێرو بەرەکەتە، ئەو کەسەی حوکمڕانیی ئاسمانەکان و زەوی هی ویە، هەروەها حوکمڕانیی، ئەوەی دەکەوێتە نێوان ئاسمانەکان و زەویشەوە، تەنیا هی خوایە، ﴿ وَعِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ ﴾، زانیاریی کاتەکە (**ساعة**)ش لە لای ئەوە، واتە: زانیاریی هەبوون بەو کاتە دیاریکراوەی کە ئاخیر زەمانی تێدا دێ، یاخود قیامەتی تێدا دێ، یان ڕۆژی دوایی بە هەردوو قۆناغەکەوە، تێیدا دێ، تەنیا لە لای ئەوە، ﴿ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴾، تەنیا بۆ لای ویش دەگێڕدرێنەوە.

﴿ وَلَا يَمْلِكُ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِهِ ٱلشَّفَٰعَةَ إِلَّا مَن شَهِدَ بِٱلْحَقِّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴾، ئەوانەش کە لە جیاتی وی، یان لەگەڵ وی، یان جگە لەوی لێیان دەپاڕێنەوە، هیچ کامیان تکا کردنیان بەدەست نیە، مەگەر ئەوانەیان کە شایەدیی بە هەقیان داوە، واتە: شایەدیی دەدەن بە یەکتایی خوا، لە بەدیهێنەرایەتیی و، پەروەردگارێتیی و، خاوەنداریێتیی و، پەرستراوێتییدا، شایەدیی بەو هەقە دەدەن و، دەشزانن، واتە: بە بەرچاوڕوونییەوە شایەدیی دەدەن، واتە: تەنیا ئەوانەیان کە ئەو شایەدییە بە هەقە دەدەن، تکا کردنیان بەدەستە، ئەوانەی لە جیاتی خواو، جگە لە خوا، لێیان دەپاڕێنەوە، تەنیا ئەوانەیان کە شایەدیی بە هەق دەدەن، تکا کردنیان بەدەستە، ئەوانیش فریشتەکانن و پێغەمبەرانن و دۆستانی خوان، ئەوانەن کە خەڵك بە نەزانیی لێیان دەپاڕێنەوەو دەیانپەرستن، ئەگەرنا ئەوانی دیکە، کە لە جیاتی خوا دەپەرسترێن، چ ژیانداربن، چ بێ ژیان بن، ئەوانە هیچیان تکا کردنیان بەدەست نیە، ئەوە واتایەکی.

یاخود: ئەوانەی کە لە جیاتی خوا لێیان دەپاڕێنەوە، هیچیان تکا کردنیان بەدەست نیە، مەگەر بۆ کەسێك کە شایەدیی بە هەق بدات، واتە: ئەوانەی لێیان دەپاڕێنەوە، کە فریشتەکان و پێغەمبەرانن، ئەوانە تەنیا تکا بۆ کەسێك

دەکەن، کە شایەدیی بە هەقی دابێ و، ئەهلی ئیمان و تەوحید بووبێ، هاوکات لە ڕووی زانیارییشەوە ئەو شایەدییە بە هەقەی دابێ.

﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ﴾، ئەگەر لێیان بپرسی: کێ دروستیکردوون؟ زۆر بە جەختکردنەوە دەڵێن: خوا ﷻ، ﴿ فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴾، کەواتە: بۆ کوێ لادەدرێن؟ [(**یؤفكون**) **یُقلَبون، یُصْرَفون**]، بۆ کوێ هەڵدەگێردرێنەوەو، بۆ کوێ لادەدرێن، یاخود: ﴿ فَأَنَّىٰ ﴾، واتە: (**فَكَیفَ**)، واتە: چۆن لادەدرێن و چۆن هەڵدەگێردرێنەوە، مادام خوا بەدیهێنەریانەو دان بەو ڕاستییەدا دێنن، ئەدی بۆچی جگە لە خوا دەپەرستن، مادام تەنیا خوا دروستیکردوون و، تەنیا خوا هەمەکارەی کەون و کائیناتە، کەواتە: هەر ئەویش شایستەی پەرستران و بەندایەتیی بۆ کرانە، کەوا بێ: بۆ کوێ لادەدرێن و چۆن لادەدرێن؟ لێرەدا کە بە بکەر نادیار (**مَجهولُ الفاعِل**)، هاتوە، یانی: ئەوانە، ویست و خواستی خۆیان لەدەست داوەو، ڕێشەمەی کارو باریان کەوتۆتە دەست کەسێکی دیکەو، بە ویستی خۆیان و، بە عەقڵی خۆیان و، بە ئازادیی خۆیان بە ڕێدا ناڕۆن و، بەمەلاو لادا دەبرێن.

﴿ وَقِيلِهِۦ يَـٰرَبِّ إِنَّ هَـٰٓؤُلَآءِ قَوْمٌ لَّا يُؤْمِنُونَ ﴾، ئەمە دەگێردرێتەوە بۆ سەر ئەو ڕستەیەی پێشێ، کە دەفەرموێ: ﴿ وَعِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴾، واتە: (**وَعِنْدَهُ عِلْمُ قِيْلِهِ**)، هەروەها خوا ﷻ زانیاریی فەرمایشتەکەیشی لە لایە؟ هی پێغەمبەر ﷺ، کە گوتی: ﴿ يَـٰرَبِّ إِنَّ هَـٰٓؤُلَآءِ قَوْمٌ لَّا يُؤْمِنُونَ ﴾، ئەی پەروەردگارم! ئەوانە کۆمەڵێکن بڕوا ناهێنن، واتە: سکاڵای کرد بۆ لای پەروەردگار، وەك لە سووڕەتی (**الفُرقان**)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ ٱلرَّسُولُ يَـٰرَبِّ إِنَّ قَوْمِى ٱتَّخَذُوا۟ هَـٰذَا ٱلْقُرْءَانَ مَهْجُورًا ﴿٣٠﴾ ﴾، پێغەمبەریش ﷺ گوتی: ئەی پەروەردگارم! خەڵکەکەم ئەو قورئانەیان واز لێهێناوەو، پشتیان تێکردوە، ئەمە سکاڵا کردنی پێغەمبەرە ﷺ لە دەست خەڵکە کەللەڕەق و خراپەکەی، سکاڵا دەکات بۆ لای خوا ﷻ، خوێنراویشتەوە: (**وَقِیْلَهُ**)، ئنجا ئەگەر (**قِیْلَهُ**) بێ، دەگێردرێتەوە بۆ سەر ڕستەیەکی

پێشـتر، ﴿ وَرُسُلُنَا لَدَيْهِمْ يَكْتُبُونَ ﴿٨٠﴾ ﴾، نێردراوەکانـی ئێمـە لەلایانـن دەنووسـن، هەمـوو کردەوەکانـی وان دەنووسـن، (وَقِيْلَهُ يَا رَبِّ)، ئـەو فەرمایشـتەی پێغەمبەریـش ﷺ دەنووسـن، کـە فەرمـووی: ئـەی پـەروەردگارم! ئەوانـە کۆمەڵێکـن بـڕوا ناهێنـن، واتـە: ئـەو سـکاڵایەی پێغەمبـەر ﷺ کـە بـۆ لای پـەروەردگاری کردوویەتی، ئەویشـیان نووسـیوە، یاخـود: (قِيْلَهُ)، بـەرکاری ڕەهـا (مَفعول مُطلَق)ە، (وَقالَ قَولَهُ)، پێغەمبـەر ﷺ قسـەی خـۆی کـرد، کـە گوتـی: ئـەی پـەروەردگارم! ئەمانـە کۆمەڵێکـن بـڕوا ناهێنـن، دواتـر لـە مەسـەلە گرنگەکانـدا، زیاتـر تیشـکی دەخەینـە سـەر: (قِيْلِهِ) و (قِيْلَهُ).

﴿ فَاصْفَحْ عَنْهُمْ وَقُلْ سَلَامٌ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴾، چاوپۆشـییان لێبکـەو پێیـان بڵـێ: سـەلام، لەمـەودوا دەزانـن، ﴿ فَاصْفَحْ عَنْهُمْ ﴾، واتـە: بـە جۆرێـك ڕوویـان لـێ وەربگێـڕە، وەك هـەر گوێبیسـتی قسـەکانیان نەبووبـی، ئەگەرنا بـەو واتایـە نیـە، کـە پێغەمبـەر ﷺ بیانبـوورێ، لـە کوفـرو شـیرك و تـاوان و خراپـە، چونکـە ئـەو کارە نـە بەدەسـت ئـەوەو، نـە لـەوەش دەیانبـوورێ، بەڵکـو یانـی: تـۆ لـە هەقـی تایبەتیـی خـۆت، کـە قسـەیەکی بـێ نەزاکـەت و شـێوازێکی نارێـك لەگـەڵ تـۆدا بەکاردێنـن، چاوپۆشـییان لـێ بکـە، یـان: وازیـان لـێ بێنـەو دوورییـان لـێ بگـرەو لاملیـان تێبکـە، ﴿ وَقُلْ سَلَامٌ ﴾، بڵـێ: سـەلام، بـۆ خـوا حافیزیـی و وازلێهێنـان و، دووریـی گرتـن و، نـەك سـەلام، بـە مانـای: سـەلام و ئاشـتییتان لەسـەر بـێ، ﴿ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴾، لـە مـەودوا دەزانـن، دەزانـن کـە چ کەتنێکـی خراپیـان کـردوە، دەزانـن کـە سـزایەکی بێـڕەزا چاوەڕێیـان دەکات، لـە ئەنجامـی ئـەو کوفـرو شـیرك و تـاوان و خراپەیانـدا.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**تاوانباران لە ئازاری دۆزەخدا دەمێننەوەو، لەسەریان سووك ناكرێ و، تێیدا بێ هیوا دەبن و، سووچی خۆشیانە، کە بەو دەردەچوون، کە لە مالیکی دۆزەخەوانیش دەپاڕێنەوە: با خوا بمانمرێنێ، پێیان دەڵێ: ئێوە تێیدا دەمێننەوە، چونکە خوا ﷻ هەقی بۆ هێنابوون، کەچی هەقتان دەدزاو، کەیفتان پێ نەدەهات، ئنجا ئەگەر ئەوان پیلانی مەحکەم بگێڕن، لە دژی پێغەمبەری خواو پەیامی خوا، خواش نەخشەی وردیان لە دژ دەکێشێ و، خەیاڵیشیان خاوە، کە پێیان وابێ خوا ﷻ ئاگاداری نهێنیی و چپەیان نیە، بگرە وێڕای ئەوە، فریشتە نێرراوەکانیشی هەموو شتێك تۆمار دەکەن:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلْمُجْرِمِينَ فِى عَذَابِ جَهَنَّمَ خَٰلِدُونَ ﴿٧٤﴾ لَا يُفَتَّرُ عَنْهُمْ وَهُمْ فِيهِ مُبْلِسُونَ ﴿٧٥﴾ وَمَا ظَلَمْنَٰهُمْ وَلَٰكِن كَانُوا۟ هُمُ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٧٦﴾ وَنَادَوْا۟ يَٰمَٰلِكُ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَ ۖ قَالَ إِنَّكُم مَّٰكِثُونَ ﴿٧٧﴾ لَقَدْ جِئْنَٰكُم بِٱلْحَقِّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَكُمْ لِلْحَقِّ كَٰرِهُونَ ﴿٧٨﴾ أَمْ أَبْرَمُوٓا۟ أَمْرًا فَإِنَّا مُبْرِمُونَ ﴿٧٩﴾ أَمْ يَحْسَبُونَ أَنَّا لَا نَسْمَعُ سِرَّهُمْ وَنَجْوَىٰهُم ۚ بَلَىٰ وَرُسُلُنَا لَدَيْهِمْ يَكْتُبُونَ ﴿٨٠﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە یازدە بڕگەدا:

١)- ﴿إِنَّ ٱلْمُجْرِمِينَ فِى عَذَابِ جَهَنَّمَ خَٰلِدُونَ﴾، بێگومان تاوانباران لە ئازاری دۆزەخدا، بە هەمیشەیی دەمێننەوە، (المُجْرِمُون: الفَاعِلُونَ لِلإِجْرَام، وَهُوَ الذَّنْبُ العَظِيم، وَالمُرَادُ: المُشْرِكُونَ الكَافِرون)، (المُجرِم)، لەسەر کێشی (مُفعِل)، ناوی بکەر (إسم فاعِل)ە، بە

مانای کەسێك کە (جُرْم) تاوان ئەنجام دەدات، (إجرام) و (جُرم) و (جريمة)ش بریتیە لە گوناهێکی مەزن، کە لێرەدا مەبەست پێی تاوانی هاوبەش بۆ خوا دانەرە بێبڕوایەکانە، بەڵام بۆیە خوا ﷻ بە وشەی (مُجرِم) ناویان دێنێ، تاکو بزانرێ کە ئەوانە وێڕای هاوبەش بۆ خوادانان و بێبڕوایی، تاوانباریش بوون، یاخود هەر خودی هاوبەش بۆ خوا دانان و بێبڕواییەکەیان، وێڕای ئەوەی هاوبەش بۆ خوا دانانەو بێبڕواییە، تاوانێکی گەورەشە.

هەڵبەتـە هــەر کەســێکیش بەینــی لەگــەڵ خــوا تێــك چــوو، بەینــی لەگــەڵ بەندەکانــی خواشــدا تــەواو نابــێ، بۆیــە هــەر کەســێك ئەهلــی کوفــرو شــیرك بــێ، مســۆگەر ئەهلــی ســتەم و تــاوان و خراپــەش دەبــێ.

٢)- ﴿ لَا يُفَتَّرُ عَنْهُمْ وَهُمْ فِيهِ مُبْلِسُونَ ﴾، لەسەریان سووك ناکرێ (لەسەریان خاو ناکرێتەوە) و، ئەوان تێیدا نائومێدو بێ هیوا دەبن، (فَتَرَ أي: سَكَنَ، وَضَعُفَ وَخَفَّ)، واتە: ڕاوەستاو، بێهێز بوو و، سووك بوو، وشەی: (فَتَرَ)، (لازِم)ەو (فَتَّرَ) (مُتَّعَدي)ە، (فَتَّرَ) واتە: لەسەری سووك کرد، کەواتە: (لا يُفَتَّرُ عَنْهُم أي: لاَ يُفَتِّرُهُ أَحَدٌ عَنْهُم، بَل يَسْتَمِرُّ العَذَابُ عَلَيْهِم بِشِدَّة)، هیچکەس ئەو سزایەیان لەسەر سووك ناکات و لەسەریان خاو ناکاتەوە، بەڵکو بەردەوام دەبێ، بگرە لە سوورەتی (النَّبأ)دا خوای باڵا دەست دەفەرموێ: ﴿ فَذُوقُواْ فَلَن نَّزِيدَكُمْ إِلَّا عَذَابًا ﴿٣٠﴾ ﴾، بیچێژن بەس سزاتان بۆ زیاد دەکەین، هەروەها لە سوورەتی (النِّساء) دا، دەفەرموێ: ﴿ كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُم بَدَّلْنَٰهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا لِيَذُوقُواْ ٱلْعَذَابَ ﴿٥٦﴾ ﴾، هەر کاتێك پێستەکانیان کوڵان و برژان، پێستی دیکەیان بۆ تازە دەکەینەوە، تاکو سزای زیاتر بچێژن، چونکە دەمارە هەستەوەرەکان زیاتر لە پێست دان.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَهُمْ فِيهِ مُبْلِسُونَ ﴾، دەگوتـرێ: (أَبْلَسَ، يُبْلِسُ، فَهُوَ مُبْلِسٌ أي: يَئِسَ، وَسُـمِّيَ إِبْلِيـسُ إِبْلِيْسَـاً لِيَأْسِـهِ مِـنْ رَحْمَـةِ اللـه)، ﴿ وَهُمْ فِيهِ مُبْلِسُونَ ﴾، ئـەوان لەوێـدا بـێ هیـوان و، تەمـا بـڕاون، هیـچ ئومێدێکیـان نەمـاوە، وشـەی (أَبْلَسَ)، واتـە: (يَئِس) نائومێـد بـوو، (إبْلِيس)یـش بۆیـە ئـەو نـاوەی لێنراوە، چونکـە لـە بەزەیـی خوا نائومێـد بـووەو هیـچ هیـوای پێـی نەمـاوە.

ئنجا لێرەدا ڕەنگە پرسیارێك بكرێ، ئەوانە بۆچی وایان لێهاتوە؟ ئایا ئەوە ستەم نیە لێیان دەكرێ؟ خواش ﷻ بۆ لابردنی ئەو گومان و خەیاڵە پووچە، دەفەرموێ:

٣)- ﴿ وَمَا ظَلَمْنَاهُمْ وَلَٰكِن كَانُوا هُمُ الظَّالِمِينَ ﴾، ئێمە ستەممان لێ نەكردبوون، ((كە ئاوا سزایان دەدەین)، بەڵكو ئەوان خۆیان ستەمكار بوون، (**الظُّلْمُ: الإِعْتِدَاءُ، وَهُوَ الإِصَابَةُ بِضُرٍّ بِغَيْرِ مُوجِبٍ مَشْرُوعٍ**)، (**ظُلْم**): بریتیە لە دەستدرێژیی و، لەوەی كەسێك تووشی زیان بكەی، بەبێ پێویستكەرێكی ڕەوا، بەڵام ئەوان خۆیان ستەمیان لە خۆیان كردوە، كە ئەو حیكمەتەی خوا ئەوانی بۆ دروستكردوە، نەیانهێنایە دی و سەریان بەرز نەكردەوە، كە خواو خاوەنی خۆیان بناسن، بزانن خوا ﷻ بۆچی لێرەی داناون، لەسەر ئەم زەوییەو پێویستە چی بكەن و چۆن بژین؟ ئەوەش ستەمێكی زلە كە تۆ لە خۆت نەپرسی، لە خاوەنەكەت نەپرسی و سەرنجی دەوروبەرت نەدەی، بۆچی لێرەی و دەبێ چی بكەی؟ ستەمە مرۆڤ خۆی وەك ئاژەڵ تەماشا بكات، لە حاڵێكدا كە لە ئاژەڵ جیایە!

٤)- ﴿ وَنَادَوْا يَا مَالِكُ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَ ﴾، بانگیان كرد: ئەی مالیك! با پەروەردگارت تەواومان بكات، واتە: با پەروەردگارت كۆتاییمان پێ بێنێ و، بمانمرێنێ، مالیك ناوی ئەو فریشتەیە، كە بەسەر دۆزەخ ڕادەگات و سەرپەرشتیی دۆزەخ هەمووی دەكات، وەك لە سوورەتی (**المُدَّثِر**)یشدا دەفەرموێ: ﴿ عَلَيْهَا تِسْعَةَ عَشَرَ (٣٠) ﴾، ئنجا مالیك، نۆزدە فریشتەی دیكەی لەبەردەست دان، كە بە تەئكید ئەوانیش فریشتەی دیكەی زۆریان لەبەردەست دان، ﴿ وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ (٣١) ﴾، خوا ﷻ هەر لەو سیاقەدا، لە سوورەتی (**المُدَّثِر**)دا دەفەرموێ: سەربازەكانی پەروەردگارت، بەس خۆی دەزانێ چەندن، بەڵام مالیك سەرپەرشتیاری گشتیی دۆزەخەو، نۆزدە فریشتەشی لەبەر دەست دان، ئنجا كە ئەوانیش لەبەردەستی ئەودان، ئەوانیش تەنیا خوا ﷻ دەزانێ چەند فریشتەیان لەبەر دەستدان، بۆ سەرپەرشتییكردن و هەڵسووڕاندنی كاروباری دۆزەخ و دۆزەخییەكان!!

٥)- ﴿ قَالَ إِنَّكُم مَّاكِثُونَ ﴾، گوتی: ئێوە ماوەوەن، كە دۆزەخییەكان دەڵێن: ئەی مالیك! با پەروەردگارت تەواومان بكات، كۆتاییمان پێ بێنێ و، بمانمرێنێ، ﴿ لِيَقْضِ عَلَيْنَا

رَبُّكَ ﴾، (لِيَقْضِ) ئەم وشەیە لە سووڕەتی: (القَصَص)دا، خوا ﷻ بۆ مراندنی بەکارهێناوە، کە دەفەرموێ: ﴿ فَوَكَزَهُۥ مُوسَىٰ فَقَضَىٰ عَلَيْهِ ﴿١٥﴾ ﴾، واتە: مووسا ﷺ مستێکی لێدا (لە کابرای قیبتی)و تەواوی کرد، واتە: کۆتایی بە ژیانی هێنا.

مالیـك وەڵام دەداتــەوە: ﴿ قَالَ إِنَّكُم مَّٰكِثُونَ ﴾، گوتــی: ئێــوە دەمێننــەوە، (**ماكِـث**) نـاوی بکـەر (**إسـم فاعِـل**)ە، واتـە: مـاوە، ئێـوە مـاوەوەن، لـە (**مَكْـث**)ەوە هاتــوە، (**المَكْـثُ: البَقَـاءُ مَـعَ انْتِظـارٍ**)، (**مَكـث وَمُكـث**) هەردووکیـان واتــە: مانــەوە لەگــەڵ چاوەڕوانییــدا.

٦)- ﴿ لَقَدْ جِئْنَٰكُم بِٱلْحَقِّ ﴾، بە دڵنیایی هەقمان بۆ هێنا بوون، ئەمە یان قسەی فریشتەکانە، کە وەحییان هێناوە، پەیامی خوایان هێناوە بۆ پێغەمبەران، ئەوانیش بە مرۆڤەکانیان ڕاگەیاندوە، یان فەرمایشتی خوایە ڕاستەوخۆ: ئێمە هەقمان بۆ هێنابوون، ئەو هەقەش بریتی بوو لە خوا بە یەکگرتن، بریتی بوو لەوە کە مرۆڤ بۆ تاقیکردنەوە دروستکراوەو، مرۆڤ ژیانی هەتا هەتایی چاوەڕێی دەکات لە ڕۆژی دواییدا، کە ئەو ژیانە هەتا هەتاییە بنیات دەنرێ، لەسەر ئەوەی ئەو ژیانە دنیاییەی چۆن گوزەراندوە؟!.

٧)- ﴿ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَكُمْ لِلْحَقِّ كَٰرِهُونَ ﴾، بەڵام زۆربەتان هەقتان دەدزا، وشەی کەڕهاندنیش بەکاردێ، دەڵێن: دەیکەڕهێنێ، بە کوردیی دەڵێن: دەیدزێ، واتە: ڕقی لێی دەبێتەوەو، کەیفی پێی نایەت، دانووی لەگەڵ ناکوڵێ، بۆچی دەفەرموێ: ﴿ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَكُمْ لِلْحَقِّ كَٰرِهُونَ ﴾، بەڵام زۆربەتان هەقتان دەدزاو، کەیفتان پێ نەدەهات؟

وەڵامەکـەی: ئەوانـەی ڕقیـان لـە هەق بـووە، حوکمڕانـە خۆبەزلگرو خۆسـەپێنەکان بـوون، چونکـە ئـەو هەقـە لەگـەڵ بەرژەوەندیـی ناشـەرعیی و نـاڕەوای ئەوانـدا تێکگیـراوە، بـەڵام زۆرینەیەکـی شـوێنکەوتووی هەڵخەڵەتـاو هەبـوون، ڕەنگـە هەقیان هـەر نەناسـیبێ، یاخـود ڕقیـان لـە هـەق نەبۆتـەوەو هەقیـان نـەدزاوە، چونکـە لەگەڵ هیـچ بەرژەوەندییەکیانـدا تێـك نەگیـراوە، بەڵکـو ڕەنگـە لـە دڵـەوە، ئـەو هەقەیـان زۆریـش خۆشویسـتبێ، نـەك هـەر نەیاندزابـێ و، ڕقیـان لێـی نەبـوو بـێ، بـەڵام لەبـەر

ئـەوەی لەلایـەن دەسـەڵاتدارەکانەوە، لەسـەریان بـە مـەرج گیـرا بـوو، کـە دەبـێ شـوێنکەوتوویان بـن و، سـەر بـەرەو لای خـوا بـەرز نەکەنـەوەو، تەماشـای پەیامـی خـوا نەکـەن، بەڵکـو دەبـێ کۆیلـەی ئـەوان بـن، بۆیـە گوێیـان نـەدەدا ئـەو هەقـە، هەرچەنـدە بـە هەقیشـیان دەزانـی، کـە ئێسـتاش هـەر وایـە، ئەوانـەی شـوێن حیزبـە عەلمانییـەکان دەکـەون و، ملکـەچ دەکـەن بـۆ ڕژێمـە سـتەمکارە خۆسـەپێنەکان، دەزانـن هـەق چۆنـەو ناهـەق چۆنـەو، دانیشی پێـدا دێنـن، دێ بـۆ لات دەڵـێ: بڵێـم چـی، ژیانـم وا دەسـووڕێ، واتـە: ژیانەکـەی ئێـرەی پـێ گرنگـترە لـە ژیانەکـەی ئـەولا و، ڕازییکردنـی ئـەو کەسـەی کردوویەتـی بـە کۆیلـەو ژێـر دەسـت، پێـی گرنگـترە، لـە ڕازییکردنـی خـوا!!.

ئـەوە (**ولكـن أكثركـم للحـق كارهـون**) لێـرەدا ئیشـکالێك دروسـت دەکات، ئەویـش ئەوەیـە کـە: هەمیشـە ئەوانـەی خۆسـەپێن و، خۆشـگوزەران و خـۆ فەڕزکـەرن بەسـەر خەڵـك و جەمـاوەردا، کەمینـەن و، خەڵـك و جەمـاوەرە هەڵخەڵەتـاوو شـوێنکەوتووەکەیان زۆرینەیـە!!، بـەڵام دەگونجـێ مەبەسـت ئـەوە بـێ، زۆربـەی خەڵکـە فریـو خواردووەکـەش، چونکـە شـوێنکەوتووی کەمینـە سـتەمکارەکە بـوون، هەمـان حوکمـی وانیـان هەبـووە.

٨)- ﴿ أَمۡ أَبۡرَمُوٓاْ أَمۡرٗا ﴾، یان ئایا ئەوان بڕیارێکیان داوە؟ یاخود ئەوان پیلانێکیان گێڕاوەو تەگبیرێکیان کردوە؟ وشەی: (**أم: لِلإِضْرَابِ الإنْتِقَالِي مِنْ حَدِيثٍ إلى حَدِيث**)، {(**أم**) **بمعنى** (**بل أ**): (**بَل أَأَبْرَموا أَمْراً**)}، واتە: بەڵکو ئایا ئەوان تەگبیرێکیان کردوە، چونکە (**أم**) بۆ گواستنەوەیە لە قسەیەکەوە بۆ قسەیەکی دیکە، کە دیارە پرسیارکردنەکە، پرسیارکردنی ترساندن و هەڕەشەلێکردنە، نەك پرسیارکردنی نکووڵیلێکردن، واتە: هەم هەڕەشە لێکردنە، هەم چەسپاندنی ئەو کارەیە کە ئەوان کردوویانە.

٩)- ﴿ فَإِنَّا مُبۡرِمُونَ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە، بڕیاردەرو نەخشەدانەرین، (**إبرام**) لە ئەسڵدا بە مانای هۆنینەوەی پەتێك و چنینی دێت، ئەگەر بە مەحکەمیی بچنرێ، بەڵام لێرەدا خوازراوەتەوە، بۆ دانانی نەخشەیەکی پتەوو دڵ لەسەر چەسپاندن جێبەجێکردنی.

١٠)- ﴿ أَمْ يَحْسَبُونَ أَنَّا لَا نَسْمَعُ سِرَّهُمْ وَنَجْوَاهُم ﴾، یان ئایا پێیان وایە ئێمە پەنهان و چپەیان نازانین، (**السِّرُّ: مَا يُخْفُونَهُ فِي أَنْفُسِهِم، وَالنَّجْوَى: مَا يَتَنَاجَوْنَ بِهِ فِيمَا بَيْنَهُم**)، (**سِرّ**): ئەوەیە کە لە دڵی خۆیاندا پەنهانیان کردوە، (**نجوی**)ش ئەو چپە چپ و فسکە فسکەیە، کە لەبەینی خۆیان دا کردوویانە، کوردەواریی دەڵێن: چپەی کرد، سرکە سرکی کرد، فسکە فسکی کرد.

١١)- ﴿ بَلَىٰ وَرُسُلُنَا لَدَيْهِمْ يَكْتُبُونَ ﴾، با، (هەم پەنهانیان دەزانین و هەم قسەی چپەیان دەزانین و)، نێردراوەکانیشمان لەلایانن دەنووسن، هەرچی دەیکەن و دەیڵێن دەینووسن، بەڵکو نیەت و ئیرادەکانیشیان دەنووسن، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە: {**عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: إِذَا هَمَّ عَبْدِي بِحَسَنَةٍ، وَلَمْ يَعْمَلْهَا، كَتَبْتُهَا لَهُ حَسَنَةً، فَإِنْ عَمِلَهَا كَتَبْتُهَا عَشْرَ حَسَنَاتٍ إِلَى سَبْعِ مِائَةِ ضِعْفٍ، وَإِذَا هَمَّ بِسَيِّئَةٍ، وَلَمْ يَعْمَلْهَا لَمْ أَكْتُبْهَا عَلَيْهِ، فَإِنْ عَمِلَهَا كَتَبْتُهَا سَيِّئَةً وَاحِدَةً»**} (**أخرجه مسلم**: ٣٤٩).

واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خوا (**عَزَّ وَجَلَّ**) فەرموویەتی: بەندەکەم ئەگەر نیەتی چاکەیەکی هێناو بۆی نەکرا، (نەك لێی پەشێمان بێتەوە)، چاکەیەکی بۆ دەنووسم، بێگومان ئەگەر کردی بە دە (١٠) چاکە بۆی دەنووسم، تاکو حەوتسەد (٧٠٠)، ئەگەر نیەتی خراپەیەکیشی هاتە دڵ و نەیکرد، لەسەری نانووسم و، ئەگەر کردی خراپەیەك دەنووسم.

بێگومان کە دەفەرموێ: ﴿ وَرُسُلُنَا لَدَيْهِمْ يَكْتُبُونَ ﴾، مەبەست لە فریشتەکانە، کە دەنێررێن و نێرراون، تاکو کردەوەی مرۆڤەکان بنووسن و ئاگایان لێ بێت و تۆماری بکەن، وەك لە سووڕەتی (ق)دا دەفەرموێ: ﴿ مَّا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ ﴿١٨﴾ ﴾، واتە: هیچ قسەیەك نابێژێ، مەگەر چاودێرێکی ئامادە لەلایەتی، ئنجا ئایا نووسینی فریشتەکان، نووسینی ڕاستەقینەیە، یاخود مەجازە، بۆ سەرژمێرو پاراستنی؟ ئەوە بەس خوای پەروەردگار دەیزانێ، بەڵام ئەگەر

مـرۆڤ بتوانـێ، بـە دەنـگ و وێنـەوە شـت تۆمـار بـكات، بـە تەئكیـد فریشـتەكانی خـوا، كـە خـوا ﷻ بـە تایبـەت بۆ ئـەوەی دانـاون، ئامێـرو هـۆكاری زۆر پێشـكەوتووتر، كـە كـردەوەی مرۆڤـەكان و هەڵسـوكەوتیان و قسـەكانیان، بەڵكـو نیـەت و نیـازو مەبەستیشـیان تۆمـار بـكات، بـە دەسـتیانەوەیەو بـەكاری دێنـن.

لێرەدا دوو شوێنەوار دێنین:

**أ- (رُوِيَ أَنَّ ابْنَ مَسْعُودٍ قَرَأَ (وَنَادَوا يَا مَالُ) بِحَذْفِ الكَافِ عَلَى التَّرْخِيمِ، فَذُكِرَت قِراءتُهُ لابْنِ عَبَّاسٍ فَقَالَ: مَا كَانَ أَشْغَلَ أَهْلُ النَّارِ عَن التَّرْخِيمِ)**، واتە: گێڕدراوەتەوە كە عەبدوڵڵای كوڕی مەسعوود وشەی **(وَنَادَوا يَا مَالِك)**ی، خوێندۆتەوە بە: **(وَنَادَوا يَا مَالُ)**، كە ئەمە لە زمانی عەرەبییدا بنچینەیەكە پێی دەگوترێ: **(ترخيم)**، ئەویش ئەوەیە كە پیتی دوای وشەكە لابردرێ، بڵێی: **(يا مالُ)**، لە جیاتی بڵێی: **(يا مالِكُ)**، ئەو خوێندنەوەیە بۆ عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) باسكراوە، ئەویش گوتوویەتی: خەڵكی دۆزەخ زۆر لەوە سەرقاڵترن ئاگایان لە **(ترخيم)** بێ!

كە ئەوە بنچینەیەكی ڕەوانبێژییە، نایانپەڕژێ بیر لەو وردە شتانە بكەنەوە!

كـە دەفەرمـوێ: ﴿ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَ ﴾، **(القَضَـاءُ: الإمَاتَـةُ)**، تـەواو كـردن، كۆتایـی پێهێنـان، بـەلام (ل)ی سـەر: ﴿ لِيَقْضِ ﴾، **(لامُ الأَمْـرِ بِمَعْنَـى الدُّعَاء)**، لامەكە بـۆ فەرمانە، بـەڵام بـە تەئكیـد بـە مانـای پاڕانەوەیـە، ئەگەرنـا فەرمـان بەسـەرچیدا دەكات؟!.

**ب-** لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا كە دەفەرموێ: ﴿ أَمْ أَبْرَمُوٓاْ أَمْرًا فَإِنَّا مُبْرِمُونَ ﴾، **(القُرطبي)** لە تەفسیرەكەی خۆی دا[١] ئەم دەقە دێنێ: **(قالَ مُقَاتِل: نَزَلَتْ فِي تَدْبِيرِهِم المَكرَ بِالنَّبِيّ ﷺ فِي دَارِ النَّدْوَةِ حِيْنَ اسْتَقَرَّ أَمْرُهُمْ عَلَى مَا أَشَارَ بِهِ أَبُو جَهْلٍ عَلَيْهِم، أَنْ يَبْرُزَ مِنْ كُلِّ قَبِيْلَةٍ رَجُلٌ لَيَشْتَرِكُوافِي قَتْلِهِ، فَتَضْعُفَ المُطَالَبَةُ بِدَمِهِ، فَنَزَلَت هَذِهِ الآيَةُ، وقَـتَلَ الله جَمِيعُهُم فـي بَدرٍ)**.

---

(١) الجامع لأحكام القرآن: ج١٦، ص:٩٣.

واتـە: موقاتیـل (کـە یەکێکـە لـە زانایـان شـوێنکەوتووان دوای هـاوەڵان)، گوتوویەتی: ئـەم ئایەتـە لـە بـارەی نەخشـە دانانیانـە لـە دژی پێغەمبـەر ﷺ لـە (دار النّدوة)دا، کاتێك ڕایـان لەسـەر ئـەوە چەسـپا، کـە ئەبـوو جەهـل ئامـاژەی پێکـرد بـوو، ئەویـش ئـەوە بـوو لـە هـەر هۆزێـك، پیاوێـك بـێ، تاکـو هەموویـان لـە کوشـتنی پێغەمبـەردا ﷺ بەشـدار بـن، دوایـی داواکردنـی خزمەکانـی بـە خوێنـی پێغەمبـەر ﷺ بێهێـز بـێ و، شـەڕیان لەگـەڵ ئـەو هۆزانـەدا پـێ نەکـرێ، ئـەم ئایەتـە لـەو بـارەوە هاتۆتـە خـوارەوەو، خـواش هەمـوو ئەوانـەی لـە جەنگـی بـەدردا فەوتانـد.

ئـەو وای گوتـوە، بـەڵام مـن پێـم وایـە: هاتنـە خـواری ئـەم ئایەتانـەو، ئـەم سـوورەتە زووتـر بـووە، لـەو نەخشـەو پیلانـەی، کـە لـە کۆتایـی قۆناغـی مەککـەدا، واتـە: سـاڵی سێزدەیەمی پێغەمبەرایەتیـی دا، هـۆزی قورەیـشی بێیـڕوا کێشـاویانە لـە دژی پێغەمبـەر ﷺ، بەڵام بێگومـان ئـەوان، بـەس بـۆ ئـەو کارە تەگبیریـان نەکـردوەو نەخشـەیان نەکێشـاوە، هەمیشـە خەریکـی نەخشـە کێشـان و کۆبوونـەوە بـوون، لـەو کـۆڕو مەجلیسـەی خۆیانـدا، لـە دژی پێغەمبـەر ﷺو چۆنیەتیـی بەرهەڵسـتییکردنی پەیامەکـەی.

### مەسەلەی دووەم:

**فەرمانکردنی خوا بە پێغەمبەرەکەی، کە بفەرموێ: ئەگەر (خوای) بەبەزەیی ڕۆڵەی هەبێ، من یەکەمینی پەرستەران دەبم بۆی! بەڵام پاکیی بۆ پەروەردگاری گەردوون، لەوەی خوای پێ وەسف دەکەن، دواییش خوا ﷻ فەرمان دەکات بە پێغەمبەر ﷺ، کە لێیان گەڕێ، لەسەر تێڕژانی قسەی پووچ و گەمە بەردەوام بن، هەتا دەگەنە ڕۆژی دیداریان:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ قُلْ إِن كَانَ لِلرَّحْمَٰنِ وَلَدٌ فَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْعَٰبِدِينَ ﴿٨١﴾ سُبْحَٰنَ رَبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ رَبِّ ٱلْعَرْشِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٨٢﴾ فَذَرْهُمْ يَخُوضُوا۟ وَيَلْعَبُوا۟ حَتَّىٰ يُلَٰقُوا۟ يَوْمَهُمُ ٱلَّذِى يُوعَدُونَ ﴿٨٣﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ قُلْ إِن كَانَ لِلرَّحْمَٰنِ وَلَدٌ ﴾، بڵێ: ئەگەر (خوای) بە بەزەیی ڕۆڵەی هەبێ.

(وَلَدٌ) خوێندراویشەتەوە: (وُلْدٌ).

٢)- ﴿ فَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْعَٰبِدِينَ ﴾، من یەکەمینی پەرستەرانم، زانایان چەند واتایەکیان بۆ لێکداونەوە:

١- گریمان خوا ﷻ ڕۆڵەی هەبێ، من یەکەمینی ئەو کەسانە دەبم، کە ئەو ڕۆڵەیەی خوا دەپەرستن، چونکە مادام ڕۆڵەی خوا بێ، گریمان ڕاست بێ، ڕۆڵەی خوا بێ، شایستەی ئەوەیە، وەك خوا ﷻ بپەرسترێ.

٢- ﴿ قُلْ إِن كَانَ لِلرَّحْمَٰنِ وَلَدٌ ﴾، (إِنْ) لابەرە (النَّافِية)یە، واتە: (مَا كَانَ لِلرَّحمنِ وَلَدٌ)، (خوای) بە بەزەیی هیچ ڕۆڵەی نیە.

٣- ﴿ قُلْ إِن كَانَ لِلرَّحْمَٰنِ وَلَدٌ ﴾، (إن كانَ لِلرَّحمنِ وَلَدٌ، فَأنا أوَّلُ العابِدينَ لِلرَّحمنِ، سَوَاءٌ كَانَ لَهُ وَلَدٌ أَمْ لاَ، وَهَذَا إِرْخَاءٌ لِلعِنان، أي: أُنَزِّهُ اللهَ عَنِ الشَّريك)، ئەگەر (خوای) بە بەزەیی

ڕۆڵەی هەبێ، وەك ئێوە ئیددیعای دەكەن، من یەكەمین كەسم كە بەندایەتیی بۆ خوا دەكەم، ڕۆڵەی هەبێ یان نەیبێ، ئەمەش جۆرێكە لە بە دەمەوەدانی بەرانبەرەكەت، كە یەكسەر لە دەماری نەدەی و بڵێی: باشە وەرن با لێی بكۆڵینەوە، داخۆ دەگونجێ خوا ڕۆڵەی هەبێ؟!

٤- ئەگەر (خوای) بە بەزەیی ڕۆڵەی هەبێ، من یەكەمین كەسم، كە قسەكەی ئێوە بە درۆ دادەنێم و، خوا بە تاك دەگرم و هەر كەسێك بە ڕاستیی خوا بپەرستێ، ڕۆڵەو وەچەی پاڵ ناداتە لا، چونكە خوا ﷻ: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۝١١﴾ الشورى.

هەڵبەتە ئەوەی كە لە هەموو مانایەكان بەهێزترە، یەكەمیانە، دواییش هی چوارەمیان، بەڵام ئەوە كە (إِنْ) لێرەدا (**الشَّرْطِية**) نەبێت و (**النافية**) بێ، واتە: (**مَا كَانَ لِلرَّحمنِ وَلَدٌ**)، ئەمە وەك زانایان گوتوویانە: لە شوێنی دیكەدا هاتووە، لەم سیاقەدا ئەو مانایە سوودێكی وا بە دەستەوە نادات.

زانایان گوتوویانە: كاتی خۆی حەججاجی كوڕی یوسووفی سەقەفیی، سەعیدی كوڕی جوبەیری گرتوە، خوا ﷻ لە سەعیدی كوڕی جوبەیر ڕازی بێ و لێی خۆش بێ، زانایەكی زۆر گەورە بووە، حەججاج بە زوڵم كوشتوویەتی، گوتوویانە: (**هَذَا التَّعْبِير مِثْلُ قَوْل سَعِيد بِن جُبير لِحجَّاج عِنْدَمَا قَالَ لَهُ: وَاللهِ لأُبَدِّلَنَّكَ بِالدُّنيَا نَاراً تَلَظَّى، قال سعيد: لَوْ عَرَفْتُ أَنَّ ذَلِكَ إِلَيْكَ مَا عَبَدْتُ إِلَهاً غَيرك**)، ئەمە لە زۆر لە تەفسیرەكان دا هاتوە، بۆ نموونە لە تەفسیری (**البَحرُ المَديد في تَفسير كِتابِ اللهِ المَجيد**)دا[1]، (**إبن عَجيبة**)، دەڵێ:

ئەم تەعبیرە وەك قسەی سەعیدی كوڕی جوبەیرە، كە حەججاج گرتی و پێیگوت، ژیانی دنیات بۆ دەگۆڕم بە ئاگرێكی بڵێسەدار، سەعیدیش گوتی: ئەگەر زانیبام ئەوە بەدەست تۆیە، بێجگە لە تۆ هیچ پەرستراوێكم نەدەپەرست، واتە: ئەوە بەدەست تۆ نیە، داخۆ من دوای ئەوەی دەمكوژی و دەمرم، دەچمە كوێ؟!

---

(١) ج٧، ص٣٧.

هەڵبەتە حیکمەتی ئەو تەعبیرە ئەوەیە، وا لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان بکات گوێ بگرن، بە هۆی ئەوەوە کە ئومێدیان وەبەردەنێ، لەگەڵیدا بگەنە ئەنجامێك، بەڵام ئەگەر هەر لە ڕێوە، لە دەماریان بدات، بێگومان گوێی بۆ ناگرن، دەتوانین بڵێین: ئەو تەعبیرە وەك ئەو ئایەتانەی سووڕەتی: (سَبأ) وایە، کە خوا دەفەرموێ: ﴿قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ قُلِ ٱللَّهُ ۖ وَإِنَّآ أَوْ إِيَّاكُمْ لَعَلَىٰ هُدًى أَوْ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٢٤﴾ قُل لَّا تُسْـَٔلُونَ عَمَّآ أَجْرَمْنَا وَلَا نُسْـَٔلُ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٢٥﴾ قُلْ يَجْمَعُ بَيْنَنَا رَبُّنَا ثُمَّ يَفْتَحُ بَيْنَنَا بِٱلْحَقِّ وَهُوَ ٱلْفَتَّاحُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٢٦﴾﴾، کە ئەمە لە زمانی عەرەبییدا پێی دەگوترێ: (**إِرْخَاءُ العِنَانِ لِلْخَصْمِ**)، بواردان بە دەمەقاڵێکەرو جڵەو شلکردن بۆ بەرانبەرەکەت، تاکو ئامادەبێ قسەت لەگەڵ بکات.

٣)- ﴿سُبْحَٰنَ رَبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ رَبِّ ٱلْعَرْشِ عَمَّا يَصِفُونَ﴾، پاکیی بۆ پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی، پەروەردگاری عەرش، لەوەی ئەوان پەروەردگاری پێ وەسف دەکەن،

ئەمە هەندێکیان ئاوایان مانا کردوە: (**أُسَبِّحُ اللهَ عَمَّا يَقُولُونَ وَيَصِفُونَ بِهِ اللهَ**)، خوا بە پاك دەگرم لەوەی ئەوان دەیڵێن و خوای پێ وەسف دەکەن.

٤)- ﴿فَذَرْهُمْ يَخُوضُوا۟ وَيَلْعَبُوا۟﴾، لێیان گەڕێ با تێبڕژێن و، یاریی و گەمە بکەن، یانی: با هەر بڕژێنە نێو قسەی پووچ و بە تاڵەوە، قسەی وا بکەن کە لە گەمەو یارییەوە نیزیکەو، زیاتر لە گەمەو یاریی دەچێت، تاکو قسەی هەق و ڕاست.

٥)- ﴿حَتَّىٰ يُلَٰقُوا۟ يَوْمَهُمُ ٱلَّذِى يُوعَدُونَ﴾، تاکو دەگەنە ئەو ڕۆژە، کە بەڵێنیان پێدراوە، ﴿حَتَّىٰ يُلَٰقُوا۟﴾، خوێندراویشەتەوە: (**حَتَّى يَلْقَوا**)، هەتاکو دەگەن، ئەگەر بڵێن: (**يُلَقُوا**) لەسەر کێشی (**مُفاعَلة**)یەو، بۆ بەشدارییکردن (**مَشارَکة**)ە، بەڵام ئەگەر (**يَلْقَوا**) بێ، واتە: تاکو پێی دەگەن، دیارە ئەو ڕۆژەی بەڵێنیان پێدراوە، یان هەڕەشەیان پێی لێکراوە، یان سزای دنیایە، یان سزای ڕۆژی دواییە، یاخود هەردووکیانە.

مەسەلەی سێیەم:

**ناساندنی خـوای بـەرزی مـەزن، لـە میانـی چەنـد سـیفەت و کردەوەیەکیـدا، وەك حوكمڕانیـی ڕەهـای گـەردوون و، هەبوونـی زانیاریـی هاتنـی ئاخیـر زەمـان و، بـە دەسـت بوونـی تـکاو، بەدیهێنـەر بـوون بـۆ تێکـڕای مرۆڤـەکان:**

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى فِى ٱلسَّمَآءِ إِلَٰهٌ وَفِى ٱلْأَرْضِ إِلَٰهٌ ۚ وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٨٤﴾ وَتَبَارَكَ ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَعِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٨٥﴾ وَلَا يَمْلِكُ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِهِ ٱلشَّفَٰعَةَ إِلَّا مَن شَهِدَ بِٱلْحَقِّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿٨٦﴾ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ۖ فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٨٧﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە یازدە بڕگەدا:

١)- ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى فِى ٱلسَّمَآءِ إِلَٰهٌ وَفِى ٱلْأَرْضِ إِلَٰهٌ ﴾، ئەو (خوا ﷻ) ئەو کەسەیە، کە هەم لە سەرێ، (لە ئاسمانێ) پەرستراوە، هەم لەسەر زەویش، واتە: (**هوَ مَعبودٌ في العالَمِ العلويِّ وَالعالَمِ السُفليِّ**)، هەم لە جیهانی سەرێ و، هەم لە جیهانی خوارێ، هەر ئەو پەرستراوە، واتە: هەر ئەو شایستەی پەرسترانە، دەنا پەرستراوی دیکە هەن، بەڵام پەرستنەکەیان نا هەقە.

٢)- ﴿ وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْعَلِيمُ ﴾، بەس ئەویش کارزانی زۆر زانایە، واتە: خوا ﷻ وەسف کراوە بە حیکمەتی تەواو و، بە زانیاریی تەواو، بە جۆرێك کە پێویستیی بە حیکمەت و زانیاریی هیچ کەسی دیکەو، هیچ شتێکی دیکە نیە.

٣)- ﴿ وَتَبَارَكَ ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ﴾، بەرزو بەپێزەو بەردەوامە، ئەو کەسەی حوكمڕانیی ئاسمانەکان و زەوی و، ئەوەی دەکەوێتە نێوانیانەوە، هی ویەو بەدەست ویە.

٤)- ﴿ وَعِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ ﴾، زانیاریی کاتەکە (**ساعة**)ش تەنیا لە لای ئەوە، (**ساعة**) وەك زۆرجار گوتوومانە: یان مەبەست ئاخیر زەمانە، یان قیامەتە، یان ڕۆژی دواییە بە هەردوو قۆناغەکەیەوە، وشەی (**ساعة**) لە ئەسڵدا بەشێکە لە کات، بەڵام وەك زاراوەیەك بەکارهاتوە، بۆ کاتی هاتنی ئاخیر زەمان، یاخود قیامەت، یاخود ڕۆژی دوایی بە گشتیی.

٥)- ﴿ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴾، تەنیا بۆ لای ویش دەگێڕدرێنەوە، خوێندراویشەتەوە: (**وَإِلَيهِ تَرجعون**)، بەس بۆ لای ویش دەگەڕێنەوە.

لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ وَتَبَارَكَ ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَعِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴾، ئەمە هەواڵدانێکە بەکارهێنراوە لە ستایشکردنی خوادا ﷻ، کە مانای (**تَبارَك**) واتە: خوا خاوەن پێزو بەرزیی و بەردەوامییە، لەبەر ئەوەی (**تَبارَكَ**) لەسەر کێشی (**تَفاعُل**) بەهێزیی ئەو مانایە دەگەیەنێ، کە لێی داتاشراوە، چونکە ڕێژگەی (**تَفاعُل**) بۆ کارێکە، لە نێوان دوو لایەن دا دەکرێ، وەك (**تَقاتَلا وَتَمَارا**)، پێکەوە جەنگان، پێکەوە دەمەقاڵێیان بوو، بەڵام لێرەدا کە بەکاردەهێنرێ بەبێ بەرانبەر ڕەچاوکردنێك، مانای وایە ماناکەی بەهێزە، واتە: ئەوپەڕی پێزو هێزو بەردەوامیی بۆ خوای بەرزو مەزنە، ئنجا مانایەکەی ئاوای لێدێتەوە: حوکمڕانیی ئەم جیهانە، کە کۆتایی دێ و، جیهانی دیکە کە دێ و بەردەوام دەبێ، هەر هی ئەوە، سەرەنجامیش تەنیا بۆ لای ئەوە.

٦)- ﴿ وَلَا يَمْلِكُ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِهِ ٱلشَّفَٰعَةَ ﴾، ئەوانەی کە لە جیاتی وی (خوا)، یان جگە لە وی، لێیان دەپاڕێنەوە، هیچیان تکا کردنیان بەدەست نیە.

٧)- ﴿ إِلَّا مَن شَهِدَ بِٱلْحَقِّ ﴾، مەگەر ئەوانەیان کە شایەدیی دەدەن بە هەق، واتە: شایەدیی دەدەن بە یەکتایی خواو، شایەدیی دەدەن بە ڕاستیی پێغەمبەری خوا ﷺ تەنیا ئەوانە توانای تکا کردنیان هەیە لە لای خوا.

٨)- ﴿ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴾، شایەدیی بە هەق دەدەن و ئەوان دەشزانن، واتە: بە بەرچاو ڕوونییەوە شایەدیی دەدەن، ئەمە واتایەکی.

واتایەکی دیکەی، ﴿ وَلَا يَمْلِكُ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِهِ ٱلشَّفَٰعَةَ ﴾، ئەوانەی کە لێیان دەپاڕێنەوە، تکا کردنیان بەدەست نیە، ﴿ إِلَّا مَن شَهِدَ بِٱلْحَقِّ ﴾، واتە: (**إلاّ لِمَن شَهِدَ بِالحَق**)، مەگەر ئەوان تکا بکەن بۆ کەسێك، کە شایەدیی دەدا بە هەق، یانی: مەگەر تکا بکەن بۆ کەسێك، کە ئەهلی ئیمان بووبێ و، ئەو هەقەی خوا ﷻ بە پێغەمبەران دا ناردوویەتی، ئەوان قبووڵیان کردبێ، ئیمانیان پێ هێنابێ، ﴿ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴾، ئنجا بە بەرچاو ڕوونیی و شارەزاییشەوە، قبووڵیان کردبێ، نەك هەر بە لاساییکردنەوەی کوێرانە.

(**الطبري**) ئەم ئایەتە قورئانییە، بە دوو جۆر مانا دەکات:

١- (**لا يَملِكُ عيسى وَعُزير وَالملائِكة الذينَ يَعبُدُهُم هؤلاءِ المُشرِكون ولايؤمنون، بِالساعة، الشَّفاعةَ عِندَ اللهِ لأحَدٍ إلاّ مَن شَهِدَ بِالحَق، يَعني به عِندَهُم إلاّ لِمَن شَهِدَ بِالحَقِ، فَوَحَّدَالله وَأطَاعَهُ على عِلمٍ مِنهُ وَيَقينٍ بِتَوحيد الله**)[1]، واتە: عیساو عوزەیرو ئەو فریشتانەی، ئەو هاوبەش بۆ خوا دانەرانە دەیانپەرستن، کە بڕوایان بە ڕۆژی دوایی نیە، تکاکردنیان لە لای خوا بەدەست نیە، بۆ هیچ کەس، مەگەر کەسێك کە شایەدیی بدات بە هەق، کەسێك خوا بەیەك بگرێ و، بیپەرستێ و فەرمانبەریی بۆ بکات، لە ڕووی زانیاریی و یەقینەوە.

یانی: عیساو عوزەیرو فریشتەکان، تەنیا تکا بۆ ئەوانە دەکەن، کە ئەهلی ئیمانن.

٢- (**ولاتَملك الآلهة التي يدعوها المشركون ويعبدونها من دون الله، الشفاعة: إلاّ عيسى وعزير وذووهما، والملائكة الذين شهدوا بالحق، فأقرّوا به وهم يعلمون حقيقة ماشهدوا به**)، واتە: ئەو پەرستراوانەی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان دەیانپەرستن و لێیان دەپاڕێنەوە، تکاکردنیان بەدەست نیە، جگە لە عیساو عوزەیرو ئەوانەی وەك ئەوانن و، فریشتەکان، ئەوانەی شایەدییان داوە بە هەق و، دانیان پێدا ناوەو، زانیویشیانە، واتە: ئەوەی کە شایەدییان

---

(١) جامع البيان، ج٢٥، ص ١٠٦.

پێداوە، زانیاریی و دڵنیاییان لە بارەی چییەتیەوە هەبووە، کەواتە: پەرستراوەکانی دیکە، چ پەیکەرو دارو بەرد بووبن، چ شەیتان و مرۆڤ بووبن، هەرچی بووبن، کە ئەو شایەدییدانە بە هەقەیان نەبووە، ئەوانە توانای تکاکردنیان نیە.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ إِلَّا مَن شَهِدَ بِٱلْحَقِّ ﴾، دەڵـێ: (**الشَّـهادةُ بِالحَـقِّ: الإقـرار بتوحيـدُ اللـه**)، بریتیـە لـە دانپێنـان بـە یەکتایی خـوادا ﷻ، کـە دەشـفەرموێ: ﴿ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴾، واتـە: (**وَيَعلَمـونَ حَقيقَـة تَوحيـدِهِ**)، واتـە: لـە ڕووی زانیاریـی و بەرچـاو ڕوونیـەوە ئـەو شـایەدییە دەدەن و، چییـەتی ئـەو یەکتاییـەی خـوا دەزانـن.

ئەمـە دەشـوبهێتە ئـەو ئایەتـەی لـە سـوورەتی (**النَّجـم**)دا هاتـوە: ﴿ وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ لَا تُغْنِي شَفَٰعَتُهُمْ شَيْـًٔا إِلَّا مِنۢ بَعْدِ أَن يَأْذَنَ ٱللَّهُ لِمَن يَشَآءُ وَيَرْضَىٰٓ ﴿٢٦﴾ ﴾، واتـە: زۆر فریشـتە هـەن لـە ئاسـمانەکاندا، تکاکردنـی ئەوان هیچ سـوودێکی نیـە، مەگـەر دوای ئـەوەی خـوا مۆڵـەت دەدا، بـۆ هـەر کەسێك کـە بیـەوێ و، ڕازیـش بـێ (شـەفاعەت و تـکای بـۆ بکـرێ).

٩)- ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَهُمْ ﴾، ئەگەر لێیان بپرسی: کێ ئەوانی هێناوەتە دی، کێ دروستی کردوون؟ ئەمە پرسیارکردنی چەسپاندنە، لێرەدا ڕووی دواندن لە پێغەمبەرە ﷺ یاخود لە کەسێکی دیاریی‌کراو نیە.

١٠)- ﴿ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ﴾، {ئەگەر لێیـان بپـرسی کـێ ئـەوانی دروستکردوە؟}، زۆر بە جەختکردنەوەوە دەڵێن: خوا ﷻ.

١١)- ﴿ فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴾، کەواتە: بەرەو کوێ لا دەدرێن؟ یاخود: چۆن لا دەدرێن؟ (**أَنَّى: إسْمُ اسْتِفهامٍ عَلَى المَكَانِ، فَمَحَلُّهُ نَصبٌ عَلَى الظَّرْفِيَّة، أي: إلى أيِّ مَكانٍ يُصرَفون؟!**)، بەرەو چ شوێنێك لا دەدرێن؟ یاخود چۆن چۆنی لادەدرێن، واتە: لە پەرستنی خوا، بۆ پەرستنی غەیری خوا لادەدرێن، لە حاڵێکدا کە خوا بەدیهێنەریانەو، خوا پەروەردگارو مشوورخۆیانە، ﴿ يُؤْفَكُونَ ﴾: (**أفِكَهُ عَن كَذا، يَأفِكُهُ أي: صَرَفَهُ عَنْهُ**)، واتە: لایدا لەو شتە.

## مەسەلەی چوارەم و کۆتایی:

**خوا ﷻ ئاگاداری سکاڵای پێغەمبەرەکەیەتی ﷺ، لە چنگ گەلەکەی کە بڕوا ناهێنن، ئەویش فەرمانی پێدەکات، بە ڕوو لێ وەرگێڕانیان و پشتگوێ خستنیان، تاکو کاتی خۆیان دێ:**

خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ وَقِيلِهِۦ يَٰرَبِّ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ قَوْمٌ لَّا يُؤْمِنُونَ ﴿٨٨﴾ فَٱصْفَحْ عَنْهُمْ وَقُلْ سَلَٰمٌ ۚ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿٨٩﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿ وَقِيلِهِۦ يَٰرَبِّ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ قَوْمٌ لَّا يُؤْمِنُونَ ﴾، گوتراوەکەیشی: ئەی پەروەردگارم! ئەوانە کۆمەڵێکن بڕوا ناهێنن، خوێنراویشەتەوە: (**وَقِيْلَهُ**)، کە بێگومان ڕاناوەکەی بۆ پێغەمبەر ﷺ دەچێتەوە، ئنجا ئەگەر (**وَقِيْلِهِ**) بێ:

**أ**- ئنجا ئەگەر (وقِليهِ) بێ: (قِيل)، واتە: قسە، (**القِيلُ: مَصْدَرُ قَالَ، وَالأَظْهَرُ أَنَّهُ اسمٌ مُرادٌ بِهِ المَفعولُ، أي: المَقولُ، مِثْلُ الذِّبْح بِمَعنى مَذْبُوح، وَالمَعنى: مَقولُهُ، وَالضَّمِيرُ المُضاف إليهِ (قِيل)، ضَمِيرُ الرَّسُولِ ﷺ بِقَرِينَةِ السِّيَاقِ**)، وشەی (**قيل**) چاوگی (**قال**)یە، ناوێکە مەبەست پێی: بەرکار (**مَفعولٌ به**)ە، واتە: گوتراوەکەی، وەك (**ذِبح**) بە مانای (**مَذبوح**)، واتە: سەربڕاو، کەواتە: کە دەفەرمووێ: (**وَقِيلِهِ**)، واتە: گوتراوەکەی پێغەمبەر ﷺ، ڕاناوەکەش لە (**قِيلِهِ**)دا، دەچێتەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ، کە بە پێی سیاق دیارە.

واتە: گوتراوی پێغەمبەر ﷺ، قسەکەی پێغەمبەر ﷺ، کە چی فەرمووە؟ ﴿ يَٰرَبِّ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ قَوْمٌ لَّا يُؤْمِنُونَ ﴾، ئەی پەروەردگارم! ئەوانە کۆمەڵێکن بڕوا ناهێنن، ئەمە سکاڵاکردنی پێغەمبەر ﷺ بوو، لە چنگ قەومە کەللەڕەق و بێبڕوایەکەی.

**ب**- بەڵام ئەگەر (**قِيْلَهُ**) بێ، لە حاڵەتی بەرکار (**مَفعولٌ بهِ**)دا دەبێ و، ئەو کاتەش دەگێڕدرێتەوە بۆ سەر ڕستەی پێشێ، کە دەفەرمووێ: ﴿ أَمْ يَحْسَبُونَ أَنَّا لَا نَسْمَعُ سِرَّهُمْ وَنَجْوَىٰهُم ﴾، ئایا پێیان وایە کە ئێمە قسەی پەنهانی ئەوان و چپە چپی ئەوان نابیستین؟

لێرەش دەفەرموێ: (**وَقِيلَهُ**) واتە: هەم چپەو قسەی پەنهانی ئەوان دەبیستین، (**وَقِيلَهُ**) هەم قسەی پێغەمبەریش ﷺ دەبیستین، کە سکاڵای کرد بۆ لای خوا ﷻ لە دەست قەومەکەی، فەرمووی: ئەی پەروەردگارم! ئەوانە کۆمەڵێکن بڕوا ناهێنن.

شارەزایانی ڕێزمانی عەرەبیی، دەڵێن: (قِيلَهُ) چاوگەو (**نُصِبَ عَلَى أَنَّهُ مَفعولٌ مُطلَقٌ أي: يَسْمَعُ وَيَعْلَمُ، قولَهُ:** ﴿ يَـٰرَبِّ إِنَّ هَـٰٓؤُلَآءِ قَوْمٌ لَّا يُؤْمِنُونَ ﴾) یانی: (قِيلَهُ) مەنصووبە وەك بەرکاری ڕەها، یانی: خوا قسەکەی دەبیستێ و دەزانێ: (**يا ربِّ....**)، بەڵام ئەگەر (**قِيلِهِ**) بێ، دەچێتەوە بۆ: ﴿ وَعِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ ﴾، واتە: (**وَعِنْدَهُ عِلْمُ قِيلِهِ**)، هەروەها زانیارییشی هەیە، خوا ﷻ بە فەرمایشتەکەی پێغەمبەر ﷺ کە سکاڵای لە دەست گەلەکەی کردوە.

هەڵبەتە پێغەمبەران (علیهم صلاة والسلام) لە چەند شوێنێکی قورئاندا، لێیان گێڕدراوەتەوە کە سکاڵایان کردوە بۆ لای خوا ﷻ، بۆ وێنە:

١- لە سوورەتی (**الفُرقان**)دا: ﴿ وَقَالَ ٱلرَّسُولُ يَـٰرَبِّ إِنَّ قَوْمِى ٱتَّخَذُوا۟ هَـٰذَا ٱلْقُرْءَانَ مَهْجُورًا ﴿٣٠﴾ ﴾، واتە: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی پەروەردگارم! کۆمەڵەکەم، خەڵکەکەم، ئەم قورئانەیان واز لێ هێنا.

٢- هەروەها لە سوورەتی (**نوح**)دا، نووح ؈ سکاڵای بۆ لای خوا کردوە: ﴿ قَالَ رَبِّ إِنِّى دَعَوْتُ قَوْمِى لَيْلًا وَنَهَارًا ﴿٥﴾ فَلَمْ يَزِدْهُمْ دُعَآءِىٓ إِلَّا فِرَارًا ﴿٦﴾ ﴾، نووح ؈ چەند سکاڵایەك دەکات بۆ لای خوا ﷻ.

٣- هەروەها لە سوورەتی (**الدُّخان**)دا: ﴿ فَدَعَا رَبَّهُۥٓ أَنَّ هَـٰٓؤُلَآءِ قَوْمٌ مُّجْرِمُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾، مووسا ؈، لە پەروەردگاری پاڕایەوە، ئەوانە کۆمەڵێکی تاوانبارو خراپەکارن.

کەواتە: ئەمەش سکاڵای پێغەمبەری خاتەمە ﷺ، لەدەست گەلە کەللەڕەق و سەرکێشەکەی.

٢)- ﴿ فَٱصْفَحْ عَنْهُمْ وَقُلْ سَلَٰمٌ ﴾، چاوپۆشییان لێ بکە، یاخود ڕوویان لێوەرگێڕەو بڵێ: سەلام، خوێندراویشەتەوە: (**فَسَوفَ تَعْلَمُون**)، واتە: بەشێوەی دواندن لەمەودوا ئێوە دەزانن، هەندێك لە زانایان گوتوویانە: دوای ئەوەی ئایەتەکانی فەرمان کردن، بە جەنگ و جیهاد هاتوونە خوارێ، ئەمە نەسخ بۆتەوە، چونکە خوا ﷻ فەرمان بە پێغەمبەر ﷺ دەکات: ڕوویان لێوەرگێڕە، یاخود چاوپۆشییان لێ بکە، لە مافی خۆت، کە بەبێ نەزاکەت دەتدوێنن و تۆمەتت بۆ هەڵدەبەستن، قسەی خراپت لە بەرانبەردا دەکەن، لە هەقی خۆت چاوپۆشییان لێ بکەو، بڵێ: سەلام، وەك زانایان گوتوویانە: (**سَلَامَ مُوادَعَةٍ وَمُتَارَكَة**)، سەلامکردنی خوا حافیزیی و وازلێهێنان، نەك سەلامکردنی بڵێ: ئاشتیی و سەلامەتییتان لەسەر بێ.

٣)- ﴿ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴾، لە مەودوا دەزانن، خوێنراوەتەوەش: (**فَسَوفَ تَعْلَمون**) ئەوەش شێوازی ئاوڕدانەوە (**اِلتفات**)ە، یانی: لە مەودوا دەزانن ئەی بێبڕوایەکان! تووشی چ سزایەك دەبن.

گوتمان: هەندێك لە زانایان گوتوویانە: ئەم ئایەتە نەسخ بۆتەوە، دوای ئەوەی ئایەتەکانی فەرمان کردن بە جەنگ هاتوونە خوارێ.

بەڵام وانییە، هەرچەندە نەك هەر لێرە، لە زۆر شوێنی دیکەش دا، هەموو ئەو ئایەتانەی فەرمان دەکەن بە چاوپۆشییکردن و ڕوو لێوەرگێڕان و پشتگوێ خستن، هەندێك لە زانایان گوتوویانە: هەموو ئەوانە نەسخ بوونەوە، بەڵام بێگومان ئەو بۆچوونە ڕاست نییە، چونکە:

**أ**- جارێ لە قوڕئانی مەککەیدا، ئایەتی نەسخ کراوە هەر ناگونجێ هەبێ.

**ب**- پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەدینەش کاتێ قسەی ناشایستەی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، یاخود هی جوولەکەکان، بەڵکو جاری وا هەیە هی مسوڵمانانی دڵ نەخۆشیشی دەبیست، هەر لاملی تێدەکردن و پشتگوێی دەخستن.

ج- ئەوە یەكێكە لە ڕەوشتە بەرزەكانی پێغەمبەر ﷺ كە خوا ﷻ فەرمانی پێكردوە، خۆیان پێ برازێنێتەوەو شتێكی چەسپاوەو، حوكمێكی شەرعیی كاتیی نیە، كە بگونجێ نەسخی بەسەردا بێ، هەرچەندە لە هەموو قورئان دا یەك حوكمی تێدانیە، نەسخ كرابێتەوە، بەو واتایە كە كاری پێ نەكرێ.

ئنجا (**محمد أمين الشنقيطي**)، لە تەفسیرەكەی خۆی: (**أضواءُ البيان**)دا، دەڵێ: باسكردنی نەسخ لێرەدا، هیچ ڕێی تێناچێ، چونكە جەنگ كردن لە شوێنێك دایە، كە پێویستە جەنگی تێدا بكرێ و، لە شوێنێكیش دا كە پێویست بێ، بە ڕەوشتی جوان و لێبوردەیی و سینگ فراوانیی و، چاوپۆشی مامەڵە بكرێ، ئەویش لە شوێنی خۆی دا، وەك لە تەفسیرەكەیدا[1] گوتوویەتی، زانایانی دیكەش لەو بارەوە هەمان قسەیان كردوە.

كەواتە: لە كۆتایی ئەم سوورەتەدا، خوا ﷻ ڕایدەگەیەنێ، كە ئاگاداری ئەو قسەیەی پێغەمبەرە ﷺ، كە سكاڵای بۆ لای پەروەردگاری كردوە: پەروەردگارم! ئەوانە كۆمەڵێكن بڕوا ناهێنن، خوای پەروەردگاریش پێی دەفەرموێ: ﴿ فَٱصۡفَحۡ عَنۡهُمۡ ﴾، ڕوویان لێوەرگێڕەو، چاوپۆشییان لێ بكە، لە هەقی خۆت، ﴿ وَقُلۡ سَلَٰمٞۚ ﴾، پێشیان بڵێ: سەلام، خواتان لەگەڵ، مادام هەر بڕوا ناهێنن و لەگەڵیاندا گەیشتوویە بن بەست، كاتی خۆتیان لەگەڵ بە فیڕۆ مەدە.

﴿ فَسَوۡفَ يَعۡلَمُونَ ﴾، لە مەودوا دەزانن، یاخود پێیان بڵێ: سەلامتان لێ بێ، (**فَسَوفَ تَعلَمون**)، لەمەودوا ئێوە دەزانن، یانی: ئەوە هەمووی فەرمایشتی پێغەمبەرە ﷺ، دیارە لە حاڵێكی وادا، كە ئینسان لەگەڵ كەسانێكدا كە كەللەڕەقن و، نەسەلمێنن و هیچیان لێ هەڵناكرێ، دەگاتە بنبەست، هیچ چاری نیە، مەگەر بڵێ: خوا حافیزتان بێ و، چی دیكە كاتی خۆییان لەگەڵدا بەفیڕۆ نەدات.

---

(١) ج٧، ص٧.

لێرەدا دێینە کۆتایی تەفسیری سووڕەتی (الزخرف)، لە خوای پەروەردگار داواکارین، کە بە لوتف و کەرەمی خۆی، عەقڵمان هۆشیارترو، دڵمان بێدارتر بکات، بۆ باشتر لێ تێگەیشتنی فەرمایشتەکەی و، چاکتر تێدا پێگەیشتنی، بە هۆی پێوە پابەندبوون و بەرجەستە کردنیەوە، چ ئەوەی لە ژیانی تاکییمان دا دەکرێ، چ ئەوەی لە ژیانی خێزانیی و، چ لە ژیانی کۆمەڵایەتیی و، چ لە ژیانی سیاسییماندا، یارمەتییمان بدات، ئەم قورئانە خۆمانی پێ بژێنینەوەو، دەوروبەرمانی پێ بژێنینەوەو، خۆمانی پێ پاك و چاك بکەین، دەوروبەرمان پێ پاك و چاك بکەین.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# نێــوەڕۆک



## تەفسیری سوڕەتی فصلت

## تەفسیری سوڕەتی الشوری

## تەفسیری سوڕەتی الزخرف